# سەرجەم بەرهەمەکانی





# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی چوارەم

ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر — دکتۆر دڵشاد مەحموود

دکتۆر ئازاد عوبێد — دکتۆر کامەران محەمەد

هەولێر ٢٠٢٢

# سەرجەم بەرهەمەکانی

# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی چوارەم


ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر    دکتۆر دڵشاد مەحموود

دکتۆر ئازاد عوبێد    دکتۆر کامەران محەمەد



هەولێر ٢٠٢٢

* ناوی کتێب: سەرجەم بەرهەمەکانی - دکتۆر کەمال مەزهەر- بەرگی چوارەم
* ئامادەکردنی: لیژنەی کۆکردنەوەی نووسین و بەرهەمەکانی پ. د. کەمال مەزهەر
* گشت کارە هونەریەکان و سەرپەرشتی چاپ: عوسمان پیرداود کواز
* وێنەی سەر بەرگ: هونەرمەند نورەدین جاف
* چاپی یەکەم - هەولێر - ٢٠٢٢
* تیراژ: (١٠٠٠) دانە
* چاپخانە: چاپخانەی دانیشفەر- هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩١٨) ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.
* نرخ (٦٠،٠٠٠) دینار

## بەرگی چوارەم:

## ئەم کتێبانە لەخۆ دەگرێت:

* میر (وردبونەوەیەکی مێژوویی دەربارەی مەکیاڤیللی و مەکیاڤیللیزم).
* ڕێنیسانس لەگەڵ باسێکی تر بە ناونیشانی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ.
* ئافرەت لە مێژوودا (کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی).
* چینی کرێکارانی عێراق (دروست بوون و سەرەتای بزووتنەوەی).

## پێشەکی

مایەی شانازی لیژنەی تایبەتی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی مێژووناسی ناودار و پەروەردەکاری گەورەی کۆچکردوو پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەرە، سەرجەم بەرهەمەکانی لە (١٠) بەرگدا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بخاتە بەردەستی خوێنەرە بەڕێزەکان. لەو دە بەرگە شەشی یەکەمیان بە زمانی کوردیین و ئەوانی دیکەشیان، واتا لە حەوتەمەوە تا دەیەم بە زمانی عەرەبیین. ئەمە بەشی یەکەمی ئەو پرۆژە گەورەیەیە کە ئامانجەکەی ئەوەیە سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆبکاتەوە و سەرلەنوێ لە چاپیان بداتەوە.

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد پێشەنگی لێکۆڵەرانی مێژووی نوێی کورد و کوردستانە و بگرە بە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تایبەتیی مێژوویی کورد دەژمێردرێت؛ چونکە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە چەندین نەوە بۆ یەکەمین جار لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی ئەوەوە سەبارەت بە کورد و کوردستان ئاشنای میتۆدی زانستی بوون لە بواری مێژوودا، کە پێشتر پێی ڕانەهاتبوون. تا ئەو ڕۆژانە خوێنەرانی کورد بەو چیرۆک و ئەفسانانە ڕاهاتبوون کە باسیان لە مێرخاسی و ئازایی میر و سەرکردە خۆجێییەکانیان دەکرد و ئەوانەیان بە سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی دادەنا. کتێب و وتارە مێژووییەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کارێکی وایان کرد، خوێنەرانی ئاسایی و ڕووناکبیرانی نەوەی نوێی کورد، مێژوویان لە لا خۆشەویست بێت و هەوڵبدەن توانای خۆیان بۆ لێکدانەوەی مێژووی نەتەوە ستەملێکراوەکەیان بخەنەگەڕ، ئەوە سەرباری ئەوەی کە دکتۆر کەمال دەورێکی گەورەی هەبوو لە هاندانی چەندین خوێندکار لە بەشەکانی مێژووی زانکۆکان بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە بواری مێژوودا لە ناوەوە و لە دەرەوەی عیراق. جگە لەوەش وانەکانی بۆ قوتابیان کە زۆربەیان کوردیش نەبوون هەمان دەوریان هەبوو لە ڕووکردنە خوێندنی باڵا بۆ خوێندنی مێژوو بە ڕێبازێکی زانستی، ئەو شاگردانە بە درێژایی تەمەنیان و کاروانی زانستییان

به دڵسۆزی و وەفاداری بۆ مامۆستای گەورەیان مانەوە. ئەم کارانەی تەنیا خوێندکارانی کوردی نەدەگرتەوە، بەڵکو هەموو ئەو خوێندکارانەشی دەگرتەوە کە سەرپەرشتی نامە و تێزەکانی کردوون یان بۆ پرس و ڕاوێژ ڕوویان لێی ناوە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی لێکۆڵینەوە و پرۆژەی توێژینەوە زانستییەکانیان.

دکتۆر کەمال بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردەوە کەوا بواری مێژووی کورد وەک کێڵگەیەکی نەکێڵراو و نەچێندراوە، بۆیە ئەو ئەرکە مەزنە پێویستی بە چەندین نەوەی توێژەر هەیە بۆ ئەوەی بەشێکی بەجێبێنن. دکتۆر کەمال زۆر بەوە دڵخۆش بوو کاتێ ئاوڕی دواوەی دەدایەوە بەرهەمی کاری پەروەردەیی خۆی دەبینی، کە چەندین توێژەر و پسپۆڕ لە بواری مێژووی کورددا لەوانەی ڕاستەوخۆ بەشداریی لە پێگەیاندنیاندا کردبوو خەریکی کارکردنن لەسەر مێژووی کورد و کوردستان. ئەوانەی سەرپەرشتی نامە و تێزە زانستییەکانیانی کردبوو یا لە ڕێی کتێب و وتار و توێژینەوە مێژووییەکانییەوە کاریگەری لەسەر دانابوون. بەرهەمی زانستیی دکتۆر کەمال مەزهەر جێی بایەخی کۆڕ و ناوەندی بەرفراوانی خوێنەران و ڕووناکبیرانی کورد و عێراقییەکان بوو.

گومان لەوەدا نییە کە کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی مێژووناسێکی پڕ بەرهەمی وەک کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر پێویستی بە پاڵپشتی و هاوکاریی چەندین توێژەر و ڕووناکبیر هەیە، تەنانەت ئەوە ئەرکی دامەزراوەیەکی تایبەتمەندە لەگەڵ چەندین کادیری زانستی و کارگێڕی تەرخانکراو بۆ ئەو کارە، نەک ئەرکی لێژنەیەکی خۆبەخشی چوار کەسیی، کە لێرە و لەوێ کار دەکەن و سێ کەسیان لە هەمان کاتدا مامۆستای زانکۆن و دەبێ سەرقاڵی وانە وتنەوەو و کاری زانستیی خۆیان بن.

ئەم لێژنەیە بەر لە کۆچی دوایی زانای گەورەمان بە چەند ڕۆژێک پێکهات، بە مەبەستی کۆکردنەوەی کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی و

پۆلێنکردنیان و پاشان لە چاپدان و بڵاوکردنەوەیان. لیژنەکە پێی باشە کۆی بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو بەم شێوەیەی خوارەوە بەسەر شەش بەشدا دابەش بکات:

**بەشی یەکەم:** کە بە خۆشحاڵییەوە وا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران، کە هەموو کتێبە بڵاوکراوەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە دە بەرگدا دەگرێتە خۆ. سەرلەبەری لاپەڕەکانی ئەم بەشە حەوت هەزار و دوو سەد و پەنجا لاپەڕەن.

**بەشی دووەم:** ئەو لێکۆڵینەوە زانستی و وتارانەن کە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە. لیژنەکەمان بەشێکی لەو وتارانە بەدەستهێناوە و وێنەیانی گرتووە، بەڵام لەم بوارە هێشتا کاری زۆر ماوە، پێویستی بە هاوکاری ژمارەیەکی زیاتر لە ئەندامانی لیژنەی سەرپەرشتیار هەیە.

**بەشی سێیەم:** ئەم بەشە ئەو کارە زانستی و رۆژنامەوانییانەی دکتۆر کەمال مەزهەر دەگرنەوە کە بە زمانی ڕووسی نووسیونی و بڵاوی کردوونەتەوە و خۆیان لە هەزار و پێنج سەد لاپەڕە دەدەن. ئەمانەیان پێویستە بکرێن بە کوردی، لیژنە هەنگاوی یەکەمی بۆ ئەمە ناوە. لە بەسەرکردنەوەی لیستی دانراو و توێژینەوەکانیدا بۆ لیژنەکە دەرکەوت کە هەندێ لەم توێژینەوە و وتارانە لە کاتی خۆیدا خوالێخۆشبوو کردوونی بە کوردی یان عەرەبی یانیش لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی دواتری خۆیدا بەکاری هێناون.

**بەشی چوارەم:** ئەم بەشەیان تەرخانکراوە بۆ کۆکردنەوەی ئەو پێشەکییانەی بۆ ژمارەیەکی بەرچاو لە کتێب و دانراوی توێژەرانی کورد و عەرەب نووسیوونی، وێڕای ئەو یادداشتنامانەی کە بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەی کردوون و پێشەکی بۆ نووسیون. ئەو پێشەکییانە زانیاری و لێکدانەوەی گرنگیان تێدان و وا پێویست دەکات بایەخ بە کۆکردنەوەیان بدەین لە زیاتر لە بەرگێکدا.

**بەشی پێنجەم:** لیژنە هەوڵدەدات ئەم بەشە بۆ ئەو دیمانە و دیدار و چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیانە تەرخان بکات کە لەگەڵ دکتۆر کەمالدا کراون، کە تێیاندا بیروبۆچوون و لێکدانەوەکانی بۆ زۆر پرسی زانستی و هزری و ڕووناکبیری دەربڕیون. ئەمانە شایەتی بۆ ئەوە دەدەن کە ئاگاداریی بەرفراوانی لەمەڕ پرسەکان هەبووە و ڕاستیی و دروستیی گەلێ لە بۆچوونەکانی و قووڵیی لێکدانەوەکانی دەردەخەن. ئەمەشیان بابەتگەلێکی دەوڵەمەندن؛ بۆ توێژینەوە و لێکدانەوە لە بیروبۆچوونە هزری و ڕووگە ڕووناکبیرەکانی.

**بەشی شەشەم:** بە ئومێدی ئەوەین ئەم بەشەیان هەموو ئەو نووسینانە بگرێتەخۆ کە لەبارەی کۆچکردووەوە نووسراون و بڵاوکراونەتەوە، جا چ کتێب و نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا بن یان لێکۆڵینەوە و وتار کە لە سەروبەندی کۆچکردنی یان لە بیرەوەری یەکساڵەی کۆچی دوایی گوتران. پێمانوایە ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانە کە پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد سەرپەرشتی کردوون و بەپێی ڕێنماییەکان توێژینەوەی هاوبەشن، لەم بەشەدا جێیان بکەینەوە. کۆچکردوو لە داڕشتنی کاری زانستی خوێندکارانیدا داهێنەر بوو، لە پرۆژەی ماستەرنامە و کارنامەکانی دکتۆرا لە بیرۆکە و ناوونیشانی بابەت و پلانی لێکۆڵینەوە بگرە تا دەگەیشتە لێکدانەوە و ڕێکخستنیان، بۆیە بە پێویست زانرا پێڕستێک بە ناوونیشانی ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانەی کە سەرپەرشتی کردوون و ناوی خوێندکار، و ئاستی کارەکە و مێژووەکەیان لەم بەشەدا جێگە بکرێنەوە. جێی خۆیەتی لێرە ئاماژە بە بەشداریی پڕجۆش و دەوڵەمەندانەی دکتۆر کەمال بکەین لە گفتوگۆی دەیان نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرادا کە پڕ بوون لە زانیاری دەگمەن و بیرۆکەی هێژا. لەبەر ئەوەی ئەو گفتوگۆیانە بە وێنە و دەنگ تۆمار کراون؛ هەوڵدەدەین پەیوەندی بە لایەنی پەیوەندیدارەوە بکەین بۆ ئەوەی ئەو تۆمارانە دەست بخەین، لە داهاتوودا بخرێنە سەر کاغەز و لە چوارچێوەی سەرجەم بەرهەمەکانیدا

بڵاو بکرێنەوە. هەروەها لیژنەی تایبەت پەیوەندی بە خوێندکارە بەتواناکانی کۆچکردووەوە دەکات بۆ ئەوەی وتاری بابەتیانە سەبارەت بە شێوازی وانەوتنەوەکانی بنووسن.

لیژنەی تایبەت کە لەم بەڕێزانە پێکهاتووە: پرۆفیسۆر دکتۆر جەبار قادر، پرۆفیسۆر دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر کامەران محەمەد حاجی، لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بیبلیۆگرافیایەکی سەرەتایی بۆ سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر ئامادە کردووە، ئەوە وێڕای ئامادەکردنی کتێبە دانراو و وەرگێڕانەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بۆ چاپ، کە ئەم بەشەیە وا لێرەدا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران و توێژەران.

خۆشبەختانە ئەندامانی لیژنەکە دەستیان گەیشت بە بەشێکی گرنگ لە نووسین و بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کە لە کتێبخانە تایبەتییەکەی خۆیدا پارێزراون. ئەوەی لەوێدا کەوتە بەرچاویان وێنەیان گرتن و هەندێ کاریان لەسەر کراوە. هاوڕێ و دۆستانیش لە دەرەوەی لیژنەکە لە هەبوونی کۆمەڵێ وتار و توێژینەوە و کتێب کە پەیوەندییان بە کۆچکردووەوە هەیە ئاگاداریان کردینەوە. بەشێکیش لەو توێژینەوە، وەرگێڕان، لێدوان یان ئەو نووسینانەی خوێندکارەکانی و مامۆستاکانیان و هەڤاڵانی کۆچکردوو لەبارەی ژیانی تایبەتی و زانستی ئەوەوە نووسیوویانە دۆسیی تایبەتییان بۆ ڕێکخراون. لیژنە ژمارەیەک وتار و توێژینەوەی مامۆستای کۆچکردوویان تایپ کردووەتەوە و بە وردی پێیانداچوونەوەتەوە و هەڵەچنیان بۆ کردوون.

لیژنەکە دوابەدوای بڵاوکردنەوەی سەرجەمی کتێبەکانی بە کوردی و عەرەبی، کە ئەم بەشەی پرۆژەکە پێکدێنن، کۆشش بۆ تەواوکردنی بەشەکانی دیکەی ئەم پرۆژە زانستی و ڕووناکبیرییە گەورەیە دەکات؛ ئەم کارە بۆ خزمەتی ڕاستی و مێژووە و بەرز ڕاگرتنی بەخششی ئەم مرۆڤە مێژووزان و پەروەردەکارە مەزنەی نەتەوەی کورد کە بەدەگمەن هاوشێوە و هاوتای دووبارە دەبێتەوە. لێرەوە لیژنەی سەرپەرشتیار داوا لە توێژەران

و ئەو خوێنەرانە دەكات كە بایەخ بە بەرهەم و داهێنانەكانی ئەم پیاوە مەزنە دەدەن دەستی یارمەتی بۆ لیژنەكە درێژ بكەن و هەر گۆڤار و ڕۆژنامەیەكیان لە لا پەیدا دەبێ كە لێكۆڵینەوە، وتار یان دیدار و چاوپێكەوتنی ڕۆژنامەوانی بڵاوكراوەی كۆچكردوویان لە لایە، بیخەنە بەردەستی لیژنەكە. بێگومان هاوكاری و یارمەتی هەمووان لەم بارەیەوە دەبێتە بنەما و بناغە بۆ دامەزراندنی كتێبخانەیەكی مێژوویی و مۆزەخانەیەكی تایبەت بە كۆچكردوو كە دەكرێ هەرچی پەیوەندی بەوەوە هەبێت تێیدا كۆبكرێتەوە و بپارێزرێت. دابەشكردنی كتێب و بەرهەمەكانی كۆچكردووی گەورە لە ڕووی بابەت و ژمارەی لاپەڕەكانەوە بەسەر بەرگەكانی ئەم چاپەدا كێشەیەكی هەندێ ئاڵۆز بوو لە بەردەم لیژنەكەدا، لەم بارەیەوە گفتوگۆی زۆر كرا تا ئەوەی لە كۆتاییدا لەسەر ئەم شێوە دابەشكردنەی خوارەوە گیرساینەوە:

**بەرگی یەكەم:** "كوردستان لە ساڵەكانی شەڕی یەكەمی جیهاندا"، "مێژوو- كورتە باسێكی زانستی مێژوو و كورد و مێژوو"، "خەباتی ڕزگاریخوازی كورد و ئازەر لە ئێراندا".

**بەرگی دووەم:** "تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی كوردیدا"، "چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد – بەرگی یەكەم".

**بەرگی سێیەم:** "چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد – بەرگی دووەم".

**بەرگی چوارەم:** وەرگێڕانی كوردیی كتێبی: "وردبونەوەیەكی مێژوویی دەربارەی مەكیاڤیللی و مەكیاڤیللیزم"، "ڕێنیسانس لەگەڵ باسێكی تر بە ناونیشانی ئەدیب و ئەركەكانی قۆناغ"، "ئافرەت لە مێژوودا- كورتە باسێكی مێژوویی و كۆمەڵایەتی"، "چینی كرێكارانی عێراق - دروست بوون و سەرەتای بزووتنەوەی".

**بەرگی پێنجەم:** "كورد و كوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەكانی حكوومەتی بەریتانیادا – بەرگی یەكەم".

**بەرگی شەشەم:** "كورد و كوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەكانی حكوومەتی بەریتانیادا – بەرگی دووەم".

**بەرگی حەوتەم:** وەرگێڕانی عەرەبیی کتێبی: "كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى" و کتێبی "كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير- دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق".

**بەرگی هەشتەم:** "دراسات في تاريخ إيران الحديث والمعاصر"، "أضواء على قضايا دولية في الشرق الأوسط"، "النهضة".

**بەرگی نۆیەم:** "صفحات من تاريخ العراق المعاصر- دراسات تحليلية"، "الطبقة العاملة العراقية- التكون وبدايات التحرك"، "ثورة العشرين في الإستشراق السوفيتي"، "رأي للمناقشة: الإطار الزمني لتأريخ العراق الحديث والمعاصر".

**بەرگی دەیەم:** "دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية"، "إنتفاضة عام ١٩٢٥ الكردية في تركيا - دراسة تحليلية"، "حول مسألة الإقطاع بين الكرد"، "ميكافيلي والميكافيلية"، "محاضرات في تاريخ الدول الكبرى بين الحربين العالميتين". وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، شەش بەرگی یەکەمی بە زمانی کوردین و چوار بەرگی دواییش بە زمانی عەرەبیین.

لە کۆتاییدا لیژنەکەمان سوپاسی هەموو ئەو ناوەند و بەڕێزانە دەکات کە ئامادەییان دەربڕی پشتگیری مادی یا مەعنەوی لە پرۆژەکە بکەن، دیارە بە ژمارە زۆرن، لە پێشەوەشیان سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولفەتاح بۆتانی، کە ژوورێکی تایبەتی بۆ ئەم لیژنەیە لە ئەکادیمیا تەرخان کرد. هەروەها سوپاسی دۆستی هێژا پرۆفیسۆر دکتۆر عیماد جەواهیری دەکەین کە تێبینی و سەرنجەکانی ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە زیادکردنی تەوەرێکی نوێ بۆ بەشی شەشەمی پرۆژەکە. هەروەها سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە ئەرکیان کێشا و لیژنەکەیان لە وتار و لێکۆڵینەوەکانی کۆچکردوو ئاگادار کردەوە. هەروەها لیژنەکە سوپاسی مامۆستا جەلال زەنگابادی دەکات کە دڵسۆزانە بۆ سەرخستنی پرۆژەکە بە باشترین شێوە کار دەکات.

**لیژنەی تایبەت بە کۆکردنەوە و**
**بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر**



# نیکۆلۆ مەکیاڤیللی

# میر

لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکی دکتۆر کەمال مەزهەر دا


وەرگێڕانی

حسێن عارف


لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی

خەیری حەمادەوە


دار الافاق الجديدة - بيروت - چاپی نۆیەم

چاپی دووەم 2006 هەولێر

# دوكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد

## وردبونەوەیەكی مێژوویی
## دەربارەی مەكیاڤیللی و مەكیاڤیللیزم

• •

## سەرپێ خستنێكی نوێی بیروباوەڕەكانی
## مێژوونووسی گەورەی سەردەمی ڕا پەڕین.

**تێبینی:** ئەم لێكۆڵینەوەیە لە ژمارە (٦)ی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٧٩ ی گۆڤاری "آفاق عربية"دا بڵاوكراوەتەوە.

**مێژوو** کەم جار ڕووناکبیرێکی وەهای بە خۆیەوە دیوە کە بەردەوام و بە درێژایی چەند سەدەیەك، لە هەموو کووچەیەکی ئەم جیهانە بەرینەماندا بیروڕاکانی بە وێنەی مەکیاڤیللی ی ئیتاڵیایی کە ناوی دەچەسپێتە زەینی هەریەکێك لەوانەی بۆ یەکەم جار لە دەرگای سیاسەت دەدەن، بووبێتە مایەی بێنەو بەرەیەکی پڕ لە ناکۆکی. لەبەر ئەوە شتێکی سەیرنییە کە ئەم پیاوە و بەرهەمی قەڵەمەکەی دەستی تائەم ڕۆژانەش لە لایەن گشت لێکۆڵەرەوەکانەوە بەهەموو ڕێبازە جۆراجۆرەکانیانەوە، جێگای بایەخ پێدان بێ. جا هەرچەندە ڕووی شێوێنراوی مەکیاڤیللی لە دێر زەمانەوە لە بیرو هۆشی ڕۆژئاواییەکاندا بەرەو سڕینەوە چووەو ڕووە ڕاستەقینەکەی جێگای گرتۆتەوە، بەڵام لای ڕۆژهەڵاتیەکان هێشتا هەر وێنەکەی لەوەبەری لە بیرو هۆشدا چەسپەو بە شێوەیەکیش کە جیاوازیی لەگەڵ ئەوەکەی ئەورووپای سەدەکانی پێشوودانیە. سا ئەم لێکۆڵینەوەیە ئامانجی ئەوەیە کە بەپشت بەستن بە نووسینەکانی خۆیو بەو دوا بیروڕایانەی لێکۆڵەرەوەکان سەبارەت بیروباوەڕەکانی پێیگەیشتوون، ڕووە ڕاستەقینەکەی مەکیاڤیللی بخاتە پێش چاو. هەروەکو تەقەلا دانێکیشە بۆ گەیشتن بەهەندێ ئەنجام لێدەرهێنانی نوێی ئەوتۆ کە بۆ گفتو گۆ لە سەرکردن و پەرەپێدان دەشێن.

# کورتەیەکی ژیانی مەکیاڤیللی

نیکۆلۆ دی بیرناردۆ مەکیاڤیللی، لە (٣) ی مایسی (١٤٦٩) دا لە شاری فلۆرنسا کەدەکەوێتە ناوەڕاستی ئیتاڵیاوە، لە دایك بووە. بە ڕەچەڵەك لە بنەماڵەیەکی تۆسکانیاییی سەرداری رەسەن بووە کە زۆر کەسیان بە درێژایی دەیەها ساڵ پایەوپلەی گرنگیان داگیر دەکردو لەئاکامیدا چرژابوونە کۆڕی ژیانی سیاسی ی پڕ لە چست و چالاکیی فلۆرنساوە، تەنانەت خاوو خێزانی باپیرە گەورەی لە ئەنجامیدا لەساڵی (١٢٦٠) دا توشی دەرکردن لە شار بووبوون و یەکێکیشیان لەبەندیخانەدا لیمردبوو. هەروەها پێش ئەوەی مەکیاڤیللی چاو بەژیاندا هەڵبێنێ، خێزانەکەیان لەڕووی بارەی ئابوورییەوە لە شکستیدا بووە ئەوە، وەك لەدواییدا سەرنجی دەدەینێ، هەندێ شوێنەواری بە هەڵس و کەوتییەوە جێهێشتوە. کەوابێ مەکیاڤیللی لە باوەشی سیاسەت و ڕۆشنبیریدا پەروەردە بووە. باوکی پارێزەریکی ناسراو بووەو دایکیشی شیعری داناوە. جا هەرچەندە زانیاریمان دەربارەی ماوەی نۆبەرەی ژیانی مەکیاڤیللی بەو شێوەیەی سەرچاوە سەرەتاییەکانی باری رۆشنبیریی ئەومان بۆ رۆشن بکاتەوە لەبەردەستدا نییە، بەڵام گومانی تێدانییە کە بە پێوانەی سەردەمی خۆی، خوێندەوارییەکی باشی بەنسیب بووە و قانوون و مێژووی[1] خوێندنەوە. لەتەمەنی حەوت ساڵاندا دەستی کردۆتە فێربونی زمانی لاتینی[2] کە ئەو وەختە زمانی زانست و ڕۆشنبیری بووە.ئینجا هەر لە سەرەتایلاوێتییەوە، حەزی خۆی بۆ هەردوو ڕۆشنبیریی کۆن و نوێ نیشانداوەو خوتبەکانی خوتبەدەری ڕۆمانیایی شیشرۆن (١٠٦-٤٣-پ.ز)

ی خوێندونەتـەوە و نوسـینەکانی ئەرسـتۆی خـەتم کـردوون و بـە بایـەخ پێدانەوە، شوێن نووسینەکانی هەردوو ڕابەری سـەردەمی ڕاپـەڕین دانـتی (١٢٦٥-١٣٢١)و پـەترارك (١٣٠٤-١٣٧٤) کـەوتوە. بـەڵام قوتابخانـەی ڕاسـتەقینەی مـەکیاڤیللی، شـەقامەکانی شـاری فلۆرنـسا بـووە کـە گـەورەترینی بلیمەتـەکانی سـەردەمی ڕاپـەڕینی وەك دانـتی و لیۆنـاردۆ داڤینشی و مایکل ئـەنجلوو چەندانی تریشی بـە جیهـان بەخـشیوە. ئـەم شارە لەوەدا لەگەڵ شـارەکانی تـری ئیتاڵیـادا جیـاواز بـووە کـە چـست و چالاکی یەکی فراوانی ئەوتۆی تێدابووە نـەك تـەنها پیشەی دەسـتەیەکی هەڵبژاردە بووبێ بەو وێنەیەی لە شارێکی گرنگـی وەك ڤینیـسیادا دەکـرا، بەڵکوو پیشەی هـەموو فلۆرنـساییەك بـووە. واتـە لـەم شـارەدا، بـە پێـی وەسـف کردنیلەلایـەن یـەکێك لەمێـژوو نوسـانەوە[٣] "هـەموو خەڵکەکـە سیاسـی بـوون" جـا بەڕاسـتی.شـەقامەکانی فلۆرنـسا، گـەلی کارەسـاتی سیاسی ی یـەك بـەدوای یـەکی پـڕ لـە دەرس و عیبرەتیـان بـە خۆیانـەوە دیبوو کە چەسپابوونە یـادی خەڵکەکـەیـەوە و بـەردەوام دەیانگێڕانـەوە و کارەسـاتی ژیـانی تایبـەتیی خۆیانیـان پێـوە بەنـد دەکـردن. دوو چـاوی بریقەدار و سەرنجێکی کاریگەری پڕ مانـا بنـوێنن. باڵایـەکی مـام ناوەنـدی ودوو لێوی تەنك کە زەردەخەنەکەیان هەرچی یەك لـە قـووڵایی دەروونیـدا بـسووڕی ئاشـکرای بکـەن.سەرچـاوەکان پـشت بـە نووسـینەکانی هاوچـەرخەکانی دەربـارەی و بـەو تابلۆیانـەی هەنـدی لـە وێنەکیـشەکانی سـەردەمی ڕاپـەڕین کێـشاویانە بـەم جـۆرە وەسـفی ڕەنـگ و ڕووی مەکیاڤیللییان کردوە.بەڵام لەودیو ئەم شێوەیەوە جیهانێکی لە بەها خۆی حەشار دەدا.مەکیاڤیللی بەنموونەیەکی دەگمـەنی قـسەقوتی و کاریگـەری لەگوێگرو دەم ڕاستی و ڕووخۆشی لـە ئاسـتی خـەڵکی هەمەچەشـنەدا، لـە

دار فرۆشـەکانی گوندەکەیـەوە تـا میرەکـانی ئیتاڵیـا و ئینجـا پادشـاکانی ئـەورووپا ناسـرابوو کـە بـەوە هـەوڵی دەدا. لـە هـەموو حاڵەتێکدا جێگـەی ڕەزامەندی بیو بچێتە دڵی خەڵکەکەوە واتە پیاوێکی خۆش مەعشەربووەو بـۆ برادەرانیـشی هێجگـار دڵـسۆز بـووەو لـە پێنـاوی خێـرۆ خۆشـی و پایەبڵندییاندا هەرچییەکی لە باردا بووبی چ بـە قـسەو چ بـە کـردار بـۆی کردوون.هەروەکوو لە ژیانیدا دڵڕەقیی نەزانیوە چییە و بەزەیی بەو مرۆڤە بیگوناهانەدا هاتۆتەوە کە بوونەتە کۆچـی قوربـانی و ئەمـەش بـە ئاشـکرا لەو نامە زۆرانەدا دەردەکەوی کە بۆ برادەرانی خۆی نووسیون خۆ لە قسە لـە ڕووییـشدا، هـیچ یـەکێك لـە نـاودارانی سـەردەمەکەی شـانی لـە شانینەداوە[٤]. بەڵام لە پاڵ هەموو ئەمانەدا، پیاوێکی بە گومـان و دوو دڵ و ڕاڕا بووە.هەورەها ئەو ئەگەر چی جارێکیان سەبارەت بە خۆی وتـوێتی: "من بە هەژاری لە دایك بووم لەبەر ئەوە پێش خۆشیبینین، هەست کـردن بە موحتاجی فێربووم[٥]" لەگەڵ ئەوەشدا خۆشی ی لە ژیاندا بـە خۆیـەوە بینیـوە و تێگەیـشتنێکینیتاڵیاییانەی ڕەسـەن تێگەیـشتووە. ژیـانی خۆشویـستوەو سـەخی تەبیعـەت بـووەو ڕەزیـل و پیـسکە نـەبووە. لـە پـارەوپوول سـەرفکردندا، چ بـۆ خـۆی و چ بـۆ برادەرانـی دەسـتی نـە گێراوەتـەوە[٦] یـا هەرچـەندە مێبـازو جـوان پەرسـت بـووە، بـەڵام قـەت نەیدەگەیاندە ڕادەی غافڵ بوون لە نەریت و بـواری بـە خـۆی نـەدەدا کـار بکاتە ئەوەی ژیانە خێزانییەکەی لی بشێوێ، بگرە وەك باوکێکی دڵسۆزی بـەڕەحم لەگـەڵ هـەر شـەش مناڵەکەیـدا دەجوڵایـەوەو ئەوپـەڕی بەتەنگەوەهاتن و خۆشەویستییشی بـە ژنەکـەی دەبەخشی. بـەم جـۆرە هیواو ئاواتە بەرینەکانی بە گونجاوییەکی تەواوەوە، لەگەڵ بلیمەتییـە بـێ

هاوتاکەی و خۆشەویستیەکەی بۆ ئیش کردن و گیانی خزمەتگوزارییەکەی بە چاکترین باردا هاتنە کایەوە.

ئەمانە هەموو نیکۆلۆیان خستە قالبێکەوە لە کۆمەڵگایەکدا کە پاشماوەی ئایدۆلۆژیای دەرەبەگایەتی و بەتایبەتی سیفەتی تاکڕەوی و دوو فاقییەکەی، بەسەر بیروهۆشی زۆربەی هەرە زۆری بەرەی خاوەن وشەو فیکردا زاڵ بووبی، وەك بێگانەیەکی لێبێ. بۆ وێنە زۆر کەسی دەرون گەندەڵ لە هاوتاکانی، حەسوودیان پێدەبردو تەقەلایان دەدا لەڕێگەی گێروگرفت بۆ دروست کردن و بڵاوکردنەوەی قسەو باسی داوێن پیسی دەربارەیو تانووت لێدانی گوایە دڵسۆز نییە، زەفەری پێبەرن. کەچی لەو کەسانە بەولاوە کە لە بیرکردنەودا هاوشانی بوون و یا بە ڕەوشت لەو بالاتر بوون ماوە بەخۆیان بدەن دابخزێنە زەلکاوی بەدکرداری و گەندەڵییەوە، لە سەروو هەموشیانەوە مێژوونوسی ناسراو گویکاردینی و دیپلۆماسی ی فلۆرنسایی فرانسیسکۆ فیتۆری — ئەمە بەتایبەتی دوای دەربەدەرکردنی —، ئیتر هیچ دۆستێکیدڵسۆزی بەخۆیەوە نەدی. بۆیە هەروەکو مێژوونووس أ.ك جیڤیلیکۆڤ دەربارەی دەڵی: "ئەو بەتەنیا بوو" بەلام "لەکەسانی تر سەر بلندتر بوو[٧]". حەسودی پێبەرانی مەکیاڤیللی پتر لەسەر ئەوە لێی پەست دەبوون کەلە ڕادەبەدەر قسە لە ڕوو بوو. لە ڕاستیدا ئەو نەیدەتوانی خۆشەویستی یان ڕق و کینەی خۆی لە خەڵکی بشارێتەوە، چونکە ئەگەر تەقەلای شاردنەوەشیانی بدایە، ئەوا شێوەی سەرو سەکوت و زەردەخەنە پڕ لەگاڵتەپێ هاتنەکەی یا لەدڵسۆزیەکەی هەر بەوبارەیاندا دەنواند بۆیە ئەو لەدەوروبەرێکدا کە زۆربەی ڕۆشنبیرانی لەنیسك بێ بەرو بێ رووتر بوون و مەرایی یان بۆ هەر خاوەن دەستەڵاتێکی پایەداروو دەوڵمەند، دەکرد، چەندە

ڕەوشت و ڕەفتار نزمیش بووایە، وەك مرۆڤێكی نائاسایی دەكەوتە پێش چاو ئینجا وەختێ لەئەنجامدا ئەویش ناچار بوو دڵی كەسانی دووڕوو ڕابگرێ، خۆی بەلاقرتێوە لە نوسینێكدا وتی:

"من زۆر لەدەمێكەوە ئەوەی بیری لێدەكەمەوە نایڵێم و ئەویشی دەیڵێم بەهیچ كلۆجێك بیری لێناكەمەوە. خۆ ئەگەر جارێكیان ڕووی دا كەناچار ببم هەق بڵێم، ئەوا بە كلافەیەك درۆو دەلەسەی وەها دەوریدەتەنم كە زەفەر پێبردنی ئاسان نەبێ"[٨]. هەروەها بەگاڵتەهاتن بەشت تاوانباریان دەكرد كە ئەوە بەپێیوەسف كردنی یەكێك لەمێژوونووسە ئیتاڵیاییەكان، بریتی بوو لەنواندنێكی چاكی "ئایینی كەسێك كەدڵسۆزانە باوەڕی بەرەهای تایبەتیخۆی هەبوو" چونكە "ئەوەی خەڵكی تر دەیان شاردەوە ئەو نەیدەشاردەوە" یا ئەگەر بیشیكردایە "ئەو سیفەتە بەرزانەی خۆی حەشار دەدان" كە وەهایان لێدەكرد "دڵپاكییەكەی بكەوێتە بەرچاوان نەك بارە ڕاستەقینەكەی"[٩].

زۆر جاریش حەسوودی پێ بەرانی مەكیاڤیللی، بۆ زەفەر پێبردن و زڕاندنی ناوی، پەنایان دەبردە بەر گەلی ڕێو شوێنی چەپەڵ. بۆ نمونە بەتەماعكار گوناهباریان دەكرد و -بەقسەی ئەوان - گوایە هەر ئەوەش هانی دا ماریا كۆرسینی بە تەماعی سەروەت و سامانەكەی بكاتە هاوسەری خۆی، لە كاتێكدا پیرۆزیی پەیوەندی ژن و مێردایەتی لە نێوانیاندا لە ڕادەیەكدا بوو كە ماریا تا دوا هەناسەی ژیانی، ئەوپەڕی وەفاداری بۆی بەوەفا بووە و تەنانەت نیكۆلۆش لە وەسێتی یەكەمیدا، بڕیاری بۆ دابوو كە تەواوی هەقی خۆی لەماڵ و موڵك بدرێتی و بە مەرجێ تەنیا خۆیو مناڵەكانیان سوود لەو میراتییە ببینن كە دوای مردنی بەجێی دێڵێ. جا بەدرێژایی ماوەی بیست وسیساڵ، پەیوەندیی نێوان نیكۆلۆو

ماریا لەو پەری باشیدا بووە. هەروەکوو نامەکانی دەریدەخەن لە هەر سەفەرێکدا کەکردوێتیی، زۆر تەنگەتاوی گەڕانەوە بووە بۆ ناو خێزانەکەی و ئەوانیش زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانیان کردووە، بەتایبەتی ژنەکەی کە نیکۆلۆ بۆ گاڵتەو گەپ بە (سەرۆکەکەم) ناوی بردووە[10] هەروەها هەندە کەسێك تەقەلایان دەدا، سەرکەوتنە بەرچاوەکانی کە بەکردەوە لە ژیانیدا بەدیی هێنابوون، بخەنە ناو گێژاوی گومان لێکردنەوە، بەتایبەتی سەرکەوتنەکانی لە کۆڕی دیپلۆماسییەتدا[11]، بەڵام گێژاوەکەیان تەنیا خەیاڵێکی خاو بوو.

ئەم هەڵوێستە نانەجیبانەیەی هاوەڵ و ناسیاوانی لە پاڵ گرفتە تایبەتییەکانی خۆیدا، جۆرە بەرچاو تاریکییەکیان لەدەروونی مەکیاڤیللیدا دروست کردو خستیانە سەر ئەو باوەڕەی گوایە حەسادەت "غەریزەیەکی ڕەسەنی تەبیعەتی ئادەمیزادە" و "ئەژادی مرۆڤایەتی بەگشتی، پتر مەیلی یەك لە بایەخی یەکتر کەمکردنەوە دەکەن نەك ستایش کردن —دەمەتەقێ[12]". بەڵام مەکیاڤیللیخۆی لەم بابەتە خەڵکە نەبوو، چونکە ئەو "هەردەم ئارە زوویەکی سروشتی بۆ ئیشکردن و بە شێوەیەك کە خێرو خۆشی کۆمەڵی تێدابێ و بێ گوێدانە هیچ شتێکیتر، هاندەری بوو —دەمەتەقێ". لەبەر ئەوە کارێکی ڕەوابوو کەمێژوو حوکمی عادیلانەی خۆی بداو ئەستێرەیحەسوودی پێ بەرانی مەکیاڤیللی، وەك هەر نەبووبن بکوژێتەوە ئەستێرەی ئەو لە ئاسمانی بێگەردی ئیتاڵیادا هەر ڕوو لەگەشانەوە بێ و ناویشی لەگشت کۆڕو کۆمەڵێکی ئایدۆلۆژی و سیاسیدا، هەر بەزیندوێتی بمێنێتەوە. ئەو هەتا ئەمرۆش لەقوڵایی گۆڕەکەیەوە، بەم شێوە بێ یاخود بەویان، چنگی لەسیاسەت هەر گیرەو بیروڕاکانی، خۆیان بەسەر گشت ڕووناکبیرە سیاسییەکاندا دەسەپێنن.

مـەکیاڤیللی سـەرەڕای ئـەو هـەموو بـەهرە و توانـاو بیرتیژییـەی، نەگەیشتە ئەوەی لە وەختێکی زوودا، شوێنی شیاوی خۆی لـە دەزگـای حوکم و کۆڕی سیاسەت لە فلۆرنسادا داگیر بکـا. هۆیەکەشـی لەبنـچینەدا دەگەڕێتەوە بۆ زەفەرنەبردنی بەو ڕێگایـە یـا ناسـیاوی پەیـداکردن لەگـەڵ ئەو کەسەی دەیتوانی بیگەیەنێتە سەر شانۆ.بەڵام کاتێ گەیشت، تەمـەنی خۆی دابوو لە (٢٩) ساڵان و ئەو وەختەزۆر کەسانی تـر پـێش ئـەم پایـەو پلەی گرنگیان داگیر کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی ئاسایی بـوو نیکۆلـۆ بـوونی خـۆی بـسەلمێنێ و جێ‌پـێی خـۆی بکاتـەوە. چـونکە ئـەو وەك دەربارەی خۆی وتوێتی، بەخت وەهای لەچارە نووسـی بـوو کـە نـەتوانێ "باسی هونەری پیشەسازیی و ئاوریشم و هونەری چینیخۆی[١٣] یـا باسـی قازانج و زەرەر بکا، بەڵکو بتوانێ تەنیا لە یەك مەسەلە بدوێ کـە ئـەویش کاروبـاری دەوڵەتــە[١٤]" بۆیــە وەختــێ لەتــەموزی ١٤٩٨ داو بــە دوای دامەزرانـدنی ڕژێمـی جـەمهووری لـە فلۆرنـسادا، سـکرتارێتیی ئەنجومـەنی دەیەی پێ سـپێردرا، لـەو کارانـەدا کـە بـەجێی هێنـان، لێوەشاوەییەکی ئەوتۆی سەلماند کە هەرزوو بەسەر هەموو ئەوانی تردا زاڵ بوو. ئەم هـەتا ئـەو وەختە هیچ ڕاپۆرتێکی ڕەسمیـی نەنووسیبوو، یا لـە هـیچ شـوێنێکدا وتـاری نەخوێندبووەوە، کە چی دارشتنە پتەوەکەی لە یەکەمینی نووسـینە ڕەسمـی یەکانیـدا، وەهایـان نیـشاندەدا کـە لـەم کـۆڕەدا خـاوەنی تاقیکردنەوەیـەکی کەڵەکەبووی چەندین ساڵ بێ[١٥]. خۆ وەنەبێ ئەرکەکەشی کەم بایـەخ بـووبێ، چونکە ئەنجومەنی دەیە سەرپەرشتیی هەموو کاروباری سەربازیو پەیوەنـدیی جەمهوورییـەتی لەگـەڵ دەرەوەدا دەکـرد و ڕووبـەڕووی چـەندین کارەسـات و ڕووداوی یەك لاییکەرەوەی وەزعەکە دەبووەوە، بەتایبەتی بـە هـۆی ئـاڵۆزیی پەیوەنـدی فلۆرنـساوە لەگـەڵ حکومەتـەکانی شـارەکانی تـری ئیتاڵیـاداو لـە

ئەنجامی تەماعکردنی بێگانەدا لە سەرجەمی وڵاتەکە زنجیرەیەك شەڕوشۆڕی یەك بە دوای یەکدای لێوەشایەوەو سوود و بەرژەوەندی دوو دەوڵەتە ئەوروپاییە بەهێزەکە، ئیسپانیا و فەڕەنسای تێدا کەوتە بەر حاڵەتی بەیەکدادان. بەهەر حاڵ، وەختێ پێیرۆ سۆدیرینیی برادەری بەسەرۆکی ئەنجومەن هەڵبژێردرا، ئەو هێندە پشتی پێ ئەستور بوو کە وای لێهات بچێتە ریزی دانەران و نەخشەکێشانی سیاسەتی جەمهوورییەتەکەوە.

مەکیاڤیللی پانزە ساڵ مایەوە و لەو ماوەیەدا بیست و چوار جار کرایە نێردراوی دیپلۆماسی کە ئەوە هەلی پەیوەندی کردنی راستەوخۆی لەگەڵ گرنگترین کەسانی ئەوسای ئیتاڵیا و ئەوروپای بۆ سازاند، وەك پاپاو پادشای فەڕەنساو ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریتی پیرۆزی ڕۆمانیا. مەکیاڤیللی لە نێوان ئەو سەفەرانەیەوە شارەزاییەکی فراوانی دەستگیربوو، چونکە لە نزیکەوە زانیاری ی دەربارەی نهێنییەکانی پەیوەندیی نێو دەوڵەتان و ڕێ و شوێنی حوکمڕانی کردنی لە ئەوروپا پەیداکرد. بۆ وێنە چوار جار خۆی بەتەنیا سەری لەدەربارەی فەڕەنسادا کە چەند مانگێکیان خایاند و لەئەنجامیاندا، شارەزای کردارو ڕەفتاری فەڕەنساییەکان و پیلانەکانی ناو دەربارو زۆر شتی تریش لە شێوازەکانی فەرمانڕەواییەکەیان بوو کە ئەمانە لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی تری خۆیدا، بە شێوەیەکی ئاشکراو ڕوون لەنوسینەکانیدا ڕەنگیان دایەوە. مەکیاڤیللی لە نێوان گەشتە دیپلۆماسییەکانییەوە هەستی کرد کە شتێك لەم جیهانەدا هەیەو ئەو مەبەستێتی، شتێك کە لێوردبوونەوەو بەدوادا گەڕان دەهێنێ[١٦]. ڕژێمی جەمهووری لە فلۆرنسادا لە ساڵی ١٥١٢ دا ڕووخاو بنەماڵەی میدیتچی. لە سایەیهێزەداگیرکەرەکانی ئیسپانیاوە دەزگای حوکمیان وەرگرتەوەو سۆدیرینی پەنای بردە بەر مەملەکەتی

عوسمانییەکان و چەندانێکی تریش لەکاربەدەستان هەڵاتن، هەروەکوو مەکیاڤیللیش کە هەرچییەکی لەتوانادا بوو کردی بۆ ئەوەی نەیەڵێ جەمهوورییەت هەرەس بێنێ، دەستی لەکار کێشایەوە. ئینجا لەسەرەتای ساڵی ١٥١٣ دا، بە تۆمەتیبەشداری بوونی پیلانێك دژی ڕژێمی ستەمکاری میدیتچی. تاوانبارکراو گیراو لە ماوەی بەندییەکەیدا شەش جار تووشی ئازاردان بوو، تا دواجار بڕیاری دوورخستنەوەی بۆ گوندی سانتاکرۆسی نزیك شاری فلۆرنسا درا کە شوێنی لەدایك بوونی خۆی بوو.

مەکیاڤیللی بەدوای ئەم کارەساتانەدا کە بوونە هۆی ڕووخاندنی جمهووری یەت و ئینجا ئازاردانی ئەم دوورخستنەوەی، تووشی نائومێدییەکی گەورەی ئەوتۆ بوو کە وای لێکرد بڕیار بدا "ئیتر قەت بیر لەسیاسەت نەکاتەوە لێی نەدوێ". بەڵام ئەمە بڕیارێك نەبوو بۆی ببرێتە سەر، بۆیە خۆی واتەنی "دوای هەزار ساڵ" لێدابڕان. بایدایەوە سەر "ئەشقە کۆنەکەی خۆی[١٧]" چونکە-وەك لەیەکێك لەنامەکانیدا وتراوە_ئەو نەیدەتوانی لە هیچ شتێك بدوێ "تەنیا لەیەك باس نەبێ کە کاروباری دەوڵەتەو کە یا ئەوەتا تەنیا لەو باسە دەدوێم، یاخود ناچاری بێدەنگییەکی ببڕای ببڕ دەبم[١٨]" بگرە ئەو لەڕۆژانی دوورخستنەوەکەیدا نەك تەنیا هەم دەینووسی و هەم بێدەنگیش نەدەبوو بەڵکو و بەردەوام گەلێ ئامۆژگاری ی سوودبەخشی بەو هاورێ دیپلۆماسییانەشی ڕادەگەیاند کە لە کۆڕی یاریکاریی سیاسەتی ئەورووپادا هەڵدەسووڕان[١٩].

لە نامەیەکدا کە مەکیاڤیللی لە ڕۆژی ١٠ کانوونی یەکەمی ١٥١٣ دا بۆ هاوڕێی دڵسۆزی فیتۆریی ناردوە، واتە دوای دورخستنەوەکەی بە ماوەیەکی کەم. باری ژیانی خۆی دوای ئەم دور خستنەوەیە، بەم شێوە کاریگەرە باس دەکا: "لەو وەختەوەی دوورخراومەتەوە، هێشتا هەر

لەدێدا دەژیم. بەیانیان زوو لەگەڵ شەبەقدا لە خەو هەڵدەستم و ڕوو دەکەمە دارستانە خنجیلەکەم تا بزانم ئایا داربڕەکان چی یان بەچی کردوە". ئینجا دوای گفتوگۆ کردنێك لەگەڵ ئەم داربڕانەدا، ڕوو دەکاتە سەر گردێك و چەند سەعاتێك بە خوێندنەوەوە بەسەر دەبا دوایی تر سووکە قاوەڵتییەك دەکا و ئینجا ڕێگای مەیخانەکە دەگرێتە بەر کە لەوێ لەگەڵ ئاشەوان و قەساب و کرێکاراندا دەکەوێتە دەم و دوو. ئیتر "وەختێك ئێوارە دادێ دەگەڕێمەوە ماڵەوە. جل و بەرگە لادێیی یانەکەم دادەکەند و کە قوڕاوی بوون و بەرگی دەربارو پێشوازی کردن دەپۆشم بۆ ئەوەی شیك بنوێنم ئەوسا بە نیازی سەردان لە کۆشك و تەلاری پیاوانی دێرین کە بە خۆشنوودییەوە پێشوازیم لێدەکەن، خۆم دەکەم بەکتێبخانەکەمدا و ئیتر ئەوە تاکەخۆراکە کە بۆ من دەس بداو بۆی خوڵقابم. لەوێ من کۆ لەباسکردن و کۆڵینەوە لە بنج و بناوانی کارو کردارەکانیان ناکەمەوەو ئەوانیش بەو گیانی مرۆڤ پەروەرییەوەی پێی پەروەردەبوون، بەسەروزمانێکی شیرینەوە وەرامم دەدەنەوە بەم جۆرە بەدرێژایی چوار سەعاتی ڕەبەرق، من هەست بەهیچ بێزاربوونێك ناکەم و هەرچی شتێك بزانم پەستم دەکا فەرامۆشی دەکەم ئیتر نە هەژاری و نەمردن دەمترسێنن.، چونکە بەکامی دڵ لەگەڵ ئەواندا دەبم"[٢٠].

مەکیاڤیللی بەم گیانەوە خۆی بۆ لێکۆڵینەوە و نوسین تەرخان کردو لەو دوا ساڵانەی ژیانیدا، کۆمەڵێ کتێبی بایەخداری دانان کەلە چەند سەدەیەك لە مەوبەرەوە و هەتا ئێستاش بەردەوام دەخوێنرێنەوە بایەخدارترینی نوسینە سیاسی و مێژوویەکانی کتێبی (میر – ١٥١٣) و "دەمەتەقێ دەربارەی دە کتێبەکەی تیتۆس لیڤی ١٥١٣ – ١٥١٦"[٢١] و "هونەری جەنگ ١٥١٩–١٥٢٠" و کتێبە گەورەکەی "مێژووی فلۆرنسا"ن

که ئەمیان لە هەشت بەرگدایەو لە ساڵی ١٥٢٠ بەدواوە، چەند ساڵێك پێوەی خەریك بوو.

مەکیاڤیللی، وەك خۆی وتویێتی، هەوڵی داوە هەرچی یەکی زانیوەو لە رێگەی تاقیکردنەوەی ساڵەهاو بڕیارە تایبەتییەکانی خۆیەوە سەبارەت بەکاروباری سیاسەت فێری بووە، دایان بڕێژێتە ناو نووسینەکانییەوە[٢٢]. بێگومان دەوڵەمەندییەکەی لە زانستا و قووڵی لە تاقیکردنەوەکانیداو دووربینی لە بڕیارەکانیدا بۆ بەخشینی ڕەسەنایەتی و کارامەیی بە نووسینەکانی سەروزیاد بوون. نیکۆلۆ هەرچەندە لە شێوەی نوسینیدا هێندە بەهێزوو ڕەوان بوو کە دەورێکی گرنگی لە گەڵاڵەکردنی زمانی ئەدەبی ی یەکگرتووی ئیتاڵیادا گێرا کە لەمەشدا لە تیروتوانجی ژەهراویی حەسودی پێبەرانی دەرباز نەبوو، بەڵام ئەو خۆی واتەنی "بەو نیازەی نەدەنووسی کە کارێکی هونەری بخوڵقێنێ" بەڵکو بەنیازی گەڕان بەدوای سیستمی سیاسەت وهێزە بزوێنەرەکانیدا، بە قوڵاییدا ڕۆدەچووە خوارەوە و دەیکۆڵییەوە. بۆیە لەدەربڕیندا خۆی لە ئاڵۆزی بە دووردەگرن و ڕەوان و ڕوون و سفت دەینووسی. ئەو ئەوەی بەلاوە گرنگ بوو "بەحیکمەتی سیاسەت بگا نەك بە دەربڕینی ئەستاتیکی، قایل کردن نەك پیاهەڵدان، ڕاچەناندنی هەست و نەستی خەڵکی نەك دڵدانەوەیان بە جوانکاریی نووسین"[٢٣] بەڵێ... مەکیاڤیللی بەحیکمەتی سیاسەت گەیشت و خەڵکی قایل کردو هەست و نەستیانی ڕاچەناند، بەڵام بە دەمییەوە بەداهێنانی هونەری و بە شیرینی ی شێوەی نووسینی دڵیشی دانەوە. هەندێك ڕایان وایە کە مەکیاڤیللی ئەگەر بایەخی تەواوی بە ئەدەب بدایە سەرکەوتنێکی زۆر لەوە زیاتری بەدی دەهێنا کە خۆی چاوە ڕووانی دەکرد[٢٤]، چونکە هاتنەبەرمەیدان و سەرکەوتنەکەی لەو بابەتە

بوون کە بەدەگمەن بلیمەتێکی تری ئیتاڵیایی لەم ڕووەوە پێشی کەوتوون، ئەگەر چی خۆی بایەخێکی کەمیشی پێدەداو وەختێکیکەمی بۆ تەرخان دەکردن[٢٥]. بۆ نمونە شانۆگەرییەکانی، لە گشت شارەگەورەکانی ئیتاڵیادا پێشکەش دەکران و سەرنجی خەڵکێکی زۆرو لەگەڵیاندا پاپاشیان ڕادەکێشا.

وەزعی مەکیاڤیللی لەدور خستنەوەکەیدا ئاسایی نەبوو بەتایبەتی لەرووی سایکۆلۆژییەوە کە لە ئەنجامی دابڕکردنیدا لە خزمەتکردن و بەشداربوون لە ژیانی ڕۆژانەدا کە خۆی باوەڕی وابوو زیاتر لە هەر شتێکی تر بۆ ئەوەو بۆ نووسین دەربارەی سیاسەت خوڵقاوە، هەژا بوو.

بەڵام مەکیاڤیللی لەم ڕووەوە هێندە بەهەڵە چووبوو کە ئەو ڕایە باوەی دەیوت: "دوورخستنەوەی زیانێك بوو بۆ خۆی و دەسکەوتێك بوو بۆ ئێمە[٢٦]" بووە ڕاستییەکی سەلمێنراو. بەهەرحاڵ، مەکیاڤیللی خۆی ڕایەکی جیاوازی هەبوو، بۆیە بەردەوام هەوڵی گەرانەوەی بۆ سەر شانۆ دەدا. و تەنانەت لە دوا ساڵانی ژیانیدا، چەند جارێك سووکە هەلێکی بۆ بەدیهێنانی ئەو ئارەزووە بۆ هەڵکەوت و هەندێ کاروفرمانی پێ سپێردرا، بەڵام لەمە گرنگتر ئەوەیە کە دوای ماوەپێدانی بە بەشداربوونی ئەو کۆڕەسیاسی یە گشتییانەی لە شاری فلۆرنسا دا دەبەستران، توانی لاوانی فلۆرنسا بەلای خۆیدا رابکێشێ.

ئەو دڵە گەورەیە، لە ڕۆژی (٢١)ی حوزەیرانی ١٥٢٧دا لە لێدان کەوت و بۆ ڕۆژی دوایی، لە سانتا کرۆسی گوندەکەی خۆیدا نێژرا. نیکۆلۆ لە کاتی سەرەمەرگدا هەمان نیکۆلۆی درێژایی ساڵانی ژیانی بوو. چونکە پێش گیان سپاردن بەچەند ساتێك، ئەوەی لاپەسندتر بوو کە لەگەڵ ڕۆشنبیراندا لەدۆزەخدا بێ تا دەربارەی سیاسەت دەمەتەقێ یان لەگەڵدا

بکا، نەك لەگەڵ نەفام و دەم ڕووتاندا بێ لە بەهەشتدا[٢٧]. بەڵام مەکیاڤیللی نەیدەزانی و چاوەڕێشی نەدەکرد کە ئەو لەم ژیانەدا هەر دەمێنێ و لە نێوانی ئەو بیروڕا دروستە لە ڕووانەوەی کە بەدڵسۆزییەوە دەریبڕین، هەر بەردەوام دەبێ لەسەر باسکردن لە سیاسەت و نەخشە بۆ دانانی.

## بیروڕا سیاسییەکانی مەکیاڤیللی

دەتوانرێ لە نیوان لێکۆڵینەوەی گرنگترین سی کتێب لە چل کتێب کە مەکیاڤیللی دایناون، واتە "میر" و "دەمەتەقی" و "هونەری جەنگ"، لە پاڵ ئەو کۆمەڵە نامانەی کە لە زۆر باردۆخی جیاجیادا بۆ نزکترین هاوڕێ یانی خۆی ناردوون، چاك شارەزای بیروڕا سیاسییەکانی ببین. ( میر) بە قەوارە بە بچوکترین کتێبی مەکیاڤیللی و ناودارترینیشیان دادەنرێ[٢٨]. هەرچەند کتێبەکانی تری لە گرنگیدا هیچیان لە میر کەمتر نییە، بەڵام پیاو کە دەیخوێنێتەوە بەڕاستی هەست دەکا، ئەو پانزە ساڵەی کە مەکیاڤیللی وەك خۆی وتوێتی تەرخانی کردبوون بۆ: "بەڕێوەبردنی کاروباری فەرمانڕەوایی، بەفیڕۆ نەچوو بوون[٢٩]".

ئەم کتێبە لە ژیانی خۆیدا. بە دەسنووس بە شێوەیەکی فراوان دەساو دەس دەکرا بەڵام بۆ یەکمجار لە ساڵی ( ١٥٣٢) دا، واتە دوای مردنی خاوەنەکەی بە پێنج ساڵ لە چاپ. دراو ئیتر هەر خێرا وەرگێردرایە سەر گشت زەمانە ئەوروپاییەکانی تریش و بۆ دەیەها جاروبگرە زیاتریش لە چاپ درایەوە. هەروەکوو سەدان ڕووناکبیرو سیاسی و نووسەرو کەوتنە لێکۆڵینەوەی و ئیستاش لە زۆر دەزگای ئاکادیمیی بەناوبانگدا، وەك

زانكۆی ئوكسفۆردو زانكۆی ئەمریكا لە بێروت و چەندانی تریش بۆتە بەندێك لە پرۆگرامی دەرسووتنەوە. جا هەموو ئەمانە پسپۆڕانیان هانداوە كە "میر" لە ناو هەموو بەرهەمەكانی سەردەمی ڕاپەڕینی بەخشندەی ئیتاڵیادا "بە هەقیانەت بە بەرهەمێكی نەمر دابنێن"[٣٠].

مەكیاڤیللی لە سەرەتادا جەمهورییەتی بۆ حوكمڕانی كردن بە ڕژێمێكی نموونەیی دادەنا.بەلام دوای ئەوەی كەوتە شیكردنەوەی بارودۆخی ئیتاڵیای دابەشكراو بەسەر پێنج دەوڵەتدا لە سەردەمی ئەودا كە بریتیبوون لە مەملەكەتی ناپۆلی لە باشوورداو، دۆقییەتی میلان لە باكووری ڕۆژئاواداو جەمهوورییەتی ڤینیسیای ئەریستۆكراتی لە باكووری ڕۆژهەلاتدا جەمهوورییەتی فلۆرنساو دەوڵەتی پاپایەتی لە ناوەڕاستا كە پەیوەندییش لە نێوانیاندا وەها لە سەر شەڕوشۆڕو ناكۆكی دەقی گرتبوو كە سەراپای نیشتمانەكەی لە بەردەم شالاوی بەردەوامی بێگانەدا دەكردە نێچیرێكی دەستەمۆ، دوای ئەوە مەكیاڤیللی لە "میر"دا گەیشتە ئەو ئەنجامەی كە باشترین ڕژێمێك بتوانێ یەكێتیی ئیتاڵیاو پارێزگاری لێكردنی بەدی بێنێ، ئەو جۆرە ڕژێمەیە شان دابداتە سەر دەسەلاتێكی دكتاتۆریی ( موتڵەق) ی بەهێزی ئەوتۆ كە گوی نەداتە لێكدانەوەی دینی دنیایی و ڕەوشتخوازی، چونكەسوودو بەرژەوەندی بالای دەوڵەت و بە شێوەیەكی تایبەتی یەكێتیی ولات، بە ڕای ئەو هەق بە میر دەدەن پەنا بەرێتە بەر هەموو ڕیو شوێنێك، وەك بەكارهێنانی زەبروزەند كە —وەك پیی لە سەر دادەگرت —بنچینەی هەقەو هەروەها دلڕەقی و كوشتن بە نهێنیو پاشگەزبوونەوە لە بەڵێن و سوێندخواردن و پەنا بردنە بەر چاوەشەكردن و بەرتیلكاری و فرت وفێڵ و درۆكردن و دووڕوویی، واتە ئامانجی پیرۆز پارسەنگی ڕی و شوێن لە هەر بابەتێك بن دەداتەوە

(الغايات السامية تبرر الوسائل أيا كانت). هەروەها ئامۆژگاریی میری وەهـا دەكـرد كـە بـۆ بـەدیهێنانی ئامـانج و زیادەخوازییـە سیاسـییەكانی خـۆی، شەرم لە هەڵبژاردنی هیچ جۆرە ڕێ و شوێنێك نەكا چەندە بێ مەزێتانـەش بن.چونكە فەرمانڕەوای سەركەوتوو ئەو كەسەیەكە بە پیی بارۆدۆخ و بـە پیـی پێویـستی، پـەنا دەباتـە بـەر هـەردوو جـۆرە ڕیـو شـوێنی مرۆڤانـەو ئاژەلانەو دەزانی چۆن لەنگەری نێوان فێڵبازیی ڕێویـو شـالاو بردنـی شـێر رادەگری، لەبەرئـەوەی كـە پێوانـە وبنـچینە بـۆ هەڵسەنگاندنی سیاسـەت سەركەوتنە. ئینجـا دوایـی بـە وەرگـرتنی ئـەم بیروڕایانـە بـە رووتـی و لـە سایەی لـی هەڵبژاردنیانـەوە لەلایـەن حوكمڕانەكانـەوە بـەو شـێوەیەی بـە دەستووری (ولاتقربوا الصلاة) بۆیان لەبار بـووە. زاراوەی (مـەكیاڤیللیزم) و (مەكیاڤیللیست) پەیدا بوون كە یەكەمیان ئاساییەو بەو جۆر سیاسـەتە دەوترێ كە هیچ گوێ ناداتە بەهای ڕەوشـت و ڕەفتـارو دووەمیـشیان بـەو كەسەی پەیڕەوی ئەو جۆرە سیاسەتە دەكا.

بەلام ئەمە بەهەر حـالێ لـەوە بەولاوەنییـە كـە بـریتی بـی لـە پۆپـەی شێوە شێوێنراوەكەی مەكیاڤیللیزم. چونكە ئەو پیـاوە بـیروڕا گرنگـەكانی خـۆی بـەبی چـەندین مـەرج بـۆ ڕەوشـتێكی بـالاو بـەبی لێكدانەوەیـەكی ژیرانەی ئەوتۆ كە شت بە باری ڕاستەقینەی خۆیدا بنـوێنی و سیاسـەت چ لـە كـات و چ لـە شـوێندا بخاتـە چوارچـێوەی ڕاسـت و دروسـتی خۆیـەوە دەرنەبڕیوە. بۆ نموونـە بـۆ مـیر زۆر بەجێیـە خـۆی وەهـا نیشان بـدا كـە خـاوەنی "بـەزەیی و وەفـاداری بـۆ بـەڵێن و هەسـتی پـیرۆزی مرۆڤانـە و دڵسۆزی و دینپەروەری"یەو "بەڕاستییش ئەو سیفەتانەی تێدان". بـەلام لە سەریشی پێوستە خـۆی وەهـا پـەروەردە بكـا كـە "وەخـتی پێویـستی ناچاری دەكا" بە "پێچەوانەی ئەوەوە خۆی نیـشان بـدا" بـۆی لەسـەرپێ

بی. بۆیە میر دەبی "بیرو هۆشی خۆی ئامادەی گونجان لەگەڵ شەپۆلدا بەو بارانەدا بکا کە ئاڵ وگۆڕی کۆشش و بەخت دەیانهێننە پێشەوە. بە مەرجێك وەك لەوەبەر وتم. ئەگەر بۆی لوا پشت نەکاتە خێرخوایی و بەڵام ئەگەر هەر ناچارو تەنگەتاو کرا. ئەوا دەبی کۆ لە خراپەکاری و شەڕخوایی نەکاتەوە. میربەشی هەژدەیەم" ئەوی ڕاستیش بی میژوو نموونەیەکی نەداوینەتی کە میرو بگرە غەیری میریش "ئەگەرناچار بووبیو تەنگەتاو کرابی. پەنای نەبردبێتە بەر خراپەکاریو شەڕخوایی" ئەمە ڕاستییەکە و بمانەوی ونەمانەوی. دانی پێدابنێین یا ڕاو و ڕێوی بۆبهێنینەوە،لەوە دەچی سیفەتێکی بەندی سروشتی خەڵکەکەبی. کەوابی مەترسی لەم لایەنەی بیروراکانی مەکیاڤیللیدا نییە کە هەر وەك خەڵکەکەی تر شتی دیوەو بەڵام ئەم بە پێچەوانەی ئەوانەوە لیی بی دەنگ نەبووە، بەڵکوو کلۆڵییە کە لەوەدایە کە ئەو مەرج و سیفەتانەی مەکیاڤیللی داوای کردوون لە بارودۆخی ئاساییدا لە میردا هەبن، وەك "بەرەحمی و وەفاداری بۆ بەڵێن و هەستی باڵای مرۆڤ پەروەری و دڵسۆزی و دینداری" لە دوو تۆیی میژوودا لە ئاوی ناو بیابان دەگمەن ترن. ئەگەر بهاتایەو گشت میرەکان پەیڕەوی بیروڕاکانی مەکیاڤیللی یان بکردایە، لاپەڕە ڕەشەکان لە دەفتەری مێژوودا هێگجار کەم دەبوونەوە.

ئینجا ئێستا با لەگەڵ مەکیاڤیللی و "میر"ەکەیدا بەردەوام بین و بزانین چ نەخشەو دەرسێك بۆ هەر تازەمیرێك دادەنی. میر لە سەری پێوستە "پیاوێکی بە تەنگەوە هاتوو بی، بەڵام بەمەرجێك لە قسەکردندا دەست نەخاتە ڕوو" لە سەرێتی خەڵکی وەها لێبکا "بەڕەحمی و وەفاداری بۆ بەڵێن و مەردایەتیو مرۆڤ پەرەوەری و دینداریی بە زەقی تێدا ببینین و ببیستن –میر– بەشی هەژدەیەم" هەروەها دەبێ خۆی "لە

هەموو ئەو شتانەی دەیخەنە بەر ڕیسواکردن و ڕق لی بوونەوەوە "بەدوور بگری. ئەو وەختێك تووشی ڕق لیبوونەوە دەبی کە ببێتە ڕاوو ڕووت کەرێك و ماڵ وموڵك و ژنانی ڕەعیەتەکەی زەوت بکا کە پێوستە خۆی لە قەرەیان نەدا" هەروەها "ئەگەر خەڵکەکە بی باریو چڵێتی و موخەنەتی و ترسنۆکی و لالآنەوەیان لە میر بینی دەشی بە نەگریس و چەپەڵی بدەنە قەڵەم.جا لەبەر ئەوەی ئەم کاروکردارانە بۆی دەبنە بەردی بناغەی مەترسی، دەبی خۆیانی لی بەدوور بگریو کاروباری خۆی وەها ساز بدا کە کردەوەکانی ئەو پەڕی مەزنی و چست و چالاکی و ورەپتەوی و خۆراگری بنوێنن". هەروەکو و سەبارەت بە حوکم کردنی رەعیەتەکەشی "دەبی ئەو بڕیارەی دەیدا ببڕای بڕ بی و هەڵوەشاندنەوەی بۆ نەبی. دەبی سوور بی لە سەر بڕیارەکانی خۆیو ماوە بە هیچ مروڤێك نەدا بیخەڵەتێنی و فێڵی لی بکا –میر– بەشی نۆزدەهەم".

مەکیاڤیللی ئامانجی لەم مەرجانە ڕازی بوونی گەل بووە لە میر، لەبەرئەوەی رەزامەندیی گەلی بۆ حوکمڕانییەکی بنج داکوتراوی سەرکەوتوو بە مەرجێکی بنچینەیی دادەنا. ڕەزامەندی گەل "یەکێکە لەو باسە هەرە گرنگانەی کە میر دەبی بایەخی پی بدا" چونکە میر دەبی "ئەگەر گەل لیی ڕازی بوو زۆر ترسی لە پیلانگێڕان لە دژی نەبی. بەلآم ئەگەر لە لایان ڕیسوا و ڕەزا گران بوو، یا هەستی کرد گەل دوژمنایەتی لەگەڵدا دەکا، ئەوا دەبی لە هەموو مرۆڤێك و لە هەموو شتێك بترسی" چونکە قەلآوقوللە "چەندە پتەویش بن" میر ناپارێزن ئەگەر "ڕق لی بوونەوە یاخۆشویستنی لە لایەن گەلەکەی خۆیەوەی"[٣١] پشتگوی خست. "میر – بەشی نۆزدەیەم و بیستەم". چاکتریش بۆ میر وەهایە کەبە پشتی گەلەکەی بگاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی کردن نەك بە یاریدەی

سەرداران. "میر- بەشی نۆیەم". هەروەها ئەو میرەی ناتوانی "بە هۆی پرۆژەی سوودبەخشەوە" گەل رابکێشێ بەلای خۆیدا "ناچار دەبی هەردەم شمشێری بەدەستەوە بیو لە سەر پێ بێ -میر- بەشی هەشتەم". هەروەکو زۆر پێوستە میر مرۆڤیکی رۆشنبیر بێ و دەبی "مێژوو بخوێنێتەوە و لە کردارەکانی پیاوانی هەڵکەوتوو بکۆڵێتەوە، تا سەرنج بداتە ریو شوێنیان لە شەڕکردندا و لە هۆی سەرکەوتن و ژێرکەوتنیان وردببێتەوە، بۆ ئەوەی لە سەرکەوتنەکانیاندا شوێن پییان هەڵبگریو لە ژێرکەوتنەکانیاندا خۆی لە هەڵەو چەوتییەکانیان بپارێزی _میر_ بەشی چواردەیەم".

مەکیاڤیللی ئەوەی لە هەر تازە میرێك داوادەکرد، دەزگایەکی رێك وپێکی بەرێوەبردنی ئەوتۆ دابمەزرێنێ کە کاروباری بە کەسانێکی لێهاتووی بی لەکە بسپێری و بەوە هەر مرۆڤە و لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دابنی. هەروەها لەسەری پێوستە "هەمیشە مەیلی بە لای مرۆڤی بەهرەدارو بەتواناادا هەبیو کەسانیدەست رەنگینی پەسەند بێ و هەڵکەوتووان لە هەر هونەرێکدا بی رێز لی بنی -میر - بەشی بیست و یەکەم" ئەم مەسەلەیە لە سنووری خۆیدا گرنگ و بایەخدارە، چونکە "یەکەم باری سەرنج کە دەربارەی میرو چۆنێتیی بیرکردنەوەی لای هەر مرۆڤیك پەیدا دەبی، لە سەرنج لێدانی ئەو کەسانەوە دروست دەبی کە لە دەوروپشتیدان واتە ئەگەر دڵسۆزو لێهاتوو بوون. ئەوا پیاو لە بەحیکمەتیی میر دڵنیا دەبی و دەوترێ: توانیوێتی لێهاتوویی دەسنیشان بکا و دڵسۆزی بگرێتە خۆی" پێوستیشە ئەوانە لەو زمان لووس. و مەرایی کەر دووړووە بلۆفچییانە نەبن کە لە "دەربارەی پاشا و میرەکاندا گرد دەبنەوە-میر- بەشی بیست و دووەم و بیست و سێیەم". ئینجا ئەوانە

دەبیباش بزانن و لەوە بە ئاگا بن کە ئەو سەنگ و ڕەنگەی هەیانە، بەندی ئەو هەڵوێستەیە کە میر لە ژێر ڕۆشناییی ڕادەی دڵسۆزی و فیداکاری یاندا بۆ خۆی ڕژێمەکەی دەیگرێتە خۆی. میریش لە لای خۆیەوە "بۆ ئیدامەپێدانی پابەندی و دڵسۆزیی وەزیرەکەی بۆ خۆی، پێویستە ئاگای لیی بێو گیرفانی پڕ لە پارەو پوول بکا و بە نیشان و دەبدەبەی بەڕێزی و گەورەیی، دەوری بتەنیو سۆزی بۆ دەرببڕیو شەرافەتمەندیی پیببەخشیو پایەو پلەیەکی بەرپرسیارانەی ئەوتۆی پی بسپێری کە ئەو پارەو پوول دەبدەبەی بەرێزی و گەورەییەی بە سەریدا دابارێنراون، هانی بدەن بۆ تەماعکردن لە دەسکەوتنی سامانی زۆرترو لەقەبی گەورەتر. یا ئەو پایەو پلەیەی پیگەیشتوە تا ئەو ڕادەیە گرنگ بی کە ترسی لە دەست چوونی لا پەیدا بکا –میر– بەشی بیست و دووەم" هەر لەم ڕوانگەیەوە میر دەبی "پیاوی دنیادیدەو بەحیکمەت بۆ کۆڕی دانیشتنی خۆی هەڵبژێری و ماوە تەنیا بەوان بدا بە سەربەستی بۆی بدوێن و لە حزوریدا ڕاستی دەر ببڕن، بەڵام بە مەرجێك ئەو سەربەستی پێدانە تەنیا لەو باسانەدا بی کە خۆی پرسیاریان دەربارە لی دەکا و لەوە نەچی بەلاوە. وەکی تر پێویستە ئەو لەلای خۆیەوە سەبارەت بەهەموو شت پرسیاریان لی بکا و گوی بۆ بیروڕایان رابگرێ و ئینجا ئەوسا بەشێوە تایبەتی یەکەی خۆی بیر لە باسەکە بکاتەوە. هەر وەکوو دەبی لەو کۆڕی دانیشتنانەدا لەگەڵ هەر یەکێك لە ڕاوێژکارانیدا وەها بجووڵێتەوە دڵنیای بکا کە چەندە بە دڵسۆزییەوە لەروو قسە بکا، میر هێندە لیی ڕازی دەبی. دوای ئەوە ئیتر پێوستە گوی لە قسەی هیچ مرۆڤێك نەگری، بەڵکوو خۆی لەبەر ڕۆشنایی بیروڕای ڕاویژکارانیدا لەباسەکە بکۆڵێتەوە و بڕیارێکی ئەو تۆی لەسەر بدا کە پاشگەزبوونەوەی تێدا نەبی" هەروەها تازەمیر دەبی "هەمیشە

ئامۆژگاری بگریتە خۆی، بەلاَم لە وەختێکدا کە ئەو خۆی دەیەوی، نەك لە وەختێکدا کە کەسانی تر دەیانەوی بگرە ئەگەر خۆی داوای نەکردبی، نابی بە هیچ کلۆجێ ماوە بدا تەقەلای ئامۆژگاریکردنی بدری. هەرچەندە پێوستە ئەو خۆی بەزیادەوە داوای بکا و باش گوی بۆ ئەو ڕاستی یانە شل بکا کە بۆی دەگێڕدرێنەوەو کە پرسیار ی دەربارە کردوون —میر— بەشی بیست و سێیەم" لەگەلّ ئەوەشدا "پێویستە سەبارەت بەو قسانەی بۆی دەکرێن وریابی و لە کارکردنیشدا وەها هەلّنەسوورێ کە لە سێبەری خۆی بترسی". هەروەها میر دەبی بۆ هەر شتەو پێوانەیەکی نەگۆڕی هەبی، بەلاَم لەگەلّ هەردەم حیساب بۆ کردنیپێداویستیو بارودۆخدا. بۆ نموونە دەبی سەخاوەت و پیسکەیی سنووریان هەبی و دلّپاکی یش تا ڕادەیەك بی کە پێوستە بەبی چەند و چۆن لە ساتی بەیەکدانیدا لە گەلّ سوودو بەرژەوەندی دەولّەتدا کۆتایی پی بێت.واتە پێوستە هەر میرێك کە دەیەوی پاریزگاری لە خۆی بکا، فێر ببی چۆن خۆی لە دلّساق و خێرخۆایی بە دوور دەگری و دەبی ئەم فێربوونەشی بە پیی پێویستیی هەر حالەتێك کە تووشی دی بەکاربهێنێ —میر — بەشی پانزەیەم". بەلاَم لە سەریەتی تا پەڕی ئەو پەڕ هەولّی تەسککردنەوەی ماوەی ئەو خۆدوورخستنەوە ناچارییە و کۆتایی پێهێنانی بدا لەگەلّ "مسۆگەرکردنی ئەمن و ئاسایش"، بگرە هەر خێرا بیگۆڕی بە "کارو کردارێك ئەو پەڕی سوودیان بۆ ڕەعیەتەکە تێدابی —میر— بەشی هەشتەم". مەکیاڤیللی بە شێوەیەکی قوولّترلە کتێبەکەی تریدا "دەمەتەقی" کە نزیکەی پێنج سالّ بە دانانییەوە خەریك بووە، گشت بیرو باوەڕەکانی خۆی سەبارەت بە سیاسەت و چونێتیی حوکمکردن و ڕەوشت و ڕەفتارو پەیوەندی ی نێو دەولّەتان و زۆر شتی تریشی بە پشت بەستن بە هەلّسەنگاندنی

تاقیکردنەوە کۆنەکانی ڕۆما تێدا کۆکردونەتەوە، دووبارە دەکاتەوە.

گرنگترین شت کە خوێنەری "دەمەتەقی"[٣٢] هەڵیدەهێنجێ ئەوەیە کە چاکەکاریی نموونەیی لای هەر هاووڵاتی یەک بەڕادەی خۆتەرخان کردنی بۆ بەرژەوەندی گشتی دەپێوری. بۆیە پیاو لە "دەمەتەقی کەیدا" وەك لە"میر"یشدا هەیە هەست دەکا مەکیاڤیللی بە پەرۆشەوە وێڵی دوای ئەو ڕژێمە نموونەییەیە کە خەو بە دامەزراندنییەوە لە ئیتاڵیادا دەبینی. گومانیشی تێدا نییە "ئەو حکومەتە میللییەی مرۆڤیکی ژیری ئەو تۆ دێنێتەکایەوە کە خەڵکی بتوانن لە ژێر سایەی ئەو یاسایانەدا کە دایاندەنی بژین، بی ئەوەی ناچاری دەسکاری کردن و ڕاست کردنەوەیان ببین حکوومەتێکی بەختەوەر دەبی" "دەمەتەقی -کتێبی یەکەم -٢".

کەوابێ جارێکی تریش میری نموونەیی لە "دەمەتەقی"دا وەها دەبینینەوە ئەو کەسەبیکە "سەرجەمی گەڵ دەکاتە دۆستی خۆی" "دەمەتەقی -کتێبی یەکەم -٤٠". بگرە مەکیاڤیللی لێرەدا سەبارەت بە شوێنی گەل لە بەرامبەر حکوومەتدا لەوە بەولاتریشەوە دەچی کە لە "میر"دا وتراوە دەڵی: "پیاوی ژیر لە مەسەلە زانراوو لاوەکییەکاندا وەك مەسەلەی دابەشکردنی پایەوپلەو پێشخستن و بەرزکردنەوە، ڕای گشتی ناخاتە پشت گوی، چونکە گەل لێرەدا ئەگەر وازی لیبهێنری خۆی جلەوی خۆی بگری، قەت هەڵە ناکا و ئەگەر جارناجارێکیش کردی، هەڵەکانی بە بەراوورد لەگەڵ ئەو هەڵانەدا کە ئەگەر دابەشکردنەکە درایە دەست چەند کەسانێك ڕوودەدەن، زۆر دەگمەن دەبن "دەمەتەقی- کتێبی یەکەم ٤٧".مەکیاڤیللی لە "دەمەتەقی" دا سەر لەنوی پی لەسەر پێوستیی ڕەچاو کردنی بنەمای "کالآ بە قەد بالآ- الرجل المناسب ڤ المكان المناسب" و ئەو پەری سوودبینین لە تواناو بەهرەو بلیمەتی یە تازە

پــشکوتوەکان دادەگرێتــەوە "چــونکە وەخــتی لاوێــك لــە ڕێگــەی چاکەکارییەکەوە کە لەگەڵ کارێکی مەزنیدا سەر هەڵدەداو ناوی دەکەوێتە سەر زاری گشت خەڵکەکە، ئەوە دەبێتـە عـەیب و عـارێکی گـەورە کـە دەوڵەت ئەو خزمەتەی نەخاتە حاڵەتی سوود لیبینینەوەو لاوەکە ناچاری چاوەڕوان کردن بکا تا بە تەمەن گەورە دەبی ئیتر لەو ماوەیەدا وای لی دی چالاکییە تایبەتییەکەی بیروهۆشی و خێرایی یەکەی لە ئیش کردندا لە دەس بدا کەولاَتەکەی دەیتوانی لە کاتی خۆیدا بیانخاتە کارو سوودیان لی ببینی" "دەمەتەقی-کتێبی یەکەم -٦٠".

لەو باسە گرنگانەی کە مەکیاڤیللی بە بایەخ پێدانیکی زۆرەوە لای لێکردۆتەوەو بەشێوەیەکی نوێ چ لە "میر" چ لە "دەمەتەقی"دا لیی دواوەو تەنانەت یەکێك لە کتێبەکانی خۆی بۆ تەرخان کردوە "هونەری جەنگ"[٣٣]، مەسەلەی سوپای نیشتمانییە کە بە گرنگترین هۆی بەدی هێنانی یەکێتیی ئیتاڵیای دادەنا. مەکیاڤیللی هەر لە وەختێکی زووەوە پەنجەی خستە سەر کەم وکوڕەییەکانی سوپا ئەوروپاییەکان، بەتایبەتی پشت بەستنیان بەهێزی سەربازی بەکریگیراو کە "مانای ڕێك وپێکی نازانن چییە، گفت و بەڵێن ناپارێزن، لە ڕووی دۆستاندا خۆیان بە ئازا نیشاندەدەن و بەرامبەر بە دوژمنان ترسنۆکن، لە خوا ناترسن و لەگەڵ خەڵکیدا بیویژدانن. ئەومیرەی پشت بەم جۆرە هێزە دەبەستی ڕەنگە تێکشکانە مسۆگەرەکەی بە دواخستنی ئەو هێرشە دوا بکەوی کە بەرێوەیە بکرێتە سەری". زامە قووڵەکەی مەکیاڤیللی لێرەدا بوو، بۆیەپێوستی بە نموونە هێنانەوە نەبوو "چونکە ئەو شکستییەی بەسەر ئیتاڵیادا هاتوە ئەنجامی یەك شتە کە ئەویش پشت بەستنێتی بۆ سالآنێکی زۆر بە لەشکری سەربازی بەکری گیراو -میر- بەشی

دوانزەدەیەم" لە ڕۆژانێکدا کە خەڵکی خۆیان دەخستە بازاڕی کڕین فرۆشتنەوەو لە وەختێکدا کە جەنگە گەورەکانی ئەورووپا بەڕادەی یەکەم بە سەربازی بەکرێگیراو دەکران و لەگەڵیاندا ئەو جەنگی سی ساڵەیەی کە دوای مردنی مەکیاڤیللی بە سەدەیەك هەڵگیرسا، دەنگێکی دڵسۆز لە فلۆرنساوە بەرزبووەوە پێی لەسەر ئەوە داگرت کە "ئەو هاووڵاتییەی جەنگی بۆ ئامانجێکی بێگانەبۆ خۆی دەکاتە پیشە، هاووڵاتییەکی باش نییە، چونکە ئەرکی سەرشانێتی خزمەتی وڵاتەکەی خۆی بکا کە هۆی تییکەوتوەو پێوستە لە پێناوی سەربەرزیی ئەودا بجەنگی".

دیارە دەبی ئەم وتانە لە چوارچێوەی کات و شوێنی خۆیاندا هەڵبسەنگێنرێن. ئەم وتانە نەك تەنیا زادەی بیروهۆشێکی بلیمەت بوون، بەڵکوو ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی کارامە و چاودێری کردنێکی وردی ڕووداوەکانی چ ئیتاڵیا و ئەورووپا چ ناوچەکانی تر بوون. ئەو لە سوپا ئەورەپاییەکان و سوپا عوسمانییەکانی کۆڵیبووەوەو هۆیەکانی لاوازیی یەکەمیان و بە هێزیی دووەمیانی دەسنیشان کردبوون. مەکیاڤیللی لەڕۆژانی جەمهوورییەتدا توانی ئەنجومەنی دەیە قایل بکا کە هیچ دەوڵەتێك ناتوانی لە خۆی وسنووری خۆیدڵنیا بی ئەگەر خاوەنی هێزی تایبەتی خۆی نەبی. هەر لەسەر ئەم بنچینەیەش ئەنجومەن بڕیاریدا هەموو ئەو هاووڵاتییە فلۆرنسایی یانە بکاتە سەرباز کە دەتوانن چەك هەڵبگرن و ئەمەش بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ ئیتاڵیا بووە هەنگاوێکی پێشەنگانە.

بایەخ پێدانی فراوانی تیوری و کردارانەی مەکیاڤیللی بە کاروباری سوپا و جەنگ لەو خەونە پیرۆزەوە هەڵقولاّ بوو کە ببینی ئیتاڵیاییەکان "بەهاندانی ئامانجێکی نیشتمانی لەڕیزی لەشکرەکانی شارەکاندا

دەجەنگن و لە ڕووی ئەورووپادا سەری خۆیان بەرزدەکەنەوەوە"[٣٤] وبە لێهاتوویییەوە مەزنکارییەکانی ڕۆمای کۆن دووبارە دەکەنەوە.

مەکیاڤیللی ئەنجامی کۆڵینەوەی لەم مەسەلانەو لە هی تریش -کە دوایی دەگەڕێینەوە سەریان - زۆر دەرسی لە مێژوو هەڵهێنجاوەو زۆر عیبرەت و حیکمەتیشی لەو دەرسانەوە دەرهێناون ئینجا هەموو ئەوانەی لەگەڵ وردبوونەوەی خۆیدا لە ژیان و ئەو ئەرکانەدا بەدەمییەوە بەجییهێناون، بەهۆشێکی بلیمەتانەو بیرێکی تیژەوە تێکەڵ بە یەکتری کردوون. ئەو بەبی پشت بەستن بە شایەتێکی مێژوویی یا زیاتر ڕای خۆی دەرنەبڕیوەو بە دەگمەنیش تاقیکردنەوەو ئەنجام دەرکێشانی کردۆتەگشتکاری یا بەبی پەنابردنە بەر ئەو ڕووداوانەی قسەکەی دەسەلمێنن ڕێنمایی کردوە. جا هەر لەبەر ئەوەیە کتێبەکانی پڕن لە نموونەی مێژوویی جۆراوجۆری ئەوتۆ کە زەحمەتە وێنەی لە نووسینەکانی ڕووناکبیرانی تردا ببینین. مەکیاڤیللی لە لێکۆڵینەوەکانیدا گەلی پرسیاری گرنگی وەهای وروژاندوون کە لە دوای سەردەمی ئەرستۆوە پشت گوی خرابوون و پوختە و مەغزایان بریتییە لە گەڕان بە دوای ئەو هۆیانەدا کە بارودۆخی بەردەوام بوون بۆ دەوڵەتان و هێزو توانای مانەوەو نەش و نماکردن لەسایەی ڕژێمێکی ئاسوودەی چەسپاودا بۆ حکوومەتان سازدەدەن. بەمە ئەو لەسنووری ئایدولۆژیای سیاسیی کلاسیکییانەی ئەورووپا چووەدەرەوەو بە شێوەیەکی هێجگار جیاوازو بنەرەتی لە نووسەرە گەورەکانی سەردەمی ناوەڕاست و بگرە جیاواز لە نووسەرە گەورەکانی سەدەی شانزەیەم و حەڤدەیەمیش، وەك هوبس و هوکرو لووك و کەسانی تر کە بە تەواوی لە لێکدانەوەی خواناسییانەی

دیاردەکانی دەوڵەت وسیاسەت ڕزگارنەبوون، کەوتە لێدوان و قسەکردن لە کۆمەڵگا و سیاسەت.[٣٥]

ئامانجی مەکیاڤیللی لە گشت نووسین و قسەکانی گەیشتن بوو بە پیرۆزترین مەبەست کە بریتی بوو لە ڕزگارکردنی نیشتمان لە گیروگرفتە ئاڵۆزەکانی و بەدی هێنانی ئەو یەکێتییەی کە لەو ڕۆژانەدا کەس بەوێنەی ئەو دەرکی بە مەغزاو ئەنجامەکانی نەکردبوو ئەو بۆ ئیتاڵیای ونجڕاکراوی دەنووسی، بۆ ئیتاڵپایەك کە بۆ داگیرکەرە بێگانەکان بووبووە کێڵگەیەکی تاقیکردنەوە، بۆ ئیتاڵیایەك کە دوای ئەوەی لە گشت کیشوەری ئەوروپادا نموونەی گەشانەوەو پێشکەوتن بوو، ڕووی لە پووکانەوەو پووچەڵی کردبوو.[٣٦] بگرە نیکۆلۆ بۆ ئامانجێکی لەوە بەولاتریشەوە دەچوو، ئەو نەك تەنیا بیری لەوە دەکردەوەو دەینووسی کە ئیتاڵیا لە ئاژاوەو ئەنجامەکانی ڕزگاری ببیو ڕادەیەك بۆ پەرت بوونی دابنریو یەکێتی ی بۆ بەدی بهێنری، بەڵکوو بیری بۆ ئیتاڵیایەك دەچوو کە لە گشت کیشوەری ئەوروپادا ببێتە هێزێکی گەورەی کاریگەر ئەم جۆرە بۆچوونە کە بۆ ئەوروپای سەردەمی ناوەڕاست شتێکی ئەوتۆی نەدەگەیاند، لە دواییدا وردەوردە بیروهۆشی گشت خەڵکەکەی داگیرکرد.مەکیاڤیللیش ئەو شانازییەی بۆ بەسەکەبووە یەکەم نوێنەری مەزنی ئەو جۆرە خواست و هیوا ڕەوایانە.

گومانی تێدا نییە کە هیچ ئامانجێکی سیاسی بۆ بارودۆخی مێژوویی ئەوسای ئیتاڵیا، لەپیرۆزیدا نەدەگەیشتە ڕادەی ئەوەی مەکیاڤیللی پێش چاوی خۆی خستبوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بە درێژایی مێژوو بیگرە. ناوی ئەو لەهەر کەسێکی تر زیاتر زڕێنرا، تاڕادەیەك وای لێهات کە لەڕیزی

شەیتانەکان وپیاوخراپە هەرەدڕەکاندا، بالاَترین شوێن داگیر بکا کە ئەمە باسێکەو هەقی لەسەر ڕاوەستان و تێوردبوونەوەیەکی تایبەتیی هەیە.

## بۆچی وچۆن ناوی مەکیاڤیللی زڕێنرا

ناوزڕاندنی مەکیاڤیللی لە ئەنجامی گەلی هۆ و بۆچوونی جۆراوجۆرەوە بوو کە هەوڵدەدەین بە کورتی لەم چەند بەندە سەرەکییەدا کۆیان بکەینەوە.

### ١- حەسوودی پیبردن:

نیکۆلۆ وەك ڕووناکبیرێکی گەورە ژمارەیەکی زۆر حەسوودی پیبەرانی هەبوون کە هەوڵیان دەدا بە چەپەڵترین شێوەو قوماربازانەترینیان زەفەری پیبەرن وئەوەبوو لە سەرەتای باسەکەماندا هەندی لایەنمان لیباس کردن. ئەوانە چەندین کون وکەلەبەریان دەخولقاند تا لە نێوانیانەوە بەو ئامانجە ناپیرۆزەیان بگەن. بەلاَم ئەو لەگەڵ ئەوەشدا ملی بۆ ئەو دڵ و دەروون چرووکانە نەدەداو هەر لەسەر بورجی بیروڕاو باوەڕی تەواوییەوە بە خۆی، سەیری دەکردن و دەیبینین لەبەر پێیدا دەستەیەك بستەبالاَی ئەوتۆن کە لە بەزەیی پێداهاتنەوە بەولاوە هیچی تر هەڵناگرن، چونکە نەخۆشی لە دڵ و دەروونیاندا بنجی داکوتاوە. بۆیە ئەم سەرەڕای هەموو خراپەکارییەکانیان، هەرچییەکی دەربارەی وردترین نهێنی و مەڵبەندی لاوازییان پێدەزانی، لەدڵە گەورەکەی خۆیدا دەیشاردنەوەو بگرە هەوڵی دەدا هەر کاتی ماوەی بۆ هەڵبکەوتایە خزمەتیشیان بکا.

سەیر ئەوەیە نیکۆلۆ لە نەشتەری هەندی لە نزیکترین برادەرە خۆشەویستەکانیشی دەربازی نەبووە. بۆ نموونە گویکاردینی کە —بەپیی

وەسف کردنی لە لایەن یەکێك لەمێژوو نووسانەوە– "لە ژیانیدا زیاتر لە مەکیاڤیللی مەکیاڤیللیست بوو"[٣٧]،

ڕەخنەی لە هەندی بیروڕای مەکیاڤیللی وەها دەگرت کە گوایە دڵڕەقانەو بیبەزەییانەیە، لە کاتێکدا لەیەکچوونێکی تەواو لە نێوان هەردوو مێژوونووسی گەورەی سەردەمی ڕاچەنین، مەکیاڤیللی و گویکاردینیدا هەیە و هەر جیاوازییەکیشیان لە بەیندا هەبی، تای تەرازوو بە ئاشکرا بەلای یەکەمیاندا دەشکێتەوە. بۆ نموونە گویکاردینی وایدەبینی مەکیاڤیللی لەو باوەڕەیدا کە گوایە گشت بەسەرهاتە سیاسییەکانی ئیتاڵیا ئەنجامی پەرت پەرت بوونی بوون بەهەڵە چووە، چونکە ئەو پەرت پەرت بوونە –بەرای ئەم– بووبووە هۆی پەیدا بوونی "گشت ئەو شارە گەشەسەندووانە" لە ئیتاڵیادا "کە نەدەتوانرا لە دەوڵەتێکی یەکگرتوودا پەیدا ببن". لەبەر ئەوە بوونی "ڕژێمێکی پادشایەتیی یەکگرتوو. لە بریتیی خۆشگوزەرانی بۆ ئیتاڵیا، دەبووە مایەی نەهامەتی".[٣٨]

هەروەها هاوڕییەکی تری (فرانسیسکۆ ڤیتۆری) دەیتوانی بە هۆی ئەو شوێنەدیپلۆماسییە بالآیەوەی لە ڕۆمای کۆڕی چست و چالاکیی فراوانی سیاسیو ئاینیدا وەك مەڵبەندێکی پاپایەتی و کڵێسەی کاسۆلیکی هەیبووە، زۆر لەوە زیاتر خزمەتی نیکۆلۆ بکا وەك دەیکرد.

## ٢-کڵێسە :

هەڵوێستی کڵێسە لە زڕاندنی ناوی مەکیاڤیللیدا گەلی کاریگەر بوو. بەلآم بۆ ئەوەی بە ڕوونی لە هەموو بارێکی ئەو هەڵوێستە تی بگەین، چاکتر وایە یەکەمجار باسی هەڵوێستی مەکیاڤیللی بەرامبەر بە کڵێسەو بە ڕژێمی دەرەبەگایەتی بە گشتی کە ئەوسا باوبوو بکەین. ئەو

هەرچەندەزیاتر پێی لەسەر کڵێسە دادەگرت، بەڵام لەهەمان کاتدا لەهەندێك لایەنی ئەوتۆی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیش دەدوا کە لە سەردەمی ئەودا گەیشتبوونە ئەو پەڕی رادەی بەربادی و لە بەردەمی پێشکەوتنی ئاسایی کۆمەڵگاکانی ئەوروپادا بوو بوونەکۆسپێکی سەرەکی.مەکیاڤیللی ئەمەی بە شێوەیەکی بلیمەتانەی تەواو گونجاو لەگەڵ تەبیعەتی ئەو پلە مێژووییەدا شیکردۆتەوە کە لەڕووی سیاسییەوە وەهای پێوست دەکردو ڕژێمێکی سیاسیی ئەوتۆی بۆ دابمەزرێنری کە بتوانێ کۆتایی بە بەرەڵلایی ئەو دەرەبەگایەتییە باوە بهێنێ. ئێمە لێرەدا تەنیا یەك نموونەی ڕەوان لە "دەمەتەقی" دێنینەوە کە لە بەشیپەنجاو پێنجەمینی کتێبی یەکەمیدایەو ئەمە دەقەکەیەتی:

"سەردار (نبیل) لە لای من ئەو بابەتە کەسانەن کە ژیان بەبێ ئیش بەسەر دەبەن، یا ئەوانەن کە لەسەر بەروبوومی زەوی و زارەکەیان دەژین بەبێ ئەوی کشتوکاڵ یا هیچ کارێکی تریان کردبێتە پیشەی خۆیان. ئەم بابەتە کەسانەش بۆ هەر کۆمارو هەر شارێك دەبنە بەڵا. خۆ ڕەنگە خراپتر لەمان ئەوانەبن کە جگە لە زەویو زارەکانیان، خاوەنی قەڵاو دەست وپێوەندیشن وبەئارەزووی خۆیان هەڵیان دەسووڕێنن. بۆ نموونە لە مەملەکەتی ناپۆلیدا و هەروەها لە مەملەکەتی پاپایەتی و ڕۆماناو لۆمباردیادا، خەڵکێکی زۆر هەن لەم دوو دەستەیەن و گومانیشی تێدا نییە کە ئەمەیە بۆتە هۆی پەیدابوونی هیچ کۆمارێك یا ژیانێکی سیاسی لەو ناوچانەدا. چونکە ئەوانەی لە بارۆدوخێکی وەهادا لەدایك دەبن، بەتوندی دوژمنایەتیی هەر شێوەیەکی فەرمانڕەوایی شارستانییانەی سەربەست دەکەن و هیچ هەوڵدانێك بۆ دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری لەو ناوچانەدا کە لەسەر ئەم شێوەیە ڕێکخراون، سەرکەوتنی بۆ بەدینایەت. خۆ ئەگەر

یەکێکیش هات و ویستی سەر لەنوێ ڕێکی بخاتەوە، ئەوا تاقە ڕێگا لە بەردەمیدا ئەوەیەکە ڕژێمی پادشایەتیی تێدا دابمەزرێنێ، لەبەر ئەوەی کە وەختێ ناوەڕۆك بەم جۆرە گەندەڵ دەبێ، قانوون لە وزەیدا نابێ بیپارێزێ و بیهێڵێتەوە. بەڵکوو پێویستە لە پاڵ قانووندا هێزێکی باڵای وەك ئەوەی ئاسایی بۆ پادشایان دەلوێ هەبێ کە خاوەنی دەسەڵاتێکی بێ سنووری جەربەزە بێو ئەو توانایەی بۆ بسازێنێ کە لە وزەیدا هەبێ بەر لە هەر سەرکێشی کردن و هەڵچوونێکی هەڵقولاّو لە زیادەخوازییەوەو هەر کاروکردارێکی گەندەڵانەی دەسەڵاتداران بگرێ".

مەکیاڤێللی بەتوندی دژی ئامۆژگارییەکانی کڵێسەی کاسۆلیکیش ڕاوەستا و بە بێبایەخی دەدانە قەڵەم و وەهای بۆ دەچوو بەر لە داهێنانی چالاکانەی مرۆڤ دەگرن کە ئەم ڕایەبە ئەمانەتەوە گیانی سەردەمەکە و ئەو ئەرکانەی دەنواند کە لە ئەستۆیدا بوون و کە لە هێڵە سەرەکییەکانیدا لەگەڵ بیروڕای گەورەترین ڕووناکبیرانی ئەوسای ئەورووپا دا، لەگەڵیاندا ئەوانەیان کەلە خەڵکە هەرەبەتەنگەوە هاتووەکانی مەسیحییەت و یەکێتیی کڵێسە بوون وەك ئارازمسی ڕۆتردامی و تۆماس مۆر، یەکیان دەگرتەوە، بگرە لەگەڵ سەرکردەکانی بزوتنەوەی ئایینسازییشدا ( الاصلاح الدینی) کە پێش مردنی مەکیاڤێللی بەتەنیا نزیکەی دەساڵێك بە توندی لە ئەڵمانیای دراوسێدا تەقییەوە، هەر یەکیان دەگرتەوە. بەلاّم نواندکەی مەکیاڤێللی لەم بارەیەوە توند وتیژتر و کاریگەرتر بوو وەك لەوان. جا ئاخۆ هیچ وتەیەك لەوە کاریگەرتر و هیچ نائومێدییەك لەوە بیبن تره کە نیکۆلۆ بە گاڵتەجارییەکی تێکەڵ لە ئازارێکی قووڵەوە وتێتی: "یەکەم شت کە دەبێ ئێمەی ئیتاڵیایی لە عۆیەیدا خۆمان بە قەرزاری کڵێسە و کاربەدەستانی بزانین، ئەوەیە کە بووینە کافرولەڕێ

لادەر" (دەمەتەقی –کتێبییەکەم –١٢) ئەمەش هەر هەمان قسەی مارتن لۆسەری سەرکردەی بزوتنەوەی ئایینسازییە کە بەردەوام دەیوتەوە.

مەکیاڤیللی یەك کە یەکێتیی ئیتاڵیای لە سەروو هەموو شتێکەوە دادەنا، نەیدەتوانی ڕای ئاشکرای خۆی دەربارەی هەڵوێستی گوێخەفاندنی کڵێسە لەم ڕووەوە، دەرنەبڕێ. سا با بەوریاییەوە گوێ بۆ ئەو قسانەی ڕایەڵ بکەین کە سەبارەت بەم باسە دەیانکا: "ئێمە لە شتێکی گەورەتریشدا قەرزاری کڵێسە و کاربەدەستانی کڵێسەین ورەنگیشە هۆی دووەمی ئەو وێرانکارییە بێ کەتووشی هاتووین، ئەویش ئەوەیە کە هەر کڵێسە یە ئیتاڵیا بەش بەش کردوەو تا ئێستاش پارێزگاری لەوبەش بەش بوونە دەکا. ئەوە ڕاستە کە دەبێ بوترێ هیچ ولاتێك هەست بە نیعمەتی یەکێتیو بە بەختیاری ناکا ئەگەر سەراپای لەژێردەسەلاتی یەك حوکمی جەمهووری یا یەك میردا نەبێ، وەك لە فەرەنسا و ئیسپانیادا هەیە. بەلام گومان لەوەدا نییە کە هۆی نەبوونی ئەو وەزعە، واتە یەك جەمهوورییەت یا یەك میرایەتی بۆ گشت ئیتاڵیا، بێ چەند وچۆن بێ سێ و دوو لێکردن دەگەڕێتەوە بۆ کڵێسە. چونکە هەرچەند مەڵبەندی کڵێسە لە ئیتاڵیا دایە و دەسەلاتە دنیاییەکەشی هەر لەوێدایە، بەلام ئەو دەسەلات وئەو چاکەیەی قەت ڕۆژێك لە ڕۆژان نەبوونەتە خاوەنی هێزێکی وەها ئەو توانایەی بۆ بسازێنی کە حوکمڕانە جەربەزە ئیتاڵیاییەکانی، سەر شۆڕی حوکمڕانیی خۆی پێ بکاو خۆی بەسەر هەموویانەوە بکاتە تاقەمیر، هەروەکوو لەولای تریشەوە قەت ڕۆژێك لە ڕۆژان، نەگەیشتۆتە ئەو ڕادەی لاوازییەی ترسی لە دەس چوونی دەسەلاتی خۆی بەسەر کاروباری دنیاییدا لیبنیشێو ناچار ببێ کە بۆ پاریزگاری کردن لەو دەسەلاتەی خۆی، دژێئەو دەولەتەئیتاڵیاییەی زیاد

له راده‌ی خواست و حه‌زی ئه‌و به‌هێز بووه، په‌نا به‌رێته به‌ر ده‌وڵه‌تێکی بێگانه. به‌م پێیه کڵێسه بۆته هۆی ئه‌وه‌ی ئیتاڵیا نه‌که‌وێته ژێر حوکمڕانیی یه‌ك تاکه سه‌روبه‌سه‌ر ژماره‌یه‌ك میرو سه‌رداری ئه‌وتۆدا دابه‌ش ببی که په‌رت په‌رت بوون و لاوازیی بکه‌ن به نه‌سیب و وای لێبێ نه‌ك ته‌نیا بۆ وه‌حشییه هێزداره‌کان[٣٩] ببێته نێچیر، به‌ڵکو بۆ هه‌ر یه‌کێ بیه‌وێ په‌لاماری بدا. ئێمه‌ی ئیتاڵیایی پێویسته که‌بۆ ئه‌م وه‌زعه ناهه‌مواره‌ی تێیکه‌وتووین، سوپاسی ته‌نیا کڵێسه بکه‌ین نه‌ك هیچ لایه‌کیتر" (ده‌مه‌ته‌قێ –کتێبییه‌که‌م– ١٢).

که‌وابێ هۆی سه‌ره‌کیی دوژمنایه‌تی کردنی مه‌کیاڤیللی له‌گه‌ڵ کڵێسه‌ی کاسۆلیکیدا له‌وه‌دابوو که‌کڵێسه بووبووه کۆسپێك له ڕێگای به‌دیهاتنی خه‌ونه گه‌وره‌که‌یداو بینینیی نیشتمانه‌که‌ی به یه‌ککگرتویی و سه‌ربه‌رزی و سه‌رفرازی. به‌م جۆره پاپاکان، به‌پێ ی شیکردنه‌وه دروسته‌که‌ی ئه‌و، له‌لایه‌که‌وه له‌وه لاوازتر بوون بتوانن یه‌کێتی ئیتاڵیا به‌دی بێنن و له‌لایه‌کی تریشه‌وه حه‌زیان نه‌ده‌کرد یه‌کێکی تر ئه‌و کاره مه‌یسه‌ر بکا. جا بۆ ئه‌وه‌ی له ڕاده‌ی قووڵیی ئه‌م شیکردنه‌وه‌یه‌ی مه‌کیاڤیللی تێبگه‌ین، پێویسته هه‌ڵوێستی کڵێسه به‌رامبه‌ر به مه‌سه‌له‌ی یه‌ککگرتنی ئیتاڵیا به‌درێژای چوار سه‌ده‌ی دوای ئه‌و بۆمبایه بێنینه‌وه یاد که مه‌کیاڤیللی زۆر به‌جه‌ساره‌ته‌وه و ڕووبه‌ڕوو ته‌قاندنی یه‌وه بێ ئه‌وه‌ی په‌نا به‌رێته به‌ر خه‌یاڵ و ئه‌ودنیا وه‌ك دانتی کردی، یاله‌زمانی پێشینانه‌وه بیروڕاکانی خۆی بنوێنێ وه‌ك پترارك په‌نای برده به‌ر. پاپایه‌تی به‌هه‌ر شێوه‌یه‌ك بۆی ده‌لوا، له‌سه‌ر به‌ربه‌ره‌کانی کردنی یه‌ککگرتنی ئیتاڵیا به‌رده‌وام بوو. وه‌ختێکیش خه‌ونه هه‌ره گه‌وره‌که‌ی ئیتاڵیاییه‌کان له‌١٨٧٠دا هاته‌دی، پاپا ملی بۆ دان نان به حکوومه‌تی ئیتاڵیای

یەکگرتوودا نەداو بەتوندی دژی ئەوە ڕاوەستا ڕۆما بچێتە پاڵی خۆی بە "حەپسی ڤاتیکان" دایە قەڵەم. ئینجا کار هەر وەها ڕۆیشت تا لەساڵی ١٩٢٩ دا مۆسۆلینیو پاپا بەپێی پەیمانێکی تایبەتی ڕێککەوتن کەیەکەمیان سەربەخۆیی ڤاتیکان بسەلمێنێ و دووەمیش دان بە ئیتاڵیای یەکگرتوودا بنێ.

ئەوەش دەهێنێ لێرەدا ئیشارەتی پێ بدرێ کە مەکیاڤیللی بە بیرەتیژەکەی و لە نزیکەوە بە چەوت و چەوێڵییەکانی کڵێسە و ئەو ئاژاوەو سەر لیشێواوی یەی دەزانی کە کارگێڕانی تووشی هاتبوون. چونکە ئەو لە ڕۆژانی جەمهوری یەتدا دوو جار وەك نێراوێکی دیپلۆماسی چوو بۆ ڕۆماو لە نێوانیانەوە شارەزای ژیانی ئەکلیرۆسەکان و ئەو بەرتیل وبەرتیلکارییە بوو بوو کەلە ناویاندا بڵاو بوو بووە بەوە زیاتر لە گەندەڵیی دەستەو دایەرەی کڵێسەو دورکەوتنەوەی تەواوی لەگیانی ڕەسەنی ئایینی مەسیحییەت دڵنیا بوو بوو.

کاردانەوەیپاپایەتی بەرامبەر بەم هەڵوێستەی مەکیاڤیللی، لەیەك کاتدا هەم توندو تیژو هەم دڵڕەقانە بوو. بۆ نمونە لە ساڵی ١٥٥٧ دا، جزویتە سەرگەرمەکانی کلێسەی کاسۆلیکی گشت کتێبەکانی مەکیاڤیللی یان سوتاندو لەگەڵیدا دادگای پشکنین (محاكم التفتيش) بڕیاری قەدەغەکردنی خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی داو هەموویانی خستە لیستەی کتێبی قەدەغەکراوەوەو ئەنجومەنی ترانتی کڵێسەیش ئەوی سەلماند. ئینجا لە ساڵی ١٥٥٩ دا کڵێسە بڕیارێکی دەرکرد کەنموونەیەکی (effigie) جەستەی مەکیاڤیللی بە ئاشکرا بسووتێنرێ، لە کاتێکدا پێش ئەوە بەنزیکەی تەنیا چارەکە سەدەیەك، ڕۆما خۆی کتێبەکانی بۆ چاپدەکردن وشانۆ گەرییە کۆمیدییەکانیشی بە ئامادەبوونی پاپا خۆی پێشکەش

دەکـران.[٤٠] هـەروەکوو مـەکیاڤیللی کتێبـە بـە بڕشـتەکەی "مێـژووی فلۆرنسا" کە لە هەشت بەرگدایە لە ڕاستیدا تەرخانە بۆ سەرجەم میـژووی سیاسیی ئیتاڵیا و بـە حـوکمی قووڵبوونـەوەی لـە هەڵسەنگاندنی ڕووداوە مێژووییەکان و شێوەدرامییەکەی لە نووسینیانداو پتەویی زمانەکەی "بـە یـەکێك لـە دەسـکەوتە هـەرە گـەورەکانی کۆڵینـەوە لـە مێـژووی نـوێ دەژمێردری"[٤١] و تا ئیستاش لەو بایەخـە نەکـەوتووە، لەسـەر داخـوازیی پاپا کلیمەنتی حەوتەم نووسـیویێتی و بـە دەسـتی خـۆی پیـشکەش بـەوی کردوە. : دوای ئـەوە شـاڵاوێکی پروپاگەنـدەی نەخـشە بـۆ کێشراوە دژی مـەکیاڤیللی دەسـتی پێکـرد کـە نووسـەر و مێژوونووسـە جزویتـە کەڵلەڕەقـەکان ڕیـزی پێـشەوەیان تێـداگرت. ئەوانـە لایەنـە بـەهێزەکانی نووسـین و بـیروڕاو هەڵوێـستەکانی مـەکیاڤیللی یـان خـستە لاوە و تـەنیا هەندێك لە بیروڕاو کردارەکانی بە شێوەیەکی ڕووتـەنی دەکـردە دەسـکەلاو بەوە وێنەیەکی ساختەی ئەوتۆیان بۆ دەنەخشاند کە چەندیشە تەقـەلایان دەدا هونەرکاریی تێدا بکەن، بەڵام هێشتا هەر لە گـەڵ واقیعـی حـاڵی ئـەو پیاوەدا نەدەگونجا. بۆ نموونە ئەوەیان لێدەکردە عەیبە کە کتێبی "مـیر" ی پێشکەش بە جۆلیانۆ ( دوایی لۆرینزۆ) میدیتچی کردبوو، ئینجا وایـان دادەنا گوایە ئەوە هەوڵدانێك بووە بۆ چاوەشـەکردنی بنەماڵـەی میدیـتچی دوای گەڕانەوەیان بۆ سەر دەزگـای حـوکمڕانی[٤٢]. هـەروەکوو هەنـدی لـە نووسـەرانی ئـەم سـەردەمەش ئـەو مەسـەلەیە لـە هـەمان ڕوانگـەی جزویتەکانـەوە هەڵدەسـەنگێنن[٤٣]. لـە ڕاسـتیدا نکوولی لـەوە نـاکری کـە مەکیاڤیللی حەزی دەکرد بێتـەوە سەرشـانۆو لـە ئیـشێکی ئـەوتۆ دەگـەڕا کەمی لە باری ئەو چـەڵەمەدارایییەی تووشـیهاتبوو سـووك بکـا و ئەمـەش کردەوەیەك نییە بە هیچ کلۆجێك لیی بگیری، چـونکە هـەر لـە بنەڕەتـەوە

غەدرە نیکۆلۆی ناو کۆمەڵگایەك کە مروڤـی هـەم گـورگ و هـەم ڕێـوی دەوری گـەورەیان تێدا دەگێـرلو پایـە وپلـە و سـامانداری لای هـەمووان بـە سـەردار و ڕەشـــۆکییانەوە مانایـــەکی تەلیـــسماوییان دەبەخـــشی، لـــە خواســـت و پێداویستییەکانی وەك هەر مرۆڤێکی تر، دابڕیکرێ. بەڵام مەسەلەکە لـەم لایەنـە ڕووتـــەی مرۆڤایـــەتیش دەچـێتە دەرەوە، چـونکە لـۆرینزۆ میدیتـچی کـە لـە ئاستیاندا وەك هەر مرۆڤێکی تر هێندەی سیفەت و تواناو بەهرە تێدابوو کـە لـە وزەیاندا هەبی بیکەنـە پیـاوێکی هەڵکـەوتوو. ئـەو لـەو بابەتـە کەسـانە بـوو کـە دەیتوانی بڕیاری ببڕاییبڕ بدلو پەیڕەوی ئەو جۆرە سیاسـەتە بکـا کـە لـە "مـیر" دا بـاس کـراوەو لیدەوەشـایەوە ئیتاڵیـا ڕزگـار بکـا و یـەکگرتنی بـۆ بـە دی بێنی(٤٤). ئەمەش بۆ مەکیاڤیللی سەروزیاد بوو کە ئەوی وەك میرێکـی نموونـەیی بێتە پێش چاو.

لەگـەڵ ئەوەشـدا دوو شـتیتر دەمێننـەوەو دەشـێ تیشکێکی ڕوونـاکتر بخەنە سەر ئەم باسە.. مەکیاڤیللییـەك کـە بـە هـۆی ئـەو پێشکەش کردنـەی کتێبەکەیەوە "میر" بە مەرایی کردن گوناهبار کرا، بەبی چەند وچۆن ئـەوەی ڕەتکردەوە کە خزمەتی "بیگانە وەحشییەکان" بکا، لە کاتێکدا کەسـانی تـر کڕنووشیان بۆ دەبردن. بەڵام با ماوە بـە کـابرا خـۆی بـدەین لـەم ڕووەوە کـە گەردەلوولێکی هەوشاری دروستکراوی دەربارە هەڵکرا، بۆمان بدوی. ئەو بـەو پەڕی ساکارییەوە دەڵی:

(من تـەنیا هێنـدەی بتـوانم سـوودبەخش بم قـەت هـیچ کارێـك و هـیچ فەرمانێکی جەمهوورییەت ڕەت ناکەمـەوە، مـن ئەمەپیـشەمە و ئەگـەر بـە کردارنەیکەم بە وتار خوێندنەوە دەیکەم و ئەگەر بە میـشیان بـۆم نـەکری بە پرۆژەکانم دەیکەم...".(٤٥) کەوابی نیکۆلۆ ئامادە بوو بـە دڵسۆزییەوە خزمەتی وڵاتەکەی بکا. لەبەر ئەوە تەنانـەت لـە تەنگـەتاوترین ساتانیـشدا

هەر سەری خۆی بەرز ڕادەگرت و حەزی لە ئیشکردنێك نەدەکرد "سوود بەخشینی تێدا" نەبێ. بۆیە ئەم "مەرایی کەرە" تەنانەت دوای دەساڵ دوورخستنەوەش بە هۆی بێزاربوونییەوە لە هەڵوێستەکانی پاپایەتی، پلەی سکرتارێتیکی سوودبەخشی یەکێك لە کاردینالەکانی ڕۆمای ڕەتکردەوە. لێرەدا پرسیارێکی پڕ مەغزا خۆی بەسەر مێژوونووسدا دەسەپێنی: ئایا بۆ مەکیاڤیللییەکی خاوەن توانا ئەگەر بەڕاستی بیویستایە مەرایی بکا، باشتر وەها نەبوو خۆی لەو کەسانە نزیك بکاتەوە کە چارەنووسی نەك یەك ئیتاڵیاییەکی وەك ئەو، بەڵکوو هی گشت ئیتاڵیایان لە چنگدا بوو، مەبەستم لە داگیرکەرە بێگانەکان و دەم ڕاستەکانی ڕۆمایەکە ئەو بەبی پێچ و پەناو سەوداو مامەڵەکردن هێرشی دەبردنە سەر؟ لێرەدا دەبی ئەوەش سەرنجمان ڕابکێشێ کەگرتنی ئەم هەڵوێستە لە لایەن ڕووناکبیرە ئیتاڵیاییەکانەوەو لەو بارودۆخە زۆر سەخت و ستەمەدا دەگمەن نەبووە. بۆ نموونە هاوچاخی مەکیاڤیللی و تاجی سەری ئیتاڵیا ومرۆڤایەتی لیۆناردۆدافینشی (١٤٥٢-١٥١٩) لە کۆتایی ژیانیدا ناچار بوو پەنا بەرێتە بەر پادشای فەڕەنسا فرانسوای یەکەم و دوا پێنج ساڵی تەمەنی لەگەڵدا و لە کۆشکێکی نزیك کۆشکەکەی ئەودا بەسەر بەرێ، بێ ئەوەی ئەمە بە ژیان و مێژووی ئەو بلیمەتەوە ببێتە تەنانەت سووکە لەکەیەکیش.

هەروەها ڕووناکبیری سۆشیالیستی ئایدیایی ئیتاڵیایی کامبانیللا (١٥٦٨-١٦٣٩) کە بۆ ماوەی (٣٣) ساڵ بەبێ مل کەچی کردن خۆی لەژێر لێدان و ئازاردان و بەندکردندا لە لایەن دادگاکانی پشکنینەوە ڕاگرت لە ئەنجامدا پەنای بردە بەر ریشیلۆی فەڕەنسایی و خۆی خستە ژێر باڵی ئەوەوە. کەوابێ هیچ گومانی تێدانیە کە مەکیاڤیللی، ئەگەر بیویستایە

دەیتوانی وەك ئەوان کردار بکاو ئەوەی بۆ ئەوان لوا بۆ ئەمیش بلوێ و بەڵام نەیکرد. بەڵێ ئەم "مەرایی کەرە" بەو پەڕی نەفس بەرزییەوەئیشکردنی لەدەرباری فەرەنسادا ڕەتکردەوە. با جارێکی تریش گوێ لەخۆی بگرین و بزانین بە شێوە گاڵتەجاڕیەکەی خۆی، لە بارەی ئەم باسەوە چی دەڵێ:

"من مردنم لەبرساندا لە فلۆرنسادا بەلاوە پەسندترە وەك لە ئینتەلاکردن لە فۆنتینبلۆدا"[46][47] یەکەمینی نووسەرەکان و بەشێوەیەکی تایبەتی جزویتەکانیان ڕەخنەیان لەسەر ئەوە لە مەکیاڤیللی دەگرت گوایە لە کتێبەکەیدا "میر" سیزار بۆرجیای بە نمونەیەك هەڵبژاردووە کە بەنهێنی شوێن پێی هەڵبگیرێ. لێرەشدا هەڵبژاردنەکەی مەکیاڤیللی لە خۆیەوە نەهاتبوو، چونکە سیزار بۆرجیا کوڕی پاپا ئەلیکساندەری شەشەمی نەوەی بنەماڵەی بۆرجیای ناسراو[48] بوو کە مەکیاڤیللی سێ جار بە ئەرکی دیپلۆماسییانە چووبوە لای و لە نزیکەوە ناسیبوویو لە ڕاپۆرتەکانیدا بە توندی ڕەخنەی لەکردارو ڕەفتارەکانی گرتبوو، بگرە بە دوژمنێکی سەرسەختی فلۆرنسای دانابوو.[49] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەنێوان سەرنجدانێکی وردی سیاسەتەکەیەوە بە درێژایی چەندین مانگ کەوتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەو ڕێ و شوێنانەی ئەم پیاوە بەکاریان دێنێ، لە توانایەنداهەیە ئیتاڵیا لەگرفتەکانی ڕزگاربکەن و بەوە زیاتر لەهەر سیاسی یەکی تر کە دیبووی یا شتی دەربارە خوێندبووەوە کاری تێکرد.[50] بەهەر حاڵ گرنگ بەلایەمەکیاڤیللی یەوە ئەوەبوو کە سیزار بۆرجیا بە هەموو شێوەیەك و بە ئیلحاحەوە تەقەلای دەدا حکومەتێکی یەکگرتووی بەهێزی ناوەندی بۆ حوکمڕانی کردنی ناوچەیەکی فراوانی ناوەڕاستی ئیتاڵیا دابمەزرێنێ و ببێتە هەنگاوێکیش بۆ یەکخستنی گشت

وڵاتەکە. هەروەها مەکیاڤیللی سەبارەت بەهەڵوێستی سیزار بەرامبەر بە لەشکری سەربازی بەکرێگیراو و تەقەلا دانی بۆ بەسەربازکردنی کوڕوکاڵانی ئیتاڵیا خۆیان و وازهێنانی لە لەقەبی کاردینال کە لەقەبێکی باڵای ئاینی بوو لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکانیدا، گەلێ پێخۆشحاڵ بوو. ئینجا لێرەدا جێی خۆیەتی بوترێ لیۆناردۆ داڤینشی یەکێك بوو لەوانەی بەدڵسۆزییەوە هاریکاری ی لەگەڵ ئەو سیزار بۆرجیایەدا کرد کە مەکیاڤیللی لەسەرەتادا بە دوودڵییەوە پەیوەندی لەگەڵدا بەست. بەم جۆرە بەبێ گوێدانە ڕادەی سەرکەوتنی مەکیاڤیللی لە هەڵبژاردنی نمونەی قارەمانەکەیدا، لەم کۆڕەدا دەبێ یەك ڕاستی تۆمار بکرێ، ئەویش ئەوەیە کە سیزار دوای نزیکەی شەش ساڵ بەسەر مردنیدا و کۆتایی هاتنی دەوری بنەماڵەکەی لە سەر شانۆی سیاسی ئیتاڵیا، ئینجا ناویچووە ناو کتێبی "میر"ەوە کە ئەوە شێوەیەکی مەوزووعییانەی ئاشکرا بە هەڵبژاردنەکەی دەدا.

هێجگار سەیریش ئەوەیە کە ڕەخنەگرانی مەکیاڤیللی، تەنیا هەڵەو چەوتییەکانی سیزار بۆرجیا بگرن و بیانکەنە بنێشتە خۆشەی ژێر زمان و بڕای بڕ خەونە باڵاکەی "خەونی مەکیاڤیللی" سەبارەت بەهەڵکەوتنی بلیمەتێکی ئیتاڵیایی بخەنە پشت گوێ کە وڵاتەکەی لە پەرت پەرت بوون و داگیرکاری ڕزگار بکاو "ڕژێمێکی نوێی ئەوتۆ کە سەربەرزی بۆ خۆی و خێرو خۆشی بۆگەل بەدی بێنێ" دابمەزرێنێ. ئەو ئیتاڵیایەی وەك نیکۆلۆ بە دڵسۆزییەوە بۆی دەچوو (هەناسەی لەبەر بڕاوە) وچاوی بڕیوەتە "ئەو مرۆڤەی دەتوانێ زامەکانی تیمار بکاو کۆتایی بە وێرانکاری و ڕاووڕووت لە لۆمباردیاداو چاوچنۆکی و زەوتکاری لە مەملەکەتی ناپۆلی و تۆسکانیادا بهێنێ و ئەو پەڵەو بڵقانەی کە لە دەمێکەوە لە جەستەیدا کیم و زوونیان

هێناوەتەوە، بتەقێنێ و چاکیان بکاتەوە. ئەوەتا ئیتاڵیا ڕۆژانە لە خودا دەپاڕێتەوە کەسێکی وەهای بۆ بڕەخسێنێ کە لەم ستەمکارییە وەحشییانەیەو چەمووشییە کوێرانەیە ڕزگاری بکا. "ئەو ئامادەی دواکەوتنی هەر ئاڵایەکەو بۆی بەپەرۆشە، بە مەرجێك یەکێك هەبێ هەڵی بگرێ و بەرزی بکاتەوە" ئینجا ئەگەر ئیتاڵیا بۆی لوا "ئەم میرە ئازادو ڕزگار کەرە" بدۆزێتەوە ستەمە بتوانری وەسفی "ئەو خۆشەویستییە بکرێ کە لەلایەن ئەو هەرێمانەوەی لە ژێر زەبرو زەندی شالاوی داگیرکەراندا تووشی چەندین بەڵای ناگەهان هاتوون دەیدرێتێ، یا ئەو تینوێتییەی بۆ تۆڵەسەندنەوە و ئەو باوەڕە نەگۆڕو پڕ لە دڵسۆزییەبێ چەندو چۆن و ئەو فرمێسکی سوپاس و ستایشەی دەیانبینێ. هەرچی دەرگاهەن لەڕوویدا دەخرێنە سەر پشت و سەرجەمی گەل بەدەم تاعەتکردن و مل بۆ کەچکردنی ڕێزلێنانەوە پێشوازی لێدەکەن، هەروەکو کەسێك نابینێ حەسوودی پێ بەرێ و هیچ ئیتاڵیایێ لە چوونە ژێر ئالاکەیەوە دواناکەوێ. ئەم ژێر دەستییەی وەحشییەکان لووتی هەموو مرۆڤێك دەچورزێنێتەوە" (میر – بەشی بیست و شەشەم). ڕەخنەگرانی مەکیاڤیللی بە هەموو ئەو شتانە نەوەستان، بەڵکو تەقەلایاندا هەڵوێستی بەرامبەر بە ئایینیش بشێوێنن و لەو ڕێگایەوە توانییان هەست و سۆزی ناسکی خەڵکە ساکارەکە بە شێوەیەکی تایبەتی بەتووندی ببزوێنن، ئەویش بەنیشاندانی لە شێوەی کافرێکی لە دین وەرگەراودا. لە کاتێکدا "تاوانی" نیکۆلۆ لەم ڕووەوە، لەوە بەولاوە نەبوو کە دەیویست مەسەلە ڕۆمانتییەکان، ناوەڕۆکێکی سیاسی یان هەبێ و "بۆ بنیادنانی ژیانی گەل" و خزمەتکردنی دەوڵەت تەرخان بکرێن.[٥١] هەروەها ئەو وەهای دەبینی کە چاککردنی باری دەوڵەت بەگۆڕینی دڵ و دەروونی خەڵکەکە

بەدی نایەت، بەڵکو بەگۆڕینی دام و دەزگاکانی بەدی دێ. بۆیە دەبینین ئەو نەك تەنیا لەمەسەلەی ئاین دەدوێ، بەڵکوو باسی گشت پەیوەندییەکانی نێوان خەڵکی دەکا وەك خۆشەویستی و ڕق و کینەو هونەرو هەموو دیاردەکانی ژیان خۆی، بە پێی ئەو دەورەی لە کۆمەڵدا دەیگێڕێ.

راستە کەنیکۆلۆ ئەرکە ئایینییەکانی خۆی بەجێ نەدەهێنان، بەڵام کافر نەبوو، بەڵکو وەك هەندێ سەرچاوە دەیسەلمێنن – "بەپێی نەریتە ئاینیی یە ناچارکارییەکان )دەژیا[٥٢] پڕ بەدڵیش ڕێزی لە دامەزرێنەرانی ئایینەکان دەناو وای بۆ دەچوو کە ئەوان دەبێ زیاتر لە دامەزرێنەرانی دەوڵەتان جێگەی دەست بۆ بەسنگەوە گرتن[٥٣] بن. جزویتەکان و کەسانی تریش، هەروەها هەڵوێستی مەکیاڤیللی یان سەبارەت بە چاکەکاری و دڵڕەقی بە شێوەیەکی دوورلە هەر بەهایەکی مەوزووعی یانە دەشێواند. ئەوان وەك لەوەبەر وتمان، خۆیانیان لەگشت ئەومەرجانە گێل دەکرد کە مەکیاڤیللی لە هەموو کتێبەکانیدا پێی لەسەر دادەگرتن و چاویان لەو قسە ئاشکراو ڕوونەی ناو "دەمەتەقێ" کەی دەنوقاند کە دەڵێ : سەر کەوتنی ڕۆمەکان و گەشەسەندنیان تا رادەیەکی زۆر ئەنجامی خۆ بەستنەوەیان بووە بە چاکەکاری یەوە[٥٤] ئەوانە لەهەڵسەنگاندنی ئەم لایەنەی بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللیدا، بە ئەنقەست ئەوەیان فەرامۆش کردوە کە ئەو لە کردارو ڕەفتاری خەڵکە ئاساییەکەی نەکۆڵیوەتەوە ، بەڵکو باسی لە ئەرکەکانی سەرشانی ئەو حوکمڕانانە بووە کە هەڵسووڕاندنی کاروبارێکی گەورەوگران و ئاڵۆزیان دەکەوێتە ئەستۆ و کە یەکەمین پێداویستیش لەم ڕووەوە، تێگەیشتنی شتە بەباری ڕاستەقینەی خۆیداو کە لاخستنی هەست و سۆز لە پێناوی جێبەجێ کردنیدا بە

باشترین شێوه. هەروەها نیکۆلۆ ئەم واقیعەی بە شێوەیەکی کاریگەرو روون لێکداوەتەوە، چونکە ئەوانەی ناتوانن لە کاتی پێویستیدا و لە پێناوی بەرژەوەندی گشتیدا لە نەریت لابدەن "چاکتر وایە چ کارێکیان حەز لێ یە بیکەن تەنیا سیاسەت نەبێ" لەبەر ئەوەی سیاسەت بەلایەوە "جۆرێکی ئەوتۆیە لە چالاکی یەکانی مرۆڤ کە ملکەچی هیچ مەرج و هاندەرێکی گیانی یا خاوەن سیمایەکی ئەدەبی نییە" و بەوە لەگشت چالاکیەکانی تری مرۆڤ جیادەبێتەوە.(٥٥) جا بەم جۆرە ماکیاڤیللی دەبێتە یەکەمین کەسێك کە تاریفێکی نوێی بۆ مەفهومی دەوڵەت داڕشتبێ.

لە پاڵ ئەو پێوانانەدا کە جارەها لامان دایە سەریان، مەکیاڤیللی باڵاترینی ئەو چاکەکاری یانەشی لە خۆگرتوون کە لە کۆڕی پەیوەندی یە سروشتییەکانی نێوان خەڵکیدا هەن.بۆ نموونە لە میردا وتوویە "بێگومان ئیمە هەقی ئەوەمان نییە سیفەتی پاکی و چاکەکاری بدەینە پاڵ ئەو کەسەی هاوولاَتییەکانی خۆی دەکوژیو ناپاکی لە برادەرو دۆستەکانی دەکاو پشت دەکاتە پەیمانەکانی و بەزەییو دینداری دەخاتەلاوە. رەنگە مرۆڤ بتوانی لە رێگەی ئەم کردارانەوە بە میرایەتی بگا، بەلاَم ناتوانی بگاتە سەربەرزی –میر –بەشی هەشتەم". "ئەو دۆستایەتییەی لە سەر بناغەی کڕین و فرۆشتن بنیادنرابی دۆستایەتییەکی ساختەیەو ئەگەر چی بە پارەو پوول دەکڕدری بەلاَم جێگەی باوەڕو موتمانە نابی و لەو بابەتەیەکە هەر هێندی پێویستیت پیی هەبوو وەك نەبوونی وەهایە – میر– بەشی حەڤدەیەم".

بەلاَم میر لە سەری پێوستە وەك وتم "ئەگەر بۆی لوا با پشت نەکاتە خێرخوایی، بە مەرجێك کە ئەگەر تەنگەتاوو ناچارکرا، کۆڵە شەڕخوایی نەکاتەوە" لەگشت حاڵەتێکیشدا بۆچوونی مەکیاڤیللی لە

هەڵسەنگاندنەکانیدا، هەر وەك هەڵسەنگاندێکی رووت دەمێنێتەوە. چونکە دەشی "ئەوەی وەك چاکەکاری دێتە پێش چاو" لە هەموو وەختێکدا چاکەکاری نەبی، لە بەر ئەوەی "دەگونجی ماڵوێرانیی لیبوەشێتەوە"، یا ئەوەی لە باری سەرنجێکی ئاساییەوە وەك خراپەکاری دێتەپێش چاو، لەباری سەرنجێکی سیاسییانەوە وەها نەبی، بە تایبەتی ئەگەر بووە هۆی "زامن کردنی ئەمن و ئاسیش و سەرکەوتن". بۆیە "ئەو میرەی بۆ فێربوونی چۆنێتی کردار وکردەوەی ئاژەڵخۆی بەناچار دەبینی، پێوستە لە یەك کاتدا لاسایی رێوی و شێریش بکاتەوە، چونکە نە شێر دەتوانی خۆی لە تەڵە بپارێزی و نەرێوییش دەتوانی لە رووی گورگاندا پارێزگاری لە خۆیبکا. لەبەرئەوە ناچار دەبی ببێتە رێوی تا تەڵە بناسێتەوەو ببێتە شێر تا گورگ بتۆقێنێ —میر —بەشی هەژدەیەم". لە هەموو ئەوەی باسمانکرد، رای مەکیاڤیللیمان بە ئاشکراو بە روونی بۆ دەردەکەویکە: مرۆڤ دەتوانی خۆی لە جیهانی سیاسەت بە دووربگری و ئەوسا بە پیی پێوانە باڵاکانی رەوشت و رەفتارو بەبی ئەوەی بە موو لییان لابدا هەڵبسووڕی و بگرە لە سەری پێوست دەبی وەها بکا. بەڵام ئەگەر چووە گێژاوی سیاسەتەوە، ئەوا دەبی لە ژێر رۆشنایی یاساکانیدا هەڵبسووڕی. ئەگەرچی مەکیاڤیللی تەنانەت لێرەشدا، ئەوەی لە میرە نۆییەکەی خۆی نەخواستوە شتێك بکا کە چارەهای چار رووی نەدابی. ئەو "حوکمڕانەکانی ئەورووپای بەد رەفتار" نەکردوە وەك دەوتری، بەڵکو "زۆر ئاسایی کردارو رەفتارەکانیانی وەك بە تەبیعەت هەن لێکداونەتەوە.(٥٦) یا بە واتایەکی ورتر ئەو سەیری مرۆڤی، حاکم بی یا مەحکوم، وەها نەکردوە کە دەبیهەبیو بەڵکو وەهای تێڕوانیوە کە هەیە. بۆ نموونە لە "میر"دا کە زیاتر لە هەر کتێبیکیتری تاوانبار دەکری، هەمان وێنەی

تەڵخی باری کۆمەلأیەتی دەبینری کە سەدان فەیلەسووف و ڕووناکبیری لەوەبەرو لەوەپاشی مەکیاڤیللی ئیشارەتیان پی داوە. هەر وەکوو ئەو سەردەمەی نیکۆلۆ تیایدا دەژیا، سەردەمی فرت و فێلّ و پیلانگێڕان و ئیرهابێکی ئەتۆ بوو کە گشت کووچە و کەل و قوژبنێکی ئەورووپای دینی و دنیایی و بگرە ڕۆژهەلأتی ئیمەشی گرتبووەوە. پیش پەیدابوونی مەکیاڤیللی بە چەند سەدەیەك پادشای ئەڵەمانیایی ئۆتۆی یەکەم (٩١٢-٩٧٣) لە هەڵسوکەوتیدا لەگەلّ سەردار و تیرەکان و لەگەلّ ئایینەدا لە ناومەملەکەتەکەی خۆی و ئەوناوچانەشدا کە داگیری دەکردن، هەموو ئەم ئامۆژگارییانەی مەکیاڤیلليی پەیرەو دەکردن. خۆ ئەگەر سیزار بۆرجیای قارەمانەکەی مەکیاڤیللی، سی جار خوشکەکەی خۆی بۆ ئامانجی سیاسیی ڕووت بە شوو دابی، ئەوا ئۆتۆش پێش ئەو بە پێنج سەد سالّ، تەنیا بۆ ئەوەی نازناوی پادشای ئیتالّیا وەربگری، بێوەژنەکەی ئەو پادشایەی لە خۆی مارەکردوە، هەروەکو -بەبیانووی گەڕاندنەوەی پاپاوە بۆ سەر تەختەکەی دوای دەرکردنی لەلایەن خەڵکی ڕۆماوە- شالأوێکی بردە سەر شارەکەو پاپا دەرکراوەکەی گەڕاندەوە شوێنی خۆی کە ئیتر لەو ساتەوە کردییە داشێکی دامە بە دەست خۆیەوەو بەپیی ئامانجەسیاسییەکانی، چۆنی دەویست وەهای هەڵدەسووڕاند.لەوانە پاپا لە سالّی ٩٦٢ دا تاجی ئیمپراتۆرێتی بەئۆتۆ بەخشی کەبووە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیمپراتۆرێتی پیرۆزی ڕۆمانیا. یا سیاسەتی پادشاکەی تری ئەڵمانیا ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرێتی پیرۆزی ڕۆمانیا فردریك باربارۆسا ( ١١٢٥-١١٩٠) لە هەندێ درێژکاریدا نەبی، دەنا هیچ جیاوازییەکی لەگەلّ ئەوەی پێشوویدا نەبوو. یا پادشای فەڕەنسایی شارلی گەورە ( شارلمان ٧٤٢-٨١٤) مەسیحییەتی هەر بەو شێوەیە کردە هۆیەك بۆ چەسپاندنی

مەملەكەتەكـەی كـە مـەكیاڤیللی دوای نزیكـەی حـەوت سـەد سـاڵ بـە نموونەیەكی باڵای دایە قەڵەم.

بەڵام لـە سـەردەمی مەكیاڤیلیـدا كـە "هێـزو تەڵكـەبازی بـوو بوونـە كلیلی سەركەوتن" و ناوی نرابوو "سەردەمی فرت و فێـڵ و سەركێـشی".[57] دەربەگەكانی ئەڵمانیا هێشتا "میر" یان نەخوێندبووەوە، وەختـی لـە ژێر پـەردەی ئاییـندا بزووتنـەوە مەزنەكـەی جوتیارانیـان ( ١٥٢٤-١٥٢٥) نوقمی دەریایەكی خوێن كـردو نزیكـەی سـەد هـەزار كەسـیان كوشـت كـە تاوانی گەورەیان جەسارەتی داواكردنی تۆزی سووك كردنی باری كڵۆڵی و كەساسییان بوو. هەروەكوو گەڵی لـە پاپاكـان لـە سـەردەمی ئـەوو پـێش ئەوو دوای ئەودا لە تەڵەكەبازی و دڵڕەقـی بـەولاوە شـێوەیەكی تریـان بـۆ مامەڵەكردن لە لا نەبوو. دەتوانری دەیەها نموونـەی مەكیاڤیلیـستییانەی تر لە مێژووی بەر لەمەكیاڤیلیدا بهێنرێنـەوە. بكـرە دەزگـا جزوێتییـە[58] سەرگەرمەكە بۆ كاتۆلیكییەت كە بەشێكی گەورەی گوناهی زڕاندنی نـاوو ناوبانگی مەكیاڤیللیی دەكەوێتە ئەستۆ، خـۆی پـتر لەهـەر لایـەنێكیتر بـە مەكیاڤیللییەت تاوانبارە، چـونكە هـەر لـە سـەرەتای دامەزراندنییـەوە لـە سالی ١٥٣٤ دا دروشمی "ئامانج بوار بە ڕێو شوێن دەدا لە هـەر چەشـنێك بن"ی گرتبوو خۆی.

لـە ڕۆژهەلاتیـشدا زۆربـەی سـوڵتانەكانی عوسمانییـەكان، بێئـەوەی ناوی مەكیاڤیللی یا ناوبانگی "میر" یان بیستبی، ئامۆژگارییەكانی ئـەویان بە جۆرێكی شێواو پەیڕەو دەكرد. بۆ نموونە سەلیمی یەكـەم بـە یاریـدەی ئینكیـشارییەكان، لـە سـاڵی ١٥١٢ دا بایەزیـدی دووەمـی بـاوكی لـە سـەر تەخت لاداو وەك كورێكی "وەجاخ روونكەرەوە"، ئەو داخوازییـەی بـاوكی جێبەجێ كرد ماوەی بدا بچی لەو شارە دابنیشی كـە تیایـدا لـە دایـك بـوو

بوو، بگره هینده بۆی "بەوەفا" بوو کە تا ئاستی شوورەی پایتەختی مەملەکەتەکەشی، بەڕێی بکا و ئیتر تەنیا دوای ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ بمری. سەلیم بەوەشەوە نەوەستا بەڵکوو بە بەهانەی زامن کردنیئاسایشی مەملەکەتەکەی، بە ڕەچەڵەکی هەموو برا گەورەکانیو منداڵەکانیاندا چووە خوارەوە هەروەکو بە یەك جەزرەبە چل هەزاری لە شیعەکانی ئەنازۆڵ قەڵاچۆ کرد، دوای ئەوەی فەتوایەکی بەشیخی ئیسلام بۆ سەلماندنی ئەو کارە نەگریسەی دەر کرد. بۆیە سەلیم بە هەقیانەت لەقەبی یاوز واتە سامناك یا تۆقێنەری وەرگرت. هەروەها دەسیسەو پیلان لە لایەن دەستەو دایەرەی ژنانەوە کارێکی وەهای کرد سەلیمی دووەمی مەی خۆری بەدمەست وناشیاوترینی کوڕانی سلێمانی قانوونی،ببێتە میراتگری تەختی پادشایەتیی ئەو باوکەی بە جەدارەتەوە لەقەبی قانوونیی لە ڕۆژهەڵاتدا و مەزنی لە ڕۆژئاوادا لینرا بوو. خۆ مرادی سییەم سفتاحی سەردەمی خۆی بە کوشتنی هەر پێنج براکەی لە ساڵی ١٥٧٤ دا دەسپێکردو کوڕەکەیشی محمدی سییەم "لێهاتووییەکی" گەورەتر لەوی نواند، وەختێك هەر لە ڕۆژی مردنی باوکیدا لە ساڵی ١٥٩٦ دا، فەرمانیدا هەر نۆزدە براکەی بخنکێنرێن و لەیەك کاتیشدا لە تەك باوکیدا لە مزگەوتی ئایاسۆفیادا ناشتنی و کۆڕی تازێشی بۆ سازدان کە بە دەمییەوە نیشانەی دڵگوشراوی و خەفتباری بۆ ئەو "قوربانییە" گەورەیەی لە پێناوی "سەر بڵندی"ی ئیمپراتۆرێتە نەمرەکەدا دابووی بەڕۆکی ڕوخساری بەر نەدەدا.

جا لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە کایەوە کە ئایا لە گشت نووسینەکانی مەکیاڤیللیدا هیچ شتێکی وەهایان تێدایە بەهانەی ڕەوا بۆ ئەم جۆرە

کردەوانـە بهێنێتـەوە کـە کەسـانی تـر هـەوڵیان داوە بەهانـە ئەگـەر بـۆ هەمووشیان نەبی بۆ زۆربەیان بهێننەوە؟

پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە بێنین، پێویستە ئیشارەت بە ڕاستییەکی گرنگی تر بدەین کە پەیوەندی پێوە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لە سەردەمی مەکیاڤیللیدا وڵاتـە ئەوروپاییـەکان یـەکیان دەگـرت و بـە ڕێگـای یەکگرتنـدا گێروگرفتـەکانی خۆیانیـان دەبڕانـدەوە. لـە کاتێکدا گێروگرفتـەکانی ئیتاڵیـا تـا دەهات دەئاڵۆزاو پـەرت بوونەکـەی قـووڵتر دەبـووەوەو ئەمـە مەسـەلەی یەکگرتنـە نەتەوایەتییەکـەی لێـدەکردە تارماییـیەکی ئـەوتۆ کـە لـە ئاسـۆی دووریشدا بەدینەکری. جا هەر توندوتیژیی ئـەو گێروگرفتارانـە بـوو کـە دەبـووە مایـەی توندوتیـژیی شـێوەی چارەسـەرکردن و دەربـڕین لـە لای کەسـێکی وەك مەکیاڤیللی کە وەنەبی تاقـە ڕووناکبیرێکی ئیتاڵیـاییش بـووبی لـەم ڕووەوە لـە هاو وێنە ئەوروپاییەکانی جیاواز بووبی. بۆ نموونـە بـۆ چـوونە سۆشیالیـستییە ئایدیاییـەکانی کامبـانیلا، زۆر لـە بـۆ چـوونەکانی پێـشەنگی ئایـدۆلۆژیای سۆشـیالیزمیئایدیایی تۆمـاس مـۆری ئینگلیـزی شۆڕشـگێڕانەتر بـوو. هـەروەکو هەڵوێستی زانـا و فەیلەسـووفی ئیتاڵیـایی جوردانـۆ برۆنـۆ لـە بـەردەم دادگاکـانی پـشکنیندا، هێنـدە ئازایانـە بـوو کـە وێنـەی لـە لای هـیچ کـام لـە زانـا ئەوروپاییەکانی سەردەمی ڕاپەڕینی وەك کۆبـەرنیکۆس و کەسـانی تـر نـەبوو. ئەو دوای هەشت ساڵ ئازاردانی درِندانەی بەردەوام، لـەڕووی دادگـادا ئـەم قسە نەمرەی کرد: "وادیارە ئێوە بەترسێکی گـەورەترەوە لـە وەی لای مـن دروسـت دەبێ، بڕیارەکەتان دەردەکەن !". لە گشت ئـەوەی باسمـان کـرد بـە ئاشـکرا بۆمان دەردەکـەوێ کـە کڵێسە دڵڕەقانـە دژ بـە مـەکیاڤیللی و بیروباوەڕەکـانی ڕادەوەستا. چونکە ئـەو جەزرەبـە یـەك لـەدوای یەکانـەی لـەو سـەردەمەدا بـەر کڵێسە دەکەوتن، شێوەیەکی پڕ مەترسی تریان لە لای کۆن خوازەکـان دەدا بـە

بیرورا واقعیی یە لە ڕووەکانی مەکیاڤیللی لە چاو بیرورای تردا، بۆیە تەقەلایەکی زۆریان بۆ شێواندنیان دەدا. ئەوان لەپاڵ قەدەغەکردنی کتێبەکانی و سووتاندنی نموونەی جەستەیدا، هەندێ لە کارگێرە ئاینییەکانیش چەندین کتێبیان بۆ هێرش بردنە سەر مەکیاڤیللی دلناو تەرخان بوون بۆ زڕاندنی ناوو شێواندنی بیرو باوەڕەکانی.

سەیریش ئەوەیە حوماسەتی پرۆتستانتەکان بۆ دوژمنایەتی کردنی نیکۆلۆ هیچی لە کاسۆلیکەکان کەمتر نەبوو کە بە "جزویتێکی قیناع پۆش"[٥٩] یان دەدایە قەڵەم، ئەمە لەگەڵ چاوپۆشی کردن لە یەککرتنەوەی تەواویاندا لەو ڕەخنانەی ئاراستەی پاپایەتی یان دەکردن. ئەم هەڵوێستەی پرۆتستانتەکان ئەنجامی چەند ڕەفتارێك بوو کە لەلایەن هەندێ حوکمڕانی مەکیاڤیللیستەوە دەژیان دەکران، وەك لە دواییدا ڕوونی دەکەینەوە. جا ئەو کتێبەگەورەیەی کە گانتێی سەرگەرمی کالڤنیزم لەساڵی ١٥٧٦ دا بە زمانی فەرەنسی بە ناوی "دژی مەکیاڤیللی"[٦٠] یەوە دایناوە، سەرلیستەی ئەو کتێبانەن کە تا ڕادەیەکی زۆر هەر لە وەختێکی زووەوە لە وڵاتە ئەوروپاییەکاندا کاریان کردە سەر ناوو ناوبانگی مەکیاڤیللی[٦١]. ئیتر هەر لە و وەختەشەوە زاراوەی مەکیاڤیللیزم بۆ یەکەمجار سەری هەڵداو بە فراوانی و بە خێرایی لەگەلی مەیدانی ئایدۆلۆژی و سیاسی ی جۆراوجۆرداو لەگەڵیاندا شانۆگەری یە ئەوروپاییەکانیش، دەس کرا بە بەکارهێنانی.

## ٣-شانۆی ئینگلیزی:

شانۆی ئینگلیزی لە سەردەمی ئەلیزابیسدا دەورێکی گەورەی لە زڕاندنی ناوی مەکیاڤیللیدا گێرا، کۆمەڵگای ئینگلیزی یەکەم باری

سـەرنجی دەربـارەی مـەکیاڤیللی و کتێبـەکانی لـە نێـوان ئـەو نوسـینە دژکارانەوە لا دروست بـوو کـە بـە شـێوەیەکی تایبـەتی گـەمارۆی بیروڕاکـانی دووتوێی "میر" یان دەدا، بۆ نموونـە کتێبەکـەی گانتـێ لـە سـاڵی ١٥٧٧ دا کراوە بە ئینگلیـزی، لـە کاتێکدا "دەمەتـەقێ" لـە سـاڵی ١٦٣٦ و "مـیر" لـە ساڵی ١٦٤٠ دا کـراون بـە ئینگلیـزی[٦٢] لـە بـەر ئـەوە ئاسـایی بـوو کەرایەکی نـاواقیعی دەربـارەی نیکۆلـۆو بیروبـاوەڕە سیاسـییەکانی لـەنێو ڕۆشـنبیراندا باوبێ و ئینجا لەشانۆی ئینگلیزیدا بە روونـی ڕەنـگ بداتـەوە و لـە سـەردەمی ئەیلیزابیسی یەکەمدا بگاتە پۆپەی، وەك ئـەوەی لـە ئـەدەبیاتی ئینگلیـزی ی ئەو پلەیەدا، کە ئێستاش بـە فراوانـی بـە چـەندین زمـان بڵاوەدەبنـەوە، ٣٩٥ جار بە ناشایستەیی ئیشارەت بـە مـەکیاڤیللی و بیروڕاکـانی دراوە[٦٣]. لەوانـە شاعیرو شانۆگەری نووسی ناسراو کریستۆفەر مارلۆ (١٥٦٤-١٥٩٣) کـە بـاری سـەرنجی سـەبارەت بـە کڵێسەو هەڵسەنگاندنی ژیـان و ئەندیشە و ئـازار بـە دەس چـاودێرکارییەوە لەگـەڵ مەکیاڤیللیـدا چـۆن یـەك بـوو، لـە شانۆگەرییەکەیدا "جوولەکەی ماڵتە" وێنەیەکی شێواوی سەبارەت بـە نیکۆلـۆ پێشکەش کردوە، بەبێ ئەوەی ڕاستـەوخۆ ئاگاداری بیروباوەڕەکـانی بوویـێ، چـونکە "مـیر" دوای مردنـی ئـەو بەنزیکـەی نیـو سـەدە ئینجـا کـراوە بـە ئینگلیـزی. هـەروەکوو شـانۆگەری نووسـی گـەورەی هاوچـاخی مـارلۆ، شکسـپیریش (١٥٦٤-١٦١٦) هـەروەهای کـردوەو لـە شـانۆگەریی "ژنـانی ویندسوور"دا زاراوەی مەکیاڤیللیزمی بەکارهێناوە، لەکاتێکدا کـە جوتبـونێکی تەواو لە نێوان بیروباوەڕی شکسپیرو مەکیاڤیللیدا هەیە، بە تایبـەتی لـە ڕووی هەڵسەنگاندنی حکـومی (متلـق) وەوە بگـرە بـاری سەرنجیـشیان بەرامبـەر بەمرۆڤ.

گومـانی تێدانیـه کـه ڕای ناشایـستەی ئینگلیزەکـان بەرامبـەر بـه مەکیاڤیللی جێ پەنجەیەکی ئاشکرای بە ڕووخساری ئـەو بیروڕایـەوە جـێ هێشت کەی سەبارەت بەو بووە باو، بەتایبەتی لە ولآتـانی ڕۆژهەلآتـدا کـه پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ ڕۆشنبیریی ئینگلیزیدا پەیدا کردو بەزۆری لەرێگەی ئەوەوە ئاشنای ڕاپەڕین بـوون، هـەروەکوو پـتر لەرێگـەی زمـانی ئینگلیزییەوە شارەزاییان دەربـارەی مێـژووی حوکمڕانـه مەکیاڤیللیـستە ئەورووپاییەکان پەیداکرد.

## ٤- مەکیاڤیللیستەکان:

حوکمڕانە مەکیاڤیللیستەکان دەورێکی ئەو تۆیـان لـە زڕانـدنی نـاوی نیکۆلـۆدا گێـڕاوە کـە لـە خراپیـدا هیـچی لـە دەوری جزویتـەکان کـەمتر نەبووە. چونکە ئەوانە ئەو بابەتەیان لە بیروڕاکانی مەکیاڤیللی هەڵدەبژارد کە بۆیان دەگونجا و ئیتر بەزۆری ئەو مەرجانەیان پشت گوێ دەخستن کە بـۆ کـردارو ڕەفتـاری حوکمڕانـانی دانـابوون. بـۆ نمونـە ژنـە پادشـای فەڕەنسایی و بـە نـەژاد ئیتاڵیـایی کـاترین میدیتـچی، "مـیر"ی بـە کتـێبی پیرۆزی خۆی[٦٤] دادەنا و بەبێ ئـەوەی وەك لەهەڵسوکەوتی خـودی خۆیـو سیاسەتە گشتیەکەیدا دەردەکەوێ، بیروباوەڕەکانی بگرێتـە خـۆی. بـەلآم دڵ مەستییەکەی بەرامبەر مەکیاڤیللی هاندانی بۆ بلآوکردنـەوەی. "مـیر" بەس بوون بۆ لەقەڵەمدانی "لە قەڵەمدانی مەکیاڤیللی" کـە بـەر پرسـیارە لــەو کــارە نەگریــسەی کــاترین کــردی، وەختێــك لەســاڵی ١٥٧٢ دا بەشێوەیەکی نامەردانە، لە شەوێکدا کە پرۆتـستانتە فەڕەنـساییەکان بـە بۆنەیــەکی ئاینیــەوە لــە (ســان برســلۆمیۆ) دا ئاهــەنگیان دەگێــڕا، قەسابخانەیەکی بۆ نانەوە کە ئـەوە بـووە هـۆی هەڵڕشـتنی لێشاوی ڕق و

کینه له لایەن پرۆتـستانتەکانەوە بەسەر مەکیاڤیللیدا ئینجا ئـەوە بـوو دوای ئەو کارەساتە بە تـەنیا پێـنج سالٚ، گانتـێ کتێبەکـەی خـۆی "دژی مەکیاڤیللی"ی دەرکردو تیایـدا نـەك تـەنیا تـاوانی قەسابخانەکەی خستە ئەسـتۆی ئـەو، بـەڵکو بەرامبـەر بـە هـەموو خراپەکارییـەکانی پادشاکانی فەرەنـسا، هنریـی دووەم و شـارلی نۆیـەم و هنریـی سـێیەم بەرپرسیای کرد.(٦٥) هەر وەکوو رەنگە ماکیاڤیللی تاقە قوربـانیی دەسـتی کاسـۆلیکی یەتیش بێ کە پرۆتستانتەکان نەك هـەر پارێزگارییـان لـێ نـەکرد، بـەڵکوو زۆر بەئاسـانی بـەوەش گوناهباریـان کـرد کـە "مامۆسـتای پادشـا کاسۆلیکەکانە"(٦٦) یا پادشای بروسیایی فردریکی گـەورەی بـەناوبانگترین مەکیاڤیللیست، بە حوماسەتێکی ساختەوە دژایەتیی مەکیاڤللییی دەکرد. پێش ئەوەی بێتە سەر حوکم، لـەو نامانـەدا کـە بـۆ ڤـۆڵتێری رووناکبیری فەرەنسایی دەناردن و لەسەر دەستووری پادشاو میرەکانی ئـەورووپا کـە تەقـەلایان دەدا خۆیـان لـە بـەرگێکی گونجـاو لەگـەڵ نـەریت و بـەهای سەردەمی رووناکبیریدا بنـوێنن، هێرشـی دەبـردە سـەر مـەکیاڤیللی. لـەو ساڵەشدا کـە چـووە سـەر تـەختی پادشـایەتی، کتێبێکـی بـەناوی "دژی مـەکیاڤللی"یـەوە(٦٧) دەرکـرد کـە تیایـدا نیکۆلـۆی بـە "پارێزگاریکـەر لـە تاوان" و بەیەکێك لە "ناگەهانییـەکانی شـەیتان"ی(٦٨) نـاو بـرد. هـەروەها فریدریك لە هەمان کتێبدا نووسیویە کەمەکیاڤیللی ئامانجی لـە بیروڕاکـانی دامەزراندنی "حکومەتێکی زۆرداری غەدداری چاوچنۆك" و هەڵگیرساندنی "جەنگی ناعادیلانـە" بـووە. جـا ئەگـەر چـی مـەکیاڤیللی لـە هـیچ یـەکێك لەکتێبەکانیدا بانگی بۆ ئەم جۆرە شتانە ڕانەهێشتوە، بەڵام فردریك خـۆی لەماوەی چل و شەش ساڵ حـوکمڕانی کردنیـدا زۆر لـەوە زیـاتری کـردوەو وەك یـەکێك لەمێـژوو نووسـان ووتـوێتی، هـەر ئـەم جـۆرە شـتانەی بـوو

"کەلەدواییدا فریدریکی گەورەیان کردە پیاوێکی ناو دار".[69] دەبێ ئەوەش بڵێین کە فردریك لە زۆر ڕووەوە لە سیزار بۆرجیاو بە تایبەتی لە پاپا ئەلیکساندەری شەشەمی باوکی دەچوو. ئەو زۆرداریەکەی لە حوکمڕانی کردندا گەیشتە ڕادەیەك ماوەی نەدا هیچ وەزیرێکی هەبن بۆ ئەوەی —وەك لاق لێدەدا— مووچەکانیان بەسەر خەزێنەوە نەبنەبار، کە چی خۆی بەبێ حساب پارەی بۆ دروستکردنی کۆشك و تەلار بۆ خۆیو دەست و پێوەندەکەی سەرف دەکرد. یا لەکاتێکدا کە ناتوانرێ نە لە دوو توێی "میر"و نە لە هیچ کتێبێکی تری نیکۆلۆدا تەنیا یەك جار ستایش کردنی حوکمی تاکەکەسی ببینرێتەوە، کەچی لای فردریك ئەمە گەیشتە ڕادەیەك کە بە تەنیا خۆی سەرپەرشتی ی سەرجەم کاروبارەکانی دەوڵەتی دەکرد و مەیتەرەکەشی بەخوێندنەوەی ئەو نامەو نوسراوانەی بۆی دەهاتن کە لەکاتی بەرەبەیاندا دەیخوێندنەوە یاریدەی دەداو لە سەعات حەوتدا ئەوەی بەڕای خۆی بە پێویستی بزانیایە کە پادشا دەبێ بیانبینێ، بۆی دەکردنە پریاسکەیەکی گەورەو دەیخستنە بەردەمی. یا هەرچەندە مەکیاڤیللی داوای بایەخدانی بە سوپای نیشتمانی دەکرد، بەڵام قەت ئامۆژگاری ی ئەوەی نەکردوە کە میرە نمونەییەکەی ٨٠٪ داهاتی دەوڵەت بۆ کاروباری جەنگ و بەرگری تەرخان بکا وەك فردریکی گەورە دەیکرد. لەڕاستیدا ڕەوانترین وتە دەربارەی کتێبەکەی فردریك ئەوەکەی ڤۆڵتێرە کە وتوویە: ئەگەر مەکیاڤیللی شاگردەمیرێکی،[70] هەبووایە ئەو ئامۆژگارییەی دەدایە کە یەکەم ئەرك و پێویست بێ بەجێی بێنێ، دەبێ دانانی کتێبێك بێ دژی مەکیاڤیللی"[71]. جا بەڕاستی فردریك ناوبانگی خۆی بەم کتێبە دەست پێکردوو ڕەنگیشە بەوە بووبێتە دوا کەسێك کە "مێژوو ماوەی دابێ وێنەی ڕاستگۆیی بشێوێنێ "[72] و بەو

نەگریسییەش. بەڵام ئەوە ئەو ڕاستییە ناشارێتەوە کە فردریک بووە لەوانەی لە چەسپاندنی نەریتێکی ناواقعیدا بەرامبەر بە مێژوونووسی گەورەی سەردەمی ڕاپەڕین بەشدار بووە.

### ٥- لاسایی کردنەوە:

ئەو هێرشە فرلوانەوی لە سەدەی شازدەیەمدا کرایە سەر مەکیاڤیللی، بووە هۆی دروست بوونی باری سەرنجێکی ناشایستە دەربارەی و بەشێوەیەکی نامەوزووعییانە ئەم نەوە بەم نەوەیەی ڕادەگەیاند. زۆریەی ئەوانەی زاراوەی ماکیاڤیللیزم بەکاردەهێنن کتێبەکانی نیکۆلۆیان نەخوێندۆتەوە، یا لە چاکترین حاڵەتدا تەنیا بە خوێندنەوەیەکی ڕووکەشیی "میر"دا کەوتوون کە نەك بچوکترینی کتێبەکانێتی، بەڵکو و نیسبەتێکی زۆر کەمی نووسینەکانی پێکدەهێنێ، ئەمە جگە لەوەی کەتەنانەت "میر" خۆیشی "وەك زانیاری نەك وەك پڕوپاگندە"،[٧٣] پێویستیی بەلێکۆڵینەوەیەکی قوڵی کۆششکارانە هەیەو بگرە هەندێ لەمێژوو نوسان دەڵێن کە "میر" دەبێ لە جارێك زیاتر بخوێنرێتەوە، "یەکەم جار ڕووکەشی کە دەبێتە هۆی –بوغزاندنی– نووسەرەکەی و دوەمجار بەوردی کە نیازو مەبەستی ڕاستەقینەی ڕوون دەکاتەوە".[٧٤] لاسایی کردنەوەی کوێرانەو پشت گوێ خستنی تەواوی کتێبەکانی مەکیاڤیللی، بوونە هۆی ئەوەی خەڵکەکە نەتوانن خۆبەخۆی خۆیان ئاشنای ئەو بیروڕایانە بن کە نیکۆلۆ بە دڵسۆزییەوە بانگی بۆ ڕادەهێشتن. هەر مرۆڤێك ئەگەر هات و بەبێ بوونی فیکرەیەکی حازر بە دەستی پێشکرد لە لای، دەستی کردە خوێندنەوەی "میر" و بە تایبەتی "دەمەتەقێ" ئەوا بەئاسانی دەرك بەوە دەکا کە مەکیاڤیللی جەمهووریەت خوازبووە پتر لەوەی لایەنگری حوکمێکی زۆردارانەی تاکەکەسی بووبێ. ئەو هەر لەسەرپشتی بێشکەوە بە ئاوو هەوایەك پەروەردە بووەو نەشونمای کردوە کە بیروباوەڕی

جەمهوورییەت خوازانەی تێدا باو بووە، چ لە شەقامەکانی شارەکەی فلۆرنسادا بووبیو چ لە ناو چوار دیواری ماڵەوەیدا کە باوەکی و باپیری لە هەرە سوار چاکانی جەمهوورییەت خوازان بوون. هەروەها ئەو بە دڵسۆزییەکی بێپایانەوەو بە باوەڕێکی هۆشیارانەوە، خزمەتی ڕژێمی جەمهووریی لە فلۆرنسادا کردوەو لە هەڵسەنگاندندا بە "حکوومەتیگەل"ی [٧٥] ناو بردوە. تاقیکردنەوەکانی مێژووی دێرینیش وایان فێرکردوە کە بە هێزیو مەزنیی رۆما زیاتر لە هەر شتێکیتر لە رژێمە جەمهوورییەکەیدا بووە، چونکە لە ژێر سێبەریدا، لێهاتوویی نەك میراتگری، ساغی دەکردەوە کە دەبێ کێ هەقی چوونە سەر دەزگای حوکمڕانیکردنی هەبێ. لە بەر ئەوە مەکیاڤیللی بە ئاواتی ژیاندنەوەی ئەو رژێمەوە بوو کە بە "بە روونی" لە "میر" و بەتایبەتی لە "دەمەتەقی"دا دەردەکەوێ وتەنانەت رۆسۆ "میر" بە کتێبی جەمهوورییەت خوازان دادەنێ [٧٦]. مەکیاڤیللی سەرکەوتنی ڕژێمی جەمهووریی بە ڕادەی هۆشیاریی خەڵکەکە و لە خۆگرتنی ڕەوشت و ڕەفتاری چاکەکارانەوە بەستۆتەوە. بەڵام لە حاڵەتی گەندەڵی و بەرەڵڵاییدا وەك لە زۆربەی وڵاتەکانی ئەورووپا و لە سەروویانەوە ئیتاڵیا دا رووی دابوو، مەکیاڤیللی وای دەبینی دەبێ حوکمێکی دکتاتۆرانەی ئەوتۆیان تێدا دابمەزرێنری کە بتوانی ببڕای ببڕ کۆتایی بە گشت شێوەکانی ئەو ئاژاوەگەرییە بهێنێ کە وێرانکاری بە گەل و نیشتمان دەبەخشن. ئەو لەم ڕایەشیدا لە زۆربەی ناودارەکانی تری سەردەمی ڕاپەڕین جیا نەبۆتەوەو لە (منطق)ی مێژوو دەرنەچووە کە لەو پلەیەیدا، سەرهەڵدانی چەندین ڕژێمی حوکمڕانی کردنی (مطلق)ی ئەوتۆی سەپاند کە لە پاشاندا گۆڕانو بەرەو پێشەوەچوونی کۆمەڵگایانی ئەورووپایان کەوتنە ئەستۆ سەرهەڵنەدانی ئەو جۆرە ڕژێمە لە ئیتاڵیادا، بە گرنگترین هۆی دواکەوتن و پەرت پەرت بوون و بێ

هێزەییەکەی لە ڕووی ئەو جۆرە دەوڵەتە ئەوروپاییانەدا دادەنرێ کە سەرکەوتووانەڕژێمی (مطلق) یان تێدا دامەزرێنرابوون.

جا فاشی و نازییەکان دوا کەسانێك بوون کە تەقەلایاندا بیربباوەڕە جەمهوورییەت خوازەکەی مەکیاڤیللی پشت گوێ بخەن و خۆیانی لێ لابدەن.

## ٦- فاشییەت و نازییەت:

فاشییەکانی ئیتاڵیا و نازییەکانی ئەڵمانیاش لە بۆچوونی تەنگەبەری خۆیانەوە بایەخیان بە مەکیاڤیللی داو لەبەر ئەو ڕۆشنایی و بۆ چوونەدا هەوڵیاندا بیروباوەڕەکانی سەر لە نوێ لەچوارچێوەیەکی تەسکی ڕووتدا لە قالب بدەنەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە شکاندنی ئەو تەوقەی ئاڵێنرابووە نیکۆلۆ کۆششێکی زۆرو تێپەربوونی ڕۆژگارێکی دوورو درێژی پێوست کردبوو. ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا چەندین کتێبی نوێ یان دەربارەی مەکیاڤیللی دانا کە بە شێوەیەکی ناڕەوا پێیان لەسەر بیروڕاکانی سەبارەت بە حوکمی (مطلق) دادەگرت و گشت ئەو لایەنانەین پشت گوێ دەخست کە پەیوەندی یان بە بارودۆخی کات و شوێنەوە هەبووە. بۆ نموونە مۆسۆلینی وای داناوە گوایە مەزەبی مەکیاڤیللی سەبارەت بە حوکمی زۆردارانە "ئەمڕۆش و دوای چوارسەدە هێشتا هەر زیندووە".[٧٧] ستایش کردنی مەکیاڤیللی لە لایەن نازیو فاشییەکانەوە گەیشتبووە ڕادەیەك کە هێتلەر کتێبی "میر"ی لە سەر مێزەکەی لەبەر دەستیدا دا نابوو، دەشوترێ هەموو شەوێك پێش نوستن سەر لەنوێ بەشێکی لێدەخوێندەوە. بەلاَم مۆسۆلینی لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی "میر" نووسی و دوکتۆرای پێ وەرگرت. ئەو "میر"ی بە "هاوەڵی هەمیشەیی حوکمڕان دادەنا".

لەگەڵ ئەوەشدا گەلی نووسەری گەلەکەیان دەرکیان بەوە کرد کە ئەو لەخۆگرتنە نامەوزووعییەی بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی لەلایەن نازییەکان و فاشییەکانەوە، بە بارێکی ناشایستەدا کار دەکاتە ناوو ناوبانگی مەکیاڤیللی، بۆیە لە رووی ئەم هەڵوێستەدا ڕاوەستان و لە سالآنی سییەکاندا کەوتنە ڕوونکردنەوەی ئەو لایەنە گەشانەی بیروڕاکانی مەکیاڤیللی کە هیچ شتێك لە گەڵ هەڵوێستەکانی هێتلەر و مۆسۆلینیدا کۆی نەدەکردنەوە.

## کەموکوورپییەکان

گومانی تێدانییە ئەو هۆیانەی نیشانماندان، بۆ زڕاندنی ناووناوبانگی هەر ڕووناکبیرێك لە جیهانداو شێواندنی بیروڕاکانی سەروزیاد بوون. هەروەکو و دەبێ بوترێ کە ئەوانەی تەقەلای زەفەر بردنیان بە مەکیاڤیللی داوە، دەستیان نەخستۆتە سەر کەم و کووڕییە ڕاستەقینەکان و لایەنە لاوازەکانی بیروباوەڕەکانی. ئەو پیاوە، وەك هەریەکێك لە ناودارانی سەردەمی ڕاپەڕین و وەك یەکێك لە نەوەی سەردەمی خۆی، وەنەبێ لە هەموو ئەو کاروبارانەدا کەلی یاندواوە ڕاستی پێکابێ، بە تایبەتی ئەوێك کە لە دەست بۆ بردنی چەند باسێکی ئەوتۆدا پێشەنگ بووە کەلە باسە هەرە ئاڵۆزەکانی بوون.

مەکیاڤیللی لە بیروڕاکانیدا ئایدۆلۆژیای بورجوازییەتی گەشەسەندوی زیادەخوازی دەنواند. ئەو لە نوسینەکانیدا ستایشی بازرگان و پیشەدارە دەس ڕۆیشتووەکانی شارنشینەکانی ئیتاڵیای دەکردو ناوی بەگەل دەبردن (popolo) و داوای لە میرەکەی دەکرد بایەخیان پێ بداو بارودۆخێکی وەهایان بۆ برەخسێنێ کە ببێتە هۆی پەرەپێدانی سوودو مەسلەحەت و خۆشحاڵییان. بەڵام بۆرجوازییەتی ئیتاڵیایی هەر دوای

لەدایك بوونە پێش وەختەکەی بەخێرایی لە نەش و نماکردن کەوت و لە پێش سەردەمی مەکیاڤیللی و لە ڕۆژانی ئەودا، تووشی تەنگ و چەڵەمەیەکی کاریگەر بوو. لە بەر ئەوە هەر بەلاوازی مایەوەو بۆی نەلوا ببێتە ئەو هێزە بەکارەی بتوانێ ئەو ئەرکە گەورانە بەجێ بێنێ کە لە بارودۆخی سەختی ئیتاڵیادا دەکەوتنە ئەستۆی. بۆیە کارێکی ئاسایی بوو ئەوە لە هەندێ بیروڕای سەرگەرمانەی مەکیاڤیللیدا بۆ ڕژێمی پادشایەتی ی (مطلق) ڕەنگبداتەوە کە لە ڕاستیدا جۆرە سات و سەودایەکی لەگەڵ ئایدۆلۆژیای دەرەبەگایەتیدا دەگەیاند، چونکە ئەم ڕژێمە ئەگەرچی دژی بەرەڵلایی دەرەبەگایەتی دەوەستا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر شێوەیەکی بالاتری لە ڕژێمی سیاسیی دەرەبەگایەتی پێکدەهێنا، هەروەکوو ئەو جۆرە حوکمڕانی کردنە هێشتا لە سەردەمی مەکیاڤیللیدا، لایەنە چاکەکانی خۆی لە دەس نەدابوون. بۆیە ئە دووفاقی و ئەم بەر و ئەو بەرکردنەی مەکیاڤیللی لە نێوان ڕژێمی کۆماری و پادشایەتیی (مطلق)دا، لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا نەبی کە باسمان کرد ناتوانری لێکبدرێتەوە. ئینجا هەر ئەم باری سەرنجەیە کە دوژمنایەتی کردنیمان بەرامبەر بە دیموکراتییەت و سڵ کردنەوەیمان لە جەماوەر بۆ لێکدەداتەوە کە بەرای ئەو "بە ئاسانی جڵەو بۆ سەرکێشی شل دەکا" و ناویانی بە "بۆرەپیاو" یا بە "ڕەشۆکی — plobs" دەبرد. بگرەئەو لە نێوان هەڵسەنگاندنی هەندێ لەو ڕاپەڕینە جەماوەرییانەوەی لە ئیتاڵیادا روویان داوە و، هەڵوێستێکیدوژمنانەی (ئاشکرای) بەرامبەر دەربیون و لە ئاکامیدا وا کەوتۆتەوە کە مەکیاڤیللی لە گشت کتێبەکانیدا ڕووی قسە بکاتە میرەکان و دەسەلاتداران و برادەرە ڕووناکبیرەکانی و بۆ ئەوان بنووسی نەك بۆ جەماوەر. (٧٨)

لێرەدا پێویستە ئیشارەت بە دوو راستی بدەین. یەکەمیان ئەوەیە: "ئەو گەلەی مەکیاڤیللی بە جۆش و خرۆشەوە پاریزگاریی لێدەکرد، لەو وەختەدا بریتی بوو لە سی هەزارودوو سەد کەس لە ناو نەوەد هەزار کەسدا کە ژمارەی خەڵکی فلۆرنسایان پێکدەهێنا".(٧٩) دووەمیشیان ئەوەیە کە مەکیاڤیللی خۆی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە یەکێك نەبوو لەوان، بەڵام دەیزانی چ دەورێکی گەورە لە گۆڕینی کۆمەڵدا دەگێڕن، ئەمە جگە لەوەی ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ سۆدیرینیدا هەیبوو کە یەکێك بوو لە دەستەی بورجوازی یەتی گەشە سەندووی فلۆرنسا، کاری خۆی دەکردە سەرئەو هەڵوێستەی بەرامبەریان.

هەروەها مەکیاڤیللی سەبارەت بە نیاز خراپـی ی ئادەمیزاد رایەکی هێگجار بەرچاوتاریکانەی هەبوو. لای ئەو خۆپەرستی بەباری چاك و خراپدا و لە هەر شوێن کاتێکدا بی، هەڵس و کەوتی مرۆڤ هەڵدەسووڕێنێ. ئەو ئەگەرچی دانی بەوەدا دەنا کە گۆڕینی ڕژێم بۆی هەیە کار بکاتە سەر باری سایکۆلۆژیی مرۆڤ، بەڵام ئەوە بە ڕای ئەو لە ئەنجامی ئەو یاسا نوێیانەدا پێکدی کە ئامانجی ڕادەدانان بی بۆ زیادخوازی لە لای خەڵکەکە.

مەکیاڤیللی لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی مێژووییدا گەلی هەنگاوی گرنگی نا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی بۆچوونێکی مێژوویی سەراپایی نەبوو. بۆیە بۆ نموونە لە وزەیدا نەبوو لە گۆڕانی مێژوویی لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکیتر تیبگا و بەلای ئەوەوە ئەو ڕابوردووەی ڕاستییەکانی لە دوو تویی کتێبەکانی مێژوو دەردەکێشان، تا ڕادەیەکی زۆر لەو حازرە دەچوو کە تیایدا دەژیا و دەیناسی. ئیتر لێرەوە مەکیاڤیللی ئەو ڕایەی لا پەیدا بوو گوایە مێژوو جۆرە زنجیرەیەك تاقیکردنەوەی ئەوتۆیە کە دەشی لە

تێگەیشتنی تەبیعەتی ئادەمیزاددا بە شێوەیەکی چاکتر یاریدەی مرۆڤی دانا بدا وەك لەوەی تەنیا پشت بە تاقیکردنەوە و یادگارەکانی شەخسی خۆی ببەستی.

بە هەر حاڵ ئەم لایەنە کووڕانەی بیروباوەڕی مەکیاڤیللی وەك ڕووناکبیرێکی گەورە، لە بایەخی کەم ناکەنەوە و بەتایبەتی ئەگەر لە چوار چێوەی کات و شوێن و هۆیە ڕاستەقینەکانیاندا، نەك ڕووکەشییەکانیان، بە شێوەیەکی دروست هەڵسەنگێنرێن . بۆ نموونە ئەگەر چی هەڵوێستە بەر چاو تاریکییەکەی بەرامبەر سایکۆلۆژیای مرۆڤ هیچ بیانوویەکی بۆ نابینرێتەوە، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ئەو ڕاستییە ناسڕێتەوە کە ئامانجی مەکیاڤیللی خولقاندنی هاوولاتییەکی ئیتاڵیایی نویی نزیك لە کاملییەوە بوو.هەر وەکو و ئەگەر چی هەڵوێستی بەرامبەر بە جەماوەر (سلبی) بوو. بەتایبەتی لە "میر"دا، بەلام لە "دەمەتەقی"دا گەلی بیروڕای گرنگ و نویی لە چاو ئەو سەردەمەدا دەربارەیان پێشکەش کردوە. بە رای ئەو "خەڵکە ڕەشۆکییەکەو میرەکان تەواو چون یەکن، خۆ ئەگەر لە سەرمان پێویست بی لایەکیان زیاتر لەوی تریان پەسەند بکەین ئەوا گومانی تێدا نییە کە تای خەڵکە ڕەشۆکییەکە زاڵ دەبی و، بەلام ئەمە بەندی ڕادەی زۆرو کەمیی ڕێزگرتنیان لەو یاسایانە دەبی کە هەردوو لا لە سایەیدا دەژین". هەروەها لە وتەکانی. "گومانی تێدا نییە کە بەهانەیەکی بەهێز هەیە و خەڵکی وا لێدەکا دەنگی گەل بە دەنگی خودا بشوبهێنن، چونکە رای گشتی لە بەڵگە و ئیشارەت نیشاندانداا هێجگار وردکارە، بۆیە لەوە دەچی هێزێکی نادیار پێشەکی گەل لە هەر خێرو شەڕێك ئاگاداربکا کە لە داهاتوودا تووشیان دی". هەروەها یەکێکی تر لە وتەکانی: "زۆر ڕووداو ئەوەشیان دەرخستوە کە خەڵکە ڕەشۆکییەکە لە

مەسەلەی هەڵبژاردنی کاربەدەستان و ناسینیاندا لە میر چاکترن، چونکە بە هیچ کلۆجی ناتوانری گەل بەوە قایل بکری کەسێك بۆ ئەم جۆرە پایەو پلانە هەڵبژێردری کە بە داوێن پیسی و ڕەوشت و ڕەفتاری گەندەڵ ناسرابی و، لە کاتێکدا میر ڕەنگە قایل ببێ و بگرە زۆر جار بەم جۆرە دامەزراندنە قایل دەبێ" (دەمەتەقێ –کتێبی یەکەم –٥٨) لە هەموو حاڵێکدا پێویستە ئیشارەت بەوە بدەین کە لە حوکمدان بەسەر کەم وکوورپییەکانی مەکیاڤیللیدا، وەك رۆتینبۆرگ بە هەقیانەت سەرنجی داوەتی، نابی "لە کەشکەلانی سەدەی بیستەمەوە" بڕوانرێتە بیروباوەڕە سیاسی و کۆمەڵایەتی یەکانی "بەڵکو و دەبی لە ناو شوورەی قەڵاکانی دەرەبەگەکانی سەدەی شازدەیەمەوە بی.[٨٠] چونکە مەکیاڤیللی سەرتاپای لە قوڕی سەردەمی خۆی دروست کراوە و زانیارییە سیاسییەکەشی، فەلسەفەی ڕۆژگاری خۆی دەنوێنی کە تەقەلای دامەزراندنی پادشایەتییەکی نیشتمانیی (مطلق) ی دەدا".[٨١] دواجار ئەو کەم کوورپیانەی مەکیاڤیلیو هی تریش، لە ڕاستیدا سووکە کەم کوورپین، یا چاکتر وایە بڵێین لە پاڵ ئەو هەموو لایەنە چاکانەی بۆ چوونە فیکرییە قووڵەکانیدا، ئاسایین.

## چەند بۆچوونێکی ئایدۆلۆژیایی تر

تا ئێستا باسی زۆر لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی ی بیروڕاکانی مەکیاڤیللیمان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەلی مەسەلەی گرنگی تر ماون کە بۆ ئەوەی وێنەی نیکۆلۆ وەك ڕووناکبیرێکی لێهاتوو لە زەینی خوێنەرو خاوەن مەبەستدا ناتەواو نەبی، دەهێنی بە نیشاندانێکی خێرا پێش

چاویان بخەین. لێرەدا چاکتر وایە بە شێوەیەکی تایبەتی ئەو دەورەی دووپات بکەینەوە کە لە پێشخستنی زانیاری ی مێژوودا گێراویێتی.

مێژوو سەرلیستەی ئەو زانیارییە مرۆڤایەتییانەیە کە بیروباوەڕی سەردەمی ڕاپەڕین کاری تێکردن. چونکە بایەخدان بە ژیاندنەوەی کەلەپووری کۆن خۆی لە خۆیدا بریتی بوو لە ئاڕاستەکردنی ڕۆشنایی بۆ سەر چەندین لاپەڕەی نەزانراو لە مێژووی سیاسی و ڕۆشنبیریو کۆمەلایەتی و تەنانەت ئابووریی ئەوروپا لە سەردەمی ڕۆمانەکان و گریکەکاندا. هەروەکو دەس کرا بە بایەخدان بە شوێنەوارە کۆنەکانی ڕۆژهەلاتیش بۆیە سەرهەلدانی "Epigraphy لێکۆلینەوەی نەخش و نیگار و هەلکۆلراوە کۆنەکان" وەك شێوازێکی گرنگ لە شێوازەکانی مێژووی کۆن، ڕاستەوخۆ بە سەردەمی ڕاپەڕینەوە دەبەسترێتەوە. بەلام کار تەنیا بەم لایەنە گرنگانەوە نەوەستا، بەلکو جۆرە گۆڕانێکیش بەسەر شێوەی لێکۆلینەوەی مێژوویی و بەسەر باری سەرنجی مێژوونووساندا سەبارەت بە ڕووداو شوێنی تاکەکەس تیایدا، داهات. بۆ نمونە سەرنجێکی ڕەخنەگرانە دەربارەی سەرچاوەو لێکۆلینەوە مێژوویی یە نوسراوەکان پەیدا بوو، بە جۆرێکی کۆششکارانە لە پەردەلادانی سەر ڕووی ئەو لاوازییە زۆرانەدا کە لێکۆلینەوە و لێکدانەوە مێژووییەکان لە سەردەمەکانی پێشتردا تووشی بوو بوون و لە سەلماندنی چەندین ڕاستیی مێژوویی گرنگی ئەو تۆدا کە لە لای خۆیانەوە بوونە هۆی ڕیسواکردنی فیکری دەرەبەگایەتی – کلێسەیی، بەشداری ی کرد. هەروەها لەسەردەمی ڕاپەڕین دا بۆ یەکەمجار مێژو بەسەر کۆن و ناوەنداو نوێدا دابەش کرا هەر لە و سەردەمەشدا گەلی لێکۆلینەوەی مێژوویی لە بابەتێکی تازە پەیدابوون کە کە بەبارێکی ڕێك و پێکی یەکگرتوودا بایەخیان بەکارەساتەکانی نیشتمان دەدا و بە جۆرێکی

گونجاو لەگەڵ هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانیدا کە لە سەرهەڵداندا بوون، کارە پڕ لە شانازییەکانی رابردوو یان دەهێنایەوە یاد. بۆ نموونە گویکاردینی (١٤٨٣-١٥٤٠) یەکەم مێژوونووس بوو لە چوارچێوەیەکی پتەودا لە مێژووی ئیتالیای کۆڵییەوە، بە پێچەوانەی مێژوونووسانی پێشترەوە کە وەها ڕاهاتبوون بەجیاجیا لە حکومەت و ناوچە جۆراوجۆرەکانی بکۆڵنەوە. ئینجا هەر بەهاندانی هەستی نەتەوایەتی، مێژونووسە تازەکان کەوتنە گەڕان بەدوای چارەسەردا بەکردار بۆ گیرگرفتە سیاسییەکانی کۆمەڵگاکانیان و تەقەلادانی زانینی هۆیە ڕاستەقینەکانی ڕووداوە مێژووییەکان. بەم پێی یە ئەوان کاریگەریی "هێزە میتافیزیکییە" کانیان لە خولقاندن و بڕیاردان لەسەر چارەنوسی کارەسات ڕەتکردەوەو دەستیان کردە کۆڵینەوە لە دەوری تاکە کەسی هوشیار (سەرکردەو کەسانی مێژوویی بەناوبانگ) لە ڕەوتی ڕووداوەکاندا. بەڵام تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم لە مێژوونووسانی سەردەمی ڕاپەڕین توانییان لەم ڕادەی لێکدانەوە براگماتییانەیەی مێژوو تێپەڕ بکەن. چونکە پوختەی کاری زۆربەیان بریتی بوو لە گەڕان بە دوای ئەو هۆیە (منطقي)یانەدا کە سەرکردە سیاسییەکان هەڵدەسوڕێنن.

مەکیاڤیللی لەم کۆڕەشدا قووڵ بوونەوەیەکی زیاتری لە کەسانی تر سەلماندو بیروڕاکانی دەورێکی گرنگیان لە پێشخستنی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و تیورییەکانیدا گێڕا، چونکە ئەو لە لێکۆڵینەوەکانیدا لە سنوری لێکدانەوەی براگماتییانەی مێژوو چوو بەودیودا و بە سەرنجێکی واقعییانەی هەڵقوڵاو لە تاقیکردنەوە و شیکردنەوەوە. نەك لە لاهووت و تیۆریی مافی خواوەندی یەوە لە حوکمڕانی کردندا، ڕوانی یە دەوڵەت و یاساکانی و باوەڕیشی بەحەتمی یەتی ڕووداوە مێژووییەکان و بە پەیوەندی لە نێوانیاندا هێنا، بەبێ گوێدانە ئیرادەی ئەوانەی تیایاندا

بەشدار دەبن. هەروەکوو گەیشتە ئەو ڕایەی کە بەیەکدادانی سیاسی بزوێنەری بنچینەیی مێژووەو بەیەکدادانەکەش بەزۆری –وەك لە کتێبەکانیدا باسی کردوە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی و چینایەتی وەردەگرێ، لەبەر ئەو ناکۆکی یە بنج داکوتاوەی لە نێوان سوودو مەسڵەحەتی گەل و چینە موڵکدارەکاندا هەیە. بۆ نمونە لەکتێبە گەورەکەیدا "مێژووی فلۆرەنسا" بە درێژایی کاروانی مێژووی ئیتاڵیا شوێن پێی خەباتی نێوان جەماوەرو ئەرستۆکراتییەکان هەڵدەگرێ. لێرەوە، واتە لەنێوان گەڕانییەوە بە دوای هۆیە بزوێنەرەکانی ڕووداوە مێژوویی کاندا و بەبێ گوێ دانە ئیرادەی ڕووتی کەسان، مەکیاڤیللی لە مێژوونوسەکانی سەردەمی ڕاپەڕینی تێپەڕاند و پێشیان کەوت. خۆ ئەگەر زانیمان مەکیاڤیللی وەك سیاسییەك دەربارەی مێژووی نووسیوە نەك وەك مێژوو نووسێك، ئەوا ئەم کارەی بایەخێکی گەورەتر وەردەگرێ، چونکە ئەو وەهای لەمێژوو دەخواست خزمەتی سیاسەت وەك زانیارییەك بکا، بۆیە ئەو بەو بارەدا بایەخی بە گێڕانەوەی ڕووداوەکان داوە کە دەرس و بیروباوەڕی لێ هەڵهێنجێ.(٨٢) مەکیاڤیللی گەلێ بیروڕای سیاسی و کۆمەڵایەتی ی بەنرخی تری لەبارەی یاسا و دیموکراتییەت و لەبارەی سیاسییەکانەوە چ لەسەرکەوتن و چ لە ژێرکەوتنداو دەوری بەخت لە دەستنیشانکردنی چارەنووسی کارەسات و کەسان و هی تری لەم بابەتە هەن. ئەو لە هەموو لێکۆڵینەوەکانیدا هەوڵدەدا بە دیوی ئەو دیوی نهێنییەکان و شتە نەبینراوەکاندا شۆڕببێتەوەو لە زۆربەی جاریشدا دەگاتە بنەوەیان و شتی نویو چاك لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە. جا داخۆ هیچ دەربڕینێك لەوە قووڵترو وردتر و واقیعیتر هەیە وەختی لە "هونەری جەنگ"دا لە سەرکەوتن و ژێرکەوتن دەدوێو دەڵێ: "سەرکەوتن

شـوێنەواری ژێرکـەوتووترین کـردار دەسـڕێتەوە، لـە کاتێکـدا ژێرکـەوتن ڕێکوپێکترین نەخشەو پلان لەبار دەبا".

بەم جۆرە نێکۆلۆ لە زۆر شتدا لە کەسانیتر جودا بـوو. هـەروەکو دوا شاکرداری ئەو تاقیکردنـەوە گەورەیـە بـوو لـە ژیانیـدا کـە سـەرکەوتووانە بردییە سەرو بووە بەڵگەیەکی لەڕووخەری ڕەسـەن بـۆ هەڵسەنگاندنی کـە زۆر بە داخەوە لە لایەن مێژوونووسانەوە هەقی خۆی نەدراوەتی.(٨٣)

## تاقیکردنەوەکە

مەکیاڤیللی وەختی وڵاتەکەی تووشی پەلاماردانێکی نۆیی بێگانە بـوو، تەمەنی لە پەنجا پێنج تێپەڕی کردبوو. لە بیستەکانی سەدەی شـازدەیەمدا جەنگـەکانی ئیتاڵیـا ( ١٤٩٤-١٥٥٩ ) کـە لـە نێـوان ئیـسپانیاو ئیتاڵیـادا دەکران، بە سەرهەڵدانی پادشای زیادەخوازی ئیسپانیایی شارلی یەکەم کـە چـاوی بڕیبـووە دامەزرانـدنی ئیمپراتـۆرێتێکی مەسـیحیانەی یـەکگرتوو، چوونە پلەیەکی سەختەوەو پاپا و فلۆرنساییەکان ناچاربوون بـۆ بـەرگرتن لـەو مەترسـییەی بـەر دەرگـای پیگرتبـوون، دەس بخەنـە نـاو دەسـتی فەڕەنساییەکانەوە. بەڵام فەڕەنساییەکان لەو شەڕە یەکلایی کەرەوەیـەدا کـە لـە شوباتی ١٥٢٥ دا ڕوویـدا، لـە بـەردەم لەشـکری ئیسپانیادا خۆیـان ڕانـەگرت و فرانـسۆی یەکـەمی پادشـای فەڕەنـسا لەلایـەن هێزەکـانی ئیسپانیاوە بەدیل گیراو بەوە دەرگای خاکی ئیتاڵیا لە بەردەم ئەو هێزانـەدا کەوتە سەرپشت. جا ئالەم وەختە ناسکەدا ژمارەیەکی کـەم لـە دڵسۆزترین نیشتمانپەروەرانی ئیتاڵیـا، ڕێگـای بـەرگری کردنیـان بـۆ پارێزگـاریکردن لـە کەرامەتی وڵاتەکەیان هەڵبژارد کە مەکیاڤیللی یەکێك بوو لە هەرە دیارترینی ئەو قارەمانانە.

گشت هەڵوێستە جۆراو جۆرەکانی مەکیاڤیللی لەو ڕۆژە سەختانەدا، شایەتی بۆ دەدەن کە چ نیشتمانپەروەرێکی راستگۆو ئازایەکی دەگمەن بووە. چونکە لە کاتێکدا کە دوودڵی زەفەری بە دەروونی زۆربە دەبرد لەگەڵیاندا پاپا خۆیشی، مەکیاڤیللی بەردەوام کڵپەیەك بوو لە جۆش و خرۆش وپیی لەسەر پێوستیی بەرگری کردن دادەگرت و پاپا کلیمەنتی حەوتەمی هاندەدا کە ئەرکی پڕ لە شەرافتمەندیی خۆی بەجی بێنی. هەروەکوو کەوتەهات و چۆکردن لەم لا بۆ ئەو لاو لەم شوێن بۆ ئەو شوێن و نووسینی نامەی یەك بە دوای یەکداو پەیوەندی کردن بە کاربەدەستانەوەو هەوڵدانی قایل کردنیان بە بی بێزاربوون یا بی ئەوەی نەخۆشییەکەی ڕێگەی پی بگری. بەڵی.. وەك خۆی وتوویە، هەموو شتێکی فەرامۆش کردوەو تەنیا بیری لە یەك شتِ کردۆتەوە: "ڕزگار کردنی وڵات و زامنکردنی سەربەستی یەکەی". [٨٤] هەر لەو ڕۆژانەشدا دوو پرۆژەی خستە بەردەم پاپا، یەکەمیان دەربارەی قەڵابەنکردنی فلۆرنسا و دووەمیشیان دامەزراندنی سوپایەکی میللی لە تۆسکانیاو ناوچەکانی سەر بەپاپادا.

چەندە مەترسییەکە زیاتر ببووایەتەوە چالاکیو بیئارامی لای نیکۆلۆ پتر پەرەی دەسەند. کەوتە بەسەرکردنەوەی دۆست وبرادەرانی و پرس و راکردن بە ڕووناکبیران. هەر وەکوو بەو پەڕی چالاکییەوەو بەبی ئەوەی بە هۆی هەڵوێستی بەزیوانەی زمان درێژەکانی پێشوەوە ساردو سڕی ڕووی تێبکا. بەشداری بەهێزکردنی قایمکاری ی فلۆرنسای دەکرد. ئەو ڕۆژانە لەکاتێکدا زۆربەی ئەو کەسانە بۆ خۆدەربازکردن مەسەلەکەیان بە وەزعی فەڕەنساوە دەبەستەوە، مەکیاڤیللی زۆر لەڕوو ڕای خۆی دەربڕیو وتی: "من باوەڕم وایە ئەرکی سەرشانمانە کە بەبێ چاوەڕوانکردنی بڕیاری فەڕەنسا و بەبێ هیچ دواکەوتنێك ئێمە خۆمان پڕچەك بکەین". [٨٥]

نیکۆلـۆ بـە هـەموو ئـەو شـتانەوە نەوەسـتا، بـەڵکوو پرۆگرامێکـی گونجاوی لەگەڵ پێداویستیەکانی ئەو وەختـەدا دانـا "کە دەبـوو بڕیـاری ئازایانەی نائاسایی و سەیری تێدا بدرێ".[٨٦] لێرەدا بە دڵسۆزییەوە بـەبێ هیچ مەرایی کردنێك بە دوای ئەو "میرە نوێیە"دا کەواتـە گـەڕان کـە ئـەو ئەرکە گرنگ و پیرۆزو سەختە بگرێتە ئەستۆ و "هەم بۆ دۆست و هـەم بـۆ دوژمنانی دەربخـا کـە ئیتاڵیـا بـۆ پارێزگـاری کـردن لـە سـەربڵندیی خـۆی لەوپەڕی ئامادەبووندایە. تەنانەت پاپا خۆی دانی بەئازایـەتی نەخـشەکەی مەکیاڤیللیـدا نـاو کەچـی دوودڵـی یەکـەی و چـەند هۆیـەکیتر، نەیانهێـشت بڕیـاری بـبڕای ببڕیـدا. لەگـەڵ ئەوەشـدا گـشت ئەمانـە ورەیـان بـە ڕۆڵـەی بەوەفای ئیتاڵیا بەرنەدا، نیشتمان لە مەترسیدایەو "ئەو لەسەری پێویـستە تەواوی خودی خۆی پێ ببەخشی"، بەڵام گەلحۆیی حوکمڕانەکان و ڕاڕایی و کورت بینییان بـووە هـۆی نەچـوونە بـەر مەیـدان. بۆ وێنـە لـە کاتێکـدا ئیسپانیای دوژمن لەولاوە هەلی لە دەس خۆی نەدەداو بە خاکی ئیتاڵیـادا بەرەو پێش ملی دەناو پێشەنگەکانی لە فلۆرنسا نزیك دەبوونەوە، ترس و سام زەفەری بە دڵی نیکۆلۆی ئازا نەدەبرد، بـەڵکو دەسـتی کـردە دانـانی نەخشەیەکی ئازایانەی نوێ کە بریتی بوو لە هێرش بردنێکی خێرا بۆ سـەر ناپۆلی و بەدیل گرتنی جێگری پادشای ئیسپانیا لەشارەکەداو چـەککردنی دەسـت و پێوەنـدو لایـەنگرانی و ئینجـا لـەوێوە تـەنگ بـە ئیـسپانیاییکان هەڵبچنرێ. بەڵام پاپا ئەم پرۆژەیەشی ڕەتکـردەوەو ئـەوەبوو لـە دواییـدا زۆر کـەوت لەسـەری، چـونکە بۆمبیـۆ کالۆنـای دوژمـنی بـە یاریـدەی سەربازەئیسپانیایی یەکان کە ڤاتیکانیان تالان کـرد، چـووە نـاو ڕۆمـاوەو کلیمەنتی حەوتەمیش زۆر بەزەحمەت توانی خۆی دەرباز بکـا. ئـیتر ئـەوە

دوا هەنگاوی ڕێگا خۆشکردنی بوو بۆ ژێرکەوتنە کوشندەکەی ساڵی دوایی تر.

مەکیاڤیللی بەوەش هەر کۆڵی نەدا لە کاتێکدا کەسانی تر پاشەکشەیان لێدەکردو خۆیانیان لە بازاڕی کۆیلەفرۆشیدا بە نرخێکی هەرزان هەڕاج دەکرد، ئەو ڕابوردووی پڕ لە جەخارو پیرێتی و نەخۆشی و خاوو خێزانی فەرامۆش کردن و بە جۆش و خرۆشی لاوییەوە لەنێوان فلۆرنساو کۆڕی شەڕدا کەوتە هاتن و چوون و پەیوەندی بەم و بەوەوە دەکردو هانی دەدان و نامە لە دوای نامەی بۆ برادەرانی و خاوەن بیروڕا دەنووسی و لە هەموو ئەو کردارانەشیدا سوور بوو لەسەر وتەکەی خۆی: نیشتمان لەمەترسیدایەو دەبێ تەواوی خودی خۆی پێ ببەخشێ — خەباتکردن تا دواهەناسەو قەت کۆڵنەدان!. "گەردەلوولەکە سەرکێشانە هەڵی کردوە، بەلام کەشتی یەکە دەبێ زەریا بداتە پێش" نیکۆلۆ، لەوەختێکدا کە لە شکری دوژمن نزیك دەبووەوە و هەر نزیك دەبووەوە. بەم شێوە دلگیرە واقیعی حالی دەنواندو هەلۆێستی خۆی دەردەبڕی.(٨٧) خۆ ئەگەر هیچ دەرفەتێکیش لە بەردەم ئیتالیاییەکاندا نەما، ئەوا لەسەر یان پێویستە وەك پێی لەسەر دادەگرت — بەسەر بەرزیەوە ڕوو لە ئاشتی بکەن، نەك بە خۆ بەدەستەوەدانێکی زەلیلانەوە. ئینجا لێرەشدا هەمدیسان دەبێ میرێکی نوێ لە کایەدا بێ کە بزانێ چۆن شەڕ یان ئاشتی هەڵدەبژێرێ. لە مەوە بەئاشکرا دەردەکەوێ کە مەکیاڤیللی وەك ڕووناکبیرێکی ڕەسەن تیۆری و کردارپێکردنی پێکەوە بەند کردوون. چونکە گشت کردارو ڕەفتارەکانی ڕۆژانی ئەو تاقیکردنەوە سەختەی، لەگەڵ گرنگترینی ئەو بیروڕایانەیدا دەگونجێن کە لە دوا بەشی "میر"دا وتراون و بەگەرمی هانی "ئازادکردنی ئیتالیا لە

وەحشییەکان" دەدەن و هیوایەکی دڵسۆزانە دەخوازن کە "خودا یەکێك بۆ رزگارکردنی تەرخان بکا" (میر –بەشی بیست و شەشەم).

مەکیاڤیللی ئا بەم جۆرە بوو، هەروەکو تا دوایی‌یش هەر بەم جۆرە مایەوە. لە رۆژانێکدا کە هاوتاکانی شەوانیان لەسەر مێزی خواردنەوە بەسەر دەبردو "بیناکاری" و "رووخاندنیان" لە هەوادا دەسازاند و پیشەیان گومان کردن بوو لە هەڵوێستی دڵسۆزترین و بەشەرەفترین کەسێك لە ریزی خەڵکەکەدا، مەکیاڤیللی رووبەرووی مەرگ دەوەستایەوەو لە پێناوی ئیتاڵیادا بیرو هۆشی خۆی ئاگر دەداو جەستەی خۆی دەپرووکاند، چونکە لەو خۆشەویستییەیدا بەرامبەری دڵسۆز بوو. بۆیە هەر لەو ساتانەدا بەهرەی بلیمەتییەکەی، ئەو وتە بەناوبانگەی لێوەشایەوە کە دەڵێ: "خۆشەویستم بۆ گیانی خۆم لە خوار خۆشەویستیمەوەیە بۆ نیشتمانەکەم".[88] چالاکی و کۆششی ئەو "پێغەمبەر بێ دەسەڵاتە"و[89] ئەوانەی لە دڵسۆزیدا هاوشانی بوون، بەفیڕۆچوو. رۆما خۆی بەدەستەوەداو نیکۆلۆش دوای ئەوەی بە دڵسۆزی یەوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێنا. هیچ چارێکی نەماگەڕانەوە نەبێ بۆ گوندەکەی. تا دوا رۆژانی تەمەنیتێدا بەسەر بەرێ[90] بەو هەڵوێستە نەگۆڕو ئاشکراو دوورەی لە مەراییکردن و لاف لێدان و بەو چالاکی یە لە رادە بەدەرەی لە سەخترین و ستەمترین وەزعدا. جارێکی تر بیسەلمێنێ کە نیکۆلۆ دی بیرناردۆ مەکیاڤیللی کێیەو کێ نیە. بەلام ئەی ئاخۆ هەڵوێستی ئەو حوسوودیپی بەرە بیبایەخانەی مەکیاڤیللی کە لە بەرزاییەوە دەیانڕوانییە وەزعەکە بۆ ئەوەی لە ساتی خۆیدا بدەنە پال لایەنی سەرکەوتوو لەم رووەوە چۆن بوو؟!... ئەوانە سەبارەت بە هەڵوێستەکانی ئەم نیشتمان پەروەرە رەسەنە، بە گیانێکی هەلپەرستانەی نامەردانەوە

کەوتنە بڵاوکردنەوەی گومانێکی نا بەجیو هەوڵیان دەدا لەو وەزیفەیە دوور بخرێتەوە کە پێش کارەساتەکانی دوایین بە دەستەوە بوو بیدریتی.

هەروەها پرسیارێکی تریش بە ئیلحاحەوە خۆی دەسەپێنیو دەڵێ: ئەگەر ئەمە ڕەوتی مەکیاڤیللی و بلیمەتییەکەی بووبی، چۆن دەشی ئەقلمان بیگری کە گوایە جەنابی مەوزوعییەت خوازەکان لە خواپیاوان، تیی نەگەیشتوون و وەك پێویستە بۆیان هەڵنەسەنگێنراوە؟... بەڵام ئاخۆ مەسەلە وەها بووە؟!

# باڵاترین هەڵسەنگاندن

یەکێك لە یاسا هەرە گەشەکانی ژیان ئەوەیە کە ناتوانری ڕاستی بۆ هەتایە حەشار بدریو کاریش لەگەڵ مەکیاڤیللیدا هەروەها کەوتەوە. هەموو ئەو کۆشش و تەقەلادانی شێواندنەی کران، هەر لە سەرتاوە لەوە دەستەوستان تر بوون کە بتوانن ڕووی ڕاستەقینەی ئەم ڕووناکبیرە لەو فەیلەسووف و زاناو خەڵکە مەوزوعییەت خوازە حەشار بدەن کە نووسینەکانی ئەویان خوێندبووەوە. لە ڕاستییشدا کەم ڕووی داوە ڕووناکبیرێکی گەورە ناوی مەکیاڤیللیی بردبی و مەدح و ستایشی نەکردبی. بۆ نموونە فەیلەسووف و زاناو کارگێڕی ناسراوی دەوڵەت فرانسیس بیکۆنی ئینگلیزی (١٥٦١-١٦٢٦)، بە وردی کتێبەکانی مەکیاڤیللیی خوێندوونەتەوەو لە ڕێبازە(أستقرائی) یەکەیدا، کەوتۆ تە ژێر کاری ئەو بیروڕایانەوەی تیایاندا پێش چاوی کەوتوون و بە تەواوی لە بابەتێکی نۆی بوون.[٩١] هەروەکوو بیکۆن یەکەم کەس بووە دەرکی بەوە کردوە کە مەکیاڤیللی بە جۆرێك لە کەسان دواوە وەك لە واقیعدا هەن. نەك وەك لە خەیاڵدا هەن و لەم بارەیەوە نووسیویە دەڵی: "ئێمە دەبی

سوپاسی مەکیاڤیللی و گشت نووسەرانی وەك ئەو بکەین کە بە ڕاست و ڕەوان و بەبی دروستکاری، وێنەی کردارو ڕەفتاری خەڵکەکەیان بە باری ئاساییدا نواندوە نەك بەو بارەدا کە دەبی[٩٢] هەبی).

هەروەها لە گەرمەی شاڵاوی بەرپەرچدانەوەی مەکیاڤیللیدا،[٩٣] ژمارەیەك لە نووسەران لە بیروباوەڕەکانی دواون و زۆر بە ڕێزلێنانەوە هەڵیاسەنگاندوون. بۆ نموونە لیپسمۆس لە کتێبەکەیدا "کتێبە سیاسییەکان" کە لە ساڵی ١٥٩٠دا بڵاوی کردۆتەوە، بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللیی دەربارەی ئایین و سیاسەت و دەوڵەت نیشانداون. لە ساڵی (١٦١٣)شداك. شۆپی لە بیروڕاکانی مەکیاڤیللی سەبارەت بە پێوستیی جیاکردنەوەی کاروباری سیاسەت لە چاکەکاری دواوە. دوای ئەویش بە بیست ساڵ جبرائیل نۆدی باسی ڕێبازی سیاسیی مەکیاڤیللی کردوەو ڕوونیکردۆتەوە کە ئەو بە دوای میرێکی شەڕانیدا نەگەڕاوە، بەڵکوو وێڵی دوای حوکمڕانێکی سەرکەوتووی لە بابەتێکی نویی ئەوتۆ بووە کە نیشتمان پێوستی پیی بووە[٩٤].

هەروەها دیکارتی فەیلەسووف و زانای ناسراوی ماتماتیك( ١٥٩٦ – ١٦٥٠) یەکێکە لە یەکەمینی ئەو ڕووناکبیرانەی مەکیاڤیللی کاری تێکردوون و ئەو ڕایەشی سەبارەت بە کردارە عادیلانەکانی حوکمڕان لە ڕژێمێکی (مطلق)ی کراوەدا داڕشتوە، بە تەئسیری بیرباوەڕەکانی مەکیاڤیللی بووە. ئەم پێش فەیلەسووفی ئینگلیزی تۆماس هۆبس (١٥٨٨–١٦٧٩) بە ماوەیەکی زۆر، گەیشتە دەسنیشانکردنی دەوری خۆپەرستی و زیادەخوازیی تاکە کەسی و حەزکردنی و پارێزگاریکردن لە خودی خۆی لە مەسەلەی دامەزراندنی هەر حکومەتێکداو[٩٥] ئەوە جی پەنجەی بە ڕووی فیکری ئەو فەیلەسووفە ئینگلیزییەوە دیارو ئاشکرایە. جۆن لووکیش (١٦٣٢–١٧٠٤)

فەیلەسووفێکی ئینگلیزییترەو هەندی لە بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی کاریان تێ کردوە. خۆ ئەگەر هەڵوێستی ئەدەبی ئینگلیزی بەرامبەر بە نیکۆلۆو زراندنی ناوی بە فراوانی لە ئینگلتەرەدا بێننەوە یاد، تێدەگەین کە هەڵسەنگاندنەکانی ئەو فەیلەسووفانەی بە سەرنجی وردوتیژیان، پەنجەیان ناوەتە سەر گیانی نووسینەکانی مەکیاڤیللی و گشت ئەو ئامانجە دوورانەی تیایاندا وترابوون، چ بایەخێکی گەورەیان هەبووە.

هەروەها دیارترینی فەیلەسووف و ڕووناکبیرانی سەردەمی ڕاپەڕین و بزووتنی گیانی نەتەوەیی ئەورووپاییستایشیان کردوە، لەوانە نووسەرو مێژوونووس و فەیلەسووفی فەرەنسایی ڤۆڵتێر (١٦٩٤-١٧٧٨)و ئەنسکلۆپیدیاییی ناسراو دیدرۆ (١٧١٣-١٧٨٤) و فەیلەسوف و نووسەرو مۆسیقازان فەرەنسایی جان جاك ڕۆسۆ (١٧١٢-١٧٧٨ ) و شاعیر و ڕووناکبیرو پێشەنگی نەتەوەخوازی لە ئەڵەمانیادا گۆتە (١٧٤٩-١٨٢٠)، هەروەکو و هیگلیش شایەتی بۆ بلیمەتیی ئەو داوە، جا یەکەمیان کە دەیزانی چۆن دڵی پادشایان ڕازی دەکا،[٩٦] فردریکی گەورەی بۆ دانانی کتێبەکەی دەربارەی مەکیاڤیللی هان دا، دوای ئەوەی لەو نامە تیبەتیانەدا کە بۆی دەناردن ستایشی دەکرد، چونکە دەیزانی کە کتێبێك لەو بابەتە چ ناوبانگێك بۆ هاوڕێ پادشا ئەڵەمانیاییەکەی پەیدا دەکا. بەڵام ڕۆسۆ بە قووڵی مەکیاڤیللیی هەڵسەنگاندوەو لە بەناوبانگترینی کتێبەکانیدا "پەیمانی کۆمەڵکاری" "العهد الاجتماعی" (جزمی سێیەم - بەشی شەشەم) و توویە: "مەکیاڤیللی وای نیشاندەدا کە گوایە دەرسی پادشایان دادەدا، لە کاتێکدا گەلی دەرسی بەهاداری پێشکەش بە گەلان دەکرد "میر" کتێبی جەمهوورییەت خوازانە و ئەوەیشی بۆ قارەمانە چارەگرانەکەی هەڵبژاردوە، بە ئاشکرا نیازی شاراوەی نووسەرەکەی نیشاندەدا. هەروەها قەدەغەکردنی

بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی لە لایەن دەربارەی ڕۆماوە مەغزای خۆی دەبەخشێ، چونکە دانەر بەبێ پێچ و پەنا وەسفی ئەو دەربارە دەکا".

هەردوو دامەزرێنەری سۆشیالیزمیی زانستانە کارل مارکس و فردریك ئینگلس، لە جارێك زیاتر بە جوانی بیروباوەڕی مەکیاڤیللی یان هەڵسەنگاندوە. مارکس بە وردیکتێبەکانی خوێندونەتەوەو بەتایبەتی "دەمەتەقێ" کە زانیارییەکی زۆری سەبارەت بە سەردارانی فلۆرنسا و ڤینیسیا[٩٧] لی وەرگرتوە. لە نامەیەکیشیدا بۆ ئینگلس "میر"ی بە "کتێبێکی نایاب" ناوبردوە، چونکە دانەرەکەی یەکێك بووە لەوانەی "لە چاوی مرۆڤەوە ڕوانیویانەتە دەوڵەت و یاساکانییان لە ئەقڵ و تاقیکردنەوەوە ئەنجام داوە نەك لە لاهووتەوە"[٩٨].

ئینگلیزیش لەقەبی "فیلەتەنەکانی ڕاپەڕین"ی بەچوار لە دیارترین و مەزنترین ناودارانی سەردەمی ڕاپەڕین بەخشیوە کە بریتین لە وێنەکێشی ئیتاڵیایی نەمر لیۆناردۆ داڤینشی و چاکە خوازی ئاینی گەورە مارتن لۆسەرو مەزنترین وێنەکێشی ئەو سەردەمەی ئەڵمانیا ئۆلبرێشت دوورەر (Durer) و لەگەڵیاندا مەکیاڤیللیش، چونکە ڕاپەڕین هەم پێویستی بە "فیلەتەن" بوو، هەم فیلەتەنیشی دەخولقاند". هەروەکو و کتێبی "هونەری جەنگ"ی زۆر لاپەسەند بووە کە ناوی بە "مارسیلیزی سەدەی شازدەیەم دەبرد"، لەبەر ئەوەی مەکیاڤیللی بەلای ئەوەوە "یەکەم نووسەری جەنگ ئامێزی سەردەمی نوێیە کە شیاوی نابردن بێ"[١٠٠].

لەم سەردەمەشماندا[١٠١] دەیەها و بگرە سەدەها لە ڕووناکبیرو مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکان بە چاوی ڕێزەوە ڕوانیویانەتە بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی و چەندین توێژینەوەو نامەی زانستانەیان بۆ لێکۆڵینەوەیان تەرخان کردوون کە دوایکورتە دووانێك لەو سیاسییانەی نوسینەکانی

مـەكياڤيللى كـارى تێكـردوون، لەگـەڵ هەنـدێ بـاس و خـوازى تريـشدا دەگەڕێینەوە سەر درێژەى هەندێكيان.

## حوكمڕانان و مەكياڤيللى

ژمارەيەكى زۆر لە حوكمڕانانى ئەوروپا و غەيرى ئـەوروپا كەوتونەتـە ژێـر تەئـسيرى بيروڕاكـانى مـەكياڤيللى يـەوە، بەتايبـەتى ئـەوەكانى دوو توێى "مير". ئەم ژێر تەئسيركەوتنەشيان لە بارودۆخێكى جۆراوجۆرو لـە ڕوانگەو بۆچونێكى جياجياوە بووە. بـەڵام لـە هـەموو حاڵەتێكدا زۆربـەى ئەم حوكمڕانانە ئەو بابەتەيان لـە بيروڕاكـانى مـەكياڤيللى هەڵبـژاردوە كـە بۆيان لە بار بووە، دەنا زۆر ئاسايى ئـەو هـەموو مـەرج و پێوانـە زۆرەيـان دەخستە پشت گوێ كـە نيكۆلـۆ بـە حوماسـەتەوە و بـە ئيمـانێكى بـبڕاى ببڕەوە پىێ لەسەر دادەگرتن كە لە ڕاستيدا ئائەمەيانە مەكياڤيلليزم.

لە يەكەمينى ئەو حوكمڕانە ئەورووپاييانـەى مـەكياڤيللى كـارى تێكـردن، پادشـاى ئيـسپانيا شـارلى يەكـەم (١٥٠٨–١٥٥٨) بـوو كـە يەكـەم حـوكمڕانى ئـەوروپايى بـوو دەربـارەى دەوتـرا "ڕۆژ لـە مەملەكەتـەكانى ئـاوا نـابى". ئـەو ئەگەرچـى سـەر گـەرمى كڵێـسەى كاسـۆليكيو پارێزگـارى لێكردنـى بـوو، بـەڵام خۆيـو وەزيرەكانيـشى هـانى بڵاوكردنـەوەى "مـير"يـان لـە ئيـسپانيادا دەدا. هەروەها تۆماس كرۆمۆيل (١٤٨٥–١٥٤٠) كە لە سـەردەمى هينريـى هەشـتەمدا سياسـييەكى ئينگليزيـى گـەورە بـوو، زۆر ئاشـناى بيروباوەڕەكـانى دووتـوێى "مير" بوو، بۆيە دانەيـەكى دەسنووسـى لـى دەسـگير خـست و بـەوە ياريـدەى پادشاكەى خۆيدا حوكمێكى (مطلق)ى ئـەوتۆ دابمـەزرێنى كـە خـۆى لـە دواييـدا بووە يەكێك لە قوربانييەكانى. هەروەكوو لـە كـاتى كوشـتنى هـەر دوو پادشـاى فەڕەنسا هينريى سييەم و هينريى چوارەمدا، ئـەو كتێبـەيان لەگيرفانـدا بينـرا.

ئەلیزابیسی یەکەمیش (١٥٥٨–١٦٠٣) کە لە سەردەمی بنەماڵەی تیۆدۆردا یەکێك بوو لە مەزنترین حوکمڕانەکانی ئینگلتەرەو گەلی سەرکەوتنی بەرچاویشی لەناوەوەو دەرەوەیدا بەدی هێناو دەیویست لە پەیوەندییەکانیدا هەردەم لەنگەرگیربێ، لە ژێر تەئسیری ئەو کتێبەدا بوو. بەلأم خۆ یەکە وەزیری فەڕەنسایی ڕیشیلیۆ کە بە سەرکەوتووترین سیاسیی نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەیەم لە ئەوروپادا دادەنری، مەکیاڤیللیی هێجگار بە دڵ بووەو لە وەسێتە سیاسییەکەیدا دانی بەوەدا ناوە کە پشتی بە بیروڕاکانی مەکیاڤیللی بەستوە. هەروەها ناپلیۆن پۆناپارت ئاشنایەتیی لەگەڵ کتێبی "میر" و "دەمەتەقی"دا هەبووەو سەرلیستەی ئەو پەسندترین هەزار کتێبە بوون کە هەڵیبژاردوون بیانکاتە کتێبخانەیەکی گەڕۆك بۆ خۆیو گەلی پەراوێزی لەسەر "میر" هەن و وایش زەن دەکری کە وەری گێڕابێتە سەر زمانەکەی خۆی. هەروەکوو هۆگریی ناپلیۆنی سییەم بۆ بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی هیچی لەوەی پێش خۆی کەمتر نەبووە. لە باسەکانی لەوەبەریشماندا ئیشارەتمان بە ژمارەیەکیتر لەو حوکمڕانانەدا کە مەکیاڤیللی کاریتیکردبوون و هەوڵیان دابوو ئامۆژگارییەکانی لە خاکێکی غەیری خاکی ئیتاڵیای سەدەی شازدەیەمدا بەجێ بێنن، لەوانە هێتلەر کە خۆی لە کتێبەکەیدا "تێکۆشانم"[١٠١] دانی پێداناوە. هەرچەندە لە ناو نووسەرانداهەن دیگۆلی سەرۆکی پێشووی فەڕەنسا وا دەدەنە قەڵەم کە چاکترین نموونەی میرە نوێیەکە بوویی[١٠٢]، بەلأم لە ڕاستیدا بارودۆخ هەر چۆنێك بێ، زەحمەتە حوکمڕانێکی هاوچاخمان بتوانی پڕبەپڕ خۆی بخاتە قالبی ئەو شەخسییەتەوە کە مەکیاڤیللی ویستوێتی. لێرەدا جێی خۆیەتی سەرنج بۆ ئەو فیکرە گرنگەرابکێشین کە شۆڕشگێڕی ئیتاڵیایی گرامشی لەم ڕووەو دەریبڕیوە. بە ڕای ئەو تاکە کەس لە جیهانی ئیستاماندا لە وزەیدا نییە ببێتە "میر"ەکەی مەکیاڤیللی، بۆیە ئەوەی دەتوانێ

ببێ و بەڵکوو پێویستە ببێتە ئەو میرە نوییە، حیزبێکی سیاسیی شۆڕشگێڕە[١٠٤] هەر وەکو ئەو ڕێ وشوێنانەی سانتیاگۆ کاریللۆی سکرتێری گشتیی پارتی کۆمۆنیستی ئیسپانیا لە کتێبەکەیدا "ئەوروکۆمۆنیزم" دلوای پەیڕەوکردنیان دەکا، لەوە بەولاوە نییە کە بابەتێکی نوییە لەو ڕایەی گرامشی بۆی چووبوو. کاریللۆ لەم بارەیەوە دەڵێ: "...ڕەنگە هاوڕێمان هەبن وەها بیربکەنەوە، ئەم بابەتە ڕێبازەی کە جۆرە مەکیاڤیللیزمییەکە، بۆی هەبی ڕێگەمان بدا لە ساتێك لە ساتاندا هەرچیمان دەوی دەسگیرمان ببی و ئەوانە ئەم هەڵوێستەش تەواو بە ئاسایی دادەنێن".[١٠٥]

گشت ئەوەی باسمان کرد، بەبی پێچ وپەنا ئەو شوێنە بڵندەمان نیشادەدەن کە مەکیاڤیللی لەوەبەرو تا ئێستاش لە کۆڕی ئایدۆلۆژیای سیاسیی جیهانیو بەرەو پێشەوە چوونیدا داگیری کردوە. لەبەر ئەوە ئاساییە کە نیکۆلۆ چەندە ڕۆژگاریش بەسەر چووبی، لە دڵی خەڵکی و بەتایبەتی ئیتاڵیاییەکاندا، شوێنی ڕێزلی نراوی شیاوی خۆی داگیر کردبی.

## پاشگەزبوونەوە

لەوەبەر لە چەند شوێنێکدا دەرمان خست کە چۆن هێزە کۆن ویستەکان نەیانتوانی رووی ڕاستەقینەی مەکیاڤیللی لە پێشدا لەبەر چاوی مرۆڤە دانسقەکان و دوواییش خەڵکەکە بە گشتی ون بکەن. ئەوبوو ئەورووپاییەکان کەوتنە تێگەیشتنی ئەو ئامانجە پاکانەی کە مەکیاڤیللی لە نێوان بیروباوەڕو بەهاکانییەوە پێشکەشی دەکردن و بەدوایدا باری سەرنجیان دەربارەی گۆڕدرا. بۆیە سەرەڕای ئەو شێواندنە بەردەوامەش، کارێکی زۆر زەحمەت نەبوو دەرك بەوە بکری کە مەکیاڤیللی نەك تەنیا ئیتاڵیا، بەڵکوو لە سنووری گشت کیشوەری ئەورووپادا سەردەستەی بانگ

ڕاهێڵەران و ڕابەرانی یەکگرتنی نەتەوایەتی بووە. بۆنمونە کافووری سەرکردەی یەکگرتنی ئیتاڵیا خۆی، لە ژێر تەئسیری بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللیدا بووە. ئیتاڵیاییەکان قەت ئەم ڕاستییەیان لە یاد نەچووەو لە زمانی یەکێك لە شاعیرەکانیانەوە بەم شێوەیە نوێنراوە "من ئیتاڵیایەکی مەزنی یەکگرتووم و نیکۆلۆ مەکیاڤیللی ئەوەی فێرکردووم"[١٠٦] لە خۆڕاییش نیە خانووەکەی لە گوندەکەیدا کە نزیکی فلۆرنسایە کراوە بە مۆزەخانەیەکی نیشتمانی، جگە لەوەی ئیتاڵیاییەکان وەك جەژنێکی نەتەوایەتی ئاهەنگیان بەبۆنەی تێپەڕبوونی چوار سەد ساڵەوە بەسەر لەدایك بونیدا بۆ گێڕاو لەو ڕۆژەدا نزرگەیەکی قەشەنگیان لە شوێنی ناشتنی نیکۆلۆدا بیناکردو ڕاست لە ژێر ناوەکەیدا، ئەو وتە پڕ مەغزایەیان بە هەڵکۆڵین نوسی کە دەبێتە پاداشتی گشت ئەو ناهەموارییەی لە ژیانیدا لەپاش مردنیشی تووشی هات و کە دەڵێ: "مەدح و ستایش هەرگیز لە وزەیدا نییە ئەم ناوە بە هەقی خۆی بگەیەنێ". ئەوسا کڵێسەش ناچار بوو لە ئەنجامدا بچێتە ژێر بارو لە ساڵی ١٨٩٠ دا ناوی کتێبەکانی مەکیاڤیللی ی لە لیستەی کتێبە قەدەغەکراوەکان دەرکێشا، ئەمەش بریتی بوو لە تەنیا پاشگەزبوونەوەیەکی ئاسایی لە ڕووی واقیعێکی سەلماودا. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا، هێشتا لە ڕۆژهەڵاتی ئێمەدا هەر وێنە شێوێنراوەکەی مەکیاڤیللی و تێکەڵکردنە کلاسیکییەکە لە نێوان ئەم و ئەو مەکیاڤیللیزمییەدا لە زەینی خەڵکەکەدا زاڵە کە ڕۆژهەڵاتییەکان پتر لە هەر خەڵکێکی ترو تەنانەت پێش ئەوەشی نیکۆلۆ چاو بە ژیاندا هەڵبێنێ بە چەندین سەدە، بە ڕێوشوێنەکانی موبتەلا بوو بوون. بە هەر حاڵ باسی مەکیاڤیللی و ڕۆژهەلات باسێکە کە هێشتا دەستی نەدراوەتێ، ئەگەر چی لەبەر گەلی هۆ هەقی بایەخ پێدان و لێکۆڵینەوەی هەیە.

# مەکیاڤیللی و ڕۆژهەڵات

مـەکیاڤیللی لـە کتێبەکانیـدا زۆر بەدەگمـەن باسـی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژهەڵاتییـەکانی کـردوەو ئـەویش لەسـنوری تـەنیا هەنـدی زانیـاری ی کەمدایە دەربارەی حکوومەتە ڕۆژهەڵاتییە کۆنەکان و زۆر لەوە دەچـێ لـە سەرچـاوەکانی کالاناپاسیـسی وەرگرتبـێ کـە ئـەویش لـە ژێـر تەئـسیری زەینـەفۆنی هاوڕێـدا بـووە، هـەر وەکـو ئیـشارەتێکی بـە سـوپای عوسمانییەکان داوە و ستایشی کردوە، بەتایبەتی لەبەرئـەوەی سوپایەك بووە لەو ڕۆژگارەدا ئـەنجامی گیـانی تاعـەتکردن و ئازایـەتی تیایـدا و بـە هۆی ئەو سەرکەوتنە خێرایانەوەی لە ناوچەکانی بولقانی سەر بە ئەورووپاو شوێنی تریشدا بەدیی هێنابوون، لە ناو ئەورووپاییەکاندا نـاوو ناوبـانگێکی باڵای پەیدا کردبوو.

بـەڵام دەبـێ لـە سوچـێکی تـرەوە بروانرێتـە مـەکیاڤیللی و پەیوەندیەکـەی لەگـەڵ ڕۆژهەڵاتـدا، چـونکە کاریگـەری ی ڕۆژهـەڵات لـە ڕاپـەڕین (Renaissance) وەك بەیـەك گەیـشتنی دووڕیـانێکی شارسـتانی، مەسەلەیەکە و لە ڕووی زانستیەوە سەلمێنراوە. گومـانیش لەوەدانیـە کـە مەکیاڤیللی وەك ڕۆڵەیەکی سەردەمەکەی خۆی و وەك یەکێك لە نـاودارانی سـەردەمی لوتکـەی ڕاپـەڕین، بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ یـا ناڕاسـتەوخۆ کەوتۆتــە ژێــرو تەئــسیری بیروبــاوەڕی ڕۆژهەڵاتییــەوە. لــەم ڕووەوە گەورەترین دوو ڕابەری سەردەمی ڕاپەڕین کە دانتی و پەترارکن پێش ئـەو کـەوتوون، یەکـەمیان لـە چـیرۆکە شـیعرییە ناودارەکەیـدا "کۆمیـدیای خواوەندی" کەوتۆتـە ژێـر کـاری "نامـەی پاکانـە خـوازیی" ئـەبوو عـەلای میعەرییـەوە، دووەمیـشیان لـە چـیرۆکەکەیدا "دیکـامیرۆن" لـە ژێرکـاری

"هەزار و یەك شەوە"دا بووە. هەر لێرەشدا دەمەوێ ئەو ڕایە دەر ببڕم کە دوور نیە مەکیاڤیللی یش کەوتبێتە ژێرکاری "کەلیلەو دیمنە"وە، یابە لایەنی کەمەوە خوێندبێتی یەوەو ئەمەش تەنیا ڕایەکەو هەقی لێکۆڵینەوەو تێوردبونەوەی هەیە، چونکە زۆر بەڵگە هەن مرۆڤ بنکۆڵکەر بۆ ئەم جۆرە باوەرە هاندەدەن. پیش هەموو شتێك "کەلیلەو دیمنە" لە ساڵی ١٠٨١ دا لە سریانییەوە کراوە بە یۆنانی و لە سەدەی سیازدەیەمدا لە عەرەبییەوە کراوە بە ئیسپانی لەسەدەی چواردەیەمیشدا بەلاتینی. بە دوایدا ئیتر بە نزیکەی هەموو وڵاتانی ئەوروپادا بڵاو بووەوە تا ڕادەیەك جێپەنجەی خۆی بەسەر داهێنانی ئەدەبی ی گەلی میللەتدا جێهێشت. جا زۆر دوورە ڕۆشنبیرێکی وەك مەکیاڤیللی کە بە قۆستنەوە کتێبی دەقۆستنەوەو وەختێکی زۆریشی بە دەستەوە بووە، "کلیلەو دیمنە"ی نەخوێندبێتەوە، بەتایبەتی کە مارسیلیۆ ڤیرجیلیۆی هاوڕیی دڵسۆزی یەکێك بووە لە نووسەرە ناسراوەکان و پێش ئەوەی مەکیاڤیللی دەس بداتە دانانی کتێبی. سیاسیو ئەدەبی، ئەو بووبووە مامۆستای وتنەوەی ئەدەب. ئەمە جگە لەوەی کە مەکیاڤیللی بەلای خۆدوورخستنەوە لە گیانی دکتاتۆرانەی ڕۆژهەڵاتییانەدا[١٠٧] لایدەداو ئەمەش هەر هەمان ئەو شتەیە کە پەندەکانی "کلیلەودیمنە" بۆی دەچوون.

هەروەها ئەگەر هەندی بەراوردکاری لەنێوان بیروڕاکانی مەکیاڤیللی وناوەڕۆکی چیرۆکەکانی "کلیلە و دیمنە"دا بکەین، لە زۆر شتیدا یەکگرتنەوەیان لەگەڵ یەکتردا تێدا بەدی دەکەین کە ڕەنگە ئەنجامی کارتێکردن بی یا تەنیا لە خۆیەوە ڕووی دابی، بەڵام لە هەموو حاڵێکدا سەرنج ڕادەکێشی. بۆنموونە دووان لە چوار ئامانجەکەی "کەلیلەو دیمنە"[١٠٨] بەپیی دەستیشان کردنی (أبن المقفع)، ئاڕاستەی پادشایانن

بۆ ئەوەی "لە گەشتەکەیدا بە ناو دیمەنەکاندا زیاتر بەتەنگەوەبی"(ل ٩٥).لە قسەکانی تری (أبن المقفع) پێش ئەوەی بچێتە ناوجەرگەی چیرۆکەکانەوە دەڵی "ئەوەی ئەم سیفەتانەی تێدا بی کاری مەیسەرنابی، لەوانە: تەوەزەلی لە کارکردندا، یا فرسەت لە دەس دان، یا باوەڕکردن بە هەر هەواڵ ڕاگەیاندەرێك" وپیاوی ژیر "لە ڕاستگۆیی بەولاوە، نابێ قسە لە هیچ کەس وەربگری، ئەگەر چی کەسەکە ڕاستگۆش بی. هەروەکوو دەبی لە هەڵەکردندا بە قیردا نەچیو کۆڵ لە تیوردبوونەوە نەداو پێوستە ئەگەر مەسەلەیەکی لیئاڵۆزا، خۆی لە هیچ لایەنێکی نەداو پێش دڵنیابوون لە دروستییەکەی هەنگاوی تێدا نەنی. پیاوی ژیر دەبی خاوەنی قسەی خۆی بی بزانی کە جەزا قەزایە" (ل ٩٢) وکیسرا ئەنەوشیروانیش هەوڵیداوە کتێبی حەکیمەکانی هندستان دەسگیر بخاو "بیداتە پاڵ خۆی و لە سەرکردایەتی کردنیدا یاریدەی لی بخوازی وکار بە راوتەدبیرە جوانەکانی بکا" لەبەر "ئەو شتانەی تیایدان و پادشایان لە بەڕێوەبردنی ڕەعیەتەکانیان و ژیاندنیان ودادکاری لە نێوانیاندا پێوستیان پییان دەبی" (ل ٩٨). ئەوەی ئەو کتێبە دەخوێنێتەوە "چاکەی پادشایان و تاعەتکردنیان" پێدەزانی و "دەیانخاتەسەروو گشت کاروکردارێکی ترەوە. ئینجا با ئەوەش بزانی، پیاوی بە شەرەف ئەو کەسەیە کەلای پادشایان شەرافەتمەند دەبیو لە دەوڵەتەکانیاندا پایەی بڵند دەکەنەوە" (ل ١٠٧) هەروەك شێرەکە بەدیمنە دەڵی کە "ڕەعیەتی پادشا و ئەوانەی لە حزوریدان، دەبی چ پیاوەتی وزانیارییەك پێدەزانن بۆی باس بکەن و چ ئامۆژگاری یەکیان لە لاهەیە بیدەنێ. چونکە پادشا نایان ناسێ و بەو پێوانەیە نەبێ ناتوانێ هەریەکەیان پایەوپلەی خۆیدا دابی" (ل١٣٦) هەروەها پیی دەڵی: "ژمارەزۆریی دەست وپێوەند، ئەگەر ئامۆژگاریکەر و

خـاوەن تاقیکردنـەوە نـەبن، بۆکـار هەڵـسووڕاندن زەرەربـەخش دەبـن، چونکە ئیش بە زۆری ژمـارە مەیسەرنابی، بـەڵکوو بـە دەسـت وپێوەنـدی دڵسۆزو چاکەکار دەبی"( ل١٢٧). هەروەها لە قسەکانی دیمنـە بـۆ شـێرە پادشا: "مشك لەناو ماڵدا دراوسییەکی بن دەست بوو، بەڵام کە بووە زیان بەخش بووە دوژمن و دەربەدەر کرا. یا باز کێوییەکی ئـاوارە بـوو، کەچـی کەبووە سوودبەخش گیرایە خۆو ماڵی کراو ڕێزی لینرا" (ل١٢٧).

چیرۆکەکانی "کەلیلە ودیمنە" زۆرجارو لـەزۆر شـێوەی خواسـتراودا، باسی تەبیعەتی خەڵك ودەوری قەزاوقەدەریان کـردوە. بـۆ نموونـە شـێرە شا باوەڕ بەقسەکانی دیمنە دێنی وئەو ئەنجامـەی لـی دەس دەکـەوی کـە خەڵکەکە دوو بابەتن "یەکەمیان تەبیعەتێکی دڕی هەیە و وەك ئەو مارەیە کە ئەگەر یەکێك پیی پێدا نـاو پێـوەی نـەدا، بـە زەرەربەخـشی نـازانی و دەچی جارێکیتر پیی پێدا دەنێتەوە. ئەوی تریان تەبیعەتینەرم وئاسـانەو وەك ئەو پوازی (سەندل) یە کەئەگەر زۆر دەستی لـی خـرا گـەرم دادێـت و ئازاربەخش دەبی"( ل١٢٨). هـەروەها لـە قـسەکانی دیمنـە بـۆ شـێرەکە: "مرۆڤی شـەڕانی لـە شـەر خـواهی ڕزگـاری نـابی، ئەگـەر لاوازیـیش ڕووی تێکرد فێڵێتری تێدا دەدۆزێتەوە"(١٥٦) "پادشایان دان بەخۆداگرن، سـزا دەرنابڕن بۆ ئەو کەسە نەبی کە تـاوانی ئاشـکرایە"(ل١٥٦–١٥٧). "شـەڕ خواهـان لـە هەمووشـوێنێکدا لـە خێرخواهـان زۆرتـرن. بـەڵام ئەگـەر دژی ڕاوەستان و بە کۆمەڵ نیشتنە گیانی لەوانەیەبیفەوتێنن. دەنا ئەگەر وەها نەبێ ئەوا دەبێتەئەو پلاری قەدەرەی ڕەت کردنەوەی بۆ نـابی" (ل١٦١). هـەروەها لـە زمـانی گایەکـەوە وتـراوە: "باشـترین سـوڵتان ئەوەیـە لـە هەڵۆیەك بچێ کـە بـەلاك دەورە درابـی، نـەك لـەلاکێك بچی کـە بـە هـەڵۆ دەوری تەنرابی) (ل١٦٦). هەندی جاریش پیاو هەست بـە لەیەکچوونێکی

تەواو لەبیروڕاو بگرە لەنزیکیی دەربڕینیش لەگەڵ یەکتردا لە نێوان "میر" و "کەلیلەو دیمنە" دا دەکا. بۆ نموونە لە زمانی "کەلیلە"وە وتراوەکە: "پیاوی بی دەسەڵات بە لەسەرخۆیی و فرت و فێل زەفەریان پی دەبا و بەفروفێل سواری کۆڵی فیل دەبی ومار لە کون دەردەێنی و یاریی پێدەکا و شێر لە ناو تابووت دەنی و ئاو بەو شوێنەدا دەبا کە مەبەستێتی و بەر لە زەرەری ئاگرو ڕەشەبا و ڕۆژ دەگری و هێزدار دەخاتەکار"(ل١٧٢). "سولتان ئەگەر پیاو چاك بی و وەزیرەکانی پیاو خراپ بن، خێروبەرەکەتی بەسەر خەڵکیدا کەم دەبێتەوەولییان دەچێتەقاتی و کەس ناوێری توخنی بکەوی. کەوابی دەست ڕەنگینیی پادشایان لە خێر بەرەکەتەکەیاندایە کە دەبی هەر لە برەودا بی" (ل ١٧٣-١٧٤) هەروەها لە قسەکانی دیمنە بۆ شێرەکە: "...ئەی پادشا رەحم بەو کەسە مەکە کەترست لیی هەیە، چونکە پادشای بە زەبرو زەند ڕەنگە یەکێك ببوغزێنی و دەستی لە کاربکێشێتەوە، بەڵام دوایی بەناچاری لەبەر کۆشش و چاکەی بە سەریەوە، لەخۆی نزیك دەکاتەوەو وەك چۆن یەکێك دەرمانێکی تاڵی دەر خوارد دەدری، بە تەمای سوود لیبینێن دەیخاتەوە گەڕ و یا ڕەنگە یەکێکی خۆشبوی ولە خۆی نزیك بخاتەوەو بەڵام کەترسی زەرەرو زیانی، وەك ئەو کەسەی لێدی مارێك بە پەنجەیەوە دەداو لە ترسی بڵاوبوونەوەی ژەهرەکەی بە هەموو لەشیدا و مراندنی، پەنجەی خۆی دەقرتێنی" (ل١٨٠). "هۆی راست ورەوانیی کار لەوەدایە پادشا ئاگاداری ئەو دۆستانە بی کە دەیەوی یاریدەیان لی وەربگری و بزانی هەر یەکەیان چ جۆرە ڕاو تەدبیرێکی لە لایەو چ نەنگییەکی تێدایە، ئینجا دوای ئەوە پێوستە پادشا کارگەرانی بەسەربکاتەوە و لە کاروباریان بپرسێتەوە، بۆ ئەوەی چاکەی هیچ چاکەکارێك و خراپەی هیچ

خراپەکارێکی لا شاراوە نەبی ئەوسا دەبی چاکە کار بەبی ئەجردانەوە نەهێڵێتەوە و ماوەش نەدا خراپەکار و تەوەزەل لە سەر خراپەکاری و تەوەزەلی بەردەوام بن. چونکە ئەگەر ئەوەی لە دەسداو جڵەوی بۆشل کرد، چاکەکاریش جڵەو شل دەکا و خراپەکار جەسارەت دەنوێنی کە ئیتر نیشەکە گەندەڵ دەبی و کار لە کار دەترازی" (٣٤٨).

ئینجا لە قسەکانی فەیلەسووف بۆ پادشا: "ئەی پادشام، ئەو کاروبارانەی کە مرۆڤ لە ناو گشت ئاژەڵاندا تیایاندا تایبەتییە، من بە چواریان دەبینم کە بریتین لە پوختەی هەرچی هەیە لە جیهاندا، ئەوانیش ئەمانەن: حیکمەت و داوێن پاکی و ئەقڵ و داد. چونکە زانستی و وردبینی لە بەشی حیکمەتن. بەحیلمی و سەبرو لەسەرخۆییو سەنگینی لەبەشی ئەقڵن. حەیاو سەخاوەت و مەستووری و سەربەرزی لە بەشی داوێن پاکین. ڕاستگۆیی وچاودێری و خێرکردن و ڕەفتار ساغی لە بەشی دادن. ئەمانە جوانکارییەکانن و پێچەوانەکانیشیان خراپەکارین. سائیتر هەر کاتێك ئەمانە لە یەکێکدا کۆبوونەوە، کەموکووڕی لە نیعمەتیدا نایگەیەنێتە بەدبەختی لەم دنیایدا یا شکستی لەو دنیایدا، یا داخ بۆ ئەمانەوەی لە ژیاندا ناخوا، یا بەشی لەماڵ وموڵکدا هەرچەندێك بیپیی خەفەتبار نابیو لە گێچەڵ سەرسام نابی بەم جۆرە حیکمەت سامانێکە کە بەلیخەرج کردنی لە بن نایەت و ئازووقەیەکە کە هەژاری لەبەریدا خۆی ڕاناگری وبەرگێکە کە قەت کۆن نابی لەزەتێکە کە بڕانەوەی بۆ نییە" (ل ٧٦).

وەختێکیش ئەم چەند دێڕەی خوارەوە دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت وەك بەیدەبای فەیلەسووف لە زمانی مەکیاڤێللییەوە لە پێشکەش کردنەوەی "میر"یدا میدیتچی بدوێنێ وەهایە کە دەڵی: "ئەی

پادشام، من دەڵێم تۆ لە مەڵبەندی باب و باپیرانتدایت لە پادشایان و کەڵەپیاوان کە پێش تۆ شاریان بنیاد ناوە و زەمین ملی بۆ داون و قەڵایان دروست کردوەو سەرکردەی لەشکر بوون و جباخانەیان ناوەتە سەریەك و ڕۆژگاریان درێژەی کێشاوەو چەکیان پەرەی سەندوەو سەردەم لە دوای سەردەم بە شادی و خۆشی ژیاون و ئەوە بەری جوانکاریی لی نەگرتوون و لە سوپاس و دەبی ئەوەش بڵێین کە لەیەکچوونی هەندی لەو شتانەی چیرۆکەکانی "کەلیلە و دیمنە" لەگەڵ نووسینەکانی مەکیاڤیللیدا، لەولای ترەوە وا ناگەیەنی کە جیاوازی لە نێوانیاندا نییە. بۆ نموونە مەکیاڤیللی لە ٥٠٪ ی بۆ دەوری قەدەرو بەخت لەهەڵسووڕاندنی کاروباردا داناوە، لە کاتێکدا لە "کەلیلە ودیمنە"دا لە زمانی ئەم فەیلەسووفەوە کەڕووی دەمی لە پادشایە وتراوە: "با ئەو کەسانەی کاروبار هەڵدەسوڕێنن وجیبەجییان دەکەن بزانن کە شت هەمووی بە قەزاو قەدەرە" (٣٥٠) و "کۆشش و جوانی ئەقڵ وهەر خێرو شەڕێك کە مرۆڤ تووشی دی بە قەزاو قەدەرە"(٣٤٨). ئینجا لێرەدا دەبی ئەوەمان لەبەر چاو بی کەمەکیاڤیللی لەژێر تەئسیری ئەرستۆشدا بووە، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا لەزۆر شتدا جیاواز بووە، بەلایەنی کەمەوە لە شێوەی نیشاندانی ئەو باسەنەدا کە لییان دەدوا، بەتایبەتی لە پشت بەستنی بەردەوامیدا بەنموونەی مێژوویی.

بە هەر حاڵ ئیمە کە دەڵێین دەشێ مەکیاڤیللی کەوتبێتە ژێر تەئسیری پەندەکانی "کەلیلەودیمنە"وە یا خوێندبێتییەوە، ئەوەش بە دوور نازانین کە ئەو یەککگرتنەوەیەی هەندێکیان لەگەڵ بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللیدا لەتەنیا ڕێکەوتەوە بی، یا ڕەتکار ( ردالفعل)ێکی لە یەك چووی بارو دۆخێکی لەیەکچووبی. ئەوەی راستی بی هەندی لەیەك چوون

لە نێوان هەڵسەنگاندنەکانی مەکیاڤیللی و ابن خلدونیشدا هەیە. بەلام بەبی ئەوەی بەڵگەی سەلمێنراو هەبن. دەری بخەن کە یەکەمیان پێشەکییەکەی دووەمیانی خوێندبێتەوە.[109] أبن خلدونیش لەلای خۆیەوە نیشانی داوە کە فەرمانڕەوای نموونەیی دەبی چۆن بی، بەلام بەپی داگرتن لەسەر ئەرکە ڕۆحانییەکانی و تەنیا وەسف کردنی بە "پادشایەکی بیرڕۆشن و بەسۆز و بەهێز و بەلام ڕی و شوێنی "سەرکوتاندنەوەی" ناشەرعی رەت دەکاتەوەو بایەخ بە خۆش گوزەرانی و ئاسوودەگیی گەلەکەی دەدا"[110]. واتە ئەویش ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی جێگیر و بەهێز و ڕێك وپێك بووە، دەوڵەتێك کە پادشا تیایدا بتوانی جڵەوی کاروبار لە ڕووی جۆرەهای تەماعکاراندا بگرێتە دەست. هەروەکو ئەو لە گەڕانیدا بە دوای ڕاستیدا، تەنیا ڕووداوە مادییەکانی گرتووەو شییکردوونەتەوەو لەو یاسایانە گەڕاوە کە بەرەوگۆڕانیان دەبەن. بە رای هیلموت ریتەر ئەوی أبن خلدون بە دەمارگیری ناوی دەبا، هەر ئەوەیە مەکیاڤیللی ناوی چاکەکاری لێناوە.[111] لێرەدا وا چاکە ئیشارەتێك بەوە بدەین، أبن خلدونێك کە لەبیروڕاکانیدا لەگەڵ ئاییندا دژ یەك نەبوون، کەچی بەکافرو زەندیق تاوانبار کرا. هەروەکوو زۆر لە مێژوو نوسانیش، لەبەرزایی سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمەوە ڕوانییانە بیروباوەڕەکانی و بەشێوەیەکی تایبەتی "وردکردنەوەی هۆیەکانی سەرهەڵدانی ئەم کارە مێژووییە بی هاوتایەیانە (پێشەکییەکە ك. م) لە سەدەی چواردەیەمدا[112] خستە پشت گوێ و ئەمەش هەمان کارەساتەکەی مەکیاڤیللی یە وەك لەوەبەر ڕوونمان کردەوە".

حوکمڕانی ڕۆژهەلاتییەکان تا ڕادەیەك لە وەختێکی زووەوە بایەخیان بە بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی داوە. وازەن دەکرێ کە کتێبی

"میر" بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ سوڵتانی عوسمانی مورادی چوارەم کە لە خۆڕزگارکردندا لە دوژمنانی و سەپاندنی هەیبەتی حوکمڕانییەکەی بەسەر خەڵکیدا، ڕێو شوێنی مەکیاڤیللیيانەی بەکار دەهێنا. بەڵام بەجۆرێکی زۆر دوور لەو بەهایانەی کە مێژوونووسی گەورەی سەردەمی ڕاپەڕین مەبەستی بوون، وەرگێڕدراوە. ژمارەی ئەوانەی بە فەرمانی ڕاستەوخۆی ئەو کوژراون بەسەد هەزار کەس دانراوە، لەگەڵیاندا سیان لە براکانی خۆی و یەکێك لە مامەکانی. لەساڵی ١٦٣٧ یشدا، لەکاتێکدا کە تاعون ڕۆژانە نزیکەی ٥٠٠ کەسی لەخەڵکی ئەستامبوولی پایتەختی قەڵاچۆ دەکرد، ئەو شەوانێکی پڕ لە کەیف و ڕابواردنێکی لەگەڵ ژنە دۆستەکانیدا بەسەر دەبرد و بە تەوسەوە دەیوت: "خودا وا ئەم هاوینە شەرخواهان سزا دەدلو رەنگە لە زستاندا نۆرە بێتە سەر شەرافەتمەندان".[112] هەروەها بایەخدانی محمد علی ی گەورەبە "میر" هیچی لە بایەخ پێدانی حوکمڕانە ئەوروپاییەکانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی کەمترنەبووە. ئەوەش بۆ حوکمڕانێکی سەرکەووتووی وەك محمد علی کە مارکس دەربارەی میسر لە سەردەمی ئەودا وتوویە "لە هەموو ئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا بەشێتی توانای ژیانی هەبێ"، شتێکی سەیر نەبووە. ئەو ئەگەر چی لەتەمەنێکی درەنگیشدا فێری خوێندواری بووبوو، بەڵام بایەخی بەهەر شتێك دەدا کە پەیوەندیی بەسیستمەکانی حوکمڕانییەوە هەبێو هەر ئەمەش بوو بووە هۆی یەکێك لە نهێنییەکانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی.

محمد علی دوای ئەوەی لە ڕێگەی یەکێ لە دیپلۆماسییە بێگانەکانەوە بایەخی "میر"ی پێزانی[113] لە ساڵی ١٨٢٤-١٨٢٥ دا [114] روفائیل أنطوان زاخووری قەشەی ڕاسپارد بۆی وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، چونکە وەك خۆی وتوویە "زۆر بە پەرۆشەوە بووە بزانێ ئەم کتێبە چی تێدایە".

سەیریش ئەوە یە کە محمد علی دوای خوێندنەوەی "میر"، لەبەیەك گەیشتنێکدا لەگەڵ دیپلۆماسییەکی ئیتاڵیایی بەم شێوەی هەڵسەنگاندوە:

"ئێوە لە ئیتاڵیادا ژاوەژاوێکی گەورە دەربارەی نووسەری ناسراوتان مەکیاڤیللی دەنێنەوە، من فەرمانی وەرگێڕانی کتێبەکەم دا تا بزانم چی تێدایە، بەڵام ئاشکرای دەکەم ئەو پیاوە زۆر لەوە کەمترە کەمن ئەنجامی ئەو ناوبانگەی هەیەتی لێم چاوەڕوان دەکرد. هەروەکو من پێتی ڕادەگەیەنم کە کتێبێکی تر هەیە عەرەبییەو سەرسام و سەرمەستی کردووم، ئەویش پێشەکییەکەی أبن خلدونە. ئەم نووسەرە لە بیرکردنەوەدا لەمەکیاڤیللی سەربەسترە و بگرە باوەڕم وایە کتێبەکەی ئەو زۆر سوودبەخشترە. ئینجا کە بڵاو کردنەوەی کتێبەکەی مەکیاڤیللی لە هەندێ لە وڵاتانی ئەوروپادا قەدەغەبێ، خۆ دەبوو قەدەغەکردنی کتێبەکەی أبن خلدون کون برترو توندوتیژتر بێ".

گومانی تێدانییە ئەوەی کاری کردۆتە رای محمد علی لاوازیی وەرگێڕانەکەی "میر"و ناڕەوانیی شێوەکەی بووە کە وای لێکردوە تێگەیشتنی زەحمەت بێ و بۆ بڵاوکردنەوە دەست نەدا.(١١٥) لەگەڵ ئەوەشدا ئەو وەرگێڕانە بایەخی مێژوویی خۆی هەیە، چونکە یەکەم وەرگێڕانی "میر"ەبۆ عەرەبی و ئینجا بە دوایدا پارێزەری میسری محمد لطفي جمعە لە ساڵی ١٩١١دا جارێکی تر لە ئیتاڵیاییەوە کردوێتی بە عەرەبی و لە ساڵی ١٩١٢دا بە ناوی "کتێبی میر کە مێژووی میرایەتی یە ڕۆژئاواییەکانە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا"(١١٦) بڵاوکردۆتەوە. وەرگێڕ کتێبەکەی بە پێشەکییەکی فرلوانی خۆی دەستپێکردوە کە لە (٥٠) لاپەڕەدایەو(١١٧) بە شێوەیەکی ڕەوان و مەوزووعییانە. گەلێ لایەنی جۆرلو جۆری ژیان و نوسینەکانی مەکیاڤیللی نیشاندەدا. سەرمەستیی وەرگێڕ سەبارەت بە مەکیاڤیللی گەیشتۆتە ڕادەیەك کە بە تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە

چووه بۆ ئیتاڵیاو سەری لە گوندەکەی و خانووەکەی داوەو لە پاریسیش یەکێك لە نەوەکانی ئەوەی دیوە. لە پێشەکییەکەیدا بە شێوەیەکی ئەدەبییانە ئەوە دەردەبڕی و لەو قسانەی تیایدا کردوونی دەڵێ:

"کە کتێبی "میر"م خوێندەوە هۆگری بووم و وام لێهات لەگەڵ چوارینەکانی خەیامدا لەگەڵ خۆمدا هەڵی بگرم. وەختێ خەفەت دامدەگری و دڵم تەنگ دەبی، خەیام دەخوێنمەوە بۆ ئەوەی بەو مەیە پیرۆزەی مەست ببم. بەڵام "میر" بۆئەوە دەخوێنمەوەکە لە مەیی خەیاڵ دەریاز ببم وبگەڕێمەوە کۆڕی ئەو ڕاستییە ئازار بەخشانەی کە لەشکرەکانی هێزو حەزوو ئارەزوو تیایدا بە شمشێری کارەسات و ڕمی بە سەرهات پێکدا هەڵدەگڕێن".[118]

*ئینجا ئەگەر ئەوە بگرینە بەر چاو کە یەکەم خوێندنەوەی "میر" لەلایەن وەرگێڕەکەیەوە "لە بەر قورسی زانینی مانا و مەغزای کتێبەکە"* تووشی "سەرسوڕمانی" کردوەو ناچار بووە "چەندین جار پێدابچێتەوە" تا "لە کۆتایی کاردا بە تەنیا تێگەیشتن و دەرك کردن بە ناوەڕۆکەکەی"[119] وازی هێناوە، لە هۆی ئەو هەندە کەلێنە تێدەگەین کە لە وەرگێڕانەکەدا هەن و کە لەگەڵ ئەوەشدا شێوەیەکی ڕەوان و ماناڕوونیی تێدایەو ئەوە وادەکا تێگەیشتنی ناوەڕۆکە سەرەکییەکەی میر بەبێ گریکۆڵ لە توانادا هەبی.

بەڵام وەك دەردەکەوی، ئەم وەرگێڕانە و پێشەکییەکەی خاوەنەکەی دەورێکی ئەوتۆیان لە پێکهێنانی باری سەرنجێکی دروستدا دەربارەی مەکیاڤیللی وبیرو باوەڕەکانی لەلای خوێنەری عەرەب و ڕۆژهەڵاتی بەگشتی نەگێڕاوە، ئەمە لە کاتێکدا هەموو نیشانەیەك وا دەگەیەنێ کە پێگەیشتنی ئەو جۆرە باری سەرنجە دەگەڕێتەوەبۆ سەرەتای سەدەی بیستەم،[121] واتە بۆ سەردەمێك کە هیچ ڕووناکبیرو مێژوونووسێکی

ڕۆژئاوایی نەمابوو، چەندە لایەنداریش بووبی، کتێبەکانی بە باری باشدا هەڵنەسەنگاندبێ، لەوانە مێژوونووسی سەر بە جەزویتەکان و عەمیدی پێشووی کۆلیجی کامبیۆن لە زانکۆی ئۆکسفورد (لیسلیۆ کەر). لەڕاستیدا کەم مێژوونووسی ناسراوی هاوچاخ هەن بە بڵندی مەکیاڤیللییان هەڵنەسەنگاندبی.

## بیروڕای هاوچاخ

لەوەبەر باسی بیروڕای ژمارەیەکی زۆر لەو فەیلەسووف و ڕووناکبیرانەمان کرد کە لە واقیعی حاڵی بیروباوەڕەکانی مەکیاڤیللی، تێگەیشتبوون بە ڕەزامەندییەوە هەڵیانسەنگاندوون. بەڵام ئاسایی بوو کار تەنیا بەوانەوە نەوەستی، بەڵکوو لە سەردەمی ئیستاشماندا چەندین ڕووناکبیر و نووسەری سەر بەگەڵی قوتابخانەی ئایدۆلۆژیایی جیاجیا، لە هەمان باس دواون و هەر کە باسی سەردەمی ڕاپەڕین و پێشکەوتنی زانستیی سیاسەت یا لێکۆڵینەوەی مێژووییان کردبی و، مەکیاڤیللییان وەك مێژوونوس و زانایەکی سیاسی بە دیار خستوە، لە ناویاندا ژمارەیەکی زۆر لە و مێژوو نووسە ڕۆژئاواییە ناسراوانەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا ناوو ناوبانگێکی بەرزیان هەیە و کتێبەکنیان وەرگێڕدراونەتە سەرزمانەکانی، بەڵام بەبێ ئەوەیشی کاریان کردبێتە سەر ئەو بیروڕایەی لە ڕیزی کوڕوکاڵانیدا دەربارەی مەکیاڤیللی باو بووە. ئینجا ئێمە لێرەدا بۆ کۆتایی پێ هێنانی لێکۆڵینەوەکەمان دەربارەی مێژوونووسی گەورەی سەردەمی ڕاپەڕین، تەنیا چەند نمونەیەکی کەم لە بیروڕاکانی نووسەرە بێگانەکان نیشان دەدەن.

له (ئینسکلۆپیدیای بەریتانیایی)دا دەربارەی مەکیاڤیللی وتراوە: "نوسەرو کارگێری ئیتاڵیایی دەوڵەت نیکۆلۆ مەکیاڤیللی، ڕووناکبیرێکی نیشتمانپەروەری بلیمەت بوو، تێگەیشتنی ژیرانەی لە سیاسەتی هاوچاخی خۆی و دەرك کردنی قوولی بە تەبیعەتی ئادەمیزاد، چاکترین بەرهەمیان لی وەشاوەتەوە کە زۆر جار بە هەڵە بەکاری گەندەڵ یا گاڵتەجاڕی دراونەتە قەڵەم. ئەو پیاوێکی سەرڕاست و هاوڵاتییەکی چاك و باوکێکی دڵسۆز بووە، هەروەکوو نوسەرێکی گەورەش بووە، چونکە ڕووناکبیرێکی مەزن بووە)[١٢٢]

"ئەنسکلۆپیدیای ئەمەریکایی"ش مەکیاڤیللی بە ڕەمزی گواستنەوە لە سەردەمی ناوەڕاستەوە بۆ سەردەمی نوی دەداتە قەڵەم و "دروستیی بیروباوەڕە سیاسییەکەی" بەو خزمەتانەوە دەبەستێتەوە کە پێشکەشی ڕژێمی جەمهووریی فلۆرنسای کردوەو بە بارێکی باڵادا قسە لەڕووییەکەی هەڵدەسەنگێنێ. هەروەکو دەیسەلمێنێ کە "مەکیاڤیللی نەی وتوە هیچ ڕەوشت و بەهایەك لە سیاسەتدا نییە، بەڵکو وتوێتی کە سیاسەت ڕەشت و بەهای تایبەتیی خۆی هەیە و ئەم جۆرە باوەڕەش عادیلانە دێتە پێش چاوو بگرە بۆ سەردەمێك کە بەدی هێنانی یەکێتیی نەتەوایەتی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی ی تیادا وەك ئامانجێکی باڵای ئەوتۆ کە هەموو شتێکی تر لە ئاستیدا لاوەکی بێ، بە پێشبینی یەك دەدرێتە قەڵەم".[١٢٣] لە باری سەرنجی "ئەنسکلۆپیدیای فەلسەفی"ی سۆڤیاتییشەوە، مەکیاڤیللی بە یەکێك لەدیارترینی ئەو ڕووناکبیرە ئیتاڵیاییانە دادەنرێ کە هەوڵی داوە "دوور لە لاهووت، یاساکانی بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵگا دەستنیشان بکا و تێڕوانینێکی ڕیالیستانەی دروست ڕوانیوێتی یە دەوڵەت و حوکمڕانان و لە باوەڕێکی

دڵسۆزانەوە نووسینی لە پێناوی یەکگرتنی ئیتاڵیادا نووسیوە".[124]
هەروەها هەمان شت لە "ئەنسکلۆپیدیای مێژوویی"ی سۆڤیاتیداو[125] لە چاپی دووەم و سێیەمی "ئەنسکلۆپیدیای گەورەی سۆڤیاتی"دا[126] وتراوەتەوە لە جزمی چوارەمی "مێژووی جیهان"یشدا نوسراوە: "ئەنجامە کوشندەکانی بەش بەش بوونی ئیتاڵیا تارادەیەکی ئەوتۆ ئاشکراو لەڕووبوون کە هەندێ لە نوێنەرە زیاتر پێشکەوتنخوازەکانی بوورجوازی یەت لەسەدەی شازدەیەمدا کەوتنە داواکردنی یەکگرتنی ئیتاڵیا و یەکەمینیشیان ڕووناکبیری سیاسی و مێژوونووسی ناسراو نیکۆلۆ مەکیاڤیللی بوو"[127] هەروەکو مێژوونوسی ئەمەریکایی کارلتۆن هیس بە هەمان جۆر مەکیاڤیللی هەڵسەنگاندوە.[128]

ئەمڕۆش دەمارگرژترین کەسانێك بۆ جزویتەکان و کزترینیان لە سۆزداریدا بەرامبەر بە مەکیاڤیللی،[129] دان بەوەدا دەنێ کەئەو "ڕێگایەکی نۆیی بۆ لێکۆڵینەوەو..... شێوازیکی تازەی بۆقسەکردن لە سیاسەت دیوەتەوە، ئەمە جگە لە تیورییە سیاسییە نوییەکانی"، هەروەکوو "بەوپەڕی وردی و بیرتیژییەوە، ئەو پاڵ پێوەنەر و هۆیانەی دەستنیشان کردوون کە هەر بزووتنەوەیەکی سیاسیدێننە کایەوە" لەبەرئەوە "بە یەکێك لە کارامەترینی ئەو نووسەرە دیارانە دادەنری کە کاریان کردۆتە سەر کاروباری سیاسی لە جیهاندا" و وادەکا "بیروڕاکانی سەبارەت بەگیروگرفتە سیاسییەکان جێگەی لێکۆڵینەوەو بە نواداچوونێکی قووڵ بن".[130] یا هەن لە هەمان باری سەرنجەوە بە "باوکی زانستییە سیاسییەکانی"[131] دادەنێن، یا بە "پێغەمبەرێکی دەوڵەتی نویی نەتەوایەتیی"[132] دەزانن. هەروەها مێژوونووسی ئەمەریکایی ڕۆبەرت بالمەر لە دووان لە کتێبەکانیدا، دەیسەلمێنی کە مەکیاڤیللی "لەناو نووسەرانی

سـەردەمی ڕاپـەڕین لـە ئیتاڵیـا دا بـە دیارترینیـان" دەژمێـردری و "مـیر" "مەزنترین میراتی ئەمری" ئەو سـەردەمەیەو مـەکیاڤیللی "خـەوی بـەو ڕۆژەوە دەدی کە خەڵکی فلۆرنسا و بگرە گشت ئیتاڵیاییـەکان بـە نوانـدنی مەردایـەتی لـە کـۆڕە سیاسـیەکانیاندا وەك ڕۆمانییـە دێرینـەکان کـردار بکـەن و لـە ڕیـزی لەشکرەکانی شارەکاندا بە هانـدانی ئامانجـە نیـشتمانییەکان بجـەنگن و سـەری خۆیان لەبەردەم ئەوروپادا بەرز بکەنەوە"[١٣٣] لـە نـاو مێژوونووسـە ئیتاڵیاییـە هاوچەرخەکانیـشدا هـەن مـەکیاڤیللی بـە شۆڕشـگێڕو[١٣٤] "پێغەمبـەرێکی بـێ دەسەلات"[١٣٥] دەدەنە قەڵەم ئەمرۆ لـە نـاو مێـژوو نووسـاندا بـە دەگمـەن هـەن دان بەوەدا نەنێن کە مەکیاڤیللی "هاوولاتی یـەکی چـاك و هـاوڕی یـەکی گیـانی بەگیانی و باوکێکی بـە تەنگـەوەهاتووی نیـشتمانپەروەرو بگـرە نموونـەیی"[١٣٦] بووە دەتوانری دەیەها نموونەی تری لەم بابەتە بهێنرێتـەوە. بـەلاّم ئیمـە تـەنیا ئـەم وێنـە پـڕ مانایـەیان لێدەخەینـە پێشـچاو کـە أ. ڤ. جیفیلیکـۆف لـە لێکۆڵینەوەکەیدا دەربـارەی مـەکیاڤیللی پێشکەشی کـردوەو وتوویـە: "ئیتاڵیـا نەیتوانی یەك بگری. بۆچی؟ ئەمە بوو ئەو پرسیارەی نیکۆلـۆ ئاراستـەی خـۆی دەکرد. ئێمە وەرامەکـەی دەزانـین (وەرامـی مـەکیاڤیللی –ك.م): یەکـەم لەبـەر نەبوونی یەکێتیی سیاسی لە ئیتاڵیادا. دووەم لەبەر ئەوەی لـەئیتاڵیا سـوپایەکی نیشتمانی چ لەکوڕو کالاّنی خۆی یا لـە سـەربازی بـەکری گـیراو نـەبوو. کـەوابی چـار چـی بـوو؟ یـەکگرتن و دامەزرانـدنی سـوپا. بـۆ جیبـەجی کردنـی ئەمـەش دەبوو شێوازەکانی کـارکردن ڕوون بکرێنـەوە. مـەکیاڤیللی بـە پـیّی بۆچـوونی خـۆی لـەم بارەیـەوە، ئـەنجامی بـەوە شـکاندەوە کـە بنـچینەکانی زانـستیی سیاسەتی دارشت، کوت ومت وەك کۆلۆمبس کە وەختی کەوتـە گـەڕان بـەدوای ڕێگایەکدا بۆ هیندستان، ئەمەریکای دۆزییەوە"[١٣٧].

گشت ئەوەی باس کرا ئەو پەڕی هەق بە مەکیاڤیللی دەدا دلوا لە ڕۆژهەلاتییەکان بکا کە خۆی لە واقیعدا چۆن بووە وەهای ببینن و بیروباوەڕەکانیشی چۆنن وەهایان هەڵبسەنگێنن. بەڵێ: "مەدح وستایش هەرگیز لە وزەیدا نییە ئەم ناوە بە هەقی خۆی بگەیەنی"

# پەراوێزەکان

(١) مەکیاڤیللی لە تەمەنی دوانزە سالأندا بوو کە یەکەم کتێبی دەربارەی مێژوو خوێندۆتەوە.

(٢) R.Ridolfi the life of Niccolo Machiauelli، translated from the Etalian by G.Grays on ،chicago ١٩٦٢،P.٢

(٣) ا.ك.جیفیلیکۆف، نیکۆلۆ مەکیاڤیللی ( ١٤٦٩–١٥٢٧) مۆسکۆ –لینینگرارد، بەزمانی ڕووسی، ل ٢٤.

(٤) R.Ridolfi ،Op.Cit ،pp ٩–١٢ F.Chabod، Machiavelli and Renissance ،transated from the Italian by D.Moore ، Cambridge ١٩٦٠ ،pp.٧–٩

(٥) R.Ridolfi ،Op.Cit ،p.٤

(٦) F.Chabod ،Op. Cit ،p.١٢٦

(٧) ا.ك.جیفیلیکۆف، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤.

(٨) هەمان سەرچاوە – ل ٣٢

(٩) ف. ڕۆتینبۆرگ، ( فیلەتەنەکانی سەردەمی ڕاپەڕین) بەزمانی ڕووسی، لینینگراد ١٩٧٦، ل ١٢٠–١٢١.

(١٠) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٠

( ١١) بروانە کتێبی
H. Butterfield، the Statecraft of Machiavlli، London ،١٩٦٠ ، p.١٢٥

(١٢) :لە شوێنیکی تری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، دەگەڕێینەوە سەر کتێبە گەورەکەی مەکیاڤیللی (دەمەتەقێ)

(١٣) پیشەسازیی قوماش لەو ڕۆژگارەدا، نەك تەنیا لە ئیتالیادا، بەڵکوو لە گشت ئەورووپادا لە پیشە بە قازانجەکان بوو.

(١٤) ئەوە لە نامەیەکیدا وتراوە کە بۆ فیتۆریی هاوڕێی ناردوە. (بگەڕێرەوە سەر
( F.Chabod ،Op.Cit pp ١٢١-١٢٢)

(١٥) أ.ك. جيفيليكۆف -سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

(١٦) F.Chabod ،Op.Cit، pp.٤،١٢٦،١٣٤-١٣٥

(١٧) R.Ridolfi ،Op،Cit،pp ١٤٥،١٥٦

(١٨) F،Chabod ،Op.Cit P.١٣٢.

(١٩) Ibid ،p.١٢٩

(٢٠) :نيكۆلا ئەلكسێيف، نيكۆلۆ مەكياڤيللی، بە زمانی بولگاری، سۆفيا، ١٩٠٨، ل ٢٧-٢٨. هەروەها ف. ڕۆتینبۆرگ، سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٢ -١٢٣. هەروەها ل.م باتكين، (مرۆڤپەروەرەئيتاڵيابييەكان)و شێوەی ژيان، شێوەی بيركردنەوە، بە زمانی ڕووسی، مۆسكۆ، ١٩٨٧، ل ٥٨-٥٩ هەروەها
"The prince" ،London ١٩٦٨، pp ١٨-١٩ ( the Introduction by G.Bull)

(٢١) تيتۆس ليڤی (٥٩پ.ز- ١٧ د.ن) مێژوونوسێكی ناسراوی ڕۆمانەكانە ٤٥ ساڵی بە دانانی كتێبە گەورەكەیەوە "مێژووی ڕۆما لە دامەزراندنی شارەكەوە" بەسەر بردووە بريتی بووە لە ١٤٢ بەرگ و تەنيا ٣٥ بەرگی ماوەتەوە. يەكەمين دە كتێبيان كە مەكياڤيللی بۆ نووسينی كتێبی ( دەمەتەقی) كردوێتييە سەرچاوەيەكی سەرەكی، باسی ئەو كارەسات و ڕووداوانە دەكەن كە هەتا ساڵی ٢٩٣ی پێش زايين ڕوويان داوە.

(٢٢) مەكياڤيللی ئەوەی لە پێشەكيی كتێبی ( دەمەتەقی)دا وتوە

(٢٣) F.Chabod ،op.Cit ،p،٢٤

(٢٤) F.Gilbert ،Machiavelli and Guiccardini.politics and history in sixteenth century. Florence، Prineeton، ١٩٦٥، p.١٩٩

(٢٥) R.Ridolfi ،Op،Cit،pp. ١٦٥-١٧٥

(٢٦)"The Prince"، p. ١٥ (the Introduction)

(٢٧) R.Ridolfi، Op. Cit، pp. ٢٤٩- ٢٥٠

(٢٨) پشتمان بە وەرگێڕانە عەرەبی و ڕووسی و ئينگليزييەكەی بەستوە.

(٢٩) بگەڕێرەوە لای: ئەلێن ڤيدرين -مەكياڤيللی -وەرگێڕانی أميرة الزين -بيروت - ساڵ نييە. ل٢٢-٢٣.

(٣٠) R.Palmer and J.Colton، A history of the Modern world، third edition، New York،١٩٦٥، p.٥٥

(٣١) مەكياڤيللی ئەم قسە بەناوبانگەی بە بۆنەی هێرشی فەرەنساييەكانەوە بۆ سەر ئيتاڵيا لە ساڵی ١٤٩٩ دا و بەرەو پێش چوونی خێرايانەيان وتووە "بگەڕێرەوە سەر مێژووی

ئیتالْیا بە زمانی رووسی جزمی یەکەم، لە ژێر چاودێری ئاکادیمیست.س.د سکارکینەدا، مۆسکۆ ١٩٧٠ ل٤٥٥"

(٣٢) : بەزۆری پشتم بە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی ئەم کتێبە بەستوە "بگەڕێرەوە سەر – دەمەتەقێی مەکیافیللی –وەرگێڕانی خیری حماد، بیروت، ١٩٦٢"

(٣٣) ئەوە تاقە کتێبێتی کەلە ژیانی خۆیدا لەساڵی ١٥٢١ دا بڵاوکراوەتەوە.

(٣٤) R. Palmer and J. Colton، Op،Cit.، p. ٥٥

(٣٥) J. Plamenatz،Man and Society. A criti-cal examenation of some important social and politicce theories، from machiavelli to Marx، vol. ١، tenth impression، London، ١٩٧٧، pp.١،٧

(٣٦) لە کۆتایی سەردەمی ناوەڕاستدا باری ئابووری ئیتالْیا خێراتر لەوڵاتەکانی تری ئەورووپا ڕووی لە پێشکەوتن کرد، ئەویش لە سایەی بازرگانی یە گەشەسەندووەکەیەوە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا و پێشکەوتنی بەرهەمی پیشەیی تیایدا بەڕادەیەك کەئیتالْیا پەر لە هەر شوێنێکی تری جیهان، یەکەمین نیشانەی پەیوەندی و بەرهەم هێنانی سەرمایە دارانەو دەستەو تاقم و چینە کۆمەڵایەتییە نوێیەکانی بە خۆیەوە دی.

(٣٧) H.Butterfield، Op. Cit.، PP. ١١٤-١١٥

(٣٨) : بۆ درێژەی باس بگەڕێرەوە لای : و.ل. فانیشتین، مێژوو ناسی ی ئەورووپایی ڕۆژئاوا لە سەردەمیناوەڕاستدا، بە زمانی رووسی، مۆسکۆ –لینینگراد ١٩٦٤،ل٢٨٦.

(٣٩) ئیتالْیاییەکانی گەلانی تری ئەورووپایان بە وەحشی (کێوی) ناو دەبرد، بەو مانایەی کەلە چاو خۆیاندا دواکەوتوون.

(٤٠) W. Lewis ،The Lion and the Fox. The role of the hero in the Plays of Shakespeare، London ،١٩٦٦ ،p. ٦٩

(٤١) د.ل. فاینشتین، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٩

(٤٢) H.Butterfield ،Op.Cit.، p، ٩٧

(٤٣) بۆ نمونە بگەڕێرەوە سەر: ئەلین فیدین، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

(٤٤) "The Prince" p.٢٠ (the Introduction).

(٤٥) : لە ڤ.رۆتینبۆرگ، سەرچاوەی پێشوو.ل١٢٢ەوە وەرگیراوە

(٤٦) : شارێکی فەڕەنسایە دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتی پاریسەوەو بارەگای دەربارەی پاشا بووە.

(٤٧): لە(ڤ. رۆتینبۆرگ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٢) ەوە وەرگیراوە.

(٤٨) : بۆرجیا بنەماڵەیەکی سەردلری ناسراوە کە بەنەژاد ئەرگۆنیی ئیسپانیایی یەو لە سەدەی پانزەیەمدا رووی کردۆتە ئیتالْیا. ئەم بنەماڵەیە لەسایەی ئەلفۆنسۆ بۆرجیا وە کە

له سالی ١٤٥٥ دا بووه به پاپا بەدیارکەوتوه. هەروەها ئەلیکساندەری شەشەمیش یەکێك بوو لە خزمانیو لە سالآنی (١٤٩٠-١٥٠٢)دا بوو بە پاپا.

(٤٩) H.Butterfield، Op. Cit.،pp ١٢١-١٢٢ ،.The Prince" ،pp. ٢٢-٢٣ "The Introduction).

(٥٠) :"مێژوویئیتالیا" (سەرچاوەی پێشوو)، ل٣٢٥-٣٣٦

(٥١) F.Chabod،Op.Cit.،pp.٩٤-٩٥،R.Ridolfi،Op.Cit.،p.٩

(٥٢) ئەلین فیدرین، سەرچاوەی پێشوو،ل٦٢

(٥٣) J.Plamenatz، Op، Cit.، p. ٢٢. R.Rodilfe، Op.Cit.، pp.٥٣-٦٤، J. Plamenatz، Op.Cit.،p.١٤.

(٥٤) : ئەم رایە بایەخێکی گەورەی هەیە، چونکە مەکیافیللییەکان دەبوو شوێن پێیان هەلبگرن.

(٥٥)F.Chabod، Op.Cit.،pp.١٤٠، ١٤٢ ،F. Gilbert، Op، Cit، pp. ١٧٦-١٧٧.

(٥٦) J.Plamenatz، Op،Cit، p. ٤٢.

(٥٧) S.H.Sabine ،A history fo Politcal theory New York، ١٩٥٠ pp.٢٢٧-٢٢٨

(٥٨) "برایتیی یەسوعییەت" یا (قەشە یەسووعییەکان)

(٥٩) R.Weiss، The spread of Italan Humanlam، London، ١٩٦٤، p.٨٤

(٦٠) : ناونیشانی تەواوی کتێبەکە ئەمەیە

"Discours sur les Moyens de bien gouverner et maintenir en bonne paix un Royaume ou autre Principaute-Contre Nicholas Machiavei" Florentin، ١٥٧٦

(٦١) بگەرێرەوە لای :

W.Lewis، Op. Cit.، pp. ٦٤،٧١-٧٢

(٦٢)Ibid،p.٧١

(٦٣) Ibid،p.٦٦

(٦٤) Ibid،p.٦٩

(٦٥) Ibid،p.٧٢

(٦٦) The Prince"، p.٩(the Introduction).

(٦٧) "Anti-Machiavel".

(٦٨) : لە ( و. د. فاینشتین، سەرچاوەی پێشوو، ل. ٢٦٨)ەوە وەرگیراوە

(٦٩) W.Lewis، Op. Cit.، p.١٠٢

(٧٠) مەبەست لەوەیە کە ئەگەر میرێك هەبوولیە خۆی بەقوتابیی مەکیاڤیللی بزانیایە، فەرمانی پێدەدا کە لە دانانی کتێبێکدا دژی مەکیاڤیللی لاسایی فریدریکی گەورە بکاتەوە.

(٧١) W.Lewis، OP. Cit.، PP. ١٠٢-١٠٣

(٧٢) Ibid ،p. ١٠٥

(٧٣) "Renaissance and Reformation ١٣٠٠-١٦٤٨، Edited by G.R.Elton، Second edition ،New York ،p. ١٠٩

(٧٤) : بگەڕێرەوە لای : ئەڵێن فیدرین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢-١٣

(٧٥) A.Ridolfi، Op. Cit.، p.٩.

(٧٦) : بگەڕێرەوە لای: ئەلین فیدین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢-١٣

(٧٧) مەکیاڤیللی، میر، ل ٦ "پێشەکی"

(٧٨) "The Civilization of the Renaissance in Italy" An Essay by J. Burckhardt، New York and Toronto ،p. ٩٣.

(٧٩) : أ. ك.جيفيليكۆف، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٧

(٨٠) : ڤ.رۆتینبۆرگ، سەرچاوەی پێشوو ل ١١٢-١١٣

(٨١) ئەنتۆنیۆ گرامشی، میری نوی، مەسەلەکانی زانستیی سیاسەت لە مارکسیەتدا وەرگێڕانی زاهی شرقان و قیس الشامی، بیروت، ١٩٧٠، ل ٣٥

(٨٢) R.Ridolfi ،Op، Cit ،pp ١٩٦-١٩٧

(٨٣) لەناو ئەو چەندین سەرچاوەیەدا کە بۆ ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە گەڕاومەتەوە سەریان تەنیا جیفیلیکۆف بایەخی تەواوی بەم باسە گرنگە داوە.

(٨٤) أ. ك جيفيليكۆف، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.

(٨٥) لە هەمان سەرچاوە وەرگیراوە، ل١٠٦.

(٨٦) هەمان سەرچاوە، ل ١٠٧.

(٨٧) : وتەکە لە هەمان سەرچاوە وەرگیراوە، ل١١١.

(٨٨) زۆربەی مێژوونوسان بە شێوەیەکی رووت و قووت ئیشارەتیان بەم وتەیە داوە، واتە بەبێ نیشاندانی ئەو باروبۆخەی تیایدا وتراوە کە ئەو بایەخێکی تایبەتی دەداتێ بۆ نموونە بگەڕێرەوە سەر:

R.Ridolfi ،Op ،Cit ،p٢٤١ ; F.Chabod ،Op، Cit p.١٤٢

(٨٩) مەکیاڤیللی زاراوەی "پێغەمبەری بێچەك"ی لەکاتی قسەکردنیدا لەبارەی رەبەنی فلۆرنسایی شۆرشگێری هاوچاخی خۆیەوە ( سافۆنارۆلا) بەکارهێناوە لەم رووەوە سەلماندویێتی کە سەرکەوتن تەنیا بەشی پێغەمبەرە چەکدارەکان بووەو دەبێ. "میر-بەشی شەشەم".

(٩٠) بەهۆی نەخۆشییەکەوە لە گەدەیدا مردوە کە رەنگە ئارام لە بەریران کارێکی گەورەی تێکدەی.

(٩١) گەلی لە مێژوونووسان مەکیاڤیللی نەك فرانسیس بیکۆن، بە داهێنەری ڕێبازی لێکەڕان (أستقرائی) دادەنێن.

(٩٢) : لە ڤ.ی. ڕۆتینبۆرگەوە وەرگیراوە، سەرچاوەی پێشوو، ل١١١.

(٩٣) سەرەڕای ئەو شاڵاوەش سیاسییەکان بە فراوانی لەسەر خویندنەوەی "میر" بەردەوام بوون "بگەڕێرەوە سەر

C.Hayes ،Modern Europe to ١٨٧٠ ،NewYork ١٩٥٩ ،p٢٦)

(٩٤) : ڤ.ی.ڕۆتینبۆرگ. سەرچاوەی پێشوو، ل١١٤

(٩٥) بگەڕێرەوە سەر "ئەنسیکلۆپیدیای فەلسەفی" بەزمانی ڕووسی، جزمی سییەم، مۆسکۆ ١٩٦٤ ل ٢٨٠.

(٩٦) ڤۆلتێر پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ ژمارەیەك لەو پادشا ئەوروپاییياندا هەبوو کە خۆيان بە پشتگیریکەری بزوتنەوەی ڕۆشنکاری (تنویر) نیشاندەدا، لەوانە فردریکی گەورە و قەیسەری رووسیا کاترینی دووەم

(٩٧) : بگەڕێرەوە لای أ.ك. جیفیلیکۆف، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠.

(٩٨) ك. مارکس و ف. ئینگلس، بەرهەمەکانیان بە زمانی ڕووسی، چاپی دووەم جزمی یەکەم، ل١١١.

(٩٩) ڤ. ی. ڕۆتینبۆرگ ئەو وتەیەی ئینگلس بۆ ناونیشانی کتێبەکەی دەربارەی سەردەمی ڕاپەڕین هەڵبژاردوە ( بگەڕێرەوە سەر پەراوێزی ژمارە ٤).

(١٠٠) : ك. مارکس و ف. ئینگلس، بەرهەمەکان، جزمی ٢٠، ل ٣٤٦.

(١٠١) : دوای گەڕانمان بە ناو هەر پەنجا وپێنج بەرگەکەی دوا چاپی بەرهەمەکانی لینیندا، هیچ ئیشارەتدانیکمان بە مەکیاڤیللی تیدا نەدین.

(١٠٢) : بگەڕێرەوە سەر: "دەمەتەقی"، پێشەکی، ل ١٥–١٧ ڤ.ی.ڕۆتینبۆرگ سەرچاوەی پیشوو، ل١٤٤.

H.Butterfield ،Op ،Cit pp ٨١–٨٣ ،J.Plamenatz.Op.Cit p. ٤٢
J.R.Strayer and others The Mainstream of Civilization، NewYork; ١٩٧٤ ،p ٤٠٨.

( ١٠٣) نووسەریش هەن کە ناپلیون بۆناپۆرت بە "نوێنەرێکی ڕاست و دوروست"ی مەکیاڤیللیزم دادەنێن. بۆ نموونە بگەڕێرەوە سەر:

(١٠٣) The Prince، p.٢٢ ( The Introduction) H.Butterfield ،Op ، Cit ،p ١٠٢

(١٠٤) : بگەڕێرەوە لای ئەنتۆنیۆ گرامش، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣ و شوێنی تریش.

(١٠٥) سانتیاگۆ کاریللۆ، ئەوڕۆ کۆمۆنیزم دەوڵەت، وەرگێڕانی د.سعاد محمد خضر، بەغدا، ١٩٧٨ ل ١٤.

( ١٠٦ ) : لە أ. ك. جیفیلیکۆفەوە وەرگێڕاوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠١.

(١٠٧) " The Prince "، p.٢١ ( The Introduction ).

(١٠٨) : پشتمان بەو چاپە بەستووە کە شێخ ئەلیاس خلیل زخریا، بیروت ١٩٦٣، ساغی کردۆتەوە و پەراوێزی لێداوە.

(١٠٩) رادەر دکتۆر ناجی حسین دەیەوێ بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەم باسە بدوێ.

(١١٠) بگەڕێرەوە سەر ئیف لاکۆست، أبن خلدونی ناودار، وەرگێڕانی میشال سلیمان، بیروت، نییە، ل١٥٦.

(١١١) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٩.

(١١٢) Creasy، History of the Ottoman Turks Beirut، ١٩٦١ ،pp. ٢٥٢–٢٥٣.

(١١٣) قسەی یەکێکە لەو وەرگێرە سورییانەی لای فەرەنساییەکان لەهێرشەکەیادا بۆ سەر میسر لەگەڵ محمد علیی گەورەدا لە سەردەمی خۆیدا ئیشی کردوە.

(١١٤) بۆ درێژەی باس بگەڕێرەوە سەر : دکتۆر جمال الدین الشیال، مێژووی وەرگێڕان و بزوتنەوەی رۆشنبیری لە سەردەمی محمد علی دا، قاهیرە، ١٩٥١، ل٧٨–٨٢، ١٦٦–١٦٧، ٢١٦

(١١٥) دەربارەی لاوازیی وەرگێڕانەکە بگەڕێرەوە سەر ئەو بەراوردەی دکتۆر جمال الدین الشیال لە ل ٢١٦ی کتێبەکەیدا کردویەتی. دەبێ ئەوەش بڵێین کە دەستنووسی ئەم وەرگێڕانە هێشتا ماوەو لە (دار الکتب ) ی میسریدایە.

(١١٦) "کتێبی میر کە بریتییە لە مێژووی میرایەتی یە رۆژئاواییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا" دانانی نیکۆلا مەکیاڤیللی، وەرگێڕانی پارێزەر محمد لتفی جمعە، قاهیرە ١٩١٢.

(١١٧) دەقی "میر" لە وەرگێڕانە عەرەبییەی دووەمەکەیدا لە ١٤٨لاپەرە دایە.

(١١٨) هەمان سەرچاوە، ل ٣٥

(١١٩) هەمان سەرچاوە، ل ٣٣

(١٢٠) لە ساڵی ١٩٦٠ دا وەرگێڕانێکی نوێی میر لە لایەن خیری حمادەوە بڵاوکرایەوە کە هەتا ئێستا چەند چاپێکی لێدەرچووە و لە پاڵ دەقی "میر" خویدا، وتەیەکی مۆسۆلینی و پێشەکییەکی فراوانی کریستیان گاوس و بە دواداچوونێکی فاروق سعدی وەك پاشکۆیەك لەدوادوایی کتێبەکەدا لە گەڵدان.

(١٢١) پارێزەر محمد لطفي جمعە وەك لە پێشەکییەکەیدا بۆ "میر" و لە شێوەی وەرگێڕانەکەیدا دەردەکەوێ، خاوەنی رۆشنبیرییەکی باڵا بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە رێگەی یەکێ لە ئەوروپاییەکانەوە نەبێ کە مەدح و ستایشی زۆری و نمونە هێنانەوەی بەردەوامی لەسەر مەکیاڤیللی سەرنجی ڕاکێشاوە و ئەوە وایلێکردوە بە دوای "میر"دا بگەڕێ و وەری بگێڕێ، دەنا چی تری دەربارەی مەکیاڤیللی نەبیستوە.

(١٢٢) " Encyclopedia Brttannica" vol. XI، Chicago-London ، ١٩٧٤، pp.٢٢٧،٢٣٠

(١٢٣) Encyclopedia Americana" vol،١٨ New York ،١٩٧٦ ،pp. ٥٢-٥٣

(١٢٤) "ئەنسکلۆپیدیای فەلسەفی"، بە زمانی رووسی، جزمە سێیەم، مۆسکۆ، ١٩٦٤، ل ٢٨٠-٢٨١.

(١٢٥) "ئەنسکلۆپیدیای مێژوویی سۆڤیاتی"، بە زمانی ڕووسی، جزمی هەشتەم، ١٩٦٥، ل ٩٢٣-٩٢٤.

(١٢٦) "ئەنسکلۆپیدیای گەورەی سۆڤیاتی"، بە زمانی ڕووسی، چاپی دووەم، جزمی ٢٥، مۆسکۆ ١٩٦٤، ل ١٠٦-١٠٧، هەروەها چاپی سێیەم، جزمی ١٥، مۆسکۆ، ١٩٧٤، ل٢٤(٧٠٩-٧١١).

(١٢٧) "مێژووی جیهان"، بەزمانی ڕووسی، جزمی چوارەم، مۆسکۆ، ١٩٥٨، ل ١١٥

(١٢٨) C.J.Hayes، Op.Cit.،pp.١٨،١١٥

(١٢٩) مەبەستمان، لیسلی ژکەری عەمیدی پێشووی کۆلیجی کامبیۆنە.

(١٣٠) بگەڕێرەوە سەر ل ١٩، ٢٢ ی پێشەکییەکەی لیسلی ژکەر لە "دەمەتەقێ"دا

(١٣١) "Aetion and Conviction in Early Modern Europe"، editors J.K.Rabb and J.E.Seigel، Princeton، New Jersey ، ١٩٦٩ ،p. ٢٦

سیفەتی دامەزرێنەری زانستیی سیاسەت بەلایەنی کەمەوە لە نیو سەدە لەمەویەرەوە، لەپاڵ ،اوی مەکیاڤیللیدایە.

(١٣٢) F.Gilbert، Op.Cit.،pp. ١٨٣، ١٩٩

(١٣٣) R.Palmer and J.Colton، Op. Cit.، pp. ٤٣

١٣٠) بگەڕێوە سەر ڤ. ی. ڕۆتینبۆرگ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٧-١٠٨

(١٣٥) R.Ridolfi ،Op. Cit.، pp. ٢٥١-٢٥٤.

(١٣٦) R.Weiss ،The Spread of Italian Humani –sm ، London ،١٩٦٤ ،p. ٨٣

(١٣٧) ا. ڤ. جیفیلیکۆف، سەرچاوەی پێشوو، لە ٩١.

Meer

میژوو کەم جار ڕووناکبیرێکی وەهای بە خۆیەوە دیوە کە بەردەوام و بە درێژایی چەند سەدەیەک. لە هەموو کووچەیەکی ئەم جیهانە بەرینەماندا بیروڕاکانی بە وێنەی مەکیاڤیللی ی ئیتالیایی کە ناوی دەچەسپێتە زەینی هەریەکێک لەوانەی بۆ یەکەم جار لە دەرگای سیاسەت دەدەن. بوویێتە مایەی بێنەو بەرەیەکی پڕ لە ناکۆکی. لەبەر ئەوە شتێکی سەیرنیی‌یە کە ئەم پیاوە و بەرهەمی قەڵەمەکەی دەستی تائەم ڕۆژانەش لە لایەن گشت لێکۆڵەرەوەکانەوە بەهەموو ڕێبازە جۆراجۆرەکانیانەوە، جێگای بایەخ پێدان بێ. جا هەرچەندە رووی شێوێنراوی مەکیاڤیللی لە دێر زەمانەوە لە بیرو هۆشی ڕۆژئاواییەکاندا بەرەو سڕینەوە چووەو رووە ڕاستەقینەکەی جێگای گرتۆتەوە. بەلام لای ڕۆژهەلاتیەکان هێشتا هەر وێنەکەی لەوەبەری لە بیرو هۆشدا چەسپەو بە شێوەیەکیش کە جیاوازیی لەگەڵ ئەوەکەی ئەورووپای سەدەکانی پێشوودانیە. سا ئەم لێکۆڵینەوەیە ئامانجی ئەوەیە کە بەپشت بەستن بە نووسینەکانی خۆیو بەو دوا بیروڕایانەی لێکۆڵەرەوەکان سەبارەت بیروباوەڕەکانی ئێکەیشتوون، ڕووە ڕاستەقینەکەی مەکیاڤیللی بخاتە پێش چاو. هەروەکو تەقەلا دانێکیشە بۆ گەیشتن بەهەندێ ئەنجام لێدەرهێنانی نوێی ئەوتۆ کەبۆ گفتوگۆ لەسەرکردن و پەرەپێدان دەشێن.

د. [illegible]

سەنتەری روناکبیری هەتاو
ژمارە ( 18 )
بەهاوکاری وەزارەتی رۆشنبیری سلێمانی لە چاپ دراوە

دکتۆر کەمال مەزهەر

# ڕێنیسانس

لەگەڵ باسێکی تر بەناونیشانی

## ئەدیبو ئەرکەکانی قۆناغ

فوئاد مەجید میسری
کردوویە بەکوردی

چاپی دووەم
٢٠٠٤

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان
www.roshnbiri.org
khanaywargeran@yahoo.com



- ناوی کتێب: ڕێنیسانس، لەگەڵ باسێکی تر بەناونیشانی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ
- نووسەر: دکتۆر کەمال مەزهەر
- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: فوئاد مەجید میسری
- بابەت: مێژوویی
- چاپی دووەم، ٢٠٠٤، سلێمانی
- بەرگ: نازەنین سالح
- تایپ و نەخشەسازی: ڕۆڤــان
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- زنجیرە: ٦٨
- ژمارە سپاردنی (٤٥٠)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە
- چاپ: چاپخانەی شڤان

# ناوەرۆك

# پێشەکی چاپی دووەم

بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست، دەرەبەگایەتی وەك سیستمێکی ئابوری-سیاسی، پشت بەستوو بووە بەدام و دەسگایەکی ئاینی. دام و دەسگایەك شەرعییەتی ئاینی دەدا بەهەموو ئەو یاسا و ڕێسایانەی دەرەبەگایەتی بەرهەمی هێنا بوون. هاوکات دەرەبەگایەتیش چەندین ئیمتیازی ئابوری و سیاسی بۆ دەسەڵاتی کڵێسە فەراهەمکردبوو. ڕۆشنتر بڵێین: لاهوتی مەسیحی بەشێك بوو لەو سەرخانەی بەتەواوی لەگەڵ ژێرخانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا دەگونجاو لەخزمەتیدا بوو. بۆیە یەکێك لەو ئەرکە گرنگانەی کەوتە ئەستۆی بیرمەندانی سەردەمی ڕێنیسانس ئەوەبوو، چاوێك بە فەلسەفەی سیاسی سەردەمەکەیاندا بگێڕنەوە و لە فۆرمێکی نوێدا فۆرمۆلەی بکەنەوە. چونکە هەلومەرجی تازەی سەردەمەکە پێویستی بەفەلسەفەیەکی نوێی سیاسی هەبوو بەجۆرێك بتوانێ ئاڵوگۆڕێك بەسەر فیکری سیاسی کۆمەڵگای کۆندا بهێنێ. ئا لەم حەقیقەتەوە بۆمان دەردەکەوێ بۆچی فیکری هومانیستانی سەردەمی ڕێنیسانس پەردەی لەسەر ڕوخساری دزێوی کڵێسەی کاتۆلیکی هەڵدایەوە و لاهوتی مەسیحی کردە یەکێك لە ئامانجەکانی.

بیروڕای هومانیستان سەبارەت بەژیانی مرۆڤ، تەواو پێچەوانەی بیروباوەڕی کڵێسە بوو کەدەیویست هەرچی شتی دونیایی هەن، بۆ خزمەتی ئەو دونیا (قیامەت) تەرخان بکرێن.! ئەم تێزە فیکرییە کە تەواو دژی لاهوتی کڵێسای کاتۆلیکی بوو، زەمینەی بۆ بزووتنەوەیەکی فیکریی مەزنتر خۆشکرد کە لەمێژوودا بە بزووتنەوەی ڕیفۆرمی ئاینیی ناسراوە. ئەو تێزە ئاینیانەی بزووتنەوەی ڕیفۆرمی ئاینیی بە ڕێبەرایەتی "مارتن

لۆتەر"و "جان کالڤن"* لەسەرەتاو ناوەڕاستی سەدەی شانزەهەمدا پیادەیان کردو جیهانی مەسیحیەتیان هەژاند، چەند تێزێکی فیکریی تازە بوون تەعبیریان لەهەل و مەرجی دونیایەکی نوێتر دەکرد. بەنموونە: لەمەیدانی سیاسیدا پشتگیرییان لەدەسەڵاتی رەهای دەوڵەتی پاشایەتیکرد. ئەو دەوڵەتەی لەهەوڵی ئەوەدا بوو، کڵێسە ناچار بکات چیتر دەست نەخاتە کاروباری سیاسییەوە.

لەکاتێکدا کڵێسەی کاتۆلیکی سوود "الربا- الفائدة"ی حەرامکردبوو، بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی شەرعییەتی پێ دەدا. ئەم هەڵوێستە پشتگیریکردنێکی ئاشکرا بوو لەسەرەتاکانی پرۆسەی کەڵەکەبوونی سەرمایە "عملية التراكم البدائي للرأسمال"و برەوی دەدا بەبەرژەوەندی چینی ناوەڕاست کە لەهەناوی کۆمەڵگای کۆنی سەدەکانی ناوەڕاست هاتبووە دەرەوەو دەیویست بوونی خۆی لەهەموو بوارەکانی ژیاندا بسەلمێنێ. شەرعییەت دان بەسوود، تێزێك بوو هاوتای بەرژەوەندی سەرمایەی بازرگانی. پرۆسەی بازرگانیش، لەو قۆناغەدا پرۆسەیەك بوو بەردی بناغەی بۆ هەموو ئەو ئاڵو گۆڕە گەورانە دارشت کەدوایی ئەورووپا بەخۆیەوە دی. هەر لەسایەی بازرگانییەکی پەرەسەندوودا کاری پیشەیی "العمل الحرفي" توانی گەشە بکاو بەخۆیدا بێ. هەر بازرگانیش بوو سیستمی ئابوری سروشتیی "الاقتصاد الطبيعي" پووکانەوەو

* مارتن لۆتەر ١٤٨٣- ١٥٤٦ لە هەرێمی "ساکسۆنیا"ی ئەڵمان لەدایکبووە. دوای ئەوەی لەزانکۆی "ئێرفۆرت" بڕوانامەی ماجستێری وەرگرت، روو دەکاتە خوێندنی یاسا. پاشان بۆتە قەشەو خەریکی خوێندنی لاهوت بووە، تا لەساڵی ١٥١٢ زانکۆی "ڤیتینبرگ" بڕوانامەی دکتۆرای پێ دەبەخشێ و لەهەمان زانکۆدا دەبێتە مامۆستا.

جان کالڤن ١٥٠٩- ١٥٦٤ لەفەرەنسا هاتۆتە دونیاوەو هەر لەوێش خوێندنی یاسای تەواو کردووە. لەبەرئەوەی سەر بەڕێبازی پرۆتستانت بوو، رووبەڕووی کڵێسە بۆتەوەو ناچار فەرەنسای جێهێشتووەو لەسویسرا گیرساوەتەوە.

لەجێی ئەو؛ سەرەتاکانی ئابوری سەرمایەداری دامەزراند کە بەرژەوەندی لەهێنانە دی بازاڕی یەکگرتوو، ئینجا قەوارەی سیاسی یەکگرتوودا دەبینییەوە.

لەبواری کلتوریشدا بایەخێکی زۆریدا بەزمانی نەتەوەیی و ژیاندنەوەی. گرنگی دان بەزمانی نەتەوەیی ئەگەرچی پێشەولیانی رێنیسانس وەك ئەرکێك لەئەستۆیانگرت؛ بەڵام لەقۆناغێکی تردا بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینیی خزمەتێکی گەورەی بەم لایەنەی کلتوری نەتەوەیی گەیاند. وەرگێڕانی "ئینجیل" لەلایەن خودی "لۆتەر"ەوە بۆ سەر زمانی ئەڵمانی هەرچەندە لەبنەڕەتدا بۆ مەبەستێکی ئاینیی بوو دەیویست هەموو کەسێکی ئەڵمان بتوانێ خۆبەخۆ لەئاینەکەی تێبگاو چیتر پێویستی بەوە نەبێ پەنا بباتە بەر لێکدانەوەو فەرمایشتەکانی پیاوانی کڵێسە؛ دەڵێین سەرەڕای ئەم ئامانجە ئاینییە، وەرگێڕانی "ئینجیل" بەسەرێك پلەو پایەیەکی شایستەی دا بەزمانی نەتەوەیی، بەسەرێکی تریش بووە فاکتەری بنیاتنانی شێوە زمانی یەکگرتوو، کە یەکێکە لەپایەکانی قەوارەی نەتەوەیی.

بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینیی وەك یەکێك لەدەرهاویشتە هەرە گرنگەکانی سەردەمی رێنیسانس، لە زەمان و زەمینەی خۆیداو لەرێگای دژایەتیکردنی لاهوتی کڵێسەی کاتۆلیکییەوە، پشتگیریی لەشێوە دەسەڵاتێکی نوێ دەکرد کە لەمێژووی ئەوروپادا بەدەسەڵاتی رەهای پاشایەتی "الملکیة المطلقة" ناسراوە.

هەموو ئەو شەڕو شۆڕو کوشتارەی لەو قۆناغەدا لەنێوان هەوادارانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی کڵێسەی کاتۆلیکیدا روویان داو گەلانی ئەوروپایان شەڵاڵی خوێنکرد، لەواقیعدا شەڕ نەبوون لەنێوان دوو مەزهەبی عیسایی جیاوازدا. شەڕ بوون لەنێوان چینێکی پشت بەستوو بەکڵێسەی کاتۆلیکی، لەبەرامبەر چینی بۆرژوای تازە پێگەیشتوودا. شەڕ بوون لەفۆرمی ئایندا، بەڵام ناوەڕۆکیان تەعبیری لەئامانجی دوو چینی کۆمەڵایەتی دەکرد. یەکەمیان لەپێناو پاراستن و درێژەدان بەدەسەڵاتی خۆی، دووەمیش دەیویست بوونی خۆی وەك هێزێکی نوێی کۆمەڵایەتی بسەلمێنێ و دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ و سیستمێکی سیاسی دابمەزرێنێ هاوتای مەوقیعی ئابوریی بێ. ئەم

چینە تازە پێگەیشتووە، بەپێچەوانەی چینی دەرەبەگەوە کە پشتی بەبەرهەمی سروشتیی "الإنتاج الطبيعي"و خود کەفایی "الاكتفاء الذاتي" دەبەست، برەوی دەدا بەبەرهەمی پیشەیی "الإنتاج الحرفي"و لەشێوەی کاڵای هەمەجۆردا دەیهێنایە بازاڕەوە. پرۆسەی کڕینو فرۆشتن، جگە لەوەی شێوە پەیوەندییەکی نوێی کۆمەڵایەتی هێنایە ئاراوەو برەوەی‌دا بەکاڵای هەمەجۆری پیشەیی، سیستمی گۆڕینەوەی کاڵا "مقايضة السلع"یشی لەبنو بێخ هەڵتەکاند کە پێشتر ئابوری دەرەبەگایەتی پەیڕەوی دەکردو لەجێی ئەو سیستمە، سیستمی دراو "النظام النقدي"ی داهێناو کردیە سیستمی باوو کارپێکراوی بازاڕ.

پەرەسەندنی کاری پیشەییو لەگەڵیدا پەرەسەندنی بازرگانی، هەروەك دوو پرۆسە بوونو یەکتریان تەواو دەکرد، پێویستیشیان بەوە بوو ماوە نەدەن هیچ کۆسپو تەگەرەیەك ڕێگا لەگەشەکردنیان بگرێ. باجی ناوچەیی، کەدەسەڵاتی ناوچەیی سەپاندبووی یەکێك بوو لەو کۆسپانەی ڕێگای لەپەرەسەندنی بەرهەمی پیشەییو پرۆسەی بازرگانی دەگرت. بۆچی.؟! چونکە دەرەبەگە ناوچەییەکان ئامادە نەبوون دەستبەرداری داهاتێك ببن چەند سەدە بوو بۆ خۆیان دابینکرد بوو. هەوڵی نەپساوەی چینی بۆرژوای تازە پێگەیشتوو، لەپێناو دابینکردنی بازاڕێکی یەکگرتووی فراواندا، هەوڵێك بوو، جگە لەوەی وردە وردە، دەسەڵاتی ئابوری میرە ناوچەییەکانی دەپووکاندەوە بووە هۆی دامەزراندنی قەوارەی سیاسی گەورەتر، کە لەمێژوودا بەدەوڵەتی نەتەوەیی ناو زەد بووە.

بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی کە بۆخۆی یەکێك بوو لەدەرهاویشتەکانی سەردەمی ڕێنیسانس، دەبوو لەناو ئەم پرۆسە مەزنەدا مەوقیعی خۆی دیاری بکا. ڕێبەرانی بزووتنەوەکە هەر زوو هەستیانکرد بەبێ پاڵپشتێکی بەهێزی سیاسیو سەربازی مەحاڵە بزووتنەوەکەیان سەرکەوتن بەدەست بهێنێ. بۆیە دەبینین دەرەنجامی پشتگیریکردنی دەسەڵات لە بزووتنەوەکەو بزووتنەوەکە لەدەسەڵات، لەلایەك بزووتنەوەکە شکڵێکی سەربەخۆی وەرگرت کەبە "پرۆتستانت" ناسراوە، لەلایەکی تریشەوە، دەسەڵات چووە فۆرمی دەوڵەتی رەهای پاشایەتییەوە.

* * *

لەبەرئەوەی تیوری دەسەڵات بەشێك بوو لە لاهوتی مەسیحی، بەدرێژایی سەدەكانی ناوەڕاست، تەنها توێژێك خوێندەواری سەر بەكڵێسە مافی ئەوەی هەبووە قسە لەسەر مەسەلەی دەسەڵات بكا. ئاوێتەكردنی تیوری دەسەڵات بە بنەماكانی ئاینی مەسیحییەوە كەكڵێسەو پیاوەكانی بەرهەمیان هێناو بەبەردەوامی پراكتیزە دەكرا، بۆ ئەوە بوو سنوورێك بۆ دەسەڵاتی میری دەرەبەگ دەستنیشان بكرێ. هاوكات كڵێسە دەیویست تاكەكەسی عیسایی دڵنیا بكاتەوە كەهەرچی كاروكردەوەیەك دەسەڵاتداران ئەنجامی دەدەن دژ بەسەرەتاكانی ئاینی عیسایی نین‌و مرۆڤی خاوەن باوەڕ لەسەریەتی پەیڕەوی فەرمان‌و فەرمایشتی دەسەڵاتداران بكا. كەواتە فیكری سیاسی‌و فیكری ئاینی لەو سەردەمەدا تەواوكەری یەكتر بوون‌و كەس بۆی نەبووە لەیەكتر جیایان بكاتەوە. ئەوەی ئەم رچەیەی شكاندو بۆ یەكەمجار سترەكتۆری فیكری سیاسی كڵێسەی لەبن هەڵتەكاند "میكیافیللی" بوو كەیەكێكە لەدیارترین بیرمەندانی سەردەمی رێنیسانس‌و تیوری دەسەڵاتی لەلاهوتی مەسیحی جیاكردەوە. ئەم هەڵوێستە فیكری‌و سیاسییەی "میكیافیللی" هەڵوێستی كەسێك بوو لەدەرەوەی دەسەڵاتی كڵێسەداو بناغەیەكی نوێی بۆ تیۆری دەسەڵات‌و شێوەی حوكمڕانیكردن دامەزراند. "میكیافیللی" كەسێكی سیاسەتمەدار بوو، نەك پیاوی ئاینی‌و هەوڵیدا بیسەلمێنێ، كەئەخلاق‌و ئاین ناشێ تێكەڵ بەتیوری دەسەڵات بكرێن. دەسەڵات دەسەڵاتەو هیچ پەیوەندییەكی بە هەڵوێستی ئەخلاقییەوە نییەو ناشێ دەسەڵاتدار خۆی پابەندی هیچ میتۆدێكی ئەخلاقیی بكا. ئەوەی لای "میكیافیللی" گرنگ بوو، پارێزگاری لەبونیادی دەوڵەت بكرێ‌و هەمیشە هەوڵی بەهێزكردنی بدرێ. جائیتر بەچ شێوەیەك بەهێز دەبێ‌و چ رێگایەك بۆ گەیشتن بەو مەبەستە دەگیرێ، گرنگ نییە. ئەوەی مەبەستە گەیشتنە بەئامانج نەك شێوازەكانی گەیشتن بەئامانج. "میكیافیللی" كە لەم روانگەیەوە دەیڕوانییە دەسەڵات، مەبەستی بوو ولاتێكی لەتوپەتكراوی وەك ئیتالیا، یەك بگرێتەوەو لەسایەی دەوڵەتێكی یەكگرتووی گەورەدا بەرێوە بچێ.. باوەڕی وابوو كەدەبێ ئاین لەخزمەت سیاسەتدا بێ نەك بەپێچەوانەوە. كەدژایەتی ئاینی عیسایی دەكرد لەبەرئەوەبوو كەمرۆڤ فێری ملكەچی دەكاو ئاینێكیش مرۆڤ لەسەر ئەو میتۆدە رابهێنێ، كۆمەڵگا بەرەو هەڵدێر دەبا. دیارە ئەم هەڵوێستە فیكرییەی "میكیافیللی"

ئەوە ناگەیەنێ کەمرۆڤێکی بێ باوەڕ "ملحد" بووە، نەخێر.. میکیافیللی باوەڕی بەئاین هەبوو، وەلی باوەڕی بەئاینی عیسایی نەبوو. سەروەریی دەوڵەتی لەوەدا دەبینیەوە بگەڕێتەوە بۆ سەر ئاینی کۆنی ڕۆمان کەبووە پشتو پەنای دەوڵەتی ڕۆماو ئەو ئیمپراتۆریەتە مەزنەی نیوەی دونیای کۆنترۆلکردبوو.

لێرەوە خەسڵەتێکی گرنگی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینیمان بۆ دەردەکەوێ، ئەویش ئەوەیە کەڕێبەرانی جگە لەوەی رووبەڕووی لاهوتی کڵێسەی کاتۆلیکی بوونەوە، بۆ خۆیشیان ڕۆشنبیری سەریەکڵێسە بوون بە لاهوتی کڵێسە گۆشکرابوون. ئەم هەڵوێستە فیکریو سیاسییە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرە، کە کۆمەڵگا پەرەسەندنێکی وەهای بەخۆیەوە دیبوو، سەرخانەکەی لەگەڵ ژێرخانی کۆمەڵگادا نەدەگونجاو پێویستی بەسەرخانێکی گونجاوتر هەبوو. سەردەمێك بوو لاهوتی کڵێسەی کاتۆلیکی نەیدەتوانی لەبەرامبەر ئەو پێشکەوتنە ئابوریو کۆمەلایەتیو ڕۆشنبیرییەدا خۆی رابگرێ کە رێنیسانس لەماوەی نزیکەی دوو سەدەدا بەرپایکردبوو. بۆیە لەسەرەتاوە بزووتنەوەکە سیمایەکی لاهوتی لەخۆگرتو هەوڵی دا بەپێچەوانەی بیروڕای کڵێسەی کاتۆلیکییەوە، پەیوەندی نێوان مرۆڤو خواوەند بەشێوەیەکی تر لێك بداتەوە. بەدرێژایی چەند سەدە کڵێسە مرۆڤی عیسایی لەسەر پرەنسیپێك راهێنا بوو گوایە، لەرێگای کڵێسەوە نەبێ مرۆڤ ناتوانێ بگاتە ئەو بەختەوەرییەی خواوەند بۆ مرۆڤی ئیمانداری ئامادەکردووە.!! بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی بەپێچەوانەی ئەم تیزەوە رایگەیاند: مرۆڤ لەتوانایدایە خۆبەخۆو بێ دەست تێوەردانی هیچ لایەنێك خوای خۆی رازی بکاو هیچیش پێویست ناکا، کڵێسە ببێتە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان خواوەندو مرۆڤ.

بێگومان ئەو لایەنەی مافی ئەوەی هەبێ خۆی بکاتە ئەڵقەی پەیوەندیو رەزامەندی خودا بۆ مرۆڤی دابین دەکا، دەشتوانێ لەگوناهەکانی خۆش بێ.! قەواڵەی لێخۆشبوون "صك الغفران" کەکڵێسە بەمرۆڤی عیسایی دەفرۆشتەوەو بەناوی خواوەندەوە لەگوناهەکانی خۆش دەبوو، یەکێکە لەدیارترین ئەو نەریتە ئاینیانەی لاهوتی عیسایی لەماوەی دەسەلاتی رەهای کڵێسەدا پیادەیکردو بەسەر کۆمەڵگایدا سەپاند.! هەر تەنها بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینیی بوو توانی رووبەڕووی ئەم نەریتە ببێتەوەو تاوانباری بکا. تەنها بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی دەیتوانی بۆ مرۆڤی عیسایی بسەلمێنێ کە

خوێندنەوەی "ئینجیل"و تێگەیشتن لەدەقەکانی، شتێکە لەتوانای هەموو کەسدایەو دەتوانن بۆ خۆیان بیخوێننەوەو پەیرەوی بکەن؛ بێ ئەوەی پێویستیان بەپیاوانی ئاین هەبێ. ئەم تێزەی ریفۆرمی ئاینی پیادەیکرد، ئەگەرچی بەڕووالەت تێزێکی ئاینییە بەلام لەناوەرۆکدا تەعبیری لەمافی تاکەکەس و هەڵوێستی تاکەکەس دەکردو بەقووڵیی ئاسەواری خۆی چ لەبواری کۆمەلایەتیی و چ لەبواری فیکرو فەلسەفەدا بەجێ هێشت. هاوکات بیرۆکەیەکی نوێ بوو بەتەواوی لەگەڵ ئەو پەرەسەندنە ئابورییەدا دەگونجا کە قۆناغە مێژووییەکە هێنابوویە ئاراوە.

بایەخ دان بە رۆڵی تاکەکەس، بەو جۆرەی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی پیادەیکرد خواستو ئامانجی ئەو چینە کۆمەلایەتییەی بەرجەستە دەکرد کەلەهەناوی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتییدا نەشونمای دەکردو رایدەگەیاند: هەموو کەس مافی خۆیەتی کار بکاو لەڕێگای پیشەییەوە بێ یان بازرگانی، سەروەتو سامان پێکەوە بنێ.

هەر لەو کاتەدا کەسیاسەتمەدارێکی وەك "میکیافیللی" تیورەکەی خۆی لەسەر دەسەلات پیادەکردو فیکری سیاسی لەلاهوتی عیسایی جیا کردەوە، رێبەرانی بزووتنەوەکە گەیشتنە ئەو باوەڕەی بزووتنەوەکەیان پێویستی بەپشتگیریی دەسەلات هەیە، دەنا مەحاڵە سەرکەوتن بەدەست بهێنن. هەر دەسەلاتیش دەیتوانی بەشێوەی سیاسیو سەربازی بەرگریی لە بزووتنەوەکەو ئامانجەکانی بکا. ئەم هەڵوێستە فیکرییەی رێبەرانی بزووتنەوەی ریفۆرم ئەگەرچی ئاکامەکەی دەسەلاتی رەهای پاشایەتی بەرهەم هێنا، بەلام دەسەلاتی رەهای لەدەست کڵێسەو پیاوەکانیدا نەهێشت. چیتر نەیاندەتوانیو بۆیان نەبوو بەناوی خواوەندەوە لەکەس بپێچنەوەو تاوانباری بکەن.

داکۆکیکردنی سیستمی پاشایەتیش لەخودی بزووتنەوەکە لەو جێیەوە سەرچاوەی دەگرت کە؛ هەتا کڵێسە دەسەلاتی ئابوری کۆتاتر بێ، دەسەلاتی سیاسیشی لاوازتر دەبێ. بەڕاستیش وا دەرچوو. هەرزوو پادشاکانی ئەورووپا دەستیانگرت بەسەر زۆربەی زەویو زارەکانی کڵێسەداو چیتر ئامادەیش نەبوون باجی ئاینیی کەپێشتر بەسەریاندا

سەپێنرابوو بەکڵێسەی بدەن. بەو جۆرە دەوڵەتی پاشایەتی هەم لەژێر رکێفی کڵێسە خۆی رزگار کرد، هەم لەرێگای بەهێزبوونی مەوقیعی ئابوورییەوە، مەوقیعی سیاسی بەهێزتر کردو مرۆڤی عیسایی ناچار بوو باوەڕ بەیەك دەسەڵات بهێنێ. ئەو دەسەڵاتەیش دەوڵەتی رەهای پاشایەتی بوو.

ئەم حەقیقەتە مێژووییە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرە کە بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی بەو جۆرەی کە لاهوتی مەسیحی لە فیکری سیاسی جیاکردەوەو تیوریزەیکرد، بەکردەوەیش بووە فاکتەری پتەوترکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی‌و پراکتیزەیکرد. حەقیقەتی مەسەلەکەیش ئەوەیە؛ رێبەرانی بزووتنەوەکە لەگەرمەی ململانەیاندا لەگەڵ دەسەڵاتی کڵێسەدا، پێویستیان بەهاوپەیمانێکی بەهێزو خاوەن قودرەت هەبوو. ئەمەیش ناچاریکردن ئەوەندە بەتەنگ مافی هاوڵاتیانەوە نەبن‌و دەربەستی ئەوە نەیەن دەسەڵات چۆن بەڕێوە دەچێ‌و ستەمی سیاسی کۆمەڵگا بەچ ئاقارێکدا دەبا. چ "لۆتەر"و چ "کالفن" راشکاوانە دەیانگوت: هاوڵاتیان لەسەریانە مل بۆ حوکمڕانی خۆیان کەچ بکەن‌و لێی یاخی نەبن. دەیانگوت: با کاروکردەوەی حوکمڕان ناعادلیش بێ، هاوڵاتی لەسەریەتی ملکەچی دەسەڵات بێ‌و بەموو لەفرمانی دەرنەچێ..! رایاندەگەیاند؛ یاخیبوون لەدەسەڵات مەزنترین گوناهەو تاکەکەسی عیسایی ناشێ توخنی شتێك بکەوێ باوەڕی لەق بکا. چونکە ئەو دەسەڵاتەی لەسەر زەمین کاروباری مرۆڤ بەڕێوە دەبا، دەسەڵاتێکی خواییەو خواوەند بەقودرەتی خۆی بەحوکمڕانی بەخشیوە.!! لەبەرئەوە هەر سەرپێچی‌و یاخیبوونێك لەتەختی پاشایەتی تاوانێکە بەرامبەر بەخواوەند.!!

وەنەبێ رێبەرانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی لەزوڵم‌و ستەمی دەسەڵاتداران بێ ئاگا بوون؛ نەء.! ئەوانە بەم هەڵوێستە دەیانویست پشتگیری دەسەڵات لەدەست نەدەن؛ نەبا بەتەنهاو بێ پشت‌و پەنا لەمەیداندا بمێننەوەو بزووتنەوەکە زیندەبەچاڵ ببێ. لەبەرئەوە راشکاوانە گوتیان؛ مرۆڤی عیسایی بەدەستی زوڵمەوە بناڵێنێ لەوە چاکترە

لەسیستەمێك یاخی ببێ خواوەند بەقودرەتی خۆی بۆ مرۆڤی دامەزراندووە*. تەنانەت مەسەلەکەیان واوەتر بردو خودی "کالڤن" رایگەیاند: حوکمڕان لەخۆوە خراپ نابێ؛ خراپیی ئەو ئیرادەی خوای لەسەرەو خواوەند دەیەوێ لەڕێگای دەسەڵاتدارێکی لەو جۆرەوە سزای هاوڵاتیان بدا.!!

ئەگەرچی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی رۆڵێکی گەلێك مەزنی لەبواری سیاسیو کۆمەڵایەتیدا بینی، بەڵام وەك هەر بزووتنەوەیەکی ریفۆرمی، نەیتوانی رۆڵی کڵێسەو پیاوانی لەڕیشەوە هەڵبکێشێ. رۆشنتر بڵێین؛ سترەکتۆری فیکریی بزووتنەوەکە پشتی بەبەرنامەیەکی ریفۆرمی دەبەست نەك ریشەیی. ئەو تێزانەیش رێبەرانی پیادەیان دەکردن چون یەکو هاوئاهەنگ نەبوونو لەسەر زەمینەی واقیع هەندێ دەرەنجامیان لێ کەوتەوە، پێچەوانەی خودی بزووتنەوەکەو ئەو ئامانجانە بوون لەسەرەتاوە بانگەشەیان بۆ دەکرا، بەنموونە: "لۆتەر" کەلەسەرەتاوە بانگەشەی بۆ ئازادی تاکەکەس کردو باوەڕی تەواوی بەئازادیی مرۆڤ هەبوو، چونکە لەڕوانگەی ئاینەوە دەیڕوانییە مەسەلەی ئازادییو بەکردەوەیش بووە هاوپەیمانی دەسەڵات، دەبینین خۆیو بزووتنەوەکەی بوونە فاکتەری هێنانەدی دەسەڵاتی رەهای پاشایەتیو بەکردەوە ئازادییان زیندەبەچاڵکرد. لەهەر وڵاتێکی ئەوروپاییدا حوکمڕانان پشتگیرییان لەتێزەکانی "لۆتەر" کردبێ، دەسەڵاتی سیاسی چۆتە فۆرمی دەوڵەتی رەهای پاشایەتییەوە. هەرچی "کالڤن" بوو، بەهەمان شێوەی "لۆتەر" باوەڕی بەدەسەڵاتی رەها هەبوو، بەڵام لەسەرەتاوە ئازادیی تاکەکەسی نەسەلماندو بڕوای پێی نەبووە. لەهەر وڵاتێکی ئەوروپاییدا رێبازەکەی بڵاوبووبێتەوە، هەوادارانی کەمینەیەکی زۆرلێکراوو ستەم

---

* ئیبنوحەنبەلو ئیبنوحەزمو ئەلماوەردیو غەزالیو ئیبنوتەیمییە کە پێنج موجتەهیدی سوننە مەزهەبن، لەمەڕ پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتو هاوڵاتی هەمان رایان هەیە. ئیبنوحەنبەل مەسەلەکە واوەتر دەباو دەسەڵاتداری فاسقیشی قەبوڵە. ئیبنوتەیمییەیش رای وایە، کۆمەڵگای ئیسلام شەست ساڵ لەسایەی دەسەڵاتێکی ستەمکاردا بێ لەوە چاکترە یەك رۆژ بەبێ دەسەڵات بێ.!!

نیدەبوون. بەڵام چونکە خۆیان بەخاوەن باوەڕی راستەقینە دەزانـی، ئامـادەبوون لەبەرامبەر دەسەڵاتدا بێ ترس و سڵەمینەوە بەرگری لەخۆیان بکەن. بەم هەڵوێستەیان وردەوردە بەردی بناغەیان بۆ نەریتێکی سیاسی دامەزراند لەوەدوا هاوڵاتی بۆی هەبوو بەرگریی لەباوەڕی خۆی بکاو ئاکام ئەو وڵاتانەی کەوتنە ژێر کاریگەری تێزەکانی "کالفن"ەوە، مەودای ئازادییان بۆ تاکەکەس فراوانتر کرد.

"لۆتەر" باوەڕی وابوو کە دەبێ دەسەڵاتی سیاسی کۆنترۆڵی کڵێسەو دەسەڵاتی ئاینی بکا. لەهەر وڵاتێکیشدا دەسەڵاتی سیاسی ئەم تێزەی پیادەکرد بێ و کڵێسە کەوتبێتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، کڵێسە مۆرکێکی نەتەوەیی بەخۆوە لکاندووەو بووەتە خاوەنی خسووسیەتی نەتەوەیی. هەرچی "کالفن" بوو رایگەیاند کەدەبێ ئاین بەتەواوەتی لەدەوڵەت جیابکرێتەوەو نابێ ماوە بدرێ کڵێسە دەخالەت لەکاروباری سیاسیدا بکا.

ئەم جیاوازییانەی لەبیرکردنەوەو تێڕوانینی هەریەک لەدوو رێبەرەکەی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینیدا دەیانبینینەوەو لێرەدا بەخێرایی ئامازەمان بۆ کردن هیچ لەڕۆڵی گرنگو مێژوویی بزووتنەوەکە کەم ناکەنەوە. بزووتنەوەیەک توانی لەزەمانو زەمینەی خۆیدا بونیادی لاهوتی مەسیحی بهێننە لەرزەو لە روانگەیەکی ترەوە بڕوانێتە ژیانو رۆڵی مرۆڤ لەدونیایەکدا، مرۆڤ بۆ خۆی بنیاتنەرو فاکتەری پێشکەوتنیەتی.

هەڵبژاردنی بابەتێکی گرنگی وەک بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی بۆ پێشەکی چاپی دووەمی ئەم کتێبە لەو روانگەیەوە بوو کە خودی بزووتنەوەکە یەکێکە لەدەرهاویشتەکانی رێنیسانسو پەیوەندییەکی دیالێکتیکی پێکیانەوە گرێ دەدا. دەنا گرنگیی بزووتنەوەکە چ لەباری مێژووییو چ لەڕووی پەرەسەندنی فیکری سیاسییەوە دەهێنێ هەزاران لاپەڕەی لەبارەوە بنووسرێو مەودا جۆراوجۆرەکان بخرێنە بەرباسو لێکۆڵینەوە.

**فوئاد**

٢-٧-٢٠٠٤

## پێشەکی چاپی کوردی

چەند بایەخ بدرێت بە رۆژگاری رێنیسانس‌و دەسکەوتە زۆرەکانی هێشتا کەمە، چونکە دەتوانین زۆری لێوە فێر بین. دیارە هەر ئەوەشە وای لەرووناکبیرانی هەموو جیهان کردووە بێ وچان بەرز بڕواننە دیاردە جیاوازە زیندووەکانی چەرخی بووژاندنەوە کەئێمەی کورد زۆر نییە لەشێوازێکی تایبەتیی خۆماڵیدا رێگەیمان گرتۆتە بەر. لەخۆڕا نەبوو پێشەنگی دەستەی رووناکبیری (چەرخی بوژاندنەوەی کورد) لەگەلێك دەرگەیان دەدا، تیایاندا هەبوو لەیەك کاتدا زانای ئاین‌و ئەدیب‌و مێژوونووس‌و رۆژنامەنووس‌و پیاوی کۆمەڵ‌و سیاسەت بوو. قازی محەمەدو جەلادەت بەدرخان‌و مەلای گەورەو ئەمین زەکی‌و پیرەمێردو حسەین حوزنی موکریانی‌و رەفیق حیلمی لەو کەڵانەی کوردن کەوەك نەمرانی رۆژگاری رێنیسانس لەپێناوی وریاکردنەوەی گەلدا بۆیان بکرایە خۆیان دەکرد بەکونی دەرزیدا.

جا دیارە کورد پێویستی زۆرە بەو بەرهەمانەی دەتوانن ببنە یاریدەدەری بۆ دۆزینەوەی رێڕەوی راست. بەوێنە شەرمە گەر لەبواری سەخت‌و بێ ئەندازە پێویستی دارشتنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا نەتوانین کەڵك لەتاقیکردنەوە یەکجار بەکەڵکەکانی رۆژگاری رێنیسانس ببینین.

سوپاسی زۆرم بۆ کاك فوئادی مەجید میسری کەئەرکی وەرگێڕانی ئەم بەرهەمەمی لەکۆڵ کردمەوەو بەکوردییەکی رەوان‌و پێشەکییەکی قووڵەوە کردییە دیاریی دەستی هەردوکمان بۆ خوێنەری کوردی ئازیز کە وریاکردنەوەی مەبەستی بەرودوای زۆریەی نووسینەکانمە.

کەمال

نەورۆزی ١٩٨٤

# ئیستاتیکای قۆناغێکی نوێ

زانیاریی مێژوو، وەك هەموو لقەکانی دیکەی زانستە مرۆڤایەتییەکان، بەدرێژایی مێژووی ئادەمیزاد سەدانو هەزاران کەس توخنی کەوتوونو شتیان لەبارەوە نووسیوەو بەشێوەی جۆربەجۆر لێیان کۆڵیوەتەوەو بیروڕای خۆیان لەسەر دەربڕیوە.

بەڵام تاناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، ئەم زانیارییە کە راستەوخۆ پەیوەندیی بەرەوتی گەشەکردنی مێژووی ئادەمیزادەوە هەیە، ئەو شەقڵە زانستییەی نەگرتەخۆ کەپێویست بوو لەنووسینەوەیدا پەیڕەو بکرێ. لای هەندێك، مێژوو ئارەزووی تاکەکەس پاڵپێوەنەری بووە. هەندێکی دیکەیش دەیانبردەوە سەرخواستی هێزە نادیارەکانو لەو روانگە میتافیزیکییەوە تێیان دەڕوانی.

لەدوای ئەو مێژووە -واتە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم- بیروڕای زانستییانە، وەك پێداویستییەکی مێژوویی هاتە کایەوەو سەرپاکی ئەو بۆچوونو لێکدانەوانەی پووچ کردەوە کەپێشتر لەسەر مێژووی کۆمەڵو لەڕوانگەی ئایدیالیزمییەوە نووسرابوونەوە. لەو کاتەوە، مێژوو بووە زانیارییەکی سەربەخۆو توندوتۆڵو بەباری ئابووریو بەرژەوەندی چینو توێژە کۆمەڵایەتییەکانەوە گرێ دراو سەلمێنرا کەبنکەی ئابوری کۆمەڵ هێزی پاڵپێوەنەری مێژووە. وەنەبێ ئەم رایە ئەوە بگەیەنێ کەبیرو نەریتی کۆمەڵایەتیو بیروباوەڕی ئاینیو هونەر بەگشتیی، هیچ رۆڵێکیان لەڕەوتی بەرەوپێشەوە چوونی مێژوودا نییە، نەخێر، چونکە ئەوانەیش لە بارودۆخی خۆیاندا بەم یان بەو شێوە کار لەبنکە ئابورییەکەی کۆمەڵ دەکەنو دەوری خۆیان دەبینن. منیش لەناوەڕۆکی ئەم چەند دێڕەدا، مەبەستم ئەوە نییە پێشەکی بۆ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی بنووسم کەخامەی رەنگینو بەبڕشتی شارەزاو پسپۆڕێکی لێهاتووی کورد بەرهەمی هێناوە. بەڵکو دەمەوێ توخنی بنچینە تیۆرییەکانی ئیستاتیکای ئەو

سەردەمە بکەوم کەدکتۆر لەدووتوێی کتێبەکەیدا بایەخێکی زۆری پێ داوەو لەبەرهەمی نووسەرو هونەرمەندانی کۆڵیوەتەوەو لـەتێروانینێکی زانسـتییانەوە چەسـپاندویەتی کەپەرەسـەندنی باری ئـابوری ئـەوروپا، زەمینەیـەکی بـەپیتی بـۆ هونـەرو ئـەدەبیاتو تێکڕای زانیارییەکانی تر رەخساندو لەسایەیدا کۆمەڵگای ئەوروپایی ئەو گۆڕانە مەزنـەی بەخۆیـەوە دی کەلـەمێژوویی مرۆڤایـەتیدا گرنگییـەکی لەئـەندازە بـەدەری پـێدراوەو ئائێستایش مایەی دەیانو بگرە سەدان توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی جۆربەجۆرە.

زاناو فەیلەسووفو هونەرمەندو نووسەران بەگشـتیی کەباسـی مێـژووی پـەرەسـەندنی ئیستاتیکا (علم الجمال) دەکەن، لایان وایە سەدەکانی بووژاندنەوە قەڵەمبازێکە بەسـەر ئیستاتیکای سەدەکانی ناوەڕاستو بیروڕای کڵێسەداو هەوڵدانێکی مەزن بووە، بۆ رزگار کردنی ئادەمیزاد لەو کۆتو پێوەندانـەی ئیسـتاتیکای دەرەبەگایـەتی لەدەسـتو پـێی نووسەرو هونەرمەندانی توند کرد بوو.

پاش ئەوەی شێوازی بەرهەمـهێنانی کۆیلەیـەتی لەئیمپراتۆریـەتی "رۆمـانی"دا تێكو پێك درا، سەرەتای قۆناغێکی نوێ دەستی پێکردو چـەند کۆمەڵگایـەکی دەرەبەگایـەتی لەئەوروپادا هاتنـە کایـەوە. بێگومـان ئـەو گۆڕانـە بنچینەییـەی بەسـەر بـاری ئـابووری کۆمەڵدا دێ، بەدوای خۆیدا بیروڕاو بنەمای فیکریـی خـەڵکیش دەباتـە بـارێکی تـرەوەو مەفهومی چاکـەو خراپـەو بـەهێزیو لاوازیـیو مـافی ئـادەمیزاد بەچەشنێکی تـر، لێـك دەدرێنـەوە. یاسـا ئیسـتاتیکییەکانیش لـەم روانگـە نوێیـەوە، دەڕواننـە سـەرجەم مەسەلەکانی ژیانو لەدوایین لێکدانەوەدا شەقڵو سیمایەکیتر دەگرنە خۆ.

لەسەدەکانی ناوەڕاست دا، هونـەر بەگشـتیی کـەوتبووە ژێـر دەسـەڵاتی کڵێسـەوەو پیـاوانی ئـاینی بـەو چەشـنەی لەگـەڵ بـیروڕای کڵێسـەدا بگونجـێ، هونـەریان ئاڕاسـتە دەکردو دەیانویسـت لەخزمـەتی ئـایندا بـێ. نووسـەرو هونەرمـەندانیش -بەپێچەوانـەی قۆناغی کۆیلەتییەوە- چینێکی هەڵبژاردەی کۆمەڵ نەبوون، بەڵکو سەر بـەچینو توێـژە کۆمەڵایەتییە هەژارو نـەدارەکان بـوون. ئەمانـە ئەگـەرچی لـەژێر بـاری چەوساندنەوەدا

دەياننالآند، بەلآم بەچەشنی کۆيلە تەماشا نەدەکران‌و کەس مافی کڕين‌و فرۆشتنيانی نەبوو.. بەجۆرێکی تر بلێين هاوولآتييەکی ئاسايی بوون‌و دەيان توانی، بەپێی ياسا، سوود لەمافی ڕەوای خۆيان وەربگرن. چينی دەرەبەگی دەسەلآتداريش لەپێناوی بەرژەوەندييەکانی خۆيدا، ناچار بوو دان بەمافی ڕەوای چينە هەژارەکاندا بنێ، چونکە ڕۆلێکی گرنگيان لەبەرهەمهێناندا دەگێڕا. ئەم واقيعە نوێيە کارێکی کرد چينی دەرەبەگ ناچار بێ حسابێکی ورد بۆ نيازو مەبەستە مەعنەوييەکانيان بکا. لەبەرئەوە کەوتەخۆو هەستی بەوەکرد پێويستی بەئايديۆلۆژيايەك هەيە بەرژەوەندييەکانی بنجبەست بکاو لەهەمان کاتيشدا بيخاتە مێشك‌و دەروونی جەماوەرەوە.

لەو قۆناغەدا ئاينی مەسيحی توانی ئەم ئەرکە بەجێبهێنێ، بۆيە بيروڕای کلێسە داوای لەچينە هەژارەکان دەکرد ملکەچی فرمانەکانی کلێسە بن‌و سەرکێشيی لەياساکانی نەکەن؛ بەسەرێکی تريش بانگی يەکسانيی بەگوێی خەلکيدا دەدا. بەلآم چ جۆرە يەکسانييەك؟!. يەکسانی ئێش‌و ئازار چەشتن‌و مردن‌و ئەو دونيا!!.. ئەنجاميش حالّ گەيشتە ئەوەی بيروڕای کلێسە بووە پالپشتێکی بەهێزی سيستمی دەرەبەگايەتی. بەوجۆرە دەرەبەگايەتی لەمەيدانی ئابووری‌و سياسی‌و کۆمەلآيەتيدا ڕەگ‌و ريشەی داکوتاو توانی دەورێکی گەورە لەهەموو ئەو بوارانەی ژياندا ببينێ.تاقە توێژێکی کۆمەلآيەتيش کەدەيتوانی‌و بۆی هەبوو توخنی لايەنەکانی ڕۆشنبيريی بکەوێ پياوانی سەر بەکلێسە بوون. ئەمانيش هەموو توانای خۆيان خستە کار تاوەکو سيمايەکی ئاينی بەسەرجەم هونەرو ئەدەب‌و لقەکانی‌تری ڕۆشنبيريی ببەخشن‌و بيانخەنە ژێر ڕکێفی ياسا ئاينييەکانەوە.

شيعرو چيرۆك‌و شانۆو پەيکەرتاشين‌و نيگارکێشان، بەڕادەيەك کەوتنە ژێر چاودێريی‌و فەرمايشتی پاپاو قەشەکانی کلێسەوە، هيچ نووسەرو هونەرمەندێك بۆی نەبوو سەرپێچی لەئاستيدا بکا. ڕاستييەکەيشی هەر ئەبوو بەو جۆرە بێ. چونکە ئەوانيش بەڕۆشنبيريی ئاينيی پەروەردەو گۆش کرابوون. کلێسەو بيروڕای ئاينی

مەسیحیش سەرخانێکی گونجاوو لەباری بنکە ئابوورییەکەی دەرەبەگایەتییان پێك دەهێنا. بیروڕای کڵێسە لەهەموو بوارێکی ژیاندا ئەوەی رادەگەیاند کەئامادەمیزاد لەپێناوی ئەو دونیا "قیامەت"دا تێبکۆشێ و کارێك ئەنجام بدا لەو دونیا بەهەشتی بەنسیب ببێ، چونکە ژیانی ئەم دونیایە کاتییەو پاداشتی راستەقینە ئەوەیە لەقیامەتدا بەئادەمیزاد دەبەخشرێ!!..

لەقۆناغی یەکەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا، بەرهەمی هونەرمەندان شەقڵی رەشبینیو بێ بڕوایی بەژیانو کوێرەوەریی ئادەمیزادیان پێوە دیاربوو. هەڵوێستی فیکریی پیاوانی سەریەکڵێسە ماوەی گەشەکردنو پەرەسەندنی لەتێکڕای بەشەکانی هونەر بڕیبوو. خۆیشیان هەستیان بەم حەقیقەتە کرد. پاش ئەوەی لەو راستییە تێگەیشتن کە تاڕادەیەك ئەدەبو هونەر دەتوانن کار لەبیروهۆشی جەماوەر بکەن، ناچار بوون بەشوێن رێگایەکی تردا بگەڕێن، بۆیە کەوتنەخۆ تاوەکو هونەر بکەنە ئامرازێك بەهۆیەوە خزمەتی ئایدیۆلۆژیای پێبکەن.

بەڵام لەقۆناغی دووەمداو لەهەمان روانگەی رەشبینییەوە هەوڵیان دەدا چی ناکۆکییەکانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی هەیە، هەر لەناکۆکی نێوان خێزانە دەرەبەگەکانەوە، تاهەڵوێستی نارەوای پاپاو قەشەکانو راپەڕینی جووتیارانو پیشەگەران هەبوو لەبەرهەمەکانیاندا رەنگیان دەدایەوەو بەرجەستە دەبوون. بەو شێوەیە هونەری ئەم قۆناغە تاڕادەیەکی باش لەڕیالیزم نزیك بووەوە، هەرچەندە نائومێدییو بڕوا نەبوون بەژیان باڵی بەسەریاندا کێشابوو. جا ئەگەر باری ئابووری رۆڵی سەرەکییو بنچینەیی لەپێکهێنانی ئیستاتیکایەکی نوێدا گێڕابێ، مەرجە لێرەدا دەست بۆ حەقیقەتێکی مێژوویی رابکێشین کە پەیوەندی راستەوخۆی بەو مەسەلەیەوە هەیە.

کاری پیشەیی "العمل الحرفي" لەو سەردەمەدا توانی پەرە بەوزەو توانای داهێنەران بدا. چونکە لەو قۆناغەدا پیشەگەرێکی دەستڕەنگین ئەوەندە شارەزای ئیشەکەی خۆی بوو، دەیتوانی لەسەرەتاوە تاکۆتایی چی وزەو توانای داهێنەرانەی هەیە بیخاتە کارو لێهاتوویی خۆی بنوێنێ، لەهەمان کاتیشدا بەرێبەرەکانێی هاوپیشەکەی پێ بکاو کڕیاری

زۆرتر بۆ بەرهەمەکەی پەیدا بکا. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کەپیشەگەران هەروەك سامانی مادییان بەرهەم دەهێنا، هونەرمەندی لێوەشاوەیش بوون‌و هێزوتوانای داهێنەرانەیان دەخستە کارو بیروبۆچوون‌و هەستی هونەرمەندانەیان تێکەڵ بەبەرهەمەکەیان دەکرد.

پەرەسەندنی کاری پیشەیی‌و گەشەکردنی بازاڕ، بوونە هۆی ئەوەی شاری گەورە گەورە بنیات بنرێن‌و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی دانیشتوانیان روو لەزیادی بکا، هەر ئەم دیاردەیە لەقۆناغێکی گەشەکردوتردا، بووە هۆی ئەوەی ساختمان‌و کڵێسەو دەیری گەورەو بڵندیان تێدا دروست بکرێن‌و بەشێوازێکی رەمزی تەعبیر لەهێزو دەسەڵات‌و سەربەستی ئەو چین‌و توێژە کۆمەڵایەتییە تازە پێگەیشتووانە بکەن کەژیانی نوێ هێنابوونییە دونیاوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانە، هێشتا هونەرو ئەدەب تاقۆناغەکانی دوایی سەدەکانی ناوەڕاست هەر لەژێر دەسەڵاتی کڵێسەو چاودێریی سیستمی دەرەبەگایەتیدا بوو. لەوەبەدوایش‌و سەرەنجامی گەشەکردنی باری ئابوری کۆمەڵگای ئەوروپایی، نووسەرو بلیمەتی وەك "دانتێ"و "پەترارك"و "بۆکاشیۆ" هاتنە کایەوەو حەقیقەتی سیستم‌و دام‌ودەسگای کڵێسەیان بۆخەڵکی روون کردەوەو تەنانەت مۆری تاوانباریشیان نا بەتەختی تەوێڵیانەوە. ئەمانە هەرچەندە دژ بەئاینی مەسیحی‌و یاسا بنچینەییەکانی نەبوون، بەڵام هەڵس‌و کەوت‌و ژیانی رۆژانەی پاپاو قەشەو میرو دەرەبەگەکان، بەجۆرێك هەژاندنیانن کردنیاننە کەرەستەو بابەتی بەرهەمەکانیان. بەو چەشنە بەردی بناغەیان بۆ ئیستاتیکای سەدەیەکی نوێ دامەزراند کە بەسەدەی بووژانەوە "رێنیسانس" ناسراوە. پاش ئەوانیش "لیوناردۆ دافینشی"و "میکائیل ئەنجیلۆ"و "رۆفائیل سانتی"و "شەکسپیر"و "سەرفانتس"و..تاد، لەبارودۆخێکی گەشەکردوتردا هاتنە ژیانەوەو شان بەشانی پەرەسەندنی شارستانیەتی نوێ، رۆڵی مێژوویی خۆیان بینی‌و بنچینەیەکی نوێیان بۆ ئیستاتیکا چەسپاند.

لای کەڵە هونەرمەندانی ڕێنیسانس، ئادەمیزاد لەهەموو شت لەپێشترە. لەبەرئەوە بەپلەی یەکەم بایەخیان پێدەداو بەجۆرێك نیشانیان دەدا، خەریکە لەکۆتوپێوەندی یاسا ئاینییەکان دەرباز ببێو دەیەوێ ماوەی بدرێتێ چالاکیی بنوێنێو پەرە بەوزەو توانای لەبن نەهاتووی بدا. چونکە ئایدیۆلۆژیای کڵێسە هەموو ڕێگایەکی لەبەردەم تەوژمی داهێنەرانەی مرۆڤدا تەنی بوو، جگە لەوەیش بەو چاوەوە دەیڕوانییە ئادەمیزاد هەروەك بوونەوەرێکی دەستەپاچەو بێ تواناو هیچ لەبارا نەبووبێ!!.

ئەدەبیاتو هونەری ڕێنیسانس بەجۆرێك لەئادەمیزادیان دەکۆڵییەوە کەپاڵەوانێکەو لەتوانایدا هەیە کاری زۆر گەورەو مەزنو بەکەڵك ئەنجام بدا.

ئیستاتیکای سەدەی نوێ، واتە ڕێنیسانس، مەفهومێکی نوێی سەبارەت بەجوامێریی ئادەمیزاد هێنایە گۆڕێ. بەپێی ئەم مەفهومە نوێیە، نرخو بایەخ بۆ ڕەچەڵەكو بنەماڵەو خانەوادە نەمایەوەو پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەفامیلیای مرۆڤ بەهۆی کارو کرداری چاکەوە دەتوانێ مەزنیی بەدەست بهێنێ. گەشەکردنی زانیارییە سروشتییەکان، یارمەتیدەرێکی گەورەی نووسەرو هونەرمەندانی ڕێنیسانس بوو. تەنانەت هەندێك لەوانە خۆیان لەبوارە جۆراوجۆرەکانی ئەو زانیارییانەدا هەڵئەسووڕان. ئەم دیاردەیەیش بووە هۆی ئەوەی بەهەموو توانایانەوە ڕوو بەڕووی بیروڕای کڵێسە ببنەوەو بیرکردنەوەو ڕەخنەگرتنو تاقیکردنەوە بکەنە سەرمەشقی لێکدانەوەکانیان.

بایەخدان بەئادەمیزادو سروشت، لای زاناو هونەرمەندانی ڕێنیسانس گەیاندنییە ئەوەی لەپەیوەندی دیالێکتیکی نێوان هونەرو واقیع تێبگەنو خاسییەتی ئەبستمۆلۆجی (الخاصية المعرفية)ی هونەر بەبارێکی زانستییانەتردا لێك بدەنەوە.

بەپێی بۆچوونی هومانیستانی [*] ڕێنیسانس، ئەرکی هونەر نیشاندانی واقیعەو دەبێ ئادەمیزادو سروشتی تێدا بەرجەستە بکرێ. چونکە ئادەمیزاد لەهەموو بوونەوەرێکی سروشت کامڵترو پێگەشتووترە. ئەمانە گەرەکیان بوو، ڕاستگۆیانە وێنەی واقیع بکێشن، بۆیە گرنگییان بەلایەنی تەکنیکی دەدا بەتایبەتی لەهونەری نیگارکێشانو

---

[*] هومانیستان: الانسانیون

پەیکەرتاشیندا و بەوردی حسابیان بۆ هارمۆنیای رەنگو هێڵو بارستاییو ... تاد دەکرد. ئەم لێکدانەوەیە ناچاری کردن فێری زانیاری یەکالاکردنەوە "التشریح" و ماتماتیكو فیزیك بن، تا لەکارە هونەرییەکانیاندا پەیرەویان بکەن.

کە دەیانگوت: پێویستە وێنەی واقیع بکێشرێ مەبەستیان ئەوە نەبوو، واقیع کۆپیە بکەن..نەء.. بەڵکو دەیانویست هەموو ئەو لایەنە جوانانەی لەناو سروشتدا هەن، هونەرمەند کۆیان بکاتەوەو لەکارێکی هونەریدا بەرجەستەیان بکاو ماوە نەدا یاساکانی سروشت بشێوێنرێ. پەیوەندی نێوان هونەرو واقیع لای هومانیستان بەشێوەی جیاواز لێك دەدرایەو بەشێوازی جۆریەجۆر پەیرەو دەکرا. هەندێکیان باوەڕیان وابوو کەمەرج نییە ئەو نیگارو وێنە هونەرییانەی دەکێشرێن کتومت لەو کەسە بچن کەمەبەستە، گرنگ ئەوەیە لەئادەمیزاد بچێو خاسییەتەکانی دەمو چاوو لەشو لاری بنیادەمی تێدا پەیرەو کرابێ.. هەندێکیشیان باوەڕیان وابوو: کەدەبێ ئەو نیگارانە وێنەیەکی دەقاودەقی ئەو کەسە بێ کەوێنەی کێشراوە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کەجوانناسانی رێنیسانس توخنی مەسەلەی پەیوەندی نێوان تایبەتو گشتیی کەوتوونو لێیان کۆڵیوەتەوە. بەمەیش بنچینەیەکی تیۆرییان بۆ مەسەلەی خەیاڵی هونەرمەند دارشتو لەسنووری کۆپیەکردنی واقیع دەرباز بوون. ئەوانە کەئادەمیزادیان لەقەوارەیەکی لەخۆی گەورەتردا دەنەخشاند، دەیانویست تەعبیر لەهێزە ئیجابییەکانی سەردەمەکەیان بکەن. چونکە بەپێی تێگەیشتنی خۆیان ئەو جۆرە کەسانەی ئەمان دەیان نەخشێنن کامڵترینو پێگەیشتووترین کەسی کۆمەڵنو لەتوانایاندا هەیە کۆمەڵگاکەیان بەبارێکی باشتردا بگۆڕن. دیارە ئەم شێوە تێڕوانینەیان لەوەوە هاتبوو کە لەڕوانگەیەکی میتافیزیکییەوە دەیانڕوانییە ئەو یاسا مەوزوعییانەی کۆمەڵو سروشت بەرێوەدەبەن. لەلایەکی تریشەوە مەبەستیان بوو لەو رێگایەوە رەخنەی پێ لەکۆمەڵی کۆنو یاساو دابو نەریتی کڵێسە بگرن.

جا چونکە مەودای زەمەنی رێنیسانس چەند سەدەیەکی خایاند، دەبینین بیروڕای ئیستاتیکی جیاجیای تێدا هاتە کایەوەو سەرباری ئەم هەموو دەستکەوتە گرنگانە

ئیستاتیکای ئەو قۆناغە مێژووییە، نەیتوانی لەسەر هێڵێکی چەسپاوو سەقامگیر ببێ. دیارترین ناتەواوییەکانیشی ئەوەبوو کەمتر توخنی گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان دەکەوت زۆرتر بایەخی بەکارە هونەرییەکان دەدا.

هەر ئەم شێوە تێڕوانینەیش بنچینەیەکی تیۆری بۆ ئیستاتیکای چینی بۆرژوا دلڕشتو تائێستایش لەلایەن جوانناس‌و هونەرمەندو نووسەرانی سەرمایەدارییەوە، بەم یان بەو شێوە پەیرەو دەکرێ بێ ئەوەی ئەوانە توخنی ئەو مەسەلە جەوهەرییە بکەون کە: هەرچەندە ئیستاتیکا ی رێنیسانس هەنگاوێکی گەورەو بەرفراوان بوو بەسەر ئیستاتیکای دەرەبەگایەتیدا بەڵام لەم سەردەمەدا هەل‌و مەرجی پەیڕەوکردنی لەئارادا نەماوەو چی هەوڵ‌و کۆششێکیش لەو مەیدانەدا دەدرێ، تەقەللایەکە بۆ ئەوەی هونەر بەگشتی لەئەرکە کۆمەڵایەتییەکەی دوور بخرێتەوەو لەدوایین لێکدانەوەدا ئەوە دەگەیەنێ، دەویسترێ درێژە بەتەمەنی پڕ لەشوورەیی سیستمی سەرمایەداری بدرێ.

بەش بەحاڵی خۆیشم کەشەرەفی بەکوردیکردنی ئەم بەرهەمەی دکتۆرم پێ رەوا بینرا، هەموو هیواو ئاواتم ئەوەیە توانیبێتم بۆشاییەکی زۆر بچووک لەنامەخانەی کوردیدا پڕ بکەمەوە، تاوەکو خوێنەری کوردیش زانیارییەکی سەرەتایی لەبارەی "رێنیسانس"ەوە پەیدا بکا.. گەر چۆنیەتی وەرگێڕانەکەیش بەدڵی مامۆستای بەڕێزم دکتۆر کەمال بوو، مایەی ئەوپەڕی خۆشحاڵی‌و پێزانینمە.

*فوئاد*

## پێشەکی
## چاپی عەرەبی

رێنیسانس (Renaissance) جێگایەکی دیاری نەك هەر لەمێژووی ئەورووپادا، بگرە لەسەرانسەری مێژووی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا هەیە. سەرپاکی ئەو داهێنانە فیکریو هونەرییانەی ئەو سەدەیە پێشکەش بەمێژووی مرۆڤایەتی کردو ئەو گۆڕانە بنچینەییەی لەشێوەی تێڕوانینی ئادەمیزاددا بەرامبەر بەژیان هێنایە گۆڕێ، بەڕادەیەك کاریان لەڕەوتی گەشەکردنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کرد، ناوەڕۆکی رێنیسانس مەودایەکی فراوانو بەرینی گرتەوەو خۆی لەخۆیدا قەڵەمبازێك بوو لەمێژووی سەرجەم گەلانی جیهاندا. چونکە هەر بەوەوە نەوەستا لەچوارچێوەکەی ئەورووپادا گیر بخوا، بەڵکو سنووری ئەو کیشوەرەی تێپەڕاندو تائێستایش لەهەموو سووچو قوژبنێکی ئەم جیهانەدا هەست بەپرشنگە درەوشەدارەکانی دەکرێ.

رێنیسانس بووە هۆی زیندووکردنەوەی کۆنو پەرەپێدانی ئەو لایەنە بەنرخانەی تا ئەو کاتە پەیڕەو دەکران. هەر بەوەیشەوە نەوەستا، زۆر لایەنی زانستییە مرۆڤایەتییەکانی لەبنەڕەتەوە گۆڕیو لەو مەیدانەدا هەنگاوی گەورە گەورەی نا. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بو، رۆژگاری رێنیسانس لای زانایان واتای سەدەیەکی ئەولوی دەبەخشیو تائێستایش مێژوونووسانو لێکۆڵەران مەبەستیانە لێی تێبگەنو وایش دەردەکەوێ ئەم ئەرکە مەزنەبەردەوامە؛ چونکە گەنجینە بەنرخەکەی رێنیسانس هێند دەوڵەمەندە، هەرگیز لەبن نایە. کەواتە هەموو رۆشنبیرێك پێویستی بەوە هەیە ئاگادارییەکی باشی لەبارەی مێژووی رێنیسانسەوە هەبێو شارەزای ئەو بارووزوفە بێ تێیدا لەدایك بووەو مەرجو دەستکەوتە رەسەنەکانی لەبواری هونەرو زانستدا بەووردی هەڵبسەنگێنێ. خاڵێکی تریش هەیە وادەکا لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنی تاقیکردنەوەکانی

ئەركێكی هێجگار گەورە بخاتە ئەستۆی پسپۆڕانو شارەزایان. زۆربەی ڕووداوەكانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس كەولاتانی ئەورووپایان گرتەوە، لەگەڵ ئەو ئاڵوگۆڕە گورجو خێرایانەدا كەئەمڕۆ لەجیهانی سێیەمدا دەبینرێن- ئەگەر جیاوازی زەمانو زەمینی لێ دەربهاوێژین- زۆر لەیەك دەچن. لەبەرئەوە گەلانی دونیای سێیەم بەگشتیو ئەو كەسانەی لەمەوقیعی سەركردایەتیدانو زانایانو قەڵەم بەدەستان بەتایبەتی، بۆیان هەیە دەرسێكی باش لەو مێژووە وەربگرن؛ دەرسێك شیاوی ئەو قۆناغە گەورەیە بێ.

مەبەستمان لەم لێكۆڵینەوەیە ئەوەیە، دەستنیشانی ئەو زەمینە مێژووییە بكەین كە ڕۆژگاری ڕێنیسانس هێنایە كایەوە، هەروەها خاسیەتو ئەنجامەكانی دیاری بكەینو پێبەپێی ئەمانەیش ڕووی ڕاستەقینەی داهێنانی گەورەترین پێشەواكانی بخەینە بەرچاوو لەورێگایەوە ڕۆشنایی ئاڕاستەی گرنگترین لایەنەكانی ئەم بابەتە خۆشو گرانە بكەین.

* * *

## بەشی یەکەم

## ئەوروپا لەبەردەم سەدەیەکی نوێدا

وڵاتانی ئەوروپا بەدرێژایی چەند سەدەیەك لەژێر باری گرانی دواکەوتوویی‌و تاریکی‌و ناڕەزاییدا دەیان ناڵاند. تێکڕای مێژوونووسان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە ئەو قۆناغە ناو بنێن سەدەکانی ناوەڕاست کەلای هەندێکیان دەگاتە ناوەڕاستی سەدەی یازدەهەم‌و لای هەندێکی تریشیان خۆی لەناوەڕاستی حەڤدەهەم دەدا. هەرچی چۆنێك چوارچێوە مێژووییەکەی لێك بدرێتەوەو بادواقۆناغەکانیشی ماوەیەکی زۆریان خایاند بێ، ئەو ساڵانە سەرەتای گۆڕانێکی گەورە بوون کە کیشوەری ئەوروپایان گەیاندە سەدەیەکی نوێ‌و ڕووداوەکانی خستیانە بارودۆخێکەوە لەتەك زۆربەی وڵاتانی دیکەی جیهاندا کەلە دواکەوتووترین قۆناغی ژیاندا بوون بەراورد ناکرێ، هەروەك لەژیانی دوو کیشوەرە تازە دۆزراوەکەی ئەمریکادا دەبینران. هەندێکی تریشیان تازە پێیان نابووە قۆناغی دەرەبەگایەتییەوەو پەیوەندی پاتریارکی هێزی بنچینەیی وڵاتانی ئەفریقاو تەنانەت بەشێکی زۆری ئاسیایش بوو. بەشێکی تریشیان -مەبەستمان لە ڕۆژهەڵاتی دێرینەی خۆمانە- لەڕووی شارستانیەتییەوە بەئەندازەیەکی ترسناك دابوویانە دواوە؛ ئەمە لەکاتێکدا بەردی بناغەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی لەوێدا بنجبەست کراو دەیویست شارستانیەتی بگەیەنێتە پلەی گەشەکردن‌و پێگەیشتن.

کیشوەری ئەوروپا "بەتایبەتی بەشی ڕۆژئاوای" لەسەرەتای ئەم سەدە نوێیەدا گەلێك ڕووداوی مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی‌و فیکریی گرنگی بەخۆیەوە دی‌و لەناو هەموویاندا ڕێنیسانس جێگایەکی دیاری هەیە. وەنەبێ دۆزینەوە جوگرافیاییە گەورەکان‌و بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی‌و[*] شۆڕشەکانی چینی بۆرژواو پەرەسەندنی زانیاریی‌و زۆر دیاردەی گرنگی تریش بایەخیان لەڕۆژگاری ڕێنیسانس کەمتر بووبێ، بەپێچەوانەوە هەر

---

[*] بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی: حرکە الاصلاح الدینی

یەکێك لەو دیاردانە ئەڵقەیەکی لەپچڕان نەهاتووی یەك زنجیرە بوونو شوێنەواریان لەمێژووی مرۆڤایەتیدا وەك ڕۆژی ڕووناك لەبەر چاوە.

بێگومان هەموو ئەم ڕووداوانە بەشێوەیەکی خۆرسکو بێپەیوەندی سەریان هەڵنەدا، بەڵکو بەشێوەیەکی سروشتی تەعبیریان لەو گۆڕانکارییانە دەکرد کەبە حوکمی چەند هۆیەکی دیاریکراو خەریك بوون بەر لەوڵاتانیتر جێ پێی خۆیان لەژێرخانی کۆمەڵگای ئەورووپاییدا قایم ئەکرد. بەو پێیە جڵەوی شارستانیەت لەدەست گەلانی ڕۆژهەڵات وەرگیراو کەوتە دەست ئەورووپاییەکان.

لەدوا دوای سەدەکانی ناوەڕاست دا، پەیوەندی سەرمایەداریی نوێ لەمناڵدانی کۆمەڵگای دەرەبەگیدا کەوتە نەشو نما کردن. ئەمەیش بووە هۆیەکی بنچینەییو تادەهات زیاتر بنکە ئابوورییەکەی بەرەو لاوازییو گەندەڵ بوون دەبرد. کۆمەڵانی خەڵکیش هەروەك تامەزرۆی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان بوون، قێزیشیان لەپەیوەندییە کۆنەکان دەهاتەوە. جا هەرچەندە سەرەتای ئەم پرۆسەی گۆڕانو گەشەکردنە بەسستی دەستی پێکرد، بەڵام ساڵ لەدوای ساڵو تادەهاتو لەئەنجامی چەند هۆیەکی چەسپاودا، هەنگاوی گورج تری دەنا.

بەنموونە: ئامرازی بەرهەمهێنانی پیشەییو کشتوکاڵیی ئەورووپا لەنێوان سەدەکانی یازدەو پازدەدا تاڕادەیەك پەرەیان سەند. ئەگەرچی پیشەگەرو جووتیارانی ئەورووپا لەژێر زەبری چەوساندنەوەی دەرەبەگایەتیدا دەیان ناڵاند، بەڵام توانیان زیاتر سوود لەبەرهەمی رەنجو تەقەللای خۆیان ببینن و لەپێناوی قازانجو دەستکەوتی زۆرتردا بایەخ بەگەشەپێدانی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بدەنو ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش بەهۆی تاقیکردنەوەکانیانەوە تەکنیکی بەرهەمهێنان بەرەوپێشەوە ببەن.

ئا بەو جۆرە دەبینین بەرلەوەی سەدەی پازدەهەم کۆتایی بێ، گۆڕانێکی بنەڕەتی لەشێوەی بەرهەمهێنانی سامانی ماددیی چەندین وڵاتی ڕۆژئاواو ناوەڕاستی ئەورووپادا ڕوویدا.

پێشکەوتنی سامانی مادی راستەوخۆ بووە هۆی ئەوەی لەوڵاتانی ئەورووپادا سەرمایە بەخێرایی کەڵەکە ببێ، بەخێرابیەکی ئەوتۆ نەمێژوو تائەو کاتە بەخۆیەوە دیبوو، نەهیچ بستێکی تری سەر رووی زەمینیش دەیتوانی شان لەشانی بدا.

لێرەدا گرنگ ئەوەیە کەسەرەتای ئەو گۆڕانکارییە نەك هەر پشتی بەگەشەکردنی بەرهەمهێنانی لادێ‌و شارو پەیوەندی بەتینی نێوانیان دەبەست‌و رووی کردە مەیدانی بازرگانیی دەرەوە، بەڵکو پەنای بردە بەر وزەو توانای ئادەمیزادیش، بەتایبەتی لەو قۆناغەدا هەزاران هەزار جووتیاری ئاوارە کە لەلادێکاندا هەموو سەرچاوەیەکی ژیانیان لەدەست چوو بوو، ئامادەبوون لەناو شارەکاندا بەرۆژانەیەکی کەم ئیش بکەن[*]

ئەم دیاردەیەیش بووە هۆی ئەوەی خاوەن کارگەکان سوودی لێ وەرگرن‌و زیاتر پەرە بەدەسگا ئابوورییەکانی خۆیان بدەن.

هەموو ئەمانە کارێکی وایان کرد لەدوادوای قۆناغی دەرەبەگایەتیدا چین‌و توێژی کۆمەڵایەتی نوێ پەیدا ببن‌و ئەنجامیش ببوونە هێزی پاڵپێوەنەری گۆڕان‌و گەشەکردن، چونکە ئەم چین‌و توێژە تازەپێگەیشتووانە خاوەنی بەرژەوەندی‌و خواستی تایبەتی خۆیان بوون. ئەو بەرژەوەندییانەی لەبنەڕەتەوە دژ بەیاساو بیرو رەوشتی باوی سەدەکانی ناوەڕاست دەجەنگان‌و چیتر بۆیان نەدەلوا پێکەوە هەڵبکەن. لەکۆتایی سەدەی پازدەهەم دا چینی بۆرژوا هەلومەرجێکی لەباری بۆ رەخسا تا وەکو چینێکی سەربەخۆ لەچەند وڵاتێکی ئەورووپای رۆژئاوادا بوونی خۆی بسەپێنێ‌و بەخێرایی گەشە بکا، بەرادەیەك سەدەیەك زیاتری نەخایاند لەئینگلیستاندا بووە چینێکی کامڵ‌و پێگەیشتوو. توێژە جۆربەجۆرەکانی دیکەی چینی بۆرژوایش رۆڵێکی بنچینەییان لەو گۆڕانەدا کتوپڕییەدا بینی کەسەرجەم لایەنی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و فیکریی کیشوەری

---

[*] ئەم دیاردەیە بەتەواوی لەو قۆناغەدا خۆی نواند کەپیشەسازی رستن‌و چنین پەرەیان سەندو خاوەن زەوییە گەورەکان لەبری بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ دەستیان دایە بەخێوکردنی مەڕومالات. جێی زەوی بەپیت‌و فەڕیان هەبوو کردیانە لەوەڕگای گەورە. ئەنجامیش جووتیاران ناچار بوون رووەو شارەکان رەو بکەن‌و بەرۆژانەو بەپارچە لەکارگە تازەکاندا ئیش بکەن.

ئەورووپایان گرتبووەوە. بەڵام توێژە ڕۆشنبیرەکەی چینی بۆرژوا "ئینتیلگێنسیا"(*) لەو قۆناغە نوێیەدا لەهەمووان زیاتر ئەرکی پەرەپێدانی مادیی و فیکریی ئەورووپای کەوتە ئەستۆ، ڕۆشنبیرانی سەربەم توێژە بەهۆی نۆژینەوەو داهێنانی نوێوە بەشدارییەکی گەورەیان لەپەرەپێدانی شێوازی بەرهەمهێناندا کرد. هەر ئەوانیش بوون ئایدیۆلۆژیای چینی بۆرژوایان خستە قاڵبێکی فەلسەفییەوەو بنچینەیەکی تیوریی نوێیان بۆ ئابووری سەرمایەداری دامەزراندو ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش ئەم تیورییە هەڵومەرجی لەبارتری بۆ ڕەخسا تاوەکو بەگوڕجی بنچینە ئابوورییەکانی دەرەبەگایەتی لەق بکاو لەجێی ئەو کۆمەڵێکی پێشکەوتووتر بنیات بنێ.

جائەگەر ئەم توێژە کۆمەڵایەتییە جڵەوی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی -زانستی- و فیکریی لە ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا گرتبێتە دەست، ئەوا لەڕووی مەنتقی مێژووەوە تەواو لەجێی خۆیدا بووە. چونکە پێویستییەکانی کۆمەڵگای نوێ ناچاری کردن لەجاران زیاترو بەشێوەیەکی فراوانتر رووبکەنە ڕۆشنبیرییەك پەیوەندی بەمەسەلە دونیاییەکانەوە هەبێ. بۆ سەلماندنی ئەم حەقیقەتە باشتر وایە نموونەیەك بەبەڵگەی سەلمێنەر بهێنینەوە. نەشونماکردنی بەرهەمهێنان بەو خێراییەو دەرکەوتنی ڕۆڵی دراو "پارە-النقد" لەبواری ئاڵوگۆڕکردنو بازرگانیی بەو شێوە فراوانە، بەپلەی یەکەم پشتی بەرێککەوتنی بازرگانیی "صفقة تجارية"و قەرزو بەربەرەکانێی توندوتیژ دەبەست. ئەمە جگە لەچەند هۆیەکی تریش کەگیروگرفتو ناکۆکی ئابووری لەنێوان بازرگانو خاوەن کارگەو پیشەگەرە دەستییەکانو داهێنەراندا خوڵقاندو سەرەنجام پێویستییان بەیارمەتیو دەسگیرۆیی پارێزەران دەبوو. ئەم دیاردەیەیش ئەو حەقیقەتەمان بۆ ساغ دەکاتەوە کەتا چ ڕادەیەك پارێزەران بەشێکی گەورەو کاریگەری بۆرژوا پێکدەهێنن. لێرەدا پێویستە دەست بۆ حەقیقەتێکی تریش رابکێشین کەپەیوەندی بەبنەمای کۆمەڵایەتی ئەم توێژەوە هەیە. بەپێچەوانەی قۆناغی

---

(*) "ئینتلگێنسیا" کە مانای "بەهرەمەند" یان "لێهاتوو" یاخود "تێگەیشتوو" دەگەیەنێو لەوشەی "ئینتلگێنس"ی لاتینییەوە وەرگیراوە، ڕووناکبیرانی ئەورووپا لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە کەوتنە بەکارهێنانی.

دەرەبەگایەتییەوە، زۆربەی ئەو رۆشنبیرانە سەر بە توێژە هەژارەکانی کۆمەڵ بوون. زۆربەیشیان -بەتایبەت ئەوەی یەکەمیان- نەگەیشتبوونە پایەیەک دەستبەرداری ئەو پەیوەندییە کۆمەلآیەتییانە بین کەتوندوتۆڵ بەچینەکەی خۆیانەوە گرێــدا بــوون. باشترین بەڵگەی پێ سەلماندنیش ئەوەیە کەپێشەوایانی سەدەی بووژاندنەوە بایەخێکی تەواویان بەواقیعی ژیانی ئەو توێژانە دەداو لەکارە هونەرییــەکانیاندا تــەعبیریان لێ دەکردو تێیاندا زمانو پەندو فۆلکلۆری میللیی بەقووڵیی رەنگیان دەدایەوە، وەك لەپاشدا باسی دەکەین. لەوەیش زیاتر، هەندێك لەرۆشنبیرانی سەر بە ئینتیلگێنسیا لەڕووی ئایدیۆلۆژیاوە سەر بەچینەکەی خۆیان بوونو بەوپەڕی دڵسۆزییەوە گیروگرفتەکانی ژیانیان دەنەخشاندو لەقاڵبێکی فەلسەفیدا دایان دەڕشت. شۆڕشگێڕی ئاڵمانی "تۆماس مۆنزێر ١٤٩٠-١٥٢٥"و زانای فەرەنسایی "ژان میسیلیە ١٦٦٤-١٧٢٩" لەو کەسانە بوون. هەر لەو قۆناغەدا چینی کرێکاران لەولآتانی ئەورووپاداو لەسەر حسابی ئەو جووتیارە هەژارانەی زەوییان شك نەدەبردو سەرچاوەی ژیانیان وشکی کردبوو، پێگەیشت. بڕێکی تریشی لەو پیشەگەرە بچووکانە پێك هاتبوو کەلە سایەی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا توانای کارکردنیان بۆ نەمابووەوە. چونکە لەو قۆناغەدا شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری گۆڕانێکی وای بەخۆیەوە دیتبوو، لەڕووی چەندایەتییەوە زۆرترو لەڕووی چۆنیەتی بەرهەمی باشترو هەرزانتری لەکەلو پەلی پیشەگەرە دەستییەکان دەخستە بازاڕەوە. ئەنجامیش بۆیان نەدەکرا لەڕووی ئابوورییەوە بەربەرەکانێی بکەنو ناچار لەناو دەسگا سەرمایەدارییەکاندا دەبوونە کرێکار. چینی کرێکاران بەهەمان شێوەی چینی بۆرژوا چەند قۆناغێکی مێژوویی بڕی، تاوەکو لەدواییدا بەتەواوی بنج بەست بوون. سەرەتا ئەوانەی بەڕۆژانە کاریان دەکرد، تەنانەت لەپێشکەوتووترین ولآتانی ئەورووپادا بەشێکی بچووکی کۆمەڵیان پێك دەهێنا. دوابەدوای ئەمەیش وردەوردە پرۆلیتاریا[1] وەك چینێکی سەربەخۆ لەکارگەکاندا دروست بوو.

---

(١) پرۆلیتاریا: لەوشەی (Proletarius)ی لاتینییەوە، وەرگیراوە کەواتای "میرات" دەگەیەنێ.

نابێ ئەو حەقیقەتەیش لەیاد بکرێ کەزۆریەی ئەو کەسانەی سەر بەم چینە بوون تاماوەیەکی دوورودرێژیش هەوڵیان دەدا پەیوەندییان بەلادێو شێوازی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵییەوە بهێڵنەوە نەك هەر ئەوەیش بەڵکو چەشنە پەیوەندییەکی پاتریارکییان لەگەڵ خاوەن کارگەکاندا پێك هێنا. لەبەرئەوە دەبینین چینی کرێکاران لەرۆژگاری رێنیسانسدا تەنها توخمێکی کۆمەڵایەتی بووە، بێ ئەوەی لەرۆڵی مێژوویی خۆی تێ بگا. بەجۆرێکی تر بڵێین: بەتەنها بووە سووتەمەنی ئاگری پەرەسەندنو هیچی تر.

هەموو ئەو گۆڕانە گەورانەی وڵاتانی ئەورووپا بەخۆیانەوە دی، لەگەڵ خۆیاندا بیری نوێیان هێنایە کایەوەو لەناوەرۆکدا تەعبیریان لەبەرژەوەندیو ئامانجی ئەو هێزو توێژە کۆمەڵایەتییە تازە پێگەیشتوانە دەکرد کەناچار بوون ململانێی زۆرانبازی لەتەك پەیوەندییە کۆنەکاندا بکەنو رۆژ لەدوای رۆژیش زیاتر پێویستیان بەوە دەبوو پەیوەندییەکانیان مسۆگەر بکەنو پەرەی پێ بدەن. رۆژگاری رێنیسانس یەکێك بوو لەو دیاردە مێژوویيو کۆمەڵایەتییانەی پێش وەخت سەری هەڵداو هاوچەرخی قۆناغێك بوو تێیدا سەدەکانی ناوەڕاست رووەو سەدەیەکی نوێ هەنگاوی دەنا.

---

یەکەمجار لەسەردەمی رۆمانەکاندا وەك زاراوەیەکی کۆمەڵایەتی بەکارهێنراوە. بەپێی ئەو ریفۆرمەی "سێرفیۆس تیللیوس"ی چاری رۆمان لەسەدەی شەشەمی پێش زایندا هێنایە کایەوە، کۆمەڵگای رۆمان بەپێی ئاستی سامانی ماددی کرا بەسێبەشەوەو هەربەشەیان بەپێی مەوقیعی ئابوورییان لەنەخومەنی گەلدا جێگایان درایە. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم دەستەیە هەر لەبنەڕەتەوە توێژێکی هەژارو نەدار بوونو پشتاوپشت میراتیان بۆ نەمابووەوە ناوی پرۆلیتاریایان لێنراو لە ١٩٣کورسی ئەنجومەنی گەل تاقە کورسییەکی پێ رەوا بینرا. بێگومان مەفهوومی سیاسیو کۆمەڵایەتی ئەم زاراوەیە لەگەڵ پەرەسەندنی مێژوودا گۆڕانێکی تەواوی بەسەردا هات. یەکەمجار زاراوەی پرۆلیتاریا لەکۆنگرەی گەلانی رۆژهەڵاتدا کەلە ئەیلوولی ١٩٢٠دا بەسترا، کرا بەعەرەبیو لەسەر یەکێك لەدروشمەکانی نووسرابوو "یا صعالیك العالم إتحدوا -*دانەر*-

(*) وشەی "صعالیك" بەواتا فەرهەنگییەکەی ئەو هەژارانە دەگرێتەوە کەخاوەن سامانەکان تاڵان دەکەنو پاشان بەسەر رەشو رووتو نەدارەکاندا دەیبەشنەوە. *وەرگێڕ*-

جا وەنەبێ تەنیا ئەو هۆیانەی ڕۆژگاری ڕێنیسانسیان هێنایە دونیاوەو کاریان لەبنکە ئابوورییەکەی کۆمەڵگای ئەورووپایی کرد، تاکە هۆی ئەو گۆڕانکارییانە بووبن کە روویان دا، نەخێر. چەندین هۆی تری دەرەکی "خارجی" ئاوێتەی هۆیەکانی ناوەوە بوونو تەوژمێکی توندیان پێبەخشینو بوونە هێزی پاڵێوەنەرو راستەوخۆ بەشداریی دروست بوونی هەندێکیان کرد.

لەدوادوای سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەورووپا دەرگای بۆ چەند لایەنێکی گرنگی کلتووری رۆژهەڵات خستە سەر گازی پشتو بەهۆیانەوە یاساو نەریتی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی هاتنە لەرزین. زۆربەی کلتووری رۆژهەڵاتیش کەلە بنەڕەتدا ئیسلامی بوونو لەڕێگای "ئەندەلوس"و "سقلیە"و ئەو وڵاتە عەرەبانەی کە بەسەر رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستدا دەیان روانی گەیشتە خاکی ئەورووپا. لەڕێگای "ئەندەلوس"ەوە بەرهەمی فەیلەسووفە کۆنەکانو لەسەرو هەموویانەوە "ئەفلاتون"و "ئەرستۆ" کەبەدرێژایی چەند سەدەیەك ون بووبوون پەرییەوەو گەیشتنە دەست ئەورووپاییەکان. هەرچەندە ئەو نووسینانە لەخەوشو ناتەواوی بەدەرنەبوون، بەڵام لەڕوانگەی ئاینو شارستانیەتی ئیسلامییەوە هەندێ شتی نوێیان خرابووە سەر. لەڕێگای "سقلیە"وە کە بەدرێژایی دوو سەدە لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامەکاندا بوو، زۆر بابەتی زانیاری وەك سروشتناسیو پزیشکیو فەلسەفی گەیشتە ئەورووپا.

شەپۆلی سوپای خاچداران کە بەتێکشکاوی دەگەڕانەوە هەر بەوەوە رانەدەوەستان ئەو چیرۆکە سەیرو عەنتیکانە لەگەڵ خۆیاندا بیەنەوە کەباسی خۆشیو رابواردنی دەرباری میسرو خەلیفەکانی رۆژهەڵاتیان دەکرد، بگرە لەگەڵ ئەمانەیشدا داهێنانی تازەو بیری نوێیان دەبردەوە. هەموو ئەمانەیش بەس بوون بۆ وروژاندنی بیری خەڵکی تاوەکو بەراوردێکی کلتووری خۆیانو پێشکەوتنی ژیانی روناکبیری رۆژهەڵات بکەن.

پاش ئەوەی دەرەبەگە ئەورووپاییەکان بەخۆیانو لەشکرو دەستو پێوەندیانەوە لەرۆژهەڵات گەڕانەوە، هەستیان بەکرۆکی ئەو پەندە کرد کە دەڵێ: "لەژیاندا ئەوەندە

تێیکۆشە وابزانە هەتا هەتایە دەژیت" لەکاتێکا بیروڕای کڵێسەی کاتۆلیکی وای پەروەردە دەکردن لەشوێنی خۆیان نەبزوون‌و لەپێناوی قیامەتدا هەموو ئان‌و ساتێك مردنیان لەپێش چاو بێ ! !.

لێرەوە ئەورووپاییەکان کەوتنەخۆو وەك دانیشتووانی رۆژهەڵات ناوەڕۆکی هەردوو پەندەکەیان رەچاو کرد. بەسەرێك کۆشکی بڵندو رازاوەیان بنیات دەناو بەسەرێکی تریش بۆ دروستکردنی دەیرو کڵێسە وەستاییەکی بێ سنووریان دەنواند.

دەبێ ئەوەیش لەیاد نەکرێ کەبەر لە رۆژگاری رێنیسانس‌و لەئەنجامی ئەو هۆیانە، یان هەندێکیاندا کەپێشتر باسیان لێوە کراو بەهۆی بزووتنەوەی "کارولنجی"ی سەدەی نۆهەم‌و "ئۆتونی" سەدەی دەهەمەوە، پرشنگی شارستانیەت ناوبەناو ئەورووپای رۆشن دەکردەوە. بەڵام سەبارەت بەوەی بەگشتیی‌و لەبوارێکی تەسکدا دەجووڵان‌و کاریان لەژیانی کۆمەڵایەتی دەکرد، دەتوانین بڵێین بەتەنها توانیان زەمینەیەکی لەبار بۆ رۆژگاری گەورەی رێنیسانس لەئەورووپادا برەخسێنن کەلەکۆتایی سەدەی پازدەهەم دا گەیشتە لوتکە. چونکە خاسییەتە تایبەتییەکانی لەهەموو راپەڕینەکانی دیکەی مێژوو بەرلەدەیەك جیا دەکاتەوە، تائەو کاتە کیشوەری ئەورووپا بەخۆیەوە نەدیبوو.

* * *

# بەشی دووەم
# خاسیەتو رۆژگاری رێنیسانس

## مەفهوومی رێنیسانس:

لەبەر رۆشنایی ئەو حەقیقەتانەی پێشتر باسیان لێوەکرا، بۆمان دەردەکەوێ کە "رێنیسانس" لەئەنجامی کۆمەڵێك هۆی ناوخۆییو دەرەکیدا هاتەکایەوەو پێکەوە لەمناڵدانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی ئەورووپادا کاری خۆیان کرد. کەواتە رێنیسانس بەحوکمی ئەو واقیعەی تێیدا لەدایك بوو، چ لەشێوەی تێڕوانینیدا بۆ دیاردەکانی ژیانو چ لەبیرکردنەوەدا، رێبازێکی نوێی گرتەبەر، تەواو بە پێچەوانەی بیروڕای باوی کۆمەڵی کۆنو پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانەوە بوو. بەتایبەتی چونکە لەرۆژگاری رێنیسانسدا ئەو پەیوەندییە کۆنانە لەلایەك بووبوونە بار بەسەر شانی کۆمەڵانی خەڵکییەوەو لەلایەکی تریشەوە تەعبیریان لەسیستمی کڵێسەی کاتۆلیکیو هەڵسوکەوتی دوگماتییانەی دەکردو کۆسپێکی گەورەشیان لەبەردەم داهێنانو بیری نوێی پەرەسەندوودا دانا بوو. زانایان لەم بارودۆخە تازەیەدا کەوتنەخۆو شێوازی نوێی جۆربەجۆریان دەدۆزییەوە تابەهۆیانەوە بەربەرەکانەی سیستمی کۆنو بیروباوەڕی باوی دەرەبەگایەتی پێبکەنو پەردەیان لەسەر هەڵبماڵن. بۆ ئەم مەبەستە رێگای ژیاندنەوەی کلتووری کۆنیان گرتەبەر، بەتایبەتی کلتووری یۆنانی. ئەوانە وا بۆ مەسەلەکە دەچوون گوایە بەهۆی ژیاندنەوەی کەلەپووری کۆنەوە دەتوانن لەکۆتو پێوەندی سەدەکانی ناوەڕاست دەرباز ببنو باشتریش دەتوانن لەیاساکانی سروشت تێبگەن.

لەم روانگەیەوە ئەم رێبازە فیکرییە نوێیە بەناوی رێنیسانسەوە(Renaissance) کە بەزمانی فەرەنسایی واتە "ژیاندنەوە" یان "زیندووکردنەوە" یاخود " لەدایکبوونی نوێ" دەگەیەنێ، کەوتە ناوناوانەوەو پیاوانی ئەو رۆژگارە بۆ یەکەمجار بەکاریان هێنا[٢].

لای ژمارەیەک فەیلەسووفو مێژوونووس، سەرپاکی مێژووی مرۆڤایەتی بەر لەو سەدەیە رووداوێکی لەڕۆژگاری رێنیسانس گرنگترو مەزنتری بەخۆیەوە نەدیوە. راستییەکەیشی هەروایە. چونکە چەندین داهێنانو گۆڕانی فیکریی نوێ هاتنە کایەوە کەڕاستەوخۆ پەیوەندییان بەو رۆژگارەوە هەیەو تائێستایش سەدان مێژوونووسو هونەرمەندو رەخنەگری سەر بەڕێبازو قوتابخانە فیکریو فەلسەفییە جۆربەجۆرەکان، لای خۆیانەوە بایەخێکی لەئەندازەبەدەری پێدەدەن. لەبەرئەو هۆیانە ئەگەر ناویەناو مشتومڕو بۆچوونو هەڵسەنگاندنی زانستیی جیاواز دەربکەوێو لەخاسییەتی رۆژگاری رێنیسانسو ئەو بابەتە گرنگانە بکۆڵنەوە کەلەمەودوا هەوڵ دەدەین رۆشنایی بخەینە سەر لایەنە گرنگەکانی، نابێ بەڕێکەوت لەقەڵەم بدرێن.

## ئیتالیاو مەودای مێژوویی رێنیسانس:

تائەمڕۆ دەستنیشانکردنی مەودای مێژوویی رۆژگاری رێنیسانسو ئەو وڵاتانەی تێیاندا دیاردەی راپەڕینێکی نوێ سەری هەڵدا، یەکێکە لەو مەسەلە ئاڵۆزانەی

---

[٢] لەزمانی عەرەبیدا وشەی "النهضة" بۆ ئەو رێبازە فیکرییەو سەردەمەکەی بەکاردەهێنرێو وەك زاراوەیەکی مێژوویی دەیان ساڵە نووسەرە عەرەبەکان بەکاری دەهێنن. -دانەر-
هەروەك زاراوەی "النهضة" بەزمانی عەرەبی مانای رێنیسانس ناگەیەنێ، لەزمانی کوردیشدا وەرگێرانی بەهەڵە زاراوەی "راپەڕین" یان بۆ داناوە کەواتای "الانتفاضة" دەگەیەنێ. بۆیە وا بەچاك زانرا لەبەکوردیی کردنی ئەم کتێبەدا "رێنیسانس" بەکاربهێنینو دکتۆر خۆیشی هەر ئەمەی بەلاوە پەسەندە -وەرگێڕ-.

مشتومڕی زانستییانەی سوودبەخشی لەسەر دەکرێ. بێگومان هەموو ئەو بەرهەمو داهێنانەی لەسەدەی پازدەهەم و شازدەهەمدا هاتنە کایەوە ملکەچی یاساو ڕێبازەکەی ڕێنیسانس نەبوون. چونکە شان بەشانی بیروڕای ئەو ڕۆژگارە، کلتووری سەدەکانی ناوەڕاست لەکاردا بوو. ئەمە جگە لەوەی کەدیاردەکانی ڕێنیسانس بەتەنها ولاتێکو سووانی نەگرتەوەو گەشانەوەو پاشان سیس بوونیشیان لەسەر هێڵێکی دیارو چەسپاو نەدەڕۆیشت. هەموو ئەم دیاردانە بەپێی بارودۆخی ئەو ولاتانە بەڕێوە دەچوون کەبووژاندنەوەیان بەخۆیانەوە دیبوو. بەلام سەرەڕای ئەم جیاوازییانەیش مێژوونووسو لێکۆلەران باوەڕیان وایە کەئیتالیا لانکەی ڕێنیسانسو بزووتنەوەی مرۆڤایەتییە.

ئێمەیش لەم بۆچوونەوە دەتوانین بیروڕایەکی گشتیی سەبارەت بە ڕۆژگاری ڕێنیسانس بخەینە بەردەستو قۆناغە سەرەکییەکانی دەستنیشان بکەین.

لەئەنجامی چەند هۆیەکی دیاریکراودا کەهەریەکەیان بەم یان بەو شێوە کاریان لەوێتر دەکرد، بیروباوەڕی ڕێنیسانس لەولاتی ئیتالیادا بەر لەولاتانی دیکەی ئەورووپا خۆی نواند.

ئەم ولاتە لەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر بەخێرایی بەرەو پێش دەچوو. لەسەدەی یازدەهەم بەدواوە ئابوری ئیتالیا بەتەواوی پشتی بەبازرگانی دەرەوە بەستو ئەنجام وزەو توانای کەشتییەکانی لەدەریای سپی ناوەڕاستدا ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزتر دەبوونو توانی هەموو ئالوگۆڕێکی نێوان ئەورووپاو ڕۆژهەلات بۆخۆی قۆرخ بکا[٣]. چونکە لەوە تێگەیشتبوون کە کەلو پەلی دانسقە "بەهاراتو ئاوریشمو عەترو خشلی زێڕو زیو" لەولاتانی ئەورووپادا بازاڕێکی بەفرۆختیان هەیە؛ دیارە ئەنجامی ئەم ئالوگۆڕەیش ئیتالیاییەکان قازانجێکی زۆریان دەست کەوت، بەڕادەیەك "هەریەکەیان لەجاران زیاتر دەولەمەند بوون"[٤].

---

(٣) J.R. Strayer and others, the mainstream of Civilization Second Edition, New York, 1974, P.207.

(٤) H. Baron, The Crisis of Early Italian Renaissance. Princeton, 1967, P.365.

هێشتا سەدەی سیازدەهەم کۆتایی نەهاتبوو، ئیتالیا لەمەیدانی ئابوری‌و کۆمەڵایەتیدا ریزی پێشەوەی داگیرکردو شارەکانیشی لەوڵاتانی دی زۆرتر پێش دەکەوتن. تەنها لەشاری "ڤینیسا"دا ژمارەی ئەو کرێکارانەی لەپیشەسازی چنیندا کاریان دەکرد گەیشتە "١٦"هەزارو لەپیشەسازی کەشتی دروستکردندا ژمارەیان خۆیدا لە "٦"هەزار کەس[°]. جا ئەگەر ژمارەی یەکەمیان ئاوێنەیەکی بێ گەردی پێشکەوتنی پیشەسازیی بێ لەشارێکی وەك "ڤینیسیا"دا، ئەوا ژمارەی دووەمیان ئەوە دەگەیەنێ کەتا چ رادەیەك بازرگانیی نەش‌و نمای کردووەو چەندیش پێویستی بەو هۆیانە بووە تاوەکو کەلوپەلەکانی لەدەریای سپییەوە بەرەو دەریای سوور بگوێزرێتەوە.

دانیشتووانی "ڤینیسیا" وەك تێکڕای شارو بەندەرەکانی دیکەی ئیتالیا، بێ دوودڵیی خۆیان دەکوتایە هەر مەیدانێکی بازرگانییەوە بەمەرجێك بیانزانیایە قازانجیان مسۆگەرە[*]، تاحاڵ گەیشتە ئەوەی چەندین بازرگان خەریکی کرین‌و فرۆشتنی کۆیلەی سپی بوون‌و بەردەوام کۆشکی میرو خەلیفەکانی رۆژهەڵاتیان بەئافرەتی "بولکان"ی سیغناخ دەکرد، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو بڕیارەی "پاپا" دەری کردو تێیدا کرین‌و فرۆشتنی ئافرەتی بەکارێکی دژ بەیاساو نەریتی ئاینی مەسیحی لەقەڵەم دەدا. دەڵێین

---

-دانەر بەتایبەتی باسی دانیشتوانی فلۆرەنسا ئەکاو مەبەستیشی ئەوەیە ئەو سەردەمە جیا بکاتەوە کە یەشەڕو شۆڕەوە خەریك بوون.

[°] کاتێك نرخ‌و بەهای ئەو ژمارانەمان بۆ دەرئەکەوێ کەبەپێودانی سەردەمی خۆیان پێوانەیان بکەین.

[*] "شەکسپیر"ی کەڵە نووسەری دراما توانی ئەم حەقیقەتە مێژووییە لەشانۆیی "بازرگانی ڤینیسیا"دا بەرجەستە بکا. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ کە تا چ رادەیك ئەدەب‌و هونەر ئاوێنەی باری ژیانی کۆمەڵەو تا چ رادەیەك مێژووی ئەدەب بەمێژووی ئابووری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتییەوە بەندە. ئەم حەقیقەتە بەروونیی لەوەشدا ئاشکرا دەبێ کە دکتۆر بۆ نووسەرو هونەرمەندانی رۆژگاری رێنیسانس تەرخان کردووە. "وەرگێر"

تەنانەت ئەو بڕیارەیش هیچ شوێنەوارێکی لەدڵو دەروونی بازرگانەکاندا بەجێ نەهێشت، چونکە "بازرگانییەك بوو قازانجی زۆری لەدوابوو"[6].

شاری "جەنەوا" و "فلۆرەنسا" و چەند شارێکی دیکەی ئیتالیا، شان بەشانی یەك، پەرەیان دەسەندو گەشەیان دەکرد. بەڕادەیەك شاری "فلۆرەنسا" لەزۆر بواری ئابوریدا شاری "ڤینیسیا"یشی بەجێهێشت. جموجۆڵی ئابوری بەو شێوە فراوانەو پێشکەوتنی پیشەسازیو ئاڵو گۆڕکردنی دراو خستییە مەوقیعێکەوە "کاری کردە سەر تێکڕای ئابوری وڵاتانی ئەوروپا"[7]. و سەرهەڵدانی یەکەمین دامەزراوی شێوە سەرمایەداری لەسەر ئاستی هەموو جیهان بۆی بووە شتێکی سروشتیی. هەر لە "فلۆرەنسا"دا یەکەمین جار پەیوەندییەکانی سەرمایەداری دەرکەوتنو یەکەمین مانیفاکتۆرەو ترۆستی دارایی "الاتحاد المالي" هاتە گۆڕێو ژمارەیەکی زۆر پیشەگەرو بازرگان تێیدا کۆبوونەوە. ئەو ترۆستانە سەرپەرشتی هاوردنو هەناردنی کەلو پەلیان دەکرد.

لەسەدەی چواردەهەمدا ژمارەی کارگەی پیشەگەرە گەورەکانی "فلۆرەنسا" کە گەیشتبوونە قۆناغی مانیفاکتۆرەو قوماشیان بەرهەم دەهێنا لە "٢٠٠" کارگە تێپەڕی کرد[8]. گەشەکردنی پیشەسازی بەو خێراییە بووە هۆی ئەوەی رێژەی کرێکاران بگاتە ٨٠٪ی هەموو دانیشتووانی شار[9] ئەمەیش ژمارەیەك بوو نەك هەر لەئیتالیادا بەڵکو لەسەر پاکی کیشوەری ئەوروپاو جیهاندا وێنەی نەبوو.

---

(6) G. CI. Sellery, The Renaissance, Its Nature and Origins, Madison, 1962, p.18.

(7) D. Hay. The Italian Renaissance in its historical background. Cambridge, 1966. p.89.

(8) پرۆفیسۆر ف.ف سیمینۆف. مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست. بەزمانی رووسی. چاپی سێیەم. مۆسکۆ ١٩٧٠ ل٢٨٠

(9) J. Gage, Life in Italy at the time of Midice, London, 1968, p.101.

هەر لەو قۆناغەدا لەشاری "فلۆرەنسا"دا گەورەترین بانك بەشێوە نوێیەکەی ملمەزراو ئاڵوگۆڕی بەبەهێزترین دراوی زێڕەوە دەکرد کەلەو سەردەمەداو لەهەموو ئەوروپادا هیچ پارەیەك نەیدەتوانی شان لەشانی بداو[10]. دەرگای ئیعتیمادی بۆ بازرگانەکانیش خستە سەر گازی پشت. نەك هەر ئەوەیش، بەڵکو دەستگیرۆیی وڵاتانی نیکەی ئەوروپایشی دەکردو قەرزو قۆڵەیشی دەدانێو چەند جارێکیش پارمەتی ئینگلیستانی دا. داموو دەسگای "فاتیکان"یش بۆ کۆکردنەوەی دەرامەتی خۆی لەئەوروپادا، تەنها پشتی بە بانکەکانی "فلۆرەنسا" دەبەست[11]. تائێستایش زۆربەی ئەو زاراوانەی گەلانی ئەوروپا لەئیش‌و کاری بانکدا بەکاری دەهێنن بەڕەگەز ئیتالیاییێو مەننێکیشیان بەهۆی پەیوەندییان بەگەلانی عەرەب‌و ئیسلام‌و بیزەنتییەکانەوە، هاتوونەتە ناوناوانەوە. یەکێك لەڕواڵەتەکانی تری گەشەکردنی "فلۆرەنسا" ئەوە بوو ژمارەی دانیشتووانی لەماوەی سەدەو نیوێکدا نزیکەی دوو ئەوەندە زیادی کرد. لەکۆتایی سەدەی سیازدەهەمدا ژمارەی دانیشتووانی گەیشتە "٧٠"هەزار کەس، پاشان لەناوەڕاستی سەدەی پازدەهەم دا خۆیدا لە "١٥٠"هەزار ئەم دیاردەیەیش دەبێ بەپێوانەی دیمۆگرافیی سەدە ناوەنجییەکان حسابی بۆ بکرێ چونکە لەو کاتەدا گەورەترین شاری ئەوروپا ژمارەی دانیشتووانی لە هەشت یەکی ئەو ژمارەیەی دوایی تێنەدەپەڕی[12]. هەموو ئەو گۆڕانە بنەڕەتییانە لەسروشتی سیستمی سیاسی شارە پێشکەوتووەکانی ئیتالیادا رەنگیان دایەوە، زۆربەی خێزانە دەسەڵاتدارەکانی ئیتالیای خستە باروبۆخێکەوە پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ کاروباری پیشەسازیێو بازرگانیدا بەست‌و لەئیش‌و کاری کشت‌وکاڵی زیاتر بایەخیان پێ دەدا.

---

[10] "فلۆرەنسا" بەر لەهەموو شارەکانی تری ئیتالیا سکەی پارەی زێڕی لێدا کە بە "فلۆرین" ناو دەبرا. شاری "ڤینیسیا" بەلای کەمەوە "٣٠" ساڵێك دوای "فلۆرەنسا" دەستی بەسکە لێدان کرد.

[11] پرۆفیسۆر ف.ف سیمینۆف. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٧، ٢٨٠-٢٨١

[12] "هەر ئەو سەرچاوەیە ل١٨٢

خێزانی "میدیجی"[13] * فلۆرەنسایی باشترین نموونەی بنەماڵەی حوکمڕانن. ئـەوەی شایانیباسـە، پارەدارەکـانو بەتایبـەتی بازرگانـەکان نوێنـەریان لەئەنجوومەنـە رەسمییەکانی چەند شارێکی ئیتالیادا زۆریە نەبوون. ئەم دیاردەیەیش ئـەوە دەگەیەنێ کـە تـەوژمی بـەتینی ئـابوری نـوێ ئـەوەندەی کـات نەهێشـتبووەوە سـەرمایەدارە ئیتالیاییـەکان خۆیـان بـەکاروباری ئەنجوومەنـە رەسمییەکانـەوە خـەریك بکـەنو بەرژەوەندییەکانیان لەو پەندەدا دەبینییەوە کە "کات لەهـەموو شت بـەنرختره"[14].

لـەویش گرنگتر؛ بەردەوامبوونی هـەر سیسـتمێکی سیاسـی لەشـارەکانی ئیتالیـادا، توندوتۆڵ بەسـترابوو بەهەڵوێسـتو رادەی پشـتگیریی کردنـی ئـەو سیسـتەمەوە لەلایـەن پارەدارەکانـەوە، تەنانـەت لەهـەندێ کـاتدا داموو دەسـگا ئابورییـەکانیان "دەوڵـەتێکی سەربەخۆ بوون لەناو دەوڵەتدا"[15].

لەمـەوە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە هەرەسـهێنانی پەیوەندییـە دەرەبەگایەتییـەکانی ئیتالیا پێش وڵاتانی تر کەوتو بەحوکمی ئەو گۆڕانکارییانە.

پێداویستییەکانی کۆمـەڵی نوێیـش بـەر لەشـوێنانی دی لـەوێ دەرکـەوتن. ئەمـەیش خـۆی لـەخۆیدا هۆیـەکی بنچینـەیی بـوو تـاوەکو ئیتالیـا بکاتـە لانکـەی رێنیسـانس. بەئەندازەیەك لەسەدەی چواردەهەمو پازدەهەم دا شاری "فلۆرەنسا" بـووە مەڵبـەندی هەموو جموجۆڵێكو ناودارترین پێشەواکانیشی خەڵکی ئەو شارە بوونو جێی خۆی بوو کەناوی "پایتەختی" رێنیسانسی لێ بنرێ[16].

---

[13] وشـەکە لـە زاراوەی " Medici "یـەوە وەرگیراوە کەپـەیوەندی بـەنیشو کـاری ئـەجزاچێتیی‌و پزیشکییەوە هەیە.

* "بەرتۆڵد برێخت" لەشانۆیی "ژیانی گالیلۆ"دا پەردە لەسەر حەقیقەتی ئەم بنەماڵەیە لادەدا، کـەچۆن پەرۆشی داهێنانی نوێ‌و کاروبـاری دەرەوە بـوون. بڕوانـە شـانۆیی "ژیـانی گـالیلۆ" وەرگـێڕانی فوئـاد میـسری. بڵاوکراوەی دەسگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی ١٩٨٢. "وەرگێڕ"

[14] J. Gage. Op. Cit, P.57.

[15] "کاتی خۆی یەکێك لەبانکەکانی شاری "جەنەوا" بەو جۆرە تاریف کراوە. " Ibid P.57. "

[16] ف.ی. رۆتینبورگ، کەڵەپیاوانی رۆژگاری رێنیسانس، بەزمانی رووسی. لینینگراد ١٩٧٦ ل٣٠

شانبەشانی ئەم هۆ بنچینەییە، کۆمەڵێك هۆی تر لەئیتالیادا هاوبەشییان لەگەڵاڵە بوون و نەشونما کردنی رێنیسانسدا کرد. چونکە ئەو وڵاتە هەر بە تەنها ئەڵقەی پەیوەندی بازرگانی نێوان ئەوروپاو رۆژهەڵات نەبوو، بەڵکو بەحوکمی شوێنە جوگرافیاییەکەی، ئەڵقەی پەیوەندی فیکریی نێوان هەردوولای پێك دەهێنا. بەهۆی ئیتالیاوە بیروڕاو دیاردە گرنگەکانی شارستانیەتی رۆژهەڵات دەگەیشتە ئەوروپاو جێپەنجەی لەبووژاندنەوەی ئەوروپادا بەئاشکرا دیارە. ئەو دەورە گرنگەی ئیتالیا بینی، بەتایبەتی لەساڵانی شەڕی خاچ پەرستاندا دەردەکەوێ و سەرجەم مێژوونووسان لەو باوەڕەدان کەپاشەکشەی سوپای شکست خواردوویان زۆر دیاردەی شارستانیەتی لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا پەڕاندەوەو بەر لەهەموو شتێك لەبووژاندنەوەی ئەوروپادا رەنگیان دایەوە.

رەگەزەکانی کلتووری رۆژهەڵات و لەسەرو هەموویانەوە کلتووری عەرەبی ئیسلامی، هەرزوو لەبیروباوەڕی رێنیسانسدا کاری خۆیان کردو دواییش لەدەستکەوتەکانیدا خۆیان نواند. شتێکی بەڵگەنەویستە کەلەبەرهەمی دوو کەس لەسێ پێشەواکەی رێنیسانسدا، واتە "دانتێ" و "بۆکاشیۆ" هەست بەکارتێکردنی داهێنانە رۆژهەڵاتییەکان دەکرێ[١٧].

لەبواری زانستیشدا ئەوەندە بەسە نموونەیەك بەبەڵگە بهێنینەوە تاوەکو ناوەڕۆك و مەودای ئەم کار تێکردنە تێبگەین. لەڕۆژگاری رێنیسانسدا پورتوگالییەکان، لەناو هەموو دەریاوانەکانیاندا کەسێکی وەك "فاسکۆ دی گاما"یان هەڵبژارد، تاوەکو ئەرکی دۆزینەوەی رێگایەکی نوێی بۆ هیندوستان بخەنە ئەستۆ. چونکە ناوبراو پیاوێکی شارەزا بوو.. ئەوەبوو بەچاکترین تفاقی شەڕی ئەوسای ئەوروپا پڕ چەکیان کردو چی نەخشەو ئامرازی ئەستێرەناسیی و زانیاری تازەدۆزراوەی ئەو کاتە هەبوو خستییانە بەردەستی، بەهیوای ئەوەی خەوە گەورەکەیان بهێننە دی. بەڵام کەگەیشتە شاری "مالیندی" سەریە "کینیا"و چاوی بە "شێری دەریا" "ئەحمەدی کوڕی ماجید" کەوت،

---

[١٧] لەو بەشەدا کە بۆ ناودارانی رۆژگاری رێنیسانس تەرخانمان کردووە، دەگەڕێینەوە سەر ئەم باسە.

هەستی کرد تا چ رادەیەك پێویستی بەیارمەتی ئەو پیاوە زاناو لێهاتووە هەیە. بۆیە بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە جڵەوی سەرکردایەتی دایە دەست. بێگومان گەر ئەو نەبوایە، نەبەو خێراییە دەگەیشتە جێ و نەسەرکەوتنیشی بەنسیب دەبوو.

هۆیەکی تری گرنگ هەیە، وای کرد خاکی ئیتالیا بەر لە وڵاتانی تر ببێتە زەمینەیەکی بەپیت و تۆوی بووژاندنەوەی تێدا چەکەرە بکا. ئاشکرایە ئەم وڵاتە چەند سەدەیەك بەر لەڕۆژگاری ڕێنیسانس بووە مەڵبەندی کڵێساو جیهانی مەسیحی. ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی لەدوو سەرەوە دیاردەکانی ڕێنیسانسی تێدا دەربکەوێ و لەدوو جەمسەری ناکۆکەوە گەشە بکاو پەرە بسێنێ.

وەك لەدواییدا بۆمان روون دەبێتەوە بەشێکی زۆری بیروڕای ڕێنیسانس، بریتییە لەڕەخنە لێگرتنی کڵێسەی کاتۆلیکی کەئەوساکە "ڕۆما" بوو بووە بنکەی و هەرچی بیروڕای سەلبی کڵێسە هەیە، لەشوێنانی دی زیاتر لەو شارەدا بەرجەستە دەبوو. ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش پتر ناڕەزایی لەدەروونی ئەوروپاییەکاندا بڵێسەی دەسەند. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە کڵێسە ناچار بوو حساب بۆ ئەو گۆڕانکارییە نوێیانە بکا کەڕێنیسانس لەگەڵ خۆیدا هێنابوونییە کایەوە. لەوەیش دەترسا نەبا وردە وردە کۆمەڵ لێی بتەکێتەوە. لەبەرئەوە کەوتەخۆو چەند پیاوێکی سەر بەبیروباوەڕی نوێی لەخۆی نزیك خستەوە. تەنانەت چەند پاپایەکیان بۆ ئەوەی کڵێسە دەوری خۆی نەدۆڕێنێ، بایەخێکی باشیان بەبیروڕای هومانیستان دەداو لەنزیکەوە پەیوەندییان لەگەڵ پەیدا دەکردن. هەندێکی تریشیان حەزیان بەزانست و چاودێری کردنی زانایان دەکرد کەیەکێکیان کوڕی زەنگ لێدەری کڵێسە پاپا نیکۆلای پێنجەم ١٤٧٧-١٥٥٤ز بوو. ناوبراو بەوە ناسرابوو رۆشنبیرێکە تەواو لەسەردەمی خۆی تێگەیشتووە و دەزانێ چۆن هەڵی دەسەنگێنێ. ئەم پیاوە رای وابوو هیچ دژایەتییەك لەوەدا نییە بایەخ بەکلتووری بەر لەزاین بدرێ و لەهەمان کاتیشدا دڵسۆزی ئاینی مەسیحی بن. ئەو دەیویست بەهۆی ئاین و "لایەنە چاکەکانی شارستانیەتی کۆنەوە سەرلەنوێ ڕۆما بکاتەوە بەپایتەختی جیهانی مەسیحی"[١٨].

---

(١٨) J.R. Strayer and Others, Op. Cit., P.P. 362- 368

لەبەرئەوە "نیکۆلای پێنجەم" بێ سێو دوو ژمارەیەك نوماینده‌ی خۆی بەکیشوەری ئەورووپادا بڵاوکردەوە، تاوەکو چی دەستنووسی کۆن هەیە کۆی بکەنەوە. سەرەنجامیش ئەو دەستنووسانە بوونە گەنجینەیەکی بەنرخو ئەوەندەی تر کتێبخانەی ڤاتیکانیان پێ دەوڵەمەند بوو. جگە لەوەی پەنای بردە بەر لێکۆڵەرەوەو مێژوونووسێکی بەتوانای وەك "لۆرێنزۆ ڤالا ١٤٠٧- ١٤٥٧ز"و چەند کەسێکی تریش، بۆ ئەوەی لەناوەڕۆکی ئەو دەستکەوتانە بکۆڵنەوە. چەند پاپایەکی تری دوای "نیکۆلا" هەمان ڕێبازی ئەویان گرت بەڵام نەك بەو شێوە فراوانەی ئەو؛ هەریەکەیشیان تا ڕادەیەکی باش ڕۆڵی خۆیان لەبواری زیندووکردنەوەی کلتووری کۆنو پشتگیریکردنی پیاوانی سەر بە ڕێنیسانسدا بینی. نەك هەر ئەوەیش بەڵکو هەوڵیشیان دەدا وزەو توانای کۆمەڵێك لەبەتواناترین پیاوانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس بخەنە کارو هانیان بدەن بلەهێنانە هونەرییەکانیان لەسەر دیوارو گومەزی بەناوبانگترین کڵێسەکانی ئیتالیادا بنەخشێنن، تاوەکو بە نەمریی بمێننەوە. هەروەك لەتابلۆکانی کڵێسە ناودارەکەی "پەترۆس"و هۆڵەکانی "ڤاتیکان"دا دەبینرێن. پێویستە ئەوەیشمان لەیاد نەچێ کەئیتالیا خۆی لانکەی کلتووری ڕۆمانی کۆن بوو، ڕۆڵێکی دیاریشی لەگەشە پێکردنی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا گێڕا بوو. هەر ئەم هۆیەیش بووە هاندەرێکی گرنگو پاڵی بەزانا ئیتالیاییەکانەوە نا، زیاتر تێبکۆشن. چونکە ئەوانە تائەو کاتە لەمێژووی خۆیان نەپچڕابوونو دەستبەرداری نەبووبوونو دەتوانین بڵێین لەزۆربەی وڵاتانی دیکە زیاتر پارێزگاریی کۆنینەی مێژووی خۆیان دەکرد.. لێرەدا دەبێ ئاگاداری ئەو حەقیقەتەیش بین، کەوڵاتانی ئەورووپا لەچوارچێوەی پەیوەندییە باوەکانی ئەو قۆناغەدا، لەباری ئابووریو سیاسییەوە نەك هەر لەسەدەکانی پێشووی خەمڵیوتر بووە، بگرە لەهەموو لایەنێکەوە بەسەر پەیوەندییەکانی سەردەمی دەرەبەگایەتیدا باڵادەست بوو کەڕۆژ لەدوای ڕۆژیش بەرەو گەندەڵ بوونو لەناوچوون هەنگاویان دەنا. لەم ڕوانگەیەوە،

دوژمنانی سیستمی دەرەبەگایەتی بەپێی تێگەیشتنی خۆیان دوژمنایەتییان دەکردو هەندێ جاریش ناوناتۆرەی وایان لێ دەنا راستییەکەی بەو جۆرە نەبوو. بەکورتی ئەوانە هەڵوێستی دوژمنانەیان کردە ئامرازێك بۆ تێکدان و هەرەس پێهێنانی ئەو رژێمە بۆگەنە. سەرەنجامیش توانییان کاری خۆیان بکەن و تەنها بەراورد کردنێکی ئاسایی دەمانگەیەنێتە ئەو حەقیقەتەی کە تا چ رادەیەك ئەو سیستمە رزیوە لەگەڵ سەدەی نووی گەشەکردوودا لەیەك دوورن.

لەبەرئەوەی هەتا ئێرە هەر بەدەستنیشانکردنی ئەو هۆیانەوە خەریك بووین کەوڵاتی ئیتالیایان کردە پێشرەوی رێنیسانس، پێویستە دەست بۆ حەقیقەتێکی تریش رابکێشین. سەبارەت بەوەی لەو سەردەمەدا ئامرازەکانی بەرهەمهێنان ساکارو سادەبوون، دەبینین بەرهەمە زانستیو تەکنیکییەکان بەسستی پەرەیان دەسەندو گەشەیان دەکرد، رێنیسانس چونکە کاتێکی زۆرو تاقیکردنەوەی زۆرتریان دەویست. ئەمە لەکاتێکدا کرۆکی رێبازە فیکرییەکانی رۆژگاری رێنیسانس لەبەرهەمی ئەو نووسەرو هونەرمەندە بەهرەدارانەدا رەنگیان دەدایەوە کەبەڕاستی خاوەنی هەستی ناسك و گیانی داهێنان بوون. لەلایەکی تریشەوە ئیتالیا ناوبانگی بەوە دەرکردووە کەسروشتێکی رازاوەی هەیە، ئەمەیش وای کردووە زمان و ئەدەبیاتی بەپێزتر بکاو سەرچاوەی داهێنان لەبوارەکانی هونەرو ئەدەبدا بتەقێتەوەو بنچینەیەکی نوێ بۆ چێژ لێ وەرگرتنی ئەم بەرهەمە جۆربەجۆرانە دابمەزرێنێ. هەر لەو سەردەمەدا گەر شاعیرێکی میللی ئیتالیایی خواست و ئاواتەکانی لەبۆتەی شیعرێکی نوێدا بتواندایەتەوەو بیویستایە بەجەماوەری رابگەیەنێ، چی کاسبکاری ناوبازاڕ هەبوو دەسگاو دووکانیان دەپێچایەوەو بەپەرۆشەوە روویان تێدەکردو گوێیان بۆ شیعرەکەی رادەهێشت[١٩].

ئەنجامی کارکردنی ئەم هۆیانە، رێنیسانس لەئیتالیادا پێش وڵاتانیتر خۆی نواندو هەل و مەرجی گەشەکردنی بۆ رەخساو توانی خزمەتێکی ئەوتۆی بکا رەگەزە

---

[١٩] هربرت فيشر. أصول التأريخ الأوروبي الحديث، ترجمة عصمت راشد والدكتور احمد عبدالرحيم مصطفى- القاهرة. الطبعة الثالثة، ١٩٧٠، ص ٤١-٤٢

بنچینەییەكانی نەش‌و نماكردنی بەجۆرێك پێببەخشێ كە لەوزەو توانای هیچ ولاتێكی تری ئەوروپاییدا نەبوو. جا هەر چەندە ئیتالیا بەهۆی دەست تێوەردانی بێگانەو بۆزینەوەی رێگای دەریایی نوێوە نوشستی هێنا، بەلام ئەم تێك شكاندنەیش تەوژمی بەتینی رێنیسانسی رانەگرت. بۆ سەلماندنی ئەم راستییەیش ئەوەندە بەسە بڵێین: كەڵە پیاوانی وەك "لیۆناردۆ داڤینشی"و "میكائیل ئەنجیلۆ"و "رۆفائیل"و هەندێكی تریش هاوچەرخی ئەو نوشستییە بوون‌و لەو ساڵانەدا لەسایەی باروزروفێكی ئێجگار ناڵەباردا كەدوایی باسیان دەكەین- بەرهەمی ئەوەندە ناوازەیان هێنایە گۆڕێ، هەتا هەتایە بەنەمریی دەمێننەوە. ئەم واقیعە واتە دەركەوتن‌و گەشەكردنی رێنیسانس لەئیتالیادا وای لەهەندێ مێژوونووس كردووە بگەنە ئەو باوەڕەی كە بووژاندنەوە تەنها ئەو ولاتەی گرتۆتەوە. ئەگەرچی ئەم لێكدانەوەیە كەمێك زێدەڕۆیی تێدایە، بەلام كار تێكردنی بیروباوەڕی ئیتالیای رۆژگاری رێنیسانس لەولاتانی تر مەسەلەیەكە هیچ كەسێك ناتوانێ نكوڵی لێ بكا. هەرچۆنێك بێ پەیوەندیی لەپچڕان نەهاتووی رێنیسانس بەولاتی ئیتالیاوە دەیكاتە نموونەیەكی وا، دەتوانین لەرێگەیەوە بەگشتیی سەردەمەكەی بەسەر ئەم سێ قۆناغەدا دابەش بكەین.

قۆناغی یەكەم: لەدوادوای سەدەی چواردەهەمەوە دەست پێ دەكا بۆ سەرەتای سەدەی پازدەهەم .

قۆناغی دووەم: واتە قۆناغی پێگەیشتن‌و نەشونماكردنی كەدەگاتە كۆتایی سەدەی پازدەهەم و سەرەتای سەدەی شازدەهەم.

قۆناغی سێیەم: واتە سەرانسەری سەدەی شازدەهەم. هەر ئەم دابەشكردنە بەهەمان شێوە دەتوانرێ بەسەر ولاتانی دیكەی ئەوروپادا بچەسپێنرێ.

قۆناغی یەكەم: واتە ئەو قۆناغەی رێنیسانسی تێدا لەدایكبوو. لەدووەمیشدا پێگەیشت‌و بەخۆیدا هات. بەلام لەسێهەمدا مرۆڤایەتی‌و بیروباوەڕی رێنیسانس دووچاری گێروگرفتێكی راستەقینە بوو، وەك لەپاشدا بەدرێژیی لێی دەدوێین. هەر یەكێكیش لەم سێ قۆناغەی بووژاندنەوە چەندین خاسییەتی بنچینەییان پێكەوە ناوەو

هەریەکێکیش لەو خاسییەتانە بەم یان بەو شێوە جیاوازییان لەتەك قۆناغی پێشووی خۆی، یان قۆناغی دوای خۆیاندا هەبوو.

## خاسییەتەکانی رێنیسانس:

رۆژگاری رێنیسانس و بزووتنەوەی مرۆڤایەتیچەند خاسییەتێکی ئەوەندە دیاریان هەیە، توانییان سەرانسەری رێنیسانس بکەنە شۆڕشێکی فیکریی و رۆشنبیریی ئەوتۆ مۆرکێکی تایبەتی بەمێژووی مرۆڤایەتییەوە بنێن. لێرەیش بەدواوە هەوڵ دەدەین گرنگترین لایەنی ئەو خاسییەتانە بەکورتی دەست نیشان بکەین.

١-لەبەرئەوەی لەدایکبوونی رۆژگاری رێنیسانس راستەوخۆ بەسترابوو بەپەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانەوە، دەبینین لەیەك کاتدا هەموو وڵاتە ئەورووپاییەکانی نەگرتەوە. ئیتالیاو چەند وڵاتێکی تری رۆژئاوا پێش وڵاتانی تر کەوتن، بەرادەیەك تەنها چەند پریشکێکی گەیشتە ئەورووپای رۆژهەلات[٢٠] و ناوچەکانی "بولکان" کە لەو سەردەمەدا کەوتبوونە ژێر دەستی عوسمانلی داگیرکەرەوە. بەلام سەرەرای ئەمەیش ئەو وڵاتانە توانییان مەرجەکانی رێنیسانس بەهۆی داهێنانی زانایانیانەوە بەهێزتر بکەن، باشترین نموونەیش ئەوەیە کەزانایەکی بەناوبانگی وەك "کۆپەرنیکۆس" هاوولاتییەکی پۆلۆنیاییە. لەم بۆچوونەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە رێنیسانس، دەستکەوتی رۆشنبیریی سەرجەم ئەو میللەتە ئەورووپاییانەیە کەلەبەر رۆشنایی باروزروفی تایبەتیو ناوخۆیی خۆیاندا، دەوریان لەگەشەپێکردنیدا دیوە. جا گەرییو رادەی کارتێکردنی شارستانیەتی رۆژهەلات بەراستی لەبەرچاو بگرین، ئەوا رێنیسانس لەچوارچێوە گشتییەکەیدا دەبێتە دەستکەوتی رۆشنبیریی تێکرای مرۆڤایەتی. راستییەکەیشی

---

[٢٠] ئەو کاتەی رووسەکان کۆشکی "کرێملین"یان بنیات نا، هونەری بیناکاریی ئیتالیایی بەتەواوی کاری تێکردبوون. قوللەو شوراکانی "کرێملین" لەسالی ١٤٨٥- ١٤٩٥ی ز بەسەرپەرشتیی چەند ئەندازیارێکی ئیتالیایی بنیات نران.

ولیە، چونکە حەقیقەتی ڕێنیسانس ئەنجامی مەنتیقی ئاوێتەبوونی بەردەوامی شارستانییەتە جۆربەجۆرەکانەو مەوداکەیشی چ لەڕووی کارکردنو چ لەڕووی کارتێکردنەوە گەلێك لە ڕێنیسانس بەرپلاوترو فراوانترە.

مایەی داخە، سەرەڕای ئەم حەقیقەتە چەسپاوە -ڕۆژئاواییەکان خۆیشیان دان بەوەدا دەنێن کە ڕێنیسانس قەرزداری ڕۆژهەڵاتییەکانە- کەچی کەمو زۆر لەنووسینەکانیاندا ڕەنگ نادانەوەو بەوچاوەوە تێی ناڕوانن کەبەرهەمی ڕەنجو تەقەلای هاوبەشی گەلانی دونیایە. ئەوەیشی کەزیاتر پاڵپشتی ئەم رایەمان دەگرێ ئەوەیە، لەڕەوتی گەشەکردنی شارستانیەتدا پرشنگی ڕێنیسانس بەتەنها بەشێك یان هەموو کیشوەری ئەوروپای رووناك نەکردەوە، بەڵکو هێزو گوڕێکی ئەوتۆی بەخۆیەوە دی، بەشێوەی جۆربەجۆر خۆی گەیاندە بست بەبستی سەر رووی زەمینو زانایانی بەپێی پێداویستو بارو زرووفو قۆناغە مێژووییەکەی خۆیان، بەشدارییان لەپێشخستنو گەشەپێکردنی دەستکەوتەکانیاندا دەکرد.

٢-گوڕوگوژمی ڕێنیسانسو چۆنیەتی پەرەسەندنی ڕاستەوخۆ بەستراوبوو بەڕادەی گەشەکردنی پەیوەندیو دیاردە ئابوریو کۆمەڵایەتییە تازەکانی وڵاتە ئەوروپاییەکانەوە. بەنموونە: ڕێنیسانس لەئینگلستاندا لەسەدەی چواردەهەمدا سەری هەڵدا. بەڵام تیژ بوونی ناکۆکیو ململانێی هێزە دەرەبەگەکان لەو وڵاتەدا بووە هۆی دلگیرساندنی شەڕی ناوخۆ[٢١] و لەسەدەی پازدەهەم دا کۆسپێکی ئەوەندە نالەباری خستە بەردەم پەرەسەندنی ئینگلستان، دیاردەکانی ڕێنیسانس تاسەرەتای سەدەی شازدەهەم دەرنەکەوتن، واتە ئەو کاتەی سەرەتای چوونە پێشەوەو گەشەکردنی ئابوریو کۆمەڵایەتی لەئینگلستان بەشێوەیەکی دیار هەستیان پێدەکرا.

لە "ئیسپانیا"یشدا گەندەڵبوونی خێرای لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی گەلی ئیسپانیا ماوەیان نەدا دیاردەکانی ڕێنیسانس بەو خێراییە تەشەنە بکەن وەك لەسەرەتادا هەر لەوێ سەریان هەڵدا.

---

[٢١] مەبەست لەشەڕی ١٤٥٥-١٤٨٥ی ز کەبەشەڕی "جوتە گوڵ- حرب الوردتين" ناسراوە.

پوختەی قسە ئەوەیە، لەدایکبوون و پاشان پەرەسەندنی ڕێنیسانس، لەسەر هێڵێکی دیاریکراو نەدەڕۆیشتن، بەڵکو بەپێی ئەو بارودۆخە خۆی دەنواند کەهەر وڵاتە پێیدا تێپەڕ دەبوو. ڕێنیسانس دەستکەوتی ڕەنج و کۆششی ئەوروپایە لەچوارچێوە تەسکەکەیداو هی هەموو جیهانە لەچوارچێوە فراوانەکەیدا.

٣-هەرچەندە ڕەگەزێکی هاوبەش هەموو دیاردەکانی ڕێنیسانسی لەسەرپاکی وڵاتە ئەوروپاییە جیاجیاکاندا بەیەکترەوە گرێدا، بەڵام هەر وڵاتە بەهۆی زرووفی تایبەتی خۆیەوە پێویستی بەوە دەکرد پێ لەسەر دیاردەیەکی تایبەتی دابگرێ و سیماو خاسیەتی خۆی بپارێزێ.

بەنموونە: لە "ئەڵمانیا"دا هومانیستان دەستیان دایە ئەو لێکۆڵینەوانەی کە "ئارلزمس- ئێرازمۆس"[٢٢] بە "فەلسەفەی عیسا" ناویان دەبا[٢٣].

لەم ڕوانگەیەوە ڕێنیسانس لە "ئەڵمانیا"دا چووە قاڵبێکی قووڵی فیکرییەوەو ڕاستەوخۆ لەمەسەلەکانی کڵێسەی کاتۆلیکییان دەکۆڵییەوە. ئەوەبوو لەدواییدا کاری لەبزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینیش کرد. بەڵام فەرەنساییەکان بەتایبەتی ڕوویان کردە لێکۆڵینەوەی یاسای ڕۆمانیی کۆن، ئەمەیش بۆ ئەو کاتە دەستپێشخەرییەکی گرنگ بوو. ئەنجامیش زەمینەیەکی لەباری بۆ گەشەکردنی لێکۆڵینەوەی یاسایی لەفەرەنسادا ڕەخساند[٢٤]. کەچی بیروباوەڕی ڕێنیسانس لەئینگلستاندا لەزەمینەی فەلسەفەو ئیستاتیکادا ڕەگی داکوتاو بەئاشکرا لەبواری ئەدەب و سۆسیۆلۆژیاو شانۆدا تەعبیری لەخۆی دەکرد. وەنەبێ ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەیش سیما ئاینییەکەیان ون کردبێ،

---

[٢٢] یەکێکە لەناودارترین هومانیستەکانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس. بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە ئەو بەشەی بۆ ناودارانی ڕێنیسانس تەرخان کراوە.

[٢٣] The Renissance and the Reformation 1300-1600, by D. Weinstian. NewYork, 1955 p.19.

[٢٤] لەمێژەوە دانشگاکانی فەرەنسا بایەخێکی گەورەیان بەیاسا داوە. تەنانەت زمانی فەرەنسایی لەڕێکخستنی کاروباری نێودەوڵەتاندا جێگایەکی تایبەتی هەیە.

بەتایبەتی لەسەردەمی شەڕی جووتەگوڵدا، چونکە هەر لەو کاتەدا شان بەشانی ئەم چەشنە بەرهەمانە، چەندین ڕۆمانی نوێ لەدایك بوون و بەهەمان شێوازی پێشوو بەشان و شکۆی سوارچاکیی و پاڵەوانێتیدا هەڵیان دەدا. چەند وڵاتی وایش هەبوون تێیاندا فیکری ڕادیکالی[*] بەهێزتر تەعبیری لەخۆی دەکرد وەك لەهەندێ وڵاتی دیکە. بەڵام سەرەڕای ئەم جیاوازییانەیش لێکچوون و نزیکیان لەیەکترەوە، بەهەر بارێکدا لێك بدرێتەوە ئەوە دەگەیەنێ کەکلتووری ڕۆژگاری ڕێنیسانس لەسەرپاکی کیشوەری ئەورووپادا سەرووەرو باڵادەست بووە.

٤-پیاوانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس بەتایبەتی لەئیتالیادا تەنها لەبوارێکدا پسپۆر نەبوون. زۆرجار ڕێکەوتووە یەکێك لەوانە چمکی چەند لایەنی جۆربەجۆری زانستی و هونەری گرتووەتە دەست. باشترین نموونەیش نیگارکێشی نەمر لیوناردۆ دافینشییە.

ناویرلو پەیکەرتاشێکی شارەزاو نووسەرێکی دیارو ئەندازیارێکی سەرکەوتوو، زانایەکی پزیشکیی یەکالاکردنەوەی التشریح-ی جەستەی ئادەمیزاد بوو. "کۆپەرنیکۆس"یش زاناو ئەستێرە شوناسێکی شارەزابوو. زانیاری پزیشکیی و یاسایی و فەلەکی لەوڵاتی خۆی و ئیتالیا خوێند. لەوڵاتەکەی خۆیدا بەدرێژایی "٤٠"ساڵ بەردەوام بەتاقیکردنەوە زانستییەکانەوە خەریك بوو. پێبەپێی ئەوەیش لەبواری دارایی و ئیدارییدا کاری دەکرد. بیروڕاو بۆچوونەکانی دەیخەنە ریزی زانایانی سەردەمەکەیەوە. "ماکیافیللی"یش هەر لەو کاتەدا کەمێژوونووس و سیاسییەکی بەناوبانگ بوو، یەکێکە لەنووسەرو فەیلەسووفەکانی سەردەمەکەی[**]. بۆ زیاتر دەست خستنە سەر ئەم

---

[*] ڕێبازی رادیکالی "رادیکالیزم" بەو ڕێبازە دەگوترێ کەدەیەوێ سیستمی کۆمەڵایەتی لەبنەڕەتەوە بگۆڕێ. ئەم ڕێبازە سیاسییە لەتەك نەش و نماکردنی پیشەسازییدا هاتە ناوناوانەوەو گەرەکی بوو کۆمەڵ لەکۆت و پێوەندی دەرەبەگایەتی رزگار بکا.
ئەم سەردەمەیشدا "رادیکالیزم" ئەو ڕێبازە دەگرێتەوە "چەپ یان راست" کەلەپێناوی گەیشتن بەئامانجدا زێدەڕۆیی "تطرف" دەکا. وەرگێڕ-

[**] ئەم دیاردەیە ئەگەرچی یەکێکە لەخاسییەتەکانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس، شتێکی سروشتی بووە. چونکە پەیوەندی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەو کاتەدا نەگەیشتبووە ئەو رادەیەی کار دابەش بکاو

دیاردەیە، لەو بەشەدا کەبۆ ناودارانی ڕێنیسانسمان تەرخان کردووە، لەچەن نموونەیەکی تریش دەدوێین.

٥-لەقۆناغی یەکەمدا پێشەوایانی ڕێنیسانس بایەخێکی زۆریان بەبەرهەمە فیکرییەکانی پێش قۆناغی دەرەبەگایەتیدا. واتە بەرهەمی ئەو چەرخەی تێیدا زانایان تەوقی بەکاتۆلیکی کردن نەخرابووە گەردنیان. ئەوانە لەهەموو شت زیاتر بایەخیان بەژیانو ئادەمیزاد دەدا. باوەڕێکی نەگۆڕیان هەبوو بەوەی کەدەتوانن لەپاش دەیانو سەدان ساڵەی زوڵمو ستەمی سەدەکانی ناوەڕاست بگەڕێنەوە سەر ڕێبازەکەی خۆیانو ئاوڕ لەژیانی ڕاستەقینە بدەنەوەو هەوڵ بدەن لەسروشت تێبگەنو تەعبیری لێ بکەنو لەڕێگەی ژیاندنەوەی کەلەپووری کۆنەوە سوود وەربگرن. هەوڵوکۆششی ئەمانە بەدرێژایی سەدەی چواردەهەمو پازدەهەم لەپێناوی ژیاندنەوەی کەلەپووری کۆندا گەیشتە ڕادەیەك خەڵکی لایان وابوو دیاردەکانی بووژاندنەوە تەنها بریتییە لە زیندووکردنەوەی ئەو زانستانەی لەسەردەمی گریكو ڕۆماندا باو بوون. بەجۆرێکی تر بڵێین: خەڵکی هەستیان بەوە نەدەکرد کەسەرهەڵدانی ئەو دیاردە نوێیانە ئەنجامێکی سروشتیی ئەو پێداویستە کۆمەڵایەتییە تازانەبوو کە بەچەند قۆناغێك سنووری کۆمەڵی کۆنیان بەجێهێشتبوو. ناوەڕۆکیشیان بریتیبوو لەو داهێنانو دۆزراوە نوێیانە لەسەدەکانی پێشوودا نەك هەر بیریان لێ نەدەکرایەوە بەڵکو پێویستیشیان پێیان نەبوو. کەواتە هۆیەکانی ڕێنیسانس وەك پێشتر باسیان لێوە کرا بەجۆرێك لەکۆمەڵدا ڕەگیان داکوتابوو، لەوە دەرچووبوون بەتەنها بریتیبن لەبووژاندنەوەی کەلەپووری کۆن. یاخود ئەنجامی هەرەسهێنانی "قوستەنتەنییە" و پەڕینەوەی "بیزەنتییەکان" و دەستنووسە گریکییەکان بووبێ بۆ ئیتالیا، وەك ژمارەیەکی زۆر لەمێژوونووسان پێی

---

- یاسای دابەشکردنی کار "تقسیم العمل" بەوجۆرە خۆی بسەپێنێ کە لەقۆناغی ئێستای سەرمایەداریدا بەدی دەکرێ. یەکێك لەخاسییەتەکانی پەیوەندی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری دابەشکردنی کارە بەو جۆرەی هەرکەسە لەبوارێکی تایبەتیدا هەڵبسووڕێ. ئەمەیش وا لەئادەمیزاد دەکا ماوەی داهێنان لەبەردەمیدا بێتەوە یەكو نەتوانێ وزەی لەبن نەهاتووە بخاتە کار. وەرگێڕ-

لەسەر دادەگرن. نەخێر، راستییەکەی ئەوەیە "ئەورووپا بەئاگا هاتبووەوەو بەپەرۆشەوە هەڵپەی بۆ زانستی نوێ دەکرد" جالەبەر ئەوە ئارەزووی لەزانستو زانیاری نوێ بوو، ناچار بوو بۆ گەیشتن بەم مەبەستە پیرۆزە لەهەموو لایەنێکەوە پەلوپۆ بهاوێژێ. بۆیە رۆڵەکانی کەوتن بەسەر لێکۆڵینەوەی "لایەنە پشتگوێ خراوەکانی گەنجینەی کلاسیزمدا کەتا ئەوکاتە لەبیرکرابوون". لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە رێنیسانس "قۆناغێکە لەقۆناغەکانی گەشەکردنی بیر[٢٥] نەك وێنەیەکی کتوپڕی رابووردوو، وەك لەبابەتەکانی داهاتوودا روون دەبێتەوە.

٦-هەموو ئەو داهێنانە نوێیانەی رۆژگاری رێنیسانس، خزمەتی زانستو تەکنیکی تازەیان دەکردو پەیوەندییەکی بەتینیان بەبەرژەوەندییەکانی چینی بۆرژواوە هەبوو. ئەمەیش بەئاشکرا لەو گۆڕانکارییانەدا بەرجەستە دەبێ کەلەمەیدانی کەشتیی دروستکردنو پێشکەوتنی لێکۆڵینەوەی جوگرافیاییو ئەستێرەناسیدا بەدی دەکران، چونکە بەبێ ئەو پێشکەوتنە مەحاڵ بوو رێگای تازەی بازرگانیی لەنێوان جیهانی کۆنو بەری رۆژئاوای سەرزەمیندا بدۆزێتەوە.

هەر لەم قۆناغەدا، بڵاوکراوەی جوگرافیایی هەمەجۆر دەردەچوونو ناوەڕۆکیان پڕ بوو لەزانیاری کۆمەڵایەتیو زانستی خۆشو گرنگ؛ بەڕادەیەك نەك هەر سەرنجی گەڕیدەو گەڕۆکەکانیان رادەکێشا، بگرە خوێنەری ئاسایش تامەزرۆی خوێندنەوەیان بوو. هەروەها بایەخ بەماتماتیكو رووەکناسییو چەند زانیارییەکی تری سروشتی دراو هەریەکەیان بەپێی پێدویستییەکانی کۆمەڵی نوێ بەشدارییان لەگەشەپێکردنی ژیانی

---

[٢٥] A. J. Grant A history of Europe. Part ll. London, 1929, p.p.463-464.

"گرانت" لەکۆتایی رایەکەی سەرەوەیدا، دەڵێ: "رێنیسانس قۆناغێك بوو لەقۆناغەکانی رەوتی گەشەکردنی بیر لەئەورووپادا". بەڵام ئێمە وشەی دواییمان لەو قسەیەی وەرنەگرت. چونکە لەتەك ئەو رایەی پێشوومانتدا کەلەخاڵی یەکەمی خاسییەتەکانی رێنیسانسدا باسمان کردووە ناگونجێ. ئەمەیش سەبارەت بەوەی کە زەمینەی رێنیسانس مەوداکەی زۆر لەوە فراوانترە کە بەبووژاندنەوەی ئەورووپا لەقەڵەم بدرێ. بەپێچەوانەوە دیاردەکانی رێنیسانس جۆرەبەجۆرەی تێکرای مرۆڤایەتی پێوە دیارە.

ئابووری وڵاتە ئەورووپاییەکاندا دەکرد. ئەم بایەخدانەیش بەزانیارییە سروشتییەکان، بنچینەی ئایدیۆلۆژیای چینی بۆرژوای تازەپێگەیشتووی پتەوتر کردو لەسەر بناغەی تاقیکردنەوە، زۆربەی هەرەزۆری بیروباوەڕی دەرەبەگایەتی پووچەڵ کردەوە، کە لەماوەی چەند سەدەیەکدا باڵی بەسەر کۆمەڵگای ئەورووپاییدا کێشابوو(*).

٧-لەبەرئەوەی هومانیستانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس بەردی بناغەیان بۆ تەلاری ڕۆشنبیریی نوێ دونیایی دانا، دەتوانرێ هەر ئەوانە بەبنیاتنەری ئایدیۆلۆژیای چینی بۆرژوا لەقەڵەم بدرێن. سەرەتای دەرکەوتنی زاراوەی هومانیزم و هومانیست Humanism, Humanistic وەك دەربڕینێکی فیکریی و کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدەهەم[٢٦]. ئەم زاراوەیە لەبنەڕەتدا لەوشەی Humanitasی لاتینییەوە، وەرگیراوە کەماناى مرۆڤایەتی دەگەیەنێ. ئەمەی دواییش لەوشەی Homo وەرگیراوە کەمانای ئادەمیزاد دەبەخشێ. ڕابەرانی ئەم ڕێبازە نوێیە مەبەستیان لەهەڵبژاردنی ئەم زاراوەیە ئەوە بوو پێ لەسەر سیما دونیاییەکەی زانستو ئەدەب دابگرن و بایەخ بەئادەمیزاد بدەن. چونکە بەدرێژایی چەند سەدەیەك و بەتایبەتی لەو کاتەوەی کەسەندیکاو ڕێکخراوە پیشەییە جۆربەجۆرەکان وەك تەوقێك لەگەردنی ئادەمیزاد ئاڵابوون. کەوا بوو دیارترین خاسییەتی هومانیزم ئەوەبوو پێی لەسەر خودی تاکەکەس دادەگرت Individualism- Individual [٢٧]. بێگومان ئەم هەڵوێستەیش

---

(*) چینی بۆرژوا لەنەشونماکردنو پێگەیشتنیدا و لەبەر رۆشنایی بەرژەوەندییە ئابووریو سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانیو بەمەبەستی بەگژاچوونەوەی بیری دەرەبەگایەتی، پشت بەدەستکەوتە زانستییەکان دەبەستێو ئایدیۆلۆژیاکەیشی سیمایەکی زانستییانە دەگرێتەخۆی. بەڵام لەقۆناغێکی تردا و بۆ سەرکوتکردنی ئەو چینو توێژە کۆمەڵایەتییانەی دژایەتی دەکەن، بەتایبەتی پرۆلیتاریا، پەنا دەباتەبەر بیری میتافیزیکیو بەهەموو توانایەوە پشتگیری دەکا. وەرگێڕ-

[٢٦] لەسەدەی شازدەهەمەوە، وەك زاراوەیەك بنج بەست بوو. وەکی تر لەو مێژووە زۆربەی هومانیستەکان زاراوەی Humanitas یان لەبەرهەمەکانیاندا بەکاردەهێنا.

[٢٧] مەبەستی هومانیستەکان لەزاراوەی Individualism تاکڕەویی الفردیة- نەبوو، بەڵکو دەیان ویست پێ لەسەر خودی ئادەمیزادو کەسایەتی تاکەکەس دابگرن.

هەروا لەخۆوە نەبوو، بەڵکو پێداویستیەکانی ژیانی سەدەی نوێ گۆڕانێکی گەورەی بەسەر پلەو پایەی تاکەکەس‌و چۆنیەتی هەڵس‌و کەوتی لەناو کۆمەڵدا سەپاند.

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، دەرەبەگەکان بەحوکمی بنەماڵەو بەئەندازەی ئەو میراتەی بۆیان لەپاش بەجێ دەما، پلەو پایەی کۆمەڵایەتییان دەست نیشان دەکرا. لەم حاڵەدا دەرەبەگ بەرهەمی رەنج‌و تەقەللای خۆی نەبوو. بەڵام لەڕۆژگاری رێنیسانسدا خێزان‌و خانەوادەی تاکەکەس بۆی نەبوو سنوور بۆ دەسەڵاتی توێژە کۆمەڵایەتییەکانی سەرووی دابنێ‌و دەبوو سەرمایەدار –بەتایبەتی لەسەرەتای قۆناغی سەرمایەداریدا– کار بکاو لەمەیدانی ئابووریدا بکەوێتە داوی بەریەرەکانەو سازش‌و بەوردیی ئاگای لەئاڵوگۆڕی بازاڕ هەبێ. دیارە هەرچی هەوڵێکیش بدا بۆ ئەوەیە وزەو توانای پەرە بسێنێ‌و ماوە نەدا لەگێژاوی بەریەرەکانێدا رایبماڵن. ئالەم تێڕوانینەوە زاناو رۆشنبیرانی رۆژگاری رێنیسانس بایەخیان بەنرخی تاکەکەس‌و خودی مرۆڤ دەداو ئادەمیزادیان کردە "پێوانەیەك بۆ هەموو ئەو شتانەی ئادەمیزاد بەرهەمی دەهێنن"[٢٨]. چونکە هەر ئەو دەزانێ "چی دەکاو چۆن بەهرەو توانای دەخاتە کار" تاوەکو "ئەوەندەی دەرفەتی بۆ برەخسێ سوود وەربگرێ‌و رێگاو جێگای خۆی لەم جیهانەدا بدۆزێتەوە"[٢٩]. لەم تێڕوانینەوە، هومانیستان تاکە کەسیان کردە پارچەیەکی سروشت‌و رایان وابوو خاوەنی توانایەکی لەبن نەهاتووەو بوونەوەرێکە دەتوانێ "سەر بەهەموو دەرگایەکدا بکا"و مادام "تۆوی چەندین زانستی تێدایە، چی دەرگا هەیە لەبەردەمیدا ئاواڵەیە". هەر لەم بۆچوونەوە هومانیستان پێیان لەسەر مەسەلەکانی ژیانی تاکەکەس‌و چونیەتی باری سەرنجی بەرامبەر بەدیاردەکانی کۆمەڵ دادەگرت. شان بەشانی ئەمەیش بایەخیان بەهەموو ئەو کردارانەی دەدا کەلەژیاندا خۆشی‌و لەزەتی دونیاییان بۆ دابین دەکا.

---

[٢٨] M.L. Bush. Renaissance. Reformation and the Outer World, London, 1967. P.153.

[٢٩] R.R. Palmer and J. Colton, A history of the Modern World. Third edition. NewYork, 1965, p.51.

بەڕادەیەك حاڵ گەیشتە ئەوەی زۆربەیان دەیان وت: مەرجی بنچینەیی ئەوەیە خودی ئادەمیزاد بەختیار بێ، جا ئیتر بەچ ڕێگایەك دەگاتە بەختیاریی، ئەوەیان گرنگ نییە. بەنموونە: "لۆرێنزۆ ڤالا" بەکوڵ رای دەگەیاند کەئامانجی ژیان بەختیارییەو پێویستە خەڵکی هەڵپەی بۆ بکەن، چونکە خواستی سروشت خۆیەتی[30]. لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم چەشنە بیروڕایانە، ڕێگای بۆ ئەوە خۆش کرد خەڵکی جارووبار لەیاسا مەعنەوییەکان دووریکەونەوەو بێپەروا خۆیان بەخۆشیو لەزەتی ژیانەوە خەریك بکەن. ئەم دیاردەیەیش بەزۆریی لەناو توێژە دەست ڕۆیشتووەکاندا دەردەکەوت. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا دەبێ ئەو حەقیقەتە لەیاد نەکەین هومانیستان مەبەستیان لەو رایە ئەوە بوو، تاکەکەس لەکۆمەڵدا جێگای شیاوی خۆی بدرێتێ، کەدەیان وت: پێویستە دڵبەستەی یاساکانی رابردوو بین، مەبەستیان ئەوە نەبوو بەتەنها تاکەکەس بکەنە "پیاوێکی ڕۆشنبیر"، بەڵکو گەرەکیان بوو بیکەنە "هاوڵاتییەکی باشترو سوودبەخشتر"[31]. بێگومان ئەم بۆچوونەیش تەعبیری لەهەڵوێستێکی ئەخلاقیی گرنگ دەکردو دەبێ لەڕوانگەی گشتیی کۆمەڵایەتیو نیشتمانییەوە تەماشا بکرێ[*].

---

[30] یەکێك لەبیروڕایەکانی "ڤالا" ئەوەبوو کە"ئادەمیزاد بەلەشو گیانییەوە خواوەند نەخشەی کێشاوەو هیچ بەشێکی شەیتان دروستی نەکردووە" بڕوانە:

E. Garin. Italian Humanism philosophy and Civil life in the Renaissance. Translated by P. Munz, Oxford. 1965, P.50.

[31] H. Baron, Op. Cit, p.p. 431- 452.

[*] ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنەی ڕۆڵی ئادەمیزاد، بەپێودانی ئەو سەردەمەو لەئاست سیستمی دەرەبەگایەتیدا بەهەڵوێستێکی پێشکەوتنخوازانە لەقەڵەم دەدرێ. بەڵام سیستمی سەرمایەداریی لەڕەوتی چوونەپێشەوەیدا، هومانیزمی خستە قالبی فەلسەفی تاکڕەویی "الفردیة"ەوە، بەمەیش کۆتێکی قورستری کردە پێی ئادەمیزادی سەردەم. چونکە تاکڕەویی بەپێی بنەماکانی فەلسەفەی ئەمڕۆی سەرمایەداریی مانای تێڕوانینی ئادەمیزادە لەزاتی خۆیەوەو بەس بێ ئەوەی ڕەچاوی ئەو یاسا مەوزوعییانە بکا کە کۆمەڵو سروشتو بیر بەڕێوە دەبەنو ئادەمیزاد دووری لەکار پێکردنو

بەهەرحاڵ پوختەی بیروڕای هومانیستان سەبارەت بەژیانی ئادەمیزاد تەواو پێچەوانەی بیروباوەڕی کڵێسەوە بوو، کەدەیویست هەرچی شتی دونیایی هەیە بۆ خزمەتی قیامەت تەرخان بکرێ! . دیارە ئەمەیش شتێکی نوێ بوو یاسای کڵێسەو پیاوە ئاینییەکان خستبوویانە کارو زۆر دوور بوو لەجەوهەری ئاینی مەسیحییەوە، بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینیش بەشێوەیەك ئەم حەقیقەتەی سەلماند، ماوەی بۆ مشتو مڕو قسە لەسەرکردن نەهێشتەوە. دەبێ ئەو راستییەیش بووترێ کەشێوەی هەڵسو کەوتو ژیانی رۆژانەی پاپاو پیاوە ئاینییەکان تەواو بەپێچەوانەی فەرمایشتەکانی خۆیانەوە بوو. لەبەرئەوە هەڵوێستی هومانیستان شۆڕشێك بوو دژی یاسای ناڕەوای کڵێسە کەدەیویست هیچ نرخێك بۆ ژیانی ئادەمیزاد نەهێڵێتەوە. لەهەمان کاتیشدا دەیانویست لەئادەمیزادو دەوروبەرەکەی تێبگەن، ئەمەیش خۆی لەخۆیدا بووە داینەمۆیەكو زانستو زانیاریی تازەی خستە گەڕو پێشی خستن.

٨-بەشی هەرە زۆری ئەو بیروڕایانەی لەتەك ڕێنیسانسدا هاتنە کایەوە کاکڵەی ئایدیۆلۆژیای چینی بۆرژوایان پێك دەهێنا. بەڵام هەندێ لایەنی دیکەی ئەو بیروڕایانە لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژیای ئەو چینە تازەپێگەیشتووە چوونە دەرەوەو بەم یان بەو شێوە تەعبیریان لەخواستو ئاواتی توێژە کۆمەڵایەتییە هەژارو نەدارەکان دەکرد، بەتایبەتی چینی کرێکاران. هەندێکی تریشیان لەئەنجامی ئەو هۆیانەدا کەباسمان کردن رەنگدانەوەی بیری دەرەبەگایەتیو پیاوانی کڵێسە بوون. لەبەرئەوە کەدێینە سەر هەڵسەنگاندنی دیاردەکانی ڕێنیسانس هەست بەجۆرە ناکۆکیو جیاوازییەك دەکەین، بەتایبەتی لەناو ئە رێبازە فیکرییانەدا کەلەو سەردەمەدا هاتنە گۆڕێ. سەرەڕای

---

کارتێکردنیاندا هەیە. نەك هەر ئەمە بەڵکو بیانوویشی بۆ بێ ئیلتیزامیی دۆزیەوەو لەژێر پەردەی خودپەرستیدا ئادەمیزادی کردە بوونەوەرێکی دەستەپاچەی هیچ لەبارا نەبوو. سەرەنجامیش بێهوودەیی ژیان بووە قیبلەگای فەیلەسوفو سۆسیۆلۆجیستەکانی سیستمی سەرمایەداری، هەر وەك لەم سەردەمەدار لەبنجو بناوانی وجودیەتو عەبەسیەتدا بەچاکیی بەدی دەکرێ. -وەرگێڕ-

ئەمەیش ڕێنیسانس بەگشتیی بەرژەوەندیی چینی بۆرژوای تازەپێگەیشتووی دەردەبڕی. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە، چونکە لەبنچینەوە دژ بەدەرەبەگایەتی بوو، بەرگێکی شۆڕشگێڕانەی لەبەر هەڵکشابوو، تەعبیری لەئاوات و ئامانجی هەموو ئەو چین و توێژانە دەکرد کەبەرژەوەندیی بنچینەییان لەوەدا دەبینییەوە، گۆڕانێکی بنەڕەتیی لەکۆمەڵدا بەرپا ببێ.

خاسییەت و پێداویستەکانی ڕێنیسانس یەکەمجار لەئیتالیادا دەرکەوتن و پاشان لەوڵاتانی دیکەی ئەورووپادا بڵاوبوونەوەو بەپێی باروزرووفی ناوخۆی هەر وڵاتە خۆیان دەگونجان و گەشەیان دەکرد. جا سەبارەت بەوەی لەسەدەی شازدەهەمدا وڵاتە ئەورووپاییەکان بەگشتیی، لەڕووی پێشکەوتن و پەرەسەندنەوە لەئاستێکدا نەبوون بتوانن پرشنگی ڕێنیسانس وەك یەك بقۆزنەوە، دەبینین لەوڵاتانی بولکان و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا سستر تەشەنەی کردو کەمتر هەست بەکارتێکردنی دەکرێ. کەچی لەشوێنێکی وەك ئینگلستان و فەرەنساو خوارووی ئەورووپادا زیاتر بڵاوبووەوە[32] پێویستە ئاگاداری ئەوەیش بین کە ئاسەواری ڕێنیسانس بەشێوەی جۆربەجۆر لەئیتالیاوە پەڕییەوە بۆ وڵاتانی تر[33]. هێرشی سوپای فەرەنسا بۆ سەر ئیتالیا دەورێکی کاریگەری بینی و بەهۆیەوە میرو شازادە فەرەنساییەکان شارەزای شێوەی ژیان و کلتووری دانیشتووانی ئیتالیای پێشکەوتوو بوون. تەنانەت لەوانەوە شێوازی جل وبەرگی نوێ و هەڵس وکەوتی کۆمەڵایەتی فێربوون. زۆریشی نەخایاند دەرباری فەرەنسا بووە بنکەیەك و چی دیاردەی ڕێنیسانس هەبوو لەئیتالیادا قۆستیانەوەو لای خۆیان پەرەیان پێدا. بەنموونە کۆشکی پاشایەتی لە"پاریس" کەبە "لۆڤەر" ناسراوەو[34]. تائێستایش لەڕیزی پێشەوەی مەزارە فیکرییەکانی جیهان دادەنرێ

---

(32) A. J. Grant. Op. Cit. Part II. P. 459.

(33) R. Weiss, The spread of Italian Humanism,London,1964,P.P.86-97.

(34) ف. ف. سیمینۆف، هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو، ل٥٠٧.

بەرهەمی ئەو تێکەڵبوونەیە. خوێندکارانیش لەم مەیدانەدا دەورێکی باڵایان بینیو لەڕێگای ئەوانەوە زۆر لایەنی سەرەتایی ڕێنیسانسی ئیتالیا گەیشتە وڵاتانی دیکەی ئەوروپا. هەر لەساڵەکانی دوایی سەدەی چواردەهەمەوە شاری "فلۆرەنسا" لەسەر شێوازێکی نوێ دەستی دایە لێکۆڵینەوەی زمانی گریکیی کۆنو ئەنجام لەهەموو بەشەکانی تری وڵاتدا بەخێرایی بڵاوبووەوە. بەسەرێکی تریش ژمارەیەکی زۆری خەڵکی وڵاتە دراوسێکان بەمەبەستی فێربوونی زمانو شارەزابوونی بەرهەمەکانی "ئەفلاتون"و "ئەرستۆ"و فەیلەسووفەکانی تر، خۆیان گەیاندە شارەکانی ئیتالیا. ئەمانە کەدەگەڕانەوە تۆوی بیروباوەڕی نوێیان بۆ نیشتمان دەبردەوەو ئەنجام بەرووبوومێکی تازە پشکوتوویان لێ هێنایە بەرهەم[35]. هەرچۆنێك بێ، سێ قۆناغەکەی ڕۆژگاری ڕێنیسانس چ لەئیتالیاو چ لەوڵاتانی دراوسێدا، بوونە هۆی ئەوەی چەند ئەنجامێکی تایبەتیی گرنگ بەدەستەوە بدەنو پاشان کار لەگەشەکردنی بیروزانستی سەرانسەری جیهانیش بکەن.

بێگومان لەتواناییشدا هەیە خاسییەتەکانی ڕێنیسانس بەهۆی دەرخستنی ئەنجامە بنچینەیەکانییەوە زیاترو روونتر بەرجەستە بکەین، بەتایبەتی چونکە هەردوو ئەو لایەنانە تاڕادەیەکی زۆر لەیەکتر ئاڵاون، بۆیە لەبەشی داهاتوودا هەوڵ دەدەین لێیان بکۆڵینەوەو پەنجەیان بۆ رابکێشین.

* * *

(35) The Renissance and the Reformation 1300-1600. P.P.9-13.

## بەشی سێیەم

## ئەنجامەکانی رۆژگاری رێنیسانس

بیروباوەڕی رێنیسانس‌و بەرهەمەکانی بوونە هۆی ئـەوەی چـەند ئـەنجامێکی گرنگی ئەوتۆ بەدەستەوە بدەن کەلەبواری کۆمەلایەتی‌و رۆشنبیریی‌و سیاسییدا بەشدارییەکی کاریگەر لەگەشە پێکردنی کۆمەلگای ئـەوروپایی‌و سـەرجەم شارستانیەتی مرۆڤایـەتیدا بکەن. تەنانەت هەندێك لەئاسـەوارەکانی لەتـەك لـەدایك بوونیـاندا نـەمریان بـۆ خۆیـان پچڕی. لێرەیش بەدواوە هەوڵ دەدەین بەکورتیی دەست بخەینە سەر لایەنی گرنگی ئەو ئەنجامانەی ژانی رێنیسانس لەچوارچێوە فراوانەکەیدا هێنانییە دونیاوە.

١-بیروباوەڕو ناوەڕۆکی شـاکارە مەزنـەکانی رۆژگـاری رێنیسـانس تـەواوی بـیروڕای کۆمـەڵی دەرەبەگایـەتی سـەدەکانی ناوەڕاسـتی هێنایـە لـەرزین. بـەر لەهـەموو شـتێك، هـەوڵ‌و کۆششـی جۆربـەجۆری هومانیسـتان پـەردەی لەسـەر حەقیقـەتی کڵێسـەی کاتۆلیکی‌و بیروڕا سـەیرو عەنتیکـەکانی هـەڵمالی. ئـەوەی سـەرنج رادەکێشـێ ئەوەیـە، پێشەوایانی رێنیسانس بایەخێکی تایبەتییان دا بـەوەرگێڕانی کتێبـە ئاینییـە کۆنـەکان. ئەمەیش خۆی لەخۆیدا ئەوەی دەگەیاند کە جگە لەپیاوانی ئاینی، خەڵکی تریش بۆیـان هـەبوو توخنـی مەسـەلەکانی ئـاین بکـەون‌و لێیـان تێبگـەن، چونکـە بـەدرێژایی چـەند سەدەیەك کڵێسە ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەی بۆ خۆی قۆرخ کردبوو. زمانەوان‌و زانایـان – نەك پیاوە ئاینیەکان– ئەم ئەرکـەیان گرتـە ئەسـتۆو زۆر لایـەنی شـاراوەو گرنگیـان بـۆ کۆمـەلانی خـەڵکی روون کـردەوە. بەنموونـە: "لۆرێنزۆ ڤالا" کـەپاپا بـۆ خـۆی ئـەرکی توێژینەوەی هەندێ دەستنووسـی خسـتە ئەسـتۆی، توانـی چـەندین هەڵـەی نـاقۆلا لـەو نوسخەیەی ئنجیلدا بدۆزێتەوە کەکرابوو بەلاتینی‌و پاشان باسێکی سەریەخۆیشی لەسەر

نووسی. هەروەها لەباسێکی تردا ئاشکرای کرد کەئەو بەڵگەنامەیەی ناوی "پەخشی قوستەنتین"ی لێنراوە و[٣٦] گوایە بەپێی ناوەڕۆکی مافی دەسەڵاتی دونیایی بەپاپاکان بەخشیوە، لەبنچینەوە ساختەیە و لەسەدەی هەشتەمدا نووسراوەنەك لەسەدەی چوارەمی زایندا. بێگومان ئەمەیش کارێکی خراپی کردە سەر ناوبانگی پاپایەتی. "لۆرێنزۆ ڤالا" جارێکی تریش ئەوەی سەلماند کەبەهیچ کلۆجێ پاپاکان مافی ئەوەیان نییە چ لە"ڤاتیکان"و "ڕۆما"و چ لەهەر بستێکی سەر رووی زەمینـدا دەسەڵاتی سیاسییان هەبێ. لەوەیش زیاتر بێ ترس و سڵەمینەوە دەیووت: "ئەوانە لەقەشەوە بوون بە جەردەو گورگ"و[٣٧] دەمیان ژەنیوەتە رەنجی خەڵکیی.

ڕاستییەکەی ئەگەر لەو سەردەمەدا چەند کەسێکی دەست ڕۆیشتوو "لۆرێنزۆ ڤالا"یان نەپاراستایە و لەترسی ئەوە نەبوایە کوشتنی شوێنەوارێکی خراپی بەجێدەهێشت، داموو دەسگای پاپایەتی بێ سێودوو کردن دەیخستە ژێر گازو گیرەی لەنگای پشکنینەوە. هەرچۆنێك بێ ئەوەی "لۆرێنزۆ ڤالا"ی بیرتیژ کردی، هێزو گوڕێکی ئەوتۆی هەبوو، زۆر مێژوونووس بە"سەرەتای لێکۆڵینەوەی رەخنەی زانستییانەی نوێ"ی دادەنێن[٣٨].

---

[٣٦] "پەخشی قوستەنتین" (Donation of Constantin) بەڵگەنامەیەکی ساختەیە لەسەدەی هەشتەمدا راوێژکارانی پاپا نووسیانەوە و تێیدا وتیان: گوایە قوستەنتینی ئیمپراتۆری ڕۆما ٣٠٦-٣٠٧ لەسەرانسەری بەشی رۆژئاوا و تەنانەت ئیتالیایشدا دەسەڵاتی دونیایی بەپاپا بەخشیوە. پاپاکان ئەم بەڵگەنامە ساختەیان لەپێناوی دەسەڵاتی دونیایی خۆیاندا، وەك چەکێك لەمەیدانی ململانەی سیاسیدا کردیانە بنچینەیەکی یاسایی و پشتیان پێدەبەست.

[٣٧] لە"أ.أ. جوبیو" وەرگیراوە. بڕوانە "گەشەکردنی دوایی بزووتنەوەی مرۆڤایەتی لەسەدەی پازدەهەمدا" بەزمانی ڕووسی. مێژووی جیهان. بەشی سێیەم. ل ٦٢٨

[٣٨] R. Stryer and others, Op. Cit. P. 334.

زۆر لەناودارترین زانایانی جیهان "لۆرێنزۆ" کاری تێکردن. لەوانە "ئیرازمۆس"و "ڤۆلتێر"و گەلێکی تریش.

بەهۆی توێژینەوەو بەراوردکردنی وردەوە "ڤالا" گەیشتە حەقیقەتێك کەئەو لاتینییەی بەڵگەنامەکەی پێنووسراوە لەزۆر خاڵی گرنگدا جیاوازیی هەیە لەتەك ئەو لاتینییەدا کەسەردەمی قوستەنتین باویووە. تەنانەت هەندێ لەو شارانەی لەبەڵگەنامەکاندا ناونووس کرابوون کاتی نووسینی ئەو بەڵگەنامەیە لەئارادا نەبوون[٣٩]. ئەم خۆخەریك کردنو بۆچوونە گرنگانە چەکێکی کاریگەری لەدەست پیاوانی کڵێسە کردەوەو چیتر بۆیان نەدەلوا ناوەڕۆکی ئینجیلو نووسراوە ئاینییەکان بەئارەزووی خۆیان لێك بدەنەوەو بەهەوای نەفس بیروڕای دەستکردی دوور لەگیانی راستەقینەی ئاینی مەسیحی بەسەر خەڵکیدا بسەپێنن. ئەوەیش کەئەرکی هومانیستانی ئاسانتر کرد ئەوەبوو، زۆربەیان لەبنەڕەتدا پیاوی ئاینی بوون، یاخود لەدامودەسگاکانی کڵێسەدا خوێندبوویانو بەچاکی هەستیان بەناتەواوییەکانی ناو ئەم دەسگایە دەکرد. جگە لەوەیش شارەزای هەڵسوکەوتی پاپاو دەستوپێوەندەکانیان بوون. لەبەرئەوە دەبینین هەڵوێستی دژایەتیکردنی ئەمانە بەرامبەر بەکڵێسە گەیشتە رادەیەك هەرچی شتێك پەیوەندی بەکڵێسەوە هەبوو رەتیان دەکردەوە، ئەوەبوو نووسەرو زانای فەرەنسایی "رابیلیە ١٤٩٤- ١٥٥٣" هەر بەوەوە رانەوەستا بەربەرەکانێی رێبازی کڵێسەی کاتۆلیکی بکا، بگرە لەبیروڕای ریفۆرمی پرۆتستانتیش قایل نەبوو. بۆیە گاڵتەی بەدەمارگیریی ئاینی کوێرانە دەهاتو رەخنەی لەرێبازی پرۆتستانتیش دەگرت، بەرادەیەك حاڵ گەیشتە ئەوەی "کالڤن"ی پێشەوای ئەو رێبازە هێرشێکی توندی کردە سەر. هەندێکی تریشیان لەوەیش زیاتر پێیان لێ هەڵبڕی، ئەنجامیش دوچاری زەبرو زەنگی رژێمو کڵێسە هاتن -وەك لەدواییدا باسی دەکەین- و نووسینەکانیشیان قەدەغە کران، یاخود کرانە خۆراکی ئاگر.

هەڵوێستی دوژمنایەتی پیاوانی رێنیسانس بەتەنها بیروڕای کڵێسەی نەگرتەوە، بەڵکو دژایەتییەکی بەهێزی هەموو ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەیشی دەکرد کەپەیوەندییان

---

(٣٩) R. Weiss, op. Cit. P.43.

بەسەدەکانی ناوەڕاستەوە هەبوو. ئەوانە لەو باوەڕەدا بـوون کەسـەدەکانی ناوەڕاست، سەردەمی دواکـەوتنو نـەزانین بـووە، لەبەرئـەوە ناویشـیان نـابوو "سـەردەمی غوتـی" کەلەو کاتەدا واتای "بەربەر"ی دەگەیاند. بەڵام ئەوانـە لـەم بۆچوونـەیاندا لەسـەر هـەق نین، چونکـە سـەدەی ناوەڕاست وەك هـەر قۆنـاغێکی تـری گەشـەکردنی کۆمـەڵگای مرۆڤایەتیو حەتمیەتی پەرەسەندن، گەلێك دەستکەوتی گرنگی پێشکەش بەمرۆڤایـەتی کردووە. هەرچۆنێك بێ، ئـەم هەڵوێسـتەی هومانیسـتان وای لەخـەڵکی کـرد سـەدەکانی ناوەڕاست بەتاریکستانی ئەنگوستەچاوو کۆتو پێوەندێکی گران بزانن. ئـەم واقیعـەیش زەمینەیـەکی فیکریـی لـەباری رەخسـاند تـاوەکو مـرۆڤ بـەرەو سـەدەیەکی نوێـی پێشکەوتووتر هەنگاو بهاوێژێ. شایانی باسە زاراوەی "سەدەکانی ناوەڕاست" یەکەمجار لەلایـەن هومانیستەکانەوە بـەکارهێنراو مەبەستیشـیان لەسـەدەی بـەر لەڕێنیسـانسو سەدەکانی دوای گرێكو رۆمان بوو.

٢-وتـرا بایـەخدانی هومانیسـتەکان بەکەلـەپووری کۆن، یـەکێك بـوو لەخاسـییەتە بنچینەییەکانی رۆژگاری ڕێنیسانس، ئەمەیش بوو لەخاسییەتە بنچینەییـەکانی رۆژگـاری ڕێنیسانس، ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی چەندین ئەنجامی زانستییو رۆشنبیریی گەورەی لێ دەستگیر ببـێ. جـا هەرچـەندە ئـەو کەلـەپوورە لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتدا بەتـەواوی پشتگوێ خرابوو، بـەڵام پیـاوانی رۆژگـاری ڕێنیسـانس بەشـوێن ئـەو دەستنووسـانەدا دەگەڕان کە لەناو کڵێسەو دەیرە کۆنەکاندا بێنـاز کـەوتبوون. ئەوانەیشـی کەبایـەخیان بـەم مەسـەلەیە دەدا نومـایندەی تایبـەتییان تـەرخان کـرد بـوو، دەستنووسـیان بـۆ بدۆزنـەوەو بەپارەیـەکی بـاش بۆیـان بکڕن. لەلایـەکی تریشـەوە سـەدان دەستنووسـی بلنسقە لە"قوستەنتەنییە"وە پەڕییـەوە[٤٠] بەتاییـەتی بـۆ ئیتالیـاو کتێبخانـەکانیان پـێ

---

[٤٠] لەگەڵ نزیك بوونەوەی عوسمانلییەکان لەئاسیای بچووك مەترسیی کەوتـە سـەر قوستەنتیـەی پایتـەختی بیزەنتییەکان، زانایـانی بەرەبـەرە رووەو ئیتالیـا کەوتنـە رێو لەگـەڵ خۆیـاندا بەکۆمـەڵ دەستنووسـی کۆنـی بەنرخیان برد.

ئاوەدان دەکرایەوەو هەندێ کتێبخانەی دیکەیش دامەزرێنرا. هومانیستان لەپێناوی وەرگێڕانو ساغکردنەوەو بڵاوکردنەوەیاندا ئەرکێکی زۆریان کێشاو توانییان زۆربەی ئەو تێکستە کۆنانەی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا وەرگێڕدرابوونو بەدەستی ئەنقەست شتیان لێ زیاد کرابوو، راستیان بکەنەوە. هەروەها بۆ یەکەمجار تەواوی بەرهەمە ناودارەکانی شاعیرانی گریکیان وەرگێڕا، لەوانە "ئەلیادە"و "ئۆدیسا"ی "هۆمیرۆس". ئەمە جگە لەبەرهەمە فەلسەفییە کۆنەکانیش، وەك زۆربەی نووسینەکانی "ئەفلاتوون".

گومان لەوەدا نییە کەسەرپاکی ئەمانە بەئاشکرا لەبوارە جۆربەجۆرەکانی زانستی مرۆڤایەتیدا کاری خۆیان کرد، بەتایبەتی لەمەیدانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیو فەلسەفیو مێژووییدا. لەلایەکی تریشەوە مشتومڕی فەلسەفییان هێنایە کایەوەو توانییان بگەنە هەندێ بۆچوونو حەقیقەتی مێژوویی نوێو نووسەرانی رێنیسانس بیروباوەڕی تازەیان لێ هەڵهێنجان.

هەر لەو سەدەیەدا ئەو بازرگانە ئەوروپاییانەی بیروباوەڕی رێنیسانس کاری تێکردبوون، دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی کەلەپووری کۆنی رۆژهەڵاتو لەگەڵ خۆیاندا بردیانەوە بۆ وڵاتەکانیانو لەلایەن هومانیستەکانەوە بایەخێکی لەئەندازەبەدەریان پێدراو سەرەنجامیش بەردی بناغەی زانیاریی "ئیپیگرافی Epigraphy" دارێژرا، کە لەنووسینو نەخشی کۆن دەکۆڵێتەوە.

٣-رۆژگاری رێنیسانس بەتایبەتی لەسەدەی شازدەهەمدا لەمەیدانی زانیارییە سروشتییەکاندا پێشکەوتنێکی گەورەیان بەخۆیانەوە دی. لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بایەخێکی کەم تەنها بەزانیاریی کیمیا درابوو، ئەویش چونکە هەندێك لەزانایانی ئەو سەردەمە لەوباوەڕەدا بوون، گوایە بەهۆی ئاوێتەکردنی کیمیاییەوە دەتوانرێ میتاڵی ئاسایی بکرێ بەمیتاڵی بەنرخو گرانبەها. ئەو تۆزە بایەخەیش کەبەزانیاریی ئەستێرەناسیی دەدراو بەوشێوە زانستییەی پەیڕەویان دەکرد، تەنها بۆ ئەوەبوو بۆ نجومگەریی بەکاری بهێنن. ئەمە لەکاتێکدا سەرلەبەری زانیارییە سروشتییەکانی تر نەك

هەر پشتگوێ خرابوون بەڵکو ڕووی ڕاستەقینەی زۆریەیشیان شێوێندرابوو. بەڵام لەسەردەمی ڕێنیسانسدا –وەك باسکرا– بایەخدان بەو زانیاریانە بووە یەکێك لەپێداویستیەکانی کۆمەڵگای نوێ. بۆچی؟! چونکە چینی بۆرژوای تازەپێگەیشتوو لەموو سەرەوە پێویستی بەم چەشنە زانیارییانە هەبوو. یەکەم: ئەو زانیارییە سروشتییانەی کەبەهۆی داهێنانی نوێوە هاتبوونە گۆڕێ و ئەنجامی حەتمیی ئەو پێشکەوتنە بوون، ڕەگەزی بنچینەیی دەسەڵاتی ئابورییان بۆ ئەو پێك دەهێنا.

دووەم: سەرپاکی دەستکەوتە زانیارییەکان بەئەندازەیەکی دیار بیروباوەڕی نوێیان پتەوتر کردو بەرەبەرە، ڕەگوڕیشەی بیری دەرەبەگایەتییان لەبن هەڵدەکێشا.

پەرەسەندنی نوێی زانستیی لەزۆر بواردا پەلوپۆی دەهاویشت و گۆڕانێکی چۆنیەتی لەبوارە جۆریەجۆرەکانی زانستدا هێنایە کایەوە. بەنموونە: لەمەیدانی ئەستێرەناسیدا زانایانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس گەیشتنە چەند ئەنجامێکی گرنگ. "کۆپەرنیکۆس ١٤٧٣–١٥٤٣" یەکەمین کەس بوو تیوری "کۆمەڵەی ڕۆژ"ی دانا و دەیووت: زەوی ئەستێرەیەکە و سەر بەکۆمەڵەی ڕۆژە، هەم بەدەوری خۆی و هەم بەدەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە. بەپێچەوانەوە کڵێسە باوەڕی وابوو کەزەمین چەق "مرکز"ی گەردوونە و چی ئەستێرەی ئاسمان هەیە بەڕێزیشەوە بەچواردەوریدا دەسووڕێنەوە[41]. دوای "کۆپەرنیکۆس" چەند زانایەکی تری وەك "جیۆردانۆ برونۆ {Brunno} ١٥٤٨–١٦٠٠ز" و "گالیلۆ گالیلی Galieli ١٥٦٤–١٦٢٤ ز" کە دوو زانای ئیتالیای بوون تولنییان پەرە بەتیۆرەکەی "کۆپەرنیکۆس" بدەن. ئەوەبوو "برۆنۆ" دەیووت: جگە لەکۆمەڵەی ڕۆژ چەند کۆمەڵەیەکی تریش هەن دانیشتووانی سەر زەوی لەبەر دووریی نایان بینن. ئەم بۆچوونەی ناوبراو کت و مت ئەو بۆچوونەیە کەلەساڵانی دواییدا ئەستێرەناسەکان سەلماندیان. ئەمە جگە لەوەی برۆنۆ لەو باوەڕەدا بوو کەدوور نییە لەئەستێرەکانی تردا ژیان هەبێ. بەڵام "گالیلۆ" بەردی بناغەی بۆ زانیاریی تەجریبیی

[41] "نیکۆلا کۆپەرنیکۆس" ئەو باسەی پێشکەش بەشەخسی پاپا کرد.

دانا. بەنموونە: بەتاقیکردنەوە سەلماندی کەلەرینەوەی بەندۆلَ چەند فراوان بێ ماوەکەی هەر وەك خۆیەتیو ناگۆڕێ. لەلایەکی تریشەوە هەندێ هەڵەی "ئەرستۆ"ی لەبارەی بزووتنەوەی تەنەکان "حركة الأجسام"ەوە ساغ کردەوەو چەسپاندی کەتەنەکان قورساییان هەرچی چەندێك بێ وەك یەك بەردەبنەوە سەر زەوی. بێجگە لەمانەیش پشتگیریی تیورەکەی "کۆپەرنیکۆس"ی کرد. بەوجۆرەو بەحوکمی بۆچوونی زانستییانە، زانایان توانییان لەسەرەتاوە زانستە سروشتییەکان لەلاهوت جیا بکەنەوە.

زانایانی رۆژگاری ڕێنیسانس لەبورای لێکۆڵینەوەی پزیشکیداو بەتایبەتی یەکالاکردنەوە "التشریح"ی جەستەی ئادەمیزادو ماتماتیكو جیۆلۆجیاو دەرهێنانی میتاڵدا دەسکەوتی گەورە گەورەیان چنگ کەوت. پزیشکان دەستیان بەیەکالاکردنەوەی لاشەی ئادەمیزاد کردو پەرەیان بەزانیاریی "ئەناتۆمیا" داو گەیشتنە چەند ئەنجامێك بەهۆیانەوە بەشدارییان لەگەشەکردنی ئەم زانیارییە گرنگەدا کرد کەڕاستەوخۆ پەیوەندی بەژیانی ئادەمیزادەوە هەبوو. ئاکامیش بووە بابەتێکی سەربەخۆو لەچەند زانکۆیەکی ئەوروپاییدا بەدەرس دەخوێنرا. هەر بەهۆی ئەم دەستکەوتە مەزنانەوە توانییان مێشکی خەڵکی ئەوروپا لەئەفسانەی بڕووپووچ رزگار بکەن. چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی مرۆڤیش لەوە دەرچوو کاسەی سەر لەت بکرێو خوێ ئاژن بکرێ تاوەکو بەحسابی خۆیان خێوو جنۆکەی لێ دەربەڕێنن، یاخود باشترین چارەسەر ئەوە بێ بەزەبری تەور لاقی بنیادەم ببڕدرێتەوە!! [42].

ئەو ئەنجامانەی زانایانی سەدەی بووژاندنەوە لەبوارەکانی جیۆلۆجیاو میتاڵ دەرهێناندا بەدەستیان هێنا، شتێکی هەروا کەم بایەخ نەبوون. بەنموونە: زانای ئەڵمانی "جۆرج باوێر ١٤٩٤- ١٥٥٥ز" کتێبێکی گەورەی بەناونیشانی "دەربارەی میتاڵ

---

[42] "ئوسامە کوڕی مونقیز" رووداوی زۆر سەیر لەبارەی زانیاریی پزیشکیی ئەوروپایی لەرۆژگاری شەڕی خاچپەرستاندا دەگێڕێتەوە. بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە "علاقات بين الشرق والغرب بين القرنين الحادي عشر والخامس عشر". عبدالقادر أحمد اليوسف. صيدا. بيروت ١٩٦٩ ل٢٦٨-٢٧٠.

دەرهێنـان لـەدوازدە بــەرگدا" لــەپاش خــۆی بەجێهێشــت. ئــەم نووســرواه یەکێکــە لەگەورەترین ئەو سەرچاوە رەسەنانەی لەقۆناغی یەکەمی گەشەکردنی سـەرمایەداریی ئەورووپادا، لەچۆنیەتی پەرەســەندنی ئامرازەکـانی بەرهەمــهێنان و شـێوە تــەکنیکی دەرهێنانی میتاڵ دەدوێ.

٤-گرنگترینی ئەنجامەکانی رێنیسانس، بـووە یارمـەتیدەرێکی گـەورە بـۆ دروسـت بوونی زمانی نەتەوەیی یەکگرتوو لەئەورووپادا.

پێش ئەو سەردەمە، زانسـتو ئـەدەب بـۆ توێژێکـی بچووکـی کۆمـەڵ قـۆرخ کرابوو. تەنانەت قسەکردن و مشتومڕ لەنێو رۆشنبیرانی ئەو سەردەمەدا هەر بەلاتینی بـوو نـەك بەزمانی نەتەوەیی. بەکورتی لەتوێژێکی بچووك بـەولاوە، جـەماوەری خـەڵك ئاگـای لـەو زمانە نەبوو. ئەم دیاردەیەیش خۆی لەخۆیدا بووە هێڵێکـی جیاکـەرەوە لـەنێوان توێـژە جیاجیاکانی کۆمەڵداو ئاکـامیش بـووە هـۆی پـەیدابوون و سـەرهەڵدانی چـەند دیـالێکتی ناوچەیی جۆربەجۆر. بەڵام لەو کاتەوەی کەپلەوپایەی تاکە کەس لەناو کۆمەڵدا گۆڕدراو وەك بوونەوەرێکی گرنگی کۆمەڵگا حسابی بۆ کـرا، دەبـوو بـەچاوێکی تـرەوە تەماشـای هەموو ئەوشتانە بکرێ کەپەیوەندییان بەژیانی ماددی و مەعنەوی ئەوەوە هەیە. زمانیش یەکێکە لەو مەسەلە بنچینەییانەی ئەم گۆڕانکارییە راستەوخۆ کاری تێکردو سەرلەبەری دیاردەکانی رێنیسانس بوونە هەل و مــەرجی گونجـاو تـا لەوڵاتـە ئەورووپاییـەکاندا زمـانی ئـەدەبی یـەکگرتوو بێتـە کایــەوە. ژمارەیــەکی زۆری پیــاوانی رێنیســانس بەتایبــەتی نووسەران بەرهەمەکانیان بـەزمانی خـەڵکیی دەنووسـی و سـامانی کەلـەپووری میللییـان کردە سەرچاوەی سرووش و کەرەستەی دەربڕینی بیروڕایـەکانیان. باشـترین نموونـەیش لـەم بارەیـەوە "فرانســۆ رابلیــە"ی فەرەنســاییە کەبەیــەکێك لــەناودارانی ســەردەمی رێنیسانس ناسراوە. ناوبراو لەنووسینەکانیدا هەمیشە رەچاوی زەوقی خوێنەری دەکرد. بۆ ئەم مەبەستەیش سوودی زۆری لەکەلەپووری میللیی وەردەگرت و بایـەخی پـێ دەدا. بەشێوەیەکی رازاوە و لەهـەمان کاتیشـدا بـەپێز و نزیـك لەقسـەی ئاسـاییەوە بابەتــەکانی

دادەڕشت. بەهۆی ئەم شێوازەیەوە بـوو بەناسـراوترین نووسـەری فەرەنسـایی سـەدەی شـازدەهەم و بەرهەمەکانیشـی وەك بەرهـەمی زۆربـەی نووسـەرانی ڕۆژگـاری ڕێنیسـانس لەناو خەڵکیدا ڕەواجێکی زۆریان پێدرا.

وەنـەبێ بایـەخدان بـەم زمانـە نوێیـە وای لـەناودارانی ڕێنیسـانس کردبـێ زمانـە کلاسیکییەکان و لەسـەرو هەموویانـەوە زمـانی لاتینـی کەتائێسـتایش لـەباری سـەرنجی زانسـتەوە دەوری خـۆی لەدەسـت نـەداوە پشـتگوێ بخـەن، نـەخێر. بەپێچەوانـەوە ژمارەیەك لەهومانیستان کەوتنەخۆ بۆ لێکۆڵینـەوەی زمـانی لاتینـی و گرێکـی و عیـبری کۆن. زۆربەیشـیان ئـەوەندە زمـانی لاتینییـان دەزانـی خۆیـان پێـوە هەڵدەکێشـاو دەیانویست بەخەڵکی رابگەیەنن کەدڵبەستەی سامانی کەلەپووری کۆنن. چونکە ئەوانە رایان وابوو کەئەو کەلەپوورە تەواو دژی یاساو نەریتی باوی دەرەبەگایەتییـەو لـەتواناد هەیە بەهۆی زمانی لاتینییەوە شتی ئـەوتۆ وەربگـیرێ، بکرێتـە چـەکێکی کاریگـەر دژی ئەو یاساو نەریتانە.

لێرەدا گرنگ ئەوەیە حەقیقەتێك لەیاد نەکەین. زۆر لەهومانیستان کە بەزمانی لاتینی دەیاننووسی، بەزمانی نەتەوەیی خۆشیان بەرهەمیان بڵاودەکردەوە. ئەمە جگە لـەوەی بەرهەمـە لاتینییـەکانیان پـاش ماوەیـەکی کـەم، زۆرجـار سـاڵێك پـتری نـەدەخایاند وەردەگێڕدرایە سـەر زمـانی نەتـەوەیی و زمانـە ئەورووپاییـەکانی سـەردەمەکە. لـەوەیش گرنگتر پیاوانی سەردەمی ڕێنیسانس تەنها ئەو بابەتانـەیان بـەزمانی لاتینـی دەنووسـی کەپەیوەندییەکی بەتینی بەزاناو فەیلەسووف و پیاوە سیاسییەکانەوە هەبوو. لەبەرئەوە دەیانویسـت بـەزمانی خۆیـان لەگـەڵیاندا بدوێـن، بۆئـەوەی ئامـانجی سـەرەکییان کەهەرەسهێنانی تەلاری فیکری دەرەبەگایەتی بوو، لەبیر بچێ. هەندێکی تریشیان بۆیـە بـەزمانی لاتینـی دەیاننووسـی ترسـی ئـەوەیان هـەبوو، نـەبا ئەوانـەی نووسـینەکانیان ئاڕاستە کراوەو مشت ومڕیان لەگـەڵ دەکـەن بەرهەمـەکانیان نەخوێندنـەوەو بەسـووك تەماشا بکرێن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ئەم دیاردەیە وردە وردە لەئارادا نەماو رۆژبەرۆژ ئەوانەی بەلاتینی دەیان نووسی ژمارەیان کەم دەبووەوە، بەتایبەتی لەبواری ئەدەبدا، تاوەکو بەتەواوی وەك دیاردەیەکی رۆشنبیریی لەگۆڕێ نەما. دواجاریش زمانی لاتینی بووە سەرچاوەیەکی گرنگ تەنها بۆ مشتومڕ، بەتایبەتی بۆ دروستکردنی زاراوەی زانستی نوێ، چونکە دەتوانرێ بەئاسانی وشەی لێ وەربگیرێ و وشەی تازەی لێ پێك بهێنرێ، لەڕووی دەربڕینیشەوە زاراوەکانی لەسەر زمان سووکترو رەوانترن. هەموو ئەمانەو چەند هۆیەکی دی لەگەڵ پەیدابوونی بازاڕی یەکگرتوودا. بوونە هۆی ئەوەی لەسەدەی پازدەهەم و شازدەهەمدا زمانی نەتەوەیی گەلانی ئەورووپا کەئێستا لەبەردەستی هەموان دان دروست ببێ. ئەمەیش بەپێچەوانەی بەرهەمەکانی سەدەکانی پێش رێنیسانسەوە بوو کە بەتەنها ئەو توێژە کۆمەڵایەتییە چێژی لێوەردەگرت کەزمانی لاتینی کۆنی دەزانی.

٥-بیروباوەڕی رێنیسانس و ئەنجامەکانی بەشێوەی جۆربەجۆر هەستی نەتەوەییان لەناو گەلانی ئەورووپادا ژیاندەوە. چونکە زمانی نوێ بووە ئامرازێك و ئەو بەرهەمە فیکرییانەی پێ دەنووسرا کەلەبەر دەستی جەماوەردا بوون. بەمەیش زیاتر ئاستی هوشیاریی کۆمەڵانی خەڵك بەرز دەبووەوە. کارکردنی ئەم هۆیە بەزۆری لەوەدا دەردەکەوێ کەزۆربەی بەرهەمەکانی رۆژگاری رێنیسانس و ئەدەبیاتی ئەو قۆناغە، پەردەیان لەسەر خەوش و ناتەواوییەکانی سیستەمی دەرەبەگایەتی هەڵدەماڵی و پێشوازییان لەکەلەپووری کۆن دەکردو بەشێوازێکی خۆش و رەوان سەرنجی خوێنەری ئاساییان رادەکێشا. جگە لەمانەیش لە ناوەڕاستی سەدەی پازدەهەم دا بەهۆی داهێنانی ئامێری چاپکردنی تازەوە، کتێب و چاپەمەنی زۆرتر کەوتە بەردەست خوێنەران و ئاڵوگۆڕیان پێ دەکرا.

داهێنانی ئامێری چاپکردنی نوێ، لەخانەی دەسکەوتە زانیاری و کلتوورییەکانی سەردەمی رێنیسانس دادەنرێ و خۆی لەخۆیدا بەدەنگەوە هاتنی پێویستییەکانی ئەو

قۆناغە بوو. بایەخ دان بەوێنەگرتنەوەی دەستنوسە کۆنەکان بەژمارەیەکی زۆرترو شێوەیەکی باشتر، پاڵی بەئەوروپاییەکانەوە نا، پەیڕەوی شێوازی چاپکردنی "چینی"یەکان بکەنو تەختەداری هەڵکۆڵدراو بەکار بهێنن. لەلایەکی تریشەوە ج هومانیستانو ج لایەنگرانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی، هەوڵیان دەدا کتێبە ئاینییەکان لەچنگی کڵێسەی کاتۆلیکیو قەشەکان رزگار بکەنو زۆرترین ژمارەیان لێ بڵاوبکەنەوە. تاوەکو خەڵکیی بۆیان روون ببێتەوە کەپاپایەتی تاچ رادەیەك لەیاسا ئاینییەکان دوورکەوتووەتەوەو فڕی بەسەریانەوە نەماوە.

لەو کاتەوەی "دانتی" لەنووسینەکانیدا سەلماندی کەدەتوانرێ لەبری زمانی لاتینی، زمانە نەتەوەییەکان بکرێنە ئامرازی دەربڕینی بیروڕا، زیاتر هەست بەپێویستیی کتێبو چاپەمەنی کرا. چونکە خەڵکی رەمەکیش بەپەرۆشەوە دەیان قۆزتنەوەو چێژیان لێ وەردەگرتن.

هەموو ئەمانە پێویستییان بەئامرازی فیکریی پەخش‌وبڵاوکردنەوەیەك دەکرد بتوانێ شان بەشانی پێداویستە کۆمەڵایەتییە تازەکان هەنگاو بنێ. بۆ ئەم مەبەستە ئەوروپاییەکان بەهۆی تەختەداری هەڵکۆڵدراوەوە، شێوازی چاپکردنیان بەبارێکی باشتردا گۆڕی. پاشان ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا، کتوپڕ رووی‌داو لەدەوروبەری ساڵی ١٤٤٥ز دا "یوحەننا گوتینبرگ ١٤٠٠-١٤٦٨ز" توانی یەکەم ئامێری لەتەختە دروست کراوی چاپکردن دروست بکا. ئامێرەکەی "گوتینبرگ" بەدەست ئیشی دەکردو پیتی بزێو "الحروف المتحركة"ی بەکاردەهێناو لەماوەی سەعاتێکدا دەیتوانی "١٠٠" لاپەڕە چاپ بکا. دیارە ئەمەیش بۆ ئەو سەردەمە گۆڕانێکی چۆنیەتی بوو لەدونیای چاپو چاپەمەنیدا.

داهێنراوەکەی "گوتینبرگ" تۆوی گەشەکردنو هێزی پەرەسەندنێکی بەگوڕو توانای بەخشینێکی بەربڵاوی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو. بەشدارییەکی گەورەیشی لەپێشخستنی زانستو زانیاریو ژیاندنەوەی کەلەپوورو بڵاوبوونەوەی بیروڕای رێنیسانسو

ئایدیۆلۆژیای رزگاریخوازانەی دوای ئەو سەردەمەدا کـرد. هۆیـەکی گرنـگ بـوو بـۆ رەگەیاندنی کلتووری نەتـەوەیی و گەلالەکردنی زمـانی ئـەدەبیی یـەکگرتووی گـەلان. تێوریشی نەبرد ئەم داهێنانە نوێیە نەك هەر بووە ماندەرێکی مەعنەوی بەڵکو بەچەشـنی پاڵپێوەنەرێکی مادیی هـانی نووسین و بڵاوکردنـەوەی دەدا. سـەرەنجامیش کتێـب وەك هەر کەلو پەلێکی تر کەوتە بازاڕەوەو کڕیارو فرۆشیاری پەیدا کرد. بـەو چەشـنە بـاری رۆشنبیریی لەوە ترازا هەر بریتـی بـێ لەچـەند کتێبخانەیـەکی تایبـەتی و ئـاڵوگۆڕکردنی کتێب لەسنوورێکی تەسکدا گیر بخوا.

بێگومان ئەگەر داهێنانی چاپخانە نەبوایە، نووسین و خوێندنەوەو فێربوون بەگشتیی هەر بەنسیبی توێژێکی سەرووی کۆمـەڵ و پیـاوانی ئـاین دەبـوون و بـەس. بـەڵام بـەهۆی چاپخانـەی نوێـوە، بەسـەرێك ژمارەیـەکی زۆر کتێـب لـەچاپ دەدراو بەسـەرێکی تریـش نرخەکەی دەهاتـە خـوارەوەو هـەرزانتر دەبـوو. بـەو جـۆرە کتێبـی خوێنـدن و فـێربوون گەیشتە دەست چینە هەژارو نـەدارەکان. جـا هەرچـەندە "گۆتینـبرگ" و هاوبەشـەکانی تەماوەیـەکی زۆر هـەوڵیان دا پارێزگـاریی نـهێنیی داهێنراوەکـەیان بکـەن، کـەچی زۆری نـەخایاند لەئـەڵمانیاو وڵاتـە ئەوروپاییـەکان و لەسـەرو هەموویانـەوە لـەئیتالیای لانکـەی رێنیسانسدا بڵاوبووەوەو نیو سەدەو چەند ساڵێکی نەبرد ئـەو کتێبانـەی بـەهۆی پیتـی بزێوەوە لەئەورووپادا چاپکران گەیشتە "٣٠"هەزار دانە. خۆ ئەگـەر تێکـڕای هـەر کتێبـە بە"٣٠٠"دانە دابنرێ، ئـەوا لـەماوەی نزیکـی "٦٠"سـاڵدا "٩"ملیـۆن کتێـب چـاپکراوە. دیارە ئەم دیاردەیەیش سەرەتایەکی گرنگ بوو بۆ بنیات نانی بنچینەیەکی مادیی ئەوتۆ زانست و رۆشنبیریی لەسـایەیدا بـەو ئـەندازە گەورەیـە گەشـەبکەن کـە بـەخێرایی رووی جیـهانی گـۆڕی. هـــەر لەبەرئەوەیشـــە مێژوونووســـان داهێنانەکـــەی "گۆتینـــبرگ" بەگەورەترین دیاریی گەلی ئەڵمانیا دادەنێن کەناوبراو لەسەدەی پازدەهـەم دا پێشـکەش بەمرۆڤایەتی کردو تەنانەت یەکێك لەم بارەیەوە، وتوویە: "داهێنانەکەی گۆتینـبرگ لـەو جۆرە کارانەیە کەیەکجار روو دەدەن و دووبارە نابنەوە"[٤٣].

---

[٤٣] G.C. Sellery. Op. Cit. P.P. 234.

٦-جائەگەر ئەم هەموو گۆڕانکارییە بنەڕەتیو داهێنانە گەورانە لەگەڵ ڕێنیسانسدا سەریان هەڵدابێ و زیاتر لەناو کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی ئەورووپادا ناکۆکیو ململانێی تیژ کردبێ، شتێکی سەیر نییە، چونکە هەموو ئەو دیاردانە بەئاشکرا سیمای یاخیبوونیان دژی دەرەبەگایەتیو کڵێسەی کاتۆلیکی پێوە دیار بوو. بەجۆرێکی تر بڵێین: کاکڵەی بیری بۆرژوای تازەپێگەیشتوویان پێك دەهێنا. ئەمە جگە لەوەی کەدیاردەی یاخیبوون، بەتەنها لایەنێکو دووانی نەگرتەوە. بەڵکو بەشێوەیەکی مەوزوعی لەمەیدانی ئەو زانیارییە تەجریبییانەیشدا خۆیان دەنواند کەتارادەیەکی زۆر لەئەدەبو سیاسەتەوە دوور بوون، چونکە سەرپاکی ئەو ئەنجامە گەورانەی زانایان بەدەستیان هێنا، ڕووی ڕاستەقینەی ئەو بیروباوەڕە دواکەوتووانەیان ڕیسوا دەکرد کە بەدرێژایی چەند سەدەیەك مێشکی جەماوەریان ئیفلیج کردبوو. لەبەرئەوە دەبینین هەڵوێستی توندوتیژی کڵێسە تەنها بەرامبەر بەو جۆرە کەسانە بوو کە بێ پێچو پەنا دوژمنایەتییان دەکرد. بگرە ژمارەیەکی زۆر زۆر لەناودارانی ڕێنیسانسیشی گرتەوەو لەپێش هەموویشیانەوە زانایانی ئەو سەردەمە. باشترین بەڵگەی ئەم حەقیقەتەیش لەو جموجۆڵەدا دەردەکەوێ کەدادگاکانی پشکنین لەو کاتەدا نواندیان. بەنموونە: داموودەسگای سەر بەکڵێسە نەك هەر بیروڕایەکانی "کۆپەرنیکۆس"ی ڕەت دەکردەوە، بەڵکو ئەو کتێبەیشی قەدەغەکرد کە زۆربەی ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردبوو. هەمان هەڵوێستیشیان بەرامبەر بە"گالیلۆ" نیشان داو ناچاریان کرد واز لەپشتگیریکردنی تیۆرەکەی "کۆپەرنیکۆس" بهێنێ کە دەیووت: زەوی بەچوار دەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە. ئەمانەو زۆر زاناو ڕۆشنبیری دیکەی سەردەمی ڕێنیسانس، یان هەموو تەمەنیان لەزیندانە تاریکەکاندا بردەسەر، یاخود بەزیندوویی دەسووتێنران. زانای گەورەی ئیتالیای "جیۆردانۆ برۆنۆ" پاش ئەوەی هەشتساڵی ڕەبەق لەزیندانەکانی دادگای پشکنینداو لەژێر زەبری ئازارو ئەشکەنجەدا ناڵاندی، لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٦٠٠داو لەگۆڕەپانێکی شاری "ڕۆما"دا بەپێش چاوی خەڵکەوە ئاگری تێبەر درا[٤٤]. سەبارەت بەوەیش کە زمانەوانی فەرەنسایی "دولییە" بەهۆی چاپخانە

---

[٤٤] "برۆنۆ" لەکاتی لێپرسینەوەدا بەوپەڕی ئازایەتییەوە بەرگریی لەبیروڕایەکانی خۆی کرد. تەنانەت

تلییەتییەکەی خۆیەوە، بیروڕای هومانیستانی بڵاودەکردەوە، لەمانگی ئابی سالی ١٥٤٦دا لەگۆڕەپانێکی "پاریس"دا سووتێنرا. بەڵام هەموو ئەم کردەوە ناڕەوایانە نەیەردەم ڕەوتی بەرەو پێشەوەچووی مرۆڤایەتیدا بێهوودە بوون. چونکە مەحاڵە بەری خۆر بەبێژنگ بگیرێ‌و ڕەوڕەوەی مێژوو بەرەودوا بگەڕێنرێتەوە، جوانترین بەڵگەی ئەم ڕاستییەیش پەیکەرە لووت بەرزو شکۆدارەکەی "دولییە"یە کە لەسالی ١٨٨٩ز داو هەر ئەو شوێنەی تێیدا سووتێنرا، بەئاهەنگێکی قەشەنگ پەردەی لەسەر لابراو سەلماندی کە نەسەرکوتکردن‌و نەسوتاندنی جەستەی ئادەمیزاد، ناتوانن بیری بەرزو گیانی پیرۆزی لەناو ببەن. ئا بەو جۆرە شانۆی تراژیدیاکەی سالی ١٥٤٦ لەپاش "٣١٣" سال بووە گۆڕەپانێکی ڕازاوەی "پاریس"و بەبێ دەنگیی جوانترین چیرۆک‌و ڕازاوەترین پەندو داستان بۆ نەوە لەدوای نەوەی مرۆڤایەتی دەگێڕێتەوە.

لەبەشێکی تری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا کەدێینە سەر باسی ناودارانی ڕێنیسانس، چەند قوربانییەکی تری دادگای پشکنین بەنموونە دەهێنینەوە. وەنەبێ زەبروزەنگی دادگای پشکنین بەتەنها ئەنجامی ئەو ململانەیە بوو بێ کەلە نێوان کۆن‌و نوێدا ڕوویدا، نەخێر. بەڵکو هەرچییەکیان دەکرد هەوڵ‌و کۆششێکی بێ سەمەر بوو، بۆ هێشتنەوەو درێژە پێدانی سیستمێك بیروباوەڕی نوێ لەناخەوە پووکاندبوویەوەو نەیدەتوانی چیتر خۆی بەپێوە رابگرێ.

٧-سەردەمی ڕێنیسانس گۆڕانێکی ڕاستەقینەی لەژیانی کۆمەڵایەتی ئافرەتدا بەرپا کرد؛ دیارە ئەمەیش ئەنجامی دوو هۆی گەورە بوو:

یەکەم: هومانیستەکان تێڕوانینێکی نوێیان هەبوو بەرامبەر تاکەکەسی ناو کۆمەڵێك ئافرەت نیوەی پێك دەهێنێ.

دووەم: شێوازی بەرهەمهێنان بەتایبەتی لەسەرەتای سەرهەڵدانی سەرمایەداریدا، لەجاران زیاتر پێویستی بەهێزی کار بوو، بەڕادەیەك دەیویست سوود لەوزەو توانای

---

-لەو کاتەدا کەبڕیاری سووتاندنیان دا، بەگاڵتە پێکردنەوە بەدادگای وت: وابزانم ئێوە زۆر لەمن زیاتر لەو بڕیارە دەترسن.

ئافرەتیش وەربگرێ. بەهەرحاڵ لەسەردەمی ڕێنیسانسدا ئافرەتی ئەوروپایی خۆی گەیاندە مەیدانی بەرهەمهێنانی پیشەسازیی و نووسینو تەختەی شانۆو تەنانەت لەمشتومڕی فەلسەفیشدا بەشداریی دەکرد. بەو پێیە پلەی کۆمەلایەتی گەیشتە ئاستێکی بالاتر، بەتایبەتی لەشارەکانی ئیتالیادا کە باروودۆخێکی گونجاوتریان بۆ ڕەخساو ئافرەت بووە خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی یەکجار قووڵ[٤٥].

ئەنجامەکانی ڕێنیسانسو بزووتنەوەی مرۆڤایەتی جگە لەوانەی پێشتر باسیان کرا، زۆر ئەنجامی دیکەی لەمەیدانی داهێنانی هونەریی و گەشەکردنی بیرو بەرهەمی ئەدەبیو تێکڕای زانستە مرۆڤایەتییەکاندا هێنایە کایەوەو بەئاشکرا لەسەرپردەی ژیانو داهێنانی ناودارە نەمرەکانی ئەو قۆناغەدا بەرجەستە دەبن.

* * *

---

(٤٥) Renissance and Reformation, 1300-1684,Edited. By G.R. Elton, Second edition, NewYork- London, P.85- 86.

# بەشی چوارەم

## ئەمران

لەبەر رۆشنایی لاپەڕەکانی پێشەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە رێنیسانس رۆڵێکی گەورەی لەژیانی رۆشنبیریی وڵاتە ئەوروپاییەکاندا بینیوەو کاری لەسەرجەم بیروهونەری مرۆڤایەتی کردووەو چرایەکی درەوشەداری شارستانیەتی مرۆڤایەتییە.

هەر لەو سەردەمەدا بوو، بەرهەمە ئەدەبیو هونەرییە نەمرەکان گەیشتنە لوتکەی جوانیی. هەر بەهۆی سەردەمی رێنیسانسەوە زیندووکردنەوەی کەلەپووری کۆن ئەو گۆڕانە مەزنەی بەسەردا هاتو زانستو فەلسەفەو زانیارییە سروشتیو مرۆڤایەتیو پەروەردەییەکانو یاساو سیاسەتو زۆر لایەنی دیکەیشی گرتەوە.

وەك لەپێشەوە باسکرا، سەرپاکی گەلانی ئەوروپا بەشدارییان لەسەردەمی رێنیسانسدا کردو سامانێکی گەورەو شاراوەی فۆلکلۆری میللیو نەتەوەیی و تاقیکردنەوەی رابوردوویان سەر لەنوێ خستەوە بەردەست. ئەمە جگە لەوەی چەندین رۆڵەی مەزنی پێگەیاندو هەموویان بەپەرۆشەوە ، لە پێناوی بەرەوپێشەوە بردنی رەوورەوەی مێژووی کۆمەڵدا ئامادەی کارکردن و خۆبەختکردن بوون .

زۆربەی هومانیستان سووربوون لەسەر ئەوەی بۆ وچان کۆشش بکەن ، چونکە لەو باوەڕەدا بوون ئادەمیزاد بە زانایی لەدایك نابێ،وتەنها هەوڵو تەقەلای بەردەوام دەیگەیەنێتە ئەو پلەیە. خۆیشیان نمونەی ئامیزادێکن لە پلەی کەماڵیان نزیك کردەوە ، چونکە شەوورۆژ خۆیان دەڕەتاندو دڵسۆزانە کاریان دەکردو هەم سوودیان لەخەڵکی وەردەگرت و هەم سوودیان پێ دەگەیاندن.

لێرەدا دەتوانین ووتەیەکی "پییەر پاولۆ"ی هومانیستی ئیتالیایی بە نموونە بهێنینەوە کە ئەوپەڕی بەختیاریی لە کۆششی بێ ووچاندا دەبینییەوە ،بەڕادەیەك

شەوی بە مردن شوبهاندووەو دەیگووت : "نووستن کات بەفیڕۆ دەدا".هەر لەو بارەیەوە لە ووتارێکدا کە ئاڕاستەی زانایانی کرد دەڵێ : ئەو کەسەی
ئارەق برێژێ بەسەر هەموو تەنگو چەڵەمەیەکدا زاڵ دەبێ و دەگاتە پایەی خۆی [٤٦]. ئا بەم گیانە بەرزەوە پیاوانی سەردەمی رێنیسانس کاریان دەکرد .

راستییەکەی کەس بۆی نالوێ سەرژمێری یەك بەیەك ناوی زاناو نیگارکێش و نووسەرانی ئەو سەردەمە بکا، چونکە سەدان ناوی درەوشەدار هەن، وەك لە بەشی خاسییەت و ئەنجامەکانی رێنیسانسدا ووتمان،بەرهەمی نەمریان بۆ بەجێهێشتووین.

لێرەیش بەدواوە هەوڵ دەدەین چەند بیروڕایەکی گشتیی سەبارەت بە جموجۆڵی هەندێکی تر لەو کەڵە پیاوانە بخەینە پێش چاو ، تاوەکو وێنەیەکی راستەقینەی رێنیسانس لە قۆناغە جیاجیاکانیدا نیشان بدەین .

## پێشەوایانی رێنیسانس

گومان لەوەدا نییە کە دەرکەوتنی پێشەوایانی رێنیسانس و سەر هەڵدانی بزووتنەوەی مرۆڤایەتی لە ئیتالیادا ، باروودووخی مێژوویی رەخساندنی و گەشەی پێکردن.

"دانتێ" و "پەترارك " و "بۆکاشیۆ" کە سێ زانای ئەو سەردەمەن بەردی بناغەیان بۆ تەلاری بەرزو بڵندی رێنیسانس داڕشت. هەر لەبەر ئەوەیش بیرو جموجۆڵیان بایەخێکی تایبەتییان پێدەدرێ و بە هۆیانەوە دەتوانرێ دەست نیشانی لایەنە بنچینەییەکانی قۆناغی یەکەمی رێنیسانس بکرێ.

---

[٤٦] ن.ف. بیفیاکینا- پیەر باولۆی هومانیست. زانایان کاری فیکریی. "ئابووریو سیاسەتو کلتووری ئەورویا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بەزمانی رووسی- مۆسکۆ ١٩٧٢ ل٣٤٢.

شەوی بە مردن شوبهاندووەو دەیگووت : "نووستن کات بەفیڕۆ دەدا".هەر لەو بارەیەوە لە ووتارێکدا کە ئاڕاستەی زانایانی کرد دەڵێ : ئەو کەسەی

ئارەق برێژێ بەسەر هەموو تەنگو چەڵەمەیەکدا زاڵ دەبێ و دەگاتە پایەی خۆی [٤٦]. ئا بەم گیانە بەرزەوە پیاوانی سەردەمی رێنیسانس کاریان دەکرد .

راستییەکەی کەس بۆی نالوێ سەرژمێری یەك بەیەك ناوی زاناو نیگارکێش و نووسەرانی ئەو سەردەمە بکا، چونکە سەدان ناوی درەوشەدار هەن، وەك لە بەشی خاسییەت و ئەنجامەکانی رێنیسانسدا ووتمان،بەرهەمی نەمریان بۆ بەجێهێشتووین.

لێرەیش بەدواوە هەوڵ دەدەین چەند بیروڕایەکی گشتیی سەبارەت بە جموجۆڵی هەندێکی تر لەو کەڵە پیاوانە بخەینە پێش چاو ، تاوەکو وێنەیەکی راستەقینەی رێنیسانس لە قۆناغە جیاجیاکانیدا نیشان بدەین .

## پێشەوایانی رێنیسانس

گومان لەوەدا نییە کە دەرکەوتنی پێشەوایانی رێنیسانس و سەر هەڵدانی بزووتنەوەی مرۆڤایەتی لە ئیتالیادا ، باروودۆخی مێژوویی رەخساندنی و گەشەی پێکردن.

"دانتێ" و "پەترارك " و "بۆکاشیۆ" کە سێ زانای ئەو سەردەمەن بەردی بناغەیان بۆ تەلاری بەرزو بڵندی رێنیسانس داڕشت. هەر لەبەر ئەوەیش بیرو جموجۆڵیان بایەخێکی تایبەتییان پێدەدرێ و بە هۆیانەوە دەتوانرێ دەست نیشانی لایەنە بنچینەییەکانی قۆناغی یەکەمی رێنیسانس بکرێ.

---

[٤٦] ن.ف. بیفیاکینا- پیەر باولۆی هومانیست. زانایان کاری فیکریی. "ئابووریو سیاسەتو کلتووری ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بەزمانی رووسی- مۆسکۆ ١٩٧٢ ل٣٤٢.

## "دانتێ" ١٢٦٥-١٣٢١ ز

" دانتێ ئەلیگیری" شاعیرێکی ناسراوی ئیتالیایەو لای هەموان یەکەمین موژدەدەری سەردەمی ڕێنیسانسە . لە فلۆرەنسا" لەدایك بووە و لە ژیانی سیاسیدا هاوبەشییەکی دیاری کردووە . لەرووی فیکرییەوە سەر بەو ڕێبازە سیاسییانە بوو کە دژی دەسەڵاتدارانی سەردەمەکەی بوون .هەر لەبەر ئەمەیش بوو پاشملە حوکم دراو تا ئەو کاتەی لە "ڕاڤنا" گیانی بە خاك سپارد ، ئاوارە ودەربەدەری نیشتمان بوو.

"دانتێ" ڕۆشنبیر ترین کەسی سەردەمەکەی خۆیەتی[٤٧]بۆیە توانی لەلایەنە گرنگ و ئاشکراکانی ڕەوتی گەشەکردنی ژیان و کۆمەڵ بەشێوەیەك تێبگا کە بۆ ئەو کاتە تێگەیشتنیان کارێکی هەروا ئاسان نەبوو.

"دانتێ" پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشا کە زمانی نەتەوەیی لە توانایدا هەیە پاڵ بە میللەتەوە بنێ و گۆڕانێکی بنەڕەتی تێدا پێك بهێنێ. بەو هەڵوێستەیشی بووە دیارترین ئەو پێشەوایانەی داوایان دەکرد لەبەرهەمی ئەدەبیدا لە بری لاتینی زمانی ئیتالیایی بەکاربهێنرێ.

ئەم بانگەوازەیش لەناو ڕۆشنبیرانی "فلۆرەنسا"دا بەجۆرێك دەنگی دایەوە،ڕۆشنبیران وەك خۆیان دەیانگوت : هەستیان بە "تام و چێژی شێوەی نوێ دەکرد"[٤٨] لەسەرەتاوە نوسینەکانی "دانتێ" ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕاو ئەم ڕێبازە تازەیەیان چەسپاند.

چونکە لەدارشتندا ئاوازێکی ناسك و تەڕو بڕی پێ دەبەخشین ، بەمەیش ژمارەیەکی زۆر نوسەرو خوێنەری بەلای خۆیدا ڕاکێشاو هانیدان بایەخی پێبدەن و چێژی لێوەربگرن و سەرەتایەکی گرنگیش بوو ، تاوەکو ئەدەب لە چوارچێوە ئەکادیمیاییە

---

[٤٧] هەندێك سوورن لەسەر ئەوەی کە لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل سەبارەت بە((دانتی))و وەرگێڕانی کۆمیدیا)) بە نسبەت پسپۆڕانی ئەوروپاوە-ئەگەر باروزروفێکی گونجاویان بۆ برەخسێ-پێویستی بە ٢٠ ساڵ دەبێ.

[٤٨] أ.أ. جوبیو دانتی- ((مێژووی جیهان)) بە زمانیڕووسی. بەرگی سێیەم ل :٦٢١.

تەنگەبەرەکەی سەدەی ناوەراست دەرباز بکا . بەو پێیە ئەم لایەنە فیکرییە گرنگە لەوە دەرچوو تەنها بابەتی فێرکردنی ئەو توێژە هەڵبژاردەیە بێ کە زمانە کۆنەکانیان دەزانی، بە پێچەوانەوە هێزی داهێنەرانەی کەوتە بەردەست کۆمەلانی خەڵک.

"دانتێ" ئەوەندە پەرۆشی زمانی نەتەوەیی بوو ، هەر بەنوسینەوە ڕانەوەستا، بەڵکو وەك زانایەکی زمان شوناس چی توانای هەبوو تەرخانیکردو هەمیشە پێی لەسەر گرنگیی هێزی دەربرین دادەگرتو چەند باسێکیشی "لەبارەی زمانی زارەکی"یەوە نووسی[٤٩]. یەکەم کتێبی بەراوردکاریی لەبارەی زمانو شیعری ڕۆمانییەوە دانا. خۆشەویستیی زمانی نەتەوەیی لای "دانتێ" گەیشتە پلەیەك بە "نانی جۆ"ی دەشوبهاند. چونکە لەو سەردەمەدا هەر ئەو جۆرە نانە ورگی هەزاران ئیتالیایی پڕ دەکرد، لە کاتێکا جۆرە نایابەکان وەك زمانی لاتینی بۆ توێژێکی کۆمەلایەتی تەرخان کرابوو. ئا بەم شوبهاندنەو بەو سەرکەوتووییە مەغزاو مەبەستێکی ئەوەندە قووڵی هەبوو، وێنەیەکی ئاشکرای ڕێبازی فیکریی ئەم شاعیرە مەزنەمان دەخاتە بەردەست. ئەو دەیویست، بۆ خەڵکیی، بۆ گەلی ئیتالیا بنووسێ، بۆیە زمانی جەماوەری هەڵبژاردو بەهۆیەوە لەگەڵیاندا دەدوا و فێری دەکردن. بەبڕوایەکی بەتینیشەوە دژی ئەو کەسانە رادەوەستا خۆی واتەنی بەچاوی سووکەوە تەماشای "زمانی رازاوەی میللیمان "دەکەن.

"دانتێ" نۆبەرەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی برتی بوو لە کۆمەڵە شیعرێك و چەند پارچە پەخشانێكو ناوی نا "ژیانی نوێ" و تێیدا چیرۆکی خۆشەویستیی خۆی و کیژۆڵەی فلۆرەنسایی" پاتریس پۆرتیناری" دەگێڕێتەوە کە چۆن لەتەمەنی ٩ ساڵییەوە کاری لەهەست و هۆشی کردووە. گەرچی لەتەمەنی ١٨ ساڵیدا مەرگ ئاوقەی سەری دەبێ، بەڵام دەبێتە سەرچاوەی ئیلهامی زۆربەی بەرهەمە شیعرییەکانی. گرنگیی ئەم

---

[٤٩] دانتێ بۆیە ئەو کتێبەی بەزمانی لاتینی نووسی تاوەکو سەرنجی نووسەرو زانایان بۆ ئەوە رابکێشێ کە تا چ رادەیەك زمای ئیتالیایی توانای دەربڕینی هەیە. لەوەیش دەترسا گەرینو بەئیتالیایی بینووسێ ئەوانە پێیان شەرم بێ بیخوێننەوەو دەستاودەستی پێبکەن.

بەرهەمەی "دانتێ"هەر لەوەدا نییە کە تاچەند لەڕووی شێوەو ناوەڕۆکـەوە سـەرکەوتنی بەدەست هێناوە، نەخێر. بەڵکو گرنگییەکەی لەوەدایە کە بە تاقیکردنـەوە سـەلماندی لەتوانادا هەیە مەسـەلە واقیعییـەکانی ژیـان بەشـێوازێکی ئـەدەبی و بـەزمانی جـەماوەر لەخەڵك بگەیەنرێ. بـەم کارەیشـی کۆت و پێوەنـدی ئـەکادیمیی کلاسـیزمی تێکشـکاند کەمەیدانی بزوتنەوەی ئەدەبیی هێنابووەوە یەك و بواری لێ تەنیبوو.

ئەدەبیاتی "دانتێ" چ لەڕووی شێوەو چ لەڕووی ناوەڕۆکەوە لەشـاکاری "کۆمیدیـا"دا کەتوای خۆی بە "کۆمیدیای یەزدانی" نـاوبرا گەیشـتە لوتکـە. ئـەم بەرهەمـە بەنرخـەی بەگەوهـەری دەروەشـەداری هـەموو دیالێکتـە ئیتالیاییـەکان‌و پـەندی میللـی‌و ئامۆژگـاری بەنرخ‌و نمونەی مێژوویی ڕازاندنەوە. بایەخێکی تایبەتیشـی بـەدیالێکتی "تۆسـکانیا"یـی داو پێی لەسـەر داگرت. لـەڕووی هونەریشـەوە، هارمۆنیایـەکی ئـەوتۆی پێبەخشـی لەوکاتەدا هیچ زمانێکی دیکەی ئەورووپایی، پێی نەگەیشتبوو. سەرەنجامیش "کۆمیدیای یەزدانی" بووە بنکەیەکی پتـەوی زمـانی ئـەدەبی یـەکگرتوی ئیتاڵیـا، کـە تـا ئێسـتایش بـەهۆی ئـەو هـەموو پـەند و ئامۆژگـاری‌و وردەکارییـەوەی پێـی مشـت و مـاڵکراوە، لـە فەرهەنگی ئەو زمانەدا جێگای شیاوی خۆی داگیر کردووە. وەنەبێ بایەخی " کۆمیدیـای یـەزدانی" کەبریتییـە لـە"١٠٠" سرروود و نزیکـەی "١٤" هـەزار بـەیت، تەنـها لـەوەدا بـێ کەفەرهەنگی زمانەوانیی دەوڵەمەند کردووە. ناوەڕۆکی ئەو شـاکارە پڕیـەتی لـەبیروڕای کۆمەڵایـەتی‌و سیاسـی و فەلسـەفی زۆر قـوڵ و پـڕ مانـاو بـەگژاچوونێکی ئاشـکراو چـاو نەترسانەیە دژی یاسـاو نـەریتی کۆن و بـەپیرەوە چونێکـی زیرەکانەیـەو پێشـوازیی لەدونیایەکی باشتر دەکا ، بەلأم لەقاڵبێکی خوازکاری" مستعار"دا.

" کۆمیدیای یەزدانی" بەیتێکی شیعری خەیاڵییەو نووسـەرەکەی بەهۆیـەوە دەچێتـە ئەودونیا"قیامەت " کە لە سێ شوێن پێکهاتووە ، دۆزەخ "الجحیم " و خاوێنگە "المطهر" و بەهەشت "الفردوس " . "دانتـێ" لـەم گەیشـتەدا شـاعیری بـت پـەرسـتی ڕۆمـانی "ڤێرجیل٧٠-١٩ پ.ز" دەکاتە ڕێ نیشاندەری قۆناغ بە قۆناغ دەبیا تا لە بەهەشـتدا بـە

دیداری "باتریس "ی خۆشەویستی شاد دەبی. "دانتێ" هەروا لە خۆو"ڤێرجیل" ناکاتە شارەزاو ڕێ نیشاندەری، ئەو لەو هەڵبژاردنەی مەبەستێکی قووڵتری هەیە.

"ڤێرجیل " هاوچەرخی سەردەمێك بوو، خۆری شارستانیەت تێیدا بەرەو ئاوابوون هەنگاوی دەنا. لە شیعرەکانیدا ئاواتەخوازی بەرەبەیانێك بوو "ڕۆژی سەدەیەکی زێرین"ی تێدا هەڵبێ. شان بەشانی ئەویش بەشان و شکۆی ئەو یاسا و نەریتانەی ڕۆمای کۆندا هەڵی دەدا کە بە دڵ و گیان ئارەزووی دەکردن و باوەڕی بەمەزنییان هەبوو. لەلایەکی تریشەوە ڕەوشتی بەرزو بێ هەوایی‌و جموجۆڵی بێ‌پایان‌و دڵسۆزیی "ڤێرجیل " لای ناودارانی ڕێنیسانس، باشترین نمونەی ئادەمیزادی سەردەمەکەیان بوو. پێ بەپێی ئەمیش ئافرەتێك لەگەڵیدا دەچێتە بەهەشت خۆشەویسترین کەسیەتی .جا سەرەڕای هێزی خەیاڵی شاعیر و خۆبەستنەوەی بە خۆشەویستیی "پاتریس"و یاساو نەریتی ئاینی عیسابییەوە، دەبینین شانازیبە تاکەکەسی خێرخواو هاوچەرخەوە دەکا، کە چۆن دەیگەیەنێتە بەهەشت و لەتەك خۆشەویسترین کەسیدا بەیەکتریان دەگەیەنێ. "کۆمیدیای یەزدانی" بە گشتیی، مۆرکی پەندو ئامۆژگاریی ئاینی پێوە دیارە کە دانتێ نەیدەتوانی خۆی لێ قورتار بکا. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ناوەڕۆکەکەی تیژترین ڕەخنەی ئەدەبییە کە تائێستا ئاڕاستەی کڵێساو پیاوانی سەر بەکڵێسا کرابێ . "دانتێ" سروودی یەکەمیان بۆ ڕووداوەکانی ناو دۆزەخ تەرخان دەکاو تێیدا پەردە لە ڕووی خۆپەرستیی‌و دڵرەقیی‌و چاوچنۆکی پیاوانی کڵێسا هەڵدەماڵێ. لەوەیش گرنگتر ئەوەیەکە لە سروودی نۆزدەهەمداو لەناو کڵپەی ئاگری دۆزەخدا چاوی بەو قەشە و پاپایانە دەکەوێ کە قەواڵەی خوالێخۆشبوون–صکوك الغفران– یان فرۆشتووە. دەبینی ئەوانە لەگەڵ ئەو تاوانبارانەدا دەسوتێن کەلەم دونیا چەتەو ڕێگرو ساختەبازو دووزمان‌و بوختان کەرو خایەنی نیشتمان بوون. ئاگری هەمیشەیی دەکاتە نیشتەجێی ئەو پاپایانەی لەوە دونیا چاوی پێیان دەکەوێ و گفتوگۆیان لەگەڵ دەکا.ئەمە لەکاتێکا

ڕێژێکی زۆر لە شاعیرو فەیلەسوفە بت پەرستەکان دەنێ، چونکە بە دڵسۆزییەوە خزمەتی زانست و کۆمەڵیان کردووەو وەك دیمان یەکێکیش لەوانە هەڵدەبژێرێ و دەیکاتە ڕێ نیشاندەر. خۆشەویسترین کەسی خۆیشی کە "پاتریس " بوو، کردییە نموونەی ئادەمیزادی سەردەمەکەی.

بەهەمان دەستوور "دانتێ" بەشی دووەمی ئەوە دونیا کە بریتیە لە خاوێنگە"المطهر" بۆ فەرمانڕەوا بت پەرستەکانی "ڕۆمان " تەرخان دەکا، چونکە ئەوانیش لەسەردەمی خۆیاندا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە خزمەتی وڵاتیان کردووەو ماوەی بەدڕەوشتییو بەرتیل خواردنیان نەداوە. بێگومان هەستی ناسك و باوەڕی نەگۆڕو پتەوی بە ئاینی عیسایی ولیان لێ کرد نەتوانێ لە "ئەعراف " زیاتر بەوانە ڕەوا ببینێ. بەم کارەیشی دەیانخاتە خانەیەکەوە لە پاپاکان بە چاکتریان دادەنێ. بەڵام ئەو جیاکردنەوەیە هەمان کات ڕێزە بۆ مرۆڤی سەردەمەکەی کە بەلایەوە کەس نایگاتێ.

هەرچۆنێك بێ تابلۆ بەجەرگەکانی " کۆمیای یەزدانی" ڕەخنەیەکی ئاشکرایە لە کڵێسە و بانگهێشتنی خەلکییە بۆ ئەوەی پەیڕەوی ڕەوشتی جوانو نەریتی بەرزی نیشتمانی بکەن. لە کۆمیدیادا، هەر ئەو جۆرە کەسانە بەبەهەشت شاد دەبن، بێ ئەوەی حساب بۆ پلەوپایەی کۆمەڵایەتی ئەم دونیایان بکرێ.

هەموو ئەمانەی ووتران گرنگن و لە گرنگیش بەولاوەترن. بەڵام " کۆمیای یەزدانی" یەکێکیشە لەو چیرۆکانەی ناوەڕۆکێکی قووڵی نیشتمانیی هەیە و ەئاشکرا تەعبیر لە بوونی نەتەوەیی گەلی ئیتالیا دەکا. نووسەری "کۆمیدیا" خەو بە یەکێتی ئیتالیا و نەهێشتنی شەڕو ناکۆکی ناوخۆوە دەبینێ و دەیەوێ دەسەلاتی دونیایی لەدەست پاپاکان وەربگرێتەوە(٥٠). هەمو ئەمانەیش هەل و مەرجی بنچینەیی بوون بۆ ئەوەی وڵات لە ڕووی سیاسییەوە نەش و نما بکا.

---

(٥٠) بەر لەوەی "لۆرینزۆ ڤالا" بیسەلێنێ کە "بەخشی قوستەنتین" بەلگەنامەیەکی ساختەیە. "دانتێ" زۆر بە توندی ڕەخنەی لێگرت ، بێ ئەوەی بزانێ ئەم بەلگەنامەیە شتێکی دروستکراوە .
بڕوانە: R. Weiss,Op. Cit.,P. 43.

له " کۆمیدیای یەزدانی"دا خوێنەر هەست بەسەرەتای سەرهەڵدانی ئایدۆلۆژیای سەدەیەکی نوێ دەکا. بێجگە لەمانەی باسکران "دانتێ" لە ناوەرۆکی ئەم شاکارەیدلو بەهۆی ئەو دیالۆژەوە بە خەیاڵ لە نێوان کەسانی جۆریەجۆری ناو " کۆمیدیا" کەیدا سازی دەکا، دەیەوێ ئادەمیزادی نوێی شارە پەرەسەندووەکانی ئیتالیا نیشان بداو پێ لەسەر خودی مرۆڤ و نرخی بنیادەم دابگرێ کەخۆی واتەنی "هۆی هاتنە دونیای بۆ ئەوەیە بەرز بفرێ ". دانتێ بە قووڵیی دەڕوانێتە جوانیی سروشت و دیمەنە دڵڕفێنەکانی بەهەشتیش هەر لەوێوە هەڵدەهێنجێ و دەیان نەخشێنێ. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە سیمای هەرە دیاری " کۆمیدیای یەزدانی" ئەوەیە بە پەرۆشەوە تەعبیر لەبەرەو پێشەوە چوونی کۆمەڵ دەکاو بە گەشبینییەوە دەڕوانێتە پاشەرۆژو بەباوەڕێکی پتەوەوە خەڵکی تێدەگەیەنێ کە دەتوانرێ چارەسەری هەموو گیروگرفتەکانی کۆمەڵگاکەی بکرێ. هەر ئەم هۆیەش بوو پاڵی بە" دانتێ"یەوە نا، بەیتە شیعرییەکەی ناو بنێ "کۆمیدیا"؛ چونکە نووسەرانی سەدەی ناوەراست بەو بەرهەمە هونەریانەیان دەووت "کۆمیدیا" کە بە گەشبینی کۆتاییان دەهاتو موژدەی خێرو خۆشیی بە خەڵکیی دەدا [٥١]. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە ناوەرۆکی بەیتەکە هەمان مەفهومی تری کۆمیدیای بەسەردا دەچەسپێ، لەو ڕووەوە کە ئامانجی رەخنەگرتنە لە ناتەواویەکانی کۆمەڵو نەریتی کۆن بەشێوەیەکی پێکەنیناوی. هەرچی ووشەی "یەزدانی"یشە، ئەوانە پێوەیان لکاند کە دوای "دانتێ" دڵبەستەی بەیتەکە بوون. چونکە ناوەرۆکێکی چڕو ئامانجێکی بەرزو پیرۆزی دەبەخشی‌و تێیدا ئادەمیزادو سروشت بە جوانترین شێوەی هونەریی نیشان دەداو لەسەر ئاوازێکی مۆسیقایی رەوانو بێ گرێو گۆڵ مشتوماڵی دەکا. ئەمە جگە لەو کەش‌وهەوا روحییەی بەو شێولزە قەشەنگە پێکی دەهێنێو بەسەرهاتەکانی تێدا هەڵدەسووڕێنێ. پوختەی قسە ئەوەیە

---

[٥١] کۆمیدیا لە بنەرەتدا لە ووشەی (Komodia)ی کۆنەوە وەرگیراوە لە سەردەمی گرێکدا بەگۆرانی پێکەنیناوی دەگوترا.

کۆمیدیای یەزدانی" بە ڕاستکۆییەوە بووە " ئاوێنەیەك چی زانست و ئاوات و هەستی سەردەمەکەی هەبوون تێیدا ڕەنگیان دەدایەوە"[٥٢].

سەرەڕای ئەمانە، دەبێ ئەوەیش لەیاد نەکرێ کە چ هەڵوێستی ڕۆژانەی "دانتێ" و چ ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی -تەنانەت کۆمیدیای یەزدانییەکەیشی لە کەم و کورِی بەدەرنەبوون. لە سەردەمی دەربەدەریداو پاش ئەوەی ناوچە بە ناوچەی ئیتالیا گەڕا تولێی لە هۆی تێکشکانی وولاتەکەی تێبگا، بۆیە دەیووت و لەمەیشدا لەسەر هەق بوو "پێویستە هاوولاتیان لە ناو خۆیاندا یەك بگرن و واز لە ناکۆکی بهێنن". دواجار چەند بیروڕایەکی ئایدیالیزمییانەی دەربڕی کە پێی وابوو لەبەر ڕۆشناییاندا دەتوانرێ گیروگرفتە سیاسییەکان چارەسەر بکرێن، وەك ئەوەی هەرکەسە لای خۆیەوە گەشە بە جیهانی مەعنەوی ئادەمیزاد بداو هەوڵ بدرێ خۆش ویستنی زانست لەدەروونی خەڵکیدا بنج بەست بێ.

"دانتێ" لەم ڕوانگەیەوە بیروڕا سیاسییەکانی دەخاتە دوو توێی ئەو کتێبەوە کە ناوی "داوەت الولیمة"ی لێ ناو بۆی تەواو نەکرا. جا لەبەر ئەوەی لەسەردەمی "دانتێ"دا ئەو بارو زرووفە نەڕەخسا لەسایەیدا ناکۆکی و دووبەرەکیی ناوخۆی نێوان دەرەبەگایەتی کۆڕ بکرێ، دەبینین بیر لە سیستمێکی پاشایەتی یەکگرتوو دەکاتەوە، تاوەکو حوکمی سەرانسەری جیهان بکا، بەمەرجێك مەڵبەندی ئەو ڕژێمە وولاتی ئیتالیا بێ. ئەوجا ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی ڕۆمانی کە هەر بەناو مابوو دەکاتە "هیوای گەورەی جیهانی مەسیحییەت "و باشترین ڕێگاش بۆ پێکهێنانی یەکێتی ئیتالیا. ئا لەم تێروانینەوە بە زمانی لاتینی کتێبێکی سەبارەت بە پادشایان نووسی و تێیدا زۆر بە توندی ڕەخنە لە ڕژێمی پاپایەتی دەگرێ، لەهەمان کاتیشدا شێوەی دەسەڵات و کرۆکی ئامانج و ئاواتەکانی ئیمپراتۆر بە چاوێکی ئەوەندە ئایدیالیزمییەوە سەیر دەکا زۆر لە واقعی ژیانەوە دوورن .

---

(٥٢) A.J. Grant op. Cit.P. 464

لێرەدا پێویستە ئەو حەقیقەتەیش فەرامۆش نەکرێ کە "دانتێ" رای وابوو، دەبێ ئەو سیستمە سیاسییە لەگەڵ بەرژەوەندی هەموو جیهاندا بگونجێو هەر ئەم گونجاندنەیش وادەکا بنیاتنانی ئەو جۆرە رژێمە پێویستو ناچاری بێو[٥٣] تا دوا هەناسەش بەوپەڕی دڵسۆزییەوەداوای دەکرد پەیوەندی نێوان دەوڵەتان لەسەر بنچینەی ئاشتیو ئاسایش دابمەزرێ .

لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێ کە "دانتێ" لێهاتووانە پەنجەی خستە سەر ناتەواوییەکانی کۆمەڵەکەیو بە قووڵیی دەستنیشانی هۆیەکانی کرد. بەڵام لەگەڵ ئەم بیروڕا واقعییانەدا بۆ راماڵینی کەموکووڕی کۆمەڵەکەی پێشنیازی دەکردن، چەندین بیروڕای ئایدیالیزمییانەو تەنانەت دواکەوتوانەش دەردەبڕێو لای وابوو گەر بێو پەیڕەو بکرێن دەیگەیەننە ئامانج و خەونەکانی دەهێننە دی. ئەم شێوە لێکدانەوەیش خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کە بیری "دانتێ" لە ئاستێکدا نەبووە لە خەوشو ناتەواوی پاك بووبێتەوە؛ هەر بەحوکمی ئەم هەڵوێستە فکرییەیش دەبینین بەرژەوەندی توێژە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکان دەردەبڕێ.

هەرچەندە "دانتێ" لە دڵەوە دژی بیرو ئایدیای سەدەکانی ناوەراست بوو، بەڵام بۆی نەلوا بەتەواوی لێیان پاك ببێتەوە. لەبەرئەوە کە بێینە سەر هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکانی پێشەوای یەکەمی رۆژگاری رێنیسانس، دەبێ حسابێکی وردیان بۆ بکەین چونکە ناوبراو "یەکەم شاعیری سەدەی نوێیە"و لەهەمان کاتیشدا "دوا شاعیری سەدەی ناوەراستە".

بێگومان هەموو ئەم خاڵانەی باسکران هیچ لە پلەوپایەی "دانتێ" کەم ناکەنەوە. ئەو، ئەوەندەی بەسە یەکەم کەس بوو لەسەدەیەکی تاریكو ئەنگوستە چاودا داوای دەکرد جڵەو بۆ هەستی ئادەمیزاد بەرەڵلا بکرێو دەیویست عەقڵ لە کۆت و پێوەند رزگار ببێ تاوەکو لە جیهان تێبگاو تاکەکەس لە کۆمەڵدا جێگای شیاوی خۆی بدرێتێ.

---

(٥٣) The Renaissance and the Reformation 1300 1600 P.P.39-40

لەم روانگەیەوە عەقڵی ئادەمیزادی لەخەوی دوور و درێژی سەدان ساڵە راپەراندو بە توندی دەستی لەیاساو نەریتی دەرەبەگایەتیو رێبازی کاتۆلیکیی باو وەشاندو شایستەی ئەوەیە بەیەکەم موژدەدەری بیروڕای سەردەمی رێنیسانس ناوببرێ. سەرەنجامیش بەرهەمەکانی بەرادەیەك کاریان لە ئەدەبو هونەری جیهانییو بیروباوەری سیاسی ئەوروپا کرد، ژمارەیەکی زۆر نوسەرو شاعیرو پەیکەرتاش و نیگارکێش و مۆسیقاژەنی گەلان ئیلهامیان لێ وەردەگرتن، بەتایبەتی لە"کۆمدیا" کەی.

راستییەکەی تێکرای هەموو ئەو نووسەرە ئەوروپاییانەی خۆیان لەیاساو نەریتی کڵێسە دەرباز کردبوو، "دانتێ" بە شاعیرێکی داهێنەرو زانایەکی مەزن لە قەڵەم دەدەن. لەوڵاتەکەی خۆیشیداو لەسەدەی چواردەهەم بەدواوە بەرهەمەکانی راستەوخۆ بوونە هێزی پاڵپێوەنەری بزووتنەوەی رزگاریخوازانەو نیشتمانیی گەلی ئیتالیا. ئەمەیش بەتەواوی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا دەردەکەوێ کە خەبات کردن لە پێناوی یەکێتی ئیتالیا دا گەیشتە لوتکە. جگە لەوەی بیروڕای "دانتێ" لەناو ئەو بزووتنەوە میللییانەدا خۆیان نواند کە لەدواییدا بەرپابوون و کڵێسە مۆری کوفرو رەفی تا بەتەختی تەوێڵیانەوە.

بەر لەوەی بچینە سەر باسی پێشەوایانی دیکەی رێنیسانس، پێویستە دەست بۆ ئەوەیش رابکێشین کە زۆر بەڵگەی مەنتیقی هەن دەیسەلمێنن بیروڕای بە بنچینە عەرەبیی و بەداڕشتنو مشت و ماڵ کراو ئیسلامی[54] لەوانە، کتێبی رسالة الغفران ی "ئەبولعەلای موعەڕی"و "الفتوحات المكية"ی "ئیبنو عەرەبی"دا باسکراون، کاریان لە "دانتێ" کردووەو لە "کۆمیدیا" کەیدا بەکاری هێناون.

---

[54] زنجیرەی ژمارە ۷ ی الموسوعة الصغيرة باسێکی سەربەخۆیەو عبدالمطلب صالح بە ناونیشانی- دانتي و المصادر العربية والاسلامية- نووسیویەتی . هەروەها بڕوانە : د. عبدالقادر احمد اليوسف . سەرچاوەی پێشوو ل۲۸۰-۲۸۱

مێژوونووسێکی وەك "ئاسن بلاسیوس " روونی دەکاتەوە کە چەند سەدەیەك بەر لەوەی "دانتێ" لەدایك ببێ، ئەو باسانەی پەیوەندییان بە شەوڕەویی "الاسراء" و چوون بۆ ئاسمان "المعراج "ەوە هەیە، وەرگێڕدراونەتە سەر زمانە ئەوروپاییەکان. کابرایەکی سەر بەکڵێسەیش لەسەردەمی "دانتێ" دا کتێبێکی داناوە تێیدا باسی ژیانی "موحەمەد" (د.خ)و وەسفی چوونی بۆ ئاسمان و پردی سیراتی کردوەو بە زوویی لە ئەوروپادا بڵاو بۆتەوە . ئەمە جگە لەوەی کە "دانتێ" لەبەردەستی زانایەکی "فلۆرەنسا"یێدا پەروەردە بووەو شارەزایەکی باشی لە کلتووری عەرەبیدا هەبووە. تەنانەت ئەم کارتێکردنە کاتێك لەبەرهەمی شیعریی ئەو زانایەدا رەنگی داوەتەوە کە بیری "دانتێ" تێدا گەیشتبووە ئاستی پێگەیشتن.

گومانیش لەوەدانییە کەسێکی وەك "دانتێ"ی شارەزای ئەدەب و زانست و مێژوو بایەخێکی زۆری بەهەموو ئەو شتانە داوە کە مامۆستاکەی قسەی لێوە کردوون و خامەی رەنگینی داینێناون.

کارکردنی چیرۆکی "هەزارو یەك شەوە"یش لە "بۆکاشیۆ"ی پێشەوای سێیەمی رێنیسانس [**] بەڵگەیەکی ترەو پاڵشتێکی بەهێزی رایەکەی "بلاسیۆس "ە. بەتایبەتی چونکە "بۆکاشیۆ"و "پەترارك "ی هاوەڵ و مامۆستای ئەو دوو زانایەن کە "دانتێ" کاری تێکردن و پەیڕەوی رێبازەکەیان کرد.

## پەترارك ١٣٠٤ ١٣٧٤ ز :

شاعیرو نووسەرو داهێنەری ئیتالیایی " فرانچیسکۆ پەترارك " (Petrarca) لە ریزی پێشەوەی هومانیستانی قۆناغی یەکەمی رێنیسانس دادەنرێ. ناوبراو سەر بەخێزانێکی بازرگانی فلۆرەنسایییە . ئەو کاتەی "دانتێ" لەشار دەرپەڕێنرا، بنەماڵەی "پەترارك "یش

---

[**] لە شوێنێکی تری ئەم بەشەدا دێینەوە سەر ئەم باسە.

لەبەر هەڵوێستی سیاسییان دەریەدەرکران. پاش تێپەڕبوونی دووساڵ بەسەر ئەو رودلوەدا "پەترارك" لەدایك دەبێ. سەرەتا، یاساو زانیاری ئاینی دەخوێنێو بەکاروباری کڵێسەوە خەریك دەبێ. "پەترارك" لە ناخەوە دڵبەستەی کلتووری کۆن بوو. زیاد لە پێویستیش بایەخی بەزمانی لاتینی دەدا، بەرادەیەك هیچ کام لە هومانیستان نەیان دەتوانی وەك ئەو زمانی لاتینی بەکاربهێنێو بیروڕای خۆیانی پێ دەربڕن. کەسیش وەك ئەو پەرۆشی ساغکردنەوەی دەستنووسە کۆنەکان نەبوو. ئەو دەستنووسانەی لای ئەویش چنگ دەکەوتن لەرووی چەندیەتی و چۆنیەتییەوە هیچ کتێبخانەیەك، تەنانەت ئەوەی ڤاتیکانیش نەیدەتوانی شان لە شانی بدا [٥٦]. "پەترارك" زۆریەی تەمەنی خۆی بۆ ساغ کردنەوەی دەستنووسە کۆنەکان تەرخان کردو لەم ڕێگایەوە توانی زۆر دەستنووسی نەناسراوی زانا کۆنەکان بدۆزێتەوە، وەك ئەوانەی نووسەرو بوێژی سیاسی رۆمان "شیشرۆن ١٠٦-٤٣ پ ز." کە بەئەندازەیەکی دیار سەرنجی راکێشا.

"پەترارك" کە دەیبینی بیروڕایەکانی لەگەڵ بیروباوەڕی سەدەی ناوەراستدا ناکۆكو دژیەکن، دەگەیشتە ئەو ئەنجامەی کە باشترین ڕێگا بۆ سەرفرازیی ئادەمیزادو خزمەتکردنی کۆمەڵو فیکر، ئەو ڕێگایەیە پێشینان گرتوویانە. بۆیە وشەی Humanitasی لاتینی لە نووسەرانی پێشوو خواستو چ خۆ و چ ئەوانەی دوای خۆی کاری تێکردبوون دووبارەیان دەکردەوەو بەشێوەیەکی بەرباڵو بەکاریان دەهێنا. بێجگە لەمەیش بەهەموو توانایەوە هەوڵی دەدا مەفهوومی ئەو زاراوەیە بەکردەوە بچەسپێنێ. بەو پێیە "پەترارك" یەکەمین کەس بوو "زانستی مرۆڤایەتی" بەرامبەر لاهووت دانا. "پەترارك" لەپاڵ جموجۆڵ و بیروڕایەکانیدا خاوەنی هەستێکی نیشتمانیی یەکجار قووڵ بوو. ئەو کە دەسەڵاتداریەتی رۆمانەکانی هەڵدەسەنگاند، لای وابوو رۆژگاری ئەوان سەردەمی نموونەیی مێژووی پاڵەوانێتیی وڵاتەکەیەتی. لەبەرئەوە وا بۆ مەسەلەکە دەچوو گوایە بەژیاندنەوەی یاساو نەریتی ئەو سەردەمە، دەتوانرێ بنچینەیەکی پتەو

---

(٥٦) R.Weiss , Op. Cit : , P.P. 24-26 .

ژیانی رۆشنبیریی‌و سیاسی سەردەمەکەی خۆی دابمەزرێنێ‌و بەهۆیانەوە یەکێتی ئیتالیایش کە هەردەم خەوی پێوە دەبینی، پێك بهێنرێ. "کەس گومانی لەوە نییە گەر بێ‌و رۆما لەخۆی تێبگا، سەرلەنوێ ئازایەتییەکەی جارانی دەتەقێتەوە"[٥٧] ئا بەم شێوەیە "پەترارك" ئەو هەستە نیشتمانی‌و ئاواتە پیرۆزانەی لەدەروونیدا پەنگیان خواردبووەوە، دەری دەبڕین. کەوابوو ئامانجی "پەترارك" چ لە ژیان و چ لەبواری داهێناندا ئەوەبوو خزمەتی سەردەمەکەی خۆی بکاو چرای رۆشنی ئیشکردن‌و دڵسۆزی لە پێناوی گەل‌و نیشتماندا هەڵبکات .

لەسەر هەمان رێبازەکەی "دانتێ" باوەڕی وابوو، کە دەبێ تاکەکەس بەخودی خۆیەوە ببەسترێتەوە نەك بەپێی بنەماڵەو رەچەڵەك حسابی بۆ بکرێ. بەم هەڵوێستەشی کەوتە سەنگەری دژ بە چینی ئەریستۆکراتەوە –ئەگەرچی خۆیشی سەر بەو چینە بوو– و ئەنجامیش لەساڵی ١٣٤٧ دا پشتگیری ئەو راپەرینەی کرد کە لە رۆما دژ بە دەرەبەگایەتی ساز کرا. تێکڕای ئەم هەڵوێست‌و بیروڕایانە لە بەرهەمەکانی "پەترارك " دا تەعبیریان لەخۆیان دەکرد[٥٨] ناوبراو هەروەك شیعری دەووت، باسی مێژوویی‌و سیاسی‌و ئەخلاقیی‌و فەلسەفیشی دەنووسی‌و یەکێك لە شاکارەکانی کە ناوی "گیانی بەرزی لێ نا" بۆ راپەڕینەکەی "رۆما"ی تەرخانکردبوو. لە شاکارێکی دیکەیدا بانگ بۆ یەکێتیی هەڵدەدا داوادەکا دەست بەرداری ناکۆکی‌و دووبەرەکیی ببن‌و ناونیشانی "ئیتالیای نیشتمانم" (Italia mia)ی بۆ هەڵدەبژێرێ. ئەم بەرهەمەیان چ لە رووی شێوە، چ لەرووی ناوەڕۆکەوە تا ئێستاش نرخی خۆی لەدەست نەداوە. کتێبی

---

[٥٧] لە (أ.ا. جوبیر) وەرگیراوە . بڕوانە ((مێژووی جیهان)) بە زمانی رووسی . بەرگی سێیەم ل ٦٢٥ .

[٥٨] "پەترارك" ژمارەیەکی زۆر نووسینی هەیە بەلام بەشێکی باشی فەوتاوە.. R.Weiss, Op. Cit. , P. 33.

"ئەفریقیا"یشی بەگیانێکی نیشتمان پەروەرانەی بەرز ناوێتە کردووە. لەچەند بەرهەمێکی گرنگیدا بەتوندی ڕەخنە لەلایەنە خراپەکانی کڵێسە دەگرێ، بەتایبەتی لەو شیعرانەدا کەناوی "نامە بێناونیشانەکان"ی لێناون. دەبێ پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین کە خۆشەویستی "پەترارك " سەبارەت بە "لاورا" بووە سەرچاوەیەکی تری ئیلهامی زۆر لەبەرهەمە ئەدەبییەکانی. بەڵام ئەم بە پێچەوانەی "دانتێ"یەوە لە شیعرو نوسینەکانیدا بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەدەوری گیروگرفتەکانی ئەم دونیا خولی دەخوارد. لەگەڵ ئەوەشدا "پەترارك " بەتەواوی لەبەکارهێنانی مەجازو خوازکاریی دوور نەکەوتەوەو هەوڵیدا لێهاتوانە واتای بەرزی ناوی خۆشەویستەکەی بەتەعبیری مەجازی بەکاربهێنێ[٥٩] سەرەڕای ئەمەیش شێوازی دەربڕینی لەئاست گوێچکەو دڵو مێشکی خوێنەردا ئەوەندە بەهێز بوون، هەست بەهارمۆنیایەکی سەرسوڕهێن دەکرا. جا ئەگەر "دانتێ" لەو دونیا "ڤێرجیل "ی کردبێتە هاوڕێی خۆی، ئەوا "پەترارك "یش پەنا دەباتەبەر ئەم شاعیرە بت پەرستە، بەڵام بەشێوەیەکی نزیك لەم ژیانەوە. بەنموونە لە یەکێك لە بەرهەمەکانی "ڤێرجیل "چەند مەسەلەیەکی دیاریکراو وەردەگرێ تالەشیعرەکانیدا تەعبیریان پێ لەشوێنەوارەکانی ناپۆلی بکارئەم شێوە دەربڕینەو بەو ڕاستەو خۆییە هەنگاوێکی گورج و خێرا بوو ڕوەو ئاسۆیەکی فراوانو بەرین، بەتایبەتی گەر مەودای کاتیی نێوان "دانتێ"و "پەترارك " لەبەرچاو بگرین. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کاریگەریی پەترارك لەناودارانی ئیتالیای سەردەمی ڕینسیانس لە"دانتێ" کەمتر نەبووە، چونکە زۆربەی هۆمانیستانی سەردەمەکەی یان هاوەڵی نزیك، یاخود قوتابی خۆی بوون. تەنانەت بیروباوەڕی "پەترارك " لەدەرەوەی ئیتاڵیا زۆر خێراتر لەبیروڕای هاوچەرخەکانی و هومانیستانی دوای خۆی بڵاوبووەوە. ئەوانە بەڕادەیەك

---

[٥٩] ناوی ئەو کچە لە وشەی (Laura)وە وەرگیراوە کە بە زمانی ئیتالیایی واتای گەڵا یان "تاجە گوڵینە" دەگەیەنێ. گریك و ڕۆمانەکانی زوو وەك ڕەمزی سەرکەوتنو نەمریی بەکاریان دەهێنا.

"پەترارك " كاری تێكردبوون لەبەرهەمەكانیاندا، لەنوسەرانی پێشوو زیاتر لاسایی ئەویان دەكردەوە. لەبەرئەوە دەتوانین قسـە لـەقوتابخانەیەكی تایبەتـی "پەتـرارك " بكـەین كەنەك هـەر لـەئیتالیادا بـڵاوبووەو تەشـەنەی كـرد بـەڵكو گەیشـتە ئـەودیوی چیاكانی "ئەلپ "[٦٠].

"پەترارك " وەك خۆی دانـی پێدا دەنـێ، سـەرەڕای ئـەو هـەموو ئـاوات و خواسـتەی لەپێناویدا كۆششی دەكرد، بۆی نەكرا خـۆی لـەو هـەمووكۆت و زنجـیرەی پێشـوو ڕزگـار بكا. بۆیە شتێكی سەیر نییە ئەگەر جۆرە ناكۆكیەك لەبیروڕاو هەڵوێستیدا بەدی بكـەین وەك لـەبیرو هەڵوێسـتی "دانتـێ" دا هەسـتی پێدەكـرا. "پـەترارك " پـاش ئـەوەی بـۆی دەركەوت ئەو هێزانە بەو شێوەیەی ئـەو بـاوەڕی پێیـان هـەبوو لـەوە دەسـتەو سـانترن بتوانن یەكێتیی ئیتالیا بەئەنجام بگەیەنن نائومێدی باڵی بەسەردا كێشـاو پاشـەو پـاش گەڕایە دواوەو لەدوا ساڵەكانی ژیانیدا وا بۆ مەسەلەكە دەچوو گوایە تاكە ڕێگایەك هەبێ گیروگرفتی سیاسی وولاتەكـەی چارەسـەر بكـا ئەوەیـە: ئیمپراتۆریـەتی پـیرۆزی ڕۆمـان بژێنرێتەوە. جگە لەوەیش خۆشویستنی ژیـان و ئـادەمیزاد زۆرجـار لەتـەك پەراگەندەی ئەو بیروڕایەنەدا لەیەكیان دەدا كە لەكڵێسەدا پێی گۆش كرابوو. ئەم ناكۆكییە بەئاشكرا لـە دووتوێـی ئـەو كتێبـەیدا دەردەكـەوێ كەلەگـەڵ یـەكێك لەپێشـەوایانی زووی ئـاینی مەسیحیدا مشتومڕ دەكاو رای خۆی بەرامبەر بەژیان دەردەبڕێ.

"پـەترارك " دوا سـاڵەكانی تەمـەنی بەتـەواوی لـەدونیای دەرەوە پچـڕاو تووشـی گۆشەگیریی هات. بەو حاڵەیشەوە هەر بیری لای پاشـەڕۆژو چارەنوسـی نیشـتمانەكەی گیروگرفتـەكانی میللـەت و مەسـەلە جەوهەرییـەكانی ژیـان بـوو. لەبـەر ئـەوە پێویسـتە لەقۆناغی یەكـەمی ڕێنسیانسـدا جێگایـەكی دیـاری بـۆ دابـنرێ و ڕادەی كاركردنیشـی

---

[٦٠] R. Weiss. Op. Cit, P.P. 27-29, 34. 86. 98-112. The Renaissance and the Reformation 1300 1600 P.9.

لەهۆمانیستانی تر دەست نیشان بکرێ، بەتایبەتی " پۆکاشیۆ " ی قوتابی و هاوڕێی هەرە نزیکی خۆی کە بەپێشەوای سێیەمی سەردەمی ڕێنسبانس ناسراوە.

## "پوکاشیۆ ١٣١٣-١٣٧٥ ز"

نوسەری ناوداری ئیتالیایی " جیۆڤانی پۆکاشیۆ" لەخێزانێکی بازرگانی فلۆرەنسایی لە پاریس لەدایك بووە. باوکی ئاواتە خواز بوو کوڕەکەی ببێتە بازرگان یاخود پارێزەر. بەلاّم " پۆکاشیۆ" ئارەزووی هیچ کام لەم پیشانەی نەدەکرد. دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ ئیتالیا لەشاری "ناپۆلی" دەستی بەجموجۆڵێکی ئەدەبی کرد. لەو کاتەدا "ناپۆلی" لەبارودۆخێکی سەیردا دەژیا. بەسەرێك بەوپەڕی شانازیەوە پەیڕەوی نەریتی کۆن و سوارچاکیی دەکرا، بەسەرێکی تریش کۆمەڵێك لەهۆمانیستان هاتبونە کایەوەو بانگی سەردەمێکی نوێیان بەگوێچکەی خەڵکیدا دەدا.

" پۆکاشیۆ" یەکێك بوو لەو کەسانەی لەلایەن شەخسی پادشای "ناپۆلی"یەوە ڕێزێکی زۆری لێ دەنراو تەنانەت کەوتیشە داوی خۆشەویستیی "ماریا"ی کچە ناشەرعییەکەی پادشاوەو ئەنجام وەك چۆن "پاتریس پۆرتینـاری"و "لاورا" کاریـان لەداهێنانەکانی "دانتێ"و "پەترارك " کـرد، بەهەمان شێوەیش "ماریـا" رۆڵێکی گرنگی لەژیانی "پوکاشیۆ" و داهێنانەکانیدا بینی. ئەو کاتەی " پوکاشیۆ" گەڕایەوە بۆ فلۆرەنسا" لەهەرەتی لاوێتیو لوتکەی جموجۆڵی ئەدەبیدا بوو، لەبەرئەوە پێشوازیەکی گەرمی لێکرا. هەر لەو کاتەدا چینی بۆرژوای تازە پێگەیشتوی ئەو شارە بەسەر چینی ئەریستۆکراتی دەسەلاّتداردا سەرکەوتنی تەواوی بەدەست هێنابوو. ئەم باروزروفە نوێیە، هەلو مەرجێکی گونجاوی بۆئەو نوسەرەگەورەیە رەخساند، تاوەکو پەرە بەوزەو توانای خۆی بداو لەژیانی سیاسیدا بەکردەوە رۆڵیخۆی بگێڕێ. ئەم نووسەرە لێهاتووە بەدڵو بەگیان پشتگیریی دەسگا جەمهوریـیەکانی دەکردو چەند ئەرکێکی دیپلۆماسی گەورەی پێ سپێردراو توانی سەرکەوتووانە بەجێیان بهێنێ. جا هەرچەندە

"پوکاشیۆ" لایەنی چین و توێژە کۆمەڵایەتییە چەوساوەکانی ناو کۆمەڵی نەگرت- کەئەوانیش کەوتبونە خۆو دەیانویست بەرژەوەندییەکانیان مسۆگەر بکەن-، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بیرکردنەوەی -پۆکاشیۆ- سیمایەکی دیموکراسیو نیشتمانی قوڵی هەبوو. ئەو دەیویست پەیامەکەی "دانتێ" و "پەترارك" بگەیێنێتە جێ؛ بەم هەڵوێستەشی توانی هەستی نیشتمانیی لەناو جەماوەردا بەرز بکاتەوە. بەوپەڕی تواناشییەوە هەوڵی دەدا لەبەرهەمە ئەدەبییەکانیەوە پلەو پایەی زمانی نەتەوەیی ئیتالی جێگیر بکاو بیسەلمێنێ ئەو زمانە زمانی نوسینو لێکۆڵینەوەیەو خۆیشی بەو زمانە بەرهەمەکانی نووسییەوە .

لوتکەی داهێنانی هونەریی" پۆکاشیۆ" لەشاکاری "دیکامیرۆن "دا دەردەکەوێ. ئەو بەرهەمە بریتییە لەسەد چیرۆکی کورتو بەسێ ساڵ لەنوسینی بووەتەوە. چیرۆکەکان لەسەر زمانی حەوت کچو سێ لاوەوە دەگێڕدرێنەوە کەلەکاتی ڕشانەوەکەی ساڵی ١٣٤٨دا شاری فلۆرەنسا بەجێ دەهێڵنو لە ڤیللایەکی دەرەوەی شاردا دەشنەوو دەڕۆژ دەمێننەوەو هەریەکەیان ڕۆژێ چیرۆکێك دەگێڕنەوە. لەمەوە کتێبەکەی ناوی "دیکامیرۆن "ی لێنرا کە بەزمانی لاتینی واتای "یاداشتی دەرۆژە" دەگەیەنێ.

بابەتەکانی "دیکامیرۆن" باسی سەرچڵیو چاونەترسیی هەندێ بازرگان دەکەن لە هەندەران. هەندێکیشیان بەشێوەیەکی زۆر جوان لە داستانو چیرۆکی فۆلکلۆریی دەماودەمو حیکایەتی ڕۆژهەڵاتی پڕ مانا وەرگیراونو سەرلەنوێ دارێژراونەتەوە[٦١] بەڵام ڕووداوی ڕۆژانەی کۆمەڵایەتی لە ناوەرۆکی گشتی چیرۆکەکانی "دیکامیرۆن" د پلەی یەکەمیان پێبەخشراوە. لەبەرئەوە دەبینین پاڵەوانەکانی ڕۆڵەی کۆمەڵگای ئیتالیاییو هەر لەپادشاو سەرۆکەوە بیانگرە تاوەکو دەستو پێوەندو جووتیارە سادەکانی لەخۆ گرتووە. نووسەر بۆ گەیاندنی مەبەست چی ووزەو توانای هەیە بۆ

---

[٦١] هیچ دوور نییە چیرۆکی "هەزارو یەك شەوە" کاری لە پۆکاشیۆ کردبێ، بە تایبەتی چونکە لەسەردەمی شەڕی خاچ پەرستاندا ئەو چیرۆکە وەرگێردرایە سەر زمانی لاتینی.

ئەوەی تەرخان دەکا چیرۆکەکانی بخاتە قالبێکی گاڵتەجارییەوە، پەردە لەسەر هەڵس و کەوتی رەبەن و قەشەو تێکڕای پیاوانی کڵێسە هەڵدەماڵێ و ئاشکرای دەکا ئەوانە کۆمەڵە خەڵکێکی مشەخۆرو ئینتەلاکردوو ساختەبازو داوێن پیس و دووزمان و مەرایی کەرن. بەو چەشنەو بەهۆی ئەم شێوازە گاڵتەجارییەوە، ناخی خوێنەر دەهێنێتە پێکەنین. "بۆکاشیۆ" راستەوخۆ توخنی مەسەلە ئاینییەکان نەکەوت، بەڵام هەنگاوێکی چاو نەترسانەی نا بۆ ئاشکرا کردنی رووی راستەقینەی پیاوانی کەنیسەو پاشان کاری لەو رێبازە ئاینییانەش کرد کە لە پێناوی چارەسەرکردنی لایەنە سەلبییەکانی رێبازی کاتۆلیکیدا بێترس و سڵەمینەوە، هاتنە کایەوە. دەبێ ئەوەش بووترێ کە ناوەرۆکی چیرۆکەکان پڕن لە نموونەی زیندوو، تێیاندا باسی سەرکەوتنی ئەو یاسایانەی ژیان دەکا کەلەتەک عەقڵی ئادەمیزادو پەرژەوەندییەکانی سەدەی نوێدا دەگونجێن. بەجۆرێك دەڕوانێتە ئادەمیزاد کەداهێنەرێکی گەورەی ژیانەو پێویستە لەشوێن و جێگای شیاوی خۆیدا دابنرێ.

" بۆکاشیۆ" بەمەوە نەوەستا بەڵکو پەرەی بەو بیرۆکەیەیش دا کەدەیگوت: نابێ پلەوپایەی تاکەکەس بەو چاوەوە تەماشا بکرێ لە چ خێزان و بنەماڵەیەکە، بەڵکو دەبێ کارو کردار بکرێنە محەکی چاکەو پیاوەتی تاکەکەس. لێرەدا گرنگ ئەوەیە دەست بۆ ئەوەیش رابکێشین کە " بۆکاشیۆ" لەسەر رێو شوێنی "دانتێ" نەرۆیشت و پێویستی بەوە نەبوو یەکێکی وەك "ڤێرجیل " زیندوو بکاتەوەو ئەو دونیا بخولقێنێ و بەهۆیانەوە دلخی دڵی لەدەست دیاردە ناهەموارەکانی کۆمەڵەکەی هەڵبڕێژێ، نەخێر. " بۆکاشیۆ" پێ لەسەر زەمینەی واقیع دادەگرێ و لە "دیکامیرۆن"دا بەزمانی نەوەی نوێی سەر بەتوێژە کۆمەڵایەتییە تازە پێگەیشتووەکان قسە دەکاو نیشانی دەدا کە چۆن وەك مافێکی رەوای خۆیان بەرەنگاری ناتەواوییەکانی واقیعی کۆمەڵایەتی دەبنەوە. نووسەر بێئەوەی هەست بەخۆی بکا، هەروەك گوزەرانی چینی بۆرژواو ئەریستۆکراتی نیشان دەدا، بەهەمان شێوەش جیاوازیی نێوان ژیانی رۆژانەی ئەم چینە تازەپێگەیشتووەو

چینە زەحمەتکێشەکان دەنەخشێنی‌و دەریدەخا تا چ رادەیەك لەیەك دوورن. لەکاتێکا دە پاڵەوانەکەی "دیکامیرۆن" لەدەرەوەی شار ژیانیان بەسەر دەبەن‌و خۆیان لەمەترسیی دەپارێزن، لەناوشاردا نەخۆشی ڕشانەوە ژیانی سەدان کەسی سەر بەچینە هەژارەکان هەڵدەلووشێ. سەرەڕای ئەمانە هەمووی " بۆکاشیۆ" وەك "دانتێ"و "پەترارك"ی هاوچەرخی لەگێژاوی ئەو ناکۆکییە کۆمەڵایەتییانەدا کەشارەکانی ئیتالیا تێیدا دەژیان‌و هەموو لایەنێکی فیکریشی گرتبووەوە، دووچاری تەنگوچەڵەمەیەکی سایکۆلۆژی بوو بوو. ئەنجامیش پیاوێکی سەر بەکڵێسە کاری تێکردو وردە وردە لە بیروڕا دونیاییەکانی پاشگەز بووەوە کە هەمیشە لەبەرهەمەکانیدا رەنگیان دەدایەوە. "پەترارك "یش نەبوایە کە" بۆکاشیۆ" بەڕابەرو مامۆستای خۆی دەزانی، ئەوا بەتەواوی دەستبەرداری هەموو جموجۆڵێکی ئەدەبیش دەبوو. سەرەڕای ئەمانەیش ساڵانی دوایی تەمەنی بۆ کاری زانستی تەرخانکردو دەستی‌دایە کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی دەستنووس‌و نووسینەوەی مێژوو، بێجگە لەوەیش لە فلۆرەنسا کورسییەکی تەرخانکرد بۆ شیکردنەوەی نووسینەکانی "دانتێ"و خۆیشی لەسەر حەفدە سروودی "کۆمیدیای یەزدانی" ی نووسی‌و یەکەم کەسیشە مێژووی ژیانی نووسەرەکەی خستە دووتوێی کتێبێکەوە. هەتا هەتایە ناوی "بۆکاشیۆ" بەنەمریی دەمێنێتەوە، چونکە چیرۆکی "دیکامیرۆن " ناوو شۆرەتێکی جیهانیی بۆ وەدەست هێناو ئەگەر لەتەك بەرهەمەکانی "دانتێ" و "پەترارك" دا بەراورد بکرێ، قۆناغێکی پێشکەوتووی پەرەسەندنی ئەدەبیاتی ئەورووپاییمان نیشان دەدا. ئەدەبیاتی سەرپاکی ئەورووپایش چ لە رۆژگاری رێنیسانس‌و چ لە قۆناغی دواتردا قەرزداری داهێنانەکانی " بۆکاشیۆ"یە[٦٢].

لەکاتێکا کۆتایی بەباسی ئەو سێ پێشەوایە دەهێنین، پێویستە جارێکی تریش ئەو حەقیقەتە دووپارە بکەینەوە کە سەرەڕای ئەو کەم و کووڕیانەی لەبەرهەم‌و بیری ئەوانەدا دەردەکەون، رۆڵێکی دیارو ئاشکرایان لە بووژاندنەوەی ئەورووپادا هەبووەو هەر

---

(٦٢) D.Hay, Op. Cit .. P. 80.

ئەولن بوون بەردی بناغەکەیان داناو پاشان لەگەڵ رەوتی پەرەسەندنی کۆمەڵدا گەشەیان پێکراو لەجاران زیاتر نەش و نمایان کرد.

شانازییە بۆ "دانتێ"و "پەترارك" و "بۆکاشیۆ" کە توانییان سەرەتای شۆڕشێك لەمەیدانی نووسیندا بەرپا بکەن‌و دوای خۆیان کاریکەنە سەر هەموو رێبازە فکرییە نوێیەکان‌و تێیاندا رەنگ بدەنەوە. لەوانەیشە "ئارازمس ئێرازمۆس" یەکێك بێ لە دیارترین ئەو هومانیستانەی کەلەو قۆناغەدا، رۆژگاری رێنیسانس ی تێدا گەیشتە چڵە پۆپە، بەئەندازەیەکی زۆر پەیڕەوی ئەو سێ پێشەوایەی کردبێ.

## ئارازمسی رۆتەردامی:

ئارازمس (١٤٦٦؟- ١٥٣٦) جێگایەکی تایبەتی لە مێژووی بزووتنەوەی رووناکبیریی ئەورووپادا هەیە . ئەمەیش نەك لەبەر ئەوەی خاوەنی زەمینەیەکی فیکریی پتەو بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەیش کە شوێن پەنجەی بەسەر بزووتنەوەی فیکریی چەندین وڵاتی ئەورووپاییەوە دیارە.

لەشاری "رۆتەردام"ی سەر بەهۆڵەندا لەدایك بوو. سەرەتای ژیان و خوێندنی لەناو کڵێسەکانی ئەو شارەدا دەست پێدەکاو دوایی بەنیازی ئەوەی بڕوانامەی دکتۆرا لە زانیارییە ئاینییەکاندا وەربگرێ، دەچێتە "پاریس"و هەر لەوێ دەبێتە عەمیدی کۆلیژی "دیفرانس"و نزیکەی شەش ساڵێکیش لەزانکۆکانی ئینگلیستاندا دەرس دەڵێتەوە ، بەتایبەتی لەزانکۆی "کامبرج"و تا ئەو رۆژەی مەرگ شاڵاوی بۆ دەهێنێ‌و لەشاری "بازل"ی سەر بە "سویسرا" چاو لێکدەنێ، لەوڵاتانی "ئەڵمانیا"و "ئیتالیا"و "سویسرا" بە جموجۆڵی زانستییەوە خەریك دەبێ .

ناوو شۆرەتی "ئارازمس" وەك زمانەوان‌و زاناو نووسەرێکی لێهاتوو لەناو کۆڕە زانیاریی‌و رۆشنبیرییەکانی ئەورووپادا بەخێرایی بڵاوبووەوە. ناوبراو شارەزاییەکی تەواوی

له زمانی لاتینیو گرێکیدا هەبوو، چەند کتێبێکیشی بۆ لێکۆڵینەوەیان تەرخانکرد. بەڵام لەبەرئەوەی بە لاتینی دەدواو پێی دەنووسی، زیاتر بایەخی بەم زمانەیان دەدا.

گەورەترین ئیشێك "ئارازمس" ئەنجامیدا ئەوەبوو تێکستەکانی "ئینجیل"و چەند کتێبێکی کۆنی کڵێسەی چەسپاندو بەوردییو بەزمانێکی رەوان وەری گێڕانە سەر زمانی لاتینی. ئەم هەنگاوەیش بووە هۆی ئەوەی خەڵکی بتوانن بە قووڵی لە "ئینجیل" تێبگەن؛ بەتایبەتی چونکە "ئارازمس" هەر بەوەرگێڕانییەوە رانەوەستا، بەڵکو تێکستەکانی ساغکردەوەو رای خۆیشی لەسەریان دەربڕی.

یەکێك لەکارە مەزنەکانی دیکەی "ئارازمس" ئەوەبوو بەشێکی زۆری پەندی پێشینانی نووسەرانی پێشووی هەڵبژاردو کۆی کردنەوەو لێی کۆڵینەوە. بەمەیش توانی بیروڕا مرۆڤایەتییەکان بەخەڵکی بناسێنێو لەکۆڕو کۆمەڵە رۆشنبیرییە جۆربەجۆرەکانی ئەورووپادا بڵاویان بکاتەوە. ئەو بەرهەمەی کە ساڵی ١٥٠٠ ز بەناونیشانی "کتێبی پەندەکان" لە نووسینەوەی بووەوە، بەناودارترین بەرهەمی "ئارازمس" دادەنرێ، ئەم کتێبە بریتییە لە کۆمەڵێك پەندو ئامۆژگاریی و قسەی نەستەقی نووسەرانی پێشوو پێکهاتووەو خۆیشی بەخامەی رەنگینی کەوتە شەنو کەوکردنی ناوەرۆكو مەبەستی بابەتەکانو بیروڕای خۆی لەسەر دەربڕی. هەموو ئەمانە وایان کرد ئەو کتێبە لەسەردەمی رێنیسانسدا ببێتە هاندەرێکی گەورەو خەڵکی بەپیر بیروڕای مرۆڤایەتییەوە بچنو پاشان وەربگێردرێتە سەر چەندین زمانی ئەورووپاییو بەئەندازەیەکی فراوان بڵاوببێتەوە.

"ئارازمس" لەبیرکردنەوەیدا، پابەندی باوەری مەسیحیی بوو. هەمیشە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە رەوتی گەشەکردنی بیری مرۆڤایەتی لەیاساو ئەخلاقی ئاینی مەسیحی باشتری بەخۆیەوە نەدیوە. هەر لەم روانگەیەشەوە دەیڕوانییە زانیارییو کلتووری کۆنو لای وابوو زانایانی زوو سەرەتای قۆناغێکی باڵاتر بوونو زۆر لەوە پیرۆزترن دەستی

دەستكارییان بۆ درێژ بكرێ. لەبەر ئەوە دژی بزووتنەوەكەی "مارتن لۆتەر" راوەستاو بەرەنگاری هومانیستی ئەڵمانی "ڤۆن هوتن"یش "دانتێ" هاتو سەرەنجام بۆ ئەم مەبەستە كتێبێكی بەناونیشانی "سەربەستی ئیرادە"وە داناو تێیدا زۆر بەتوندی هێرشی بردە سەر بیروراپەكانی "مارتن لۆتەر"و بەرگریی لە سەربەستیی ئیرادەی تاكەكەس دەكرد. سەرەرای ئەمانەیش، بیروباوەڕی "ئارازمس" –بیەوێو نەیەوێ– بووە هێزێكی كاریگەری ناو بزوتنەوەی ریفۆرمی ئاینی. وەك باسكرا بە وردیی "ئینجیل"و كتێبە ئاینییە كۆنەكانی وەرگێراو بەتەواوی دەستی پیاوانی كڵێسەی خستە روو. سەلماندیشی كە تا چ رادەیەك لە بیروڕای ئاینی مەسیحی لایان داوە. بێگومان مەبەستیشی لەم كارەی ئەوەبوو رووبەڕووی زوڵمو ستەمی كۆمەڵایەتی سەردەمەكەی بێتەوە. هەروەها لە نوسینەكانیدا دەستی بۆ ئەوە رادەكێشا كە خاوەندارێتیی تاكەكەس "الملكية الفردية"و جیاوازی كۆمەڵایەتیی‌و هەژاریی تاچ رادەیەك زیانی مەعنەوی بە كۆمەڵ دەگەیەنن، بەوەیشەوە رانەوەستا، بەشێوازێكی گاڵتەجاریی رەخنە لەقەشەكان دەگرێو دەری دەخا ئەوانە لەژێر دروشمی جۆریەجۆردا خۆیان حەشارداوەو راستییەكەی هەر خەریكی خۆشیی‌و رابواردنی خۆیانن. ئەو كتێبەیشی كەناونیشانی "لەبارەی ستایشی نەفامییەوە" بڵاوی كردەوە، نموونەیەكی روون‌و ئاشكرای رەخنەی توندوتیژی "ئارازمس"ە سەبارەت بە یاساو نەریتی ئاینی‌و سیاسیی تارماوای سەردەمەكەی‌و لەرێگەی دەرخستنی هەڵس‌و كەوتی خەڵكی دووزمان‌و نەزان‌و ساختەبازەوە، زیرەكانە ناخی خوێنەر دەوروژێنێ‌و بەكوڵ دەیهێنێتە پێكەنین‌و بەشێوازێكی هونەری تر لەهاوچەرخانەكانی، پەردە لەسەر حەقیقەتی پیاوانی كڵێسە هەڵدەماڵێ. بەم كارەیشی هەلو مەرجێكی لەباری بۆ بزوتنەوەی ریفۆرمی ئاینی رەخساند، تاوەكو لەكاتی خۆیدا وەك پێویست بتەقیتەوە، بەتایبەتی چونكە نووسینەكانی بەزوویی وەردەگێردرانە سەر زمانەكانی ترو لەناو خەڵكیدا رەواجێكی

زیاتریان هەبوو. بەڕادەیەك ژمارەی هەموو ئەو كتێبانەی چاپكران‌و لەپێش هەموویانەوە كتێبی "لەبارەی ستایشی نەفامییەوە" گەیشتە هەزاران دانە. دیارە ئەم ژمارەیەیش بۆ ئەو سەردەمە ئەوەندە گەورە بوو، بەرهەمی هیچ نووسەرێك پێی نەگەیشتبوو .

"ئارازمس"ی ڕۆتەردامی بەهەڵسوكەوت هێمن‌و لەبیركردنەوەدا بەلای ئاشتیی‌و لێبوردندا دایدەتاشی، لەبەرئەوە حەزی بەئاڵۆ گۆڕی سیاسی كتوپڕو پشێوی نەدەكرد. بەپێچەوانەوە باوەڕی وابوو كە دەتوانرێ بەهۆی عەقڵ‌و فێربوونەوە خەڵكی بخرێنە سەر ڕێگای ڕاست. لای ئەو، عەقڵی ئادەمیزاد باڵاترین شتەو دەبێ هەموو بڕیارێكی دروست پشتی پێ ببەستێ. فەرمانڕەوای سەركەوتوو دەبێ بەعەقڵ چارەسەری ناكۆكی‌و نوویەرەكی‌و شەڕی ناوخۆ بكاو هەر لە ڕێگای عەقڵیشەوە چارەسەر بۆ كێشەی نێو دەوڵەتان بدۆزێتەوەو ئاشتییەكی سەروەر دابمەزرێنێ. سەرپاكی ئەم بیروڕا سیاسییانەشی خستە دووتوێی ئەو كتێبەوە كە ناوی "پەروەردەی میری مەسیحی" لێنابوو.

"ئارازمس" لەم كتێبەدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ كە پێویستە میر هەموو تواناى خۆی بخاتە كار تاوەكو لای گەل خۆشەویست بێ‌و مەرجە "خاوەن بەزەیی‌و بەتاقەت‌و هاودەم" بێ‌و دەبێ "وەزیرەكانیشی لەوكەسانە هەڵبژێرێ ئەم سیفاتانەیان تێدابێ"و هەوڵ بدات "وڵاتەكەی بەباشی بناسێ"[63].

لەم ڕوانگەیەوە "ئارازمس" بایەخێكی زۆر بەلایەنی پەروەردەو فێربوون دەدلو كتێبێكیشی نووسی تێیدا چەند بیروڕایەكی زۆر بەنرخ دەردەبڕێ. بەنموونە: دژ بەشێوازی فێركردنی دەرەبەگایەتی دەوەستێ‌و ئاشكرای دەكا زۆر لایەنی ئەو شێوە پەروەردەیە بۆ ڕواڵەت‌و دۆگماتییانە یاساكانی پەیڕەو دەكرێن. "ئارازمس" هەر بەمەیشەوە ڕاناوەستێ، دژی لێدانی قوتابی دەوەستێ‌و داوا دەكا شێوازی فێركردن

---

[63] Action and Conviction in Early Modern Europe. Editors J.K. Rabb and J.E. Seigel, Princeton,1969 . P.P. 20-21

سووك بكرێو لای وایە دەبێ بەجۆرێك بێ لەگەڵ ئارەزووی قوتابیاندا بگونجێو گیانی ملهێنانیان تێدا بژیەنێتەوە. بەو چەشنە دەبینین بیروڕاو ڕێبازی "ئارازمس" مەودایەکی فراوانو بەربلاوو وەردەگرێو بەلای زۆربەی مێژوونووسانەوە "ناودارترین کەسە کە بزووتنەوەی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دیوە"[٦٤]. هەندێکی تریش بە"میری زانایان"[٦٥] ناوی دەبەن. لەبەرئەوە ئەگەر هەموان دڵبەستەی بووبن شتێکی سەیرو سەرنج ڕاکێش نییە. ئەوەتا لای چەند پاشایەکی ئەورووپایی بەتایبەتی لای ئەوانەی ئەم دەستگیرۆییکردنو بەدەنگیانەوە چوو، جێگای شیاوی بۆ تەرخان کراوە. ئەمە جگە لەوەی توانیی زمانێکی هاوبەش لە نێوان زۆربەی هومانیستانی سەردەمەکەیدا بدۆزێتەوەو بیانکاتە هاوڕێی نزیکی خۆی "تۆماس مۆر" کە بەپێشەوای بیری سۆشیال ئایدیالیزم ناسراوە، یەکێکە لەو کەسانە.

## سۆسیال ئایدیالیستەکان

لەو رۆژەوەی کە جیاوازیی باری ژیان لە نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکاندا پەیدا بووەو زوڵمو چەوساندنەوە، دەسەڵاتی بەهێز بەسەر بێ هێزدا سەپێنراوە، خەڵکە زۆر لێکراوەکە وێڵن بەدوای چارەسەرێکدا ژانو ئازارەکانیان کەم بکاتەوە. جا وەنەبێ هەوڵو کۆششی ئەم چینە بەش خوراوە دژی واقیعە تاڵەکە بەتەنها سیمای پاڕانەوەو تەقینەوەو یاخیبوونی بەخۆیەوە لکاندبێ، بەڵکو مۆرکی جۆربەجۆری پێوە نراوەو هەندێ جار لەپێناوی دواڕۆژێکی باشتردا لەدەریای بێ بنی خەیاڵدا کەوتوونە مەلەکردن. ئەم دیاردەیەش بە روونیی لەئەدەبیاتی میللیی گەلانی دونیادا دەردەکەوێ. لەسەردەمی گرێك و رۆمانی کۆندا، داستانی "سەدەی زێرین" هاتە کایەوەو تێیدا

---

[٦٤] Renaissance and Reformation 1300 1648 . ed . by G.R. Elton , second edition . New York , London. 1968 P. 59

[٦٥] R. Palmer and J. Colton, Op. Cit. , P. 59

کۆمەڵ بەجۆرێك دەنەخشێنێ هەرچی پێی بوترێ جیاوازیی و چەوساندنەوە لە گۆڕێ نییە. لەلایەکیتریشەوە، چەندین زانا هەمان ئاواتی مرۆڤایەتییان سەرلەنوێ لەزەمینەی فیکریی جۆربەجۆرەوە مشتومال کرد. "ئەفلاتون" لەبیرکردنەوەید ئایدیالیست بوو بەرگریی لە "کۆمەڵگای کۆیلەیەتی" دەکرد؛ کەچی هەمیشە خەوی بەسیستمێکەوە دەبینی تێیدا زانایان جڵەوی فەرمانڕەوایی بگرنە دەستو چەشنە خاوەندارێتییەکی بەکۆمەڵ تێیدا پەیڕەو بکرێو پەروەردەی منداڵانیش بخرێتە ئەستۆی ئەو سیستمە. لەسەدەی دووەمی پێش زاییندا نووسەری گریکی "یامبوڵ" گەشتێکی خەیاڵیی بەناو دەریادا دەکاو ئەنجام دەگاتە دورگەیەك دەکەوێتە خوارووی نیمچە دورگەی عەرەبەوە کەخێڵێکی بەختیار تێیدا دەژینو ئەوەی پێی بوترێ چەوساندنەوەو جیاوازیی لەناویاندا نییە.

نووسەر لای خۆیەوە ژیانی ئەم خێڵە بەنموونەی ژیانێکی ئایدیایی دادەنێ. لەسەدەی ناوەراستداو تەنانەت دوای ئەو سەدەیەیش خەڵکی خەونیان بەوەوە دەدی ئایدیای زووی ئاینی مەسیحی لەبارەی یەکسانییو برایەتییەوە بژیەننەوە. ئەم ڕێبازە فیکرییە لەگەڵ دەرکەوتنی پەیوەندییەکانی سەرمایەداریو جیاوازیی کۆمەڵایەتیو نارەزایی خەڵکیدا مەودایەکی بەربڵاوترو قووڵتری بەخۆیەوە دی. ئەوەتا لەباسێکدا کە لەسەدەی شازدەهەمدا لە ئینگلستان نووسراوە، تێیدا بەم جۆرە باسی جیاوازیی کۆمەڵایەتیو نارەزایی خەڵکی کراوە: "کێو لەچ سەردەمێکدا دیویەتی خەڵکێکی زۆر لەژیانی خۆیان نارەزابنو خەڵکێکی کەمیش پێی قایل بن؟. کێو لەچ سەردەمێک دیویەتی خەڵکێکی ئەوەندە زۆر ئارەزووی گۆڕانو تازەکردنەوە بکەن؟. کەس بیستوویەتی ژمارەیەکی ئەوەندە زۆر پیاوچاك هەبن، یان ڕاستتر ئەو هەموو خەڵکە هەبن کە دەیانەوێ سیستمی چینایەتیو دەوڵەت تێكو پێك بدەن؟ کەس بیستوویەتی کە ژمارەیەکی ئەوەندە زۆر خەڵك هەبن رەخنە لەپادشایانو کاروکرداریان بگرنو کەمێکی زۆر کەمیش لایەنگریان بن؟!".

بیروباوەڕی یەکسانییو عەدالەتی کۆمەڵایەتی لەسایەی ئەو جۆرە ژیانەدا مەودایەکی نوێو دەرکەوتووتری بەخۆیەوە دی، بە رادەیەك لەسەردەمی ڕێنیسانسدا

ڕێبازی سۆسیال ئایدیالیزم[٦٦] لەسەردەستی چەند هومانیستێکی دەرکەوتووی سەر بە وڵاتــە ئەوروپاییــەکاندا بەئاشــکرایی خــۆی دەنوانــد. دیارترینی ئــەو کەسانەیش کــە توخنی ئەم مەسەلەیە کــەوتن "تۆمــاس مــۆر"ی ئینگلیزییــە کــە بەپێشــەوای هــەموویان ئەسراوە. دوای ئــەویش "تۆمــازو-تۆمــاس-کامپــانیلا"ی ئیتالیاییــە کــە بەنوێنــەرێکی دەرکەوتووی ڕێبــازی سۆسیال ئایدیــالیزمی رادیکــالی ناســراوە، ئــەو ڕێبــازەی کــە لــەو ســەردەمەدا بنــەما فیکرییــەکانی بــە ئاشــکرا دەرکــەوتن. سۆســیال ئایدیالیســتەکان گیروگرفتی کۆمــەڵگایان بەشــێوەیەك چارەســەر دەکرد جیاوازییــەکی تــەواوی لەگــەڵ شێوەکانی پێشودا هەبوو. ئەوانە ئەگەر چی نیازی پاکو ئامــانجێکی پــیرۆز پــاڵی پێوە دەنان عەوداڵی ژیانێکی باشترو خۆشتر بن؛ بەڵام ئــەو جیهانــەی ئــەوان پێکیــان دەهێنــا ئەوەندە خەیاڵیی بوو، مەحاڵ بووکەس پێی بگاو لەسایەیدا بحەوێتەوە. "تۆماس مۆر" لــە بــەناوبانگترین نووســینیدا باســی وڵاتێکــی ئاســوودەو بــەختیار دەکــا لــە دورگــەی "یۆتۆپیــا"دا، کــەچۆن بــەهۆی سیســتەمەکەیەوە لەهــەموو ئــەو گیروگرفتانــە بــەدوورە کەکۆمەڵگاکانی تر، پێوەی دەناڵێنن.

لە "یۆتۆپیــا"دا، نــەخاوەندارێتی تاکەکــەس هەیــەو نەچەوســاندنەوە. دوکــانو عەمبارەکان بۆ هەموانەو هەرکەس چی پێویست بێ بەخۆڕایی وەری دەگرێ. هەر ماڵێك دوو دەرگای هەیەو هەمیشە بۆ خەڵکی لەســەر پشــتن. هــەموو کەسێکی نــاو "یۆتۆپیــا" دەبێ ئیش بکــا بەمــەرجێك مــاوەی ئیشــکردنی لەڕۆژێکدا شــەش ســەعات زیــاتر نــەبێ. ئافرەت مافی تەواوی خۆی هەیە لەگەڵ پیاودا بەیــەك چــاو تەماشــا دەکرێ. ئارایشــتو دلوودەرمانی خۆ جوانکردن بەکارناهێنێو جوانیی سروشتی لامەبەستە، چونکە پیــاوانی نــاو "یۆتۆپیــا" ئارەزوویــان لەئارایشــت نییــەو لای ئــەوان ڕەوشــتی بــەرز لــەپێش جوانییەوەیە. لەناو ئــەم کۆمەڵــەدا ئاســتی هوشــیاریی خــەڵك لەڕادەیەکدایــە ڕقیــان

---

[٦٦] لێرەدا هەرئەوەندە بەپێویست زانرا لە هێڵە بنچینەییەکانی ئەو ڕێبازە بدوێین، وەکو تــر دەهێنــێ لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ بۆ ئەم باسە تەرخان بکرێ.

لەئالتون‌و زێڕ دەبێتەوە لەبەرئەوە دەیکەنە کۆت‌و پێوەندی کۆیلەو قەعدەی منداڵو نیشانەی تایبەتی بۆ تاوانباران[*].

فەیلەسوف‌و سیاسی‌و شاعیرو زانای‌ئیتاڵیایی " کامپانیلا" لە کتێبی "شاری خۆر"دا لە"تۆماس مۆر" بەولاوەتریش دەچی[١٧]. دانیشتوانی ناو شارەکەی ئەم "خزمەتی شت‌و مەك ناکەن، بەڵکو شت‌و مەك خزمەتی ئەوان دەکا" هەموو کەس ڕۆژی چوار سەعات ئیش دەکاو ماوە بە"خەڵکی دەروون پیس‌و مشەخۆر نادرێ". دانیشتوانی ئەو شارە لەچێشتخانەدا پێکەوە نان دەخۆن‌و پێکەوەدەژین‌و دەوڵەتیش ئەرکی پەروەردەو فێرکردنی منالآن دەگرێتە ئەستۆ.

هەر لەسەردەمی ڕێنیسانسدا چەند کەسێکی دی، هەمان ڕێبازیان گرت‌و بەم یان بەو شێوە بیروڕایەکانی "مۆر"و "کامپانێلا"یان دووپات دەکردەوە، لەوانە "سیرانۆ"ی فەرەنسایی‌و "تۆماس مۆنزێر"ی ئەڵمانیی‌و ژمارەیەکی تریش. بەلآم "مۆنزیر" یەکەم کەس بوو بیروڕایەکانی لەناو چەوساوەکاندا بلآوکردەوەو لایەنی تیوریی‌و پراکتیکی یەك

---

[*] "تۆماس مۆر" سالی ١٤٧٧ز لەدایکبووەو لەسالی ١٥٠٠ز بەدواوە بووە بەپارێزەر. سالی ١٤٩٩ چاوی بە"ئارازمس"ی هۆلەندایی کەوتووەو بیرو باوەڕی ئەو کاری تێکردووە. سالی ١٥١٦ لەنووسینی "یۆتۆپیا" بووەتەوە. لەسەردەمی "هەنری هەشتەم "دا بووەتە راوێژکاری پاشا. لەئەنجامی ئەو ناکۆکییەی کەوتە نێوان شا "هەنری" و "پاپا"وە شا لەپاپا یاخی دەبێ‌و خۆی بەسەرۆکی کڵێسەی ئینگلیزی دادەنێ "مۆر" بەم هەڵوێستەی "هەنری" قایل نابێ، بۆیە شا بڕیاری کوشتنی دەردەکاو لەبەرەبەیانی "٦"ی تەمموزی سالی ١٥٣٥دا لەسەری دەدرێ بروانە ( يوتوبيا".ترجمة وتقديم د. انجيل بطرس سمعان . دار المعارف بمصر ١٩٧٤. 
- وەرگێڕ

[١٧] "کامپانیلا" لەزۆر بۆچونیدا لەسنوری فەلسەفەی ڕۆژگاری ڕێنیسانس تێپەڕندا. بۆ زیاتر تێگەیشتن بروانە :

E.Garin, Italian Humanism. Philosophy and. Civic Life in the Renaissaance. Oxford. 1965.P.p 215-220.

خستو بوو بەیەکێك لەسەرکردە ناودارەکانی جەنگی بەناوبانگی جووتیارانی ئەڵمانیا لەساڵانی ١٥٢٤–١٥٢٥دا.

بیروڕای سۆسیال ئایدیالیستیەکان لەبریتی ئەوە پشت بەزەمینەی واقیع ببەستێ لەجیهانێکی خەیاڵاوییدا دەخولایەوە. "تۆماس مۆر"یش هەروا لەخۆوە کتێبە بەناوبانگەکەی ناونانێ "یۆتۆپیا" کەبەزمانی لاتینی مانای "شوێنێکی نەبوو" دەگەیەنێ. جا لەگەڵ ئەوەیشدا کەبیروڕای ئەمانە شوێن پەنجەیان بەڕێبازەکانی دوایی سۆشیالیزمەوە دیارەو کەمو زۆر کاریان تێکردوون، بەڵام لەچوارچێوە تەسکەکەی خۆیدا گیری خواردو نەیتوانی لەسەردەمی ڕێنیسانسدا کاری خۆی بکا. بەتایبەتی ئەگەر لەتەك ئەو بەرهەمە زۆرو جۆربەجۆرانەی نیگارکێش و پەیکەرتاشەکاندا بەراورد بکرێن کە بەئەندازەیەکی دیار بڵاوبوونەوەو پەرەیان سەند.

## نیگارکێش و پەیکەرتاشانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس

نیگارکێشان و پەیکەرتاشین لە ڕەوتی گەشەکردنی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا ڕەگو ریشەیەکی قوڵیان هەیە. یەکێك لە خاسیەتەکانی ئەم دوو هونەرە ئەوەیە، گەر بێتو باروبروفێکی باشیان بۆ برەخسێ –لە چاو هونەرەکانی تردا– زووتر نەشونما دەکەن. سەردەمی ڕێنیسانس تەواوی ئەو هەلو مەرجانەی بۆ ئەم دوو هونەرە رەخساندو بەرادەیەك کۆتو پێوەندیان پچراند، هیچ لایەنێکی دیکەی زانستی مرۆڤایەتی نەیتوانی شان لەشانیان بدا. لەو سەردەمەدا، دەبوو هونەر ئەو کۆسپە گەلەبارە تەخت بکا کە ڕێگای لەداهێنان دەگرتو دەیخستە ناو چوارچێوەیەکی تێجگار تەنگەبەرەوەو ئادەمیزادی بەجۆرێك ئیفلیج دەکرد نەتوانێ هەست بەجوانیی سروشت بکا. تابلۆکانی سەدەی ناوەراست نەك هەر تاریكو ڕەشبین بوون بەڵکو "ر.م.سکۆب" وتەنی "دەروونی ئادەمیزاد قیزی لێیان دەهاتەوە". لەبەرئەوە دەبوو هونەرمەندە تازەکان ڕێگەیەکی سەخت بگرنە بەر تاکو ئەو ئادەمیزادەی "هونەری مەسیحی بە

بچوك‌و ملكەچی دادەنا" بكەنە "بوونەوەرێكی گەورەو سەربەرز"ی ئەوتۆ[68] نەك زەمین "ئاسمانیش داگیر بكا"[69] ترازیدیای عیسا لەوەوە كە بەتارماییەكی ترسناك نیشان دەدرا، لە پێناوی بیروباوەڕدا بكرێتە دەرس‌و پەندی ژیان.

بەهۆی پەرەموچی كەڵە هونەرمەندانی سەردەمی ڕێنیسانسەوە مردنی عیسای چوارمێخە كێشراو بەرگێكی نوێ‌و نەمری بەبەردا هەڵكشا كە لەژێریدا ئازارو ئەشكەنجەكانی حەشار دەدرێن. عیسا كە "بەداردا دەكرێ لەهەرەتی لاویدایە"و بە منداڵیی ساویلكەیەو بەچەشنی هەر منداڵێكی تر وەك پەپولە بەدەورو خولی "مریەمی دایكیدا" دەسوڕێتەوەو پێوەندیی ڕاستەقینەی هەموو دایك‌و فرزەندێكمان نیشان دەدا.

زۆر هۆی تریش هەبون وایان كرد هونەری سەردەمی ڕێنیسانس بەو خێراییە گەشە بكەن. دەتوانین بڵێین هەموو گەلانی ئەوروپا بەچین‌و توێژە كۆمەڵایەتییە جیاجیاكانیانەوە بەشدارییان لەدەوڵەمەند كردنی ئەم لایەنە گرنگەی ژیانی رۆشنبیریدا كرد. باری ژیانی خەڵكە هەژارو نەداراكان لەدۆزەخی چەوساندنەوەدا، داهێنانی سادەو لەهەمان كاتدا بەهێز لەبواری فۆلكلۆرو كاری پیشەییدا؛ سەرپاكی ئەمانە بوونە سەرچاوەی ئیلهامی هونەرمەندان.

هەرچەندە ژمارەیەكی زۆری ئەو هونەرمەندانە سەر بەتوێژە كۆمەڵایەتییە هەژارەكان بوون‌و پاشان مەوقیعی چینایەتییان پێ‌بەپێی گۆڕانی كۆمەڵ گۆڕدرا، بەڵام هەموو ئەو پەیوەندیانەیان دەپچڕاند كە بە رابوردووی خۆیانەوە دەیان بەستنەوە. تەوژمی بەتینی یاساو نەریتی كۆمەڵایەتی نوێ بەجۆرێك كاریان لەخاوەن سامان‌و دەوڵەمەندان كرد. دەیان ویست هەتا لەژیان دان بەشان‌و شكۆیاندا هەڵبدرێ بۆ ئەم مەبەستە نیگاركێش‌و پەیكەرتاشەكانی ئەو سەردەمە بەڕوونیی خاسییەتەكانی ڕێنیسانسیان بەرجەستە دەكردو دەتوانین بەهۆی ژیان‌و بەرهەمی هەر سێ كەڵە هونەرمەندەكەی ئەو قۆناغە

---

(68) M.L. Bush , Op. Cit. , P. 153

(69) R. Palmer and J. Colton, Op. Cit. , P. 52

"لیۆناردۆ دافینشی"و "میکائیل ئەنجیلۆ"و "رۆفائیل سانتی"یەوە کەلە ئیتالیادا سەریان هەڵدا، پایەی بەهرەمەندییان لەم مەیدانەدا بخەینە پێش چاو.

## لیۆناردۆ دافینشی ١٤٥٢-١٥١٩ ز:

کەم رێکەوتوەمێژووی مرۆڤایەتی بلیمەتێکی وەك "دافینشی"ی بەخۆیەوە دیبێ کەلە هەموومەیدانەکانی هونەرو زانستو ئەدەبو فیکردا سوارچاك بوبێو بەلێهاتوویی بەتواناترین بلیمەتو داهێنەری سەردەمی رێنیسانس لەقەڵەم بدرێ[*].

"لیۆناردۆ" لەشاری "فینشی"ی سەر بە "فلۆرەنسا" لەدایك بووەو هەر لەوێش بەهرەمەندیی دەرکەوتوەو کەڵکەڵەی داهێنانی کەوتۆتە سەر. "لیۆناردۆ دافینشی" لەتێڕوانینێکی نیمچە فەلسەفییەوە باوەڕی وابووە کەپەیوەندییەکی لەپچڕان نەهاتوو هونەرو زانست بەیەکترەوە دەبەستێتەوەو هەتا مردیش لەم رایەی پاشگەز نەبووەوە. ئەو لای وابوو دەبێ داهێنان لەبواری نیگارکیشاندا بەوردیی پشت بەشێوەی گونجاو ببەستێ، دیارە ئەمەیش پێویستی بەوە هەیە –سووریش بوو لەسەر ئەم رایەی– نیگارکێش شارەزاییەکی تەواوی لەماتماتیکدا هەبێ. ئەگەر نیگارکێشێکی رەسەن بیەوێ بەوردیی تەعبیرلەجەستەی ئادەمیزاد بکا، دەبێ ئاگاداری وردترین ئەندامی لەشی مرۆڤ بێ. کاتێکیش دەتوانێ ئەم کارە ئەنجام بدا لەئەناتۆمیا تێگەیشتبێ، بۆیە خۆیشی بایەخێکی تایبەتی بەم زانیارییە دەدا. پاشان "لیۆناردۆ" پەیوەندی نێوان زانستو نیگارکێشانی بەهۆی سروشتەوە دەست نیشان کرد.

هەمیشەیش پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەسروشت بۆتەی گشت زانیارییەکانەو لەهەمان کاتیشدا مەیدانی سەرەکی داهێنانی نیگارکێشانەو داوای لەهونەرمەندان دەکرد لەپێناوی داهێنانێکی هونەریی رەسەندا زانستی راستەقینە فێربن.

---

* سەیر ئەوەیە قوتابخانە سایکۆلۆژییەکەی "سیگموند فرۆید" هۆی بلیمەتی ئەو پیاوە مەزنە دەباتەوە سەر گرێی کەمو کوورپی. "فرۆید" لەو لێکۆڵینەوەیەیدا کە بۆ"دافینشی"ی تەرخان کردووە رای وایە ئەو هونەرمەندە "هۆمۆ سیکسی" "الشذوذ الجنسي"هەبووە!! ـ وەرگێڕـ

لەمەوە "لیۆناردۆ" جگەلەوەی نیگارکێشـێکی سـەرکەوتوی لێدەرچـوو، بنچینەیـەکی تیوریشـی بۆهونـەری نیگارکێشـان دامـەزراند. پـاش مردنیشـی تێبینییـە گرنگـەکانی لەدووتوێی کتێبێکدا چاپکران. بـەلای "لیۆنـاردۆ دافینشـی"یـەوە، پایـەی نیگارکێشـان لەهـەموو هونـەرەکانی تـر بـالآترە، چونکە دەتوانـێ "هـەموو ئـەو شـتانە دەربـبڕێ کەدەبینرێن" بۆیـە بەزانیارییـەکی سـەرەخۆیش نـاوی دەبـا. بـێ گومـان خۆیشـی لـەو مەیدانەدا ئەوەندە بەدەسەلآتو لێـهاتوو بـوو گەیشـتە پلـەی کـەمالّو ئـەو چـەند تـابلۆ کەمـەی لەپاشـی بـەجێمان، تائێسـتا بەدەگمـەنترین بەرهــەمی هونـەری نیگارکێشـان دادەنرێن. ناوبراو لەناوەڕۆکی ئەو تابلۆیانەدا بەگەشـبینییەوە سـامانی لـەبن نـەهاتووی سروشتو ژیانی دەردەبڕیو لە هیچ بەرهەمێکیدا دەست بەرداری ئەم تێروانینەی نابـێو تەنانەت لەو تابلۆیانەشیدا کە بۆ کارەساتی ئاینیو پیـاوانی کلّێسـەی تـەرخان کـرووە هەست بەو ترسو بیمە ناکرێ کـە لەبەرهـەمی زۆر نیگارکێشـی هاوچـەرخیدا دەبیـنرێن "لیۆناردۆ" لە تابلۆی "مەریـەم و گـولّ"دا، داهێنەرانـە بـەختیاریی ئـافرەتێك بەرجەسـتە دەکا کـە لەگـەلّ کۆرپەکـەیدا یـاری دەکـا. لـەتابلۆ بەناوبانگەکـەی "مۆنــالیزا" یـاخود "جۆکـەندە" دا کـە سـالّی ١٥٠٢[٧٠] نەخشــاندوویەتی بــەهۆی نیگــاو زەردەخەنــە تەمارییەکـەی ئـەو ئافرەتــەوە، مەودایـەکی هونـەرییو لەهــەمان کاتیشــدا تایبــەتیی بەجوانییە بێ وێنەکەی دەبەخشێ. بەرادەیـەك زەردەخەنەکـەی "مۆنـالیزا" ئەوسـایشو ئێستایش مایەی مشتو مڕو لێکۆلینەوەی چەندین نیگارکێشو خەلّکی پسپۆڕە.

بەو جـۆرە دەبینـین سـەرچاوەی داهێنانـەکانی "لیۆنــاردۆ" دەچێتــەوە سـەر شارەزاییەکی قوولّو شۆڕبوونەوەی بەناخی دەروونی کەسانی ناو تابلۆکانیداو چۆنیەتی هـەلّبژاردنی رەنـگو گونجـاندنی لەتـەك نـاوەڕۆکی بەرهەمەکـەدا. ئەمـە جگـە لـەو بزووتنەوەیەی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن لەوێنەکانیدا هەستی پێ دەکرێ. هـەموو ئـەم

---

[٧٠] تابلۆی "مۆنالیزا" ئەگەر لەهەموو ئەو شـتانەی لـە مۆزەخانـەی "لۆڤـەردا"دا، دانـراون بـەنرختر نەبێ، ئەوا یەکێکە لەوانە.

خاسییەتانەی لەبەرهەمەکانی "لیۆناردۆ"دا دەرکەوتن، کردیانە پێشەوای قۆناغی نوێی پەرەسەندنی هونەر لە ئیتالیاو دواییش لە ئەوروپا دا. سەبارەت بەم هۆیانە، ناتوانرێ "لیۆناردۆ"ی زاناو "لیۆناردۆ"ی نیگارکێش لەیەکتر جیابکرێتەوە. ناشێ نەئەمیان و نەئەویان لە "لیۆناردۆ"ی مرۆڤ دابڕ بکرێن. "لیۆناردۆ" ئادەمیزادێکی کامڵو بلیمەتێکی هەڵکەوتووی ئەوتۆ بوو، هەموو لقەکانی زانستی تێدا ئاوێتەی یەکتر دەبوون و مێزوپێژێکی تەواویان بەبەرهەمە جۆربەجۆرو ناوازەکانی دەدا. ئەو پیاوە زانایەکی ئەوەندە بلیمەت بوو بەسەرنجو تێبینییە وردەکانی چەند مەڵۆیەکی بەپیتی خستە سەر شارای زانستی مرۆڤایەتی. لە ماتماتیکو روەکناسیو میکانیکو فیزیکو ئەستێرەناسیو جیۆلۆجیاو ئەنەتۆمیاو فیسیۆلۆجیای ئادەمیزادو ئاژەڵو هونەرە سەربازییەکانی دەکۆڵییەوە. بۆ گەیشتن بەمەبەست، جگە لە بۆچوونەکانی خۆی پەنای دەبردە بەر تاقیکردنەوەو لێکۆلینەوەی زانایانی پێشوو. کەلە میکانیکی دەکۆڵیەوە پشتی بەدەسکەوتی ئەوانەی پێش خۆی دەبەست. خۆیشی وەک ئەندازیارێکی خاوەن تاقیکردنەوە شتی نوێی دەخستە سەر بۆچوونەکانی ئەوان. "لیۆناردۆ" بایەخێکی زۆری بە هەندێ مەسەلەی گرنگ دەدا. وەک کاردانەوە "رد الفعل"و هاوکێشەیی "التوازن"و بەربوونەوەی تەنەکان "سقوط الأجسام"و شێوەی بەرگریی تەنە جۆربەجۆرەکان "مقاومة الأجسام المختلفة"و زۆری تریش. لەبەر رۆشنایی تاقیکردنەوەکانی چەند پرۆژەیەکی بۆ شارێکی نمونەیی داڕشت چەند نەخشەو پلانێکی نوێی بۆ هونەری بیناسازیی ئامادەکردو دەیوست پەرە بە هونەری بیناسازی گومەز بدا. یەکەم کەسیش بوو هەوڵیدا ئامێرێك دروست بکا توانای فڕینی هەبێ. بۆ ئەم مەبەستە پەنای بردە بەر تاقیکردنەوەو لەشێوەی فڕینی باڵندە ورد دەبووەوە، ئەنجامیش نزیکەی سەد تیوری ئەم بارەیەوە داڕشتو توانی چەند ئامێرێك دروست بکا بەهۆی دەست یاخود بەهۆی سپرینگەوە لە زەوی بەرز ببنەوەو دوایی گەیشتە ئەو باوەڕەی -ئەمە بۆ ئەو کاتە شتێکی ئێجگار گرنگ بوو- کە ئامێرێك توانای فڕینی هەبێ دەبێ لەناو خۆیدا

ماشینێکی سەربەخۆ بیجووڵێنێ. دوای مردنیشی لەناو دەستنووسەکانیدا چەند وێنەیەکی پەرەشووت و فڕۆکەی ستوونی -هیلیۆکۆپتەر- دۆزراوەتەوەو گەرەکی بوو بەهۆی پەرەشووتەوە یارمەتی ئادەمیزاد بدا تاوەکو لەشوێنە بەرزەکانەوە بەهێواشیی خۆی بهاوێتە سەر زەوی.

جگە لەمانە "لیۆناردۆ" چەندین نەخشەی بۆ ئامێرە تازەکان دانا، لەوانە ئامێری چنین و شیکردنەوەی لۆکەو مشت و مالکردنی شووشەو دارتاشیی و هەڵکەندنی جۆگەو تواندنەوەی میتاڵ و زۆری تریش. ئەو یەکەمین کەسە ویستی هێزی رووناکیی دیاری بکاو پاشان لەسەر بنچینەی تاقیکردنەوە بیبەستێتەوە بە مەودای شوێن -البعد المکاني-ەوە. دەتوانرێ ئەو بەراوردەی "لیۆناردۆ" کردی سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی شەپۆلەکانی سەر رووی ئاو لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەنگ و رووناکیدا بەسەرەتای تیوری "شەپۆلی تیشک- التموج الضوئي" دابنرێ.

"لیۆناردۆ" بە درێژایی تەمەنی وەك نیگارکێش و زانایەك بایەخی بە "ئەنەتۆمیا" دەداو هەر بەوەوە نەوەستا نەشتەرکاریی لەجەستەی ئادەمیزاددا بکا، بەڵکو لاشەی ئاژەڵی جۆربەجۆریشی یەکالا کردەوە. ئەو دەستنووس و وێنە ئەنەتۆمیانەی دوای مردنی بۆی بەجێهێشتووین، نەك هەر لەبەرهەمەکانی سەردەمی خۆی تێپەڕاندووە بگرە لەوانەی سەدەکانی دوای خۆیشی کامڵترن. ئەم زانا هونەرمەندە گەیشتە هەندێ ئەنجامی زۆر گرنگ ئەوەبوو سەریبۆقی لەلاشەکەی جیاکردەوەو دڵی دەرهێنا. یەکەم کەسیشە ژمارەی راستەقینەی بڕبڕەکانی کلێنچکە -العصعص-ی ئادەمیزادی دۆزیەوە. رێی تێدەچێ بیری لەوە کردبێتەوە چۆن ئادەمیزاد لەشێوە سەرەتاییەکەیەوە نەش ونمای کردووە، چونکە ئەو بەراوردکارییەی لەنێوان ئادەمیزادو ئاژەڵی نزیك بەئادەمیزاددا کردوویەتی، یەکێکە لە پرۆژە زانستییەکانی.

لەمەیدانی ئەستێرەناسیدا، بەهەموو توانایەوە دژی ئەو بیروڕایانە دەوەستا کە زەوییان بەچەقی گەردوون دادەنا. یەکەمین کەسە سەلماندی رەنگی راستەقینەی مانگ

خۆڵەمیشییە. هەروەها لەو باوەڕەدا بوو کە دوور نییە وشکاییو دەریاکان بە درێژایی مێژوو گۆڕانیان بەسەردا هاتبێ. بەڵگەیشی بۆ ئەم رایەی ئەوە بوو کە پاشماوەی ئاژەڵی دەریایی لەو شوێنانەدا دەدۆزرێنەوە کە ئێستا زۆر لەکەنار دەریاکانەوە دوورن.
شایانی باسە "لیۆناردۆ" بەشدارییەکی گەورەیشی لەگەشە پێکردنی ئامرازەکانی جەنگدا کرد. لەناودەستنووس و نەخشە لەپاش بەجێماوەکانیدا هەندێ وێنە دۆزراونەتەوە زۆر لە تانکو زرێپۆش دەچن هەوڵێکی زۆریشی دا، پەرە بەتۆپو تەقەمەنی ئەو سەردەمە بدلو چەند نەخشەیەکیشی بۆ جلو بەرگی ژێر ئاوو ئەو چەشنە پردانە کێشا کەلەوەختی شەڕو بەپێی پێویست دادەمەزرێنرێن. سەرباکی ئەم هەوڵو کۆششەی "لیۆناردۆ" لەپێناوی ئەوەدا بوو سەربەخۆیی وڵاتەکەی بپارێزێ. ئەوەتا لە یاداشتەکانیدا دەڵێ:
"..من ئامرازی بەرگریکردنو هێرش بردن دروست دەکەم تاوەکو بەهۆیانەوە بەرەنگاری ئەو زۆردارانە ببنەوە کەچاویان تێمان بڕیوە. بۆیە دروستیان دەکەم تاوەکو پارێزگاریی ئەو خەڵاتە گەورەیەیان بکەم کە سروشت پێی بەخشیوین، ئەویش سەربەستییە.."[71]
"لیۆناردۆ" بەکوڵو دڵ پاڵپشتی ئاشتیی دەگرت‌و[72] وەك زانایەك دژی شەڕ دەستاو لای ولبوو ئەوپەڕی شێتییە، دیارە بەم قسانەیش تەواو نیشانی پێکاوە، چونکە لەو کاتەدا نەیدەزانی چەند بەرهەمێکی دانسقەی دەبنە قوربانی شەڕەکانی "ناپلیۆن "و "هیتلەر"و تەنانەت ئەو شەڕانەیش کە لەسەردەمی خۆیدا روویان دا ئەوەبوو پادشای "میلان " رووی لێنا پەیکەرێك بۆ "سفۆرزای" گەورەی بنەماڵەکەیان دابڕێژێ، "لیۆناردۆ" بەدڵ و گیان بەدەنگییەوە چوو. هەر لەو نەخشانەدا کە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکە ئامادەی

---

[71] لە کتێبی "عبقرية ليوناردو دافنشي في الهندسة"ی دکتۆر جلال شوقي وەرگیراوە . چاپی قاهیرە ١٩٦٤ ل٢٧٣.

[72] لەسەر پێشنیازی ئەنجومەنی ئاسایشی جیهان، لەمانگی نیسانی ١٩٥٢دا، چەند دەسگایەکی رۆشنبیریی جیهانیی بەبۆنەی تێپەڕبوونی پێنج سەد ساڵ بەسەر لەدایك بوونی هونەرمەندی داهێنەرو زانای گەورە "لیۆناردۆ دافنشی"یەوە ئاهەنگیان گێڕا.

کردبووە، دەردەکەوێ کە تەنها بەرزیی ولاخەکەی حەوت مەتر زیاتر بووە. "لیۆناردۆ" ماکێتی پەیکەرەکەی لە قوڕ دروست دەکا تا لە دواییدا بکرێتە قالبو بەبرۆنز دابڕێژێ. ئەو سەلیقەی هونەریو وردەکارییەی لەو نمونەیەدا بەکاری هێنابوون، وایان کرد تا ئەو کاتەی دادەڕێژرێ لە گۆرەپانێکی شاردا دابنرێو خەڵکیی دەستە دەستە بچن تەماشای بکەن. بەڵام ئەو هێرشەی فەرەنسا کردییە سەر "میلان "و پێویستی ولات بە برۆنز، ماوەی نەدا پرۆژەکەی بەئەنجام بگەیەنێ. لەوەیش سەیرتر ئەوەبوو، کاتێک سەربازە فەرەنساییەکان گەیشتنە ئەو شارە نموونەی پەیکەرەکەی "لیۆناردۆ"یان کردە نیشانەو مەشقیان لەسەر دەکرد(۷۳) بەو چەشنە کارێکی هونەریی زۆر مەزنیان لەپێش چاوی خاوەنەکەی لەکەڵک خستو ئەویش لەئاست ئەم کارەساتەدا خۆی پێنەگیراو چووە "ڤێنسیا"و لەوێشەوە گواستییەوە بۆ "فلۆرەنسا".

"لیۆناردۆ داڤنشی" هەموو تێبینیو بۆچوونە زانستییەکانی بەزمانی نەتەوەکەی دەنووسییەوەو بەتوندیی وەك ڕۆڵەیەکی ئەمەکداری گەلو سەردەمەکەی دژی زمانی لاتینی بوو. لەم بارەیەوە بەچەند وتەیەکی بەنرخ رای خۆی دەردەبڕێو دەڵێ: ".. لەناو زمانەکەی خۆمدا ئەوەندەم وشە هەیە زۆر لەوە زیاترن تەعبیریان لەشتەکان پێبکەمو ناوەرۆکی بیروڕاکانمیان پێ دەربڕم .." .

"لیۆناردۆ" خوویەکی لەگەڵدا بوو، هەمیشە دەفتەرێکی تایبەتی لە باخەڵدا هەڵدەگرتو تێبینییەکانی تێدا تۆمار دەکردنو پاشان بە پێی بابەت رێکی دەخستنو بە پێچەوانەشەوە دەینووسینەوە، واتە لە راستەوە بۆ چەپ. سەیر ئەوەیە دەیتوانی بە ئاسانیی بەهەردوو دەست بنووسێو نیگاربکێشی. مایەی داخە تائێستا تەواوی نووسینەکانی بەدەستمان نەگەیشتوون، ئەوەیشی کە لەبەردەست دایە نزیکەی حەوت هەزار لاپەڕەیەکی جیاجیای دەستنووسەکانێتیو لەمۆزەخانەکانی ئەورووپا "لەندەنو

---

(۷۳) M.L. Bush , Op. Cit. , P. 163

پاریس‌و میلان"و هەندێکی تردا، پارێزراون‌و بەهۆیانەوە دەتوانرێ بیروڕایەکی ئاشکرا سەبارەت بەمەزنیی‌و گەورەیی ئەم زانا هونەرمەندە پێك بهێنرێ.

ئەوەی شایانی باسە لەناو یادداشتەکانیدا شتی وایان تێدایە ئەوە دەگەیەنن "لیۆناردۆ" ئاگاداری بەرهەمی زانا موسڵمانەکان بوو بێ، لەوانە: "رازی"و "ئیبن سینا". لەنیوەی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستکرا بە چاپکردنی نووسینەکانی "لیۆناردۆ"و لەسییەکانی ئەم سەدەیەدا کۆتاییان هات. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ، بۆچی ئەو کەڵە پیاوە نەیتوانیوە بەئەندازەیەکی زۆر کار لەگەشەکردنی زانست بکاو بەوخێرلییەی کە پێویست بوو کار لەو داهێنانە زانستییانە بکا کەزانایانی سەدەکانی دوای ئەو پێی گەیشتن، لەکاتێکا "لیۆناردۆ" زۆر لەپێش ئەوانەوە دەستی بۆ درێژ کردبوون‌و دۆزیبوونییەوە.

بەنموونە: "لیۆناردۆ" سەد ساڵێك بەر لە "گالیلۆ" چەند دیاردەیەکی لەبارەی هەڵهاتن‌و ئاوابوونی مانگەوە دۆزیبوەوە. ئەو کاتەیش کە ئەمریکییەکان یەکەم "تایپ رایتەر"یان داهێنا[٧٤] "لیۆناردۆ" ٣٥٠ ساڵ بوو نەخشەکەی کێشابوو.

راستییەکەی کەس ناتوانێ داهێنانەکانی ئەم ئادەمیزادە مەزنە لەمەیدانی زانست‌و هونەردا سەرژمێر بکا. پێویستە ئەو حەقیقەتەش فەرامۆش نەکرێ کە "لیۆناردۆ" هلوچەرخی سەردەمێك بوو، وڵاتەکەی لەرووی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتییەوە بەرەو هەڵدێر هەنگاوی دەنا. بەرادەیەك ناچاربوو بیست ساڵی دوایی تەمەنی کۆڵ بەکۆڵ بگەڕێ تا شوێنێك بدۆزێتەوەو تێیدا ئارام بگرێ‌و پەرە بەداهێنانەکانی بدا. بێگومان ئەم بارە دەروونییە بەتەواوی کاری کردە سەر بەرهەمەکانی دوایی "لیۆناردۆ"و بەئاشکرا پێوەیان دیارە. دواجاریش لەسەر داخوازیی "فرانسوای یەکەم"ی پاشای فەرەنسا چووە پاریس‌و لەدەریاری ئەودا رێزێکی زۆری لێنراو کۆشکێکی تایبەتی بەتەنیشت کۆشکی پاشایەتییەوە بۆتەرخان کراو شەخسی "فرانسوا" بەردەوام

---

[٧٤] یەکەم تایپ رایتەر "آلة الطابعة" ساڵی ١٨٦٧ دروست کرا.

هامشۆی دەکردو هەموو جارێك ماوەی چەند سەعاتێکی بەگفتوگۆ کردن لەگەڵدا بەسەر دەبرد. بەڵام جێی داخە ئەم بەهەشتە زۆری نەخایاندو پاش دووساڵ ئەم هونەرمەندە بلیمەتەی سەری نیشتمانەکەی گەیاندە کەشکەڵانی ئاسمان بەئاوارەیی سەری نایەوە. دوا پیاوەتیشی ئەوە بوو هەرچی هەبوو بەو خزمەتکارەی بەخشیی کەبەدرێژایی تەمەنی وەفادارو خزمەتگوزاری بوو.

## میکائیل ئەنجیلۆ( ١٤٧٥-١٥٦٤ )

نیگارکێش و پەیکەرتاش و ئەندازیارو شاعیری ئیتالیایی ناسراوە. لە "فلۆرەنسە" پێگەیشتووەو هەرلەوێ خوێندوویەتی و فێری نیگارکێشان و پەیکەر تاشین بووە. "ئەنجیلۆ" نزیکەی ٩٠ساڵێك ژیا. واتە ژیانی دەکەوێتە نێوان ساڵەکانی دوایی سەدەی پازدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەهەمەوە. بەو پێیە دەبێتە هاوچەرخی گرنگترین قۆناغەکانی شۆرشی رۆشنبیریی نوێی ئەورووپا کەولاتەکەی خۆی مەڵبەندی یەکەمی تیشکە پرشنگدارەکانی بوو. هەر لەسەرەتاوە بایەخێکی زۆری خۆی واتەنی "بەلەش و لارە جوانەکەی ئادەمیزاد" دەدا. وێنەی ئادەمیزادی بە رووتی دەکێشاو بەرجەستەی دەکرد. بەلەش و لارەکەی هێزو وزەو پێداگرتنی ئادەمیزادی دەردەبڕی و لەدەم و چاوو روخساریدا شانازیی بەخۆوەکردن و سەربەرزیی مرۆڤایەتییانەی دەنەخشاند. "ئەنجیلۆ" بەم شێوازی دەربڕینە دەیویست لەیاسا ئیستاتیکییەکانی سەدەی ناوەراست و بیروڕای کڵێسە دەرباز بێ و پێ لەسەر ژیانی ئەم دونیایە دابگرێ و شانازیی بەبلیمەتەکانی پێشوو، بەتایبەتی پەیکەر تاشەکانەوە بکا، کەلەسەردەمی ئەودا بۆ یەکەمجار بەرهەمەکانی دۆزرانەوەو خەڵکی بەپەیکەری "ئەپۆلۆ" و "ئەفرۆدێت" و گەلێکی تریش ئاشنا بوون. بەو چەشنە "ئەنجیلۆ" سنووری تێروانینی کڵێسەو بیروڕا خەیاڵاویی و رەشبینەکانی شکاند کەدەبوو هونەرمەند پەیرەویان بکاو لەو روانگەوە شێوەو سیمای پیاوانی مێژوو دەربڕێ. پەیکەرە مەزنەکەی "داود" کە نزیکەی

سێ ساڵ پێوەی خەریك بوو، لەبەردی مەڕمەڕ هەڵی کەندو بەرزاییەکەی پێنج مەتر دەبێ، هاوارێکە بەڕووی یاسا ئیستاتیکیو فیکرییەکانی سەدەکانی ناوەڕستدا. بۆ دروستکردنی پەیکەرە بەناوبانگەکانی تریش وەك "بەزەیی-الرحمة"و "موسا"و "کۆیلەی پێوەندکراو- العبد المقید"و "کۆیلەیەك لە گیانەڵادا- العبد المحتضر" هەمان ڕێبازی گرتەبەر. بەڵام لەدوو پەیکەرەکەی دواییو هەندێکی تردا بەشێوەیەکی ئەفسانەیی پیاوەتی ئەو ئادەمیزادە سادەیە دەردەبڕێ کەسوورە لەسەر ڕزگاربوونو سەرفرازیی. "مووسا"کەیشی هێند لە ئادەمیزادی زیندووی دەکرد خۆی پێی سەرسام بوو، کاتێکیش لەداتاشینی بووەوە پڕپەدەم هاواری لێکرد: دەی بدوێ! !. شێوازی دەربڕینی "ئەنجیلۆ"و بیرو ڕایەکانی نەدەچوونە دڵی دەسەڵاتدارانی وڵاتەکەیەوە بەتایبەتی چونکە بەتوندی پشتگیری ئەو ڕێبازە سیاسییەی دەکرد کەسیستمی جەمهوری دیموکراسی لاپەسەندبوو. لەوکاتەیشدا خەڵکی سەر بەو ڕێبازە دووچاری ململانەیەکی توندوتیژ هاتبوون. کاتێك ڕژێمی جەمهووری بۆماوەیەکی کەم لە فلۆرەنسادا سەقامگیربوو، "ئەنجیلۆ" بەدڵو گیان پشتگیری کرد. کاتێکیش لەلایەن هێزەکانی پاپاو لەشکری بێگانەوە ئابلووقە درا، شانبەشانی دانیشتووانی فلۆرەنسا ماوەی یازدە مانگی ڕەبەق وەك سەرەك ئەندازیاران ئەرکی پاراستنی شووراکانی شاری گرتە ئەستۆ. ساڵی ١٥٣٠ کە فلۆرەنسا خۆیدا بەدەستەوە "ئەنجیلۆ" ناچار بوو لەبەرچاو ون ببێو خۆی بشارێتەوەو هەتا گفتی بەپاپا نەدا چەند کارێکی هونەریی بۆ ئەنجام بدا، پاپا دەستی لێهەڵنەگرتو لێی خۆش نەبوو بەڵام بەم خۆبەدەستەوەدانەیشی ماوەی کڵێسەی نەدا دەست بەسەر هەستی قووڵو ڕەسەنیدا بگرێ ئەوەتا لە شیعرێکیدا کەوەڵامی "جیۆڤانێن سترۆتسی" پێدەداتەوە ئەم هەستە بەکوڵەی لە قاڵبێکی هونەری قەشەنگدا دەردەبڕێ.

"ئەنجیلۆ" لە پەیکەری "شەو"دا کیژۆڵەیەکی نازدارمان نیشان دەدا، بەئەندازەیەك نوقمی خەو بووە، ئاگای لەدوونیا نەماوە. "سترۆتسی" ئەوەندە پەیکەرەکە لەبەر دڵی

جوان دەبێ، لێهاتوویی "ئەنجیلۆ" کاریتێدەکا، بەشیعرێك هەستی خۆی دەردەبڕێو دەڵێ: "گەرێنو ئەو کیژە بەئاگابێتەوە دەکەوێتە قسەکردن" !! کەچی ئەو "ئەنجیلۆ"یەی هەموو گیانی بزووتنو جۆش و خرۆش بوو، بەشعرێك لە ژێر ناونیشانی "بەختیاریی لەنوستندایە" وەڵامی دەداتەوەو لای وایە، بەختیاریی گەورەتر ئەوەیە "ببیتە بەرد" چونکە "لەم سەدە تاوانبارو شەرمەزارەدا" "مردنو بێ ئاگایی چارەنووسێکن خۆزگەیان پێدەخوازرێ"، بۆیە بەزمانی کیژۆڵە نوستووەکەی نێو شەوەزەنگی ئەنگوستە چاوەوە دەپارێتەوە "لەو خەوە قووڵە بەئاگای نەهێننەوە"[٧٥]

وەنەبێ ئەم هونەرمەندە بلیمەتە بیر روناکە لەزەبروزەنگی کۆنەپەرستانی سەردەمەکەی ڕزگاری بووبێ، نەء. سیخوڕەکانی ڕژێم بەردەوام بەشوێنییەوە بوون. لەولایشەوە پاپا فەرمانیدا بەنیگارکێشێك "دەستکاریی" هەندێ دیمەنی رووتی تابلۆکانی بکا. ئەنجامیش کۆمەڵانی خەڵك ئەو هونەرمەندە بەکرێگیراوەی ڕیسوا کردو هونەرمەندانیش نەفرەتیان لەچارەی کرد. لەم بارو دۆخەدا "ئەنجیلۆ" ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر هەستی بەتەنهایی دەکردو وردە وردە لەنیگارکێشانو پەیکەرتاشین دوورکەوتەوەو سی ساڵی دوایی تەمەنی بۆ هونەری بیناکاریو شیعر تەرخان کردو بەقوڵیی تراژیدیای ژیانی دەردەبڕی. ئەو کە بەشیعر لەخۆشەویستیی دەدوا دەیویست تەعبیر لەپەیوەندی نێوان ئادەمیزادو جوانی سروشت بکات. هەروەها وەسفی تەنیایی هونەرمەندی دەکرد کەچۆن دەورووبەرەکەی دوژمنایەتی دەکات. ئەمە جگە لەوەی چەندین بابەتی دیکەی کردە هەوێنی شیعرەکانیو لەهەمویاندا دڵڕەنجاویی یەکێك لە هومانیستەکان دەردەخا کەلەبەردەم تەوژمی جەورو ستەمدا دەستە پاچە راوەستاوەو بەچەشنی هۆمانیستەکانی تر لەبەر ڕۆشنایی ئەو بیرو ڕاو ئایدیایەی باوەڕی پێی هێنابوو ماوەی نەدا تۆقاندنو سەرکوتکردن ملی پێ کەچ بکات.

---

[٧٥] بڕوانە: أ.أ. جوبێر. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٧، تێیدا دەقی شیعرەکەی "ستڕۆتسی" و "ئەنجیلۆ" بلاوکراوەتەوە.

## ڕۆفائیل سانتی ١٤٨٣ ١٥٢٠ ز :

نیگارکێش و ئەندازیاری بەناوبانگی ئیتاڵیایی "ڕۆفائیل سانتی" لەشاری "ئۆربینۆ"ی نزیک "فلۆرەنسە" لەدایك بوو. ساڵانی لاوێتیی لەفلۆرەنسەدا بردۆتە سەرو هەر لەوێشدا لەجموجۆڵی هونەرمەندانی پێش خۆی و بەتایبەتی "لیۆناردۆ دافینشی" کۆڵیوەتەوە. هەرچەندە بەهۆی داهێنانەکانیەوە زۆر شتی نوێی خستە سەر کەلەپوری هونەری ئەو شارە، بەڵام بەشی زۆری کارە هونەریەکانی لە "ڕۆما"دا جێبەجێکرد. "ڕۆفائیل" لەبەرهەمەکانیدا جێگایەکی تایبەتی بۆ کەلەپوری مرۆڤایەتی و پێشەوایانی تەرخانکردووە. تەنانەت وێنەی فەیلەسوفەکانی "سوکرات، ئەرستۆ، ئەفلاتون، بەتلیمۆس"و زۆری تریشی کێشاو لەڕوانگەی بیری هۆمانیستانەوە لەناوەرۆکی ئەو تابلۆیانەدا کەبەپێی خواستی پاپا، لەسەر دیوارو بنمیچی ڤاتیکان دروستی کردن پەنجە بۆ مەسەلە جۆر بەجۆرەکانی ژیان درێژ دەکات. "ڕۆفائیل" لەوەیش زیاتر پێی لێ هەڵبڕی، ئەو کەپیاوانی کڵێسەی ڕەسم دەکرد، بەسرووش ڕای دەگەیاند ئەوانە کوتومت دەڵێی سۆفستاییەکانی سەردەمی پێشوون؛ چونکە وەك ئەوان لەشت دەکۆڵنەوەو وەك ئەوانیش مشت و مڕ دەکەن، تەنها جیاوازییان ئەوەیە ئەمان بەرگی قەشەو رەبەنیان لەبەردایەو هیچی تر .

سەبارەت بەوەی لەو سەردەمەدا شمشێری زوڵم و ستەم لەسەر گەردنی زانا ئیتالیاییەکان ڕاگیرا بوو، "ڕۆفائیل" نەیدەتوانی ئەو هەموو بیرڕا مرۆڤایەتییانە دەربڕێ کەلەدەرونیدا پەنگیان خواردبووەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەیش بەپەرۆشەوە بەشداری بزوتنەوەی نیشتیمانی دەکرد، چونکە دروشمە بنچینەییەکانی سەربەستیی بیروڕاو یەکێتی ئیتالیا بوو.

ئەگەرچی "ڕۆفائیل" تەمەنی کورت بوو –بە ٣٧ساڵیی مرد– بەڵام کۆمەڵێك تابلۆی بۆ بەجێهێشتبووین و بەپێچەوانەی بەرهەمەکانی "دافینشی"یەوە، زۆربەیان تا ئێستا

ماون و هۆڵی ناودارترین مۆزەخانەکانی جیهان و دیوارو گومەزەکانی "ڤاتیکان"یان رازاندۆتەوە.

خاسیەتی تابلۆکانی "رۆفائیل" چ لەبەرهەمە سەرەتاییەکانیدا وەك "خەونەکانی سوارچاکێك– أحلام فارس" و چ لەو تابلۆیانەیدا کە مەرجە هونەرییەکانیان تێدا کۆبونەتەوە، ناوبانگیان دەرکردووە، وەك "قوتابخانەی لاتینی–المدرسة اللاتينية"و "مەریەم"و "شێوی خودایی– العشاء الرباني"و زۆری تریش، دەڵێن خاسییەتیان لەوەدایە وردو قووڵ مەبەستەکانی دەردەبڕی.

چەند تابلۆیەکی تریشی هەن دەست رەنگینانە جوانی لەش و لاری ئافرەتی تێیاندا بەرجەستە کردووە. وادیارە "رۆفائیل" لەجوانی بێکۆتایی سروشت تینوویەتی نەشکاوە، بۆیە لەنامەیەکدا دەڵێ: "بۆئەوەی جوانی کیژێك دەربخەین، پێویستە لەچەندین ئافرەتی جوان وردبینەوە. جا لەبەرئەوەی ئافرەتی جوان کەمن و هەڵبژاردنیشیان کارێکی ئاسان نییە، نیگارکێش ناچار دەبێ پەنابباتە بەر بیرو خەیاڵ و بەوێنە دەری ببڕێ"[٧٦]. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ رۆفائیل، هەندێ جار جلەو بۆ خەیاڵی داهێنەرانە شل دەکا تاوەکو مەودایەکی نیستاتێکی قووڵ بەبەرهەمەکانی ببەخشێ. "رۆفائیل سانتی" لەمەیدانی هونەری بیناکاریشدا بەسەلیقەو لێهاتوو بوو. بەر لەوەی کڵێسە ناودارەکەی "پەترۆس" لە "رۆما" تەواو ببێ، ئەم هونەرمەندە کرایە ئەندازیاری لێپرسراوی ئەو پرۆژەیە سەرپاکی ئەو ساختمانانەی لەژێر چاودێریی ئەودا بنیات نران گەواهی بلیمەتیی و دەست رەنگینییەتی لەم مەیدانەدا.

زۆر بلیمەتی تر، لەرۆژگاری رێنیسانسدا دەرکەوتن و لەبواری داهێناندا بەبەرهەمی هونەری و فیکریی هاوبەشییانکرد. لەوانە "کۆتۆ"و "دۆناتیللۆ" و "تیتیان"و گەلێکی تریش کەمێژوو بەشانازییەوە ناوی نەمریانی تۆمار کردووە، بەتایبەتی هەر ئەوانە بوون

---

[٧٦] بڕوانە: أ. جوبێر، کلتووری رێنیسانسی ئیتالیا ل١٢٦.

تولنیان راستەوخۆ ئازارو ئاواتی کۆمەڵو تاکەکەس دەربڕینوهونەریشیان کردە هۆیەکی گرنگ بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە. ئەو پیاوە نەمرانە ئەوەندەیان بەسە کەهونەرەکەیان لەپاش خۆیانو هەتاهەتایشە لەپێناوی خزمەتی ئادەمیزاددا بەردەوام دەبێ. تەقیکردنەوە دەوڵەمەندەکانی ژیانیش بەڵگەی سەلمێنەری ئەم حەقیقەتەن.

پەرەسەندنی هونەر لەڕۆژگاری ڕێنیسانسدا بەتەنها لایەنی نیگار کێشانو پەیکەرتاشینی نەگرتەوە. بگرە پەل بۆ زۆر مەیدانی تریش هاویشت. گرینگترینیان هونەری بیناسازییە. لەگەڵ سەدەی ڕێنیسانسدا ساختمانی بەرز بەشێوازی نوێ هاتنە گۆڕێو ئەمڕۆ لەخانەی شوێنەوارە نەمرەکانی شارستانیەتیدا دادەنرێن. ئەوەی شایانی باسە، خێرایی کارو ڕاپەڕاندنی یەکێکە لەدیاردەکانی تەکنیکی بیناسازیی تازە. پێشتر، دروستکردنی ساختمانێك دەیان ساڵو هەندێ جار چەند سەدەیەکی دەخایاند، بەڵام لەسەردەمی ڕێنیسانسدا ماوەی بیناکردنی کۆشکێکی ڕەنگین یاخود کڵێسەیەکی گومەزداری بەنەخشو نیگار لەچەند ساڵێك زیاتری پێ نەدەچوو. بێگومان هەموو ئەمانەیش چەند لاپەڕەیەکی دیاری ژیانی ئادەمیزادو مێژووی پەرەسەندنیەتی.

## "پەرەسەندنی لێکۆڵینەوەی مێژوویی"

زانیاری مێژوو، لەڕیزی پێشەوەی ئەو زانیارییە مرۆڤایەتییانە دادەنرێ کەبیروڕای ڕێنیسانس کاری تێکردن؛ پێشتریش پەنجە بۆ هەندێ لایەنی ئەم مەسەلەیە ڕاکێشرا کەپەیوەندیان بەم بابەتەوە هەیە بایەخدان بەکەلەپووری کۆن، بۆ ئەوە بوو ڕۆشناییەکی بەتین بخرێتە سەر لاپەڕە شاردراوەو نادیارەکانی مێژووی سیاسیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی ئەورووپا لەسەردەمی گریكو ڕۆماندا، هەر لەسەردەمی ڕینیسانسدا بایەخێکی زۆر بەشوێنەوارە دێرینەکانی ڕۆژهەڵات درا. تەنانەت توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی نەخشو نیگارو پەیکەرە کۆنەکان "Epigraphy" بەمەبەستی شارەزابوونی مێژووی بەر لەزاین، یەکێکە لەو بابەتانەی لەسەردەمی ڕێنیسانسدا سەری

هـەڵداو پەیوەندییـەکی راسـتەوخۆی بـەو قۆناغـەوە هەیـە. لەلایـەکی تریشـەوە، لێکۆڵینەوەی مێژوویی گۆڕانێکـی بنـەڕەتی بەسـەردا هـات مێژوونووسـان لەڕوانگەیـەکی تازەوە دەیانڕوانییـە کارەسـاتە مێژوویـیەکان‌و ڕۆڵـی تاکەکەسـیان تێدا دیاری دەکرد. ئەوانە بەچاوێکی رەخنە گرانەوە لەسەرچاوەو لێکۆڵینەوە مێژوویە تۆمار کراوەکـان ورد دەبونەوە. بەم کارەیش نەك هەر دەستیان خستە سەر ناتەواوی‌و کەم‌و کوڕییەکانی ئەو سەرچاوە کۆنانە. بەڵکو چەندین حەقیقـەتی مێژوویـی گرنگیـان چەسپاندو بەهۆیانـەوە بیروڕای دەرەبەگایەتیان یەکالا کردەوە.

"لۆرێنزۆ ڤالا" لەپاش لێکۆڵینـەوەو توێژینەوەیـەکی وردو بەڵگەی سـەلمێنەر دەری خست "بەخشی قوستەنتین" قەوالەیەکی ساختەو دروستکراوە. بێ گومان ئـەم دەست پێشـــخەرییەی "ڤـالا" هـــەنگاوێکی چاونەترسـانە بـوو لـــەمەیدانی لێکۆڵینـــەوەی مێژووییدا. هـەر لەسەردەمی رێنیسانسیشدا بۆ یەکەمجار مێـژوو بەسـەر سـێ قۆنـاغ دا دابـەش کـرا -کۆن وناوەڕاست ونوێ-، ئەمـە جگـە لـەوەی چـەند لێکۆڵینەوەیـــەکی مێژوویی نوێ سەریان هەڵداو لەناوەرۆکیاندا بایەخێکی زۆر بەڕووداوە نیشـتیمانییەکان‌و شان‌و شکۆی دێرینەی میللەت دراوە. بەجۆرێك لەگەڵ هەستی نەتـەوەیی‌و نیشتیمانیی ئـەو سـەردەمەدا بگونجـێ. بەنموونـە: "ف گویچـاردینی ١٤٨٣ - ١٥٤٠ ز" یەکـەمین مێژوونووسە لەسەرپاکی مێژووی وڵاتی ئیتاڵیای کۆڵییەوە، بەپێچەوانەی ئەوانەی پێـش خۆیەوە کەوەك چەند پارچەیەکی جیاجیا دەیان روانییە وڵاتی ئیتالیاو لـەو روانگەیـەوە مێـژووی هـەر بەشـەیان بـەجیا دەنوسییەوە. هەسـتی نەتـــەوەییش بەرادەیـەك پـاڵی بەمێژوونووسانەوە نـا دەیانویسـت چارەسـەری بـەکردەوە بـۆ کێشـە کۆمەڵایەتییـەکان بدۆزنەوەو هۆی راستەقینەی کارەساتە مێژووییەکان دەستنیشان بکەن لـەم بۆچونـەوە ئـەو جـۆرە لێکدانەوانـەیان رەت دەکـردەوە گوایـە "هـێزە نادیارەکـان" دەسـتیان لەدروسـتبوون‌و چارەنووسـی رووداوەکـاندا هەیـە!! ئـەنجامیش دەگـەڕان بـەدوای ئـەو تاکەکەسە هۆشیارەدا کەڕۆڵێکی دیاری لەڕەوتی بەرەو پێشەوە بردنـی بەسـەرهاتەکاند

گیراوه. لیرەدا پێویستە ئەو حەقیقەتەش فەرامۆش نەکرێ کەژمارەیەکی کەمی هومانیستەکان نەبێ کەسی تر توخنی ئەم چەشنە لیکدانەوە شێوە پراگماتییەی مێژوو نەکەوت. چونکە مەبەستی بنچینەیی هەموویان ئەوە بوو لەو هۆ مەنتیقییانە بکۆڵنەوە کەسەرکردە سیاسیەکانیان دەبزواند. بەپێی بیروڕای "گویچاردینی" خۆپەرستیی تاکەکەس مێژوو دروست دەکا جەماوەر هیچ دەورێکی لەم مەسەلەیەدا نییە. بەوەیشەوە رانەوەستا، بەچاوێکی سووکەوە دەیڕوانییە کۆمەڵو داوای دەکرد لەدامو دەسگای دەوڵەت دوور بخرێتەوە. چونکە بەلای ئەوەوە بەڕێوەبردنی سیستمی سیاسی ئیشی توێژە دەست ڕۆیشتووەکانە!!. ئەوەی شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لەو هومانیستانەی بەمەسەلەکانی ئەدەبو فیکرو فەلسەفەوە خەریك بوون لەهەمان کاتیشدا مێژوو نووسیش بوونو راستەوخۆ خزمەتێکی گەورەی لێکۆڵینەوەی مێژوویان کرد. بەرهەمەکانی تریشیان بوونە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ ئەو توێژەرانەی دەیانەوێ ئەمڕۆ لەمێژووی ئەوروپای دوادوای سەدەکانی ناوەڕاست بکۆڵنەوە. شان بەشانی ئەمانەیش لای هەندێ هومانیستی تر لێکۆڵینەوەی مێژوویی بووە بابەتێکی سەربەخۆو دەستی بەسەر بیرو هۆشیاندا گرتو چی وزەو توانایان هەبوو، بۆ توێژینەوەی رووداوە مێژووییەکانیان تەرخانکرد. یەکێکیش لەوانە "ماکیافیللی"یە کەبەدیارترین مێژوونووسی سەردەمی رێنیسانس دەژمێردرێو تائێستایش بەشێوەی جۆر بەجۆرو سەرنجڕاکێش ناوی بەسەر زاری کۆڕو کۆمەڵە سیاسی وڕۆشنبیرییەکانەوەیە.

## "ماکیافیللی ١٤٦٩ ١٥٢٧ ز"

سیاسەتمەدارو مێژوو نووسی ناسراو "نیکۆلا دی بیرناردۆ ماکیافیللی" سەر بەبنەماڵەیەکی خانەدانی فلۆرەنسایییە. بەر لەوەی بێتە دونیاوە گوزەرانی خێزانەکەی بەڕادەیەك هەرەس دێنێ نابووت دەبێ. دوای ئەوەی "میدیتشی"ی فەرمانڕەوای

پێشووی "فلۆرەنسا" ساڵی ١٤٩٨ دەردەپەڕێنرێو سیستمی جەمهووری دادەمەزرێ "ماکیافیللی" بەدڵو گیان لەتەك ڕژێمی نوێدا هاوکاری دەکاو پایەی سکرتێری "ئەنجوومەنی دە ئەندام مجلس العشرە"ی دەدرێتێ کەئەرکی سەرپەرشتیکردنی کاروباری بەرگریو سیاسەتی دەرەوەی جەمهووریەتی "فلۆرەنسا"ی پێ سپێردرا بوو. ڕاستە "ماکیافیللی" یەکێك لەگەورە لێپرسراوانی ڕژێم نەبوو، بەڵام بەزیرەکییو جموجۆڵی خۆی توانی لەو سەردەمەدا کار لەژیانی سیاسیی "فلۆرەنسا" بکا. "ماکیافیللی" بەمەبەستی ڕاپەڕاندنی کاروباری سیاسی ڕژێمی جەمهووری بیست گەشتی دیپلۆماسی کردو لەهەموویشیاندا سەرکەوتنی بەدەست هێناو لەڕێگای ئەو گەشتانەوە چاوی بەژمارەیەك گەورە پیاوی گرنگی ئەورووپا کەوت، لەوانە پادشای فەرەنسا "لویسی دوازدەهەم "و "پاپا"وئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز "مەکسیمیلانی یەکەم"و ژمارەیەکی تریش .

پاش ساڵی ١٥١٢ز کەدامو دەسگای سیستمی جەمهووری تێكو پێك دراو بنەماڵەی "میدیتشی" گەڕانەوەو جڵەوی دەسەڵاتیان گرتەوە دەست، "ماکیافیللی" دەستی لەکار کێشرایەوەو پاش ماوەیەکیش بەتۆمەتی ئەوەی سەر لەنوێ هەوڵی دامەزراندنی سیستمی جەمهووری داوە، دەگیرێو دوای ئازاردان بەرەڵلا دەکرێو دەینێرنە گوندێکی نزیك "فلۆرەنسا"و لەوێدا هەتا مردن بەنووسینو لێکۆڵینەوەوە خەریك دەبێو لەپاش خۆی چەند لێکۆڵینەوەیەك بەجێ دەهێڵێ کەتائێستایش بەگرنگترین بەرهەمی فیکریو سیاسیو مێژوویی سەردەمی ڕێنیسانس دەژمێردرێن، بەتایبەتی کتێبە بەناوبانگەکەی "میر-الأمیر" کەبەڕای زۆربەی مێژوونووسان لەناو گشت بەرهەمەکانی ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا "بەڕاستیی بەرهەمێکی نامرە"[٧٧]. بۆیە پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کەدەبێ "وەك زانیارییەك لێی بکۆڵرێتەوە، نەك وەکو پڕوپاگەندەی سیاسی"[٧٨]؛ جگە لەوەیش

---

(٧٧) R. Palmer and J. Colton.Op. Cit. . P. 55

(٧٨) Renaissance and Reformation 1300 1648, P. 106.

چەند بەرهەمێکی دیکەی گرنگی نوسیوە لەوانە "هونەری شەڕ-فن الحرب" و "مێژووی فلۆرەنسا" کەلەدوو تویی هەشت بەرگدا لەتێکڕای مێژووی سیاسیی ئیتالیای کۆڵیوەتەوە؛ ناوبراو بەحوکمی ئەوەی بەقووڵیی لەڕوداوە سیاسییەکان وورد دەبووەوەو بەشێوازێکی دراماتیکیو زمانێکی توندو تۆڵ بابەتەکانی دادەڕشت بە "یەکێك لەگەورەترین دەستکەوتی لێکۆڵینەوەی مێژوویی نوێ لەقەڵەم دەدرێ"[٧٩]، هەرچەندە کەدێتە سەر گێڕانەوەی هەندێ ڕووداوی مێژوویی توشی هەڵە دەبێ، بەڵام تا ئێستایش نووسینەکانی نرخی خۆیان لەدەست نەداوە.

"ماکیافیللی" لەسەرەتاوە رای وابوو کەسیستمی جەمهووری باشترین شێوەی رژێمی سیاسییە، لەبەرئەوە بەهەموو توانایەوە هەوڵی بۆ دەدا. دوای ئەوەیش کە بارو دۆخی ئیتالیای شیکردەوە، بینی رۆژ لەدوای رۆژ ئاگری شەڕو پشێویو ناکۆکی لەنێوان شارو ناوچەکاندا تاو دەستێنێو وڵات پتر لاواز دەبێو هەلو مەرجی داگیرکردن چاکتر بۆ بێگانە دەڕەخسێنێ لە کتێبی "میر"دا دەگاتە ئەو باوەڕەی کە باشترین رژێم بتوانێ ئیتالیا یەك بخاو بەرگری لێ بکا، ئەو رژێمەیە پشت بە سەنترالیزمو دیکتاتۆریەتی موتڵەق ببەستێو گوێ نەداتە هیچ جۆرە مەسەلەیەکی ئاینیو دونیاییو ئەخلاقیی. چونکە بەرژەوەندی گشتیی دەوڵەتو بەتایبەتی یەکێتیی وڵات "میر" یاخود "پاشا" ناچار دەکا لەو پێناوەدا هەموو رێگایەك بگرێتە بەر، جا ئیتر ئەو رێگایە بەکارهێنانی هێز بێ -وەك پێی لەسەر دادەگرت- یان ئازاردانو کوشتنو خیانەتو پارانەوەو شوێنە ونیی بەرتیل دانو فێڵبازیو درۆکردنو دوو زمانیی بێ گرنگ نییە، مادام مەبەست پیرۆزە دەشێ هەموو رێگایەکی بۆ بگیرێ(*) هەمیشەیش ئامۆژگاری

---

[٧٩] و.ل. فاینشتاین، مێژووی ئەورووپای رۆژئاوا لەسەدەی ناوەڕاستدا. بەزمانی روسی.موسکۆ لینینگراد ١٩٦٤ ل٢٧٩.

(*) سەبارەت بەو تیورەی "ماکیافیللی" کە "بۆگەیشتن بە ئامانج هەموو رێگایەکی چاك و خراپ بەڕەوا دەزانێت" مارکس ووتوویە: "ئامانج و مەبەست چەند پیرۆز بن ناشێ رێگای ناڕەوا و چەپەڵیان بۆ بگیرێ..." -وەرگێڕ-

دەسەلآتدارانی ئیتالیایی دەکرد شەرم نەکەن و هەر ڕێگایەك بە پەسەند دەزانن با نارەوایش بێ بیگرنەبەر تاوەکو بەهۆیەوە خواستو ئامانجە سیاسییەکانیان بهێننە دی. چونکە فەرمانڕەوای سەرکەوتوو ئەو کەسەیە بتوانێ بەپێی پێویستیی بارو زروفی وڵات پشت بەڕێگای مرۆڤانەو نامرۆڤانە ببەستێو لەیەك کاتدا ڕێوییەکی فێڵبازو شێرێکی بەهەڵمەت بێو لەشوێنی خۆیدا دەست نەپارێزێ. لەم تێڕوانینەوە "ماکیافیللی" گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەدەبێ سیاسەت محەکی سەرکەوتن پێوانە بکرێ. سەبارەت بەم لێکدانەوەیە دوای ئەو زاراوەی "ماکیافیللیزم الماکیافیللیە"و "ماکیلفیللیست" هاتنە گۆڕێ. مەبەست لەیەکەمیان ئەو ڕێبازە سیاسییەیە کەگوێ بەهیچ یاسایەکی ئەخلاقی نادا، دووەمیشیان بەو کەسە دەوترێ کە پەیڕەوی ئەو ڕێبازە دەکا. بەڵام پێویستە بەچاوێکی ترەوە تەماشای "ماکیافیللی" بکرێ. ئەویەر لەهەموو شتێك نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز بوو، دەیویست وڵاتەکەی لە چنگی بێگانەی داگیرکەر ڕزگاری ببێو یەك بگرێو شکۆی ڕابردووی بژیەنێتەوە. چونکە لەدڵەوە بۆی دەسووتا، وەك خۆی لەنامەیەکیدا دانی پێدانـاوە "لە گیانی خۆی خۆشتری دەوێ(٨٠) ئەم "تیورەی ماکیافیللی" ئەنجامی شیکردنەوەیەکی قووڵی واقعی ئیتالیاو تاقیکردنەوەی تایبەتیو خۆشەویستی ڕاستەقینەی بوو بەرامبەر بەوڵاتەکەی. جا ئەگەر بەدڵسۆزییەوە هەوڵی بۆ بدرایە، دەبوو لەو کاتەدا پشتی پێببەسترێو ڕێنومایی بکرێ "ماکیافیللی" یەکێك بوو لەو کەسانەی بەتوندی بەرپەرەکانەی سیاسەتی دەرەبەگایەتیو پاپایەتی دەکردو لای وابوو ئەوانە گەورەترین کۆسپن لەبەردەم یەکگرتنی ئیتالیادا، هەرچی بیرو ڕای کڵێسەیشە هەستو نەستی ئادەمیزاد ئیفلیج دەکەنو ماوەی داهێنان بۆ ئادەمیزاد ناهێڵنەوە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ "ماکیافیللی" دژی باوەڕی کڵێسە بووە، بە پێچەوانەوە باوەڕی وابوو کە دەتوانرێ ئاینی بکرێتە ئامرازێکی کاریگەرو بۆ خزمەتی سیاسەت بەکاربهێنرێ(٨١). "ماکیافیللی" بەتوندی ڕەخنەی لەسیستمی سووپایی وڵاتەکەی دەگرت، چونکە پشتی بەکۆمەڵە

---

(٨٠) E. Chabod, Machiavlli and tha Renaissance ,Combridg 1960

(٨١) Ibid PP .95-96

خەڵکێکی بەکرێگیراو "المرتزقە" دەبەست کەلە تـاڵانو بـڕۆو شـرەخۆری بـەولاوە هیـچ ئامانجێکی دیکەیان نەبوو، لەبەرئەوە ناویشی نابوون خڵتەی کۆمەڵ. ئەو لەم بارەیـەوە رای وابوو کەپێویستە دەوڵـەت سـوپایەکی رێـك وپێکـی هەمیشـەیی خـاوەن دیسـپلینی هەبێو ریزەکانی بەلاوانی تازە پێگەیشتوو پڕبکرێنـەوەو سـەربازییش بکرێتـە ئـەرکێکی نیشتمانیو لەئەسـتۆی هـەموو کەسێك بێـت، تـاوەکوو ببێتـە ئـامرازی رزگـارییو هـێزی راستەقینە بەدەسـت "مـیر"ی دیکتـاتۆرەوە. "ماکیـافیللی" هەمیشـە خـەوی بـەوەوە دەدی لەشکری شارەکانی ئیتالیا "لـە پێنـاوی ئامانجە نیشـتمانییەکاندا" بجووڵـێ تـا ئیتالییەکان لەبەردەم هەموو ئەوروپادا بە شانازییەوە سەربڵند بکەنەوە[٨٢]. جا بۆ ئەوە میری تازە ئەم ئەرکە پیرۆزە بەجێبهێنێ، دەبێ بزانێ چ جۆرە خەڵکێك بە یارمەتیدەری نزیکی خۆی هەڵدەبژێرێ. ئەوانە پێویسـتە لـەو جـۆرە کەسانە بـن کـە مـەراییو ریـایی نازانن. دەبێ دڵسۆزو لێوەشاوەو بەتوانا بنو بەدڵ پاڵپشتی سیستمەکە بگرن. لەهەمان کاتیشدا پێویستە تێبگەبەنرێن کە پلەو پایەی سیاسیان بەندە بـەرادەی دڵسـۆزییانەوە بەرامبـەر بەدەوڵـەتو رادەی پشـتگیریکردنی هەڵوێسـتە سیاسـییەکانی "مـیر"ەوە. بیروڕای سیاسـی "ماکیـافیللی" رۆڵێکـی گـەورەی لـە گەشـەکردنی تیـۆرو لێکۆڵینـەوە مێژووییەکاندا گێڕا. هەرزوو لەنووسینەکانیدا سنوری لێکدانەوەی پراگمـاتیزمی شـکاند. ئـەنجامی تاقیکردنـەوەو شـیکردنەوەی تایبـەتی خـۆی گەیشـتە ئـەو بـاوەڕەی کـە لێکدانەوەی لاهووتیی سەبارەت بەمەسەلەی حوکمڕانیو تیـۆری مـافی خودایـی "نظريـة الحق الالهـي" تـێڕوانینێکی بـێ بناغـەن. لەبەرئـەوە ریالیسـتانە دەیڕوانییـە دەوڵـەتو یاسـاکانیو لای وابـوو رووداوەکـانی حەتمیەتـی مێـژوو دروستیـان دەکـاو ئـەو کـەسانەی هـەڵیان دەسـووڕێنن رۆڵێکـی ئەوتۆیـان تێـدا نییـەو پێویسـتە چاویـان لێبپۆشرێ. سەرەنجامیش پوختەی بیروڕای لەوەدا کۆدەکاتـەوە کـە ملمڵانـەی سیاسـی دڵنەمۆیەکەو مێـژوو دەبزوێنـێو مـادام ناکۆکییـەکی تونـدو تیـژ لـەنێوان چەوسـاوەو چەوسـێنەردا هەیـە -وەك لـە نووسـینەکانیدا لێـی دواوە- ئـەو ملمڵانەیـە مۆرکـی کۆمەڵایەتیو چینایەتی بەخۆیەوە دەنێ. لە کتێبـە گـەورەکـەی "مێـژووی فلۆرەنسا"دا

---

[٨٢] Ibid P135,R.Palmer and J .Colton .Op.Cit..P55

شوێن پێی خەباتی جەماوەرو چینی ئەریستۆکرات بەدرێژایی مێژووی ئیتاڵیا هەڵدەگرێ. هەر لەم بۆچوونەوە لەمۆی راستەقینەی ڕووداوە مێژووییەکان دەکۆڵێتەوەو خواستو ئارەزووی تایبەتی تاکەکەس بەلاوە دەنێ و هەموو مێژوونووسانی سەردەمی ڕێنیسانس بەجێ دەهێڵێ.

"ماکیافیللی" بەبیروڕایەکانی تەعبیری لەئایدۆلۆژیای چینی بۆرژوای تازەپێگەیشتوو دەکرد. لەبەرهەمەکانیدا بەشانو شکۆی بازرگانو پیشەگەری شارەکانی ئیتاڵیادا هەڵیداوەو هەر ئەوانەی بەمیللەت Popolo دەزانی. داوای لە "میر" دەکرد چاودێرییان بکاو بارودۆخێکیان بۆبڕەخسێنێ تێیدا بەرژەوەندییەکانیان پەرەپێبدەنو بەخۆشیی بژین. بەلام چینی بۆرژوای ئیتاڵیا بەو خێراییەی لەدایکبوو لەنەشونما کردنیش وەستاو لەسەردەمی "ماکیافیللی"دا کەوتە گێژاوی تەنگوچەڵەمەیەکی ئەوتۆوە بۆی نەلوا لەو بارودۆخە گرانەی ئیتاڵیا تێیدا دەژیا، ببێتە هێزێك ئەو ئەرکە گەورانە بەجێبهێنێ کەلێی چاوەڕوان دەکرا.

جا ئەگەر لەئەنجامی ئەم ئالوگۆڕەدا "ماکیافیللی" بیروباوەڕی گۆڕدرابێو بەپەرۆشەوە ئاواتەخوازی سیستمی پاشایەتی موتڵەق بوویێ، شتێکی سروشتییە. چونکە ئەم هەڵوێستەی خۆی لەخۆیدا جۆرە سازشێك بوو لەگەڵ بیری دەرەبەگایەتیدا[٨٣] و ئاکامیش خستیە ریزی دوژمنانی جەماوەرو سیستمی دیموکراسییەوە، بەرادەیەك وایلێهات سڵی لەجەماوەریش دەکردەوەو بەڕای ئەو کۆمەلانی خەڵك "بەئاسانی شوێن سەرەڕۆیی دەکەون". بەویشەوە نەوەستا ناوی "رەشەخەڵك" – Plebs –یشی لێنانو بەئاشکرایش دوژمنایەتی دەکردنو لەو

---

[٨٣] لەدوادوای سەدەکانی ناوەڕاستدا چەند سیستمێکی موتڵەق لەئەورووپادا هاتنە کایەوە سەرهەڵدانی ئەم چەشنە سیستمە تارادەیەکی زۆر لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو قۆناغە مێژوویەدا دەگونجا. هەرچەندە ئەوانە بالاترین شێوەی سیستمی سیاسی دەرەبەگایەتی بوون، بەلام لەسەردەمی ماکیافیللیدا هێشتا هەندێ لایەنی ئیجابیان تێداما بوو.

نووسینانەیدا کەباسی چەند راپەرینێکی جەماوەری ئیتالیا دەکات بەتەواوی هەڵوێستی دوژمنانەی خۆی بەرامبەریان دەردەبڕێ. لەم روانگەیەوەو بەحوکمی ئەم هەڵوێستەی لەهەموو بەرهەمەکانیدا رووی دەم دەکاتە "میر"و دەسەلأتداران و زانایانی هاوڕێی و بوئەوان دەنووسێ نەك بۆجەماوەر[84]. تێکڕای ئەم خاڵە سەلبیانەی لەبیروباوەڕی "ماکیافیللی" دا دەبینران، وەك مێژوونووس و نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز هیچ لە پلەوپایەی کەم ناکەنەوە، بەتایبەتی گەر بێو لەچوارچێوەی زەمان و زەمینی خۆیدا بلیبنێین و بەوردیی لەکرۆکی مەبەست و مەرامی تێبگەین. ئەوەی راستی بێت ماکیافیللیستەکان تارادەیەکی زۆر ناوو شۆرەتی "ماکیافیللی" یان شێواندووە. هەندێ لەو فەرمانڕەوایانەی بەهەڵسوکەوت و سیاسەتی رۆژانەیان لە"میر"ەکەی ئەو تێیان پەڕلندبوو، هێرشێکی زۆریان کردەسەر. لەوانە "فرەدرێکی دووەم"ی پاشای "پروسیا" بوو. ناویراو کتێبێکی سەربەخۆی سەبارەت بەبیروڕاکانی "ماکیافیللی" داناو مەبەستی بوو گوایە "پووچیان" بکاتەوە. شایانی بایە هەر لەو ساڵەدا کە "فرەدریك" چووە سەر تەخت ئەو کتێبەیشی نووسی[85]. لەلایەکی تریشەوە چەندین فەرمانڕەوای دیکتاتۆر، لەزەمان و زەمینی جۆربەجۆردا کەزۆر لەبارو زروفی ئیتالیای سەدەی شازدەهەم جیاوازبوون، لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیانداو بەمەبەستی هێشتنەوەو درێژەپێدانی دەسەلأتی سیاسییان پەنایان بردە بەر بیروڕایەکانی ئەوو بەو جۆرەی دەیانویست بەکاریان دەهێنا. سەرکردەی بەناوبانگی "فەرەنسا" "ریشیلیۆ ١٥٨٥ ١٦٤٢" کەلەمەیدانی سیاسیدا سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێنا یەکەمین فەرمانڕەوای دیکتاتۆرە کە بێ ترس و سڵەمینەوەو بەئاشکرا دان بەوەدا دەنێ کەلەزۆربەی بیروڕاو هەڵوێستە سیاسییەکانیدا قەرزداری "ماکیافیللی"یە. ئەوانی تریش هەرچی

---

[84] The Civilization of the Renaissance in Italy . An Essay by J.Burckhardt , Nnwyork and Toronto, P.93.

[85] "فرەدریکی دووەم" ئەو کتێبەی لەساڵی "١٧٤٠" زدا بەناونیشانی "دژی ماکیافیللی" نووسی .

"ماکیافیللی" وتبووی بەخردەوە پەیڕەویان دەکرد، بەڵام وەك بنچینەیەکی تیوریی ڕەتیان دەکردەوە. زۆرجاریش لەبارودۆخێکی وەهادا بەکاریان دەهێنا جیاوازییەکی بنەڕەتییان نەك هەر لەگەڵ ئەوکاتو شوێنەدا هەبوو کەبیروباوەڕی "ماکیافیللی" تێیدا سەریهەڵدا، بەڵکو لەپێناوی ئەو ئامانجەیشدا نەبوو کەئەو مەبەستی بوو. ئەوەیشی کەناوو شۆرەتی "ماکیافیللی"ی و بیروڕایەکانی ئەوەندەی تر زڕاند، هەڵوێستی دوژمنانەی کڵێسەو ئەو بڕیارەی بوو کەسەبارەت بەقەدەغەکردنی کتێبەکانی ئەو دەریکرد. ئەمە لەکاتێکدا ماکیافیللی لەسەر خواستی پاپا مێژووی "فلۆرەنسا"ی نووسیبووەوە[86]. بەسەرێکی تریش مێژوونووسە بۆرژواکانو بەتایبەتی سۆسیۆلۆجیستەکانی فاشیزم ئەوەندەی تر ناووشۆرەتی "ماکیافیللی" یان شێواند. چونکە ئەمانەیش بەتەنها لەسەر ئەو تیورەی سوورن کەپەیوەندی بەسیستمی دیکتاتۆریەتی موتڵەقەوە هەیە، بێ ئەوەی توخنی ئەو بیروڕایانەی بکەون کەباسی خاسیەتەکانی ڕژێمی جەمهووری دەکاو بەچاکترین سیستمی دادەنێو ماوەنادا دەسەڵات بەمیرات بکەوێتە دەست فەرمانڕەواو لای وایە پێویستە تواناو لێهاتوویی بکرێنە مەحەکی هەڵبژاردنی حوکمڕانان. سەرباری ئەمانەش نازییەکانو فاسیشتەکان بەڕادەیەك ڕێنومایی بیروڕای "ماکیافیللی" یان دەکرد، کەسێکی وەك "هیتلەر" هەمیشە کتێبی "میر" لەسەر مێزەکەی بوو. "مۆسۆلینی"یش لەو لێکۆڵینەوەیەیدا کەلەبارەی هەمان کتێبەوە ئامادەی کردبو پلەی دکتۆرای پێ وەرگرت، بەشان وباڵی "ماکیافیللیدا" هەڵدەدا. دوای ئەوەیش کەدەسەڵاتی سیاسی کەوتە دەست باسێکی دیکەی هەر لەو بارەیەوە ئامادەکردبو تێیدا هەڵوێستی "ماکیافیللی"ی سەبارەت بەحوکمی تاکەکەس

---

[86] سەیر ئەوەیە ساڵی ١٥٥٩ ز کڵێسە بڕیارێکی دەرکرد تێیدا فەرمانی دا ماکێتی پەیکەرەکەی بسووتێنرێ . کەچی بەر لەوە بەچارەکە سەدەیەك "ڕۆما" خۆی تەواوی نووسینەکانی چاپکردبوو. کۆمیدیاکانیشی لەبەردەم "پاپا"دا نیشان دەدران.

روون کردەوەو گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە "بیروڕاکانی لەپاش چوار سەدە هێشتا هەر زیندوون"(٨٦) (*).

بەوجۆرە "ماکیافیللی" لەلایەن هەندێکەوە بەر تانەو تەشەرو بڕێکی تریش بەبێ ئەوەی لەڕوانگەیەکی زانستییانەوە بۆی بچن کەوتنە بەرگری لێکردنیو لایان وابوو لەهەموو کەس راستگۆترە، چونکە وەك دەڵێن "هەموو ئادەمیزادێك لەناو خۆیدا ماکیافیللییە". بەڵام چ ئەمانو چ ئەوان "ماکیافیللی" مێژوونووسو "ماکیافیللیزم" تێکەڵ بەیەك دەکەن. ئەوانە کەدێنە سەر هەڵسەنگاندنی بیروڕایەکانی هیچ حساب بۆزەمانو زەمینی ناکەن کەچۆن تەماشای رووداوەکانی کردووەو بەچ دڵسۆزییەکەوە هەوڵیداوە چەند رێگایەك باش یان خراپ بدۆزێتەوە، تا بەهۆیانەوە بگاتە ئەو مەبەستە پیرۆزانەی بەبڕوایەکی تەواوەوە هەوڵی بۆ دەدان. کەواتە "ماکیافیللی" رۆڵەی سەردەمو کۆمەڵەکەی خۆی بوو.

لەبەرئەوە هەروا بەخۆڕاییو لەخۆوە نییە کەزاناو فەیلەسووفی وەك "مارکس"و "دیکارت"و "بیکۆن"و "ریشیلۆ"ی سەرەك وەزیرانی فەرەنسا کە بە سەرکەوتووترین پیاوی سیاسی نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەم دادەنرێو "ئەلیزابێتی یەکەم"ی پادشای ئینگلستان کەسەردەمەکەی بە"سەدەی زێڕین" ناسراوەو "ناپلیۆن پۆناپارت" کە بەوردیی "میر"ی خوێندۆتەوەو رێی تێدەچێ هەرئەویش کردبێتی بە فەرەنسایی،

---

(٨٦) نیقولا ماکیافیللی، الأمیر، تعلیق: بنیتو موسولینی، مقدمة کریستیان غاوس، تعریب خیری حماد، بیروت، الطبعة الثالثة ١٩٧٠ ص٦.

(*) وەنەبێ بیروڕاکانی (ماکیافیللی) بەتەنیا کاریان لەبیری پیاوە سیاسییەکان کردبێ و بەم یان بەوشێوە بەدرێژایی چوار سەدەو نیو پەیڕەو کرابێ، بەڵکو بەئەندازەیەکی دیاریش کاری لەهەستو هۆشی نووسەرە دەرکەوتووەکانی دوای خۆی کردووە. سەرنجدانێك لەناوەڕۆکی شانۆییە بەناوبانگەکانی "ولیام شەکسپیر"و شانۆیی "جولەکەکەی مالتا"ی "کریستۆفر مارلۆ" بەڵگەی ئەم راستیەنو لەشوێنی خۆیدا پەنجەیان بۆڕادەکێشین. وەرگێڕ

شوێن پێی ئەویان هەڵگرتووەو سوودی پێیان بەخشیوەو پشتیان پێی بەستووە.
شایانی باسە "ماکیافیللی" لەمەیدانی ئەدەبیشدا دەستێکی باڵای هەبووەو چەند سروودو شیعرو نامەو پەخشانی لەدوا بەجێماوەو لەناوەڕۆکیدا بەتوندی رەخنە لەنەریتی کۆنی کۆمەڵایەتی‌و هەڵوێستی ناڕەوای کڵێسە دەگرێ‌و بەهۆی روونیی مەبەست‌و رەوانیی زمان‌و دەربڕینی قووڵ‌و دوورکەوتنەوەی لەدرێژ دادڕیی، سامانێکی زۆری خستەسەر گەنجینەی ئەدەبیاتی ئیتاڵیایی. وابزانم ئەوەندە بەسە بڵێین مێژوونووسی گەورەی سەردەمی ڕێنیسانس بەڕاستیی لایەقی ئەو چەند وشەیەیە کەلەسەر مەزارەکەی نووسراوەو دەڵێ: "هیچ ستایشێك نییە شایانی ئەم ناوە بێت نیکۆلۆ ماکیافیللی". هەر ئەم دێڕەش بەسە بۆئەوەی ناوو شۆرەتی هەتاهەتایە بەنەمریی بهێڵێتەوە.
بێگومان لەناو پێشەوایانی ڕێنیسانسدا بەتەنها "ماکیافیللی" بەرەنگاری واقیعەکەی نەبووەوە، بەڵکو زۆری تریش لەو هومانیستانەی هاوچەرخی قۆناغی دوایی ڕێنیسانس بوون، بەهەمان شێوەی "ماکیافیللی" چوون بەگژ واقیعی کۆمەڵگاکانیانداو رووبەڕوویان بوونەوە.

## تەقینەوە بە رووی واقیعدا

بیروڕای ئایدیالیزمی‌و نیازو مەبەستی مرۆڤایەتیانەی پیاوانی سەردەمی ڕێنیسانس‌و دامێنانەکانیان، نەك هەر پاڵنەرێکی گەورەی بزووتنەوەی فیکری بوون لەئەورووپادا بەڵکو بوونە هۆی ئەوەی لەقۆناغەکانی دواییدا تەوژمێکی بەگوڕ بەڕێنیسانس ببەخشن. بەڵام ئەوهەموو نیازو مەبەستانە، نەیانتوانی ئامانجەکانیان بهێننەدی. ئەو رۆژەی ئەوان بەتەمای بوون، بەلاچوونی پەردە لەسەر دەرەبەگایەتی هەڵنەهات‌و لەو حەقیقەتەش تێنەگەیشتبوون کەئەو ئاڵوگۆڕە بەتەنها ناتوانێ سەرفرازیی راستەقینە بۆئادەمیزاد بهێنێ. لەبەرئەوە هەر دەبوو ئەوەی دواییان بە رووی واقیعدا بتەقنەوە، بەتایبەتی

لەوکاتەی کەپەرەسەندنی پەیوەندییەکانی سەرمایەداری لەکیشوەری ئەورووپادا بووە هۆی ئەوەی ناکۆکیە کۆمەڵایەتییەکان تیژتر بکاو توێژە کۆمەڵایەتییە جۆربەجۆرەکان زیاتر گرد بکاتەوەو دراو "پارە" رۆڵێکی گەورەتر ببینێو لەپێناوی نیازو مەبەستی تایبەتیدا فێڵو تەڵەکەبازیی زۆرتر بخرێتە کار. دیارخستنی ئەم واقیعەیش بەئاشکرا لەبەرهەمەکانی دوونووسەرە بەناوبانگەکەی قۆناغی دوایی سەردەمی رێنیسانسدا رەنگ دەدەنەوە کە "شەکسپیر"ی ئینگلیزیو "سەرڤانتس"ی ئیسپانیاییەو هەردووکیان لەدوادوای سەدەی شازدەهەمو سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا گەیشتنە لوتکەو لەیەک ساڵیشدا کۆچیان کرد.

## شەکسپیر ١٥٦٤ ١٦١٦

شاعیری گەورەی ئینگلیزو درامانووسی جیهانیی "ولیام شەکسپیر" لەشاری "ستراتفورد" لەناو خێزانێکی پیشەگەردا هاتۆتە دونیاوەو هەر لەو شارەیشدا گراماتیکو زمانی ئینگلیزی خوێندووە. ئەوبارە ناهەموارەی بەسەر ژیانی باوکیدا هاتو نەداریی خێزانەکەی ناچاریان کرد لەتەمەنی چواردەساڵیدا دەست لەخوێندن هەڵبگرێو یارمەتی باوکی بداو نەتوانێ خوێندنی باڵا تەواوبکا. لەهەرەتی لاوێتیدا چووە "لەندەن"و لەشانۆیەکی ئەوێدا بووە ئەکتەر. بەمووچەی ئەکتەرێو قازانجێکی کەمی ئەو تێکستە شانۆییانەی دەینووسین ژیانی بەڕێوەدەبرد.

لەبەرئەوەی لەبارەی مێژووی ژیانی "شەکسپیر"ەوە زانیارییەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە چەند بیروڕایەکی نازانستیانە هاتنە گۆڕێو نکولیان لەوەدەکرد "شەکسپیر" هەبووبێ. بۆسەلماندنی ئەم بۆچوونەیان هەوڵیاندەدا بەرهەمەکانی بەجۆرێك نیشان بدەن گوایە هی خەڵکی وەك "بیکۆن"ی فەیلەسوفو هەندێ نووسەری ئەوسەردەمەو ئەو ئەریستۆکراتیانەن بەئەدەبیاتەوە خەریك بوون. بەڵگەیشیان بۆ ئەم ڕایە ئەوەبوو: ناشیێو مەحاڵە ئەوداهێنانە مەزنانەی

"شەکسپیر" بەرهەمی ئەکتەرێکی سادەی وەك ئەو بن. سەرەڕای ئەوەش ناویرلو سەریەخێزانێکی ئەریستۆکراتی نەبووەو لەدانیشگادا ڕۆشنبیریی بەرزی بەدەست نەهێناوە !.

"شەکسپیر" بەبێدەنگیی خزمەتێکی گەورەی ئەدەبو شانۆی کردو بەڕاستی ڕۆڵەیەکی مەزنی میللەتەکەی بوو. لەناوەڕۆکی "١٥٤" کاری ئەدەبییو "٣٧" شانۆیید جارێك توخنی ناوی خۆی نەکەوتووە. "شەکسپیر" پەنای دەبردەبەر شانۆی میللیو شیعری ئینگلیزی و ئەفسانەی مێژوویی‌و لەڕێگای ئەوانەوە، چارەسەری گیروگرفتەکانی ڕۆژگاری خۆی دەکرد. ناوەڕۆکی شانۆییە سەرەتاییەکانی بۆ ئامانجێکی دوور تەرخانکردووەو لای وایە کۆمەڵ پێویستی بەسیستمێکی بەهێز هەیە تاوەکو سنوورێك بۆدەرەبەگایەتی دابنرێ. هەرچەندە "شەکسپیر" سیستمی پاشایەتی لەجەمهووری بەلاوە پەسەندترەو باوەڕیشی وابوو کەدەبێ خانەدانەکان ئیمتیازی تایبەتییان هەبێ. بەڵام سەرەڕای ئەوەش نووسەرێکی ڕیالیست بوو. ئەو پاشایەکی هۆشمەندو مرۆڤپەروەری دەویست تاوەکو یەکێتی وڵاتو ئاشتی‌و ئاسایش بپارێزێ. بۆیە "هەنری پێنجەم"ی کردە نموونەی ئەو پاشایەو خستییە ناو دەروونی خەڵکییەوە لەبەرهەمەکانی تریشیدا لەهەمان ڕوانگەوە بۆهەمان مەبەست پەردە لەسەر ئەو فەرمانڕەوایانە هەڵدەماڵێ کەتوانای بەڕێوەبردنی وڵاتیان نییە وەك "هەنری شەشەم"و "ڕیشاردی دووەم"و پاشا دیکتاتۆرەکان لەبابەتی "ڕیشاردی سێیەم"و "شاجۆن"و زۆری تریش. بەکورتی هەوڵ دەدا بیروڕای گەلی ئینگلیز سەبارەت بەشەخسی ئەو فەمانڕەوایانەو سیستمو ڕووداوی سەردەمەکانیان دەربڕێ. ڕاستییەکەی بیروڕای قۆناغی دووەمو سێیەمی سەردەمی ڕێنیسانس‌و بزووتنەوەی مرۆڤایەتی لەنووسینەکانی "شەکسپیر"دا ڕەنگیان داوەتەوە. لەبەهەمەکانی زوویدا "ڕۆمیۆو جولیێت"و "خەونی نیوەشەوێکی هاوین"و "بازرگانی ڤینیسیا"[*]. ئادەمیزادی خێرخوا بەسەر هێزی

---

[*] دکتۆر لەژمارە (٦) ی ساڵی ١٩٧٩ی گۆڤاری (آفاق عربية)دا باسێکی تری بەناونیشانی "تأملات تاريخية فى ماكيافيللى والماكيافيللية" بلاوکردەوە، تێیدا بەدووروودرێژی لەم مەسەلەیە دواوە.لەم

شەڕخوازو دواکەوتوودا سەردەخا. لەو بەرهەمە درامایانەشیدا کەلەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا نووسیونی تراژیدیاکان قووڵ دەبنەوەو تەعبیر لەوناکۆکیە کۆمەڵایەتییانە دەکەن کەڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرەدەستێنن. لەشانۆیی "هاملێت"و "ئۆتێللۆ"و "شالیر"و "تیموونی ئەتینایی"و زۆری تریشدا ئەوحەقیقەتەمان نیشاندەدا کەتا چ ڕادەیەك خولستو ئاواتەکانی پیاوانی سەردەمی ڕێنیسانس لەگەڵ واقیعی ژیانو کۆمەڵ لەیەکتر دوورن . "شەکسپیر" هەوڵیدا لەڕێگای بەرهەمەکانیەوە پێ لەسەر ئەوە دابگرێ کەچۆن بەرژەوەندی تایبەتیی خەڵکی دەجوولێنێ . لەهەمان کاتیشدا ئاشکرای دەکا کەلەگێژاوی ئەو ململانەیەدا خەڵکی سادەو دڵو دەروون خاوێن دەبنە قۆچی قوربانیی مەبەستو ئارەزووی دەسەلاتداران . بەنموونە: تراژیدیای "هاملێت" دەکاتە ڕوانگەیەك لێوەی دەڕوانێتە فێڵو تەڵەکەی ژیان. ئەو بەدەرخستنی چارەنووسی پاڵەوانەکەی لەوە بەولاوە کەدەیەوێ تراژیدیای ئادەمیزادێکی دڵپاك نیشان بدا کەڕوویەڕووی زوڵمو ستەمی کۆمەڵەکەی بۆتەوە هیچ مەبەستێکی دیکەی نییە(*). تەقینەوە بە ڕووی ئەو

---

-ئۆناغەدا کەدکتۆر پەنجەی بۆڕاکێشاوە، بەهۆی گەشەکردنی پەیوەندییەکانی سەرمایەدارێتییەوە، سەرمایە کەڵەکەبوو. سەرمایەدارانیش گەرەکیان بوو بەشێوەی جۆربەجۆر پارەکانیان بخەنەگەڕ. نەمەوە کڵێسەی کاتۆلیکی کەوتەخۆو فەتوایدا سوودخواردن حەرامەو ناشێ پارە بەسوود بدرێ. "شەکسپیر" وەك هەرکەسێکی سەر بەڕێبازی کاتۆلیکی لەشانۆیی "بازرگانیی ڤینیسیا"دا بیروڕای کڵێسە بەرجەستەدەکا. جا لەبەرئەوەی جوولەکان پەیڕەوی بیروڕای ئاینی مووساییان دەکردو ملکەچی بڕیارو فەتوای کڵێسە نەبوون ، بێ ترسو سڵەمینەوە پارەیان بەسوود دەدا. "شەکسپیر" لەو شانۆییەیدا پشتگیری هەڵوێستی کڵێسە دەکاو لەهەمان ڕوانگەیشەوە ئاینی مووسایی تاوانبار دەکا. دەبێ ئەوحەقیقەتەش لەیادنەکەین کەیەکێك لەئامانجەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی لەئەورووپادا ئەوەبوو سوودی سەرمایە حەڵاڵ بکرێو ماوەی سەرمایەداران بدرێ پارەکانیان بەشێوەی جۆربەجۆر بخەنە کارەوە. بەم هەڵوێستەیش ڕێبازی پرۆتستانتی بووە یارمەتیدەرێکی باشی سەرمایەدارانو کەڵەکەبوونی سەرمایەی مالیی "تراكم الرأسمال المالي". وەرگێڕ-

(*) هاملێت " بۆئەوەی تۆڵەی کوشتنی باوکی لەمامو دایکی بستێنێ، چەند ڕێگای جیاواز دەگرێتەبەر. جاروبار خۆی شێت دەکا. هەندێ جاریش وەك ئادەمیزادێکی گەمژەو هیچ نەزان خۆی

واقیعەدا لەشانۆیی "تەیمونی ئەتینایی"دا قووڵتر بەرجەستە دەبێ[٨٧]. "شەکسپیر" لەناوەڕۆکی ئەو بەرهەمانەیدا ئاشکرای دەکا، پایەی تاکە کەس لەکۆمەڵی نوێدا هیچ پەیوەندییەکی بەسیفەتی شەخسییەوە نییەو سامانی ماددی، پلەو پایەی کۆمەڵایەتی ئادەمیزاد دەست نیشان دەکا. "تەیموون" هەتا دەوڵەمەندە جێگای ڕێزی خەڵکییە، کە نابووتیش دەبێ هەموو لێی دەتەکنەوەو کەس بەدەوریەوە نامێنێ. "تەیموون" کە بەنابووتی داخ و خەفەت هەڵدەڕێژێ مەبەستی ئەوەیە، هێزو جادوی زێڕ نیشان بدا کەچۆن "ناشیرینی دەکاتە جوانی" و "درۆ دەکاتە ڕاستی"و "پیر دەکاتەوە بەلاو". بۆچی؟ چونکە زێڕ "جوانترین دیارییە بۆچاوەگەشەکان"و تیشکەکەیشی "وەك کڵپەی ئاگر لەهەموو شتێك بەتینترە"و هیچ "ئافرەتێکیش نییە سنگی بۆئەم خۆشەویستە نازدارە نەکاتەوەو پێشوازیی لەو دڵدارە نەکات کە بەکڵاوڕۆژنەدا بۆی دێتەخوارێ".

کاتێك "تەیموون" دەبینێ زێڕو سامان، ئادەمیزاد دەکەنە کۆیلەو لەوەوە کەبوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی قسەخۆش و نوکتەزانە، دەبێتە ئادەمیزادێکی گۆشەگیرو رقی لەهەموو ئەو خەڵکە دەبێتەوە کەلەپێش چاوی بوونەتە "بووکە سەماکەرە

-نیشاندەدا. لەشوێنی خۆشیدا هێز بەکاردەهێنێ. کەوابوو "شەکسپیر"یش کەم یان زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بیری "ماکیافیللی" یەوەو هەمان تێڕوانینی هەبووە. لەشانۆیی "ئۆتێللۆ"دا "ئیاگۆ" ماکیافیللی واتەنی: ڕێوییەکی فێڵبازو لەشوێنی خۆشیدا شێرێکی چاونەترس و بەهەڵمەتەو چی ڕێگای نارەواو ناشایستە هەیە دەیانگرێ بۆئەوەی تۆڵە لە"ئۆتێللۆ" بستێنێ. "ماکبێث"یش بۆئەوەی دەسەڵاتی بکەوێتە دەست هەرچی نەشێ دەیکا. لەشانۆیی "یۆلیۆس قەیسەر"دا "شەکسپیر" بیروراکانی بەتەواوی لەگەڵ "ماکیافیللی"دا جووت دەبێ. شەکسپیر کەکوشتنی "یۆلیۆس قەیسەر" دەکاتە بابەتی شانۆیەکەی و لەڕوانگەی خۆیەوە دایدەڕێژێتەوە مەبەستی ئەوەیە ڕای بگەیەنێ کە لەناوبردنی پاشایەکی وەك "قەیسەر" ئەنجامەکەی ئاکۆکی و دووبەرەکی و شەڕی ناوخۆ دەخولقێنێ و گەل بەرەو هەڵدێری نەهامەتی دەبا. وەرگێڕ

[٨٧] دکتۆر "عبدالواحد لوئلوئە" ئەم تێکستە بەنرخەی "شەکسپیر"ی کردووە بەعەرەبی و ساڵی ١٩٧٧ لە "کوێت" چاپکراوە.

بەدەست زێردارانەوە"، لەمەوە "پشت کردنە ئادەمیزاد"و "بەسووکیی تەماشاکردنی خەڵك" دەکاتە یاسای "رۆژانی دوایی تەمەنی"و "دۆستایەتیو میوانداریی‌و کۆمەڵو بەزەیی" لەبەرچاوی دەبنە "چەند وشەیەکی پڕوپووچ"و "خزمو دراوسێو نیشتمان"یش دەبنە "چەند ناوێکی مردووی بێ کەڵك". لەبەرئەوە ئەگەر "شەکسپیر" لەبەرگی مرۆڤێکی رەوشت بەرزی ئەتینایدا ئادەمیزادێکی هاوچەرخمان نیشان بداو ئاواتەخوازی ئەوەبێ "دەردێکی کوشندە لەسەر زەمین بکەوێتەوە" شتێکی سەیر نییە!! "تەیموون" پاش ئەوەی رووبەڕووی واقیعی کۆمەڵی نوێ دەبێتەوە ئینجا لەهێزی جادوگەرانەی پارەو سامان تێدەگاو بۆی دەردەکەوێ ئەوانەی هەمیشە عەودالی پارەن‌و هەڵپەی بۆ دەکەن وایان لێهاتووە تەنانەت "سەگ لەسوالکەریش بفرێنن" بۆیە دەڵێ:

"لەحەوشی ماڵەکەمدا درەختێکم هەیە، نەش‌ونما دەکا، واپێویستیی پاڵم پێوە دەنێ، بیبڕمەوە، ناچارم پەلە بکەم،
بەدۆستەکانم بڵێ، بەدانیشتووانی ئەتینای رابگەیەنە،
هەر لەگەورەی تابچووکیان، بەپێی پلەو پایەیان،
لەمەزن تا گەندەپیاو،
کێ دەیەوێ بەلاکانی ببڕێتەوە،
دەستو برد کا، بێتە ئێرە،
تادەمی تەور درەختەکەی نەپەڕاندووە،
پەتێك هەڵخاو خۆی هەڵواسێ"

ئابەم وێنە هونەرییە جوان‌و قووڵە "تەیموون" ئەو واقیعە تاڵو دڵتەزێنە دەردەبڕێ کە تا "دەستبڵاویی نەیکردە سوالکەر" هەستی بەخۆی نەکرد بەرادەیەك "دۆستەکانی بە تەواوی نەیان دەناسییەوە"و تەنانەت "سەرنجی ئەو کەسانەیشی

رانەدەکێشا کە پێشتر مەراییان دەکردو خواخوای ئەوەیان بوو ئەم بە لاچاوێك تەماشایان بکا". "سێرڤانتس"یش هەر لەم روانگەیەوە تەعبیر لەهەمان واقیع دەکا، بەڵام بەشێوەیەکی تر.

## سێرڤانتس

"سێرڤانتس" بەناوبانگترین نووسەری ئیسپانیایەو بەنووسینەکانی بنچینەو بناغەی بۆ زمانی یەکگرتووی ئیسپانی دارشتو یەکێکە لەو کەسانەی بەشداربیان لەگەشەپێکردنی ئەدەبیاتی جیهاندا کرد. ناوبراو تەمەنی لاوێتیی لەئیتالیادا بەسەر بردو لەلایەن چەتە دەریاییەکانی جەزائیرەوە بەدیل دەگیرێو لەماوەی پێنج ساڵ دیلێتیدا ئازایانە بەچەندین شێوە هەوڵی خۆڕزگارکردن دەدا. پاش ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ئیسپانیا وەك فەرمانبەرێك دەستبەکار دەبێو بەهۆی ئەوەوە کەزۆر ناوچەی وڵاتەکەی دەگەڕێ لەنزیکەوە ئاگاداری هەرەسهێنانو تێشکانی ژیانی دانیشتووان دەبێ. هەر لەو کاتەیشدا زەبروزەنگی کڵێسەو دادگای پشکنین بووبوونە بارێکی گران بەسەر شانی بزووتنەوەی فیکریی ئیسپانیاوە ئەویش بەتۆمەتێکی دروستکراو دوو جار دەگیرێو کتێبە بەناوبانگەکەی "دۆن کیخۆت" یان "دۆن کیشۆت" کەچیرۆکێکی ریالیزمییە لەبەندیخانەدا دەنووسێو لەناوەرۆکیدا گیانی سەردەمەکەی بەشێوازێکی هونەریی زۆر بەرز نیشان دەدا. پاڵەوانی چیرۆکی "دۆن کیشۆت" خەو بە زیندووکردنەوەی نەریتی سوارچاکییەوە دەبینێ، لەکاتێکدا سەردەمی بەسەرچووە. ئەو پاڵەوانە تاقەکەسێکە لەم حەقیقەتە تێنەگەیشتووە. بۆیە لەبەردەم خوێنەردا بەرگێکی پێکەنیناوی دەپۆشێو دەیەوێ لەسەر رێو شوێنی دەرەبەگایەتی واقیع بگۆڕێ.

لەقۆناغی دەرەبەگایەتیدا هەموو شتێك پشتی بەهێزی بازوو دەبەست. ئەوەتا "دۆن کیشۆت"یش دەیەوێ بەزەبری دەستو قامکی خۆی واقیعی تفتو تاڵی کۆمەڵەکەی بگۆڕێ. لەبەرئەوە دەبینین جارێك لەسەر هەتیوو بێدەرەتانان دەکاتەوەو

جارێکیش سزای ستەمکاران دەدا، بەڵام لەواقیعدا هیچی پێ ناکرێ‌و دەبێتە هۆی ئاژاوە نانەوەو زەرەرو زیانیش بەخەڵکی دەگەیەنێ. سەرەڕای ئەمانەیش "دۆن کیشۆت" لەدڵدا ئادەمیزادێکی خێرخوایەو خۆشویستنی مرۆڤ پاڵی پێوەدەنێ بەرگری لەسەربەستیی‌و عەدالەت بکاو دڵدارو دولبەر بپارێزێ‌و دڵبەستەی شیعرو زانستیش بێ.

کەواتە ئەم سوارچاکە رەوشت بەرزە نموونەی هومانیستێکی رەسەنە. ئایدیای ئەو بیروبڕوای دژ بەدەرەبەگایەتییە کەلەسەردەمی رێنیسانسداو لەناوجەرگەی کۆمەڵگای دەرەبەگیدا سەری هەڵدا. بەڵام ئەو کۆمەڵگا نوێیەی لەجێی ئەو بنیاتنرا نەیتوانی خەونەکانی بهێنێتە دی. لەبەرئەوە لەلایەك جووتیارە دەوڵەمەندو دڵرەقەکان‌و لەلایەکی تریشەوە بازرگانەکان بەچاوی سووك تەماشایان دەکردو گاڵتەیان بەشێوەی بەرگریکردنی لەهەژاران‌و لێقەوماوان دەکرد.

"سێرڤانتس" بەبلیمەتیی خۆی توانی واقیع‌و هەڵوێستی توێژە کۆمەڵایەتییە تازەکان‌و ئەو ململانەیە دەرببڕێ کەنەبیری ئایدیالیزمی‌و نەخەونی رۆمانسییانە بۆیان چارەسەر نەکرا. کتێبی "دۆن کیشۆت" بەهۆی رەوانیی دەربڕین‌و شێوازە کۆمیدیاییەکەیەوە، ناوو شۆرەتێکی وای پەیداکرد، بەچەندین زمان وەرگێڕدراو دەیان جارو بەدرێژایی چەند سەدەیەك لەچاپ درایەوە.

* * *

# ئه نجام

لەبەر رۆشنایی هەموو ئەوانەی کەباسکران، بۆمان دەردەکەوێ سەردەمی رێنیسانس چرایەکی رۆشنی شارستانییەتی ئادەمیزادو قۆناغێکی مێژوویی پڕ لەدەرس و تاقیکردنەوەو دەستکەوتی گەورە گەورەیەو دەهێنێ لێی بکۆڵرێتەوەو شتی نوێی لێوە فێر بین. جالەبەرئەوەی رۆژگاری رێنیسانس یەکێکە لەو بابەتە مێژووییانەی سەدان مێژوونووس و خەڵکی تریش توخنی کەوتوون و بایەخیان پێداوە بەڵام تائێستایش بەریەرەڵڵایە بۆ ئەو کەسانەی مەبەستیانە شتی نوێ بخەنە سەر ئەو دەریا لەبن نەهاتووەو رۆژهەڵاتییەکانیش دەتوانن شتی تازەی لێ هەڵبهێنجن و شتی نوێ بخەنە سەر سامانی دەوڵەمەندی. دووریش نییە بەهۆی پشکنین و بەشوێنداگەڕانی تێکڕای ئەو دەستنووسە عەرەبی و ئیسلامییانەوە کە تائەمڕۆیش چاوەڕوانی لێکۆڵینەوەوتوێژینەوەی زانستیانەن و لەبەر رۆشنایی سەرچاوە رەسەنەکانی سەردەمی رێنیسانسی ئەورووپا، بتوانن ئەم ئامانجە زانستییە مەزنە بهێننە دی.

* * *

**پاشکۆ**

# ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ لەبەر رۆشنایی تاقیکردنەوەکانی ئەوروپای رۆژگاری ((رێنیسانس))دا *

**پێشکەشە بە((یەکێتی نووسەرانی کورد))**

---

* لێکۆڵینەوە لەژمارە ٤، ٥، ٦، ٧ی گۆڤاری کارواندا بڵاوکراونەتەوە. لەبەر گرنگی بابەتەکەو پەیوەندی بەم باسەوە بەباشمان زانی لەپاشکۆی ئەم کتێبەدا جارێکی تر بڵاوی بکەینەوە.

## چەند وشەیەك

کاتی خۆی چەند جارێك برایانی ((یەکیەتی نووسەرانی کورد)) داوایان لێکردم بەشداریی لەیەکێك لەکۆڕە سەرکەوتووەکانی یەکیەتیدا بکەم. ئەو کارەی، زۆر بەداخەوە، لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی بۆم نەکرا، هەرچەندە هەر ئەوسا کەوتمە کەڵاڵە کردنی ئەم بەرهەمە بۆی کەئێستە وا لە"کاروان"ی کۆڕیەدا بڵاوی دەکەمەوەو پێشکەش بەوانی خۆشەویستی دەکەم.پێم وایە لێکۆڵینەوەیەکی وەك "ئەدیبو ئەرکەکانی قۆناغ لەبەر رۆشنایی تاقیکردنەوەکانی ئەورووپای رۆژگاری رێنیسانسدا" شایانی ئەوەیە پێشکەش بە "یەکیەتی نووسەرانی کورد" بکرێ کەجێگەی رەوای لەقوڵایی دڵی هەموو رووناکبیرێکی دڵسۆزی کوردا بۆ خۆی کردۆتەوە، لەوانەشە هەر ئەوە پاکانەیەکی بچووکم لای ئەندامانی یەکێتی بۆ بکات کەبەرهەمی نازدارو سەرکەوتووی هەریەکەیان بۆتە هاندەرو بزوێنەری خاوەنی ئەم وتارەی بەلەش لێیار دوورو بەگیان لەناو جەرگەیاندایە.

## سەرەتا

تاقیکردنەوە زۆرەکانی مێژوو لەو رۆژەوەی نووسین پەیدا بووە تا ئیمڕۆی ئێمە روون و ئاشکرا نیشانیان داوە تەنها ئەو بەرهەمانە نەمرن کە ئاوازی رازاوەی پڕ لەجۆش بۆ خۆشی و ناخۆشی گەل دەڵێن. رۆژگاری رێنیسانس و بەسەرهاتە هەمەچەشنەکانی بەڵگەیەکی مێژوویی کەم هاوتان بۆ روون کردنەوەی ئەم راستییە.

رێنیسانس بەو سەردەمە دەگوترێ کە ئەورووپای دواکەوتوو هۆشی تێیدا هاتەوە بەرخۆی "لەسەدەی سیازدەوە تاوەکو سەدەی شازدە". ئەو ئاڵ و گۆڕە گەورەیە ئەنجامی هەرەسهێنانی قۆناغی دەرەبەگی و دەست پێکردنی قۆناغی سەرمایەداری بوو کە بۆ ئەوساکەی مرۆڤ هەنگاوێکی یەکجار گەورە بوو بۆ پێشەوە. دیارە دەبوو بەو پێیەش بیرە دواکەوتووەکانی رۆژگاری دەرەبەگی روو لەنەمان بکەن و بیری نوێی گونجاو لەگەڵ ئەرکە تازەکانی کۆمەڵدا جێگەیان بگرێتەوە. ئەوەیش بۆ خۆی فەرمانێکی هەروا ئاسان نەبوو، چونکە یاسای ژیان کارێکی ئەوتۆی کردووە هەڵکەندنی رەگو ریشەی چەسپاوی بیری کۆن هەمیشە پێویستی بەهەوڵ و کۆششی بێوچان و ورد بێ. لە رۆژگاری رێنیسانسدا جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە قورسە کەوتە ئەستۆی پێشڕەوی دەستەی روناکبیری ئەو قۆناغەی ئەورووپاوە[1].

**ئەوساکە سەرتاپای ئەوروپا گیرۆدەی زنجیرەیەك گیروگرفت و کێشەی کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی نالەبار هاتبوو. گیروگرفتەکانی وەك دێومزمە چۆکیان بەسەر سنگی کۆمەلانی خەلکدا دابوو، سەریان لێ شێواندبوون و ژیانیان پێ تال کرد بوون بێ ئەوەی لەسروشتیان تێ بگەن تا بتوانن خۆیانیان لەدەست قوتار بکەن. یەکەم نمونە و بەلگەمان کلێسە و پیاوەکانییەتی.**

---

[1] زیاتر مەبەستمان ئەورووپای رۆژئاوایە.

ئاینی عیسایی کەدەورویەری دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر پەیدا بوو هەنگاوێکی گەورە بوو بەرەو پێشەوە، لەسەرەتاوە کۆیلەو چەوساوانی ناوچەیەکی گرنگی جیهان دەورەیان داو، بەگیان پارێزگارییان لیٚ دەکرد، کەچی فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی ڕۆمای کۆن‌و دیارە هەر لەبەرئەوەش بەلایەنی کەمەوە سیٚ سەدە بەرەنگاری هاتن‌و بەهەزار جۆر ویستیان لەناوی بەرن.

دوژمنایەتی ئاینی عیسایی بەفیڕۆ ڕۆیی‌و تادەهات زیاتر رەگی لەناو چەوساوانداداکوتاو زیاتر وەك هێزێکی بزوێنەری ژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی خۆی دەنواند، ئەوەی فەرمانڕەوایانی ناچار کرد سەرنجی بدەنیٚ‌و هەوڵ بدەن کەڵکی لیٚ وەربگرن.

ئەو راستییە سەرەتای سەدەی چوارەم تێکەڵ بە ڕووداوێکی ناوخۆ بوو کەپێکڕا بوونەوە هۆی هەڵگەڕانەوەی هەڵوەستی پاشایانی ڕۆما بەرامبەر بەکڵێسەو ئاینی عیسایی.

ئەو کاتە، واتە سەرەتای سەدەی چوارەم، لەسەر تەختی پاشایی دوویەرەکییەکی گەورە لەنێوان چوار دەسەڵاتداری ڕۆمادا دەستی پیٚ کرد. یەکێك لەو چوارە کەناوی قوستەنتین بوو دروست هێزو توانای گاورەکانی نرخاند، بۆیەکا خۆی لیٚ نزیك خستنەوەو پەیمانی دانیٚ کە ئەگەر بێتوو یاریدەی بدەن تاجی شاهی بنێتە سەر ئەوسا ئەویش یەکسانی دەداتە ئاینی عیسایی‌و وەك ئاینەکانی تر رەفتاری لەگەڵ دەکات.

ئەوەبوو قوستەنتین ساڵی ٣٠٦ بەمەرامی خۆی گەیشت‌و بۆ ماوەی ٣١ ساڵ بەناوی قوستەنتینی یەکەمەوە پاشایی کرد (ساڵی ٣٣٧ کۆچی دوایی کرد). قوستەنتین گفت‌و پەیمانەکانی خۆی بردەسەر‌و ئازادیی بەگاوران بەخشی‌و هەرچی خانوویەرەو زەوی‌و زاری زەوت کراوی کڵێسە هەبوو بۆی گێڕایەوە.

لێرەوە ئاڵوگۆڕێکی زۆر گەورە لەژیانی کڵێسەو ڕێبازیدا دەستی پیٚ کرد. لەساڵی ٣٢٥ەو عیسایی بووە ئاینی رەسمیی دەوڵەت‌و کڵێسە دانی بەوەدا نا کە قوستەنتین سەرۆکی باڵای دین‌و دنیاو نوێنەری عیسای پێغەمبەرە (د.خ). هەرچەندە قوستەنتین بۆ

خۆی پیاوێکی دڵڕەق‌و خوێن ڕێژ بوو، تەنانەت دەستی چووە گیانی ژنێکی‌و یەکێك لەکوڕەکانی‌و ژمارەیەکی زۆر لەخزمانی‌و هەر لەبەرئەوەش سەیر نییە ئەگەر بڵێین تا بەر لەماوەیەکی کەم لەمردنی نەبووە عیسایی.

بەو جۆرە کڵێسە تادەهات زیاتر تێکەڵ بەژیانی دونیاو سیاسەتی ڕۆژانەی ئیمپراتۆری ڕۆمانی دەبوو تەنانەت وا پێوەی لکا ساڵی ٣٩٥ لەگەڵ دابەش بوونی ئەوداو بەدەستووری ئەو ئەمیش بوو بە دوو بەشەوە –کڵێسەی ڕۆژئاوایی ڕۆمانی‌و کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی بیزەنتی[٢]. ساڵی ١٠٥٤ ئەو دابەشبوونەی کڵێسە بەدروستبوونی کڵێسەی کاتۆلیکی ڕۆژئاوایی‌و کڵێسەی ئەرتەدۆکسیی ڕۆژهەڵاتی تەواو چەسپا. یەکەمیان، واتە کڵێسەی کاتۆلیکی ڕۆژئاوایی، لەسەرەتاوە شوێنی دیارو کاری گەورە بوو لەجیهانی عیساییدا. سەرۆکی ئەو کڵێسەیە لەسەدەی پێنجەمەوە نازناوی "پاپا"ی بۆ خۆی هەڵبژارد کەواتای "باوك" دەگەیێنێ، دەیویست بەو نازناوەی وا رابگەیێنێ کەئەو باوکی ڕۆحی گشت گاورانە. ڕۆژبەڕۆژ دەسەڵاتی پاپا فراوانتر دەبوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی سێبەری کڵێسە دەرەبەگان‌و فەرمانڕەوایانی لەجاران زیاتر حەواندەوە. کار گەیشتە بەوەی میران‌و پاشایان‌و گەورە پیاوانی ئەورووپا ڕیزیان دەبەست تاوەکو بەماچ کردنی پێی پاپا شاد ببن[٣]. یەکێك لەپاشاکانی ئیمپراتۆریی ڕۆمانی ناچار بوو بەخۆی‌و دەستەو دایەرەیەوە سێ‌شەوو سێ ڕۆژی ڕەبەق بەڕووت‌و قووتی لەبەردەمی قاپیی کۆشکی پاپادا بووەستێ بۆ ئەوەی لە زەللەیەکی خۆش بێ!.

بەو جۆرە کڵێسە بووە بەشێکی بنەڕەتی ڕژێمی دەرەبەگی‌و یەکێك لە دامودەزگا هەرە گرنگ‌و کاریگەرەکانی. کڵێسەو پیاوانی بەدەستووری دەرەبەگە گەورەکان

---

[٢] لەبەر چەند هۆیەك کەئێرە جێگەی باسیان نییە ئیمپراتۆری ڕۆمانی کۆن ساڵی ٣٩٥ بووە دووبەشەوە یەکەمیان هەر بەو ناوەوە مایەوەو بەشی ڕۆژئاوای ئەو وڵاتە کۆنەی گرتەوەو ئەوەی تریشیان بەناوی ئیمپراتۆری بیزەنتییەوە بەشی ڕۆژهەڵاتی گرتەوە.

[٣] J.R. Strayer, H.W.Gatzke, E.H. Harbison, The Mainstream of Civilization, the Second Edition, NewYork, 1974, P.375 .

بەهەزار ناوو بیانووەوە کەوتنە زەوتکردنی زەوی‌و زار. تا ڕۆژی ڕێنیسانس هەڵهات کارگەیشت بەوەی بەلایەنی کەمەوە سێ‌یەکی زەوییە هەرە بەپیت‌و بەرەکەتەکانی زۆریەی وڵاتانی ئەورووپا بکەوێتە دەست کڵێسەو پیاوەکانییەوە کەبەهەمان شێوازی باوی ئەوسای دەرەبەگی کەڵکیان لێی وەردەگرت‌و بگرە جاری وا هەبوو ئەوانی جووتیارانیان خراپتر دەچەوساندەوە بەوەی تەماعی گوایە مسۆگەر کردنی ئەوە دونیایان پێدەدان. تێکەڵی نێوان کڵێسەو دامودەزگای دەرەبەگی وا قووڵ بۆوە کەبەر لەڕێنیسانس ژمارەیەکی زۆر لەمولکدارە گەورەکانی ئەورووپا هەمان کات بوونە کاربەدەست‌و فەرمانبەری گەورەی کڵێسە[1]. باشەوەیش بڵێین کەئەوساکە فەرمانبەرو کارگێڕو کاربەدەستانی کڵێسە لەشکرێك بوون بۆ خۆیان، ژمارەیان دەگەیشتە ٧٠٠هەزار کەس لەکاتێکدا هەموو دانیشتوانی ئەورووپای ئەو سەردەمە بەسەریەکەوە بریتی بوون تەنها لە ٤٦ملیۆن کەس[*]. هەمان کات کڵێسەو قەشەکانی دەستیان تێکەڵی بازرگانی‌و پیشەسازی کردو کار نەما نەیکەن.

کەوابێ کڵێسەو ڕژێمی دەرەبەگی بوونە گیانێك‌و تەنێك، لەبەرئەوە کاربەدەستانی یەکەمیان لەڕێگەی بیریشەوە کەوتنە خزمەتی دڵسۆزانەی دووەمیان. بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستەیان بەدەیان بیروباوەڕی نوێیان بەناوی ئاینەوە داتاشی کەسەرتاپایان دوورکەوتنەوەی ڕاستەوخۆبوون لەماك‌و ناوەڕۆکی عیسایی. یەکێك لەو بیروباوەڕە دەستکردە ترسناکانەیان دەیگوت هەرچی لەژیانی ئیمڕۆدایە نەگۆڕەو دەست بۆبردنی "دەست تێوەردانە لەکاری خوای مەزن". هەروەها ئەوان وایان بردبووە مێشکی ساکارانەوە کەمرۆڤ بەسروشت تاوانبارەو لەڕێگەی کڵێسەوە نەبێ هەرگیز بۆی

---

[1] بڕوانە:
C.L. Becker and K.S. Cooper, Europe since 1600, New Jersey 1964, p.28.

[*] D. Hay, Europe in the fourteenth and fifteenth centuries, London, 1966, p.59.

سیەخۆی لەبەندی تاوانەکانی قوتار بکات. وردکردنەوەی ئەو "شەکرانە" مانای ئەگوڕینی رژێمی دەرەبەگی و بەستنەوەی خەڵکیان بەکڵێسەوە دەگەیاند. بۆ ئەوەش کە سەرۆ نەکەونەوە فەرمانڕەوایانی کڵێسە لەسەرەتای سەدەی سیازدەمینەوە خوێندنەوەی تەورات و ئینجیلیان بێ یاریدەی قەشەیەك قەدەغەکرد. واتە ئەوەی پێویستایە بەرهەمێکی ئاینی کۆن بخوێنێتەوە دەبوو پەنابەرێتە بەر یەکێك لەپیاوانی کڵێسە کەئەویش، بێگومان، بەمەرامی دڵی پاپاو کاردینالەکان ناوەڕۆکی بۆ لێك دەدایەوە. جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە بۆ ئەوسای ئەورووپا کارێکی گران نەبوو چونکە پیاوانی کڵێسە تاکە دەستەی خوێندەواری کۆمەڵ بوون.

دیسان بەر لەهەڵهاتنی رۆژی رێنیسانس کڵێسە لەڕاستیدا بووە بەدەوڵەت لەناو دەوڵەتدا، لەشکری سەربەخۆو دەزگای کارگێڕی و دارایی تایبەتیی خۆی هەبوو، شەڕی هەڵدەگیرساندو تێکەڵ بەشەڕی دەوڵەتان دەبوو. بەو جۆرەش تا دەهات ئەرکی سەرشانی پەرەی دەسەندو زیاتر ئاتاجی پارەو پووڵ دەبوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی کەهیچ جیاوازییەك لەژیانی سەردارانی ئەوو میرو پاشایانی ئەورووپادا نەما. لەبەرئەوە پاپاو کاردینالەکان هەر رۆژەی بەندو باوێکی نوێیان دادەمەزراند تازیاتر گیرفانیان بەزێڕ بئاخنن. لەوەدا قەشەو پیاوە ئاینییەبچووکەکانی تریش پڕ بەدڵ پشتگیرییان دەکردن چونکە بایەخدانی ئەوانیش بەژیان گەیشتبووە رادەیەکی ئەوتۆ بەدەگمەن، وەك سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان باسی دەکەن، توخنی کڵێسەو کاری ئاینی دەکەوتن[٦].

مشتێکی زۆر بچووك نموونەیەکی زۆر گەورەی ئەو خەروارەیە. پاپاکان ئاشکرا کەوتنە فرۆشتنی ناوو نازناوو پایە ئاینییەکان، ئەوەی زۆرتری بدایە شوێنێکی چاکتری بەردەکەوت، جاخوای دەکرد ئەو کەسە دز یاجەردەو پیاوکوژ دەبوو. پاپاو

(٦) Ibid, pp. 131-132; C. Hayes, Modern Europe to 1870. NewYork, 1959, p.135

کاردینالەکان بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکو زۆر بێ شەرمانە دەستیان دایە فرۆشتنی "نوشتەی تاوان رەوێن" (صك الغفران) کەلەکۆتایی سەدەی یازدەدا بۆ هاندانی گاوری بۆ بەشداریکردن لەشەڕی خاچداراندا دامات، بەڵام ئەوسا کڵێسە بەمفت دەیدایە خەڵکی نەك بەپارە. کەچی زۆری نەبرد سەردارانی کڵێسە "نوشتەی تاوان رەوێنیان" خستە بازاڕی رەشەوەو کەوتنە فرۆشتنی، کەم کاریتر بەرادەی ئەو کارە بووە هۆی بەرەڵابوونی جڵەوی خراپەو خراپەکاری لەئەوروپادا، بەتایبەت لەنێوان پارەدارلند چونکە بەپێی فەرمایشتی پیاوانی کڵێسە هەرکەس دەیتوانی بەر لەمردن لێخۆشبوونی یەزدان لەتاوانەکانی بەکرینی یەکێك لەو نوشتانە بنیات بنێ. سەیر ئەوەیە پاپ دەیفەرموو ئەو نوشتانە تانرخیان نەدرێ ناکەونە کار [٧].بەر لەڕێنیسانس کار گەیشت بەوەی خەڵکی بتوانن "نوشتەی تاوان رەوێن" بەقیست یان بۆ بەشێك لەگوناهەکانیان بکڕن. بەڵام تەنانەت بەرچاوی پیاوە ئاینییەگەورەکانی نەگرت، بۆیەکا بەندێکی نوێیان هێنایە کایەوە بەوەی "مافیان" دا بە هەرکەسێك بیەوێ لێخۆشبوونی یەزدان لەتاوانی مردوەکانی بەکرینی نوشتەیەك لەو نوشتانە مسۆگەر بکات[٨]. واتە ئەوساکە کوڕی هەر ستەمکارێك بۆی هەبوو بەپارە بەئەوپەڕی رێزەوە باوکی رەحمەتی لەدۆزەخەوە بگوێزێتەوە بۆ بەهەشت. ئەوەی جەنگیزخان و هۆلاکۆو تەیموری لەنگ لەبەرئەوەی پارەدار بوون دەیانتوانی بەهەشت بۆ ئەوان و بۆ خۆیشیان قۆرغ بکەن، "زۆڵە" زرینگەکانی ئەو رۆژگارە دەیانگوت:

"خواوەندی گەورە حەز بەمردنی تاوانبار ناکات، دەیەوێ بژی و هەر پارە بدات"[٩].

ئەمەش بەشێك لەناوەرۆکی یەکێك لەو نوشتانەیە کەدەیگوت:

---

[٧] E.S. Crosby, Reformation amd and the Reformers, Amsterdam, 1963, p.95.

[٨] Ibid, p. 57; H.J. Grimm, The , Reformation Era 1500- 1650, fourth printing , NewYork, 1958, pp. 49-51.

[٩] بڕوانە: ر. موسجروف سكوب، تراث النهضة،- "تاريخ العالم"، المجلد السادس، ص٤٣.

"...یەکەم لەگشت لۆمەیەکی ئاینی بەهەر جۆرو شێوازێك دووچاریان هاتبیت رزگارت دەکەم، ئینجا لەهەموو تاوانەکانتو لەسەرتاپای ڕابوردنەکانت چەند زۆرو گەورە بن... بەپێی دەسەڵاتی پیرۆزی کڵێسە لەهەر سزایەك کەلە ئەعرافدا[10] لەسەر ئەو گوناهانە دەبێت بیچێژێت قوتارت دەکەمو دەتگێڕمەوە ئەو ڕۆژەی تێیدا کۆرپەیەکی پاكو خاوێن بووی. لەبەرئەوە کەکۆچی دواییت کرد دەرگەی ئازارت لێ دادەخرێو دەرگای خۆشیو بەهەشتت بۆ دەکرێتەوە...".

دێرەکانیش کەسەرەتای پەیدابوونیان جێگەی برایەتیو یەکسانی بوون لەسەدە ناوەنجییەکاندا بوونە سەرچاوەیەکی تری پارە هەڵڕشتن بەسەر پیاوە ئاینییەگەورەکاندا. بۆ ئەوەی زەویو زاری کڵێسەو موڵکەکانی لەدەست نەچن جەنابیان وایان بەباش زانی قەشەکان تادەمرن "بوخچەی نەکراوە"بن، ئافرەتیان شوو نەکاتو پیاویان ژن نەهێنێ. ئەوەش بۆ خۆی دێرەکانی ئەوسای کردە جێگەی خراپەو رابواردن. یەکێك لەپاپاکانی ئەو رۆژگارە کەناوی ئەنۆسێنتی سێیەم بوو ١١٩٨- ١٢١٦) بۆخۆی لەبەڵگەیەکدا دەربارەی "دێری ئاگاشا" نووسیویە دەڵێ ئەو دێرە "گشت ناوچەکانی پیس کردووە". سەرچاوەیەکی تری ئەوسای کڵێسە باسی ئافرەتێکی کردووە کە کارگێڕی یەکێك لەدێرە گەورەکان بووەو دەڵێ "شەو نەبوو بەمەی خۆی کاس نەکات". بەڵگەیەکی تری کڵێسەی هەر ئەوسا باسی ئافرەتانی ناو دێرێکی ئینگلیزی بەم جۆرە تۆمار کردووە: ئەوان گوێیان نەدایە فەرمانی پاپا کەدەیگوت دەبێ دەست لەبەرەڵڵایی هەڵگرن؛ دوای ئەوەی فەرمانەکەی پاپایان دایەوە بەدەمو چاوی ئەو قەشەیەدا کەبۆی هێنابوون "سوێندیان خوارد کەتا مردن دەست لەرابواردن هەڵنەگرن"[11].

---

[10] ئەعراف یا "مطهر" بەو شوێنە دەگوترێ کە گوایە کەوتۆتە نێوانی دۆزەخو بەهەشتەوە. وشەی "الأعراف" لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە.

[11] بڕوانە: الدکتور عبدالقادر أحمد الیوسف، العصور الوسطی الأوروبیة، صیدا- بیروت، ١٩٦٨، ص٢٤٨-٢٤٩

هەموو ئەوانەی باسمان کردن و گەلێك لایەنی تری ژیانی وەك ئەوان بوونە هۆی دروستبوونی نارەزاییەکی زۆر لەناو کۆمەڵانی خەڵك و بەتایبەت لەناو رووناکبیرە دووربینەکانی ئەو رۆژگارەی ئەورووپادا کەکەوتنە رەخنەگرتن لەکڵێسەو پیاوانی ئاینی و رەفتارە ناهەموارەکانیان. ئەو نارەزاییە هەندێ جار شێوەی بزووتنەوەی وەردەگرت. دیارە فەرمانڕەوایانی کڵێسەیش دەسەوسان نەوەستان، دەست و برد کەوتنەخۆ بۆ لێدان و دامرکاندنەوەی چالاکییەکانی ناحەزانیان کەبوویوونە یەکێك لەنیشانەو بەڵگەکانی هەرەسهێنانی سەرتاپای رژێمی دەرەبەگیی ئەوسای ئەورووپا. ئەوەبوو لەسەرەتای سەدەی سیازدەمینەوە دەستیان کرده دامەزراندنی دادگەیەکی تایبەتی سەر بەخۆیان کەبە دادگەکانی پشکنین[12] ناسراون. هیچ مێژوونووسێك نییە ئیمرۆکە راستەوخۆ دان بەوەدا نەنێ ئەو دادگایانە لاپەڕەیەکی رەش و سیای ئەورووپان کەمێژوو کەم لەهاوتایانی بەخۆیەوە بینیوە.

دادگاکانی پشکنین بەنهێنی کاریان دەکرد، خراپترین جۆری ئازاردانیان بەکار دەهێنا. ئازاردەرانی دەستەیەکی نەزان و نەفام و چاوبرسی بوون، کڵێسە وای بردووە مێشکیانەوە کەگوایە بەو کارەیان بەهەشتی پڕ لە مەی و پەری بۆ خۆیان و نەوەیان بنیات دەنێن. هەروەها بەشێك لەسامانی ئەوانەی دەکەوتنە بەردەستیان و بەزەبری قامچی ناچار دەبوون خۆیان بەتاوانبار دابنێن بەر ئەوان دەکەوت. لەبەرئەوە زۆر بەدەگمەن هەبوون بتوانن تاسەر دان بەخۆیاندا بگرن. جاری واهەبوو ئازاردانیان چەند ساڵێکی دەخایاند. بەوێنە زانای گەورە جۆردانۆ برۆنۆ (١٥٤٨ - ١٦٠٠) هەشت ساڵی رەبەق ئەو ئازارەی چێشت.

بەو جۆرە بەسەدان هەزار رۆڵەی دڵسۆزی ئەورووپا بوونە قوچی قوربانیی دادگە دواکەوتووەکانی پشکنین. سەیر ئەوەیە ئەوانەی تاوانبار دەکران سەریان نەدەپەڕێنرا وەك ئەوسا لەئەورووپا باو بوو. بەڵکو دەسووتێنران گوایە لەبەرئەوەی کڵێسە بەخێوی

---

[12] "محاكم التفتيش".

دژی خوێن ڕشتن بوو!. هەروەها بەپێی فەرمانی پاپا دەبوو دەزگاکانی مەیری تلولنبارەکان بسووتێنن چونکە کلێسە بۆخۆی دەستی نەدەچووە گیانی خەڵکی!!.
هەر کەسیش تاوانبار دەکرا ئەوەی لەسامانی بێبەری دەکراو کلێسەو پیاوەکانی دمبوونە وەچەی!!! زۆری ئەبرد بەپێی بڕیارێکی تایبەتی دادگەکانی پشکنین مافی "سزادانی" مردوانیشیان وەرگرت و کرێگرتەکانیان زۆر بێ شەرمانە گۆڕی هەزارانیان هەڵتەکاندو پاشماوەی ئێسك و پروسکی لاشەکانیان سووتاندن و بەو بیانووەوە کەوتنە زموتکردنی هەر خانوبەرەو زەویوزارێك بەناویانەوە بەجێمابوون.

لەبەرئەوانەی باسمان کردن هیچ سەیر نییەکاتی خۆی خەڵکی نازناوی "خوێن ڕێژ"یان بۆ ژمارەیەك لەپاپاکان هەڵبژارد بوو، وەك ئەسکەندەری شەشەم (١٤٩٢-١٥٠٣) کەناشیرینی رەفتارەکانی کارێکی ئەوتۆی کرد هەموان، بەکاتۆلیك و پرۆتستانت و بەئیماندارو بێئیمانەوە زۆر بەتوندی رەخنەی لێ بگرن و لۆمەی بکەن[13]. داهاتی ئەو پاپایە خۆی لەنزیکەی دوو ملیۆن دۆلار دەدا[14]. کە سەدان ملیۆنی ئەمڕۆی دەکرد.

دەستەو دایەرەی پاپا لەکوێ بۆیان بلوایە لەوێ زیاتریان بەخەڵك دەکرد. ئەوەی لەئەڵمانیای دابەش دەیانکرد بەکتێبیش تەواو نابێ. لێرەدا تەنها یەك نموونەی مانادار دەهێنمەوە. پیاوە ئاینییەکانی ئەوسای ئەو وڵاتە باجیان لەمەیخانەو لەکارخانە وەردەگرت و تەنانەت پاکانەیان بۆ ئافرەتی بەرەڵڵا دەکردو دەیانفەرموو تاوانی ئەوانەش کەدەچنە باخەڵیان لەو بابەتەیە کەیەزدان بەئاسانی لێی خۆش دەبێ.
لەبەرئەوە هیچ سەیر نییەلەسەدەی چواردەو پازدەمیندا نەخۆشیی سووزەنەك لەئەڵمانیادا بەجارێك تەشەنەی سەندو کەوتە دروێنەی گیانی دەیان هەزار کەس.

سەرباری گشت ئەمانە، کلێسە بەئاشکرا دژی بزووتنەوە نەتەوەییەکان و پەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو بوو چونکە هەردووکیان دەبوونە هۆی وریابوونەوەی

---

(13) E.S. Crosby, Op. Cit p.240.

(14) Ibid, p.239.

چەماوەرو کەم بوونەوەی دەسەلاتی خۆی. هەر لەبەرئەوەش کلێسە دژی بلاوبوونەوەی خوێندن و خوێندەواریی بوو، سەرەتا بەریەرەکانییەکی زۆری چاپخانەی نوێی کردو لەوساوە دەستی دایە بلاوکردنەوەی لیستەی تایبەتی بۆ ناوی ئەو بەرهەمە ئەدەبیی و زانستییانەی لای پەسەند نەبوون و لەبەرئەوە قەدەغەی دەکردن.

بەهەمان دەستوور ئەورووپای بەر لەپێزگاری رێنیسانس دووچاری زنجیرەیەکیتر گیروگرفت و کێشەی کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسیی تێکهەلکێش هاتبوو. رژێمی دەرەبەگی و شێوازی چەوساندنەوەی ئەو رژێمە و ئەنجام و دیاردەکانی بوبونە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم رەورەوەی پێشکەوتنی گشت گەلانی ئەوسای ئەورووپادا. بادەی خۆشی ناو کۆشک و قەلا گەورەکانی دەرەبەگەکانی ئەوسا بەخوێن و فرمێسک و ئارەقی ناوچەوانی هەزاران دەگەڕا. لێرەشدا مشتێکی زۆر بچووک نمونەی خەروارێکی تەڵ گەورەیە. جوتیارانی سەدە ناونجییەکانی ئەلەمانیا دەبوو پاش مردنیش باج و سەرانە بدەنە ئاغا زیندووەکانیان. ئەوەی ئەو مردوانە مافیان نەبوو دەست بۆ ئەو میراتە بەرن کەبۆیان دەمایەوە بەرلەوەی سێیەکیان لەگەل مشتێك پارەدا پێشکەش بەئاغا دەکرد ئەو باجە ناوی خۆی بەخۆیەوە بوو– "مردوانە".

چەوساندنەوەی بێ ئەندازە جوتیارانی ئەورووپای لەژیان وەڕس کرد کەبەر لەکۆتایی سەدە ناونجییەکان بەسەدان هەزاریان ناچار بوون لەزۆر ناوچەو مەلبەندا پەنا بەرنە بەر چەك. سالی ۱۵۱۷ نزیکەی ۹۰هەزار جوتیاری ستێریا لەئەلەمانیا بۆ ماوەی سێمانگ لەسەر یەك بێ وچان کەوتنە پەلاماردانی کۆشک و تەلاری ئاغاکانیان. ژمارەی تەنها قوربانییەکانی شۆڕشی گەورەی جوتیارانی ئەلەمانیا لەسالی ۱۵۲٤– ۱۵۲٥دا خۆی دەدە لەنزیکەی سەد هەزار کەس[15]. بۆ ئەوەی باشتر لەهۆو ئامانجەکانی ئەو جۆرە راپەڕینو

---

[15] هیچ سەرچاوەیەك ژمارەی قوربانییەکانی ئەو شۆڕشەی بە لە ٥٠هەزار کەمتر لەقەلەم نەداوە بەوێنە بڕوانە:

(C. Hayes Op. Cit. P.143)

شۆڕشانە تێبگەین کورتەی ناوەڕۆکی ئەو "خەوە" دەهێنینەوە کەگوایە شوانێکی ئەو سەڵتە بینوییە. ساڵی ١٤٧٦ هانز کەشوانێکی ئەڵەمانی بوو رایگەیاند گوایە "دایکی یەزدان هاتۆتە خەوی‌و پێی گوتووە دەسەڵاتی ئاسمان بۆ سەر زەمین نزیك بۆتەوەو ئیتر نەپاشاو نەمیرو ئاغاو نەپاپا ناویان لەناواندا نامێنێ‌و هەموو پیاوان دەبنە براو ئافرەتانیش دەبنە خوشکی یەکترو وەك یەك دەبنە خاوەنی زەوی‌وزارو لەوەڕگەو جەنگەڵ‌و دارستان...". ئەو "خەوە" خۆشە بەس بوو بۆ ئەوەی بەهەزاران دووی هانز کەون.

لەژێر سایەی رژێمی دەرەبەگیدا زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا دابەش‌و لێك دابڕاو بوون. ئەڵەمانیا، بەوێنە، ئەوساکە لە دەیان میرنشینی دوژمن بەیەك پێکهاتبوو. شارە گەورەکانی ئیتالیاش هەریەکەیان دەوڵەتێك بوو بۆ خۆی. هەربەو پێیەش لەسەرتاپای ئەورووپادا زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو نەبوو. زمانی وا هەبوو لە دە دیالێکت‌و پتر دروست بووبوو. چین‌و دەستەکانی سەرەوەی کۆمەڵ بەلاتینی دەدوان‌و هەر ئەویشیان بۆ نووسین‌و خوێندن بەکاردەهێنا. لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا دەبوو بەچرای رۆن گەڕچەك بەدوای کوێرە خوێندەوارێکدا بگەڕایتایە. رشانەوەو لەرزوتاو ئاوڵەو سورێژەو دەیان نەخۆشیی تری وەك ئەوان شانبەشانی برسێتی دروێنەی ژیانی هەزارانیان دەکرد. تەنها ئەو رشانەوەیەی ساڵی ١٣٤٨ لەچەند مەڵبەندێکی ئەورووپادا بڵاوبۆوە بووە هۆی مردنی سەدان هەزار کەس.

بەو جۆرە کڵێسەو رژێمی دەرەبەگی بەگشتی بوونە کۆسپ لەبەردەم هەموو پێشکەوتنێکی نوێدا. سەرەتاو ناوەندی سەدە ناوەنجییەکان ئەوە بۆ رژێمی دەرەبەگی‌و تایبەت بۆ کڵێسە لوا، بەڵام لەکۆتایی ئەو قۆناغە مێژووییەدا ئیتر بۆی نەدەلوا چونکە لەمناڵدانی کۆمەڵگای ئەوساکەی ئەورووپادا هێزو دەستەی نوێ دروست بوون کەدولڕۆژیان لەهیچ روویەکەوە لەگەڵ رژێمی دەرەبەگیدا نەدەگونجا. ئەوەی بووە هۆی پەیدا بوونی بیری نوێ کەبێ‌بەزەییانە کەوتە ئابڕووبردنی بیرە دواکەوتووە باوەکانی

ئەو رۆژگارە تاریکە. دەبوو نەشتەری تیژی رووناکبیرانی مەڵبەندە پێشکەوتووەکانی ئەوسای ئەورووپا بەر لەهەمووان بکەوێتە دادڕینی پەردە رەشە دەستکردەکانی کڵێسە. شاعیرو نووسەری گەورەی ئیتالیاو جیهان دانتێ یەکەم کەس بوو دەنگی زوڵاڵی بەرزکردەوەو پەردەی راماڵیوگشت ئەورووپای هەژاند.

## دانتێ و کۆمیدیای یەزدانی:

"هەزار ساڵی ژیان لەئاستی ئەمریدا تروکەیەکە"

-دانتێ-

بەهاری ساڵی ١٢٦٥ دانتێ ئەلجیری، لەناو خێزانێکی دێرینو ناسراوی فلۆرەنسەدا لەدایك بوو[١٦]. لەهەرەتی لاویدا تێکەڵ بەژیانی سیاسییو کۆمەڵایەتی فلۆرەنسە بوو کە ئەوساکە لەهەموو شارەکانی ئیتالیاو ئەورووپا بەناوبانگو پێشکەوتوتر بووە[١٧]، دانتێ لایەنی "پارتی سپییان"ی گرت کە لەبازرگانانو سەنعەتکارانی فلۆرەنسە پێکهاتبوو. ئەوانەی ئەوسا دەستەیەکی زۆر پێشکەوتووی کۆمەڵگای ئیتالیایی بوون. ساڵی ١٣٠٢ کاتێك ناحەزانی ئەوان کەبریتی بوون لەمیرو ئەرەستۆکراتی دەسەڵاتیان وەرگرت فەرمانی هەڵواسینی دانتێیان دەرکرد. بەڵام بەوەی باش بوو لەو کاتەدا دانتێ لەدەرەوەی فلۆرەنسا بوو بۆیەکا، بۆ بەختی هەموان. بەردەست نەکەوت، لەگەڵ ئەوەش کە دانتێ وازی لەسپییەکان هێناو وەك خۆی دەیگوت "خۆم بوومەتە پارتی خۆم". ئینجا پاش سیازدە ساڵ کاربەدەستانی فلۆرەنسە دیسان فەرمانی خنکاندنیان دەرکردەوە، بۆیەکا تامردن نەیتوانی جارێکی تر بەفلۆرەنسای خۆشەویستی شاد بێتەوەهەرچەندە بێسوود تەقەلایەکی زۆریدا بۆ ئەوەی دەستی لێ هەڵبگرنو رێگەی گەڕانەوەی بدەنێ. کەئەوەی بۆ نەلوا کەوتە گەڕان بەو شارو مەڵبەندانەی ئیتالیادا

---

[١٦] دانتێ مانگی مایسی ساڵی ١٢٦٥ لەدایك بووە، بەڵام تائێستە ئەو رۆژەی تێیدا هاتۆتە دنیاوە بەتەواوەتی نەزانراوە.

[١٧] مێژوونووسان نازناوی "پایتەختی رێنیسانس"یان داوەتە فلۆرەنسە.

کەسەر بەفلۆرەنسە نەبوون[18]. لەو ساڵانەدا زۆرجار دووچاری نەبوونیو گێرمەو کێشە هات. دانتێ دوا شەش ساڵی ژیانی لەشاری رافنا بردە سەر تا رۆژی چواردەی ئەیلولی ساڵی ١٣٢١ چاوی لێك ناو هەر لەوێش نێژرا. شایانی باسە کاربەدەستانی ئیتالیا ساڵی ١٩٦٦. واتە پاش تێپەڕبوونی ٦٤٥ ساڵی رەبەق بەسەر کۆچی دوایی دانتێدا فەرمانی خنکاندنەکەیان هەڵوەشاندەوە.

دانتێ پیاوێکی ساکارو هێمن، لەسەرخۆو کەم دوو بوو. زانایەکی یەکجار زیرەكو خوێندەوارو ورد بوو، لەسەرەتای ئەورووپای ئەو رۆژگارەدا کەسێك نەبوو شان بدا لەشانی. کاتێکیش ئەو تێکەڵ بەکۆڕی ژیان بوو ئیتالیای نیشتمانی گەیشتبووە رۆخی ئاڵوگۆڕێکی ئابووریو کۆمەڵایەتی گەورە کەزۆر ئاتاجی لێشاوی شەپۆلێکی فرلوانی بیر بوو بۆ راماڵینی کۆنو چەسپاندنی نوێ. بێ ئەو شەپۆلە رەورەوەی ژیانو بەتەکانیش نەیدەتوانی هێدی بەرەوپێش بڕوا. دانتێی دوورو وردبین چەکەم کەس بوو درووست دەرکی ئەو راستییە گرنگو بایەخدارەی کرد.

بەر لەهەموان دانتێ هەستی بەوەکرد کەدەبێ ئەدیب بۆ گەل بنووسێ کەوابێ دەبوو هەر بەو زمانەیش بنووسێ کەهەمووان نەك دەستەیەکی تایبەتی، لێی تێدەگەیشتن. ئەو بۆچوونە شۆڕشێکی گەورە بوو بۆ کۆتایی سەدەی سیازدەمین کاتێك رووناکبیرانی ئەورووپا بەلاتینی بەرهەمی خۆیان بڵاودەکردەوەو نووسین بەزمانی نەتەوەیی بەلایانەوە پەشمو نزمی بوو. ئا لەو کاتەدا دانتێ خولیای زمانی ئیتالیایی دای لەکەللەیو بەپەرۆشەوە کەوتە سۆراخی دیالێکتەکانی[19]. زۆری نەبرد دەستی دایە دانانی بەرهەمی تایبەتی دەربارەی زمانی نەتەوەیی کە دەیگوت وەك "نانی جۆ" بۆ هەمووانە نەك بۆ دەستەیەکی بچوکی تایبەتی[20]. شایانیباسە دانتێ ئەو بەرهەمانەی بەزمانی

---

[18] ئەوساکە ئیتالیا بەسەر ژمارەیەك میرنشینی سەربەخۆدا دابەش بووبوو.

[19] H.B. Cotterill, Medieval Italy, NewYork, 1915, pp. 51- 544.

[20] زۆر خواردن هەن کەتەنها لەئاردی گەنم دروست دەکرێنو ئەوسا لەخوایێداوەکان بەولاوە کەسێکی تر دەستیان پێیاندا رانەدەگەیشت. وێڕای ئەوە نانی جۆ بۆ مەعیدە سووکترە وەك لەنانی گەنم، واتە هەزمی زمانی نەتەوەیی وەك نانی جۆ لەهەزمی نانی گەنم وەك زمانی لاتینی ئاسانترە.

لاتینی دادەنا چونکە دەیویست لەڕێگەیانەوە پاڵ بەنووسەرانی ئیتالیاوە بنێ بەزمانی زگماکی خۆیان بنووسن‌و سووریش دەیزانی کەسێکیان بێزیان نایەت توخنی ئەو بەرهەمانەی بکەون ئەگەر بەلاتینی نەنووسرێنەوە. هەرچی بەرهەمەکانی تری بوون دانتێ بەزمانی نەتەوەیی دایدەنان چونکە دەیویست لەڕێگەیانەوە بگاتە قوڵایی هەستو دەروونی زۆرینەی گەل. لەڕێگەی هەردووکیشیانەوە. واتە لەڕێگەی بەرهەمە لاتینییەکان‌و ئەوانەیان کەبەزمانی ئیتالی دایدەنان، توانی زۆر زوو کاریکاتە سەر دەستەیەك رووناکبیری ئەوسای ئیتالیا کە وایان لێ هات. بەپێی گوتەی خۆیان. لە"شیرینی شێوازی نووسینی نوێ تێبگەن"[21].

بەو جۆرە دانتێ ئەلجیری یەکەم بەردی گەورەی لە بناغەی دامەزراندنی زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەکانی ئەورووپادا بوو بە قەڵغانی پاراستن‌و گەشە پێ‌کردنی هەستو نەریتی نەتەوەیی‌و چەکی کاریگەری ریسواکردنی کۆن‌و بنیاتنانی نوێ‌و پێشخستن‌و بڵاوبوونەوەی ئەدەبی نەتەوەیی کەوەك نانی جۆی ئەو رۆژگارە بووە خۆراکی هەمولن. ئەو ئامانجە بەرزو رەوایانە وایان لەدانتێ کردبوو بەتوندی پەلاماری ئەوانە بدات کەخۆی وتەنی "هەوڵ دەدەن لەنرخی زمانە نازدارەکەمان کەم بکەنەوە". بەلام هەر بۆ خۆیشی زۆر زوو سەلماندی چۆن دەتوانرێ بەدروستی تەنانەت مەبەستی فەلسەفیش لەدوو توێی زمانی نەتەوەییدا رابگەیێنرێ. بۆیەکا زۆری نەبرد دڵسۆزێك نەما بیەوێ گوێ بۆ ئاوازی قەڵب‌و ناهەمواری ئەو جۆرە کەسانە رایەڵ بکات. هەموو وایان لێ هات لە"شیرینی زاری خۆیان تێبگەن".

یەکێك لەبەرهەمە زووەکانی دانتێ ناوی "ژیانێکی نوێ"یە کە دەورویەری سالی ١٢٨٣– ١٢٩٥ بەزمانی ئیتالی، نەك لاتینی، دایناوە[22]. لەو بەرهەمەیدا دانتێ بەشیعری

---

[21] أ.أ. جوبێر، دانتێ، بەزمانی رووسی، -((مێژووی جیهان))، بەرگی سێیەم، مۆسکۆ، ١٩٥٧. ل٦٣١.

[22] "خوێندنەوەی بەرهەمەکانی دانتێ"، دانانی دەستەیەك زانا، بەزمانی رووسی، مۆسکۆ، ١٩٧١. ل٥٩.

رلۆلوە یادی یەکەم خۆشەویستیی خۆی دەکاتەوە. ئەو خۆشەویستییەی لەتەمەنی نۆ ساڵیدا کتوپڕ هەستی پێ کردو تامردن لەکۆڵی نەبۆوە. لەو تەمەنەیدا دانتێ بۆ یەکەم جار کچێکی شۆخی لەخۆی گەورەتری بەناوی پاتریس پۆرتیناریەوە بینیو بەتیری عەشقی گرفتار بوو. هەرچەندە پاتریس نەبزوا، بەڵکە گاڵتەشی بەدانتێ دەهاتو مێردی بەدەوڵەمەندێك کردو لەهەرەتی لاویدا چاوی لێك نا. بەڵام بەهۆی خۆشەویستیی رەسەنی ئەوەوەو لەڕێگەی بەرهەمەکانییەوە چۆتە خانەی نەمرانەوە. راستە دڵی تەسکی دانتێ بەلووت بەرزیو زیاتر بەمردنی پاتریس گەردی لێ نیشت، بەڵام ئەوەمان بەخێر بۆ گەڕا چونکە دانتێی زیاتر خستە سەر رێگەی خوێندنەوەو پشکنینو نووسین کەدەبیویست بەهۆیانەوە خەفەتی قووڵیی دەروونی بڕەوێنێتەوە.

ناوەڕۆکی "ژیانێکی نوێ" زۆر لەچوارچێوەی تەسکی خۆشەویستی فراوانترە. دانتێ لەو بەرهەمەیدا گەلێك رووی ژیانی ئیتالیای دەوروبەری کۆتایی سەدە ناونجییەکانو فۆلکلۆرو ئەدەبی ئەوسای تۆمار کردووە. لەهەمووشی گرنگتر ئەوەیە دانتێ بە "ژیانێکی نوێ" زەنگی دەست پێکردنی قۆناغێکی نوێی بۆ نووسینی ئەدەبیی ئەورووپا لێدا. نیشانیدا چۆن ئەدیب دەتوانێ بەزمانی نەتەوەیی خۆی، هەستو نەستی رووداوێکی ئاسایی رۆژانەی مرۆڤ رابگەیێنێ. بەو جۆرە سەرەتای قوتاربوونی ئەدەب لەکۆتو زنجیری ژەنگاویی سەدە ناونجییەکان دەستی پێکرد. لەوساوە ئەو هونەرە گەورەیەی مرۆڤ سەری لەکۆڕی تەسکی ناو کۆشکو دیواری بڵندی قوتابخانە ئایینییەکان دەرهێناو رووی دەمی کردە هەموان. ئەو دەسکەوتە یەکێك بوو لەدیاردە گەورەکانی رێنیسانسو بووە هۆیەکی گرنگ لەو هۆیانەی رێگەیان بۆ ئاڵوگۆڕە شۆڕشگێڕییە قووڵەکانی ئەورووپاو دوای ئەو جیهان خۆش کرد.

پاش دەوروبەری دوازدە ساڵ دانتێ شاکاری "کۆمیدیای یەزدانی"ی پێشکەش بەئیتالیاو ئەورووپاو گشت جیهان کرد کەیەکێکە لەبەرهەمە ئەدەبییە دڵنسقە نەمرەکانی مرۆڤ. واپێ دەچێ دانتێ ساڵی ١٣٠٧ دەستی بەدانانی

"کۆمیدیای یەزدانی" کردبێ. گەر ئەو ساڵە دروست بێ ئەوا بەچواردە ساڵ لەدانانی هەر سێ بەشەکەی کۆمیدیا بۆتەوە چونکە ساڵی تەواو بوونی کە (١٣٢١)ە بەدروستی زانراوە.

"کۆمیدیای یەزدانی" کەگەورەو بەناوبانگترینی بەرهەمەکانی دانتێیە لەسێبەش پێکهاتووە: "دۆزەخ"و "ئەعراف"[٢٣]. و "بەهەشت". هەر بەشەشیان بریتییە لە ٣٣ سروود کە هەموویان بەسەریەکەوە پتر لە چواردە هەزار بەیتی رازاوە پێکدەهێنن.

دانتێ بەزمانی نەتەوەیی "کۆمیدیای یەزدانی"ی داناوە چونکە ئەو باسانەی لەوێدا هێناونییەوە گشتینو وەك دوایی لێیان دەدوێین زۆر بەوردی دەردەکانی کۆمەڵی پێ بیراز کردوون.. لەبەکارهێنانی زمانی نەتەوەییدا دانتێ وەستاییەکی گەورەی نواندووە کەدیالێکتی رەخسیوی تۆسکانیی کردۆتە بناغەو بەوشەی هەڵبژاردەو لەبلری دیالێکتەکانی تری زمانی ئیتالی زاخاوی داوەتەوەو تەواو دەوڵەمەندی کردووە. هەروەها سروودەکانی کۆمیدیای بەپەندی پێشینانو قسەی نەستەقی باوویاپیرانو فۆلکلۆری باوی نــاو کۆلانــان رازاندۆتــەوە. بــەو کــارەی دانتــێ ســامانێکی زۆری کەلــەپووری دەوڵەمەندی گەلەکەی لەفەوتان رزگار کرد کەبەو هۆیەوە تائیمرۆکەش بەرووبووی تۆیە ئەو سامانە وان لەسەر زاری ئیتالیاییەکان. سەرباری ئەوانەو هەر بەهۆیشیانەوە دانتێ بووە یەکەم کەس کە بناغەی زمانی ئەدەبی نەتەوەیی یەکگرتووی بۆ گەل ئیتالی دارشت.

"کۆمیدیای یەزدانی" پڕە لەوردەکاریی وەستایەکی هونەرمەند، هیچ دەسکەوتێکی ئەدەبیو ڕووناکبیریی رابوردوو نییە دانتــێ تێکهەڵکێشــی بەرهەمــەکانیو لەســەرو هەموویانەوە کۆمیدیاکەی نەکرد بــێ، هەرکەس بیەوێ تەواو لەناوەڕۆکی "کۆمیدیای یەزدانی" تێبگات دەبێ تاڕادەیەکی باش شارەزای فەلسەفەو ژیانی کۆمەلایەتیو

---

[٢٣] "خوێندنەوەی بەرهەمەکانی دانتێ"، دانانی دەستەیەك زانا، بەزمانی رووسی، مۆسکۆ، ١٩٧١. ل٥٩.

سیاسی‌و مێژوویی پێش سەدەی سیازدەمین بێ. بەپێی قسەی شارەزایان ڕۆژئاوالییەکان بۆ تێگەیشتنی جیهانی پانو بەرینی دانتێو وەرگێڕانی "کۆمیدیای یەزدانی" پێویستیان بە ١٥تا ٢٥ ساڵە[٢٤]. لەبەر ئەوە هیچ سەیر نییە لەدەزگا زانستییەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا تاوەکو ئێستەش کۆڕی تایبەتی بەلێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی بەرهەکانی دانتێوە خەریکن کەکۆمیدیا، وەك گوتمان، شاکاریانە.

ئەوانەی باسمان کردن بێگومان هەموویان گرنگو بایەخدارنو دەنگدانەوەی ئەرکەکانی قۆناغنو لەبەرئەوەش بەڕەوایی پایەی "کۆمیدیای یەزدانی"یان بەرزکردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لایەنێکی زۆر گرنگتر لەوان لەناوەڕۆکی کۆمیدیادا وەك تەوژم خۆ دەنوێنێ. وەك گوتمان دانتێ لەو بەرهەمەیدا وەستایانە پەردەی لەڕووی هەموو کەموکورتیو ناتەواوییەکانی کۆمەڵ راماڵیوە. لەکۆمیدیادا گوایە دەچێتە جیهانی پاش مردنو سەرەتا دەگاتە دۆزەخ. لەیەکەم سروودی دۆزەخەوە دانتێ کەوتۆتە پەلاماردانی ئەو پاپاو کاردینالو قەشانەی لەژیاندا خراپەیان کردووەو نوشتەی تاوان رەوێنیان فرۆشتووەو خزمەتی نیشتمانو گەلیان نەکردووە، ئەوانەی بەچاوبرسیو خۆفرۆش ناوی بردوونو لەڕیزی دزو جەردەو دڵڕەقانی جیهاندا داینــاونو سەرەوژێر هەڵیواسیونو ئاگری دۆزەخی بۆ کردوونەتە لانەی هەتایی. لەسروودی نۆزدەمینی دۆزەخدا، بەوێنە، توشی پاپا بۆنیفاتشۆی هەشتەم دێو بێ سڵ کردنەوە بەتاوانبارو بەرتیل خۆرو خائینو جەردەی کڵێسەو دوژمنی نیشتمان ناوی دەبات، بۆنیفاتشۆ لای دانتێ "پەڵەی شەرمو نزمییە بەناوچاوانی سەرتاپای مرۆڤەوە". دانتێ تەنانەت ئاشکرا ناوی کڵێسەش دەباو لەسروودی سیودووەمینی ئەعرافدا ئافرەتێکی خراپی کردۆتە نوێنەری.

"کۆمیدیای یەزدانی" بەتەرازوویەکی ورد زۆربەی گەورەپیاوانی کڵێسەی نرخاندووە، کەمترین چاکەی بۆ تۆمار کردوونو یادداشتی لەسەر داونەتەوە، بەوێنە ئەدریانی

---

[٢٤] بروانە: دانتي اليجري، الكوميديا الإلهية، المطهر، ترجمة حسن عثمان، الطبعة الثانية، القاهرة، ١٩٧٠، ص٤٧١.

پێنجەم لەئەعراف لەنزیك بەهەشتەوە داناوە[٢٥]. تەنها لەبەرئەوەی بۆتە پاپا ئیتر دەستی لەبەخیلی هەلگرتووەو دڵسۆزانە ئەركی سەرشانی جێبەجێ كردووە.

هەمان كات كەدانتێ پاپاو قەشە خراپەكانی بێبەزەییانە بەئاگری دۆزەخ دەسووتێنێ شاعیرو نووسەرە بت پەرستە گەورەكان دەنرخێنێ‌و بەچاوی رێزو خۆشەویستییەوە سەیریان دەكا، ئەوانیشی لەئەعراف لەنزیك بەهەشتەوە داناوە لەگەڵیان دەدوێ، یادی خزمەت‌و چاكەكانیان دەكاتەوە لەوەیش زیاتر، ڤێرجیلی ناوداری كردۆتە رێنومای خۆی، بەجووتە پێكەوە ئەعراف دەبڕن. ڤێرجێلی شاعیری بتپەرستی رۆمانی كەساڵی حەفتای پێش زایین لەدایك بووەو ساڵی نۆزدەی پێش زایین كۆچی دوایی كردووە، پیاوێكی زاناو داناو هەست ناسك‌و شەرمن، نمونەی رەوشت بەرزی‌و دڵسۆزی بووە. لەبەرهەمەكانیدا لەهەر شت زیاتر بایەخی بەمرۆڤ داوە، باسی جوتیارو شوان‌و كچە لادێی‌و جوانی سروشتی كردووە. ڤێرجیل نیشتمان پەرست بوو خۆزگەی بەو رۆژانە دەخواست كەرۆما تیایاندا بەهێزو یەكگرتوو بووە ئەوانەش بەسەر بوون بۆئەوەی ڤێرجیل لەرووەوە سەرنجی دانتێ رابكێشن. بەڵام دانتێ لەو هەڵبژاردنەید مەبەستێكی تریشی هەبوو، ڤێرجێلیش وەك رووناكبیرانی رۆژگاری رێنیسانس لەقۆناغێكدا دەژیا رۆژی نوێ لەكەلەوە سەری دەرهێنا بوو. ئەویش، وەك ئەولێ عەوداڵی تەوژمی گۆڕان بوو.

لەسییەمین سروودی ئەعرافدا ناوی پاتریس پۆرتیناری دێتە ناو كۆمیدیاوە، لەوەد دانتێ وردەكارییەكی هونەرمەندانەی كردووە، چونكە بەو پێیە پاتریس لە٣٠ سروودی ئەعراف‌و لە٣٢ سروودی دۆزەخدا ناوی نییە كەتێكڕا دەكەنە ٦٣، كۆی سێ‌و شەشی دەكاتە نۆ، بەهەمان دەستوور پاتریس لە ٣سروودی ئەعراف‌و لە٣٣ سروودی بەهەشتد ناوی هەیە كەپێكڕا دەكەنە ٣٦، كۆی شەش‌و سێش دیسان هەر دەكاتە نۆو دانتێش وەك باسمان كرد. لەتەمەنی نۆ ساڵیدا بوو كە پاتریس بۆ یەكەم جار تەلی دڵی توند هەژاند.

---

[٢٥] لەسروودی نۆزدەمینی ئەعرافدا ناوی هێناوە.

دوای ئەوەی دانتێ لەدوا قۆناغی ئەعرافدا تووشی یەکەم خۆشەویستی ژیان دەبێ تر ئەو دەکاتە ڕێنومای و لەگەڵی دەچێتە بەهەشت. هەرچەندە، بێگومان، خۆشەویستیی ڕەسەن هاندەری یەکەمی ئەو هەڵبژاردنەی پاتریسە، بەلام هەمان کات گومان لەوەش ناکرێ کەدانتێ بەو کارەی دەیویست نرخی بەرزی مرۆڤی هاوچەرخی خۆیو هەستی ڕێزی بەرامبەر ناوەڕۆکی عیسایی بدا، چونکە لەڕاستیدا دانتێ بەهیچ جۆر دژی ئاینی عیسایی نەبوو بەڵکو دوژمنی باوەکوشتەی ئەوانە بوو کەڕووی ڕستەقینەیان شێواندبوو، ئەوانەی لەژێر پەردەی ئایندا ئەوی نەدەشیا دەیانکرد.

لەدوابەشی "کۆمیدیای یەزدانی"دا دانتێ بەشێوازێکی دڵڕفێن باسی بەهەشت دەکات. بەهەشتی کۆمیدیا جێگەی ڕەوای دڵسۆزان و نیشتمانپەروەران و پیاوچاکانە، جێگەی ئەوانەیە کەلەژیاندا ئازاری کەسیان نەداوەو لەچاکەو دڵسۆزیو خزمەت و خۆشەویستیی بەولاوە شتێکی تریان نەزانیوە.

دانتێ ئەلجیری نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز بوو. ئەو دەیویست ئیتالیا یەکگرتوو، بەهێزو خاوەن دەسەلات بێ. هەرکەسێك ڕۆژێك لەڕۆژان خزمەتێکی ئیتالیای کردبێ ئەو ناوی لەکۆمیدیادا هێناوە. هەر بەوجۆرەش زۆر بەتوندی ڕەخنەی لەباری سیاسیی ئیتالیای سەدەی سیازدەمین گرتووە، بەجۆرێك دەیویست سەرنجی پێ ڕابکێشێ و هەستی پێ ببزوێنێ. ئەوەتا لەسروودی شەشەمینی ئەعرافدا ڤێرجیل و سۆردیلۆی شاعیری کۆنی ڕۆما یەکتر دەبینن، هەر کەناوی نیشتمان دێ هەردووکیان بەگەرمی باوەش بەیەکدا دەکەن[٢٦]. کاتێك دانتێ بەو جۆرە دەیانبینێ ماتەمینی دایدەگرێ چونکە پارچە پارچەیی و ڕەشبگیریی نیشتمانی بیردەکەوێتەوە کە "بۆتە کەشتییەکی بێ کەشتیەوان لەناو زریانێکی پڕ تەوژما". "یاسا چ دادێك دەدا ئەگەر کەشتییەکە بەدەست سەردارێکی لێهاتووەوە نەبێ؟" دوای ئەو پرسیارە دانتێ بەچاوی پڕ فرمێسکەوە ڕوودەکاتە قاپیی خواوەندی مەزن، دەیەوێ بزانێ چاوی ڕەحمەتی

---

[٢٦] هەردوو شاعیری ڕۆمای کۆن ڤێرجیل و سۆردیلۆ خەڵکی شاری مانتوا بوون.

لەئاستی نیشتمانی خۆشەویستیدا نوقاندووە یا کاری خێری بەدەستەوەیە بۆی. هەر لەوێدا دانتێ دەکەوێتە لۆمەی فلۆرەنسە کە "عەدالەت تێیدا تەنها لەسەر زارانە". کەدانیشتووانی کوژراوی پارەی مفتو پایەی بەرزن ئەی ئیتالیای خۆشەویست "رۆڵە زیندووەکانت کە وان لەناو یەك دیوارو یەك سەنگەردا دەست لەکوشتاری یەکتر هەڵناگرن. یەکتر لەتو کوت دەکەن"! . ئەی ئیتالیای کڵۆڵ "بڕوانەرە رۆخی دەریاکانتو ئینجا بڕوانە سەر سینەت بزانە لەهیچ قوژبنێکدا تروسکی ئاشتی بەدی دەکەیت؟".

دانتێ باش لەوە گەیشتبوو کەڕەوشت بەرزیی مەرجێکی بنەڕەتی سەرکەوتنی کۆمەڵە، لەبەرئەوە عەودالی مرۆڤی نموونە بوو. دەیزانی "هەزار ساڵ ژیان لەئاست ئەمریدا تروکەیەکە، ناوداریو شۆرەت چەشنی گیا سەوز دەبێو زوو وشك هەڵدێ" (سروودی یازدەمینی ئەعراف). بۆ دەربڕینی ئەو مەبەستە بەرزەی دانتێ گەلێک نموونەی جوانو ماناداری لە"کۆمیدیای یەزدانی"دا هێناوەتەوە. وەك بەڵگە ئەم دوو نموونەیەی سروودی پازدەمینی ئەعراف دێنمەوە:

لەپڕ ئافرەتێکی ترم بەدی کرد، فرمێسکی خەفەتو
توورەیی جۆگەی لەسەر گۆنای بەستبوو.
رووی دەمی تێ کردو وتی:
"ئەگەر تۆ سەرداری ئەو شارەی کەخواوەندانی
-کۆن- لەسەری پەلاماری یەکیان دا، ئەو
شارەی تیشکی هەموو زانستێکی لێوە دەدرەوشێتەوە،
ئەوا، ئەی پستراتۆس، تۆڵە لەو دوو
دەستە چەپەڵە بسێنە کە بەئاشکرا لە
گەردنی کیژۆڵەمان ئاڵان".
ئینجا ئەو سەردارە ناسکەم بەدی کرد، بەڕوویەکی

خۆشەوە پێی گوت:

"جا ئەگەر ئێمە سزای ئەوانە بدەین کەخۆشیان

دەوێن ئاخۆ دەبێ چی لەوانە بکەین کەڕقیان

لێمانە؟".

بەو جۆرە دانتێ یەکێك لەداستانە یۆنانییە کۆنەکانمان بۆ دێنێتەوە. گوایە لاوێك لەیەکێك لەشەقامەکانی شاری ئەسینادا ئاشکرا پەلاماری کچی سەرداری ئەو شارە پستراتۆسی[٢٧]. داوەو ماچی کردووە. شاژنی دایکی شێتگیر بووەو پستراتۆسی هاوسەری هانداوە تۆڵە لەو لاوە بسێنێ. ئەویش لەوەڵامدا بەهێمنی پێی گوتووە:

"جا ئەگەر ئێمە سزای ئەوانە بدەین کەخۆشیان

دەوێن ئاخۆ دەبێ چی لەوانە بکەین کەڕقیان

لێمانە؟".

نموونەی دووەم:

ئینجا دەستەیەکم دی خوێن لەچاویان دەباری،

بەردبارانی لاوێکیان دەکردو بەتووڕەیی هاواریان

لێك دەکرد:

با بکوژرێ، با بتۆپێ...

ئەویش لەژێر زەبری مەرگدا بەبەر چاوەوە دەکەوت، بەڵام

تادوا هەناسەی چاوەکانی بڕیبووە ئاسمان... لەیەزدانی

بەرز دەپاڕایەوە لەوانە خۆش بێ کەبەردەبارانیان دەکرد".

بەو جۆرە دانتێ باسی کوشتنی ستیڤانمان بۆ دەکات کەیەکێك بوو لەسەردارە ناودارەکانی ئاینی عیسایی. ستیڤان کاتی خۆی رەخنەی لەچەند لایەنێکی ئاینی

---

[٢٧] ئیمپراتۆر پستراتۆس لەنێوانی ٦٠٥و ٥٧٢ی پێش زاییندا فەرمانڕەوایی کردووە.

مووسايي گرتووەو گوايە دەستەيەك جوو لەسەرئەوە بەردەبارانيان كردووەو ئەويش لەخودا پاڕاوەتەوە لێيان نەگرێو بيانبەخشێ.

لەوانەيە لەو بۆچوونانەی دانتێدا زێدەڕۆيی ڕۆمانسی هەبێ. بەڵام گرنگ مەبەستی بەرزيیە كەهەميشە چاكە بەلايەوە چاك بووە. سەرتاپای ڕەخنەو ستايشەكانی لەجێگەی خۆياندا بوون. دانتێ تەنانەت ڕەخنە لەخۆشی دەگرێ. لەيەكەم ديدەنيدا پاتريسی خۆشەويستی لێی دەپرسێ ئاخۆ دوای مەرگی ئەو هيچ خۆشييەكی ژيان سەری لێ شێواندووەو ڕێگەی ڕاستی لێ ون كردووە. ئەويش لەوەڵامدا دان بەوەدا دەنێ كە "دوای ون بوونی ئەو" جاروبار پێی هەڵنوتوە!.

دەريای بێ بنی "كۆميديای يەزدانی" سەرەتايەكی بێ كۆتاييیە. ڕشتەی مرواريیەكانی ڕۆژبەڕۆژ زياتر دەدرەوشێنەوە. كۆميديا وەستايانە ئابڕووی كۆتو زنجيرە ڕەشەكانی سەدە ناونجيیەكانی بردو چرای بۆ ڕزگاریو سەرفرازیو ژيانی نوێ هەڵكردو لەوێوە بەرەوپێش بەگوڕ پاڵی بەڕەوڕەوەی مێژووەوە نا. وەك -گرانت-ی مێژوونووسی ڕۆژئاوايی دەڵێ كۆميديا بەڕاستی "ئاوێنەی سەرتاپای زانستو هەستو خواستی" چەرخی خۆی بوو[28]. مەبەستی بەرودوای كۆميديا مرۆڤو نيشتمانە. لەبەر ئەوانەشە "كۆميديای يەزدانی" بۆتە بەرهەمێكی نەمرو جێگەی ڕەوای بۆ خۆی لەقوڵايی دەروونی نيشتمان پەروەرانو دڵسۆزانو زانايانو هونەرمەندانو ڕەمەكی ڕووناكبيرانی وڵاتە پێشكەوتووەكاندا كردۆتەوە. سەدان ساڵە بۆتە يەكێك لەهاندەرە گەورەكانی شۆڕشگێڕانی ئيتاليا. هونەرمەندێكی لێهاتووی وەك فرانسۆ ڕۆدان (١٨٤٠-١٩١٧) دوا سیو حەوت ساڵی ژيانی بۆ دروست كردنی پەيكەری "دەروازەی دۆزەخ" تەرخان كرد كەوێنەكانی لەكۆميدياوە وەرگرتو ئينجا فرياش نەكەوت تەواوی بكات. هاوڕێو شاگردەكانی بۆيان تەواو كردو ئێستە مۆزەخانەی -ڕۆدان-ی لەپاريس

---

A.J Grant, A history of Europe, part II Middle Ages, London, 1929, (28) p.464.

ڕزلتنۆتەوە. تەنانەت هیتلەریش شانازیی بەدانتێو بەرهەمەکانییەوە دەکردو دەیویست سیلنکاتە بەلگەی سەلمێنەری بەرزی ڕەگەزی ئاری.

شایانی باسیشە دانتێ بۆخۆی ئەو بەرهەمەی ناونابوو "کۆمیدیا". بەلام نووسەرانی دوای خۆی وەك نیشانەی جوانیو تەواوی وشەی یەزدانییان پێوە لکاندووە.

لەرۆژگاری دانتێوە رووناکبیران روویان کردە کۆمیدیاو کەوتنە روونووس کردنو بلاوکردنەوەی. زۆری نەخایاند کاتێك رووناکبیرانی دەرەوەی ئیتالیاش قۆستیانەوەو دەستیان دایە وەرگێڕانی. هەمان کات "کۆمیدیای یەزدانی" یەکێکە لەو بەرهەمە ئەدەبییانەی چاپخانەکان لەگەڵ داهاتنی چاپی نوێدا کەوتنە چاپکردنی. سالی - ١٤٧٢- واتە پاش ماوەیەکی زۆر کەم لەدۆزینەوەی چاپی نوێ لەلایەن گۆتێنبۆرگەوە. کۆمیدیا بۆ یەکەم جار لەمێژوودا چاپ کرا.

بێگومان ئەوانەی باسمان کردن واناگەیەنن "کۆمیدیای یەزدانی" یا بەرهەمەکانی تری دانتێ هیچ کەموکورتییان نییە. زۆر مەبەستو ئامانج هەن دانتێ تەواو نەی پێکاوون. بەوێنە بەلای ئەوەوە زانستو بەرزکردنەوەی ئاستی بیر تاکە رێگەن بۆ جێبەجێکردنی بەختەوەریو سەرفرازی بۆ مرۆڤ.ئیمپراتۆریی رۆمانی کە لەپەلو پۆ کەوتبوو لای دانتێ "گەورەترین هیوای جیهانی عیسایی بوو".

دیارە ئەو جۆرە کورت بینیە ئاساییانە بۆ رۆژگاری خۆیان ناتوانن هیچ لەپایەی یەك جار بلندی دانتێو بەرهەمەکانی کەم بکەنەوە. بەتایبەت ئەگەر ئەویش لەیاد نەکەین کەنە ئەوو نەکەسی تری وەك ئەو ئەوساکە نەیاندەتوانی خۆیان بەتەواوەتی لەدوا تالەکانی سەدە ناونجییەکان رزگار بکەن. وەك ئینگلس دەلێ پێویستە ئەوەمان لەبیر بێ کەدانتێ وەك چۆن یەکەم شاعیری چەرخی نوێ بوو هەمان کاتیش دوا شاعیری سەدە ناونجییەکان بوو. مێژوونووسیش هەن پێشنیار دەکەن "کۆمیدیای یەزدانی" بکرێتە هێلی نێوان ئەو دوو چەرخەی مێژوو[29].

---

[29] بەوێنە بڕوانە: H.B. Cotterill, Op. P. 494.

هەرچۆن بێت ئەمریی دانتێ لەوەوە هاتووە کە ورد لەئەرکەکانی قۆناغ تێگەیشتو دڵسۆزانە رەفتاری لەگەڵ کردن و چارەی رەوانی بۆ دۆزینەوە. لەوەوە هاتووە کەدەیزانی: (هەزار ساڵی ژیان لەئاستی ئەمریدا ترووکەیەکە).

**سەرەتا:**

لەبەراییدا باسی باری ژیانی ئەورووپاو کێشەکانیمان لەکۆتایی سەدە ناونجییەکاندا کرد، لەوێدا دیمان چۆن رژێمی دەرەبەگی بەگشتیو کڵێسەو پیاوەکانی بەتایبەتی بوویوونە بارێکی قورس بەسەر شانی کۆمەڵانی خەڵکی وڵاتانی ئەورووپاوە، بێ لابردنی ئەو کۆسپە رەوڕەوەی مێژووی ئەو پارچە گرنگەی جیهان بەهیچ جۆر نەیدەتوانی بەرەوپێش بڕوات. بەشێکی زۆر لەئەرکی تەخت کردنی قۆرتە گەورەکانی ئەو قۆناغە کەوتە ئەستۆی پێشەنگی دەستەی رووناکبیری ئەوسای ئەورووپاوە. وەك گوتمان یەکەم ئەدیبی لێهاتوو کەئەو ئەرکە پیرۆزەی گرتە ئەستۆ دانتێ ئەلجیری بوو. زۆری نەبرد دوو ناوداری تر دیسان فلۆرەنسەی ئیتالیا هاتنە ئەو کۆڕەوە کەدانتێ یەکەم ئاڵای سەرفراویی نوێی تێدا هەڵکرد، یەکەمیان پێترارك و دووەمیان بۆکاشیۆ بوو.

**فرانچیسکۆ پێترارك:**

**باجەنگەواریی جارانمان زیندوو بکەینەوە**

**-پیترارك-**

شوێنی پیترارك لەژیانی رووناکبیرانی ئەورووپای کۆتایی سەدە ناونجییەکاندا هێند دیارو گەورەیە وای لەزۆر مێژوونووس کردووە نازناوی "باوکی رێنیسانس"ی بۆ هەڵبژێرن. گەر پێترارك دروست لەئەرکەکانی قۆناغ تێنەگەیشتایەو دڵسۆزانە بەدوای دەرمانی نەخۆشییەکانیدا نەگەڕایە هەڵبەت شیاوی ئەو شوێن و پایە بەرزە نەدەبوو.

رۆژی ٢٠ی مانگی تەمووزی ١٣٠٤ فرانچیسکۆ پیترارك (Franceso Petrarc) لەناو خێزانێکی بازرگانی فلۆرەنسەیدا چاوی هەڵێنا. وەك کاتی خۆی گوتمان بازرگانەکانی ئەوسای ئیتالیا لەهەموان زیاتر دژی رژێمی دەرەبەگی و عەودالی

ـەتلویرندنی کۆت و زنجیری ژەنگاویی سەدە ناونجییەکان بوون، بۆیەکا باوویاپیرو کەسوکاری پێترارك بەدەستووری دانتێ سەریە پارتی سپییان بوون. ئەوانیش لەگەڵ دانتێ بەرلەوەی پێترارك بۆخۆی لەدایك ببێت لەفلۆرەنسە دوورخرانەوە[30]. کەوابێ هەر لەکۆرپەییەوە پیترارك بووە یەکێك لەقوربانییەکانی کۆن و کۆنەپەرستان، ئەوەی زۆر زوو لەهەست و نەستیا رەنگی دایەوە.

لەتەمەنی دوازدە ساڵییەوە پێترارك کەوتە خوێندنی یاسایی و ساڵی ١٣٢٦ بووە فەرمانبەری کڵێسە. لەهەرەتیی لاوێتیدا بەشارانی ئیتالیاو وڵاتانی ئەوروپادا گەڕا. پیترارك زۆر لەنزیکەوە تێکەڵی خەڵکی ساکار دەبوو، جاری واهەبوو بەرگی جووتیاری دەپۆشی و وەك فەلاحان دەچووە کێڵگەو راوی لەگەڵ دەکردن، پێترارك بەشی زۆری ژیانی لەشاری ئەڤینیۆن بردەسەر کەئەوساکە پایتەختی پاپاو مەڵبەندی گەورەپیاوانی کڵێسە بوو[31]. هەمیشە عاشقی بەرزیی ژیان و جوانیی سروشت بوو، کەم هەبوون بەرادەی پێترارك لە ئاوازی سات و سەمتوورو زیل و بەم تێبگەن، بۆ خۆیشی، وەك دانتێ لەهەندێکیاندا وەستا بوو.

خوێندن و کارو جۆری ژیان و گەشتەکانی فرانچیسکۆ پێترارك بۆی بوونە سەرچاوەی رەسەنی تێگەیشتنی لایەنی جیاوازی ژیانی گەل و نیشتمان. هەرزوو بیری وردی پاڵی پێوەنا بکەوێتە بەراوردێکی بەجێ و رەوا لەنێوانی رابوردووی ئیتالیاو رۆژانی سەردەمی خۆیدا، گەر بەر لەپەیدابوونی دەسەڵاتی فراوانی سەردارانی کڵێسە ئیتالیا یەکگرتوو، پێشکەوتوو، دەنگی زوڵاڵ بوویێت، ئەوا دیارە دەبێت لادانێکی گەورە بووبێتە کۆسپ و

---

[30] پاش دوو ساڵ پێترارك لەشاری ئارێتسۆ لەدایك بوو.

[31] لەژێر فشاری پاشایانی فەرەنسەدا پاپایانی کڵێسەی کاتۆلیکی لەمانگی مارتی ساڵی ١٣٠٩وە تاوەکو مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٣٧٧ بێ لەسێ ساڵی نێوان ١٣٦٧و ١٣٧٠ لەبریتی رۆمای ئیتالیا شاری ئەڤینیۆنی فەرەنسە بکەنە مەڵبەندی خۆیان، ئەو ساڵانە لەمێژوودا بە"دیلیی ئەڤینیۆن" یا "دیلیی بابل" ناودەبرێن.

مەینەتی‌و دواکەوتنی گەل‌و نیشتمان. ئەو بۆچوونە هەستی سۆراخی رابوردووی ناخی دەروون‌و مێشکی پێترارکدا هەڵگەند. لەوساوە پێترارک دەستی دایە کۆکردنەوەو لێکدانەوەی پاشماوە دێرینەکانی نیشتمان، بەتایبەتی دەستنووسی کۆن کەکونو کەلەبەری ئیتالیاو ئەستەموڵ‌و دەوروبەریانی بۆ تەی کرد. بۆ خۆی نزیکەی ۳۰۰دەستنووسی دانسقەی کۆکردەوە کەهی وایان تێدا بوو کەس بەبوونی نەدەزانی. هەر دەستنووسێکیشی بۆ نەکڕدرایە یەکسەر رونووسی دەکرد. بەو جۆرە پێترارک کتێبخانەیەکی پێکەوە نا کەئەوساکە لەسەرانسەری ئەوروپادا لەوێنەی نەبوو[32].

فرانچیسکۆ پیترارک زۆربەی ژیانی بۆ لیکدانەوەی ئەو دەستنووسانە تەرخان کردو هەر لەبەرئەوەش لاتینییەکی عەنتیکە فیربوو، بەیۆنانیشەوە خۆی خەریك کرد تاوەکو بتوانیت یەکسەر لەناوەرۆکی بەرهەمی فەلسەفی‌و رووناکبیریی گریکیی کۆن تێبگات[33].

پیوە لکانی بێ ئەندازەی پیترارك بەرابوردووەوە کاریکی وای کرد ئەو لەدانتێ زیاتر بایەخ بەزمانی لاتینی بداتو زۆرتری پێ بنووسیت چونکە دەیویست، خۆی وتەنی، هەموو نووسەرانی ئەوروپا لەبەرهەمەکانی تێ بگەن[34]. بەلام ئەو بەرهەمانەشی کەبەزمانی زگماکی خۆی نووسیەنی زۆرن‌و دەوریان لەدارشتنی ئیتالیای نویدا کەم نییە. لەهەردووکیشیاندا، وەك دانتێ، مرۆڤی هاوچەرخ‌و نیشتمانی مەبەست بوو. پیترارك یەکەم کەس بوو وشەی مرۆڤایەتیی[35]. لەرۆمانەکانەوە وەرگرتو جیگەی

---

[32] R. Welss, The spread of Italian Humanism, London, 1964, pp.24-26.

[33] M. L. Bush. Renaissance, Reformation and the Outer world, London, 1964 pp. 151-152

[34] وەك لەبەرایيدا باسمان کرد ئەوسا هەموو رووناکبیرانی ئەوروپا لاتینییان دەزانی.

[35] مەبەست (Humanisma)ە کەلە (Humanitas)ی لاتینییەو ئەویش لە (Homo)وە وەرگیراوە کەمانای مرۆڤە.

دیارو شیاوی لەنووسینەکانیدا بۆ تەرخان کرد. مەبەستی بەرودوای پێترارك لەوەدا قوتارکردنی مرۆڤو بەر لەهەر شت بیری مرۆڤ بوو لەبەندو ئەسارەتی سەدە تلونجییەکان، چونکە باش دەیزانی بەبێ کارێکی ئەوتۆ سەرفرازیی نیشتمان خەوی بێ ئەنجامە، لەوەدا پێترارك مەبەستێکی گەورەی تریشی هەبوو، بەدەستووری دانتێ، ئەو جۆری مرۆڤ نەك وەجاغی مەبەست بوو. وەجاغزادەی رەسەن لای پێترارك ئەو کەسەیە کەبۆ کاروپیشەو بیرو گەلو نیشتمانی خۆی دڵسۆزە.

فرانچیسکۆ پێترارکیش، وەك دانتێ، خۆشەویستیی تێکەڵ بەشیعرەکانی کردو جارێکی تر سەلماندی کەئەدیب دەبێت دووی کڵاوی بابردوو نەکەوێت بەڵکو ئاوازی خۆش بۆ ژیان بڵێت. هەر لەبەر ئەوەش شیعرەکانی پێترارك کە بەناوەڕۆك و بەڕوخسار رلزلوەو دەوڵەمەندن یەکسەر کەوتنە سەر زاران، هەموان بەپەرۆشەوە دەیانقۆستەوە، نیسان هەر لەبەرئەوەشە کە شیعرەکانی پێترارك تائیمڕۆکەش زیندوون، هەرچەندە تەمەنیان خەریکە لە ٦٠٠ساڵ تێپەڕ دەکات.

پێترارك گیرۆدەی خۆشەویستیی شۆخێکی مێرددار بەناوی لۆرا (لاورا)وە بوو. لەتەمەنی بیستو سێ ساڵیدا لۆرا لەکڵێسەیەکی ئەڤینیۆن لەتەل دڵی پێترارکی دا، بەڵام تادوا هەناسەی ژیانی ناونیشانی نەدا بەدەستەوە نەبا، خوانەکەردە، ناوی بزڕێ، یادی لەسینەی خۆیدا پاراستو نەمریی لەشیعرەکانیدا بۆ نووسی بێ ئەوەی رۆژێ لەڕۆژان توخنی بکەوێت. لەوەدا پێترارکی مرۆڤ وەك پێترارکی هونەرمەندو وەك شیعرەکانی بەرز بوو. پێترارك دەربارەی خۆشەویستیی لۆرا نووسیویە دەڵێت:

"سەعات یەکی رۆژی شەشی نیسانی ساڵی ١٣٢٧ بۆ یەکەم جار لەکڵێسەی سانتا کلارای شاری ئەڤینیۆن چاوم بەلۆرا کەوت کە لەگۆرانیێکانەدا دەنگی دایەوە. ساڵی ١٣٤٨یش هەر لەو شارەو هەر لەو مانگ و رۆژو سەعاتەدا ئەو خۆرە لەژیانمدا ئاوابوو"[٣٦].

---

[٣٦] ول دیورانت، قصة الحضارة، الجزء الأول من المجلد الخامس (١٨)، ترجمة محمد بدران، الطبعة الثانية، القاهرة، ١٩٦٧، ص٧.

پێترارك وەستایانە ناوی لۆرای لەشیعرەکانیدا بەکاردەهێنا، کەڵکی لەوە وەردەگرت کەلۆرا واتای ئەو گەڵا دەگمەنە دەبەخشێت کەڕۆمانەکان کاتی خۆی تاجەگوڵینەی سەرکەوتنیان پێ دەچنیو کەپاشان دانیشتوانی ئیتالیا وەك نیشانەی قەدرو ڕێز یەکێکیان لێ نایە سەر سەری خۆی. پێترارك ئەو مانا بەرزەی بۆ خۆشەویستێکی رەسەنی تری تەرخان کرد– نیشتمان!.

خۆشەویستیی نیشتمان لای فرانچیسکۆ پێترارك بێ سنوورو بێئەندازە بوو، ئەوەش دیارە، لەتێگەیشتنی بێ لادانی ئەرکەکانی قۆناغەوە هاتبوو. هەر لەو قوژینەشەوە سەیری مێژووی سەردەمی رۆمانەکانی دەکردو ئەو هەموو بایەخەی بەڕابردوو دەدا. دەیویست لەو ڕێگەیەوە بەوردی لەهۆکانی هێزو دەسەڵاتی ئەوسای نیشتمان تێ بگات. کەم شت وەك دابەش بوونو پارچە پارچەیی ئیتالیا هەناوی دەهەژاند، پێترارك چاوی بەرایی نەدەهات رۆمای کاولو دواکەوتوو ببینێت، کوژراوی ئەوە بوو رۆما بگەڕێتەوە دۆخەکەی جارانی، بگەڕێتەوە ئەو رۆژگارەی لەسەرتاپای جیهاندا شارێك نەبوو شان بدات لەشانی، دەیویست ئەو سەردەمە بێنێتەوە یادی هاوچەرخانی کەنیشتمان تێیدا نەسوخرەکێشی ئەم نەگبەتییەی دەستی ئەویان بوو، لەپێناوی بووژاندنەوەی رۆمای خۆشەویستیدا پێترارك تەنانەت پاپاکانی هان دەدا لەئەڤینیۆنەوە بگەڕێنەوە ئیتالیا. بەوشەی نازدارو هەڵبژاردە لەتەل هەستی هەموانی دەدا:

"ئاخۆ کێ بێت گومانی هەبێت

کەی رۆما هۆشی وەبەر خۆیدا هاتەوە،

جەنگاوەرییەکەی جارانمان دەژێتەوە؟"[٣٧].

* * *

"ئەی خوێنی لاتینی بەڕێز هەڵچۆ"[٣٨].

---

[٣٧] أ.أ جویێر، فرانچیسکۆ پێترارك، "مێژووی جیهان"، بەزمانی رووسی، بەرگی سێیەم، مۆسکۆ. ١٩٥٧، ل٦٢٥.

کۆت و زنجیری ئەستۆت بخەرە ژێر پێتەوە!"[39].

ئا بەو جۆرە پێترارك هاونیشتمانییانی دەبزواند، بەچرای پرشنگداری وشە رێگەی راستی نیشان دەدان. دیارە دەبوو دووربینێکی وەك پێترارك بەهەست و بەگیان و بەقەڵەم لەگەڵ هەموو دیاردەو بزووتنەوەو رووداوێکدا بووایە کەترووسکەی هیوای بۆ گەلو نیشتمان لێ بەدی بکرایە. لەبەر ئەوە زۆر بەگەرمی پشتی ئەو راپەرینەی گرت کەبەهاری ساڵی ١٣٤٧ چەوساوانی رۆما دژی دەرەبەگەکانی بەرپایان کردو ئاڵای کۆماریان بەسەرکردایەتی کۆلا دی رێنزۆ "Cola di Rienzo" تیا هەڵکرد. پێترارك بۆخۆی هاورێی کۆلا دی رێنزۆ بوو، پێکەوە چەند ساڵێکیان لەشاری ئەڤینیۆن بردە سەرو کاری زۆری کردە سەر رێبازی ژیان و جۆری بیرکردنەوەی. لە "گیانی بەرز"دا کەیەکێکە لەشاکارە نەمرەکانی، پێترارك بەپەرۆشەوە کۆلا دی رێنزۆی هاورێی بۆ رزگارکردنی نیشتمان هان دەدا[40].

بەهەمان دەستوور فرانچێسکۆ پێترارك رووی دەمی دەکردە هەموان، بەشی زۆری شیعرەکانی نامەن بۆ پاپاو میرو پاشاو نووسەرە مردووەکان، دەیویست لەچاکەو خراپەیان وێنەی رێگەی راست بۆ نەوەی هاوچەرخ و دوارۆژی ئیتالیا بکێشێت. هەر لەبەرئەوەش بەشێکی تری شیعرەکانی نامەن بۆ نەوەی داهاتوو، بۆ ئەوانەی هێشتا لەدایك نەبوون. لەشاکاری "ئیتالیای نیشتمان"و "نامە بۆ نەوەی داهاتوو"[41] و "ئەفەریقا"[42] و بەرهەمی تریدا، کەبەداخەوە بەشێکیان فەوتاوون، لەو جۆرە نامانەی پێترارك بەدی دەکرێن.

---

[38] بەکەمێك دەسکارییەوە وەرم گێراوە.

[39] R.S. Hoyt, Europe in the Middle Ages, London, 1957, p.594

[40] دەوروبەری کۆتایی ساڵی ١٣٥٤ ناحەزانی کۆلا دی رێنزۆ زەفەریان پێی بردو کوشتیان.

[41] کورتەی ژین نامەی خۆیەتی.

[42] دەربارەی سەرکەوتنی ئەسکیپۆی ئەفەریقاییە بەسەر هانیبالی ناوداردا، ئەو سەرکەوتنەی کاتی خۆی رزگاریی بۆ ئیتالیا هێنا.

پێترارکیش، هەرچەندە وەك دانتێ ئیماندار بوو، لەبەشێك لەنامەکانیدا زۆر بەتوندی رەخنەی لە کلێسەو رەفتاری نامەمواری سەردارانی گرتووە. لەبەرئەوەی پێترارك لەکلێسە خوێند بووی ماوەیەك فەرمانبەری دەزگایەکی ئاینی بوو بەشی زۆری ژیانی لەئەڤینیۆنی پایتەختی ئەوسای پاپاو کاردینالەکان بردبووە سەر، لەبەرئەوانە زۆر چاك ئاگاداری بەدفەڕیی کاریەدەستانی کلێسە بوو. نەشتەری رەخنەی نامەکانی هێند لێیان تیژ بوو، تامردن زاتی نەکرد بەشێکیان بڵاو بکاتەوە. "نامە بێناونیشانەکان" ناونیشانی ئەو شیعرانەی پێترارکە کەکلێسەو پاپاو قەشەو رەبەنە بەرەڵاکانی پێ ریسوا کردوون.

لەگەڵ ئەو هەموو بۆچوونە وردانەیدا پێترارکیش بە دەستووری دانتێ، نەیتوانی بەتەواوەتی خۆی لەکۆتی کۆن رزگار بکات. بۆیەکا ئەمیش وەك ئەو، کەوتە چەند هەڵەیەکەوە، راستە پێترارك لەبەرهەمەکانیدا لەژیانی سەرزەمین دوور نەکەوتەوە. یەکسەر دەدوا، بێسڵ کردنەوە کەڵکی لە بەرهەمی شاعیرە بت پەرستەکانی وەك ڤێرجێل وەردەگرت[43]، بەڵام لەهەڵبژاردنی ئامرازی گۆڕیندا چاك نیشانی نەپێکا.

لەبەرئەوەی ئەو هێزانەی ئەو پەنای بۆ دەبردن لەژیانی خۆیدا هیچیان بۆ هەڵنەسوڕا، ئەویش پەلەی بوو، باش لەتەمەنی درێژی مێژووو هێزە بزوێنەرەکانی تێنەدەگەیشت. لەبەرئەوە بێهوودە لەدوا سالآنی تەمەنیدا رووی کردە ئیمپراتۆریی پیرۆزی رۆمانی[44]، دەیویست بەزۆر گیانی بکاتەوە بەبەرداو لەو رێگەیەوە بنیاتی

---

[43] دەربارەی ڤێرجیل بروانە بەشی یەکەمی ئەم وتارە.

[44] مەبەست لەئیمپراتۆریی پیرۆزی رۆمانی (الإمبراطورية الرومانية المقدسة) ئەو دەوڵەتە فراوانەی سەدە ناوەڕاستییەکانە کەئەڵەمانیا بەشێك لەئیتالیاو خاکی چیكو سویسرەو هۆڵەندەو بەلجیکاو لۆکسەمبۆرگو چەند هەرێمێکی تری ناوەندی ئەورووپای پێکەوە بەستبوو "سالی ٩٦٢ ئۆتۆی یەکەمی پاشای ئەڵەمانیا دایمەزراند". پاش چەند سەدەیەکی کەم ئیمپراتۆریی پیرۆزی رۆمانی بووە دەزگایەکی بێ دەسەلآت، هەرچەندە بەناو تاوەکو ١٨٠٦مایەوە. لەسەردەمی رێنیسانسدا رۆژی ئیمپراتۆریی پیرۆزی رۆمانی تەواو بووبوو.

ڕزگاریی نیشتمان و ئازادیی گەل بنێت، بەر لەکۆچی دواییشی لەژمارەیەك ئەمیرموەرییەکانی نووی دەربارەی ژیان پاشگەز بۆوەو بەرهەمێکی بەناوی "تەحقیری ژیان"ەوە[١٥]. بڵاوکردەوە. هەر بەو هۆیەشەوە پێترارك دواڕۆژانی ژیانی بەگۆشەگیری بردەسەر. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕۆژی نۆزدەی تەمموزی ساڵی ١٣٤٧ لەئارکوای نزیك پادوا چاوی لێك نا، نیشتمان و گەلی لەیاد نەکرد.

فرانچیسکۆ پێترارك، بێگومان، شایانی ئەوەبوو یەکسەر جێگەی ڕەوا لەقووڵایی دڵسۆزاندا بۆخۆی بکاتەوە. نازناوی میری شاعیران و ڤێرجیلی نوێی پێ ڕەوا بوو. لەڕۆژانی ژیانی خۆیەوە بەدەیان ئەدیبی ئیتالی لەدەوری بەرهەمە نازدارەکانی کۆبوونەوەو نوێکاریی لێوە فێردەبوون، لەنووسین و خوێندنەوەدا لاسایییان دەکردەوە، بەڕادەیەك "پێترارکیزم" بووە زاراوێکی باوی ناو کۆڕە ئەدەبییەکانی ئەوسای ئیتالیا، بۆکاشیۆی ناودار یەکێك لەشاگردو هاوڕێ نزیکەکانی پێترارك بوو کەتەنانەت بەشێوەش تاڕادەیەك وێك دەچوون[١٦].

جیۆڤانی بۆکاشیۆو هەزارو
یەك شەوەی ئەورووپا:
هەژاری لەسامان بێبەریمان
دەکات، بەڵام ناتوانێت
دەست بۆ ئابڕوومان ببات!
-بۆکاشیۆ-

شارەزایان بۆکاشیۆ بەسێیەمین پێشەنگی کاروانی ڕووناکبیرانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس دادەنێن، لەبەرئەوە شوێنی ئەویش لەتۆماری ئەمرانی مێژوودا دیارو پرشنگدارە.

---

(١٥) De Contemptu Mundi.

(١٦) R. Weiss, op. Chfi, p.29.

سالی ١٣١٣ جیۆڤانی بۆکاشیۆ "J.Boccaccio" لەپاریس لەباوکێکی بازرگانی ناسراوی فلۆرەنسەیی‌و دایکێکی نەناسراوی فەرەنسەیی لەدایك بوو[٤٧]. هەر بەمنداڵی باوکی هێنایەوە ئیتالیاو چەند ساڵێکی ناخۆشی لەگەڵ باوەژنی لەشارێکی نزیك فلۆرەنسەدا بردەسەر. لەتەمەنی دە ساڵیدا باوکی ناردییە شاری ناپۆلی بەو نیازەی وەك خۆی رێگەی بازرگانی بگرێتەبەر، بەڵام بۆکاشیۆ لەوساوە ئارەزووی خوێندنەوەو دڵتێی شیعر دای لەکەللەی، شیعری بەخۆراکی هەژار دادەنا. بۆکاشیۆ تەنانەت مەیلی نەبوو خوێندنی یاساو ئاینیش کەحەزی دووەمی باوکی بوون. لەهەرەتی لاوییەوە بۆکاشیۆ تێکەڵ بەدەستەی رووناکبیری ناپۆلی بوو کەئەویش ئەوسا، وەك فلۆرەنسە، یەکێك بوو لەشارە پێشکەوتووەکانی ئیتالیا. وادیارە سەرەتای خوێندنەوەی قووڵی بۆکاشیۆ بەبەرهەمی دانتی‌و پێترارك دەستی پێکردووە.

هەرزوو، لەتەمەنی هەژدە ساڵییەوە جیۆڤانی بۆکاشیۆ تووشی داوی خۆشەویستیی بوو، ئەویش، وەك پێترارك لەکڵێسەیەکی شار بەتیری عەشقی ماریای زۆڵە کچی پاشای ناپۆلی گرفتار بوو[٤٨]. ماریا لەژیان‌و هونەری بۆکاشیۆدا دەوری پاتریسی دانتی‌و لۆرای پێترارکی بینی‌و ناوی لای ئەو بووە فیامێتا "Fiammetta" واتە ئاگرۆك یا پشکۆ[٤٩] هەموو رۆمانە زووەکانی بۆکاشیۆ بۆ باسی خۆشەویستیی فیامێتا تەرخان کراون، وەك رۆمانی فیلۆکۆلۆ کەساڵی ١٣٣٨ دەستی پێکردو دوایی تەواوی کرد. لەو بەرهەمانەیدا کەبە زمانی نەتەوەیی‌و زاراوی تۆسکانی دایرشتوون، بۆکاشیۆ کۆن‌و نوێی تێکەڵ کردووەو گەلێك سامانی رۆشنبیریی رۆژگاری خۆی‌و بەرلەخۆی پاراستووەو چرای بۆ پەخشانی نوێ هەڵکردووە. ئەمەی دوایییان بۆ ئەو سەردەمەی هەموان، بەشوێنەوە گاوانەوە، تیا بوویبوونە شاعیرو بایەخی بۆ پێشخستنی رەورەوەی ئەدەب یەکجار زۆر بوو.

---

[٤٧] تاوەکو ئێستە رۆژی لەدایك بوونی نەزانراوە.

[٤٨] دایکی ماریا یەکێك بوو لەدۆستەکانی پاشای ناپۆلی.

[٤٩] لەئاگرەوە، فیامێتا بچووککردنەوەی نازداریی کڵپەی ئاگرە.

سالّی ۱۳٤۰، واته لەتەمەنی ۲۷ ساڵیدا جیۆڤانی بۆکاشیۆ گەڕایەوە شاری فلۆرەنسە لەکاتێکدا هێزە پێشکەوتووەکانی دەسەڵاتیان گرتبووە دەست، دانیشتووانی شار زۆر بەگەرمی پێشوازییان کردو وەك نیشانەی خۆشەویستیی‌و رێز تاجەگوڵینەی سەرکەوتنیان نایە سەری، فەرمانڕەوایانی فلۆرەنسەش دەرگەی کاری گەورەیان بۆ خستە سەر پشت، بەو جۆرە ژیانێکی لەبارتر بۆ بۆکاشیۆ گونجاو دەریای بیری لەجاران زیاتر خرۆشا. لەفلۆرەنسە رۆمانی فیلۆکۆلۆی تەواو کردو ژمارەیەك رۆمانی تری دانا کەیەکێکیانی ناونا "فیامێتا"و ساڵی ۱۳٤٥ لەنووسینی بۆوە، پاش پێنج ساڵ، واتە دەوروبەری ساڵی ۱۳٥۰ دەستی کردە دانانی شاکاری "دیکامێرۆن" کە سێ ساڵی رەبەقی پێوە خەریك بوو. "دیکامێرۆن" بۆکاشیۆی گەیاندە لوتکە.

ئەو ساڵانەی بۆکاشیۆ بە دانانی "دیکامێرۆن"ەوە خەریك بوو رشانەوە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای گرتبۆوە[٥٠]. فلۆرەنسە یەکێك بوو لەو شارانەی رشانەوەی ساڵی ۱۳٤۸ قڕی خستە ناو دانیشتوانیانەوە[٥١]. سەرچاوەکانی ئەو سەردەمە دەڵێن لەماوەی تەنها شەش مانگی یەکەمدا سێ‌دەر پێنجی خەڵکی فلۆرەنسە بەو دەردە مردن، بۆکاشیۆ ژمارەی ئەو مردوانەی بە ۹٦هەزار کەس داناوە، کە وا پێ دەچێ فیامێتاش یەکێکیان بوو بێت، خانووبەرەو شەقامەکانی شار بە لاشەی مردوو داپۆشرابوون، باوکێك نووسیوییە چۆن بەدەستی خۆی پێنج لەمنداڵەکانی لەچاڵێکدا ناشتووە.

---

[٥٠] ساڵی ۱۳۳۳ نەخۆشیی رشانەوە سەرتاپای چینی گرتەوەو لەرێگەی چینەوە چەند ناوچەیەکی تری ئاسیا خراپ تووش هاتن، بەهۆی کێچ‌و مشکی ناو ئەو کەشتییانەی کەلوپەلی بازرگانیی رۆژهەڵاتیان دەهێنایە ئەوروپا، ئیتالیار ژمارەیەك وڵاتی‌تری ئەو کیشوەرەش دەوروبەری ساڵی ۱۳٤۸ هەمان نەخۆشییان تیا بڵاوبۆوە.

[٥١] بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە:

ول. ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الأول من الجلد الخامس ، ۱۹٦۷، ص٥٢-٥٥.

E. Peters, Europe, The World of the Middle Ages, NewJersey, 1977, pp.527-528.

لەو ڕۆژە ستەمانەدا بۆکاشیۆ دەستی کردە دانانی "دیکامیرۆن". گوایە حەوت کچو سێ کوڕی فلۆرەنسەیی ئەو ڕۆژانە لەیەکێك لـە کڵێسـەکانی شـار یـەکتر دەبینـنو بڕیـار دەدەن بۆ ماوەی دە ڕۆژ پێکەوە بچنە ڤیللایەکی قەراغ شار تا بەو جۆرە خەمی خۆیان بڕەوێنن[52]. لەوێ بۆ هەر شەوەی پاشایەك بۆ کۆڕەکەیان هـەڵدەبژێرن، هـەر شـەوەش دەبوو هەریەکەیان چیرۆکێك بگێڕێتەوە کە پاشـا لەسـەرەتاوە باسـەکانی دیـاردەکردن. هەر لەوەشەوە بۆکاشیۆ ناوی "دیکامیرۆن"ی بۆ چیرۆکەکانی هەڵبژارد کە لەدوو وشەی یۆنانی کۆن پێکهاتووەو پێکەوە مانای "یاداشتی دە ڕۆژە" دەگەیێنن[53]. زۆر نووسـەر "دیکامیرۆن"یان ناوناوە "هەزارو یەك شەوەی ئەورووپا". وابێ دەچێت بۆکاشـیۆ کـاتی خـۆی چیرۆکـەکانی "هـــەزارو یـــەك شـــەوە"ی خوێندبێتـــەوە کـــە لـــەڕۆژگاری شـــەڕی خاچدارانەوە کرابوونە لاتینی. بەپێی قسەی جاستۆن باری لـەو کتێبـەیدا کـەناوی نـاوە "ئەدەبی فەرەنسەیی سەدە ناونجییـەکان" لەڕێگـەی بۆکاشـیۆوە ژمارەیـەك لەچیرۆکـە ڕۆژهەڵاتییە باوەکان گەیشتوونەتە دەست ئەورووپاییەکان[54].

چیرۆکـەکانی "دیکامـیرۆن" کورتـن، تێکـڕا یـەکی شـەش حـەوت لاپـەڕە دەبـن. هەریەکەیان پێشەکییەکی کورتی لەگەڵدایەو هەموویان بەزمانێکی یەکجار پاراوو ناسکو بەهێزو لەسـەر بنچینـەی دیـالێکتی تۆسـکانی داڕێـژراونو تـاوەکو ئیمڕۆکـەی ئێمـەش سەرنجی خوێنەران رادەکێشـن. بـەلای شـارەزایانەوە "دیکامـیرۆن" دەوری لەداڕشـتنی زمـانی ئـەدەبیی یـەکگرتووی ئیتالیـادا تەنانـەت لـە "کۆمیدیـای یـەزدانی"ی دانتـێو بەرهەمـەکانی پێـترارکیش زیـاتر بـووە. ئەوانـە بەسـەر یەکـەوە بەلگـەی یەکـەمن کـە جیۆڤانی بۆکاشیۆ لەگێژاوی سەدەی چواردەمیندا ورەی بەرنـەداو چـاك لـە ئەرکـەکانی قۆناغ تێگەیشتو بەو جۆرە ڕێگەی ڕاستی خزمەتی گـەلو نیشـتمانی گرتەبـەرو چووە خانەی بەرزی نەمرانەوە.

---

[52] بۆکاشیۆ ناوی فامێتای خۆشەویستی بۆ یەکێك لەو کچانە هەڵبژاردووە.

[53] Deka hemeral

[54] بڕوانە: محمد مفید الشوباشي، رحلة الأدب العربي إلى أوروبا، القاهرة، ص١٢٦-١٢٧.

فۆلکلۆرو حیکایەتی باوی ناو خەڵکی سادەو ساکاری ئیتالیاو فەرەنسەو داستانو ئەفسانەی ڕۆمانو یۆنانەکانو چیرۆکە باوە ڕۆژهەڵاتییەکان سەرچاوەی "دیکامیرۆن"ن. بۆکاشیۆ زۆر هونەرمەندانە ئەو کەرەستە رەسەنەی تێکەڵ بە باری ژیانی ئەوسای ئیتالیا کردووەو وەستایانە هەوڵی داوەتیماری بیمارییەکانی کۆمەڵی پێ بکات، قارەمانەکانی "دیکامیرۆن" نموونەی هەموو دەستەو چینەکانی کۆمەڵن -لەپاشاو میرەوە تاوەکو بازرگانو قەشەو رەبەنو ئینجا خەڵکی سادەو ساکار، لەکورتبینەوە تاوەکو دووربین، لەتەپۆوە نەفامەوە تاوەکو زاناو دانا-.

چیرۆکەکانی "دیکامیرۆن" زۆر بەرز خۆشەویستیی وەك دیاردەیەکی رەوای ژیان دەنرخێنن، ئەوەی بەهیچ جۆر لەگەڵ سەرنجی ئەوسای کڵێسەو ژیانی رەبەنیدا نەدەگونجا. لەو قوژینەوە جیۆڤانی بۆکاشیۆ وێنەیەکی دڵفڕێنی ژیانمان بۆ دەکێشێت، بێبەزەیی لەلەقەو دارکاریی ئەو کەسانە دەکات کە مانای بەرزی خۆشەویستیی دەشێوێنن.

هەمان کات خاوەنی "دیکامیرۆن"سەرکەوتووانە بەشێوازێکی نوێ هەوڵی داوە لەرێگەی پلارو توانجی بەجێو نموونەی پڕ ماناوە دوو پەڵە هەوری رەشی ئاسمانی رۆژگاری خۆی برەوێنێتەوە کەبووبوونە هۆی کوێرکردنەوەی گەلێك راستیو هێزی بزوێنی ژیان. یەکەمیان پێوەندی بەنرخاندنی مرۆڤو دووەمیان پێوەندی بەکۆتەکانی کڵێسەوە بوو.

لە"دیکامیرۆن"دا کەم لایەنی تری ژیان بەرادەی نرخی مرۆڤ سەرنجی بۆکاشیۆیان راکێشاوە. لەزۆربەی چیرۆکەکانیدا دەیەوێت تێمان بگەیێنێت کە نرخی مرۆڤ والە خۆیدا نەك لەوەجاغو بنەچەو خێڵو خێزانیدا، بۆ پێکانی ئەو نیشانە بەرزە جیۆڤانی بۆکاشیۆ وەك هونەرمەندێکی بەدەسەڵات لەگەڵ خۆیدا دەتباتە ناو ناخی دەروونی قارەمانەکانییەوە، هەموویانت بۆ رووتو قووت دەکاتەوە. وات لێ دەکات پڕ بەدڵ بەمیرێکی گێل یا بەبازرگانێکی چاوبرسی پێبکەنیتو بەو رادەیەو، بگرە زیاتریش،

ڕێزی کوڕەشوانێکی زیرەك بگریت. زۆرجار دوای پەتپەتێنێکی باش سەر بەپاشاو میرو وەجاغزادەکان شۆڕ دەکات. کەڵکەڵەی سەفەری هاتو نەهات دەخاتە کەللەیانەوەو بەدەستی بەتاڵ دەیانگێڕێتەوە ناو کۆشك و تەلارە رازاوەکانیان. بەئاسانی دەیانکاتە مەخسەرەی یەکێك لەنۆکەرە زیرەك و وریاکانیان.

هەموو جارێکیش تەنها راستیو دڵسۆزی سەردەخات ئەگەرچی لەڕێگەی بەقوربانی کردنی جووتێك شۆخیشەوە بێت. ئەوەتا جیسمۆندی کچی تانکریدی پاشای سالێرنۆ دەکەوێتە داوی خۆشەویستی جیسکاردۆوە کەیەکێك بووە لەیاساوڵە وەجاغزادەکانی باوکی، جیسمۆندی شاکچ بەدەیان میرو ئاغاو بەگی قۆزو دەسەڵاتداری دەبینی کەهەموو لەخوایان دەویست پێیان قایل بێت، بەڵام کەس وەك جیسکاردۆ تەلی دڵی نەهەژاند، چونکە نەك هەر لاوێکی شۆخ بەڵکە زیرەك و وریاو خاوێن و دڵپاك و دڵسۆزیش بوو. کەپاشای باوکی لەڕقانا جیسکاردۆی نەدارو نەناسراوی کوشت و لەجامێکی زێڕدا دڵی بۆی نارد، جیسمۆند دوای ئەوەی هەر لەو جامەدا ئەو ژەهرەی ئامادەی کردبوو خواردییەوەو بەرلەوەی چاوەگەشەکانی لێك بنێت رووی دەمی کردە پاشای باوکی و پێی گوت:

> باوکی بەڕێزم! ئێمە هەمووومان بەرهەمی یەك دەست و یەك کەرەستەین.. چاکەو رەوشت جیاکەرەوەی یەکەمی مرۆڤن یاسا بائەوەی لەیاد کردبێت، بەڵام سروشت هەرگیز لەیادی ناکات... باوکی بەڕێزم گەر بەسەنگی رەوشت و چاکە ئەوانەی دەوروبەرت بکێشیت دەبینیت کەسیان ناگاتە قولەپێی جیسکاردۆ... هەژاری، باوکی بەڕێزم، لەسامان و پارەو پوول بێبەریمان دەکات، بەڵام ناتوانێت دەست بۆ ئابڕومان ببات!.

بۆ ئەوساکەی ئەورووپا کەسەنگی تەرازووی کێشانی مرۆڤ تێیدا وەجاغ و بنەچە بوو. کە هەر رۆژەی نەونەمامێك لەقوژبنێکیدا دەبووە پووشووی ئاگری یەکێک

دەسەڵاتداران، کەگەورەترین زاناو ئەدیبی "بێئەسڵو فەسڵ" مافی نەبوو بیر لەکچە تەڕۆیەکی میرزادە بکاتەوە، یا دەست بۆ هەندە کارو فەرمانێك بەرێت کەتەنها لایەقی خۆی بوون، بۆچوونە وردەکانی جیۆڤانی بۆکاشیۆ دەسکەوتی گەورەو تێگەیشتنی دروستی ئەرکەکانی قۆناغ بوون، مەرجێکی بنەڕەتیی پێویست بوون بۆ ئازادکردنی مرۆڤ لەتەوقە دەسکردە ناهەموارەکانی کۆمەڵ، دیارە بێ ئەوانەیش بەرەوپێش بردنی گەلو رزگارکردنی نیشتمان لەکێشە کوشندەکانی کارێکی مەحاڵ بوو.

هەر بەو جۆرو شێوازەش بۆکاشیۆ کڵێسەو پیاوە چاوچنۆکەکانی لە "دیکامیرۆن"دا ریسوا کردووە، بەشێك لەچیرۆکەکانی ئەو شاکارە قەشەو رەبەنەکانی بۆ هەڵواسیوین‌و ئابڕووی رەفتارە ناشیرینەکانی بۆ بردووین‌و بیری دواکەوتوویانی بۆ خستووینەتە سەر ساجی عەلی، خوێنەر پڕ بەدڵ پێیان پێدەکەنێت‌و هەست دەکات چۆن رۆژی ئەو فێڵبازانە لەسەر دەستی بۆکاشیۆو مامۆستاو هاوەڵو شاگردەکانیدا دەستی کردۆتە ئاولبوون، لەو چیرۆکانەی "دیکامیرۆن"دا بۆکاشیۆ پێمان دەڵێت ئەوانەی دەیانەوێت رێگەی راست نیشانی خەڵك بدەن دەبێت بەر لەهەمووان بیر لەخۆیان بکەنەوە تاوەکو ببنە نموونەو قسەیان بەفیڕۆ نەڕوات، پێی وایەو راستیش دەکات، کەنابێت کەس قسەی ئەو مێزەر بەسەرانە بەپوولێك بکڕێت کەبۆ خۆیان دەقاودەق دیوی ئاوەژووی فەرمایشتەکانیانن. بەشی ئەو جۆرە کەسانە لەکۆتایی چیرۆکەکانی "دیکامیرۆن"دا هەر ژێر کەوتنە چونکە لەژیاندا دەبێت هەر چاکە سەرکەوتوو بێت، خۆ ئەگەر بەهۆی زەبری زۆردارانەوە بۆ ماوەیەك وا رێك نەکەوت ئەوا چاکەکە دەبێتە نموونەو بەنەمری دەمێنێتەوە.

"دیکامیرۆن"یش وەك "کۆمیدیای یەزدانی" یەکێکە لەشاکارە نەمرەکانی ئەدەبی جیهانی، بەڵکو تائێمرۆکەش ژمارەی خوێنەری ئەویان گەلێك لەهی ئەمیان زیاترە(**).

(**) دیارە ئەوە لەپایەی بەرزی "کۆمیدیای یەزدانی" کەم ناکاتەوە، تەنها ئەوەندە هەیە تێگەیشتنی ناوەرۆکی ئەو زۆر لە "دیکامیرۆن" زەحمەترە.

"دیكامیرۆن" یەكەم جار ساڵی ١٤٧١ بەزمانی ئیتالیایی چاپ كرا، بەڵام تائێستا سەدان جار بەئیتالیایی‌و بەهەموو زمانە پێشكەوتووەكانی جیهان چاپ كراوەتەوە. بەدەگمەن لە ئەوروپا كتێبخانەیەكی تایبەتی هەڵدەكەوێت دانەیەك لە "دیكامیرۆن"ی تێدا نەبێت.

دەبوو بۆكاشیۆش وەك دانتێی رەهبەرو پێتراركی مامۆستاو هاوڕێی دروست بۆ هەموو مەبەستەكانی نەچێت، ئەویش، وەك ئەوان، كوڕی رۆژگاری خۆی بوو، نەیدەتوانی خۆ لە هەموو داوەكانی كۆمەڵ رزگار بكات‌و بەوردی لەقووڵایی گشت هێزە بزوێنە نەبینراوەكانی تێ بگات، لەبەرئەوە هیچ سەیر نییە خەریك بوو بڕوای بۆكاشیۆ بەژیان كەمێك بلەقێت، بەر لەكۆچی دوایی بەماوەیەك پێترارك نەبوایە لەوانە بوو دەست لەنووسینیش هەڵبگرێت.

جیۆڤانی بۆكاشیۆ دواساڵەكانی تەمەنی بۆ كاری زانستی‌و نووسینی بەرهەمی مێژوویی تەرخان كرد. هەر لەو ساڵانەشدا بوو كەدەستی دایە تۆژینەوەی بەرهەمەكانی دانتێ‌و تاكۆچی دوایی كرد فریا كەوت حەڤدە لەسروودەكانی "كۆمیدیای یەزدانی" لێك بداتەوەو یەكەم كتێب دەربارەی ژین نامەی خاوەنیان دابنێت.

رۆژی ٢١ی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٣٧٥ جیۆڤانی بۆكاشیۆ لەچێرتاڵدۆی نزیك فلۆرەنسە چاوی لێك ناو بووە نموونەیەكی بەرزی تری ئەو ئەدیبانەی چاك لەئەركەكانی قۆناغ تێ دەگەن‌و دڵسۆزانە خزمەتی گەل‌و نیشتمان دەكەن، ئەوانەی هەمیشە ناویان بەزیندوویی دەمێنێتەوە.

## ئێرازمۆسی رۆتەردامی‌و "ستایشی كەران"

لەسەرتاپای ئەوروپای رۆژگاری رێنیسانسدا كەم زانای ئەوتۆ هەڵكەوتووە بتوانێ شان لەشانی ئێرازمۆسی رۆتەردامی " Erasmus Rotardamus" بدات یا بەڕادەی ئەو كار بكاتە سەر ژیانی رووناكبیریی ئەوسای زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا.

تاوەكو ئێستە بەتەواوەتی رۆژو ساڵی لەدایكبوونی ئێرازمۆس ساغ نەبۆتەوە. بەپێی هەندێك لێكدانەوە دەبێ رۆژی ٢٨ی مانگی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٤٦٦ لەشاری

"ڕۆتەردام"ی هۆڵەندا چاوی هەڵهێناوە. سەرچاوەش هەیە ١٤٦٩ بەساڵی لەدایکبوونی دادەنێ.

ئێرازمۆس لەبەرئەوەی بەهەتیووی گەورە بوو[٥٦]. لەڕوویەکەوە ناچار بوو پەنا بەرێتە بەر یەکێك لەڕەبەنگەکانی کڵێسە[٥٧]، لەوێ بناغەی خوێندنو فێربوونی بۆ خۆی داڕشت، هەرچەندە بەدڵ حەزی لەخوێندنی فێرگەیەکی سەربەخۆ دەکرد. لەو سەردەمەی ژیانیدا کەمێك مەیلی وێنەکێشیی هەبوو، دوای ئەوەیش بەماوەیەك لای مامۆستایەکی ناسراو شتێك مۆسیقا فێر بوو، هەر لەوساشەوە شەقڵی زیرەکیو وریاییو ئارەزووی بێ ئەندازەی خوێندنەوەی پێوە دیاری دا.

زوو خولیای خوێندنی بەرزو گەڕانو هاتوچۆ دای لەکەللەی ئێرازمۆس. ساڵی ١٤٩٥ هۆڵەندەی نیشتمانی بەجێهێشتو رووی کردە پاریسی فەرەنسە. لەوێش بە چوار ساڵ بەشی تیۆلۆجیی[٥٨] زانکۆی پاریسی بڕیو زۆری نەبرد بووە رابەری "کۆلیج دی فرانس"ی بەناوبانگ. دوای ئەوە کەوتە گەڕان بەولاتانی ناوەندو رۆژئاوای ئەورووپادا. نیشتمانی خۆی دەپەرست، بەلام ولاتانی تریشی زۆر خۆش دەویست. کە کاربەدەستانی "زوێریخ" تکایان لێکرد شارەکەیان گەورە بکاتو لەوێ بەیەکجاری نیشتەجێ ببێ؛ بەدەم سوپاسێکی گەرموگوڕەوە تێی گەیاندن ئارەزووی لەوەیە ببێتە هاونیشتمانی هەموانو باوەش بەسەرانسەری جیهاندا بکات.

لەبەرئەوە "ئێرازمۆسی رۆتەردامی" تاوەکو گوڕی پێ ما بەدەگمەن تا سەر لەیەك ولاتو یەك شارو لەیەك شوێن دەژیا. دوای هۆڵەندەو فەرەنسە شەش ساڵی رەبەقی لە"کەمبریچ ئۆکسفۆرد"ی بەناوبانگی ئیتالیا بردەسەر، چەند ساڵێکیش لەئەڵەمانیاو

---

[٥٦] ساڵی ١٤٨٤ باوکی کۆچی دوایی کرد بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ بۆخۆیو براکەی بەجێبهێڵێ.

[٥٧] ئەگەر رەبەن (راهب)و (راهبە) بێ ئەوا دەتوانین رەبەنگە لەسەر کێشی پرسگەو پەناگە بۆ (دیر)و (أدیرة) بەکار بهێنین.

[٥٨] Theology واتە (لاهوت) یا زانستی ئایین.

ئیتالیا ژیاو لەساڵی ١٥١٢ەوە سویسرەی کردە مەڵبەندی خۆی. دوای ئەوەی پیری رووی تێکردو گوێی لێ بڕی ناچار دوا پازدە ساڵی ژیانی بەتەواوەتی لەشاری "بازل"ی سویسرە[٥٩] نیشتەجێ بوو، ئیتر زۆر بەدەگمەن ئەو شارەی بەجێ دەهێشت تا رۆژی دوازدەی مانگی تەمووزی ساڵی ١٥٣٦ لەوێ گیانی سپارد.

لەنەفامانو حەسوودان بەولاوە یەکێك نەبوو ئیرازمۆسی رۆتەردامی بەدڵ خۆش نەوێت. زاناو روناکبیرە کەڵەکانی سەرانسەری ئەورووپای رۆژگاری خۆی شانازییان بەهاوڕێیەتی یا شاگردێتی ئیرازمۆسەوە دەکرد. بۆ خۆیشی رووخۆشو دڵسۆزو دڵ فراوانو دەست کراوەو قسە لەڕوو، دوژمنی باوەکوشتەی درۆزنو قسەبەرو زمان درێژو خۆهەڵکێشو نەزان، رازێنەرەی کۆڕو گوڵی سەردەستەی مەجلیسانو دەم راستی هەموان بوو. بەکورتی زانایەکی پیاوو پیاوێکی زانا بوو.

بە شایەتی هەموان خامە رەنگینی وەك ئیرازمۆس لەژیاندا کەم هەڵکەوتووە. نووسینەکانی تیغ بڕو نیشان پێكو هەست بزوێنو ناسكو رازاوەن. بەڕەوانی یاریی بەوشەو رستەو، نوێکاریی لەنووسیندا دەکرد. گەلێك زمانی دەزانیو زمانی لاتینیشی وەك زمانی زگماك دەزانیو خۆی فێری گریکیش کرد، ئەو وردەکارییەی ئیرازمۆس لەفۆنەتیکی زمانی گریکیدا کردی بۆی بووە شێوازو لەمەیدانی زانستدا بەشیاوی خۆی چەسپاند.

ئیرازمۆسی رۆتەردامی لەنووسینەکانیدا جگە لەناوی خۆی دوو نازناوی ئەدەبیشی بەکار دەهێنا، یەکەمیان دیزیدێریۆس "Desiderius" و دووەمیان جێرهارد جێرهاردز "لەهەندێك زماندا گێرهارد گێرهاردز" "Gerhard Gerhards"بوو.

بێگومان زانایەکی وا دانا دەبوو دروستو ورد لەئەرکەکانی قۆناغ تێبگات. لەوەیش زیاتر، زانای ئەوتۆ هەن دەڵێن جیهانی پڕ کێشەو ئەندێشەی ئیمڕۆکەشمان بەڕادەی ئەوسای ئەورووپا پێویستی بەپەندە وردەکانی ئیرازمۆسە[٦٠].

---

[٥٩] (بال)یش دەگوترێ.

[٦٠] وەك زانای سویسرایی فرنەرێ کایەیو زانای هۆڵەندەیی یۆهان هۆیزنجا بڕوانە: "أعلام وأفكار نظرات في التأريخ الثقافي"، تأليف المؤرخ الهولندي الكبير يوهان هويزنجا، ترجمة عبدالعزيز توفيق جاويد، مراجعة الدكتور زكي نجيب محمود، القاهرة، ١٩٧٢، ص٣٦٦، ٣٨٣-٣٨٤.

بیروڕای مرۆپەروەرانەی[٦١] باوی ڕۆژگاری ڕێنیسانس لەچەند بەرهەمێکی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامیدا بەڕوونی خۆی نواندووە، وەك کتێبی "ڕابەری جەنگی عیسایی"[٦٢] کە ساڵی ١٥٠١ تەواوی کردو کتێبی "دژی بەربەران"[٦٣] کە دوای ئەو بەنزیکەی ٢٠ساڵ لەدانانی بڵاوەو زۆر بەرز ئەدەبی کلاسیکی تێدا نرخاند. لەو نووسینانەیدا ئێرازمۆس هەوڵی داوە نیشانی بدات نهێنییەکانی ئاینی عیسایی لەسەروو ڕادەو توانای تێگەیشتنی مرۆوەن. هەمان کات ئەو لەقوژینی ئاڵوگۆڕو بەرەوپێش چوونی مرۆڤ و دەسکەوتەکانییەوە سەیری ئاینی عیسایی دەکرد.

ئێرازمۆس باوەڕی بەئاڵوگۆڕو بەرەوپێش چوون زۆر هەبوو، لەو قوژینەوە سەیری دیاردە گرنگەکانی ڕۆژگاری خۆی دەکردو دەیگوت "زانست دەژێتەوەو جیهان دەگەڕێتەوە سەر ڕێگەی ڕاستی هۆش و ئەدەبی باڵاش دیسان دەگەشێتەوە". بەلام شان بەشانی ئەوەش ئێرازمۆس پێی وابوو خووڕەوشتی مرۆڤ و ئارەزووی پتر لەسروشت هێزی بزوێنی ژیان و ڕەوڕەوەی مێژوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئێرازمۆس شوێن و جێگەی تایبەتیی سروشتی بەتەواوەتی لەیادنەکردووە و جاروبار لەنووسینەکانیدا بەپیاهەڵدانێکی زۆرەوە باسی دەکات، ژیان و هونەرو زانست لەبەرویبوومی نوورناخاتەوە.

سەرنجەکانی ئێرازمۆس دەربارەی دەسەڵاتی میرو دامودەزگای میریی لەو بەرهەمەیدا ڕەنگیان داوەتەوە کەساڵی ١٥١٦ بەناوی "پەروەردە (یا فێرکردنی) میری عیسایی"ەوە بڵاویکردەوە[٦٤]. ماکی ئەو سەرنجانەی لەدەوری ئەو بیرەی دەسووڕێنەوە کەلە قوژینی ئەوەوە دەیڕوانییەبڕبڕەی دامەزراندنی دامودەزگای میری-

---

(٦١) Humanism.

(٦٢) (Enchiridion Militis Chritian)

(٦٣) (Antibarbarorum Liber)

(٦٤) (Institutio Principis Christiani)

یاسای ژیـانو بەرژەوەندییـەکانی کـەپێی وابـوو پلـەیان گـەلێك لـەژوورووی تـاکو تایبەتییەوەیە. هەرچەندە ئـەم لێکدانەوەیـە بـۆ ڕۆژگـاری خـۆی بۆچوونێکی ورد بـوو. بەڵام ئێرازمۆس، وەك دواییش باسی دەکەین، نەیتوانی بەقووڵی لەدیاردە سیاسییەکانی ژیانو هێزە نەبینراوە بزوێنەکانیان تێبگات.

بیروڕاکانی ئـێرازمۆس دەربـارەی ژیـانی سیاسـی هەرچـەندە تاڕادەیـەك سـادەو ساکارن، بەڵام بۆ ئەوسای ئەورووپا کەمبایەخ نەبوون. ئـەو بـۆ خـۆی پیـاوێکی هێدیو هێمن، لەسەرخۆو یەکجار نەرمو نیان بوو، بەسروشت سـەر بەئاشـتیو دژ بەشـەڕ بـوو. هەر لەبەرئەوەش لەگەڵ هیچ ئاڵوگۆڕێکدا نەبوو کەهێزی تێدا بەکاربهێنرێ. پێـی وابـوو هۆشی وردو خوێندەواریی بەرزو زانینی زۆر؛ بۆیان هەیە مرۆ لەکێشـەو چەرمەسـەریو دەوڵەتان لەبێنەو بەرە رزگار بکات. دەیگوت عەقڵی مرۆ کەچڵەپۆپەی بەرزییە دەتوانێ ببێتە بناغە بۆ هەر رژێمێکی سەرکەوتوو، بۆیـەکا سـوور بـوو لەسـەرئەوە کـەدەبێ مـیر هەمیشە پەنای بۆ بەرێ تاوەکو لەرێگەیەوە بتوانێ تۆوی شەڕو دوویـەرەکیو ناحـەزیی ناو کۆمەڵ بنبڕ بکات.

هەمان کات ئێرازمۆس فـەرمانڕەوایانی ئـەورووپای هـان دەدا هـەوڵ بـدەن لای گـەل خۆیـان خۆشەویسـت بکـەن. لـێرەدا ئـێرازمۆس بەتـەواوەتی لەئەرکـەکانی قۆنـاغ تێگەیشتبوو، بەتایبـەتی ئەگـەر لـەیادمان بـێ ئەوسـاکە لەسەرانسـەری جیهاندا مـیرێك نەبوو، وەك ئـەو دەیویسـت، دڵنـەرمو لەسـەرخۆو گـەل پـەروەرو وەزیرەکانیشـی وەك خۆی پیاوی دانسقەو لێهاتوو، هەموویان شارەزای کۆنو کەلەبەری نیشتمان بن[٦٥].

هەر لەبەرئـەوەش ئێرازمۆسـی رۆتـەردامی بایـەخی زۆری دەدا بـەخوێندنو خوێندەواری. خوێندەواری بەلایەوە باشترین هۆی پەروەردەکردنی دروستی بیروهۆشـی مرۆیە، بۆیە بەشێك لەنووسینەکانی بۆ باسی پـەروەردە تـەرخان کـردووەو پـەردەی

---

(٦٥)

Rabb and J.E. Seigel, Princetion, 1969 pp. 20-21.

ـەیوی ناتەواوییە زۆرەکانی شێوازی خوێندنی قۆناغی دەرەبەگی لاداوەو گەلێك
مێرشی بردۆتە سەر دارکاریکردنی قوتابی‌و جۆری دەرس وتنەوەی مامۆستایان‌و داوای
ـیکردوون هەوڵ بدەن مەبەستەکانیان بەجۆرێکی روون‌و بێ‌پێچ‌و پەنا بگەیێننە قوولایی
ـەروونی شاگردەکانیانەوە.

ئێرازمۆس بەتەوس‌و گاڵتەپێکردنەوە باسی مامۆستایانی رۆژگاری خۆی کردووە.
ـیەکێك لەشاکارەکانیدا نووسیویە دەڵێ:

"هەموان دەزانن... ئەو مامۆستایانە هەڵدەگرن نەك رۆژی پێنج
وچانی وەك ئەلیادەی (هۆمیرۆس- ك.م.)، بەڵکە رۆژی پێنج
سەدجار بەر لەعنەت خرێن لەسەر جۆری بیرو قوتابخانە
بۆگەنەکانیان. قوتابخانەن یان بەندیخانە، یا کارگەو قەسابخانەن‌و بۆ
قوتابیان دانراون؟. چەند پیر بن، بێ بەلابن، هێند کەر دەبن،
وادەزانن کەس بەقولەپێیاندا ناگات.. بەناو پۆلەکاندا وەك کەڵەشێر
دێن‌و دەچن، کوێرانە بەو دووسەرە واوەی دەیزانن دەکەونە گیانی
جۆراوجۆری باس‌و بابەت.. بڕوا بفەرموون ئەوەی ئەوان دەیزانن
پوولێکی قەلب ناهێنێ!"(٦٦).

ولش بوو، کڵێسە کارێکی ئەوتۆی کردبوو مامۆستایانی قۆناغی دەرەبەگی تەنها
لەمەیدانی ئاین‌و فەلسەفەدا شتێکی کەم بزانن، هەرچی بۆنی زانستی نوێی لێ بهاتایە
نەدەبوو ئەوان توخنی بکەون، فێرگەکان نیمچە بەندیخانەیەك بوون بۆخۆیان‌و ئینجا
لەگەڵ ئەوەش تەنها منداڵانی چین‌و دەستەکانی سەرەوەی کۆمەڵ بۆیان هەبوو روویان
تێبکەن. کەواتە رزگارکردنی خوێندن‌و خوێندەواری لەکۆت‌و زنجیرە قەبەکانی
سەدەناوەنجییەکان یەکێك بوو لەئەرکە گرنگەکانی سەرشانی رووناکبیران. ئێرازمۆس

---

(٦٦) ئەم قسانەی لە"ستایشی گەمژان"دا کردووە کەدوایی بەدرێژیی باسی دەکەین.

دەیگوت ئەرکی نموونەیی سەرشانی ئەدیبی لێهاتوو کاری بێوچانە بۆ نەهێشتنی ئەزلی کەبەدەردی کوشندەی کۆمەڵو هۆی ناتەواوییەکانی دادەنا.

ئێرازمۆس بۆخۆی وەك پیاوێکی زیرەكو لێهاتوو مامۆستایەکی بەرزو پشتی قوتابیو شاگردو هاوەڵەکانی بوو، بەپێشکەوتنیان گەشەی دەکرد، واتە نموونەی زانای رەسەن بوو نەك ئەوانەی پێشکەوتنی قوتابیو هاوڕێکانیان خورپەی لەدڵیان هەڵدەساندو رووی گرژ دەکردن، ئەوانەی، ناشکوری نەبێ، لای خۆشمان کەم نین! بەدڵسۆزی، نەك لەپێناوی پارەو پوولدا یان بۆ مەبەستی تر، "کتێبی جوانکاری"و چەند بەرهەمێکی تری بۆ فێرگەکان دانا. چاپی یەکەمی "کتێبی جوانکاری" ساڵی ١٥٢٩ بڵاوکرایەوەو لەماوەی بیست ساڵدا چل جار چاپ کرایەوە.

بەهەمان دەستوور ئێرازمۆس بایەخی زۆری بە رابردوو دەدا، رۆژگاری کۆنی رۆمانو گرێکی بەرز دەنرخاندو، وەك گوتمان، زمانی هەردوو لایانی دەزانی. هەروەها لەڕێگەی چەند بەرهەمێکییەوە زیاتر سەرنجی رووناکبیرانی رۆژگاری رێنیسانسی بۆ دەسکەوتە گەورەکانی ئەو قۆناغە گرنگەی ئەورووپا راکێشا. بەهادارترینی بەرهەمەکانی ئێرازمۆسی رۆتەردامی لەو مەیدانەدا ئەو شاکارەیەتی کەساڵی ١٥٠٠ بەناوی "کتێبی پەندی پێشینان"ەوە بڵاوی کردەوە[٦٧]. لەچاپی یەکەمی ئەو کتێبەیدا ٨٠٠پەندی هەڵبژاردەی گرێکی لەگەڵ لێکدانەوەو لێدوانی قووڵی خۆیدا بڵاوکردەوە کەڕووناکبیرانی ئەورووپ یەکسەر قۆستیانەوە، ئەوەی وای لە ئێرازمۆس کرد چەند جارێك چاپی بکاتەوەو هەرجارەش کۆڵێك پەندی دانسقەی نوێی بخاتەسەر تابەر لەکۆچی دواییکردنی ژمارەی ئەو پەندانەی ناو کتێبەکەی خۆی دا لەچەند هەزارێك. ئەو بەرهەمەی ئێرازمۆس تەنها لەژیانی خۆیدا ٦٠جار چاپ کرایەوەو کرایە ئینگلیزیو فەرەنسەییو ئیتالیاییو ئەڵمانیو هۆڵەندەیی.

---

(٦٧) (Adagia).

دڵسۆزیی ئێرازمۆس بۆ ئاینی عیسایی خستییە سەر ڕێگەی لێکدانەوەی ئینجیل‌و وەرگێڕانی بۆسەر زمانی لاتینی. لەو کارەیدا ئێرازمۆس وەستاییەکی بێ‌هاوتای نواند، ئینجیلی وەها ڕەوان کردە لاتینی کەخوێندەواران بەئاسانی بتوانن لەناوەڕۆکی تێبگەن، لەکاتێکدا وەرگێڕانەکانی بەر لەو، وشک‌و ڕەق‌و ناتەواو بوون. ئەم کارەو نووسینەکانی تری ئێرازمۆس خۆی کارێکی ئەوتۆیان کرد ڕووناکبیرانی ئەوسای ئەورووپا پتر لەئاینی عیسایی بگەن‌و بزانن تا چ ڕادەیەك کڵێسە لەڕێی ڕاست لایداوەو ئاینی کردۆتە داردەستی خزمەتی پاپاو قەشەو ڕەبەنەکان‌و هۆی کوێرکردنەوەی زەینی توێژەی گەل.

لەو ڕێگەیەوە ئێرازمۆس بێ ئەوەی بۆ خۆی بیەوێ بووە هۆی گەیینی مەرجە پێویستەکانی تەقینەوەی شۆڕشی گەورەی چاك کردنی ئاین لەئەورووپادا کەبەر دوا قۆناغی ژیانی کەوت. وەك گوتمان ئێرازمۆس لەلایەکەوە ئیماندارێکی دڵسۆزو[68] لەلایەکی تریشەوە دژ بەشۆڕش‌و ئاڵۆگۆڕی کتوپڕ بوو، بۆیەکا نەبووە لایەنگری بزووتنەوە گەورەکەی مارتن لۆتەری بەناوبانگ، بەڵکو بەپێچەوانەوە دژیشی وەستاو بەنووسین هێرشی بردەسەر، هەرچەندە سەردارانی ئەو بزووتنەوەیە بەدڵ هەوڵیان دا ڕای بکێشنە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە[69]. کە بەڕاستی جێگەی شیاوی ئەو بوو. هەموان دەیانزانی ئێرازمۆس چۆن بەئەوپەڕی دڵسۆزییەوە هەوڵ دەدات خۆی وتەنی "خانەی خودا لەنەزانیی بەریەری ڕزگار بکات"[70].

لەهەمان کاتدا دوژمنانی "بزووتنەوەی چاککردنی ئاین"یش کەسەر بە کڵێسەی کاتۆلیکی بوون گەلێك هەوڵیان دا ئێرازمۆس ڕاکێشنە ناوڕیزەکانی خۆیانەوەو چەند

---

(68) تادوا هەناسەی ژیانی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی بەدڵسۆزی بۆ ئایینی عیسایی مایەوەو خۆی بەسەربازی عیسا دادەناو ١٥٠٤ساڵی کتێبێکی بەناوی "پەیامی سەربازی عیسایی"یەوە دانا.

(69) H.G. Koenigsberger and G.L. Mosse, Europe in the sixteenth Century, London, 1968, p.103.

(70) ئەو ڕستەیەی لەکتێبی "میری عیسایی"دا گوتووە.

پایەیەکی بەرزیان بۆ پێشنیار کرد، بەڵام ئەو هەموو جارێك یەك وەڵامی دەدانەوە "دەمەوێ شیرێکی بێ قەڵغان و ئازاد بم!". دەبێ سەرنجی ئەو وەڵامە بەرزە لەو قوژبنەشەوە بدەین کە ئێرازمۆس بەشی زۆری ژیانی بەنەداری و دەست کورتی بردەسەر.

دیسان ئێرازمۆس بێ ئەوەی بۆخۆی بیبەوێ لەڕێگەی ژمارەیەك بەرهەمی تریەوە گەورەترین خزمەتی پێشکەش بە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی چاککردنی ئاین کرد[71] لەو بەرهەمانەیدا بەشێوازێکی ڕازاوەی پڕ لەتەوس و توانج گاڵتە بەو پیاوە ئاینییانە دەکات کەلەهەموو بازاڕێکدا زۆر هەرزان خۆیان دەفرۆشن، ئەوانەی لەخۆیان و گیرفانیان بەولاوە بیر لەهیچی تر ناکەنەوە و داردەستی کاریشیان، بەداخەوە، ئاینە. کەم کەس وەك ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی توانیویە وێنەی قەشە ورگنە گوپ هەڵاوساوە سوورە هەڵگەڕاوەکانمان لەسەر تەختی برسێتی هەژاران بۆ بکێشێ، ئەو قەشانەی خۆی وتەنی "زیانیان لەقازانجیان زیاترە"، ئەوانەی "بەمەی تاوانی خەڵکی لەناو ورگیان دەتوێننەوە" و بە "نوشتە تاوان ڕەوێنە بێ‌فەڕەکانیان" گیرفانیان دەئاخنن و ئینجا لەگەڵ ئەوەش هەریەکەیان وای نیازە بەخۆی و تەزبیح و ریشی درێژیەوە بێتە دەستەڕاستی عیسای پێغەمبەر!. "جا ئەگەر کەرێتی و سادەیی خەڵکی نەبوایە کڵێسە چۆن خۆی پێ ڕادەگیرا.؟! بەو جۆرە پرسیارانە ئێرازمۆس ڕووناکبیرانی دەهەژاند و هۆشی دەهێنایەوە بەبەریانا.

ئەو جۆرە وێنانە زۆرجار لە "ستایشی کەران"دا بەرچاو دەکەون. "ستایشی کەران"[72] بەرزترین شاکاری ئێرازمۆسی نەمرە[73]. کە پاشبەندی ئەدەبیی ڕۆژنامەی "تایمس"ی بەناوبانگی لەندەنی پاش پتر چوار سەدە ناوی "نارنجۆکی ڕێنیسانسی ئاینی" لێناوە

---

(71) گەلێك زانا و مێژوونووس بزووتنەوەی چاککردنی ئاین (حركة الإصلاح الديني) کەسەرەتای سەدەی شازدەمین لەئەورووپادا تەقییەوە بەشۆڕش دادەنێن.

(72) The Praise of Folly)

کەم بەرهەمی نووسەرە کەڵەکانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس بەڕادەی "ستایشی کەران" دەنگی دلوەتەوە، رەنگبێ لێرەدا ئەوەندە بەس بێ بڵێین "ستایشی کەران" تەنها لەژیانی خاوەنیدا چل دانە جار لەسەر یەك چاپكرایەوەو بەدەیان هەزار دانەی بەهەر چوار قوڕنەی ئەورووپادا بڵاوكرایەوەو بەدەستوبرد گۆڕدرایە سەر دوازدە زمانی زیندووی ئەو كیشوەرە. سەنگی ئەو ژمارانە لەتەرازووی ئەوسای جیهاندا یەكجار قورسە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەیش لەیاد نەكەین كەچاپی نوێ هێشتا كۆرپەیەكی لەخەم نەڕەخسیو بوو، رووناكبیرو كۆلكە خوێندەوار لەشاراندا بەپەنجەی دەست دەژمێردران. وەك دەگێڕنەوە بەدەگمەن خوێندەوارێكی ئەورووپایی هەبوو بەپەرۆشەوە "ستایشی كەران"ی نەخوێندبێتەوە. تەنانەت پاپایان جۆلیۆسی دووەم و لیۆی دەیەمیش ئەو بەرهەمەی ئێرازمۆسیان لەبەرگەوە تابەرگی خوێندۆتەوەو سەریەقوڕ لەگەڵ ناوەڕۆكیدا پێكەنیون [٧٣].بێگومان ئەگەر "ستایشی كەران" دڵسۆزانە بیرازی دەردەكانی كۆمەڵی نەكردایە هەڵبەت رووناكبیران وا بەگەرمیی نەیاندەقۆستەوە.

ئێرازمۆس ساڵی ١٥٠٩ "ستایشی كەران"ی داناوە، وەك خۆی دەڵێ بەحەوت ڕۆژ تەولوی كردووە. هەرچەندە كەرێتی كەران وای لەئێرازمۆس كرد ئەو شاكارەی بنووسێ كەبریتییە لەسكاڵایەكی رەوا لەدەست نەفامان، بەڵام لەهەمان كاتدا ناوەڕۆكی ئەوەش دەگەیێنێ كەكۆڕینی دەوروبەری پڕ لەگێلو بەخیلو چاوبرسیو خۆپەرست كاری ڕۆژو

---

دەقی وەرگێڕانی ئەو ناوە "ستایشی كەرێتی"یە، بەڵام پێم وایە بەكوردی ئاوازی "ستایشی كەران" خۆشتر دێتە گوێ بۆیەكا ئەو وردە دەسكارییەم لەناوەكەیدا كرد. نووسەرانی عەرەب ناوی ئەو كتێبەیان كردۆتە "تمجید السفاهة" یا "مدح الحماقة" یا "الثناء علی الطیش". شایانی‌باسە مامۆستای بەڕێزو هاوڕێو برای خۆشەویستم دوكتۆر عبدالقادر أحمد الیوسف ئەو شاكارەی ئێرازمۆسی كردۆتە عەرەبیو هێشتا بڵاوی نەكردۆتەوە. بۆ باسی ئەو بەرهەمەی ئێرازمۆس كەڵكم لەدەستنووسەكەی ئەویش وەرگرتووە.

[٧٣] E.S. Crosby, Reformation and the Reformers, Amesterdam, 1963, p.82.

دوو ڕۆژ نییە. ڕاستە ڕەخنەکانی ئێرازمۆس ڕەق و جەرگبڕن، بەڵام ئەو عەودالی ڕێگەی ڕاست و ڕەوان بوو کەپێی وابوو ڕەخنەی توندو تیژ مرۆڤیان دەگەیێنێتێ. پێویستە ئەوەیش بڵێین کەلەگەڵ هەرەسهێنانی ڕژێمی دەرەبەگی و سەردەرهێنانی سەرمایەداری کێشەکانی کۆمەڵ لەجاران زیاتر بوون. ڕەنگبێ ئەوەی کەژمارەی پارێزەران لەڕۆژئاوای ئەورووپای ئەوسادا بەجۆرێکی هەست پێکراو پەرەی سەند باشترین بەڵگە بێ بۆ پێسەلماندنی ئەو ڕاستییە. ئێرازمۆس دوای دانانی "ستایشی کەران" بەنزیکەی یازدە ساڵ لەنامەیەکیدا کەبۆ یەکێك لەهاوڕێکانی خۆی نووسیوە دەڵێ:

"هەرچەندو لەهەر شوێن تووشی گێژاوی بەرەڵڵایی مرۆ دێم زیاتر باوەڕ دێنم کەلە هیچ چەرخێکدا بێ ئابڕوویی و کەرێتی و ستەم وەك ئێستە باو نەبووە".

ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی کەخۆی نەبوونیی چێشتبوو، دۆستی هەزاران و لایەنگری یەکسانیی چین و دەستەکانی کۆمەڵ بوو. هەرچەندە لەوەیشدا ئاینی عیسایی ڕابەری یەکەمی بوو، بەڵام وردە نوێکاریی خۆی هەر کردووە و ڕەخنەی لەخودماڵی گرتووە هەروەها جاروبار پزیشکی توانج و پلارەکانی بازرگانە نوێکانیشی گرتۆتەوە، ئەوانەی وەك دەیگوت، بوونەتە هۆی گرانیی کەلوپەل و خراپبوونی بابەتیان. بەڵام ئێرازمۆس وەك گەلێك شتی گرنگیتر، دەیویست تەنها لەڕێگەی میرو پاشایانەوە بەرپەرستی ئەو ناتەواوییانەی کۆمەڵ بکات.

ئێرازمۆسیش وەك هاوەڵەکانی هەموو نیشانەکانی دروست پێنەپێکرا، لەوەدا ئەمیش، وەك ئەوان، کوڕی ڕۆژگاری خۆی بوو. وەك گوتمان لەبڕوایدا بەمیرو پاشایان زێدەڕۆیی دەکرد، دەیویست ئەوان هان بدات بۆ ئەوەی بەدەستی خۆیان ڕژێمەکانیان بگۆڕن، لەکاتێکدا بەچاوی خۆی دەیبینی چۆن باڵی باڵدارو ناڵی ناڵدار دەشکێنن و زمان لەبن دەردەهێنن و چاوان هەڵدەکۆڵن و سەران دەپەڕێنن بۆ پاراستنی ڕژێمەکانیان کەبەلای خۆیانەوە لەهیچیان کەم نەبوو. ئێرازمۆس لەوە دڵنیا بوو بە بانگەوازێکی ئەو

پاشای پورتوگال هۆشی دێتەوە بەبەراو بازاڕی ڕەشی بازرگانە نوێکان بنبڕ دەکات. لەمەڵوەستیشیدا بەرامبەر "بزووتنەوەی چاککردنی ئاین" کەوتە هەڵەیەکی گەورەوە. لەوەدا ئێرازمۆس هەر دوورەپەرێز لەئاستی ڕەوڕەوەی مێژوودا نەوەستا، بەڵکو ویستیشی کۆسپی بێنێتەبەر[٧٤]. پێی وابوو دەبێ گەلان لەئاستی زۆرداریدا دان بەخۆدا بگرن نەبا بزووتنەوەیان ببێتە هۆی نانەوەی ئاژاوە.

بەڵام ئەو ناتەواوییانە بۆیان نییەهیچ لەپایەی بڵندی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی کەم بکەنەوە. ئێرازمۆس زۆر کەم لەکتێبەکانی دوور دەکەوتەوە، نووسەتنی کەمو خوێندنەوەی زۆر بوو، بۆ خۆی دەیگوت "ئەو شوێنە خانەمە کە کتێبخانەکەمی لێیە". هەروەها ئەوانەی تێکەڵیان دەبوو دەستەیەکی تایبەتیی وەك خۆی بوون، بۆیەکا نەیدەتوانی تەواو هەموو لایەنەکانی دەردو ئازاری کۆمەڵ ببینێو هێزە بزوێنە نهێنییەکانی دەستنیشان بکات.

شایانیباسە ئێرازمۆس بۆخۆی باش دەرکی کردبوو کەلەوانەیە بیروڕاکانی بێکەموکورتی نەبن. "تۆبڵێی ئێرازمۆس بەتەنها لەناو هەمواندا بێ هەڵەبێ؟ لەوانەیە ئۆگەستینو جیرۆمیش[٧٥] کەوتبنە هەڵەوە. ئەمە گوتەی ئێرازمۆس خۆیەتی کەپێی وابوو "نەگۆڕیی هەڵوەست تەنها لەدووپاتکردنەوەی یەك فەرمایشتدا نییە، بەڵکو لەوەشدایە هەمیشە هەوڵی پێکانی هەمان نیشان بدرێ".

وەك لەسەرەتاوە گوتمان لەسەرتاپای ئەورووپای ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا کەم زانا هەبوو بتوانێ شان لەشانی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی بدات. مێژوونووس هەن بەبالاترین ڕووناکبیری ئەو قۆناغەی دادەنێن[٧٦]، هەشن نازناوی "میری زانایان"یان بۆی

---

[٧٤] بەناوی "سەربەستیی را" ئێرازمۆس کتێبێکی دژی مارتن لۆتەری ڕەهبەری پرۆستانتەکان بڵاوکردەوە.

[٧٥] دوو ڕابەری گەورەی ئاینی عیسایی بوون.

[٧٦] 1300-1684,ed. By G.R. Elton,
Second edition, NewYork- London, 1968. P.59.

هەڵبژاردووە[٧٧]. هەمووان بەچاوی ڕێزەوە تێیان دەڕوانی، بۆ خۆیشی هاوڕێی دڵسۆزی هەموان بوو. "تۆماس مۆر"ی دانەری بناغەی بیروباوەڕی "سۆشیالیزمی یۆتۆپی"ی کەبەشی داهاتووی باسەکەمانی بۆ تەرخان دەکەین، یەکێك بوو لەهاوڕێ گیانی بەگیانێکانی، چەند ساڵێکیان لەئینگلتەرە پێکەوە بردەسەرو دواییش مەرگ لێکی بڕین. ئیرازمۆس "ستایشی کەران"ی بەتەوسێکی ناسکەوە پێشکەش بەمۆر کردو هەر لەڕێگەی ئەویشەوە کاتی خۆی هێنری هەشتەمی پاشای ئینگلتەرەی ناسی.

## "سۆشیالیزمی یۆتۆپی" یا"بەهەشتی خەو"

**سەرەتا:**

هەرچەندە ئەو ئاڵو گۆڕانەی ئەوروپای ڕۆژئاوا لەکۆتایی سەدەناونجییەکاند بەخۆیەوە بینینی هەنگاوێکی گەورەبوون بۆ پێشەوە چونکە بوونە هۆی هەرەسهێنانی ڕژێمی دواکەوتووی دەرەبەگی، بەڵام ئەرکی گرانی جێبەجێکردنیان کەوتە ئەستۆی کۆمەڵانی خەڵکی مەڵبەندەکە خۆیەوە. بەداخەوە زۆرجار ڕەوڕەوەی مێژوو بەخوێنو فرمێسکو ئارەقی ناوچەوانی چەوساوان بەرەوپێش دەچێت. ئەو دیاردەیە لەئینگیلتەرەی ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا زۆر زەق خۆی نواند.

لەبەر گەلێك هۆ ئەوساکە پیشەسازیی کوتاڵی ئینگلیزی هەنگاوی گەورەی بۆ پێشەوە نا[٧٨]. بازاڕی زۆر وڵات دەرگەیان بۆ ئەو کوتاڵە نایابە خستە سەر گازی پشت کار گەیشت بەوەی ئینگیلتەرە لەناوەندی سەدەی شازدەمیندا ساڵی ١٢٢هەزار تۆپ کوتاڵی دەناردە هەندەران، واتە بیستوچوار هێندی ناوەندی سەدەی چواردەمین، ئەو

---

(٧٧) R. Palmer and J. Colton, Ahistory of the Modern World, third edition, NewYork, 1965, p.51.

(٧٨) خوریی ئینگیلتەرە لەجیهاندا کەم هاوتایە. تەڕوتوشیی ئاووهەواشی مەرجێکی باشی پیشەسازیی کوتاڵە.

کاتە هەمووی بەسەر یەکەوە ساڵی ٥هەزار تۆپــی دەنــاردە بــازاڕی وڵاتــانی دەوروبــەری خۆی. بەر لەکۆتایی سەدەی شازدەمین ئەو کوتاڵە لە ۸۲٪ی هــەموو ئــەو کەلوپەلانــەی پێکدەهێنا کە ئینگیلتەرە دەینارد بۆ دەرێ[۷۹].

بەوجۆرە دروستکردن‌و بازرگانیی کوتاڵ بووە سەرچاوەی قازنجێکی ئەوتۆ کەکەس تا ئەو ساکە بەخەویش لەوێنەی بەخۆیەوە نــەبینیبوو، بۆیــەکا پــارەداران بەپەرۆشــەوە روویان تێکرد. زۆربــەی هــەرەزۆری دەرەبــەگانی ئینگلیتــەرە دەســتیان لەکشــتوکاڵ هەلگرت‌و کێڵگەکانیان کردە لەوەڕگە بــۆ پــەروەردەکردنی مــەڕو زۆرکردنــی بــەرووبوومی خوری کەکارگە نوێکان لەهەموو لاوە بەپەرۆشــەوە بــەنرخی چــاك دەیانقۆستەوە. وەك ئاشکراشە شوانکارەیی، بەپێچەوانەی کشتوکاڵەوە، پێویستی بەهێزی کاری زۆر نییــە. ئەو کێڵگەیەی جاران بەدەیان‌و سەدان جوتیار دەبــرا بــەڕێوە کــەبووە لەوەڕگــە ئــەرکی بەچەند شوان‌و گاوانێك جێبەجێ دەکرا. بەڵگە ئینگلیزییەکانی ئەو رۆژگارە باسی ئــەوە دەکەن چۆن لەگەلێك ناوچە دوو سێ شوان جێگەی ۲۰۰جووتیاریان دەگرتەوە. بەو پێیە بەلایەنی کەمــەوە لــە ۹۰٪ی جووتیــاران لــەزەوی‌وزارو کــاری کشــتوکاڵ بێبــەریی کــران. دەرەبەگانی ئینگیلتەرە بــێ پــەروا کەوتنــە گیــانی پیاوەکانیــان‌و بــەدەیان هــەزاریان لێ ئاوارە کردن. ئەو ئاغایانەی تا دوێنێ کەللەی ئەو جووتیارەیان دەپەڕاند بوێرێ بســتێك لەزەوی‌وزاری فراوانیان دووریکەوێتەوە بەدەیان دێ‌و گوندیان کاول کرد تەنها بۆ ئەوەی پیاوەکانیان ناچار بکەن سەری خۆیان هەلگرن. بەشی زۆری ئەو قورپەسەرانە بەناچاری دلیانە دەشت‌و کێوو پەنایان بردە بەر ئەشکەوت‌و لێڕو دارستان‌و لەگژو گیاو میوەجات بــەولاوە هیــچ نــەبوو بیخــۆن، بەتایبــەتی دوای ئــەوەی بەماوەیــەکی کــەم قڕیــان خســتە بەرلنەکێویی ناوشاخان‌و ماسیی ناو ئاوانەوە.

بەشێکی زۆر لەو ئاوارانە بەناچاری روویان کردە شارە گــەورەکانی وڵات‌و ئامادەبوون بەنانەسکی هەر کارێکیان دەست بکەوێ بیکەن. سواڵکەرو دەرۆزەگــەران هــەموو لایان

[۷۹] بڕوانــە: یــو.م. ســابریکین. ســەرەتای پێشــکەوتنی ســەرمایەداریی لەئینگیلتــەرەدا. - "مێــژووی جیهان" بەزمانی رووسی، بەرگی چوارەم، مۆسکۆ، ۱۹٥۸. ل۳۱٤.

تەنی. دزیو جەردەییو پیاوکوژی بوونە پیشەی رۆژانەی هەزاران. گرانیش هێندەی تـر تەنگی بەهەموان هەڵچنی.

هەڵوێستی کاربەدەستانی ئەوسای ئینگیلتەرەو یاساکانیان بوونە سەرباری مەینەتیی ئەو هەژارانە. هێنریی هەشتەم کەلەساڵی ١٥٠٩ەوە تاوەکو ساڵی ١٥٤٧ پاشایەتیی کرد ویستی لەرێگەی یاساوە دەرێژەگەری قەدەغە بکات. بەپێی یاسایەکی تایبەتی پیاوانی میری هەرکەسێکیان بەتۆمەتی دەرێژەگەری بگرتایە بۆ جاری یەکەم دارکارییان دەکـرد ئەگەر هەمان کـەس جـاری دووەم بگیرایـەوە ئەوسـا وێـڕای دارکـاری لایـەکی گوێشیان دەبڕی. لەجاری سێیەمدا دەبرایە بەر پای قەنارەو سووکو باریك لەسەر برسێتی دەکـر بەسێدارەدا!.

باری قورسی ژیانی هەژارانی ئینگیلتەرەی سەدەی شازدەمین بووە هۆی تەقینەوەی زنجیرەیەك راپەڕینی جوتیاران. لەو راپەڕینەدا کەسـاڵی ١٥٤٩ بەڕابـەریی رۆبـەرت کێـت "Robert Ket" لەرۆژهەلاتی ئینگیلتەرەدا تەقییەوە ژمارەی تەنـها ئەوانـەی چـەکیان هەلگرتو گیانیان خستە سەرلەپی دەسیان لە ٢٠هەزار کەس تێپەڕی[٨٠].

بێگومان دەبوو ئەو بارە جەرگبڕەی ئاوارانی نیشتمان هەناوی ئەدیبو رووناکبیرێکی گەورەی وەك تۆماس مۆر بهەژێنێ. ئەو قسە پڕ تەوسەی لەو رۆژگارەدا مۆری بەناوبانگ کردی "مەڕ واخەریکە زەلام بخوا" بووە پەندێکی چەسپاوی زمانی ئینگلیزی.

## تۆماس مۆر

حەوتـەمین رۆژی مـانگی شـوباتی سـاڵی ١٤٧٨ تۆمــاس مـۆر (Thomas More) لەلەندەن لەدایك بوو. بنەماڵەی مۆر خوێندەوارو ناسراو بوو، بەر لـەتۆماس ژمارەیـەکی

---

[٨٠] "مێـژووی سـەدەناوەنجییەکان"، بـەزمانی رووسـی، بـەرگی دووەم، مۆسـکۆ، ١٩٦٦، ل٢٢٢-٢٢٤.

بۆ دادکارو پارێزەری بەناوبانگی تێدا هەڵکەوتبوو[81]. هەر لەلەندەنی پایتەخت تۆماس مۆر خوێندنی تەواو کرد. سەرەتا چووە "فێرگەی ئەنتۆسی پیرۆز" و پاشان زانکۆی ئۆکسفۆردی بەناوبانگی بڕی. لەوساوە تێکەڵ بەدەستەی رووناکبیری بەرزی ئەو رۆژگارەی ئینگیلتەرە بوو. وەك لەبەرایشدا باسمان کرد مۆر بووە هاوەڵی گیانی بەگیانیی ئێرازمۆسی رۆتەردامی کەناوو شۆرەتی سەرانسەری ئەورووپای گرتبۆوە.

هونەرو ئەدەبو سروشتو چەند زانستێك سەرنجی تۆماس مۆریان راکێشا[82]. مۆر لەلاتینیو گریکیدا زمانزانێکی وەستابوو. ئەو سەرەتای بزووتنەوەی وەرگێڕانی کەلەپووری دێرینی ئەورووپای لەو دوو زمانەوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی دامەزراند[83].

تۆماس مۆر لەهەموو روویەکەوە پیاوێکی راستو مرۆیەکی بێ غەلو غەش بوو. وەك هاوسەر دڵسۆزو وەك باوك جگەرسۆزو وەك هاوڕێ وەفادارو وەك کاربەدەست چالاكو ئازاو وێڕای هەمووشیان دڵ نەرمو بەخشندە بوو. بۆ خۆی ژنەکەیو منداڵەکانی بەشیری چاکەو مۆسیقاپەروەریو ئەدەبگوزاری گۆش کرد. ماڵی دیوەخانی زانایانو پەناگەی هەزاران بوو. خەڵکی بۆ خۆیان نازناوی "باشترین هاوڕێی هەزار"یان بۆ هەڵبژارد[84].

پاش تەواوکردنی ئۆکسفۆرد تۆماس مۆر بووە پارێزەرو یەکسەر ناوبانگی دەرکرد. یاسازانو قسەرەوانو گوتەبێژو سەرڕاست بوو، ئەوانەش، وەك ئاشکرایە، مەرجی سەرەکین بۆ سەرکەوتنی پیاوانی داد. کە ساڵی ١٥٠٤ خۆی بۆ ئەندامەتی پەرلەمان

---

[81] باوکی تۆماس مۆر دادکارێکی بەناوبانگ بوو.

[82] س.ب. کان، مێژوویی بیری سۆشیالیزمی، بەزمانی رووسی، مۆسکۆ، ١٩٦٦، ل١٤. (لەمەودوا: S.B.Kan)

[83] H.H. Hudson, The Epigram in the English Renaissance, NewYork, 1966, pp. 30-31, 43.

[84] لەنووسینەکانیدا ئێرازمۆسی رۆتەردامی گەلێك لایەنی پرشنگداری ژیانو رەفتاری تۆماس مۆری بۆ تۆمارکردووین. وەك هاوڕێیەکی نزیك، ئێرازمۆس لەنزیکەوە تێکەڵ بەخێزانی مۆر بوو.

پـالاوت کـەس نـەما دەنگـی بۆ نـەدات، بەتایبـەتی بازرگانـانی لـەندەن کەدەسـتەی پیشکەوتووی ئەوسای کۆمەڵ بوون. دەنگی زوڵاڵی تۆماس مۆر لـەوێش بـەرزبۆوە. مۆر ئازایانە بەرەنگاری سیاسەتی چەوتی هێـنریی حەوتـەم[٨٥] هـاتو بـەهیچ جۆر ملی بۆ نەداو کەزانی هیچی پێ ناکرێ دەسـتی لـە پەرلـەمان هـەلگرت. هـەر لەبەرئـەوەش مۆر مەرگی هێنریی حەوتەمی وەك "رۆژی رزگاری" نرخاند[٨٦].

هێنریی هەشتەم بەرلـەوەی بێتـە سـەر تـەختی پاشـایی خـۆی لـەڕووناکبیرانی رێنیسانس نزیك دەخستەوە کەیەکێکیان تۆماس مۆر بوو. لەوساوە جێگری تەختو مۆر بوونە هاوڕێ، زۆرجار ئەویان سەری لەمیان دەدا. کەهێنریی هەشتەم بۆ یەکەمجار ژنـی هێنا تۆماس مۆر پێنج پارچە هۆنراوەی تایبەتیی خۆی لەدەفتـەرێکی رازاوەدا بـەدیاری پێشـکەش کـرد. ئـەو دەفتـەرەی مـۆر ئێسـتە یەکێکـە لەکەلـەپووره دەگمەنـەکانی "مۆزەخانەی بەریتانی"[٨٧].

تۆمـاس مـۆر لـەو بڕوایـەدا بـوو کەفـەرمانڕەوایی هێـنریی هەشـتەم لەگـەڵ خـۆی سەرفرازی بۆ گەلو نیشتمان دێنێ، بۆیەکا هەر کەئەو هاتە سەر تەخت بەدڵ پشتگیریی کردو کاتێك داوای لێکرد بگەڕێتەوە سەر کاری میری فەرمانی نەشکاند. سـەرەتا بـووە یـاریدەری شـەریفی لـەندەنو ئینجـا بـووە ئـەندامی "ئەنجومـەنی کۆشـك"و لەسـاڵی ١٥٢٩شـەوە بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ بـووە راوێژکـاری یەکـەمی پاشـا. بەرلـەوەش بـووە سەرۆکی پەرلەمانی بەریتانیو لەیەکەم گوتەیدا بەو بۆنەیەوە داوای کرد نوێنەرانی گـەل لەلێدوانو وتووێژەکانیاندا چاونەترسو سەربەست بن[٨٨].

---

[٨٥] هێنری حەوتەم لەساڵی ١٤١٣ەوە تاوەکو ساڵی ١٥٠٩ پاشای ئینگیلتەرە بوو.

[٨٦] ی.ن. ئوسینۆفسکی، رێبازی سیاسـی کتێبـی "ریتشـاردی سـێیەم"ی تۆمـاس مـۆر، "ئـەورووپای سەدەناوەنجییەکان. ژیانی ئابووریو سیاسـیو رووناکبیی". بـەزمانی رووسـی، مۆسـکۆ، ١٩٧٢، ل٤١٨.

[٨٧] H.H. HudsonM Op. Cit. P41.

[٨٨] سـاڵی ١٥٢٣ تۆمـاس مـۆر ئـە وتـارەی خوێنـدەوە کـە تائێسـتەش لەگەڵ بەڵگـە دێرینـەکانی پەرلەمانی بەریتانیدا هەلگیراوە.

رۆژی نەخاياند تۆماس مۆر دڵی لەهێنریی هەشتەمیش کرمێ بوو. باشترین بەڵگەی ئەو راستییە شاکاری "یۆتۆپیا"ی پڕ لەتوانجو رەخنەیە. وەك دواییش باسی دەکەین مۆر کاتێك "یۆتۆپیا"ی دانا هێشتا لەچڵەپۆپەی کاری میریدا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا دوا ئەڵقی پێوەندیی لەگەڵ رۆماو پاپادا پچڕاند. هەرچەندە مۆر بەدەستووری ئێرازمۆسی هلوەڵی رەخنەی توندوتیژی لەکڵێسەو پیاوانی دەگرت، بەڵام زۆر بەپەرۆش بوو بۆ پارلستنی یەکێتی جیهانی عیسایی‌و هەر لەبەرئەوەش دژی بزووتنەوەی چاککردنی ئێنو لۆتەری رەهبەری ئەو بزووتنەوەیە وەستا[٨٩].

هەرچەندە هێنری هەشتەم هەوڵی دا بەڵام تۆماس مۆر لە هەڵوێستی خۆی پاشگەز نەبۆوە، ئەوسا بەفەرمانی پاشا مۆر نەك تەنها لەکار دوورخرایەوە، بەڵکو زیندانیش کرا. دوای گرتنیشی هێنری چەند جارێك بێ سوود هەوڵی دا پەشیمانی بکاتەوەو بیگێڕێتەوە سەر تەختویەختەکەی جارانی. تەنانەت پاڕانەوەو فرمێسکی مارگرێتی کچیشی دڵیان نەرم نەکرد. ئەوسا بەپێی فەرمانی پاشا بەرەبەیانی رۆژی حەوتی تەمموزی ساڵی ١٥٣٥ سەری پەرێنراو بۆ "عیبرەت" لەبەردەمی یەکێك لەپردەکانی لەندەندا هەڵواسراو دوایی بەپێی نەریتی ئەوسا توڕدرایە ناو روباری تایمسەوە. ئەوەندە هەیە هێنری "رەحمی تلیسایەوە"و رێگەی نەدا بەپێی دەستووری باوی ئەوسا بەر لەناشتنی جەرگو هەناوی لەلەشی جیابکەنەوە، رێگەشی دایە کەسوکاری لەناشتنیدا بەشداربن‌و پرسەی بۆ بگرن[٩٠].

کەم کەس لەمێژوودا بەپرادەی تۆماس مۆر ئازایانە بەرەنگاری مەرگ هاتوون. وەك دەگێڕنەوە تا دواهەناسەی ژیانی زەردەخەنە لەلێوی نەپەڕیوە. کەهێناویانە سەری بقرتێنن بەیەکێك لەئەفسەرەکانی گوتووە:

---

[٨٩] H.J. Grimm, The Reformation Era 1500-1650, P.70
and Reformation 1300-1640:, PP. 66-67.

[٩٠] ئەوساکە هەرکەسێك بەدوژمنایەتی پاشا تاوانبار بکرایە سەری دەقرتێنراو توڕدەدرایە ناو شاری تایمسەوەو ئینجا زۆر بێشەرمانە جەرگو ریخۆڵەیان دەردەهێناو بێ ئاگاداری کەسوکاری بەجیا لاشەکەیان دەناشت... ئای مێژوو کە بەکەڵکی چونکە هەموو راستییەك تۆمار دەکەیت!.

"تکایە هەر بۆ سەرکەوتن یاریدەم

بدە، لەهاتنە خوارەوەدا خۆم

کاری خۆم مەیسەر دەکەم!".

دوای ئەوەی لەسەر تەختەی سەرقرتانەکە دریژیان کردووە بەدەم زەردەخەنەوە رووی کردۆتە کابرای تەور بەدەستو پیی گوتووە:

"ساتیکم لی راوەستە تاریشم

لائەدەم، ئەو بیتاوانە... ملیشم

کورتە، دەست باش داگرە نەبا

تەورەکەت تەتەلە بکات"[91].

* * *

تۆماس مۆر ژمارەیەك نووسینی بایەخداری دوای خۆی بەجیهیشت. نووسینەکانی کاری زۆریان کردە سەرژیانی رووناکبیریی ئەورووپای رۆژگاری رینیسانسو دوای رینیسانس. کەم کەس بەرادەی ئەو لەئەرکەکانی قۆناغ تیگەیشتبوونو کەسیش وەك ئەو بۆ چارەسەرکردنیان نەچوو، چونکە، خۆی وتەنی، "نەیدەتوانی وەك کەسانی تر بیر بکاتەوە"[92]. هۆیەکی گرنگی تریش لەئارادا بوو بۆ ئەوەی تۆماس مۆر بتوانێ باشتر لەدەردەکانی کۆمەڵ تیبگات، ئەو، وەك گوتمان، وەك پاریزەریکی ناسراوو فەرمانبەریکی گەورە ئاگاداری رووداوی ژیانو بەسەرهاتی جەرگبری نەدارو لیقەوماوان بوو. پیاویکی دلرەقو خۆپەرستو چەوسینەریش نەبوو تادەردو ئازاری خەلکی نەبیزووینێ.

---

(91) S.B. Kan, Op. Cit., P.16. تۆماس مۆر، یوتوپیا، ترجمة وتقدیم الدکتور أنجیل بطرس سمعان، القاهرة، ١٩٧٤، ص٣٦.

(92) 74. Renaissance and Reformation 1300-1648 ئەوە قسەی تۆماس مۆر خۆیەتی کەلەبەندیخانەوە بۆ مارگریتی کچی نووسیوە.

"مێژووی ریچاردی سێیەم" یەکێکە لەبەرهەمە نایابەکانی تۆماس مۆر کەتاوەکو ئێستەش بەسەرچاوەیەکی رەسەنی لێکدانەوەی رۆژگاری فەرمانڕەوایی ریچارد دادەنرێ کەدەوروبەری کۆتایی سەدەی پازدەمین بۆ ماوەی دووساڵ پاشایەتیی ئینگیلتەرەی کرد[93]. مۆر زانیارییەکانی ئەو بەرهەمەی دەماودەم لەخەڵکەوە کۆکردۆتەوە[94]. لە "مێژووی ریچاردی سێیەم"و ژمارەیەك بەرهەمی تریدا تۆماس مۆر زۆر توند رەخنەی لەزۆرداری‌و زوڵم‌و زۆری میرو پاشایان گرتووە، ئەو کارەی ئەوسا زمانی لەبندا لەسەر دەبڕا. ژمارەیەك لەبەرهەمەکانی مۆر ناویان بەخۆیانەوەیە، وەك "لێدوانی خۆشی دژی ئەندێشە" [95].تەنانەت کەڵەنووسەرێکی وەك شکسپیریش لەبەرهەمەکانیدا کەڵکی لەنووسینەکانی تۆماس وەردەگرت کە "یۆتۆپیا" گوڵی سەردەستەیانە.

## "یۆتۆپیا":

لەنێوانی ساڵی ١٥١٥و ١٥١٦دا تۆماس مۆر بۆ کاری میری لەلەندەنەوە چووە شاری ئەنتروێپی هۆڵەندەو بروجی بەلجیك‌و ئەو ماوەیەی بەهەل زانی بۆ داڕشتنی ئەو بیروڕایانەی وادیارە لەدەمێکەوە لەقوڵایی دەروونیدا پەنگیان خوارد بۆوە. لەوێ کتێبی بەناوبانگی "یۆتۆپیا"ی نووسی کەبۆخۆی لەژێر ناوەکەیدا بەم جۆرە بەخوێنەری دەناسێنێ:

"کتێبی زێڕینی بەکەڵك‌و خۆش
دەربارەی باشترین رژێمی

---

[93] ریچاردی سێیەم (١٤٥٢-١٤٨٥) ساڵی ١٤٨٣بووە پاشا. پیاوێکی دڵڕەق بوو، دەستی چووە گیانی یەکێك لەبراکانی‌و ژنێکی خۆی دەرمانخوارد کرد. یەکێك لەدراماکانی شکسپیر باسی ژیان‌و رەفتاری ریچاردی سێیەم دەکات.

[94] E.N. Osinovsky, Op. Cit. P.407.

[95] وا پێدەچێ دەوروبەری ساڵی ١٥٢٢ تەواوی کردبێ.

فەرمانڕەوایی و دورگەی یۆتۆپیای نوێ".

"یۆتۆپیا" لەدوویەش پێکهاتووە. مۆر بەشی دووەمیانی لەدەرەوەی ولآتو بەشی یەکەمیانی دوای گەڕانەوەی بۆ لەندەن دانا. لەبەشی یەکەمی کتێبەکەدا تۆماس مۆر باسی ناردنی بۆ ئەنتروێپ دەکاتو چۆن لەوێ گوایە تووشی گەڕیدەیەکی پورتوگالیی شارەزا بووە بەناوی هیتلۆدایەوە. لەڕێگەی ئەو گفتوگۆیە کەگوایە لەگەڵ هیتلۆدلید کردوویە مۆر گەلێك پلارو توانجی بەجێی گرتۆتە رژێمی سیاسیو ئابووریی باوی ئەوسای رۆژئاوای ئەوروپا. بەزمانی هیتلۆدایەوە تۆماس مۆر لەو بەشەی کتێبەکەید دەڵێ:

"کەس نییە بتوانێ سیاسەتی پاشایان

بگۆڕێ... ئەوان بایەخ بەشەڕ زیاتر

دەدەن وەك لەئاشتی... هەوڵ دەدەن

خاکی‌نوێ زەوت بکەن لەبریتی ئەوەی

بایەخ بدەنە ولآتی خۆیان... سەیرو

سەمەرە لەوەدایە کەدزە گەورەکان

دەبنە دادکارو سزای دزە بچوکەکان

لەسەر ئەو پارچە نانە دەدەن کە

لەتاو قوڕەی سکیان زات دەکەن

دەستی بۆ ببەن... بیستومە دەڵێن

بەرخەکانتان کەجاران دەستەمۆو بێوەیو

کەمخۆر بوون ئێستە چاوبرسیو درندەن،

پیاو دەخۆن، کێڵگەو خانوبەرەو شاران

وێران دەکەنو دانیشتوانیان هەڵدەلووشن!!".

کەس، تەنانەت مارلۆو شکسپیری گەورەش بەو جۆرە باسی پاشاو میرو گەداو مەرگرانی ئەو رۆژگارەی ئینگیلتەرەیان نەکردووە.

دوای ئەوەی هیتلۆدای بەسەرو پۆتەلاکی پاشایان‌و رژێمی پڕ لەزۆرداریياندا دێتە خواری دەڵێ تەنها یەکسانیی تەواوو هاوبەشیی گشتیی بۆیان هەیە مرۆ لەکێشەی‌و چەرمەسەری‌و چەوساندنەوە رزگار بکەن، بەڵگەشی دورگەی "یۆتۆپیا"یە. لەوێدا گوایە تۆماس مۆر تکا لەهیتلۆدای دەکات باسی "یۆتۆپیا"ی بۆ بگێڕێتەوە. بەو جۆرە بەشی دووەمی کتێبەکەی دەست پێ دەکات.

"یۆتۆپیا" دورگەیەکی رازاوەیە کەوتۆتە ئەوپەڕی دونیاوە. دانیشتوانی گیرۆدەی هیچ کێشەیەک نین، کەس ناچەوسێنێتەوە، کەس زۆر لەکەس ناکات، هەرلەبەر ئەوەش کەس رقی لەکەس نییە. زەوی‌وزاری "یۆتۆپیا" هی هەمووانە، کۆگاکانی هەرچی دڵ بیەوێ تیایاندایە، ساڵ دوازدەی مانگ دەرگەیان ئاواڵەیە، کێ چی بوی بۆ خۆی دەیبا. سەرجەمی دانیشتوانی "یۆتۆپیا" نیشتەجێی شارانن، واتە گوندو لادێ نازانن. هەر خانووەی دوو دەرگەی هەیەو هەردووکیان هەمیشە ئاواڵەن.

کەس نییە لە"یۆتۆپیا"دا کار نەکات، رۆژی کاریش شەش سەعاتە کەبەرهەمی بەشی ژیانی پڕ لەخۆشیی هەموان دەکات. دەستەیەک زانای هەڵکەوتوو نەبێ کەخۆیان بۆ پێشخستنی کۆمەڵ تەرخان کردووە ئیتر هەموان وەک خوشک‌وبرا دەچنە کارگەو کێڵگەکان‌و شەرم لەهیچ کارو پیشەیەک ناکەن چونکە بەری رەنجیان بۆ خۆیانە. کۆمەڵ بەرپرسیاری نەخۆش‌و کەفتەکارانە کەهەموان بۆیان دەبنە کەسوکار. منداڵان دەبێ بخوێنن، خوێندنیش دەبێ لەسەر بناغەی تیۆری‌و چاوبینی دامەزرێ، بەوێنە ئەوی لەفێرگە دەربارەی کشتوکاڵ دەیخوێنن پێویستە لەکێڵگەش بەچاو ببینن.

کەمترین جیاوازی لەنێوان ئافرەت‌و پیاوی "یۆتۆپیا"دا نییە. هەردووکیان وەک یەک فێر دەبن‌و وەک یەک کاردەکەن‌و وەک یەک لەرۆژی تەنگانەدا چەک هەڵدەگرن. گەر ویستی ئافرەت، بۆی هەیە تەنانەت بشبێتە مەلاو پێشنوێژ. باری ژیانی "یۆتۆپیا"

کارێکی ئەوتۆی کردووە ئافرەت هیچ جۆرە ئەرکێکی ناوماڵی نەکەوێتە ئەستۆ، تەنانەت چێشتیش لێنانێ چونکە ئەو خۆراکەی لەچێشتخانە رازاوەکاندا بەدەم ساتوسەمتورەوە پێشکەشی هەموان دەکرێ دەستی پێوە دەخورێ. هەموو ژەمێك بەدەم قسەی خۆش و پەندو راوێژی پیرانەوە دەبەنە بەسەر.

خێزانی "یۆتۆپیا" نمونەی تەبایی و بەرزییە. بەرلە هەژدە ساڵی کچ نابێ شوو بکات و کوڕیش بەرلەوەی تەمەنی ببێتە بیستوسێ ساڵان نابێ ژن بهێنێ. بەر لەمارەبڕین دەبێ باش یەك بناسن چونکە دوایی جیابوونەوە کارێکی ئاسان نییە رێگەی جیابوونەوە هەر ئەوکاتە دەدرێ کە هەردوولا دوای بیرکردنەوە هاتبنە سەر ئەو رایەی پێکەوە دانویان ناکوڵێ. داوێن پیسیی لایەکیش دەبێتە هۆی جیابوونەوە، بەڵام قوربەسەر داوێن پیس، لەبەر چاوی هەموان ریسوا دەبێ!. ئافرەتانی "یۆتۆپیا" سوراو سپیاو نازانن، لای پیاوانی؛ ئەو جوانە جوانە کەبەرەوشتیش جوانە.

کۆڵەکەی رژێمی سیاسیی "یۆتۆپیا" یەکسانی و یەکمافییە. هەموو شارانی "یۆتۆپیا" لەژێر سایەی یەکێتییەکی فیدراڵیی راستەقینەدا حەواونەتەوە. میر نەمیر کاربەدەستان هەموویان لەلایەن دانیشتوانەوە هەڵبژاردنی ساڵانەیان بۆ دەکرێ. هەرچی میرە جارێك هەڵدەبژێردرێ، دەبێ داناو لێهاتوو بێ. میری "یۆتۆپیا" چاك لەوە گەیشتووە گەر هەڵەوەڕ یا خۆهەڵکێش بێ یاکەمێك پێ خوار دانێ و بیەوێ بیروڕای خۆی داسەپێنێ ئەوا یەکسەر تەخت و تاراجی لەکیس دەچێ. هیچ کارو فەرمانێکی گەورەی دەوڵەت نییە لەکۆبوونەوەی گشتیدا بڕیاری لەسەر نەدرێ. سزای خنکاندن لەسەرانسەری دورگەی "یۆتۆپیا"دا تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کەبەراستی دوژمنی رەوشت و چاکە و کۆمەڵن، ئەوانەی هیچ دادیان ناداو دەبنە باری گران بەسەر دانیشتوانی نیشتمانی رازاوەی گەلی "یۆتۆپیا"وە.

یاسای "یۆتۆپیا" مافی تەواوی سەربەستیی ئاینی بۆ هەموان پاراستووە، تەنانەت خوا نەپەرستانیش ئازادن و بۆیان هەیە بکەونە گفتوگۆو لێدوانی تایبەتیی لەگەڵ

شەرمزاو زانایاندا، بەڵام نابێ لەکۆبوونەوەی گشتیدا چالاکی بنوێنن. خۆ گەر هەموان سەر بەوەدا بنێن گیان نەمرو ژیان دەستکردی یەزدانە ئەوا دەتوانن جڵەوی بەرەڵڵایی بشتر دلبین بکەن. دانیشتوانی "یۆتۆپیا" ئاینی عیسایان بۆیەکا لاپەسەندە چونکە کاتی خۆی داوای یەکسانیی هەموانی دەکردو بە رووی جیاوازکەراندا هەڵسا.

دیارە کۆمەڵێك ئەندامانی بەو شێوە خاوێنە گۆش بکرێن بەختەوەرو سەرفراز دەمێن، هیچ هۆیەك لەئارادا نابێ بۆ ئەوەی دەروونی کەسێکی تووشی گرێ بێ، یا کەسێکی رقی لەکەسێکی بێ. هەموان دڵپاكو کراوەو چالاکن. بەچرای رۆنگەرچەکیش چاوچنۆکێك لەسەرانسەری دورگەی "یۆتۆپیا"دا نادۆزیتەوە. سەرتاپایان گاڵتەیان بەزێر دێ، پڕ بەدڵ بەو بێگانانە پێدەکەنن کەسەروپۆتەڵاکیان بەمیدالو نیشانی زێرین رازاندۆتەوە، چونکە ئەوان لەوەتەی هەن زێر بۆ دروستکردنی کۆتو زنجیری بەندانو قەعادەی منداڵان بەکاردەهێنن.

کەس وەك دانیشتوانی "یۆتۆپیا" لەجوانی سروشت تێناگات. گشتیان عەوداڵی زانیاریو خوێندنەوەو مۆسیقاو وەرزشو گەشتو گەڕانن. ئاشتی پەروەرو دژ بەشەڕن، بەڵام قوڕ بەسەر ئەوەی دەستیان بۆ درێژ دەکات، سەرتاپایان بۆی دێنە مەیدانەوە، بێ سێو دوو گیانو سەروماڵیان فیدای نیشتمان دەکەن. ئامادەشن دەستی یاریدەی دڵسۆزانە بۆ ئەو دراوسێیانەیان رابکێشن کەدژی زۆرداریو لەپێناوی سەرفرازیدا دەجەنگن. ئەوی لەخۆیان زیادبێ دەیکەنە دیاریی دەستیانو پێشکەشی کۆمەڵانی تری دەکەن.

بەو جۆرە تۆماس مۆر وێنەی کۆمەڵێکی بەختەوەرو بێ کێشەی بۆ کێشاوینو لەرێگەیەوە کۆمەڵگا پڕ کێشەکانی رۆژگاری خۆی بۆ ریسوا کردووین. بەڵام مۆر باش لەوە گەیشتبوو کەدورگەکەی بەهەشتی خەوەو وادیارە هەر لەبەرئەوەش ناوی "یۆتۆپیا"ی بۆ هەڵبژاردووە کەلەدوو وشەی لێکدراوی لاتینی پێکهاتووەو بەسەریەکەوە واتای "ئەو شوێنەی نییە" دەگەیێنن.

لەدێرزەمانـەوە ژمارەیـەك ڕووناكبـیری تـر بیریـان لەیەكسـانیو نەهێشـتنی چەوساندنەوە كردۆتەوە[٩٦]، بەلآم كەسیان نەیانتوانی وەك تۆماس مۆر بەوردی بۆ تێ لایەنی مەسەلەكە بچن. مۆر یەكەم كەسە دروسـت خـاوەنێتی تایبـەتیو گشـتیو شوێنیانی لەژیانی كۆمەڵدا نرخاندووە. مۆر لەو بارەیەوە نووسیوییە دەڵێ:

"لەهەر شوێن خاوەنێتی باوبێو
پارەوپول سەنگی كێشان بێ ناتوانرێ
كاروباری میری بەجۆرێكی ڕاستو شێوازێكی
سەركەوتوو ببرێ بەڕێوە"[٩٧].

تۆماس مۆر یەكەم كەسە بۆ ئـەو ڕاسـتییە چووە كەیەكسـانیی ڕاستەقینە دەبێتـە هۆی نەمانی جیاوازیی نێوان لادێو شارو كاركردن دەبێتـە ئـەركی سەرشـانی هـەموان. ئەو بۆچوونانەی دوایی ڕەنگیان لەبیروباوەڕی سۆشیالیزمی زانستیدا دایەوە.

تۆماس مۆر بەدامەزرێنەری ڕێبازی "سۆشیالیزمی یۆتۆپـی" دادەنرێ[٩٨] كەیەكەم شـێوازێكی ڕێكوپێكـی سۆشـیالیزمە لـەمێژوودا. ڕاسـتە تۆمـاس مۆریـش وەك هـەموو ڕووناكبیرانی ڕۆژگاری خـۆی نـەیتوانی گشـت نیشـانەكان دروسـت بپێكـێو لەژمارمیەك هەڵوێستو نرخاندنیدا ئەویش كەوتە هەڵەوە[٩٩]، بەلآم لەگەڵ ئەوەشـدا كـەس وەك ئەو

---

[٩٦] ئیفلاتۆن لەسەدەی چوارەمی پێش عیسـادا عـەوداڵی دامـەزراندنی كۆمـەڵێكی یەكسـان بـوو. نووسەری گرێكی ئێمبۆڵ "یا یامبول" دوای ئەو بەنزیكەی دوو سـەدە باسـی دوورگەیـەكی بەختـەوەری كردووە كەدانیشتووانی چەوساندنەوەیان نەزانیوە.

[٩٧] ی.ی. ڤیرتسـمان، ژیانی ڕووناكبیریی ڕێنیسـانس لەئینگیلتەرە، -"مێژوویـی جیـهان" بـە(زمـانی ڕووسی)، بەرگی چوارەم، مۆسكۆ، ١٩٥٨، ل٣٤٥.

[٩٨] بەعەرەبی: الاشتراكیة الطوباویة. "طوبی" بەواتای بەهەشت دێت.

[٩٩] وەك هەڵوێستی بەرامبەر بزوتنەوەی چاككردنی ئاین كەبەچەشنی ئیرازمۆسی هاوەڵی نزیكی دژی وەستا. هەروەها چـەند دیاردەیـەكی دواكـەوتووی سـەدەناوەڕاستیيەكان كـەمێك لەتریفـەو پرشـنگی كـەم

ﻗﻪوڵ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی قۆناغ نەچوو، ئەو یەکەم کەس بوو ویستی حەشت بهێنێتە ئەمەدونیاوەو تۆوی چەوساندنەوەو زۆرداری لەکۆمەڵ ببڕێ. هەر سەر ئەوەشە تۆماس مۆر بۆتە یەکێك لەنەمرانی مێژوو. ناوی شانۆگەری و فیلمی "پیاوی هەموو چەرخێك" کەدەربارەی ژینامەی مۆرە وا بەخۆیەوە. واشە، هەموو چەرخێك پێویستی بەکەڵەپیاوی وەك تۆماس مۆرە، پێویستی بەوانەیە کە لەئەرکەکانی قۆناغ دەگەن و وەك ئەو دڵسۆزانە بیرو خامەیانیان بۆ تەرخان دەکەن. زۆری نەبرد ئەورووپای رۆژگاری رێنیسانس و دوابەدوای ئەو رۆژگارە ژمارەیەك رووناکبیری تێهەڵتووی تر ویستیان بەدەستووری تۆماس مۆر لەرێگەی سۆشیالیزمی یۆتۆپییەوە سەرفرازی بۆ گەل و نیشتمان بهێنن.

* * *

---

حەلوتای دێرە نازدارەکانی "یۆتۆپیا"یان کەمکردۆتەوە. وێڕای ئەوانەش تۆماس مۆر "یۆتۆپیا"ی بەزمانی لاتینی دانا نەك بەزمانی نەتەوەیی، واتە رووی دەمی کردە دەستەی سەروەی کۆمەڵ کە تۆسالی کەموکورتیکانی ژیانی گەلیان کەوتبووە ئەستۆوە. "یۆتۆپیا"سالی ١٥١٦ بۆ یەکەمجار بەلاتینی بەم ناوەوە چاپ کرا:

Utopia"

زۆری نەبرد "یۆتۆپیا" وەرگێڕدرایە سەر زۆربەی زمانە ئەورووپاییەکان و تا ئێمڕۆکە بەدەیان جار چاپکراوەتەوە.

# "سۆشیالیزمی یۆتۆپی" دوای مۆر

## کامپانێللاو "شاری رۆژ":

ئەو ئاوەی تۆماس مۆر رشتی لەوانە نەبوو جارێکیتر بگیرێتـەوە، گوپوتینی لەگەڵ زۆربـوون و پەرەسـەندنی چەوسـاندنەوەدا توندوتیژتـر دەبـوو. بەرلـەوەی رۆژگـاری "رێنیسـانس" کۆتـایی بـێ ژمارەیەك رووناکبیری تـر هـەر یەکەیان بـەجۆرێك کەوتنـە سۆراخی "بەهەشتی خەو". یەکێك لەو رووناکبیرانە کامپانێللای ئیتالیایی بوو.

تومازۆ، یا تۆماس کامپانێللا "Tommaso Campanella"[١٠٠] رۆژی ٢٥ی ئـەیلولی سـاڵی ١٥٦٨ لـەناو خـێزانێکی نیمچەهـەژاردا لـەدایکبوو. بـاوکی پینـەچی و دایکـی کەیبانووی ماڵ بوو. سەرەتا لەکڵێسە خوێندی و هـەر لـەوێش بـووە قەشـە، بـەڵام زۆری نەبرد دەستی لەژیانی رەبەنی هەڵگرت و رووی کردە نووسینی شـیعرو فەلسـەفە. سـاڵی ١٥٩١ یەکـەم کتێبـی فەلسـەفیی بڵاوکـردەوە. لـەبیروباوەڕیدا کامپـانێللا زۆر بـەتوندی رەخنەی لەگەلێك لایەنی رێبازی توێژینەوەی وشکی فەلسەفیی رۆژگاری خۆی دەگرت و ئازایانە پەنجەی بۆ کەموکورتێکانی کڵێسە رادەکێشا. زۆری نـەبرد لەسـەر بیروبـاوەڕی گەشبینی خرایە زیندانەوە.

دوای بەربوونی تومازۆ کامپانێللا جـارێکی تـر سـەری نـەکردەوە بەکڵێسـەدا، کەوتـە گەڕان بەپارچەکانی نیشتماندا. هیچ وەك دەردو ئـازاری هـەژاران و دابەشبوونی ئیتالیـا دەروونی نەدەهەژاند. ئەوسا باشوری ئیتالیای نیشـتمانی لـەژێر دەسـتی ئیسـپانییەکاندا دەینـاڵاند. کامپـانێللای چاونـەترس پلانـی شۆڕشـێکی گـەورەی دانـا کەمەبەسـتی نەهێشتنی دەسەڵاتی ئیسـپانییەکان و دامـەزراندنی رژێمێکـی کۆمـاریی سـەربەخۆ بـوو

[١٠٠] بەرلەوەی ببێتە فەرمانبەری کڵێسە ناوی جۆڤانی دۆمینکۆ بوو.

بەداخەوە دوژمنان پێیان زانیو دیسان کامپانێللایان گرتەوە. ئەمجارەیان یەکێك لەدادگە دواکەوتووەکانی پشکنین دوو تۆمەتیان دایە پاڵی، یەکەمیان تۆمەتی یاخیبوون دژی دەسەڵاتی میریو دووەمیان تۆمەتی دوژمنایەتی پاپاو کڵێسە. ئەئازاردانی بێئەندازەو نەتەماعی دونیا سەریان بەڕۆڵەی دڵسۆزی گەلو نیشتمان شۆڕ نەکرد. خۆی بەشانازییەوە نووسیویەو دەڵێ:

"هیچ شتێك نەبوو بتوانێ

ورەم پێ بەربدات، کەسێك نەیتوانی

وشەیەکم لێ دەربهێنێ"[١٠١]

ئازایەتی کەم هاوتاو قسەزانینی چەند جارێك ملی تۆمارێ کامپانێللایان لەپەت قوتار کرد، بەلام نەیانتوانی لەبەندیخانەی رزگار بکەن. کامپانێللا بەسەریکەوە ٢٣ساڵی رەبەقی لەزیندانەکانی رۆماو ناپۆلی بردەسەر. ٢٣ساڵ بەندیو ئەشکەنجە بەرد دەتوێنێتەوە، بەلام کاری نەکردە سەر کامپانێللای نەبەز کە لەنووسینو بیرکردنەوە. لەو ماوەیەدا بەدەیان کتێبی دەربارەی فەلسەفەو سیاسەتو ئەستێرەناسییو پزیشکیو ئابووریو هونەری جەنگو ئەدەبو شیعر داناو توانی ژمارەیەکیان بەقاچاغ لەئەڵەمانیا بگەیێنێتە چاپ.

لەبەندیخانەشەوە تۆمارێ کامپانێللا عەوداڵی هەواڵی نیشتمانو زانایان بوو، هەوڵی دەدا هەرچۆنێك بێ لێیان نەپچڕێ. هەر ئەوەندە بیستی کڵێسەو دادگاکانی پشکنین فشاریان خستۆتە سەر زانای بەناوبانگ گالیلۆ گالیلی[١٠٢] لەوێوە بەخامەی تاریکبڕی کەوتە ریسواکردنی دوژمنانی. ئەو هەڵوێستەی کامپانێللا هێندەی تر شایانی رێزو قەدر

---

(١٠١) S.B. Kan, Op. Cit., P.23.

(١٠٢) زانای گەورەی ئیتالیایی گالیلۆ گالیلی "Galilei" {١٥٦٤- ١٦٥٢} لەفیزیاو میکانیكو ئەستێرەناسیو ئەدەبو رەخنەو شیعردا دەستی باڵابوو. راکانی کۆپەرنیکۆسی دەربارەی خرِی زەویو سووڕانەوەی بەدەوری رۆژدا سەلماند.

دەبێ گەر بێتو بۆخۆی لەگەڵ ژمارەیەك لەبۆچوونەكانی گالیلۆدا نەبوو، بـەلام بەلایـەوە بەریەرەكانێی زانایانو فەرامۆشكردنی ئازادیی بیریان نەنگیو پەڵەی شەرم بوو.

ئەو جۆرە هەڵوێستە پیاوانانەی كامپانێللا، وێڕای نووسینە بـەرزەكانی، بوونـە هـۆی دەنگدانەوەی ناوی لەسەرانسەری ئیتالیاو ئـەوروپای رۆژئـاوادا. تەنانـەت پاپـا ئوربـانی هەشتەمیش یەكێك بوو لەوانەی كامپانێللای چوبو بەدڵدا. بەیاریدەی ئەو مانگی مایسـی ساڵی ١٦٢٩ پاش ٣٣ساڵ ئەشكەنجە دەرگەی زیندان بۆ كامپانێللا كرایەوە. پاش چەنـد ساڵێكی كـەم كامپـانێللا لـەئیتالیا هەڵهات چونكـە بـاش دەیزانـی درەنـگو زوو هـەر دەیگرنەوە. كامپانێللا دوا پێنج ساڵی ژیانی لەفەرەنسە بردەسـەر كەئەوسـاكە بـەهۆی ریشلیۆی سـەرەك وەزیرانـەوە[103] بـاری ژیـانی رووناكبـیرو زانایـانی لەزۆربـەی وڵاتـی ئەوروپا باشتر بوو. رۆژی ٢١ی مایسی ساڵی ١٦٣٩ دڵی گەورەی كامپانێللا لەدوور وڵات لەلێدان كەوت.

تۆمارۆ كامپانێللا بیروڕای سۆشیالیزمی یۆتۆپیی خۆی لەو كتێبـەیدا تۆمـار كـردووە كەساڵی ١٦٠٢ لەناو زینداندا بەناوی "شاری رۆژ"ەوە دایـنـا. "شـاری رۆژ" بەرهـەمێكی ئـەدەبیو فەلسـەفیو سیاسییە. گوایـە دەریـاوانێكی ئیتالیـایی رێگـەی لێ ون دەبـێو شـەپۆلی دەریـا دەیباتـە دوورگەیـەكی نەناسـراو كەدانیشـتوانی بەدەسـتووری دوورگـەی "یۆتۆپیا" یەكسانو یەكمافـو بەختـەوەرن. كەسـیان نەكەوتوونەتـە بـەندو ئەسـارەتی پارەوپوولەوە. سامانی زۆری "شاری رۆژ" تەرخانی خزمەتی هەموانە، واتە كەس لەوێ نەبۆتە كۆیلەی سەرمایە، بەڵكە ئەمیان بۆتە خزمەتكاری ئەڵقە لەگوێی گشت لایـەكێك. لەسەرانسەری "شاری رۆژ"دا چەوسێنەرێك یا بێكارەو نەخوێندەوارێك بەدی ناكرێ. كـە لای هەموان ئەركی پیرۆزی ژیانە، كاری رۆژانـەی كەسـیش لـەچوار سـەعات تێناپـەڕێ. دوای ئەوە هـەموو ژیانیـان بەخوێندنـەوەو ئاهـەنگو سـەیرانی خۆشو وەرزشو كاری

---

[103] كاردینـال ریشـیلۆی بـەناوبانگ {١٥٨٥- ١٦٤٢} لەسـاڵی ١٦٢٤ەوە بـووە سـەرەك وەزیرانـی فەرەنسە كەلەسەردەمی ئەودا وڵات لەهەموو روویەكەوە باش بەرەوپێش چوو.

موتەری دەبەنە سەر. سەرتاپای دانیشتوانی "شاری ڕۆژ" ئازاو بەجەرگو بەخۆیووردوون، نیشتمان هێندەی پێداون لەڕۆژی تەنگانەدا کەمتەرخەمی ناکەن‌و گیانی بۆ بەخت بکەن.

بەچەشنی دوورگەی "یۆتۆپیا" دانیشتوانی "شاری ڕۆژ" پێکڕا لەچێشتخانە رازاوە گشتییەکان نان دەخۆن، خۆیان فەرمانڕەوایانیان هەڵدەبژێرن، کەس نییە نەخوێنێ‌و بناغەی خوێندنیش تیۆری‌و چاوبینەو بۆ ئەو مەبەستە هەموو دیوارەکانی ناوشار بەوێنەی دڵفڕێن رازێنراونەوە، قوتابیان زۆرجار ئەوی لەفێرگە دەبیستێن لەناوشاردا بەچاویش دەبینێن. بەری خوێندن بۆ کچو بۆ کوڕ وەك یەك بەرەڵلایەو بەزمانی زگماکی خۆیان هەموو قۆناغەکانی دەبڕن. ئەمەیان تێگەیشتنی وردی ئەرکی قۆناغ بوو، چونکە ئەوساکە خوێندن لەسەرانسەری ئەورووپادا بەلاتینی بوو نەك بەزمانی نەتەوەیی.

تۆمازۆ کامپانێللا بڕوای بەتوانای بێسنووری مرۆ بوو بۆیەکا دانیشتوانی "شاری ڕۆژ"ی بەسەر سروشتدا زاڵکردووە[١٠٤].

کامپانێللا لەژمارەیەك بەرهەمی تریدا زنجیرەیەك بیروڕای وەك ئەوانەی "شاری ڕۆژ"ی بۆ تۆمار کردووین، جاری واهەیە لەنووسینەکانیدا کامپانێللا داوای دامەزراندنی رژێمێکی یەکسانی دوور لەشەڕو کێشە بۆ هەموو جیهان دەکات. پێی وایە داهاتی جیهان هێند زۆرە کەس نەبێتە قوربانیی برسێتی‌و نەبوونی‌و کەس چاو نەبڕێتە خاکی کەس‌و بەو جۆرە ئاشتی‌و تەبایی باڵ دەکێشن بەسەر ژیاندا، ئەوساکەش "بەپێی یاسای سروشت" زانست‌و فەلسەفەو رەوشت دەگەنە چڵەپۆپە[١٠٥].

سەرنجەکانی تۆمازۆ کامپانێللا ئەنجامی تێگەیشتنی راستی ئەرکەکانی قۆناغ بوون. بۆ خۆی لە"شاری ڕۆژ"دا باس دەکات چۆن لەحەفتا هەزاری دانیشتوانی شاری ناپۆلی

---

[١٠٤] کامپانێللا، شاری رۆژ، چاپی رووسی، مۆسکۆ- لینینگراد، ١٩٤٧.

[١٠٥] أ.خ. گۆفونکیل، دەستنووسێکی نەزانراوی تۆمازۆ کامپانێللا،- "ئەورووپای سەدەناوەنجییەکان" (سەرچاوەی ناوبراو)، ل٣٦٣- ٣٦٤.

تەنها دەپازدە هەزارێکیان شەوو ڕۆژ دەڕوتێنەوەو ئەوی ناشێ دەیکەنو ئەوانی تریش ژیانی پڕ لەتەمەڵیو بەرەڵڵاییو رابواردنی بێ شوورەیی دەبەنە سەرو بوونەتە میکرۆبی خراپە بۆ گیانی هەموان[١٠٦].

کامپانێللاش وەك کەڵەڕووناکبیرەکانی تری ڕۆژگاری رێنیسانس نەیدەتوانی هەموو یاسا بزوێنەکانی ژیان بەوردی ببینێ. بەوێنە لای ئەو دەوری سروشتی مرۆ لەناتەواوییەکانی کۆمەڵدا زۆر لەوە زیاترە کەهەیە. گوایە خوێندەواریش بۆی هەیە سەرفرازیی راستەقینە لەگەڵ خۆیدا بهێنێ، هەر لەبەرئەوەش منداڵان لەکەسوکاریان دەکاو لەناو قوتابخانە تایبەتییەکاندا بەشێری چاکە گۆشیان دەکاتو زاناو دلنایان دەکاتە سەردەستەی کاروباری میری. پێی وایە خوێندەوار نابێ بکەوێتە هەڵەوە. خۆی لەهۆنراوەیەکیدا دەڵێ:

ئەی دەبەنگی[١٠٧] مەرگ بۆ تۆ
ئەوا من هاتمە ژیانەوە[١٠٨]

کەوابێ تۆمازۆ کامپانێللا نیشانەکانی دروست دیار کرد، بەڵام لەڕوویەکەوە ڕێگەی پێکانیانی دروست بۆ نەکێشاین. هەرلەبەرئەوەش لەبریتی جەماوەر رووی دەمی کردە میرو پاشایانو داوای لێ دەکردن ئەوان گوایە خەونە خۆشەکانی "شاری ڕۆژ" بهێننە دی، واتە بێ ئەوەی بزانێ کلیلی گۆڕی خۆیانی دەدانێ!.

لەگەڵ ئەوەشدا تۆمازۆ کامپانێللا یەکێکە لەپێشەنگە ناودارەکانی ڕێبازی "سۆشیالیزمی یۆتۆپی" کەکاری زۆری کردە سەر بیروڕای ئەوانەی دوای خۆی ئەو

---

[١٠٦] کامپانێللا، شاری ڕۆژ، ل٦١.

[١٠٧] مەبەستی نەخوێندەواریو زۆرداریە.

[١٠٨] أ.أ. ئەبرامسۆنو س.د. سکازکین، ئیتالیای سەدەی شازدەمین.- "مێژووی جیهان". بەرگی چوارەم، ل١٢٠.

ڕێگەیەیان گرتەبەر. "شاری ڕۆژ" وەرگێڕدراوەتە سەر گەلێك زمانو دەیان جار تاوەکو ئێستە لەچاپ دراوەتەوە[١٠٩].

## "مۆنزێر"و ئەوانیتر:

بیروباوەڕی "سۆشیالیزمی یۆتۆپی" لەئینگیلتەرەو ئیتالیادا نەگیرسایەوە، بێجگە لەوان لەچەند مەڵبەندێکی تری ئەورووپای ڕۆژئاوادا سەری هەڵدا. تۆماس مۆنزیر "T.Munzer" تاکەپێشەنگی ئەو ڕێبازەیە کە لەڕۆژگاری ڕێنیسانسدا ویستی بەزەبری شمشێر ئاڵای یەکسانی بچەسپێنێ.

تۆماس مونزێر دەوروبەری ساڵی ١٤٧٠ لەشاری شتۆلبێرگی ئەڵەمانیا لەدایکبوو. زانکۆی لایپزگو فرانکفۆرتی تەواو کردو یەکێك بوو لەخوێندەوارە هەرەزیرەکەکانی ئەڵەمانیای ڕۆژگاری ڕێنیسانس[١١٠]. هەرزوو دەرکی بەناتەواوییە زۆرەکانی کڵێسەی کردو بووە لایەنگری بزووتنەوەکەی مارتن لۆتەری بەناوبانگ[١١١]، بەڵام ئەو لەسەرنجەکانیدا دەربارەی چاککردنی کڵێسە گەلێك لەلۆتەرو هاوەڵەکانی شۆڕشگێڕتر بوو بۆیەکا زۆر زوو لێکدابڕانو مونزێر کەوتە لۆمەو ڕەخنەگرتنی ورد لەلۆتەر کەبەپیاوێکی مەراییکەری دادەنا[١١٢].

بەلای مونزێرەوە دەبوو بزووتنەوەی چاککردنی ئاین هەموو ڕووەکانی ژیان، نەك کڵێسە بەتەنها بگرێتەوە. دەیگوت ئەوانەی پارەنانی هەتیوو هەژار زەوت دەکەن

---

[١٠٩] ساڵی ١٦٢٣ بۆ یەکەم جار "شاری ڕۆژ" بەزمانی ئیتالیایی لەچاپ درا.

[١١٠] H.J. Grimm, Op. Cit, pp. 166- 16g.

[١١١] دەربارەی سەرنجەکانی مونزێر بڕوانە: -1300

1648 166- 16g.

[١١٢] م.م. سمیرن، چاککردنی ئاینو شەڕی گەورەی جوتیاران لەئەڵەمانیا،- "مێژووی جیهان"، بەرگی چوارەم، ل١٦١.

دوژمنی یەکەمی خودانو دەبێ چەکیان لەڕوودا هەڵگیرێ. مونزێر داوای دامەزراندنی ڕژێمی بێ چەوساندنەوەی دەکرد.

تۆماس مونزێر باش بۆ ئەوە چوویوو کەچەوساوان تیغی کوشندەی ڕژێمی زۆرداریـن بۆیەکا رووی دەمی تێدەکردنو بۆخـۆی تێکـەڵیان دەبـوو. زۆرجـار شـان بەشـانی جووتیارانی ئەڵەمانیا دەچووە کێڵگەکانو بەدەم کارەوە قسەی بۆ دەکردنو بۆ شۆڕش هانی دەدان. مونزێر بەم جۆرە ئاینو ژیانی تێکهەڵکێش دەکرد:

"بڕوانن چۆن میرانو ئاغایان بوونەتە
هۆی بڵاوبوونەوەی سووسەلەمو دزیو
جەردەیی. چی ئەما ئەوانە بۆ خۆیانی
زەوت نەکەن، دەبێ ماسیی ناو ئاوو
مەلی ناو ئاسمانو هەموو ڕووەکی سەرزەمین
بۆ خۆیان بێ. ئینجا دوای ئەوەش بەناوی
یەزدانەوە داوا دەکەن کەس دزی
نەکات... ئەو دڵڕەقانە پێستی جوتیاری
بەسزمانو پیشەگەرو هەموانیان کەوڵ کردووە..."[١١٣].

مونزێر لەکاتی شـەڕی گـەورەی جوتیـاراندا دوورەپـەرێز نەوەسـتاو ئازایانـە لەتـەك شۆڕشگێڕاندا چووە جەرگەی خەباتەوەو تابەبرینداری نەکەوتە دەسـت دوژمـن دەسـتی لەچەك بەرنەدا. پاش ئەوەی دەرەبەگان چەند ڕۆژێك لەسەر یەك بەبەرچاوی خۆیانـەوە خستیانە ژێر ئەلەقەوە بـێ ئـەوەی ورتـە بکـات، ئینجـا بەئەوپـەڕی ڕقـەوە داخـی دڵـی خۆیان پێڕشتو ڕۆژی ٢٧ی مایسی ساڵی ١٥٢٥ لەتوکوتیان کرد. بـەڵام ئـەوان ناویـان ونو تۆماس مۆنزێر ناوی زیندووە.

---

(١١٣) .S. Skazkin, Op. Cit., Vol. Ll, p.83.

لەفەرەنسەش ژمارەیەك رووناكبیری ئەو رۆژگارە كەوتنە سۆراخی یەكسانی بۆ ئەندامانی كۆمەڵ. نووسەری بەناوبانگ فرانسوا رابلێن "١٤٩٦- ١٥٣٣" F.Rabelais لەنووسینەكانیدا "بەگەرمی دژی چەوساندنەوە وەستاو وێنەی دەرەبەگانی ئەوسای وەك پیاوی دڵرەق و ورگن و چاوچنۆك و مەیخۆر بۆ كێشاوین[114].

هەرچی نووسەری فەرەنسی سیرانۆ " Cyrano de Bergerac" بوو "١٦١٩-١٦٥٥" تەواو كەوتبووە ژێر كاری سەرنجەكانی كامپانێللاوە، تەنانەت ناوی بەرهەمەكانیشی وەك ئەو هەڵبژارد. ئەویش خوێنەر لەگەڵ خۆی دەباتە ئەو بەهەشتانەی دانیشتوانیان لەخۆشی و دڵسۆزی و برایی بەولاوە هیچیتر نازانن. سیرانۆ یەكێك لەو بەرهەمانەی ناوناوە "جیهانێكی تر یامێژووی كۆمیدیی دەوڵەتانی مانگ" و یەكێكیانی تری ناوناوە "مێژووی كۆمیدیی دەوڵەتانی رۆژ". لەو بەرهەمانەیدا مرۆ دەگاتە مانگ و ئەستێرەی ترو لەوێ بەچاوی خۆی دەبینێ چۆن هەموان لەسایەی یەكسانیدا حەوانەتەوە. پلەی زانست و ئاشتیپەروەری لای سیرانۆ یەكجار بەرزە.

جیرارد وینستێنلیش "Winstanley" كەیەكێك بوو لەنووسەرانی ئینگلتەرەی نیوەی یەكەمی سەدەی حەڤدەمین "١٦٠٩- ١٦٥٢" لەبەرهەمەكانیدا بەگەرمی داوای نەهێشتنی چەوساندنەوەو بڵاوكردنەوەی یەكسانی و روخاندنی رژێمی پاشایەتیی دەكرد "یاسای سەربەستی"[115] شاكاری وینستێنلیە كەویستی لەرێگەیەوە فەرمانڕەوایانی نوێی ئینگلتەرە بۆ لەناوبردنی خاوەنێتی تایبەتی هان بدات[116].

هەرچەندە جێبەجێكردنی ئاواتە بەرزەكانی دەستەی یەكەمی رێبازی "سۆشیالیزمی یۆتۆپی" لەبەر گەلێك هۆی تێكهەڵكێش كارێكی ئاسان نەبوو، بەڵام گرنگ ئەوەیە كەس بەرادەی هەڵگرانی ئاڵای ئەو رێبازە لەئەركەكانی قۆناغ تێنەگەیشت و وەك ئەوان بۆ

---

(114) V.F. Simeonov, Op. Cit. P. 492.

(115) "The Law of Freedom" سالی ١٦٥٢بۆ یەكەم جار چاپ كرا.

(116) S.B. Kan, Op. Cit., pp. 26- 29.

چارەسەرکردنیان نەچوو. شەقڵی گەلێك لەسەرنجە وردەکانی ئەو ڕووناکبیرانە لە بیروباوەڕو ڕێبازی داهاتووی سۆشیالیزمدا ڕەنگی داوەتەوە. بێگومان ئەمری ئەوان‌و هاوەڵەکانیان لەوەوە هاتووە کەکاتی خۆی بەوردی لەئەرکەکانی قۆناغ تێگەیشتن.

## دواوشە:

مەبەستی بەرودوای ئەم زنجیرە وتارەم ئەوەیە بڵێم تاقیکردنەوەکانی ڕۆژگاری زیندووی ڕێنیسانس بۆیان هەیە ببنە پەندو دەرسی پڕ مانا بۆ هەموو ئەدیبێکی لێهاتووی جیهانی پان‌و بەرینی ئیمڕۆو دواڕۆژ. ئەگەر بێکەس‌و جاف‌و هەڵمەت‌و مزووری‌و پەشێو‌و مستەفاو میسری‌و ڕەوف‌و مەم‌و مەنمی‌و بەدری‌و بێگەردو حسەین‌و کاوس‌و ئیحسان‌و ئاکرەیی‌و خورشیدەو ئەختەرو هێرۆو سیامەنسوری‌و قەرەداغی‌و عەبدوڵلاو سندی‌و فندی‌و عیزی‌و حەمەفەریق‌و بۆتانی‌و کاکەحەمەو برا خامە زێڕینەکانی ترمان وەك ئەدیبانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس لەئەرکەکانی قۆناغ تێنەگەن‌و وەك ئەوان چاونەترس‌و لەخۆبوردوو نەبن ئەوا بێگومان نەدەچنە ناخی دڵی کەسەوەو نەدەچنە خانەی نەمرییەوە کە دانتێ وتەنی هەزار ساڵ ژیان لەئاستیدا تروکەیەکە ! !.

# سەرچاوە

## بەزمانی ئینگلیزی


Rabb and J. E. Seigel, Princeton, 1969.

Baron H., The crisis of early Italian Renaissance, Princeton, 1967.

Bush M. L., Renaissance, Reformation and the Outer World. London, 1967.

Chabod E., Machiavill and Renaissance, Cambridge, 1960.

Gilmore R., The World of Hummanism, 1453- 1517, NewYourk.

Grain E., Italian Humanism, Philosophy and civic life in the Renaissance, translated by P. Munz. Oxford, 1965.

Grant A. J., A history of Europe, Part II, London, 1929.

Hay, D., The Italian Renaissance in ita historical background. Cambridge. 1966.

Laven P., Renaissance Italy 1464- 1524. London 1966.

Plamer R. R. and Colton J., A history of the Modern World, third edition, NewYork, 1965.

Renaissance and Reformation 1300 1648 Edited. by G.R. Elton , second edition . New York , London,?

Schweitzer F., Dictionary of the Renaissance.

Sellery G. CI., The Renaissance. Its nature and origins, Madison, 1967.

Sigleton Ch., Art, Science and History in the Renaissance, Baltimore. 1967.

Strayer J. R. and others, The mainstream of Civilization, second edition, New York, 1974.

Burckhardt, NewYork and Toronto.?

The Renaissance and the Reformation 1300- 1600
Weinstein, NewYork,

Weiss R., The Spread of Italian Humanism, London, 1964.

Grimm H.J. The Reformation Era 1500-1650, P.70 Renaissance and Reformation 1300-1640.

Hudson H.H. The Epigram in the English Renaissance, NewYork, 1966.

Crosby E.S. Reformation and the Reformers, Amesterdam, 1963.

Koenigsberger H.G. and G.L. Mosse, Europe in the sixteenth Century, London, 1968.

Rabb and J.E. Seigel, Princetion, 1969.

Peters E. Europe, The World of the Middle Ages, NewJersey, 1977, pp.527-528.

Hoyt R.S. Europe in the Middle Ages, London, 1957.

Cotterill H.B. Medieval Italy, NewYork, 1915.

Hayes C. Modern Europe to 1870. NewYork, 1959.

D. Hay, Europe in the fourteenth and fifteenth centuries, London, 1966.

Becker C.L. and K.S. Cooper, Europe since 1600, New Jersey 1964.

## بەزمانی رووسی


یەکینا ن.ف.، هومانیست پێر پاولۆ ڤێرجیریۆ- چالاکیی روونا‌کبیری‌و زانایـان، "ئـەوروپا لـە سەدە ناوەنجییەکاندا. ئابووری، رامیاری، روونا‌کبیریی، مۆسکۆ، ۱۹۷۲.

جوبێر أ.أ.، بەرەوپێشچوونی بزووتنـەوەی مرۆڤایـەتی لەسـەدەی پـازدەمیندا، - "مێـژووی جیهان"، بەرگی سێیەم، مۆسکۆ، ۱۹۵۷.

جوبێر أ.أ.، دانتێ، - "مێژووی جیهان"، بەرگی سێیەم، مۆسکۆ، ۱۹۵۷.

جوبێر أ.أ.، فرانچیسکۆ پەترارک، - "مێژووی جیهان"، بەرگی سێیەم، مۆسکۆ، ۱۹۵۷.

رۆتینبۆرگ ف.ی.، کەڵەپیاوانی رێنیسانس، لێنینگراد، ۱۹۷٦.

سیمینۆف و.ل.، زانسـتی مێـژوو لەئـەوروپای رۆژئـاوادا لـە سەدەناوەنجییەکاندا، مۆسکۆ- لێنینگراد، ۱۹٦٤.

سمێرن م.م.، چاککردنی ئـاین‌و شـەڕی گـەورەی جوتیـاران لەئەڵـەمانیا،- "مێـژووی جیـهان"، بەرگی چوارەم، بەزمانی رووسی.

ئەبرامسۆن أ.أ. و س.د. سکازکین، ئیتالیای سەدەی شازدەمین.- "مێـژووی جیـهان". بـەرگی چوارەم، بەزمانی رووسی.

گۆفونکیـل أ.خ.، دەستنووسـێکی نـەزانراوی تۆمـازۆ کامپـانێللا،- "ئـەوروپای سەدەناوەنجییەکان"، بەزمانی رووسی.

کامپانێللا، شاری رۆژ، چاپی رووسی، مۆسکۆ- لینینگراد، ۱۹٤۷.

ڤێرتسمان ی.ی.، ژیانی روونا‌کبیریی رێنیسانس لەئینگیلتەرە، -"مێژوویی جیهان" بە(زمـانی رووسی)، بەرگی چوارەم، مۆسکۆ، ۱۹۵۸.

کان س.ب.، مێژوویی بیری سۆشیالیزمی، بەزمانی رووسی، مۆسکۆ، ۱۹٦٦.

ئوسینۆفسکی ی.ن.، ڕێبازی سیاسی کتێبی "ڕیتشاردی سێیەم"ی تۆماس مۆر، "ئەورووپای سەدەناوەنجییەکان. ژیانی ئابووریو سیاسیو ڕووناکبیی". بەزمانی ڕووسی، مۆسکۆ، ١٩٧٢.

"مێژووی سەدەناوەنجییەکان"، بەزمانی ڕووسی، بەرگی دووەم، مۆسکۆ، ١٩٦٦.

خوێندنەوەی بەرهەمەکانی دانتێ"، دانانی دەستەیەك زانا، بەزمانی ڕووسی، مۆسکۆ. ١٩٧١.

## بەزمانی عەرەبی

حلال شوقي، الدكتور، عبقرية ليوناردو دافنشي في الهندسة، القاهرة، ١٩٦٤.

شكسبير، تيمون الأثيني، ترجمة الدكتور عبدالواحد لؤلؤة. الكويت، ١٩٧٧.

عبدالقادر أحمد اليوسف، الدكتور، علاقات بين الشرق والغرب بين القرنين الحادي عشر والخامس عشر، صيدا- بيروت، ١٩٦٩.

عبدالمطلب صالح، دانتي ومصادره العربية والاسلامية، بغداد، ١٩٧٨.

نيقولو ماكيافيللي، الأمير، تعليق بنيتو موسوليني، مقدمة كريستيان غاوس، تعريب خيري حماد، الطبعة الثالثة، بيروت، ١٩٧٠.

هربرت فيشر، أصول التأريخ الأوروبي الحديث، نقله إلى العربية الدكتورة زينب عصمت راشد والدكتور أحمد عبدالرحيم مصطفى، الطبعة الثالثة، القاهرة، ١٩٧٠.

توماس مور، يوتوبيا، ترجمة وتقديم الدكتور أنجيل بطرس سمعان، القاهرة، ١٩٧٤، ص٣٦.

أعلام وأفكار. نظرات في التأريخ الثقافي"، تأليف المؤرخ الهولندي الكبير يوهان هويزنجا، ترجمة عبدالعزيز توفيق جاويد، مراجعة الدكتور زكي نجيب محمود، القاهرة، ١٩٧٢.

ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الأول من الجلد الخامس (١٨)، ترجمة محمد بدران، الطبعة الثانية، القاهرة.

محمد مفيد الشوباشي، رحلة الأدب العربي إلى أوروبا، القاهرة.

دانتي اليجري، الكوميديا الإلهية، المطهر، ترجمة حسن عثمان، الطبعة الثانية، القاهرة، ١٩٧٠.

عبدالقادر أحمد اليوسف، الدكتور، العصور الوسطى الأوروبية، صيدا- بيروت، ١٩٦٨.

موسجروف سكوب ر.، تراث النهضة،- "تأريخ العالم"، الجلد السادس.

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد

# ئافرەت لە مێژوودا

(کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی)

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد

# ئافرەت لە مێژوودا

(کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی)

---

چاپخانەی «الحوادث»

بەغدا - ١٩٨١

# پێشەکی

« ئافرەت نیوەی کۆمەڵە » ، « ئافرەت هیچی لە پیاو کەمتر نی‌یە » ، « کۆمەڵ بێ ئافرەت وەك مەلی تاك باڵە » • قسەی لەم جۆرو بابەتە فەرهەنگی هەموو زمانێکی پڕ کردۆتەوە • ئیمرۆکە بە دەگمەن خوێنـدەواری وا هەڵدەکەوێت لـە دڵیشدا نەبێت بـە سەرزاری‌ی لایەنگری مافی تەواوی ئافرەت نەبێت • خوا هەڵناگرێ هی ئەوتۆش زۆرە لـە دەرەوە ئـاڵای یەکسانی‌و لە ماڵـەوە تێـلای بـێ سانی‌ی هەڵگرتووە • هەر چۆن بێت مەسەلەی ئافرەت‌و شوێنی لە کۆمەڵدا باسێکی گرنگەو هەموو کات لێدوان‌و لێکۆڵینەوە هەڵدەگرێت •

لەم چەندانەدا لێکۆڵینەوەیەکم لـە « یەکیەتی ئافرەتانـی عیراق »ەوە بۆ نرخاندن بۆ هات • لە کاتی هەڵسەنگاندنیدا هەستم کرد کەرەستەیەکی باشم دەربارەی ئافـرەت لا کۆبۆتەوە کە بۆ بەرهەمێکی مێژوویی‌و هەمان کات کۆمەڵایەتی دەست دەدات • بە دڵیش حەز دەکەم دیاریم بۆ هەموو کۆڵەکە گەورەکانی گەلەکەم هەبێت • کەواتە دەبوو ئەم بەرهەمە لە دایك بێت •

سەرچاوەکانی ئەم کتێبە زۆرو جیاوازن ، بەشێکیان دێڕ دێڕ لەم گۆڤارو لەو رۆژنامە کۆکراونەتەوە ، بەشێکیشیان سەرچاوەی فەلسەفیو ئەنسکلۆپیدینو ئەوانیتریـان سەرچاوەی گشتین کـە کتێبی ئەوتۆیان تێدایە بۆ مەیدانی خۆی قووڵو بەنرخە بەڵام بـۆ ئەم بەرهەمەی من تەنها چەند دێڕێکم لێی وەرگرتووە (١)٠

هەرچۆن بێت هیوادارم بەم کارەم خزمەتێکم کردبێت ٠ بەلای خۆمەوە بەر لە هەموو شت ئەم بەرهەمە دیاری‌یەکی پچوکە بـــە دڵ پێشکەشی دەکەم بە ئافرەتی سەربەرزی کورد ، بەو دایكو خوشكو کیژە دڵسۆزانەی سەرمان پێ‌یان گەیشتۆتە کەشـکەلانی فەلەك !

× × ×

(١) بە وێنە : عبدالله عفيفي ، المرأة العربية في جاهليتها واسلامها ، الاجزاء ١ ــ ٣ ، القاهرة ، بلا ٠

# بەهاری کورتی ئافرەت

ئافرەت‌و کشتوکاڵ ، پەیدابوونی
خێزان ، مێردزۆریی ، چۆن
باوك منداڵی خۆی ناسی‌یەوە ،
کەرو لاڵەکانی ڕۆژهەڵات •

لە سەردەمێکی زۆر کۆنی مێژوودا نەبێت کە ئافرەت تێیدا یەکەمی کۆمەڵێکی یەکجار سادەو ساکار بوو ئیتر لەوەدوا ئافرەت هەر زەلیلی ماڵ‌و ژێردەستەی ئاغایەتی پیاو بووە • ئەو بارەی سەر شانی ئافرەت تا ئیمڕۆش لە زوربەی هەرە زۆری ناوچەکانی جیهاندا هەر وەك جاری جاران قورسە • لە ڕوانگەی تێکرای مێژووی بەسەرهاتی ئافرەتەوە دەتوانین زوربەی ئاڵ‌و گۆڕەکانی کۆمەڵ‌و ڕادەی بەرەوپێش چونی ببینین •

سەرەتا کە مرۆف نیمچە ئاژەڵێکی بێ پەروا بوو ئافرەت گیرۆدەی هیچ بەندێك نەبوو • ئەوساکە شتێك نەبوو پێی بووترێت خێزان • هیچ پیاوێك منداڵی خۆی نەدەناسی‌یەوە ، لەو وابوو ئافرەت وەك درەخت بەر دەگرێت ، پیاویش نەبێت ئەو زاووزێی خۆی هەر دەکات • لەبەر ئەوە منداڵ تا لە خەم دەڕەخسا تەنها بە کۆڵی دایکی‌یەوە بوو •

بەخێوکردنی بەو جۆرەی منداڵ زۆر ئەرکی ژیانی خستە سەر شانی ئافرەت • ئەمیان ، بەپێچەوانـەی پیاوەوە ، دەبوو مشـوری خۆراکو پۆشاکو پاراستنی خۆیو منـداڵەکانی بخوات • ئافـرەت زۆر لە پیاو زیاتر عەوداڵی بەروبومی دارو درەختو گژو گیا بوو ، بۆیەکا وا پێ دەچێت کشتوکاڵ ـ یەکەم بەردی گەورەی بناغـەی شارستانەتی مرۆڤ ـ بەرهەمی بیری ئەو بێت کە دیسان وا پێ دەچێت ئەوسا لە بیری پیاو تیژتر بوبێت •

ئافرەتو کشتوکاڵ وا تێکەڵ بە یەك بوون کە ئەو ، نەك پیاو ، بووە خواوەندی پیتو بەرەکەت لە سەرەتای پەیدا بوونی ئایینداا • ئەو سەردەمەش کە بیری ساکاری مرۆڤ بۆ ئەوە چوو قوربانی بداتە خوا دەستکردەکانی خۆی بەو نیازەی دڵیان نەرم بێت بەڵکو گەشە بە بەرهەمی ساڵانەی بدەنو لە بەڵای ناگەهان دووری بخەنەوە ، ئافرەت بووە قۆچی ئەو قوربانی‌یە • لە زۆر شوێـن بـەر لە تـۆو وەشاندن بازی ڕەشی بەخت بەسەر کچێکی گەنجەوە دەنیشتەوە کە ونجن ونجن دەکراو پارچەکانی وەك مـوفەڕك تێـکەڵ بە خاکی کێڵراو دەکرا • ئەستیکەکانی مەکسیك لەگەڵ سەرەتای پێگەیشتنی گەنمەشامیدا سەری کچێکی گەنجیان بۆ دەکردە دیاری‌ی دەستیانو بە خوێنی گەرمی ئاوڕشێنی گوڵە زەردەکانیان دەکرد ، لەگـەڵ دروێنەشیدا داپیرەیەکیان کەوڵ دەکردو پێستەکەیان پێشکەشی مەلا گەورە دەکرد نەبا سەرما ، خوا نەکەردە ، زەفەری پێ بەرێت •

ئافرەت سەرەتا گەنموجۆی دۆزی‌یەوە ، بەڵام دوایی فێری چاندنی بەرهەمی تری وەك كەتانیش بـوو • ئەمە بـیری ئافرەتی خستە سەر رێگەی چنین كە بەرهەمێكی گرنگی تری شارستانەتی كۆنە • لەو رۆژەوە چنین‌و دەرزی‌و درومان بوونە پیشەی ئافرەت• بەڵام ئەوساكە درومان بەنیوەیی بوو ، پیاو كە لە ڕاوەشكار دەهاتەوە خۆی پێستی نێچیرەكەی كەوڵ دەكردو ئینجا بە چیچكانەوە دەكەوتە درومانی •

دیاردەی هەرە گەورەو بەكەڵكی ژیان ئەوەیە كە ناتوانێت لە ئاستی خۆیدا بووەستێت • بەپێی ئەو یاسا چەسپاوە مرۆڤی سەردەمی كۆن هەرچەندە لەسەر خۆ بەڵام بێ وچان هەنگاوی بەرەو پێشەوە دەنا ، نەوە دوای نەوە ئەركی زیاتر دەبوو تا وای لێ هات نەتوانێت بە تەنها ژیانی رۆژانەی بەڕێوەبەرێت ، دەبوو هەر یەكە لایەك لـە ئەركەكانی ژیان بگرێتە ئەستۆ ، واتە دابەش كـردنی كار هاتە ناوەوە • بەم جۆرە ژیانی پێكەوەی ئادەمـیزادو دروسـت بـوونی خاووخێزان خۆی داسەپاند • ئەم كارە لە ڕەوڕەوی بەرەوپێـش چوونی ئادەمیزادا نەك هەنگاو ، بەڵبو بازێكی یەكجار گەورە بوو •

لەگەڵ ئەوەش ئافرەت دەسەڵاتی خۆی نەدۆڕاند • منـداڵ هەر بە ناوی دایكەوە ناو دەبرا ، خاڵوان پشتی ڕاستەقینەو جێگەی بڕواو متمانە بوون • عێل‌و هۆزو تـیرە لە دایـكەوە دەسـتیان پێ دەكرد • ئەوسا شتێك نەبوو پێی بڵێن گواستنەوەی ئافرەت بۆ ماڵە

مێرد ، لانەی کامیان باشتر بوایە ئەوی تریان دەچووە خزمەتی ، زۆربەی جاریش وا ڕێك دەکەوت زاوا بە خۆیو شرپو شیتاڵییەوە رووی دەکردە ماڵە بووك • جیابووتەوەش بە دەست ئافرەت بوو ، کەی گەیشتە ئەو بڕیارە دەبوو بێ سێو دوو ماڵو منداڵو هەوێکانی(!) بەجێ بهێڵێت • ئەو ڕۆژگارە لە چین ماڵ ناو ماڵ هەمووی هی ژن بوو نەك پیاو کە تەنانەت بە دەگمەنو زۆر جار بە پەلە تەنها بۆ کاری خێر سەری دەکرد بە ماڵدا •

ئەو سەردەمە ئافرەت مێردی بە چەند پیاوێك دەکردو بۆ خۆشی ئەوانی هەڵدەبژارد • شایانی باسە تاوەکو ئێستەش چەند هۆزێکی هەرە دواکەوتووی ئاسیاو ئەفریقیا پەیڕەوی ئەو نەریتە دەکەن • لە مالیزیا هۆزی ئەوتۆ هەیە کچ تێیدا شوو بە چەند برایەك دەکات ، هەر شەوەی لەگەڵ یەکێکیان دەنوێت ، دەستەبرا دەبنە هەوێی یەکترو کەم وا رێك دەکەوێت دانویان پێکەوە بکوڵێت•

لەگەڵ زیاتر چەسپ بوونی دابەش کردنی کارو زیاتر جێگیر بوونی پیاو لە شوێنێکدا دیاردەی مێردزۆریی بەرەو پوکانەوە رۆیشت • فێربوونی بەخێوکردنی ئاژەڵ دەوری گەورەی لەمەدا بینی • بەر لەو فێربوونە پیاو بە ڕاوەشکارەوە خەریك بوو ، لەم لاو لەو لا بەدوای نێچیردا دەگەڕا بۆیەکا کەم دەکەوتە ماڵەوە • بەڵام وا بەشێك لە ئاژەڵی دەستەمۆ کردو کەوتە پەروەردە کردنیان، کەواتە ئەو گۆشتەی عەودالی بوو هاتە بەر دەستی بۆیەکا وەك جاری

جاران پێویستی بە ڕاوەشکار نەما ، مەگەر بۆ گۆشتێکی ناسکی وەك ئاسك‌و پۆڕ جارو بار تیرو کەوانی هەڵبگرتایەو بەرەو لوتکەی شاخ‌و ناو دارستانەکان بکەوتبایە ڕێ •

بەم جۆرە پیاو گەلێك لە جاران زیاتر بە ماڵەوە بەسترایەوە ، کەلوپەلی زۆر بوو ، زیاتریش دەیناسینەوە • وردە وردە لەوەش گەیشت کە ئافرەت وەك دار بەر ناگرێت • لەمەدا خێری ئەو ئافرەتە ناشرینانە بنووسرێ کە پیاوان توخنیان نەدەکەوتن ! کەواتە منداڵانی ئافرەت دەبێت هەر یەکەیان هی یەکێك لە مێردەکانی بێت • ئەمە ڕێگەی بۆ تاك مێردیی خۆش کرد ، چونکە بێ ئەو نەدەکرا پیاو منداڵی خۆ بناسێتەوە ، ئەو منداڵەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پێوەی دەلکاو خۆشتری دەویست •

وێڕای ئەوە دیار نەبوونی باوك بە هۆی زۆر مێردییەوە دەبووە هۆی بەرەوڕووبوونەوەی میراتی بۆ کەس‌و کاری دایکی کە گومان لە شیرازەی خزمایەتی‌یاندا نەبوو • کەواتە ئەو پیاوەی دەمرد بەڕ داخەوە سەری دەنایەوە کە نەیدەزانی کام لەو زارۆڵانەی ساڵەهای ساڵ لەگەڵیان ژیاوە دەقاو دەق هی ئەون • تەنانەت گومانی لەوانەشیان دەکرد کە کوتومت چوبونەوە سەر خۆی • ئەمە نە لەگەڵ هەست‌و ئارەزووی مرۆڤ‌و نە لەگەڵ بەرژەوەندی‌یە ئابووری‌یەکانیدا نەدەگونجا • بەم جۆرە ڕێگەی دروست بوونی خێزانی تاك مێردیی هێندەی تر خۆش بوو •

سروشتیش دەوری خۆی بینی • ئادەمیزاد هەرچۆن بوو لەوە گەیشت کە بەرهەمی ئەو زاوو زێیەی لە ژنو مێردی خزم دەکەوێتەوە وەك ئەو بەرهەمە لەش ساغو چاپوكو چالاك نییە کە لەو ژنو مێردانە دەکەونەوە کە بە خوێی چێشت بە یەك ناگەن • هەر لەبەر ئەوەشە ڕۆژهەڵاتی ئێمە ، بەپێچەوانەی ئەوروپاوە ، پڕ لە گێلو کەڕو لاڵە •

کەوابێ ژیانی خێزانیِ ڕێكو پێكو خستنەوەی نەوەی لێهاتوو لەگەڵ ڕەشبەڵەکی ناو دەستەو دایەرەیەکی تەسکدا نەدەگونجا • زۆر جاریش ژنخوازیی لە عێلو تیرەیتر دەبووە پشتو مایەی دەسەڵاتو زۆر بوونی سامان •

پێکڕا هەموو ئەمانە خێزانی نوێیان بۆ مرۆڤ داتاشی • بەڵام بەپێی نەریت تا ماوەیەك ئافرەت سەرتاپای دەسەڵاتی لەم جۆرە خێزانەدا نەدۆڕاندو کۆتەڵی بەجارێك نەڕوخا •

پایەبەرزیی ئافرەتی زوو لە ئاینیشدا ڕەنگی دایەوە • بەشێکی زۆر لە خواوەندە دەستکردەکانی کۆن ئافرەت بوون • بتەکانی مەککە لە شێوەی ژندا دروست کرابوون • بەر لە عیسا لە سەردەمی ڕۆمانەکاندا لە ئیتالیا بت پەرستی ئەوتۆ هەبوون بە چەقۆ بەردەبوونە زەکەریان تاوەکو زیاتر بچنەوە سەر ئافرەت !

## ڕۆژی ڕەشی ئافرەت

**داوێن پیسی . عەباو پەچە . کوڕ پەرستیی، ژن زۆریی، کۆرنێلیاو میسالینا . مەکرو جامبازیی ئافرەت، پیاوی ژنانی، دیوەخانو چایخانە . حەمامی ژنان . سوورو سپیاو .**

بەهاری ئافرەت تەمەنی کورت بوو . زۆری نەبرد ژیان خراپ تای تەرازووی بە لای پیاودا شکاندەوە . ئافرەت یەك لە دوای یەك مافەکانی لەکیس چوون ، لە زۆر شوێن بووە کەلوپەلێکی هەرزان ، بووە کارەکەرو کەنیزەك، خۆ گەر خۆو بەخت جوانیی بۆی بهێنایە ئەوساکە ئەوپەڕەکەی دەبووە بووکەشووشە یا بووکەسەماکەرەی پیاو .

بەشێك لە دیاردە نالەبارەکانی باری ژیانی نوێی ئافرەت شێوازی هەڵگەڕاوەی نەریتی کۆن بوون . بۆ ئەوەی نمونەی ئەم باسەمان پێ قوت بدرێت پێویستە ئەوە بێنینەوە یاد کە دەست هەڵگرتن لە نەریت کارێکی ئاسان نییە . هەروەها چەند کۆمەڵ دواکەوتوتر بێت هێند زیاتر پەرۆشی نەریتی کۆن دەبێت ، گەلێك جار بەر لەوەی دەستی لێ هەڵبگرێت بەرگی نوێی بەبەردا دەکات .

کە خێزانی نوێ پەیدا بوو لە گەلێك شوێنو ناوچە زۆرمێردیی کۆن بەم جۆرە رەنگی دایەوە: شەوی یەکەم ئەو خزمو هاوڕێیانەی

بۆ ئاهەنگی گواستنەوە بانگ‌دەکران بەر لە زاوا یەك بە دوای یەکدا بە نۆبووك دەگەیشتن • تا ماوەیەك لەمەوبەر زۆر هۆزی دواکەوتووی ئەفەریقایی بە شانازی‌یەوە پەیڕەوی‌ی ئەم نەریتەیان دەکرد • ئاغاو دەسەلاتداری گەلێك ناوچەو مەڵبەند ئەم نەریتەیان قۆستەوەو بۆ ماوەیەکی دورودرێژ کردیانە ماڵ بەسەر بووکی مسکێنەکانیانەوە کە شەوی یەکەمیان بۆ جەنابی ئاغا بوو •

شایانی باسە دانەری بناغەی لێکۆڵینەوەی مێژووی خێزان زانای سویسری‌ی بەناوبانگ یۆحەننا باخۆفن ( ١٨١٥ – ١٨٨٧ ) دوای لێکۆڵینەوەیەکی وردو قووڵ شەرەفی گەورەی دامەزراندنی خێزانی بەخشیوە بە ئافرەت • وەك ئەو دەڵێت ئافرەت بەر لە پیاوو زیاتر لەو قێزی لە خێزانی زۆرمێردی‌ی دەبۆوە • باری ژیان‌و ناسکی‌ی هەست کارێکی ئەوتۆیان کرد ئافرەت لە پیاو زیاتر پەرۆشی پاراستنی خێزان بێت ، تایبەت لەبەر ئەوەش کە تێکچونی ئەو لانەیە زوربەی جار ماڵ وێرانی‌و برسێتی‌و سەرگەردانی‌ی بۆ خۆی‌و زارۆڵەکانی دەهێنا • ئەو ترسە کارێکی وای کرد ئافرەت بۆ پیاو دڵسۆزتر بێت وەك لە پیاو بۆ ئافرەت • ئەمیان بەدەگمەن‌و ئەویان بێ‌دەگمەن داوێن پیسە •

ئا لێرەدا ، واتە لە مەسەلەی داوێن‌پیسیدا ، دەست درێژی‌ی کۆمەڵ بۆ سەر ئافرەت رووت‌و قووت لە هەموو شت زیاتر خۆ دەنوێنێت • داوێن‌پیسی‌ی بێ‌دەگمەنی پیاو تا ئیمڕۆش لە زۆر

قوژبنی ئەم جیهانە پان و بەرینەدا کارێکی دەستەبرای ئاسایی یە •
کەچی داوێن پیسی ی دەگمەنی ئافرەت کە زۆر جار خۆفرۆشتنی
ناچاری یە بۆ لەتە کولێرەیەك یا گەزێك جاو ئەو تاوانە گەورەیەیە
کە کەس ، بە ئافرەتەکە خۆشی یەوە ، پێی ڕازی نابێت • لەو
بڕوایەدام بە درێژایی مێژوو هیچ پیاوێك لەسەر داوێن پیسی ی
خۆی نەکوشتبێ ، کەچی تا ئیستە بە هەزاران کیژۆڵەی ناسك
بوونەتە قۆچی قوربانی ی ئەو کارە کە دەبێت بۆ هەردوو لا وەك
یاك مایەی شەرم و شورەیی بێت • خۆ گەر زیاتر عەودالی ڕاستی و
یەکسانی ی بین ئەوا دەبێت بڵێین دەبوو بە درێژایی مێژوو سزای
داوێن پیسی ی پیاو لە هی ئافرەت زیاتر بێت ، چونکە تا ئەم چەندانەی
دوایش لە سەرتاپای جیهاندا پیاو مافی هەڵبژاردنی هاوسەری هەبوو
نەك ئافرەت کە زۆر جار ناچار دەبوو مێرد بە هی وا بکات کە تا
مردن جێگەی لە دڵیدا نەدەبۆوە •

با لێرەدا چەند نمونەیەکی مانادار بڕیاری بێ مانای کۆمەڵ
لەم بارەیەوە بهێنمەوە • زاناو نووسەری گەورەی ڕۆمانە کۆنەکان،
ئەو پیاوەی یەکەم کەس بوو مێژووی بە زمانی لاتینی نووسی یەوە ،
موفەتیشی بالای ولات مارکۆس پۆرسیۆس دەوروبەری ٢٠٠ سال
پێش عیسا رووی کردۆتە پیاو پێی وتووە :

« گەر بە داوێن پیسی ی ژنەکەت زانی بۆت هەیە بێ ترس
دادگەو سزا یا پرسینەوە لەتوکوتی بکەیت • خۆ گەر هاتوو

ئەو بە داوێن‌پیسی‌ی تۆی زانی بۆی نی‌یە پەنجەت بۆ بهێنێت •
هەرچۆن بێت ئافرەت ئەو مافەی نی‌یە » •

دوای شازدە سەدە لەو فەرمایشتەی مارکۆس پۆرسیۆس کە دەبێت بۆ خۆی زۆر داوێن‌پیس بوبێت ، مافی پیاو لە ئەوروپای ڕۆژئاوا بێ کەم‌و زۆر بەم جۆرە تۆمار کراوە :

« مێرد دەتوانێت لە هاوسەری بداتو برینداری بکات ، بۆی هەیە سەرتاپا دای‌تلێشێنێت‌و پێی لە خوێنیدا بگەوزێنێت •
ئەو پیاوە گوناهی ناگات گەر ئاە لە ژنەکەیدا مابوو برینەکەی بۆ بدروێتەوە » •

هەر ئەو سەردەمە زۆر جار پیاوە داوێن‌پیسەکان ئافرەتی داوێن‌پیسیان شاربەدەر دەکرد ، یا رووت‌و قووتیان دەکردەوە ، خۆڵ‌و دۆیان بەسەردا دەکردو بەو جۆرە بە دەم هوهاوە بە نـاو شاردا دەیان گێڕاو ئینجا بۆ چـەند ڕۆژێك بـە کۆڵەکەیەکیانەوە دەبەستەوە تا پیاوان بیکەنە عیبرەت بۆ ژنان • میسری‌یە کۆنەکان سزای ئافرەتی داوێن‌پیسیان لەمەدونیادا دەدا ، بەڵام سزای پیاوی داوێن‌پیسیان کردبووە قەرزی ئەوەدونیا •

باپیرەگەورەی باخ‌و ئەنەشتاین‌و برێخت دەیانگوت گـوێ مەدەنی ، چۆنتان بێ خۆشە ئاوەها پێستی ئافرەت کەوڵ کەن ، بێ ترس‌و دوو دڵی‌ی بی‌گورن ، دای ماڵن ، ئەو کافرە نۆ پێستی هەیـە !

بەم جۆرە ئافرەت بووە کەلوپەلی نیمچە بێ گیانی پیاو کە بەرە بەرە وای لێ کرد خۆی لەبیر بچێتەوەو وابزانێت باری قورسی سەر شانی لە ژیانو سروشتەوە هاتووە نەك لە کۆمەڵەوە •

ئاژەڵو مەلیش ، نەك تەنها مرۆڤ ، شتی خۆشەویست دەشارنەوە ، بەڵام ئەوان مێینەیان نەبۆتە کەلوپەلی نێرینەیان تاوەکو لە چاو دووری بخەنەوە • لای مرۆڤ کار وای لێ هات : لە هەر شوێنێك ئافرەت بۆ کار پێویست نەبوایە ماڵ دەبووە لانەی شەوو ڕۆژی •

دیارە ئافرەت وەك کەلوپەل بێ گیان نی یە ، هاتوچۆ دەکاتو لەوانەیە بۆ کاری پێویست ڕێگەی بکەوێتە دەرێ یا بیانیو نەناسیاو ڕێگەیان بکەوێتە ماڵی • پیاوی قورمساغ فێڵی خۆی دۆزی یەوە : جلو بەرگی ئاودامانو دوای ئەو پەچەو سەرپۆشی داهێنا کە وا پێ دەچێت ئەکەدی یەکان بەر لە گەلانی کۆنی تری جیهان بەکاریان هێنابێت • بیانووشی بە دەستەوە بوو ، گوایە پیاو بەو کارەی دەیویست ئافرەتی خۆی لە ئافرەتی خراپ جیا بکاتەوە •

لە زۆر شوێن پیاو داهێنانی پەچەو سەرپۆشی قۆستەوە • هەر ئەوەندە پێغەمبەر ( د • خ • ) ویستی دوازدە ژنەکەی خۆی بە پەچەو سەرپۆش لە ئافرەتی تر جیا بکاتەوە سەرتاپای پیاوانی مەککەو مەدینە لاساییان کردەوە •

لەگەڵ گەورە بوونی پیاوو زەلیل بوونی ئافرەتدا نرخی کوڕ بەرزو هی کچ نزم بۆوە • سەردەمی هەرە زوو کە هێشتا جیاوازی ی

له نێوانی ئافرەت‌و پیاودا دروست نەبوبو کەس کچ‌و کوڕی لێـك جیانەدەکردەوە ، هەر کامیان خوا بیدایە مایەی شادی‌ی بوو • بەڵام بۆ تەمەنی مێژوو زۆری نەبرد کوڕ بووە زێـڕ تەڵا کچیش مایەی بەڵا • لە سەردەمی بابلی‌یەکاندا ئەو ئافرەتەی منداڵی لەبار خـۆی بردایە ، کە لەوانە بوو کوڕ بێـت ، تیرەبـاران دەکـراو لاشەی دەکرایە خۆراکی قەل‌و داڵ • بـەر لە ئیسـلام لە نیمچە دۆرگەی عەرەب کچ زیندەبەچاڵ دەکرا •

لە هندستان ئەو پیاوەی کوڕی نەبوایە دەستوبرد کچەکانی دەدا بە شوو ، یەکەم کوڕی هەرکامێکیان بوایە دەبووە کوڕی ئەو ، دوای شیرەگۆشە جارێکی‌تر باوەشی دایکی نەئەدی‌یەوە • خۆ ئەگەر پیاوێك کچیشی نەبوایە ئەوسا دەبوو خێزانی بۆ کوڕ لەگەڵ یەکێك لە برایانی یا خزمانی بنوێت ! ڕۆمانەکان لە کاتی مارەبڕیدا دەیاننوسی پیاو بۆ کوڕ حەبێ یا عەتێی خواستووە • خۆ گەر خوانەکەردە ئەو ئافرەتە کوڕی نـەبوایە دەبـوو مێردەکەی لێی جیا بێتەوە ئەگەرچی زۆر زۆریشی خۆش‌بویستایە •

لە یۆنانی ڕۆژگاری پێش عیسا ئەو ماڵەی کچیان ببوایـە سەرەپەتێکی خوری‌و بۆ کوڕ تاجەگوڵینەیـەکی گەڵا زەیتونـی ڕازاوەیان بە بەر قاپی‌ی ماڵەکەیانـدا هەڵدەواسـی ، یـەکەمیان دەیگوت قوڕبەسەرێکمان بووە لەوانەی کاریان چنین‌و دەرزی‌و درومانە ، دووەمیشیان مژدەی شـادی‌ی ئیمـڕۆ بەختی بەرزی‌ی

دواڕۆژی ڕادەگەیاند • زۆر جاریش باوك ئەو سەرەپەتە پیسەی لە کیس نەئەدا ، کۆرپەی قومات نەکراوی دەبردە سەرەنوێلکێکی دوورو فڕێی دەدا • نووسەرێکی یۆنانی بەر لە دوو هەزار ساڵو شتێك نووسیویە دەڵێت :

« کوڕ پەروەردە دەکرێت با کەسوکاریشی زەنگین بن » • کچیش تووڕ دەدرێت با کەسوکاریشی زەنگین بن » •

ئەو کچەش کە « بەخت » بۆی دەهێناو توڕ نەئەدرایــە سەرەنوێلك چارەنووسی بە دەست باوکییەوە لە چارەنووسی دایکی ڕەشتر دەبوو • عیبرانییــەکان کە باپیرە گەورەی جووەکانی ئیمڕۆن ، کچیان لە بازاڕ دەفرۆشت • باوك بۆی هەبوو کچەکەی بخاتە کارخانەوە ، یا بەرامبــەر پــادداشتێــکی کەم کچێنییەکەی بەخشێت بە پارەدارێك ، یا لەسەر بێشکان بەشووی بدات ، یا کەی ویستی لە مێردەکەی بسێنێتەوە • لەوەش سەیرتر : زۆر جار ژن دەبووە ماڵی هۆزی مێردەکەی ، گەر بەر لەوەی کوڕێکی ببوایە مێردەکەی بمردایە دەبوو شوو بکاتە یەکێك لە براکانــی خوالێخۆشبوو هیچ نەبێت تا کوڕێکی لێی دەبوو کە بە ناوی مێردی یەکەمەوە تۆمار دەکرا •

کوڕ یەکێك بوو لەو هۆیانەی ژنزۆرییان دروست کرد • ئەو پیاوەی لە ژنی یەکەمی کوڕی نەبوایە ژنی بەسەر دەهێنا ، لەمیشیان نەیبوایە یەکێکیتری بەسەر دەهێنا • یەکێك لە شاعیرە

کۆنەکانی یۆنان دەیگوت : « ژن هێنان بەڵایەکەو بە ملەوەیە چونکە بێ ئەو بەڵایە ناتوانین بگەینە ئەو قەڵایەی ناوی کوڕە » • هەر بە پێی فەرمایشتی ئەو گەر وا نەبێت بۆ پیاو وا باشترە ئافرەت بکڕێت‌و کەی ویستی بیخاتە بەر جووت •

کە کوڕ وابێت دایك حەقی بوو ڕۆژی هەزارو یەك جار بە بەر چاوی زەقی خوشکانەوە خۆی بە دەوری سەریدا بگێڕێت •

زۆرژنیش مەینەتی‌ی سەیری‌ی بۆ ئافرەت هێنا • بە هەزارانیان لە تاو هەوێ‌و جیاوازکاری‌ی مێرد خۆیان کردە خۆراکی ئاگرو ماسی • چینی‌یە کۆنەکان زۆر جار هەموو کچەکانیان بەسەر یەکەوە دەدایە شوو ، بەڵام بە یەك پیاو ، خوشکانی دوێنێ دەبوونە هەوێی ئیمڕۆ ، خوشکایەتی ئیتر دەوری نەدەما •

لەرزوتاو گرانەتاو ڕشانەوەو دەیان نەخۆشی‌ی تر بە گوێنی منداڵیان دەناردە گۆڕستانەکان • لە عیراق تا بیستەکانی ئەم سەدەیەش لە هەزار منداڵی تازە لەدایك بوو ۲۹۰یان گیانیان بە خاك دەسپارد • لە قوژبنی ئەم ژمارەیەوە دەتوانین باشتر باری ژیانی منداڵی زوو بهێنینە بەر چاوی خۆمان ، مردنی زۆرو زووی منداڵ‌و پێویستی‌ی کوڕ بۆ کار دوو خوی تریان بەسەر مرۆڤدا داسەپاند ، یەکەمیان ژن هێنانی زۆرو ئەوی‌دی‌یان منداڵ زۆری‌ی کە ئەرکی گەورەی هەردوو لایان دیسان کەوتەوە ئەستۆی ئافرەت •

به پێی یاسای ڕۆمانـەکان تەمەنی شووکردن دوازدە سـاڵ بوو ، بەڵام بە دەگمەن کچ تا ئەو تەمەنە دەمایەوە • لە هندستان تەمەنی هەشت ساڵان سەروزیادی بوو بـۆ ئەوەی کـچ لە بـوك بوکێنێی کۆلانان بکرێتو خۆی بێتە بوکی ڕاستەقینە • هەمان کات چ لە هندستانو چ لە یۆنان ، چ لە ڕۆماو چ لە بۆرما ژن بـۆی بلوایە لەبەر خاتری چاوی کاڵی مێردەکەی ، با خێلیش بوایە ، ڕۆژی بە لای کەمەوە منداڵێکی دەردەپەڕاند •

بۆ ئەم دوو باسە بە کورتی داستانی ئافرەتێـکی ڕۆمانیتان بۆ دەگێڕمەوە کە ناوی کەوتۆتە سەر لاپەڕەی مێژوو بۆیەکا ژینامەیمان بەدەستەوەیە • ئەو ئافرەتە ناوی کۆرنێلیایە کە پێش عیسا بە دوو سەدە ژ یاوە • کچی یەکێك لە دەسەڵاتدارانی ڕۆما بوو• زیرەکیو شارەزاییو خوێندەوارییی کۆرنێلیا دەنگی دابۆوە • کە مێردەکەی مرد پاشای میسر داوای کرد ، چەند لەگەڵی خەریك بوون شووی پێ نەکرد ، کۆرنێلیا وەك دایکێکی بەوەفا خۆی بۆ منداڵەکانـی تەرخان کرد کە گەورە پیاوی ناوداریان تێدا هەڵکەوت • ئینجا بـا بێینە سـەر مەبەسـت : شیشرونی گوتەبـێژو شاعیری ڕۆمانـیی بەناوبانگ دەڵێت ئەو ڕۆژەی کۆرنێلیا لاشەی مێردەکەی بە خاك سپارد هێشتا دەستەکچ بوو (١) ، بەڵام هەر ئەو ڕۆژەش دوازدە

---

(١) زوربەی سەرچاوە کۆنەکان دەڵێن ئەوساکە تەمەنی کۆرنێلیا٢٥ ساڵ بووە ، بەڵام بە قسـەی شیشرۆندا وا پـێ دەچێت لەوەش کەمتر بوبێت •

کوڕی زەردو سوور چواردەوری تەرمی باوکیانو کۆرنێلیای بێوەژنی دایکیان دابوو !

بێ گومان هەموو ئافرەتانی ڕۆما وەك کۆرنێلیا نمونەی شەرەفو دایکایەتی ڕاستەقینە نەبوون . زولمی کۆمەڵ زۆریانی خستە داوی هەڵەوە . هەر ئەو دەوروبەرە کلۆدیۆسی پاشای ڕۆما کە لە پەنجا تێپەڕیبوو میسالینای هێنا کە هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمی دەهات . میسالینای چاو گەشی گەردن کەشی ئەبرۆ کەوانی بیوێرایە شەو تا بەیان لەگەڵ منداڵە وردەکانی هاوەڵی لە باخچە فراوانەکانی کۆشكو تەلاری مێردیدا دەکەوتە چاوشارکێ . زۆری نەبرد میسالینا دەستی دایە چاوشارکێیەکی تر تا لە پڕ شێتو شەیدای سیلیۆسی گەنم ڕەنگی باڵابەرزی هەڕەت لاو بوو . میسالینای هەرزەکار گرێی دڵی بۆ زۆر کەس کردەوە تا دەنگوباوی خۆشەویستیی بەر گوێی پاشا کەوتەوە . جارێکی تر کەس چاوی بە میسالینا نەکەوتەوە ، بۆگەنی لەشو لاری ناسکی کیژی بیست ساڵە هەموو ڕۆمای پڕ کردەوە .

بێ گومان نە شەکسپیرو مۆلیێرو تۆلستۆیو نە نووسەرە کەڵەکانی تری جیهان لە خۆڕا نەبوونە شایەری عاشقان ، ئەوانەی لە تاریکە شەودا لە تاو چاوی کاڵی یاری زەوتکراو خۆیان دەهاویشتە باوەشی مەرگەوە ، یا ئەو کیژە ناسکۆڵانەی هۆڵە ڕازاوەکانی شارە ناودارەکان کە بە تیلەی چاوێك بە تیری عەشق

گرفتار دەبوون‌و لە ناو شۆخێك دەستیان لە تەخت‌و بەخت‌و گشت سامانی دونیا هەڵدەگرت •

وێڕای مافی جیابوونەوە کە پیاو تاکە خاوەنی بوو بێوەپیاو مافی ژن هێنانەوەی هەبوو ، بەڵام قۆڕ بەسەر بێوەژن ، بە دەگمەن هی وایان هەبوو جارێکی‌تر چاوی بە پیاو بکەوێتەوە • لە هندستان هۆزی ئەوتۆ هەبوو دەبوو ژنیـان لەتـەك لاشـەی مـێردا خۆیان بسوتێنن • زۆر دوور نەڕۆین بەر لە سەدەیەك دوو میری هندستانی لە ڕۆژێکدا تەواو بوون ، یەکێکیان حەفدەو ئەوی‌تریان سیازدە ژنی هەبوو • بیستونۆیان هـەر ئـەو ڕۆژە لەگـەڵ مێردەکانیان سوتێنران ، سی‌یەمیان لە هەوێکانی بەخت ڕەشتر بوو ، لەبـەر ئەوەی سکی هەبوو ڕۆژی سوتاندنی خرایە دوای ناوك بڕینی کۆرپەکەی کە بە شیری مەمکی دایکی زەیستانی شاد نەبوو •

ئافرەت بووە قوربانی‌یەکی تری ئارەزووی پیاوو یاســـای کۆمەڵ ، بووە داردەسـت بۆ زۆرکـردنی ســـەروەت‌و سـامان‌و فراوان کردنی زەوی‌و زارو پەرە پێدانی تواناو دەسەڵات • بـە هەزاران گوڵاڵە سوورەی ماڵـە هەژار لـە بەندیخانـەی کۆشك‌و تەلاری خواپێداوەکاندا بە سیل‌و دیق وشك بوونەوە • چەندان کیژی ناسك‌و نازدار لەبەر خاتری بستە زەوی‌یەك کرانە پەردەی ئـەو دەعەجانی‌و جانەوەرانەوە کە ڕەنگێ خواوەندی گەورە لە وێنەیانی کردبێتە یاساوڵی تۆقێنەری دۆزەخ • کەژاوەو تەختەڕەوانی ڕازاوە

زۆر کچه میرو پاشایان له نیشتمان‌و هاوزوبان دوور خسته‌وه بـۆ ئه‌وه‌ی نه‌با خـوانه‌که‌رده زه‌بـرو زۆری بـاوك‌و کاکیان که‌مێك بله‌قێت • ئه‌ی چه‌ند هه‌زار زارۆڵه‌ی سه‌ر بێشکه بوونه ژنی مێردار یا کچی ده‌م نه‌پوشکوتو بوونه نرخی ژنی براو ئامۆزا • قازانجی هه‌موو ئه‌مانه بۆ پیاو و زیانیان بۆ ئافره‌ت بوو •

ئافره‌ت بۆ پاراستنی خۆی به ناچاری فێری مه‌کربازی‌ی‌و جامبازی‌ی ، نازو نووزو ڕشتنی به خه‌ربار فرمێسکی راست‌و درۆ بوو ، که‌چی ئه‌مه‌ش بۆی بووه له‌که • بڕوا ناکه‌م زمان هـه‌بێت ئافره‌تی نه‌کردبێته مار •

که‌وابێت ئافره‌ت بۆ خۆی هه‌ڵنه‌گرێت بۆ ژیانی دووه‌م ، به‌ڵکو ئه‌مـه خوایـه لـه‌وه دونیـا بحه‌سێتـه‌وه • لـه ئه‌ورووپای سـه‌ده ناونجی‌یه‌کاندا به هه‌زاران کیژۆڵه‌ی نازدار ئاودامان به‌رگی سپی‌یان پۆشی‌و خۆیان بۆ ئایین‌و کڵێسه ته‌رخان‌کرد • بـه‌ڵام ئه‌وانیـش مرۆڤن ، جاری وا هه‌بوو خۆیان پێ نه‌ده‌گیراو وره‌یان به‌رده‌دا • زۆریان به قه‌ڕابه‌ی مه‌ی تاڵاوی ژیانیان ده‌ڕه‌وانده‌وه • هی واشیان هه‌بوو مه‌ی دادی نه‌ئه‌دا ، که‌مێـك زیاتـر ده‌ڕۆیشـت • به‌ڵـگه کۆنه‌کانی کڵێسه پڕن له نمونه‌ی سه‌یری ئه‌و لاپه‌ڕه‌یـه‌ی تـری تۆماری گه‌وره‌ی ژیانی ئافره‌ت • پاپا خۆی پـڕ بـه‌ده‌م هاواری ده‌کرد ده‌یگوت دێری ئاگاتـا گشت ناوچـه‌که‌ی پیس کردووه • ساڵی ۱۳۰۰ پاپا بۆنیفێسی هه‌شته‌م بێ سوود ویستی ڕاده‌یه‌ك بـۆ

ئەو جۆرە ڕەفتارانە دابنێت • یەکێك لـە بەڵگەکانی کڵێسە باسی ئەوە دەکات چۆن ئافرەتەکانی دێری لینکۆلن لە ئینگیلتەرە نوێنەری پاپایان ریزگاو کردو هەر بە بەر چاوی خۆیەوە سوێندیان خوارد تا مردن دەست لە ڕابواردن هەڵنەگرن ، ئەمە لە کاتێکدا کە دەبوو ڕۆژی حەوت سەعات بە نوێژو سێ سـەعات بـە خوێندنەوەی ئینجیلەوە بەرنە سەر •

لە ڕاستیشدا کڵێسە هیچی بۆ ئافرەت نەکرد ، دەستی بـۆ بخرایەتە ناو کاری یەزدانەوە مافی یەکسانیی ئەودونیاشی لـێ نەسەندنەوە • کڵێسەی دەستەخوشکانی تەنانەت خواشیان بە زۆر کردە پیاو ! • کڵێسە مریەمی دایکی عیسا نەبوایە بە جارێك قوڕی بۆ ئافرەت دەگرتەوە ، چونکە ئافرەت بە لای ئەوەوە لـە ڕۆژی حەوای دایەگەورەیـەوە تاوانبـار بـوو ، گوایـە حەوا ئادەمی بابیرەگەورەی پیاوی هاندا سێوەکەی بەهەشـت بخـوات • بـەو پاسـوەوە کڵێسـە پیاوەکانی خـۆی هان دەدا ژن نەهێنن ، بـەڵام ڕاستەکەی دەیویست لەسەر حسێبی ئافرەت زەوی‌وزاری فراوانی لە میراتگر بپارێزێت تا بۆ خۆی بگەڕێتەوە • کە پیاو شوولی لـێ هەڵکێشا کڵێسە ڕەحمی تلیسایەوە بەوەی نەیهێشت بارستی ئـەو شوولکەی مێرد ژنی پێ دارکاریی دەکـرد لە چـەند سانتیمێک زیاتر بێت •

بەڵێ دارکاری کردنی ئافرەت بووە پیشەیەکی «بەرزی» پیاو •

نەك هەر ئەوە ، بەڵكو دوای ئەوەی ژن بە زۆر کرایە کۆیلـــە
ڕەقیو سەرکێشیی بوونە سەنگی کێشانی پیاوەتی،ئەو پیاوە پیاو بوو
کە کەمتر بایەخ دەدات بە ژنو ناو مـــاڵ ، وای نەکردایـــە لای
دۆستو برادەر دەبووە ژنانی • جگە لەوە تا دەهات پیاو لە ئافرەت
دونیادیدەو شارەزاتر دەبوو ، بەو جۆرەش ژیانی ناو ماڵ ڕەونەقی
نەما ، پیاو لە بێتاقەتیدا بۆ جێگەیەك دەگەڕا لەگەڵ ئەوانەدا کاتی
تێدا بەرێتە سەر کە وەك خۆی پیاونو بە ڕادەی خۆی لە ژیانو
دەوروبەر دەگەن • ئەمە بووە هۆی پەیدا بوونی دیوەخانی پیاوان
لە ماڵەوەو چایخانەو گازینۆو مەیخانە لە دەرەوە •

ئافرەتیش هیچی بۆ نەمایەوە هاتوچۆی ناوبازاڕ نەبێت • خوا
هەڵناگرێت لەمەدا ئەویش کەم جامبازیی نەکرد ، ڕۆژی ســێ
جار بۆ سەلکە پیازێك بچوایەتە دوکانان لای خۆش بوو • قــەت
دەستی بۆ پێڵاوو بەرگی حــازر نەدەبرد ، هەزارو یەك عەیبی لێ
دەدۆزینەوە هەر بۆ ئەوەی بە بیانووی پێوانەو پراوەوە چەند جارێك
بچێتە دەرێ ، بۆیەکاش بازاڕی کەوشو بەرگدروو بەدرێژایی
مێژوو گەرم بووە • لە خۆوە نەبوو کە بازاڕی حەمامی ژنـــان
هەمیشە لە هی پیاوان گەرمتر بوو • بێ گومان پیاو لە ئافرەت کەمتر
قسە ناکات ، بەڵام ئەمیان جێگەی وەك حەمام نەبوایە شوێن نەبوو
سکاڵای دڵی خۆی تێدا بکات بۆیەکا سوپاس بۆ قیژەو غەڵبە غەڵبی
کە « حەمامی ژنان »ی کردە زاراو •

پیاو بەلایەوە نەنگی بوو دەست بۆ ئەو کارانە بەرێت کە لـە ناو لەش قورسی‌ی خۆی بە زۆر بە سەر ئافرەتیدا داسەپاندبوون • منداڵ هەڵگرتن پارەی تێدا بوایە بەر ئەوی نەدەخست • وەکو تر لە هەر شوێنێك هەر کارێك لەبەر هەر هۆیەك داهاتی زۆر بوایە پەلاماری دەدا با ئەو کارە بە پێی نەریتی دەستکردی کۆمەڵ هـی ئافرەتیش بوایە ، هیچ شەرمی پێ نەدەهات وەك گوڵ دەیکرد • لە شارە گەورەکانی ڕۆمای کۆندا کە هێزی کار زۆر بوو پیاو ناچار ماڵانی گەسك دەداو جلی دەشت‌و دەچووە سەر تەنوورو بەرگی ژنانەی دەدوری‌و شتی دەچنی‌و بۆن‌و گوڵی دەفرۆشت •

لە چین بە پێچەوانەوە لەبەر زۆری‌ی کرێکارو جوتیار تەنانەت لە کێڵگەو دارستانەکانیشدا هیـچ جۆرە کارێـك بـەر ئـافرەت نەدەکەوت • ئەمە نرخی ئافرەتی چینی لە هەموو شوێنێکی تر زیاتر هێنایە خوارێ • شارەزایان دەڵێن ملیۆنەها لە کچانی چین لە قوپی ( هۆڕ )و ڕۆبارو دەریاکاندا خنکێنراون یا سووك‌و ئاسان کراونەتە خۆراکی بەراز • ئەوانەشیان کە ژیانیان بۆ دەنووسرا لەڕو لاواز چاوەڕوانی مەرگی خوایان دەکرد ، تا خوشکێك بە دەم چەمۆڵەوە مستێك گەنمەشامی‌ی دەکرایە کۆشی براکەی دە مستی دەقۆستەوە • لە حەوت ساڵانەوە زەبری دایك بەسەر کوڕەوە نەدەما ، هێلکە زێڕین دەهاتە ڕیزی ئاغایانی ناو ماڵ •

پیری‌ی‌و ناشرینی چنگێکی‌تریان کردە سەر مەینەتی ئافرەت•

ئافرەت دەبوو کارێکی وا بکات هەمیشە لەبەر چاوی پیاو جوانو گەنج بنوێنیت ، بۆیەکا ئەوەندەی عەقڵی بۆ مابۆوە هەمووی خستە کـار تاوەکو چرچو لۆچی دەموچاوی بشارێتەوە ، بۆنی پیریی لە خۆی دوور بخانەوە • بەو جۆرە ئافرەت فێری سوورو سپیاوو مێخەكو عەترو سمڵو دەموچاو هەڵگرتنو دەیان بەندو باوی تر بوو کە هێز نییە جارێکی تر لێیانی دوور بخاتەوە با بەشێکیشیان بۆی خراپ بن • لەناو پیری ئافرەت فێری درۆیـەکی گەورەش بـوو : کـەم کردنەوەی تەمەن •

پەرۆشی جوانی وای لە ئافرەت کرد ئـامادە بێـت ئازاریی دۆزەخ وەك شەکراو بنۆشێت • پاشایەکی چینی پتر لە ٢٦٠٠ساڵ لەمەوبەر پێی پچوکی ئافرەتی پێ جوان بوو ، ئەم کفرە گەورەیە وای لە دایکانی گشت چینو ماچین کرد بکەونە جەڕ دانی پێی منداڵەکانیان بۆ ئەوەی گەورە نەبێت • ئەو نەگبەتانـە دەبـوو دە دوازدە ساڵ بەسەر یەکەوە ئازاری بێ ئەندازەی لە قاڵبدانی پێیان بچێژن• ساڵی ١٩١١ میری ناچار بوو بە پێی یاسایەکی تایبەتی ئەو نەریتە ناشرینە قەدەغە بکات ، ئینجا لەگەڵ ئەوەش ماوەیەکی تری پێ ویست تا ئافرەتانی ڕۆژهەڵاتی دوور دەستیان لێی هەڵگرت •

هەزاران ساڵە شووکردنی کچی دانە دانە بە کوڕی سەرو سەکوت ناشرین یـا بەڕەڵلا تێـکەڵ بە ژیانی ڕۆژانـەی هـەموو کۆمەڵێك بووە • کەچی زۆر دەگمەن وا ڕێك دەکەوێت لاوێکی قۆز کچێکی ڕەزاقورس بخوازێت، خۆ گەر هاتو شتێکی وا ڕووی

دا ئەوا بێ گومان زۆرزانێکی چاوبرسیی خۆی بۆ میراتی کچە دەوڵەمەندێك ناوەتەوە • چیرۆکنوسی فەرەنسەیی بەناوبانگ بەلزاك ( ١٧٩٩ – ١٨٥٠ ) زۆر جار وەستایانـە ئیمەنی ئەو ڕاوکەرە هەلپەرستانەی بۆ کێشاوین کە دیسان نێچیریان ئافرەت بوو •

جاران لە ئەوروپا زۆر وا ڕێك دەکەوت کچێکی هەژار بۆ ئەوەی لە دەست ئیفلیجێکی دەوڵەمەند ڕزگاری بێت دەبووە ڕاهیبە •

بە درێژایی مێژوو هەموو ئاڵوگۆڕێکی ناو کۆمەڵ کەم یا زۆر کاریان کردۆتە سەر باری ژیانی ئافرەت ، بەڵام تا کۆتای سەدە ناونجی یەکان هیچ کامیان لەو بارەیەوە نەیانتوانیوە بە ڕادەی پەیدا بوونی پێوەندەی سەرمایەداریی کاری تێ بکەن •

## سەرەتایەکی نوێ

ژیانی نوێی ئافرەت . ئـافرەتو
کار . ئافرەتو خوێندن . مـادام
کـۆری . خەبـاتی ئافرەتـان .
شـۆڕشی فەرەنســەو ئـافرەت •
چـیرۆکی خـانمی لەندەنـی •
داگیرکردنی هۆڵی پەرلەمــان •
ئافرەتانو کۆشکی سپی •

لە کۆتای سەدە ناونجی یەکاندا ، واتە لەگەڵ سەرەتای چرۆ کردنی پەیوەندەی سەرمایەداریو زۆر بوونی داخوازی یەکانـی ژیان ، ئافرەت ڕووی کردە گەلێك کاری نوێ • چەند دێڕێـکی پارچەیەك هۆنراوەی ئەو سەردەمە کە کەوتبووە سەر زوبانی کچان

دەتوانێت وێنەی باری قورسی ژیانی ئافرەتی ئەوسامان بە وردی بۆ بکێشێت • ئەو هۆنراوەیە بە ناوی ئەو ئافرەتانەوە کە ئاوریشمیان دەچنی دەیگوت :

ئاوریشمی زۆر دەچنین
هیچیشی لێ نابینین
هەژارین ، ڕوتوقوتین
هەر برسین‌و هەر تینوین
نانمان گەر دەسکەوت بەیان
هیچمان نابێت بۆ شێوان

وەك هەموو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی تر دەبوو باری ژیانی ئافرەتیش لە قۆناغی سەرمایەداریدا لە زۆر ڕووەوە بگۆڕدرێت ، تایبەت دوای شۆڕشی پیشەسازیی کە کارێکی ئەوتۆی کرد دەزگا ئابوورییەکانی قۆناغی نوێ ئافرەتی شاریش ڕاکێشنە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە • بەڵام ئەو ئاڵ‌و گۆڕە ئازادی‌و سەربەستیی نەکردە دیاریی دەستی بۆ ئافرەت • ماوەیەکی دورو درێژ گەلێك نەریت‌و سەرنجی قۆناغی دەرەبەگی دەربارەی ئافرەت هەر وەك خۆیار مانەوە ، هیچ نەبێت ئەوانەیان کە ڕێگەی چەوساندنەوەی زیاتری ئافرەتیان بۆ سەرمایەداران خۆش دەکرد •

ئافرەت وەك پیاو بووە کرێکارو دوایی فەرمانبەر ، بەڵام نە لە ڕووی کرێ‌و موچەو نە لە ڕووی مافی کۆمەڵایەتی‌و ڕووناکبیرییەوە نیوەی ئەوی بۆ نەدەلوا ، جگە لەوەی ئەرکی خاوو

خێزانیشی وەك جاری جاران بە سەر شانەوە مایەوە • لەبەر ئـەوە ئەو نووسـەرانـەی دەڵێـن ئافـرەت یەکـەم قوربانیی شـۆڕشی پیشەسازیی بوو لە ڕاستی دوور نەکەوتونەوە •

سەرەتای سەدەی نۆزدە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ئافرەت بە دەستە ڕوویان کـردە فابریقـەو کارگـەو دەزگـا پیشەسـازییە گەورەکان • بە وێنە لە فەرەنسە نیـوەی ئـەو کرێـکارانەی لـە کارگەکانی چنیندا کاریان دەکرد ئافرەت بوون کە وەك هەمـــوو کرێکارەکانی تر ڕۆژی بە لای کەمەوە دوازدە سەعات کاریـــان دەکرد ، زۆر جاریش ماوەی کاری ڕۆژانەیـان دەگەیشتە پـازدە سەعاتو زیاتر • ساڵی ١٨٣١ کرێکارانی کارگەی چنینی ئاوریشمی شاری لیۆنی فەرەنسە کە زوربەیان ئافرەتو منداڵ بوون هاوین لە سەعات سێی پێش بەیانەوە دەچوونە سەر کار تا تاریکایی شەو تەواو دادەهات ، زستانیش سەعات پێنجی بەرەبەیان تا یازدەی شەو کاریان دەکرد ، واتە ڕۆژی حەڤدە سەعاتی ڕێك دەخزانە جێکاری تاریكو تەڕوتووشاوییەوە بۆیەکا ژمارەیەکی زۆریان بە دیق مردن •

برسیێتیو نەبوونی پاڵیان بـە ئافرەتـەوە نا ڕوو بکاتە هـەر شوێنێك پولێك زیاتری لێ هەڵکرێت • لە ئینگیلتەرە بە هەزاران ئافرەت بوونە کرێکاری کانە خـەڵوزە بەردینـەکانی لانکشـایەرو یۆرکشایەر • چەوساندنەوەی نامرۆڤانەی ئەو ئافرەتانە سـەرنجی هەموانی راکێشا • لە یەکێـك لـەو راپۆرتانەدا کە سـاڵی ١٨٤٢

دەربارەی کاری ئافرەت لە کانە خەڵوزەکانی ئینگیلتەرەدا دانراوە بێ کەمو زیاد دەڵێت ئەو ئافرەتانە ناچار دەبوون وەك سەگ لە سەر دەستو پێ بە سکەخشێ عەرەبانەکێن بە دوای خۆیانـدا ڕابکێشن • ئەو کچانەی تەمەنیان لە دە ساڵ کەمتـر بوو کـاری کردنـەوەو داخستنەوەی باگۆڕەکانیان دەدانێ ، ئەو زاڕۆڵانە بەر لـە هەموان دەهاتنە سەر کارو دوای هەموان دەگەڕانەوە مـاڵێ • گەرمـای بێ ئەندازەی کانەکان ژنو پیاوی ناچار دەکرد پێکڕا بە ڕوتوقوتی کار بکەن • شایانی باسە شەش سەدە زیاترە ئافرەتی ئینگـلیز لە کـانە خەڵوزە بەردینە زۆرەکانی باشووردا کار دەکەن •

چ لێرەو چ لە شوێنی تر ئافرەت وەك پیاو کاری دەکردو بـە ڕادەی ئەو بەرهەمی پێشکەش دەکرد ، کەچی لەگەڵ ئەوەش زۆر دەگمەن کرێی ئەو لە نیوەی کرێی پیاو تێدە پەڕی • مەرایی‌کەران، ئەوانەی وشەو بیر دەفرۆشن،دەستوبرد پاکانەی ئەم جیاوازکاری‌یە ناشرینەیان لە چەند ڕستەیەکی یتەو داڕێژراودا پێشکەش‌کرد :

ئافرەت وەك پیاو ئەرکی بەخێو کردنی کەسی بەسـەرەوە نی‌یە ! ئەو زانا « پایە بڵندانە » تەنانەت بێوەژنەکانیشـیان لەبیر خۆیـان بـردەوە ! •

ئافرەت دیسان پەنای بردە بەر مەکرو جامبازی‌ی:ژمارەیەکیان بەر لەوەی دامەزرێن خۆیان دەکردە «پیاو»،تاس‌و لووس سەریان دەتاشی‌و چاکەت و پانتۆڵیان لەبەر دەکردو مەمکـدارە بێ بەختەکانیان تونـد

سینەی خۆیان دەپێچاو دەنگی خۆیان گڕ دەکرد تا بگەنە « پایە »ی پیاوەتی بەڵکو ئەمـە خوایە بە ئاواتی ڕۆژانەی کرێکاری پیاو بگەن کە ئەویش بۆ خۆی بێ ئەندازە کەم بوو •

کەمیی ڕۆژانە ئافرەتی لای خاوەن کارگەکان «خۆشەویست» کرد ، زۆر جار وای لێ دەکـردن بیانگـۆڕنەوە بە پیـاو ، تایبەت بەوانەیان کە سەرکێشی‌یان دەکرد • ئەمە بووە هۆی دروست بوونی ڕق‌و کینەو دووبەرەکی لە نێوان کرێکاری ئافرەت‌و پیاودا • ماوەیەك کرێکاری پیاو بە گەرمی داوای دەکـرد نەهێڵـرێ ئافرەت توخنی کارگەکان بکەوێت ، دەیانگوت شوێنی ئاسایی کاری ئافرەت ، هەر کارێك بێت ، تەنها ناو ماڵە •

ئافرەت لە زۆر مافی تر بێ بەری کـرا • بۆ تەمـەنی مێژوو دەبێت بڵێین تاوەکو دوێنێ ئێوارێ ئافرەت مافی خوێنـدنی نەبوو • تۆ بڵێیت مێینە لە نێرینە کەمتر تینووی خوێنـــدەواری بوبێت ؟ • کچێکی پۆلۆنی لە سەدەی چواردەداو دەستە خوشکێکی ئیسپانیی لە سەدەی خەڤدەدا گوتیان هەر کەسێك شەکری وای شکاند سەری دای لە بەرد !• هەردووکیان هێند تینووی خوێندن بوون بە بەرگ خۆیان کردە کوڕ ، ئەو ڕۆژەی بەو جۆرە گەیشتنە بەر دەروازەی زانکۆ پێ‌یان وابوو جیهانیان پێ بەخشراوە • یەکەمیان بەخت بۆی نەهێنا ، پاش دوو ساڵ خوێندنی ڕێکوپێـك ڕۆژێکیـان بـەرزیی سینەی سەرنجی سمێڵ بابرەکانی ڕاکێشا کە بە هۆما زانکۆبەدەریان کـــرد ! •

پاش دەورو بەری نیو هەزار ساڵ نەوەی ئەو کیژە ناچار بوون دیسان لە پۆلۆنیا زانکۆیەکی نهێنیی گەڕۆك دابمەزرێنن کە دواڕۆژی یەکێکیان پڕ بەدەم هاواری کرد : شەرمە ئافرەت لە مافی خوێندن بێ بەریی بکرێت • ئەو یەکە زانای گەورە ماری کۆریی بوو کە پیاوان بە شانازی‌یەوە ساڵی ١٩١١ لە سەر سینی زێڕ خەلاتی نۆبلیان پێشکەش کرد •

بە هەمان دەستوور ئافرەت مافی نەبوو نە خۆی‌و نە کەس بۆ پەرلەمان هەڵبژیرێت • لە زۆر شوێن مافی میراتیشی نەبوو ، بەڵکو ئارەقی ناوچەوانی هی خۆی نەبوو •

بێ مافیی ناڕەواو جیاوازکاریی بێ ئەندازە ئافرەتیان خستە سەر ڕێگەی خەباتی بێ وچان لە پێناوی یەکسانیدا • سەرەتا ئەو خەباتە کۆك‌و ڕێکخراو نەبوو ، ناڕەزایی ئافرەت لەو جۆرە کردارو ڕەفتارانەدا خۆی دەنواند کە چەند نمونەیەکیمان لە لاپەڕەکانی پێشوودا خستە بەر چاو • خەباتی بەرە بەرە پەرەی سەندو قاڵبی خۆی وەرگرت‌و بەو جۆرەش تێکەڵ بە ژیانی سیاسیی گەلە پێشکەوتووەکانی جیهان بوو •

یەکەم جار ئافرەت لە ڕۆژگاری شەڕی سەربەخۆیی گەلی ئەمەریکادا ( ١٧٧٥-١٧٨٣ ) دەنگی بەرز کردەوەو داوای مافی هەڵبژاردنی کرد ، تایبەت دوای ئەوەی شان بە شانی براکانی هاتە ناو کۆڕی خەباتەوەو بە ئەوپەڕی لەخۆ بوردنەوە ڕێگەی بۆ

سەرفرازیی گەلو ئازادیی نیشـتمان خـۆش کرد • هەنگـاوی داهاتووی گەورەی ئافرەت لەم مەیدانەدا بەر ڕۆژگاری شۆڕشی فەرەنسە کەوت کە ڕۆژی چواردەی تەمموزی ساڵی ۱۷۸۹ یەکەم ئاڵای بە سەر قەڵای باستیلەوە کەوتە شەکانەوە •

ئافرەتانی فەرەنسـە لە زوربـەی ڕوداوەکانی شـۆڕشـدا بەشدارییان کردو دەوریان لە سەرکەوتنیدا بینی • دەوروبـەری ۸ هەزار ئافرەتی سەوزە فرۆشی بازاڕەکانی پاریسو خوشکە کرێکارەکانیان ڕۆژی پێنجەمو شەشەمی تەشرینی یەکەمی ساڵی ۱۷۸۹ بۆ نـانو ئازادیی هێرشـیان بردە سەر کۆشـکی ڤێرسای ناودار ، ئەو ڕۆژەی جەنابی ماری ئەنتوانێتی شازادە داوای کرد بە کێکی گوێزدار قۆڕەی سکی ئەو هەزارانە بووەسـتێنن ! • نووسەری ئەوتۆ هەیە دەڵێت شۆڕشدا زۆر گەورەن ، بە ڕادەیەك نووسەری ئەوتۆ هەیە دەڵێت «ڕاستە پیاو باسـتیلی گرت ، بەڵام ئافرەت وڵاتی ئازادکرد » •

ئافرەتانی فەرەنسە لە ڕۆژە گەورەکانی شۆڕشـدا بۆ خۆش چالاکانە هاتنە دەست • هەر لەو ڕۆژانەدا بوو کـە یەکەم گۆڤـارو یەکەم یانەو یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتان لە مێژوودا سەریان دەرهێنا • ئافرەت لە فەرەنسـەی شـۆڕش تێکەڵ بـە کـۆڕی ڕێکخـراوە سیاسییەکانیش بوو ، لە هەر شوێن بۆی بلوایـە داواکانی خـۆی پێشکەش دەکرد کـە ئەوساکـە بریتی بـوون لە مافی خوێنـدنو

هەهەڵبژاردن‌و جیابوونەوە لە مێردو چەند داوایەکی تری لەو جۆرو بابەتە •

بە داخەوە دیسان بەهاری ئافرەت زۆر کورت بوو ، هەمووی بەسەر یەکەوە پێنج ساڵی نەبرد کاتێك سەردارانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە لە هەڵوەستیان بەرامبەر ژن پاشگەز بوونەوەو کۆتای ساڵی **١٧٩٣** فەرمانی داخستنی سەرتاپای یانەو ڕێکخراوەکانی ئافرەتانیان دەرکرد •

ئەم کارە لە سەردارانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە چاوەڕوان دەکرا چونکە زوربەی هەرە زۆریان هێشتا یەکسانی ئافرەت‌و پیاویان پێ هەزم نەدەکرا • سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی‌ش کە یەکێك بوو لە پیاوە گەورەکانی شۆڕش ڕووی دەمی کردە ئەو دەستە ئافرەتەی بەخێری وەك پشتیوان پەنایان بۆ هێنا بوو ، بە گرژی‌یەکەوە فەرمووی : « بۆچ سروشت مەمکی پێ بەخشیوین تا ئێمە شیر بدەینە زاڕۆڵەکانمان ؟ » (١)• مەبەستی فەرمایشتەکەی جەنابی سەرۆك ئاشکرایە : سروشت ئێمەی پیاوی بۆ دەرەوەو ئێوەی ئافرەتی بۆ ماڵەوە دروست کردووە •

بەڵام تازە کار لەوە ترازا کەس بتوانێت تا سەر خۆی لەبەر لێشاوی خەباتی ئافرەتاندا بگرێت کە هەر ڕۆژەی لەشوێنێك‌و هەر جارەی بە شێوازێك خۆی دەنواند • هێشتا فەرمانڕەوایانی نوێی

---

(١) ئەم قسەیە هی جان جاك ڕۆسۆیە •

فەرەنسە بڕیاری داخستنی یانەکانی ئافرەتانیان مۆر نەکردبو کە کەمێك لەو لای سنووری ڕۆژئاوای فەرەنسەوە ، لە ئینگلتەرە دەنگی زوڵاڵی ئافرەتێکی پەرۆش بۆ مافی خۆشکانی بەرز بۆوە • ساڵی ١٧٩٢ لە لەندەن ماری وولستونکرافت (١٧٥٩-١٧٩٧) کتێبێکی بە ناوی « بەرگری لە مافی ئافرەتان »ەوە بڵاوکردەوە کە تێیدا زۆر بە گەرمیو بە پشتیوانی بەڵگەی مێژوویيو قسەو بەراوردی ورد داوای دەکرد بێ دواخستن مافی ڕەوای ئافرەت بدرێت • کتێبەکەی ماری کە دەستوبرد وەرگێڕدرایە سەر چەند زمانێك لە زۆر وڵاتی ئەوروپا دەنگی دایەوەو بووە هۆیەکی یاریدەری گرنگی تر بۆ دروست بوونی بزوتنەوەی ڕێکخراوو سەربەخۆی ئافرەتان •

یەکەم بزوتنەوەی ڕێکخراوی ئافرەتان بە ناوی « فێمینیزم » ( Feminism ) ەوە ناسرا کە لە وشەی « فێمینا » ( Femina ) ی لاتینییەوە کە واتای ئافرەتە ، وەرگیراوە • لە فەرهەنگی زمانە ڕۆژئاواییيەکاندا «فێمینیزم» ( بزوتنەوە لە پێناوی یەکسانیی ئافرەتاندا ) دەگەیێنێت • ئەم بزوتنەوەیە ، وەك وتمان ، لەگەڵ شۆڕشی گەورەی فەرەنسەدا زیاتر خۆی گرتو دوا بە دوای ئەو پەلی هاویشت •

ئامانجی سەرەکیی «فێمینیزم» بریتی بوو لە جێ بەجێ کردنی یەکسانیی ئافرەت لەگەڵ پیاودا • سەرەتا لایەنگرانی «فێمینیزم»

ئەو یەکسانی‌یەیان بە تەرازووی خوێندن دەکێشا ، گەورەترین ئامانجی ئافرەت بە لایانەوە جێ بەجێ کردنی یەکسانی‌ی بوو لەو مەیدانەدا • لەگەڵ بەرەوپێشچوونی پیشەسازی‌ی‌و پەرەسەندنی کاری ئافرەتدا ئامانجەکانی بزوتنەوەی یەکسانیش زیاتر بوون ، ئینجا لایەنگرانی داوای یەکسانی‌ی ئافرەتیان دەکرد لە کارو کرێدا، داوایان دەکرد دەرگای هیچ کارو پیشەیەك لەبەر دەم ئافرەتدا دانەخرێت • پاش ماوەیەك داوای مافی یەکسانیشتیان لە مەیدانی سیاسیدا کرد کە هەزاران ساڵە لەسەر پیاو تاپۆکراوە •

ئافرەت بۆ خۆشی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تێکەڵ بە ژیانی سیاسی‌ی دەبوو • بە وێنە لە سی‌یەکانی سەدەی نۆزدەدا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نزیکەی ١٠٠ کۆمەڵەو ڕێکخراوی ئافرەتان چالاکانە خەباتیان دژی ڕژێمی کۆیلەیی باشوور دەکرد کە ئەو ساڵانە ببووە مەسەلەی سیاسی‌ی یەکەمی گەل‌و نیشتمان • هەر ئەو دەوروبەرە ئافرەتانی ئینگیلتەرە تێکەڵ بە خەباتی کرێکاران‌و دەستەو چینەکانی تر بوون‌و زۆر بە توندی دژی ئەو باج‌و سەرانە زۆرانە وەستان کە ببونە بارێکی قورس بە سەر خۆیان‌و خاووخێزانیانەوە •

شۆڕشە گەورەکەی ئەوروپا لە ١٨٤٨ و ١٨٤٩ دا هێندەی تر ئافرەتیان بزواند • ژنانی فەرەنسە دیسان چەند یانەیەکی سەربەخۆیان دامەزراند کە داوای یەکسانی‌ی سیاسی‌یان دەکرد •

هەر ئەوساش کرێکاری ئافرەت لە فەرەنسە یەکەم ڕێکخراوی تایبەتی‌ی خۆیانیان دامەزراند .

ساڵی ١٨٤٨ لایەنگرانی بزوتنەوەی یەکسانی‌ی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یەکەم کۆنگرەی ئافرەتیان لە مێژوودا بەست‌و تۆماری مافی ئافرەتیان بڵاوکردەوە کە بەڵگەیەکی گرنگی مێژووی بزوتنەوەی ئافرەتانە . لەوساوە بەستنی کۆنگرەی ساڵانەی لایەنگرانی مافی ئافرەتان بووە کارێکی ئاسایی .

هەمان کات ئافرەتانی بەریتانیا کەوتنە داواکردنی مافی هەڵبژاردن ، تایبەت لەو سەردەمەدا پەرلەمانی ئینگلیزی بۆ خۆی خەریکی چاککردنی یاسای هەڵبژاردنی گشتی‌ی بوو . ساڵی ١٨٦٧ ئافرەتانی بەریتانیا داوایەکی ڕەسمی‌یان پێشکەش بە میری کرد کە تێیدا داوای مافی یەکسانی‌ی هەڵبژاردنیسان دەکرد . ڕەتکردنەوەی ئەو داوایە پاڵی بە ئافرەتانی چەند شارێکی بەریتانیاوە نا ژمارەیەک کۆمەڵەی داواکردنی مافی هەڵبژاردن دابمەزرێنن کە زۆری نەبرد لە « یەکیەتی نیشتمانی‌ی ئافرەتانی بەریتانیا »دا کۆبونەوە . ساڵی ١٨٦٩ ئافرەتانی نیویۆرک‌و بۆستن ڕێکخراوی سەربەخۆیان دامەزراند . زۆری نەبرد کە ئافرەتانی ئەڵەمانیاو سویسرەو نەرویج‌و دانیمارک‌و کەنەدەو فەرەنسەو ئیتالیا یەک لە دوای یەک ئەوانیش ڕێکخراوی تایبەتی‌یان بۆ خۆیان دامەزراند .

ساڵی ١٨٨٨ ئافرەتانی ئەمەریکا هەنگاوێکی گرنگی‌تر بۆ پێشەوە چوون بەوەی « ئەنجومەنی ئافرەتانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا »یان دامەزراند • هەمان ساڵو دیسان بە هاندانی ئافرەتانی ئەمەریکا « ئەنجومەنی ئافرەتانی جیهان » دروست بوو • ساڵی ١٩٠٤ یش «یەکیەتی ئافرتانی جیهان بۆ خەبات لە پێناوی یەکسانی‌ی هەڵبژاردندا » دامەزرێنرا ( ئیستە ناوی بووە بە یەکیەتی ئافرەتانی جیهان ـ لایەنگرانی یەکسانی‌ی مافو ئەرك ) •

زۆر ئافرەتی لێهاتوو چالاکانە تێکەڵ بە بزوتنەوەی یەکسانی‌ی ئافرەتان بوون ، وەك نووسەری فەرەنسەیی بەناوبانگ جۆرج ساند ( ١٨٠٤-١٨٦٧ ) کە زوربەی چیرۆکەکانی (ڤلانتیناو لیلیاو جاكو ئەوانی‌تری) بۆ باسی باری نالەباری ژیانی کچو ژنی تەرخان کردوون• شایانی باسە چیرۆکەکانی جۆرج ساند تا ئیستەش سەرنج ڕادەکێشن •

ئەم جۆرە چالاکی‌یانە هێندەی تر ئافرەتانی ئەوروپاو ئەمەریکایان وریا کردەوە ، تایبەت رووداوەکانی ڕۆژانەی ژیانیش ئەوەندەی تر دەیبزواندن • لێرەدا پرسیارێکی ڕەوا خۆی قوت دەکاتەوە : ئاخۆ کام تاریك پەرست بێت ماف نەداتە ماری وولستونکرافتو جۆرج ساندو ئەوانەی وەك ئەوان داوای یەکسانی‌یان بۆ ئافرەت دەکرد ؟• ئەم چیرۆکە کورتەی ژیان بۆ ئەو جۆرە کەسانە دەگێڕمەوە کە خوام بکات نەبن :

خانمی لەندەنی ئەو بەیانی یە خۆی تاس و لووس داو جزدانی بە پارە ئاخنی و بە لەنجەو لار بەرەو بازاڕ کەوتە ڕێ • پێی وابوو خوا جوانێکی تری وەك ئەوی دروست نەکردووە • خوا هەڵناگرێ بەژن و بالاو بۆن و بەرامەی سەرنجیان ڕادەکێشا • خانم هەوڵی دەدا وا نیشان بدات سەیری کەس ناکات ، بەلام لە ژێرەوە بە پەنجە ئەوانەی دەبژارد کە زیاتر لێی ورد دەبنەوە •• ڕێگەی بازاڕ ئەوەندە دوور بوایە بە خەیاڵیدا نەدەهات • لە کۆگاکان دەگەمەن دەستی بۆ شتێك دەبرد ، خۆی کەمی نەبوو • لەپڕ دەستێك جلی گەڕانی گرانبەها سەرنجی ڕاکێشا ، بێ سەوا فەرمانی پێچانەوەی دا • کە دەستی برد پارەکەی بدات حەپەسا ، جزدانەکەی پوولی سووری تێدا نەمابوو • قیژەو هاواری خەڵکی بەسەردا داباراند • زۆری نەخایاند پۆلیسی وریای بازاڕ پارەی دۆزی یەوە،بەلام خانمی لەندەنی نەیتوانی هیچی لێ وەربگرێتەوە ، یاسا دەیگوت پارە هی پیاوە نەك ئافرەت ، دەبوو مێردەکەی لە تەکیدا بچێتە پۆلیسخانە بۆ وەرگرتنەوەی •

ئەم کارە بە هەر تەرازوویەك بیکێشیت لەگەڵ عەقڵدا ناگونجێت ، کەچی تا سەدەیەکیش لەمەوبەر ڕۆژ نەبوو پێشکەوتوترین کۆمەڵی ئەورووپا چەند ڕوداوێکی لەو جۆرەی خانمی لەندەنی بە خۆیەوە نەبینێت ، ئەوەی هێندەی تر ئافرەتی شێتگیر دەکردو باڵی پێوە دەنا سوور بێت لەسەر داواکردنی مافەکانی،تا وای لێ هات کەوتە سەر ڕێگەی خۆپێشاندان و کرداری تری سەرنج

ڕاکێش • کار گەیشت بەوەی دەورو بەری کۆتای سالّی ١٩٠٨ دەستەیەك ئافرەتی خوێن گەرم بارەگای پەرلەمانیان لە لەندەن گرت‌و هەر یەکەیان بە زنجێرێکی قەفە ئەستوور تونـد تونـد خۆیان بـە کورسی‌یەکانی ناو هۆلّی کۆبونەوەوە بەستەوە • بـە پۆلیس‌و بـە ئاسنگەر بە چوار سەعات ئینجا توانی‌یان بیانکەنەوە •

هەر ئەو دەورو بەرەش بوو کە هاوەلّەکانی ئـەو ئافرەتانە لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ ماوەیەك هەر ڕۆژەی دەستەیەکیان لە واشنگتۆنی پایتەخت دەچونە بەر دەرگای « کۆشکی سپی »و کش‌و مات بێ دەنگ بە سەرماو بـە گـەرما تا خـۆر ئاوا دەبـوو دەوەستان • سەرەتا فەرمانڕەوایـانی ئەمەریـکا خۆیـان لێ گێل دەکردن ، لەوان وابوو بەو جۆرە وەڕس دەبن‌و دەست هەلّدەگرن• کە خۆ گێل کردن دادی نەدا پۆلیس بە بیانووی تێکدانی هاتوچۆوە جارو بار یەك دوانێـکیان لـێ دەگرتـن‌و لە واشنگتۆنیـان دوور دەخستنەوە • هەرچۆنێك بوو ئافرەتانی ولاّتە یەکگرتووەکانـی ئەمەریکا بـەو کارەیـان سەرنجـی ڕای گشتی‌یـان ڕاکێشـاو بە کاربەدەستانیان سەلماند کە ئامادە نین بە هیچ جۆرێك دەست لـە خەبات هەلّبگرن •

پەرەسەندنی بیرو باوەڕی سۆشیالیزم کە بە یەك چاو سەیری ئافرەت‌و پیاو دەکات بووە هۆیەکی تری بەهێز بوونی بزوتنەوەی ئافرەتان بەر لەوەی سەدەی نۆزدە کۆتای بێت • وەك دوایی باسی

دەکەین زاناو خەباتکەرانی ئەم ڕێبازە وەستایانە مەسەلەی بێ مافیی ئافرەتیان تێکەڵ بە خەباتی سیاسیی ڕۆژانەی کۆمەڵانی خەڵک کرد ، ئەو کارەی سەرەتای ئازادیی ئافرەتی نزیکتر خستەوە •

## تیشـــکی ئازادیی

مـافی خوێندنو هـەڵبژاردنو
جیـابوونەوە • یـەکەم دوکتۆرو
پـارێزەری ئافـرەت • داهـاتی
سالانـەی ئافرەتی ئەمەریـکا •
ئافرەتانی ژاپۆنیـا • ئـافرەتە
خراپەکانـی بەغـدا • کێشـەی
جیابوونەوە • هیتلەرو ئافرەت •
ئافرەت لای ئەرستۆو ڕۆسۆ •

گشت ئەوانەی باسمان کردن بەسەر یەکەوە ، بێ گـومان لە سەروو هەموشیانەوە خەباتی بێ وچانی ئافرەتان خۆیان ، ڕێگەی سەرکەوتنیـان بـۆ مەسـەلەی ڕەوای ئافـرەت خـۆش کـرد • فەرمانڕەوایانی وڵاتە پێشکەوتووەکان یەك لە دوای یەك ناچار بوون دان بە چەند مافێکی گرنگی ئافرەتدا بنێن کە وا لە خوارەوە چەند نمونەیەکیان لێ دەخەینە بەر چاو :

- سالی ١٨٤٧ لە بەریتانیاو سالی ١٨٧٤ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو سالی ١٨٩٢ لـە فەرەنسە بە پێی یاسا ماوەی کاری

ڕۆژانەی ئافرەت کرایە ١٠ ساعات (١)• ئەمە بێ گومان هەنگاوێکی گەورە بوو بەرەو پێشەوە ، تایبەت گەر ئەوە بێنینەوە یاد کە بەر لەو ساڵانە زۆر جار ئافرەت نزیکەی ١٥ سەعاتو زیاتریش کاری دەکرد • دوا بە دوای ئەوە باری کاریشی کەمێك چاك کرا • لە ساڵی ١٨٨٠وە ئافرەتانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو لە ساڵی ١٨٨٩وە ئافرەتانی ئینگلیز دەیانتوانی ببنە ئەندامی ئەو ڕێکخراوانەی بەر لەوە لە سەر کرێکاری پیاو تاپۆ بوون •

● لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان دەست کرا بە دامەزراندنی قوتابخانەی ناوەندیی کچان کە تا ماوەیەکی زۆر مامۆستاکانیان پیاو بوون ، هەر کچەی دەبوو یەکێك بیگەیێنێتو بیباتەوە • سەرەتا لێدوانو پرسینەوە لەو قوتابخانانەدا نەبوو نەبا ببنە هۆی دروست بوونی پێوەندیی لە نێوان مامۆستای پیاوو قوتابیی کچدا • کچان هەر گوێیان دەگرت •

ساڵی ١٨٤٠ زانکۆی زوێریخ ڕێگەی وەرگرتنی کچانیدا ، بەڵام لە زۆر وڵات بۆ ئەوەی کچو کوڕ تێکەڵ نەبن دەزگای خوێندنی بەرزی سەربەخۆ بۆ کچان کرایەوە • بەرە بەرە

---

(١) لە فەرەنسە سەرەتا ڕۆژی کاری ئافرەت کرایە یازدە سەعاتو دوایی لە ساڵی ١٩٠٤وە کرایە دە سەعات •

زانکۆ ناوداره‌کانی تری جیهان ده‌رگه‌یان بۆ کچان کردەوه ، به‌ڵام تا ماوه‌یه‌ك وه‌رگرتنیان ده‌بووه هۆی دروست بوونی کێشه‌ی گه‌وره ، جاری وا هه‌بوو کوڕان قاپی‌یان له کچان ده‌گرت و نه‌یانده‌هێشت بچنه ژووره‌وه •

- ساڵی ١٨٥٨ ژنی ئینگلیز مافی جیابوونه‌وه‌ی له مێرد پێ به‌خشرا •

- ساڵی ١٨٦٩ ئه‌و ئافره‌ته ئینگلیزانه‌ی باجیان ده‌دا مافی هه‌ڵبژاردنی ئه‌ندامانی شاره‌وانی‌یان وه‌رگرت •

- ساڵی ١٩١٨ هه‌ر ئافره‌تێکی ئینگلیز ته‌مه‌نی له ٣٠ زیاتر بوایه‌و ده‌رچووی زانکۆ یا کرێگرته‌ی خانویه‌ك بوایه ده‌یتوانی له هه‌ڵبژاردنی گشتیدا به‌شدار بێت • ساڵی ١٩١٩ ئافره‌تانی ئه‌ڵه‌مانیاو دوای ئه‌وان به ساڵێك ئافره‌تانی ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مه‌ریکا هه‌مان مافی هه‌ڵبژاردنیان وه‌رگرت •

- له نیوه‌ی یه‌که‌می سه‌ده‌ی نۆزده‌دا ڕێگه به ئافره‌تانی ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مه‌ریکا درا ببنه مامۆستا • دوای ئه‌وان به ماوه‌یه‌ك ئافره‌تی ئینگلیزیش هه‌مان مافی وه‌رگرت • ئه‌م هه‌نگاوه ڕێگه‌ی خۆش کرد که یه‌ك له دوای یه‌ك ده‌رگای کاری تریش بۆ ئافره‌ت بکرێته‌وه •

- ساڵی ١٨٤٨ مافی موڵکی‌یه‌ت درا به ژنی مێرداری ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مه‌ریکا •

● ئافرەتانی فەرەنسە ساڵی ١٩٠٧ مافی خەرج کردنی موچەو کرێی خۆیان پێ درا ، تا ئەو ساڵە داهاتی ئافرەت موڵکی پیاو بوو ، بۆ ئەو دەشیا هەموو پارەی ژنەکەی لە مەیخانەکاندا بسوتێنێت ، بەڵام خۆی کە بە ئارەقی ناوچەوان پەیدای دەکرد بۆی نەبوو دەست بۆ پولێکی بەرێت •

هیچ گومان لەوەدا نی‌یە وەرگرتنی ئەم مافانە هەنگاوی گەورە بوون چ لە ژیانی ئافرەتدا بە تایبەتی‌و چ لە ژیانی کۆمەڵدا بە گشتی• بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەم مافانە ناتەواو بوون‌و بەو جۆرە لەوانە نەبوون یەکسانی‌ی ڕاستەقینە بۆ ئافرەت مسۆگەر بکەن ، بۆیەکا ئافرەت ناچار دەستی لە خەبات هەڵنەگرت •

نمونەی ناتەواوی ئەو مافانە زۆرە • بە وێنە یاسادانەری ئینگلیز ناماقوڵی‌یەکی گەورەی کردبوو بەوەی مافی هەڵبژاردنی دابووە تەنها ئەو ئافرەتانەی تەمەنیان لە ٣٠ زیاتر بوو لە کاتێکدا ئەو تەمەنەی بۆ پیاو هێنابووە سەر ٢١ ساڵان • وا دیارە بەلای ئەوەوە جیاوازی‌ی نێوان تەمەنی عەقڵی پیاوو ئافرەت یەك دەر سێ بوو !• ئەو کارە بە ڕادەیەك ناشرین بوو کە میری‌ی بۆ خۆی دوای ١٠ ساڵ ناچار لێی پاشگەز بۆوە • وا دیارە براده‌رانی ئەو ئینگلیزە لە فەرەنسە پێویستیان بە سەد ساڵ لێکۆڵینەوە بوو بۆ ئەوەی مافی هەڵبژاردن بدەنە ئافرەت ، چونکە لە ساڵی ١٨٤٨ەوە ئەو باسە هاتە گۆڕێ بەڵام تاوەکو ساڵی ١٩٤٤ بڕیاری لە سەر نەدرا •

ڕاسته ئافرەتی ئینگلیز ، وەك وتمان ، ساڵی ١٨٥٨ مافی جیابوونەوەی لە مێردی خراپ وەرگرت ، بەڵام تا ساڵی ١٩٣٨ ، واته له ماوەی ٨٠ ساڵی ڕەبەقدا ئەو مافەی ئافرەت له هی پیاو زۆر کەمتر بوو .

زانکۆکانی ئەوروپاو ئەمەریکا یەك له دوای یەك کەوتنە وەرگرتنی قوتابیی کچ ، بەڵام دوای دەرچوونیان سەرەتا ئەو کچانه تووشی هەزار بێنەو بەرە دەبوون تا کارێکیان دەست دەکەوت . یەکەم ئافرەتی فەرەنسەیی که ساڵی ١٨٧٥ دوکتۆرای له کاری پزیشکیدا وەرگرت پاش حەڤدە ساڵ چاوەڕوانی ئینجا دامەزرا . بڕیاری دامەزرانی دەسته خوشکێکی پارێزەری سێ ساڵی خایاند .

زووربەی ئەم کۆسپانه که لەگەڵ عەقڵ نەدەگونجان بوونه بەشێك له مێژووی رابوردووی بزوتنەوەی ئافرەتان . خەباتی ئافرەتانو ڕووناکبیره شۆڕشگێڕەکان زۆر بەرهەمی تریان دا ، بوونه هۆی پساندنی گەلێك عەڵقەی تری کۆتو زنجیری ئافرەت . وەك دیمان ئافرەت له وڵاته هەره پێشکەوتووەکانی جیهاندا تا دوای شەڕی یەکەمی جیهانیش له مافی هەڵبژاردنو خۆ پاڵاوتن بێ بەری بوو ، بەڵام ئەم دیمەنه بە خێرایی گۆڕا : ساڵی ١٩١٧ ئافرەتانی تەنها ٦ وڵات (نەمسەو نیوزیلەندەو نەرویجو دانیماركو فینلەندەو ئایسلەندە) مافی هەڵبژاردنیان هەبوو ، له ماوەی چوار ساڵدا ئەو ژمارەیه گەیشته ١٧ ، بەڵام ساڵی ١٩٧٠ گەیشته ١٢١ ، واته لەو ساڵەدا

ئافرەتانی ١٢١ وڵات مافی هەڵبژاردن و خۆپاڵاوتنیان هەبوو • ئافرەت لە جاران زیاتر سەربەست بوو ، خوێندەوارو فەرمانبەری لە ناودا زۆرتر بوو •

لەگەڵ ئەوەش تا ئێمرۆکە ناتوانین باسی یەکسانیی تەواوی ئافرەت و پیاو لە زوربەی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بکەین ، چ جای سەرتاپای وڵاتە دواکەوتووەکان• بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم ڕاستی‌یە دیسان پەنا دەبەینەوە بەر چەند نمونەیەکی مانادار • سەرەتای حەفتاکان لە بەریتانیا ٩ ملیۆن ئافرت کاریان دەکرد، لەمانە تەنها ملیۆن و نیوێکیان موچەو کرێیان وەك هی پیاو بوو ، ئەوانی تریان لە یەك جۆر کاردا لە پیاو کەمتریان وەردەگرت • لە شەستەکاندا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەنها لە ٥٪ی ئەو ئافرەتانەی کاریان دەکرد داهاتی ساڵانەیان وەك داهاتی مام‌ناوەندی‌ی کەسێکی ئەمەریکایی بوو • هەر لەوێ ساڵی ١٩٦٥ ڕۆژانە یا مانگانەی ئافرەتێك بەقەدەر لە ٦٤٪ی ڕۆژانە یا مانگانەی پیاوێك بوو • پاش پێنج ساڵ لەوەش نزمتر بۆوە ، گەیشتە تەنها لە ٥٨٪ • ئافرەتە ڕەش پێستەکان لە ٢٠٪ی تر لەوە کەمتریان وەردەگرت •

لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکان بێ کاری‌ی هەمیشە لە ناو ئافرەتدا زیاترە وەك لە ناو پیاودا • ساڵی ١٩٦٩ بێ کاری‌ی لە ناو ئافرەتانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا خۆی دەدا لە تریکەی لە ٥٪، کەچی لە ناو پیاواندا لە لە ٣٪ کەمتر بوو •

کۆتای شەستەکانو سەرەتای حەفتاکان لە ٨٥٪ی نەخوێندەواری هەموو جیهان ئافرەت بوون • ڕاستە ئافرت مافی هەڵبژاردنو خۆ پاڵاوتنی وەرگرت ، بەڵام هەمیشە ژمارەی ئەندامانی ئافرەت لە پەرلەمانەکانی زوربەی هەرە زۆری وڵاتەکانی جیهانـدا لە ژمارەی ئەندامە پیاوەکانیان بە سێو چوارو دە قات کەمتر بوونو کەمترن• لە هەندێك وڵاتی پێشـکەوتوو ژمارەی ئـەو ئافرەتانە تا دێت کـەم دەبێتەوە • بە وێنە ساڵی ١٩٤٦ هەمووی بەسەر یەکەوە ٣٩ ئافرەت ئەندامی پەرلەمانی فەرەنسی بوون ، کەچی ساڵی ١٩٦٨ ژمارەیان هاتە سەر تەنها ٦ کەس • لەوەش خراپتر : تا ساڵی ١٩٤٦-١٩٤٧ یاسای ژاپۆنیای پێشکەوتوو بە یەك چاو ســـەیری ئافرەتو پیاوی نەدەکرد • دوای ئەوەی ساڵی ١٩٤٦ مافی هـەڵبژاردن بە ئافـرەتی ژاپۆنیا درا ئەو ساڵە ژمارەی ئەندامە ئافرەتەکانی پەرلەمـــانی ئەو وڵاتە گەیشـــتە ٣٩ کەس ، بەڵام سێ ساڵ وەرنـەچەرخا کاتێـك ژمارەیان هاتە سەر تەنها ١٢ کەس • نمونەیەکی لەوەش سەیرتر : لە ساڵی ١٩٢٣وە ئافرەتانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا داوای یەکسانیی تەواو لەگەڵ پیاودا دەکەن • ســاڵی ١٩٧٢ کۆنگرێس یاسایەکی لەو بارەیەوە دانا کە تا ئێمڕۆش نەکەوتۆتە کار چونکـە هێشتا دوو دەر سێی ئەنجومەنی یاسا دانانی ویلایەتەکـان بڕیاریان لەسەر نەداوە ، ١٥ ئەنجومەنیان دژی ئەو یاسایەنو گەر هیچ نەبێت دوانیان تا حوزەیرانی ســاڵی ١٩٨٢ بیری خـۆیان نەگـۆڕن ئەوا یاساکە پووچ دەبێتەوە •

ئەم جیاوازکاری‌یە ناڕەوایە زیاتر لەو مەیدانانەدا خۆ دەنوێنێت کە پێویستی‌یان بە پلەی خوێندنی بەرزو شارەزایی زۆرە • تا چەند ساڵێکیش لەمەوبەر لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەنها لە ١٪ی ئەندازیاران و لە ٣٪ی پارێزەرو دادکاران‌و لە ٧٪ی پزیشکان‌و لـە ٩٪ی زانایان ئافرەت بـوون ، واتـە لـە ٩١٪ی زانایـان‌و ٩٣٪ی پزیشکان و لە ٩٧٪ی پارێزەرو .دادکاران‌و لە ٩٩٪ی ئەندازیارانی ئەمەریکا پیاو بوون •

بێ گومان ژمارەیەکی زۆر لە کێشە جە رگبڕەکانی کۆمـەڵ ئەنجامی باری قورسی ژیانی ئافرەتن • لێرەدا بۆ دەرخستنی ئەنجامە خراپەکانی نەخوێندەواری‌و کەم‌خوێندەواری‌ی ئافرەت ئەم نمونەیە دێنینەوە : لە ٨٨٪ی ئافرەتە خراپەکانی نەرویج نیمچە خۆیندەوارن، لەوانەن کە ئەوپەڕەکەی قوتابخانەی سـەرەتایی‌یان تەواو کردووە یا چەند پۆلێکی ئەو پلەی خوێندنەیان بڕیوە • ساڵی ١٩٥٧ـ١٩٥٨ نزیکەی لە ٨٠٪ی ئافرەتە خراپەکانی قاهیـرەو لە ٨١٪ی ئافرەتـە خراپەکانی لوبنان نەخوێندەوار بوون • چـەند ساڵێك لەمـەوبەر ژمارەی نەخوێندەوارانی ئافرەتە خراپەکانی بەغـدا کە لـە ٥٪یان تورکمان‌و لە ٧٫٥٪یان کورد بوون (١) لەوانەی قاهیرەو لوبنـــان زیاتر بوون • با ئەوەش بڵێین کە لـە ٥٥٪ی ئافـرەتە خراپەکانی

---

(١) بڕوانە : كريم محمد حمزة ، البغاء السري في بغداد • دراسـة ميدانية ، رسالة ماجستير في علم الاجتمـاع ، بغـداد ، ١٩٧٤ ، ص ١٣٥ •

ولاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەولیان داوە خۆیان بکوژن•ئەوی بیەوێت تێ دەگات ئەم ڕاستی‌یە چەند ئاو دەکێشێت !

لە لایەکی ترەوە جیاوازی‌ی توانـای ئابووری‌ی لە نێـوان ئافرەت‌و پیاودا یەکێکە لە هۆ گەورەکانی پەیدا بوونی هاوسەری‌ی مەسلەحەت کە ئەمیشیان بۆ خۆی بۆتە هۆی سەرەکی‌ی زۆر بوونی جیابوونەوە لە ولاتە سەرمایەداری‌یەکاندا • سـالی ١٨٩٠ لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرامبەر هەزار ژن خواسـتنی نوێ ٥٥ جیابوونەوەی ژن‌و مێرد هەبوو • سال بە سـال ژمـارەی دوایی‌یان توندتر بین‌بڕکێی لەگەل ژمارەی یەکەمدا دەکرد : سـالی ١٩٠٠ جیابوونەوە بووە ٧٧و سالی ١٩١١ بووە ٩١و سالی ١٩٢٠ گەیشتە نزیکەی ١٦٧و سالی ١٩٤٠ خۆی دا لە ٢٠٠و لە حەفتاکاندا لە ٢٥٠ تێپەڕی کرد • زۆری‌ی ئـەم ژمارەیـەی دوایی وای لە هەنـدێك نووسەر کـردووە بلێن کێشـەی جیابوونـەوە لە ولاتێـکی وەك فەرەنسەدا زۆر گەورە نی‌یە ، چونکە لەوێ ژمارەی جیابوونەوە لە هەزاردا تەنها ••• سەدو بیست‌و پێنجە ! •

ژمارەیەك لە زانایانی ڕۆژئاوا پاکانە بۆ جیاوازکاری‌ی نێوان ئافرەت‌و پیـاو دەکـەن • لایەنـگرانی تیـۆری‌ی بایەلـۆجی ئەو جیاوازکاری‌یە بە ئەنجامی جیاوازی‌ی توانای لەشـی ئافرەت‌و پیاو دادەنێن • فەیلەسوفی فەرەنسەیی ئۆگۆست کۆمت ( Comte ) (١٧٩٨-١٨٥٧) دەیگوت بێ‌سانی‌ی ئافـرەت لە کۆمەلدا کـارێکی ڕەوایە چونکە سروشت لەشی ئەوی لاواز دروست کردووە •

لە کۆتای سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا لە وڵاتە ڕۆژئاوایی‌یەکان‌و زیاتر لە هەموویان لە ئەڵەمانیا « تیۆری‌ی سێ کافەکە » دەنگی دابۆوە کە لە پیتی یەکەمی سێ وشەی ئەڵەمانی وەرگیرابوو : ( Kriche, Kuche, Kinder )

واتە کڵێسەو موبەق‌و منداڵ • لایەنگرانی ئەم تیۆری‌یە لەو باوەڕەدا بوون خوا ئافرەتی تەنها بۆ ئەو سێ کارە دروست کردووە : نوێژو ڕۆژوو ، چێشت لێنان لەگەڵ پەروەردە کردنی منداڵ•هەرچەندە ئەم تیۆری‌یە زوو ڕیسوا بوو،بەڵام لە سی‌یەکاندا هیتلەر ویستی گیانی بکاتەوە بە بەردا • بۆ خۆی لەو ڕۆژەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست ( ساڵی ۱۹۳۳ ) کەوتە سەندنەوەی زوربەی ئەو مافانەی ئافرەتانی ئەڵەمانیا بە ڕەنجی شان‌و خەباتی بێ وچان پێ‌یان گەیشتبون ، هیتلەر نیازی بوو ئافرەت بکاتەوە دایەن‌و چێشتکەری ماڵ‌و کارەکەری کڵێسە •

جێگەی داخە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە ڕووناکبیرە هەرە گەورەکانی مێژوو ( ئەرستۆو ئەبیقرات‌و جان جاك روسۆو پرودۆن‌و گەلێکی تر ) لە مەسەلەی ئافرەتدا خراپ تێکەوتوون‌و لەوێدا بیانەوێت‌و نەیانەوێت چوونەتە ڕیزی ڕووناکبیرە کۆنەپەرستەکان• بە لای ئەرستۆوە (۳۸٤-۳۲۲ی پێش عیسا) - گەورەترین ڕووناکبیرو فەیلەسوفی سەردەمی کۆن ، قوتابی‌و مامۆستای ئەکادیمیا ناودارەکەی ئەفلاتۆن ، مامۆستای ئەسکەندەری مەکەدۆنی ، « ژن هەر ژن » بوو • فەیلەسوف‌و نووسەرو مۆسیقاری بەناوبانگی

فەرەنسە جان جاك روسۆ (١٧١٢ـ١٧٧٨) کە بە بیرو باوەڕی
وردی ڕێگەی بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە
خۆش کرد لە کاتێکی درەنگی وەك ناوەندی سەدەی هەژدە دەیگوت:

«ئەرکی ئافرەتان لە هەموو چەرخ و ڕۆژگارێکدا بریتی‌یە لە
هەوڵ و تەقەللا بۆ ئەوەی بە دڵی پیاو بن ، خزمەتی بکەن و
شایەنی خۆشەویستی و ڕێزی بن »٠«ئافرەت بۆ ئەوە دروست
بووە کە پابەندی پیاو بێت ، بۆیەکا پێویستە زوو فێری
خواردنەوەی زۆرداری‌ی بێت و گوێ نەداتە هەڵەکانی مێردو
سکالآیان لە دەست نەکات » ٠ دیارە هەر لەبەر ئەوەش بە لای
روسۆوە هیچ پێویست نەبوو کچ زوو بخرێتە بەر خوێندن ٠

هەرچەندە باسی سەرنجی کڵێسەمان سەبارەت بە ئافرەت کرد،
بەڵام جێگەی خۆیەتی لێرەدا قسەی یەکێك لە قەشە گەورەکانی
سەدە ناونجی‌یەکان بهێنینەوە ٠ یۆحەنای دەم زێڕین دەیگوت « هیچ
کام لە دڕندەکانی سەرزەمین وەك ئافرەت زیان‌بەخش نی‌یە » ٠
بەڵێ نازناوی جەنابی یۆحەنا «دەم زێڕین » بوو ٠ یەکێك لە نەوەی
بە وەفای ئەو «دەم زێڕین»ە لە ناوەندی سەدەی بیستدا ، بەڵێ لە
ناوەندی سەدەی بیستدا نووسیوی‌یە دەڵێت درۆو دەلەسەو مەرایی
کردن وان لە خودی سروشتی ئافرەتدا ٠ ئەو یەکە جەنابی زانای
کۆمەڵایەتی ئەمەریکایی ئۆتۆ بۆلاکە کە ساڵی ١٩٥٠ کتێبێکی بە
ناوی « تاوانی ئافرەت »ەوە بلاوکردۆتەوە ٠ یەکێك لە سەرچاوەکانی

ئۆتۆ بۆلاك كتێبی « چەكوشی جادووگەران »ە كە ســاڵی ١٤٨٧ ، واتە نزیكەی ٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر ، دانراوە •

بەوەی باشە ژیانو مێژوو بێ بەزەیی پیروباوەڕی نالەبار زیندەبەچاڵ دەكەن • لە مەسەلەی ئافرەتیشــدا بەڵگە زۆرەكـانی هەردووكیان بەســن بۆ بەربەچ دانــەوەی ئەوانــەی لایەنــگری پێسانیی مێینەو نێرینەن •

## وەلامی ژیانو مێژوو

سەمیرامیس • كیلۆپاترا • تەختی
بەلقیس • زەنوبیــای تەدمــور •
خۆلــەمێشی لاشــەی جانــدارك •
ئافرەتانی ئەسپارتە • قبــوڵ •
مادام رۆلان • مــاری كــۆری •
ئافرەتانی سۆڤێت •

بەڵگەكانی ژیانو مێژوو وا نیشان دەدەن كە هیچ جیاوازییەك لە نێوانی ئافرەتو پیاودا نییەو گەر هەشبێت دەســتكردی كۆمــەڵ خۆیەتی • سەردەمی هەرە زوو بە هیچ كلۆجێــك جیــاوازیی لە نێوان كاری مێینەو نێرینەدا نەبوو ، ئافرەت بەر لە دروســت بوونی خێزان تەنانەت ڕاویشی دەكرد ، ئەوساكە وەك پیاو بەهێزو بەتوانا، چاو قایمو ئازا بوو •

دوای ئەوەش كە ئافــرەت بە زۆر كــرایە ئەنــدامی دووەمی

کۆمەڵو گەلێك مافی لێ سەندرایەوەو لە زۆر کارو ئەرکی گرنگ دوور خرایەوەو لە گەلێك پایە بێبەری‌ی کرا ئینجا هەر دەرفەتی بۆ هاتبێتە پێشەوە نیشانی داوە کە هیچی لە پیاو کەمتر نی‌یە ، وەك ئەو فەرمانڕوایی کردووەو چۆتە جەنگەی شەڕەوەو بیری بۆ شتی نوێ چــووە •

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستی‌یانە دیسان پەنا دەبەینەوە بەر چەند بەڵگەو نمونەیەکی ژیانو مێژوو •

شامورامات کە بە هەڵە ناوی بۆتە ســەمیرامیس دەوزوبەری ٢٨٠٠ ساڵ لەمەوبەر بووە فەرمانڕەوای بە دەسەڵاتی ئاشوورو چەند شەڕێکی سەرکەوتووی کرد کە بەشی زۆریان لەگەڵ میدی‌یەکانی باپیرەگەورەی کوردا بوون • سەمیرامیس کە هەتا هەتایە ناوی لــە ناواندا دەبێت وەك دەڵێن بە شانازی‌یەوە ئەم قسانەی لەسەر تاشــە بەردێك هەڵکەندووە :

« سروشت منی بە ئافرەت دروست کرد ، بەڵام کردارەکانم بۆڕی کرداری پیاویان داوە ، فەرمــانڕەوای ئیــمپراتۆری‌ی نەینەوام ، بەر لە من هیچ ئاشــوری‌یەك دەریــای گــەورەی نەبینیوە ، بەڵام من بە چاوی خۆم چوار دەریا دەبینم کە وان لە ژێر دەسەڵاتمدا » •

ئاخۆ کام خوێندەوار هەبێت ناوی شازادەی بەناوبانگی میســر کلیۆپاترای نەبیستبێ ؟• وابزانم کەس • بەڵام واشبزانم بە دەگمەن

هەن بزانن کە میسر تەنها یەك کلیۆپاترای بەناوبانگی پێشکەش بە مێژوو نەکردووە • ئـەو کلیـۆپاترایەی وەهـا دەنـگی داوەتـەوە کلیۆپاترای حەوتەمە کە هاوسەری دیۆنیسی پاشا بوو • کلیۆپاترای حەوتەمو دیۆنیس کـە پێکرا فەرمـانرەوایی‌یان دەکرد لە سـەر دەسەڵات تێکچون • ساڵی ٤٨ی پێش عیسا خۆیو لایەنگرانی دوور خرانەوە بۆ سوریا ، بەڵام ساڵی نەبرد کە کلیـۆپاترا توانیی بـە یاریدەی یۆلیۆس قەیسەر بگەڕێتەوە سەر تەختی پاشایەتی میسر • یۆلیۆس قەیسەر کوژراوی زیـرەکیو وریـاییو دونیادیدەیـیو شۆخیی کلیۆپاترا بوو • کە ئەو کوژرا کلیۆپاترا دەسـتی لەگەڵ مارك ئەنتۆنیۆ تێکەڵ کردو ساڵی ٣٧ی پێش عیسا شووی پێ کرد • پاش شەش ساڵ کە دوژمن زەفەری پێ بردن هەردوکیان خۆیان کوشـت •

داستانی ژیانی کلیۆپاترا سەرنجی نووسەرێکی گەورەی وەك شەکسپیری وەها ڕاکێشا کە یەکێك لە بەرهەمە ناودارەکانی خۆی بۆ تەرخان کرد • ژینامەی کلیۆپاتراو ئەو مارەی کـە دەڵێن خۆی پێ کوشت بوونە هەوێنی بەرهـەمی زۆر نووسـەرو هونەرمـەندی بەناوبانگی تر •

بەڵام هەر وەك وتمـان ژمـارەیەك کلیۆپاتـرای تر بـەر لـە کلیۆپاترای حەوتەم بەشداری‌یان لە فەرمانڕەوایی میسـری کۆندا کردووە • کلیۆپاترای یەکەم نزیکەی ١٥٠ ساڵ بەر لەو دەسەڵاتی

وڵاتی بۆ ماوەی چەند ساڵێك گرتە دەستو لە مەیدانی کارگێڕیدا هیچی لە مێردە جوانەمەرگەکەی کەمتر نەبوو • کلیۆپاترای سێیەم (١٦٠–١٠١ی پێش عیسا) ماوەیەکی دورو درێژ شان بە شانی پاشای مێردی فەرمانڕەوای دەسەڵاتداری میسرو دەوروبەری بووەن •

بەلقیس بەر لە ئیسلام بە ماوەیەکی زۆر بۆ ماوەی پازدە ساڵی ڕەبەق، تاکە فەرمانڕەوای یەمەن بوو ، وەك سەرچاوە کۆنەکان باسی دەکەن زۆر جار بە لای کەمەوە ١٠٠ هەزار پیاو لە دوای ئەم ئافرەتەوە دەڕۆیشتن • تەختی بەلقیس هێند ڕازاوە بوو سەرنجی زوربەی شاعیرانی ئەو سەردەمەی ڕاکێشا • مێژوونووس هەن دەڵێن گوایە بەندی مەئرەبی ناودار بە فەرمانی بەلقیس دروست کراوە • قورئانی پیرۆز بە درێژی باسی تەختو بەختو دەسەلاتی بێ وێنەی بەلقیسی کردووە •

کاتێك ڕۆمانەکان باڵی باڵدارو ناڵی ناڵداریان دەشکاند زەنوبیای تەدمور (١) کە وا دیارە لە جوانیدا کەم هاوتا بووە ، توانی وەك پاڵەوان لە ناوەندی سەدەی سێیەمدا ، واتە نزیکەی چوار سەدە بەر لە ئیسلام ، بێتە مەیدانەوەو ئەوی بە کەم پیاو دەکرێت بیکات ، ڕۆمانەکانی دەرکردو دەسەڵاتی خۆی گەیاندە میسرو سودان ، شامو عیراقو ئاسیای بچوك • لە دوا شەڕیدا زەنوبیا ساڵی ٢٨٢ کەوتە دەست ڕۆمانەکان کە بە ڕێزەوە ناردیانەوە وڵاتی خۆی •

---

(١) تەدمور ١٥٠ میل کەوتۆتە ئەولای دیمەشقەوە •

جێگــەی شیاوی جــان دارك قوڵایی دڵی هەمــوو نیشتمانپەروەرێکە • ئەم کچە جوتیارە کە چاوی کردەوە فەرەنســەی نیشتمانی لە ژێر پۆستاڵی ئینگلیزی داگیرکەردا دەیناڵاند • تا ئــەو نەهاتە مەیدانەوە کەس نەیتوانی شاری ئۆرلیان ئازاد بکات • باســی ئازایەتیو لەخۆبوردنی جان دارك کەوتە سەر زوبانی گشت لایەك، باڵی بە هەزاران لاوی فەرەنسەوە نا بێ ترس بکەونە گیانی دوژمن • بۆ خۆی هەمیشە لە ڕیزی پێشەوە بوو تا لە شەڕێکی گەرمی نزیك پاریس بە تیری دوژمن پێکراو کەوتە دەســت ژمارەیــەك پیــاوی ترسنۆکی خۆفرۆش کە بێ ســەوا بە هــەزار لیڤەر فرۆشتیان بە ئینگلیزەکانی دوژمنیان • جان دارك تا ئەو ڕۆژەی کڵپەی ئاگــری داگیرکەر دوا هەناسەی ژیانی لێ بڕی (٣٠ی مایسی ١٤٣١) سەری بۆ کەس شۆڕ نەکرد ، خۆڵەمێشی لاشەی پیرۆزی زیاتر پیــاوانی فەرەنســەی بۆ خەبات هان دا •

ئەوانەی لە ناو پاشا هەرە ناودارەکانی ئەورووپــادا دەتــوانن شان لە شانی ئێلیزابێثی یەکــەم بدەن زۆر کــەمن • ئێلیزابێــث بۆ ماوەی ٤٥ ساڵی ڕەبەق ( لە ١٥٨٨وە تاوەکو ١٦٠٣ ) فەرمانڕەوایی ئینگیلتەرەی لە باوكو براو خــزمانی باشــتر کــرد • ئێلیزبێث لــە سەردەمێکی زۆر ناسکدا خۆی تەرخان کرد بۆخزمەتی وڵاتەکەی، تەنانەت شووشی نەکرد هــەرچەندە هەموو میــروپاشای ئــەورووپا شانازی یان دەکرد گەر ئەو پێیان ڕازی بوایە • کاروباری وڵات لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی ئێلیزابێثدا وەهــا رێکوپێكو بێ کێشــە

نەچوو بە ڕێگەوە کە تا مردنی یەك جار سەرەك وەزیرانی نەگۆڕی • لە سەردەمی ئەودا بوو ئینگلیزەکان توانی‌یان بگەنە ئەمەریکا ، هەموو ئەو قەرزانەی لەسەر ولاتەکەیان بوو بیدەنەوە ، کلك‌و باڵی پاشای لەخۆ بایی بووی ئیسپانیا فلیپی دووەم بکەن کە بەر لەوە بێ سوود هەوڵی دونیای دا بۆ ئەوەی ئیلیزابێث شووی پێ بکات •

ئافرەتە ئەسپارتەیی‌یەکانی یۆنانی کۆن شەڕ نەبێت کە کەوتبووە ئەستۆی مێردەکانیان ئیتر هیچ ئەرکێکی پیاو نەبوو بە ڕێکوپێکی بەجێی نەگەیێنن • پیاوە ئەسپارتەیی‌یەکان دەگمەن دەکەوتنە ماڵ، هەمیشە یا لە بارەگای لەشکر خەریکی مەشق یا لە ولاتان مەشغوڵی شەڕ بوون • وەك مێژوونووسێکی ئەو سەردەمە باسی دەکات پیاوانی ئەسپارتە فریا نەدەکەوتن تەنانەت منداڵەکانیشیان بە باشی بینن • کشتوکاڵ ، بازرگانی ، پیشەسازی‌و هەموو کارێکی تری ژیانی ئەسپارتە بە دەست ئافرەتەوە بوون • هی وایان هەبوو داهاتی ساڵانەی شانی لە شانی داهاتی ساڵانەی بودجەی دەوڵەت دەدا •

هەر بەو جۆرەش لە کاتی شەڕی دوورودرێژی خاچداراندا زۆر جار ئافرەت جێگەی ئەو میرو پاشاو دەرەبەگە گەورانەیان دەگرتەوە کە بە خۆیان‌و لەشکریانەوە بەرەو فەلەستین دەکەوتنە ڕێ • ناوچەی شامپێنی ناو فەرەنسە بۆ ماوەی چل ساڵ ( لە ١١٨٢وە تاوەکو ١١٢٢) بە دەست ئافرەتێکەوە بوو •

له پێشکەوتووترین وڵات تا ناوەنـدی سـەدەی حـەقدەش کەیبانوو گـەر میوانێکی بهـاتایە دەبوو بیـاتە ژووری نوسـتنی ، کەلەگی‌و دیوەخان هی پیاو بوون . بەڵام کە ئافرەتی ئەوروپا چاوی کردەوە ئـەویش دیوەخـانی بۆ خـۆی دامەزرانـد . ئافرەتـە دەستدارەکانی پاریس‌و لەندەن کە خولیای یەکسـانی‌ی کەوتبووە کەلەیانەوە قبـوڵیان داهـێناو هەر یەکـەیان ڕۆژێکی حـەفتەیان بۆ میوانداری هەڵبژاردە.ئەوانەی دەچوونە ئەو دانیشتنانە تەنها بایەخیان بە ئارایشت‌و خۆ ڕازاندنەوە نەئەدا ، بەڵکو دەشیانویسـت قسـە بزانن‌و وەك پیاوان دەنگیان هەبێت . واش بوو . لەو دیوەخانانـەدا گەلێك ئافرەتی لێ هاتوو دەرکەوتن ، ئەوانەی وەك پیاو قسـەزان بوون،وەك ئەو بیریان دەکردەوەو لە جیهان‌و دەوروبەر دەگەیشتن .

ئەم جۆرە نیمچە کۆبونەوانە زیـاتر ئافرەتیان بەرەو ژیـانی سیاسی‌ی بردەقسە بەرزەکەی مادام ڕۆلان لە گەرمەی هەراوبگری شۆڕشی فەرەنسەدا ، لەوکاتەدا کـە تاوانبارو بێ تـاوان وەك یەك سەریان دەپەڕێنرا ، تا ئیمڕۆش لە شوێنی خۆیدا دەنگ دەداتەوە، گرمەی دێت ، هەزاران داستان دێنێتەوە یاد :

« ئەی سەربەستی ! چەند تاوان بە ناوتەوە دەکرێت ! »

شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە سەرداران‌و لایەنگرانی شۆڕش پێیان لە دیوەخانی مادام ڕۆلان نەدەبڕاو هەموویان بە ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستی‌یەوە سەیریان دەکـرد . مادام ڕۆلان بە تـەواوەتی

کاری کردبووه سەر جان ماری رۆلانی هاوسەری کە لە گەرمەی ڕووداوەکانی شۆڕشدا دوو جار بووە وەزیری کاروباری ناوخۆ • زۆری نەبرد مادام رۆلان بۆ خۆیشی بووە یەکێك لە قوربانی‌یەکانی ئەو تاوانە گەورانەی بە ناوی ئازادی‌و سەربەستی‌یەوە دەکران ، ڕۆژی ٨ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٧٩٣ سەری قرتێنرا ، کە پاش دوو ڕۆژ جان ماری‌ی مێردی پێی زانی ئەویش لە داخانا خۆی کوشت •

ماری کۆریش ئافرەتێکی ناسراوی ترە کە لەگەڵ زانا گەورەکانی جیهان ناو دەبرێت • دۆزینەوەی ڕادیۆم بەرهەمی بیری وردی ئەوو پیێری هاوسەری‌یە • بەو دۆزینەوەیەی ماری کۆری کە خەڵاتی بەرزی نۆبلی پێ وەرگرت ، هیوای نەهێشتنی نەخۆشی شێرپەنجە پەیدا بوو • ژیانی ڕۆژانەو کارە زانستی‌یەکانی ماری کۆری‌ی تا ئێستەش سەرنجی نووسەران ڕادەکێشن • زۆر نی‌یە فرانسواز جیرۆی نووسەری فەرەنسەیی کتێبێکی سەربەخۆی دەربارەی ئەو زانا پایە بڵندە بڵاوکردۆتەوە ، فرانسواز کتێبەکەی ناو ناوە « ئافرەتێك کە جێگەی ڕێزە » •

تاقی کردنەوەی ئەو وڵاتانەی هەموو مافێکی ئافرەتیان داوە لە هەموو شت زیاتر ئەو ڕاستی‌یە دەسەڵمێنن کە جیاوازی‌ی لە نێوان نێرینەو مێینەدا نی‌یە • هەر بۆ نمونە چەند ژمارەیەکی کەم لەم بارەیەوە دەخەینە بەر چاو • لە یەکیەتی سۆڤێت هەموو دەرگایەک

لە کێڵگەکانەوە تا ئاسمان گەڕیی ، بۆ ئافرەت خراوەتە سەر گازی پشت ، ئەمەش ئەنجامی ڕاستەو خۆی ئەوکارەیە :

ساڵی ١٩٢٨ ژمارەی ئەو ئافرەتانـەی لە یەکیـەتی سـۆڤێت کاریان دەکرد خۆی دەدا لە ٨ر٢ ملیۆن کەس ، ساڵی ١٩٧٠ ئەو ژمارەیە گەیشتە نزیکەی ٤٦ ملیۆن کەس • لە شورەوی لە ٥١٪ی کـرێکـارو فەرمانبـەرو لە ٥٤٪ی ئـەوانەی لـە کۆڵخۆزەکاندا بە کشتوکاڵ یا پەروەردەی ئاژەڵەو خەریـکن ئافرەتن • دیسان هەر لـەوێ لە ٤٧٪ی ئەوانـەی بە کـاری زانسـتی‌یەوە خـەریکن‌و لـە ٧٢٪ی مامۆسـتاو لە ٣١٪ی ئەندازیارو لە ٧٢٪ی پزیشك ئافرەتن • لە ساڵەکانی شـەڕی دووەمی جیهاندا پتر لە ملیۆنێك ئافـرەت چەکیان هەڵگـرت‌و دژی داگیرکەرە نازی‌یەکان چوونە ناوجەرگـەی شـەڕەوەو ژمارەیەکی زۆر قوربانی‌یان داو گەلێکیان لە پێناوی نیشتماندا چوونە سەر پای قەنارە •

ئەمانەو گەلێك شتی تری وەك ئەمانە بەڵگەی ئەوەن کە مێینە هیچی لە نێرینە کەمتر نی‌یە • لە ڕاستیشدا تا ئیمڕۆ هیچ بیرێك وەك سۆشیالیزمیو بە ڕادەی ئەو یەکسان سەیری ئافرەتی نەکردووە •

## بیری سۆشیالیزم‌و ئافرەت

ئەفلاتۆن‌و ئافرەت • ئافرەت لای ئیبن
روشد • ڕێنیسانس • تۆماس مۆرو
کامپانیللاو فۆرێی‌و بیبێل‌و ئافرەت •
جـان دۆروان‌و پرودۆن • ڕۆژی ٨ی
مارت •

دەبوو باری قورسی ژیانی ئافـرەت لـە زووەوە ســـەرنجی نووسەرو فەیلەسوفە گەورەکانی جیهان ڕابکێشێت ، تایبەت ئەوانەیان کە دڵسۆزانە بـە دوای چارەســەر کـردنی کێشـەکانی کۆمەڵـدا دەگەڕان • ئەوانەی لە میسری کۆن دەمردن پارچـەیەك کاغـەزی بەردی‌یان لەگەڵ دەناشتن کە ئەمەی تێدا نووسرابوو :

« کەسم نەکوشتووە ، فرمێسکی کەسـم نەڕشـتووە ، داوێن پیسیم نەکردووە ، ئازاری بێوەژنم نـەداوە ، شـیرم لە دەمی کۆرپە نەفڕاندووە ••• کەواتە گەورەکان ڕێگە بە مـردوو بدەن بێتە خزمەتتان » •

فەیلەسوفی گەورەی یۆنان‌و جیهان ئەفلاتۆن بەر لە نزیـکەی ٢٣٠٠ ساڵ دەیگوت هیچ جیاوازی‌یەك لـە نێوان نێرینەو مێیینـەدا نی‌یە،گەر هەشبێت جۆرە نەك ڕادە،واتە لەوانەیە ڕادەی زیرەکی‌ی پیاوێك لە ئافرەتێك یا لـە پیاوێـکی تر زۆرتربێـت،هەروەك‌چـۆن دەشێت ڕادەی زیرەکی‌ی ئافرەتێك لە پیاوێك یا لە ئافرەتێـکی تر زۆرتر بێت • لەبەر ئەوە ئەفلاتۆن دەیگـوت رژێمی ســەرکەوتوو

دەبێت بێ هیچ جۆرە جیاوازی‌یەك كاروباری میری‌و گشت كارێكی تر بە ئافرەت‌و پیاو بسپێرێت‌و وەك یەك بۆ هەموو ئەرك‌و فەرمانێك ڕایانبهێنێت • تەنها ئەوەندەیە بە لای ئەفلاتۆنەوە ئەو ئافرەتانەی كاریان پێ دەسپێردرێت دەبێت بە دەستوری پیاو لە چین‌و توێژەكانی سەرەوەی كۆمەڵ بن •

فەیلەسوفی گەورەی عەرەب‌و ئیسلام ئیبن روشد (١١٢٦ـ١١٩٨) تا ڕادەیەك ئاوا بوونی خۆری شارستانەتی ئیسلامی بەو بارە قورسەوە دەبەستەوە كە ئافرەتی تێكەوتبوو •

لە سەردەمی ڕێنیسان (نهضە)دا كە ڕوناكبیرانی ئەورووپا ویستیان ئادەمیزاد لە كۆت‌و زنجیری سەدە ناوەنجی‌یەكان ڕزگار بكەن‌و شوێنی شیاوی خۆی لە كۆمەڵدا بدەنێ ئافرەتیش وەك نیوەی مرۆف سەرنجی ڕاكێشاو سەنگی لە جاران زیاتر بوو • لای دانتی‌ی یەكەم نووسەری سەردەمی ڕێنیسانس پاتریس پۆرتینـاری وەك ئافرەتێك هیچی لە ڤێرجیلی نووسەرو شاعیری گەورەی ڕۆمانی‌ی كۆن كەمتر نەبوو • ئەنتۆنیۆ ئیڤانۆی روناكبیری ئیتالیایی سەردەمی ڕێنیسانس لە ناوەندی سەدەی پازدەدا ، واتە پتر لە ٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر دەربارەی ئافرەت نووسیویە دەڵێت :

« ڕاست نی‌یە ئافرەت وەك دابەستە بیەسترێتەوە ، لە ژیان دوور بخرێتەوە تا وای لێ دێت وەك ئەوانەی ساڵەهای ساڵ لە بەندیخانەدا دەمێننەوە بە هەموو شتێك سەرسام بێت » •

ڕوناکبیرێکی ئیتالیایی تری هەر ئەو سەردەمە بە ناوی جیللی‌یەوە دەیگوت نیوەی کۆمەڵ کە پیاوە دەبێت دان بە تاوانی گەورەی خۆیدا بنێت‌و لێی پەشیمان بێتەوە ، چونکە پیاوان بە چاوی نۆکەرو کارەکەرو کەنیزەك سەیری ئافرەت دەکەن نەك وەك هاوڕێ ، ئەمەش ، وەك دەیگوت ، « کارێکە هیچ دڵەڵێك زات ناکات بیکات » •

زانای هەرە گەورەو مامۆستای هەموو دەزگا ئەکادیمی‌یەکانی ئەوروپای سەردەمی ڕێنیسانس ئێرازموس(١٤٦٦ـ١٥٣٦) بە هەمان دەستوور سەرنجی بۆ ئەوە ڕادەکێشا چۆن هۆزو تیرە دواکەوتووەکانی ئەو سەردەمەی ئەمەریکای تازە دۆزراوە مێرد لەسەر جیابوونەوە سزا دەدەن نەك ژن •

لە سەردەمی ڕێنیسانسدا بۆ یەکەم جار لە مێژوودا بیروباوەڕی سۆشیالیزم سەری دەرهێنا • یەکەم کەس کە دەرکی ئەو ڕێبازەی کرد تۆماس مۆری زانای گەورەی ئینگلیز بوو •

تۆماس مۆر(١٤٧٨ـ١٥٣٥)لەبەر ئەوەی زیرەك‌و شارەزاو خاوێنی وەك خۆی کەم بوون بووە ئەندامی پەرلەمان‌و پاش ماوەیەك کرایە ڕاوێژکاری یەکەمی پاشای ئینگلتەرە • مۆر کە مامۆستایەکی بەهرەمەندو پارێزەرێکی سەرکەوتوو بوو قەت حەزی لە کاری میری نەدەکرد ، بەڵام پێی وابوو لەو ڕێگەوە دەتوانێت دەور لە چاك‌کردنی باری خراپی کۆمەڵدا ببینێت • کە ئەوە سەری نەگرت

جلەوی دایە دەست خەیاڵو بە نـوکی خـامەی ڕەنگینی دیمـەنی کۆمەڵێکی بۆ کێشاین کە لە وێنەی ئەبوو ، کۆمەڵێك کـە تۆماس مۆر دەیویسـت بێتە نمونەی ڕژێمی داهاتووی ژیانی ئادەمیزاد • مۆر ئـەو کۆمەڵەی ناو نـا «یۆتۆپیا» کـە لـە دوو وشـەی لاتینی پێکهاتووەو بە هەردوکیان مانای « ئەو شوێنەی نی‌یە » دەبەخشن •

لە «یۆتۆپیا» هیچ جۆرە جیاوازی‌یەك نەبوو ، هەموان یەکسان بوون ، وەك یەك کاریان دەکردو وەك یەك دەژیان • بە پێی یاسای هەمان کۆمەڵ هەرچی جیـاوازی بێ لە نێـوانی ئافرەتانو پیـاوانی «یۆتۆپیا»دا نەبوو • ئافرەت لە کێڵگەو کارگەو کارگێڕیو فێرگەو لەشکرو هەموو شوێنێکی تر وەك پیاو کاری دەکـرد • ئافرەتـانی «یۆتۆپیا» مافی ئەوەیان هەبوو تەنانەت بشبنە قەشـەو بەڕێوەبـەری کاروباری کڵێسەو پەرستگاکان • هیچ ئافرەتێکی یۆتۆپی خـۆی بە جل شتنو چێشت لێنانەوە خەریك ناکات چونـکە خۆشی بکـوژێت ناتوانێت نانی بەلەزەتی وەك چێشتخانە گشتی‌یەکان لێ بنێتو جلو بەرگ وەك ئەو دەزگایانە بشوات کە بۆ ئەو کارە تەرخاو کراون• ئاخۆ کام ئافرەت بێت حەز نەکات لەگەڵ هاوەڵەکانی بە دەم ئاوازی خۆشەوە لە کۆشکێکی ڕازاوەدا کاتی نان خواردن بەرێتە سەر •

ئافرەتانی «یۆتۆپیا» هەموو خوێنـدەواری تەواون ، کـاتی بێ کاری‌ی بە خوێندنەوە یا وەرزش یا لێدانی ساتوسەمتور دەبەنە سەر، گاڵتەیان بە زێڕو خشڵ دێت چونکە لای ئەوان کەلەبچەو ئاودەست لە زێر دروست دەکەن • هیچ کام لە ئافرەتانی «یۆتۆپیا» ئارایشـت

بەکار ناهێنن لەبەر ئەوەی جوانی سروشت لایان لە سەروو هەموو جوانییەکەوەیە ، جگە لەوەی بە لای پیاوانی «یۆتۆپیا»وە یەکەم جوانیی ڕەوشتەو دووەم جوانیی دەموچاو •

شایانی باسە تۆماس مۆر بە پێی توانا کچەکانی بە گیانی «یۆتۆپیا» گوش دەکرد بۆیەکا بوبونە نمونەو لە هەموو شوێن بەنجەی ڕێزیان بۆ ڕادەکێشرا • وا دیارە شارەزاییو زانیاریی ئەوکچانە سنووری نەبووە ، هەر لەبەر ئەوەش بوونە سەرچاوەی گرنگی ڕوون کردنەوەی ژینامەو بەسەرهاتی باوکیان •

دیارە تۆماس مۆری گەورە کە لە هەموو شتێکدا وەك سەرنجی بۆ ئافرەت بەرز بوو ، بۆ کۆمەڵی دواکەوتووی ئەوسای ئینگیلتەرە دەستی نەئەدا • ڕۆژی ٦ی تەمموزی ساڵی ١٥٣٥ لە یەکێك لە بەندیخانە تاریکەکانی لەندەنی پایتەخت سەری پەڕێنرا •

دوای تۆماس مۆر بە دەوروبەری نیو سەدە تۆمازۆ کامپانێللای ئیتالیایی (١٥٦٨ــ١٦٣٩) لە «شاری ڕۆژ»دا چمکێکی کردە سەر مافەکانی ئافرەتانی «یۆتۆپیا» بەوەی سەعاتی کاری ڕۆژانەی بۆ ئەوانو پیاوان کردە چوار لە بریتی شەشو سەرتاپای ئەرکی پەروەردەو بەخێوکردنی منداڵی خستە ئەستۆی دەوڵەت •

سەدەی هەژدەو نۆزدە بیری «سۆشیالیزمی یۆتۆپی»(١)

(١) ئەو ڕێبازی سۆشیالیزمی‌یەی زۆر زەحمەتە لەگەڵ ژیاندا بگونجێت بە ناوی کتێبەکەی تۆماس مۆرەوە ناو نراوە « سۆشیالیزمی یۆتۆپی » •

زۆر پەرەی سەند • گشت سۆشیالیستە یۆتۆپی‌یەکانی ئەو سەردەمەش ، تەنها پرودۆن نەبێت ، دانیان بە هەموو مافێکی ئافرەتدا ناوەو لە هیچ ڕوویەکەوە لە پیاویان جیا نەکردۆتەوە • باری ژیانی ئافرەت لای شارل فۆرێێ (١٧٧٢-١٨٣٧) پێوانەی ڕاستەقینەی ئازادی‌ی کۆمەڵە • فۆرێێ دەیگوت هیچ کۆمەڵگایەکی ئەم جیهانە نە ئیمڕۆو نە سبەینێ مافی نی‌یە بڵێت ئازادم تا ئافرەتەکانی لە هەموو ڕوویەکەوە ئازاد نەبن ، دادو دادپەروەری بێ باڵو گیان دەمێننەوە تا سەرتاپای مافەکانی ئافرەت دەدرێن •

ساڵی ١٨٧٩ روناکبیری ئەڵەمانی‌ی ناودار ئۆگۆست بێبێل کتێبێکی بە ناوی « ئافرەتو سۆشیالیزم »ەوە بڵاو کردەوە کە تێیدا باسی ژیانی پڕ ئەندیشەی ئافرەتانی وڵاتە سەرمایەداری‌یەکان دەکاتو بە گەرمی شۆڕشگێڕان هان دەدات پشتگیری‌ی لە مەسەلەی ڕزگاری‌ی ئافرەت بکەنو داوا لەمانیش دەکات ڕیزەکانیان ڕێك بخەنو بچنە ناو کۆڕی خەباتەوە بۆ جێ بەجێ کردنی مافەکانیان• لە هەمان کتێبدا بێبێل زۆر بە توندی بەرپەچی ڕاکانی پرودۆن سەبارەت بە ئافرەت دەداتەوە •

بیری سۆشیالیزم کاری کردە سەر ژمارەیەك ئافرەتی چالاك • یەکێك لەوانە جان دۆروانی فەرەنسەیی بوو کە ئافرەتێکی قسەزانو لێهاتوو بوو ، لە هەر کۆڕێکی سیاسی بۆی بلوایە مەسەلەی ئافرەتی دەهێنایە پێشەوە • دۆروان زۆر چاك دەیزانی یاسای

ولاتەکەی ڕێگەی ئافرەت نادات خۆی بۆ پەرلەمان بپاڵێوێت ، ئینجا لەگەڵ ئەوەش لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٨٤٩دا خۆی پاڵاوت تەنها بەو نیازەی بە ناوی پرۆپاگەندەوە خەڵك لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو باسی بێ مافی ئافرەتیان بۆ بکات .

بەڵام هیچی نابێت بەو قسانەی بە پرودۆنی وتن . وەك وتمان پێشتر جوزێف پرودۆنی فەرەنسەیی (١٨٠٩-١٨٦٥) تاکە سۆشیالیستی سەدەی نۆزدە بوو کە لەو باوەڕەدا بوو ئافرەت تەنها بۆ ناو ماڵ دروست بووە . پرۆدۆن لەم بارەیەوە قسەی قۆڕی زۆر کردووە ، بەڵام جارێکیان جان دۆروان لە قافدا باش دەیگرێت کە بە تەوسەوە پێی دەڵێت :

« ئەرێ جەناب زەحمەت نەبێ پێم ناڵێیت کام پارچەی لەشتە تۆی کردۆتە یاسادانەر »

لە وەڵامدا جەنابی پرودۆن ڕەنگی سوور سوور وەك گۆمی خوێن هەڵگەڕاو هیچی تر !

بەرە بەرە ئافرەتانی ئەم ڕێبازە تێکەڵ بە خەباتی شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵانی خەڵك بوون . ساڵی ١٨٧١ ئافرەتانی فەرەنسە دەوری باشیان لە پاراستنی « کۆمۆنەی پاریس »دا بینی . نزیکەی ١٠ هەزاریان لە پایتەخت ئازایانە هاتنە مەیدانەوە بۆ بەرگری لە کۆمۆنە بەرامبەر هێرشی دوژمن . ئەو ڕۆژانە « یەکیەتی ئافرەتان بۆ پاراستنی پاریس و چاودێری بریندارن » دامەزرا . ژمارەیەک لەو ئافرەتانە لە شەڕی شەقامەکانی پاریسدا کوژران .

زۆری نەبرد کرێکاری ئافرەتی ئینگیلتەرەو فەرەنسەو ئەڵەمانیا ڕێکخراوی تایبەتی‌یان بۆ خۆیان دامەزراند • ساڵی ١٨٩١ کرێکاری ئافرەتی ئەڵەمانیا کەوتنە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی ( Gleichheit ) ( گلایخایت ـ یەکسانی‌ی ) کە کلارا تسێتکین (١٨٥٧-١٩٣٣) بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ لەسەر یەك سەرنووسەری بوو •

هەنگاوی داهاتووی گەورە لە سەرجەمی بزوتنەوەی ئافرەتاندا بەستنی یەکەم کۆنگرەی جیهانی‌ی ئافرەتە سۆشیالیستەکان بوو لە شتوتگارتی ئەڵەمانیا ساڵی ١٩٠٧ • کۆنگرەی شتوتگارت دەستەی سکرتێرانی ئافرەتانی جیهانی بە سەرۆکایەتی کلارا تسێتکین دامەزراندو ڕۆژنامەی «گلایخایت»ی کردە ئۆرگانی • لە کۆتاییدا بەشدارانی کۆنگرە بەیانێکیان بڵاو کردەوە کە تێیدا داوای خەباتیان دەکرد بۆ یەکسانی‌ی مافی ئافرەتو پیاو لە هەڵبژاردندا • ١١ ئەندامی کۆنگرە دژو ٤٧یان لایەنگری ئەم بڕیارە بوون •

دووەم کۆنگری ئافرەتانی جیهان ساڵی ١٩١٠ لە کۆپنهاگنی پایتەختی دانیمارك بەسترا • نوێنەرانی ئافرەتانی حەڤدە وڵات لەم کۆنگرەیەدا بەشدار بوون • یەکێك لە بڕیارە گرنگەکانی کۆنگرەی کۆپنهاگن دانانی ٨ی مارت بوو بە ڕۆژی ئافرەتانی جیهان کە کلارا تسێتکین پێشنیاری کرد • تا ساڵی ١٩١٤ ئافرەتانی هەر وڵاتە لە یەکێك لە ڕۆژانی مارتدا یادی ڕۆژی ئافرەتیان دەکردەوە ، بەڵام ئەو ساڵە وا ڕێك کەوت ئافرەتانی نەمسەو هۆڵەندەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو هەنگاریاو ڕوسیاو ئەڵەمانیاو سویسرەو

چەند وڵاتێکی تر پێکەوە ٨ی مارت یادی ئەو ڕۆژەیان کـردەوە ، لەوساوە ٨ی مارت بە تەواوەتی وەك ڕۆژی ئافرەتانی جیهان جێگەی خۆی گـرت •

ڕۆژی ٨ی مارت بزوتنەوەی ئافرەتانی زیاتر بۆ پێشەوە برد• لەوساوە هەموو ساڵێك زوربەی ئافرەتانی جیهان ڕۆژی ٨ی مارت بە شێوەیەکی سەرنـج ڕاکێـش دەکـەونە خۆو دروشـمەکانیـان بڵاودەکەنەوەو کاری ساڵانەیان لە کۆڕی خەباتدا هەڵدەسـەنگێنن • یەکێك لە یادەکانی ٨ی مارت ئاگری شۆڕشێکی گەورەی لە ڕووسیا هەڵگیرساند • ئافرەتانی پیترۆگرادی پایتەخەت ٨ی مارتی ســاڵی ١٩١٧ خۆنیشاندانێکی گەورەیان دژی شەڕو ڕژێمی چارو برسێتی کرد ، لەو ڕۆژەوە جەماوەری پیتـرۆگرادو شارە گەورەکـان وا خرۆشان تا لە ماوەیەکی کەمدا تەختوتاراجی نیکۆلایان تێکومەکان نەدا دەستیان هەڵنەگرت •

هەموو ئەو ڕاستییانەی تا ئێستە باسمان کردن نیشانی دەدەن چۆن ئافرەت ڕێگەیەکی سەختی بڕی تا هاتە پێشەوەو بووە هێزێکی بزوێنەری دیاری کۆمەڵ • ڕاستە ئافرەت گەیشتووە بە گەلێك مافو جێگەی شیاو ، بەڵام تا ئێمرۆش بە هەموو پلەیەك نەگەیشتووە •

## ئافرەتی ئیمڕۆ

خەباتی نوێی ئافرەتان · کێشەی تری ئافرەت · جیابوونەوە لە یەکیەتی سۆڤێت · کۆمەڵەی دوور خستنەوەی پیاو · ڕۆژنامەی دانو نینۆك ·

بەسەرهاتەکانی شەڕی یەکەمی جیهان کۆسپی زۆریان هێنایە ڕێگەی بزوتنەوەی ئافرەتان کە لەگەڵ تەواو بوونی ئەو شەڕەدا دیسان تێهەڵچوونەوە · دوای شەڕ ژمارەیەك ڕێکخراوی تری ئافرەتان دروست بوو، وەك «یەکیەتی فێدرالی ئافرەتە زانکۆیی‌یەکانی جیهان» ( ساڵی ١٩١٩ دامەزرا )و « دەرگای کراوەی ئومەمی‌یەت بۆ ئازادکردنی ئابووریی کرێکاری ئافرەت» (ساڵی ١٩٢٩ دامەزرا)و «یەکیەتی فێدرالی ئەو ئافرەتانەی بە کاری سەربەستەوە (١) خەریکن» (ساڵی ١٩٣٠ دامەزرا) · هەمان کات بزوتنەوەی ئافرەتان لە زۆر وڵاتی تردا سەری دەرهێنا ، وەك میسرو لوبنانو تورکیاو چینو ئێرانو ژمارەیەك وڵاتی ئەمەریکای لاتینی ·

لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە ئافرەتان کەوتنە بایەخ دان بەو مەسەلە گەورانەش کە بەر لەوە بە کاری پیاو دادەنران ، وەك مەسەلەی ئاشتی · بە وێنە ئابی ١٩٣٤ دەوروبەری ١١٠٠ نوێنەری ئافرەتانی دەیان وڵات ( وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، فەرەنسە ، ئینگیلتەرە ، یەکیەتی سۆڤێت ، سویسرە ، ئیسپانیا ، بەلجیکاو ئەڵێك

(١) مەبەست ئەو کارانەیە کە سەر بە میریی نین ·

ولاتی تر ) له پاریس کۆنگرەیەکی گەورەیان دژی شەڕو فاشیزم بەست•دوای نزیکەی چوار ساڵ ئافرەتانی جیهان بە هەمان دەستوور کۆنگرەیەکی تریان لە مارسێلیا بەست •

شەڕی دووەمی جیهان بە ملیۆن کچی هەتیوو ژنی بێوەژن کرد ، دەیان هەزار ئافرەتی زەردو سوور بوونە خۆراکی ئاگری شەڕ • دیارە دوای ئەو شەڕە سامناکە دەبوو بزوتنەوەی ئافرەتانیش وەك هەموو دیاردەکانی تری کۆمەڵ هەنگاوی نوێ بەرەو پێشەوە بنێت • کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ « یەکیەتی دیموکراسیی ئافرەتانی جیهان » دامەزرا کە سەرەتا ئافرەتانی ٣٩ ولات تێیدا بەشدار بوون • چ ئەم یەکیەتی‌یەو چ زوربەی ڕێکخراوەکانی تری ئافرەتانی جیهان بایەخ دەدەن بە مەسەلە گرنگەکانی ژیانی ئیمڕۆی ئادەمیزاد ، وەك مەسەلەی ئاشتیو ئازادیی گەلانو خەبات دژی برسێتیو چەوساندنەوەی نەتەوەییو ئەو جۆرو بابەتانە •

شایانی باسە دەمێك ساڵە ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان بایەخ دەدات بە بزوتنەوەی ئافرەتانو داواکانی • ساڵی ١٩٦٩ ، بە وێنە ، ئەنجومەنی ناوبراو لەسەر داوای ئافرەتانی جیهان بڕیاری نەهێشتنی جیاوازکاریی ئافرەتی بلاوکردەوە •

لەگەڵ ئەوەش زۆر لایەنی کێشەی ئافرەت هێشتا چاوەڕوانی چارەسەر کردنن • لۆسیل مایەری سکرتێرەی گشتیی کۆنگرەی ئافرەتانی جیهان کە ساڵی ١٩٨٠ لە کۆپنهاگن گیرا ئاشکرا دانی

بەوەدا نا کە لەم ساڵانەی دوایدا شتێکی ئەوتۆ بۆ ئافرەت نەکراوە. لە ڕاستیشدا وایە ، تایبەت گەر سەیری جیهان بەسەر یەکەوە بکەین.زۆر دوور نەڕۆین تا سەرەتای حەفتاکان نزیکەی لە ٨٥٪ی ئافرەتانی ئەفەریقا نەخوێندەوار بوون . ئیستەش جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ لەو بارەیەوە نی‌یە ، هەرچەندە پێمان ناوەتە کۆتای سەدەی بیستەم .

بەشێکی زۆر لە ئافرەتانی جیهان دەزانن بنووسن‌و بخوێننەوە، بەڵام کەمیان خوێندەوارن . ڕەنگبێ لە هەزارا یەکی ئافرەتە هەرە خوێندەوارەکانی ئەو وڵاتانەی پێ‌یان دەڵێن جیهانی سێیەم ڕۆژی چاو بە ڕۆژنامەیەکدا نەخشێنن ، یا ساڵی کتێبێك نەخوێندنەوە . ئەو جۆرە خوشکانە بە ڕووکەش گەیشتوونەتە لقە پۆپەی پێشکەوتن ، بەڵام لە ناوەرۆکدا جیاوازی‌یەکی ئەوتۆیان لەگەڵ داپیرەگەورەیاندا نی‌یە . زوربەیان ناوی هەموو بۆنە خۆشەکانی کارگە ناودارەکانی فەرەنسەیان لەبەرە ، هەرچەندە قورسیشن ، بەڵام کەسیان ناوی دوو بەرهەمی هیچ نووسەرێکی گەورە نازانن ، هەرچەندە سوکیشن .

پاشماوەی ئەو جۆرە ئافرەتانە بوونەتە بار بە سەر شانی وڵاتە سۆشیالیستەکانەوە کە ئەوانیش گیرۆدەی گەلێك کێشەی ئافرەتن، وەك کەمی‌ی یا ڕادە نزمی‌ی باخچەی ساوایان . ڕاستە جیابوونەوە لە یەکێتی سۆڤێت لە هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکان کەمترە ، بەڵام تەنانەت لەوێش نیسبەتی ئەو جیابوونەوەیە ساڵ بە ساڵ بەرز

دەبێتەوە • ساڵی ١٩٦٠ جیابوونەوە لە هەزاردا ٣ر١ بوو ، ساڵی ١٩٦٥ بووە ٦ر١و ساڵی ١٩٧٠ بووە ٦ر٢و دوای سێ ساڵ گەیشتە ٨ر٢ •

لە وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانی جیهان ، وەك دیمان ، هێشتا ئافرەت بە تەواوەتیو لە هەموو ڕوویەکەوە یەکسان نی‌یە • بێزاری‌ی ئافرەتانی جیهان ئیمڕۆ لە زۆر شتدا خۆ دەنوێنێت • لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانی ڕۆژئاوا هەر دەستە ئافرەتی وەڕسن‌و ڕێکخراوی تایبەتی‌ی بۆ خۆیان دادەمزرێنن • لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا تەنها لە فەرەنسەو ئیتالیاو ئینگیلتەرە نزیکەی ٥٠ ڕێکخراوی ئافرەتانی لەو بابەتە دامەزرێنران •

هەر لەو جۆرە وڵاتانە ئافرەتی وا پەیدا بوون کە بە هیچ جۆر چارەی پیاویان ناوێت • ژمارەیەك لە ئافرەتانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕێکخراوێکیان دامەزراندووە ناوی « کومەڵەی دوور خستنەوەی پیاوە »• دەستەیەك لە هاوبیرانی ئەو ئافرەتانە دیسان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا « کۆمەڵەی جیهانی‌ی ستەمی ئافرەتانی دۆزەخ »یان دامەزراندووە •

بەخشەو نووسراوی ئەو ڕێکخراوانەش زۆر دەگەیێنن • «دان‌و نینۆك» ناوی یەکێکە لەو ڕۆژنامانەی ئافرەتانی ئەمەریکا بڵاویان دەکەنەوە • «ئافرەتی شەڕانی»ش ناوی یەکێکە لەو بەخشانەی خوشکەکانیان لە ئینگیلتەرە چاپیان دەکەن •

ئەگەر بێ مافیی ئافرەتی کورد لایەنێکی باشی تێدا بێت ئەوەیە کە شکور دەستی ناگاتە « دان‌و نینۆك » و «ئافرەتی شەڕانی»و ئەو جۆرە دەنگانەی وا گڕ بوون نووزەی ئاوازی ناسکی ئافرەتیان تێدا نەمـــاوە ٠

## ئافرەتی کورد

ئـــافرەتی کـــورد لای گەڕیـــدە ئەوروپایی‌یەکان ٠ ئاواتی حاجی قادرو مەلای گەورەو گۆران‌و بێکەس‌و قانیع‌و هێمـــن ٠ زمـــانی خەســو ٠ کچـی خوێندەواری هەولـێرو سلێمـانی ٠ حەپســە خـــان‌و مینا خـــان ٠ کچانی زانکۆی بەغدا ٠

گەڕیدە ئەوروپایی‌یەکان گەلێکیان بە شان‌و باهـــووی ئافرەتی کوردا هەڵداوە ، بە ڕادەیەك جارو بار خۆمانمان لە بیر دەچێتەوە ٠ وابزانم ئەو گەڕیدانە بێ نیازی خراپ کەمێك زۆر ڕۆیشتون ، وا دیارە کە لە کۆڵانە تەسکەکانی شارە داخـــراوەکانی ڕۆژهـەڵاتەوە هاتوونە ناو شاخ‌و داخە کراوەکانی کوردستانەوە کەمێك سەریان لێ تێکچووە بۆیەکا ئافرەتانی کوردیان لە ئافرەتانی دەوروبەریان باشتر هاتوونەتە بەر چـــاو ٠

ڕاستە ئافرەتی کورد بێ خاوس نی‌یە ، بەڵام ئافرەتانی هەموو ناوچە شاخاوی‌یەکانی جیهان هیچ کاتێك هیچ کامیان بێ‌خاوس نەبوون

چونکه نه سەرماو سۆڵەی زستان‌و نە تەڵزمی بـەردی شاخەکان ڕێگەی پێ خاوسی‌ی نادەن • هەر ئافرەتێکی دەشتەکانی هندستان بهێنیتە نـاو شاخـەکانی کوردسـتان دەبێـت نان لـە دەمی خۆی‌و زاڕۆڵەکانی بگرێتەوە تا پارەی جوتێك پێڵاو بۆ خـۆی‌و بۆ ئـەوان پاشەکەوت دەکات •

بە هەمان دەستوور ئافرەتی لادێی کورد کەمێـك لە ئافرەتی لادێیی چەند شوێنێکی تر پۆشتەترن ، حەزیان لە ئاڵ‌و والآ زۆرە، جل‌و بەرگیان دڵ دەکاتەوە ، بەڵام ئەمیشیان بەرهەمی سـروشتە ، ئەو ئافرەتە چاوی بە سەوزایی‌و شینایی‌و گوڵاڵەسوورەی دڵفرێن کردۆتـەوەو هەمیشـە ئەو ڕەنگـانە دڵ‌و هەسـتیان بزواندووە • خۆ ئەگەر تەواو پۆشتەش نەبێـت ئەوا بەرگـەی بەفرانبارێك ناگرێـت •

دیسان ڕاستە ئافرەتی لادێیی کورد عەباو پەچەی نەزانیوە ، بەڵام هەر ئەوەمان مابوو ئەو ئافرەتانە بە عەباو پەچەوە بە ناو دڕك‌و داڵی نـاو کەندەڵان‌و چـڕە داری لێـڕان‌و لێشـاوی ئـاوی نـاو گەلی‌یەکاندا مەشکەو هەمانەی پڕ بگوێزنەوە • هـەر ئافـرەتێکی عەجەم ڕێی بکەوتایە کوردستان دەبوو بەر لەوەی دەسـت بۆ هیچ بەرێت عەباو پەچەکەی فڕێ بدات • بڕواننە سەیرانە تێکەڵـەکانی ئیمڕۆش دەبینن باجی ڕەعناو باجی مرووەت وەك کنێرو وەك ڤیان بێ عەباو پەچە هاتوچۆ دەکەن •

مەبەستم لەم قسانە ئەوەیە بڵێم ئافرەتی کورد نە هیچی لە کەس زیاترەو نە هیچیشی لە کەس کەمترە • کەی ، بێکەسەو وتەنی ، « گیرۆدەی دەستی زوڵم » بوو ئەوساکە وەك هەموو دەستە خوشکێکی گیرۆدەی تری دواکەوتوو دەبێتو شەقڵی ئەو دواکەوتنەی پێوە دیار دەبێت • وابزانم لەگەڵمان گەر بڵێم پێویستە کورد لە هەموو کەس زیاتر لە داڵغەی ڕۆمانسییەوە بەدوور بێت•

ئافرەتی کورد ، وەك هەموو ئافرەتانی جیهان ، بە درێژایی مێژوو گیرۆدەی بێ مافیو زۆرو ستەمی کۆمەڵ بووە • ژمارەیەك لە دابو نەریتە هەرە ناشرینە دەستکردەکانی ژیان ڕەگو ڕیشەیان لە ناوماندا داکوتاوە • لە لادێکان هێشتا ژن بە ژنو شیربایی هەر ماون • تەنانەت لە شارەکانیش دەگمەن کچمان بە ئارەزووی خۆی شوو دەکات • مارەییو پەڵپو نازونوزی ماڵە کچ بوونەتە کۆسپێکی گەورە لەبەر دەم ژن خواستندا ، قانیع حەقییە « مارە بڕینی » ناو ناوە « بە پارە کڕین » • تا دوێنێ هەبوون شانازییان دەکرد کە تەنە لۆکە بەشێك لە نیشانەی ماڵە زاوا بوو ، هەشبوون هەر بۆ ئەوە لیك بە لالغاوەیاندا دەهاتە خواریێ ، نەیاندەزانی چۆن بۆڕی ئەو «بیرتیژانە» بدەن کە لۆکەیان کردە دیاریی دەستیان •

پێوەندیی نێوان بوكو خەسوی ئیمڕۆمان جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ڕابوردوماندا نییە ، جاری وا هەیە خراپتریش بووە،بەڵگەش ئەو وشە نوێیەی ناو زمانی کوردییە کە بوکەکانمان ڕێكو پێك بۆیان داتا شیوین بەوەی «صبار»ی دڕك ژەهراویی

عەرەبی‌یان کـــردۆتە ... ( زمـانی خەســو ) . بڕوا ناکەم پرۆفیسۆرەکانی زمان‌و ئەدەبی کوردی قەت بۆ زاراوێکی وا لەپار بچـونایە !

نەخوێندەواری‌ی باڵی ڕەشی بە سەر زوربەی هـەرە زۆری ئافرەتانی کوردستاندا کێشاوە.ئەم نمونەیە لە ڕابوردووی نزیکمان دێنمەوە :

ساڵی ١٩٥٢ لە هەموو پارێزگای هەولێر تەنها ٧٥٩و لە هەموو پارێزگای سلێمانی تەنها ١١٣٢ کچ دەچوونە قوتابخانەی سەرەتایی. ئەوانەی هەولێر هەموو بەسەر یەکەوە ٣٩و ئەوانەی سلێمانیش ٤٩ مامۆستای ئافرەت دەرســیان پێ دەگوتنـەوە . هەر ئەو ســاڵە لـە پارێزگای هەولێر ١٣١٢٨٨ ئافرەتی نیشتەجێ هەبوون ، ژمـارەی ئەوانەیان کە لە پێنج ساڵان زیاترو نەخوێندەوار بوون گەیشـتبووە ١٠٧٩٤٠ کەس . هەمان ساڵ ژمارەی ئافرەتانی پارێـزگای سلێمانی بێ کۆچەرەکانی خۆی دەدا لە ١٢٤٦٣٣کەس ، ژمارەی ئەوانەیان کە لە پێنج ساڵان زیاترو نەخوێندەوار بوون گەیشتبووە ١٠١٨٨٦ کەس . لەبەر ئەوە هیـــچ ســەیر نی‌یە هـەر ئەو دەوروبـەرە لـە پارێزگای هەولێر لە ٨٢٤ منداڵی تازە لـە دایك بوو لـە ســاڵێکدا ٥٢٢یان‌و لە سلێمانی لە ٥٢٣ منداڵی تازە لـە دایك بوو ٣٦١یان بـە خاك سپێردران .

نامەوێت زیاتر دڵگیرتان بکەم بۆیەکا لـەو ژمارە زۆرانـەی

دەربارەی پێش پەنجاکان کۆم کردوونەوە هیچتان بۆ ناهێنمەوە •

بە داخەوە تا ئیمڕۆش ڕووناکبیرانی کورد ، دەستەیەك شاعیریان نەبێت ، وەك پێویستە هەستیان بەم کە لێنە گەورەیەی ژیانی گەلەکەیان نەکردووە ، گەر نەگەڕابینە دواوە هیچ نەچوینەتە پێشەوە • «کوردستان»ی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیی کۆتای سەدەی ڕابوردوو چەند جارێك لەو شوێنانەیدا کە بە ناوی ئاینەوە کوردی بۆ خوێندن هان داوە ئافرەت و پیاوی تێکەڵ کردووە ، کەچی دوای نزیکەی نیو سەدە کون و قوژبنی ژمارەی ساڵێکی گۆڤارێکی وەك «هاوار» دەبشکنیت بێ ئەوەی هاوارێکی بۆ ئافرەتی کورد تێدا بدۆزیتەوە •

لەم مەیدانەدا ، وەك زۆر مەیدانی تری ژیانی ڕووناکبیریمان، شاعیران بۆڕی ئەوانی تریان داوە (١)• «نێرو مێ» لای حاجی قادری کۆیی فەرقیان نەبوو • مەلای گەورە چەند جارێك لە شیعرەکانیدا بە وردی هاتۆتە سەر باسی ئافرەتی کورد ، بۆ چاکە هانی داون و بە توندی ڕەخنەی لەو داب و نەریتانە گرتووە کە ئافرەت گیرۆدەیانن • مەلای گەورە وەك باوکێکی دووربین بەر لە هەموان لە کۆیە کچەکانی خۆی خستە بەر خوێندن • بێکەسیش بە گەرمی ئافرەتی کوردی بۆ تێکۆشان و سەرپۆش فڕێدان هان

---

(١) دەربارەی ئەم باسە بڕوانە : محەمەدی مەلا کەریم ، خەباتی شیعری کوردی لە پێناوی ئازادیی ئافرەتاندا ، ـ « بەیان » ، بەغدا ، حوزەیرانی ١٩٧٥ ، ل ٢ ـ ١٥ •

دەدا • لە چلەکاندا « نەسرین دەمێکە »ی بێکەس ببووە سروودێکی نیشتمانیی ئازادیخوازانی کورد ( دەوروبەری ناوەندی ساڵی ١٩٤٤ کاك شەوکەت محەمەد ئاوازێکی ناسکی بۆ دانا ) • « قەڵشی کوڵمی سووتاوی کچی لادێ »و ڕەنجەڕۆیی « کیژی شێخو کیژی حاجیو کیژی ئاغا » سەرنجی هێمنی موکریانیی‌یان ڕاکێشا • گۆران « توندو تیژترین دەنگی بێزاریی لە باری پڕ جەورو ستەمو دواکەوتووی ژیانی کوردەوە » دەربڕیوە •

کەسمان نی‌یە نەزانێت کە ئافرەتی کورد بەش بە حاڵی خۆی لە کۆڕی خەباتدا درێغیی نەکردووە • لێرەدا تەنها چەند ڕاستی‌یەکی کەم زانراو یا نەزانراو دەخەمە بەر چاو •

حەپسە خانی نەقیب ئافرەتێکی لێ هاتوو بوو ، لە بیستو سی‌یەکاندا چەند جارێك نامەی تایبەتیی ناردووە بۆ بارەگای یەکیەتی نەتەوەکان لە جنێڤو تێیدا باسی ئەو جەورو ستەمە زۆرەی کردووە کە بە سەر کورد هاتوون • ئەو نامانە ئێستە بوونەتە بەڵگەی گرنگ بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی نوێی گەلەکەمان • مینا خانی هاوسەری قازی محەمەد نەمر لە ڕۆژگاری کۆماری مەهابادا جێگەی حەپسە خانی نەقیبی گرتبۆوە • وا دیارە خەریکی دامەزراندنی یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتان بووە •

لە سەردەمی پاشایەتیدا کچە کوردەکانی زانکۆی بەغدا ئازایانە لە خۆنیشاندانە نیشتمانی‌یەکانو ئاهەنگە نهێنی‌یەکانی

نەورۆزدا بەشدار دەبوون • ئـەم ناوانە بەشێکن لەوانەی بە چاوی خۆم دیومن‌و لە بیرمن : خوالێخۆشبووان ڕوناك زوهـدی‌و نەوزەر نوری ، نازەنین سالح قەفتان ، حۆری‌ی عەلی ئاگا ، درەخشانی عارف نەجیب ، شەوقی‌یە ئەحمەد ، درەخشـانی شـێخ جەلال ، زەکیێی عومەری سام ئاغا ، سورەیا محەمەد ، نەزیرە ڕەشید ، ناجی‌یە مستەفاو گوڵشەن ڕەواندوزی‌و ژمارەیەکی تر کە بە داخەوە نایەنەوە یادم •

هیوادارم باری ژیانی ئافرەتانی کوردو مێژووی بزوتنەوەیان زیاتر سەرنجی نووسەرانمان ڕابکێشن‌و گەلێك بەرهەمی تری وەك « ئافرەت لە چیرۆکی کوردی‌دا »ی کاك صەباحی غالب‌و « خەباتی شیعری کـوردی لە پێناوی ئازادی‌ی ئافرەتاندا »ی کاکە حەمـەو « ئافرەتی لادێی کورد »ی کاك بورهان قانیع بەشێك لە کەلێنەکانی کتێبخانەی کوردی‌ی بڕیکەنەوە •

× × ×

# پێڕست

ئافرەتی کورد

ئافرەتی کورد لای گەڕیدە ئەوروپایی یەکان • ئاواتی حاجی قادرو مەلای گەورەو گۆرانو بێکەسو قانیعو هێمن • زمانی خەسو • کچی خوێندەواری هەولێرو سلێمانی • حەپسە خانو مینا خان • کچانی زانکۆی بەغدا • ٧٤–٨٠

× × ×

## سەرنج

بە داخەوە ژمارەیەك هەڵەی چاپ کەوتوونەتە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەوە ، بە پێویستمان زانی سەرنج بۆ ئەمانەیان ڕاکێشین :

ل ١٧ : کۆتای پێنجەم دێڕ دەبێتە ( زەنگین ) نەبن •

ل ٣٠ : وشەی یتەو لە دێڕی چواردەمیندا دەبێتە پتەو •

ل ٣٣ : هەموو دێڕی دوازدەمین لادەبرێ و ئەمەی دەخرێتە جێ : دەوری ئافرەتانی فەرەنسە لە شۆڕشدا زۆر گەورە بوو ،

ل ٤٦ : یەکەم وشەی دوا دێڕ دەبێتە نزیکەی •

ل ٥٦ : وشەی ئەوروپادا لە یەکەم دێڕی دووەم پەرەگرافدا دەبێتە ئەوروپا ، ئیلیزبێثی چوارەم دێڕی هەمان پەرەگراف دەبێتە ئیلیزابێت •

ل ٦٤ : وشەی ئەبوو لە دووەم دێڕدا دەبێتە نەبوو ، وشەی تەرخاویش لە پازدەمین دێڕدا دەبێتە تەرخان •

## گلەیی‌و سوپاس

- لە دەستنووسی ئەم کتێبەدا چوکلە بۆ پیتی (ر)ی قەڵەو لە سەرەتاو ناوندو کۆتای وشەکاند دانراوە ، بەلاّم دوای چاپ زوربەی ئەو چوکلانە لە (ر)ی سەرەتای وشەدا نەماون . هەروەها لە گەلێك شوێندا نوقتەو وێرگولی نێوان ڕستەکان بە جیا چاپ نەکراون . ئۆباڵی هەردووکیان وان لە ئەستۆی تیپکارانی چاپخانەی « الحوادث »دا . لەگەڵ ئەوەشی دڵسۆزیی ئەوان نەبوایە ئەم بەرهەمە وا ڕێك‌و پێك نەدەکەوتە بەر دەستی خوێندەواران ، ئەوەی شایانی سوپاسی زۆرە .

- گەلێك سوپاس بۆ برای خۆشەویستم دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە بەشێك لە ئەرکی چاپ کردنی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆ .

---

لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا
ژمارە ( ١١٩٧ ) ساڵی ١٩٨١ی دراوەتێ

الدكتور كمال مظهر احمد

# المرأة في التاريخ

(بحث تاريخي – اجتماعي موجز)

ثمن ٤٠٠ فلس

بغداد – ١٩٨١
مطبعة الحوادث

# چینی کرێکارانی عێراق

## دروست بوون و سەرەتای بزووتنەوەی




دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد

فوئاد مەجید میسری

کردوویە بە کوردی



ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوان یارمەتی لە چاپدانی داوە

١٩٨٦

دكتور كەمال مەزهەر ئەحمەد

# چینی كرێكارانی عێراق
# دروست بوون وسەرەتای بزووتنەوەی

فوئاد مەجید میسری
كردوویە بە كوردیی
١٩٨٥

ئەمینداریێتی گشتیی رۆشنبیری ولاوان یارمەتی لە چاپدانی داوە

سوپاس بۆ:
* كاك عەلی بۆسكانی
* بەڕێوەبەرو كرێكارانی چاپخانەی «دار آفـاق عربيـة»، كە بـە هەوڵو كۆششی بێ ووچانیان نەیانهێشت ئەم بەرهەمە زیندەبەچاڵ ببێ.

## لە جیاتی پێشەکی

بۆ جاری دووەم شەرەفی بە کوردی کردنی بەرهەمێکی تری ناوازەی «دکتۆر کەمال»م بە نسیب بوو . مایەی خۆشحالیمە کە لەخەرمانی بەپیتی ئەو قەڵەمە بەبرشتە خەرمان لۆخی خۆمم بەرکەوت .

با هەژاریی و دەست کورتی ی کیتێبخانەی کوردی لەولاوە بووەستێ ، نای شارمەوە بایەخ و وگرنگی ی کیتێبی «چینی کرێکارانی عیراق» جارێکی تریش خستمییەوە سەر هەواو هەوەسی وەرگێران . ئەم کتێبە جگە لەوەی کە لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی زانستی یانەیەو بە خامەی رەنگینی زانایەکی کورد هاتووەتە بەرهەم ، بابەتێکی ئێجگار بەکەڵک سود بەخشەو زەمینەی سەرهەڵدانی چینێك شی دەکاتەوە کە نەك هەر لە وولاتی ئێمەدا، بەڵکو لە سەرانسەری دونیادا ، رۆڵی لە پێشخستن و گەشەپێدانی کومەڵگای مرۆڤایەتی دا بووەو هەیەو ئەرکی گۆرکردنی چەوساندنەوەو راماڵینی ستەم و دامەزراندنی سیستەمێکی پێ سپێردراوە ، مرۆڤ لە چەوساندنەوە قوتار دەکا . ئەمە جگەلەوەی کە تا ئێستا یەك دوو نامەی دکتۆراو ماجستێرو هەندێ نووسینی لاوەکی نەبێ، لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەکی تێروپڕ لە بارەی ئەم مەسەلە گرنگەوە نەنووسراوە. ئەوەیشی کە هەیە بە زمانی عەرەبی نووسراون و بلاوکراونەتەوەو ئەو رۆشنبیرە کوردانە نەبن کە مەبەستیانە لە بنج و بنەمای ئەو چینە تێ بگەن و شارەزای بین، خوێندەواری کورد بە گشتی ی شتێکی ئەوتۆ لەم بارەیەوە نازانێ، ئەمەیش بەلای منەوە ناتەواویەکی گەورەیەو دەبێ خوێنەری کورد خۆی پێ ی قایل نەبێ.

شێوەی پێکهاتنی چینی کرێکارانی عیراق ، هەر ئەو شێوە پێکهاتنەیە کە وڵاتانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ژێردەستەو ئەفریقیاو ئەمریکای لاتین بە خۆیانەوە دیوە ، واتە ئەو وڵاتانەی کەوتنە ژێر زەبری چەوساندنەوەی کۆلۆنیالی ونیمچە کۆلۆنیالی یەوە.

وڵاتی عیراق پێش بەرپا بوونی جەنگی یەکەمی جیهانی بەشێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی و لەلایەن ئەو دەولەتەوە کە تێیدا پەیوەندی دەرەبە گایەتی سەروەرو باڵادەست بوو، حوکمڕانی دەکرا. جا هەرچەندە سیستەمی دەرەبەگیەتی وڵاتانی ڕۆژهەڵات هەر لەسەرەتای پێکهاتنیانەوە سیمای تایبەتی و خسووسی ییەتی خۆیان هەبووەو لەچەند ڕوویەکەوە جیاوازی یان لەگەڵ دەرەبەگایەتی ئەوروپادا بووە، بەلام لەجەوهەردا هەردووکیان یەك شت بوون، چونکە جەوهەری پەیوەندی بەرهەمهێنانی ئەو سیستەمە لەسەر بناغەی موڵکانەی زەوی «الريع العقاري» بنیات نراوە.
گومان لەوەدا نی یە کە دەوڵەتی عوسمانی هەرگیزنەی ویستووە وڵاتانی ژێردەستەی خۆی پەرەپێبدا، بەپێچەوانەوە هەمیشەدانشتووانی لە ژێرباری چەندین جۆر زوڵمی ئابوری و سیاسی و کۆمەلایەتی دا چەوساندووەتەوە. پێش نەکەوتنی وڵات لە ڕووی پیشەسازی یەوە وکەمدرەتانی ی بازاڕای ناوخۆوبایەخ نەدان بەو زانستو زانیاری یانەی ئەوروپای ڕۆژئاوا بە دەستیان هێنابوو، لەگەڵ چەندین هۆی تری سیاسی دا، کارێکیان کرد گەلانی ژێردەستەی دەوڵەتی عوسمانی گەشەکردنێکی ڕاستەقینەبە خۆیانەوە نەبینن.
جا ئەگەر والی یەکی وەك «مەدحەتپاشا» بەحوکمی ئەوەی کە پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو، حەزی بە دامەزراندنی پرۆژەی «تەراموا ی» کردبێ، یاخود هەولی پێشخستنی «دەمیرخانە» کەی سوپای تورکی دابێ و بۆیەکەمجار ڕۆژنامەیەکی بە شێوەی نوێ لە عیراقدا دەرکربێ، هیچ لەو حەقیقەتە ناگۆڕن کەدەوڵەتی عوسمانی، دەوڵەتێکی دەرەبەگایەتی بووەو سوودو قازانجی لەمانەوەدرێژە پێدانی پەیوەندی بەرهەمهێنانی دەرەگایەتی دا، دیوەتەوە.

ڕاستی یەکەی مەسەلەی سەرهەڵدان و گەشەکردنی چینێکی کۆمەلایەتی نوێ بە پێی خواست و بڕیاری ئەم یان ئەو دەوڵەت تەواو نابێ ، بەڵکو پرۆسیسێکەو بەندە بەو یاسا مەوزووعی یانەوە کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەڕێوە دەبەن و ئادەمیزاد بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ دەوری خۆی لەدروست بوونی دا

دەبینێ . پەرەسەندنی کاری پیشەیی و دامەزراندنی کارگەی سوپایی و ڕاکێشانی ڕێگای ئاسن لە لایەن ئەڵمانەکانەوەو دامەزراندنی چاپخانەو ... تاد بوونە هۆی ئەوەی لە مناڵدانی ئەو سیستەمەدا توێژی یەکەمی چینی کرێکاران پێك بێ و پاشان لەبارو دۆخێکی تردا زیاتر گەشە بکاو پەرە بستێنێ.

دوای ئەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی هات، وولاتی عیراق ڕاستەوخۆ کەوتە ژێر دەسەلاتی بەریتانیاوە. ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە دامەزراندنی ئەو پرۆژانەی پەیوەندی‌یان بە نەخشە ستراتیژی‌یەکانیانەوە هەبوو. ڕاکێشانی ڕێگای ئاسن و تەواو کردنی ئەو هێڵانەی کاتی خۆی تورك و ئەڵمانەکان بۆیان تەواو نەکرابوو، لە گەڵ فراوان کردنی بەندە ری «بەسرە»و پێشخستنی کۆمپانیاکانی نەوت، هەموو ئەمانەپێویستیان بە ژمارەیەکی زۆر کرێکار هەبوو. ڕەوکردنی ژمارەیەکی زۆری جووتیاران و هەلاتنیان لە زوڵم و ستەمی دەرەبەگاریەتی لە لایەك و هەرەس هێنانی گوزەرانی سەدان پیشەوەری بچووکی ناو شارەکان - بەهۆی بلاوبوونەوەی کەل و پەلی بیانی‌یەوە - لە لایەکی ترەوە بوونە هۆی ئەوەی خەلکێکی زۆری بێ ئیش فڕێ بدەنە مەیدانی ئیش کردنەوە.

هەرچەندە بەرهەمهێنانی پیشەیی، کەبڕبڕەی پشتی ئابوری شارەکانی عیراق بوو، ئەو بازارەی جارانی نەما، بەلام هێشتا ژمارەیەك خەلکی پشەوەری لێ کۆبووبووەوە ژیانیان پێوەی بەسترا بوو. دامەزراندنی هەندێ کارگەی بچووکی وەك بەفر دروست کردن و چنین و خشت و چاپخانە و لەو شوێنانەیشدا کە خەلووزی بەردو قیرو خوێ و بەردە مەڕمەڕ دەردەهێنران توێژێکی تری چینی کرێکارانی عیراق دروست بوو. کەواتە سەرچاوەی دروست بوونی چینی کرێکاران بە پلەی یەکەم پرۆژەو دامەزراوە بیانی یەکانە، ئنجا ئەو کارگە ئەهلی‌یانەی بە سەرمایەی نیشتمانی‌ی دامەزران، لەگەڵ ئەو پیشەوەرانەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پیشەکانیان لەبەردەم بەرهەمی زۆرو باشتری بێگانەدا ئەپووکانەوەو ناچار دەبوون بێنە ریزی کرێکارانەوە. گومان لەوەدا نی‌یە کە ئەو ژمارەیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەزیاد بوون‌دا بوو، کەواتە چینی کرێکارانی عیراق لەگەڵ دروست بوونی‌دا دیاردەی بێکاریشی هێنایە ئاراوە. دەسەلاتدارانی ئینگلیزو کۆمپانیا بیانی‌یەکانیش دەیانزانی چۆن سوود لەم دیاردەیە وەردەگرن و چۆنیش دەیقۆزنەوە، تاوەکو چاکتر گیرفانیان پڕ بکەن. جا بۆ ئەوەی باشتر لەجەوهەری ئەم دیاردەیە تێ بگەین، دەبێ دەست بخەینە سەر هۆیەکانی.

بەر لەهەموو شتێك بڵاوبوونەوەی بێ ئیشی ی لەو سەردەمـەدا بەپلەی یەکەم پەیوەندی بە دەسەڵاتی کۆلۆنیالی یەوە هەبوو. بەریتانیای داگیرکەر وەك دەوڵەتێکی ئیمپریالیزمی جگەلەوەی کە عیراقی کردبووە بازاڕێکی بەفروخت بۆ ساغ کردنەوەی بەرهەمی پیشەسازی خۆی و لەرووی ستراتیژی یەوە هیوایەکی زۆری پێ ی بـوو، چنگی لە سامـانی نەوتیش گـیر کـردبـوو. راستـە چـەنـد کـۆمپـانیـایـەکی خستبـووە گـەڕو نـەوتیـان دەردەهێنـاو شیلەی رەنجی زەحمەتکێشان و خێرو بێری وڵاتیان بە تاڵان دەبرد، بەلام ئەوانە نەخشەیەکی تریان کێشابوو. بە پێ ی نەخشەکەی بەریتانیا، تا بۆیان بکرایە کـەمترنـەوتی عیراقیان دەردەهێناو لەبری ئـەوە نەوتی ئێـرانیان دەر دەکـرد، بۆ ئـەوەی نەوتەکەی عیراق بکەنە «إحتیاطي» دوا رۆژ، چونکە ئەوانە عیراقیان بە موڵکی هەتا هەتایی خۆیان دەزانی !!. هەر ئەم سیاسەتە وای لەئینگلیزەکان کرد توخنی پیشە سازی نەوتیش نەکەون. باشترین بەڵگەیش ئەوەیە کە هەندێ بەرهەمی نـەوت لە وولاتانی تـرەوە دەهێنران بـۆ عیـراق. بـەریتـانیـا وەك دەوڵەتێکی ئیمپریالیزمی، دەیزانی گەشە پێدانی ئەو پیشەسازی یە بێجگە لەوەی لە ڕووی ئابووری یەوە زەرەرو زیانێکی گەورەی پێ دەگەیەنێ، دەبێتە هۆی پەرەسەندنی چینی کرێکاران لە رووی چەندیەتی و چۆنیەتیشەوە. رێگای ئاسن و بـەندەری «بەسرە» یش کـە دوو مەیـدانی تری ئـابووری بـوون و راستەوخـۆ لەلایەن ئینگلیزەوە بەرێوە دەبران، هەنگاوێکی ئەوتۆیان نەنا کە هیـچ نەبێ لەداهـاتی تایبەتی خۆیان کارگەو کارخانەی وا دابمەزرێنن پێویستی یەکانی خۆیان دابین بکا، یاخود شارەکانی عیراق بە هۆی رێگای ئاسنەوە بە یەکترەوە ببەستن وهۆی گواستنەوەی رێك وپێکی ئاوی لە روباری دیجلەو فوراتدا بخەنە کار.

سیستەمی نیمچە دەرەبەگایەتیش لەو قۆناغەدا هۆیەکی تری تەشـەنە کردنی بێکاریی بوو. چەوساندنـەوەی جووتیـاران لەسەر دەستی دەرەبـەگو خـاوەن زەوی و سەرەك عـەشیرەتـەکاندا کـارێکی کرد، ئـاستی گـوزەرانی جووتیاران بە ئەندازەیەك هاتە خوارەوە نەیان دەتوانی لەلادێ بمێننەوە. ئەوانە لەسایەی ئەو سیستەمەدا، لە بەرهەمی ساڵانەیان ئەوەندەیان بۆ نەدەمایەوە تا وەرزی داهاتوو بیان ژیەنێ. ساڵ بە ساڵ لە ژێر باری سەلەم و سـوودا زیاتـر پشتیان دەچەمایەوە. دیارە بەم حاڵەیشەوە نەیان دەتـوانی کەڵك و سـوود لە پیشەسازی نیشتمانی ی و بەرهەمی پیشەیی خۆ وولاتی وەربگرن و بیان کڕن و پێویستی یەکانی ژیانی خۆیانی پێ دابین بکەن. ئەمەیش ئەوەندەی تر بێ بازاڕی بڵاوکردەوەو کاری لەبەرهەمی پیشەوەران و ئاستی ژیانی ئەوانیش کرد. چونکە

ئەگەر جووتیاران «کەبەشێکی گەورەی میللەتی عیراقیان پێك دەهێنا» توانای کڕین‌و ئاڵو گۆڕکردنی کەل‌و پەلی بەرهەمی نیشتمانی‌یان هەبوایەو بیان توانیایە کەرەسەی تری بەرهەمهێنان بکڕن، بێ گومان پیشەسازی نیشتمانیش پێشتر دەکەوت‌و ژمارەیەکی زۆر کرێکاری بێ ئیشیش دەست بەکار دەبوون‌و بەرهەمی کشتوکاڵیش پشتی بە پشەسازی نیشتمانی دەبەست، نەك بازاڕی دەرەوە. هەر ئەم واقیعە نالەبارەیش پاڵی بە دەیان‌و سەدان خێزانی جووتیارانەوە دەنا، لە هەندێ بواردا ئیش بکەن. ئیش کردن بە ژن‌و منال لەهەندێ بواری وەك ڕنین‌و داگرتنی خورمادا، ڕێگای لە کرێکاران دەبەست ئیشیان دەستگیر ببێ. ئەوانە بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن بەربەرەکانەی کرێکارانیان دەکرد و بەکرێ‌یەکی زۆر کەم ڕۆژ هەتا ئێوارە دەچەوسێنرانەوە.

هۆیەکی تری بێکاریی ئەوەبوو لەهەندێ پیشـەدا، کرێکـاران بە پـارچە ئیشیان دەکرد، چونکە ئەم چەشنە ئیش کردنە هەروەك قـازانجێکی زۆری بۆ خاوەن کار تێدا بوو، لەو لایشەوە ژمارەیەکی زۆر کرێکاری یەدەکی بـۆ کاتی پێویست مسۆگەر دەکردو بەربەرەکانەیشی دەخستە ناو ڕیزی کرێکارانەوە.

هـەموو ئـەوانەی لەسـەرەوە باس کـران چەنـد هۆیـەکی مـەوزووعی بڵاوبوونەوەی بێکاریی بوون. لێرەدا پێویستە ئەو حەقیقەتەیش لەیاد نەکرێ کە کرێکاران خۆیشیان لە سەرەتای ئەو قۆنـاغەدا نـەگەیشتبـوونە ئـەو پلەیەی کەپێویستە ببن. ئەو جووتیارانەی کە بۆ کرێکاریی دەهاتنە شارەوە، بەو نیازە نەدەهاتن بە تەواوی لەلادێ‌و پەیوەندی‌یەکانی بپچڕێن. ئـەوانە تـەنها زوڵم‌و ستەمی دەرەبەگایەتی کە هەرەسی بە ئابوری کشتو کاڵی‌یان هێنابوو، پاڵی پێوە دەنان لادێ بەجێ بهێڵن‌و بە شوێن سەرچاوەیەکی تری ئابوری‌دا بگەڕێن، وەکو تر هەر بە تەمای ژیانی لادێ‌و چاویان لە دەستکەوتی ئەوێ بوو.

ئەمانـە لەڕووی هوشیـاریشەوە پـەرەیان نـەدەسەنـد، چونکـە لەتەك دواکەوتووترین ئامرازی کار کردن‌دا هەڵس‌و کەوتیان دەکرد. لەهەل‌و مەرجێك‌دا کرێکار نەتوانێ ئاگاداری دەستکەوتی زانستی‌و پێشکەوتنی تەکنیك ببێ‌و کاریان پێ بکا، هەرگیز هەست بەو گۆڕان چوونەپێشەوەیە ناکا کە ڕەوتی گەشە کردنی مرۆڤایەتی بە خۆیەوە دیوە.

«بـوونی کۆمـەڵایەتی دەست‌نیشـانی هوشیـاری کۆمـەڵایەتی دەکـا». حەقیقەتی ئەم ووتە فەلسەی‌یە نەك هەر لەو مەسەلەیەدا خۆ دەنوێنێ کە ئێستا لێ‌ی دواین، بەڵکو لەوەیش‌دا دەردەکەوێ کە جووتیاران بەحوکمی درێژە پێدانی

پەیوەندی عەشرەتی یان لەگەڵ لادێدا ، نەیان دەتوانی خۆیان لە نەریت رەوشتی دەرەبەگایەتی دەرباز بکەن. ئەنجامیش هیچ لە مەوقیعی خۆیان تێ نەدەگەیشتن و نەیان دەزانی لە پرۆسیسی بەرهەمهێنانی سامانی ماددی‌دا چ رۆڵێکیان هەیەو چ ئەرکێکی مێژوویی لەئەستۆیانەو چۆن و لەسایەی چ هەلو مەرجێك‌دا دەتوانن مافە رەواکانیان وەدەست بهێنن. لەبەر ئەوە هەرگیز ناتوانین چاو لەو پەیوەندییانە بپۆشین کە لەڕووی کۆمەلایەتی‌یەوە بایەخێکی گەورەیان هەیەو لەزۆر سەرەوە شێوەی دروست بوون و بنەمای ئایدۆلۆژی و پلەی رێکخستنی بزوتنەوەی کرێکاران دەستنیشان دەکەن. راستەو نکوولی لەوە ناکرێ کە بوونی ئەم پەیوەندی‌یانە بەندە بە چەندین هۆی ئابوری و سیاسی و کۆمەلایەتی‌یەوەو بەگشتی ی کار لەگەشەکردنی پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتی یەکان دەکەن. بەلام دەبێ ئەو حەقیقەیش فەراموش نەکرێ کە خۆ بەستنەوە بە لادێ وە ودرێژەدان بە پەیوەندی عەشاریەری و تیرەگەری کار لە چۆنیەتی دروست بوونی چینی کرێکاران و گەشەکردنی هوشیاری چینایەتی دەکا. پەیوەندی هەمیشەیی کرێکاران بە تیرەو عەشیرەتەوە ، رێگا لە کرێکاران دەگرێ ئاستی هوشیاری‌یان بەرز بێتەوەو لەناو ریزەکانیان‌دا ئایدۆلۆژیای خۆیان تەشەنە بکا.

لە مێژربوو سەرمایەدارانی ئینگلیز بە هۆی سۆسیۆلۆجیست و سایکۆلۆجیست وزانا ئابوری‌یەکانی‌یەوە هەولی دەدا تۆوی دووبەرەکی ی و ناکۆکی لەریزی کرێکاران‌دا بچینێ . لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا کرێکارانی ئیرلەندەی بەگەلە رەوانەی ئینگلستان دەکرد . بەم کارەی ویستی جیاوازیی نەتەوەیی بکاتە هۆیەك تا کرێکاران بەگژ یەکتردا بکا . سا ئەگەر بەهۆی زاناو رۆشنبیرە پێشرەوەکانەوە کە جەوهەری ئەم مەسەلەیەیان شی‌کردەوە ، سەرمایەدارانی ئینگلیز ئەم سیاسەتەیان بۆ نەچووبێتە سەر ، ئەوا بەهۆی نزمی ی ئاستی هوشیاریی چینی کرێکارانی عیراقەوە، تاڕادەیەکی باش بە مەرامی خۆیان گەیشتن . دەسەلاتدارانی ئینگلیز بەمەبەستی ناکۆکی دروست کردن و خۆش کردنی ئاگری دوو بەرەکی ی ، جیاوازی‌یەکی زۆریان لە نێوان کرێکارە هیندی‌یەکان و عیراقی‌یەکان‌دا دروست کرد . بەڕادەیەك منالێکی هیندی ئەگەر ئیشتی بکردایە رۆژانەکەی لە کرێکارێکی عیراقی پتر بوو . سەرەڕای ئەوەیش جارو بار بۆ مەبەستی خۆی هەندێ ئیمتیازی پێ دەبەخشین تاوەکو ببنە مایەی رق و کینەی کرێکارە عیراقی‌یەکان.

بەمەیشەوە رانەوەستان لەناو کرێکارانی عیراقیش‌دا رێگای لەو چەشنەی

گرته بەر ، بە نموونە: کرێکارێکی کورد رۆژانەکەی «٧» ئانە لە کرێکارێکی عەرەب زیاتر بوو. بەکورتی‌ی بۆ کپ کردنی هوشیاریی چینایەتی ، جیاوازیی نەتەوەیی دەکردە هۆ. لە ناو هەندێ دام‌و دەزگایش‌دا سیستەمی « یونیفۆرم » ی داهێناو دەبوو هەر دەستەو تاقمە بەپێی مەزهەبی ئاینی‌و رەگەزو نەتەوەیان بەرگی جیا جیا بپۆشن.

ئینگلیزەکان چ لە سالانی ئینتیداب‌و چ دوای کۆتایی هاتنی ئینتیدابیش، توانی‌یان سوودێکی گەورە لە نەشارەزایی‌کەم تێ‌گەیشتنی کرێکاران وەربگرن، ئەمەیش لە مەسەلەی دانانی رادەی هەرە کەمی‌ی رۆژانەو چۆنیەتی خستنەسەر ئیش‌و دەرکردن‌و هەل‌و مەرجی ئیش‌دا بە باشی‌ی دەردەکەوێ.

ئەو رۆژانەیەی بۆ کرێکارانی عیراق دانرابوو، زۆر لەوە کەمتر بوو بتوانێ پێداویستی‌یە سەرەتایی‌یەکانی خۆی‌و مال‌و منداڵی پێ دابین بکا. زۆر جار بیانووی دام ودەزگاکانی ئینگلیزو رژێم دەرهەق بەم مەسەلەیە ئەوە بوو کە «إنتاجية»ی کرێکاری عیراقی ئەوەندە نی‌یە شیاوی رۆژانەیەکی لەوە زیاتر بێ. جا ئەگەر ئەم بیانووە کەمێك راستی‌ی تێدا بێ، هۆیەکەی هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوان. چونکە رۆژانەیەکی کەم هەرگیز ئەوەندەی خواردەمەنی پێویست بۆ دابین ناکا، ووزەی ئیش کردنی‌تە واوی پێ ببەخشێ‌و ئەنجام «انتاجية»ی دێتە خوارەوە.

ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی کەمترین رۆژانە بە کرێکاران بدەن پەیرەوی چەشنە سیستەمێکیان دەکرد کەم رێ کەوتووە لە شوێنی تر کاری پێ کرابێ. بە نموونە: ماوەی ئیش کردنی رۆژ انەیان دەهێنایەوە یەك، وەك ئەوەی کرێکار رۆژی «٦» سەعات ئیشی پێ‌دەکراو بەرامبەر بەوە رۆژانەکەیشی کەم دەکرایەوە. جاری وایش هەبوو، ئەوەندەیان دەهێنایەوە یەك، لەسەری مانگ‌دا مووچەی «١٥» رۆژی وەردەگرت. لەگەل ئەمەیش‌دا رۆژ بەرۆژ نرخی کەل‌و پەل‌و خواردەمەنی‌و تێکرای پێویستی‌یەکانی ژیان بەرز دەبوونەوە. تەنانەت ئەگەر لە هەندێ دام‌و دەزگایش‌دا کرێکاری هەمیشەیی سال بەسال رۆژانەکەی زیادی بکردایە، شتێکی لە ئاستی گوزەرانی نەدەگۆڕی، چونکە نیسبەتی کرێ‌ی راستەقینەی دەهاتە خوارە وە.

شێوەیەکی تری چەوساندنەوەی کرێکاران ئەوە بوو، لەبری پارە، کرێ‌ی نەختینەی دەدرایە. ئەم چەشنە کرێیە لەناو وولاتە سەرمایەدارە پەرەسەندووەکان‌دا نەماوە، ئەگەر هەیش بێ تەنها کرێ خانوو دەگرێتەوە بەلام

لەوولاتێكی ژێـردەستـەی وەك ئـەوسـای عیـراقدا، شێـوەیـەكی تـری چەوساندنەوەی كرێكاران و بەتاڵان بردنی كاری كرێ گرتە بوو. ئـەوە بوو لە جیاتی پارە خواردەمەنیو كەلو پەلی پێویستیان دەدانێو زۆر جاریش بەقەرز بوو. پرۆژەی خانووبەرەو نیشتەجێ كردنی كرێكارانیش بەرامبەر بە چەردەیەك پارە كە لەمووچەكەیان دادەشكێنرا، شێوەیەكی تری كرێی نەختینە بوو، بێ ئەوەی كرێكاران بە خۆیان بزانن. نزمیی ئاستی هوشاریی كرێكـاران وادەكا لەحەقیقەتی ئەم چەشنە كرێیە تێ نەگەن. بۆیە دەبینین لەهەندێ كاتدا كە تەنگوچەڵەمەی ئابوری پەرەدەستێنێو كەل و پەلو خواردەمـەنی بە سـانایی دەستگیر نابن هەول دەدەن خاوەن كار لەبری پارە كرێی نەختینەیان بداتێ، بێ ئەوەی لەو حەقیقەتە تێبگەن كە بە دەستی خۆیان سەرچاوەیەكی تری گیرفان پركردنیان بۆ دۆزیونەتەوە.

دامـەزراندنو دەركـردنی بە ئـارەزوو؛ هەلو مـەرجی نالەبـاری ئیش كردنیش بە پێی قەواڵەیەكی تایبەتی بەسەر كرێكاراندا، دەسەپێنراو بۆیان نەبوو لەپێستی خۆیاندا بجوولێنەوە . بە كورتیی هەرچی جۆری چەوساندنەوە و دادۆشین هەیە، داموو دەزگاكانی ئینگلیزو رژێم لەگەڵ كرێكاراندا بەكـاریان دەهێنا. تا لەقۆناغێكی تری پەرەسەندنی بزووتنەوەی چینی كـرێكاراندا لەو راستییە، تێگەیشتن كە تەنها بەیەكخستنی ریزەكانیان بە ئامـانج دەگـەنو قۆناغی یەكەمی ئەو خۆرێكخستنو یەكێتییەیش پێكهێنانی نیقابەو رێكخراوی پیشەییە. بۆیە هەوڵدان بۆ ئەو مەبەستەو جێبەجێ كردنی، بـووە ئەڵقـەی ناوەندی خەباتی ئەو چینەو پاشان خەباتی ئابورییان كردە چەكی كاریگـەرو لەرووی ستەمكاراندا هەڵیان كێشا، وەك لەدوو توێی ئەم بەرهەمە بەنرخەی دكتۆر كەمالدا شیكراوەتەوەو رۆشنانی خراوەتە سـەر قۆنـاغە یـەك لەدوای یەكەكانی.

لە كاتێكدا كە دەستی رێز بۆ كۆششی بێ ووچانی دكتۆر كەمال بە سنگەوە دەگرمو چاوەڕوانی بەشەكانی تری ئەم كتێبە بێ هاوتایەی دەكەم، لە بەردەم ناوی ئەو سەربازە نەناسراوانەدا سەر نەوی دەكەم كە ئەركی پێشرەوایەتی كردنی ئەو چینەیان گرتە ئەستۆو بـە بەرهـەمی ئەدەبیی «شیعـرو چیرۆك» ئاسۆی بیری ستەمـدیدەكـانیان روونـاك كردەوەو دەرگـای ژیانێكی بـاشترو خۆشتریان بۆ خستنە سەر گازی پشت.

فوئاد

۱۳ ـ ۹ ـ ۱۹۸٤

# پێشەکی

---

باسی چینی کرێکارانی عێراق‌و شێوازی بزووتنەوەکەیان، چ لەسەر ئاستی ناوخۆو چ لەسەر ئاستی ئەو لێکۆڵینەوە بیانی‌یانەی توخنی چەندین بابەتی مێژووی عیراقی تازەو هاوچەرخ کەوتوون، لاپەرەیەکی گرنگ‌و لەسەر نەنووسراوی مێژووی سیاسی‌و کۆمەلایەتی عیراق پێك دەهێنێ[1].
بەر لە هەموو شتێك هەست بەوە دەکەین مێژوو نووسانمان بە دەستی ئەنقەست خۆیان لەم مەسەلەیە دزیوەتەوە. لێرەدا ئەوەندە بەسە نموونەیەك بە بەڵگە بهێنینەوە تاوەکو ئەم بۆچوونەمان مەودای راستەقینەی خۆی وەربگرێ. ئەوەتا

کەسێکی وەك «عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی»، لە سێ جزمی یەکەمی دانراوە بە ناوبانگەکەیدا «مێژووی وەزارەتەکانی عیراق»[2] کە بۆ ئەو ڕووداوانەی تەرخان کردووە لە ڕۆژی ٢٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٥ بەولاوە ڕوویان داوە؛ واتە لەڕۆژی دروست بوونی یەکەم وەزارەتی عیراقی‌یەوە تا ٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ کە مێژووی ڕەسمی‌ی کۆتایی هاتنی ئینتیدابو بوونی عیراقە بەئەندامی کۆمەڵی گەلان، کەم وزۆر توخنی کرێکارانو ئەو مەسەلانە نەکەوتووە[3] کە ئەوەندە گرنگو بایەخدار بوون، جێگایەکی دیاریان لەو ڕاپۆرتە ڕەسمی‌یانەیشدا زەوت کردووە کە لەسەر چۆنیەتی بەڕێوە بردنی عیراق دەنووسرانو بەریتانیا بە سیفەتی ئەوەی دەستی بەسەر عیراقدا گرتبوو، پێشکەش بە کۆمەڵی گەلانی دەکرد. شایانی باسە «ئەلحەسەنی» لەو سێ جزمەدا باسی ڕووداوی ئەوتۆ دەکا، لە ڕووی نرخو بەهای مێژوویی‌یەوە زۆر لە ئاستی مەسەلەی کرێکاران نزمتر بوون.

گەر بێو حساب بۆ ئەو هەمووبایەخ پێدانە بکەین کە مێژوونووسانی ئەم ناوچەیە بە بابەتی لەو چەشنەی وولاتانی خۆیان داوەو[4] نرخ بۆ هەوڵو کۆششی ئەو نووسەرە عیراقی‌یانەیش دابنێین کە بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەی کرێکاران داویانەو وای لێ کردن بە شوێن «کەسایەتی کرێکار لە چیرۆکی عیراقیدا» بگەڕێنو دەربارەی «ڕۆژنامەی کرێکاران»[6] بنووسن؛ دەڵێین گەر بێو حساب بۆ ئەمانە بکەین، ئەوسا بەتەواوی ئەم کەمو کوڕی‌و ناتەواوی‌یەمان بۆ دەردەکەوێ.

جارێکی تریش کەم تەرخەمی‌ی ئەو مێژوو نووسانەمان لەوەدا بۆ ئاشکرا دەبێ کە لەو حەقیقەتە تێ دەگەین ئەم هەڵوێستەیان ئەنجامی تێ ڕوانینی کلاسیکی‌یانەیانە، تێ ڕوانینێك سەردەمی بەسەر چووەو ئەوانە گەرەکیانە مێژووی چینێك پشت گوێ بخەن ئەمڕۆ ژمارەیان خۆی لە ملیۆنێك دەداو بەوانەوە کە ئەوان دەیان ژیەنن نزیکەی ٨٠٪ی سەرجەم دانیشتووانی شارەکان پێك دەهێنن.[7] گەر بێو تەماشای مەوقیعی ئابووریشیان لە بەرهەمهێنانـدا بکەین وەك «نەوت، کبریت، چیمەنتۆ، کاکڵەی میتالۆژیای ئەسکەندەری‌یە، پیشەسازیی داودەرمان لەسامەڕاو شووشە لە ڕەمادی‌و پیشەسازی سووكو پیشەیی بیناکاری لەسەرپاکی شارەکانی عیراقدا»، دەبینین ئەوەی ئەو چینە لە ڕووی ماددی‌یەوە بەرهەمی دەهێنێ ٩٠٪و بگرە زیاتری هەموو داهاتی نەتەوەیی‌یە. بەبڕاوی ئێمە تەنها ئەمە بەسە بۆ ئەوەی پاڵ بە -

مێژوونووسانمانــەوە بنێ رەگو ریشەی مێـژوویی چینی کرێکـاران و چۆنیـەتی ـڕوست بوونیدا بچنە خوارەوە. گەر ووردتریش بـۆ مەسـەلەکە بچـین، دەبێ بەوپەڕی خۆ بەکەمزانینەوە دان بەو ڕاستی یەدا بنێین کە مەحاڵە وەك پێویست ـە هەموو مەوداکانی چەوساندنەوەی ئیمپریالیزمانەی گەلی عیراق ـ لە سەردەمی داگیرکردن و ئینتیداب دا ـ تێبگەین و بەزەحمەتیش دەتوانین مەوزووعی یانـە دەست بخەینە سەر لاپەڕەکانی مێژووی سیاسی ی نوێی عیراق و خەباتی گەل لەپێناوی سەربەخۆییدا بە درێژایی ئەو سـالانە، ئـەگەر بـە تێرو تـەسەلی لەواقیعی کۆمەلایەتی و ئابوری و سیاسی ی کرێکاران و جووتیارانی ئەو ڕۆژگارەی عیراق نەکۆڵینەوە. ئەمانە لە هەموو حالێکدا هێزی بنچینەیی و داینەمۆی هەموو ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ و پێکهێنەری ئەو سوپایەن[٨] کەبەبێ کۆششی ئەو هیچ گۆڕانێك دروست نابێ. ئەمانە لەپرۆسیسی گۆڕانی کۆمەلدا هۆیەکی ئیجابین و زۆربەی کات سروشتی بزووتنەوەکەیان پشت بەو هۆیانە دەبەستێ کەلەژێرەوە، واتە لەقەوارەی کۆمەلایەتی و پەیوەندی بـەرهە مهێنـانی باوەوە هـەلقولاون. دەمێنێتەوە سەر چۆنیەتی ئاراستە کردنیان، ئەمەیـان بەتـایبەتی بـەنیسبەت کرێکارانەوە بەهۆی بنچینەی لە قەلەم نادرێ، هەر لەبەر ئـەمەیشـە گۆڕانی بـەردەوامی هێزە کـۆمەلایـەتی یەکـان لەسەر شـانـۆی سیـاسی، هـەمیشـە لەپەرژەوەندی ئەمان دایە. بەنموونە: ئەمڕۆ ڕۆلی وەچەی جووتیارو کرێکارانی «شۆڕشی بیست» لەناو هەموو دیاردەیەکی ژیانی سیاسی ئابوری و کۆمەلایەتیدا، لەتەك ڕۆلی وەچەی سەرۆك عەشیرەتەکاندا جیاوازە. ئەمـەیش لای خۆیـەوە ناچارمان دەکا بایەخ بەمێژووی ئەو «چینە بدەین کە لە نـاوجەرگـەی گەلەوە هەلقولاوە» وەك ڕۆژنامەیەکی زووی کرێکا ان وەسفی کردووە[٩]

دەتوانرێ مێژووی چینی کرێکـارانی عیراق بـەر لەشۆڕشی ١٤ی تـەممووزی ١٩٥٨ بە سێ قۆناغی بنچینەی دابەش بکرێ. یەکەمیـان: قۆنـاغی پێکهاتنی، دەکەوێتە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمـەوە. دووەمیان: ئـەو قۆنـاغەیـە کەسەرەتای بزووتنەوەی کرێکارانی بەخـۆیەوە دی و ڕۆژگـاری دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ی دەگرێتەوەو ئەشێ سالی ١٩٣٢ بەکۆتایی ئەم قۆناغە لەقەلەم بدەین. چونکە ئەوسالە قۆناغی گواستنـەوەیە لە مێـژووی عیراقـدا و کۆتـای بەسەردەمی ئینتیداب هات و سەردەمێکی تر هاتە گۆڕێ کەبەسەربەخۆیی ناو دەبرێ. * بەلام قۆناغی سێیەم ئەو قۆناغەیە کە چینی کرێکارانی عیراق، وەکو چینێکی کاریگەری ناو بزووتنەوەی نیشتمانی ی گەلی عیراق لەسـەر شانـۆی سیاسی دەرکەوت و خۆی نواند.[١٠]

ئەم لێکۆڵینەوەیەمان لەبارەی قۆناغی یەکەم و دووەمی مێژووی چینی کرێکارانی عێراقەوەیە. بێ گومان ئەو دوو قۆناغەیش لەبەر کەمی ی سەرچاوەو نەبوونی راو بۆچوونی ئاشکراو روون سەبارەت بەباس و بابەتە تێك ئاڵاوەکانیان، ئاڵۆزترین لایەرەی مێژووی ئەو چینەن. ئەم دوو قۆناغە بایەخێکی لە رادە بەدەریان هەیەو تەنها بە توێژینەوەی ئەم دوانە دەتوانین لە بنچینەی مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسی یەکانی چینی کرێکارانی عێراق تێ بگەین، چونکە بەبێ ئەوانە ناتوانرێ واقیعی چینی کرێکاران و مێژووی بزووتنەوەکەیان لەقۆناغی دواتردا دیاری بکەین. ئەو قۆناغەی کە وەك ئەوانی تر، لاپەرەکانی شاراوەو تەمومژاوی نین و تارادەیەکی باش ئاشکراو روونن.

سەبارەت بە چۆنیەتی ئامادە کردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە پشتمان بەژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی جیا جیا بەستووە. لەپێش هەموویانەوە بەڵگەنامەی رەسمی ی و راپۆرتی ئینگلیز کە دەربەق بەچۆنیەتی بەڕێوەبردنی عێراق لە سەردەمی ئینتیدابدا نووسیویانە. لە ناو ئەم بەڵگە نامانەدا زانیاریی زۆر بایەخدار سەبارەت ئەو پرۆژانە هەیە کە ئیشیان بەژمارەیەکی زۆری کرێکاران کردووە، وەك: بەندەری بەسرەو رێگاری ئاسن. هەروەها زانیاری زۆریان لەبارەی کۆمەڵە کرێکاری و پیشەی یەکان و چۆنیەتی گوزەرانی کرێکاران بە گشتی ی و یاسای کرێکاران و چەندین مەسەلەی تر تێدایە کە بۆ نووسینەوەی مێژووی چینی کرێکارانی عێراق چاوپۆشی یان لێ ناکرێ.

وەنەبێ رۆژنامەیش رۆڵی لەو سەرچاوانە کەمتر بێ. رۆژنامەکانی ئەو سەردەمەیش زانیاری وردو دەگمەنی ئەوتۆیان تێدایە رۆشنای دەخەنە سەر بابەتی جیا جیا کە پەیوەندی راستەوخۆیان بەسەرجەم پشێوی و بزووتنەوەکانی کرێکاران و هەڵوێستی رژێم و هێزە سیاسی یەکانەوە هەیە. جا بۆ ئەوەی وێنەیەکی کت و متی قۆناغی یەکەمی بزووتنەوەی چینی کرێکاران بخەینە بەردەست و بۆ ساغ کردنەوەی هەندێ رووداو و ژمارەو شتی لەو بابەتە، پشتمان بە سەرپاکی رۆژنامەکانی ئەوسا بەستووە، بێ ئەوەی گوێ بدەینە رێباز و هەڵوێستی جیا جیایان. ئەوانە هەندێکیان رۆژنامەی میری بوون، وەك «العراق» و «صدى العهد». هەندێکی تریان لەرۆژگاری «شۆرشی بیست» ەوە بە هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە ناوبانگیان دەرکردبوو، وەك «الاستقلال». هەندێکیشیان زمانی حاڵی ئەپۆزیسیۆن بوون وەك «الاخاء الوطني» و «نداء الشعب». هەیش بوو لەبەر ئەوەی ئاستێکی بلندی رۆژنامەگەری هەبوو، لەو رۆژگارەدا ناوو شۆرەتێکی لەئەندازەبەدەری پەیدا کرد بوو، وەك: «العالم العربي». ئەمە جگە لە

ڕۆژنامەکانی کرێکاران کە بە هۆی باس و بابەتەکانیانەوە گەیشتینە هەندێ ڕاو بۆچوونی پێویست و لەبەر ڕۆشنایی‌یان توانیمان سیمای قۆناغی زووی بزووتنەوەی کرێکاران دەست نیشان بکەین.
کە دێینە سەر نیشان دانی زۆربەی مەسەلە گرنگەکان، هەوڵمان داوە چی بەڵگەنامەو ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە نووسیویانە، بیاننووسینەوەو دەری ببڕین، تاوەکو لە لای ئەو کەسانەی هەمیشە گومانیان لە ئاستی هوشیاری توێژە زەحمەتکێشەکان و ڕادەی هەست کردنیان بە پەرژەوەندی‌یەکانی خۆیان هەیە، بینە بەڵگەی پێ سەلماندن.
لە چوار جار چاو پێ کەوتنی یەکەمین نیقابی «محەممەد سالح عەبدولجەببار ئەلقەزاز»[11] و چاو پێ کەوتنێکی مامۆستا «ئیبراهیم عەبدولجەببار ئەلقەزاز» ی برای‌دا زانیاری‌یەکی زۆرو سوودبەخشمان دەست کەوت . وا دەردەکەوێ ئەمەی دوایی‌یان لە دوا دوای سەردەمی ئینتدابداو لەژێرەوە، وەك هەموو ڕۆشنبیرێکی سەردەمەکەی ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا بێ.
زۆر کەس هەن لەوانەی‌توخنی ڕوو داوەکانی سەردەمی ئینتیدابی بەریتانیایی کەوتوون بە هەڵەدا چوون. ئینجا لەبەر ئەوەی کە هەندێ هۆی ئاشکرا هەن‌ کۆسپ و تەگەرەیەکی زۆر دەخەنە بەردەم ئەم چەشنە باس و لێکۆڵینەوانە، ئەو هەڵەو ناتەواوی‌یانەی ڕوویان داوە بەشتێکی سروشتی ی دەزانین‌ و لە هەمان کاتیشدا ئەوەندەی لە تواناداا بووبێ و بە پشتی سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان ڕاستمان کردوونەوە. هەموو ئەو حەقیقەتانەی لە دووتوێی ئەم کتێبەدا ڕوون کراونەوە بیروڕای ئەو نووسەرە ڕۆژئاوایی‌یانە پووچەڵ دەکەنەوە کە سوورن لەسەر ئەوەی گوایەکۆمپانیا بیانی‌یەکان و بەتایبەتی کرێکارانی کۆمپیانیای نەوت «وەزعێکی باشیان هەیە»[12]
زۆر بە ترسەوە سوودمان لەو زانیاری‌یانە وەرگرتووە کە لە ناو چەند سەرچاوەیەکی کەمدا تۆمارکراون‌ و لە بزووتنەوەی کرێکارانی‌سەردەمی ئینتیداب دەدوێن. ئەو سەرچاوانە جگە لەوەی کە زۆر بە کورتی‌ی خۆیان لەقەرەی ڕووداوەکان داوە؛ ئەو هەڵو مەرجانەیشیان تێدا نی‌یە کە پێ ی دەبنە حەقیقەتی مێژوویی باوەڕ پێ کراو. بە نموونە: لە هیچ ڕۆژنامەو بەڵگەنامەیەکدا، تەنانەت بە ئیشارەتیش باسی «مانگرتنی کرێکارە چەوولم بێژەرەوەکان» نەکراوە، کە گوایە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٢ دا لەبەسرە ڕووی داوەو ئەنجام کۆمپانیاکانیان ناچار کرد «مل بۆخواستی کرێکاران شۆڕ بکەن» وەك لە یەکێك لەو سەرچاوانەدا نووسراوە.[13] ئەمە لە کاتێکدا کە ڕۆژنامەو بەڵگەنامەکانی ئەو

قۆناغە لە چەند مەسەلەیەکی ئەوتۆی کرێکاران دواون، لە رووی گـرنگی‌یەوە ناگەنە ئاستی ئەو مانگرتنە.
وامان بە چاك زانی بابەتی کتێبەکە بکەینە پێنج بەش. یەکەمیان باسی پێکهاتنی چینی کرێکارانی عیراق دەکا، کە وەك باسمان کرد لە سـالانی دوای سەدەی نۆزدە هەمەوە دەست پێ دەکا تا جەنگی یەکەمی جیهان. بە هۆی ئەوەیشەوە کە عیراق لە ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بووە یەکێك لە مەیـدانەکـانی شەڕ، چینی کرێکارانیش گۆڕانێکی گەورەی بە خۆیەوە دی‌و بەخۆیدا هـات، ناچـار بووین بەشێکی تایبەتی بۆزرووف کارو کـرێکارانی عیـراق لە ماوەی جـەنگدا تەرخان بکـەین. دوو بە شــەکەی تـری ئەم کتێبــە لەو زرووفە مــەوزووعی‌یە دەکۆڵێتەوە کە بووە هۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی کرێکاران؛ بە دوورو درێژیش لە رووداوەکانی ئەو بزووتنەوەیە دەدوێ. ناوی هەموو ئەو کەسانەیشمان تۆمار کردووە کە دەوری ئیجابییان لەو بزووتنەوانەدا بینیوەو سەربازی وونی ئـەو مەیدانە بوون، کەچی مێژووی هاوچەرخی عیراق ئەوەندەی تۆزێـك توخنیـان ناکەوێ لە کاتێکدا رۆڵی ئەوانە شیاوی هەموو ناو هێنانێکە.
لە کۆتایی: بـە شێوەیـەکی چڕو پـڕ باسی‌سـروشتی بزووتنـەوەی کرێکـاران‌و قۆناغەکانی دەرکەوتن‌و سەرهەڵدانیمان کردووە کە لەدواییدا کاری لە ڕەوتی ئەو بزووتنەوەیە کرد.
دەبێ ئەو راستی‌یەیش دووبارە بکەینەوە کە ئەم کۆششەمان کە لە دوو توێی ئـەم کتێبەدا پێشکـەش کراوە، هــەنگاوێکــە بۆ لێکـۆڵینەوەی مێـژووی چینی کرێکارانی عیراق‌و حەقیقەتی بزووتنەوەکەی، هیوا دارین هەنگـاوی تری بـە دوادا بێ‌و ئەم بابەتە گرنگە مافی رەوای خۆی بدرێتێ.
دواجار، زۆر سوپاسی هەموو ئەو براو هاورێیانە دەکەم کە یارمەتی‌یان دام ئەم کتێبە بەم شێوەیەی ئێستە رووناکی ببینێ، لە پێش هــەموویــانەوە مـامۆستـا «محــەممەدی مــەلا کەریم» و «دکتـۆر هاشم سـالح ئـەلتکـریتی» و هــەمــوو کارگوزارانی «مەڵبەندی نیشتمانی‌ی بەڵگەنامەکان ـ المرکز الوطنی للوثائق» و «کتێبخانەی کۆڕی زانیاری عیراق» و «کتێبخانەی نیشتمانی‌ی» و «کتێبخانەی ناوەندی» و «کتێبخانەی لێکۆڵینەوەی بالا»ی سەر بە کۆلیجی ئادابی دانشگای بەغدا.



١ - چەند لێکۆڵینەوەیەکی عیراقی‌ی زۆر کەم هەن لەهەندێ لایەنی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق دواون‌و ئێمەیش لەو بەشەدا کە بۆ سەرچاوەکانمان تەرخان کردووە، ناومان هێناون. چەند لێکۆڵینەوەیەکی لەوانەیش کەمتر بە زمانی بیانی نووسراون‌و لەو بابەتانە دەدوێن کە پەیوەندی‌یان بە چینی کرێکارانی عیراقەوە هەیە وەك:
M. M. AL — Habib. The Labour movment in Iraq, middle Eastern Affairs, New York, 1956; E. A. Kinch, Social effects of the Oil Industry in Iraq; (International Labour Review) , Geneva Vol. LXXV, No 3, march 1957; R. Khadhiri, Labour and indu stry in Iraq. A Thesis Submitted to the Faculty of the Univ - ersity of Mississippiin Partial fulfilment of the requireme nts for the Degree of master of Science in the Department of Economics and Buisness Administration; University of Miss - issippi, May 1958.
(ئەم نامەیە لە بنچینەدا باسی ئەو رووداوە کرێکارانەیە دەکا کە لەساڵانی سی بەدواوە روویان داوە، بەتایبەتیش باسی ئەو یاسا کرێکاری‌یانە دەکا کە بەر لە ساڵی ١٩٥٨ لە عیراق دەرچوون.) م. کۆپەرمان. بزووتنەوەی کرێکاران لەعیراقدا. بەزمانی رووسی. گۆڤاری - رۆژهەڵاتی شۆڕشگێڕ - مۆسکۆ. ژمارە شەش ١٩٣٤.
«گۆڤاری - الثقافة الجديدة - ئەم ووتارەی لە لاپەڕە ٩٧ - ١٠٦ ی ژمارەی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٧١ دا بە زمانی عەرەبی بڵاوکردەوە.» هەروەها نووسەری ئەو لێکۆڵینەوەیە، دوو باسی دیکەی بە زمانی رووسی لەبارەی چینی کرێکارانی عیراقەوە بڵاوکردەوە. یەکەمیان لە لاپەڕە ٥٥ - ٦٢ ی ژمارە (٦) ی ساڵی ١٩٦٨ ی گۆڤاری «گەلانی ئاسیاو ئەفریقیا» دا بە ناونیشانی «مانگرتنی کرێکارانی نەوتی کەرکووك ساڵی ١٩٤٦»، دووەمیان لە کتێبی «پێکهاتنی چینی کرێکارانی عیراق» مۆسکۆ. ١٩٧١ ل ٣٧ - ٨١.
٢ - عبد الرزاق الحسني تاريخ الوزارات العراقية. الطبعة الثالثة. صيدا. الجزء الاول ١٩٦٥ الجزء الثاني ١٩٦٥. الجزء الثالث ١٩٦٦.
٣ - «ئەلحەسەنی» تەنها لە بەشی سێیەمدا نەختێك بە درێژی باسی مانگرتنی گشتی‌ی دژ بە یاسای شارەوانی‌یەکانی کردووە. بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە کرێکارانەوە هەیە لەوەندە زیاتر کەمێك باسی کرێکاران‌و دەوریان لەو مانگرتنەدا دەکا، هیچی‌تری نەووتووە.

٤ - ئەو لێکۆڵینەوانەی مێژوونووسان لەبارەی مێژووی چینی کرێکارانی میسر و سوریاو لوبنان‌و تورکیاو ئێرانەوە نووسیویانە، زۆر لەوانە چاکترن کەلەعیراقدا نووسراون. بەنموونە: لە میسر کۆمەڵێك نامەی دکتۆرا سەبارەت بە مەسەلەی کرێکاران ئامادە کران، وەك نامەی دکتۆراکەی «ئەوال عەبدولعەزیز» کە بە ناونیشانی «بزووتنەوەی کرێکاران‌و شوێن دەستی لە پەرەپێدانی مێژووی سیاسی میسر دا ١٨٩٩ - ١٩٢٥»، ئەومبوو ساڵی ١٩٦٣ مشت‌و مڕی لەسەر کرا. هەروەها نامەیەکی دیکەی دکتۆرا ساڵی ١٩٦٧ مشت‌و مڕی لەسەر کرا و ناونیشانەکەی «هەڵوێستی رۆژنامەی میسری بەرامبەر بزووتنەوەی کرێکاران ١٨٨٢ - ١٩٥٢» بوو. کەچی تا ئێستا لای خۆمان خۆمان مشت‌و مڕ لەسەر تاکە نامەیەك سەبارەت بەچینی کرێکارانی عیراق کراوە، ئەویش دەزگایەکی زانستی سەرپەرشتی‌ی کردووە عیراقی نی‌یە. مەبەستمان نامەی دکتۆراکەی «عەبدولڕەزاق موتلەك ئەلفەهد»، ٥ کەساڵی ١٩٧٧ لە قاهیرە مشت‌و مڕی لەسەرکراو ناونیشانەکەی «مێژووی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق ١٩٢٢ - ١٩٥٨» بوو.

٥ - رزاق ابراهیم حسن. الشخصية العمالية في القصة العراقية بغداد ١٩٧٧ ،٢٢٠ لاپەرمیە، رەئووف حەسەن. کرێکار لە چیرۆکی کوردی‌دا. رۆژنامەی «العراق» بغداد ١٥ آذار ١٩٧٩.

٦ - رزاق ابراهیم حسن. الصحافة العمالية في العراق. بغداد ١٩٧٩ ،٨٠ لاپەڕمیە.

٧ - ئەمە ئەگەر هەر کرێکارێك سێ کەس بژیەنێ.

٨ - مەبەستمان مەفهوومی تێکڕای رووداوی مێژوویی‌یە، بەمێژووی شارستانی‌یەتیشەوە. خواست‌و ئاواتی فرعەونەکانی میسر کەدەیانویست هەتا هەتایە نەمر بن‌و ناویان کوێر نەبێتەوە، لەگەڵ بلیمەتی‌ی ئەندازی‌یارەکانیان، بەبێ رەنج‌و ئارەقی ئەو کۆیلانەی تەلاری ئەو هەرەمانەیان دانا ٭کەبەیەکێك لەحەوت عاجباتی‌یەکەی دونیا لەقەڵەم دراون، دەبێتە خەیاڵێکی رووت. بەڕاستی‌ی گوناهە کەباس ئەو مێژووەمان کرد بەتەنیا هەر خاوەن قامچی‌مان لەیاد بێ‌و بەس.

٩ - «العامل». بغداد العدد الأول ٨ ايلول ١٩٣٠

٭ مێژوونووسان وا ڕاهاتوون ساڵی کۆتایی هێنان بەئینتیدابی بەریتانی، ساڵی سەربەخۆیی دەنووسن. دکتۆریش لەو شوێنانەدا کەپێویستی کردووە، هەمان زاراوەی بەکار هێناوە. بەلام بەش‌بەحاڵی خۆم لە هەرشوێنێکدا ئەو زاراوەیە هاتبێتە ڕێگام لەجیاتی سەربەخۆیی، «کۆتایی هاتنی ئینتیداب»م بەکار هێناوە، چونکە لابردنی ئینتیداب ئەگەرچی بە رووالەت جۆرە سەربەخۆیی‌یەکی دەگەیاند بەلام وەك وولاتێکی نیمچە کۆلۆنی مایەوەو لەهیچ روویەکی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌یەوە سەربەخۆ نەبوو. - وەرگێڕ -

١٠ - بەپێ‌ی بەڵگەنامەیەکی زووی کرێکاران؛ لە سەردەمی ئینتیداب‌دا بزووتنەوەی کرێکاران بە سێ قۆناغ دابەش کرابوو. یەکەمیان لەساڵی (١٩٢٤) ٥ وە کەهەوڵی دامەزراندنی یەکەم ڕێکخراوی کرێکاران دراو لەساڵی ١٩٢٩ دا کە هەندێ کۆمەڵ دروست بوون‌و بەپێ‌ی ئەم رایەکۆتایی بەو قۆناغە هات‌و سەرەتای قۆناغی دووەم دەستی پێ‌کرد کە تاساڵی ١٩٣١ ی خایاند. پاشان قۆناغی سێیەم لەگەڵ مانگرتنی گشتی‌ی دژ بە سیاسای باجی شارەوانی‌یەکان، دەستی پێ کرد. [بڕوانە: وثائق‌و مراسلات بين نقابات العمال العراقية ومثيلاتها الاجنبية من سنة ١٩٣٢ الى سنة ١٩٣٥. مكتبة المجمع العلمي العراقي - الوثيقة - ٢ -.]

ئەومیش بریتی‌یە لە نامەیەکی «محەممەد سالح ئەلقەزاز» کە لە ١٦ ی شوباتی ساڵی ١٩٣٣ دا بۆ سکرتێری نیقابەکانی کرێکارانی جیهانی‌ی ناردووە لە بەرلین.

١١ - «محەممەد سالح» جووتە ناوە.

١٢ - بەنموونەبڕوانە: K. M. Langley, th Industrilization of Iraq, Cambridge, 1961. P, 77.

١٣ - بڕوانە: (عبد السلام الناصري - ابو نصير) معارك طبقية. بغداد ل. ٦ - ٧ «مێژووی لەسەرنی‌یە».

رەگو ریشەی چینی کرێکارانی عیراق:

گومان لەوەدا نی یە کە سەرهەڵدانو پێکهاتنی چینی کرێکاران بەندە بە باری کۆمەلایەتی و ئابوری یەوە، ئەم دیاردەیـەیش لە کۆمـەڵێکەوە تـا کۆمـەڵێکی تر جیاوازی هەیە. هەرچۆنێك بێ ئەم چینە بە دوو ڕێگای سەرەکی ی دروست دەبێ. یەکەمیان بەندە بە گـەشـەکـردنی سروشتی ی بنکـە کۆمـەلایەتی یـەکەوە، لە قـۆناغێکی دواکـەوتووەوە رووەو قـۆناغێکی پـەرەسـەنـدووتـر. دووەمیش لە بنەڕەتەوە بەندە بە هۆ دەرەکی یەکانەوە. ئەم شێوە پێکهاتنەیش کارێکی گەورە دەکاتە سەر سروشتی ئەم چینە نوێیە، بە تایبەتی لە سەرەتای تەمەنیدا. لە وولاتە ئەورووپای یەکانداو بەتایبەتی ڕۆژئاوای یەکانیان، هەردوو کـۆڵەکەکـەی کۆمەڵگای سەرمادیەداری کە چینی کرێکارانو چینی بۆژوا بوون، لە منالدانی کۆمەڵگای گەندەڵ بووی دەرەبەگایەتی سەدەکانی ناوەڕاستدا پێکەوە هـاتنە کایەوەو خۆیان نواند. ئەمەیش ئەنجامی حەتمی ی پەرەسەندنی ناوەوەی کۆمەڵ بوو کە ڕێگای خۆش کرد بەرهەمی پیشەیی بە خڕایی گەشە بکاو پەرە بسێنێو لەگەڵ خۆیدا شێوازی نوێو هێزی نوێ ی لە بەرهەمهێناندا سەپاند.[1]

بەلام لە ڕۆژهەلاتدا، دواکەوتنی شارستانیەت بواری نەدا ئەو هەلو مەرجەی بۆ برەخسێ تا لە سایەیدا بنکە ئابوری یەکە بە هەمان شێوە گەشە بکا. لەبەر ئەوە دروست بوونو پێکهاتنی چینی کرێکاران لە وولاتانی ڕۆژهەلاتدا، لە بنەڕەتەوە پەیوەندی بە هۆیەکی دەرەکی یەوە هەبوو ئەویش نەشو نماکردنی بازرگانی بوو، کە لە ئەنجامی ناردنی کەلو پەلی جۆر بەجۆر بۆ دەرەوەو هاوردنی کەلو پە لی بیانی لە دەرەوەی وولات، هاتە کایەوە. ئاکامیش ئالوگۆڕێکی گەورە لە بواری ئابوری و کۆمەلایەتیدارووی دا، کە لە دایك بـوونی چینی کرێکـاران لە ریزی پیشەوەی ئەو ئالوگۆڕە دادەنرێ. بۆیە سەرپاکی چینی کرێکـاران لە وولاتانی ئاسیاو ئەفریقیادا لەو کاتەوە پێکهاتوون کە سەرمایەداریتی ئەورووپا لە ناویاندا کەوتنە کنەکردن؛ یان بە شێوەی ڕاستەو خـۆ داگیری دەکـردن. تەنـانەت لە ژاپۆنیادا کە پەرەسەندووترین وولاتی ئاسیایەو ئەمڕۆ ململانێ لەگەڵ گەورە ترین وولاتی سەرمایەدارییدا دەکا، سەرەتای دروستبـوونو پێکهاتنی چینی کرێکارانی بەندە بەو قۆناغەوە کە پورتوگالی یـەکان لە سـەدەی شانـزەهەمدا دەسەلاتی کۆلۆنیالی خۆیان بەسەردا سەپاندو یەکەمین کۆمپانیای بازرگانی یان تێدا دامەزراندو پاشان دەستیان کرد بە بنیات نانی چەندین کۆمپانیـای تری بازرگانی بە مەبەستی ناردنە دەرەوەی کەلو پەل.

چینی کـرێکارانی عیـراق له ڕووی پێکهـاتنی یـه‌وه بـه نمـوونـه‌یـه‌کی سـروشتی ی شێوازی دووه‌م داده‌نـرێ. دواکـه‌وتـوویی وولات له ئـه‌نجـامی داگیرکردن دا له‌لایه‌ن مه‌گۆل و ته‌ته‌ر وپاشان عوسمانلی یه‌کانه‌وه، ماوه‌یان نه‌دا رێگای به‌رهه‌مهێنانی پیشه‌یی بگرێته به‌ر و به‌شێوه‌ی وولاتانی ئه‌وروپای رۆژئاوا گه‌شه بکا. له‌به‌ر ئه‌وه‌و به‌هۆی بچووکی ی بازار و که‌می ی دراوه‌وه، ئه‌م شێوه به‌رهه‌مهێنانه له باشترین حـاڵ دا له شوێنی خـۆی ده‌خولایـه‌وه، بێ ئه‌وه‌ی هه‌نگاوێك بۆ پێشـه‌وه بچێ. ئه‌وه بوو به درێژایی چه‌ند سه‌ده‌یـه‌ك له‌م باره‌دا مایه‌وه تا به‌رهه‌ مى پیشه‌یی عیراقي به‌ره‌نگاری که‌ل و په‌لی بیانی بووه‌وه‌و چووه قۆناغێکی نوێ ی ئه‌وتۆوه به‌ته‌واوی مۆرکی له‌ناوچوونی نا به تـه‌ختی ته‌وێـلی خۆیه‌وه، وه‌ك له دواییدا به درێژی باسی ئه‌نجامه‌کانی ده‌که‌ین.
ئه‌وروپایی یه‌کان له مێژووی تازه‌یاندا به‌زوویی رێگای عیـراقیان دۆزی یـه‌وه. ساڵی ١٥٨٣ نزیکه‌ی ده بازرگانی ئینگلیز به به‌غداو به‌سره‌دا رووه‌و هیندستان تێپه‌رین. یه‌کێکیشیان دوای گه‌رانه‌وه‌ی گه‌یشته مووسل و به‌م شێوه‌یه تاریفي به‌غدا ده‌کا گوایه «مه‌ڵبه‌ندێکی گه‌وره‌ی بازرگانی ی ترانسیته». کاتێکیش کـه نرخی به‌هارات لای ئه‌وروپای یه‌کان هاوتای نرخی ئالتوونی هه‌بوو[٢]
ئه‌م بازرگانه ئینگلیزه له‌و راپۆرته‌یدا که له‌مه‌ر «به‌سره» نووسیویه، ده‌ڵێ: «... مه‌ڵبه‌ندێکی گرنگی بازرگانی ی به‌هارات داوده‌رمانه».[٣]
له سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌م به‌دوواوه، ئـه‌وروپایی یـه‌کان بـه شێوه‌یـه‌کي ترسنـاك ده‌ستیان خسته کاروباری عیراقه وه، ئه‌مه‌یش ئه‌نجامی جیاجیای به ده‌سته‌وه دا. پێش هه‌موو شتێك بازرگانیی ناردنه ده‌ره‌وه‌ی که‌ل و په‌ل سنووری جارانی پساندو مه‌ودایه‌کی فراوانتری گرته‌وه‌و قه‌ڵه‌مبازێکی گه‌وره‌ی بۆ پێشـه‌وه دا، به‌تایبه‌تی دوای ساڵی ١٨٦٩ که که‌نداوی «سویس» ی تێدا کرایه‌وه نرخی که‌ل و په‌لی ره‌وانه‌کراو له عیراقه‌وه بۆ ده‌ره‌وه له نێوان ساڵانی ١٨٦٤ ـ ١٨٧١ دا که گه‌یشتبووه ١٥٠ هه‌زار دینار، له سه‌ره‌تای جه‌نگی یه‌که‌می جیهاندا گه‌یشته ٣ ملیۆن دینار. واته نرخی که‌ل و په‌لی ره‌وانه کراوی عیراق له ماوه‌ی نزیکه‌ی ٥٠ ساڵدا بیست ئه‌وه‌نده زیادی کردووه.[٤] ئه‌مه له کاتێکدا که به درێژایی چه‌ندین ساڵ له شوێنی خۆی چه‌قیبوو.[٥] جا گه‌ر بێ و ئه‌م ژماره‌یه ببه‌ینه‌وه سه‌ر ره‌گ و ریشه بازرگانی یه‌که‌ی ئه‌وکاته بۆمان ساغ ده‌بێته‌وه که تا چ راده‌یه‌ك بازرگانی ی که‌ل و په‌ل ناردنه ده‌ره‌وه له عیراقدا نه‌ش و نمای کردووه. له نێوان ساڵانی ١٨٥٠ ـ ١٨٧٠ دا له‌وه‌وه که ساڵی ٣٠٠ ته‌ن جۆی ره‌وانه‌ی ده‌ره‌وه ده‌کرد، له ساڵی

١٩١٢ دا، واته ساڵێك پێش هەڵگیرساندنی جەنگ گەیشته ٧٧ هەزار تەن، واته ٢٥٠ ئەوەندە زیادی کرد. بەنیسبەت «خوری» یشەوە، بە هەمان شێوەو لە هەمان ئەو ماوەیـەدا لە ساڵی ٣٠٠ تـەنەوە گـەیشته ١٢ هـەزار تەن. گـەنمیش ١٤ ئەوەندەی جاران رەوانەی دەرەوە کرا.[٦] بازرگانیی خورمایش گۆڕانێکی لەو چەشنەی بە خۆیەوە دی، بەتایبەتی چونکە ئینگلیزەکان گەرەکیان بوو تۆزێك لەو تەنگو چەڵەمە ئابوورییە کەم بکەنەوە کە هیندستان پێوەی دەیناڵاند. ئەوە بوو لە ساڵی ١٨٩٦ دا سە رجەمی ئەو خورمایەی رەوانەی دەرەوە کرا، خۆی دا لە ٦٠٠ هەزار سندووقو لەوچەردەیە ٥٣ هەزاری گەیشتە بەندەری نیویۆرك.[٧] ئەو شێوازە باوەی لە ئارادا بووو پەیرەو دەکرا، نەیدەتـوانی شان بـە شانی پێداویستەکانی ئەم قۆناغەو گۆڕانەکانی بڕوا. لەبەر ئەوە دەبوو پشت بە ئامڕازو هێزی تازە ببەستێ. دیارە ئەمەیش بـووە هۆی ئـەوەی عیراق دەرگـا لەسەر ئامرازی نوێی ئەورووپای بە شێوەیەکی تاڕادەیەك بەربڵاو بخاتە سەر گازی پشت. ئەو کۆمپانیا بیانییانەی بە خێرایی جێ پێیان لە وولاتدا قایمکردو ئەو کۆمپانیا خۆماڵییانەی بە مەبەستی پڕ کردنەوەی ئەو بۆشاییـیانەی کتو پـڕ هاتبوونە گۆڕێ؛ کەوتنە خۆو دەستیان کـرد بە هێنـانی ماشینی نـوێ، تا بـە هۆیانەوە هێزو گوڕ بخرێتە کاروباری کەڵو پەل رەوانە کردنەوە. لە ساڵی ١٨٨٩ دا دوو کۆمپانیای بەریتانیایی[٨] کە خەریکی خوری رەوانە کردن بوون، یەکێکیان دوو ئامێری پەستاوتنی ئاوی گەورەو ئەوی تریان دوو ئامێری پەستاوتنی هەبوو بە هێزی هەڵم ئیشیان دەکردو تێکرا ساڵی ٢٥ هەزار فەردە خورییان دەنارده دەرەوە.[٩] لە ســەرەتای ســەدەی بیستەمــدا ژمارەی ئـەو کۆمپـانیـانـەی لە سەرانسەری عیراقدا خورمایان دەنارده دەرەوە ١٢ کۆمپانیا بوون، بە تەنهـا هەشتیان لە بەسرە کاریان دەکردو[١٠] بە هۆیانەوە کاروباری رەوانە کردنی خورما بـاشترو رێـكو پێكتـرو لە رووی چـەنـدیـەتیشــەوە زۆرتـر بـوو.[١١] بـەر لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیش کۆمپانیایەکی ئەمریکـایی لە وولاتدا دامەزرا «رەگی بەلەك» ی بۆ دەرەوە دەنارد. هەر زوویش «دەوروبەری ســاڵی ١٨٦٩» جۆرە ماشێنێکی نوێ پەیدا بوو، رەگی بەلەکی گورزە دەکرد.[١٢]

پاش ئەوەی سەرمایەی رۆژئاوایی خۆی گەیاندە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو جێ پێی خۆی قایم کردو شان بە شانی پەرژەوەندییەکانی تری کە رۆژ بە رۆژ پەرەیان دەسەندو توندو تۆڵ بە شوێن پێی ئابـوورییانــەوە گرێ درابـوون؛ پێویستیان بە گەشە پێدانی هۆیەکانی هاتوچۆ بوو لە عیراقدا. لێرەوە ئینگلیزو

ئەڵمان و دەوڵەتانی تریش بایەخێکی گەورەیان بە رێگاری هامشۆی ناو روباری دیجلەو فوراتو شەتولعەرەب داو رێگاری ئاسنیشیان لە میسۆپۆتامیاوە گەیاندە کەنداوی عەرەب. لەولایشەوە بەستیانەوە بە ئەوروپاوە.[13] ئەنجامی ئەم گرنگی پێدانە، چەند پرۆژەو دامو دەزگایەکی نوێ لە و وڵاتدا دامەزران. کۆمپانیای «بێت لەنج» کە ساڵی ١٨٤٠ بە مەبەستی بازرگانی ی پێکهات، پاش ماوەیەك دوو پاپۆری گواستنەوەی بە بەردەوامی ی بە ناو روباری دیجلەدا هامشۆی دەکرد. بە مەرجێك بابی عالی ماوەی نەدا لە دوو پاپۆر زیاتر بخاتە گەڕو سەرەڕای ئەوەیش کە جاروبار پەلپو بیانووی زۆری پێ دەگیراو دەخرایە ژێر گازو گیرەوە[14]، دەڵێن سەرەڕای ئەوەیش توانی سەرکەوتنی باش بەدەست بهێنێ، بەڕادەیەك سەرمایە بنەڕەتی یەکەی کە «١٥» پانزە هەزار پاوەن بوو، لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیدا گەیشتە ١٠٠ هەزار پاوەن و لە ساڵی ١٩١٩ دا گەیشتە ٣٠٠ هەزار.[15]

رێگای ئاسنیش لە عیراقدا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیەو سەرەتای راکێشانی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم. لەو کاتەوەو تا هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهان، پەیوەندی نێوان بەریتانیاو ئەڵمان لەوپەڕی ناکۆکی و ململانێدا بوو. ئەڵمانەکانیش لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی ی ئاشکرا، توانی یان دەست پێشخەری بکەن و یەکەمین رێگای ئاسن لە میسۆپۆتامیادا دابمەزرێنن و بیکەنە بەشێك لە پرۆژەی بەناوبانگی رێگای ئاسنی بەغدا. ئەوەبوو سەر لە بەیانی ی رۆژی ٢٧ی تەمووزی ساڵی ١٩١٢ سەرۆکی ئەشغالی ئەڵمانیا، بە بۆنەی دانانی بەردی بناغەی رێگای ئاسنی بەری «کەرخ» ەوە ئاهەنگێکی گێرا. شایانی باسە بڕیار وابوو ئەو رێگایە لە «مسەرە» وەبۆ ئەوسەر خاکی عیراق ببڕێ.[16] والی بەغداو ژمارەیەکی زۆر لێپرسراوانی بیانی و پیاوی ناوداری عیراق ئامادەی ئەو ئاهەنگە بوون.[17]
ئەڵمانەکان ئەوەندە پەرۆشی ئەم پرۆژەیە بوون، تەنیا بۆ ئاهەنگەکە چل ئەندازیاری پسپۆری رەگەز جیاجیایان هێنابوو[18] و «بە هیوا بوون کرێکارو فەرمانبەری زۆر تریشی بۆ بهێنن و کات بە فیرۆ نەدەن» و ئەمم پرۆژەیە تەواو بکەن.[19] هەر بۆ ئەو مەبەستە کۆمپانیای رێگای ئاسنی بەغدا مافی ئەوەی پێ درا، بۆ گواستنەوەی کرێکارو کەلو پەلو ئامرازەکانی ئیش کردن، روباری دیجلەو فورات بەکار بهێنێ. ئەوە بوو «کۆمپانیای بەلچیکی» دامەزراو ئەم کاروبارەی پێ سپێردرا.[20] دەست بەجێ دەستیش کرا بە هێنانی ئامرازو

ماشینی پێویست بۆ ڕاکێشانی ئەو ڕێگایەو لە ماوەی دوو ساڵ کەمتردا تێکڕای ئەو شتانەی لە دەرەوەی عیراقەوە بۆ ئەم مەبەستە هێنرابوون، لە ٤٠ هەزار تەن تێپەڕی کرد.[٢١]

بەو جۆرە بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانی ٧١ میلی لێ تەواو کراو بەهۆیەوە بەغداو سامەڕا پێکەوە گرێ دران. جا لەبەر ئەوەی ئەڵمانەکان هیوایەکی گەورەیان بەم پرۆژەیە هەبوو، لە هەموو ڕوویەکەوە بایەخیان پێ دا. بۆیە ڕاپۆرتێکی تایبەتی بەریتانیا کە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ نووسراوە، دان بەوەدا دەنێ کە «ئەم بەشەی زۆر چاك دروست کراوە»[٢٢]

لە ناو ئەم دامو دەزگایانەدا کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە سەرمایەی بیانییەوە هەبوو، توێکڵی یەکەمی چینی کرێکارانی عیراق لە دەوری ئەو کاکڵە لاوازە پێکهات کە چەند پرۆژە یەکی میری دروستی کردبوو، وپاشان بە دوورو درێژی قسەی لێ دەکەین. کۆمپانیای «بێت لەنج» بۆ چاککردنەوەی پاپۆرەکانی، ئامرازو ماشینی نوێی هێناو شۆستەیەکی تایبەتیو کارگەیەکیشی لە بەسرە دامەزراند. «کۆمپانیای ڕێگای ئاسنی بەغدا» یش چەندین کارگەو دامەزراوەی دیکەی پێویستی بۆ کاروباری بینا کردنو چاککردنەوەی شەمەندوفەر هەبوو.

ئەگەرچی ژمارەی ڕاستەقینەی ئەو کرێکارانە لە ئارادا نییە کە لەو شوێنانەدا کاریان دەکرد، بەڵام سەرچاوەکان ڕوونیان کردووەتەوە کە خەڵکێك هەبوو بەکرێ ئیشیان کردووە، تارادەیەکی چاکیش لەم مەیدانە تازەیەدا سەرکەوتوو بوون.[٢٣] کەچی ژمارەی تەواوو باوەڕ پێکراوی ئەو کرێکارە کاتی یانە لەبەردەستدان کە خورمایان دەڕنیو دایان دەگرتو پاشان بۆ دەرەوەی وڵاتیان دەنادر. ژمارەی ئەوانەیش بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگ خۆی لە ٢٠ تا ٢٥ هەزار کەس داوە.[٢٤]

هەرچی سەرمایەی نیشتمانیشە ڕۆڵێکی زۆر پچووکی گێڕاوەو خۆی لە خۆیا لە پاشکۆی سەرمایەی بیانیدا بوو، لەبەر ئەوە هەر لە بنەڕەتەوە نەیتوانی ببێتە هۆی پێکهاتنی چینی کرێکارانی عیراق. چەندین هۆی جۆر بە جۆریش هەبوو کە بەم یان بەو شێوە بە یەکترەوە بەسترابوونو ئەم دیاردەیەیان خولقاند، لەسەرو هەموویانەوە پاشکەوتوویی وڵات بوو لە ڕووی شارستانیەتەوە کە ماوەی نەدا بەرهەمی پیشەیی بچێتە قۆناغێکی باڵاترەوە. ئەمە جگە لەوەی هاتنە خوارەوەی ئاستی گوزەران بوو بووە هۆی ئەوەی هێزی کڕین لای هاووڵاتیانی عیراق ئەوەندە کەم ببێتەوە لەسەرانسەری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دەستی بۆ درێژ

بکرێ. ئەمەیش بازاڕی ناوخۆی هێنایەوە یەك و ماوەی نەدا گەشە بکاو ئاسۆیەکی ئەوەندە رووناکیش نەدەبینرا تا سەرمایەی کەڵەکە بووی نیشتمانی ی هان بدا ـ ئەگەرچی لە بنچینەیشدا لاواز بوو ـ روو لە بەرهەمی پیشەسازی بکا. بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەم تێکرای هێزی کڕین لە لای هاوولاتی یەکی عیراق لە باشترین حاڵدا لە سێ یەکی تێکرای هێزی کرینی هاوولاتی یەکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کەمتر بوو[25]. لەبەر ئەوە سەرمایەداری عیراقی هەروا بە ئاسانی نەدەهاتە مەیدانێکەوە، نەیزانیایە قازانجی مسۆگەرە.

هەروا بەرێککەوتیش نەبوو « مەمەدحەت پاشا» ی والی کە دەستی بە دامەزراندنی «کۆمپانیای تەرامواى بەغدا ـ کازمیە» کرد، ناچار بوو زۆربەی بەشەکانی ئەوپرۆژەیە بەزۆرملی بەسەر فەرمانبەرەکانی ناوخۆدا بسەپێنێ و بەوانی ساغ بکاتەوە.[26] سەرمایەدارە عیراقی یەکانیش بە دوو دڵی یەکی زۆرەوە هاتنە سەر ئەو باوەڕەی چەند پرۆژەیەك بکەنەوە، بەلام ئەنجام رۆشنایی یان نەدی. لە ٢٨ ی شوباتی ساڵی ١٩١٢ دا میری مافی دامەزراندنی تەرامواى کارەبایی نێوان بە غداو «ئەعزەممی یە» و «قەرارە»ی دا بە « مەحموود چەلەبی ئەلشابەندەر » لەگەڵ ئیمتیازی دامەزراندنی ئیستگەیەکی کارەبا لە بە غدا.[27] هەر چەندە «سەرپاکی دانیشتووانی شار پەرۆشی » ئەوە بوون «بەغدابە کارەبا رۆشن بکرێتەوە» وسەرەڕای ئەوەی کە «نیشتمانپەروەری بە ئەمەك مەحموود چەلەبی ئەلشابەندەر» چووە «لە وولاتی فەرەنگ ئەندازیاری شارەزامان بۆ بهێنی»[28] و ئەگەرچی چەند ئەندازیارێکی ئینگلیزیش لە یەکی ئەیلوولی ئەو ساڵەدا گەیشتنە بەغدا بۆ لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی بارو زرووفی شارو پلان دانان[29]، بەلام ئەو پرۆژەیە رۆشنایی نەبینی. پرۆژەی راکێشانی رێگای ئاسنی نێوان بەغداو خانەقینیش کە دەویسترا بە سەرمایەی نیشتمانی ی پێك بهێزێ، بەمەرەی پرۆژەکەی پێشوو چوو.

جگە لەم هۆ بنەرەتی یە، بەشێکی گەورەیش لە سەرمایەی کەڵەکەبوو، کەوتە دەست خاوەن زەوی یە گەورەکان، کەبریتی بوون لەو سەرۆك عەشیرەتانەی نەیان دەزانی گەر بێ و سەرمایەکانیان لەبواری بەرهەمهێنانی پیشەسازییدا بخەنە کار، چ قازانجێکیان دەست دەکەوێ. بۆیە هەموو ئامانج و مەبەستیان هاتبووە سەر ئەوەی چییان لێ زیاد بێ، یان کۆی بکەنەوە، یاخود ئاڵتوون وخشڵ و چەکی پێ بکڕن. بازرگانەکانیش چاویان بڕیبووە پیشەکەی خۆیان، چونکە دەیانزانی قازانجیان مسۆگەرترە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە بەر لەجەنگی یەکەمی جیهانی مەیدانی هەرە فراوانی سەرمایەی نیشتمانیی، بازرگانیی دەرەوە بووە، ئەویش بەم یان بەو شێوە بەسترا بوو بە سەرمایەی بیانییەوە. چوار کۆمپانیا لەو هەشت کۆمپانیایەی لە بەسرەوە خورمایان دەنارده دەرەوەی وولات خاوەنەکانیان عیراقی بوون. هەروەها ژمارەی کارگەی بچووکی پێستە خۆش کردن لە بەغدادا پێش جەنگی یەکەمی جیهانی گەیشتە نۆ کارگە.[30] بازرگانەکانیش بایەخێکی زۆریان دا بە ڕەوانە کردنی خوری لەسەر شێوەی تازە. بازرگانە بەسرەییەکانیش هەندێ ماشێنی تازەیان هێنایە وولاتەوە بۆ گورزە کردنی رەگی بەلەك.

لە ئەنجامی پەرەسەندنی هۆیەکانی گواستنەوەدا، سەرمایەی نیشتمانیی توانیی ڕۆڵێکی تارادەیەك گەورە لەم مەیدانەدا بگێڕێ. بۆیە هەندێ کەس کەوتنە کرینی بەشەکانی کۆمپانیای تەراموای بەغدا ـ کازمییەووا دەردەکەوێ قازانجێکی ئەوەندە زۆری فرێ داوە گەیشتووەتە نزیکەی ١٠٠٠ر٠ی سەرمایەکەی.[31] پێش ئەوەیش چەند بازگانێکی‌تر کۆمپانیایەکی هاوبەشی لەو جۆرەیان بۆ هامشۆو گواستنەوەی ناو ئاو دامەزارند.[32] دەورو بەری ساڵی ١٨٩٦ بازگارنێکی ئەرمەنی لە بەسرە «کۆمپانیای عارەبانەی یایلی» دامەزراند، تاوەکو لە نێوان بەسرەو عەشاردا هاتوچۆ بکا. چوار ساڵ دوای ئەوە دوو کەسی تری بەسرەیی کۆمپانیایەکی دیکەی لەو جۆرەیان بنیان ناو پاشان هەوڵیان دا لەسەر هەمان ڕێگا ئۆتۆمۆبیل بەکار بهێنن.[33] لە کۆتایی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١١ دا کۆمپانیای نیشتمانیی پاپۆر بە ناوی «کۆمپانیای بازرگانیی کەشتییەکانی بەسرە» وە دامەزراو لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی داهاتوودا کەوتە کارو دوو دانە کەشتیی خستەگەر.[34] لە ساڵی ١٩١٢ دا بۆ یەکەمجار ئۆتۆمۆبیل لە نێوان بەغداو دیالەدا کەوتە گواستنەوەی خەڵکیی وماوەی‌نێوان ئەو دوو شارەی بە ٤٠ دەقیقە بڕی،[35] ئەمەیش ئەوەی دەگەیاند کە لەمەیدانی گواستنەوەو هامشۆدا گۆڕانێکی چۆنیەتی رووی دا. هەر لەم رووەوە لەو ماوەیەدا، هەوڵێکی تریش لە بەسرە درا.[36] لە دوا دوای سەدەی نۆزدەهەمەوەو لەبەر هەندێ هۆی رۆشنبیریو سیاسی، دانیشتووانی عیراق بایەخێکی باشیان بە دامەزراندنی چاپخانەدا، بە تایبەتی کە «بە چاوی خۆیان بینییان میری تا چ رادەیەك سوودو قازانجی لەو چاپخانانە دەست دەکەوێ کە مەدحەت پاشا هێنابووی»[37] هەرچەندە هەندێك لەم چاپخانە بەردین بوون، بەڵام زۆربەیان نوێ بوونو شانیان لە شانی چاپخانە ناسراوەکانی ئەوسای

ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەراست دەدا.[38] بێ گومان ئەم چاپخانانەیش هەر لەبەغداد نەبوون، بەلکو ژمارەیەکیان لە بەسرەو مووسل دامەزرا. کاتێکیش جەنگی یەکەمی جیهانی هەلگیرسا، بە تەنها لە شاری بەسرە دا چوار چاپخانە کاریان دەکرد کە تاقە یەکێکیان هی میری بوو.[39] لەو رۆژەوە ئیتر دەست کرا بە هێنانی ئامرازی دارشتن وبرین وداکوتانی مس و مشت و مال و زەرکەفت و جزوبەندکردن بۆ ئەم چاپخانانە.[40]

لەبەر ئەوە شتێکی سروشتی بوو کە ماشینی نوێ، لەوانەی پەیوەندی راستەوخۆیان بەژیانی رۆژانەو گوزەرانی دانیشتووانەوە هەبوو، بە ئاسانی بێنە وولاتەوە. ئەوەتا لە سالانی دوایی سەدەی نۆزدەهەمەوە کارگەی بەفر دروستکردن و ئاشەمەکینەی نوێ و کارگەی سۆدەو سیفون و لەو بابەتانە لە شارە گەورەکانی عیراقدا دامەزرێنران.[41] لە سالی ۱۹۰۸ دا کۆمپانیایەکی چنینی بچووك لە بەغدا بنیات نراو مەکۆی تازەی لە دەرەوە بۆ هێنرا[42] پێش بەرپا بوونی جەنگیش ماشێنێکی میکانیکی خشت دروست کردن هێنرایە عیراقەوە.[43]

ئەگەرچی لە ناوەراستی سەدەی رابوردووەوەو لە ئەنجامی هاوردنی کەل و پەلی بێگانەوە، دەستێکی توند لە بەرهەمی پیشەیی وەشێنرا، بەلام لەم قۆناغەدا هەر ئەو بنکەی سەرەکیی پیشەسازیي نیشتمانیی بوو،[44] ئەویش بەشی زۆری پێویستی یەکان، لەبابەتی قوماش و شت و مەکی ناومال و کەرەسەی بیناکاری و کەل و پەلی تری بۆ هاولاتیان دابین دەکرد. تا جەنگی یەکەمی جیهانی بە سەدان مەکۆی دەستیی خەریکی بەرهەمهێنانی قوماش و چادرو گوریس و شتی لەو جۆرە بوون. بە نموونە لە سالی ۱۹۱۱ دا بە تەنها لە شاری مووسلدا ۵۰۰ جۆلا کاریان دەکرد،[45] دیارە لە بەغداد ژمارەیان لەوەیش زۆرتر بووە. لە کۆتایی سەدەی رابوردوودا قونسولي بەریتانیایي لەبەغدا، باسی بیست کوورە خشتی گەورەو بچووك دەکا. نزیکەی بیست سالێك دوای ئەو مێژووەو بەهۆی ئەوەوە کە خەلکیی هەلپەی دروست کردنی خانووبەرەبان دەکرد، ئەم جۆرە پرۆژرانە ژمارەیان زیادی کرد.[46] سەرەرای بەکارهێنانی کە شتی نوێ و بنیات نانی کۆمپانیای تایبەتی بۆ هامشۆو گواستنەوە، کەچی پیشەسازی بەلەم و کەشتیی دروستکردن لە چەند شارێکی عێراقدا وەك خۆی مایەوەو ئەوانەی خاوەنی ئەم پیشەیە بوون دەیانتوانی کەشتی وا دروست بکەن دژێژی ۳۰ گەزو پانیی ۸ گەز پتربێ.[47]

ئەم دام و دەزگا ئەهلیانە، بوونە سەرچاوەی دووەمی پێکهێنانی چینی کرێکارانی عیراق. ئەو کارگە نوێیانەی سەر بەم کەرتە بچووکە بوون،

ژمارەیەکی باش کرێکاریان تێدا جێ بووەوەو شێوازی ئیش کردنیان تەواو لەگەڵ شێوەی کارکردنی پێشوودا جیاواز بوو. شان بە شانی ئەمانەیش بە هەزاران کرێکار بەردەوام لەو جێگا پیشەیی یانەدا ئیشیان دەکردو تا زادەیەکیش زرووف ئیش کردنیانْ بە هۆی تەشەنە کردنی کاریْ کریْ گرتەوە گۆڕدرا بوو.

سەرچاوەیەکی تری پێکهێنانی چینی کرێکاران و هۆی گەشە کردنی کە بە پلەی سێیەم دەست نیشان دەکرێ، بەندە بەو کاروبارانەوە کە والی یەکانی عوسمانلی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیدا جێ بەجێ یان کرد. پەرژەوەندی خەزینەی عوسمانلیش لەوەدا بوو هەندێ پرۆژەی نوێ بۆ دابین کردنی پێداویستەکانی فەیلەقی شەشەم کە بارەگاکەی لە بەغدا بوو، ئەنجام بدا. «نامیق پاشا» کە دوو جار کرا بە والی عیراق «١٨٥٢ و ١٨٦١ ـ ١٨٦٧» یەکەم کەسە ئەم مەسەلەیەی خستە ئەستۆی خۆی. ئەوە بوو لە ساڵی ١٨٦٤ دا یەکەم کارگەی میکانیکی نوێی دامەزراندو لەو خوری یەی لە ناوخۆی وولاتدا دەرێسرا، جل و بەرگی سوپایی دروست دەکرا.[٤٨]

گەشە کردنی زووی پیشەسازی لە عیراقدا، ئەگەر لەتەك ناوی والی رۆشنبیری عیراق «مەدحەت پاشا» دا باس بکرێ مافی خۆیەتی. ناوبراو لە یەکەم ووتاریدا کە بە بۆنەی دانانی یەوە بە والی عیراق لە ساڵی ١٨٦٩ دا خوێندی یەوە، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە پێویستە بایەخێکی گەورە بە پیشەسازی نوێ بدری.[٤٩] لە یەکەم ژمارەی رۆژنامەی «الزوراء» داکە خۆی دەری کرد، قسە لە «کەشتی ناو دەریا» و «رەوتی شەمەندوفەری نێوان وولاتان» و «هێزی ئەلەکتریك و... کارگە» و «زۆری تریش لەو شتانەی کاروباریان ئاسان کردووە» و «پیشەسازی جۆربەجۆر» دەکا کە چۆن هەموو ئەمانە وایان لە ئەوروپایی یەکان کردووە «لەم دونیایەدا بە خۆش گوزەرانی ی بژین».[٥٠]

راستی یەکەی « مەدحەت پاشا » ئەوەندەی کە دەستی توانای دەیگەیشتیْو بە پێ ی ئەو دەسەلاتەی پێ ی بەخشرابوو، هیچ کەمتەر خەمی یەکی بۆ پێشخستنی ئەم لایەنە ئابووری یە گرنگە نەکرد. ئەوەبوو لەسەردەمی ئەودا کارگەی چنینی « عەباخانە » کە « نامیق پاشا » دایمەزراندبوو، فراوان کراو چەردەیەکیش پارەی تەرخان کرد بۆ هێنانی ماشێنێکی نوێ کە هێزی ٧٠ ئەسپی هەبوو. گرنگی یەکی زۆریشی دا بە چاککردنی چەك و پەرەپێدانی تا «پێویستی یەکی گرنگ » دابین بکا، وەك رۆژنامەی « الزوراء » ی ئەو کاتە نووسیویە.[٥١] هەر لە سەردەمی ئەویشدا بوو کۆمپانیای تەراموای بەغدا ـ کازمی یە دامەزراو هێڵێك بە درێژایی ٧ کیلۆمەتر

راکێشرا، هەردوو شارەکەی پێکەوە دەبەست. دامەزراندنی یەکەم چاپخانەی نوێ لە سەردەمی ئەودا بە مەزنترین کاری مەدحەت پاشا دادەنرێ. لە ساڵی ١٨٦٩ دا والی تازە « چاپخانەیەکی نایاب، کەشخە و بە هەڵم ئیش کردوو » ی دامەزراندووە « چاکترین چاپخانەی میسر » نایگاتێ.(٥٢) کاروباری ئەو چاپخانەیە بە تەنها بریتی نەبوو لە دەرکردنی یەکەم رۆژنامە لە مێژووی وولاتدا،(٥٣) بەڵکو هەندێ نووسراوو ساڵنامەی چاپ دەکردو کاروباری رەسمیشی ئەنجام دەدا. ئەوانەیشی بەرەو دوا پاش « مەدحەت پاشا » بوونە والی عیراق ژمارەیەکی تر چاپخانەیان هێناو لە ساڵی ١٨٨٩ دا یەکێکیان لە بەسرەو دووانیشیان لە بەغدا دامەزرێزان. ئەو چاپخانەیەیش کە ساڵی ١٩٠٥ «حازم بەگ» دایمەزراند، دوا چاپخانەیە میری لە دەرەوەی وولاتەوە هێنابێتی.(٥٤)

عوسمانلییەکان لەکاروباری گواستنەوەدا تارادەك بایەخیان بە بەکارهێنانی کەشتی دەدا، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا پەیوەندییەکی پتەوی بە گەشە کردنی پیشەسازییەوە هەبوو. « رەشید پاشا » یش کە ساڵی ١٨٥٢ کرا بە والی عیراق، رایسپارد چەند کەشتییەکی هەڵمی لە ئەوروپا بۆ بکڕن. بۆ بەرێوەبردنیشیان کەلو پەلی لە ئەورووپاوە هێناو لە بەری «کەرخ» دا «دەمیرخانە» واتە «ئاسنگەرخانە» یەکی دامەزراند بۆ چاککردنەوەی ئەو کەشتییانە. « نامیق پاشا » یش لە سەر هەمان رێو شوێنی ئەو، کارخانەکانی بەلجیکای راسپارد چەند کەشتییەکی هەڵمی بۆ دروست بکەن، تاوەکو لە روباری دیجلەدا بیانخاتە گەڕ. ئەوە بوو لە سەردەمی خۆیدا دوو لەو کەشتییانە گەیشتنە عیراق و لە دەوروبەری ساڵی ١٨٦١ دا کەوتنە ئیش. بێجگە لەوەیش « دەمیرخانە » کەی فراوانتر کردو چەند کرێکاری لە ئەورووپاوە بۆ هێناو بە رادەیەك پەرەی پێ دا، توانای چاك دروستکردنیشی هەبوو.(٥٥)

« مەدحەت پاشا » لە والییەکانی پێش خۆی زیاتر بایەخی بەوە دا لە روبارەکانی وولاتدا کەشتی بخاتە گەڕ بە تایبەتی چونکە دەیویست لەم مەیدانەدا بەربەرەکانەی کۆمپانیا بیانییەکان بکاو بە هۆی ئەم پرۆژەیەیشەوە دەستکەوتێکی باش بۆ خەزێنەی دەوڵەت دابین بکا. ئەوە بوو دوو پاپۆڕی تازەی کڕیو بەم دوانەوە ژمارەی کەشتییەکان لە سەردەمی ئەودا گەیشتنە هەشت کەشتی. ئنجا کۆمپانیایەکی تایبەتی دامەزراند بۆ سەرپەرشتی کردنی کاروباریان وچەردەیەکی باش خەڵووزی بەردینی لە « عەدەن » و « مەسقەت » و « بەندەر عەبباس » و «بوشەهر » خست. ئەمانەیش یەکەم کەشتی عوسمانلی

بوون له نۆكەندی « سوێس » ە وەو لە ناو دیجلەو فوراتیشدا بەرەو ژوور گەیشتنە دوورترین شوێن. دەمیرخانەكەیشی پەرە پێدا كە لە دوادوای سەردەمی « نامیق باشا » دا پشت گوێ خرا بوو.(٥٦)

هەرچەندە بەربەرەكانێ كردنی كۆمپانیا گەشەكردووە بیانی‌یەكان لەم مەیدانەدا كارێكی گران بوو ، بەڵام عوسمانلی‌یەكان تا جەنگی یەكەمی جیهانی بایەخیان بە هامشۆو گواستنەوەی ناو ئاودەدا . لە ساڵی ١٩١١دا میری بە مەبەستی پەرەپێدانی هات‌وچۆلە نێوان عێراق و سوریادا دوو . . پاپۆڕی لە روباری فوراتدا خستە گەڕو توانی‌یان بە ماوەی ٧٥ سەعات بگەنە « مەسكەنە ».(٥٧)

یەكێك لەو پرۆژانەی دەوڵەت لە سەرەتای جەنگی یەكەمی جیهاندا جێ بە جێی بەستی [هیندی‌یە] بوو، كە ٣٠٠ هەزار لیرەی تێ چوو، و لە رۆژی ١٢ی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩١٣ دا كرایەوە.(٥٨) ئەم پرۆژەیەیش ژمارەیەك كرێكاری گرتە خۆی و بە بەتەنها لەو شوێنانەدا كە خۆڵكاریی دەكرا، ژمارەیان لە نێوان هەزار تا سێ هەزار كرێكار دا بوو؛ نزیكەی هەزار كرێكارێكیش لەو شوێنانەدا كاریان دەكرد كە گەچی پێویستیان بۆ پرۆژەكە دروست دەكرد.(٥٩) شایانی باسە ئەم پرۆژەیە وەك پرۆژەكەی رێگای ئاسنی بەغدا، سەبارەت بە راپەڕاندنی بەشێك لە كاروبارەكانی ئامرازو ماشینی تازەی بەكار دەهێنا. لێرەدا ئینگلیزەكان دوو شەمەندوفەریان خستە كارو هەریەكەیان ٢٠ ئەسپ هێزی راكێشانیان بوو، بە درێژایی كیلۆمەترێك یەكی ١٦ عارەبانەی پڕ لە خۆڵیان رادەكێشا، بەم كارەیش گەیشتنە « ئەنجامێكی سەر سوڕهێن »، وەك « ویلكۆكس » لە راپۆرتەكەیدا نووسیویە.(٦٠) جگە لەمانە هەر لەو پرۆژەیەدا چەندین ئامرازی تازەی‌تر بەكارهاتن، لەوانە پێنج ماشینی گەڕۆكی توانا ١٦ ئەسپی بوون، ئەو ترومپایانەیان دەخستە گەڕ كە پارەیەكی زۆریان بۆ پرۆژەی ناوبراو پاشەكەوت دەكرد.(٦١)

بەر لە جەنگی یەكەمی جیهانی، چ دەوڵەت و چ هاووڵاتیان فرسەتیان لە هەندێ لە كانەكانی وولات هێنا، وەك: خەڵووزی بەردین و خوێ و قیرو بەردە مەرمەڕ. ئەو خەڵووزەی ئەوسا لەنزیك كفری‌یەوە دەردەهێنرا ساڵی بە ٣٠٠ تەن خەمڵ كراوە. لە «هیت» «رۆژی لە ٤٠ تا ١٠٠ باری گوێ درێژ قیر دەردەهێنرا»(٦٢)

ئەمانەی باس كران ئەو سێ سەرچاوە سەرەكی‌یە بوون كە تێیاندا تۆوی چینی كێكارانی عیراق چەكەرەو نەش و نمای كرد. لە ناو ئەمانەدا ژمارەیەكی زۆر كرێكاری هەمیشەیی و كاتی ی ئیشیان دەكرد. رۆژهەڵاتناسی سۆفیەتی دكتۆر ل. ن. كاتلۆف ژمارەیان بە «دەیان هەزار» دەخەمڵێنێ و بۆ ئەم بۆچوونەیشی پشت بە چەندین سەرچاوەی جۆر بە جۆر دەبەستێ، لە پێش هەموویانەوە، ئەو راپۆرتانەن كەكونسوڵی‌یەتی رووسی ئامادەی كردوون.(٦٣) هەرچۆنێك بێ

کرێکاران وایان لێهات له پێکهێنانی دانیشتوانی شارەکاندا قەوارەیان پەیدا کرد، بە تایبەتی ئەگەر ئەوەمان لە پێش چاو بێ کە تا ساڵی ١٩٠٥ شارنشینەکان ٢٤٪ ی تێکرای دانیشتووانی عیراقیان پێك دەهێنا.[٦٤] گرنگ ئەوەیە ئاگامان لەوە بێ کە ژمارەیەکی باشی ئەم توێژە کۆمەڵایەتی یە نوێ یە لەو کاتەوە کەوتنە خۆ کە شێوازو هەل و مەرجی نوێ ی ئیش کردنیان پەیرەو کرد.

## هەل و مەرجی ئیش کردن و خاسیەتەکانی کرێکارانی عێراق بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان

بێ گومان شتێکی زۆر سروشتی یە کە هەل و مەرجی ئیش‌کردن لە عیراقدا پێش جەنگی یەکەمی جیهانی زۆر نالەبار بوو بێ؛ چونکە ئەو دیاردەیە خۆی لە خۆیدا ئاوێنەیەکی بێ گەردی واقیعی دواکەوتووی وولاتو نزمی ی ئاستی گوزەرانی جووتیاران بوو، لە سایەی سیستەمی چەوساندنەوەی دەرەبەگایەتیدا، کە ناچاری دەکردن بە هەموو بارو زرووفێکی ئیش‌کردن قایل بین، جا ئیتر بۆ رازی کردنی سەرەك عەشرەتەکەیان بوو بێ، یان هەڵاتن بوو بێ لە پەیوەندی دەرەبەگایەتی، یاخود بۆ ئەوە بووبێ گیروگرفتی ئابووری لە سەرشا نیان سووك بکەن. لەبەر ئەوە هەروا بەرێکەوت نی یە کە ساڵی ١٨٨٩ قونسوڵی بەریتانیا لە بەغدا، دەنووسێ و دەڵێ: «چەندت بوێ کرێکاری ناشارەزات دەست دەکەوێ»[٦٥] ئەمانە کە ئامادەی کار دەبوون، هەرگیز بیریان لە سەعاتی ئیش‌کردن نەدەکردەوە. راستی یەکەیشی سەعاتی ئیش کردن دیاری نەکرا بوو. بۆیە کرێکار لە رۆژهەڵاوە تا رۆژ ئاوا بوون و جاری وایش هەبوو تا دوای رۆژ ئاوا بوون کاری دەکرد. شارەزاترین کرێکار رۆژی لە دە تا یازدە سەعاتو تەنانەت زۆر جار لەوەیش زیاتر خۆی دەرەتاند.[٦٦] نزمی ی ئاستی گوزەرانی خێزانە دەست کورتو هەزارەکان پاڵی بە ژن و منداڵەوە دەنا بۆ ئیش کردن. ئەوانە لایەنێکی گەورە بوون و ئەو هەزاران کرێکارە کاتی یانەیان پێك دەهێنا کە هەلپەی ئیش‌کردنیان دەکرد، بە تایبەتی لە مەیدانی رنین و داگرتنی خورمای بۆ دەرەوە رەوانە کراو دا. ژن و منداڵ نیوەی ئەو کرێکارانە بوون کە گەچیان بۆ پرۆژەی بەستی [هیندی یە] بەرهەم دەهێنا. قۆنتەراتچی یەکانی ئەو پرۆژەیەیش بۆ تەواو کردنی ئیشەکەیان پشتیان بە کرێکاری ئافرەت منداڵ دەبەست.[٦٧]

لەو کاتەدا رۆژانەی کرێکار لە عیراقدا، کەمترین رۆژانە بوو لە سەرانسەری ئیمپراتۆریەتی عوسمانلیدا. لە کاتێکدا کە تێکرای رۆژانەی

کرێکارێکی چنین لە ناو تورکیادا ٥ر٨ قروش بوو، کرێکارێکی عیراقی لەسەر هەمان پیشە رۆژی ٧ قروشی وەردەگرت. تێکرای رۆژانەی کرێکارانی پێستە خۆش‌کردن لە تورکیادا ١٣١٦ قروش بوو، کەچی رۆژانەی کرێکاری پێڵاودروو لە عیراقدا ١ر٢ قروش کەمتریشی هەبوو.[٦٨] لە گەڵ ئەوەدا کە خشت دروست کردن کارێکی قورسەو تا دێتە بەرهەم بە چەند قۆناغێکدا تێ دەپەڕێ[٦٩]، کەچی ئەو کرێکارانەی گرانترین قۆناغی ئەم پیشەیەیان ئەنجام دەدا لە بەغدادا، رۆژانەکەیان ٧ قروش بوو[٧٠]. لە ئیش‌و کاری بیناکاریشدا رۆژانەی کرێکار زۆر لەوەیش کەمتر بوو. ئەوانەی لە پرۆژەی بەستی [هیندی‌یەدا] خۆڵکاری‌یان دەکرد لە باشترین حاڵدا رۆژانەکەیان لە نێوان ٣ و ٤ قروشدا بوو. ئەو منداڵانەیش لە مەیدانی بینا کردندا کاریان دەکرد رۆژی ٥ر١ قروش‌و ئەوانەی خەریکی گەچ دروست کردن بوون لە ٥ر١ تا ٥ر٢ قروشیان وەردەگرت.[٧١] جاری وایش هەبوو، کرێکار لە بریتی ئەو ئیشە قورس‌و گرانەی جێ بەجێی دەکرد کرێی نەختینەی ددرایە، ئەمەیش دەبووە هۆی ئەوەی کرێی راستەقینەیان بێتە خوارەوە.* لە هەموویشی خراپتر ئەوە بوو کە ئەو دام‌و دەزگایانەی سەر بە خەزێنەی دەوڵەت بوون بەزۆریی سەربازو بەندەکانیان دەهێنا بۆ ئیش کردن‌و کرێیەکی رەمزییان دەدانێ. لە زۆر ناوچەیشدا ئیشی سوخرە باو بوو، تەنانەت ئەم دیاردەیە خۆی گەیاندە هەندێ لە شارەکانی عیراق، بە نموونە لە شارێکی وەك بە سرەدا « بەناو حەماڵ‌و شۆفیرەکان » یان ناچار کرد لە شار هەڵبێن‌و بچنە دەرەوە.[٧٢]

پەیوەندی دەرەبەگایەتی‌و عەشرەتگەریش یەکێك بوو لە لەو هۆیانەی درێژەی بەباری چەوساندنەوەی کرێکاران‌و کەم کردنەوەی رۆژانەیان دەدا. لە دەورو بەری ساڵی ١٨٧٦ دا موتسەرِیفی شاری « مونتەفیك » هەر لەبەر ئەوەی خۆی یەکێك بوو لە سەرۆك عەشرەتەکانی ئەو ناوچەیە توانی ژمارەیەکی زۆر جووتیاری ناوچەکە بە رۆژانەیەکی کەم بەکرێ بگرێ بۆ ئەوەی بەستێك لە سەر روباری فورات بنیات بنێ.[٧٣] ئەوانەیش کە سەرپەرشتی‌ی پرۆژەی بەستی هیندی‌یەیان دەکرد بە ئارەزووی خۆیان کرێکارانیان هەڵدەسووڕاند، ئەمەیش نەك لەبەر زۆریی کرێکارو کەمی‌ی رۆژانەکەیان، بەڵکو لەبەر ئەوەی مانگی لیرەیەکیان بەو سەرەك عەشیرەتانە دەدا کە پەنجا کرێکاریان رەوانەی پرۆژەکە دەکرد.[٧٤] ئەمە جگە لەوەی کە سەرۆك عەشرەتەکان بە کەیفی خۆیان‌و بەبیانووی ئەوەی گوایە لە بەردەم میرییدا لێپرسراون، پارەیان لە کرێکاران دەکێشایەوە.[٧٥] لە هەمان کاتیشدا هەندێ لەو سەرۆك عەشیرەتانە لە

پرۆژەکەدا بوونە قونتە راتچی.

جا بۆ ئەوەی واقیعی ژیان و گوازەرانی کرێکاری عیراقی لە قۆناغەکانی یەکەمی مێژووی دروست بوونی دا تێ بگەین، نرخی کەل و پەلی پێویستی ئەو کاتە بە نموونە دەهێنینەوە. لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٨ دا نرخی هوققەیەك « دەکاتە چوار کیلۆگرام» نان ٥ر٢ قروش و هوققەیەك گۆشتی مەڕ ٥ قروش و هوققەیەك رۆن ١٦ قروش بوو.[٧٦] لە کاتێکا رۆژانەی کرێکار هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات، کەچی بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەم نرخی شت و مەك بە خێرایی بەزر بووەوە. نرخی ئەو پێویستی یانەی باس کران لە ساڵی ١٩١٣ دا، واتە لە ماوەی بیست ساڵ کەمتردا سێ تا چوار ئەوەندە زیادیان کرد. بەو جۆرە نرخی هوققەیەك نان گەیشتە ٦ قروش و گۆشت ٢٤ قروش و رۆن ٤٠ قروش.[٧٧]

ئامرازەکانی ئیش کردن و بەرهەمهێنان بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی تەواو سەرەتایی بوون، بێ گومان ئەمەیش زیاتر هەل و مەرجی ئیش کردنی گران دەکرد. ئەو کرێکارانەی لە پرۆژەی بەستی هیندی‌یەدا ئیشیان دەکرد « دەبوو پاچ و پێ‌مەرەی خۆیان بۆ ئیش ببەن ».[٧٨] لە « هیت » کرێکاران بە لقی دارخورما قیریان دەردە هێنا.[٧٩] دیارە لە بارو زرووفێکی وادا ژمارەی کرێکارە شارەزاکان تا بڵێی کەم دەبوون، ئەوانەیشی کە هەبوون لە بنەڕەتدا پیشەوەرو دانیشتووی شار بوون. قوتابخانەی پیشەوەرانیش کە « مەدحەت پاشا » بنیاتی ناو ژمارەی قوتابی‌یەکانی گەیشتە ١٥٠ کەس، نەیتوانی رۆڵێکی ئەوتۆ بگێڕی و کرێکاری شارەزا پێ بگەیەنێ، بە تایبەتی چونکە مەبەست لە بنیات نانی ئەو قوتانجانەیە ئەوە بوو، چەند کادیرێکی شارەزا بۆ چاپخانەکەی میری و دەمیرخانەکەی پێ بگەیەنێ کە خەریکی پەرە پێدانی بوو. پرۆژەی رێگای ئاسنی بەغدایش هەندێکی تری لەو کرێکارە شارەزایانە قۆزتەوە.[٨٠] ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دوو چاپخانەی میری بە هۆی پشتگوێ خستن و نەشارەزایی یەوە بە تەواوی لە کار کەوتن.[٨١] کەمی‌ی کادیرو سادەیی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بوونە هۆی سستی‌ی بەرهەم. باشترین بەڵگەیش ئەوەیە کە بەر لە جەنگی یەکەم بینای دایەرەیەکی بچووکی پۆستە لە نزیك سەنتەری بەغداوە نزیکەی دوو ساڵی خایاند.[٨٢]

پێش هەڵگیرساندنی جەنگ نە لە دامەزراوەبیانی‌یەکان ونە لە دام و دەزگا رەسمی‌یەکانی‌میری و ئەهلیدا، یاسای زامن کردنی ژیانی کرێکار لە گۆڕێ نەبوو. تەنانەت ئەگەر کرێکارێك لە کاتی ئیش‌کردندا بمردایە، کەس و کارو

وەچەی ئەو کرێکارەمیچیان لە بریتی وەر نەدەگرت. لەو رۆژگارەی عیراقدا تاقە بەندێك چی یە لە یاسای کارو کرێکاری دەوڵەتی عوسمانلی بەسەرکرێکارانی عیراقدا نە دەچەسپا. دەبێ ئەوەیشمان لە بیر نەچێ کە ئەو یاسایە لە روانگەی تەسکی سەدەکانی ناوەڕاستەوە دانرا بوو، لە بنەڕەتیشدا یاسایەکی ناتەواوو پووچەڵ بوو، لەبەر ئەوە نە بەرگری لە کرێکاران دەکردو نە دانی بە مافەکانیشیاندا دەنا.[٨٣]

بۆیە شتێکی سروشتی ی بوو کە لە سایەی ئەم بارو زرووفەدا کرێکارێکی نوێ و جووتیارێکی جاران جیاوازی یان نەبێ؛ ئەوەندە هەیە هەل و مەرجی پێکەوە ئیش کردن لە چەند پرۆژەیەکداو کاری قورس و گران لە هەندێ پرۆژەی تردا، لە جاران پتر تووشی نەخۆشی ی و مەترسی دەکردن. « ئاداموف » ی قونسوڵی رووس لە بەسرە، بۆمان دەگێڕێتەوە کە چۆن ئەو کرێکارانەی لە وەرزی خورما رنین دا دەهاتن بۆ کارکردن منداڵەکانیان لە تەك خۆیان دا دەهێناو لەبارو دۆخێکی زۆر نارەحەت داو لەناو حەسیردا دەژیان و خۆراکی سەرەکی یان یا ئەو خواردنە بوو کە لە گەڵ خۆیان هێنابوویان، یاخود خورمای پاشماوە بوو. بە مەیش دەبوونە سەرچاوەی گەلێك دەردو نەخۆشی ی وەك « کۆلێرا » و « تاعوون » و « ئاوڵە » و « تەراخۆما » ، کە نیوەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە بە دەستی یانەوە دەیان ناڵاند.[٨٤] سەرەڕای هەموو ئەمانە کرێکاری عیراق بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەم، بۆی نەکرا بە هوشیاری یەوە بجووڵێ و هەنگاوێکی ئەوتۆ بنێ کەمێك زوڵم و ستەمی لە سەر کەم ببێتەوە. ئەوانە بە هیچ شێوەیەك هەستیان بە واقیعی چینایەتی خۆیان نە دەکرد، جگە لەوەیش پابەندی نەریتی عەشایەری و دابەش بوونی پیشەیی لادێ بوون. بە سەرێکی تریش لە تەك ئامرازو ماشێنی نوێ ی تەکنیکی دا پەیوەندی یەکی لاوزیان هەبوو. ئەم هۆیانە کارکیان کرد لە سەر حاڵی خۆیان بەردەوام بن، واتە جووتیار بوون، بەڵام لە بەرگی کرێکاردا. لەبەر ئەوە بچووکترین نیشانەمان لە بەردەستادا نی یە، بزووتنەوەیەکی رێك و پێکی کرێکارانەمان لەو قۆناغەی مێژووی چینی کرێکارانی عیراقدا نیشان بدا. ئەوەندە هەیە چەند بزووتنەوەیەکی خۆرسك لە هەندێ ناوچەی جیاجیادا روویان دا، بێ ئەوەی شوێن دەستیان دیار بێ و شتێکی ئەوتۆ لە پاش خۆیان بەجێ بهێڵن. لە ساڵی ١٨٧٦ دا وکاتێك لە شاری « مونتەفیك » دا زوڵم و ستەم گەیشتە لوتکە، ئەو کرێکارانەی لەو شارەدا خەریکی بنیات نانی بەستێك بوون، بڕیاریان دا مان لە ئیش بگرن. بەڵام موتسەڕیفی ئەو شارە توانی بە زەبری چەك ناچاریان بکا بچنەوە سەر ئیش. گرنگ ئەوەیە ئەم مانگرتنە لە ئەستەمبووڵدا

دەنگی دایەوەو رۆژنامەکانی ئەو کاتە لە سەریان نووسی.[٨٥] لە سەرەتای جەنگی یەکەمیشدا دەباغچی یەکانی ئەعزەمی یە کە لە رووی چەندیەتی و چۆنیەتی یەوە حسابیان بۆ دەکردا، دوو جار مانیان گرت. یەکەمجار لە پایزی سالی ١٩١٢ دا، کاتێك کرێکاران کۆبوونەوەو بریاریان دا تا رۆژانەکانیان زیاد نەکرێ نەچنەوە سەر ئیش. پاشان «شیخ عەبدولرەزاق ئەلچەلەبی» کە سەرۆکی دەباغچی یەکان بوو، لە گەلیان کەوتە وتوویژ کردن و ملی بۆ داخوزی یەکانیان کە چ کردو ئەوانیش چوونەوە سەرئیش و کاری خۆیان.[٨٦] دووەمجاریش لە سەرەتای کانوونی یەکەمی ١٩١٣ دا بوو، کاتێك «عەبدولهادی ئەلئەعزەمی» کە رۆشنبیرێکی ناوچەکەبوو،[٨٧] سەرکردایەتی کردن. ئەمجارەیان بەتەواوی دەستیان لە ئیش هەلگرت و داویان کرد ٢٥٪ ی رۆژانەکەیان بۆزیاد بکری و ئەنجام «خاوەن کارگەکان ناچار بوون داخوازی یەکانیان جێ بەجێ بکەن و ئەمانیش گەرانەوە سەرئیش».[٨٨]

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە چینی کرێکارانی عیراق جگە لەوەی بە زەحمەت لەدایك بوو، درەنگیشی خایاند. سەرەتا وەك هێزێکی بچووك لە چوارچێوە کۆمەلایەتی یەکەدا شان بە شانی چینی بۆرژوای گەورەی بازرگانی ی خۆی نواند. بێ گومان ئەم چینەی دوایی یان راستەو خۆ پەیوەندی بە سەرمایەی بێگانە «کۆمپرادۆر» ەوە هەبوو. چونکە هەردوو چینی کرێکاران و بۆرژوای بازرگانی لە سایەی چەند هۆیەکی چون یەکدا پێکهاتن. چینی کرێکارانی عیراق وەك چینی کرێکارانی گشت وولاتە دواکەوتووەکان بە چەندین سال بەر لە بۆرژوای پیشەسازیی نیشتمانی دروست بوو بوو. لای خۆیشمان لادێ سەرچاوەی سەرەکی ی پێکهاتنی ئەم چینە تازەیە بوو. زۆربەی کرێکاران لەم قۆناغەدا هێشتا پەیوەندی یان لەتەك لادێدا نەپساندبوو. تەنانەت کەلە پرۆژە تازەکان دا ئیشیان دەکرد، بۆ ئەوە بوو ئابوری کشت و کالی یان بە تەواوی هەرەس نەهێنێ، تایبەتی چونکە چەوساندنەوەی دەرەبەگایەتی گەیشتبووە لوتکە.[٨٩] هەر لەبەر ئەوەیش بوو کرێکارە کاتی یەکان و ئەوانەی وەرز بە وەرز ئیشیان دەکرد، زۆربەی چینی تازە پێ گەیشتووی کرێکارانیان پێك دەهێنا. ئەم دیاردەیەیش راستەوخۆ کاری کردە سەر ئاستی هوشیاری چینایەتی و سیاسی کرێکاران و رادەی پەرەسەندنیان لەو قۆناغەدا. تەنانەت لە رووی سایکۆلۆژیشەوە کاری لە زۆربەیان کردبوو. نەبوونی پەیوەندی یەکی سەرومر لەتەك ئامرازی نوێی بەرهەمهێناندا وای کرد لەسەر رەوشت و خووی

جووتیاران بمێننەوە، نەك پەیرە وی نەریتو هەڵسو کەوتی کرێکـاران بکەن. لەبەر ئەوەئەم چینە کۆمەڵایەتی‌یە نوێیە هەر ئەوە بوو کە لە خۆیدا بوو بووە چینێك Class in it self، واتە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی تازەی پێ نەگەیشتوو بوو، بە هیچ شێوەیەك واقیعی ژیانو رۆڵی گرنگی خۆی لە پرۆسیسی بەرهەمهێناندا نەدەزانی. نەیدەزانی چ ڕێگایەکیش هەڵبژێریو هەنگاوی یەکەمی رزگاربوونی خۆی لێوە بهاوێژێ.

سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئەم قۆناغەی مێژووی چینی کرێکارانی عیراق بە قۆناغێکی گرنگ دادەنرێ، چونکە هەر لەو ماوەیەدا کـاکڵەو توێـژی یەکـەمی پێکهاتو جووتیاران بەشێوەیەکی فراوانو بەربڵاو ڕێگای شاریان گرتە بـەرو پەیوەندی نێوان شارو لادێ پەرەی سەند. هەموو ئەم دیاردانەیش لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیو ساڵانی دوای جەنگدا لەبواری کۆمەڵایەتیو سیاسی‌دا جێ پەنجەیان دیار بوو.



## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

١ - یەکەم چینی کرێکار لە مێژوودا لەدەورو بەری سەدەی پازدەدا لە ئیتالیا دەرکەوت. بۆیە ئیتالیا بە یەکەمین وولات دادەنرێ کە بەر لەوولاتانی‌دیکەی ئەوروپا پەیوەندی‌یەکانی سەرمایەداری تێدا لە دایك بووبێ.



٢ ـ لەو رۆژگارەدا بەهارات گرنگترین کەلو پەلی بازرگانی بوو کە لە رۆژهەلاتەوە رەوانەی رۆژئاوا دەکرا. لە کۆتایی سەدەکانی ناوەراستدا بایەخێکی زیاتریش پێدراو لەهەمان کاتیشدا هەلو مەرجی گواستنەوەی چووە بارو دۆخێکی گرانەوە، بۆیە بەشێوەیەکی خەیالی ی نرخی زیای کرد، بە رادەیەك بووە پێوانەی سامانی خەلکی ئەوروپا. گەران بەشوێن کانگای نوێ ی بەهاراتدا یەکێکە لەو هۆیانەی پالی بە ئەوروپاییەکانەوە نا شوێنی تازە بدۆزنەوە.

٣ ـ Zaki Salih, Mesopotamia (Iraq) 1600 — 1914. A Study in British foreign Affairs, Baghdad. 1957, P.P. 27 — 28.

٤ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە [الدكتور محمد سلمان حسن. التطور الاقتصادي في العراق. التجارة الخارجية والتطور الاقتصادي ١٨٦٤ ـ ١٩٥٨] الجزء الاول. صيدا. بيروت ١٩٦٥. ل ٩٤.

٥ ـ پێش ئەو ماوەیە کەلو پەلی عیراق تەنها بۆ وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەنێردرا.

٦ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە: «التطور الاقتصادي في العراق، الدكتور محمد سلمان حسن. سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٢ ـ ١١٧.

٧ ـ لە سالی ١٨٧٧ دا سەرجەمی خورمای بەرهەمهێنراوی عیراق ٦٠ هەزار تەن بوو، ٤٠ هەزاری رەوانەی دەرەوە کرا. هەروەها بڕوانە.

Zaki Saleh, OP. Cit. P. 195.

K. M. Langley, The Industrilization of Iraq P. 26.

٨ ـ مەبەست لە هەردوو کۆمپانیای «بێت لەنچ» و «داربی ئەندەروویر» ە.

٩ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: «الدكور محمد سلمان حسن» سەرچاوەی پێشوو ل. ٢٨٦ ـ ٢٨٧. هەروەها [K. M. Langley, Op.Cit; P. 28].

١٠ ـ ل. ن کاتلۆف. راپەڕینی رزگاریخوازانەی نیشتمانیی عیراق سالی ١٩٢٠. بەزمانی رووسی. مۆسکۆ. ١٩٥٨ ل. ٥٩.

١١ ـ سالی ١٩٠١ ئەو کۆمپانیانەی لە بەسرە ئیشیان دەکرد، ٣٠ هەزار سندووقیان زیاتر ناردە دەرەوە.

١٢ ـ بڕوانە: «الشيخ محمد الشيخ خليفة بن حمد بن موسى النبهاني. التحفة النبهانية.» الجزء التاسع «تاريخ البصرة» الطبقة الثانية. القاهرة ١٣٤٢ هـ ل ٦٤.

١٣ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە: Zaki Saleh, OP. cit., PP. 149 — 202

١٤ ـ S. H. Longrigg, Four Centuries of modern Iraq, 1925, PP, 293 — 294.

١٥ ـ Zaki Saleh, OP. cit., PP, 159, 188 — 189, R. Coke. Baghdad — the city of the peace, London 1927, P. 241.

١٦ ـ یەکەم جار لە سالی ١٨٨٨ دا بیر لە پرۆژەی رێگای ئاسنی بەغدا کرایەوە، واتە ئەو سالەی کە بە هۆی رێگای شەمەندوفەرەوە، ئەستەمبوولو بەرلین پێکەوە بەستران. دوای ئەوەی رێگای ناوبراو بەرەو خوار هات و پاش دەسال کە تزاری ئەلمانیا ولیامی دووەم بۆ جاری دووەم سەری لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا، کافتی وەرگرت ئیمتیازی راکێشانی رێگای ناوبراوی بدرێتێ لە شاری «قۆنیە» وە تا کەنداوی عەرەب.

١٧ - بڕوانە گۆڤاری «لغة العرب» بغداد. ايلول ١٩١٢ ل. ١١٧.

١٨ - هەر ئەو سەرچاوە.

١٩ - «لغة العرب» آذار ١٩١٢ ل. ٣٦٧.

٢٠ - «لغة العرب» تشرين الاول ١٩١٢ ل. ١٥٨.

٢١ - الدكتور محمد سلمان حسن. سەرچاوەی پێشوو ل. ٤١٤.

٢٢ - مركز الوطني للوثائق الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/١٠ موضوع الملفة: المسكك ١٩٢٦ «ڕاپۆرتی ژەنەرال ف.د. هامند».

٢٣ - ئەندازیارە ئەڵمانیەکان دووبارەی دەکەنەوە کە کرێکارانی کورد لەو پرۆژەیەدا تەواو لێهاتوو بوون. بڕوانە Dagobert Von Mikusch, Mustafa Kemal between Europe and Asia, London, 1931. P. 300.

٢٤ - ل. ن. کاتلوف. سەرچاوەی پێشوو ل ٥٤.

٢٥ - بۆ تێ گەیشتنی تەواوی ئەو ژمارانە؛ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ل ٤٩ - ٥٠.

٢٦ - بڕوانە: K. M. Langley. OP. cit., P.10

٢٧ - بڕوانە: ڕۆژنامەی «العراق» بغداد. ٢٣ حزيران ١٩٢٨.

٢٨ - «لغة العرب» نيسان ١٩١٢ ل ٤٥٥

٢٩ - «لغة العرب» تشرين الثاني ١٩١٢.

٣٠ - بڕوانە: S. H. Longrigge, Irag 1900 to 1950. A Political, Soci al and economic history, London, 1953 PP. 32 — 33.

٣١ - بڕوانە: K. M. Langley, OP. cit., P. 10.

٣٢ - بڕوانە: S. H. Longrigge, Four Cinturies of Modern Iraq PP. 293 — 294.

٣٣ - بڕوانە: [الشيخ محمد الشيخ خليفة بن حمد بن موسى النبهاني. الجزء التاسع. التحفة النبهانية] ل. ٦٤ - ٦٥.

٣٤ - «لغة العرب» تشرين الثاني ١٩١٢.

٣٥ - «لغة العرب» تشرين الثاني ١٩١٢.

٣٦ - بڕوانە: «الشيخ النبهاني. الجزء التاسع» سەرچاوەی پێشوو ل ٦٥.

٣٧ - بەقسەی گۆڤاری «لغة العرب» کانوون الثاني ١٩١٣ ل ٣٠٣.

٣٨ - هەرئەوسەرچاوە ل ٣٠٣ - ٣٠٥.

٣٩ - بۆ زیاتر شارەزا بوون لە چاپخانەکانی عیراق پێش جەنگی یەکەمی جیهانی، بڕوانە: گۆڤاری «لغة العرب» کانوّ الثاني ١٩١٣ ل ٣٠٣ - ٣٠٩. «التحفة النبهانية. الجزء التاسع» ل ٦٦ - ٦٧. «شهاب احمد الحميد. تاريخ الطباعة في العراق. مطابع القطاع الخاص ١٨٣٠ - ١٩٧٥ الجزء الاول بغداد ١٩٧٦.

٤٠ - «لغة العرب» كانون الثاني ١٩١٣ . ل ٣٠٤ - ٣٠٥.

٤١ - بڕوانە: «التحفة النبهانية. الجزء التاسع. ل ٦٤ - ٦٥، ٦٧ - ٦٨.
عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين. المجلد الثامن. بغداد ١٩٥٦ ل ٦٥.

٤٢ - بڕوانە: K. M. Langley. OP. cit., P. 30.

٤٣ - [الدكتور محمد سلمان حسن. التطور الاقتصادي في العراق] ل. ٣٠٤

٤٤ - لە بەشی چوارەمدا بە درێژیی لەو باسە دەدوێین، چونکە پەیوەندییەکی ڕاستەو خۆی بە سروشتی بزووتنەوەی کرێکارانەوە هەیە بە تایبەتی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی.

٤٥ ـ الدكتور محمد سلمان حسن. هەر ئەو سەرچاوە ل ٢٨٣.
٤٦ ـ هەرئەوسەرچاوە ل ٣٠٣.
٤٧ ـ بروانە «لغة العرب» ايلول ١٩١٢ ل. ٩٥ ـ ٩٦.
٤٨ ـ بروانە: (الدكتور محمد سلمان حسن) هەر ئەو سەرچاوە ل ٢٩٢.
٤٩ ـ بروانە دەقی ووتارەکەی مەدحەت پاشا کە لە کتێبی «تاریخ العراق بین احتلالین» ی «عەبباس ئەلعەزاوی» دا بلاو کراوەتەوە. بەرگی حەوتەم ل ١٦٢ ـ ١٦٤.
٥٠ ـ لەکتێبی «من تاریخ الصحافة العراقیة» ی خالد حبیب الراوی، یەوە وەرگیراوە. بغداد ١٩٧٨ ل. ٩ ـ ١١.
٥١ ـ لە کتێبی «تاریخ العراق بین احتلالین» ەوە، وەرگیراوە. بروانە: بەرگی حەوتەم ل ٢٢٣.
٥٢ ـ بروانە: گوڤاری «لغة العرب» کانون الثانی ١٩١٣ ل ٣٠٤.
٥٣ ـ مەبەستمان رۆژنامەی «الزوراء» ە ئە رۆژی ١٥ ی حوزەیرانی ١٨٦٩ یەکەم ژمارەی دەرچوو.
٥٤ ـ بروانە: «لغة العرب» کانون الثانی ١٩١٣. ل ٣٠٤ ـ ٣٠٥ هەروەها «تاریخ العراق بین احتلالین. عباس العزاوی» المجلد السابع ل ١٠٢ ـ المجلد الثامن ل ١٧١.
٥٥ ـ بروانە: تاریخ العراق بین احتلالین. عباس العزاوي، المجلد السابع ل ١٠٩ ـ ١٣٦، ١٥٣ ـ ١٥٤، ٢٢٢ ـ ٢٢٣.
٥٦ ـ بروانە «التحفة النبهانیة ـ الشیخ النبهانی» سەرچاوەی پێشوو ل ٦٣ ـ ٦٤ هەروەها «تاریخ العراق بین احتلالین. عباس العزاوی» المجلد السابع. ل ١٨٨ ـ ١٨٩، ٢٢٢ ـ ٢٢٣.
٥٧ ـ «لغة العرب» تموز ١٩١١ ل ٣٣ ـ ٣٤.
٥٧ ـ «لغة العرب» تموز ١٩١١ ل ٣٣ ـ ٣٤.
٥٨ ـ بروانە: «لغة العرب» کانون الثانی ١٩١٤ . ل ٣٩٠ ـ ٣٩١.
٥٩ ـ سێر ویلیام ویلکۆکس. ئاودێریی لە عیراقداو سەرەتایەك لە بارەی پاشەرۆژی عیراقەوە. بەرگی یەکەم. بەغدا ١٩٣٧. ل ١٢٦ ـ ١٣٤.
٦٠ ـ هەر ئەو سەرچاوە ل ١٤٠.
٦١ ـ هەر ئەو سەرچاوە ل ١٤١ ـ ١٤٢.
٦٢ ـ «لغة العرب» آذار ١٩١٢. ل ٣٥١ ـ ٣٥٢.
٦٣ ـ ل. ن. کاتلۆف. سەرچاوەی پێشوو. ل ٥٥.
٦٤ ـ بروانە: الدکتور محمد سلمان حسن. سەرچاوەی پێشوو. ل ٥٣ ـ ٥٥.
٦٥ ـ لەلاپەرە ٣٠٣ ی سەرچاوەی پێشووەوە، وەرگیراوە.
٦٦ ـ بروانە: سعید عبود السامرائی. سیاسات التصنیع والتقدم الاقتصادی فی العراق. النجف. ١٩٧٣ ل ٥١.
٦٧ ـ سیر ویلیام ویلکۆکس. سەرچاوەی پێشوو. ل ١٢٨، ١٣٤.
٦٨ ـ ل. ن. کاتلوف. سەرچاوەی پێشوو. ل ٥٦ هەروەها ا. د. نوفیجیف. باسێکی ئابوری تورکیا بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی. بە زمانی رووسی. مۆسکۆ ـ لنینگراد. ١٩٣٧ ل ١١٣.
٦٩ ـ بروانە: «لغة العرب» حزیران ١٩١٣ ل ٥٦٠ ـ ٥٦٦.
٧٠ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٥٦٦.

٧١ ـ بڕوانە: سیر ویلیام ویلکۆکس. سەرچاوەی پێشوو. ل ١٢٦، ١٢٨، ١٣٤.

• ئەو پارەی کرێکار بە شێوەی ڕۆژانە، یاخود مانگانەوەری دەگرێ، پێی دەوترێ کرێی بە ناو «الاجر الاسمی». بەڵام کرێی ڕاستەقینە ئەو کرێیە یە کە کرێکار تا چەند دەتوانێ پێویستییەکانی ژیانی خۆیو خاوخێزانی پێ دابین بکا. هاتنە خوارەوەی بەهای کرێی ڕاستەقینەو زیاد کردنی کرێی بەناو ئەگەر نرخی پێویستیو کەلو پەلی لەگەڵدا نەچەسپێ، لەبریتی ئەوەی کرێکاران بەرەو خۆشگوزەرانی بەرێ، بەرەو خراپییان دەبات ـ وەرگێڕ ـ

٧٢ ـ النصرة في اخبار البصرة. للقاضي احمد نور الانصاری. تحقیق الدکتۆر یوسف عز الدین بغداد ١٩٧٦. ل ٤٢ ـ ٤٣. «ڕاپۆرتێکە ناوبراو ساڵی ١٢٧٧ ی کۆچی بۆ مونیب پاشای والی بەسرەی نووسیوە».

٧٣ ـ بڕوانە: «عبد الرزاق مطلك الفهد» سەرچاوەیپێشوو ل ٩٤.

٧٤ ـ سیر ویلیام ویلکۆکس، سەرچاوەی پێشوو. ل ٩٤.

٧٥ ـ سەرەك عەشرەتەکان کاتێیان بە میری دەدا چەند کرێکاری پێویست بێ بۆی بهێنێو لە هەمان کاتیشدا بەرپرسیاری هەموو کردارو هەڵسو کەوتێکیان بن.

٧٦ ـ لغة العرب، آذار ١٩١٣ ل ٤٢٠ ـ ٤٢١.

٧٧ ـ لغة العرب، ایلول ١٩١٢. ل ١١٧ ـ ١١٨. کانون الثانی ١٩١٣. ل ٩١٩. آذار ١٩١٣ ل ٤٢٠ ـ ٤٢١.

٧٨ ـ سیر ویلیام ویلکۆکس، سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٦.

٧٩ ـ سعید عبود السامرائی. سیاسات التصنیع والتقدم الاقتصادی في العراق. ل ٥٢.

٨٠ ـ بڕوانە: The Iraqi Directory. A General and commercial Direct ory of Iraq 1936, Baghdad 1936. P 556.

٨١ ـ بڕوانە: لغة العرب، کانون الثانی ١٩١٣، ل ٣٠٤.

٨٢ ـ بڕوانە: عباس العزاوی. العراق بین احتلالین. المجلد الثامن. ل ٢٣٩.

٨٣ ـ لە بەشی سێیەمدا کە باسی یاسای کرێکارانە دەکەین، دێینەوە سەر ئەم مەسەلەیەو بە درێژیی لێی دەدوێین.

٨٤ ـ لە «ل.ن. کاتلۆف» ە وە، وەرگیراوە. بڕوانە ڕاپەڕینی ڕزگاریخوازانەی نیشتمانیی عیراق ساڵی ١٩٢٠. بە زمانی ڕووسی. ل٥٦

٨٥ ـ بڕوانە «عبد الرزاق مطلك الفهد» ل ٩٤. هەروەها «محد احمد محمود. احوال العشائر العراقیة العربیة وعلاقتها بالحکومة ١٨٧٢ ـ ١٩١٨. رسالة ماجستیر. بغداد» ل. ٤٦. ٤٧.

٨٦ ـ بڕوانە «لغة العرب» تشرین الثاني ١٩١٢. ل٢١٦. هەروەها «لغة العرب» آیار ١٩١٣.

٨٧ ـ گۆڤاری «لغة العرب» ناوی ناهێنێ، ئەوەندە نەبێ دەڵێ «. ئەمجارە سەرۆکەکەیان یەکێکە وەختی خۆی لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی دەرچووە» بڕوانە «لغة العرب» کانون الثاني ١٩١٤. ل ٣٩٢. وا باس دەکرێ کە «عەبدولڕەزاق ئەلئەعزەمی» بەردەوام هەڵوێستی ئیجابی بەرامبەر توێژە کۆمەڵایەتییە هەژارەکەی ناوچەکەی خۆی هەبووەو لە ساڵی ١٩٢٤ دا قوتابخانەیەکی ئێوارانی لە گەڕەکی ئەعزەمییە بۆ قەلاچۆ کردنی نەخوێندەواری کردوەتەوە.

٨٨ ـ «لغة العرب» کانوون الثانی ١٩١٤. ل ٣٩١ ـ ٣٩٢.

٨٩ ـ زۆربەی کات، کرێکار خاو خێزانی لە لادێ بەجێ دەهێشت، چونکە نەیدە توانی لە ناو شاردا ژیانیان بۆ مسۆگەر بکا. ئەمە جگە لەوەی کە لادێ بۆ حاڵەتی بێکاریو نەخۆشیو پیربوون تاقە پەناگای بوو. لەبەر ئەوە بە هەموو توانایەوە پارێزگاری ئەو پەیوەندییەی دەکرد، بەتایبەتی کەدەبینی ژیانی عەشایەری بە هەموو جوامێریو پیاوەتییەکییەوە، تاکەپشت و پەنای خۆی و خێزانەکەیەتی.

له زووه‌وه ئینگلیزه‌كان بیریان له میسۆپۆتامیا كردبووه‌وه‌و لایان وابوو سنووری رۆژئاوای تاج‌و ختی دێرینه‌یانه‌. دوای ئه‌وه‌ی ئه‌م ووڵاته له رووی ئابوری‌یه‌وه به پاشكۆی به‌ریتانیاوه به‌ستراو به‌ته‌واوی جێ پێ ی خۆی تێدا قایم كردو بنكه‌یه‌كی ئه‌وتۆی تێدا دامه‌زراند، ده‌یتوانی پشتی پێ ببه‌ستێ، ده‌ڵێین دوای ئه‌وه‌و له‌گه‌ڵ هه‌ڵگیرساندنی ئاگری جه‌نگی یه‌كه‌مدا خۆیان بۆ ئه‌وه ئاماده كرد داگیری بكه‌ن‌و به ره‌سمی‌ی بیلكێنن به ئیمپراتۆریه‌ته فراوانه‌كه‌یانه‌وه. له‌به‌ر ئه‌وه رۆژێك دوای هه‌ڵگیرساندنی جه‌نگ له نێوان ده‌وڵه‌تی عوسمانلی‌و هاوپه‌یمانه‌كاندا، ئینگلیز ده‌ستی كرد به جێ كردنی ئه‌و هێرشه‌ی بۆ داگیركردنی عیراق سازی دابوو.

جه‌نگی یه‌كه‌می جیهانی له‌چاو شه‌ڕه‌كانی تری پێشووی نێوان ده‌وڵه‌تاندا جیاوازی‌یه‌كی ته‌واوی هه‌بوو. ئه‌م جه‌نگه‌یان له هه‌موو كاتێك زیاتر پشتی به‌خێرایی‌و ته‌كنیك ده‌به‌ست. هه‌ندێ شتی نوێ‌ی هێنایه كایه‌وه پێشتر له ئارادا نه‌بوون. دیاره عیراقیش نه‌یده‌توانی خۆی له‌م په‌ره‌سه‌ندنه‌و ئه‌نجامه‌كانی به‌دوور بگرێ؛ به‌تایبه‌تی كه بووه یه‌كێك له مه‌یدانه سه‌ره‌كی‌یه‌كانی جه‌نگ له رۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست دا.

چینه ساواكه‌ی كرێكارانی عیراق له سه‌رووی هه‌موو ئه‌و توێژه كۆمه‌ڵایه‌تی‌یانه‌وه داده‌نرێ كه له چه‌ندین رووه‌وه روودا‌و كاره‌ساته‌كانی جه‌نگ كاری له دروست بوون‌و پێكهاتنیان كرد بوو. ئینگلیزه‌كان ده‌یانویست به زووترین كات ووڵات داگیر بكه‌ن‌و به‌ته‌واوی ده‌ستی به‌سه‌ردا بگرن. عوسمانلی‌یه‌كان وئه‌ڵمانه‌كانیش له‌گه‌ڵیاندا، گه‌ره‌كیان بوو به هه‌ر نرخێك بێ عیراقیان له ده‌ست ده‌رنه‌چێ، ئه‌مه‌یش نه‌ك له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شوێنێكی ستراتیژی هه‌بوو، به‌ڵكو له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له جیهانی ئیسلامیدا جێگایه‌كی دیارو كاریگه‌ری داگیر كردبوو. هه‌ردوولاو به تایبه‌تی ئینگلیزه‌كان هه‌وڵیان ده‌دا، به په‌له ئه‌و پرۆژانه جێ‌به‌جێ بكه‌ن كه به هۆیانه‌وه مه‌به‌سته‌كانیان دێته دی. ئه‌ڵمانه‌كان بایه‌خێكی زۆریان به پرۆژه‌ی رێگای ئاسنی به‌غدا، داو ده‌ستیان كرد به راكێشانی ئه‌و هێڵه له سامه‌ڕاوه‌و به‌ره‌و ژوور. ئه‌و به‌شه‌یشی كه ته‌واو بوو بوو، چه‌ند له توانای دا بوو به‌كاریان هێنا. توركه‌كان بۆ ئه‌وه‌ی ته‌نگو چه‌ڵه‌مه‌ی سووته‌مه‌نی‌یان نه‌یه‌ته رێ چ بۆ كه‌شتی‌یه‌كانیان‌و چ بۆ شه‌مه‌ندوفه‌ری نێوان به‌غداو سامه‌ڕا، راده‌ی ئه‌و خه‌ڵووزه‌ی له « كفری » ده‌رده‌هێنرا له ساڵێكدا گه‌یاندیانه هه‌زار ته‌ن. بۆ ئه‌م مه‌به‌سته كانێكی ئێجگار قووڵیان هه‌ڵكه‌ند. هه‌روه‌ها رێگایه‌كی تازه‌یشیان له

نێوان « کفری » و دیجله دا کردەوە. بە شێوازە باوەکەی ئەوسا بەرهەمی نەوتیان زیاد کرد. جا لەبەر ئەوەی ئینگلیزەکـان دەستیان بـەسـەر گشت دەرگـاکانی کەنداوی عەرەب دا گرتبوو، ئەڵمانەکـان نەیـان دەتوانی لە لای سـەرووەوە پەیوەندی بە تورکیاوە بکەن، ناچار بوون لە کـاتی جەنگـدا دامو دەزگایـەکی پالاوتنی نەوت دابمەزرێنن.[1] ئینگلیزەکان لە هەمووشت زیاتـر بایـەخیان بـە کردنەوەی ڕێگا دەدا، تاوەکو ماشێنو کەلو پەلی سوپاییان بە ئاسانیی بەرەو ژوور بڕوا، بە تایبەتی کە توانییان لە ڕۆژانی یەکەمی هێرشەکەیاندا، « فاو » داگیر بکەنو پاشان بچنە « بەسرە » وە. فراوان کردنی بەندەری « فاو » لە ڕیزی پێشەوەی ئەو پڕۆژانەدا بـوو کە هێـزی داگیرکـەر دەستی پێ کرد. چـونکە پێویستییەکی لە ڕادەبەدەریان پێی هەبوو، بـۆ داگرتنو بـەتاڵکـردنی ئەو کەشتییانەی چەکو جبەخانەو تفاقی جەنگیان بۆ سوپا دەهێنا. جا ئەم کـارە سەرەڕای ئەوەی کە زۆر گران بوو لە ماوەیەکی کەمدا ئەنجام دراو بەندەری ناوبراو وای لێهات لە ماوەی دووساڵو نیو کەمتر دا. ووزەی گەیشتە هـەشت ئەوەندەی جاران. ئەمە لە کاتێکدا کە تا ساڵی ١٩١٦ دامو دەزگای ئەو بەندەرە بە ٤٧ ڕۆژی تەواو ئنجا دەیتوانی باری ١١ پاپۆڕ دابگرێ. واتە تێکڕای ووزەی لە ڕۆژێکدا ١١٧ تەن بوو. کەچی لە ساڵی ١٩١٨ دا، ئەم ژمارەیە گەیشتە ٣٩ پاپۆڕو بە «٥» ڕۆژ بەتاڵ دەکران. واتە تێکڕای ووزەی لە ڕۆژێکدا بوو بە ٣٣٨ تەن.[2] بێ گومان ئەم کارەو دەست پیاهێنانی بەندەرەکە، پێویستیی بە ژمارەیەکی یەکجار زۆر کرێکار دەبوو؛ ئەمەیش ئینگلیزەکانی ناچار کرد بە تایبەتی لە « بوشەهر » ەوە بیانهێنن.[3]

پڕۆژەکانی ڕێکاری ئاسن بە فراوانترینو گرنگترینی ئەو پڕۆژانە دادەنرێ کە داگیرکەران لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی دا جێ بەجێیان کرد. لەگەڵ چوونە پێشەوەی سوپاکەیشیاندا دەستیان بە ڕاکێشانی ڕێگای ئاسن کردو تەنها لە ماوەی شەڕدا لە بەندەرەوە بەرەو ژوور ١٢٥ میلی لێ تەواو کرا.[4] ڕێگـای دووەمیشیان کە هەر ئینگلیزەکان لە ماوەی جەنگدا تەواویان کرد، ڕێگای نێوان « حیللە » و « بەغدا » بوو کەدرێژاییەکەی ٦٥ میل دەبوو. ئەمە جگە لەوەی کە لقێکی رووەو « کفل » ڕاکێشا تاوەکو بەئاسانی دەغلو دان بگەیەنێتە سوپا داگیر کەرەکەی. پاش داگیر کردنی بەغداو لەتەك چوونە پێشەوەی سوپاکەیدا رووەو مووسڵ، دەست کرا بە دامەزراندنی دوو ڕێگای تازە یـەکەمیـان ساڵی ١٩١٧ گەیشتە « باقووبە » و ئنجا بەرەو ژوور بردیان تا لە ساڵی ١٩١٨ دا گەیاندیانە

جەبەل مەنسوور؛ پاشان لە نزیك سنووری ئێرانەوە گەیشتە « قۆرەتوو » و « خانەقین ». ڕێگای دووەمیشیان ئەوەی نێوان بەغداو سامەڕا بووولەو شوێنەوە دەستیان لێ هەڵگرتبوو کەوتنە ئیشکردن. ئینگلیزەکان ئەو ڕێگایەیان بەرەو « بێجی » بردو تەواویان کرد، تاوەکو بەزوویی یارمەتی سوپایی بگەیەنێتە ئەو ناوچەیە، بە تایبەتی چونکە لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ دا بزووتنەوەی سوپایی لەو ناوچەیەدا دەستی پێ کرد.

لە هەمان کات دا داگیرکەران دەستیان کرد بە کردنەوەی ڕێگاو بانو هەڵکەندنی جۆگەو روبار، تا بە ئاسانیی ماشێنو ئامرازە سوپایییەکانیان بگوێزنەوەو بەهۆیانەوە تفاقی جەنگو زەخیرەو کەلو پەل بگەیەننە سوپاکەیان. پاش داگیرکردنی بەغدایش چەند کارگەیەکی خشت دروست کردنیان بنیات نا بە نەوت ئیشیان دەکرد.[5] جموجۆڵی ئینگلیزەکان لەمەیشی تێپەڕاندو خۆی گەیاندە بواری کشتو کاڵ، تاوەکو دەغڵو دانی پێویست بۆ هێزە سوپاییەکەی ناو عیراق دابین بکا. بە نموونە: لە ساڵانی شەڕدا دەستیان بە هەڵکەندنی نۆکەندی مەحموودییە کردو ١٢٠٠ ـ ١٧٠٠ کرێکار ئیشی تێدا دەکردو لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ دا کرایەوە.[6]

ئینگلیزەکان بۆ تەواو کردنی ئەم کاروبارانەیان پێویستیان بە ژمارەیەکی ئەوەندە زۆر کرێکار هەبوو، سەرچاوە مێژووییەکان هەریەکە بە جۆرێك باسی دەکەن.[7] بە پێی ئەو زانیارییانەی « ا. ت. ویلسن » ی لێپرسراوی سیاسی ناو سوپای بەریتانیا لە خاکی عیراقدا، باسی دەکا سەرجەمی ئەوکرێکارانەی لە کاتی جەنگدا بۆ مەرامی جۆر بەجۆر خراونەتە سەرئیش نزیکەی ١٥٦ هەزار کەس بووەوبەم شێوەیەی خوارەوە دابەش کرابوون. ٨ هەزار بەندی هیندیو ١٥ تیپ کرێکاری هیندی کە هەر تیپەی بریتی بوو لە هەزار کرێکارو ١٢ تیپی تری هیندی کە لەو کوڵکێشانەی بۆ بارکردنو بەتاڵ کردنی پاپۆڕو کەڵەكو شەمەندوفەر پێکهاتبوون. نزیکەی ٤٠ تیپی ناوخۆییش « چەند کەرتێکی ئێرانیو کوردو عەرەب » ی تێدا بوو لەم لاولەو لا ئیشیان دەکردو ژمارەیان خۆی لە ٥٠ هەزار کەس دەدا.[8] بە تەنها ژمارەی ئەوانەی لە پرۆژەکانی ڕێگای ئاسن دا ئیشیان دەکرد ٢٤ هەزار کرێکار زیاتر بوون.[9]

وا دیارە ئینگلیزەکان سەرەڕای ئەو هەموو کرێکارە زۆرەی لە بەردەستیان دا بوو، هێشتا بەدەست دەردی بێ کرێکارییەوە دەیان ناڵاند، بۆیە مەوڵیان دا لە ناوچەکانی کەنداوی عەرەب « مەسقەت، بوشەهرو شوێنی ترەوە » کرێکار بهێنن.[10] تەنانەت حاڵ گەیشتە ئەوەی ماوەی هاووڵاتیانیان نەدەدا بە ئارەزووی

خۆیان کرێکار بخەنە ئیشەوەو دەبوو بە بێ کۆبوونی تایبەتی کرێکار رابگرن. ئەوەتا لە ٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ دا «س. ج. هوکر» ی حاکمی سوپایی بەغدا بەیاننامەیەکی دەرهەق بەو کۆڵکێشانەی ئینگلیز زۆر پێویستی پێیان بوو، بڵاو کردەوە تێیدا دەڵێ:

«بەم بەیاننامەیە هەموو ئەو بازرگان و خانچی یانە ئاگادار دەکەین کە کۆڵکێشیان لەلا ئیش دەکا؛ لەمەو دواو بۆ کاروباری گواستنەوە لەناو غەدادا، ژمارەیەکی دیاری کراو کۆڵکێش رادەگیرێ. بازرگانەکان بەهۆی ئەم دایەرەیەوە نەبێ، بۆیان نی یە ئیش بەکەس بکەن و نابێ هیچ کۆڵکێشێکیش هەڵپەی ئەوە بکا راستەوخۆ بچێتە لای بازرگانەکان بۆ ئیش کردن..»[11]

کاتێکیش مەغزاو مەبەستی ئەم دابەش کردنە بە چاکی ی تێ دەگەین کە ئەو راستی یەمان بۆ دەردەکەوێ ژمارەیەکی ئێجگار زۆر کۆڵکێش لە ساڵانی جەنگدا لە بەغدا ئیشیان دەکرد. ئەوەتا لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨ دا سەرجەمی هەموویان گەیشتووەتە ٦٨٢٨ کەس.[12] جا داگیرکەران بۆ ئەوەی ئەو ناتەواوی یە پڕ بکەنەوە، ژن و منداڵیان لەو کاروبارانەدا دەخستە ئیشەوە کە دەیانزانی سوودیان لێ وەردەگیرێ. لە پرۆژەیەك لە پرۆژەکانی بەغدادا کە ژمارەی کرێکارەکانی ٢٩٠٠ کەس بوو، ١١٠٠ کەسیان ئافرەت بوون، واتە نیسبەتیان ٤٠٪ی گشت کرێکارانی پرۆژەکەی دەگرتەوە.[13]

بێ گومان بەڕێوەبردنی ئەم هەموو خەڵکە جۆراو جۆرو جیاوازە لە بارو دۆخی ناخۆشی جەنگدا، هەروا شتێکی ئاسان نەبوو، بەتایبەتی ئینگلیزەکانیش دەیانویست سوودی تەواو لە وزەو توانایان وەربگرن. لێرەدا نیشان دانی چەند نموونەیەکی ئەو واقیعە تاڵەی کرێکاران لە ساڵانی جەنگدا دیویانەو تێیدا ژیاون بەسەو بگرە زۆریشە بۆ ئەوەی نارەواترین شێوەی کۆیلەیەتیمان بێنێتەوە یاد.

بەر لە هەموو شتێك ئینگلیزەکان بەسەرپەرشتی ی ژەنەراڵێکی سەر بە سەرۆکایەتی ئەرکان، دایەرەیەکی تایبەتی یان دامەزراند. ئەرکی ئەم دایەرەیش هەر ئەوە نەبوو چی کرێکاریان پێویستە مسۆگەری بکاو لە گشت بارو زرووفێکدا زامنی هێشتنەوەیان بێ، بەڵکو ماوەیەیشی نەدەدا دام و دەزگاو دایەرەکانی تری میری بۆ پەیدا کردنی کرێکاران لەناو خۆیاندا بەربەرەکانەی یەکتری بکەن، چونکە هەموو چەشنە بەربەرەکانەیەك کاری دەکردەسەر بازاڕو رۆژانەی کرێکاران.

ئەوەیشی کە زیاتر دەرفەتی چەوساندنەوەی بۆ ئینگلیزەکان دەرەخساندو لەسایەیدا کرێکاری عیراقی و بیانی دادەدۆشی ی ئەوە بوو، سەرەك عەشرەتی

گەورەو بچووك و خەڵكی تریش دەبوونە قونتەراتچی و لەناوەوەو دەرەوە چەندیان پێویست بوایە كرێكاریان بـۆ كۆ دەكـردنەوە. ئینگلیـزەكانیش لە پـاداشی ئەم هەڵوێستەیاندا ئیمتیازی ئەوتۆیان پێ دەبەخشین، تاوەكو بەردەوام بن لەسەر كۆكردنەوەی كرێكاران و چەوساندنەوەیان.[١٤] جگە لەوەیش لە كاتی پێویستدا، بێ سڵەمینەوە هێزیان بەكار دەهێنا، وەك لە ناوچەی « فاو » رووی دا.[١٥] ئەوەتا كەسێكی وەك « مس بێل » كە ئاگای لە وردو درشتی كاروباری عیراق بووە، دان بەوەدا دەنێ كە هێزە داگیركەرەكان « تا رادەیەكی باش هێزیان بەكار هێناوە » بۆ ئەوەی چەند تیپێك كرێكار كۆ بكەنەوە.[١٦]

ئنجا بۆ ئەوەی ئەو كرێكارانە بە باشترین شێوە بچەوسێنرێنەوە ئەوانەی سەرپەرشتی ی ئەم دایەرەیەیان دەكرد، كەوتنە دابەش كردنیان بەسەر چەند تیپێكی جیا جیاداو هەر تیپەی بریتی بوو لە هەزار كرێكار. هەر تیپەیش دابەش دەكرا بەسەر چەند بلۆكێك « كۆمەڵێك » و هەر یەكەیان بریتی بـوون لە ١٠٠ كرێكارو تاكە كەسێك سەرپەرشتی دەكردن پێ ی دەترا « ئودوباشی ». ئـەمیش چوار كەس یارمەتی یان دەداو هەریەكەیان بەرپرسیار بوو لە ٢٥ كەس. ئەمانە لەبەر ئەوەی ئیمتیازو دەستكەوتی تایبەتی یان دابوونێ، بۆ چەوساندنەوەی هاو خوێنی خۆیان لەئینگلیز ئینگلیزتر بوون.[١٧]

دەبوو هەموو كرێكارێك لەگەڵ دامەزراندنی دا، ئیستیمارەی تایبەتی پڕ بكاتەوە و تێیدا ئەو زانیاری یانەی پەیوەندی یان بە ناونیشان و شوێنی ئیش كردنی پێشوویانەوە هەبوو بنووسیایەو چەند زمانیشی بزانیایە تێیدا تۆمـاری دەكرد. قەواڵەیەكی بە ئینگلیزی و عـەرەبی ی نووسـراوی مۆر دەكـردو بەپێ ی ئـەو قـەواڵەیە دەبـوو گشت ئەو مـەرجانـەی بۆی دانـراون و زیاتـر پێ ی دەبووە داردەستی چەوسێنەران، جێ بەجێ یان بكا. ئەمەی خوارەوەیش ئەو مەرجانەن كە لەناوەرۆكی قەواڵەكەدا نووسرابوون:

« .. یەكەم: دانی پێدا دەنێم كە كرێ گرتەمو[١٨] مل كەچی یاسای سوپاییم و لەبـەردەست قومـاندانی ئـەو سوپـایەدام كـە تێایـدا دادەمەزرێم. لە رۆژی دامەزراندیشمەوە ئەو قوماندانە لێپـرسراومـەو لەرووی پەروەردەو شتی لەو بابەتەوە سەروەری منە.[١٩]

دووەم: پەیمان دەدەم، بۆ هەر شوێنێك كەبەرەسمی ی فەرمانم پێ بدرێ بچم، دووبارە پەیمانیش دەدەم لە ئەمرۆوەو بۆ ماوەی شەش مانگ خزمەت بكەم. گەر ویستیشم دوای ئەو ماوەیە دەستبەرداری ئەم ئیشە ببم، دەبێ مانگێك پێشتر ئاگادارێ ئەو ئەفسەرە بكەم كەلە بەر دەستی دام.

سێیەم: پێی لێ دەنێم کە هەر کاتێك بەد ڕەوشتییەك لێی ڕوودام یان تووشی نەخۆشی بووم، خاوەن کار بۆی هەیە لە ئیش دەرم بکا..»[٢٠]

ئینگلیزەکان تەنها بەمەیشەوە ڕانەوەستان، بەڵکو چەند ڕێگای لەوەیش نارەواتریان گرت، تاوەکو کرێکاران نەپەرژێنە سەر ئەوەی ڕیزەکانیان یەك بخەن. بە سەرێکی تریش بەربەرەکانەیان لە نێوانیاندا دروست دەکرد، تا لە ڕقی یەکتر چی وزەو توانایان هەیە بیخەنە کار و ئیش ڕاپەڕێنن. بۆ ئەم مەبەستە بە چوار چەشن کرێکارانیان دابەش کرد و هەر جۆرەیان ڕۆژانەیەکی دیاری کراوی هەبوو. کرێکاریش دەیتوانی بە پێی دەست ڕەنگینیی خۆی ئیشەکەی بگۆڕێ. هەر بە نیازی تێك دانی ڕیزەکانیان، ڕۆژانەی کرێکارێکی کورد ٧ ئانە[٢١] لە ڕۆژانەی برا عەرەبەکەی زیاتر بوو.[٢٢] لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو، دام و دەزگای ئینگلیزی داگیرکەر سیستەمی یونیفۆرمی بەسەر نەتەوەو تایەفە جیاجیاکاندا سەپاند، بە مەرجێك کرێکار لە کیسەی خۆی جل و بەرگ و ئەو نیشانانەی بۆی دانراوە بکڕێ. بە نموونە: دەبوو کرێکاری سوننەی عەرەب جامەدانەی سوورو عەگالی ڕەش لەسەر بنێ. کرێکاری شیعەیش جامەدانەی شین و عەگالی سپی ببەستن.[٢٣]

داگیرکەران لە ساڵانی جەنگدا گەلێك ڕێ و شوێنیان بۆ ڕێکخستنی کارو ڕۆژانەو جۆری ئیش و سەعاتی ئیشکردن و چۆنیەتی گواستنەوەی کرێکار لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر، دانا. سەرپاکی ئەو هەنگاوانەیش بۆ ئەوە بوون، باشترین ڕێگا بۆ چەوساندنەوەی کرێکار بدۆزنەوەو ماوەیان نەدەن لە ئیش هەڵبێن، لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی بەربەرەکانێ نەکەوێتە نێوان دەسەڵاتی سوپایی و مەدەنییەوە.[٢٤]

ئەگەرچی گەلێك تەعلیمات دەربارەی ڕۆژانەی کرێکاران دەردە چوون، بەلام بە پێی شوێن و کات و جۆری ئیش دەگۆڕدران و لەتیرەیەکەوە بۆ تیرەیەکیتر جیاوازییان هەبوو. لەبەر ڕۆشنایی باشترین ئەو تەعلیماتانەی لەبەردەستدان « هەڵبژاردە » ی کرێکاران دەکران بە چوار بەش، یاخود چوار پلەوە. کرێکاری جۆری یەکەم مانگانەکەی ١٤٠ ڕووپیە و جۆری دووەم ١٠٠ ڕووپیەو سێیەم ٦٠ ڕووپیەو چوارەم ٤٠ ڕووپیە بوو. بە پێی ئەم مەرجانەی خوارەوەیش دابەش دەکران. دەبوو جۆری یەکەم زمانی ئینگلیزیو تورکی و عەرەبیی بەنووسین و خوێندنەوە بزانێ و توانای وەرگێڕانیشی هەبێ. جۆری دووەمیش دەبوو عەرەبیی و ئینگلیزی بەنووسین و خوێندنەوە بزانێ و توانای وەرگێڕانیشی هەبێ. کرێکاری جۆری سێیەم دەبوو بە نووسین و خوێندنەوە

عەرەبی ی بزانێ و ئەوەندەیش کە پێویستــە زمانی ئینگلیـزی یان « ئــەوردو » بزانێ.[٢٥] ئاشکرایە ئەم مەرجانە ئەوەیان دەگەیاند کە لەسایەی ئــەم دابەش کردنە سەیرو عەنتیکەیەدا باشترین ودەست رەنگینترین کرێکاری عیراقی، بە زەحمەت جۆری چوارەمی پێ ڕەوا دەبینرا.

ئەمەی خــوارەوەیش لیستەیــەکە تێیـدا رۆژانەی کــرێکاری شــارەزاو پیشەوەران دەردەخا.

| | |
|---|---|
| مندالان | رۆژی یەك روپیە |
| پاککەرەوە | رۆژی یەك روپیە |
| گەسك لێدەر | رۆژی یەك روپیە یاخود مانگی ٣٠ روپیە |
| کرێکاری باخچە « باخەوان » | رۆژی یەك روپیە یاخود مانگی ٣٠ روپیە |
| خشت بڕ | رۆژی دوو روپیە. |
| قازانکەر | رۆژی سێ روپیە |
| ئاسنگەر | رۆژی سێ روپیە |
| کرێکاری مافوور دروستکردن | رۆژی دوو روپیە |
| کرێکاری بەلەم و عارەبانە دروستکردن | رۆی دوو روپیە و ٨ ئانە. |
| جۆلا | رۆژی سێ روپیە و ٨ ئانە |
| مسگەر | رۆژی سێ روپیە |
| شۆفێری کەشتی و کرێن | ڕۆژی سێ روپیە |
| شۆفێری ئۆتۆمۆبیل | رۆژی دوو روپیە و ٨ ئانە |
| کارەباچی | رۆژی چوار روپیە |
| وایەرمان | رۆژی سێ روپیە |
| فیتەری ماشین | رۆژی سێ روپیە |
| فیتەری ئۆتۆمۆبیل | رۆژی سێ روپیە و ٨ ئانە |
| شووشەچی | رۆژی یەك رۆپیە و ٨ ئانە |
| بۆیاخچی | رۆژی یەك روپیە و ٨ ئانە[٢٦] |

وا پێ دەچێ ئەو رۆژانەیەی لەم لیستەیەدا ناو نووس کراوە، خاوەن پیشە نەبوو بێ، کرێکاری عیراقی ی نەگرتۆتەوە. تەنــانەت کــە نووســراوە مندالان، مەبەستیان مندالی هیندۆسەکانە. چونکە دیاری کردنی رۆژانەی کرێکاری کوردو

عەرەب بەناو، لەو تەعلیماتانەدا بوو کە لە رۆژی ۱۰ی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۱۷ دا دەرچوو بوون، ئەویش بۆ کرێکاری عەرەب ١٤ ئانە بوو. واتە لە رۆژانەی منداڵێکی هیندیش کەمتر. کرێکاری کوردیش رۆژانەکەی روپیەیەك و دوو ئانە بوو.[٣٧] ئەمە جگە لەوەی کە رۆژانەی خاوەن پیشەکانی بەغدا لە کاتی جەنگدا لەوەیش کەمتر بووە، کە لە لیستەکەی سەرەوەدا دیاری کراوە، وەك بەڵگەنامە رەسمی یەکانی ئەو سەردەمە باسیان دەکا.[٣٨]

هەرچۆنێك بێ، ئەم رۆژانانە سەرەڕای کەمی یان هێشتا پڕ بە پڕی خۆی واقیع یان نیشان نەداوە، چونکە بەشێکی ئەو رۆژانەیە دەچووە گیرفانی سەرەك عەشیرەت و ئەوانەی خۆیان بە خاوەنی کرێکاران دەزانی. ئەمەیش هەر بەتەنها بۆ کرێکاری عیراقی نەبوو. بە نموونە: کرێکارێکی ئێرانی کە رۆژانەکەی یەك روپیە بوو ۲۰٪ ی لێ دادەشکا.[٣٩] گرنگ ئەوەیە ئاگاداری ئەوە بین کە لە ساڵانی جەنگدا رۆژانەی کرێکار هەر ئەو رۆژانەیە یاخود نزیکی ئەو رۆژانەیە بوو کە پێش جەنگ وەری دەگرت. ئەمە لە کاتێکدا نرخی کەل و پەلی پێویست لە ساڵانی شەڕدا سێ ئەوەندەو زیاتریش بەرز بووەوە[٣٠] ئەمەیش ئەوەی دەگەیاند کە رۆژانەیش بە کردەوە سێ ئەوەندە هاتبووە خوارەوە.

سوخرەیش لە عیراقدا وەك خۆی مایەوە، بە تایبەتی لەو مەیدانەدا کە قۆنتەراتچی یەکانی ناوخۆ ئیشیان دەکرتە ئەستۆ بەپارچە جێ بە جێ یان دەکرد. بە زۆریی، بەندو یەخسیر بەبێ رۆژانە یاخود بە کرێ یەکی رەمزیی ئیشیان پێ دەکرا. شایانی باسە ژمارەی ئەمانە تا بڵێی زۆر بوو. هەبوو لە هیندستانەوە بە تایبەتی بۆ ئیش پێ کردن هێنرا بوو. باشترین بەڵگەیش ئەوەیە کە لە ساڵی ۱۹۱۸ داژمارەی بەندەکان گەیشتە ۱۲ هەزار کەس و بەشێوەی کرێکار لە جێگای جیا جیادا ئیشیان پێ دەکردن.[٣١]

ئینگلیزەکانیش چی رێگا هەیە گرتیانە بەرو پاڵیان پێوە دەنان هیچ کەمتەرخەمی یەك لە ئیشدا نەکەن و لەوە دەچێ لەم مەیدانەدا بە ئامانجی خۆیان گەیشتبن. ئەوەتا راپۆرتێکی رەسمی ی دانی پیا دەنێ کە « کاری ۱۲۰۰ کەس لەوانە، هاوتای کاری ۱۵۰۰ ـ ۱۸۰۰ کرێکاری ترە ».[٣٢]

بارودۆخی ئیش کردن لە ساڵانی جەنگدا تا بڵێی سەخت و نالەبار بووە. دەبوو کرێکاران چەندین سەعات کە لەتوانای ئادەمیزاد بەدەرە، بەرگەی سەرمای زستانی بیابان و هەتاوی سووتێنەری هاوین بگرن. جا هەرچەندە دەستوور وابوو رۆژی ۹ سەعات ئیش بکەن،[٣٣] بەلام کەم رێ دەکەوت کەسێك بووبێ بە بە پێ ی دەستوورو سەعاتی ئیش کردن هەڵس و کەوتی کردبێ، بە

تایبەتی قۆنتەراتچی یەکان. ئەمە جگە لەوەی کە ئیشی ئەو کرێکارانە ئاسان نەبوون و زۆربەیان ئیشی زۆر سەختیان پێ دەکرا، وەك قوولکردنی بەندەرو راکێشانی ریگاری ئاسن و بەتاڵ کردنی کەشتی و وگواستنەوەی کەل و پەل. زۆر جاریش کرێکاران بە نانە سکی ی ئیشیان پێ دەکراو[34] بەقسەی سەرچاوە ئینگلیزی یەکان خۆیان[35] ئەو خواردنەی دەیان درایە بە تەنها بەشی نیوە رۆژەیەکی کرێکارەکەی نەدەکرد، کەچی سەرەرای ئەمەیش سەرەك عەشرەت و بازرگانەکانی ناوخۆ کە بوو بوونە قۆنتەراتچی و بە هۆی ئەوانەوە خواردنەکەیان بەسەردا دابەش دەکرا، بەشێکی زۆریان تالان دەکرد.

هیچ گومان لەوەدا نی یە کە لە باروزرووفێکی وا سەخت و دژوارداو لەئەنجامی بەتەنگەوە نەهاتنی تەندروستی و پارێزگاری نەکردنی کرێکاراندا، ژمارەیەکی زۆریان دەبوونە قوچی قوربانی ی. گەر بێ و بەوردیی چاوێك بە ژمارەی کرێکارە بەندەکاندا بگێرین کە ناویان لە راپۆرتەکانی بەریتانیادا نووسراوە، بۆمان دەردەکەوێ چەندیان لێ مردووە. لە کەرتێکدا کە ژمارەیان ۲۱۵ر۱ کەس بووە، لە ماوەی ۲۵ مانگدا ۹۰ کەسیان لێ زایە بووە. واتە تێکرای ژمارەی مردوو گەیشتە ٥ر٧٪ .[36] ئەوانەیشی کە کەفتەکار بوون ژمارەیان زۆر لەمردووەکان زیاترە. لە کە رتێکدا کە بریتی بوو لە ۰۸۰ر۱ کرێکار لە ماوەی ٣٤ مانگدا ٣٨٤ کەسیان بەرکەوتن، واتە نیسبەتی بەرکەوتووان ٣٥٪ ی پێك دەهێنا.[37]

نە لە سالانی جەنگ نە لەپێش جەنگیشدا، دانیشتووانی عیراق هیچ جۆرە یاسایەکی کرێکارانەیان بە خۆیانەوە نەدیبوو. زامن کردنی ژیانی کرێکارانیش تەنها ئینگلیزو ئەورووپایی یەکانی دەگرتەوە. لە ناو قەوالەی کاریشدا کە پێشتر باسمان کرد، برگەیەکی ئاشکرای تێدایەو بە پێی ئەو برگەیە هەر کاتێك دووچاری نەخۆشی بوو و نەیتوانی لەسەر ئیش بەردەوام بێ، دەردەکرێ.[38]

رەنگە دەستکەوتی بەشێکی زۆر کەمی کرێکاران لە سالانی جەنگدا هەر ئەوە بوو بێ کە لە کاتی کارکردن و تێکەل بوونیاندا، سوودیان لە شارەزایی کرێکارە تەکنیکی یەکانی ئینگلیز وەرگرتووە. چونکە داگیرکەران لەتەك خۆیاندا ژمارەیەکی زۆر ئەندازیارو کرێکاری شارەزایان هێنایە وولاتەوە، بۆ راپەراندنی کاروبارەکانیان. لەبەر ئەوە کارگەو وەرکشۆپی تایبەتی یان بۆ چاککردنەوەی ئۆتۆمۆبیل و پاپۆرو چەك و تفاقی جەنگ دامەزراند.

هەرچەندە لەسایەی باروزرووف داگیرکردنی سوپایی و یاسای جەنگدا مەودای بزووتنەوەی کرێکاران هاتبووەوە یەك، بەلام بارودۆخی قورس و گرانی

کرێکاران پاڵی پێوە نان بە شێوەی جۆر بەجۆر نارەزایی خۆیـان دەربڕن، بـا نارەزایی یەکی یشیان بە شێوەیەکی سادەو ساکار بوو بێ. وەك لەبەڵگەنامەکانی ئەو کاتەدا دەردەکەوێ سالی ١٩١٩ لە بەندەر بزووتنەوەیەکی دژ بـە ئینگلیز بەرپاکرا وکاربەدەستانی « بەسرە » کەوتنە خۆو چەند هەنگاوێکیان « لەدژی ئەو کەشتی وانانە نا، کە شەرِیان بە کەشتی یەکانی سەر بە ئینگلیز فرۆشتبوو ».[٣٩] لە دوا دوای کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ دا، لە ناوچەی « عەممارە » ٤٦٣ کرێکار ئیشیان بەجێ هێشت؛ ئەنجام داگیرکەران گولله بارانیان کردن‌و ژمارەیەکیان بریندار کراو ٣٩ کەسیشیان لێ گیراو لەبەندیخانەکەی شار توندکران.. بەقسەی بەڵگەنامەکانی بەریتانیا، زۆر دەرەبەگی ناوچەکە هاوکاری یان لەتەك ئینگلیزدا کرد، بۆ ئەوەی بە زۆرەمـلێ چ ئەوان‌و چ کـرێکاری‌تـر بخەنـەوە سەر ئیش‌و ئەوانەیشی هەلاتوون بیانگێرنـەوە.[٤٠] سەرەرِای ئـەو هەمـوو زەبرو زەنگـەی داگیرکەران دەیان نواند، زۆری نەبرد هەر لەو ناوچەیـەداو لە ٧ی کانـوونی دووەمی ساڵی ١٩١٨ دا پترلە ٤٠ کرێکار دەستیان لە ئیش هەڵگرت‌و ئەنجام ٢٧ کەسیان لێ گیراو لە باروزرووفێکی زۆر سەخت دا بە زۆر خشتیان پێ دەبرِین وتا یەکێکیان لێ مرد.[٤١] لە کارگەی « سۆدا » دروستکرن دا لە بەغدا، ٢٥ کرێکاری « جوو » بەرهەڵستی ئەوەیان دەکرد رۆژانی شەممە ئیشیان پێ بکرێ. ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی کۆمەڵێك گیروگرفت بێنێتە رێگای ئـەوانەی سـەرپەرشتی ی کارگەکەیان دەکردو ناچار بوون داوا لە لێپرسراوان بکەن بە زۆر بیانخەنـەوە سەرئیش یان کاروباری کارگە لەسەر شێوازێکی نوێ رێك بخرێتەوە.[٤٢] کرێکارە بەندەکانیش هەر ئەوەندەی هەلێکیان بۆ هەڵکـەوتایـە هەڵدەهـاتن.[٤٣] خاوەن زەوی وسەرەك عەشرەتەکانیش بەردەوام بوون لەسەر ئـەوەی داگیرکـەران چەندیان بوێ، کرێکار بۆ دام‌و دەزگاکانیان کۆ بکەنەوە.[٤٤]

ئەم رووداوانەو هی تـریش، پاڵیـان بە داگیـرکەرانـەوە نا، بـەتونـدی بەرهەڵستی یان بکەن‌و ماوە نەدەن پەرە بستێن. بۆیە بێ سڵە مینەوە، قامچی یان بەکار دەهێناو جەستەی سەرپێچی کەرانیان بەدرێژایی چەند سەعاتێك لە ناو چاڵدا دەناشت‌و بە کۆمەڵ خەڵکیان لە ناو زیندان‌دا توند دەکرد و ئیهانە دەکران‌و ئیشی گرانیان بە سەردا دەسەپاندن، حاڵ گەیشتە ئەوەی حساب بۆ لێپرسراوان نەکرێ.. ئەمانیش فەرمانیان دەرکرد، لاقی ئەو کرێکارانە بەر گولله بدەن، کە گومانی هەڵهاتنیان لێ دەکەن‌و نیازیان وایـە لەو دۆزەخە رزگـاریان بێ.[٤٥] لە

لایەکی تریشەوە داگیرکەران ناچار بوون هێزێکی گەورەی سوپایی بخەنە کار، تاوەکو بتوانن بەردەوام ئیش لەسەر ڕێگای ئاسنی نێوان بەغدا و بەسرە بکەن. ئا بەم جۆرە کرێکارانی عیراق و ئەوانەیشی کە عیراقیی نەبوون، بەدرێژایی سالانی جەنگی یەکەمی جیهانی ژیانیان بەسەر دەبرد. بەلام سەرەڕای ئەمانەیش چینی کرێکارانی تازە پێگەیشتووی عیراق، لەو ماوە مێژووییە گران و سەختەدا توانی تا ڕادەیەك لە ڕووی چەندیەتی و چۆنیەتی یەوە پەرە بستێنێ. لەمەیش گرنگتر ئەوە بوو کرێکاری عیراق بۆ یەکەمین جار بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و لەنزیکەوە داگیرکەرانی ناسی و حەقیقەتیان تێ گەیشت. سەرهەلدانی ئەمانەیش لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی یەوە لە هەلوێست و هەلس و کەوتیدا بەرامبەر بە دەسەلاتی بەریتانیا، ڕەنگیان دایەوە.

## سەرچاوە و پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: « ن. ك. کارسون. ڕۆژهەلاتی عەرەب. عیراق. بەزمانی ڕووسی. مۆسکۆ ١٩٢٨ ل ٢٠٢. هەروەها « عبد الرزاق الحسني. العراق قديماً وحديثاً. الطبعة الثانية. صيدا. ١٩٥٨ » ل ١٦١.

A. T. Wilson, Mesopotamia, 1917 — 1920 A. clash of Loyalities, London, 1930. P. 48.

٢ ـ بڕوانە: K. M. Langley, op. Cit., P. 108.

٣ ـ المركز الوطني للوثائق. File No 164/33 Labour 1918.

٤ ـ ئەو زانیارییانەی لە بارەی ڕێگای ئاسنەوە لە سەردەمی جەنگی یەکەمدا نووسراون لە ڕاپۆرتێکی ژەنەرال. ف. هامند و ڕاپۆرتێکی دیکە وەرگیراوە کە حکوومەتی عیراق ئامادەی کردووە. « بڕوانە: الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة ص ١٠. موضوع الملفة / السكك الحديدية ـ ١٩٢٦. الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي. رقم الملفة ص ١٠. موضوع الملفة: السكك ١٩٢٩ ـ ١٩٣٢ ».

٥ ـ K. M. Langley, op. cit., P. 40.

٦ ـ « المركز الوطني للوثائق. File No. 164 / 15 Labour for Mahmudhya canal 1918.

٧ ـ مس بيل ژمارەی ئەو کرێکارانەی لە عیراق کۆیان دەکردنەوە بە ٦٠ هەزار کەس دەخەملێنێ. بڕوانە: « العراق في رسائل مس بيل، ترجمة: جعفر الخياط. تقديم وتعليق عبد الحميد العلوجي. بغداد ١٩٧٧ » ل ١٧٧.

٨ ـ A. T. Wilson, Mesopotamia 1917 — 1920 — PP. 46 — 47.

٩ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/ ١٠ موضوع الملفة: السكك ١٩٢٩ ـ ١٩٣٢. تقرير اللجنة المالية عن السكك الحديدية في العراق.

١٠ ـ المركز الوطني للوثائق. File No 164/102 — 1916 — 1917. Fileno. 164/23. Labour, 1918.

١١ ـ المركز الوطني للوثائق. File No 164/2 — 1. Labour Baghdad. 1917 — 1918. P.67.

١٢ ـ المركز الوطني للوثائق. File No 164/14. Laboureres of Baghdad 1918.

١٣ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە.

١٤ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق: File No. 164/118. Labour Contractor, 1917 File No. 164/21. Labour Baghdad, 1917 — 1918.

١٥ ـ H. Young. The Independent Arab. London, 1933. P. 52.

١٦ ـ « العراق في رسائل مس بيل » ل ١٧٦.

١٧ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: File No. 164/2 — 1. Laboureres of Baghdad 1918

١٨ ـ دەقاودەقی تێکستەکە چۆنە، بەو جۆرە دەینووسینەوە.

١٩ ـ مەبەست لە رەوشت باشی « حسن السلوك » ە.

٢٠ ـ المركز الوطني للوثائق. File No. 80/19. Establishment. General, 1917.

٢١ ـ ئەوەی باو بوو رۆژی روپیەیەك و دوو ئانە بەکرێکاری کورد دەدرا واتە ٨٣ فلس، کەچی کرێکارێکی عەرەب رۆژانەکەی ١٤ ئانە واتە ٥٦ فلس بوو.

٢٢ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە: « د. کەمال مەزهەر ئەحمەد. چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی چینی کرێکاری کورد. گۆڤاری ـ رۆشبیری نوێ. ژمارە ـ ٧٢ ـ شوباتی ١٩٧٩ ل ٨ ـ ١٤. هەروەها File No, 80/19. Establishment General 1917 PP. 79, 88. 104 — 105.

٢٣ ـ المركز الوطني للوثائق: File No. 164/2 — 1. Labour Baghdad 1917 — 1918 PP. 108 — 112.

٢٤ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە: « المركز الوطني للوثائق ـ File No. 80/19. Establish ment General. 1917. File No. 164/2 — 1. Labour Baghdad 1917 — 1918. PP. 79, 88. 102 — 103.

٢٥ ـ المركز الوطني للوثائق: File No. 80/19 Establishment General 1917.

٢٦ ـ المركز الوطني للوثائق: File No. 164/2 — 1. Labour Baghdad 1917 — 1918 P. 88 File No. 80/19, Establishment General 1917.

٢٧ ـ بڕوانە « المركز للوثائق » File No. 194/2 — 1 Labour Baghdad 1917. 1918, P. 88.

٢٨ ـ بە نموونە بڕوانە: هەمان فایلی پێشوو ل « ٩ ».

٢٩ ـ المركز الوطني للوثائق: File No. 164/5, labour from Dizful 1917 — 1918.

٣٠ ـ بەنموونە: نرخی نان سێ ئەوەندەی جاران و بگرە زیاتریش بەرزبووەوە هەروەها زۆر کەل و پەلی پێویستیش لە بازاڕدا نەمان و ئەنجام هەزاران هاوڵاتی لە برساندا مردن.

٣١ ـ بڕوانە: (A summary of the history, With suggestions, and recommendations of the seven Jail Labour and Porter Corps, employed in Mesopotamia from october 1916 to July 1919) Baghdad. 1920. P.8.

٣٢ ـ Ibid. P. 3.

٣٣ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق. File No. 80/19, Establishment General 1917.

٣٤ ـ دەربارەی چەندیەتی ئەو خواردنەی بە کرێکاران دەدرا، بروانە « المركز الوطني للوثائق » File No. 164/2.1 — labour Baghdad 1917 — 1918.

٣٥ ـ بروانە: H. Young. op. cit., PP. 51 — 52.

٣٦ ـ (A. Summary of the history, With suggestions, and reco mmend ations of the seven Jail. Labour and porter Corps, employed in Mesopptamia from october 1916 to July 1919. p. 15.

٣٧ ـ Ibid

٣٨ ـ بروانە: برگەی سێیەمی ئەو قەوالەیەی پێشتر دەست نیشانمان کرد.

٣٩ ـ بروانە: المركز الوطني للوثائق: File No. 144/522 1918.

٤٠ ـ المركز الوطني للوثائق: File No. 164/5, Labour from Dizful 1917 — 1918.

٤١ ـ هەر ئەو فایلەی پێشوو.

٤٢ ـ المركز الوطني للوثائق: File No. 164/14. Labourers of Baghdad 1918.

٤٣ ـ (A. summary of the history, With suggestions, and recommen dations of the Seven Jail Labour and Porter corps, employed in Mesopotamia from october 1916 to July 1919) P. 16.

٤٤ ـ المركز الوطني للوثائق: File No. 164/52. 1918.

٤٥ ـ المركز الوطني للوثائق: File No. 164/5. Labour from Dizful 1917 — 1918.

قۆناغی دووەمی مێژووی پێکهاتنی چینی کرێکارانی عیراق وقۆناغی یەکەمی بزووتنەوەکەی، لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەست پێ دەکاو لە چوارچێوە مێژوویییەکەیدا دەکەوێتە نێوان سالانی « ١٩١٨ و ١٩٣٢ » واتە لەو رۆژەوەی کە وولات راستەوخۆ لە لایەن بەریتانیاوە، بەناوی داگیرکردن « ١٩١٨ ـ ١٩٢١ » یاخود ئینتیدابەوە « ١٩٢١ ـ ١٩٣٢ » حوکم دەکرا.

ئەنجامی ئەوەی گەورەترین دەولەتی ئیمپریالیزمی ئەوسا، بە شێوەیەکی راستەوخۆ دەستی بەسەر عیراقدا گرت، ئەم وولاتە چەند ئالو گۆڕێکی ئێجگار گرنگی بەسەردا هات، ئاکامی ئەم دەست بەسەرا گرتنەیش شوێن دەستی بەسەر قەوارەی کۆمەلایەتی میللەتی عیراقو بەتایبەتی بە سەر چینی کرێکارانەوە دیارە. لەو ماوەیەدا چینی کرێکاران بە حوکمی ئەوەی چینێکی تازە بوون، هەلو مەرجی گەشەکردنی زۆرتر بۆ رەخسا بوو؛ لەبەر ئەوە زۆر بە خێرایی پەرەی دەسەند. ئەگەرچی جەنگ کۆتایی هاتبوو، بەلام لەبەرچاوی ئینگلیزەکان عیراق تا ئەو کاتە بایەخی ستراتیژی خۆی لەدەست نەدابوو، بەتایبەتی بە هۆی بەربەرەکانەی نێوان دەولەتە ئیمپریالیستەکانەوە کە رۆژ لە دوای رۆژ و بەمەبەستی ئابلوقەدانی ناوچەکەو دەست گرتن بەسەرسامانەکانیدا « نەوت بەتایبەتی » پەرەی دەسەند. بە سەرێکی تریش « مەترسی » نوێ لە ناوچەرگەی خۆی* یان لە سنوورەکانیدا هاتنە گۆڕێو[1] بەهۆی هەلمەتی شۆرشگێرانەی دانشتوانی رۆژهەلاتی ناوەراستەوە کە شێوەی راپەرینو شۆرشی بەردەوامی دژ بە داگیرکەرانیان گرتە خۆ، دەلێین بەهۆی ئەمانەوە، ئینگلیز ناچار بوو بەشێکی گەورەی هێزە سوپاییەکەی لەسەر خاکی عیراق بهێلێتەوە وبنکەی هەمیشەیی تێدا دابمەزرێنێ. دیارە ئەم هێزانەیش بەردەوام پێویستیان بەئیشی بیناکارییدەبوو. بە نموونە: لە سالی ١٩٢٠ دا ژمارەی ئەو کرێکارانەی لەم جۆرە پرۆژانەدا کاریان دەکرد گەیشتە چەند هەزار کەس. « لە عیراقو ئێراندا ٣٤ هەزار کەس بوون ».[2] لە هەمان کاتدا ئەو رێگاو بانانەی ئینگلیزەکان بە مەبەستی ستراتیژیی خۆیان لە سالانی جەنگدا بنیاتیان نابوون گەورەترو فراوانتریان کردن، تاوەکو هەر رووداوێکی لە ناکاوو تازە بەرپا بوو، بەکاریان بهێنن و دوای ئەو ماوەیەیش بکرێنە ئامرازی چەوساندنەوەی ئابوری، بەو جۆرەی کە خۆیان چاوەراوانیان دەکرد. هەر ئەم بیرکردنەوەیەیش بوو وای لێ کردن دوای جەنگ بەردەوام ئیش لە رێگای ئاسنی « قورەتوو » ی نزیك « خانەقین » دا بکەن. ئەوە بوو لە کۆتایی مانگی ئایاری سالی ١٩١٩ وە، بۆکارو

باری شت گواستنەوە خراپە کار.[٣] ئەم ڕێگایە بەنیسبەت ئینگلیزەکانەوە بایەخێکی گەورەی هەبوو؛ نەك لەبەر ئەوەی چەند بیرێکی نەوت لەو ناوچەیەدا هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو شوێنەی تێیدا ڕێگاکە کۆتایی پێ دێ « حەوت میل لە سنووری ئێرانەوە دوورە » و دەکەوێتە « سەر ئەو ڕێگا بازرگانییەی دەچێتە کرماشانەوە »، وەك لە ڕاپۆرتەکەی ژەنەراڵ « ف. د. هامند » دا، دەقاودەق باسی دەکا.[٤] داگیرکەران گرنگییەکی زۆریان بەم مەسەلەیەداو دەیانویست زیرەکانە پلانێکی بێ جێ بەجێ بکەن، ئابوری ڕۆژئاوای ئێران بە عیراقەوە ببەستن؛ بە تایبەتی بە بەندەری بەسرەوە.[٥] دیارە ئەمە لایەنی کەمی نیازو مەبەستیان بوو، چونکە ئەوان پلانی زۆر لەوە گەورەتریان دادەناو دوورتر دەیانڕوانی و خەویان بە ڕێگای نێوان بەغداو « باکۆ »[٦] وە دەبینی کە مەڵبەندێکی گرنگی بەرهەمهێنانی نەوتە لە قەفقاس.[٧]

سەرەرای ئەو تەنگەو چەڵەمە ئابورییانەی ئینگلیزەکان دووچاری هاتبوون و سەبارەت بە هەندێ هۆی سیاسی و ستراتیژی، ناچار بوون چەند ڕێگایەکی ئاسنی تا ڕادەیەك ڕێك و پێك رابکێشن. ئەم حەقیقەتەیش جارێکی تر لەمەسەلەی ڕاکێشانی ڕێگای نێوان « کنگربان ـ کەرکوك » دا دەردەکەوێ کە بە هۆی تەنگە چەڵەمەی ئابورییەوە ڕاگیرا. ئەوەتا نێردراوی سکرتێری مەندووبی سامی بەریتانیا لە عیراق، ڕۆژی ٢٤ی تشرین دووەمی ساڵی ١٩٢٤ بۆ سکرتێری ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق دەنووسێ:

«.. مەندووبی سامی فەرمانی پێدام، پێتان ڕابگەیەنم کە لە پاش سەردانەکەی ئەم د وایی‌یەی بۆ سلێمانی، بۆی دەرکەوتووە کە دەستکردن بە ڕاکێشانی ڕێگای ئاسنی کەرکووك کارێکی سیاسی گرنگی کردووەتە سەر سەرانسەری کوردستانی خواروو. چونکە دانیشتووان باوەڕیان وایە حکوومەتی عیراق گومانی لەوە نەماوە کە کۆمەڵی گەلان ئەو بەشە گەورەیەی وڵات بۆ عیراق تەرخان دەکا. ئەم کار تێ کردنەیش لە بنەڕەتەوە هەڵوێستی سیاسی گۆڕیوە. جا گەر بێ و بەهۆی بێ پارەیی‌یەوە لەپڕ دەست لە ڕاکێشانی ئەو ڕێگایە هەڵبگیرێ، ئەوا مەسەلەکە تەواو پێچەوانە دەبێتەوەو ڕای گشتیی وای بۆ دەچن ئەوەندەی نەماوە کوردستانی خواروو بدرێ بە تورکەکان..»[٨]

لەمەوە، ئەنجوومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ٢٠ی کانوونی یەکەمی ئەو ساڵەدا بڕیاری دا لەو هەڵوێستەی پاشگەز ببێتەوە چونکە « باری سیاسی ئێستا وا پێویست دەکا دەست بە ڕاکێشانی ڕێگای ئاسنی کەرکووك

بکریٚ.» وچاو « له ته‌نگو چه‌لّه‌مه‌ی ئابوری » بپۆشریٚ.[٩] به‌و جۆره له مـانگی ئه‌یلوولی سالّی ١٩٢٥ دا ئه‌و ریٚگایه له « کنگربان » ٥ وه رووه‌و « که‌رکووك » به دریٚژایی ٥٣ میل راکیٚشرا و به‌وه ریٚگای ئاسنی نیٚوان « که‌رکووك » و « به‌غدا » کۆتایی هات.

پاش راگرتنی جه‌نگ، ئینگلیزه‌کان ده‌ستیان کرد به دروست کردنی ئه‌و به‌شه‌ی که‌وتووه‌ته نیٚوان « ئوور » و « حیلله » وه‌و ١٦٣ کیلۆمه‌تر دریٚژیه‌تی، تاوه‌کو ریٚگای ئاسنی نیٚوان « به‌غدا » و « به‌سره » ته‌واو ببیٚ.[١٠] جگه له‌مه‌یش هه‌ندیٚ لقی تریان لیٚ راکیٚشا، وه‌ك، ریٚگای « زوبیٚر ـ جه‌بـه‌ل سه‌نـام » که بـۆ گواستنه‌وه‌ی به‌رد به‌کار ده‌هیٚنراو دریٚژی ٥ر٢٣ میل بوو. هه‌روه‌ها له « ئوور » ٥ وه بۆ « ناسری‌یه » که دریٚژی ١٠ میله. هه‌ندیٚ ریٚگای تریشیان به دریٚژایی ٣٦ میل له‌ناو به‌نده‌ری به‌سره‌دا راکیٚشا، تاوه‌کو ئیش‌و کاری داگـرتن‌و بارکـردن ئاسان‌تر ئه‌نجام بده‌ن. ئه‌مه جگه له‌و ریٚگایـه‌ی که « مـه‌فره‌ق » و بـه‌سـتی « هیندی‌یه » ی به‌یه‌که‌وه به‌سته‌وه‌و دریٚژایی ١٨ میل بوو. ریٚگایه‌کی دیکه‌یشیان له نیٚوان رۆژ ئاواو رۆژهه‌لاّتی به‌غدادا راکیٚشا دریٚژی شه‌ش میل بوو، تا به‌سه‌ر روباری دیجله‌دا فارگۆنی شه‌مه‌ندوفه‌ر به ئاسانی ی به‌په‌ریٚننه‌وه.

پاش کۆتایی هاتنی جـه‌نگ کـاروباری چـاککردنـه‌وه‌ی ریٚگاو مـاشین‌و فارگۆنه‌کانی شه‌مه‌ندوفه‌ری عیراق گۆرانیٚکی هه‌ست پیٚکراوی به‌سه‌ردا هات. ئه‌وه بوو، هه‌ر سیٚ کارگه‌که‌ی ریٚگای ئاسن کران. به‌یه‌ك[١١]، که به کارگـه‌ی « ئه‌لشالچی‌یه » ناسراوه له به‌غـدا. ئه‌وجـا ئامـرازی نوی‌و کـادیری شـاره‌زا وپسپۆریان بۆ نارد، به‌راده‌یه‌ك له ماوه‌ی سالیٚکدا ده‌یتوانی « ٤٨ » فارگۆن چاك بکاته‌وه.[١٢]

بیٚ گومان کاروباری چاککردنه‌وه‌ی فارگون‌و ریٚگای ئاسن، پیٚویستی‌یان به ژماره‌یه‌کی زۆر کریٚکار هه‌بوو. له ٣١ی مانگی مارتی سالّی ١٩٢٥ دا ژماره‌ی سه‌رپاکی ئه‌وانه‌ی له به‌رده‌ست به‌ریٚوه‌به‌رایه‌تی ریٚگای ئاسن دا ئیشیان ده‌کرد گه‌یشته ٩٣٠٢ که‌س.[١٣] جا هه‌رچه‌نده ئه‌م ژماره‌یه له‌به‌ر زۆر هۆ کـه گرنـگ ترینیان ته‌واوبوونی زۆربه‌ی ئه‌و ریٚگایانه بوون پیٚشتـر باسمـان کردن، کـه‌م ده‌بووه‌وه. ده‌لیٚین سه‌ره‌رای ئه‌وه‌یش هیٚشتا ریٚگای ئاسن له هه‌موو روویه‌که‌وه که‌رتیٚکی گرنگ وبنچینه‌یی چینی کریٚکارانی عیـراقی پیٚك ده‌هیٚنـا. به نمـوونه له‌سالّی ١٩٢٦ دا ژماره‌یان گه‌یشته ٨١٢٩ که‌س.[١٤] ته‌نانه‌ت ئه‌و کـاته‌ی کـه ئینتیدابی به‌رتیانیایی کۆتایی هات ژماره‌یان له پیٚنج هه‌زار که‌س پتر بوو.[١٥]

هەر لەبەر ئەو هۆیانە داگیرکەران بایەخێکی تایبەتی‌یان دا بەبەندەری بەسرە. چونکە پەرە پێدانی هاتوچۆلە « شەتولعەرەب » دا، بەنیسبەت پەرژەوەندی کۆمپانیای نەوتی « ئینگلیزی ـ فارسی » یەوە کە لە ناوچەی « عەبادان » دا ئیشی دەکرد، کاریکی زۆر پێویست بوو. بۆیە کۆمپانیای ناوبراو ساڵی ۱۹۲۳ چەردەیەك پارەی بە قەرز دا بە عیراق تا بەندەرەکەی پێ فراوان بکا. ئنجا لە کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۲٤ دا دەست کرا بە ئیش‌کردن و قووڵایی بەندەرەکەیان گەیاندە « ۲۸ » پێ و « ۳۰۰ » پێ » یش بۆکاتی هەڵچوونی دەریا فراوان کرا، تاوەکو جێگای زۆرترین ژمارە کەشتی‌ی تێدا ببێتەوە. لە ساڵانی ئینتیذاب‌دا، لە داهاتی خۆی هەندێ ئیشی تری لەو بابەتەی تێدا کراو[16] بەرادەیەك پێویستی بە ژمارەیەکی زۆرتر چاودێریکەرو کرێکار هەبوو.[17] بەڵام تێکرای ژمارەی کرێکارانی بەندەر لە ناوەراست و کۆتایی ساڵانی بیستدا لە ۷٥۰ کەسی تێپەراند، ئەمە بێجگە لە نزیکەی ۱۲٥۰ کرێکاری تر کە ناوبەناو خەریکی فراوان کردن بوون.[18]

سەرەنجامی ئەو پەرەسەندنەی گشت لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی گرتبووەوە، لە ساڵانی دوای جەنگدا بە شێوەیەکی فراوان دەست کرابە راکێشانی رێگاوبانی قیرتاوو چەورێژ کراو. تاوەکو ببنە ئامرازێك بو چەسپاندنی داموو دەزگا تازەکانی دەولەت لە هەموو کون و قوژبنێکی وولات دا. ئەمەیش خۆی لە خۆی دا ئەوەی دەگەیاند گەرەکیەتی باجێکی زۆرتر بۆخەزێنە مسوگەر بکا. بەتایبەتی چونکە مانەوەی هێزەکانی بەرتیانیا لە عیراق دا بووبووە بارێکی گران بەسەر وولاتەوە.[19] لە ساڵانی ئینتداب دا چەند رێگایەکی ئێجگار سەخت راکێشران وەك رێگای هەولێر ـ رەواندوز ـ رایات کە لەسەر سنووری ئێران کۆتایی دێ‌و[20] راپەراندنیشی پێویستی بەژمارەیەکی زۆر کرێکار هەبوو کە لە ماوەی سێ ساڵ دا تێکرا هەزار کرێکار ئیشیان لەسەر دەکرد و بۆئەوەمەبەستە لە بەرایی رێگای « جوندیان » ٥ وە بەرەو رەواندوزی خواروو رێگایەکی ئاسنی سێ میلی‌یان راکێشا.[21] بە کورتی‌ی سەرجەمی ئەوانەی لە کۆتایی ساڵانی بیستدا لە بواری رێگاوباندا کاریان دەکرد، ژمارەیان گەیشتە ٤٢٥۰ کرێکار.[22] دیارە کردنەوەی ئەم رێگاو بانە تازانەو گەشە کردنی کارو شێوازی ژیان، لە دوای جەنگی یەکەمەوە، کارێکی باشیان کردە سەر مەیدانی هامشۆ کردن و گواستنەوە، لە وولات‌دا. بە رادەیەك لە کۆتایی ساڵانی بیست دا ژمارەی شۆفێرەکان زۆر بە خێرایی گەیشتە ٤٥۰۰ کەس و لای کەم چواریەکی ئەوانە شۆفێری ئۆتۆمۆبیلی بار هەڵگر بوون[23]

پیشەسازیی نەوت گرنگترینی ئەو مەیدانەیە کە ژمارەیەکی زۆر لەو جۆرە کرێکارانەی تێدا کۆبووبووەوە کە پەیوەندی راستەوخۆو بەردەوامیان بە بەرهەمی میکانیکی یەوە هەیە بەتایبەتی لە دوادوای سەردەمی ئینتیدابدا. ساڵی ۱۹۲۵ کۆمپانیای نەوتی تورکی ی « دوایی بوویە: عیراقی » لە ناوچەی کەرکووك دا تەنها ۱۸۰ کرێکاری هەبووکە، بە پشکنینی نەوتەوە خەریك بوون. بەلام لە ماوەی ساڵێکدا ژمارەیان گەیشتە ۲۵۰۰ کرێکارو پاشان بوو بە ۳۵۰۰. کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی ـ فارسی هەر لەمەیدانی پشکنین دا لە ناوچەی نەوتخانەی نزیك « خانەقین » دوو هەزار کرێکاری خستبووە ئیشەوە.[24] هەروەها کۆمپانیای ناوبراو ساڵی ۱۹۲۷ لە « ئەلوەند » دەزگایەکی پالاوتنی دامەزراند تاوەکو بەرهەمە نەوتی یەکان بگەیەنێتە هەموو لایەکی وولات و پێویستی یەکانی دابین بکا. ساڵی ۱۹۳۳ ژمارەی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی عیراق گەیشتە شەش هەزارو پاشان لە ساڵی ۱۹٤۷ دا بوو بە ۱٤ هەزار.[25] هەتا ساڵی ۱۹۳٤ یش نزیکەی ٥ هەزار کەس بە راکێشانی بۆری نەوتی نێوان کەرکووك و دەریای سپی ناوەراستەوە خەریك بوون و بەشێکی زۆری ئەمانە کرێکاری عیراقی بوون.[26] بێ گومان سەرباکی ئەم جموجوڵەی کۆمپانیاکانی نەوت کارێکی باشیان کردە سەر کاروباری بیناکردن و کۆمپانیاکانی گواستنەوە، کە ئەرکی بارکردن و گواستنەوەی کەل و پەل و ئامرازی جۆر بە جۆریان گرتبووە ئەستۆ، تاوەکو ئەو شت و مەکانە بگەیەننە شوێنی ئیش کردن.

بە حوکمی چەندین هۆی تایبەتی و گشتی ی و لە پێش هەموویانەوە تەنگ و چەڵەمەی ئابوری لە ئینگلتەرەدا کە لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگەوە پێوەی دەیناڵاند، بە هۆی ئەوەیشەوە کە باری سیاسی لە عیراقدا سەقامگیر نەبووبوو. بچووکی ی وکەم دەرەتانی ی بازاڕای ناوخۆیش لەولاوە بووەستێ. هەموو ئەم هۆیانە نەیان هێشت سەرمایەی ئینگلیزی رووەو میسۆپۆتامیا رەو بکاو لەمەیدانی نەوت دا نەبێ لە هیچ بوارێکی دیکەی پیشەیازییدا رۆڵی خۆی نەگێرا. بەلام ئینگلیزەکان بەرامبەر بەمە حەزیان دەکرد عیراق بکەنە بەرهەمهێنەرو سەرچاوەیەکی کشتوکاڵی ی، بە تایبەتی ئەو بەرهەمە کشتوکاڵی یانەی دەبنە کەرەسەی خاو بۆ بەرهەمی پیشەسازیی. لەم تێ روانینەوە، دەیانویست لە مەیدانی بەرهەمهێنانی لۆکەدا عیراق بکەنەوە سەرچاوەی دووەم، لەبەر ئەوە لە ساڵی ۱۹۲۰ دا « کۆمپانیای گەشە پێکردنی لۆکە » یان دامەزراند، بەلام لەم مەیدانەدا بەختیان باشی نەهێنا. بۆیە ژمارەی کرێکارەکانیشی لە ناوەراستی

سالآنی بیستدا ١٥٠ کەس و لە کۆتایی بیستەکاندا بە هەزارحاڵ گەیشتە ١٧٥ کەس.[٢٧]

بەڵام بەرامبەر بەم حاڵە، لە دوای جەنگی یەکەمەوەو بەتایبەتی لە کۆتایی سالآنی بیستدا، باروزرووفی نوێ هاتنە کایەوەو بوونە هۆی ئەوەی تاڕادەیەك پەرە بە پیشەسازیی نیشتمانیی بدەن. ئەنجامی نزیك بوونەوەو تێکەڵ بوونی جیهانی سەرمایەداریی، باری سەرنجی سەرمایەدارانی عیراق و شێوەی تێ ڕوانینیان دەرهەق بە باری ئابوری ووردە ووردە گۆڕدرا و دوای کۆتایی هاتنی جەنگ چەند ساڵێکی نەخایاند، ژمارەیەك لەو سەرمایەدارانە کەوتنە خۆو پلانی دامەزراندنی چەند کۆمپانیایەکی ئەهالیان دانا وەك « کۆمپانیای ئەهالیی گشتیی عیراق» تاوەکو « لەسەر ڕێ و شوێنی تازە »[٢٨] بەغداو دەریای سپی ناوەڕاست بە یەکترەوە ببەستێ. ئنجا « کۆمپانیای عیراقی ئەهالی » دانرا کە خەریکی « پیشەسازیی و کشت وکاڵ و بازرگانیی و میتالی جۆربەجۆرو کاروباری گشتیی بوو »، بە مەرجێك بەغدا ببێتە مەلبەندەکەی و مافی ئەوەی هەبێ « نوماینده و لقی خۆی لە سەرانسەری عیراق و دەرەوەی عیراقدا بکاتەوە ». پاشان کۆمپانیای سێیەم دامەزرا تالەسەر ڕێ و شوێنی « پلانەکەی ویلیام ویلکۆکس »[٢٩] بەستی « فەلووجە » دروست بکا.

ئەگەرچی هیچ کام لەو کۆمپانیانە لە سالآنی ئینتیداب دا دەرنەکەوتن، بەڵام هەر بیرکردنەوە لە دامەزراندنیان[٣٠] نیشانەی ئاڵ و گۆڕێکی هەست پێکراوی نیازو مەبەستی چینی بۆرژوای تازە پێگەیشتووی عیراق دەگەیەنێ. ئەمەیش خۆی لە خۆیدا هەل و مەرجی بنچینەیی دەرکەوتنی پیشەسازی نیشتمانی یە کە سەرەتاکانی دەچێتەوە بۆ سالآنی بیستی ئەم سەدەیە.[٣١] لە ساڵی ١٩٢٦ دا یەکەم کارگەی نیشتمانیی چنین و ڕستن لە مێژووی وولآتدا بە ناوی « کارگەی فەتتاح پاشا » وە دامەزرا و لەیەکەم ڕۆژێ دروست بوونیدا ٦٥ کرێکار ئیشی تێدا دەکرد وپاش پێنج ساڵ ژمارەیان گەیشتە ٢٠٠ کەس و وای لێهات بەرهەمی ئەم کارگەیە بەشێکی پێویستیی شارو دامەزراوە ڕەسمی یەکانی بە قوماش دابین دەکرد. هەر لەو ساڵەدا دوو کەسی لوبنانی « تەبیارە » و « عەببود » کارگەیەکی بچووکی جگەرەیان بنیات ناو لەماوەی پێنج ساڵدا بە خێرایی پەرەی سەندو ساڵی ١٩٣١ ژمارەی ماشینەکانی گەیشتنە ١٥ و کرێکارەکانی لە ١٠٠ کەس تێپەڕین. سەرکەوتنی ئەم کارگەیەو بەو خێرایی یە بووە هۆی ئەوەی پاڵ بە سەرمایەدارانی عیراقەوە بنێ، سەرمایەکانیان لەم

پیشەسازی‌یەدا بخەنە گەڕ و بە هەمووی چەند ساڵێکی کەمی نەخایاند ژمارەی کارگەی جگەرە دروستکردن لە عیراقدا گەیشتە ١١ و سەدان کرێکار تێیانـدا کاریان دەکرد. لە ساڵی ١٩٢٨ یشدا ماشین‌و ئامرازی پێویست بۆ کارگەیەکی چیکەنەی لۆکە بە سـەرمایـەی عیراقی هێنـرایە وولاتـەوەو ناوی « کـارگەی چیکـەنەی عیـراق » ی‌لێنرا و رۆژی ٧ی تشـرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ بـە رەسمی‌ی کـرایەوە. مـاوەیەك پێش ئـەوەیش کارگـەی پێستە خـۆشکردنی « ئەلخضەیری » لە بەغدا کرایەوەو لە سەرەتادا ٢٥ کرێکار تێیدا کاریان دەکرد. پاشان چەند کارگەیەکی تری لەو جۆرەو یەکێکیش لە مووسڵ کرانەوە.[٣٢]

دوای کۆتایی هاتنی جەنگ پیشەسـازیی کەرەسـەی بیناکـاریی پەرەی سەند، بە تایبەتی دروست کردنی خشت بە شێوەیەکی هەستپێکراو گەشەی کرد. ژمارەی ئەو کووره خشتانەی بە هێزی هەڵم کاریان دەکرد لە ماوەی ١٠ ساڵدا ١٩٢٩ ـ ١٩٣٩، لە دوو کارگەوە گەیشتە ١٣ کارگەو لە ناویان‌دا سەدان کرێکار هەڵدەسووڕان.[٣٣] بە هەمان شێوەیش ژمارەی ئاشەمەکینەو چاپخانە[٣٤] و ماشینی کارەبا ژمارەیان زیادی‌کرد و لە دوا ساڵی ئینتیداب دا ژمارەی ماشینی کارەبا گەیشتە ١٩. هەروەها کارگەی دروستکردنی بەفریش لە دوای ساڵانی جەنگەوە لەوە دەرچوو بە تەنها لە بەغداو بەسرەدا بکرێنەوە، بەڵکو ژمارەیەك لەو کارگانە هەر لە زووەوە لە شارەکانی تریشدا دامەزرێنران بە نموونە: لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٢٢ کارگەیەکی بەفر دروستکردن لە کەرکووك کەوتە کار.[٣٥] ئەمە بێجگە لەوانەی لە مەیدانی رنین‌و داگرتنی خـورما دا ئیشیـان دەکرد و زۆربەیشیان عیراقی بوون؛ بە رادەیەك لە دوای جەنگەوە ژمارەیان زیادی کرد تا گەیشتە نزیکەی ٤٥ هەزار کەس.[٣٦] سەدان کرێکاریش لەو پرۆژە ئاودێری‌یانە دا کاریان دەکرد کە ئینگلیز تا رادەیەك بایـەخی پێ دابوون، وەك جـۆگەی « لەتیفی‌یە ». ژمارەیەکی باشی کرێکارانیش بە دەرهێنانی میتاڵی پێویستەوە خەریك بوون. چونکە لەو ساڵانەدا خەڵکی‌ی لە کانەکانی « سیکی » ی نزیك « دهۆك » و « هەرپوول » ی سەروو « مووسڵ » و « کفری » و لە نزیك « زاخۆ » وە کەوتنـە دەرهێنانی خەڵووزی بەردین. لە « توزخورماتـو » و « زاخۆ » و « هیت » و « سەرسار » و « مەحاویل » و « کووفە » و « خالیس » و « سەماوە » و شوێنی تریش، ستیـان بە دەرهێنـانی خـوێ کـرد. لە « سـامـەڕا » و « سـەقـڵاوی‌یـە » و «ئەسکەندەری‌یە » گەچیان بەرهەمهێنا و لە نزیك « مووسڵ » و « کەرکووك » و « شەتاتە » « دەستیان بەدەر هێنانی بەردە مەرمەڕکرد.[٣٧] گۆڕانێکی باکەمیش بێ بەسەر ئـامرازەکـانی بەرهـەمێنان‌دا هـات‌و شێوازی ئیش‌کـردنیش لە لایەن

بەلێندەرەکانەوە، تارادەیەك جیاوازی لەتەك شێوە باوەکەی بەر لە جەنگی یەکەم دا هەبوو.

شان بە شانی هەموو ئەمانەی باسکران، هەزاران کرێکار لە ناو شارەکاندا لە بواری خزمەتگوزاری و بازرگانیدا کاریان دەکرد، لەوانە کرێکارانی چێشتخانە و ئوتێل و شارەوانیو بیناکاریو زۆری تریش. سەرەرای ئەو تەنگو چەڵەمەیەی بەرهەمی پیشەیی تێی کەوتبوو پێوەی دەینالاند، لەسالانی ئینتدابدا پیشەوەران هێشتا کەرتێکی گەورەی زەحمەتکێشانی عیراقیان پێك دەهێنا. نەك هەر ئەوەیش بەڵکو بەحوکمی پێویستیو فراوان بوونی شارەکان و کۆتایی هاتنی بەرهەمی سروشتیی و پەرە سەندنی پێویستییە کۆمەلایەتییە نوێیەکان، مەوقیعی ئابوری چەند کەرتێکی دیاری کراویان پتەوتر بوو. لە دوا سالی ئینتدابدا بە تەنیا لە « بەغدا » ١٣٠ مسگەر و ٧٠ ئاسنگەر کاریان دەکرد.[٣٨] بە پێی راپۆرتێکی رەسمیی کە مێژووی سالی ١٩٣٢ ی لەسەرە، ژمارەی پیشەوەران لەسەرانسەری عیراقدا ٥٠ هەزار کەس بووە.[٣٩]

ئا بەو جۆرە لە سالانی داگیر کردنی عیراقو ئینتدابی بەریتانیدا بە ئاشکرا هەست بە گەلالە بوونی چینی کرێکارانی عیراق دەکەین، بەئەندازەیەك دەتوانین قسە لە توێژێکی کۆمەلایەتی نوێی ئەوتۆ بکەین چ لە رووی ئیشکردن و چ لە رووی چەندیەتی و چۆنیەتییەوە جیاوازیی لە تەك توێژە کۆمەلایەتییەکانی تردا هەبوو. لە چاو سالانی جەنگیشدا چەند هەنگاوێکی گەورەی بۆ پێشەوە نا. هەر لەم قۆناغەدا دانیشتووانی شارەکان بە هۆی پێکهاتنی چینی کرێکارانەوە ژمارەیان زیادی کرد و پیشەوەرانیش لە جاران زیاتر بوونە سەرچاوەیەکی گرنگ و بەردەوامو ئەوکەسانەیان دەنارده ناو چینی کرێکارانەوە کە بە تەواوی پەیوەندییان لەگەل بەرهەمی کشتوکالیو لادێدا پساندبوو. لەوانەیش پتر بوون کە لە بنەرەتەوە پەیوەندییان لەتەك هۆیەکانی بەرهەمهێنانی پیشەسازی سادەدا هەبوو. ئا ئەم حەقیقەتەیش شوێن پەنجەی بەسەر گەلالەبوونی هوشیاری چینایەتی کرێکارانەوە دیارە، بە تایبەتی لەم قۆناغەدا و لەدواییدا بەرێزیی باسی دەکەین.

سەرەرای هەموو ئەمانەیش، لەم قۆناغەدا هێشتا هەر لادێ سەرچاوەی سەرەکیی پێکهاتنی چینی کرێکاران بوو. بە تایبەتی کە پەیوەندی نێوان شارو لادێ قایم تربوو. ئەمەیش لە ئەنجامی ئەوەدا بوو کە زولم و ستەمی

دەرەبەگایەتی لە دوای سالانی جەنگەوە، وەك دیاردەیەكی كۆمەلایەتی تا دەهات زێفی دەسەند، جووتیارانیش بۆ دەرباز بوون لەو دۆزەخە ناچار دەبوون كۆمەل بەرەو شارەكان رەو بكەن، چونكە هەرچی سەرچاوەی ژیان هەیە لەدەستیان چوو بوو. لە زووەوە، بە نموونە لە سالی ۱۹۱۹ دا، ژمارەی ئەو كرێكارانەی لە ناوچەی « رەمادی » یەوە بەرەو « بەغدا » رەویان كردبوو، گەیشتە نزیكەی دوو هەزار كەس.[٤٠]

واقیعی نەتەوایەتی گەلی عیراقیش لە گشت قۆناغەكانیو لە سەرانسەری وولاتدا كاری لە پێكهاتنو دروستبوونی چینی كرێكاران كردو تێیدا رەنگی دایەوە و یەكەم توێژی كۆمەلایەتی یە لەسەرو خوارووی وولاتداو لەناو ریزەكانی دا نوێنەری نەتەوەو تیرە جیاجیاكان كۆبوونەتەوە. كرێكاری عەروب شان بەشانی كرێكاری كورد لە كۆمپانیاكانی نەوتدا كاریان دەكرد، هەروەك كرێكاری كوردیش لە بەندەری بەسرەو پرۆژەكانی رێگاو باندا ئیشی دەكرد. لە ناوەراستی سالانی بیست دا ژمارەی كرێكارانی كورد لە ناو دامەزراوەكانی رێگای ئاسن دا، نزیكەی ۲۳٪ ی تێكرای ئەو كرێكارانەی پێك دەهێنا كە لەم مەیدانەدا ئیشیان دەكرد. سالی وایش هەبوو نیسبەتیان لەوەیش زیاتر بوو.[٤١] جا هەرچەندە دەسەلاتدارانی ئینگلیز لەبەر چەند هۆیەك كە پاشان قسەیان لێوە دەكەین، پشتیگیریی ئەم دیاردەیەیان دەكرد، بەلام هەر ئەم دیاردەیە لە مەودایەكی دوورتر دا ئاسەوارێكی ئیجابی بەجێ هێشت و بووە هۆی گەلالە بوونی هوشیاریی چینایەتی لەناو كرێكارانی عیراقدا. پێكەوە كاردنو چەشتنی زولمو ستەمی چەوساندنەوە بەبێ جیاوازیی و لەیەك سەرچاوەوە، بوونە هۆی دەركەوتن و پەرەسەندنی گیانی برایەتی نەتەوەیی لە دەروونی كرێكارانی عیراقدا. رەنگدانەوەی ئەو گیانەو لە قوناغی دروست بوونی چینی كرێكاراندا، بەجوانیی لەو چەند ووشەیەدا دەردەكەوێ كە كرێكارانی رێگای هەولێر ـ رەواندوز ـ رایات پاش كۆتایی هاتنی ئیشەكەیان سالی ۱۹۳۲ لەسەر گاشە بەردێك هەلیان كۆلیوە.[٤٢]

لەگەل ئەوەدا سەرەرای لاوازیی سەرمایەی نیشتمانیی و لەبەر ئەوەیش كە دەولەت خاوەنی پرۆژە بنەرەتییەكانی وولات بوو، دەبنین كارو كرێكاران لە قۆناغی دوای جەنگی یەكەمدا بە دەست كۆمەلێك گیروگرفتی راستەقینەوە دەیان نالاند.

## گیروگرفتی بنچینەیی کارو کرێکاران و

## رەنگدانەوەی لە ناو بزووتنەوەی کرێکارانی عێراقدا

---

تێکرای پیشەوەرە جۆربەجۆرەکان، بە کرێکارە پیشەییبەکانیشـەوە لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ دووچاری گەلێك گیـروگرفت هـاتن. ئاوێتـە بوونی ئابوری وولات لەتەك بازاڕی سەرمایەداری جیهان دا بەسەرێك و داگیر کردنی عیراق بەشێوەکی راستەوخـۆ بەسـەرێکیتر، بـوونە هـۆی ئەوەی بـەرهەمی پیشەیی لە ناو وولاتدا بە خێرایی بەرەو لەناوچوون بچێ. ئەم باسەیش دەهێنێ لە لایەن ئەو کەسانەوە کە بەتوێژینەوەی مێژووی چینی کرێکارانی عیراقـەوە خەریکن، بایەخێکی گەورەی پێ بدرێ. چونکە لە ناوچوونی بەرهەمی پیشەیی لەو قۆناغەدا شوێنەوارێکی زۆر دیاری بەسەر بزووتنەوەی کرێکارانی عیراقەوە بەجێ هێشت. نەك هەر ئەوەیش بەڵکو ئەم مەسەلەیە خۆی لە خۆیدا کلیلێکە بۆ تێ گەیشتنی لایەنە گرنگەکانی ئەو بزووتنەوەیە و خاسییەتەکانی چ لە سالانی داگیرکردن و ئینتداب و چ لە دوای ئەو قۆناغەیش.

ئاوێتە بوونی عیراق لە گەڵ بازاڕای سەرمایەداریی جیهانی، ماوەی ئەوەی نەدا، بەرهەمی پیشەیی کە بە درێژایی چەند سەدەیـەك وولات ناوبـانگی پێ دەرکردبوو گەشە بکاو پەرە بستێنێ. سـەرەنجامیش هیـچ پیشەیـەك لەوانە، بەدەگمەن نەبێ، نەیتـوانی بەرەو قـۆناغی مـانیفاکتـورە هەنگـاو بنێ.[٤٣] بە پێچەوانەوە دەبنیین لەو ماوەیەدا بەرهەمی پیشەیی بەگشتیی و بەهۆی ئەوەوە کە نەیدەتوانی بەربەرەکانەی کەل و پەلی بەلێشاوی ئەورووپایی هەرزان بەهابکا، رووەو لەناوچوون دەرۆیشت. بەنموونە ژمارەی جولاکانی شاری «بەغدا» لەوەوە کە سالی «١٨٦٦»، ٣٥٠٠ کەس، بوون، لەسالی ١٩٣٢دا هاتنە سەر ١٢٠کەس و زۆربەیشیان مەکۆی دەستییان بەکار دەهێناو لە مالی خۆیاندا کاریان دەکردو ئەوپەڕی بەرهەمی رۆژانەی تاقە یەکێکیان لە ٦ مەتر تێ نەدەپەڕی.[٤٤] وەنەبێ جێ پـەنجەی ئـەم دەستە کـوشندەیـە تەنهـا بەسـەر کـاری پیشـەیی نـاو شارەگەورەکانەوە خۆی نواندبێ، بەڵکو سەرتاپای شارو شارۆچکەکانی عیراقی گرتبووەوە، ئەوەندەی جولاکانی «بەغدا» و «بەسرە»و

« مووسل » بە دەست کەل و پەلی بێگانەوە دەیان نالاند، ئەوەندەیش جۆلاکانی « دیالە » و « نەجەف » و شوێنەکانی‌تر دادو بێ دادیان بوو. ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەم بەربەرەکانەیە بە تەنها کاری نەکردە سەر پێداویستی‌یەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵکی ی، بەڵکو گشت بەرهەمە پیشەیی‌یەکانی گرتەوە. بەنموونە: لەپێش جەنگدا « سلەیمانی » و « رەواندووز » هەندێ چەکیان بەرهەم دەهێنا، بە قسەی هەندێ نووسەر هاوشانی ئەو چەکانە بوون کە لەووڵاتانی ئەورووپای ئەوسادا دروست دەکران.[45] لە « رەواندوز » وەرشەیەك، تۆپی بۆ لە شکری دەسەڵاتدارانی ناوچەکەو والی « مووسل » دروست دەکرد و[46] بەشێکی ئەو میتالانەی وەرشەی ناوبراو پێویستی پێیان بوو لە کانەکانی نزیکی‌یەوە، بەهۆی کاری کرێ گرتەوە دەردەهێنران.[47] کاتێکیش کە « مارك سایکس » لە ساڵی ۱۹۰۲ دا بە شاری « سلەیمانی » دا گوزەری کرد، بە چاوی خۆی ۱۵۰ چەخماخ سازی بینی بە دروستکردن و چاککردنەوەی چەکەوە خەریك بوون و عەشرەتەکانی ئەو ناوچەیش لەو تفەنگانەیان بەدەستەوە بووە کە لە ناوخۆدا دروست دەکران، بۆیە لە کاتی خۆی‌دا سەرنجی ئەو لێپرسراوە ئینگلیزی‌یەی راکێشاوە. « ئەدمۆندس » یش دوای ئەو، پێی لێ دەنێ کە دوای داگیر کردنی ووڵات لەلایەن بەریتانیاوە، پیشەی چەخماخ‌سازیی بەتەواوی لەئارادا نەما.[48]

ئەم بارە ناهەموارە، رۆژ لە دوای رۆژو بە هۆی ئەو سیاسەتی باج وەرگرتنەی کە حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عیراق گرتیانە بەر، رووەو خراپتر دەچوو. لە لایەکەوە باج لەسەر، توێژە کۆمەڵایەتی‌یە جیاجیاکان زیاد دەکرا و باجی نوێ‌یشیان دەسەپاند، لە لایەکی تریشەوە هیچ کام لەو باجانەی خرابوونە سەر کەل‌وپەلی لەدەرەوە هێنراوی بێگانە، بۆ ئەوە نەبوون بەرهەمی پیشەیی ووڵات بپارێزن‌و گەشەی پێ‌بکەن. ئەوەتا هەتا ساڵی ۱۹۰۷ نیسبەتی ئەو گومرگەی لە سەر کەل‌و پەلی ئەورووپایی دانرابوو ۸٪ ی نرخەکەیان بوو. هەرچی تەقەللایەکیش درابێ بۆ زیاد کردنی ئەو نیسبەتە، دەوڵەتە ئەورووپایی یەکان بەرەنگاری هاتوون‌و پووچیان کردووەتەوە. تا بە هەزار حاڵ لە مانگی تەمووزی هەمان ساڵ‌دا پاش ئەوەی دەوڵەتە گەورەکان قایل بوون، توانرا نیسبەتی گومرك لەسەر کەل‌و پەلی بیانی بکرێتە ۱۱٪. بە درێژایی ساڵانی جەنگیش لە سەرانسەری عیراقدا ئەو بڕیارەی دەوڵەتی عوسمانلی جێ‌بەجێ نەکرا کە دەبوو رەسمی گومرك بکرێتە ۳۰٪. پاش ئەوەیش کە « بەیاننامەی رەسمی گومرگی ژمارە ۱۹ ی ساڵی ۱۹۱۹ » لە ساڵەکانی ئینتدابدا ۱٤ جار

دەستکاری کرا، نیسبەتی ئەو گومرگەی لەسەر کەل‌و پەلی بیانی دانرا، بەدەگمەن نەبێ لە ١٥٪ ی نرخی ئەو کەل‌و پەلانە تێنەدەپەڕی، ئەویش هەندێ بابەتی خواردنەوەو بۆن و جگەرەی دەگرتەوە.[٤٩]

ئەم سیاسەتە بووە هۆیەکی گرنگی یارمەتیدەر بۆ پتر هاوردنی کەل‌و پەلی ئەوروپایی کە لە ماوەی ٢٠ ساڵ دا « ١٨٦٥ ـ ١٨٨٥ » ٧ کەرەت نرخیان زیادی کردبوو، تا سەردەمی جەنگی یەکەم سێ ئەوەندەی تر زیاد بکا.[٥٠] بەلام لە سەردەمی داگیرکردن و ئینتدابی بەریتانیایی‌دا دەرگای بازارەکانی عیراق لەسەر کەل‌و پەلی بێگانە، بەتایبەتی کەل‌و پەلی ئینگلیزی کەوتنە سەر گازی پشت. ئەمەیش گیروگرفتی پیشەوەرانی لە جاران خراپتر ئالۆزاند، بۆیە داوایان لە دەوڵەت کرد، رەسمی گومرك لەسەر کەل‌و پەلی بیانی زیاد بکرێ و بەئەندازەیەك بێ « نەتوانێ بەربەرەکانەی کەل‌و پەلی خۆماڵی بکا »، وەك دەقاو دەق لەو ئەرزوحاڵەدا نووسراوە کە دەستەیەك خەڵکی پیشەوەر لەگەڵ کۆتایی هاتنی ئینتداب دا پێشکەش بە داموو دەزگا رەسمی‌یەکانیان کرد.[٥١]

بەلام لەگەڵ ئەمانەیشداو هەرچەندە گیروگفتی پیشەوەران لە دوای جەنگ قووڵتر دەبوونەوە، رژێم هیچ هەنگاوێکی ئەوتۆی نەنا تۆزێك گوزەرانیان بەرەو باشی ببا. بە نموونە: یاسای پشتگیری کردنی پیشەسازی کە ساڵی ١٩٢٩ دەرچوو.[٥٢] تاقە بەندێکی تێدا نی‌یە، دەست بداتە باڵی پیشەوەران. چونکە ئەو دامەزراوانەی سوودیان لە ئیمتیازەکانی وەردەگرت، دەبوو وزەی میکانیکی بەکار بهێنن و نرخی ئامێرو ماشینەکانیشیان لە ٣٠ هەزار روپیە کەمتر نەبێ. بەرامبەر بەمەیش پیشەوەران وەك بەشێکی جەماوەری زەحمەتکێش بە دەست سیاسەتی باج وەرگرتنی دەوڵەتەوە دەیان ناڵاند، وەکو لە دواییدا بۆمان روون دەبێتەوە.

جا بۆ ئەوەی مەودای تەواوی ئەم حەقیقەتە باشتر بەرجەستە بکەین، چەند برگەیەکی پڕ مەغزای ئەو ئەرزوحاڵە دەخەینە بەرچاو کە دەباخچی‌و مشت‌وماڵکەر و پێڵاو دروەکانی « مووسڵ » پێشکەش بە لێپرسراوانیان کرد و تێیدا داوایان دەکرد لە بەرهەمی کۆمپانیای « باتا » ی بیانی بیان پارێزن. ئەوانەی ئەرزوحاڵەکەیان مۆر کردبوو، لە لێپرسراوان دەپاڕێنەوە «.. دەستی یارمەتی‌یان بۆ درێژ بکەن » و دەپاڕێنەوە « خۆیان وماڵ‌و منالیان کە ژمارەیان خۆی لە چوار هەزار کەس دەدا لە مەترسی‌ی برسیەتی » بپارێزن. پاشان پیشەوەران دەقاو دەق دەڵێن:

ـ ئەم قسەیش هی دوا ساڵی ئینتیدابە ـ:

«.. ئێمە چەند ساڵە بەوپەڕی خۆڕاگرتنەوەو لە ئەنجامی بەربەرەکانە کردنی کەل و پەلی بیانی دا، نەبوونی ی و برسیەتی دەچێژین. زۆر جار زوڵمان لێ کراوەو لای لێپرسراوان دادو بێ دادمان کردووە، تاوەکو بەفریامانە وەبێن و لە بەلای ئەم بەربەرەکانێ کوشندەیە بما نپارێزن.[53] ئێمە لە کاتێکدا کە بەم کوێرەوەری و هەژاری یە ژیان بەسەر دەبەین، کۆمپانیای - باتا - دای بە سەرمان داو دوکانێکی لەشارەکەمان دا کردەوە تاوەکو بەرهەمی خۆی تێدا ساغ بکاتەوەو ئەو پارووەنانەی پەیدامان دەکرد لە گەروومانی دەربهێنێ و برسی و بێ کارو ئاوارەمان بکا.. رزگارمان کەن لە کۆمپانیای - باتا - ، چونکە ئەوەندەی نەماوە بەتەواوی خۆمان و ماڵ و منداڵمان لەناو ببا ..»[54]

ئا ئەم ئەرزوحاڵە کە داوا لە مەلیك و سەرەك وەزیران و هەردوو وەزیری ناوخۆو دارایی دەکا، کارێکی وا بکەن باجێکی زۆرتر بخرێتە سەر کۆمپانیای - باتا - وەهەموو کەل و پەلێکی بیانی هاوچەشنی کەل و پەلی عیراقی، لە ریزی کرێکاران و پیشەوەران دا، دەنگێکی باشی دایەوە.[55]

بەو چەشنە، ئەو پیشەوەرانەی بە درێژایی چەند سەدەیەك بووبوونە کۆڵەکەی ئابوری شارەکانی عیراق و تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بەبەرهەمەکانیان بازارەکانی ناوخۆو بگرە چەند هەرێمێکی دراوسێشیان سیسخناخ دەکرد[56] کەوتنە بارودوخێکی ئابوری زۆر ناهەموارەوەو ئەنجامی دەست تێوەردانی ئابووری و سیاسی ی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان، لە تەنگ چەڵەمەیەکی راستەقینەدا دەژیان. لەبەر ئەوە ئەگەر رقێکی رەوا لە دڵ و دەروونی ئەوانەدا، دژی کەل و پەلی بیانی و خاوەنەکەی و ئەوانەیش کە هاوردن و ساغ کردنەوەیان ئاسان دەکەن، کەڵەکە بووبێ شتێکی زۆر سروشتی یە. ئەم هەڵوێستە لە ساڵانی ئینتداب دا زۆر جار سیمایەکی توباوی توندوتیژی دەگرتە خۆی. بە نموونە: لە دوا دوای ساڵی ١٩٣٠ دا خەڵکی « کەربەلا » وازیان لە چایی و قاوە خواردنەوە هێنا، چونکە شت وەکی بیانین. قاوەخانەکانی شار لەبریتی ئەوانە ماست و خورمایان دەفرۆشت؛ لەناو ماڵانیش دا دۆشاو دەخورایەوە.[57] هەر لەو رۆژانەدا رۆژنامەکانی ئەو رۆژگارە دەنگوباسێکیان لەمەڕ ئەو سوێندە بڵاو کردەوە کە چۆن « سی پیاوی ئاینی ی هەرە بەناوبانگی نەجەف خواردوویانەو گفتیان داوە بە تەواوی دەست لە چایی خواردنەوە هەڵبگرن و هەوڵیش بدەن ئەم بیروڕایە لە ناو جەماوەردا بڵاو بکەنەوە ».[58] دوای ماوەیەکیش کۆمەڵی کرێکاران و پیشەوەرانی « مووسڵ » بە شێوەیەکی فراوان

کەوتنە پڕوپاگاندە دژی کەل و پەلی بیانی، وەك ڕۆژنامە ناوخۆیی یەکانی ئەوکاتەو لەوانە ڕۆژنامەی « الاخلاص » ی مووسڵاوی دەستی بـۆ درێژ کـردووە، حاڵ گەیشتووەتە ئەوەی ئەو کەسانەی سەرپەرشتی ی پڕوپاگاندەکەیان دەکـرد « خاوەنی چاپخانەکانیان هان دەدا شیری خۆماڵی لە بریتی چایی بێگانە بفرۆشن.. خاوەن چاپخانەکانیش بەوپەڕی خۆشحـاڵی یەوە بـەم پێشنیازە قـایل بـوون و هەندێکیان دەستیان بە شیر فرۆشتن کرد و ئەوانی تریش لەسبەینێوە دەست پێ دەکەن.»[٥٩]

بە حوکمی ئەو هۆیانە، لە ساڵانی ئینتداب و بەتایبەتی لە دوا ساڵەکانیدا، هەوڵێکی زۆر درا بۆ پشتگیـری کردنی پیشـەسازی نیشتمـانی ی لە بەغـدا، کۆمەڵێکی تایبەتی بە ناوی « کۆمەڵەی پشتگیری کردنی بەرهەمە نیشتمانی یەکان » دامەزرێنرا و ئامانجی سەرەکیی ئەوە بوو « پاڵ بە نەتەوەوە، بە حکوومەت و میللەتەوە بنێ لە جیاتی بەرهەمی بیانی بە هەموو چەشنەکانی یەوە، یارمەتی بـەرهەمـەنیشتمانی یـەکان بـداو بەکـاریان بهێنن». لەوانـەیش کە ئـەندامی دامەزرێنەری بوون، خەڵکی وەك « موحەممەد بەهجەتولئەسەری» و « حـافز جەمیل » و « سەلمان ئەلسەفوانی » یان تێدا بوو.[٦٠] لە هەندێ شاریشدا و بۆ هەمان مەبەست، لیژنەی تایبەتی پێکهات و بەو بـۆنەیـەوە چەنـدین ئاهـەنگ گێڕدراو ووتاری گەرم و گوڕ دەخوێندرانەوە تاوەکو هانی خەڵکی ی کەل وپەلی بدەن خۆماڵی بکڕن. نوێنەرانی جەماوەریش بۆ نیشان دانی نارەزایی خۆیان و سەبارەت بەوەی کەل و پەلی بیانی بازاڕی وولاتی داگیرکردووەو بەربەرەکانەی کەل و پەلی خۆماڵی ی دەکا، سەردانی کارگە ئەهلی یەکانیان دەکرد.[٦١] کۆمەڵەی کرێکار و پیشەیی کان، لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنیانەوە، بەگەرمی ی بە پیر ئەم مەسەلەیەوە چوون، تەنات مادەی ٢٧ ـ ٣٠ی پڕۆگرامی ناوخۆی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بریاری دا هەموو ساڵێك دوو پیشانگا بـە مەبـەستی هانـدانی پیشەسازی نیشتمانی ی بکاتەوەو بۆ هەر پیشەیەکیش خەڵاتێکی دیاری کرد.[٦٢] هەر بەراستیش کۆمەڵی ناوبراو چەند جارێك ویستی ئەم مەسەلەیە، بە کردەوە بچەسپێنێ.

بۆیە زۆر شتێکی مەنتیقی بوو کە ئەم رقە رەوایە دژی هەموو شتێکی بیانی بچێتە بارێکی ترەوەو لە هەڵوێستی سیاسی ی دژ بە ئیمپریالیزم دا خۆی بنوێنێ. ئەم دیاردەیەیش لە سەردەمی ئینتداب دا لەبەر دوو هۆی بنەڕەتی ی زۆر گەورە بوو. هۆی یەکەم ئەوەیە: پیشەوەران سەرەرای ئەو تەنگوچەلەمـەیەی تێیـدا

دەژیان هێشتا هەر توێژێکی کۆمەڵایەتی یان پێك دەهێناو کاریان لە ژیانی شار دەکرد و شارەکانیش ووردە ووردە خەریك بوون جێگایەکی دیارتر لە مەسەلە سیاسی یەکانی وولاتدا بۆ خۆیان داگیر بکەن. بە پێی تەقدیری وەزارەتی دارایی نیسبەتی پیشەوەران « کرێکاران و دوکاندارەکان » هێشتا لە ٣٪ وزیاتری دانیشتووانی پارێزگاکان پێك دەهێنن.[٦٣] گرنگی ئەم رێژەیەیش بە چەندیەتی ژمارەیان نی یە، بەڵکو گرنگی یەکەی لە چۆنیەتی یان دایە. چونکە ئەمانە چ لە شارو چ لە لادێکاندا پەیوەندی یەکی راستەوخۆیان بە توێژە کۆمەڵایەتی یەهەژارەکانەوە هەبوو. لەوەیش گرنگتر ئەوە بوو کە لە زۆر سەرەوە بەیەکترەوە بەسترابوونەوە. بەپێی هەندێ بۆچوون وخەملاندن نزیکەی ٧٥٪ ی پیشەوەران ئاستی گوزەرانیان لە رادەیەکی ئەوەندە نزمدا بوو، راستەوخۆ کاری لە هێزی کڕین « القوة الشرائية » ی کرێکاران و جووتیاران دەکرد. ئەوانی تریش کە رۆژانەکانیان زۆرتر بوو، بریتی بوون لە زێرنگەرو زیوگەرو فەرش چنەکان و پیشەگەری لەو جۆرە.[٦٤] ئەوانەیش هیچ رۆڵێکیان لە جموجۆڵی ئەو کۆمەڵە پیشەیی یانەدا نەدەبینی کە لە سەرەتای ساڵانی سی دا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن خۆیان سەپاند.

هۆی دووەمیش ئەوە بوو: بەشێکی گەورەی پیشەوەران بێ کاری رووی تێکردن و تەنانەت ئەوانەیش کە دوکانی پیشەیی یان هەبوو بەرەو نابووتی دەچوون. ئەمانە هەر بەوەوە رانەوەستان رقێکی رەوا لەدڵ و دەروونیاندا پەروەردە بکەن، بەڵکو روویان کردە ریزەکانی چینی تازەی کرێکاران. ئەم دیاردەیەیش بە شێوەیەکی راستەوخۆ کاری لە بزووتنەوەی کرێکاران کردو هەر ئەو پیشەوەرانەیش بوون بە درێژایی ساڵانی ئینتدابی بەریتانیایی بوونە سەرکردەو پێشرەوی کرێکاران.[٦٥]

گیروگرفتی زۆرو باروزرووف لەیەکچووی ژیان، لە ساڵانی داگیرکردن و ئینتدابدا پیشەوەران و کرێکارانی لەیەك ئاستدا کۆکردەوە. لە قۆناغی دوای جەنگدا، چینی کرێکارانی عیراق تووشی چەندین جۆر چەوساندنەوە هاتن، ئەمەیش بەر لە هەمووشتێك لە مەسەلەی سەعاتی ئیش کردن و رۆژانەو بێ کاری و زامن کردنی ژیان دا رەنگیان دایەوە. بە درێژایی ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی شتێکی ئەوتۆ لە سەعاتی ئیش کردن کەمی نەکردەوە. بە دەگمەن نەبێ کرێکار رۆژی لەهەشت سەعات پتر ئیشی پێ دەکرا. لەوەیش خراپتر ئەوە بوو کە هیچ کام لەو دامەزراوە رەسمی یانە، پەیڕەوی سیستەمی ٤٨ سەعات ئیش

کردنی هەفتانەیان نەدەکرد. وەك بەڵگەنامە رەسمی یەکانی بەریتانیا پێی لێ دەنێن، ئیش کردنی هەفتانەی کرێکارانی نەوت دەگەیشتە ٥٤ سەعات. جا بۆ ئەوەی بزانین تا چ رادەیەك بەش خوراو بوون، ئەو حەقیقەتە دەخەینە بەر چاو کە ئیش کردنی هەفتانەی کرێکار بە پێی بەڵگەنامە رەسمی یەکان لە هەندێ لەو کارگە ئەهلی یانەدا کە تازە دامەزرابوون لە ٤٨ سەعات تێپەڕی دەکرد.[٦٦] لەگەڵ ئەمەیشدا زانیاری یەکی زۆرمان لەبەردەستدا هەیەو هەموویشیان دڵنیامان دەکەن کە لە هەندێ بەشی کۆمپانیای نەوتی عیراقدا کرێکاران هەفتەی ٥٤ سەعات زیاتر ئیشیان پێ دەکرا. لە دوا سالی ئینتداب دا شۆفێری تراکتۆرەکان رۆژ هەتا ئێوارەو بگرە بەشێکی شەویش ئیشیان دەکرد.[٦٧] بۆیە چەوساندنەوەی کرێکاران لەلایەن دامەزراوەکانی میری یەوە گەیشتە ئەوپەڕی. لە بەڕێوەبەرێتی ئەشغال دا ئیش کردنی هەفتانەی کرێکاران دەگەیشتە ٧٠ سەعات. بەڕێوەبەرێتی کشتوکاڵیش لە هاوین دا هەفتەی ٦٣ سەعاتو لە زستان دا هەفتەی ٧٠ سەعات ئیشی پێ دەکردن.[٦٨] بەلام ئیش کردنی رۆژانە بە نیسبەت ئەو کرێکارانەوە کە، وەرزاو وەرز ئیشیان دەکرد، لە نێوان ١٤ ـ ١٦ سەعات دا بوو.[٦٩]

کرێکاری عیراقی بەرامبەر بەم ئیشە قورس و گرانە، رۆژانەیەکی ئەوەندە کەمی وەر دەگرت نە هاوتای ئەو رەنجە بوو ئەو بەختی دەکردو نە لەگەڵ دەستکەوتی بێگانەو قازانجی دەوڵەتیشدا بەراورد دەکرێ. هەر بەو حاڵەیش مایەوەو رۆژانەی کرێکارێکی عیراقی لە رۆژانەی کرێکاری زۆربەی وولاتانی ئەم ناوچەیە کەمتر بوو. لێرەدا جارێکی تریش بە شێوەکی ئاشکرا چەوساندنەوەی بێگانە خۆی دەنوێنێ کە چۆن ئەو دامەزراوانەی بە سەرمایەی ئەو بەڕێوە دەچوون هەوڵیان دەدا رۆژانەی کرێکاری عیراقی کەمبکەنەوەو تا بۆیان بکرێ زوڵمیشی لێ بکەن. لەبەر ئەوە، ئەگەر کرێکاری نەشارەزای عیراقی لە کۆمپانیای نەوت دا مانگی ٨ روپیە[٧٠] کەمتری لە کرێکارێکی هاوسنفی خۆی لە « کۆمپانیای فەتتاح پاشا » وەرگربێتێ شتێکی سەیر نی یە.[٧١] گەر بێو ئەوەیش بخەینە بەرچاوی خۆمان کە کرێکارێکی نەوت مانگی ٣٠ سەعات زیاتری لە کرێکارێکی چنینی کارگەی باسکراو ئیش دەکا، ئەوسا هەست دەکەین تێکڕای « معدل » ئەو جیاوازی یە تا چ رادەیەك بەرز بووەتەوە. کرێکارانی رێگای ئاسنیش هەفتەی لە ٣ ـ ٦ روپیە کەمتریان لە کرێکارانی هەندێ پرۆژەی ئەهلی وەردەگرت. لە سالی ١٩١٩ دا رۆژانەی هەندێ کرێکاری شارەزا کە لە « قورنە » ئیشیان دەکرد دوو سێ یەکی ئەو رۆژانەیەی هاوسنفەکانیان بوو کە لە شوێنە ئەهلی یەکان دا ئیشیان

دەکرد.[٧٢] جا بۆ ئەوەی ئەم بارو دۆخە لەجێی خۆی سەقامگیر ببێ، کۆمپانیا بیانی یەکان قەواڵەی ئیش کردنی زۆر نارەوایان بە سەر کرێکارەکانیاندا دەسەپاند، نەك هەر ئەوەیش بەڵکو لە نێوان خۆیان دا ڕێك دەکەوتن بۆ ئەوەی سیستەمێکی یەکگرتوو سەبارەت بە سەعاتی ئیش کردن و ڕۆژانەی کرێکاران بچەسپێنن، وەك هەردوو کۆمپانیای نەوتی کەرکووك و خانەقین کردیان.

جا بۆ ئەوەی ئاستی گشتی ی تێکڕای ڕۆژانەی کرێکاران لە ساڵانی داگیرکردن و ئینتداب دا، بخەینە بەردەست، لێرە بە دواوە ئەم نموونانە دەنووسینەوە. بە قسەی ڕاپۆرتە ڕەسمی یەکان، ئەوپەڕی مانگانەی کرێکاری نەشارەزا لە ساڵی ١٩٢٦ دا لە کارگەی « فەتتاح پاشا » دا، دەگەیشتە ٤٥ ڕوپیەو لە کۆمپانیای نەوت دا ٨ر٣٧ ڕوپیەو لە ڕێگای ئاسن دا ٣٥ ڕوپیەو لەبەندەری بەسرە ٣٠ ڕوپیەو لە « کۆمپانیای ئینگلیزی پەرەپێدانی لۆکە » دا ٢٥ ڕوپیە، بوو.[٧٣] تێکڕای ئەم ڕۆژانانەیش لە دامەزراوەکانی سەر بە میری دا، بەرە بەرە، دێنە خوارەوە. ئەوەتا لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ی ئەشغال و مەساحە وکشتوکاڵ دا، لە باشترین حاڵ دا دەگەیشتە ٣٠ ڕوپیە.[٧٤] تابلۆی تراژیدیایی ڕۆژانەی کرێکارانی عیراق زۆرتر لەو هێڵە بەیانی یەدا بەرجەستە دەبێ کە کەمترین ڕۆژانەمان نیشان دەدا، واتە ڕۆژانەی زۆربەی کرێکاران. ئەوەتا ساڵی ١٩٢٦ لە ڕێگای ئاسن ٢٥ ڕوپیەو لە بەندەری بەسرە ٣٠ ڕوپیە بوو.[٧٥] کەچی دوای پێنج ساڵ کەمتر لەو دوو دامەزراوەیەدا بوو بە ١٥ ڕوپیە.[٧٦] بە نیسبەت ئەو کرێکارە کاتی یانەیشەوە کە لە مەیدانی بیناکاری و ئیشی تردا هەڵدەسووڕان ڕۆژانەیان زۆرتر هاتە خوارەوەو ڕۆژ بەڕۆژ بەپێی ی حاڵی بازاڕ دەگۆڕدرا، ئەمە جگە لەوەی کە لە شاروچکەکاندا دەگەیشتە نزمترین پلە. بەقسەی نووسەرێك، لە ناوەڕاستی ساڵانی سی دا و لەشارۆچکەیەکی وەك « مەحموودی یە » دا، گەر کرێکار ڕۆژی پێنج فلس ـ مانگی دوو ڕوپیە ك.م ـ و نانێك و تۆزێك خورما دەست بکەوێ زۆر خۆشحاڵە » هەروەها دەڵێ: « کرێکاری کشتوکاڵ هەن حاڵیان زۆر لە حاڵی ئەوانەیش خراپترە کە باسمان کردن».[٧٧]

سەرپاکی دامەزراوەکانیش هەوڵیان دەدا، تا بۆیان بکرێ، سوود لە ئیشی ئافرەت و منداڵ وەربگرن. بێ گومان ئەوانەیش بە ژمارە کەم نەبوون و زۆر جار زۆربەیان پێك دەهێنا. ئەوەتا ژمارەی کرێکارانی « کارگەی دروستکردنی گۆرەوی لۆکەو خوری » لە بەغدا لە دوا ساڵی ئینتداب دا گەیشتووەتە ٣٠ کەس و

هەر هەموویشیان دەستە کچ بوون و تەمەنیان لە نێوان ١٢ ـ ٢٠ ساڵ دا بووە.[٧٨] لە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکالیش دا، ئافرەت و منداڵ پێکەوە، زیاد لە ٣٠٪ ی سەرجەم کارگوزارانیان پێك دەهێنا.[٧٩] بەڵام ژمارەی ئافرەت و منداڵ کە لە مەیدانی رنینەوەی خورماو داگرتنی دا کاریان دەکرد، وەك خۆی بە زۆریی مایەوە. تەنانەت دامەزراوەیەکی وەك بەندەری بەسرە، بۆ هەندێ ئیش و کار ئافرەت و منداڵی بەکار دەهێناو لە هەموو حاڵێکدا رۆژانەی ئەوانە نە گەیشتووەتە روپیەیەك و لە زۆر کاتیش‌دا، نەگەیشتووەتە کەمترین رۆژانەی کرێکاری شارەزای پیاو.[٨٠]

سوود وەرگرتن لە ئیشی بەندەکان، لە ساڵانی داگیرکردن و ئینتداب دا، دزێوترین لاپەڕەی کار کردن لە مێژووی عیراق دا نیشان دەدا. بە تایبەتی کاتێك دامەزراوە حکوومی یەکان ژمارەیەکی زۆر بەندیان لە پرۆژەکانیان دا خستە ژێر باری ئیش کردنەوە. ئەوانە بۆ کردنەوەی رێگاو ئیشی بیناکاری و خشت بڕین و ئەو ئیشانەی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی ی شارەکان بوون، دەخرانە کار. لە مانگی مارتی ساڵی ١٩٢٤ دا بۆ پینەو پەرۆ کردنی بەستەکانی « بەغدا » ٢٠٠ بەندیان خستە ئیشەوە. بەندەکانی « بەسرە» خەستەخانەی « مود » یان دروست کردو بەندەکانی « باقوبە » یش بە بێ رۆژانە رێگاو بانیان تەخت دەکرد.[٨١] لە دوا دوای ساڵی ١٩٣٠ دا نزیکەی ٩٠٠ بەند بۆ هەڵکەندن و پاککردنەوەی جۆگەی « لەتیفی یە » خرانە سەر ئیش.[٨٢] لە سەرەتای ساڵی ١٩٣١ پتر لە ٨ هەزار بەندی عیراقی لە ئیشی بیناکاری جۆر بە جۆردا ئیشیان پێ دەکرا.[٨٣] هەرچۆنێك بێ ئەوانە رۆژی بەلای کەمەوە ٨ دانە سەعات بە بێ پارە کاریان دەکرد، یان رۆژانەیەکی رەمزی یان دەدرایە، ئەویش دەچووە خەزێنەی بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانەوە، یاخود گیرفانی ئەو لێپرسراوانەی پڕ دەکرد کەبۆ کاروفرمانی تایبەتی خۆیشیان ئیشیان پێ دەکردن. سەر جەمی ئەو پارانەی لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣١ دا لە رۆژێکدا بە ٣٨٣٦ بەند دراوە، گەیشتووەتە ١١١٥ روپیە. واتە تێکڕا هەر بە سێ بەند روپیەیەك کەمتریان بەر کەوتووە.[٨٤]

لەو ساڵانەدا بارو زرووفی ئیش کردن بە نیسبەت بەندەکانەوە زۆر لە بارو زرووفی کرێکارانی تر، قورستر بووە. وەك رۆژنامەیەکی ئەو کاتەی ئینگلیز لەبەسرە نووسیویەتی: بەدەستی بەستەو لەبەر سووری هەتاو کە هەندێ جار پلەی گەرما دەگاتە ١١٠ پلەی فەهرەنهایت، هەر بە ٨ ـ ١٠ کەسیان، نیوتەن لقی دارخورمایان دەدا بەشان‌داو[٨٥] پاش تەواو کردنی ئەم کارە پڕ لە ئازارو

ئەشکەنجەیە، بەدەستی بەستەوە دەگەڕانەوە بۆ بەندیخانەکانیان کە لە « بەندیخانەی سەدەکانی ناوەڕاست دەچوون »، وەك ڕۆژنامەیەکی سەر بە میری تاریفی کردووە.[86] هەموو ئەمانە، بوونە هۆی تەشەنە کردنی نەخۆشی ی لە ناویان دا. لە ماوەی مانگێك دا بە تەنها لە پرۆژەکەی جۆگەی « لەتیفی یە » دا کە پێشتر باسمان کرد لە ۹۰۰ بەند ۷۰۰ کەسیان نەگەڕانەوە.[87]

دام و دەزگاکانی رژێم بەردەوام بوون لەسەر ئەم هەڵوێستە نامرۆڤانەیان بەرامبەر بە بەندەکان، بەڕادەیەك حاڵ گەیشتە ئەوەی « بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی » دەرهەق بە زۆر بوونی ژمارەی بەندەکان، دڵخۆشی ی خۆی دەردەبڕێ،[88] چونکە ـ بەقسەی ئەو ـ بەهۆی ئەوانەوە « زەوی و زارێکی زۆر، بێ ئەوەی هیچی تێ بچێ دەژیەتەوە » و « بزووتنەوەیەکی بازرگانی ی و کشتوکاڵی ی بە سوود بۆ وولات و هاووڵاتیان دەکەوێتەگەڕ » وەك لە دەقی ئەوراپۆتەی دا نووسیویە کە ڕۆژی ٥ ی تەممووزی ساڵی ۱۹۲۳ پێشکەش بە « فەخامەتی وەزارەتی ناوخۆ » ی کردووە.[89] بلیمەتی ی ئەم بەڕێوەبەرە گەیشتە رادەیەك پێشنیازی کرد « بەندیخانەیەکی گەڕۆك دابمەزرێ و لەژێر دەواردا بێ و پاچ و پێمەرەی بخرێتە بەردەست و شوورایەکی لە تەلی دڕکاوی بە چوار دەوردا بکێشرێ و هێزی کارەبای بخرێتە سەر». ئەوجا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە سیستەمی رەفتار کردن لەگەڵ سەرسەری دا، پەیڕەو بکرێ و چی سەرسەری هەیە بنێردرێن بۆ ئیش کردن و شوێنێکی تایبەتی یشیان بۆ جیا بکەنەوە، ناو بنرێ وەرشەی سەرسەری یەکان و وەك بەند خواردنیان بدرێتێ »، گەر خەڵکیش پێویستی پێیان بوو، بە ڕۆژانە ئیشیان پێ بکەن بەمەرجێك ئەو پارەیە بۆ « پاککردنەوەو چاککردنی نەهرەوان و دوجەیل » و « بینا کردنی بەستەکەی نزیك سامەڕا » خەرج بکرێ.[90]

بارو دۆخی بەم چەشنەی بەندەکان و شێوەی ئیش پێ کردنیان، رای گشتی عیراقی وورووژاند. بەنموونە حزبی « الاستقلال » داوای کرد تا ئەوکاتەی بڕیاری حوکمەکەی دوا پلەی وەردەگرێ، ئیش بە بەند نەکرێ. هەر ئەم حزبە کە ناوەندی یەکەی لە « مووسڵ » بوو، لەم بارەیەوە راپۆرتێکی دا بە وەزارەتی ناوخۆو لە دوا دوای ساڵی ۱۹۲٤ دا وێنەیەکی لە ڕۆژنامەکانی ناوخۆدا بڵاو کردەوە.[91] ڕۆژنامەی « بەسرەتایمس » یش بە توندیی رەخنەی لەو بارودۆخە نارەوایە گرت کە بەندەکان تێیدا کاریان دەکرد.[92]

بەندەکان خۆیشیان چیتر لە ووزەیان دا نەما بەم حاڵە قایل بن و بە شێوەی جۆربەجۆر نارەزایی خۆیان دەردەبڕی. هەبوو لە کاتی گواستنەوەی دا

له شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، با ماوەی بەندیەتیشی کەم بووبێ، هەڵدەهات. لە ناو هەندێ بەندیخانەیش دا پشێوی کەوتەوە، وەك ساڵی ۱۹۲۳ لە بەسرە رووی دا. لە مانگی کانوونی یەکەمی ئەو ساڵەدا بەندەکانی بەسرە مانیان لە ئیش گرت ولە ناو بەندیخانەدا مانەوە و بەردە بارانی لێپرسراوانیان کرد.[93] بەڵام نە ئەم هەڵوێستانەو نە نارەزایی دەربڕینی رای گشتیی، نەیانتوانی کار بکەنە سەر هەڵوێستی میری، سەبارەت بە بەندەکان. بە پێچهوانەوە بە زەقترین شێوە، لەتەك بەندە مانگرتووەکانی بەسرەدا جووڵایەوە. تەنانەت « بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی » داوای کرد « یاسای سزادانی بەغدایی » دەستکاریی بکریو دوو ماددەی تری بخرێتە سەر. یەکەمیان: هەر بەندێك حوکمی هەتا هەتایی درابێو « لە ناو بەندیخانەدا تاوانێکی وای کرد هەقی ساڵێك یان زیاتر بەند کردنی هەبێ » لە سێدارە بدرێ. دووەمیش: « هەر بەندێك پانزە ساڵ حوکم درابێ و لە ناو بەندیخانەدا تاوانێکی وای کرد هەقی ساڵێك یان زیاتر حوکمی هەبێ، بۆی بکرێ بە حوکمی هەتا هەتایی.[94]

بێ گومان ئیش کردن بە بەندەکان و بەم شێوەیە، هەر دەبوو کار بکاتە سەر کار و مەسەلەی بێکاریی، وەك لەمەودوا روونی دەکەینەوە.

گیروگرفتی رۆژانە هەر بە تەنها مەسەلەی کەمیی نەبوو، بەڵکو زرووف و هۆی تری دیاری کراو ئەوەندەی تر ئاڵۆزیان کرد. کۆمپانیا بیانی یەکان، بە ئارەزووی خۆیان دەستیان دەخستە رۆژانەی کرێکارە عیراقی یەکانەوە، بە تایبەتی چونکە بە درێژایی ساڵانی ئینتداب حکومەتی عیراق ئەو کۆمپانیانەی نەخستبووە ژێر چاودێریی سانسۆرەوە. بە پێچەوانەوە، بەڵگەیەکی زۆر لەبەر دەستدان، دەیسەلمێنن کە لێپرسراوان هەوڵی ئەوەیان داوە رۆژانەی کرێکاران کەم بکەنەوە. بە نموونە: « ئەنجومەنەکانی شارەوانی » زۆر بەتەنگ ئەوەوە بوو « کرێی لە رادەبەدەری کۆڵکێشان » کەم بکرێتەوە.[95] بەر لەوەیش لە « حیللە » حاکمی سیاسی بەریتانیا چی ئیشی بیناکاریی هەیە رایگرت، تاوەکو رۆژانەیەك بەسەر کرێکاران دا بسەپێنێ کە خۆی بە ئاسایی دادەنا.[96] راستی یەکەیشی هەر بە تەنها کرێکاران بوون لەهێنا و رۆژانەیەکی باشتردا کەوتبوونە گێژاوی ململانەوە. چونکە هەمووان دەیانویست بە رۆژانەیەکی کەمتر ئیشیان پێ بکەن، تەنانەت لە سەرەتای ساڵانی بیستدا رۆژنامەیەك مەسەلەی « رۆژانەی کرێکاران » ی بە « گیروگرفتێکی قورس و گران » لە قەلەم داوە و رای وابووە « کرێکاران زوڵم دەکەن » و « ئەو رۆژانەیەی ئەوان داوای دەکەن زۆرە؛ نەکەس

بەر پەرچیان دەداتەوەو نەخۆیشیان هۆشێك دێننەوە بەبەر خۆیاندا. گیروگرفتی دارایی و بێ بازاریی و ـ هۆی تریش ـ لەگەڵ ئەو رۆژانەیەدا ناگونجێ کە برای کرێکار داوای دەکا، ئا ئەمەیە بەشخوراوی »[97] لەم حاڵەدا گەر کۆمپانیا بیانی‌یەکان رۆژانەی کرێکاران کەم بکەنەوە شتێکی سەیر نی‌یە. بە نموونە: لە رۆژانی یەکشەممە و جەژنە رەسمی و ئاینی‌یەکاندا، هەردوو دەوڵەتی عیراق و ئینگلیز کارگەی « شالچی‌یە » یان نە کار دەخست و کرێکارانیش کری ئەو رۆژانەیان لێ دەبڕدرا.[98] لە دوا ساڵەکانی ئینتدابدا کۆمپانیاکانی نەوت، مانگانەی کرێکارە نەشارەزاکانیان بەنیسبەتی ٢٥٪ هێنایە خوارەوە و لەوەوە کە ساڵی ٣٧،٨،١٩٢٦ر روپیەیان هەبوو کردیان بە ٣٠ روپیە. بەرێوەبەرایەتی بەندەریش شوێن پێی ئەو کۆمپانیانەی هەڵگرت؛ ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٢٦ دا مانگانەی کرێکارە نە شارەزاکانی لە ٣٠ روپیەوە کرد بە ٢٥ روپیە.[99] جا گەر بێ و تەماشای زیاد بوونی نرخی شتومەکی پێویست بکەین، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێ کرێکاران تا چ رادەیەك ستەمدیدە بوون. باشترین بەڵگەیش ئەوەیە کە لە دوای جەنگی یەکەمەوە، رۆژانەی زۆربەی کرێکارانی عیراق ئەوەندەی نرخی شووشەیەك شیر بووە.

زۆر جاریش ئەو رۆژانەیەی دەگەیشتە دەستی کرێکاران لەوەیش کەمتر بووە کە دەستمان بۆ راکێشاوە. بە نموونە: ئەو کرێکارانەی لە کۆمپانیا کانی نەوت و پرۆژەی راکێشانی بۆری نەوتی نێوان کەرکوك و دەریای سپی ناوەڕاست ئیشیان دەکرد و سەر بە خێڵە رەوەندەکان بوون، دەبوو بەشێکی رۆژانەکەیان ـ لە دەیەکەوە تا سێ‌یەکی ـ بدەن بە سەرەك خێڵەکەیان.[100] زۆرجاریش دەست رۆیشتووەکانی ئەو خێڵانە ئیش و کاری بۆری راکێشان و شتی تریان بە قۆنتەرات وەردەگرت و رەعیەتەکەی خۆیان بە نارەواترین شێوە دەچەوساندەوە. بە نموونە: کۆمپانیای نەوتی تورکی زۆربەی ئیش و کاری رێگاو بان و پاسەوانی‌ی، بە قۆنتەرات دەدا بە سەرەك خێڵەکانی ناوخۆ.[101] سەرەڕای ئەمەیش جێ دەستی شێوازی دەرەبەگایەتی بە زەقی‌ی بەسەر هەڵس وکەوتی کرێکاران و تەنانەت ئەوانەیشەوە دیار بوو کە لەوەرشە و دوکانە پیشەیی‌یەکاندا کاریان دەکرد. ئەم واقیعەیش لە لایەن ئەندامێکی پەرلەمانی ئەوساوە[102] بەم شێوەیە باسکراوە و دەڵێ:

«... بە چاوی خۆت دەتبینی، کرێکارە و لە کارگە یاخود لە دوکانێکدا رۆژ هەتا ئێوارە کار دەکا، شەویش لە ماڵی خاوەن ئیشەکەیدا خزمەتی میوانی دەکرد و قاوەی دەگێڕا..»[103]

لەوەیش خراپتر. هەرچەندە ماددەی « دە » ی دەستووری وولات ئیشی زۆرەملێی قەدەغە کردبوو، بەلام داموو دەزگای داگیرکەران و حکومەت بە بیانووی تەواو کردنی هەندێ کارو باری پێویست، بە ئارەزووی خۆیان و بە رۆژانەیەکی رەمزیی ئیشیان بە سەر کرێکاراندا دەسەپاند. دەولەت بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ ئەم دیاردەیەی کە بە پێچەوانەی دەستووری وولاتەوە بوو دابنێ، لە سالی ١٩٢٧ دا « یاسای پەنا وەبەر بردنی پێویست » ی دەرکرد. بە پێی بەندەکانی ئەو یاسایە « ماف » ی ئیش پێ کردنی کرێکارانی دا بەو لایەنانەی پەیوەندییان بەم مەسەلەیەوە هەبوو، تا بەو رۆژانەیەی ئەوان دایدەنێن ئیشیان پێ بکرێ. دیارە بیانوویشیان بۆ ئەم هەلوێستە ئەوە بوو بەست دروست دەکەن بەربەستی لافاو دەکەن و تیپی تایبەتی بۆ قەلاچۆ کردنی کوللە پێك دەهێنن و زۆر ئیشی تری لەو بابەتەو هەموویشی لە بنەڕەتدا خزمەتی دەرەبەگەکان و پەرژەوەندی ئەوانەی دەکرد. لە لایەکی تریشەوە فەرمانبەران بە هەمان شێوەو بێ سل کردنەوە کرێکارانیان بۆ ئیش و کاری تایبەتی خۆیان دەچەوساندەوە. زۆر جاریش دەستکاری ئەو رۆژانە رەمزییەیشیان دەکرد کە میری بۆ ئیش پێ کردنی کرێکاران دیاری کردبوو. ئەم دیاردە نا بەجێیە هەر لە سەردەمی عوسمانلی و سەرەتای سالانی داگیرکردنەوە یەقی دابووەوە، بە رادەیەك دەولەت ناچار بوو، بێهوودە هەولێك بداو سنوورێکی بۆ دابنێ. ئەوەتا ماددەی «١٠٠» ی «یاسای سزا بەغدایییەکان» دەقاو دەق دەلێ: «.. هەر فەرمانبەرێك بە زۆرەملێ ئیش بەسەر کرێکارێکدا بسەپێنێ و ئەو پارەیەی کە بۆ ئەو ئیشە تەرخان کراوە ببا بۆ خۆی، حەوت سال بەند دەکرێ، یاخود چەردەیەك پارەی لێ دەسێنرێ، یان هەردوو سزاکەی بە سەردا دەدرێ.. هەروەها ماددەی ١١٩ی هەمان یاسا دەلێ: « هەر فەرمانبەرێك بە زۆرەملێ ئیشی تایبەتی بەکرێکار بکا سزا دەدرێ..»[١٠٤]

ئەنجامی هەموو ئەمانەی پێشتر باسکران، کرێکاران لە ناو شاردا نزمترین توێژی کۆمەلایەتییان پێك دەهێنا[١٠٥] و یانێکی کولەمەرگییان دەبردە سەر و ئەوەی کە وەریان دەگرت بەکردەوە هەر بەشی ئەوەی دەکرد ئاهێکیان تێ گەڕێ و بتوانن لە سەر ئیش بەردەوام بن، وەك رۆژنامەی « نداء العمال » بە ئاشکرا دانی پیا دەنێ. ئەوەتا لە یەکەم ژمارەیدا دەلێ: « هیلاکیی و شەکەت بوونی دەست و بازووی کرێکاری عیراقی بە ئاستەم نانە سکیی بۆ دابین دەکا..»[١٠٦] زۆر جاریش ئەو تۆزە دەرامەتە ژیانی مەمرەو مەژیی پێ نەدەبەخشین. بەقسەی

لێپرسراوانی ئینگلیز خۆیان، ئەوەی کرێکارانی رێگاوبان لە ناوچەی کوردەوارییدا وەریان دەگرت بەشی «نان و جگەرە»[١٠٧] ی نەدەکردن. جا ئەگەر نەخۆشی و مەرگ لە ناویاندا بە شێوەیەکی ترسناك بڵاو بووبێتەوە، شتێکی سروشتی بووە. بە پێی ئەو سەر ژمێرە رەسمییەی لە ناوەڕاستی سالانی بیستدا ئەنجام دراوە، نیسبەتی مردنی سالانە لە ناو کرێکارانی رێگای ئاسندا، گەیشتە لە هەزاردا ٢ر٥٤ و لە ناو کرێکارانی بەندەری بەسرەدا لە هەزاردا ٥ر٧٦. نیسبەتی نەخۆشیش لە ناو کرێکارانی رێگای ئاسندا سالی گەیشتە لە هەزاردا ٢ر٤٦ و لەبەندەری بەسرە لە هەزاردا ٢ر٢٧ و لەکۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی ـ فارسیدا گەیشتە لە هەزاردا ٢ر٠٧.[١٠٨] راستییەکەی نیسبەتی نەخۆش زۆر لەو ژمارانەی سەرەوەیش پتر بوون، چونکە بەشێکی زۆر لەوانەی نەخۆش دەکەوتن ناچار دەبوون شان بدەنە بەر دەردو نەخۆشی، تاوەکو لە ئیش دانەبڕێن و بەهۆی نەخۆشییەوە نان براو نەبن.

بێگومان یەکێك لە هۆیەکانی ئەم بارودۆخە نالەبارە ئەوەیە کە بایەخێکی ئەوتۆ بە تەندروستیی کرێکاران نەدراوە. ئەوەیشی کە هەبووە لە چوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا بوو، یاخود هەر لە ئارادا نەبووە. راپۆرتێکی رەسمیی لەم بارەیەوە دەقاودەق دەلێ:

«.. هیچ زانیارییەك دەرهەق بە چارەسەرکردنی راستەقینەی تەندروستیی کرێکاران، لەو شوێنانەدا کە ئیشی تیا دەکەن لەبەر دەستدا نییە. بەلام راستییەکەی ئەوەیە بلێین: کاروباری تەندروستییان بە هۆی نەبوونی یاساو سانسۆرەوە کە پێویستە میری بە سەر خاوەن ئیشدا بیسەپێنێ، پشت گوێ خراوە..»[١٠٩]

دامەزراوە بیانییەکان تا رادەیەك بایەخیان بە تەندروستیی کرێکارەکانیان دەدا، بەلام هێشتا بەو جۆرە نەبوو کە پێویستە. بە نموونە: لە سالی ١٩٢٦ دا لە بەغدا، تاقە نەخۆشخانەیەکی ٤٥ کەسی، دەبوو چاودێری ئەو ٨ هەزار کرێکارە بکا کە لە ناوچەی «مووسڵ» و «خانەقین» ەوە تا دەگاتە «بەسرە» دەژیان.[١١٠] کرێکارانی نەوتی «خانەقین» یش بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیی دەبوو بچوونایە بۆ کەرکووك.[١١١]

بە درێژایی سالانی ئینتداب هیچ گۆڕانێکی ئیجابی بارو زرووفی ئیش کردنی نەگرتەوە، بە پێچەوانەوە چەندین بەلگەمان لە بەردەستدایە، بۆمان دەر دەخەن کە چۆن لە پرۆژە بیانییەکاندا تەندروستیی کرێکاران خرابوە پشت

گوێو کەس بە تەنگی‌یەوە نەدەهات. بەنموونە: بەڕێوەبەرایەتی ڕێگـای ئاسن تەنیا لە ساڵێك‌دا رادەی خزمەتگوزاری تەندروستی‌ی هێنایە خوارەوە، تێکڕای ئەو پارانەی بۆ تاکە کەسێك لەگەڵ مانگانەکەی‌دا خەرج دەکرا، ۷۳ روپیە بوو. کەچی ئەو پارەیە بە درێژایی ساڵی ۱۹۲٥، « ۸٥ » روپیە بوو.[۱۱۳] پاش تێپەڕ بوونی حەوت ساڵیش، هەر ئەو بەڕێوەبەرایەتی‌یە بڕیاری دا ۷۰ هەزار روپیە لەو پارانە چز بکا کە بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی تەرخان کردبوو. پاشانیش بەشێکی لە بینای نەخۆشخانەکە خستە سەر لقی ئەندازیاریی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن(*) جا بۆ ئەوەی مەودای تەڵخو ناریکی ئەم وێنەیە زیاتر بەرجەستە بکەین، دەقی بەندی دووەمی ئەو قەواڵە تایبەتی‌یە دەنووسینەوە کە بەڕێوە بەرایەتی ڕێگای ئاسن پێش ئەوەی کرێکـار بخاتـە سەر ئیش پێ‌ی مـۆر دەکرد. دەبێ ئـەوەیش بزانـین کە ئـەو بەڕێـوەبەرایـەتی‌یە لە داموو دەزگـاکـانی‌تـر، چـاکتـر خزمەتگوزاریی تەندروستی‌ی بۆ کـرێکارەکـانی دابین دەکـرد. دەقی بەنـدی دووەمی قەواڵەکە دەڵێ: «.. گـەر بە هـۆی رەفتار خـراپی‌ی خۆمـەوە، یان لە نەزانین‌و گوێ‌نەدان بە ئیشەوە، نەخۆش کەوتم‌و نەمتوانی پچمە سـەر ئیش؛ بەڕێوەبەری ڕێگای ئاسن بۆی هەیە بێ ئاگادار کردن ئەم قەواڵەیە پووچ بکاتەوە. گەر لە ئیشیش دەرنەکرام؛ بۆم نی‌یە مووچەی ئەو ماوەیە وەربگرم کە نەهاتوومە سەر ئیش. بە حوکمی ناوەرۆکی ئەم قەواڵەیەیش ئەو ماوەیەم بە خزمـەت بۆ حساب ناکرێ.».[۱۱٤]

بێ گومان ئەو کەسەی مەرجی ئاوا نارەوا بسەپێنێ سڵ لەوەیش ناکاتەوە، گوێ نەدان بـەئیش‌و بەد رەفتـاریی‌و نەزانینیش بکـاتە هـۆی هەمـوو دەردو نەخۆشی‌یەك. ئەمەیش ئەوە دەردەخا بۆچی زۆربەی کرێکاران کە لە ناکاوتووشی نەخۆشی دەبوون، هەر لەسـەر ئیش بەردەوام بـوون. زۆر نموونـەی سەیـرو سەمەرە هەن باسی هەڵس‌و کەوتی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگـای ئاسن دەکـەن لەم مەیدانەدا. بە نموونە کرێکارێکی شـارەزا لە کاتی ئیشـدا دەستێکی دەقرتێ، کەچی ئەو بەڕێوەبەرایەتی‌یە بڕیار دەدا رۆژانەکەی لە ۳ روپیەو ٤ ئانەوە بکرێتە یەك روپیە کەمتر. کرێکارێکی تریش دوای ئەوەی لە ئیش کردن‌دا چاوی راستی کوێر دەبێ، ٥۰٪ ی مووچەکەی دەهێننە خوارەوە. یەکێکی‌تر لە کاتی ئیشدا لەسەر ستوونێك بەر دەبێتەوەو سێ مانگی رەبەق لە جێگادا دەکەوێ‌و سەرەڕای ئەوەی کە نەچوونی بۆ ئیش کـردن لە ویست‌و ئارەزووی خـۆی بە دەربووە، کەچی بە تۆمەتی ئەوەی لە ئیش دابڕاوە، دەردەکرێ.[۱۱٥] زۆر کاتیش ئەگەر کرێکار لە لایـەن دکتۆری کـارگەکـەیەوە مـۆڵەتی ناسـاغی‌ی بدرایـە،

بەڕێوەبەرایەتی مووچەی ئەو ڕۆژەی هەر لێ دەبڕی.[116] بە درێـژایی سالانی داگیر کردن و بەشێکی زۆری سالانی ئینتداب نە بۆ کرێکاری عیراقیی خۆیی و نە بۆ وەچەکانی زامن کردنی کۆمەلایەتی لە ئارادا نەبووە. تا لە سایەی چەندین هۆی ناوخۆیی و دەرەکی یدا چەشنە زامن کردنێکی ئێجگار دانسقە هاتە کایەوە. زۆربەی دامەزراوەو پرۆژەکان، دوای مردنی کرێکار، یان بریندار بوونی لە کاتی ئیش دا ئەوەی پێی بووترێ پاداشت نەیان دەدایە.

بەڕێوەبەرایەتی بەندەری بەسرە، تەنها پاداشی بەو کرێکارانە دەدا کە لە سەر ئەو کەشتی یانە ئیشیان دەکرد بۆ هەلکەندنی رووبارو قوولکرنەوەی تەرخان کرابوون.[117] چونکە خەلکی ی پە رۆشی ئەو کارەگران و پڕ مەترسی یە نەبـوون. کۆمپانیای نەوتی عیراقیش بەم چەشنە پاداشی کرێکارانی دەدا. کرێکاری پیاو گەر لە ئەنجامی ئیش کردندا بمردایە، چەردەیـەك پارەی دەدرایـە، دەیکردە مووچەی ٣٠ مانگ یان ١٥٠٠ روپیە، کامیان کەمتر بـوایە. منـدالی مردوویش چەردەیەك پارەی دەدرایە دەیکردە مووچەی شەش مانگی. کرێکاری پیاویش گەر بە هۆی ئیشەوە، کەفتەکاری هەمیشەیی ببوایە، ئەوا پاداشتێکی دەدرایە دەیکردە مووچەی ٤٢ مانگ، یان دوو هەزار روپیە، کامیان کەمتر بوایە. هەر بۆ ئەو حالەتە، منال چەردەیەك پارەی وەر دەگرت، دەیکردە مووچەی ٨٤ مانگی یان ١٥٠٠ روپیە کامیان کەمتر بوایە. هەرچی کۆمپانیای نەوتی « خانقین » ە، بۆ ئەو جۆرە حالەتانە، پاداشتێکی تۆزێك زیاتری بە کرێکارە کـانی دەدا.[118] بەلام لە پرۆژەکانی تردا بۆ ئەوەی « خزمەتگوزاری تەندروستی ی بۆ کرێکـاران دابین بکرێ و پاداشتی مال و مندالی ئەوانە بدرێتەوە کە دەمرن » لەوە بـەولاوە کە « ململانەیەکی کـوشندە » یـان دەکرد هیـچ شتێکی تر لە گـۆڕێ نەبـوو، وەك ئەندازیارێکی ئینگلیزی پێی لێ دەنێ.[119]

وەنـەبێ بریـندار بوونی کـرێکاران لە کـاتی ئیش کردن دا، حـالەتێکی دەگمەن و دانسقە بووبێ، بە تایبەتی کە کۆمپانیا بیانی یەکان تا بۆیان بکـرایە پشتیان بە هەول و تەقەللای کرێکاران دەبەست و وزەی کرێکار لە بەکار هێنانی ئامێر کەمتری تێ دەچوو و هەرزانتر بوو. ئەمە لەلایـەك لە لایەکی تـریشەوە ئەوەی کە ئێستا بە شێوەیەکی نوێ بۆ پارێزگاری کردنی کـرێکار جێ بـەجێ دەکرێ، بە تایبەت لەو شوێنانەدا کە پێویستە پارێزگاری کرێکار بکرێ، ئەوسا لە ئارادا نەبوو. لەبەر ئەوە شتێکی سەیر نی یە ئەگەر تەقینەوەی یـەکەم بیـری نەوتی کەرکوك لە ١٣ ی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٢٧ دا، ببێتە هۆی مردنی ٢٠ کرێکار و بریندار بوونی ژمارەیەکی تریش.[120] ئەمەیش میریی ناچار کرد چەند هەنگاوێکی خێرا بنێ، نەك لەوە زیاتر خەلکی تێدا بچێ. ئەوە بوو بە درێژایی ١٧

میل، لەسەر بۆری نەوتەکان پێنج مەخفەری دروست کرد و هەردوو گوندی « حسێنئاغا » و « قزلیاو » کە نزیك بوری یەکان بوون چۆڵ کردن.[121] زۆر جاریش رۆژنامەکانی ناوخۆ باسی بریندار بوونی کرێکارانیان لە کاتی ئیش کردندا دەکرد، کەچی شتێکی ئەوتۆیشیان نەدەکرد، کەمێك باری شانیان سووك ببێ.[122]

کرێکارانی رێگاوبان، جگە لەوانەی پێشتر باسکران، مەترسی یەکی تریشیان بەسەرەوە بوو. سەرەك خێڵەکان دەرهەق بە حاڵی خۆیان، کردنەوەی رێگاوبانی تازەیان بە مەترسی یەك دەزانی ولایان وابوو هەرەشە لە سەربەخۆیی یان دەکا و هۆیەکن بۆ سەپاندنی یاساو دەستو دەسەلاتی دەوڵەت. لەبەر ئەوە هەوڵیان دەدا بە هەموو شێوەیەك تەگەرە بخەنە ئیش و کارەکانی. بەم کارەیشیان ژیانی کرێکاران مەترسی یەکی راستەقینەی دەکەوتە سەر و بارودۆخێکی دەروونی ی ناخۆشی بۆ دروست دەکردن؛ بە تایبەتی تۆڵەسەندنەوە، لە ناو عەشیرەتەکاندا، بەورێکی زۆری بینی ـ « ئا. م. هاملتن » ی ئەندازیار، چەندین رووداوی لەو جۆرە دەگێڕێتەوە کە بە درێژایی ئەو سێ ساڵەی بەرێگای هەولێر ـ رەواندوز ـ رایات ـ ٥ وە خەریك بووە، روویان داوە.[123] زۆر جار ئەم عەشرەتانە ئەوەی کرێکاران بە رۆژ بنیاتیان ناوە، بە شەو تێکیان دەدایەوە. چەند رووداوێکی لەو بابەتەیش لە ناوەراستو خوارووی وولاتدا، لەسەر رێگای ئاسنرروویان دا، بۆیە ناچار بوون بە شەو ئێشکی بگرن. جگە لەوەیش قەواڵە بە سەرەك عەشیرەکان مۆر کرا، کە دەبێ هەر یەکە لە ناوچەی خۆی دا پارێزگاری رێگای ئاسن بکا.[124] لەو سەردەمەداو بەتایبەتی سالانی سەرەتای ئینتداب، عەشرەتەکان چەند جارێك هێرشیان بردە سەر کرێکاران. هەر بە نموونە: لە مانگی ئاباری ساڵی ١٩٢٣ دا، نزیکەی ٥٠ « بەدەوی »، هێرشێکیان بردە سەر رێگای شەمەندوفەر، لە نزیك « سامەڕا » وە و ئەنجام سێ کرێکار کوژران و یەکێکیش بریندار کراو پاشان ئەویش مرد.[125]

زۆر بەڵگەی تر هەن گەواهی ناخۆشی ی باروزرووفی ئیش کردنو نەبوونی خزمەتگوزاریی پێویست و زامن نەکردنی ژیانی کرێکارانن لە سەردەمی داگیر کردن و ئینتدابدا. زۆربەی ئەوانەی لای کۆمپانیاکانی نەوت ئیشیان دەکرد، دەبوو بە درێژایی چەند میلێك بە پێ برۆن، تا دەگەیشتنە شوێنی ئیش کردنی خۆیان یان ئەو شوێنەی سەرپەرشتی ی ئیشی ئەو کرێکارانەیان لێ دەکرد کەلەبەر دەستیاندا بوون.[126] بەشێکی ئێجگار کەمی کرێکاران نەبێ، ئەوانی تر مۆڵەتی سالانەیان نەدەدرایە، کە ئەویش لە باشترین حاڵدا لە ١٤ رۆژ تێپەڕی نەدەکرد و کرێکاریش بۆی نەبوو کۆی بکاتەوە. زۆر جاریش ئەم چەشنە مۆڵەتە، دەخرایە بری مۆڵەتی نەخۆشی ی.[127] خانووبەرەو شوێنی زۆربەی هەرە زۆریشیان لەگەڵ

ناخۆشترین خانووی گوندەکانی عیراقدا جیاوازی‌یان نەبوو. بەڵگەنامە رەسمی‌یەکان خۆیان دان بەوەدا دەنێن کە بەڕێوەبەرایەتی ی گشتی ی ئەشغال خێوەتی بۆ هەزاران کرێکار ئامادە کردبوو. بەڕێوەبەرایەتی کشتو کاڵیش کرێکارەکانی لە کۆختەدا نیشتەجێ دەکردن. وەنەبێ حاڵی کرێکاری نەشارەزای کۆمپانیا بیانی‌یەکان لە حاڵی ئەوانە باشتر بووبێ. کۆمپانیای نەوتی عیراق، جێگای لە تەنەکەو حەسیرو قامیش دروست دەکرد تا زۆربەی کرێکارەکانی تێدا نیشتەجێ بکا. لەوەیش خراپتر؛ بەڕێوەبەرایەتی بەندەری بەسرە، کرێی ئەو زەوی‌یانەی لە کرێکارە نەشارەزا کان وەردەگرت کە لە نزیک بەندەرەوە بۆی تەرخان کردبوون و لە گیرفانی خۆیان کۆختەیان تێدا دروست کردبوو.[128]

دەرکردنی بێ بەهانە، یەکێك بوو لە دیارترین گیروگرفتی کارو کرێکاران لە عیراقدا. ئەم مەسەلەیە تەنانەت لە دوای سالانی ئینتدابیش وەك خۆی مایەوە. چی دامەزراوی ئەهلی‌و میری‌و بیانی هەبوو، دەیانتوانی بە ئارەزووی خۆیان‌و کەی ویستیان کرێکار دەربکەن‌و کرێکاری ترلە شوێنیان دابمەزرێنن. هیچ کام لەم دام‌و دەزگایانەیش، پاداشی ئەو کرێکارانەیان نەدەدایەوە کە بە هۆ و بێ هۆ دەریان دەکردن. نەك هەر ئەوەیش بەڵکو ئاگاداری‌یەکیشیان نەدەدانێ تاوەکو لە ماوەیەکی دیاری کراودا مشووری خۆیان بخۆن: بە نموونە: بەڕێوەبەری ڕێگای ئاسن کە کرێکارێکی دەر دەکرد، مووچەی ڕۆژێك زیاتری نەدەدایە، هەروەها ڕۆژێکیش بەر لە دەرکردنی ئاگاداری دەکرد.[129] بەڕێوەبەرایەتی ناوبراو بە ئاشکرا ئەم « ماف » ەی لە بەندی یازدەهەمی ئەوقەواڵەیەدا بۆخۆی مسۆگەر کردبوو، کە کرێکاری پێ کردبووە کۆیلەیەکی دەست‌و پێ بەستراوو دابوویە دەست بەڕێوەبەرایەتی:

« ١١ ـ گەر هات‌و بە بەد ڕەفتاری‌و سەرپێچی کردن تاوانبار کرام، بەڕێوەبەری ڕێگای ئاسن بۆی هەیە بەبێ ئاگادار کردن لە ئیش دەرم‌بکا ».[130] ئەم بەندە ناڕەوایە، بە شێوەیەکی ئەوەندە نابەجێ پەیڕەو دەکرا، کەم ڕێکەوتووە، لە سەرانسەری جیهان‌دا وێنەی هەبوو بێ.[131] لە ڕۆژانی یەکەمی سەربەخۆیی وولاتیش‌دا، دامەزراوەکانی سەر بە میری‌ر دامەزراوە ئەهلی‌یەکان، ئەو پەرەکەی مووچەی مانگێکیان بەو کرێکارە دەدا کە لە ئیش دەردەکرا؛ وەك ئەوەی چاپخانەی حکومەت لە ساڵی ١٩٣١ دا دەرهەق بە چەند کرێکارێك کردی.[132] لەبەر ئەوە شتێکی سروشتی‌ی بوو کە ئەم هەڵوێستە ببێتە هۆی بڵاو بوونەوەی بێکاریی. دیارە بێکارییش خۆی لە خۆی‌دا ئاڵۆزترین‌و گرنگترین گیروگرفتێك بوو کە چینی کرێکارانی عیراق لە سالانی داگیرکردن‌و ئینتداب‌دا بە دەستی‌یەوە دەیان نالاند.

## بێ کاریی وکرێکارە بیانی یەکان
## لە ساڵانی داگیرکردن و ئینتدابدا

پەرەسەندنی چەوساندنەوەی دەرەبەگایەتی لە لادێدا و زیاد بوونی ژمارەی ئەو جووتیارانەی هیچ سەرچاوەیەکی ژیانیان لە لادێدا نەما بوو، لەگەڵ زیاتر دەرکەوتنی جیاوازیی نێوان گوزەرانی شارو لادێو رەوکردنی بە گەلەی جووتیاران بەرەو شارە گەورەکان؛ ئەمانەو لە ناو چوونی بەرەبەرەی بەرهەمی پیشەیی‌و لاوازیی بەرهەمهێنانی پیشەسازیی نیشتمانی‌ی‌و کەم بوونەوەی پرۆژە ستراتیژی‌یەکان‌و چەندین هۆی تریش، دەڵێن هەموو ئەمانە وایان کرد لە ساڵانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی‌دا، ژمارەیەکی زۆر کرێکار فڕێ بدەنە بازاڕەوە، بێ ئەوەی کەس لێیان بپرسێتەوەو پێوبستی بە هێزی بازوویان هەبێ. لەمەوە دیاردەی بێکاریی لە ناو کرێکارانی عیراق‌دا بە شێوەیەکی ترسناك‌و کاریگەر تەشەنەی کرد. هەر لە ماوەی سێ ساڵی دوای‌جەنگ‌دا ٥٠ هەزار کرێکار لە ئیش دەر کران. ئەوانە بەشێکی کەمیان نەبێ بەرەگەز فارس بوون، زۆربەیان کوردو عەرەب بوون.[١٢٣] سەرەرای ئەمەیش هەر لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگ‌دا چەند ئاسنگەرخانە داخران.[١٢٤] کۆمپانیابیانی‌یەکانیش، بە تایبەتی بەرێوەبەرایەتی رێگای ئاسن، بەردەوام ژمارەی کرێکارە عیراقی‌یەکانی کەم دەکردەوە. لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٢٧ دا، بەرێوەبەرایەتی ناوبراو دەستی لە کۆمەڵێکی زۆر کرێکاران هەڵگرت. ئەمانە زۆربەیان عیراقی بوون، بەم کارەیش لەشکری بێ کاران ئەوەندەی تر زیادی کرد...».[١٢٥]

گیروگرفتی بێکاریی لە دوا ساڵەکانی تەمەنی ئینتداب‌دا و لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆی بە یەکاچووکە یەك کاری لەوی‌تر دەکرد، تا دەهات پتر پەقی دەدایەوە. دەتوانین تەنگوچەڵەمەی ئابوری سەرمایەداریتی جیهانی « ١٩٢٩ ـ ١٩٣٣ » و رادەی کارکردنی لە باروزرووفی عیراق بە گشتی‌ی، بە دیارترین هۆی بێکاریی لەقەڵەم بدەین.[١٣٦] کۆمپانیا بیانی یەکانیش رۆڵێکی بنچینەیی‌یان لە خولقاندنی ئەم بارە ناهەموارەدا بینی؛ وەك لە بابەتەکانی داهاتوودا روونتر لێیان دەدوێین‌و قسەیان لەسەر دەکەین. دامەزراوەکانی سەر بە میریش رۆڵی خۆیان لە زیاتر ئاڵۆز کردنی ئەم مەسەلەیەدا گێرا بە نموونە: وەزارەتی. « مەعاریف » کتێبی قوتابخانەکانی لە « میسر » چاپ دەکرد،[١٣٧] لە کاتێك‌دا چاپخانەکانی عیراق بە دەست بێ بازاری‌یەوە دەیان ناڵاند. جگە لەوەیش چاپخانەی حکوومەت بە بیانووی بێ ئیشی‌یەوە ژمارەیەك کرێکاری دەرکرد، کەچی لە هەمان کات‌دا بە بیانووی ئەوەی ئیشی زۆرە، کاری زیادەی بەسەر کرێکارەکانی تردا سەپاند.[١٣٨] کارگە ئەهلی‌یە تازەکانیش، ژمارەیەکی کەمی ئەم کرێکارانە نەبێ،

جێگای ئەم هەموو خەڵکە بێ ئیشەیان تێدا نەدەبووەوە کە ڕۆژ بە ڕۆژیش زیادیان دەکرد. لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٣٢ دا ژمارەی ئەو بێ کارانەی بە تەنها لای «کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیکی عیراق» خۆیان ناونووس کردبوو نزیکەی ٥ هەزار کەس دەبوون و مانگێکی نەبرد ژمارەیان گەیشتە ٦ هەزار کەس، پێش ئەوەی ساڵ تەواو ببێ گەیشتنە ١٠ هەزار کەس. بەلام ژمارەی بێکاران لە شارەکانی تردا، بە چوار ئەوەندەی ئەو ژمارەیە خەمڵ کراوە.[١٣٩] نیوەیشیان پیشەیەکو زیاتریشیان دەزانی.[١٤٠] لە بارودۆخێکی وادا هەر ئەوەندەی بانگەوازێك دەربارەی هەندێ ئیشو کاری دیاری کراو بلاو بکرایەتەوە، ئەگەر لەوپەری وولاتیشدا بوایە، سەدان کرێکار هەڵپەیان بۆ دەکرد خۆیان ناونووس بکەن.[١٤١]

بێ کاریی پاڵی بە ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارانەوە نا وولات بەجێ بهێلنو بۆ ئیش کردن پەنا ببەنە بەر وولاتانی دراوسێ. بێ گومان ئەوانە لە غەریبیدا دەبوو بە هەموو چەشنە کارێك قایل بنو ژیانێکی سەخت بەسەر بەرن، بە ڕادەیەك جاری وا هەبوو، ژیانیشیان لەدەست دەدا.[١٤٢] ئەمانەو «ژمارەیەکی زۆر کرێکاری عیراقی» برانە ئێرانەوەو لە کۆمپانیای نەوتدا کاریان بێ سپێردرا، بێ ئەوەی حکوومەتی عیراق ئاگای لەوە بێ «چۆن خراونەتە سەرئیشو ڕۆژانەیان چەندەو هەلو مەرجی ئیشکردنیان چییەو ژمارەیان گەیشتووە چەند» وەك لە بەڵگەنامەیەکی ڕەسمیدا باسی کراوە.[١٤٣] شایانی باسە ئینگلیزەکانیش لە سەر ڕێو شوێنی هەمیشەیی خۆیان بە جۆرێك لە گەڵیاندا دەجوولانەوە جیاوازییەکی تەواوی هەبوو لەگەڵ شێوەی هەڵسو کەوتیان بەرامبەر بە برا کرێکارەکانیان لە عیراقدا. بە نموونە: کرێکارە عیراقییەکان لە «عەببادان» لە ناو خانووبەرەی کۆمپانیای نەوتدا نیشتەجێ کران.[١٤٤] لێرەدا بێ سوود نییە ئەگەر دەست بۆ ئەو حەقیقەتەیش درێژ بکەین کە لەو کاتەدا ئێرانییەکان، داوایان لە دەوڵەتی بەریتانیا دەکرد، کرێکارە عیراقییەکان لە وولاتەکەیان دوور بخرێنەوە.[١٤٥] لە سەرەتای سالانی سیدا، مەسەلەی بێکاری بوو بە کێشەیەکی کۆمەلایەتی ڕاستەقینەو بەشێوەیەکی فراوان سەرنجی ڕای گشتیی ڕاکێشا. بەدرێژایی دوو ساڵی دوایی تەمەنی ئینتداب، کەم ڕێکەوتووە ڕۆژنامەیەکی ناوخۆ دەربچێو بە م یان بەو شێوە لە مەسەلەی بێکاری نەدوا بێ.

سیاسەتی ئینگلیزیش لە عیراقدا ڕۆڵێکی دیاری لە گیروگرفتی بێ کارییدا بینی. سروشتی ئیمپریالیستەکان وایە، لە هەر جێگەیەك بارگەو بنەیان خست؛ هەوڵ دەدەن پۆلیسو سەربازی سوپاو کرێکاری شارەزای ناو داموو دەزگا جۆربەجۆرو گرنگەکان بکەنە جێی متمانەیانو لێیانەوە نزیکبن. ئەم تاقیکردنەوەیە لە لابورە گەورەکەی هیندوستاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

ئـەوە بوو سـەربازو پـۆلیسیان لە خێڵە نـاسراوو ئێجگـار دواکـەوتـووەکـان هەڵدەبژارد؛ بە تایبەتی لەو عەشرەتانەی کە سەرکردەکانیان تا سەر ئێسقان ئەڵقە لە گوێی ئینگلیز بوون. لەبەر ئەوە شتێکی سروشتی ی بوو داگیرکەران هەوڵی ئەوە بدەن لە میسۆپۆتامیادا هەمان تاقیکردنەوە دووبارە بکەنەوە، چونکە نیازیان وابوو بیکەنە بنکەیەکی چەسپاوو هەمیشەیی لە ناوجەرگەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا. ئەمەیش ئەوە دەردەخاکە بۆچی کەوتنە خۆو هێزی « الشبانة » و « لیڤی » یان دامەزراند و لە بەغدا قوتابخانەیەکی تایبەتی یان بۆ کوڕی سەرەك عەشرەتەکان کردەوە.

هەرچەندە ئینگلیزەکان بە هۆی خەبـاتی بێ ووچانی میللەتی عیـراقەوە نەیانتوانی بگەنە مەبەست و لەم مەیدانەدا دووچاری تێشکان هاتن، بەلام ئەو سیاسەتەیان کە دەرهەق کرێکاران نەخشەیان بۆ کێشابوو سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا. بەر لە هەموو شتێك هەوڵیان دا ماوەی شارەزا بوونی کرێکاری عیراقی لە رووی هونەری یەوە تا دەتوانرێ بەربەست بکرێ، بۆ ئەوەی کادیری هونەری عیراقی پێ نەگاو لەو لایشەوە مەیدانیان بۆ چۆڵ ببێ، بێگانەو خەڵکی ئەڵقە لە گوێی خۆیان بە شێوەیەکی لە رادە بەدەر دابمەزرێنن. ئەمەیش خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە خاسی یەتەکانی چینی کرێکارانی عیراق و تا ئەو رۆژەیش وولات سەربەخۆیی سیاسی وەرگرت ئەم خاسی یەتەی لێ نەبووەوە. واتە کەمی ی ژمارەی کرێکاری شارەزا لە ناو ریزەکانی چینی کرێکارانی عیراقدا.

کۆمپانیا بیانی یەکانیش دەرهەق بە پێگـەیانـدنی کادریـری خۆوولاتی رێگای جۆربەجۆریان دەگرت و پاشەکشەیان لەو ئەرکانـە دەکرد کـە بە پێی بەڵگەنامە رەسمی یەکانی نێوان ئەوان ودەوڵەت، دەبوو جێ بەجێ ی بکەن.[١٤٦] کۆمپانیاکانی نەوت تەنـانەت دوای ئینتـدابیش، بۆ راپـەڕاندنی ئیش و کـاری هونەری بە تایبەتی مەسەلە ئالۆزەکـان، پشتیان بـەو کەسـانە دەبـەست کە سـەربەخـۆیان بـوون و پەیـوەندی یـەکی پتـەویـان لەگـەڵیـان هـەبـوو.[١٤٧] بەڕێوەبەرایەتی رێگـای ئاسن، هـەرگیز هـەنگاوێکی تـایبەتی سـەبارەت بـە پێگەیاندنی کادیری هونەری عیراقی نەنا لە دام و دەزگاکانی خۆیدا. بە نموونە: ئەو بەڕێوەبەرایەتی یە لەتەك « قوتابخانەی سنعاتکاران » دا پێك هات تا بەشتێك پارە مەشق بە چەند کرێکارێك بکا. کەچی بەڕێوەبەرایەتی نـاوبراو لە مـاوەی دووساڵ دا تەنهـا ٣٧ کەسی نـارد و لەم ژمارە کـەمەیش تـاقە سێ کـەسیان دەورەکەیان تەواو کرد، ئەوانی تر گێڕدرانەوە بۆ قوتابخانەکەیان، چونکە یان زۆر

منـدال بوون، يـاخـود ئـارەزووی ئیش‌کـردنی نـاو کـارگـەيـان نـەبـوو.[148] بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن بەمەیشەوە ڕانەوەستـا بەڵکـو لە کۆتـایی سالی ١٩٣٠ دا ئـەو دوو قوتـابخانـەیەیشی داخست کـە لە سالانی داگیـرکردن‌دا ئینگلیزەکان لەبەر پێویستی‌یەکی زۆر بۆ مەشق پێ کردنی ژمـارەیەك کـرێکار دایان مەزراندبوون.[149]

هەموو ئەم کارو کردەوانە بە پێش‌چاوو گوێی لێپرسراوانی عیراقـەوە روویان دەدا.[150] سەرەڕای ئەوەی وولات پێویستی‌یـەکی زۆری بە کـادیری هونەری هەبوو و لەگەڵ ئەوەیش‌دا کە لایەنە کرێکاری‌یەکان چەندین جار پێیان لەسەر ئەم مەسەلەیە دادەگرت‌و دووپاتیان دەکردەوە کە بایەخی پێ بـدرێ؛ دەڵێین سەرەڕای هەموو ئەمانەیش هێشتا کرێکاران وپیشەوەران سوور بوون لەسەر ئەوەی قوتابخانەی پیشەسازی‌یان بۆ بکرێتەوە تا مەشق بەکرێکاران بکاو تـەنانـەت داوایشیان دەکـرد شان بـە شانی قـوتابیـانی، دەوڵەت شـارەزاو لێهاتووەکانیان بۆ دەرەوەی وولات بنێرێ.[151] بۆیە کۆمەڵە جۆر بە جـۆرەکانی کرێکاران لە سەرەتای سالانی سی‌دا، ناچار بوون دەورەی رۆشنبیری و مەشق پێ کردنی تایبەتی بۆ ئەندامانیان بکەنەوە و بۆ ئەم مەبەستەیش کتێبی جیا جیای لەمەڕ پیشەسازی‌و میکانیکیان هێنا تا لە دەورەکان‌دا بخوێنرێن.[152] چەندین بەڵگە بەدەستەوەن گەواهی ئەوەن کە تا چ رادەیەك کرێکـاران‌و پیشەوەرانی عیراق ئامادەی فێربوون‌دا هێنانن.[153]

پیشەسازی نیشتمانیش، لە سنوورێکی زۆر تـەسك‌دا نـەبێ، ئەوەنـدە پێویستی‌ی بە کرێکاری هونەری نەبوو، بۆیە نەیتوانی کارێکی ئەوتۆ بکاتە سەر ئەم مەسەلەیە. لە خۆڕایش نەبوو کە خاوەنی یەکـەم کارگـەی چنینی نوێی ئەهلی‌ی ناچار ببێ، پرۆژەکەی لە « کازم » بنیات بنێ. چونکە لەوێ ئەوەندەی ئەو دەیویست‌و زیاتریش کرێکـاری پیشەیی، لەوانـەی بۆ ئـەو ئیشە پشتیـان پێ دەبەسترا و شارەزای ئەم پیشەیە بوون، دەست دەکەوتن. هەر لەبەر نەبوونی کرێکاری شارەزا، دامەزراندنی یەکەم کارگەی پێستە خۆشکردن دوا خرا. ئەوە بوو چەند پارەدارێکی سەر بەو پیشەیە، ناچار بوون چەند کرێکـارێك لەسـەر حسابی خۆیان بنێرن بۆ ئەورووپا، تاوەکو ببنە پسپۆڕی ئەو پیشەیەو هەتا ئەم هەنگاوە نەنرا، کەسێکی وەك « عەلی سائیب ئەلخزەیری » نـەیتوانی، یـەکەم کارگەی پێستە خۆشکردن لە وولاتدا، دابمەزرێنی.[154]

تێکڕای ئەم هەنگاوە لاوەکی‌یـانە بـۆیان نـەکرا کـار بکەنـە سەر ئـەو

دەلاقەگەورەیەی چینی کرێکارانی عیراق پێوەی دەینالاند؛ ئەویش نەبوون وکەم شارەزایی بوو لە رووی هونەرییەوە. لەسالانی داگیرکردندا لە نـاو تێکرای کرێکارانی پرۆژەو دامەزراوەکاندا، کرێکارە عیراقییـە شارەزاکـان بەشێکی ئێجگار کەمیان پێك دەهێنا. بە نموونە: لە سەرەتای سالی ١٩٢٠ دا لە ناو ٤٠٦ کرێکاری عیراقیدا کە لە ناوچەی « قورەتوو » ی نزیك « خـانەقـین » ئیشیان دەکرد، تەنیا سێ کەسیان شارەزا بوون. لە مانگی ئەیلوولی هەمان سالدا، ئەو کرێکارە عیراقییانەی لە بەغدا کاریان دەکرد و ژمارەیان خۆی لە پێنج هەزار کەس دەدا، ٣٥٦٨ کەسیان نەشارەزا بوون.(١٥٥) لە سـەردەمی ئینتدابیشدا کەمێك نەبێ، ئەم واقیعـە هەر وەك خـۆی مایـەوە. جا بـۆ ئەوەی وێنـەیەکی راستەقینەی ئـەم مەسـەلەیە بخـەینە بـەر چاو، چـەند نمـوونەیـەك لەسەر دامەزراوەکانی میری دەهێنینەوە؛ چونکە ئـەو ژمارانـەی تایبـەتن بە پـرۆژە بیانییەکان، زۆر جار کرێکاری عیراقی و بیانی تێکەڵ دەکەن، دیارە نیسبەتی شارەزاکانیش لە ناو کرێکارە بیانی یەکاندا، زۆر لە نیسبـەتی عیراقییـەکان زیاترە. گرنگ ئەوەیە، ئەم نموونانە کە لە بەلگەنامە رەسمییەکانمان وەرگرتوون، هی دوو سالی دوایی سەردەمی ئینتدابن. واتە پاش ئەوەی بیست سالی رەبەق بووعیراق لە ژێر دەسەلاتی راستەوخۆی دێـرینەتـرین دەولەتی پیشەسـازی جیهاندا، دەژیا. لە سالی ١٩٣١دا لە بەرێوەبەرایەتی « مەساحە » ٣٥٠ کەس ئیشیان دەکرد، سەرپاکیـان نەشـارەزا بوون. بـەرێوە بـەرایەتی بـرووسکەو پۆستەیش لە سەرجەم کرێکارەکانی، کە ژمارەیان خۆی لە ١٠٣ کرێکار دەدا، ١٧ کە سیان شارەزا بوون. لەناو هەموو ئەو کرێکارە عیراقییانەدا کە لە کارگەی شوشتنی خوری سەر بە کۆمپانیای « لەنج » دا کاریان دەکرد، تاقەکرێکارێکی شارەزای تێدا نەبوو.(١٥٦) کەمیی کادیری هونەری خۆمالی، دامەزراوە ئەهلییە کانی ناچار کرد پەنا وەبەر کرێکاری بیانی بنێن. بە نموونە: لە سالانی سیدا، کارگەکانی جگەرە دروست کردن ٥٤ کەس و کارگەی شقارتە ٦ کەسی بیانییان لابوو ئیشیان دەکرد.(١٥٧)

ئینگلیزەکان ئەوەی مەرامیان بوو، بەهۆی ئەم کێشەیەوە دەستیان کەوت؛ ئەوە بوو کردیانە بەهانەیەك تاوەکو بەگەلە کـرێکاری بیـانی بۆ ئیش کـردن بهێننە عیراقەوە.(١٥٨) لە سالانی داگیر کردندا خەلکی هیندوس و ئێرانی و هی تریش، زۆربەی هەرە زۆری کـرێکاری ئـەو پرۆژانـەیان پێـك دەهێنا کـە سیستەمی داگیرکەران لە وولاتدا بنیاتیان نـابوو. تـەنانـەت سەرجـەمی ئەو کـرێکارە

عیراقی‌یانه‌ی ساڵی ١٩٢١ له دامو ده‌زگاکانی ریگای ئاسن‌دا ئیشیان ده‌کرد گه‌یشته ٧٥٠ که‌س، ئه‌وانی‌تر که له بیست هه‌زار که‌سیان تێپه‌راند بیانی بوون.[١٥٩] ئه‌م نیسبه‌ته له دوورترین ناوچه‌ی وولاتیش‌دا هه‌ر وه‌ك خۆیه‌تی. هه‌ر شوێنێك له شکری داگیرکه‌ران پێی گه‌یشتبێ، ژماره‌یه‌کی زۆر کرێکاری بیانی شوێنیان که‌وتوون، یان له‌گه‌ڵیان‌دا بوون. له سه‌ره‌تای ساڵی ١٩٢٠دا « ٦٠٩ » کرێکار له ناوچه‌ی « کنگربان » و ١٠٠ کرێکار له « بازیان » له‌سه‌ر ریگای « سله‌یمانی » و « ٣٠ » له « تاووق » ی نزیك « که‌رکووك » ئیشیان ده‌کرد. به‌رامبه‌ر به‌وان ١٢٨٠ کرێکاری هیندۆسیش له کاردا بوون.[١٦٠] بێ گومان له‌م رووه‌وه هیچ جیاوازی‌یه‌ك له سه‌رانسه‌ری وولات‌دا نه‌بوو.

له ساڵانی ئینتداب‌دا، سه‌باره‌ت به دوو هۆ ئه‌م باره که‌مێك گۆردرا. یه‌که‌میان: ته‌واو بوونی به‌شێکی زۆر له‌و پرۆژه ستراتیژی‌یانه‌ی ئینگلیزه‌کان له‌گه‌ڵ هه‌ڵگیرساندنی ئاگری جه‌نگی یه‌که‌م‌دا ده‌ستیان پێ کردبوو. دووه‌میان: هه‌ڵوێستی کرێکاران‌و هێزه سیاسی یه‌کانی عیراق به‌رامبه‌ر به‌و هه‌موو کرێکاره بیانی‌یانه‌ی له وولاته‌که‌یان‌دا ده‌ژیان. به‌لام سه‌رباری ئه‌وه‌یش هێشتا ئه‌وانه به درێژایی سه‌رده‌می ئینتداب نیسبه‌تێکی ئێجگار زۆری کرێکارانیان له عیراق‌دا پێك ده‌هێنا. کۆمپانیاکانی نه‌وتیش به هیچ کلۆجێ گوێ‌یان به‌و قه‌والانه نه‌ده‌دا که له گه‌ڵی‌دا مۆر کرابوون، به تایبه‌تی ئه‌و به‌نده‌ی که ده‌بوو کرێکاری عیراقی بخاته ئیشه‌وه.[١٦١]

به‌رێوه‌به‌رایه‌تی ریگای ئاسن له‌مه‌یش زیاتر پێی لێ هه‌ڵبری‌و به ته‌واوی پشتی به کرێکاری بیانی ده‌به‌ست. به‌رێوه‌به‌رایه‌تی به‌نده‌ری به‌سره‌یش له‌م رووه‌وه جیاوازی‌یه‌کی ئه‌وتۆی نه‌بوو.

سه‌رچاوه‌کان که دێنه سه‌ر خه‌مڵ کردنی ژماره‌ی کرێکاری بیانی له ساڵانی دوایی سه‌رده‌می ئینتداب‌دا رای جیا جیایان هه‌یه. سه‌رچاوه کرێکاری‌یه‌کان، بۆ ئه‌وه‌ی رای گشتی‌ی به لای خۆیان‌دا رابکێش و بیانخه‌نه پاڵ خۆیان، زێده‌رۆیی له ژماره‌کان‌دا ده‌که‌ن. سه‌رچاوه ره‌سمی‌یه‌کانیش به‌تایبه‌تی ئینگلیزی‌یه‌کان، هه‌وڵیان ده‌دا تا بۆیان ده‌کرێ ژماره‌کان که‌م بکه‌نه‌وه، به‌تایبه‌تی که بێ‌کاری بووه مه‌سه‌له‌یه‌کی گشتی‌ی‌و له هه‌موو لایه‌که‌وه بایه‌خی پێ درا. زۆر جار سه‌رچاوه ئینگلیزی‌یه‌کان ئه‌و کرێکاره ئێرانی‌و هیندۆسانه‌ی جنسی‌یه‌تنامه‌ی عیراقی‌یان وه‌گرتبوو به کرێکاری بیانی له قه‌له‌م نه‌ده‌دان. وا لێره‌دا چه‌ند نموونه‌یه‌ك له هه‌ر دوو سه‌رچاوه‌که ده‌خه‌ینه پێش چاو، له هه‌موو

حاڵێکدا وێنەیەکی رووناکمان سەبارەت بە زۆریی کرێکـاری بیانی لە وڵاتدا نیشان دەدا.

بە قسەی سەرچاوەیەکی کرێکاری، نیسبەتی ئەوانەی جنسییەتنامەی جیاجیایان هەبووەو لە دامو زگای کـۆمپانیـای نەوتی ئینگلیـزی فارسدا لە « خانەقین » ئیشیان دەکرد بەم جۆرەی خوارەوە بووە.

| | ئێرانییەکان | ئەرمەنییەکان[162] | هیندۆسەکان | عێراقییەکان |
|---|---|---|---|---|
| کرێکارانی نەوتخانە | ٥٠٪ | ٢٠٪ | ٢٠٪ | ١٠٪ |
| کرێکارانی ئیستگەی پاڵاوتن | ٦٠٪ | ٢٠٪ | ١٤٪ | ٦٪ |
| کرێکارانی ئیستگەی بارکردن | ٤٣٪ | ٢٣٪ | ٢٢٪ | ١٢٪[163] |

شایانی باسە کاتێك رۆژنامەکانی ناوخۆ ئەم ژمارەیەیـان بڵاو کـردەوەو قسەیان لەسەر کرد و رای گشتییان وریا کردەوە، کۆمپانیای ناوبراو بـەهیچ شێوەیەك بەدرۆی نەخستنەوە.

سەرچاوەرەسمییـەکان و راپـۆرتەکـانی بەریتـانیا ژمـارەی کرێکـاری بیانییان لە ساڵی ١٩٢٦ دا بە ٢٠٪ خەمڵ کردووە. نیسبەتێکی نزیك بەوەیشیان بۆ ئەو کرێکارە بیانییانە داناوە کە لە ساڵی ١٩٢٧دا لە کۆمپانیاکانی نەوتدا کـاریان دەکـرد. ساڵی ١٩٣٠ یش ژمـارەی کرێکـارە بیانییـەکانی بـەندەری بەسرەیان بە ٤٠٪ خەمڵ کردووە.[164]

لێرەدا پێویستە دوو تێبینی بچووك، بەڵام پڕ مەغزا بخەینە روو. لە ١٦ی تەمووزی ساڵی ١٩٢٨ دا، کاتێك وەزیری ئەشغال و هاتوچۆ لە بەردەم پەرلەماندا رای گەیاند گوایە نیسبەتی کرێکاری بیانی لە کۆمپانیا بیانییەکاندا لە عیراق لە ٢٠٪ی هەموو کرێکاران تێپەڕ ناکا، رۆشنبیرێکی ئەو کاتە بەرەنگـاری دەبێو

لەژێـر نازنـاوی « لادێیەکی دڵ پـڕ لەسوێ » دا، ووتـارێکی سـەرەکی ی لە ڕۆژنامەیەکی ئەو کاتەدا بڵا و دەکاتەوە و دەقاودەق دەڵێ:

«.. لە هەر سێ ناوچەکەی کۆمپانیای نەوتی خانەقین کە ـ نەوتخانەو ئەڵوەند ـ شوێنی پاڵاوتن ـ و ئیستگەی بارکردنن، سێ مانگم بەسەر بردووە. ئەو کرێکارە عیراقی یانەی لەو کۆمپانیایەدا کار دەکەن نیسبەتیان لە ٣٠٪ تێپەڕ ناکا، کەچی تەنانەت پاسەوان و ئەو قۆنتەراتچی یانەی خانووبەرە بۆ ئەورووپایی و کرێکارەکان دروست دەکەن و خەڵکی تریش هەموو بیانین.»[١٦٥]

بەڵام نە وەزیرو نە کۆمپانیای ناوبراو نەیانتوانی بەرپەرچی ئەم حەقیقەتە بدەنەوە. پاش ماوەیەکی کەمیش وەزارەتی ئـەشغال و هـاتوچـۆ بڵاوکـراوەی مانگانەی خۆی لەمەڕ نەوتی عیراق بڵاوکردەوە تێیدا باسی دەکا گوایە ژمارەی ئەو کرێکارە ئێرانی یانەی لە کۆمپانیای نەوتی خانەقین کار دەکەن تەنیا ١٦٨ کەسن.[١٦٦] بەڵام هـەر دوای دوو ڕۆژ، ڕۆژنامـەکانی نـاوخۆ لەبـەر ڕۆشنایی سەرچاوە ئێرانی یەکان، ئەو ژمارەیەیان بەدرۆ خستەوەو سوور بـوون لەسەر ئەوەی کە ژمارەیان گەیشتووەتە ٨٥٧ کەس؛[١٦٧] وەزارەتیش نەیتوانی وەڵامێکی ئەم هەواڵە گورچك بـڕە بداتـەوە. بەپێچـەوانەوە، لە ژمـارەکانی داهـاتووی بڵاوکراوەکەیدا چیتر توخنی ژمارەی کرێکارە بیانی یەکان نەکەوت و تەنها باسی رادەی بەرهەمهێنان و ئیش و کاری کومپانیاکانی دەکرد.[١٦٨]

ئەم هەموو کرێکارە بیانی یەو لەباروزرووفێکدا کە بێکاری لە ناوخـۆی وولاتدا تـەشەی کـردبوو، کـارێکی سەلبی کـردە سـەر دەروونی کـرێکـارە عیراقی یەکان کە بە شێوەیـەکی لە ئەنـدازە بەدەر دژایـەتی یان دەکـردن؛ بە تایبەتی بەرامبەر کرێکارە هیندۆسەکان و لایان وابوو بەزۆری ئەمانـە کاریـان کردووەتە سەر کارو کرێکاران لە عیراقدا. ئەوەیشی کە پتر کاری لە هەڵوێستی کرێکارە عیراقی یەکان دەکرد، ئەوەبوو کرێکارە بیانی یەکان هەندێ ئیمتیازیان پێ بەخشرابوو، ئەمان لێی بێ بەری بوون. بە نموونە: بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن ٥٠ تا ١٥٠٠ روپیە مانگانەی دەدا بەوانەی لە هیندوستـانەوە دەیهێنـان، هەر بەگەیشتنیان مانگی ٢٠ روپیەی تریان بە ناوی « مخصصات »ی خـواردنەوە دەدرایە. بەپێی قەواڵەی ئیش کردنیش مافی ئەوەیان هەبوو لەسەر حسـابی بـەڕێوە بـەرایەتی نیشتـەجێ بکرێن و تیمـاری نەخـۆشەکـانیان بکـرێ. گەر کۆمپانیایش نەیتوانی شوێنی نیشتەجێ کردنیان بۆ دابین بکا، ٨٪ی مووچەکەیان لە بری کرێی خانوو بدرێتێ. هەر کەسێکیش ماوەی دوو ساڵی لە ئیشدا بەسەر

برد، بۆی هەبوو لە بریتی هەر ١٢ رۆژ خزمەت، رۆژێك مۆڵەت وەربگرێ. یەك مانگی تەواویش مۆڵەتی نەخۆشی ی بە مووچەی تەواو دەدرایەو گەر پێویستیشی بکردایە مـانگێکی تری بـە نیوەی مـووچەکـەی دەدرایە. هـەروەها زیـادەی ساڵانەیش‌یان هەبوو. کاتێکیش ماوەی ئیش کردنیان کۆتـایی دەهات، دەبـوو بەڕێوەبەرایەتی لەسەر حسابی خۆی بینێرێتـەوە بۆ هینـدوستان. بـەو پێ‌یە رۆژانەی کرێکارێکی ئاسایی هیندۆس بەلای کەمەوە، دەگەیشتە چوار ئەوەندەی رۆژانەی کرێکارێکی عیراقی؛ ئەمە جگە لەو ئیمتیازانەی ئەگەر حسابیان بۆبکرێ جیاوازی‌یان لە چوار ئەوەندەیش تیپەڕ دەکا. لە ساڵی ١٩٢٦دا سەرجەمی ئەو مووچانەی بەڕێوەبەرایەتی رێگای ئاسن بە ٥٧٠١ کرێکاری عیراقی داوە، ١٧١ هەزار و ٣٠ روپیە بووە. بەرامبـەر بەوە ٣٠٠ هـەزار روپیە دراوە بـە ١٢٠٠ کرێکارو مووچەخۆری هیندۆس کە لە هەمان دام‌و دەزگادا ئیشیان دەکرد.[١٦٩] لە لایەکی تریشەوە، کرێکارە بیانی‌یەکان مووچەیەکی نەگۆڕیان وەردەگرت و هیچ شتێکی لاوەکی کاری تێ نەدەکرد، بە پێچەوانەی کرێکارە عیراقی‌یەکانەوە کە رۆژانەکەیان بە بیانووی جۆر بەجۆر دەبڕدرا و لێی دادەشکێنرا بە نمـوونە: دامەزراوەیەك مووچەی نەگۆڕی دەدا بەو ٦١ کەسەی لای ئەو کاریان دەکرد و ٤٧ کـەسیان بیـانی بوون.[١٧٠] وەنـەبێ ئەم جیـاوازی‌یەیش، هـەر کرێکـارە نەشارەزاکانی گرتبێتەوە، بەڵکـو تەکنیکی‌یـەکانیش دەگـرتەوە. بـە نموونـە: مووچەی مانگانەی شۆفیری شەمەدوفەرگەر عیراقی بوایە لە نێوان ٦٠ تا ١٠٠ روپیەدا بوو. کەچی مووچەی شۆفیرێکی بیانی لەو جۆرە، لە نێوان ٢٠٠ تا ٤٠٠ روپیەدا بوو، جگە لەو « مخصصات » ەی بۆی دانرا بوو.[١٧١]

کە دامەزراوە بیانی‌یەکان، ناو بەناو دەکەوتنە رێکخستنی کرێکارەکانیان، بە دەگمەن دەستیان بۆ هیندۆسەکان دەبرد. دوای جەنگیش کە ئینگلیزەکان بۆ یەکەمجار هەوڵی رێکخستنی لەو جۆرەیان داو لەماوەی ساڵانی ١٩١٨ ـ ١٩٢١ دا، نزیکەی ٥٠ هەزار کرێکاریان لە ئیش دەرکـرد، توخنی تـاقە کـەسێك لەو هیندۆسانە نەکەوتن کە لە وڵات کاریان دەکرد.[١٧٢] تەنانەت لە ساڵانی ١٩٢٩ ـ ١٩٣٣ یشدا کە گیروگرفتی ئابوری سەرمایـەداریتی جیهان گـەیشتە لوتکـە، ئینگلیزەکان لەسەر ئەم سیاسەتەیان بەردەوام بوون و بگرە مەبدەئێکی تریان خستە پاڵ، ئـەویش کەم کـردنەوەی مـاوەی ئیش کردن‌بـوو، بەرامبـەر بەوە مووچەیشیان هێنایـە خوارەوە[١٧٣]، بێ ئـەوەی دەست لە مووچـەی کرێکـارە بیانی‌یەکان‌و « مخصصات »ەکانیان بدەن، بەمەیش ئەوەندەی تر، رق‌و کینەیان لە دڵی کرێکارانی عیراق‌دا دروست کرد.[١٧٤]

لە هـەمان كـاتدا، ئینگلیزەكـان بـەشێكی زۆری ئـەو ئیشـانـەی كـە پەیوەندییان بە چاودێری كردنی راستەو خۆی كرێكارانەوە هەبوو دایان بـە مووچەخۆرە هیندۆسەكان. بە نموونە: لە ساڵی ١٩٢٦ دا ژمارەی ئەوانـەی لە دامودەزگاكانی رێگای ئاسندا، چاودێری باركردنیـان دەكرد و بـەرێوەبـەری ئیستگە بوون گەیشتبووە «١٠٢» كەس لەوانە ٥٦ كەسیان «واتە نزیكەی ٦٠٪» یان، هێندۆس بوون. هەروەها «١٠٦» هیندۆسیتر ئیشو كاری نووسینەوەیان رادەپەڕاند.[١٧٥] ئەمە لە كاتێكدا كە نەك هەر رۆشنبیرانی عیراق، بەڵكو زۆربەی فەرمانبەرەكانی سەردەمی عوسمانلی بە دەست بێ كارییەوە، دەیان ناڵاند.

ئینگلیزەكان كە بە دەستی ئەنقەست و بەو چەشنە لەتەك هیندۆسەكان دەجووڵانەوە، لەناو هیندوستاندا بە ملیۆنان كەس بە دەست سیاسەتی ناڕەوای ئەوانەوە، دەیان ناڵاند؛ بۆیە لەوێ بوونە هێزی بنچینەیی و بزوێنەری خەباتی نیشتمانیی دژ بە بەریتانیای داگیركەر، وەك لە ڕاپەڕینە جەمـاوەرییەكـانی سـاڵانی ١٩١٨ ـ ١٩٢٢، ١٩٢٨ ـ ١٩٣٢ و چـەنـد راپـەڕینێكی تـریشـدا دەردەكەوێ. بەلام لە عیراقدا، حاڵ بە جۆرێكیتر بوو، چـونكە ئینگلیـزەكان توانییان لایەنێكی گەورەی ئامانجی سیاسییان دەرهەق بە كرێكاران جێ بەجێ بكەن. بەو جۆرە هەزاران كرێكاری بیانی بووبـە داردەستی ئینگلیزو چییـان گەرەك بوایەو چۆنیان مەبەست بوایە، بۆیان مەیسەر دەكردن، بێ ئەوەی ترسی ئەوەیان هـەبێ لەڕوویان دا، هـەڵگەڕێنـەوە. بەشێكیشیـان بوونـە ئامـرازی چەوساندنەوەی كرێكارە عیراقییەكان، چ بە شێوەی زۆ لێكردن و چ بە شێوەی چاودێری كردن، ئەنجامی ئەمەیش ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوەو گیروگرفتێكی زۆر ڕوویاندا.[١٧٦] لەبەر ئەوە هەروا لەخۆڕا نەبوو كە چەند جارێك كرێكارە ئێرانیی و هیندۆسەكان كۆ بوونەوەو ئەرزوحاڵیان پێشكەش بە دەسەلاتدارانی وولاتەكانی خۆیان كرد، تا چی كرێكاری عیـراقی هەیـە لە دامودەزگاكـانیاندا، دەریـان بكەن.[١٧٧] وا دیارە حكوومەتی ئێران چەنـد هەنگـاوێكی بە كـردەوەی دژ بەو كرێكارە عیراقییانە نابوو، كە لە كۆمپانیاكانی نەوتی ئینگلیزی فارسیدا ئیشیان دەكرد.[١٧٨]

لە هەمویشی خراپتر ئەوە بوو، ئینگلیزەكان تا ڕادەیەكی باش توانییـان كرێكاران لە كێشە بنچینەییەكانیان و هۆیە راستەقینەكانیان دوور بخەنـەوە، ئەوەبوو پێش كۆتایی هاتنی ئینتیداب و دوای كۆتایی هاتنیشی، دوژمنایەتی كردنی كرێكارە هیندۆسەكانیان پێ كردنە مەسەلەی بنچینەیی و دروشمی سەرەكیی خەباتی رۆژانەیان.[١٧٩] چەند لایەنێكی سیاسی جیاجیایش، لە پێش هەموویانەوە

رۆشنبیره شۆڕشگێرەکان تێکەڵ بە هێرشی دژبەکرێکارانی هیندۆس بوون. بەر لەوەی مەودای بزوتنەوەی کرێکاران بە تەواوی جێی خۆی بگرێ، رۆشنبیران و رۆژنامەکانی ناوخۆ دەنگیان بەرز کردەوەو دەیانویست ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەن. هەر زوو رۆژنامەی « العراق » ووتارێکی بە ناونیشانی « رۆڵەکانی ووڵات ئاتاجی نانن و بێگانەکانیش لە نازو تیعمەتدا دەژین. مەسەلەی کرێکارە بێ ئیشەکان لە عیراقدا.» بڵاوکردەوە.[180] هەفتەیەکی نەخایاند هەر لەو رۆژنامەیەدا « عیراقی یەکی بێکار » ووتارێکی بە ناونیشانی « هاواری کرێکارێك » نووسی و لە هەمان روانگەوەو بە هەمان گیانەوە چارەسەری مەسەلەکە دەکا.[181] زۆری تریش بە شێوازێکی کاریگەر و دڵتەزێن و چاو نەترسانە، لەسەر ئەو مەسەلەیە نووسی یان.[182]

لێرەدا گرنگ ئەوەیە لەو حەقیقەتە تێ بگەین کە ئەو هێرشە تا ڕادەیەك پەردەی لەسەر رووی راستەقینەی حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عیراق هەڵماڵی؛ چونکە هەڵوێستی نارەوای ئەوانە تەنانەت رۆژنامە کۆنەویستەکانیشی هێنایە قسە. رۆژنامەی « العراق » چەند ووشەیەك لەسەر ئەرزوحاڵێکی کرێکاران کە دژ بە کۆمپانیای نەوت پێشکەشیان کردبوو، دەنووسێ: « دادو بێ دادی کرێکارانی عیراق لە دەست کۆمپانیا بیانی یەکان شتێکی تازە نی یە، بەڵکو چەندین جاری تریش بووە، بەڵام کەسمان نەبینی بایەخیان پێ بداو مافی خۆیان بداتێ.».[183] « لادێ یەکی دڵ پڕ لە سوێ»[184] یش، بەم جۆرە کۆتایی بە نووسینەکەی دێنێ و دەڵێ:

«.. ئەم چەند ووشەیەم دەنێرم بۆ ئەوانەی دەرهەق رۆڵەی ووڵاتەکەیان تۆزقاڵێك بەزەیی ودڵسۆزی لە دڵیاندا هەیە. بۆ ئەوانەی لە کەناری دیجلەو فوراتدا پەروەردە بوون و پێ گەیشتوون بۆ ئەوانەی لەسەر کورسی وەزارەت و پەرلەمان کە لە بنچینەدا هی گەلەو بۆ گەلە، پاڵیان لێ داوەتەوە.. تۆ بڵێی کەس هەبێ گوێیان لێ بگرێ ؟! تۆ بڵێی کەس هەبێ لەجێی خۆی ببزوێ»[185] « عیراقی یەکی بێکار » یش لە بێدەنگی ی ئەو نوێنەرانەی « لە رۆڵەی گەورەو بچووکی نیشتمان هەڵبژێردراون »[186] سەرسامی ی خۆی نیشان دەدا.

خۆ گێل کردنی ئینگلیزەکان و هەڵخەڵەتاندنی بەردەوام و بەرگری کردنی درۆزنانەیان لە هیندۆسەکان؛[187] ئەوەندەی تر ئاگری دوژمنایەتی کردنی هیندۆسەکانی خۆش کرد، بە ڕادەیەك نارەزایی تووڕە بوونی جەماوەر دژی ئەوانە چووە قالبێکی گشتی یەوە و لە هەموو شوێنێکدا هەستی پێ دەکرا. جا ئیتر ئەو شوێنە ناو کارگەکان بووبێ، یان لە داموو دەزگاکانی سەر بە میری و

بیانی یەکان، یاخود لە کاروفرمانی تردا. بێ گومان ئەم هەڵوێستەیش مایەی سەرسوڕمان نی یەو هەر دەبوو رووبدا، بە تایبەتی لە ئەنجامی ئەو هێرشە فراوانەدا کە سەرکردایەتی کرێکاران بە مەبەستی کار کردنە سەر هەستو سۆزی هاووڵاتیان کردی. « ئەی رۆڵەکانی دیجلەو فورات: ئێوە بە رەوای ئەزانن برا کرێکارەکانتان لەسەر خاكو نیشتمانی خۆیان و لەناو نەتەوەی خۆیاندا رووتو برسی بن و بێگانەیش لە نازو نیعمەتدا بژین؟...» ئا بەم چەشنە « محەممەد سالح ئەلقەزاز » رووی دەمی کردە « میللەتی عیراقی مەزن و حزبە سیاسی یەکان و کۆمەڵەی هەرەوەزی کرێکاران و لایەنە نیشتمانی یەکان و کۆمەڵەی خێرەومەندان و پیاوانی ئاین و رۆژنامەنووسان و چینی پارێزەران* ولاوانی رووناکبیروپیاوانی ئازای پاشەرۆژ و هەموو ئەو کەسانەی خاوەنی ویژدانێکی زیندوون وگشت نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز...».[١٨٨]

«محەممەد سالح ئەلقەزاز » کە کۆنترین ئەندامی نیقابی ی کرێکارانی عیراقە، ئەمڕۆ دان بەو راستی یەدا دەنێ کە چ سەرکردایەتی کرێکاران و چ رۆشبیران ئەو مەسەلەیەیان زیاد لە پێویست گەورە کردبوو.[١٨٩] چونکە کرێکارە هیندۆسەکان، لەوە بەولاوە کە دارەدەستێکی هەڵخەڵەتێنراو بوون بەدەست ئینگلیزەکانەوەو ژیان و گوزەرانی سەخت ناچاری کردبوون نیشتمانی خۆیان بەجێ بهێڵن، شتێکی تر نەبوون. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو هیندۆسانە لەو بەهەشتە پڕ لە نازو نیعمەتەدا نەبوون کە سەرکردایەتی کرێکاران و رۆژنامەکانی ناوخۆ دەیانویست نیشانی رای گشتی ی بدەن. لە زۆر پرۆژەدا ئەوانە رۆژی دەسەعات کاریان پێ دەکرا.[١٩٠]، نائومێدییش پاڵی بە زۆر کەسیانەوە دەنا، عیراق بەجێ بهێڵن و تەنانەت هەندێ جار حاڵ دەگەیشتە ئەوەی خۆیشیان بکوژن.[١٩١] لە ماوەی تەنها سێساڵدا « لە ١٩٢٤ تا ١٩٢٧ » نزیکەی هەزار کەسیان ووڵاتیان بەجێ هێشت.[١٩٢] ژمارەیەکی زۆریشیان هەوڵیاندا جنسی یەتنامەی عیراقی وەربگرن، ئەوە بوو لە ماوەی دووساڵدا زیاد لە ٥٠٠ کەسیان بوون بەعیراقی.[١٩٣]

لێرەدا پێویستە ئەو راستی یەیش لەیاد نەکرێ کە ئەگەر لەو کاتەدا چینی کرێکاران سەرکردایەتی یەکی هۆشیاریان ببوایە، دوور نی یە بەشێکی کرێکارە هیندۆسەکانیان بەلای خۆیاندا رانەکێشایە. یاخود لای کەم وایان لێ دەکردن هەڵوێستێکی بێ لایەن نیشان بدەن. باشترین بەڵگەیش لەم رووەوە تاقیکردنەوەکانی « شۆرشی بیست » ە. چونکە لەو رۆژگارە ناسکەدا، خەڵکێکی

زۆری هیندۆس بە تایبەتی موسڵمانەکانیان پشتگیریی خەباتی عادیلانەی میللەتی عیراقیان دەکردو بڕێکیشیان کەوتنە سەرپێچی کردن لە فەرمانی سەرکردە ئینگلیزەکانیان.(١٩٤) ئەمە لە کاتێکدا کە هەڵوێستی توندو تیژی خەڵکی عیراق بەرامبەر بە کرێکارە بیانی یەکان، بووە هۆی ئەوەی ئەنجامی ئاوەژوو بە دەستەوە بدا؛ واتە ئەوانەی کە دەیان چەوساندنەوە، بوونە « پارێزەر » یان‌و وایان لێهات سڵ لە کرێکارە عیراقی یەکان‌و کۆمەڵەکانیان بکەنەوەو هەر کە دەرفەتێکیشیان بۆ بڕەخسایە، زۆریان بۆ دەهێنان، وەك پێشتر باسمان کرد.

هەرچۆنێك بێ مەسەلەی کرێکارە بیانی یەکان، بووە یەکێك لە هۆیە بنچینەیی یەکانی خەباتی کرێکاران، بە تایبەتی لە کۆتایی سالآنی بیست دا. جا ئەگەر لەووڵاتدا یاسایەکی کرێکارانەبۆ ڕێکخستن‌و پارێزگاری کردنی مافەکانیان لە گۆڕێ بوایە، نە ئەو مەسەلەیەو نە مەسەلەی لەو بابەتە، نەیان دەتوانی گیروگرفتی کرێکاران ئەوەندە ئاڵۆز بکەن.

---

## یاسای کرێکاران لە سایەی

## سیستەمی داگیرکردن و ئینتداب دا

---

هەڵوێست‌و بیانووی ئینگلیزەکان، بەرامبەر بە یاسای کرێکاران لە عیراق‌دا، لە ناوەرۆکی ئەو ڕاپۆرتەدا کە ساڵی ١٩٢٦ پێشکەش بە « کۆمەڵی گەلان » یان کرد، بەوە لێك دەدایەوە گوایە:

«.. هەوڵدان بۆ جێ بەجێ کردنی یاسایەکی ئاڵۆزی کرێکارانە لە عیراق‌دا، وەك ئەوەی کە پێشکەوتنی شارستانیەتی و مێژووی کرێکاران لە ووڵاتە ڕۆژئاوایی یەکان سەپاندیان، کارێکی بێ هوودەیە. چونکە ئەوەی ئەمڕۆ لە عیراق‌دا لە ئەستۆمانەو بەکردەوەیش پەیرەو دەکرێ ئەوەیە، چەند ماددەیەکی یاسایی سادە و ئاسان دابنرێن تاوەکو کرێکار و جووتیاری عیراق لە چاوچنۆکی ی خاوەن کار و سەرەك عەشرەتەکان بپارێزرێن..»(١٩٥)

ئینگلیزەکانیش بە درێژایی سالآنی داگیرکردن و ماوەیەکی زۆریش لە سالآنی ئینتداب بە کردەوە هەر ئەوەیان پەیرەو دەکرد و لێپرسراوانی عیراقیش

سوور بوون لەسەر ئەوەی کە عیراق وولاتێکی کشتوکاڵی یە و پێویستی بە یاسای کرێکاران نی یە.[196] لەو قۆناغەدا باشترین هەنگاوێك لەم رووەوە نرابێ، ئەوە بووە کە چەند برگەیەکی سەیرو عەنتیکەی یاساو سیستەمی عوسمانلی پەیرە و دەکران کە هەندێکیان چارەکە سەدەیەك بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەم دەرچووبوون.[197] ئەوانەیش بریتی بوون لەوەی: ماوەی کرێکار نەدرێ بەبێ رەزامەندی رەسمی ئیش بکا.[198] و ناکۆکی نێوان کرێکارو خاوەن پیشە بخرێتە بەردەم دادگای تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە. هەروەها دامەزراندنی نەقابەی کرێکاران و رێکخراوی کرێکارانەی بە تەواوی قەدەغە کردبوو.

بەلام نە ئینگلیزەکان و نە کاربەدەستانی عیراق نەیانتوانی تاسەر گوێ لە دانانی یاسای کرێکاران بخەفێنن. بە تایبەتی چونکە مەسەلەکە گەیشتە رادەیەك بووە یەکێك لە داخوازی یە سەرەکی یەکانی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق و تێکرای هێزە نیشتمانی یەکانیش پشتگیری یان دەکرد. لە کۆتایی سالانی بیستدا، کرێکاران کەوتنە خۆ لە پێناوی یاسایەکی تایبەت بە کرێکاراندا خەباتیان دەکرد، ئەمەیش بە قسەی بەڵگەنامە رەسمی یەکان خۆیان، کارێکی راستەوخۆی کرد و ناچاری کردن لەم رووەوە چەند هەنگاوێك بنێن.[199] ئەنجام حاڵ گەیشتە ئەوەی کۆمەڵەی کرێکاران و پیشەوەران هەریەکەیان لای خۆیەوە، مسوودەیەکیان بۆ یاسای پێشنیازکراو پێشکەش پەرلەمان و ئەنجومەتی وەزیران و چەند وەزارەتێك کرد؛ وەك « کۆمەڵەی سنعاتکاران »[200] و « کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان »[201] کردیان. « محەممەد سالح ئەلقەزاز » ی سەرۆکی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » لە رۆژی ٣١/٣/٩٣١ دا یاداشتێکی دوورو درێژی پێشکەش بە لێپرسراوان کرد و تێیدا بە ١٩ بەند، لە گرنگترینی ئەو گیروگرفتانە دەدوێ کە کرێکارانی عیراق بەدەستیانەوە دەینالاند. وەك دیاری کردنی سەعاتی ئیشی رۆژ بە هەشت سەعات و ئیشی شەو بە شەش سەعات « بەندی یەکەم ». هەروەها لە « بەندی دووەم و سێیەم » دا، داوا دەکا، کرێکار مافی ئەوەی هەبێ مووچەی رۆژانی موڵەت و جەژنە رەسمی یەکان وەر بگرێ. لە « بەندی چوارەم و پێنجەم » دا، داوا دەکا گەر کرێکار لە کاتی ئیش کردندا کەفتەکار بوو، یان پیری زۆری بۆ هێنا، مافی ئەوەی هەبێ پارەی بدرێتێ و خانەنشین بکرێ. لە « بەندی شەشەم و حەوتەم » دا، داوا دەکا ئیش پێ کردنی منداڵ و کرێکاری بیانی قەدەغە بکرێ. لە « بەندی هەشتەم »، داوا دەکا مەشق بە کرێکاران بکرێ و لە « بەندی نۆهەم » دا، داوا دەکا « مافی کرێکاران لە چەوساندنەوەی سەرمایەداران و سەرەك کارگەو کۆمپانیاکان بپارێزرێ،

ئەوەیش؛ یان بەدامەزراندنی بیرۆیەکی کرێکارانە دەبێ، یاخود بە پێکهێنانی چەند لیژنەیەک، لە بابەتی لیژنەی دیسپلین‌و ئەرکی تەماشاکردنی داواو شکایەتی کرێکارانی پێ دەسپێردرێ ». ماددەکانی تریش پەیوەندی‌یان هەبوو بە قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری و تەندروستی‌و دیاری‌کردنی ڕۆژانەو شتی لەو بابەتەوە.[٢٠٢]

هەر لەم ماوەیەدا، هۆیەکی دەرەکی‌ی هاتە پێشەوەو چ ئینگلیزەکان‌و چ کاربەدەستانی عیراقی ناچار کردتا، ڕادەیەک بایەخ بە یاسای کرێکاران بدەن. ئەو هۆیەیش ئەوە بوو؛ عیراق بوو بە ئەندامی « کۆمەڵەی گەلان » کە ماددەی « ٢٣ آ » ی بەرنامەکەی دەقاودەق دەڵێ:

« دەبێ ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان هەل‌و مەرجێکی مرۆڤانە بۆ ئیش پێ کردنی پیاوو ژن‌و منداڵ دابین بکەن، ئەمەیش تەنها بە هۆی یاساوە دەبێ‌و بەس...»[٢٠٣] لەولایشەوە بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان » ی سەر بە « کۆمەڵی گەلان »، هەر لە ناوەڕاستی ساڵانی بیستەوە، بایەخێکی باشی دابوو بەوەی کە ئاخۆ عیراق بە سیفەتی ئەوەی دەوڵەتێکەو لە سایەی ئینتیداب دایە، تا چ ڕادەیەک یاساکانی ڕێکخراوە کانی نێوان دەوڵەتان پەیڕەو دەکا. لە ٢٥ ی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٢٦ دا، مەندووبی سامی‌ی بەریتانیا، سەبارەت بەو یاسایانەی « کۆنگرەی کاری دەوڵەتان » لە کۆبوونەوەکانی ساڵانی ١٩١٩ - ١٩٢١ بریاری لەسەر دابوون، یادداشتێکی ئاڕاستەی سەرەک وەزیران کرد و تێیدا دەپرسێ ئاخۆ تا چ ڕادەیەک دەتوانرێ « هەندێ لەو بڕیارانە بە تەواوی یان پاش دەستکاری کردینان جێ بەجێ بکرێن...» بە تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندی‌یان بە ئیش پێ کردنی منداڵان‌و شەوکاری ئافرەتان‌و شتی لەوبابەتەوە هەیە.[٢٠٤] داموودەزگاکانی ئینتیداب لای خۆیانەوەو بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٢٦ دا و لەو ڕاپۆرتەدا کە ناو بەناو لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی عیراق پێشکەش بە « کۆمەڵەی گەلان » یان دەکرد، وەسفێکی گشتی‌ی باری ژیان‌و گوزەرانی کرێکاران و هەل و مەرجی ئیش‌کردن لە ووڵاتدا، دەکا:[٢٠٥]

بەلام نە ئینگلیزەکان و نەکاربەدەستانی عیراق، پەرۆشی ئەم مەسەلەیە نەبوون. ئەوەتا لە ڕۆژی ٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٦ دا، وەزارەتی ناوخۆ وەڵامی یادداشتەکەی « مەندووبی سامی » بەم جۆرە دەداتەوەو دەڵێ:

«.. کرێکارانی عیراق ئەو قەبارە ڕێک‌و پێکەیان نی‌یە، تا ئەو ڕێککەوتنامانەی لە بارەیانەوە مۆر دەکرێن جێ بەجێ‌یان بکەین. لەبەر ئەوە بە

پێویستی نازانین لەم ڕووەوە هیچ هەنگاوێك بنێین..»[٢٠٦]

هەڵوێستی بە کردەوەی لێپرسراوانیش ئەو حەقیقەتە باشتر دەچەسپێنێ بۆچی « فایلی کرێکاران لەوەزارەتی ناوخودا، لەدوای ٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦ وە تا سەرەتای ساڵی ١٩٢٩ هیچ شتێکی سەبارەت بە مەسەلەی کرێکاران تێدا نی یە...»، وەك بەڵگەنامەیەکی ڕەسمی ئەو سەردەمە، دەقاودەق باسی دەکا.[٢٠٧]

پاش سێ ساڵ گوێ خەفاندن، دەبینین حکوومەتی عیراق لە ناکاو مەسەلەی کرێکارانی بیر دەکەوێتەوە، بەلام نەك لەبەر خاتری چاوی ئەوان بەڵکو بە هۆی ئەوەی خەریك بوو، ببێتە ئەندامی « کۆمەڵەی گەلان ». لە ١٣ی شوباتی ١٩٢٩ دا، سکرتاریەتی ئەنجومەنی وەزیران یادداشتێکی بۆ وەزارەتی ناوخۆو دارایی و ئەشغال و هاتوچۆ ناردو تێیدا دەست بۆ نووسراوەکەی ٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦ درێژ دەکا و ڕای سەرەك وەزیرانیشی دەخاتە پاڵ و دەڵێ:

«... پێویستە حکوومەتی عیراق، وەك هەموو حکوومەتانی تر بەتەنگ ڕێکخستن و چاودێری کردنی هەل و مەرجی ئیش کردنەوە بێ. بەلام لەبەر ئەوەی هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە، دایەرەیەکی تایبەتی بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم ئەرکە پێك بهێنرێ، پێشنیاز دەکا لە ئێستاوە ئەرکی چاودێری کردنی هەل و مەرجی گشتی ی ئیش کردن لە عیراقدا، بخرێتە ئەستۆی یەکێك لە وەزارەتەکان..»[٢٠٨]

بە هۆی ئەوەیشەوە کە لێپرسراوان بە باشی نەیان دەڕوانی یە کرێکاران، ئەم مەسەلەیە کەوتە گێژاوی ڕۆتین و بگرەو بەردەی نێوان دامودەزگا ڕەسمی یەکانەوە. وەزارەتی ناوخۆ بەو جۆرە وەلامی دایەوە گوایە وەزارەتی ئەشغال و هاتوچۆ « ئەو دایەرەیەیە کە دەبێ ئەو ئەرکەی پێ بسپێردرێ »، وەزارەتی ئەشغال و هاتوچۆیش، وەلام دەداتەوەو دەڵێ: جێ بەجێ کردنی ڕێککەوتنامەی نێوان دەوڵەتان بە سەر کرێکاراندا کارێکی « ئێجگار گرانە »، لەبەر ئەوە پێشنیاز دەکا، دایەرەیەك یاخود وەزارەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێ و ئەم ئەرکەی بخرێتە ئەستۆ. پاشان وەزارەتی دارایی داوای وێنەیەکی ئەو ڕێککەوتنامەیە دەکا، تاوەکو لێی بکۆڵێتەوە.

پاش ئەوەی « چەند مانگێك ئەم مەسەلەیە خەوت »، وەك بەڵگەنامەیەکی ڕەسمی ی ووتوویە[٢٠٩]، ڕۆژی ٣/١١/١٩٢٩ وەزارەتی ناوخۆ بەوە قایل بوو کە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی یەکان و ئەو دایەرانەی سەر بە ئەون « چاودێری هەل و مەرجی ئیش کردن لە عیراقدا » بکەن. بەلام بەڕێوەبەرایەتی ناوبراو لەوە دەستەوسان تر بوو، بتوانێ ئەم ئەرکە بەجێ بهێنێ و سەرژمێرو زانیاری تەواو لە

بارەی کرێکاران و مەرجی ئیش پێکردنیانەوە پێشکەش بکا؛ بۆیە لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ دا هەڵوەشێنرایەوە.[٢١٠] ئەگەرچی « هەمیشە کرێکاران نارەزایی‌یان دەردەبڕی وهەندێ لە کۆمەڵەکانیان بەردەوام لە رۆژنامەکانی ناوخۆدا شکایەتیان دەکرد ..»، وەك سەرچاوەلێپرسراوەکان خۆیان، دانی پیا دەنێن.[٢١١] دەڵێین سەرەڕای ئەمانەیش مەسەلەی چاودێری کردنی هەل و مەرجی ئیش‌کردن بە تەواوی پشت گوێ خرا.

لەبەر ئەو هۆیەی دوایی و « بە هۆی ئەوەی کە لیژنەی هەمیشەیی ئینتدابی سەر بە کۆمەڵەی گەلان بایەخێکی زۆری بە مەسەلەی کرێکارانی عیراق دەدا » ولە ئەنجامی ئەوەیش‌دا کە هەندێك لایەنی سیاسی لە ژێر کارتێکردنی ئەم دوو هۆیەدا کەوتنە خۆ، رژێم ناچار بوو هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە مەسەلەی کرێکاران وردە وردە بگۆڕێ. ئەوە بوو، لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣١ دا نوێنەری « دلێم » کە « دکتۆر فایەق شاکر » بوو، پرۆژەیەکی پێشکەش پەرلەمان کرد تاوەکو بکرێتە بناغەی یاسایەکی سەربەخۆی کرێکاران لە وڵاتدا. پرۆژەی ناوبراو، بە نۆ خاڵی سەرەکی ی ئەم مەسەلانەی دیاری کردووەو رێ و شوێنی بۆ داناون.

١ ـ دیاری کردنی سەعاتی ئیش‌کردن.
٢ ـ کرێی رۆژانی جەژن و ئەو رۆژانە بدرێتە کرێکارە هەمیشەیی‌یەکان کە کارگەو دام و دەزگاکان بە رەسمی ی لەکار دەکەون.
٣ ـ کرێکاران لە زوڵم و ستەمی سەرمایەداران بپارێزرێن.
٤ ـ مافی کرێکاران لە کاتی نەخۆشی‌دا بچەسپێنرێ و بەتەنگ چارەسەر کردنیانەوە بن.
٥ ـ زامنی تەواوەتی ی ئەو کرێکارە هەمیشەیی‌یانە بکرێ کە لە ئیش دەردەکرێن.
٦ ـ گەر کرێکار لە کاتی ئیش کردن‌دا کەفتەکار بوو، چەردەیەك پارەی لە بریتی بدرێتێ.
٧ ـ ئەو کرێکارانەی ماوەیەکی زۆر لای کۆمپانیاکان ئیش دەکەن و پاشان توانای ئیش‌کردنیان نامێنی، مووچەی خانەنشینی‌یان بدرێتێ.
٨ ـ ماوە نەدرێ ئیش بە منداڵان بکرێ.
٩ ـ دەبێ کۆمپانیاکان لەو ئیشانەدا کە رۆڵەکانی عیراق تێیدا شارەزان، ئەوان دابمەزرێنن.[٢١٢]

کرێکاران و لایەنە سیاسی‌یەکانی وڵات بەپیری ئەم پرۆژەیەوە چوون و

خۆشحاڵی ی خۆیان دەربڕی و پاشان پەرلەمان بڕیاری لەسەردا و لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ۱۱ی کانوونی یەکەمدا، ڕایسپارد لایەحەیەکی یاسایی « لە بارەی مافی کرێکارانەوە » دابنرێ. دوای ئەوە لە ڕۆژی ۱۹ی ئایاری ۱۹۳۱ دا ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری دا لیژنەیەك بە سەرۆکایەتی وەزیری ناوخۆ « موزاحیم ئەلپاچەچی » و ئەندامێتی ی بەڕێوەبەری گشتی ی مەعاریف « ڕەشید ئەلخواجە » نوێنەری وەزارەتی مەعاریف و سەرۆکی دیوانی نووسینەوەی یاسا و نوێنەری وەزارەتی داد « نەسرەت ئەلفارسي » و دکتۆر « ب. ە. یکز » ی نوێنەری وەزارەتی تەندروستی ی لەگەڵ حاکمێکی بەریتانیایی دا بە سیفەتی ڕاوێژکاری یاسایی، پێك بهێنرێ بە مەرجێك « مەحموود ئەحمەد » ی سکرتێری شارەوانی یەکان ئیش و کاری سکرتاریەتی ئەو لیژنەیە ڕاپەڕێنێ کە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕێککەوتنامەو لایەحەکانی دەوڵەتان دروست بووەو پەیوەندی یان بەمەسەلەی کرێکارانەوە هەیەو ئاخۆ تا چ ڕادەیەك دەتوانرێ لە عیراقدا جێ بەجێ بکرێ. ئەنجومەنی وەزیران مافی ئەوەیشی دا بە لیژنەی ناوبرا کە یەکێك یان دوو کەس لە ئەندامانی بنێرێت سەر لە « بیرۆی کرێکانی دەوڵەتان » بدەن لە « ژنێف ».[٢١٣]

لیژنەکە لە ۳۰ لایەحەی یاسایی و ۳۹ ڕاسپاردەی کۆڵییەوە کە « بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان » بڕیاری لەسەر دابوون. بە هەموو توانایشی یەوە هەوڵی دا پەلپ و بیانووی وا بدۆزێتەوە تاوەکو یاسایەکی تایبەتی بۆ کرێکاران دەرنەکرێ یان ماوە نەدا ئەو لایەحە دەوڵەتی یانەی نووسراون لە عیراقدا جی جێ بکرێن. لەبەر ئەوە شتێکی سروشتی و چاوەڕوان کراو بوو کە لیژنەکە[٢١٤] بگاتە ئەو بۆ چوونەی کە « لە حاڵی حازردا، زۆر بەکەمی ی نەبێ... توانای جێ بەجێ کردنی » ناوەرۆکی ئەو لایەحەو ڕاسپاردانە لە عیراقدا نی یە.. سوووریش بوو لەسەر ئەوەی کە چەندین دەوڵەتی ئەندام لە ـ کۆمەڵی گەلان ـ دا بەشداریی هەموو ئەو ڕێککەوتنامانەی ـ بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان ـ نەبوون و تەنها لە چەند ڕێککەوتنامەیەکدا هاوبەشی یان کردووەو بەس.[٢١٥]

لەم کاتەدا « جەعفەر ئەلعەسکەری » کە وەزیری مفەوەزی عیراق بوو لە « لەندەن » گەیشتە « ژنێف » و پەیوەندی بە لێپرسراوانی ـ بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان ـ ە وەکرد. بیرۆی ناوبراویش ڕایسپارد کە لای کەم دەبێ عیراق بەم لایەحانەی خوارەوە قایل ببێ.

١ ـ یاسای دیاری کردنی سەعاتی ئیش کردن و ڕێکخستنی ئیشی منداڵ و ئافرەتان.

٢ ـ یاسای پارێزگاری کردنی تەندروستی کرێکاران.

٣ ـ یاسای ـ تعویض ـ ی کرێکاران، کە لە کاتی ئیشدا کارەساتی قەزاو قەدەریان لێ روو دەدا.
٤ ـ یاسای پێکەوە نانی نیقابەی کرێکاران و پێکهێنانی رێکخراوی ئەوتۆ لە ناکۆکی یەکان بکۆڵێتەوەو بەلایە کیاندا بخا.
٥ ـ یاسای ئیش پێ کردنی کرێکاران و پاراستنی مووچە.
٦ ـ یاسای هاندانی دروست کردنی کۆمەڵی کشت و کاڵی.

سەرەڕای ئەوەی‌کە وولات بە ئەندازەیەکی لە ڕادەبەدەر پێویستی بەم یاسایانە هەبوو، تاوەکو کاروباری ئیش کردن و کرێکارانیان پێ رێك بخا، کەچێ ئەو وەزیرە سوور بوو لەسەر ئەوەی: «عیراق لە حاڵی حازردا و بەر لەوەی بچێتە کۆمەڵی گەلانەوەو ببێتە ئەندامی لیژنەی کرێکارانی دەوڵەتان هیچ رێککەوتنامەیەك مۆر ناکا و بە پێویستی نازانێ » و « ئەو کاتەیشی چووە ناو کۆمەڵی گەلانەوە، هەر ئەوەندەی لەسەرە بە هەندێکیان قایل ببێ و هیچی تر ».

دیارە مەرامیشی هەر ئەوە بوو « ئەو کۆسپە لابچێ »[٢١٦] کە رێگای لە عیراق گرتبوو بچێتە کۆمەڵی گەلانەوە. لەبەر ئەوە شتێکی سەیر نەبوو کە « جەعفەر ئەلعەسکەری » نەیتوانی چیتر لە « ژنێف » چاوەڕوان بکا، تاوەکو ئاگاداری « پێشنیازەکانی بیرۆی کرێکاران » ببێ، ئەوە بوو بە هۆی نزم بوونەوەی نرخی « پاوەن » ە وە بە پەلە گەڕایەوە بۆ « لەندەن »[٢١٧] بەلام داوەتی سەرۆکی « بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان » ی کرد، سەر لە عیراق بدا، بەتایبەتی چونکە بیرۆی ناوبراو خۆی نەدەکرد بە خاوەنی مەسەلەی کرێکارانی عیراق و بە پیریەوە نەدەچوو.

بەو جۆرە دانانی یاسای کارو کرێکاران هەر لە ناو چوار دیواری ئەنجومەن و وەزارەتەکاندا، لە نێوان رۆتین و دەستاودەست پێکردندا دەخولایەوە، بێ ئەوەی بگاتە ئەنجامێکی هەست پێکراو. ئەمە لە کاتێکدا کە حکوومەت گفتی دابوو ساڵی ١٩٣٢ لە دانانی یاسای کرێکاران ببێتەوە.[٢١٨]. بەلام هەنگاوی هەرە گرنگی حکوومەت لەگەڵ سەربەخۆیی وولاتدا، لەم بارەیەوە ئەوە بوو دوو ماددەی خستە ناو « یاسای بەڕێوەبەردنی شارەوانی یەکان » ە وە کە ساڵی ١٩٣١ دەری کرد. ئەم دوو ماددەیەیش پەیوەندی یان بە کرێکاران و سنعاتکارانەوە هەبوو:

« ماددەی ٥٥ ـ وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە بە پێی ئەم ماددەیە رێ و شوێن بۆ چاودێری کردن و پشکنینی هەل و مەرجی ئیش کردن و خۆش گوزەرانی ی کرێکاران لە رووی کۆمەلایەتی یەوە دابنێ...»

« ماددەی ٥٨ ـ چۆنیەتی پێکهێنانی نیقابەی پیشەوەران و کاسبکاران و سنعاتکاران ـ دیارە کرێکاران نا. ك. م ـ ، بە ستراوە بە یاسایەکی سەربەخۆوە.»[٢١٩]

بێ گومان ناوەڕۆکی ئەم دوو ماددەیە هیچی لە واقیعی ژیانی نالەباری کرێکاران نەگۆڕی و هەر دەبوو ئەم هەڵوێستە سەلبی یەی حکوومەت بەرامبەر بە دانانی یاسایەکی تایبەت بە کرێکارانەوە ئەوەندەی تر کرێکاران بورووژێنێ. ئەمەیش بە روونیی لە ناوەڕۆکی ئەو یاددا شتانەدا دەردەکەوێ کە کۆمەڵەی کرێکاران و پیشەوەران لە کۆتایی ساڵانی بیستدا، ئاراستەی لێپرسراوانیان کردووە. لەو یادداشتەدا کە « محەممەد ساڵح ئەلقەزاز » بە ناوی « کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیك » ەوە، پێشکەش بە ئەنجومەنی وەزیران و پەرلەمان و چەند وەزارەتێکی کردووە، دەڵێ:

«.. کۆمەڵانی کرێکاران و سنعاتکاران وەڕس بوون ئەوەندەیان داوا لە حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عیراق کرد یاسایەك دابنێ و بەرژەوەندی کرێکارانی عیراق لە چنگ تۆخیانی کۆمپانیاکان و سەرمایەداران بپارێزێ.. ئەوە ویژدان نی یە حکوومەت کۆمپانیاکان بپارێزێ و دەستبەرداری کرێکاران ببێ بەو چەشنە بمێننەوە، بێ ئەوەی یاسایەك هەبێ لە زوڵم و ستەم بیان پارێزێ..»[٢٢٠]

ئا بەو جۆرە کرێکارە عیراقی یەکان بە درێژایی ساڵانی داگیرکردن و ئینتیدابی بەریتانی، لە یاسای کرێکاران بێبەش کران، بە مەیش ئەوەندەی تر گیروگفتی کارو کرێکاران ئاڵۆز بوو، بە ڕادەیەك لەو قۆناغەدا بووە داینەمۆی بزووتنەوەی تێکرای کرێکاران لە وڵاتدا.



## سەرچاوە و پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

* مەبەست پەرسەندنی بزووتنەوەی کرێکارانە لە ناوچەرکەی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان و تیژ بوونی ناکۆکی نێوان چینی بۆرژواو پرولیتاریای ئەو وڵاتانەیە کە بە هۆی لەدەست چوونی وڵاتانی ژێر دەستەوە دوو چاری تەنگو چەڵەمەی ئابووری دەبن. ـ وەرگێڕ ـ

١ ـ مەبەستمان لە سەرکەوتنی یەکەم شۆڕشی سۆشیالیستی یە لە رووسیادا، هەروەها شۆڕشەکانی چینی بۆرژوا کە هەندێکیان بوونە هۆی دامەزراندنی سیستەمی نەتەوەیی « وەکو لە تورکیادا

رووی‌دا ، و هیچ نەبێ لە سەرەتادا هەڵوێستی دژ بە ئیمپریالیزمی جیهانی و ئیمپریالیزمی بەریتانیلییان هەبوو.

٢ - بڕوانە: A. L. Haldane, the Insurrection Mesopotamia 1920, London, 1922, P. 108.

٣ - المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/ ١٠ موضوع الملفة: السكك ، ١٩٢٩ - ١٩٣١ ، « ئەو ڕاپۆرتە تایبەتی‌یەکە میری بۆ ئەو مەبەستە ئامادەی کردووە».

٤ - المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/ ١٠ موضوع الملفة السكك ١٩٢٦.

٥ - هەر ئەو هۆیەیش پاڵی پێوە نان، ڕێگای هەولێر - ڕەواندوز - رایات، رابکێشن. لەمەڕ ئەو وتووێژانەیش کە سەبارەت بە راکێشانی ڕێگای ئاسنی نێوان مووسڵو بەغدا کرا و دمیانویست لەڕێگای کفری - کەرکووک - هەولێرەوە ئەنجامی بدەن، بڕوانە:

A. T. Wilson, Mesopotamia 1917 — 1920. P. 19.

٦ - ئەو ڕۆژگارە ئازەربایجانی سەروو بەدەست دوژمنانی شۆڕشی ئەکتۆبەرەوە بوو. جا بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان خۆیان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بکەن لە شکرێکی گەورەیان بە سەرکردایەتی ژەنەراڵ « دنستر فیل » ڕەوانەی ئەو مەڵبەندە کرد.

٧ - بڕوانە: G. Napier. the road from Baghdad to Baku ( the Geographical Journal) London. vol. L III, No I. January 1919

٨ - المركز الوطني للوثائق. File No. 45/36. Railway — 1924.

٩ - هەر ئەو سەرچاوەیە.

١٠ - ئەو زانیاری‌یە بنچینەیی‌یانەی لەمەڕ ڕێگای ئاسن نووسراونەتەوە، لە راپۆرتەکەی ژەنەراڵ « هامند » و ئەو راپۆرتە تایبەتی‌یەوە، وەرگیروان کە لیژنەیەکی سەر بە میری ئامادەی کردبوو. «بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي. رقم الملفة. ص/ ١٠ موضوع الملفة: السكك: ١٩٢٦؛ الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي. رقم الملفة ص/ ١٠ موضوع الملفة: السكك ١٩٢٩ - ١٩٣١.

١١ - بڕوانە: بەشی دووەمی ئەم کتێبە.
المركز الوطني للوثائق. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/ ١٠ موضوع الملفة: السكك.

١٢ - ١٩٢٦ « راپۆرتەکەی ژەنەراڵ هامند ».

١٣ - Iraq Railways. Administration Report for the year 1924 — 1925 Baghdad 1925. P. 16.

١٤ - (Report by tile Britannea Majesty's to the council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1926) London, 1927, P. 29.

١٥ - (Special report by His Majesty's, Government in th United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the progress of Iraq during the period 1920 - 1931) London. 1931. P. 246.

١٦ - (The Iraqi Directovy, general and Commercial Directory of Iraq 1936). Baghdad. 1936. P. 268.

١٧ - (Basrah port. Administration Report of the finacial year 1925 — 1926) Baghdad Administration Report of the finan-cial year 1926 — 1928) Baghdad 1927. P. 37.

١٨ - Report on the administration of Iraq for the year 1926.) P. 29. (Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern irel and to the Council of the League of Nations on the administration ofIraq for the year 1913 London 1931. P.P. 64 .

١٩ ـ لە شوێنێکی تردا باسی ئەوە دەکەین ئەم مەسەلەیە تا چەند کاری لە بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق کردووە.

٢٠ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بروانە: کتێبەکەی ئا . م. هاملتن کە ئەندازیارو سەرپەرشتی کەری ئەو رێگایە بوو. A. M. Hamilton, Road through Kurdistan. London 1937.

٢١ ـ بروانە رۆژنامەی: «نداء الشعب» بغداد. ٤ تشرين الثاني ١٩٣٠.

٢٢ ـ بروانە: Report on the administration of Iraq for the year 1931 P. 66.

٢٣ ـ Special Report of the progress of Iraq during the Period 1920 — 1931. P.139.

٢٤ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1926. PP. 105 — 106.

٢٥ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٣/٢. موضوع الملفة: شركة النفط التركية ١٩٢٦.

Report on the administration of Iraq for the year 1926. B. shwadran, The Middle East, Oil and the Great Powers, New york 1955. P. 78. The Iraqi Directory, 1936. P. 522.

٢٦ ـ E. A. Kinch, Socil effects of the oil industry in Iraq. P. 194. The Iraqi Directory 1936. P. 522.

٢٧ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1926 P. 29.

هەروەها. « الدكتور محمد سلمان حسن » سەرچاوەی پێشوو. ل ٢٩٠.

٢٨ ـ دەستەی بەڕێوەبەری ئەم کۆمپانیانە بریتی بوون لە « حەمدی ئەلپاچەچی » و « نەجیب ئەلئەسفەر » و « سابت عەبدولنوور » بروانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٣/٢. موضوع الملفة: شركة النفط التركية ١٩٢٢.

٢٩ ـ هەر ئەو فایلەی پێشوو.

٣٠ ـ ئەمە جگە لەو سەرمایەدارانەی زوو کە پەیوەندییان بەکۆمپانیابیانییەکانەوە هەبوو.

٣١ ـ نووسەری وا هەیە ساڵی ١٩٢٩ کە یاسای پشتگیری کردنی پیشەسازی نیشتمانی ی تێدا دەرچوو، بەمێژووی نەشو نماکردنی پیشەسازیی نوێی عیراق دادەنێ. بەنموونە: بروانە: « الدكتور نوري خليل البرازي، الصناعة ومشاريع التصنيع في العراق. القاهرة. ١٩٦٧ » ل ٢٨ ـ ٢٩.

٣٢ ـ بۆ زیاتر شارەزابوونی ئەم کارگانە بروانە:

Report on the administration of Iraq for the year 1926. P. 29

Report on the administrarion of Iraq for the year 1931.

P. 69. K. M. Langley, op. cit., PP. 37, 45 — 46. 57 — 59.

«العراق» ٣٠ حزيران و ١٠ تموز ١٩٢٨؛ « الاستقلال »، ١٧ تشرين الثاني ١٩٣١، « الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦ » بغداد ١٩٣٦ ص ٧٩٠ ـ ٧٩٨. سعيد عبود السامرائي. الانماء الصناعي وقواعده الاساسية في العراق. بغداد ١٩٦٠ ل: ٢٦. ٣٢ ـ ٣٣، ٤٧.

٣٣ ـ سەر ژمێرێکی وردی کرێکارانی کوورەخشتمان لا نییە کە ژمارەی راستەقینەیانمان لەو قۆناغەدا بۆ دەست نیشان بکا. بەڵام دەتوانین بە بەراورد کردن لەتەک ساڵانی دوایی‌دا پێوانەیەکیان بۆ دابنێین. لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی دا ژمارەی کارگەی خشت دروست کردن بە تەنها لەناو بەغدا دا ١١ « کارگە بوون و ژمارەی کرێکارەکانیان سێ هەزار کەس زیاتر بوو. بروانە: « الدكتور محمد سلمان حسن » سەرچاوەی پێشوو. ل: ٣٠٥.

٣٤ ـ لەبەر ئەوەی جموجوڵی سیاسی و فیکری کەوتە ناو هەموو ریزەکانی گەلی عیراقەوە، لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ یەک لە دوای یەک چاپخانەی نوێ دەهێنرایە وولاتەوە. بۆیە ژمارەیان بە خێرایی زیادی کرد. هەندێکیان بۆ یەکەمجار لە شاری « کەرکووک » و « سلەیمانی » و « عەممارە » و هی تریشدا دامەزرا. بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بروانە: « شهاب احمد الحميد. تاريخ الطباعة في العراق، مطابع القطاع الخاص: ١٨٣٠ ـ ١٩٧٥. الجزء الاول، بغداد. ١٩٧٦؛ « العراق » ٢ آب ١٩٢٢.

٣٥ ـ « العراق » ٢٨ تموز ١٩٢٢.
٣٦ ـ بڕوانه: « الدكتور محمد سلمان حسن » سەرچاوەی پێشوو. ل ٢٨٩.
٣٧ ـ ڕۆژنامەی « الدليل » بغداد ٢٦ مايس ١٩٢٩.
٣٨ ـ Special Report. P. 247.
٣٩ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٣/٥. موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم. (٧/١/٣٢ ـ ١٧/١٢/١٩٣٢).
٤٠ ـ بڕوانه: Ghassan R. Atiyyah, Iraq 1908 — 1921. Political Study, Beirut, 1973. P.228.
٤١ ـ Iraq Railways. administration Report for the year 1924 — 1925. P. 16. (League of Nation Frontier bitween Turkeyand Iraq. P.5. Report on the administration of iraq for the year 1926. P. 29

٤٢ ـ G. Moriss, The Hashemite Kings, London 1959 P. 57
٤٣ ـ لە سایەی پەیوەندی بەرهەمهێنانی نوێ ی سەرمایەداری‌دا، کاری پیشەیی ڕووەو قۆناغێکی بالاتر کەشەدەکا پێ دەوترێ بەرهەمی مانیفاکتۆرەیی. ئەم چەشنە بەرهەمهێنانە لەجاران زیاتر پشت بە دابەش‌کردنی کار و کاری کرێ گرتە دەبەستێ‌و خۆی لە خۆیدا هەنگاوێکی گرنگە ڕووەو بەرهەمهێنانی پیشەسازیی نوێ.
٤٤ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانه: « الدكتور محمد سلمان حسن » سەرچاوەی پێشو ل ٢٨٢ ـ ٢٨٣ هەروەها: Special Report P. 247
٤٥ ـ بەنموونە بڕوانه: « مفصل جغرافية العراق ـ طه الهاشمي ـ بغداد ١٩٣٩ » ل ٤٠٢.
٤٦ ـ لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم دا والی مووسڵ ٨٠ تۆپی لە ژێر دەستدا بوو، زۆربەیان لە ڕەواندوز دروست کرابوون. ئێستایش نموونەی ئەو تۆپانە لە مۆزەخانەی سوپایی بەغدادا دانراون‌و درێژی یەکێکیان ٣ مەترو ٢٣ سانتیمەترە.
٤٧ ـ « انور المائي. الاكراد في بهدينان. موسل ١٩٦٠ » ل ٣
٤٨ ـ Mark Sykes The calipha Last heritage, A short hstouy of the Turkish Empire, London 1915. P. 344.
C. G. Edmonds. Kurds, Turks and Arabs, Politics, travel and research in north Eastren Iraq 1919 — 1925. London, 1957. P. 80.
٤٩ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانه: « الدكتور محمد سلمان حسن » سەرچاوەی پێشوو ل. ٣٤٣ ـ ٣٤٧
K. M. Langely, op. cit., P. 23.
٥٠ ـ K. M. Langely, op.
٥١ ـ دەقی ئەرزوحاڵەکە لە ڕۆژنامەی «العالم العربي» ی ڕۆژی ٩ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ دا بڵاو کراوەتەوە.
٥٢ ـ بڕوانه: محاضر مجلس النواب لسنة ٩٢٨ واعتيادي بغداد ١٩٢٨ ل: ١٨٩ ـ ١٩١.
٥٣ ـ لەو دەقەدا کە دکتۆر وەری گرتووە، هەڵەیەکی زمانەوانی تێدایە، ڕاستی کردووەتەوە.
٥٤ ـ « العالم العربي » ٩ تشرين الثاني ١٩٣٢.
٥٥ ـ بڕوانه: المركز الوطني للوثائق: الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي: رقم الملفة ص/٥/٣ موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم (٧/١/٩٣٢ ـ ١٧/١٢/١٩٣٢) تاييد مطاليب عمال احذية الموصل. « العالم العربي » ٢٥ تشرين الثاني ١٩٣٢.
٥٦ ـ وەك شتومەکی چنراو. بڕوانه: K. M. Langely, OP. cit., P.23.
٥٧ ـ بڕوانه: « جريدة: نداء الشعب » بغداد. ١٥ كانون الاول ١٩٣٠.
٥٨ ـ « جريدة نداء الشعب » ٢٩ كانون الاول ١٩٣٠.
٥٩ ـ لە ڕۆژنامەی « العراق » ی ڕۆژی ٩ مارتی ١٩٣١ ەوە، وەرگیراوە.

٦٠ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: د/١٤ موضوع الملفة: الاحزاب السياسية.

٦١ ـ بروانه: « العالم العربي » ١٧ شباط ١٩٢٧. جريدة « الرصافة » بغداد ٢ حزيران ١٩٣٠؛ « نداء الشعب » ٧ تشرين الثاني و ١٥ و ٢٢ كانون الاول ١٩٣٠ و «٥» كانون الثاني ١٩٣١؛ « الاستقلال » ١٧ تشرين الثاني ١٩٣١. ئەمانەو چەند رۆژنامەو گۆڤارێكی تری ئەو رۆژگارە

٦٢ ـ دەقی ئـەو سێ مـاددەیـە لە « العـالم العـربي » ی رۆژی ٢ ی تشـرینی یـەکـەمی ١٩٢٩ دا بڵاوكراونەتەوە.

٦٣ ـ بروانه: « هاشم جواد. مقدمة في كيان العراق الاجتماعي بغداد. ١٩٤٦ » ل ٦٧.

٦٤ ـ هەر ئەو سەرچاوە ل ٧٠.

٦٥ ـ لە شوێنێكی تری ئەم بەشەدا بە درێژی لەم باسە دەدوێین.

٦٦ ـ بروانه: (Report on administration of Iraq for the year 1928.) P. 29.

٦٧ ـ بروانه: « العالم العربي » ٢٨ تشرين الاول ١٩٣٢.

٦٨ ـ المركز الوطني للوثائق. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم (١٩٣٢/١/٧ ـ ١٩٣٢/١٢/١٧)، Repot on the administration of Iraq for year 1931. P. 28.

٦٩ ـ بروانه: « رزوق شماس. مشكلة العمال في العالم وفي العراق. بغداد ١٩٣٦. » ل ١٩٤.

٧٠ ـ روپیەیەك دەكاتە ٧٥ فلوس.

٧١ ـ Report on the adminstration of Iraq for the year 1928. P. 29.

٧٢ ـ المركز الوطني للوثائق. File No. 164/24. Labour 1919

٧٣ ـ Report on the adminstration of Iraq for the year 1928 P. 29.

٧٤ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٣٥، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم (١٩٣٢/١/٧ ـ ١٧ ـ ١٢ ـ ٩٣٢).

٧٥ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1928 P. 29.

٧٦ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1931 P. 865.

٧٧ ـ « رزوق شماس. مشكلة العمال في العالم وفي العراق. » ل ١٩٤.

٧٨ ـ Special Repout. P. 247.

٧٩ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم. (١٩٣٢/١/٧ ـ ٩٣٢/١٢/١٧).

٨٠ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بروانه: المركز الوطني للوثائق. هەر ئەو فایلەی پێشوو. هەروەها. « العراق » ٣ تموز ١٩٢٢. هەروەها. Report on the administration. of Iraq for the year 1928., P. 29. Special Report PP. 246 — 247.

٨١ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق. File No. 19/11. 1921

٨٢ ـ « نداء الشعب » ٤ تشرين الثاني ١٩٣٠.

٨٣ ـ « العراق » ٣ آذار ١٩٣١.

(بە نموونە: لە حوزەیرانی ١٩٣١ دا، پتر لە دوو هەزار بەند لە مووسڵ لە دەرەوەی بەندیخانە دا بە رۆژانەی ٤ ـ ٦ ئانە ئیشیان پێ دەكرا. هەر لەو ماوەیەدا ژمارەی ئەو بەندانەی لە « حیللە » بەخۆڕایی ئیشیان پێ دەكردن گەیشتە ٣٢٤٥ و لە « كووت » گەیشتە ١٠٨٧ و لە « بەغدا » ١٠٧٠ و لە « باقووبە » ٦٠٥ و لە « كەركووك » ٢٤٠ و لە « عەمارە » ٣٥ كەس) بروانه: « صدىٰ العهد: ١٧ تموز ١٩٣١ ».

٨٤ ـ « نداء الشعب »، ٤ تشرين الثاني ١٩٣٠. « العراق » ٣ آذار ١٩٣١.

٨٥ ـ Basrah Times. 29 V. 1921.

٨٦ ـ « العراق » ٣٠ آذار ١٩٣١.
٨٧ ـ « نداء الشعب »، ٤ تشرين الثاني ١٩٣٠. ( بەرمڵا کردنی هەندێك لەو بەندانە هیچ لە واقیع ناگۆڕێ. »
٨٨ ـ بۆ خۆشبەختی ئەو بەڕێوەبەرە، لە سەرانسەری شارەکانی عیراق دا بەندیکی زۆر هەبوو، لە سەرەتای سالی ١٩٢٤ دا بە تەنها لەبەندیخانەی « بەغدا » دا ٨٠٠ کەس زیاتری تێدا بوو. ( بڕوانە: « العراق »، ٧ شباط ١٩٢٤ ).
٨٩ ـ دەقی راپۆرتەکە لە: المركز الوطني للوثائق. File No. 19/11, 1931.
٩٠ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. هەر ئەو فایلەی پێشوو.
٩١ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. هەر ئەو فایلەی پێشوو. هەروەها. « العراق » ٢١
٩٢ ـ Basrah Times. 29 V.1921.
٩٣ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. File No.19/11, 1923. File No. 57/19 — 9 — 1. 1921.
٩٤ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. File No. 57/19 — 9 — 1, 1923.
٩٥ ـ بڕوانە: « العراق تشرين الاول ١٩٢٢.
٩٦ ـ بڕوانە: « الدكتور محمد سلمان حسن » سەرچاوەی پێشوو ل ٣٠٤.
٩٧ ـ « العراق » ٢١ حزيران ١٩٢٢.
٩٨ ـ « العالم العربي » ١٣ تشرين الثاني ١٩٣٠.
٩٩ ـ ئەو ژمارانە، لە سەرژمێری رەسمیی بەریتانیا وەرگیراون. بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: Report on the administration of Iraq for the year 1926. PP. 29 — 30. Special Report. PP. 245 — 246.
١٠٠ ـ جريدة « اتحاد الشعب » بغداد ١٣ آيار ١٩٦٠. « العالم العربي » ١٢ كانون الثاني ١٩٣٦ E. A. Kinch. OP. cit. P. 197.
١٠١ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٣/٢، موضوع الملفة: شركة النفط العراقية ١٩٢٧.
١٠٢ ـ نوێنەری شاری « دیوانیە » ـ فەریق ئەلموزهیر ـ بوو.
١٠٣ ـ « الدولة العراقية. محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية السادسة. الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٣٥ » بغداد. ١٩٣٦. ل ٤٤٠.
١٠٤ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال وماينعلق بهم، تقرير وزارة الداخلية عن العمل والعمال في العراق سنة ١٩٣١. Report on the admi Nistion of Iraq for the year 1926. P. 34.
١٠٥ ـ لەو سەردەمەدا، شارەزاترین کرێکار هێشتا نەدەگەیشتە پلەی بچووکترین فەرمانبەری مەدەنی لە کۆمەڵگای عیراقدا.
١٠٦ ـ « نداء العمال » العدد الاول. ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠. ل ١٤.
١٠٧ ـ بڕوانە: A. M. Hamilton. op. cit., P. 61.
١٠٨ ـ Report on the administrati on of Iraq for the year 1926. PP. 31 — 32.
١٠٩ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣. موضوع الملفة: العمال وماينعلق بهم (١٧/١ ـ ١٧/١٢/٩٣٢).
١١٠ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1926 PP. 29 — 30.
١١١ ـ « العراق » ٤ آذار ١٩٣١.
١١٢ ـ بڕوانە: Iraq Railways, Administration Report for the year 1924 — 1925. P. 16.
١١٣ ـ بڕوانە: « جريدة ـ الاهالي » بغداد. كانوون الثاني ١٩٣٢.

١١٤ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣. موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم (١/٧ ـ ١٧/١٢/١٩٣٢).

١١٥ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. ، هەر ئەو فايلەی پێشوو ، هەروەها ، العالم العربي ، ٣ ايلول ١٩٣٢.

١١٦ ـ ، العالم العربي ، تشرين الثاني ١٩٣٠.

١١٧ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة. ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم (١/٧ ـ ١٧/١٢/١٩٣٢).

١١٨ ـ المركز الوطني للوثائق. ، هەر ئەو فايلەی پێشوو ، هەروەها Special Report P. 245.

١١٩ ـ A. M. Hamilton. OP. cit., P. 61.

١٢٠ ـ بڕوانە ، گەشتێك لە كوردستانا ـ عەلائەددين سەججادی. بەغدا ١٩٥٦. ل ٨٢ ،.

١٢١ ـ ، العراق ، ٦ كانون الاول ١٩٢٧.

١٢٢ ـ بۆ نموونە بڕوانە: ، العالم العربي ، ١٣ ايلول و ٢٥ تشرين الاول و ٦ تشرين الثاني ١٩٣٢.

١٢٣ ـ لەو كتێبەیدا كە ناوی: (Road through Kurdistan)ی لێناوە.

١٢٤ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية File No. 45/11. Railways 1922 — 925

١٢٥ ـ هەرئەوفايلەی سەرەوە.

١٢٦ ـ ، جريدة ـ خەبات ، بغداد ٣ تشرين الاول ١٩٦٠. ، نداء الشعب ، ١٣ تشرين الثاني ١٩٣٠.

١٢٧ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: File No 164/32, office of civil Cammissoner — Baghdad, Labour, 1918 — 1920. (Report on the administration for the year 1926) PP. 31 — 32.

١٢٨ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە ، المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي. رقم الملفة ص/٥/٣، موضوع الملفة العمال ومايتعلق بهم (١/٧ ـ ١٧/١٢/٩٣٢). Report on the administration of Iraq for the year 1926 — PP. 31 — 32.

١٢٩ ـ هەر ئەو سەرچاوە.

١٣٠ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم. (٧/١٢/٩٣٢).

١٣١ ـ لە شوێنێكی تری ئەم بەشەدا دێینەوە سەر ئەم باسە.

١٣٢ ـ بڕوانە ، العراق ، ١٩ كانون الثاني ١٩٣١.

١٣٣ ـ المركز الوطني للوثائق. File No 164/37. Labour. 1920 — 1921.

١٣٤ ـ ، العراق ، ٢٥ آيار ١٩٢٧.

١٣٥ ـ ڕۆژنامەكانی ناوخۆ ئەو بڕیارەی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسنیان بە كارەساتێك لەقەڵەم دا. بڕوانە ، العراق ، ٢٥ آيار ١٩٢٧.

١٣٦ ـ دوایی دێینەوە سەر ئەم بابەتە.

١٣٧ ـ جريدة ، الاخبار ، بغداد، ٢٠ تشرين الثاني ١٩٣١؛ ، الاستقلال ، ٢٠ تشرين الثاني ١٩٣١.

١٣٨ ـ ، العراق ، ٥ تشرين الثاني ١٩٣١.

١٣٩ ـ ، العالم العربي ، ١٦ حزيران و ٧ تموز ١٩٣٢ و ١١ كانون الثاني ١٩٣٣؛ ، الاخاء الوطني ، ٢٧ حزيران ١٩٣٢.

١٤٠ ـ بڕوانە ، الاخاء الوطني ، ٤ تموز ١٩٣٢.

١٤١ ـ بە نموونە: بڕوانە ، العراق ، ١٠ و ٢٧ آب ١٩٣١.

١٤٢ ـ بە نموونە: بڕوانە ، العالم العربي ، ١٩ شباط ١٩٣٢ ، هەر لەو ژمارەیەدا هەواڵێكی تێدایە باسی ئەوە دەكا كرێكارێكی عیراقی لە بیروت بووە بەژێر بەفرەوەو مردووە ،.

١٤٣ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ١/١٧ ـ ١٧/١٢/٩٣٢).

١٤٤ ـ « العراق » ٢٢ آيار ١٩٢٨.
١٤٥ ـ هەر ئەو سەرچاوە.
١٤٦ ـ بەندی پێنجەمی ڕێککەوتنامەکەی ساڵی ١٩٢٥ کە لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتدا مۆر کـرا دەڵێ: پێویستە « تا دەتوانرێ » کرێکاری عیراقی بەکار بهێنرێن و مەشقیان پێ بکرێ. بەڵام کۆمپانیاکان هەوڵیان‌دا، تا بۆیان بکرێ کەمتر کرێکاری عیراقی دابمەزرێنن. لەبەر ئەوە عیراقی‌یەکان ئەو گلەو پەیمانەی کۆمپانیاکان باسیان دەکرد بە مەرەکەبی سەر کاغەزیان دادەنا، وەك پەیامنێری ڕۆژنامەی « العراق » لە کەرکووك نووسیویە. بڕوانە: « العراق » ٢٧ نیسان ١٩٢٨.
١٤٧ ـ مەبەستمان لەوە نی‌یە ئەوانە بەکرێ گیراوی کۆمپانیاکان بوون، بەڵکو دەتوانین بڵێین چەشنە پەیوەندی‌یەکی دەروونی‌یان لەگەڵ پەیدا کردبوون. کۆمپانیاکانی نەوت، ئەو جۆرە کرێکارانەی هەڵدەبژارد کەخۆشگوزەرانی‌یان تاڕادەیەك بە بوونی ئەوانە بەسترابوو؛ ئەوەندەی دڵسۆزی کۆمپانیاکان بوون، ئەوەندە بەتەنگ مەسەلەی کرێکارانەوە نەدەهاتن.
١٤٨ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦، تقرير هامند.
١٤٩ ـ « نداء الشعب » كانون الاول ١٩٣٠.
١٥٠ ـ کەم ڕێ دەکەوت ڕژێم سەرنجی کۆمپانیا بیانی‌یەکان بەلای ئەم حەقیقەتەدا ڕابکێشێ، تەنانەت ئەگەر لەژێر زەبری باروودۆخێکی دیاری کراودا هەنگاوی لەو بابەتەی بهاویشتایە، کەسیـك گوێی لێ نەدەگرت. « بڕوانە: العالم العربي، ٦ آب ١٩٣٠ ».
١٥١ ـ لە ناوەڕاستی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٣٠ دا، « کۆمەڵەی سنعەتکاران » داوایەکی لەم ڕووەوە پێشکەش بە وەزارەتی مەعاریف کرد.
١٥٢ ـ بە نموونە: بڕوانە: « العراق » ٧ و ١٩ كانوون الثاني ١٩٢٨؛ « العالم العربي »، ٢٠ حزيران و ٥ تموز ١٩٣٠ و ٢٤ شباط ١٩٣٣؛ « الاستقلال » ١٤ آيار ١٩٣١؛ ی. لیفین. العراق « بە زمانی ڕووسی » مۆسکۆ ١٩٣٧. ل ٩٣.
١٥٣ ـ لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا بەڵگەیەکی زۆر بەدەستـەوەن ئەم حـەقیقەتـە دەر دەبڕن. بەنموونە بڕوانە: « العراق » ٧ و ١٩ كانون الثاني ١٩٢٨. « الرصافة » بغداد ٢ حزيران ١٩٣٠. جريدة « العامل » بغداد، ٨ ايلول ١٩٣٠. ص ١٠ ـ ١٣، « نداء الشعب » ٧ كانون الثاني ١٩٣١. هەروەها بڕوانە: « الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦ » ص ٨٠٥.
١٥٤ ـ بڕوانە: « الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦ » ص ٧٩١.

K. M. Langely, op, p.31.

١٥٥ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق.
File No 164/4, progress Reports from the Controller of Labour 1919 — 1920.
١٥٦ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال وما يتعلق بهم (١/٧ ـ ١٢/٩٣٢) Report on the administration of Iraq for the year 1931 P. 67.
١٥٧ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: د. كمال مظهر احمد، من تاريخ تكون الطبقة العاملة العراقية. جريدة « التآخي » بغداد ١ آيار ١٩٧١.
١٥٨ ـ ئەنجامی ئەوەی ئینگلیز هانی کرێکاری بیانی دەدا بێنە عیراقەوە، چەندین نوما یندەی کاری دەوڵەتان ڕوویان کردە میسۆپۆتامیا و لقی خۆیان تێدا دەکردەوەو جموجوڵ و چالاکی یان نواند. بڕوانە: (المركز الوطني للوثائق. File No 164/20, Labour, the Bombay — Panjab Labour Agency. 1919 — 1920. File No 164/30. Labour. Maltes labour for Mesopotamia 1919.

١٥٩ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/ ١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦، تقرير الجنرال ق.د. هامند.

١٦٠ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق: File No 164/4, progress Reports from the Controller of Labour 1919 — 1920, PP. 307 — 308, 336.

١٦١ ـ « العراق » ٢٢ آذار ١٩٢٧ « هەروەها بروانه به راويزى ژماره ـ ١٥٠ ».

١٦٢ ـ زۆربەى ئەو ئەرمەنىيانە، ئەوانە بوون لە ساڵى ١٩١٥ دا لە جەنگى كوشتن و قەلاچۆ كردن لە توركيا، پەنايان وەبەر عيراق هێناو پاشان جنسيەتنامەى عيراقىيان وەرگرت.

١٦٣ ـ بروانە: « العراق » ٢٢ آيار ١٩٢٨.

١٦٤ ـ بۆ ئەو نيسبەتانە پشت بەو ژمارانە بەستراوە كـە لە مەڵبـەندى نيشتمـانى بەڵگـەنامـەكان نووسراون. بروانە « المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/ ١٠ موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦. تقرير الجنرال. ف.د. هامند » « العراق » ٢٨ تشرين الثاني ١٩٢٨
Report on the administration of Iraq for the year 1928. PP. 105 — 108. Special Report PP. 168, 176
(the Iraqi Directory, 1936.) PP. 534 — 535.

١٦٥ ـ « العراق » ٢٠ تموز ١٩٢٨.

١٦٦ ـ بروانە: « العراق » ٢ تشرين الاول ١٩٢٨.

١٦٧ ـ بروانە: « العراق » ٤ تشرين الاول ١٩٢٨.

١٦٨ ـ بەنموونە بروانە: بڵاوكراوەى رەسمىى مانگى ئەيلوول لە رۆژنامەى « العراق » ى رۆژى ٢٢ى تشرين دووەمى ساڵى ١٩٢٨ دا.

١٦٩ ـ بۆ زياتر تێ گەيشتن بروانە: Report on the administration of Iraq for the year 1928. PP. 31 — 32.
المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي رقم الملفة: ص/ ١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٤ ـ ١٩٢٨، رقم الملفة ص/ ١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦، تقرير الجنرال ف.د. هامند؛ « العراق » ٢٧ تشرين الثاني ١٩٢٨؛ « الاخبار » ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣١. لە بەشى داهاتوودا دێينەوە سەر ئەم باسە.

١٧٠ ـ بروانە « العالم العربي » ٨ كانون الثاني ١٩٣٣.

١٧١ ـ بروانە بەياننامەكەى « كۆمەڵەى سنعاتكاران » كە لە « تطور الحركة النقابية في العراق» ى هاشم علي محسن. بغداد ١٩٦٦ ص ٣٣ و ١٠٥ » دا بڵاو كراوەتەوە.

١٧٢ ـ بروانە: المركز الوطني للوثائق. File No 164/34, Labour, 1920 — 1921

١٧٣ ـ لە بەشى داهاتوودا كەمێك بە درێژى لەم بابەتە دەدوێين.

١٧٤ ـ تەنها جارێك نەبێ كە بەڕێوەبەرايەتى رێگاى ئاسن ٢٥٪ ى مووچەى هێندوسەكانى بڕى و بە گورجى پاشگەزيش بووەوە. (بروانە: « العالم العربي » ايلول ١٩٣٢).

١٧٥ ـ بروانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة. ص/ ١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦. تقرير الجنرال ف.د. هامند.

١٧٦ ـ بەنموونە بروانە: « العراق » ٢٨ تموز ١٩٢٨؛ « نداء الشعب » ١٣ تشرين الثاني ١٩٣٠، « الاخاء الوطني » ٢٦ آيار ١٩٣٢.

١٧٧ ـ چاوپێكەوتنێك لەگەڵ « محەممەد ساڵح قەزاز » دا، رۆژى ١/٨/٩٧٩.

١٧٨ ـ بروانە: « العراق » ٢٢ آيار ١٩٢٨.

١٧٩ ـ بروانە ئەو باسەى لە بەشى داهاتوودا بۆ بزووتنەوەى كرێكاران تەرخان كراوە.

١٨٠ ـ « العراق » ٢٥ آيار ١٩٢٧.

١٨١ ـ « العراق » ٣١ آيار ١٩٢٧.

١٨٢ ـ لەو شوێنەدا کە باسی هەڵوێستی هێزەسیاسییەکان بەرامبەر بە بزووتنەوەی کرێکاران دەکەین لە هەندێک نموونەی ئەو نووسینانە دەدوێن.

١٨٣ ـ « العراق » ٢٥ حزيران ١٩٢٨.

١٨٤ ـ دوورنییە « لادێیەکی دڵ پڕ لە سوێ » نازناوی نووسەری پێشکەوتن خواز « مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید » نەبێ کە بە گەرمیی بەرگری لە مەسەلەی کرێکاران دەکرد، وەک لە دواییدا ڕوونی دەکەینەوە.

١٨٥ ـ « العراق » ٢٢ آيار ١٩٢٨.

١٨٦ ـ « العراق » ٣١ آيار ١٩٢٧.

١٨٧ ـ ڕۆژنامەی « الاوقات العراقية » کە ئینگلیز دەری دەکرد بەرگرییەکی زۆری لە هێندوسەکان کرد وچەندجارێک هەوڵیدا بیانو بۆ ئیش پێکردنیان بەو زۆرییە، بهێنێتەوە. (بڕوانە: « جريدة صوت العراق » بغداد ١٠ تشرين الاول ١٩٢٩.

* وا پێ دەچێ سەرکردایەتی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » لە ڕووی تیوری‌و دەستی نیشان‌کردن‌و جیاکردنەوەی چینە کۆمەلایەتییەکان‌دا شارەزاییەکی باشیان نەبوو بێ، دەنا پارێزەرانیان بە چینێکی سەربەخۆ دا نەدەنا. ڕاستییەکەی پارێزەران توێژێکن لە چینی بۆرژوای بچووک‌و لەتەک پزیشک‌و ئەندازیاراندا بە خاوەن پیشەی سەربەست « ذوی المهن الحرة » دادەنرێن. ـ وەرگێڕ ـ

١٨٨ ـ ئەو پەرەگرافە دەقاودەق لەو بەیاننامە چاپکراوەدا نووسراوەکە « محەممەد سالح ئەلقەزاز » ی سەرۆکی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بەسەر حزبەکانی عیراق‌و ڕۆژنامەکانی ناوخۆدا بڵاوی کردەوە. بڕوانە: لاپەڕە « ١٠٥ »ی « تطور الحركة النقابية في العراق» ی هاشم علي محسن. بغداد ١٩٦٦.

١٨٩ ـ چاو پێکەوتنێک لەگەڵ « محەممەد سالح ئەلقەزاز » دا، ڕۆژی ١/٨/٩٧٩.

١٩٠ ـ المركز الوطني للوثائق. — File No 164/4, progress Reports from the Controller of Labour 1919 1920, P. 307.

١٩١ ـ ڕۆژنامەکانی ناوخۆ هەواڵی ئەو هێندۆسەیان بڵاوکردەوە کە چۆن خۆی کوشتووە وچۆنیش نائومێدی پاڵی پێوە ناوە دەست لە ژیان هەڵبگرێ. هەروەها نووسیویە کە ١٢ ڕوپیە قەرزداری خاوەن ئوتێلەکەیەو پاشان کە گیرفانەکانیان پشکنی ١٣ ئانە زیاتری پێ نەبوو. بڕوانە « العراق » ١٢ شباط ١٩٢٧.

١٩٢ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦. تقرير الجنرال ف.د. هامند؛ « العراق » ٢٨ تشرين الثاني ١٩٢٨.

١٩٣ ـ جريدة « السياسة » بغداد ٢٣ آذار ١٩٣١. هەروەها بڕوانە « نداء الشعب » ١٤ كانون الاول ١٩٣٠.

بڕوانە: الدكتور علي الوردي. لمحات من تاريخ العراق الحديث. الجزء الخامس. القسم الاول، بغداد، ١٩٧٧، ص ٣٢٥ ـ ٣٢٦؛ ل.ن. کاتلوف سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٣.

A. M. Hamilton, op cit, P. 31.

١٩٥ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1926. P. 33.

١٩٦ ـ بە نموونە: بڕوانە ئەو ڕاپۆرتەی وەزارەتی ناوخۆ لە شوباتی ١٩٣٢دا دەرهەق بە « کارو کرێکاران لە عیراقدا ساڵی ١٩٣١ » ئامادەی کردووە. « المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ٩٣٢/١/٧ ـ ٩٣٢/١٢/١٧.

١٩٧ ـ

١٥٩ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦، تقرير الجنرال ق.د. هامند.

١٦٠ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق: File No 164/4, progress Reports from the Controller of Labour 1919 — 1920, PP. 307 — 308, 336.

١٦١ ـ « العراق » ٢٢ آذار ١٩٢٧ « هەروەها بروانه په راوێزی ژماره ـ ١٥٠ ».

١٦٢ ـ زۆربەی ئەو ئەرمەنی‌یانە، ئەوانە بوون لە سالی ١٩١٥ دا لە جەنگی کوشتن‌و قەلاچۆ کردن لە تورکیا، هەلیان وەبەر عیراق هێناو پاشان جنسی‌یەت‌نامەی عیراقی‌یان وەرگرت.

١٦٣ ـ بروانه: « العراق » ٢٢ آیار ١٩٢٨.

١٦٤ ـ بۆ ئەو نیسبەتانە پشت بەو ژمارانە بەستراوە کە لە مەلبەندی نیشتمانی بەلگەنامەکان نووسراون. بروانە « المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/١٠ موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦. تقرير الجنرال. ف.د. هامند » « العراق » ٢٨ تشرين الثاني ١٩٢٨
Report on the administration of Iraq for the year 1928. PP. 105 — 106. Special Report PP. 169, 176
(the Iraqi Directory, 1936.) PP. 534 — 535.

١٦٥ ـ « العراق » ٢٠ تموز ١٩٢٨.

١٦٦ ـ بروانه: « العراق » ٢ تشرين الاول ١٩٢٨.

١٦٧ ـ بروانه: « العراق » ٤ تشرين الاول ١٩٢٨.

١٦٨ ـ بەنموونە بروانە: بلاوکراوەی رەسمی‌ی مانگی ئەیلوول لە رۆژنامەی « العراق » ی رۆژی ٢٢ی تشرین دووەمی سالی ١٩٢٨ دا.

١٦٩ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بروانە: Report on the administration of Iraq for the year 1928. PP. 31 — 32. المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي رقم الملفة: ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٤ ـ ١٩٢٨، رقم الملفة ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦، تقرير الجنرال ف.د. هامند؛ « العراق » ٢٧ تشرين الثاني ١٩٢٨؛ « الاخبار » ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣١. لە بەشی داهاتوودا دێینەوە سەر ئەم باسە.

١٧٠ ـ بروانە « العالم العربي » ٨ كانون الثاني ١٩٣٣.

١٧١ ـ بروانە بەیاننامەکەی « کۆمەلەی سنعاتکاران » کە لە « تطور الحركة النقابية في العراق» ی هاشم علي محسن. بغداد ١٩٦٦ ص ٣٣ و ١٠٥ » دا بلاو کراوەتەوە.

١٧٢ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق. File No 164/34, Labour, 1920 — 1921

١٧٣ ـ لە بەشی داهاتوودا کەمێک بە درێژی لەم بابەتە دەدوێین.

١٧٤ ـ تەنها جارێک نەبێ کە بەرێوەبەرایەتی رێگای ئاسن ٢٥٪ ی مووچەی هێندوسەکانی بری‌و بە گورجی پاشکەزیش بووەوە. (بروانە: « العالم العربي » ايلول ١٩٣٢).

١٧٥ ـ بروانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة. ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦. تقرير الجنرال ف.د. هامند.

١٧٦ ـ بەنموونە بروانە: « العراق » ٢٨ تموز ١٩٢٨؛ « نداء الشعب » ١٣ تشرين الثاني ١٩٣٠، « الاخاء الوطني » ٢٦ آيار ١٩٣٢.

١٧٧ ـ چاوپێکەوتنێک لەگەل « محەممەد سالح قەزاز » دا، رۆژی ١/٨/٩٧٩.

١٧٨ ـ بروانه: « العراق » ٢٢ آيار ١٩٢٨.

١٧٩ ـ بروانە ئەو باسەی لە بەشی داهاتوودا بۆ بزووتنەوەی کرێکاران تەرخان کراوە.

١٨٠ ـ « العراق » ٢٥ آيار ١٩٢٧.

١٨١ ـ « العراق » ٣١ آيار ١٩٢٧.

١٨٢ ـ لەو شوێنەدا کە باسی هەڵوێستی هێزەسیاسییەکان بەرامبەر بە بزووتنەوەی کرێکاران دەکەین لە هەندێک نموونەی ئەو نووسینانە دەدوێین.

١٨٣ ـ « العراق » ٢٥ حزيران ١٩٢٨.

١٨٤ ـ دوورنییە ، لادێیەکی دڵ پڕ لە سوێ ، نازناوی نووسەری پێشکەوتن خواز ، مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید ، نەبێ کە بە گەرمیی بەرگری لە مەسەلەی کرێکاران دەکرد، وەک لە دواییدا روونی دەکەینەوە.

١٨٥ ـ « العراق » ٢٢ آيار ١٩٢٨.

١٨٦ ـ « العراق » ٣١ آيار ١٩٢٧.

١٨٧ ـ رۆژنامەی « الاوقات العراقية » ، کە ئینگلیز دەری دەکرد بەرگرییەکی زۆری لە هێندوسەکان کرد وچەندجارێک هەوڵیدا بیانو بۆ ئیش پێکردنیان بەو زۆرییە، بهێنێتەوە. (بروانە: « جريدة صوت العراق » بغداد ١٠ تشرين الاول ١٩٢٩.

* وا پێ دەچێ سەرکردایەتی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » لە رووی تیوریو دەستج نیشانکردنو جیاکردنەوەی چینە کۆمەلایەتییەکاندا شارەزاییەکی باشیان نەبوو بێ، دەنا پارێزەرانیان بە چینێکی سەربەخۆ دا نەدەنا. راستییەکەی پارێزەران توێژێکن لە چینی بۆرژوای بچووکو لەتەک پزیشکو ئەندازیاراندا بە خاوەن پیشەی سەربەست « ذوی المهن الحرة » دادەنرێن. ـ وەرگێر ـ

١٨٨ ـ ئەو پەرەگرافە دەقاودەق لەو بەیاننامە چاپکراوەدا نووسراوەکە « محەممەد سالح ئەلقەزاز » ی سەرۆکی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بەسەر حزبەکانی عیراقو رۆژنامەکانی ناوخۆدا بڵاوی کردەوە. بروانە: لاپەرە « ١٠٥ »ی « تطور الحركة النقابية في العراق» ی هاشم علی محسن. بغداد ١٩٦٦.

١٨٩ ـ چاو پێکەوتنێک لەگەڵ « محەممەد سالح ئەلقەزاز » دا، رۆژی ١/٨/٩٧٩.

١٩٠ ـ المركز الوطني للوثائق. — File No 164/4, progress Reports from the Controller of Labour 1919 1920, P. 307.

١٩١ ـ رۆژنامەکانی ناوخۆ هەواڵی ئەو هیندۆسەیان بڵاوکردەوە کە چۆن خۆی کوشتووە وچۆنیش نائومێدی پاڵی پێوە ناوە دەست لە ژیان هەڵبگرێ. هەروەها نووسیویە کە ١٢ روپیە قەرزداری خاوەن ئوتێلەکەیەو پاشان کە گیرفانەکانیان پشکنی ١٣ ئانە زیاتری پێ نەبوو. بروانە « العراق » ١٢ شباط ١٩٢٧.

١٩٢ ـ بروانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦. تقرير الجنرال ف.د. هامند؛ « العراق » ٢٨ تشرين الثاني ١٩٢٨.

١٩٣ ـ جريدة « السياسة » بغداد ٢٣ آذار ١٩٣١. هەروەها بروانە « نداء الشعب » ١٤ كانون الاول ١٩٣٠.

بروانە: الدكتور علي الوردي. لمحات من تاريخ العراق الحديث. الجزء الخامس. القسم الاول، بغداد، ١٩٧٧، ص ٣٢٥ ـ ٣٢٦؛ ل.ن. کاتلوف سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٣.

A. M. Hamilton, op cit, P. 31.

١٩٥ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1926. P. 33.

١٩٦ ـ بە نموونە: بروانە ئەو راپۆرتەی وەزارەتی ناوخۆ لە شوباتی ١٩٣٢دا دەرهەق بە « کارو کرێکاران لە عیراقدا ساڵی ١٩٣١ » ئامادەی کردووە. « المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ٩٣٢/١/٧ ـ ٩٣٢/١٢/١٧.

١٩٧ ـ

١٩٨ ـ ئيشى بيناكارى و دارتاشى و كشوكالَّى نەدەكرتەوە.
١٩٩ ـ بە نموونە بروانە: المركز الوطني للوثائق: الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/٥/٣ موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ١٩٣١.
٢٠٠ ـ دەربارەی ئەو پرۆژمیە بروانە: « صدى العهد » ١٤ آيار ١٩٣١؛ « الاستقلال » ١٤ آيار ١٩٣١.
٢٠١ ـ دەربارەی ئەو پرۆژمیە بروانە: « الاستقلال » ٢٧ تشرين الثاني ١٩٣١.
٢٠٢ ـ « رەززاق ئیبراهیم حەسەن » چلكی بۆ چووە كە دەڵێ ئەم كارە » یەكێكە لە دەسپێشخەریی‌یە ناوزاەكانی كۆمەڵەی سنعەتكاران » بەڵام پەرلەمان لە ساڵی ١٩٣٦ دا پرۆژەكەی « ئەلقەزاز » ی مۆر نەكرد وەك ئەو دەڵێ. » بروانە: رزاق ابراهيم حسن. تاريخ الطبقة العاملة في العراق، ص ١٨ » . ئەوی راستی‌ی بێ پرۆژەكەی « ئەلقەزاز » لە رووی ناوەرۆكەوە، نەك دارشتنەوە زۆر لەو یاسای كرێكارانەی پەرلەمان لە ساڵی ١٩٣٦ مۆری كرد، تێرو تەسەل تر بوو.
٢٠٣ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1931 P. 24.
٢٠٤ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٣/٥، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ١٩٣١، « معالجات عمالية » منشورات. « الثقافة الجديدة » بغداد ١٩٧٥. ص ٢٧٤.
٢٠٥ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1926 PP. 29 — 34.
٢٠٦ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٣/٥، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ١٩٣١.
٢٠٧ ـ بروانە: هەر ئەو سەرچاوە، فایلی پێشوو.
٢٠٨ ـ هەمان سەرچاوەوفایل.
٢٠٩ ـ هەمان سەرچاوەوفایل.
٢١٠ ـ راپۆرتی ساڵانەی لەمەڕ شێوەی بەڕێوەبردنی عیراق هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەم بەرێوەبەرایەتی‌یە، دەباتەوە سەر بێ دەرامەتی و تەنگوچەڵەمەی دارایی. بروانە: Report on the administration of Iraq for the year 1931 P. 25.
٢١١ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/٣/٥، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ـ ١٩٣١.
٢١٢ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بروانە: ( الدولة العراقية. محاضر مجلس النواب لسنة ١٩٣٠) الاجتماع الاعتيادي ص ١٨٢ ـ ١٨٣. هەروەها بروانە پاشكۆی ژمارە ـ ٣ ـ Special Report, PP. 244 — 245.
٢١٣ ـ ئەو بەندە چز كرا و ئەگەر لیژنەكە زانی ئەو دیدمنی‌یە كارێكی پێویستە داوا لە ئەنجومەنی وەزیران بكا. بۆ زیاتر تێ گەیشتن بروانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة ص/٣/٥. موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم. ١٩٣١.
Report on the administration of Iraq for the year 1931. PP. 24 — 27.

٢١٤ ـ لە ناو ئەو لیژنەیەدا تاقە كەسێكی تێدا نەبوو نوێنەری كرێكاران یاخود ئەو كۆمەڵە بێ كە سەرنجی رای‌گشتی‌یان بەلای یاسای‌كرێكاران‌دا راكێشا و لەو بوارەدا راستەوخۆ دەوری خۆیان بنیبوو.
٢١٥ ـ بروانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣ موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ١٩٣١.
٢١٦ ـ ئەو رستەیە لە دەقی ئەو نامەیەدا نووسراوە كە « جەعفەر ئەلعەسكەری » ناردی بۆ وەزارەتی دەرەوەی عیراق و مێژووی ٢ ی تشرین یەكەمی ساڵی ١٩٣١ ی بەسەرەوە یە. ئەوی راستی‌ی بێ حكوومەتی عیراق هەر ئەوەندەی پێ كرا، داوای لە مەندووبی سامی كرد ئاگاداری لیژنەی

ئینتیدابی سەربەکۆمەڵی گەلان بکا، بە پێشیازەکانی بیروی کرێکارانی دەوڵەتان قایل بووەو بەم زووانەیش یاسای پێویست دادەنێ. بڕوانە: Report on the administration of Iraq for the year 1931, P. 28.

٢١٧ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم. ١٩٣١.

٢١٨ ـ بڕوانە: Report on the administration of Iraq year 1931 PP. 64 — 65.

٢١٩ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال وما يتعلق بهم ٧/١ ـ ١٧/١٢/١٩٣٢. هەروەها. Report on the administration of Iraq for the year 1931 PP. 28, 64.

٢٢٠ ـ بڕوانە دەقی یادداشتەکە. « العالم العربي » ٢٤ آيار ١٩٣٢.

## سەرەتای بزووتنەوەی کرێکاران

ئەوی ڕاستی بێ بە تەنها باری گرانی ژیان پاڵی بە کرێکارانەوە نەنا بچنە مەیدانی خەباتەوە، بەڵکو چەند هۆی تریش هەبوون ماوەیان نەدەدا، نارەزایی کرێکاران بەگورجی بچێتە بارێکەوە هەوڵی گۆڕینی واقیعی پڕ لە ئێش و ئازاریان بدەن. دەتوانین نزمیی ئاستی هوشیاریی چینایەتی لە ریزی پێشەوەی ئەو هۆیانە دابنێین؛ دیارە ئەمەیش ئەنجامی کۆمەڵێک هۆی تری یاریدەدەر بوون، وەك: نەخوێندەواری کە بەشێوەیەکی بەر بڵاو لەناو کرێکاران‌دا تەشەنەی کردبوو. ژمارەیەکی زۆر کەمی کرێکارە پیشەیی‌یەکان نەبێ لەوانەی شارنشین بوون‌و لەحوجرەدا فێری خوێندن و نووسینی سەرەتایی بوو بوون، بە دەگمەن کرێکارێك دەبینرا خوێندەواریی هەبێ. سەرەڕای ئەوەیش ئەمانیش وەك جووتیاران لە هوشیاری سیاسی بێ بەش بوون، تەنانەت وایش بۆ مەسەلەکە دەچوون کە سیاسەت پیشەیەکە و تایبەتە بە توێژە کۆمەڵایەتی‌یە دەست ڕۆیشتووەکان‌و شتێکە لە وزەو توانای ئەودا نی‌یە. هەر ئەم تێ فکرینە باوە؛ وای لێ کردبوون وەك حەقیقەتێك لە قەڵەمی بدەن. ئا ئەم بۆچوونە هەڵەیە ڕاستەو خۆ کارێکی سەلبی کردە سەر سروشتی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق لەو قۆناغەدا.

ئینگلیزەکانیش دەیانزانی، چۆن خۆیان بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان دەکەن‌و چۆنیش کۆسپ دەخەنە بەردەم ئەو ڕێگایانەی ئاستی هوشیاریی کرێکاران بەرز دەکەنەوەو لە سایەیان‌دا بزووتنەوەیەکی کرێکارانە دروست دەبێ؛ چونکە ئەوان لە تێگەیشتنەوە حەقیقەتی بزووتنەوەیەکی لەو جۆرەیان دەزانی‌و ترسیان لە ئەنجامە ئابوری‌و سیاسی‌یە کانی هەبوو. بۆیە شان بەشانی ئەو ڕێگا بە پێچ‌و پەنایانەی لە بەشی سێ‌یەمدا بە دوورو درێژی باسمان لێوە کردن؛ بەردەوام ریزەکانیان « پاك دەکردنەوە »، واتە کرێکارە کۆنەکانیان دەردەکرد و لە شوێنی ئەوان تازەیان دادەنا، تاوەکو مانەوەی ئەوانەو پەیوەندی هەمیشەیی‌یان نەبێتە هۆی تێگەیشتنی نوێ. لە کۆتایی ساڵی ١٩٣١ دا کۆمپانیای نەوتی عیراق ١٠٠ کرێکاری عیراقی لەوانەی پێنج ساڵ‌و زیاتر بەسەر دامەزراندنیان‌دا تێپەڕی بوون، دەرکرد. زۆربەی ئەو کرێکارانە لەوانە بوون لەتەك دەست بەکار بوونی کۆمپانیای ناوبراودا دامەزرا بوون. بیانوویشیان بۆ ئەم هەنگاوە ئەوە بوو، گوایە چەند هۆیەکی ئابوری ناچاری کردوون دەستبەرداریان ببن. کەچی بە پەلەپەل لە جێی ئەوانە کرێکاری هیندۆسی‌یان بەمووچەیەکی زیاتریش دانا.[1] لەبەر ئەوە

له خۆڕا نەبووکە ساڵی ١٩٥٦[٢] لەناونزیکەی سیانزە هەزار کرێکاری عیراقی ناو کۆمپانیای نەوتی عیراقدا، تەنها ٥٨ کەس ٢٥ ساڵ خزمەتیان تەواوکردبوو، « ١٢٤ » کەسیش ٢٠ ساڵ خزمەتیان هەبوە، « ٣٠٤ » کەسیش ١٥ ساڵیان تەواو کردبوو. بەرامبەر بەوانە ١٠٧٣٢ کرێکار ماوەی خزمەتیان پێنج ساڵی تێ نەپەڕاند بوو. شایانی باسە ئەو ژمارانەی سەرەوە هی یەك جۆر کرێکار نین، بەڵکو لە ناویاندا کرێکاری شارەزا و پیشەوەر ... ـر بەجۆرو کرێکاری نەشارەزایش هەیە.[٣]

دەبێ ئەوەیش بوترێ کە هەندێ داموو دەزگای ئەهلی ی هەر زوو کەوتنە « پاککردنەوە » ی ریزی کرێکارەکانیان. بە قسەی رۆژنامەیەکی کرێکاران حاوەن چاپخانەکان کرێکاری یەدەکیان ئامادە دەکرد. رۆژنامەکە ئەمانە بە « چینی دووەم » ناو دەبا کە خاوەن چاپخانەکان « فێری پیشەکەیان دەکردن و هەرکاتێك چینی یەکەم نارەزایی دەربڕی و زانی یان ئەم هەڵویستەیان دەبێتە هۆی ئەوەی دەست لە ئیش هەڵبگرن، وەك ئامرازێك بەکاریان دێنن». رۆژنامەکە دەڵێ: ئەو گرووپە یەدەکە، ئەو خەڵکە بێ دەرەتانەن دەستاو دەستیان پێ دەکرێ و هیچ شتێکیش لەبارەی خاوەن چاپخانەو هەڵس و کەوتیانەوە نازانن »و بۆ جێ بەجێکردنی مەرامی کاری خۆیان چۆنیان بوێ دەیان چەوسێننەو ە، جا بە « هەڕەشەو گوڕەشەی دەرکردن بێ » یاخود « بەو گفتو پەیمانە زلزلانە بێ کە بۆیان هەڵدەڕشتن »، « دەردو مەینەتی ی ژیانیان لە بیر دەبردنەوە ». یان « ناو بە ناو ئاژاوەیان تێدا دەنانەوەو سوودیان لە جیاوازی بیروڕاو دووبەرەکی یان وەردەگرت. »[٤] لێرەدا جێی خۆیەتی دەست بۆ ئەوەیش رابکێشین کە باری ژیانی کرێکارانی چاپخانە لە سەرەتای سەرهەڵدانی چیرۆکە ریالیزمی یەکانی عیراقدا، رەنگی دایەوە.[٥]

زۆربوونی کرێکاری کاتی ی لە ناو ریزی کرێکارانی عیراقدا بە ئاشکرا رۆڵێکی سەلبی گێڕا و ماوەی نەدا هوشیاری چینایەتی ـ ئابوری و سیاسی ـ لە ناویاندا گەشە بکا، هەروەك لە پێشەوە باس کرا. بەشێکی زۆری ئەوانەو تەنانەت کرێکارە هەمیشەیی یەکانیش بەتەواوی پەیوەندی یان لەگەڵ لادێ و نەریتی عەشرەتگەرییدا نەپچڕاندبوو. ئەوانە لایان وابوو ئیش کردن لە شار و لە ناو پرۆژە جۆر بەجۆرەکاندا، دەبێتە هۆی یاریدەدەرو ناهێڵێ ئابوری کشتوکاڵی یان هەرەس بهێنێ. ئەمانە زۆربەی هەرە زۆری ئەو کرێکارانەیان پێك دەهێنا کە لە رێگاوبان و پرۆژەکانی ئاودێری و بیناکاری و خورما رنین و داگرتن و ئیشی لەو بابەتانەدا کاریان دەکرد. ژمارەی ئەوانەیش زۆر لەو کرێکارانە پتر بوو.

که له کۆمپانیاکانی نەوت و داموو دەزگای لەو جۆرەدا ئیشیان دەکرد. سەیر ئەوەیە ژمارەیەکی زۆر لەو کرێکارانە هەرچی پێی بوتری سەرچاوەی ژیان له لادێدا نەیان مابوو، بەلاّم هێشتا پەیوەندی‌یان لەتەك ئەو جۆرە ژیانەدا نەپسا بوو. وەك « هاملتن »ی ئەندازیار دەیگێڕێتەوە، بەشێکی زۆر له دانیشتووانی دەشتایی‌یەکانی دەوروبەری « مووسل »، ئەوانەی که خاوەن زەوی نەبوون و کشت وکاڵیان نەدەکرد، بە هاوین لەسەر رێگای « رەواندوز » ئیشیان دەکردو زستان دەگەڕانەوە گوندەکانی خۆیان.[٦] ئەم چەشنە کرێکارانەیش گیانی بزووتنەوەیان تێدا نی‌یەو گەر برێکیشیان گیانی راپەڕنینان تێدا دروست ببێ، ئەوا بە دەگمەن نەبێ ئەویش لە سنووری بزووتنەوەیەکی خۆرسك تێپەڕ ناکا.

له وولاّتانی تازە پێگەیشتوودا، ئەوانەی لە کارگەکانی چنین‌دا ئیش دەکەن بە دەستەی یەکەمی چینی کرێکاران دادەنرێن و داینەمۆی بزووتنەوەی کرێکارانن، چونکە بە ژمارە لە هەمووان زیاترن و لە گشت کرێکاری کەرتەکانی دی پەرەسەندووترن.[٧] بەلاّم لە عیراق‌دا مەسەلەکە جیاواز بوو، چونکە کرێکارانی پیشەسازیی چنین بە درێژایی سەردەمی ئینتیداب نیسبەتێکی کەمی چینی کرێکارانی تازەیان پێك دەهێناو،[٨] بەقسەی ئەو راپۆرتە رەسمی‌یەی بەریتانیا دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی عیراق پێشکەش بە کۆمەڵی گەلانی کرد، باری گوزەرانی کرێکارانی چنین لە رووی سەعاتی ئیش کردن و رۆژانەوە لە سەرجەم کرێکارانی‌دی باشتر بوو.[٩] هەرچی کرێکارە عیراقی‌یەکانی کۆمپانیای نەوت بوون، زۆربەیان نەشارەزاو لەو کەسانە بوون لە دێهاتەکانی دەورو بەرەوە، رەویان کردبوو، ئەوەیشی پێی بووتری هوشیاری سیاسی نەیانبوو.

کرێکارانی رێگای ئاسن بە حوکمی ئەوەی بەشێکی گەورەیان لە بەغدای پایتەخت‌دا کۆبووبوونەوەو لە نزیکەوە ئاگاداری باری سیاسی هێزە نیشتمانی‌یەکان بوون، ژمارەیەکی زۆریشیان سەر بە پیشەوەران بوون، لە رووی هوشیاری یەوە جیاوازی‌یەکی نیسبی‌یان لەتەك تێکڕای کرێکارانی تردا هەبوو. ئەمە جگە لەوەی کرێکارانی رێگای ئاسن بە پێی سروشتی چینایەتی‌یان دەچنەوە سەر کەرتە پێگەیشتووەکەی چینی کرێکاران و زۆر لە کرێکاری کارخانەوە نزیکن، کە بە کاکڵەی چینی کرێکار و پێشڕەوەکەی دادەنرێن. ئەم خاسی‌یەتەیش تا رادەیەکی زۆر بەسەر ئەو کرێکارانەدا دەچەسپێ کە لە کارگەکانی « شالچی‌یە » دا کاریان دەکرد. جا هەر چەندە ئەم توێژە لە قۆناغی یەکەمی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق‌دا رۆڵێکی دیاری گێڕا و بگرە سەرکردایەتیشیان دەکرد، بەلاّم ئینگلیزەکان توانی‌یان بە گیروگرفتی

لاوەکی‌یەوە خەریکیان بکەن، وەك لە باسەکانی بەشی رابوردوودا لێیان دواین.

سەرباکی ئەم هۆیـانە و هی تـریش، ماوەیـان نەدا نـارەزایی دەربرین سەبارەت بە باری ژیان‌و گوزەرانیان بچێتە قۆناغێکی بالاترەوە؛ واتە قۆنـاغی تەقینەوەو کاری نیقابی رێك و پێك.

بەلام بەرامبەر بەمە، کۆمەلێك هۆی‌تر تارادەیەك یارمەتی‌یان دا، چەند هەل‌و مەرجی پێویست پێ بگەن‌و پال بە کرێکاری عیراقی‌یەوە بنێن بجوولێ؛ دیارە نزم بوونەوەی بەردەوامی باری ئابوری و نالەباری زرووف ئیش‌کردن، لە ریزی پێشەوەی، ئەو هـۆیانـە دادەنرێن. لە لایـەکی تریشـەوە. نەش و نمـاکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی‌و بیروبـارەری دژ بە ئیمپـریالیـزم وەك چۆن کـاری لە بیروهۆشی رۆلەکانی عیراق کرد، هەر بەو شێوەیەیش رۆلێکی گرنگی لە هوشیار کردنەوەی‌بیری کرێکاراندا گێرا. بێ گومان پەیدا بوونی رۆشنبیرانیش لەسەر شانۆی سیاسی وەك توێژێکی شۆرشگێر دەورێکی باشی بینی لەم مـەیدانـەدا. تەنانەت هەندێ لەوانەی سەر بەم توێژە بـوون بەر لەهـەمووان بـەنووسینی ووتارو بلاوکردنەوەی لەناو رۆژنامەکانی نـاوخۆدا، سـەرنجی خەلکی‌یـان بۆ واقیعی تال و تفتی ژیانی کرێکارانی عیراق راکێشا. لێرەدا گرنگ ئەوەیە بزانین کە بەشێکی ئەو شنبیرانە سەر بە خێزانە پیشـەیی‌یەکـان بوون. بـە نموونـە: « محەممەد مەکی ئەلئەشتەری » کە دوایی بووە سەرۆکی « کۆمەلەی هاریکاری سەرتاشان » بە یەکێك لە ناسراوترینی ئەو رۆشنبیرانە دادەنرێ.

بێ گومان چەندین هۆی دەرەکیش هەبوون توانیان رۆلێکی دیاریکراو لە بزواندنی کرێکارانی عیراق‌دا بگێرن، چونکە نەدەتوانـرا کرێکـاری عیراق بـە تەواوی لەو رووداوو کارەساتانە دابر بکرێن کە لە دەوروو پشتی‌دا روویان دەدا. خەباتی کرێکارانیش لە دەرەوەی وولات و سەنگی کۆمـەلایەتی‌و سیـاسی‌یان، راستەوخۆ کاری لە بیرورای رۆلە هوشیارەکانی چینی کرێکارانی عیراق‌و هەموو ئەو کەسانە کرد کە بە تەنگ مەسەلەکەیانەوە دەهاتن، وەك « محەممەد سالح ئەلقەزاز » دەلێ، بە تایبەتی لەو کاتەوەی کە زانی‌یان « لە سەرانسەری وولاتانی رۆژهەلات‌دا ـ بێجگە لە وولاتانی ئەوروپا کە کـرێکاران بـوونە خـاوەنی مافی چەسپاوی خۆیان ـ کرێکاران یاسایان هەیە دەیانپارێزێ و حالی ئەوانە وەك حالی کرێکاری لای ئێمە نی‌یە. لە فەلەستین‌و هیندوستانی داگـیر کراودا، لە چـین‌و ژاپۆنیا و تورکیا و میسر وئێراندا، یاسا هەیـە کرێکـاران دەپارێـزی و دان بە رێکخراوو دامودەزگاکانیان‌دا دەنێ و دایەرەی تایبەتی هەیە لە زولم‌و ستەمی چەوسێنەران دەکولێتەوە »[١٠]

« مەحموود ئەحمە ئەلسەید » لە ڕۆژی یەکی ئابی ساڵی ۱۹۳۰ داو لەو ووتارەی‌دا کە بە بۆنەی ئاهەنگێکی کرێکارانەوە گێردرا و خوێندی‌یەوە، باسی ئەوە دەکا چۆن « لە دوا دوای سەدەی نۆزدەهەمەوە کرێکارانی وولاتە عەرەبی‌یەکان ووریا بوونەتەوەو دەزانن سوودی هاوکاری‌و یەکخستنی ریزەکانیان چەندە.» ئەو لای وایە « مانگرتنی کرێکارانی جگەرە دروست‌کردن کە ساڵی ۱۸۹۹ لە قاهیرەو لە پێناو زیاد کردنی ڕۆژانەدا » « یەکەمین بەڵگەی ئەم ووریا بوونەوەیە ». پاشان دێتە سەر هەوڵ‌و کۆششی زووی کرێکارانی میسرو سووریا کە لە پێناوی نیقابەیەک‌دا، بەرگری لە مافەکانیان بکا دایان. ئنجا دەست بۆ گرنگی‌ی ئەو مانگرتنەیان رادەکێشێ کە بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی سازیان کرد.[۱۱]

لە لایەکی تریشەوە، باری ژیانی کرێکارانی وولاتە پەرەسەندووەکان، کرێکاران و ڕۆشبنیرە شۆڕشگێڕەکانی عیراقی بە ئەندازەیەک هوشیار کردەوە، لە نووسین‌و ووتار و یادداشتی سەرکردەکانی‌دا ڕەنگیان دایەوە. ئەوەتا هەر لەو ئاهەنگەدا کە لە سەرەوە باسکرا « مەحموود ئەحمەد ئەلسەید » پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە « پەرلەمانی سیستەمە ئەورووپایی‌یەکان سەدان نوێنەری کرێکارانیان » تێدایە.[۱۲] « محەممەد مەکی ئەلئەشتەری » یش لە بارەی هەمان مەسەلەوە دەنووسێ:

«.. حاڵی کرێکاری عیراق ئەوەندە خراپ و نالەبارە گریانت بۆی دێ. نە پەیرەوێکی هەیەو نەنیقابەو نەکۆمەڵەیەک تا تێیدا کۆببنەوەو ریزەکانیان یەک بخەن. دەیبینی هەمیشە وەڕسەو ئاخ و داخ هەڵدەکێشێ چونکە توانای بەڕێوەبردنی کاروباری خۆی نی‌یە. ئەمە حاڵی کرێکاری لای خۆمانە، کەچی هاوسنفی ئەو لە ئەورووپادا کە لە بارەیانەوە دەبیستین و لە ڕۆژنامەکان‌دا شتیان لەسەر دەخوێنینەوە، خۆیان و هاورێیانیان هاوکاری یەکتر دەکەن و دەستیان لە دەستی یەکتر دایەو یارمەتی یەکتر دەدەن.. کرێکاری ڕۆژئاوایی نیقابە، کۆمەڵە، سیستەم‌و یاسای هەیەو هەموو ئەمانەیش دەستەبەری مافی ڕەوای ئەوانن.. گەر کرێکارێک توانای کارکردنی نەما، ئەو کۆمەڵەیە، یان ئەو نیقابەیە کە تێیدا ئەندامە، مانگانەیەکی بۆ دەبڕێتەوە تاوەکو پێی بژی..»[۱۳] بەو جۆرە، باری ژیانی کرێکاری ڕۆژئاوایی بووە خولیایەک، دەستەی یەکەمی سەرکردە نیقابی‌یەکانی عیراق و ڕۆشنبیران خەویان پێوە دەبینی ».[۱٤]

سەرکردەی نیقابی ناسراو « محەممەد سالح ئەلقەزاز » ئەوە دووپات دەکاتەوە کە لە زووەوە، مانگرتنی کرێکارانی وولاتە عەرەبی‌یەکان و دەستگرتنی

کرێکاران بەسەر دامودەزگای دەوڵەتی یوولاتێکی گەورەی ئەورووپاییدا، لە دوای سەرکەوتنی یەکەم شۆڕشی سۆشیالیستی، کاریان لە بیرو هۆشی کردبوو.[15] شایانی باسە ئینگلیزەکان، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن سەرنجی دانیشتووانی عیراقیان بەلای شۆڕشی ئوکتۆبەری سۆشیالیستیدا راکێشا. بە نموونە: پێش ئەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی دوایی بێ، لەو رۆژنامانەدا کە لە عیراق بەزمانی عەرەبیو کوردیو فارسی و تورکمانی دەریان دەکرد، پروپاگاندەیان دژی بیروباوەڕی سۆشیالیزم دەکرد.[16] ئەم هێرشە لە دوای جەنگیش هەر بەردەوام بوو، بەلام ئەمجارەیان رۆژنامەی « العراق »ی عەرەبی و « پێشکەوتن » ی کوردی، ئاڵاکەیان هەڵگرت. دیارە بە تەنها هێرشێکی لەو جۆرە، بەس بوو، بۆ ئەوەی رۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکان لەو راستییە تێ بگەن کە ئیمپریالیزمی بەریتانی دوژمنی باوەکوشتەی سۆشیالیزمە. شان بەشانی ئەمانەیش و لەتەك ئەو پروپاگاندە فراوانەدا کە ئینگلیزەکان بلاویان دەکردەوە، ناو بەناو بیروڕای وا دەهاتە کایەوە لەگەڵ مەبەستو ئامانجی پروپاگاندەدا نەدەگونجا، ئەمەیش دەبووە هۆی ئەوەی چەندین پرسیاری نوێو هەمەچەشن لە مێشکی خوێنەردا بورووژێنێ.

دەبێ ئەوەیش لەیاد نەکرێ کە کرێکارانی عیراق بەر لەوەی بزووتنەوەکەیان بە خۆیدا بێ و لەسەر ئاستی ناوخۆ رەنگو رووی خۆی وەربگرێ، هەندێ پەیوەندییان لەگەڵ سەرکردەی کرێکارانی وولاتە عەرەبییە کاندا بەست. ئەوە بوو لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٩ دا، نووسەرو کرێکاری لوبنانی « فوئاد شیمالی » کە چەندین ساڵی لە بەندیخانەکانی فەرەنسای داگیرکەردا بەسەر بردبوو، پێنج دانەی لەو کتێبەی خۆی « نیقابەکانی کریکاران ـ نقابات العمال » نارد بۆ « کۆمەڵەی سنعاتکاران ». کۆمەڵەی ناوبراویش داوای لە ئەندامانی کرد بیخوێننەوە خەباتو تێکۆشانی نووسەرەکەی « بکەنە سەرمەشقی تێکۆشان».[17]

لە هەندێ کتێبی عیراقیدا دەست بۆ چەند بزووتنەوەیەکی سادەی کرێکاران کە پێشتر روویان داوە[18]، درێژ دەکەن وەك مانگرتنی ساڵی ١٩١٨ ی کرێکارانی بیناکاری لە « نەجەف » و مانگرتنی کرێکارانی کەشتی دروستکردن لە « بەسرە » لە هەمان ساڵدا.[19] بە قسەی ئەو سەرچاوانە لە مانگرتنەکەی دواییاندا « سەدان کرێکار »[20] بەشدارییان کردووەو لەو ئەرزوحاڵەدا کە پێشکەش بە کاربەدەستان کراوە « داوا دەکەن باری گرانیان لەسەر شان لابرێ و لە رووی رۆژانەو مووڵەتەوە، وەك کرێکارە بیانییەکان تەماشا بکرێن..»[21]

سیمای چینی کرێکارانی عیراق، وەك هێزێکی کۆمەلایەتی ناو بزووتنەوەی نیشتمانی ی لە رۆژگاری « شۆڕشی بیست » دا خۆی نواند. کرێکارو پیشەوەرانی بەغدا، بڕبڕەی پشتی هەموو ئەو کۆڕو کۆبوونەوە جەماوەری یانە بوون کە لە مزگەوتەکانی ئەوی دا دەبەستران. هەر ئەم کۆبوونەوانەیش نموونەی یەکێك لە گرنگترین پلەی هوشیاری نیشتمانی ی ئەو کاتەی عیراق نیشان دەدەن. ئەو حەقیقەتانەی بەلگەنامە نهێنییەکانی پۆلیسی بەریتانیایی لە بەغدا تۆماری کردوون لە توانایاندا هەیە تارادەیەك رۆشنایی بخەنە سەر ئەم مەسەلەیە. یەکێك لەو بەلگەنامانە وەسپی ئەو خۆنیشان دانە دەکا کە لەسەر « شەقامەکانی رۆژهەلاتی بەغدا » رووی داوەو دەلێ: « تەپڵو تەنەکە لێ دەدران و داوای سەربەخۆیی دەکرا ». ئەم خۆ نیشان دانەیش دوو کەس سەرکردایەتی یان کردووە « یەکێکیان، « شێخ تەهای کوڕی خزەییرە » کە دانیشتووی رۆژئاوای بەغدایەو دارفرۆشێکی بچووکە. دووەمیشیان، عەبدولرەزاقی کوڕی عەلی یەو لە گەرەکی فەزل ئاشپەزە ». لە راپۆرتێکی تری نهێنیدا، پۆلیس لە بارەی ئەو کۆبوونەوەیەوە کە لە رۆژی ١٥ی تەمموزی سالی ١٩٢٠ دا لە مزگەوتی حەیدەرخانە سازکرا، واتە لە گەرمەی رۆژگاری شۆڕشدا، دەقاودەق دەلێ:

«.. کاتێك جەماوەرەکە بلاوەیان لێ کرد، بنیادەم هەر ئەوەندەی بۆ دەکرا تەماشای ئەو خەلکە هەزارە بکا کە بریتی بوون لە زەحمەتکێشان و خەلکی بێ کاری ناو چایخانەکان »[٢٢]

یەکەم هاوولاتی عیراقیش کە لە رۆژانی یەکەمی شۆڕشدا « ٢٤ی ئایاری ١٩٢٠ » شەهید کرا، دارتاشێکی بێ زمان بوو. لە رۆژی دوایی دا جەماوەر بە خۆ نیشان دانێکی گەورە بە خاکیان سپاردو ناوی « شەهیدی نیشتمان »[٢٣] یان بەسەردا بڕی. لە رۆژی ٣ی ئابدا، لایەنگیرانی شۆڕیش بە یارمەتی کرێکاران، توانی یان ئاگر لە کەمپی ئۆتومبیلەکانی دوژمن بەر بدەن لە بەغدا. جا لەبەر ئەوەی چەردەیەکی چاك سووتەمەنی تێدا بوو، تارادەیەك کاری لە هامشۆی هێزەکانی ئینگلیز کرد، چونکە ئەو هێزانە بۆ گواستنەوەو هێنان و بردنی ئازووقە سەربازەکانیان، زیاد لە پێویست پشتیان بە ئۆتۆمۆبیل دەبەست تاوەکو بیانگەیەنێتە مەیدانی جەنگ. بەتایبەتی لەو کاتەدا شۆڕشگێران توانیبوویان لە چەند جێگایەکی گرنگی ناوەڕاست و خوارووی وولاتدا، ڕێگای ئاسن تێك و پێك بدەن.[٢٤]

چەندین بەلگەو نیشانەی تری دوای « شۆڕشی بیست » یش جارێکی دی ئەوە دەسەلمێنن کە وردە وردە کرێکاران نەك هەر بوونەتە هێزێکی کۆمەلایەتی

خاوەن دەنگ رەنگی تایبەتی خۆیان، بەڵکو دەبوو حسابیشیان بۆ بکرێ. رۆژنامەی « العراق » ی سەر بە میری لە سەر ووتارێکیدا بە ناونیشانی « کرێکار بازووی پەیکەری کۆمەڵە » دەڵی: «.. ماوەیەکی دوورو درێژی مێژووی مرۆڤایەتی، کرێکاران بە نزمترین چینی کۆمەڵ دادەنران، بەڵام دەبێ ئەو حەقیقەتە بگوترێ کە ئەوانە بە هیچ شێوەیەك لە خەڵکی تر کەمتر نین.»[٢٥]

لە خۆڕایش نەبوو کە لە مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٢٢ دا، یەکەم بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی لە بەغدا، بۆ هەر جۆرە ئیش و پیشەیەك، سەرۆکێکی هەڵبژارد. ئەوەبوو رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە بە جۆرێك ئەم هەڵوێستەیان لێك دایەوە گوایە هەنگاوی یەکەمە بۆ « دامەزراندنی نیقابەی کرێکارانی رێك و پێك و سەرەنجامیش وولات لە رووی ئابوری یەوە سوودێکی زۆریان لێ وەردەگرێ.»[٢٦] جا لەگەڵ ئەوەیش دا کە ئەرکی ئەم دەستەیە بە تەنها بریتی بوو لە رێکخستنی کاروباری مووچەو رۆژانە بە شێوەیەك هەردوولا - کرێکارو خاوەن کار - قایل بکا، بەڵام سەرهەڵدان و چۆنیەتی هەڵسەنگاندنی بەم چەشنە، ئەو مەغزاو مەرامە دەبەخشن کە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە.

یەکەمین نیشانەی تێگەیشتن و پێگەیشتنی کرێکاران و هەستکردنیان بە رێگای خەباتی بێ ووچانیان لە پێناو دەستخستنی مافە رەواکانیان دا، بەندە بەو هەوڵ و کۆششەوە کە هوشیار ترین کەسی ئەو کرێکارانە[٢٧] لە پێناوی دامەزراندنی یانەیەکی سەربەخۆی کرێکاران دا بەختیان کرد. پاش ئەوەی میری لە رۆژی ٢٩ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٩ دا « یاسای کۆمەڵەکان » ی داناو لە ناوەڕاستی مانگی تەموزدا رۆژنامەکان بڵاویان کردەوە[٢٨]، هێزە سیاسی یەکانی عیراق کەوتنە خۆو بە رەسمی ی حزبی خۆیان پێکهێنا. کۆمەڵە پیشەیی یەکانیش یەك لە دوای یەك و بە گورجی ی دامەزران. لەوانە « نیقابەی پارێزەران » کە دوو لقی کردەوە، یەکێك لە « مووسڵ » و ئەوی ترلە « بەسرە »[٢٩]. ئنجا کۆمەڵی « ئەجزاچی یەکان »[٣٠] و « کۆمەڵی پزیشکان » ئەویش دوو لقی لە « مووسڵ » و « بەسرە » کردەوە.[٣١] بۆ یەکەمین جاریش دەستەیەك ئافرەت، یانەیەکی ئافرەتانیان بە ناوی « یانەی راپەڕینی ئافرەتان لە بەغدا » دامەزراند و لە کۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ دا کرایەوە[٣٢] هەر لەساڵی ١٩٢٤ دا جموجوڵێکی هەست پێکراو رووی دا بۆ دامەزراندنی چەندین کۆمەڵەی پیشەیی.[٣٣]

ئا لەم ماوەیەدا « کۆتایی ساڵی ١٩٢٤ » کرێکاران هەستیان بە رۆڵی مێژوویی خۆیان کرد و تێ گەیشتن کە « پێویستە کۆمەڵی تایبەتی یان بۆ دابمەزرێنرێ، تا هەوڵی حەوانەوەیان بدا و ئیش و کاریان رێك بخا و سەعاتی

ئیش کردن و رۆژانەو شتی تریان بۆ دیاری بکا ».[٣٤] ئنجا « محەممەد سالح ئەلقەزاز » و « محیەددین مەحەممەد»[٣٥] ی سەرۆکی « بەشی فیتەرخانەکەی کارگەی سوپا »[٣٦] و « قاسم عەبباس » ی کرێکاری رێگای ئاسن لە کارگەی « شالچی یە »[٣٧] ئەزروحالێکیان دا بە وەزارەتی ناوخۆ و تێیدا داوایان کرد ماوەیان بدرێتی، یانەیەکی کرێکاران دابمەزرێنن. بەلام وەزارەتی ناوبراو، سەرەرای هات و چۆی ئەوانە و سەرەرای ئەوەی کرێکارە بیانی یەکان، یانەی تایبەتی لەو جۆرەیان بۆ کرابووەوە، داواکەی ئەمانی دایە داواوە. بەرێوەبەرایەتی رێگای ئاسنیش ئەم دەستپێشخەری یەی کرێکارانی بە لاوە پەسەند نەبوو؛ بۆیە کەوتە خۆ چەند هەنگاوێکی ئیداری دژی « ئەلقەزاز » و « قاسم » و « عەبباس » نا. ئەمەی دوایی یانی لە جێگەکەی خۆی گواستەوەو زیادەی سالانەی ئەوانی تریشی راگرت.[٣٨]

بایەخی ئەم کارە بە تەنها لەوەدا نی یە کە سەرەتایەکی گرنگ سەبارەت هوشیاریی کرێکاران نیشان دەداو خۆی لە خۆیدا نیشانەی گۆرانێکی چۆنیەتی یە لە بیروهۆشی کرێکاران دا، بەلکو بێجگە لە مانەیش ئەوە دەگەیەنێ کە سەرەتای پێکهاتنی سەرکردایەتی یەکی کرێکارانەی هوشیار هاتووەتە مەیدان و لە پەرژەوەندی زەحمەتکێشان و هەل و مەرجی ئیش کردن و دابین کردنی ئەو پەرژەوەندی یانە، با بە شێوەیەکی سەرەتاییش بێ، تێ گەیشتووە. ئەم کاکلەیە کەوتە نەش و نما کردن و تا دەهات خەلکی هوشیاریان لەدەور کۆ دەبووەوە و بەوپەری دلسۆزی یەوە، خزمەتی مەسەلەکانی کرێکارانیان دەکرد و توانی لە قۆناغێکی نوێی مێژووی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق دا سەرکردایەتی بکا. گومان لەوەدا نی یە کە بە بێ ئەو کاکلەیە نەیان دەتوانی سیما و مۆرکی خۆرسکی ی لە خۆیان بکەنەوە.

وەنەبێ ئەو هەلویستەی وەزارەتی ناوخۆ وورەی بە « ئەلقەزاز » و هاورێکانی بەرادبێ، بە پێچەوانەوە بە درێژایی چەند سالێك، پاو بە ناو داخوزی یەکەیان تازە دەکردەوە، ئەگەرچی هیچ ئەنجامێکیان دەستگیر نەبوو.[٣٩] بەوەیشەوە رانەوەستان، بەلکو هەر لەو ماوەیەدا چەند جارێك لە رۆژنامەکانی ناوخۆدا گرنگی ی و بایەخی رێکخراوی کرێکارانەیان روون کردەوە.[٤٠] ژیانی پر لە ئەشکەنجەی زەحمەتکێشان و تەشەنە کردنی بێکاری لە ناویان دا، پالی پێوە نان ئەو رێگا تازەیە بگرنە بەر کە لە هێزە سیاسی یەکانی ترەوە فێری بوون. ئەویش

پێشکەش کردنی ئەرزوحال و داخوزیکردن لە لێپرسراوان بوو، بە هیوای ئەوەی دەستگیرۆیی یان بکەن و باری سەرشانیان سووك بکەن. لەو رۆژگارەدا کرێکاران وەك خەڵکی تر « هیوایەکی گەورەیان بە مەلیك و وەزیرە بەرێزەکان » هەبوو. چونکە دڵنیا بوون لەوەی کە « چاوی رەحمو بەزەیی یان » لێیانەوە دەبێ، وەك « کرێکارێکی بێ ئیش » لەو ووتارەیدا کە بە ناوونیشانی « هاواری کرێکارێك »[٤١] نووسیویەتی. ئەم جۆرە تێکۆشانە، تا ماوەیەك بووە شێوەی خەباتی کرێکاران. بەلام وردە وردە لە بێ ئەنجامی ئەم رێگایە تێ گەیشتن، چونکە نە هیچی دەست خستن و نە لەوەدوایش دەیتوانی دەستکەوتێکی کرێکارانەیان بۆ بچەسپێنێ. بۆیە کرێکاران دەرهەق بە میری کەوتنە قسە کردن کە دەبێ لە جیاتی پشتگیری کردنی کۆمپانیا بیانی یەکان، کرێکاران بپارێزی. ئەمە جگە لەوەی کە رەخنەیان لە نوێنەرانی گەلو وەزیرەکان دەگرت، چونکە گیروگرفتە بنچینەیی یەکانی کرێکارانیان پشت گوێ خستبوو.. پاشان « شکایەتێکی زۆر » بنەسەر رۆژنامەکاندا دابارییو « دەستە دەستە کرێکاری بێ ئیش رووی تێ دەکردنو بارگرانیی خۆیان روون دەکردەوە » بەلام میری « هیچ گوێی بەو هاتو هاوارەدا کە لە زاری سەدان خەڵکی بێ ئیشەوە دەهاتە دەرێ و هەنگاوێکی ئەوتۆتۆیشی نەنا، ئەو خەڵکە لەو تەنگو چەڵەمەیە رزگار بکا »[٤٢]

ئەوجا بزووتنەوەی کرێکاران لە دژی کۆمپانیا بیانی یەکان بە ئاشکرا دەستی پێ کردو سەرەتای مانگرتنی کرێکارانەی رێك و پێك لەو ماوەیەدا خۆی نواند. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٢٧ دا کرێکارانی رێگای ئاسن یەکەم مانگرتنیان ساز کرد[٤٣] و دروشمی چەند داخوازی یەکی پیشەیی یان بلند کردەوە. لەوانە: زیادکردنی رۆژانە بە ئەندازەیەك لەتەك رۆژانەی کرێکارە بیانی یەکاندا بگونجێ. هەروەها لەکاتی خۆیدا بە بێ دواکەوتن مووچەیان بدرێتێ[٤٤] و مۆڵەتیان دوا نەخرێ و کرێی خانووی ئەو کرێکارانە کەم بکرێتەوە کە لە خانوبەرەی بەرێوەبەرایەتی رێگای ئاسندا، نیشتەجێن. بەرێوەبەرایەتی ناوبراو بە دەنگ هەندێ لەو داخوزایانەوە هات، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە وەرگرتنی مووچەو دوا نەخستنی مۆڵەتەوە هەبوو. گفتیشی دا بە راستیی چاو بە داخوازییەکانی تردا بگێرێ. کرێکارانیش دوای ئەم هەنگاوە چوونەوە سەر ئیشو کاری خۆیان و بۆ یەکەمجار لە دژی چەوسێنەرانیان تامی سەرکەوتنیان چەشت. « محەممەد سالح ئەلقەزاز » کە دیارترینی سەرکردەی مانگرتنەکە بووە، بە تایبەتی ئەوە دووپات دەکاتەوە کە هاوکاری مانگرتووەکان لەم ئاقیکردنەوە نوێیەدا، وای لە رژێم کرد ناچار بێ حساب بۆ کرێکاران بکا.

تەنانەت کە داخوازی‌یەکەی پێشوویان لەمەڕ دامەزراندنی یانەی کرێکارانیان تازە کردەوە، دەم‌و دووی لێپرسراوان لەگەڵیان‌دا بە جۆرێکی تر بوو.[٤٥]

هەر لەو ماوەیەدا دەسپێشخەری‌یەکی نوێ هاتە گۆڕێ‌و خۆی لە خۆی‌دا بەڵگەی ئەو گۆڕانە بوو کە بزووتنەوەی کرێکاران لە سەرەتای نەش‌ونما کردنی‌دا بە خۆیەوە دی. لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٨ دا، « ٤٥ » کرێکار کۆبوونەوەو پرۆتستۆیەکیان دژی « هەڵس‌و کەوتی دڵڕەقانەی کۆمپانیای نەوت‌و تێکڕای کۆمپانیا بیانی‌یەکان » مۆر کردو پاشان وێنەیان دا بە لێپرسراوان و رۆژنامەکانی ناوخۆ.[٤٦] هەندێ دەسپێشخەری دیکەیش هەر لەو ماوەیەدا دەرکەوتن کە هەر یەکەیان لە رووی مێژووی‌یەوە بایەخی خۆیان هەبوو، چونکە بوونە سەرەتایەك بۆ دەرباز بوونی ئەو کرێکارانەی لە بنەڕەت‌دا جووتیار بوون‌و بە شێوەی جیا جیا پابەندی نەریت‌و رەوشت‌و پەیوەندی عەشایەری بوون. هەندێك سەرچاوە باسی ئەو ناکۆکی‌یانە دەکەن کە لە نێوان کرێکاران‌و سەرەك عەشیرەتەکان‌دا روویان داوە، سەبارەت بەوەی بە شێکی رۆژانەو مانگانەکانیان وەردەگرتن.[٤٧]

سەرپاکی ئەم بزووتن‌و گۆڕانکاری‌یانە لەتەك کۆتایی ساڵانی بیستدا تێکەڵ بە رەوتی بزووتنەوەیەکی فراوانتر بوون کە بە چەندین خاسی‌یەت‌و شێوەی دەربڕینی نوێ‌وە هاتنە کایەوە؛ هەموو ئەمانەیش بە ئاشکرا لە دامەزراندنی یەکەم کۆمەڵی کرێکارانەو پیشەیی‌یانەدا، رەنگیان دایەوە.

## سەرهەڵدانی کۆمەڵەی کرێکاری‌و پیشەیی

لە ناوەڕاستی ساڵانی بیستەوە کرێکاران و پیشەوەران کەوتنە خۆ و چەند جارێك هەوڵی دامەزراندنی کۆمەڵەی کرێکارانەیان دا. تا گیروگرفتەکانیان زیادی بکردایەو ئاڵۆزتر بوایە، توێژە هوشیارەکەی ئەو چینە باشتر پێی لەسەر خۆ رێکخستن دادەگرت‌و یەکخستنی تێکۆشانیانی بە پێویستی‌یەکی گرنگ لە قەڵەم دەدا. « محەممەد سالح ئەلقەزاز » ئەم مەسەلەیە بە کورتی‌ی‌و بە شێوەیەك باس دەکا بە ئاشکرا دیارە کە چاك لەو هەل‌و مەرجانە تێ گەیشتووە کە هەندێ گیروگرفتی زەحمەتکێشانی عیراقی کەم دەکردەوە؛ ئەوەتا لە بارەی پێکهێنانی کۆمەڵەی کرێکارانەوە، دەقاو دەق دەڵێ:

«... ئێمە بە تەواوی لاوازبووین‌و کەسێك نی‌یە داوای مافەکانمان بکاو لەبەردەم میری‌و کۆمپانیاکان‌دا ببێتە نوێنەرمان و لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندی‌یان بە ئێمەوە هەیە رێکمان بخەن؛ ئەم بێ دەسەلاتی‌یەیشمان

ئەنجامی ناکوکی نێوان خۆمانە.. یەکێتی‌یش ئەگەر بە شێوەیەکی راست و دروست پێك نەیەت ئەنجامێکی هەست پێ کراوی نابێ. رێکخستنیش تەنها بە رێگای دروستکردنی کۆمەڵو نیقابەوە دەبێ. سەبارەت بەم هۆیانەو بە یارمەتی کرێکارە هوشیارەکان نزیکەی دوو ساڵ لەمەو بەر چەند داخوزی‌یەکمان.[48] پێشکەش کردووە، تاوەکو رێگامان بدرێ ئەو کۆمەڵانە پێك بهێنین »[49]

بێ گومان لێپرسراوان نەیان دەتوانی تاسەر گوێ لە داخوازی کرێکاران سەبارەت بە پێکهێنانی کۆمەڵی تایبەت بەخۆیان بخەفێنن. چونکە لەوکاتەوەی کە وردە وردە دەنگی کرێکاران بەرز بووەوەو گیروگرفتەکانیان لە ناو رای گشتی ی‌و لە ئاستی رەسمییدا خۆیان سەپاند؛ ئارەزووی پێکهێنانی ئەو جۆرە کۆمەڵانە، تا دەهات لە کرێکاران‌و پیشەوەرە تازەکان‌دا، زیاتر تەشەنەی دەکرد.

پاشان « ئەلقەزاز » و هاورێکانی وازیان لە دامەزراندنی یانەی کرێکاران هێنا و لەناوەراستی ساڵی ۱۹۲۸ دا، داخوازی‌یەکی تازەیان دا بە وەزارەتی ناوخۆ و داویان کرد رێگایان بدرێ کۆمەڵێك بە ناوی « کۆمەڵی کرێکاران » ەوە[50] دابمەزرێنن. سەرتاشەکانیش شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرت. ئەوەبوو «محەممەد مەکی ئەلئەشتەری » و چەند سەرتاشێکی شاری بەغدا داوایان لە وەزارەتی ناوخۆ کرد، رێگایان بدەن « کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان » دابمەزرێنن، چونکە مەبەستیانە « گوزەرانی سەرتاشان باشتر بکەن‌و دەستی یارمەتی‌و برایەتی بۆ یەك دریژ بکەن و لە سایەی خۆشەویستی‌و دڵسۆزی و رێز لێگرتنی یەکتردا کۆ ببنەوە »[51] دەستەی دامەزرێنەری ئەم کۆمەڵەیە داوایان لە پەرلەمان کرد دەست بخاتە ئەم مەسەلەیەوەو وەزارەتی ناوخۆ ناچار بکا رێگای دامەزراندنی بدرێ؛ ئەوەبو، وتوویژێکی زۆر سەبارەت بەم مەسەلەیە لە نێوان پەرلەمان‌و لایەنە لێپرسراوەکان‌دا کرا.[52] رەنگە هەر بەو هۆیەیشەوە بووبێ کە « ئەلئەشتەری » و هاوەڵەکانی بەر لە خەڵکی‌دی مۆڵەتی دامەزراندنی کۆمەڵەکەیان وەگرت. « کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان » یش کە بە رەسمی ی لە ۱۰ ی شوباتی ساڵی ۱۹۲۹ دا[53] دامەزرا، بە یەکەمین کۆمەڵی پیشەیی دادەنرێ کە رێگای ئیش‌کردنی لە عیراق‌دا پێ درابێ.[54]

کرێکارانی چاپخانەو بەرگدرووەکان و شوفێرو میوە فرۆشان و زۆری تریش، یەك لە دوای یەك داخوازی پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆ کرا. بەڵام وەزارەتی ناوبرا و زۆر بە سستی ی لەو داخوازی‌یانەی دەکۆڵی‌یەوە. بە نموونە: مێوەفرۆشەکان لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۲۹ دا، داوای دامەزراندنی کۆمەڵەکەیان کرد[55]، کەچی وەزارەتی ناوخۆ چەند مانگێك وەڵامەکەی دوا

خستن‌و تا ٤ی کانوونی دووه‌می ساڵی داهاتوو، نه‌یانتـوانی یه‌کـه‌م ده‌سته‌ی به‌ڕێوه‌به‌ری کۆمه‌ڵه‌که‌یان هه‌ڵبژێرن.[٥٦]

به‌و جۆره له سه‌ره‌تای ساڵی ۱۹۲۹ وه چه‌ند کۆمه‌ڵه‌یه‌ك به ناوی پیشه‌یی جۆر به‌جۆره‌وه هاتنه ئاراوه و بێجگه له «کۆمه‌ڵی کرێکارانی چاپخانه‌کانی عیراق» که له ٤ی کانـوونی دووه‌می ساڵی ۱۹۳۰ دا بـه ره‌سمی‌ی ڕێگای دراو[٥٧] «کۆمه‌ڵه‌ی کرێکارانی میکانیکی عیراق» که له دوادوای مانگی کانوونی دووه‌می ساڵی ۱۹۳۰ دا به ره‌سمی‌ی مۆڵه‌تی وه‌رگرت[٥٨]، ده‌ڵێین بێجگه له‌و دوو کۆمه‌ڵه‌یه هیچ کام له‌وانی‌تر ناوی کرێکاریان پێوه نه‌بوو؛ هیچشیان له سه‌ره‌تادا ئه‌وه‌نده‌ی تۆزقاڵێك له خزمه‌تی کرێکاران‌و په‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌کانیان‌دا نه‌بوون، وه‌ك له‌مه‌ودوا ڕوونی ده‌که‌ینه‌وه.

جا ئه‌گه‌ر به وردیی ته‌ماشای چۆنیـه‌تی دروست بوونی ئـه‌م کۆمـه‌ڵانه بکه‌ین، ده‌بینین هه‌موویان له بنچینه‌دا کۆمه‌ڵی پیشه‌یین، یاخود کۆمه‌ڵێکن بنکه‌یان له کرێکاران‌و پیشه‌وه‌ران پێك هاتووه‌و ـ ورده بـۆرژوا ـ سه‌رکـردایه‌تی‌یـان ده‌کـه‌ن. با له‌و تـاقه کـۆمه‌ڵه‌یـه‌وه پێیدا بچـین کـه له نـاو تێکـڕای کـۆمـه‌ڵه نیشتمانی‌یه‌کان‌دا (٥٩) ناوی کرکارانی له خۆی ناوه، واته «کۆمه‌ڵه‌ی کرێکارانی چاپخانه‌کان». سه‌رۆکی ئه‌م کۆمه‌ڵه‌یه ناوی «عه‌بباس حوسه‌ین ئال ئه‌لچه‌له‌بی» یه و به مانای ته‌واوی ووشه خۆی کرێکار نه‌بوو. لێره‌دا گرنگ ئه‌وه‌یه ڕه‌چاوی ئه‌وه بکه‌ین ناوبراو کـه له ڕۆژی ۱۱ی کانـوونی دووه‌می ساڵی ۱۹۳۰ دا بـه ئه‌ندامی ده‌سته‌ی به‌ڕێوه‌به‌ری کۆمه‌ڵه هـه‌ڵبژێـردراوه‌کانی تـه‌نها ۳٦ ده‌نگی وه‌رگرت، ئه‌مه‌یش به نیسبه‌ت هه‌ڵبژێردراوه‌کانی تره‌وه که‌متـرین ژماره بـوو، چونکه تێیاندا هه‌بوو له دوو ئه‌وه‌نده‌ی ئه‌و زیاتر ده‌نگی هێنابوو[٦٠]. ڕاسته له داواکه‌ی ده‌سته‌ی دامه‌زرێنه‌ری «کۆمه‌ڵه‌ی کرێکارانی چـاپخانـه‌کان» دا کـه ڕۆژی ۲۷ی ته‌مموزی ساڵی ۱۹۲۹ پێشکه‌ش به وه‌زاره‌تی ناوخۆ کرا، باسی ئه‌وه کراوه که ئامانجی کۆمه‌ڵه[٦١] ئه‌وه‌یه «ئاگای له حاڵی کرێکارانی چاپخانه‌کان بێ له عیراق‌داو په‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌کانیان بپارێزێ» وئه‌م کۆمه‌ڵه‌به «سوودی تر ده‌به‌خشێ‌و ده‌بێته مایه‌ی خێرو خۆشی‌ی بۆ سه‌رتاپای وولات».[٦٢] به‌ڵام سه‌رۆکه‌کـه‌ی له یه‌که‌م کۆبوونه‌وه‌ی ده‌سته‌ی به‌ڕێوه‌به‌ردا که ڕۆژی ۱۸ی کانوونی دووه‌می ساڵی ۱۹۳۰ ساز کرا، له‌باره‌ی ئامانجه‌کانی کۆمه‌ڵه‌وه ده‌قاوده‌ق ده‌ڵێ:

«.. بـڵاو کـردنـه‌وه‌ی گیـانی خـۆشـه‌ویستی‌ی له ڕیـزی کـرێکـارانی چاپخانه‌کانی عیراق‌داو هه‌وڵدان بۆ پێشخستنی هونـه‌ری چاپکـردن وشاره‌زا

کردنی کرێکار لەم مەیدانەداو بە تەنگەوە هاتنی تەندروستی‌یان ئامانجمانە. هەرچیش لە تواناداا بێ بۆ پاراستنی مافی خاوەن چاپخانەکان دریخی ناکەین..»
پاشان کۆتایی بە قسەکانی دێنێ و دەڵێ:

«.. هاورێیان؛ لە سەرانسەری جیهاندا کرێکارانی چاپخانە خزمەتێکی زۆری کۆمەڵگایان کردووە، ئەوان نەبوونایە خەڵکی نەیان دەتوانی کتێب و رۆژنامە، کە پڕن لە زانیاری جۆر بەجۆر، بخوێننەوە. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرتان. دڵسۆزی خاوەن چاپخانەکان بن چی ئەرکی سەرشانتانە لە ئاستی ئەواندا بەجێی بهێنن»[٦٣]

بۆیە شتێکی سەیر نی‌یە گەر کۆمەڵەی ناوبراو لیژنەیەکی تایبەتی پێک بهێنێ و ئەرکی ئەوەی پێ بسپێرێ «بەشێوەیەکی عادیلانە کار بەسەر چاپخانەکاندا دابەش بکاو ناکۆکی نێوان کرێکارانیش ـ بڕوانە: تەنها لە نێوان کرێکاراندا ـ ك .م ـ بە ئاشتی‌ی چارەسەر بکا..».[٦٤] کاتێکیش سەرۆکی کۆمەڵە بۆی دەرکەوت بەم شێوەیە ناگاتە ئامانجەکانی و پاش ئەوەی دڵنیا بو لەوەی دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە لە بنەڕەتدا بە دڵی خاوەن چاپخانەکان نەبووەو[٦٥] بەرژەوەندی تایبەتی‌یان ناچاری کردن دڵڕەقانە بەرامبەر کرێکاران بجووڵێنەوە؛ دەڵێین لەو کاتەوە وردە وردە سیاسەتی خۆی گۆڕی. ئەم هەڵوێستەیش بە ئاشکرا لە ناوەرۆکی رۆژنامەی «نداء العمال» دا، دەردەکەوێ کە پاش دامەزراندنی کۆمەڵەکەیان بە ماوەیەك خۆی دەری دەکرد.[٦٦] لەگەڵ ئەوەیشدا سەرۆکی «کۆمەڵەی کرێکارانی چاپخانەکان» هێشتا هەر باوەڕی بە «گفتی شیرینی» گەورە لێپرسراوان «هیممەتی چالاکی‌یان» هەبوو. هیوایەکی گەورەیشی پێیان بوو کە «بەرژەوەندیی کرێکاری عیراق»[٦٧] بپارێزن. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە وازهێنانی «ئال ئەلچەلەبی» لە سەرۆکایەتی کۆمەڵەی ناوبراو، لەگەڵ پاشەکشەی بزوتنەوەی، کرێکاران و لە ئەنجامی هێرشی کۆنەپەرستاندا کە دوایی باسی دەکەین شتێکی سەرسوڕهێن نی‌یە.[٦٨]

لەوەیش سەیرتر ئەوەیە کە پەیڕەوی ناوخۆی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» تاقە ئیشارەتێکی تێدا نی‌یە، پەیوەندیی بەکرێکارانەوە هەبێ[٦٩] ئەمە لە کاتێکدا کە بنکەی سەرەکی‌ی کۆمەڵەیشیان پێك دەهێنا. بەلام سەرەڕای ئەوەیش لە هەموو کۆمەڵەکانی‌تر زیاترو دڵسۆزانەتر خزمەتی مەسەلەی رەوای کرێکارانی عیراقی کرد.[٧٠] بەرامبەر بەمەیش پرۆگرامەکەی چەند بەندێکی بنچینەیی تێدایە

راستەوخۆ پەرژەوەندی پیشە وەران دەپارێزێ. ئەوەتا ماددەی یەکەمی پەیرەوی ناوخۆی دەقاودەق دەڵێ: «تاکە مەبەستی» کۆمەڵە ئەوەیە «پیشە وەران لە رووی پیشەسازیو کۆمەلایەتیو ئەخلاقی‌یەوە پەروردە بکا». ماددەی دووەمیش دەڵێ: «کۆمەڵە هەوڵ دەدا پیشەسازی لە عیراقدا پێش بخاو ئەو کەسانەیش کە لیهاتوون دەیان نیرێتە دەرەوەی وولات تا لە یەکێک لە پیشەسازی‌یەکاندا ببنە پسپۆر». ماددەی «٢٥»یش پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ئەرکی لێژنەکانی کۆمەڵە ئەوەیە: «هانی ئەو پیشە سازی‌یانە بدەن کە خۆیان سەرەو کاری دەکەن.»[٧١] وەك پێشتریش باسکرا ماددەی ٢٧ - ٣٠ پەیرەوی ناوخۆی کۆمەڵ دەقاودەق دەڵێ: پێویستە ساڵی دوو پێشانگا بە مەبەستی هاندانی پیشەشازیی نیشتمانیی بکاتەوە.

ناوەرۆکی ماددەی حەوتەمی پەیرەوی ناوخۆ بە باشی‌ی رۆشنایی دەخاتە سەر بنچینەو بینای کۆمەڵەی ناوبراو لە سەرەتای دروست بوونی‌یەوە. ئەو ماددەیە دەڵێ: هەر عیراقی‌یەك -بڕوانە: هەر- عیراقی‌یەك بێ ئەوەی تەماشای ئەوە بکرێ سەر بە چ چینێکی کۆمەلایەتی‌یە ك م -ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێ بە ئەندامی ئەم کۆمەڵە وەردەگیرێ.

ئا : تەمەنی لە بیست ساڵ کەمتر نەبێ.

ب : رەوشتی باش بێ.

جـ : مافی مەدەنی‌ی لێ وەر نەگیرابێتەوە.

د : بەلای کەمەوە دوو ئەندامی کۆمەڵ بیناسن.

پاش هەموو ئەمانە شتێکی زۆر سروشتی‌ی بوو کە «محەممەد ساڵح ئەلقەزاز»[٧٢]ی باوەڕ پێکروای «کۆمەڵەی سنعاتکاران» داوی مۆڵەت پێدانی کۆمەڵەکەیان، بانگەوازێك بۆ «کرێکاران و سنعاتکاران» دەربکاو تێیدا بانگیان بکا بێنە ناو ئەو کۆمەڵەوە کە بۆ «بەرگری کردن لە پەرژەوەندیو پاراستنی ئەو بەرهەمانەتان کە لە کەڵك کەوتن و لە ناوچوون» دروست بووە. «دەی‌خۆ کەون با یەکگرین و بەهەمووان هاریکاری یەکتر بکەین و لەبەردەم خووانیشبتماندا پەیمان بدەین کە لە دوای ئەم یەکێتی‌یە جیا نە بینەوە»[٧٣] لێرەدا بە ئاشکرا دیارە کە مەبەستی لە یەکێتی‌ی نێوان «کرێکاران و خاوەن پیشەسازی‌یەکان» ە.

وا پێ دەچێ پیشەوەران یان سنعاتکاران بە هۆی نەزانین و وتێ نەگەیشتنی جیاوازی نێوان کرێکاران و پیشەوەرانەوە، خۆیان بە کرێکار لە قەڵەم دابێ. یاخود لەبەر ئەوەی کە کرێکاران بووبوونە خاوەنی دەنگو رەنگی خۆیان و

جێ پێیان له کۆمه‌ڵدا قایم کـردبوو، پیشـه‌وه‌ره‌بچکۆله‌کـان حه‌زیـان ده‌کرد شانازیی به‌وه‌وه بکه‌ن گوایه ئه‌وانیش کرێکارن. شایانی باسه «محه‌ممه‌د ساڵح ئه‌لقه‌زاز» که‌یه‌مین نیقابی‌یه، تا ئه‌مڕۆیش پێ له‌سه‌ر ئه‌وه داده‌گـرێ کرێکـار بووه‌و زۆریش شانازی‌پێوه ده‌کـا.[74] ئه‌م «کـرێکاره» سـاڵی ١٩٠٥ هاتـووه‌ته دونیاوه‌و به هه‌موو پێوانه‌کانی ئه‌وسای وولاتانی رۆژهه‌ڵات، سه‌ر به خێزانێکی مام‌ناوه‌ندی بووه.[75] باوکی پیشه‌وه‌ر بووه گوڵنکه‌ی هه‌ڵده‌بـه‌ست. سه‌بـاره‌ت به‌وه‌ی گوزه‌رانی باش بووه، هه‌ر چوار کوڕه‌که‌ی «واته: محه‌ممه‌د ساڵح‌و سێ براکه‌ی تـری» ناردووه‌تـه به خـوێندن. ئـه‌میان نـه‌بێ، ئه‌وانی‌دی بـوونه‌تـه مووچه‌خۆرو به پێودانی سه‌رده‌می خۆیان پله‌و پـایه‌ی دیـاریان هـه‌بووه.[76]. «محه‌ممه‌د ساڵح» قۆناغی سه‌ره‌تایی له به‌غدا ته‌واو کردووه‌و پاشـان له ساڵی ١٩١٧ دا چووه‌ته «مه‌کته‌بی پیشه سازی‌یه‌کان»[77]. پاش چه‌ند ساڵێك چووه‌ته «قوتانجانه‌ی بازرگانی‌ی ئه‌هلی‌ی ئێواران. جگه له زمانی زگماکی خۆی، زمانی ئینگلیـزی‌و تورکی‌و هینـدۆسیش به چـاکی‌ی ده‌زانێ.[78] دیاره هـه‌موو ئـه‌م سیفه‌تانه‌و زیره‌کی‌ی خۆیشی.[79] وایان کردووه له هاوته‌مه‌نه‌کانی خۆی زیاتـر ماوه‌ی خۆ رۆشبنیر کردنی بۆ بڕه‌خسێ. ته‌نانه‌ت‌زۆر جاریش داویان لێ کردووه ببێته مووچه‌خۆر. ئه‌مه جگه له‌وه‌ی له گه‌رمه‌ی رۆژگاری سه‌رکردایه‌تی کردنی بزوتنه‌وه‌ی کرێکاران‌دا، وه‌رشـه‌یه‌کی ئـاسنگه‌ریی‌و چـاگردنـه‌وه‌ی ماشـێن‌و ئامرازی جۆر به‌جۆری هه‌بووه. دانیشتووی گه‌ره‌کی «ئه‌عزمی‌یه» یش بوو که ئه‌وسا به باشترین گه‌ڕه‌کی «بـه‌غدا»داده‌نـرا.[80] که‌واتـه یه‌کـه‌مین نیقـابی‌و سه‌رۆکی «کۆمه‌ڵه‌ی سنعاتکاران» یان باوه‌ڕپێکراوی ئه‌وکۆمه‌ڵه‌یه، پیشه‌وه‌رێکی لیبرالی‌و نیشتمانپه‌روه‌رێکی ره‌سه‌ن بووه‌و به هۆی زرووفی تایبه‌تی‌و مه‌وزوعی‌ی خۆیه‌وه[81]، وه‌ك پێشتر باسی هه‌ندێ لایه‌نی بنچینه‌یی‌مان کرد[82] بووه‌ته خاوه‌نی مه‌سه‌له‌ی کرێکاران. ئه‌م حه‌قیقه‌یش ئه‌و بۆچوونه‌مان چاکتر ده‌چه‌سپێنێ که تاچ راده‌یه‌ك پیشه‌وه‌ران توانیویانه له ناو بزووتنه‌وه‌ی کرێکارانی عیراق‌دا ده‌وری خۆیان ببینن.

سروشتی چینایه‌تی ئه‌م کۆمه‌ڵانه پاڵی به سه‌رکرده‌کانیانه‌وه ده‌نـا ، له هه‌موو بـۆنه‌یـه‌ك‌دا پشتگیریی پیشـه‌سازیی نیشتمـانی‌ی بکه‌ن . تـه‌نانـه‌ت کۆبوونه‌وه‌کانی هه‌ندێکیان له‌بنچینه‌دا بۆ ئه‌وه ته‌رخان ده‌کران ووتاری جـۆر به‌جۆر له باره‌ی پشه‌سازی نیشتمانی‌یـه‌وه بخوێنـرێته‌وه ، وه‌ك « کـۆمه‌ڵه‌ی هاریکاری سه‌رتاشان » له ئاهه‌نگی رێز لێنانی شه‌وی ٢٧ ی کانوونی دووه‌می

سـالی ۱۹۳۰ دا بـه بـۆنـه‌ی مـۆڵه‌ت پێـدانی « کـۆمـه‌ڵه‌ی کـرێکـارانی چاپخانه‌کان » ه‌وه کردی . ئه‌وه بوو به‌شی زۆری ئه‌و ووتارانه‌ی به‌و بۆنه‌یه‌وه خوێندرانه‌وه قسه‌یان له‌ پیشه‌سازی چنینی نیشتمانی ده‌کرد[۸۳] . که‌چی که‌سێك نه‌بوو له‌و ده‌یان کۆڕو کۆبوونه‌وه‌یه‌دا که کۆمـه‌ڵه‌کان‌و له‌ پێش هـه‌موویـانه‌وه « کۆمه‌ڵه‌ی سنعاتکاران » ده‌یان گێڕا توختی ئه‌وه بکه‌وێ چۆن‌و به‌ چ شێوه‌یه‌ك سه‌رمایه‌ی نیشتمانی‌ی کرێکاران ده‌چه‌وسێنێته‌وه ، یان باسی ئه‌وه بکا بـاری ژیانی کرێکاران له‌ ناو دامه‌زراوه ئه‌هلی‌یه‌کان‌دا زۆر له‌ باری ژیانی کرێکارانی ناو کۆمپانیا بیانی‌یه‌کان خراپتره . به‌ نموونـه : له‌ کۆمپـانیای « تـه‌راموای » دا کرێکار نۆزده سه‌عات له‌سه‌ر یه‌ك ئیشی ده‌کرد ، رۆژانه‌که‌یشی زۆربه‌ی کات له‌ روپیـه‌یه‌کی تێ نـه‌ده‌پـه‌ڕانـد[۸٤] . وه‌نـه‌بێ زرووف کـرێکـارانی چـاپخـانـه ئه‌هلی‌یه‌کانیش له‌وان باشتر بوو بێ[۸۵] . ئه‌وانـه ئه‌وسـایش‌و ئێستایش له‌نـاو کرێکارانی وولاته دواکه‌وتووه‌کان‌دا که‌رتێکی رۆشنبیر پێك ده‌هێنن ، له‌به‌ر ئه‌وه هه‌ندێ جار زۆر به‌گران ئه‌و ژماره‌یه‌ی که پێویسته ده‌ست ده‌که‌ون . هه‌ر له‌سه‌ر بناغه‌ی چه‌وساندنه‌وه‌ی کرێکارانیش بوو که سه‌رمایه‌ی نیشتمانی‌ی به‌ پێودانی ئابوری ئه‌و کاته‌ی کۆمه‌ڵگای عیراق قازانجێکی خه‌یاڵی ده‌ست که‌وت . ئه‌وه‌تا پاش تێپه‌ڕ بوونی چه‌ند ساڵێك به‌سه‌ر دامه‌زراندنی کارگه‌ی « فه‌تتاح پاشا » دا ، سامانی ئه‌و خێزانه به‌ ٤ ملیۆن دینار خه‌مڵ کراوه ، ئه‌مه له‌ کاتێکدا که کوڕه‌که‌ی « فه‌تتاح پاشا » تـا ساڵی ۱۹۲۰ مـووچه خـۆرێکی میری بـووه‌وه مانگانه‌که‌ی له‌ « ۵۰۰ » روپیه تێپه‌ڕی نه‌ده‌کرد. سامانی « محـه‌مه‌د تـاهیر ئه‌لبه‌غدادی » یش که ساڵی ۱۹۳٤ کارگه‌یه‌کی هاوبه‌شی جگه‌ره دروست‌کردنی دامه‌زراند گه‌یشته دوو ملیۆن دینار ، که‌چی به‌ر له‌وه‌ی ئه‌م کارگه‌یه دابمه‌زرێنێ داهاتی ساڵانه‌ی له‌ ۱۵۰۰ روپیه تێ نه‌ده‌په‌ڕی[۸٦] . وه‌ك « ئه‌لقه‌زاز » بـاسی ده‌کا : سه‌ره‌رای ئه‌وه‌ی که ئه‌و کۆمه‌ڵانه‌ی دامه‌زران پێویستی یه‌کی له‌ راده به‌ده‌ریان به‌ یارمه‌تی هه‌بوو ، به‌ڵام هیچ کام له‌و پاره‌دارانه ده‌ستی یارمه‌تی‌یان بـۆ درێژ نـه‌کردن[۸۷] ، بـۆیه رۆشنبیـران‌و کرێکـاران بـه خـۆرایی بـاربـوی ئیشوکاره‌کانیان ده‌کردن‌و رایان ده‌په‌ڕاندن[۸۸] ، ده‌ڵێین سه‌ره‌ڕای هه‌موو ئه‌مانه کـه‌چی له‌ ناو هـه‌مووان‌دا « نـووری فه‌تتـاح پاشـا » به‌ سـه‌رۆکی شه‌ره‌ف « کۆمه‌ڵه‌ی سنعاتکاران » هه‌ڵده‌بژێرد را[۸۹] .

با له‌ هه‌موو ئه‌و شتانه گه‌ڕێین که پێشتر باسکران ؛ دامه‌زراندنی ئـه‌م کۆمه‌ڵانه به‌ خاڵێکی دره‌وشه‌دار و گرنگی مێژووی نوێی عیراق داده‌نرێ‌و کاتی

خۆی لە زۆر مەیدانی جیاجیای رای گشتی ی عیراق دا بە شێوەیەکی بەربلاو دەنگی دایەوە . هێزە نیشتمانی یەکان و رۆژنامەکانی ناوخۆ بایەخێکی هەست پێکراویان بەم « بزووتنەوە پیرۆزە » داو هانی وەزارەتی ناوخۆیان دەدا ماوەی دامەزراندنی ئەو چەشنە کۆمەڵانە بدرێ تاوەکو « چینی کرێکاران جموجوڵی تێ بکەوێ »[90] دوواییش دەستی رێزیان بۆ « کاری پڕ سوود » یان بەسنگەوە گرت و لایان وابوو « بایەخ دان بە کرێکاران و بەرهەمەکانیان ئەرکێکە و لە ئەستۆیانە ».[91] بە بۆنەی مۆڵەت پێ دانی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » ەوە ، رۆژنامەی « العالم العربی » سەر ووتاری ئەو رۆژەی بە ناونیشانی « پێویستی ی پاڵەوان و کردار دەخولقێنێ » تەرخان کرد . نووسەری ووتار دەڵێ :

«کە دەوترێ ئەوانەی بە رەنجی بازووی خۆیان دەژین ـ بەراستیش ئەوانە بە شەرەفترین کەسن ـ و لە پێناوی خۆشگوزەرانی دا هەڵپەی ئیش دەکەن و دەیانەوێ مافە پیرۆزەکانیان زامن بکەن ، دڵخۆش دەبم ، وەك دڵخۆشی ی ئەوانەی نەك ئاو بەڵکو خوێن بە دەمارەکانیان دا دەگەڕێ[92] »

ئنجا قسەو رای هەمە چەشن لە بارەی کرێکارانەوە سەریان هەڵدا ، کە تا ئەو کاتە نەبیسترابوون . « کرێکاران ، واتە هەموو ئەوانەی بە ئارەقی ناوچەوانیان نان دەخۆن ـ وەك خوا فەرموویەتی ـ بەخشندەن و سوود بەخش ترین ئەندامن بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ، چونکە هەم بۆ خۆیان و هەم بۆ خەڵکی ی ئیش دەکەن و گەر بێ و لە کار بکەون ژیان رادەوەستێ »[93] ئەم جۆرە هەڵوێستە ئەوەندەی تر ورەی کرێکارانی بەرز کردەوەو زیاتر باوەڕیان بە خۆیان پەیدا کرد ، بە تایبەتی چونکە بە درێژایی چەندین ساڵ لە کۆمەڵدا پشت گوێ خرابوون . ئەوەتا کرێکارێك لە ئاهەنگێك دا کە سەرتاشان و کرێکاری چاپخانەکان تێیدا ئامادە بوون ، بەم جۆرە هەستی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ : « لە ناو لەشی ئەو کرێکارانەدا کە ئێستا خەریکن لە خەوی چەند ساڵە راستیان دەبێتەوە گیانێك هەیە ، ئەویش گیانی راپەڕین و هەڵمەت بردنە رووەو بەرزیی »[94] .

لە لایەکی تریشەوە ئەم کۆمەڵانە ، خزمەتێکی زۆری ئەندامە کرێکارو پیشەوەرەکانی خۆیان کرد . گەر بێ و ئەوە لە بەرچاو بگرین کە ئەمانە یەکەمین دامودەزگان لە مێژووی عیراق دا ئەرکی داکۆکی کردنیان لە مەسەلەی کرێکاران خستە ئەستۆ ، ئەوەندەی تر بایەخی ئەو خزمەتگوزاری یە مان بۆ ساغ دەبێتەوە . هەر ئەو کۆمەڵانە بوون لە دژی بێکاری دەجەنگان و پەردەیان

لەسەر هەلویستی نارەوای کۆمپانیا بیانی‌یەکان بە رامبەر بە کریکارانی عیراق داماڵی‌و چەندین یادداشت‌و پرۆتستویان سەبارەت بەم دوو مەسەلەیە پیشکەش کرد . « کۆمەڵەی سنعاتکاران » و « کریکارانی چاپخانەکان » و « هاریکاری سەرتاشان » چەند دەورەیەکیان کردەوەو بە ئیواران ئەندامە نەخویندەوارەکانیان فیری خویندن‌و نووسین دەکردو ئاستی خویندەواری ئەوانی تریشیان بەرز دەکردەوە . هەندێ جاریش زمانی عەرەبی‌و ئینگلیزی‌و لایەنە بنچینەیی‌یەکانی تەکنیکی نوێ دەگوترانەوە ، بەتایبەتی کە سەرکردەی ئەو کۆمەلانە لەوە تێگەیشتن کە « کاتی ئەوە هاتووە کریکاران لە خەوی غەفلەت راستیان بیتەوەو داوای زانست‌و بەرووبومی ژیان بکەن »[٩٥] ئەم کۆمەلانە چەندین ئاهەنگ‌و کۆڕیان گێراو ئەندامانیان کۆدەبوونەوە وگوێیان لەو ووتارانە دەبوو کە بۆ خەڵکی وەك ئەوان تازەو نەبیستراو بوون ، وەك « کریکارو شوین دەستی لە ژیانی پراکتیکی‌دا »[٩٦] و « پەیوەندی‌یەکانی کریکاران لە جیهاندا »[٩٧] و « یەکیتی‌ی‌و شوین دەستی لەکۆمەڵدا »[٩٨] و « کۆمەڵە پیشەیی‌یەکان و شوین دەستیان لە کۆمەڵدا »[٩٩] و « سەرتاش‌و پەیوەندی پیشەکەی بە تەندروستی‌یەوە »[١٠٠] و زۆر بابەتی تریش کە هەر هەموویان ئامانجیان هاندانی کریکاران بوو تا « زیاتر تێبکۆشن » و « کۆششیان یەك بخەن‌و ئەو تویژە ون‌بووە لە خەوی غەفلەت راست بکەنەوە ، بۆ ئەوەی کۆمەلیك کریکاری بەهیزی یەککرتوو پیك بهینن‌و لە ئیستا زیاتر داوای ئەو مافانەیان بکەن کە لە زۆر رووەوە پشت گوێ خراون » تا ئەو کاتەی « کریکاری عیراقی بە مافی زەوت کراوی خۆی شاد دەبیتەوەو کەرامەتی پێشیل کراوی دەست دەکەویتەوە »[١٠١]

بە هۆی ئەم کۆمەلانەوە ، کریکاران‌و پیشەوەران بۆ یەکەمجار کاری شانۆیی‌یان کردە ئامرازی خۆ رۆشنبیرکردن[١٠٢] هەندێ جاریش ئەم کۆمەلانە بە پێی ئەو توانا کەمەی هەیان بوو ، یارمەتی ئەندامە نەداراو دەست کورتەکانیان دەدا[١٠٣] جاری وایش هەبوو جموجۆڵی ئەم کۆمەلانە ئەنجامی راستەوخۆیان وەدەست دەهینا . بە نموونە : لە کۆڕیکی « کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان » دا هەر ئەوەندەی خاوەن باس لە خویندنەوەی نووسینەکەی بووەوە ، تیکرای ئامادە بوان بریاریان‌دا کەس بۆ قومارکردن هامشۆی « لۆنا پارك » نەکا ؛ وا پێ دەچی خەڵکیکی زۆری سەر بە چینە هەژارەکان لەو سەردەمەدا خوویان دابیتێ‌و بەدەستی‌یەوە نالاندوویانە[١٠٤]

جموجوڵی کۆمەڵەی کرێکاران و پیشەوەران لە ناو رای گشتی ی عیراق‌دا بە باشی دەنگی دایەوە . ئەوەتا « ئیبراهیم حیلمی ئەلعومەری » کە رۆشنبیرێکی ئەو قۆناغەیە بەم شێوەیە چالاکی ی ئەوسای کرێکاران هەڵدەسەنگێنێ :

«هەرکەسێك شوێن پێ ی راپەرینی کرێکارانی عیراق هەڵبگرێ و خۆی بگەیەنێتە ناو یانەو کۆمەڵەکانیان و گوێ لەو بیرورا ئازادانەیان بگرێ کە لە کۆرو کۆبوونەوەکانیان‌دا دەری دەبرن و بە باشی بڕوانێتە ئەو شێوە تێفکرینەی کە چارەسەری هەل و مەرجی ئیش کردن و مەسەلە تایبەتی یەکانی خۆیانی پێ دەکەن ؛ خێرو خۆشی یەکی زۆر لەمانە رادەبینێ و وایان لێ چاوەڕوان دەکا ببنە هۆی شانازیی هەمیشەیی نیشتمان و خۆشگوزەرانی یەکی بەردەوام ..»[105] « سەلمان ئەلسەفوانی » یش رووی دەم دەکاتە کرێکاران و دەڵێ : « ئەم خۆ یەکخستنەتان لە ناو کۆمەڵەکانتان‌دا و لە دووساڵ لەمەوبەرەوەو دەنگی دلێرانەتان کە جاروبار بە هۆی رۆژنامەوە لە ئاسۆی وولات‌دا دەنگ دەداتەوە موژدەی خێرو خۆشی یەو هیوا دارین لە داهاتوودا ببێتە رووناکی یەکی ئەوتۆ پەردەی رەش و تاریکی لەسەر ئەم وولاتە لێ قەوماوە بڕەوێنێتەوە »[106] گۆڤاری « الحاصد » یش چالاکی ئەم کۆمەڵانە بە بەڵگەی « راست بوونەوەی کرێکاری عیراق لەپاش نوستنێکی دوورو درێژ » لەقەڵەم دەداو « گیانێکی بەرزە » و خەریکە دەرژێتە « دەروونی کرێکارانی عیراقەوە » وەك سەرنووسەری گۆڤاری ناوبراو لە دوای بەشداری بوونی لە کۆبوونەوەیەکی « کۆمەڵەی کرێکارانی چاپخانەکان » دا ، نووسیبووی[107] .

هەرچەندە جموجوڵی کۆمەڵەی کرێکاران و پیشەوەران بە تەنها لە بەغدادا چەقی بەستبوو ، بەڵام کارێکی ئەوتۆیشیان کرد ، کرێکارو پیشەوەری شارەکانی تریش بگرێتەوەو ئەنجامیش نەك هەر لە هەندێکیان‌دا لقی کۆمەڵەکانی بەغدایان تێدا کرایەوە ، بەڵکو لە چەند شارێکیشدا کۆمەڵی سەربەخۆ دامەزران ؛ وەکو « کۆمەڵەی میوەفرۆشان » لە « مووسڵ » کە وەزارەتی ناوخۆ لە سەرەتای تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ دا مۆڵەتی دامەزراندنی[108] دا . هەروەها ژمارەیەکی زۆر کرێکارو پیشەوەر ، داخوازی یان پێشکەش بە بارەگای کۆمەڵەکانی بەغدا کردو دەیانویست لە شارەکانیان‌دا لقی ئەو کۆمەڵانە بکرێتەوە[109] دەستەی بەڕێوەبەری هەندێ لەو کۆمەڵانەیش بە مەبەستی پێکەوە نانی پەیوەندی یەکی راستەوخۆ لەگەڵ زەحمەتکێشان و هێزە سیاسی یەکان‌دا ، سەریان لە ناوچەکانی‌تر داو هەر بەراستیش توانی یان لەو کارەی پێیان سپێردرابوو ، تارادەیەك سەرکەوتن وەدەست بێنن[110] .

کـۆمەڵەی « هـاریکاری سـەرتاشـان » بە هـۆی « محـەمـەد مـەکی ئەلئەشتـەری »[111] یەوە کـە سەرۆکی بـوو ، لەگەڵ « کـۆمەڵەی کـرێکارانی چاپخانەکان » کە بەهۆی سروشتی پیشەکەیانەوە هـوشیاری‌یـەکی باشیـان هەبوو ، لە سەرپاکی کۆمەڵەکانی‌تری ئەو قۆناغە جموجوڵو جەماوەریان زیاتر بوو . بەڵام لەگەڵ ئەوەیش‌دا هێشتا هەر « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بزێوترین‌و بەهێزترینی هەموو ئەو کۆمەڵانە بوون‌و لە هەموویشیان پتر خەریکی مەسەلە بنەڕەتی‌یەکانی جەماوەری کرێکاران بوو .

---

## کۆمەڵەی سنعاتکاران

---

ئەو داوایەی دەستەی دامەزرێنەری « کۆمەڵەی کرێکاران » پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆی کرد ، تا ماوەیەکی زۆر لە لایەن وەزارەتی ناوبراوەوە دوا خرا چونکە ، یەکەم : ئامانجی کۆمەڵە ئەوەبوو کەرتێکی فراوانی کرێکاران ڕێك بخا . دووەم : لەبەرەئەوەی بە تەنها ئەو ، دەبوو ڕوو بە ڕووی کۆمپانیایەك ببێتەوە کە تا ئەو کاتە لەژێر ڕکێفی ئینگلیزدا بـوو ، هەر ئـەوانیش بەڕێـوەیان دەبـرد . سێیەم : دەستەی دامەزرێنەری ئەو کۆمەڵەیە بزێوتـرین کرێکـار بوون‌و ڕژێم دانی خێری پێدا نەدەنان . چوارەم : ئەو کۆمەڵەیەی پێشنیازی دامەزراندنی کرا ، ناوی کۆمەڵەی کرێکارانی لێ نرابوو . بەڵام پاش ئەوەی وەزارەت مۆڵەتی « کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان » ی داو بە هـۆی ئەوەی کـە بەردەوام پێ لەسەر ئەم داخوازی‌یە دادەگیـرا ، وەزارەتی ناوخـۆ بە داواکـەی دەستەی دامەزرێنەر قایل بوو ، بە مەرجێك ناوی کرێکاران بگۆڕدری بـە ناوێکی دی . ئەنجام هەمووان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن ناوی « سنعاتکاران » ی لێ بنێن . ئنجا بە بۆنەی ئەوەی کە وەزارەتی ناوخۆ ڕێگای‌دا بەڕێز « عەبدولڕەحیم ئەفەندی ئـەلتکریتی »[112] و هـاوەڵەکـانی کـۆمـەڵەیـەك بـە نـاوی « کـۆمـەڵەی سنعاتکاران »[113] ەوە دابمەزرێنن ڕۆژنامەکانی نـاوخۆ بـە پیر ئـەم هەواڵەوە چوون‌و موژدەیان بە هەموو « سنعاتکاران » دا . کۆمەڵەی ناوبراویش ڕۆژی مۆڵەت پێ‌دانی کە ڕێکەوتی ١ ی تەمموزی ساڵی ١٩٢٩ ی دەکرد ، بە مێژووی ڕەسمی‌ی دامەزراندنی خۆی دانا[114] .

ئەم کۆمەڵەیە هەر لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی‌یەوە دیسپلین‌و ڕێك‌وپێکی پێوە دیار بوو . ئەوەتا دەستەی دامەزرێنەری بە هۆی ڕۆژنامەکـانەوە کـات‌و

شوێنی هەڵبژاردنی یەکەم دەستەی بەڕێوەبەری ، بە پێی ماددەی یازدەی پەیڕەوی ناوخۆی دەست نیشان کرد[115] . لە کاتی دەست نیشان کراودا « ٢٦ ی تەمووزی ١٩٢٩ » دەستەی گشتیی لە بیناکەی « ئامۆژگای زانستی » کۆبوونەوەو ئەنجامی هەڵبژاردنەکەیش بەمجۆرەی خوارەوە بوو .

١ ـ محەممەد سالح عەبدولجەببار ئەلقەزاز ـ سەرۆك .

٢ ـ ئەحمەد ئەلسەید محەممەد ـ جێگری سەرۆك .

٣ ـ محەممەد موستەفا « کرێکار لە رێگای ئاسن » سکرتێر .

٤ ـ نەعیم فەتتوحی « فیتەر لە رێگای ئاسن » ئەمینداری سندووق .

٥ ـ یوسف ئەلسەید تاها « فیتەر لە رێگای ئاسن »[116] چاودێری گشتیی

٦ ـ عەبدولجەببار سەلمان « فیتەر ، سەرۆکی بەش لە کارگەی سوپایی » ئەندامی یاریدەدەر .

٧ ـ محیەددین محەممەد «کرێکاری رێگای ئاسن»[117] ئەندامی یاریدەدەر[118]

سەرەتا « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بیناکەی سینەما « رۆیاڵ » یان کردە بارەگای خۆیان و دوایی لە مانگی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا گواستییەوە بۆ بارەگا تایبەتییەکەی خۆی لە «حەیدەرخانە»[119]

بە پێی ماددەی ٣٧ ی پەیڕەوی ناوخۆ « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بێجگە لە دەستەی بەڕێوەبەر چەند لیژنەیەکی تریشی هەبوو ، وەك لیژنەی توکمەچییەکان و لیژنەی تۆڕنەچییەکان و هی تریش ، هەر یەك لەم لیژنانەیش دەستەی بەڕێوەبەر و سەرۆکی خۆیان هەبوو[120]

پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵە[121] لە نۆ بەش و ٣٩ ماددە[122] پێك هاتووەو ئامانجی کۆمەڵەو مەرجی وەرگرتنی ئەندامان و ئەرکی دەستەو لیژنەکانیان دیاری کردووە .

ماددەی یەکەمی پەیڕەوی ناوخۆ بە شێوەیەك ئامانجی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » ی دارشتووە ، گەر وا نەبوایە هەرگیز ماوەی نەدەدرا لە باروزرووفی ئەوسای وڵاتدا ئیش بکا .[123] ماددەی یەکەم دەڵێ : « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بە هیچ جۆرێك توخنی سیاسەت و ئاین ناکەوێ و تاکە مەبەستی ئەوەیە ، سنعاتکاران لە رووی رەوشت و پیشەسازیی و زانستیی و کۆمەڵایەتییەوە پەروەردە بکاو بیروباوەڕی بەرز لە ناو ئەندامانیدا بڵاو بکاتەوە »[124] سەرۆکی کۆمەڵیش چەندین جار لەو ووتارانەیدا کە بە بۆنەی جیاجیاوە دەیخوێندنەوە ، ئەم مەسەلەیەی دووبارە دەکردەوە . بە تایبەتیش لەو کاتانەدا پێی لەسەر ئەم مەسەلەیە

دادەگـرت کـە دەسـەلاتدارانی رژێم دەیـانـویست بـە بیـانـوووی خۆهەڵقورتاندن لە کاروباری سیاسەتەوە ، کۆمەڵە دابخەن . دیارە ئـەم شێوە تێ‌روانینەیش رای ئەوانەبوو کە جڵەوی کـاروباری سیـاسەتیـان بەدەستەوە بووو ، وایان دادەنا گوایە سیاسەت پیشەیەکە رەشـە خەڵك لێی نازانن . لەبەر ئـەوە قەدەغـە کردنی سیـاسەت هـەر « کۆمـەڵەی سنعـاتکاران » ی نـەگرتبـووەوە بەڵکـو سەرپـاکی کـۆمـەڵە پیشـەیی‌و کرێکاری‌یەکان بە بێ جیاوازی بەدەستی‌یەوە دامابوون . بـە نموونـە : « محەممەد مەکی ئەلئەشتەری » سوور بوو لەسەر ئەوەی کە مەبەستی « کـۆمەڵەی هـاریکاری سـەرتاشـان » تەنهـا « هاریکـاری‌و ئـابـوری‌و تەندروستی‌یەو بەس . هیچ پەیوەندی‌یەکی بە سیاتەوە نی‌یە »[١٢٥] .

بێ گـومان ئـەم شێوە داڕشتنـەی بە زۆرەمـلێ بە سـەر پەیـڕەوی ناوخـۆدا سـەپێنرابـوو ، نەیتـوانی رێگا لە کـرێکـاران‌و پیشـەوەران بگـرێ تـاوەکـو لەشارەکاندا تەعبیر لە بزووتنەوەی نیشتمانی‌ی بکەن . بە پێچەوانەوە ، ئەوان بەکردەوە بوونە سووتەمەنی ئەو مەسەلەیە . ئەمە جگەلەوەی کە سەرکردایەتی کۆمەڵە خۆی دەگەڕا بە شوێن دەرفەتێکدا تا هەڵوێستی سیاسی دژ بە ئیمپریالیزم دەرببڕێ . کاتێکیش کە پەیوەندی نێوان وەزارەتی « ناجی ئەلسوەیـدی » و لێپرسراوانی ئینگلیز لە عیراقدا بەو رادەیە تێکچوو « ئەلسوەیدی » ناچار کرا رۆژی ٩ ی مارتی ١٩٣٠ ئیستیقالە بکاو حەقیقەتی مەسەلەکەیش بۆگەل روون بکاتەوەو ئەنجامیش خۆنیشان دانی زۆر گەورە ساز کـرا[١٢٦] دەڵێین : ئـا لەو کاتەدا « محەمەد سالح ئەلقەزاز » بە نـاوی لاوانی کرێکـارو سنعاتکـارانەوە پرۆتستۆیەکی بڵاوکردەوە تێیدا دەڵێ :

« لاوە کرێکارەکان‌و سنعاتکاران لەم بارودۆخە نالەبارە تەواو داخ لە دڵن‌و نارەزایی خۆیان بەرامبەر بە کەللە ڕەقی‌ی ئینگلیز لە ئاست داخوازی‌یـەکانی گەلدا ، دەردەبڕن‌و پشتگیـری وەزارەتەکـەی ـ ئەلسـوەیدی ـ دەکـەن کە بەشێکە لە داخوازی‌یەکانی وڵات‌و داوا لە بەرێزان نوێنەرانی گەل‌و دڵسۆزانی میللەت دەکەن بە هەموو شێوەیەك سووربن لەسەر داخوازی‌یەکانی نەتەوەی عیراق »[١٢٧]

هەروەك « ئەلقەزاز » دووپاتی دەکاتەوە « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بـە کوڵ‌ودڵ دژی پەیمـانی ١٩٣٠ ی نێوان عیـراق‌و بەریتـانیا راوەستـاو چەنـد پرۆتستۆیەکی دژی ئەو پەیمانە بۆ کۆمەڵی گەلان رەوانە کـرد ، بۆ دڵنیـاییش

کۆمەڵی ناوبراو لە گەیشتنی پرۆتستۆکانی ئاگاداری کردەوە . ئەم هەڵوێستەی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بەرامبەر بەو پەیمانە ، کاربەدەستانی ئینگلیزو دەسەڵاتدارانی عیراقیان وروژاندو سەرکردەکانیان بەوە تاوانبار کرد گوایە لە پەیڕەوی ناوخۆ لایان داوە[128] . لێرەدا پێویستە دەست بۆ ئەو ڕاستی یە درێژ بکەین کە زۆر سەرکردەی کۆمەڵە کرێکاری پیشەیی یەکان و لە پێش هەموویشیانەوە « ئەلقەزاز » و « ئەلئەشتەری » پەیوەندی پتەویان بە سەرکردە نیشتمانپەروەرەکان و ئەپۆزیسیونی ئەوساوە هەبوو ، وەك « جەعفەر ئەبولتمەن » و خەڵکی تریش .

بەو چەشنە « کۆمەڵەی سنعاتکاران » لە سنووری پەیڕەوی ناوخۆو ئەو ئامانجانەی لە ماددەکانی دا دیاری کرابوون ، چووە دەرەوە . ئامانجی ڕاستەقینەی کۆمەڵەیش لەو کارو کردارانەدا دەردەکەوێ کە لەتەك قسەو گوفتاری « ئەلقەزاز » دا یەکیان دەگرتەوە ؛ خۆیشی چەندین جار دووپاتی کردووەتەوە کە مەبەستی کۆمەڵە « بەرگری‌کردن لە مافی کرێکاران و خەبات کردنە بۆ دەست‌خستنی داواکانیان و پاراستنیان لە چنگی ئەوانەی یاری بە بەرژەوەندی یەکانیان دەکەن . « با چی تەوژمی کۆسپ و تەگەرەو زریانی بەهێزو سەرهەڵگرتوو هەیە ، هێرش بۆ بەردی سەختی بیروباوەڕمان بهێنن ، گەر خۆمان داناوەو تووشی هەزاران چورتم بووین ، دەست لەم مەسەلەیە هەڵناگرین » و هەوڵ دەدەین « کرێکاری عیراقی لەو کۆت و زنجیرە ڕزگار بکەین تێوەی ئالاوەو دەمانەوێ بەمانای تەواوی ووشە[129] بەختیاری بکەین ، تا لەگەڵ برای کرێکاری پێشکەوتووی ڕۆژئاوایی دا ووردە ووردە یەکسان دەوەستێتەوە »[130] .

بە هۆی کۆمەڵێك هۆوە کە بەم یان بەو شێوە کاریان لە یەکتر دەکرد « کۆمەڵەی سنعاتکاران » لە گشت کۆمەڵەکانی دی ، پتر دەوری لە ژیان و بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق دا بینی . بەر لە هەموو شتێك ئەو کۆمەڵەیە لەسەر بنکەیەکی کرێکارانە بنیات نرابوو ، نەك پیشەوەرانە . بەشی زۆری ئەو بنکەیەیش بریتی بوو لە کرێکارانی ڕێگای ئاسن . ئەمانە جگە لەوەی تەواو لە کرێکاری کارخانەوە نزیکن ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش زیاتر دەچەوسێنرانەوە ، بۆیە هەمیشە بە توندی نارەزایی خۆیان دەردەبڕی[131] لە لایەکی تریشەوە زۆربەی سەرکردەکانی ئەو کۆمەڵەیە سەر بە چینێکی کۆمەڵایەتی بوون و لەچاو سەرکردەی کۆمەڵەکانی تردا هوشیاری یەکی چینایەتی قووڵتریان هەبوو . « ئەلقەزاز » خۆیشی سەرکردەیەکی بێ وێنە بوو بەوپەڕی دڵسۆزی یەوە

بەرگریی لەو مەسەلەیە دەکرد کە خۆی کردبووە خاوەنی . دەیزانی چۆن سۆزی خەڵکی دەبزوێنیو بە چ شێوەیـەك لە ناخـەوە دەیان وورووژێنیو چـۆنیش گیروگرفتەکانیان نیشان دەداو بەرگری لە حەق دەکا .

« کۆمەڵەی سنعاتکاران » کەوتبووە ژێر کارتێکردنی هەندێ رۆشنبیری شۆرشگێرەوە لەناو ئەمانەیش‌دا خـەڵکی وا هەبـوون رێبازی سـۆشیالیـزمی گـرتبووە بـەر وەك چیـرۆك‌نـووسی پێشکـەوتنخـواز « مـەحمـوود ئـەحمـەد ئەلسەید »[١٣٢] و « حسەین ئەلرەحال » و « عەبدوڵلا جەددوع » و « ئیبراهیم ئەلقەزاز » کە وەك « ئەلقەزاز » باسیان دەکا ، هانی بزووتنەوەی کرێکارانیان دەداو بەهەموو شێوەیەك دەستگیرۆییان دەکرد .[١٣٣]

بێ گومان ئەم هەڵوێستەیشیان هەروا لە خۆوە نەبوو ، بەڵکو ئەنجامی ئەوە بوو ئەمانە لە خەڵکی دی قووڵتر لە واقیعی کۆمەڵ تێ گـەیشتبوون . ئـەوانە لەو باوەڕەدا بوون : « کۆلەکەی ژیان کرێکاران رایان گرتـووە . خەڵکی تـەمەڵو ئیش‌نەکەر میکرۆبنو پێویستە قەلاچـۆ بکرێن »[١٣٤] شـایانی بـاسە زۆربـەی ئەوانەی ناومان هێناون بەشداری‌یان لەو کۆڕانەدا دەکرد کە کۆمەڵە سـازی دەکردن ، گوتارو باسی کرێکارانەیان بۆ دەخوێندنەوەو هەر بەراستیش کارێکی گەورەیان کردە سەریان .[١٣٥] ئەمە جگە لەوەی کە رۆڵێکی دیاریان لە رۆژنامە کرێکاری‌یەکان‌دا گێڕا .

سەبارەت بەم هۆیانەو هی‌تریش « کۆمەڵەی کرێکاران » بە زوویی جێگای خۆی لە ناو زەحمەتکێشانی عیراق‌دا داگیرکردو لەو سەردەمە ناسکەی مێژووی وولات‌دا دەنگو رەنگی خۆی لەناو بزووتنەوەی نیشتمانی‌دا ، دەرخست . تەنها لە ماوەی ساڵێك‌دا دەوروبەری سێ هەزار کرێکـار چوونـە ریزەکـانی‌یەوە[١٣٦] وەنەبێ جموجۆڵی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بە تەنها لە بـەغدای پایتەخت‌دا گیـری خواردبێ نـەخێر ؛ بـەڵکو هـەر لە زووەوە هەوڵی‌دا خـۆی بگەیـەنێتە شارەکانی‌دی و مەڵبەندەکانی‌تـری کرێکـاران‌و لەو شوێنـانەدا کـە فارگـۆنی شەمەندوفەریان لێ چاك دەکرانەوە چەندلقێکی بۆ کرێکارانی رێگای ئـاسن لە « دیوانی یە » و « ئوور » و « هینەدی‌یـە » و « قەرەخـان » و شوێنی‌تـریش کردەوە . دوای تێپەڕ بوونی شەش مانگیش بەسەر دامەزراندنی‌دا ، وەفدێکی بەناوی « وەفدی خواروو » ەوە بە سەرۆکایەتی « ئەلقەزاز » پێکهێنـا . ئەم وەفدە « دەگەیشتە هەر شوێنێك لە لایەن کرێکارانی ئەو شوێنەوە بە گەرمی‌ی

پێشوازیی لێ دەکرا ، و لەهەموو ئەو شوێنانەیش یەك لە دوای یەك کۆبوونەوەیان بۆ کرێکاران و سنعاتکاران ساز دەکردو ئامانجی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » و چۆنیەتی ئیش و کارەکانیان بۆ روون دەکردنەوە . بەو جۆرە لقی کۆمەڵەی ناوبراو لە « بەسرە » و « ناسریـیە » و « حیللە » و شوێنی تریش کرایەوە . ژمارەی کرێکارانی ئەو کۆمەڵەیە لە شارێکی وەك « بەسرە » دا گەیشتە (٦٠٠) کەس[١٣٧] .کرێکارانی « خانەقین » لایان وابوو ، چالاکیو جموجۆڵی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » « وزەی ئیش‌کردنیان » پێ دەبەخشیو « تیشکی بەختیاری‌یان بۆ دەنێری »[١٣٨] ، بۆیە لقێکی کۆمەڵیان لە شارەکەیان‌دا کردەوە .

« کۆمەڵەی سنعاتکاران » لە ناو تێکڕای کۆمەڵە پیشەیی و کرێکاری‌یەکانی تردا ، ناوو شۆرەتێکی ئەوەندە گەورەی دەرکرد ، هیچ کام لەو کۆمەڵانە بەبێ پرس و راوێژکردن بە ئەلقەزاز و هاورێکانی تری ، کاروباریان ، ئەنجام نەدەدا[١٣٩] . «ئەلقەزاز» نیازی بووە چی کۆمەڵی کرێکاری وپیشەیی هەبووە لە یەك رێکخراوی سەربەخۆدا کۆیان بکاتەوەو زۆر جاریش لە بۆنەی جیا جیادا قسەی لەم مەسەلەیە کردووەو پێ‌ی لەسەر دادەگرت . ئەوەتا لەو ئاهەنگەدا کە بە بۆنەی تێپەڕ بوونی ساڵێك بەسەر دامەزراندنی کۆمەڵەدا ساز کراوە ، بەم‌شێوەیە کۆتایی بەو ووتارەی دەهێنێ‌و دەڵێ :

«.. لە کۆتایی‌دا ، هیوادارین ئەم رۆژە لە ساڵی داهاتوودا بە جۆرێك بکەینەوە کە هەموو کۆمەل وخاوەن پیشە سازی‌یەکان ـ با ناویشیان جیاواز بێ یەکیان گرتبێ‌و کۆمەڵەیەکی گشتی یان بۆ خۆیان پێك هێنابێ[١٤٠] . «کۆمەڵەی سنعاتکاران» وەك «ئەلقەزاز» باسی دەکا لە رووی دارایی‌یەوە توانایەکی ئەوتۆی نەبووە. سەرچاوەی دارایی کۆمەڵە بریتی بووە لە «ئابوونەی مانگانەی کرێکارە هەژارو نەداراکان وبەپلەی یەکەم[١٤١] کرێکارە ئازدیخوازەکانی رێگای ئاسن[١٤١] . هەروەها لەو پیتاکە کەمەی کە لەدەستکەوتی ئەو ئاهەنگەبۆی مایەوە کە رۆژی ١٣ ی ئەیلوولی ١٩٣٠ لەسەر شانۆی «ئۆپێرا» سازی کرد.[١٤٢]

سەرەڕای بێ توانایی‌و کەم‌دەرامەتی‌ی ، کۆمەڵە‌توانی لە ماوەی دوو ساڵی تەمەنی‌دا ، بە پشتی کرێکاران‌و رووناکبیران جموجۆڵێکی بەرفراوان بنوێنێ . بایە خێکی‌زۆری‌دا بە سازکردنی کۆڕو کۆبوونەوە بۆ ئەندامەکانی . باباتی ئەو باس‌و لێکۆڵینەوانەیش کە لەو کۆڕانەدا دەخوێندرانەوە ، لە باس

گـوتاری کـۆمەڵەکـاتی‌تـر ، بـاشتـر چـارەسـەری مـەسـەلەی کـرێکـاران‌و گیروگرفتەکانیان دەکرد . ئەوانەیش کە بۆ گـوێ‌گرتن ئـامادەی ئـەو کۆڕانـە دەبوون ، زۆر لە ژمارەی ئەوانە پتر بوون کە بە شداریی کۆڕو کۆبوونـەوەی کۆمەڵەکانی تریان دەکرد . زەحمەتکێشان بە گشتی‌ی‌و کرێکارانی ڕێگای ئاسن بە پەرۆشەوە بە دەنگ بانگهێشتنی ئەم کۆمەڵەیەوە دەچوون . زۆربەی کاتیش هەندێ لە پیاوە ناودارەکانی ناو بزووتنەوەی نیشتمانی‌ی‌و نوێنەری ڕۆژنامـە کـان‌و پیاوانی ئـایین‌و لاوە شـۆڕشگێڕەکـان ، ئامـادەی ئەم کـۆبوونـەوانـە دەبوون .[143] جاری وایش هەبوو ئەندامە هوشیارەکانی کۆمەڵە بە بۆنەی ١ ی ئایارەوە[144] بە نهێنی‌و لە ماڵی یەکێکان‌دا ، یاخود لەنـاو فارگـۆنێکی بەتـاڵ‌دا ئاهەنگیان دەگێڕا[145]

«کۆمەڵەی سنعاتکاران » لەناو ئەندامانی‌دا بایەخێکی باشی بە مەسەلەی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری دابوو ، بۆ ئەم مەبەستەیش دەورەی تایبەتی بۆ کردبوونەوە . هەروەها چەند پۆلێکیشی کردەوە تا ئەو ئەندامانـەی ئارەزووی زمانی ئینگلیزی‌و سەرەزایی خۆیان بدەن . بە سەرێکی تریش کۆمەڵە بەپـارە یارمەتی هەندێ کرێکاری داو[146] لەتەك پزیشکێك‌دا ڕێك کەوت تا بـە خۆڕایی چارەسەری نەخۆشەکانیـان بکا[147] . لەگـەڵ چەنـد پارێـزەرێکیش‌دا پێکهات تاوەکو سۆراخی داواو شکایەتی کرێکارە هەژارەکان بکەن بەبێ پارە .

ئەوەی کە بە شانازی‌یەوە بۆ « کۆمەڵەی سنعاتکـاران » تۆمـار دەکرێ ئەفرەیە ، بەبێ جیاوازیی نەتەوەو ئاین‌و تیرەو ڕەگەز تـەماشـای ئەنـدامانی دەکرد . کاتێکیش کـە لەکۆتـایی مانگی کـانوونی یـەکەمی سـاڵی ١٩٣٠ داو بەبۆنەی سەری ساڵی تازەوە ئـاهەنگی گێـڕاو ژمارەیـەکی زۆر لە ئەنـدامانی بەشداری‌یان تێدا کرد ، دەست پێشخەری‌یەکی ئەوەندە جوان بوو ، ڕۆژگاری « شۆڕشی بیست » ی دەهێنایەوە یاد . هـەر لەو ئاهـەنگەدا چـەند ووتـارێك خوێندرانەوەو هەموویان کـرێکارانیـان هان دەدا دەست بخـەنە نـاو دەستی یەکەوەو هاریکاری یەکتر بکەن[148] .

جا ئەگەر « کۆمەڵەی سنعاتکاران » لەو قۆناغەدا بایەخێکی تایبەتی بە مەسەلەی بێکاری دابێ شتێکی سروشتی‌ی بووە . چونکە کۆمەڵەی ناوبراو هەر لەزووەوە داوای لە بێکارەکان کردبوو لە بارەگا خۆیان ناونووس بکەن . هەروەها پەیوەندیشی بە چەند لایەنی ، جیاجیاوە کرد ، ئەو بێکارانە بخەتە سەر ئیش هەر بەراستیش کاری بۆ هەندێکیان دۆزی‌یـەوە . چەنـد جارێکیش ئـەوەندەی لە توانای‌دا بوو ، بە پارە دەستگیرۆیی دەیـان کرێکـاری بێ‌ئیشی کرد[149] بـۆیە

کرێکاره بێ ئیشـەکانیش تـا دەهات زیـاتر لە « کـۆمـەڵەی سنعـاتکـاران » دەورووکانو ڕۆژی بە دەیان کەسیان لە بارەگاکەیدا کۆدەبوونەوە ، تەنانەت هەندێ جار ئەو ڕاستە شەقامەی بە تەنیشت بارەگای کۆمەڵەوە بوو ، ئەوەندەی خەڵك تێ دەرژا ڕێگای هامشۆیان دەبەست . ئەم هەموو بایەخ پێدانەی کۆمەڵە بە مەسەلەی بێکاریو کرێکارە بێئیشەکانی دەدا ، دامو دەزگـای ڕژێمی بە تەواوی ورووژاند و لە تاوا کەوتنە پروپاگاندە کردن گـوایە بـە هانـە هانـەی ئەپۆزیسون ئاژاوە دەنێنـەوەو ئەوەیشی کـە ڕۆژنامـەکان لە بـارەی کرێکـارە بێئیشـەکانـەوە بڵاوی دەکـەنەوە لە ڕاستییـەوە دوورن[١٥٠] بەرامبـەر بەم هەڵوێستە « کۆمەڵەی سنعاتکاران » ناچار بوو داوا لە هەموو کرێکارێکی بێئیش بکا بڕوا نامەیـەك لەمەڕ دوائیشیو بـەڵگە نـامەیـەکی ڕەوشت باشیی (!!) لە موختاری گەڕەکەکەی وەربگرێو لەتەك شەهـادەتنامـەی جنسییەدا بیـدا بە کۆمەڵە . ڕایشی گەیاند ئامادەیە ، بە پارە یارمەتی ئەو کەسانە بدا کە لەبەر بێ دەرامەتیی توانای دەرهێنانی شەهادەتنـامەی جنسییـەیان نییـە[١٥١] . لە هەموو ئەوانەیش گرنگتر ئەوەبوو زۆر چالاکانە بەشـداری لە سەرکـردایەتی کردنی خەباتی کرێکاران و پیشەوەراندا کردو ئەنجامیش لە سەرەتای ساڵانی سیدا بووە یەکێك لە گرنگترین سیماکانی بزووتنەوەی نیشتمانیی گەلی عیراق ، وەك لە دواییدا باسی دەکەین .

یەکێك لەو کارانەی جیبـەجێی کردو شـایانی بـاسکردنـە ، ئەوەبـو هەوڵیدا بە پێی تێگەیشتنی خۆی ، بە هەر شێوەیەك بێ دەنگی کـرێکاری عیراق بگەیەنێتە دەرەوەی وڵات . بە نموونە : حەزی دەکرد تەنانەت دەزگا دیپلۆماسییەکانو دەوڵەتانی تر ، لە ناکۆکی نێوان کـرێکارە عیـراقییەکـان و کۆمپانیا بیانییەکان بکۆڵنەوە[١٥٢] . بـۆیە « محـەممەد سـالح ئەلقـەزاز » ی سەرۆکی کۆمەڵە ، بەر لەوەی عیراق ببێتە ئەندامی « کۆمەڵی گەلان » و پاش ئەوەیش ، بەردەوام پەیوەندی بە « بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان ـ International (Labour office لە « ژنێف »[١٥٣] و « یەکێتیی نیقابەکانی کرێکارانی جیهان ـ Fed- (eration of Trade Union لە « بەرلین » دەکرد .[١٥٤] وا پێ دەچێ ئەم هەڵوێستەیش لەوەوە هاتبێ کە « کۆمەڵی گـەلان » لە کاتی وەرگـرتنی عیراق بـە ئەنـدام ، بایەخێکی باشی بەمەسەلەی کارو کرێکارانی عیراق دابێ[١٥٥] . لە ١٤ ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٢ دا « ئەلقەزاز » نامەیەکی بۆ « بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان » ناردو تێیدا قسە لە « باری ناهەمواری کرێکارانی عیراق » دەکاو داوای لێ دەکا بە پێی توانا یارمەتی کرێکارانی عیراق بدەن تا لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە گەشە

بکەن . پاشان سەرۆکی کۆمەلە وەلامی بیروی ناوبراوی لەتەك چەند نامیلکەیەکدا پێ گەیشت و لە ناویاندا دەرفەتی ئیش‌کردن و جۆری ئەو یارمەتی‌یەی کە دەتوانن پێشکەش بە کرێکارانی عیراقی بکەن ، روون کراونەتەوە[١٥٦] .

بە پێی راسپاردەکەی « بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان » « ئەلقەزاز » بە نامە پەیوەندیی لەتەك « یەکێتی‌ی نیقابەکانی کرێکارانی جیهان » لە « بەرلین » بەست . لەو نامەیەی‌دا کە رۆژی ١٨ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ بۆ سکرتاریەتی ئەو رێکخراوەی ناردووە ، داوا دەکا زانیاریی تەواو لە بارەی بزووتنەوەی کرێکارانی جیهانەوە بۆ « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بنێرن ، هەروەها رووی دەمیان تێ دەکا دەستی یارمەتی بۆ کرێکارانی « کەنار فورات » درێژ بکەن ، چونکە پێویستی‌یان بەوە هەیە « براکانیان لە دەرەوە هەندێك یارمەتی‌و چەپکێك تیشکیان بۆ بنێرن »[١٥٧]

ئەوی راستی‌ی بێ هەموو ئەم پەیوەندی‌یانە ، نەیانتوانی گۆڕانێکی چۆنیەتی لە ناو بزووتنەوەی کرێکارانی ئەوسای عیراق‌دا دروست بکەن ، ئەمەیش بە هۆی باری سەرنجی ئەوانەوە بوو کە جڵەوی بەڕێوەبردنی ئەو رێکخراوانەیان گرتبووە دەست‌و هەمیشە ئامۆژگاری کرێکارە عیراقی‌یەکانیان دەکرد « توخنی سیاسەت نەکەون‌و گرنگی‌ی بە زرووفی گشتی‌ی کرێکاران بدەن‌و بەس »[١٥٨] بەلام سەرەڕای ئەمانە هەمووی ، نامە ئاڵ‌وگۆڕ کردنی « ئەلقەزاز » لەتەك ئەو رێکخراوانەدا ، سەرنجی هەندێ لایەنی دەرەوەی بۆ ئەو واقیعە تاڵە راکێشا کە کرێکارانی عیراقی تێدا دەژیان . لەوەیش دەچێ چەند رۆژنامەیەکی بیانی ، بەم یان بەو شێوە دەستیان بۆ ئەم نامە ئاڵ‌و گۆڕ کردنە راکێشا بێ[١٥٩] . کاتێکیش کرێکاران داوایان لە « کۆمەڵەی سنعاتکاران » کرد نوێنەری خۆی بنێری بەشداری لە کۆنگرەی کرێکارانی دەوڵەتان‌دا بکا کە بڕیار بوو ساڵی ١٩٣٣ ببەسترێ ، میری رێگای نەداو بەم کارەیشی هەڵوێستی رەسمی‌ی خۆی بەرامبەر بە کرێکاران لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەوە ئاشکرا کرد[١٦٠] . هەر لەبەر ئەوەیش بوو ، رژێم لە پەیوەندی نێوان کۆمەڵەی ناوبراو‌و دامو دەزگاکانی دەرەوە سڵی دەکردەوەو هەوڵی دا لە هەر چوار لاوە ئابلووقەی بدا ، تا حاڵ گەیشتە ئەوەی « ئەلقەزاز » ناچار بوو بە نهێنی‌و بە هۆی ئەوانەوە کە دەچوونە دەرەوەی وولات نامە کانی بۆ « بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان » و

« یەکێتی ی نیقابەکانی کرێکارانی جیهان » بنێری[١٦١] . دەسەلاتتدارانی رژێم بە ئەندازەیەك لەم پەیوەندی یانە تۆقیبوون جارێکیان دەستیان گـرت بەسـەر وێنەی خۆنیشان دانێکی کرێکاران دا لە ترسی ئەوەی نەبا لە دەرەوەی وولات بلاو بکرێتەوە[١٦٢] . شایانی باسە کاربەدەستان هەولێکی زۆریان دا « ئەلقـەزاز » قایل بکەن برووسکەیەك بۆ « بیرۆی کرێکارانی دەولەتان بنێری » و تێیدا رای بگەیەنێ گوزەرانی کرێکارە عیراقی یەکان روو لە باشی یەو میری بایەخیان پێ دەدا[١٦٣] .

چالاکی ی « کۆمەڵەی سنعاتکـاران » و سووربـوون و بەرگـری کردنی، سەرکردایەتی یەکەی لەسەر گرنگترینی ئەو مەسـەلانەی پـەیوەنـدی یان بـە زەحمەتکێشانی عیراقەوە هەبوو ، لە ناو رای گشتی ی عیراق دا ناوو شۆرەتێکی گەورەی پەیدا کرد . بە درێژایی ساڵانی ١٩٢٩ ـ ١٩٣١ کەم رێککـەوتووە ، رۆژنـامەیـەك لە بەغـدا دەرچووبێ و پـەنجەی بـۆ دەستکـەوتێکی کـۆمـەڵە رانەکێشابێ ، یان چەند برگەیەکی لە قسەی سەرکردەو گوتاربێژەکانیان بلاو نەکردبێتەوە . هەر زوویش رۆژنامەکان خۆیان کردە خاوەنی « ئەو کارە سوود بەخشانەی کۆمەڵەی سنعاتکاران ئەنجامی داون و شایانی رێزو ستایشن »[١٦٤] .

جموجۆڵی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » و بلاوبوونەوەی ناوو شۆرەتی بە دڵی ئینگلیزەکان و ئەو کار بەدەستە عیراقی یانە نەبوو کە چەندین کۆسپیان خستە بەردەمی و ویستیان لە کاری بخەن . یەکەم هەنگاویان ئەوە بوو ، رێکخراوێکیان دروست کرد بۆ بەربەرەکانێ کردنی .. دیارە رێکخراوێکی لەو جۆرەیش بەڕای ئەوان دەبوو تـوانایـەکی ئەوتـۆی پێ ببەخشـرێ کرێکـاران بەلای خـۆی دا رابکێشێ . ئەوەبوو لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٠ دا « کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیکی عیراق » دامەزراو لەرۆژی ٣٠ ی کانوونی دووەمی هەمان ساڵ دا ، دەستەی دامەزرێنەری لە بارەگاکەی دا لە « رەئس ولقەریە »[١٦٥] کۆبوونەوەو « سەلیم ئەحمەد ئەلمیسری » بە سەرۆك و « ئـەحمەد جـاسم » بە سکـرتێرو جێگـری سەرۆك و « محەممەد ماهیر » بە ئـەمینداری سنـدووق و « داوودسەلمـان » و « سەلمان شێخ ناسر » و « عەبدوڵلا ئەلجەنابی » و « خەلیـل بەربـووتی » بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر هەڵبژێردران[١٦٦] . جا لەبەر ئەوەی بێکاریی بوو بووە گرێ کوێرەی هەموو گیروگرفتەکانی ئەوسای کرێکاران ، بەپەڕەوی ناوخۆی ئەو کۆمەڵەیە وای دەگەیاند گوایە ، هەرچی کرێکاری بێ ئیش هەیە ئیوەی ئەو مـووچەیـەی دەدرێتێ کـە لە دوا ئیشی دا وەری گـرتـووە[١٦٧] . بـەلام لەگـەل ئەوەیش دا « کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیك » بۆی نەکرا هیـچ رۆڵێك لە ژیـانی

کرێکاران‌دا بگێڕێ‌و تا ئەو کاتەی کەوتە دەست چەند رۆڵەیەکی دڵسۆزی چینی کرێکاران ، بە گۆشەگیریی‌و دوورەو پەرێزی مـایەوە ، وەك لە دوایی‌دا بـاسی دەکەین . چەند هەوڵێکی تری لەو بابەتەیش درا تاوەکو لە ناوەوە « کۆمەڵەی سنعاتکاران » هەڵتەکێنن ؛ بەوەی خەڵکی گومان لێکراویان دەهێنایە ناویەوە . لەو جێ‌یەدا کە لە مـانگرتنی کـرێکاران دەدوێـین بە دوورو درێـژی قسە لەم مەسەلەیەیش دەکەین .

هــەوڵ‌و تــەقــەللای رژێم لەم بـوارەدا « ئـەلقـەزاز » یشی گـرتـەوە . لێپرسراوان چەند جارێك هەوڵیان‌دا بە وەزیفەیەك لە دەرەوەی عیراق لە خشتەی بەرن ، ئنجا کە زانیان بۆیان نەرم نابێ ، ویستیان بەوە چەواشەی بکـەن لە « بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان » دا ببێتە نوێنەری عیراق . دوای ئەوەی کە ناو براو ئەم پایە گەورەیەیشی رەت کـردەوە ، بە بیـانوی ئـەوەی گوایـە لە ئێش پچراوە ، دەریان کرد[١٦٨] . بەلاَم مـەبەستی لێپـرسراوانی رێگـای ئاسن لەم هەنگاوەیان ئەوە بوو چیتر ماوەی نەدەن راستەوخۆ تێکەڵ بە کرێکارانی ئـەم دامەزراوەیە ببێ و ئاگای لە گیرفتەکانیان بێ . لە هەمان کات‌دا ژمارەیەك لە چالاکترین ئەندامانی ئەو کـۆمەڵە ، لەوانـە « دەروێش موراد » کـە لە خولی دووەمی هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەردا بە جێگری سەرۆك دەرچوو بوو ، لە بەغدا دوورخرانەوە . ناوبراو بە چالاکی‌ی شۆرەتی دەرکردبوو ، لە فێرکردنی میکـانیك‌و دەرس گـوتن بە ئـەندامـانی کۆمـەڵەدا بـەشـداری‌یـەکی چـاکی کردبوو[١٦٩] . پاشان توانیان یەکێکی وەك « نەعیم فەتتووحی » کە کرێکارێکی رێگای ئاسن بوو بە وەزیفەیەکی باشتر دەستخەڕۆ بکەن‌و لە کـۆمەڵە دووری بخەنەوە[١٧٠] . کاربەدەستان بۆ ئەوەی کۆمەڵە پیشەیی‌و کـرێکاری‌یـەکان لە « کۆمەڵەی سنعاتکاران » دابڕن و نەهێڵن لە ناو یەك‌دا هاریکاری بکەن ، رێگا نەما نەیگرن . لەولایشەوە هەوڵیان دەدا ناوو شـۆرەتی « ئەلقـەزاز » لەلای سەرکردەی کۆمەڵەکانی دی [١٧١] بزرێنن[١٧٢] ئنجا هەڵس‌و کـەوتی بە تـەواوی خرایە ژێر چاودێری‌یەوە .

کاربەدەستان هەر بـەوەیشەوە رانـەوەستان ، بـەڵکو تـۆمەتێکیـان بۆ « ئەلقەزاز » و شازدە ئەندامی تری کۆمەڵە دروست کردو بە هۆیەوە دران بە دادگای جەزای بەغداو یەکی بیست روپیە جەزایان لێ سەندن . بەلاَم رژێم بەم حوکمە قایل نەبوو ، چونکە سزای لەو جۆرە ئەوە نەبوو ترس‌و بیم بخـاتە دڵی سەرکردایەتی کۆمەڵەوە ، لەبەر ئەوە دام‌و دەستگای پۆلیس داواکەی لە دژیان

« إستئناف » کرد . کەچی دادگای « إستئناف » نەك هەر داواکەی پۆلیسی رەت کردەوە بەڵکو سەربارەت بە بێ بناغەیی داواکـە ، بڕیـاری‌دا جەزاکـەیشیان بدرێتەوە[١٧٣] . دوای ئەم رووداوە چەندین جاری‌تر « ئەلقەزاز » گیراو تۆمەتی نارەوای بۆ دروست کرا ، تەنانەت جارێکیان تاوانی ئەوەیان خستە پاڵ گوایە کارێکی دژ بە میری کردووە ، پاشان دەرکەوت ئەو کاتە ئەم لە بەنـدیخانـەی مەرکەزی‌دا نالاَندوویەتی[١٧٤] .

راستی‌یەکەی چـالاکی‌ی‌و جموجـۆڵی دوژمنانی رێکخـراوە کرێکـاری‌و پیشەیی‌یەکان بە تەنها دژی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » نەبوو ، ئـەگەرچی لە بنچینەیش‌دا دوژمنی سەری ئەو بوون . بە نموونە گۆڤاری « الحاصد » دەست نیشانی « ئەو کۆسپ‌و تەگەرانە دەکا، کە خرانە بەردەم کۆمەڵەی کرێکـارانی چاپخانەکان » لە یەکەم ساڵی تەمەنی‌دا[١٧٥] تەنـانەت لای دوژمنـانی کۆمـەڵە کرێکاری‌و پیشەیی‌یەکان‌و ئەوانەیش کە دەستیـان بە پشتیـان‌دا دەدا ، حاڵ گەیشتە ئەوەی سەرۆکی « کۆمەڵەی میوەفرۆشان » یان بە رۆژی رووناك‌و لەو کاتەدا کە لە کۆبوونەوەکەی ٢٠ ی نیسانی سـاڵی ١٩٣٠[١٧٦] هاتـە دەرەوە ، بکوژن . ئەم رووداوە ئـەوەندەی تـر کرێکـاران‌و پیشەوەرانی ورووژانـدو بە خـوێنیشان‌دانێکی گـەورە تێیدا بـەیداخ‌و دروشمی جـۆربـەجـۆریـان بـەرز کردبووەوە ، بە خاکیان سپارد . کۆمەڵەکانی تریش پرسەیان بۆ داناو بڕیاریان‌دا جەژنی قوربان کە رێکەوتی ٢٨ ی نیسانی دەکرد جەژن نـەکەن ؛ هـەروەها کرێکاران بۆ دەربڕینی نارەزایی لە ناو خـۆیان‌دا جـەژنە پیـرۆزەیان قـەدەغە کرد[١٧٧] . زۆر ری‌ی تێ دەچی کوشتنی سەرۆکی « کۆمەڵەی میوەفـرۆشان » پێشتر پیلانی بۆ دانرابێ‌و لەپێناو ئامانجێکی دیاری کراودا جێ بەجێ کرابێ .

ئەمەیش بە روونی‌ی نەك هەر لە شێوەی کوشتنەکـەی‌دا دەردەکەوێ بـەڵکو لەوەیش‌دا دیـارە رێککەوتی ئـەو رۆژانە دەکـا کە بـزووتنەوەی کـرێکـاران‌و نیقابەکانی عیراق لە هەرەتی‌دا بوو . ئەوەتا رۆژنامە نیشتمانی‌یەکـان رۆژی دوای ئـەو رووداوە بە ئـاشکرا دەست بـۆ ئەم حـەقیقەتـە رادەکێشن بڵاوی دەکەنەوە کە کوشتنی سەرۆکی « کۆمەڵەی میوەفـرۆشان » لەوە بـەولاوە کە « ئەنجامی دڵسۆزی‌و بە تەنگەوەهاتنی برا میوەفرۆشەکانی بووە[١٧٨] » شتێکی ترنی‌یە . ئەوەیشی لێرەدا پێویستی بە باسکردن هەیە ، ئەوەیە ئەوکەسەی پاش ئەو رووداوە بە زۆر بەسەر « کۆمەڵەی میوەفرۆشان» دا سەپێزا سیاسەتێکی تەواو پێچەوانەی هەبوو . لە رۆژگارێك‌دا کە هێرشی کۆنـەپەرستـان گەیشتـە

ئەوپەڕی ، ئەم سەرۆکە تازەیە دژی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » ڕاوەستاو لە دژی کرێکاران و کۆمەڵەکانیان پشتگیری هەڵوێستی ڕژێمی کرد[١٧٩] .

هەموو ئەم کارو کردەوانە نەیانتوانی لە پشت و پەنای « کۆمەڵەی سنعاتکاران » کەم بکەنەوە ، یاخود کار بکەنە سەر میللیەتی . بە پێچەوانەوە ئەو کەسەی شوێن پێی ڕووداوەکانی ئەو قۆناغە هەڵبگرێ ، بە تەواوی بۆی دەردەکەوێ کە چ کرێکاران و چ پیشەوەرە بچکۆلەکان زیاتر لە دەوری دروشمەکانی ئەو کۆمەڵەیە گرد بوونەوە . هەر لەو ماوەیەدا لە شارەکانی تری عیراقەوە ، یەك لە دوای یەك داوا پێشکەش بە کۆمەڵە دەکراو دەیانویست ببنە ئەندام و لقی کۆمەڵیان لە شارەکان دا بۆ بکرێتەوە . هەروەها کرێکارانی کارگەی وەزارەتی ئەشغال لە بارەگای کۆمەڵ دا کۆبوونەوەو بڕیاریان دا بچنە ناو کۆمەڵەوە ، چونکە « حەقیقەتی ئەو خزمەتگوزاریەی پێشکەش بە کرێکارە عیراقیەکانی کردووەو یارمەتی دانیان بە شێوەی جۆر بەجۆر لای هەموان ئاشکراو ڕوونە »[١٨٠] . پێویستە ئەوەیش بگوترێ کە ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە ڕۆڵێکی گەورەیان لەم مەیدانەدا گێڕاو ئامانج و چالاکیەکانی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » یان بۆ ڕای گشتیی عیراق ڕوون کردەوە . کۆمەڵەی ناوبراو خۆیشی هەر لەو قۆناغەداو لە بواری جموجۆڵی ڕاگەیاندن و بەهۆی ڕۆژنامەی کرێکارانەوە ، دەورێکی دیاری بینی .

## ڕۆژنامەو هۆیەکانی تری ڕاگەیاندنی کرێکاران

لە دوا دوای سالانی بیستەوەو تا کۆتایی سەردەمی ئینتیدابیش ، ڕۆژ نامەکانی ناوخۆ بە تایبەتی ئەوانەی بەرهەڵستی سیاسەتی ڕژێمیان دەکرد ، بووبوونە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ئەو کۆمەڵانەو جەماوەری خەڵکی عیراق . ئەم ڕۆژنامانە کەوتنە بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی کۆمەڵەکان و نیشاندانی گیروگرفتی کرێکاران و هەندێ جاریش بەرگریان لە مەسەلە ڕەواکانیان دەکرد . سەرکردەی ئەو کۆمەڵانە بۆ ڕاکێشانی ڕای گشتیی هەولیان دا سوود لە ڕۆژنامەکانی ناوخۆ وەربگرن و ڕایان بکێشن بەلای ئەو مەسەلانەدا کە زۆر جار بە شێوازێکی ڕۆمانسیانە دەیان وروژاند ، هەر وەك لە باسی بێکاریی کرێکاران دا قسەی لەسەر کرا . ئەوەیشی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە کە

رۆژنامەکانی ئەو رۆژگارە چەند نازناوی تازەیان هێنایە کایەوە وەك « کرێکار » کـرێکـارێکی بێ ئیش » و « لادێ یـەکی دڵ پـڕ لە سـوێ » و هی تـریش . هەموویشیان لە مەسەلەی کرێکاران و چالاکی یە کانیان دەدوان[181] .
چالاکی ی راگەیاندنی کرێکاران بە تەنها بەمەوە رانەوەستا ، بەڵکو لە کۆتایی سالانی بیستەوە لە زۆر رووەوە رێبازی نوێ ی گرتە بەر ، بە رادەیەك دەتوانین قسـە لە سەرەتـای دەرکەوتنی رۆژنـامەی سـەربەخۆی کرێکـاران بکەین . سەرکردەکانی کۆمەڵە کرێکاری و پیشەیی یەکان ،هەستیان کرد کە دەبێ خۆیان بهاوێژنە ئەو مەیدانە گرنگەوە کە بووەتە یەکێك پـێویستی یەکـانی خەبـاتی سەرکەوتوویان[182] . بە تایبەتی هەندێکیشیان چەند سـاڵێك بـەر لەپێکهاتنی کۆمەڵەکانیان لە بواری رۆژنامەنووسی دا ئیشیان کردبوو . ئەوە بوو عەبباس حسـەین ئال ئـەلچەلەبی » کـە یەکـەم سـەرۆکی « کـۆمـەڵەی کـرێکـارانی چاپخانەکانی عیراق » بوو رۆژنامەیەکی « ئەدەبی ی و کۆمەڵایەتی و کۆمیدی و رەخنەیی » بە ناوی « الحقائق » ەوە لە ٢٢ ی شوباتی ١٩٢٤ دا دەرکردو لە سـەرەتای سـاڵی ١٩٢٦ دا رژێم بە بیـانـووی ئـەوەی لە رێبـازی رۆژنـامـە ئەدەبی یەکان لای داوە ، لە کاری خست . پـاشان « ئـەلچەلەبی » لە ٣٠ ی نیسـانی ساڵی ١٩٢٧ دا رۆژنـامەیـەکی تری « ئـەدەبی ی و کۆمـەڵایەتی ی و کۆمیدی » بە ناونیشانی « صدی الحقائق »[183] دەرکرد ، بەڵام ئەمیش چەند جارێك لە کار خراو دوای نۆ مانگ بە یەکجاری ئیمتیازەکەیان لە خاوەنـەکەی سەندەوە[184] .

وەنەبێ دەرکردنی رۆژنامەیەکی کرێکارانە لە زرووف ئەوسای عیراق دا هەروا شتێکی ئاسان بووبێ . « عەبباس حسەین ئال ئەلچەلەبی » کە خاوەنی رۆژنامەی « نداء العمال » بوو لەسەر ووتاری یەکەم ژمارەی ئەو رۆژنامەیەدا ، دەڵێ : « .. لە مێژ بوو دەمانویست رۆژنامەیە دابمەرزێنین لە زمان کرێکارانەوە قسە بکاو پەرژەوەندی یان بپارێزێ و پشتگیریی خواستەکانیان بکـاو بیروڕای ئەوان دەربرێ » بەڵام ـ وەك دووپاتی کردووەتەوە ـ « زۆر شت بوونە رێگرو زۆریش کۆسپ و تەگەرەی نالەبار خرایە بەردەممان »[185] .

ئەوەی کە زانراوە لە ساڵی ١٩٢٩ وە، هەوڵی دەرکردنی رۆژنـامەیـەکی نیقابی لە عیراق دا دراوە. دوای مۆڵەت پێدانی «کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان» بە چەند مانگێك سەرۆکی ئـەو کۆمـەڵەیە «محـەممەد مـەکی ئەلئـەشتەری» ئەرزوحاڵێك بە وەزارەتی ناوخۆ دەداو تێیدا داوای کرد رێگای بدرێ رۆژنامەکی

«ئەدەبی و کۆمەلایەتی و رەخنەیی وێنەدار» بە ناوی «التعاون» ەوە، دەربکا. وەزارەتی ناوبراو لە رۆژی ١٦ ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٩دا، بڕیاری لەسەر داواکەی دا. بەلام «ئەلئەشتەری» دواکەوت و رۆژی ١٤ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ یەکەم ژمارەی دەرکرد. «ئەحمەد عیززەت موحەممەد رۆژبەیانی» بەڕێوەبەری لێپرسراوو «مەلا حوممادی» یش بە ڕێوەبەرو سەر نووسەری بوو. ئەم رۆژنامەیە نەیتوانی لە چوار یان پێنج ژمارەزیاتر دەربکا[١٨٦]. دوای ئەوە «راجی ئەلعەسکەری» کە ئەندامێکی «کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیك» بوو لە رۆژی ١٤ ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ دا سەر لە نوێ ئیمتیازی ئەو رۆژنامەیەی بە ناوی «صدی التعاون»ەوە، وەرگرتەوەو لە پاش سێ مانگ «لە ١٩ ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٠دا» یەکەم ژمارەی دەرچوو. دووەم جار سەرۆکی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی رۆژنامەیەکی نیقابی بۆ زەحمەتکێشانی عیراق دەربکا. ئەوەبوو «محەممەد سالح ئەلقەزاز» داوای لە میری کرد رێگای بدرێ گۆڤارێکی پازدە رۆژی بە ناوی «الصنائع» ەوە دەر بکا. وەزارەتی ناوخۆ لە رۆژی ٢٩ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٠ دائیمتیازەکەی پێدا. بەلام لەبەر لە ناوچوونی ژمارەکانی تا ئێستا نازانرێ بە تەواوی چەند ژمارەی لێ دەرچووە. هەموو ئەوانەیش دەرهەق رۆژنامەی کرێکاران دواون، مێژووی مۆڵەت پێدانی ئەو گۆڤارە «واتە حوزەیرانی ١٩٣٠» بە سەرەتای دەرچوونی دادەنێن[١٨٧]. لە بیبلۆگرافیای رۆژنامەکانی عیراقیش‌دا هەمان را دووبارە بووەتەوە[١٨٨].

بەلام هەندێ بەڵگەی باوەڕ پێکراو هەن ئەم رایە پووچ دەکەنەوە . دوای ئەو مێژووەی ئەو نووسەرانە باسی دەکەن ، رۆژنامەکانی ئەو رۆژگارە بە ئاشکرا روونی دەکەنەوە کە « ئەلقەزاز » نیازی وایە[١٨٩] گۆڤاری « الصنائع » دەر بکا رۆژنامەی « العالم العربي » رۆژی ١٠ ی تەممووزی ساڵی ١٩٣٠ هەواڵێکی بلاو کردووەتەوەو رای گەیاندووە کە « محەممەد سالح ئەلقەزاز » ی سەرۆکی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » ئیمتیازی گۆڤارێکی پازدە رۆژیی بە ناوی ـ الصنائع ـ ەوە ، وەرگرتووە . ئەم گۆڤارەیش کە دەبێتە ئۆرگانی کۆمەڵەی ناوبراو یەکەمین گۆڤاری عیراقی‌یە ، کرێکارانی عیراق بەدەستی خۆیان دەری دەکەن و زمانی حاڵی ئەوانە . دەستەیەك لاوی پێگەیشتوو ، سەرپەرشتی‌ی دەکەن ، بەم زووانە دەردەچێ و پڕە لە بابەتی کۆمەلایەتی وپیشەسازیی و هەموو ئەو شتانەی لای چینی کرێکاران بایەخ دارن »[١٩٠] بە پێی ئەو هەواڵەو شێوەی

بلاوکردنەوەکەی بە ئاشکرا دەردەکەویّ « کۆمەلەی سنعاتکاران » خۆیان هەوالەکەیان بلاوکردووەتەوە . کەواتە ناشیّ گۆڤاری « الصنائع » بەرلە ١٠ ی تەمووزی سالی ١٩٣٠ دەرچووبیّ و دوور نی یە یەکەم ژمارەی لە کۆتایی هاوین یاخود سەرەتای پایزی ١٩٣٠ دا دەر نەچووبیّ . بە قسەی « ئەلقەزاز » گۆڤاری « الصنائع » سیّ ژمارە زیاتری لیّ دەرنەچووە ، ژمارە - ٣ - ی هەر لە چاپخانەو پیّش بلاوبوونەوەی لە لایەن میری یەوە دەستی بەسەردا گیراوە[191] سەر نووسەری ئەو گوڤارە « ئەلقەزاز » و بەرپوەبەرەکەی « عەبدولمەجید ئەلرافیعی » بووە . « محەممەد مەکی ئەلئەشتەری »[192] و « مەحموود ئەحمەد ئەلسەید » و « حسەین ئەلرەحال » و « عەبدولفەتتاح ئیبراهیم » و « عەبدوللا جەددوع » و « عەبدو لقادر ئەلسەییاب »[193] و چەند کەسیّکی تریش تیّیدا دەیاننووسی . هەر ژمارەیەکی نزیکەی ١٥٠٠ دانەی لیّ چاپ دەکراو بە پیّودانی ئەو کاتە رەواجیّکی باشی هەبووە[194] . شایانی باسە ئەوانەی سەرپەرشتی یان دەکرد هەولیّان دا ناوەکەی بکەن بە « صوت العامل » بەلام دەسەلاتدارانی رژیم بەم داوایە قایل نەبوون و دایا نە دواوە[195] .

گۆڤاری « الصنائع » چارەسەری گرنگترین ئەو گیروگرفتانەی دەکرد کە کریّکاری عیراقی بەدەستیانەوە دەینالاندو لەپیّش هەموویانەوە مەسەلەی بیّکاریی . بۆیە چەندین ووتاری لەم بارەیەوە بلاوکردەوە ، ئەو ووتارانەیش بوونە هۆی زیاتر هوشیار کردنەوەی کریّکاران و تیّگەیشتنیان لە واقیعی ژیانی کریّکاران لە دەرەوەی عیراق . ئەمە جگە لە بلاوکردنەوەی چەندین باس و خواسی تر کە بە دلی نەبوون و ئەنجام بە لادان و پیّ لیّ هەلبرین لەقەلەم دراو میری کردیە بەلگەو بیانوو بۆ ئەوەی لە کاری بخا[196] . بە قسەی «ئەلقەزاز» هۆی راستەوخۆی دەست بەسەردا گرتنی ژمارە سیّ ی ئەو گۆڤارە چامەیەکە لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەلەدا کە بە بۆنەی جەژنەوە ساز کرابوو ، خویّندرایەوە . چامەکە دەلیّ .

« أعيد لشعب أفسد المال رأسه      فخان ومن خان البلاد له القتل
أعيد لشعبٍ وقعت صك رقه،      عصابةٌ سراق فانهكه الغل
أعيد وعمال البلاد حقوقها      سليبه أطماع تراسها القتل »

لیّپرسراوان وایان لە قەلەمدا کە بەیتی یەکەم و دووەمی شیعرەکە راست و

ڕەوان مەلیك دەگریتەوە . پاشان کە زانی‌یان دەقی چامەکە لە ژمارە سێ‌ی « الصنائع » دا بلاو بووەتەوە ، بە گورجی دەستیان بەسەردا گرت ، ئەگەرچی « ئەلقەزاز » بۆ خۆ پاراستن لە بگرەوە بەردەی دەسەلاتدارانی ڕژێم بەیتی یەکەمی شیعرەکەی بەم جۆرەی خوارەوە گۆڕیبوو :

« أعيد لشعبٍ أفسدَ المالَ جلّه فخانوا ، ومن خان البلاد له القتل[197] »

تاکە ڕۆژنامەیەکی کرێکاران کە تا ڕادەیەکی باش شتی لە بارەوە بزانرێ ڕۆژنامەی « العامل » ە [198] . هەر ئەوەندەی خاوەنەکەی لە ٩ ی ئابی ساڵی ١٩٣٠ ئیمتیازەکەی وەرگرت ئیتر کەوتە خۆ بۆ دابین کردنی پێداویستەکانی . ئنجا بەیاننامەیەکی چاپکراوی لەم بارەیەوە بەسەر ڕۆژنامەو لایەنە سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌یەکاندا بلاو کردەوەو تێیدا ڕوونی دەکاتەوە کە نیازی وایە « ڕۆژنامەی ـ العامل ـ دەربکا . ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی وێنەدارەو بۆ خزمەتی کرێکاران هاتووەتە مەیدانەوەو تەماشای کاروباری ئەوان دەکاو بەرگری لە مافی ڕەوایان دەکا »[199] .

« عەبدولمەجید حەسەن » کە خاوەنی ڕۆژنامەکە بوو ، لە چاپخانەیەکی ئەهلی‌دا کرێکار بوو ، جگە لەوەیش ئەندامێکی چالاکی « کۆمەڵەی کرێکارانی چاپخانەکانی عێراق » بوو ، لە بزووتنەوەی کرێکارانی ئەو سەردەمەیش‌دا چالاکانەو بێ کۆڵدان خەباتی دەکرد[200]

یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی « العامل » لە ڕۆژی دووشەممەی ڕێکەوتی ٨ ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ دا بە قەوارەی ٢٨ × ٢١ سم دەرچوو[201] . لە ژێر ناوەکەی‌دا نووسرابوو « ڕۆژنامەیەکی ئەدەبی‌ی هونەریی هەفتانەی وێنەدارە . عەبدولمەجید حەسەن خاوەنیەتی‌و « فایەق ئەلقشتێنی بەڕێوەبەریەتی »[202] ئەم ژمارەیە چواردە بابەتی تێدا بلاو کراوەتەوە گرنگترین‌یان : « ووتەی کرێکار » کە بە شێوەی سەر ووتار ، هێڵی گشتی‌ی ڕۆژنامەکەو چۆنیەتی ڕێبازەکەی ڕوون دەکاتەوە . « ژیانی کرێکار » ئیبراهیم حیلمی نووسیویەتی . ئنجا ووتاری « یەکێتی‌ی کۆمەڵەی کرێکاران » ی مەحموود ئەحمەد[203] و « تۆبڵێی ئیش بکەن » ی سەلمان ئەلسەفوانی‌و « چاکەی کرێکاران » ی ئەمین ئەحمەد . وەك بە ئاشکرا لەو ناوونیشانانەدا دیارە ، ڕۆژنامەی « العامل » خۆی بۆ خزمەت کردنی مەسەلەی کرێکاران‌و

رۆشنبیرکردنیان تەرخان کردبوو ، ئەمەیش بە تەواوی لەسەر ووتارەکەیدا دەردەکەوێ کە دەڵێ :

« ئەی کرێکاری عیراق : ئەم رۆژنامەیە کە ناوی تۆی لەسەر لاپەڕەی یەکەمی نووسیوە ، رۆژنامەی خۆتە . چەکێکی ئەدەبی یە بەدەستتەوەو بۆت هەیە لە خەبات و تێکۆشانی بەردەوامتداو لەپێناو دەستخستنی مافی پێشێل کراوو بەرگری کردن لەو مەسەلەیەی کە بەشێکە لەمەسەلەی کرێکارانی وولاتە عەرەبی یەکان ، شانازی پێوە بکەی . ئەم رۆژنامەیە ئەو دەنگە زولاڵەی تۆیە کە سەرانسەری جیهان دەیبیستێ و دەزانێ تۆیش زیندوویت و هەست بە چەوساندنەوەو زەوت کردنی مافەکانت دەکەی . هەست دەکەی خۆت و براکانت کە لە وولاتانی دراوسێدا دەستی زۆرداران لەت و پەتی کردوون ، لێپرسراویت . هەست دەکەی کاتی راپەڕین هاتووەو دەبێ شان بە شانی راپەڕیوان بۆگەیشتن بە ئامانجی هاوبەشمان کۆشش بکەین و خۆمان بگەیەنینە ئایدیای ئەم چینە زەحمەتکێشەی سەر رووی زەوی » . لە کۆتایی سەر ووتارەکەیدا رۆژنامەکە بەم جۆرە رووی دەم دەکاتە کرێکارانی عیراق و دەڵێ : « چی بۆ کرێکاران بە سوود بەخش دەزانی پێشیناز بکە - واتە رۆژنامەکە ك . م - چ. بیروڕایەکت مەبەستە دەری ببڕەو هەمیشەو هەتا هەتایە دووبارەی بکەرەوە کە دروشمی ئێمە لەژیاندا و تا ئەو کاتەی بە ئامانج دەگەین ئەوەیە : ئەی کرێکارانی جیهان یەککرن [٢٠٤]

هەرچی ووتارەکەی « مەحموود ئەحمەد ئەلسەید » ی چیرۆکنووسە کە بە ناونیشانی « یەکێتی ی کۆمەڵەی کرێکاران » بلاوی کردبووەوە ، شایانی ئەوەیە هەڵوێستەیەکی تایبەتی بۆ بکەین ؛ چونکە بە شێوەیەکی جوان رۆشنایی دەخاتە سەر چەندین لایەنی گرنگی ژیانی کرێکارانی عیراق و ئاستی بزووتنەوەیان لە قۆناغی یەکەمدا . ئەمە جگە لەوەی کە بە هۆیەوە لە باری سەرنجی رۆشنبیرە شۆڕشگێڕە رادیکالی یەکان تێ دەگەین بەرامبەر بەو هێزە نوێ یەی لە بینای کۆمەلایەتی گەلی عیراقدا خۆی نواند . « ئەلسەیید » دەڵێ : « .. بانگەوازی یەکەمم بۆ هەموو کرێکاران و جووتیارانی وولاتەکەمان ، بۆ هەموو ئەشکەنجە دراوو ستەمدیدەیەك ، بۆ هەموو سەربازە سەر بلندەکانی مرۆڤایەتی کە لە گەورەترین جەنگدا و لە پێناوی مافەکانی چینی کرێکاران و سەربەستی ی و ئایدیا پیرۆزەکەیاندا پشتی یەکتری دەگرن ، هەر ئەو بانگەوازەیە کە سەرکردەکانی ئەو چینە پێش دەیان ساڵ و ئێستایش

دەیڵێنەوە : ـ ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن ـ با ئەم بانگەوازە دروشمی کرێکارانی خۆیشمان بێ ، بە بێ جیاوازیی کارو پیشەیان . با ئەوەیش بزانن کە ناکۆکیو بەربەرەکانەی یەکتر لەوە بەولاوە کە تێکیان دەشکێنێو بەرەو دواوەیان دەباو تاماوەیەکی دوورو درێژ مافیان بە فیرۆ دەبا هیچی تریان لێ دەستگیر نابی » سەبارەت بە مافی کرێکارانیش دەلسەبید » دەڵێ :

« کرێکاران مافی زۆریان هەیەو خاوەنی نینو هەروا بە ئاسانیش وەدەستی ناهێنن . گومانی تێدا نییە ئەوانە مافی ژیانو بەبێ دەست خستنیان مردن گەلێك باشترە کرێکار مافی رەوای خۆیەتی رۆژی هەشت سەعات ئیش بکا ، کەچی زۆربەی کات چواردە سەعات ئیشی پێ دەکرێ . مافی خۆیەتی بێ ئیش نەبێ . مافی رەوای خۆیەتی منالەکانی لە قوتابخانەدا فێری خوێندنو نووسین بین ، نەك بە نەزانیی فرێ بدرێنە سەر شەقامەکان ، یاخود بخرێنە بەر شاگردییو لەناو کارگەو کارخانەکاندا ئیشی گرانیان پێ بکرێ . مافی خۆیەتی خواردنی سوود بەخش بخواوو بەرگی باش بپۆشێ وجێورێیەکی لەباری هەبێ تێیدا بحەوێتەوە نەك وەك ئاژەلێ کێوی لە ئەشکەوتدا بژی . مافی خۆیەتی ، گەر خۆی یان مالو منالی نەخۆش کەوتن پزیشك چارەسەریان بکاو داودەرمانی پێویستیان بدرێتیو گەر کەفتەکار بوو ، نەیتوانی ژیانی خۆی دابین بکاو لەسەر ئیش بمێنێتەوە ؛ چەردەیەك پارەی بدرێتیو گەر پیریی زۆری بۆ هێناو چیتر بۆی نەکرا ئەرکی خۆی بەجێ بهێنێو ئیش بکا ، مووچەی خانەنشینیی بدرێتێ کە مردیش مووچە بدرێ بە خێزانەکەی » . « ئەلسەبید » لە کوتایی ووتارەکەیدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە « گەر بێو کرێکاران هاوکاری یەکتر نەکەنو کۆمەلەکانیان لەسایەی ئالایەکی یەکگرتوودا یەك نەخەن کە راستتروایە ناوی ـ یەکێتیی کۆمەلەو نیقابەکانی کرێکاران ـ ی لێ بینێن ، هەرگیز بەو مافانەیان شاد نابن » دەبێ ئامانجیشی « بەرگری کردن بێ لە پەرژەوەندی هاوبەشی کۆمەلەی کرێکاران » و « هەوڵ دان بێ بۆ دانانی یاسایەکی ئەوتۆ تا لەسایەی ئەو سیستە مەکۆمەلایەتی یە دێرینەیەدا کە بە زۆرەملێ پەیرەوی یاساکانی دەکرێ ، خۆیانو مافە رەواکانیان بەپێی توانا بپارێزرێو کرێکاریش سەربەستو سەربلند بژی »[٢٠٥]

ژمارەی یەکەمی رۆژنامەی «العامل» چەند ووتارێکی گشتیشی

تێدا بلاوکراوەتەوە، وەك «ئەو کەسەی بەختەوەری دەدۆزێتەوە»ی «عەبدولرەحمان ئەلرەکابی» و «گۆتینبرگ چۆن هونەری چاپکردنی دۆزییەوە.

گۆیتنبرك گەرژنی نەهێنایەو ئەویش بەردەوام هانی نەدایە، ئەوا مرۆڤایەتی شارستانیەتی لە دەست دەچوو» و «ووتو ویژێك لەگەڵ داهێنەری کاتژمێری عیراقی ی مامۆستا عەبدولرەزاق مەحسوب ئەلئەعزەمی» و «رابوردووی خەمناك» ی «لوتفی بەکر سیدقی» و «لە پەراوێزدا : کرێکاری ئێمەو ئەوان» کە باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی کارەبا دەکا لەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاداو پاشان لەتەك واقیعی کرێکارو جووتیاری عیراقا بەراوردی دەکا «لەسەر شانۆی هونەر» کە باسی تیپە هونەرییەکانی عیراق دەکاو چەند بابەتێکی تری لەو جۆرە .

جا گەر بێ و هەموو ئەو هەل و مەرجانە لە بەرچاو بگرین ، ئەوا رۆژنامەی «العامل» لە رووی شێوەو ناوەرۆك و شێوازی دەرهێنان و پلەی رۆشنبیری یەوە ، جێگابەکی تایبەتی داگیر دەکا . لەناو رۆژنامەکانی تریش دا تاکە رۆژنامەیەکە گیروگرفتی کرێکارانی عیراقی دەست نیشان کردووەو بە شێوەیەکی لە هەموان قووڵتر هەل و مەرجی خەباتی سەرکەوتوویەیان دەخاتە روو . [٢٠٦]بۆیە هەر زوو وەك رۆژنامەیەکی کرێکاران سەرنجی خەڵکی ی بەلای خۆی دا راکێشا . [٢٠٧]

تا ئێستا رایەکی چەسپاو دەربارەی ژمارەکانی رۆژنامەی «العامل»لە ئارادا نی یە . هەندێك سوورن لەسەر ئەوەی لە یەکەم ژمارە زیاتری لێ دەرنەچووە [٢٠٨] ، هەندێکی تریش رایان وایە سێ ژمارەی لێ دەرچووە . [٢٠٩] ئێمەیش سەرەرای هەول و تەقەللایەکی زۆر لە یەکەم ژمارە زیاترمان بۆ نەدۆزرایەوە . زۆر ری ی تێ دەچێ کە ئەوە یەکەم و دوا ژمارەی رۆژنامەی ناوبراو بێ .

هەرچەندە رۆژنامەی [٢١٠] «نداء العمال» «ژمارە : یەك ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠ ، ٢٨ × ٢٠ سم» [٢١١]لە زۆر رووەوە لە ئاستی رۆژنامەی «العامل» دا نەبوو ، بەڵام بە حوکمی چەند هۆیەکی دیاری کراو ،دەچێتە خانەی رۆژنامەی کرێکارانەوە . «عەبباس حەین ئال ئەلچەلەبی» کە «سەرۆکی کۆمەڵەی کرێکاری چاپخانەکانی عیراق» بوو ، دەری دەکرد . هەر کە ژمارەی یەکەمی کەوتە بازارەوە ، بۆ سبەینێ رۆژنامەکانی ناوخۆ بڵاویان کردەوە کە «بایەخ بە ژیان و کاروباری کرێکاران دەدا[٢١٢]» . ئەم راستی یەیش بە تەواوی چ لە نیشان دانی بابەتەکانی ژمارەی یەکەمی دا وچ لە تاریفی رۆژنامەکە خۆی دا دەردەکەوێ . ئەوەتا لە لاپەرەی یەکەم دا نووسیویەتی «رۆژنامەیەکی کۆمەڵایەتی رەخنەیی ئەدەبی ی پازدە رۆژیی وێنەدارە . زمانی حاڵی کرێکاران و

چەکی ئەدەبی‌یانە . ئامانجی خزمەت کردنی کرێکارانە لە سەرانسەری وولاتە عەرەبی‌یەکان‌دا .»[٢١٣] لە سەروو ناوی رۆژنامەکەوە نووسراوە : «قەوارەی میللەتان بە بازووی کرێکاران دروست دەبێ‌و راپەرینی ئەوان تەوقی ستەم‌و کۆتی گومرایی دەتوێنێتەوە»[٢١٤]

یەکەم ژمارەی «نداء العمال» بریتی‌یە لەم حەڤدە بابەتە . «بانگەوازی کرێکاران»ی خاوەنی رۆژنامەکەو «پەرەسەندنی جێ‌و رێی کرێکاران»ی «یووسف رەجیب»[٢١٥] و «لە باخچەی ئەدەب‌دا»ی «شاعیرێکی گەورە» و «رۆکفلەری پارێزەر»ی «راجی راعی»و «بۆ کرێکارە ئازادیخوازەکان»ی «سەلمان ئەلسەفوانی»و «بیروڕای گەورەپیاوان دەرهەق بە شەرەفی رۆژنامە»و «یادی رۆژی ١٣ی تشرین دووەم»[٢١٦] و «رووداوی کرێکارانە لە هەندەران»و «لە باخچەی رۆژنامەگەری‌دا»و «هەمەرەنگ»و «چەند رێکەوت‌و بیرێك»ی «ئەمیر شەکیب ئەرسەلان»و «گەشتێك لە پێناو پەرژەوەندیی کرێکاران‌دا» ی خاوەنی رۆژنامەکەو «نەهامەتی یەکانی رۆژهەلات»ی «عوسمان پاشا مورتەزا»و «ئەلفرێد نۆبل»و «کۆمەلەی کرێکارانی چاپخانەکانی عیراق» هەر بە پێنووسی خاوەنی رۆژنامەو «شکایەتی کرێکارانی رێگای ئاسن»و «دۆزینەوەی قوتانجانەیەك چوار هەزار سال لەمەو بەر بنیات نراوە» .

بە ناونیشانی بابەتەکان‌دا بە روونی دەردەکەوێ کە رۆژنامەی «نداء العمال» بە پلەی یەکەم بایەخی بە بابەتەکانی کرێکاران‌و پاش ئەوە بە رۆژنامەچێتی داوە ، بەمەدا دیارە کەخاوەنەکەی تا چ رادەیەك بە تەن کاری رۆژنامەگەری‌یەوە بووەو[٢١٧] چۆن دەوری سەرەکی ی لە دەرکردنی رۆژنامە تازەکەو نووسینی بابەتەکانی‌دا بینیوە . ژمارەی یەکەمی لە وێنەکی گەورەی بەرێوەبەرەکەی کە پارێزەر «تەوفیق ئەلفکێکی» بووە ، زیاتر هیچی تری بلاو نەکردووەتەوە ، بەلام تیێدا گفتی داوە لە ژمارە دوودا ووتارێك بنووسێ‌و بلاوی بکاتەوە .

رۆژنامەی «نداء العمال» هوشیارانە ئامانجەکانی دیاری کردبوو . لە سەرووتاری ژمارەی یەکەمی‌دا بەم جۆرە دەست پێ دەکاو دەلێ : «ئەم رۆژنامەیەمان کە بۆ خزمەتی نیشتمان‌و خەبات‌کردن لە پێناو بیروباوەری رزگاریخوازانەدا هاتووەتە مەیدان‌و لە ناوجەرگەی ئەو چینەوە هەلقولاوە کە رۆڤایەتی پێکیهێناوە ، پێشکەش دەکەین بە خوێنەران ، بە کرێکاران‌و خەلکی تریشەوە . ـ ئەو ـ چینی کرێکارەی کە بە زەبری شان‌و بازوویان دونیا ئاوەدان

بووەوەو چەندین وولاتو شارستانیەت بنیات نرا..» هەرچی «بیروباوەڕی ڕۆژنامەکەیشە بە نامەکەیدا دیارە چ مەغزاو مەبەستێك دەگەیەنێو پێویستمان بە لێکدانەوەی ماناکەی نییە . کە ووترا ـ نداء العمال ـ مەبەست ئەوەیە کارلە هەستو ئەستیان بکرێو هەلپەی بەکگرتن بکەنو شان بە شانی یەکتر هاریکاری بکەنو پیشەسازی پێش بخەنو کۆمەلکاکەیان بەرەو خۆش گوزەرانی بەرن» . ئا لەم بۆچوونەوە ڕۆژنامەی ناوبراو خزمەت کردنی مەسەلەی کرێکارانی خستە ئەستۆی خۆیو «گومانی تێدا نییە کە لە پێشخستنی وولاتداو بۆ گەیشتن بە ئامانجە پیرۆزەکانی ، شوێن دەستی دیار دەبێ..»[218]

هەر لە سەرووتارەکەیدا هەست بەوە دەکەین کە سەرەتای گۆڕانو چوونە پێشەوەیەك لە بیرو مێشکی سەرکردە نیقابییەکاندا گەلاڵە بووە . ئەوەتا نووسەرەکەی ئاشکرای دەکا : ئێمە «ئەم ڕۆژنامەیە لەبەر ڕۆشنایی بیروباوەڕێکی ڕاستو دروستو لەسەر بنچینەی خۆبەخت کردن لە پێناوی چینێکدا ، دەردەکەین کە خۆمان ڕۆڵەی بەوەفای ئەوینو لە هەمووکەس چاتر ئاگاداری پێویستییەکانینو بۆ بیستنی دادو فیغانیان گوێچکەمان لە هەموو لایەنێکی دی سووکترەو بە نالەنالیشی لە هەموو دڵێکی تر زۆرتر خەمبار دەبین..»[219]

«ئال ئەلچەلەبی» بەم جۆرە کۆتایی بە سەر ووتاری ژمارەی یەکەمی «نداء العمال» دەهێنێو دەڵێ : «..با خوێنەران ئاگاداری ئەوەیش بن کە ئەم ڕۆژنامەیەمان هەرچەندە زمانی حاڵی کۆمەڵە کرێکارییەکانە کە ئێمە تییدا ئەندامین ، بەلام بە هەموو تواناوە بایەخیش بەو مەسەلە گشتییانە دەدەین کە بە لای نەتەوەکەمانەوە گرنگە ، بە تایبەتی مەسەلە کۆمەلایەتیو ئەدەبیو ئایدۆلۆژییەکان . جا ئەگەر کرێکار خزمەتکاری کۆمەڵو نیشتمان بێ ، ئەوا ڕۆژنامەی ـ نداء العمال ـ شانازیی بەوەوە دەکا کە هەر دەم ئامادەیە خزمەتی ڕاپەڕینی گشتیی بکاو لە نێوان چینەکانی نیشتماندا پەیکی بیرو ئایدۆلۆژیا بێ .»[220] شایانی باسە ـ نداء العمال ـ بلاویشی کردەوە کە لە ژمارەکانی داهاتوویدا لاپەڕەیەك بە ناوی «مینبەری قوتابیان»ەوە بۆ بیروڕای «ڕۆشنی قوتابیان» تەرخان دەکا .[221]

وەنەبێ هەموو ئەو ووتارانەی لە ـ نداء العمال ـدا بلاوکرانەوە لە ئاستی سەرووتارەکەیدا بووبێ، زۆربەیان لە ڕووی داڕشتنو بەرچاو خستنی بابەتەکانیانەوە لاوازن . ئەگەرچی لە ناوەرۆکی ژمارەی یەکەمدا بە گشتیی هەڵەی کەمی تێدایە ، بەلام بابەتەکان هەندێ جار لە هەڵەی زەق بەدەر

نین[٢٢٢] ، ئەمە لەکاتێکدا کە دەبوو ئەو رۆژنامەیە لە سەرپاکی رۆژنامەکانی تری کرێکاران لە رووی چاپ و دەرهێنانی هونەری‌یەوە ، باشتر بوایە ، چونکە زمانی حاڵی «کۆمەڵەی کرێکارانی چاپخانەکان» بوو .

تا ئێستا زانیاری‌یەکی تەواو سەبارەت بە ژمارەکانی رۆژنامەی ـ نداء العمال ـ لە ئارادا نی‌یە . هەندێ سەرچاوە وای دەگەیەنن گوایە چوارمانگ دوای دەرچوونی یەکەم ژمارەی لە کار خراوە .[٢٢٣] نووسەریش هەیە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە تەنها سێ ژمارەی لێ دەرچووەو پاشان وەستاوە .[٢٢٤] بەش بە حاڵی خۆیشمان لە یەکەم ژمارە زیاترمان بۆ نەدۆزراوەتەوە .[٢٢٥]

ئەوی راستی بێ هیچ کام لەو رۆژنامانە نەیان دەتوانی لەوەندە زیاتر درێژە بکێشن . یەکەم : لەبەر زۆر لێ کردن و تەنگەتاو کردنی خاوەکانیان «وەك لەگەڵ ـالصنائع ـ دا کردیان» . دووەم : بە هۆی نزمی‌ی ئاستی هوشیاریی و بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری لەناو ئەو چینەدا کە ئەو رۆژنامەیەیان بە ناوەوە دەردەچوو . بۆیە کەم دەرامەتی‌ی ئەو رۆژنامانە رۆڵێکی ئەوتۆی لە داخستنیاندا نەبینی؛ گۆڤاری ـالصنائع ـ ی لێ دەرچی کە بە هۆی بەربەرەکانەی رژێمەوە، بووبووە خولیای رۆشنبیرانی عیراق و رەواجێکی باشی هەبوو ، زۆربەی کات کرێکارە هوشیارەکان تەنها ئەو چەند ژمارەیەیان دەخوێندەوە کە بە خۆرایی بۆ کۆمەڵەکانیان دەنێردران و پاشان ئەمانیش ناوەرۆکی گشتی‌ی باسەکانیان بە دەمی‌ی بۆ برادەرەکانیان دەگێڕایەوە .

لەو ماوەیەدا لە شاری «مووسڵ» رۆژنامەیەك بە ناوی «العمال»ەوە کەوتە بازارەوە . بە پێ‌ی بۆ چوونی ئێمە ناشێ ئەو رۆژنامەیە لە ریزی رۆژنامەی کرێکاران دابنرێ .[٢٢٦] چونکە ئەو کەسەی دەری‌دەکردو ئەوانەی تێیدا دەیان نووسی هیچ کامیان کرێکار نەبوون . ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە ، لەو سنوورەدا نەبێ کە ئەپۆزیسیون کێشابووی ، توخنی مەسەلەی کرێکاران و گروگرفتەکانیان نەکەوت . ئەمەیش بە تەواوی لە پێش چاو خستنی ئەو بابەتانەدا دەردەکەوێ کە لە یەکەم ژمارەی‌دا بڵاوکراونەتەوە . بە ئاشکرایش لە چەند حەقیقەتێکی تردا خۆ دەنوێنێ و هەڵبژاردنی ناوەکەیشی یەکێکە لەو حەقیقەتە چەسپاوانە . چونکە لەو قۆناغەدا «کرێکار»و «کرێکاران»و زاراوەو ناوی لەو بابەتە چەماوەری رۆشنبیران حەزیان لێ دەکرد و ئارەزوویان لێ‌ی بوو . بە تایبەتی دوای ئەوەی کت و پڕ بە شێوەیەکی سەرنج راکێش کرێکارانی عیراق بوونی خۆیان سەپاند . گرنگ ئەوەیە ئەو راستی‌یە وەبیر بهێنینەوە کە

لێپرسراوانی ئەو سەردەمە بەهیچ شێوەیەك ئامادە نەبوون مۆڵەتی «رۆژنامەیەکی رۆژانەی‌سیاسی»ی بدەن ، ئەگەر ئەو رۆژنامەیە گشتی ی‌و ناکرێکارانە نەبوایە ، هەروەك بە ئاشکرا پەیرەوەکەی رۆژنامەی «العمال» لە ژمارەی یەکەم‌و لەسەر لاپەرەی یەکەمی بلاوی کردبووەوە . میریش هەر لەبەر رۆشنای پەیرەوەکەی بوو کە لەەی ئایاری سالی ١٩٣١دا رێگای دەرچوونی‌دا . واتە پاش ئەوەی داوای ئیمتیازەکەی لە وەزارەتی ناوخۆ کرا ، دوو مانگ تێ نەپەری مۆڵەتی دەرچوونی درایە .(٢٢٧)

لە بەشی سەرەوەی لاپەرەی یەکەمی رۆژنامەی «العمال»دا نووسرابوو ، «رۆژنامەیەکی رۆژانەی سیاسی گشتی‌یە . جارێ هەفتەی سێ کەرەت دەردەچێ . سەعدەددین زیادەی پارێزەر خاوەنی ئیمتیازو بەرێوەبەریەتی .» یەکەم ژمارەی لە رۆژی ەی ئەیلوولی سالی ١٩٣١دا بە قەوارەی ٥٦ × ٤٠ سم دەرچوو . (٢٢٨)

پێش ئەوەی بابەتەکانی یەکەم ژمارەی ئەو رۆژنامەیە بخەینە بەرچاو ، بە پێویستی دەزانین ئەو حەقیقەتە دووبارە بکەینەوە کە خاوەنەکەی هیچ پەیوەندی‌یەکی راستەوخۆی (٢٢٩)نە بە کۆمەلە کرێکاری‌و پیشەیی‌یەکانی عیراق‌و نە بە لقەکانیانەوە لە «مووسل»و نە بە هیچ دەستەو لایەنێکی کرێکارانەوە نەبوو . (٢٣٠)بریار وابوو ئەم رۆژنامەیە ببێتە زمانی حالی حزبێکی سیاسی بە ناوی «العمال» ەوە پەیرەوی ئەم حزبەیش لە هەموو شتێکی‌تر زۆرتر بایەخی بەو مەسەلە سیاسی‌یانە دەدا کە خەلکی تێیدا دەژیان . وا پێ دەچێ ئەوانەی نیازی دامەزراندنی ئەو حزبەیان هەبووو رۆژنامەی «العمال» یشیان دەردەکرد ، ویستبێتان لاسایی کرێکارانی وولاتە رۆژئاوایی‌یەکان بکەنەوە کە ئەو کاتە لە ناو چەند دەستەو تاقمێکی سیاسی عیراق‌دا ناوو شۆرەتێکی گەورەیان پەیدا کردبوو . لەو شوێنەیش‌دا کە باسی هەلوێستی هێزەسیاسی‌یەکان دەکەین دەرهەق بە چینی کرێکارانی عیراق ، بە دوورو درێژی لەم مەسەیە دەدوێین .

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ ، بۆچی رۆژنامەی «العمال» لە سەر ووتاری یەکەم ژمارەی‌دا خۆی بە «لاوانی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرە بەشەرەفەکان‌و دلسۆزانی وولات، ، هەلگرانی ئالای تێکۆشان لە پێناو سەربەستی ی‌و سەربەخۆی‌دا» دەناسێنێ . جا کە ئەم رۆژنامەیە مۆرکی کرێکارانی پێوە نەبووبێ ، ئەوە ناگەنێ توخنی مەسەلەی کرێکاران نەکەوتوە ، بە تایبەتی لەو رۆژگارەدا مەسەلەی کرێکاران بە جۆرێك خۆی سەپاندبوو سەرنجی هەموو لایەکی رادەکێشا . ئەوەبوو رۆژنامەی باسکراو لە دوای سەرووتاری یەکەم

ژمارەی [٢٣١] ، کورتە ووتارێکی بە ناونیشانی «ڕۆژنامەی ـ العمال ـ پاڵپشتی کرێکاران و خەڵکی ستەمدیدەیە و زمانی حاڵی ئەوانە» بڵاوکردەوە ، تێیدا دەڵێ :

« مەبەست[٢٣٢] لە دامەزراندنی ڕۆژنامەی ـ العمال ـ کۆکردنەوەی سامان و دەستکەوتی تایبەتی نەبووە ، نەخێر . بەڵکو مەبەست بەرگری کردنە لە مافە زەوتکراوەکانی وولات و پەردە هەڵماڵینە لەسەر پروپاگاندەکانی ئیمپریالیزم کە ویستویەتی و دەیەوێ چی خێرو بێری وولات هەیە بە تاڵان بیباو دوا فلس لە گیرفانمان بهێنێتە دەرەوەو بیدا بە سەرمایەدارانی بێگانە .. ئەنجامی داگیرکردن ؛ لە دەست چوونی سامان و کوێرەوەری چینەکان و کرێکاران و نابوت بوونی هەمیشەیی یە . ئەوەتا ئەمڕۆ هەژاریی زۆری بۆ هێناوین ، کرێکارانیش بێ ئیش و کار دەسووڕێنەوەو بە دەردەسەری نەبێ ناتوانن ڕۆژی چەند ئانەیەك پەیدا بکەن ، تا ماڵ و مناڵی برسی و ڕووت و ڕەجاڵیان بژیەنن . ئەمە هەمووی لە کاتێکدا کە نرخی دەغڵ و دان بە ڕادەیەك شکاوە تا ئێستا نەبینراوە[٢٣٣] کەواتە گەر بێ و بەر بەرەکانەی ئیمپریالیزم بکەین ، واتە یارمەتی کرێکاران و هەژاران دەدەین بەمەیش ئەو سامانەی وولات دەپارێزین کە ماوەو ناهێڵین چیتر بۆ دەرەوە بچێ . کەوابوو ، ڕۆژنامەی ـ العمال ـ بۆیە دامەزراوە ببێتە ئامرازێك بەرهەڵستی ئیمپریالیزم بکاو پاڵپشتێکی گەورەی کرێکاران و هەژاران و خەڵکی بێچارە بێ . هەرچیش لە تواناداد بێ بۆ ئەم ڕێگایە بەختی دەکەین . بڕیاریشمان داوە لەم ڕۆژنامەیەدا گۆشەی تایبەتی بە ناوی « شکایەتی کرێکاران » ەوە بکەینەوەو تێیدا ئەو شکایەت و داوایانە بڵاو بکەینەوە کە لە لایەن کرێکاران و خەڵکی تریشەوە پێمان دەگەن ، چونکە زۆربەی شکایەت و داد و بێدادی کرێکاران لە جێی خۆیەتی و مەگەر هەر داخ و خەفەتیان بۆ هەڵبڕێژن و ڕەنگ زەردیی و پرزە لێ براوی یان بۆ مابێتەوە .. لەبەر ئەوە تکا لە هەموو چینەکانی کرێکاران و خەڵکی ستەمدیدە دەکەین شکایەتیان چی یە ئاگادارمان بکەن[٢٣٤] جا ئیتر ئەو شکایەتانە دژی دام و دەزگا ڕەسمی یەکانە ، یان دژی هەندێ فەرمانبەر و خەڵکی ترە ، تا بەوپەڕی خۆشحاڵی یەوە بڵاویان بکەینەوە ، چونکە ئەم ڕۆژنامەیە بە تایبەتی بۆ بەگژا چوونی ژیانی کوێرەوەری و پارێزگاری چینە هەژارەکان دامەزراوەو بە سنگێکی فراوانەوە وەریان دەگرێ .. ڕۆژنامەی ـ العمال ـ پاڵپشتی کرێکاران و خەڵکی ستەمدیدەیە و زمانی حاڵیانەو هەر بەو جۆرەیش دەمێنێتەوە .. »

هەرچەندە ئەم ڕۆژنامەیە بە باشی سیاسەتی ئیمپریالیزم و واقیعی تاڵ و

تفتی توێژە چەوساوەکانی کومەڵگای عیراقی بە یەکەوە گرێ دابوو ، بەلام لە هەمان کاتدا ، نەیتوانیبوو دەست بنێتە سەر گرنگترین گیروگرفتی کرێکارانی عیراق . بە نموونە : داوا لە « کرێکاران و خەڵکی زۆر لێکراو » دەکا دژی هەندێ « دام و دەزگای رەسمی ی » و « هەندێ فەرمانبەرو خەڵکی تر » شکایەتەکانیان بنێرن ، بێ ئەوە کۆمپانیا بیانی یەکانی بە بیردا بێ کە ئەو کاتە لە دەروونی زۆربەی کرێکارانی عیراقدا بووبوونە گرێ کوێرە . شتێکی بەڵگە نەویستە ئەو رۆژنامەیەی بەراستی ی خۆی بۆ مەسەلەی کرێکاران تەرخان بکا ، دەبێ خۆی بە شوێن گیروگرفتو داواکانیاندا بگەرێ نەك چاوەروان بێ بۆی بنێرن .
شایانی باسە هەر لەو ماوەیەدا گۆڤارو رۆژنامەی تری وەك « الشباب » و « الأهالی » لە رۆژنامەی ـ العمال ـ قووڵتر لە مەسەلەی کرێکاران و گیروگرفتەکانیان دەدوان ، وەك لە جێ یەکی تری ئەم بەشەدا بە دوورو درێژیی لە هەندێ لایەنی دەدوێین .

رۆژنامەی « العمال » بەشێکی زۆری لاپەرەی دووەمی بۆ دەنگو باسی ناوخۆ تەرخان کردووە . هەروەها بەشێکی گەورەی لاپەرەی سێیەمیشی بۆ دەنگوباسی جیهان داناوە . لە لاپەرەی چوارەمیدا « عەلی ئەلنعێمی » بە شێوەیەکی رۆمانسی یانە هانی جەمارەری خەڵکی عیراق دەدا ئیش بکەن . بەو چەشنە یەکەم ژمارەی بە چیرۆکێکی شاکار کۆتایی دێ کە باسی دایکێك دەکا چۆن لە سەرمادا رەق هەلاتووەو چۆنیش کورەکەی لە داخ و خەفەتی دایکی مێشکی تێك دەچێ و شێت دەبێ . ئنجا چەند ئامۆژگاری یەکی ژاپۆنی سەبارەت بە « بەختیاری ژن و مێرد » بڵاو دەکاتەوەو داوا لە مێرد دەکا « لە بەردەم خێزانەکەیدا هەمیشە گرژومۆن نەبێ » و پێویستە « جارو بار گاڵتەو گەپی لەگەڵدا » بکا و « نوکتەی بۆبگێرێتەوە ، یا نوکتەکە خۆشیش نەبێ » و مادام لەسەری نی یە « بە دڵسۆزی یەوە خۆشی بوێ » دەبێ هەوڵ بدا « هەندێ جار ئارەزووەکانی جێ بەجێ بکا » « ئەمەیش بایەخێکی ئەوتۆی نی یە . »!!.

رۆژنامەی « العمال » ی مووسڵاوی چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچووە[٢٣٥] وادیارە لەسەر رێبازەکەی خۆیشی بەردەوام بووە . لە ژمارەی رۆژی ٨ ی حوزەیرانی ١٩٣٢ دا ، دەنگو باسی گشتی ی وەك : « سەربازو ئەفسەرە بەریتانیایی یەکان و خێزانەکانیان سەر لە هاوینەهەوارەکان دەدەن » و « دروستکردنی ئوتێلێك لە ئامێدی » و « کردنەوەی رێگای نێوان دهۆك و ئامێدی » و لەو بابەتانەی بڵاو کردووەتەوە[٢٣٦] .

وەنەبێ بە تەنها ئەو ڕۆژنامانەی ناوی کرێکاریان لە خۆیان دەنا ، لەرووی شێوەو ناوەڕۆکەوە ناتەواوی‌یان تێدا بووبێ نەخێر ، تەنانەت ڕۆژنامەکانی کرێکاران خۆیشیان لە کەموکوڕی بەدەر نەبوون . بە نموونە : لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی « العمال » زۆر جار ڕوو بە رووی بیروڕای ناکۆك دەبینەوە[٢٣٧] جاروبارێش بابەتی ئەوتۆ دەخوێنینەوە ، کەم ڕێکەوتووە ڕۆژنامەکانی تر خۆیان لە قەرە دابێ ، بە تایبەتی لەو قۆناغەدا کە ململانەی نێوان هێزە نیشتمانی‌یەکان و دەسەلاتی ئیمپریالیزم گەیشتبووە لوتکە . هەروەها ئەم ڕۆژنامانە شتی وا سەیرو عەنتیکەیان بلاو دەکردەوە ، زۆر دوور بوون لە مەسەلەکانی چینی کرێکارانەوە . بە نموونە : دەست دەنێینە سەر ئەو ووتارەی « راجی ئەلراعی » کە بە ناونیشانی « لە ٤ دۆلارەوە بۆ چەندین ملیار . ڕۆکفلەر ـ جان ڕۆکفلەر» کە لە ڕۆژنامەی « نداء العمال » دا بلاوی کردووەتەوە و تێیدا دەیەوێ کرێکارانی عیراق هان بدا شوێن پێ‌ی ملیاردێری ئەمریکایی ـ ـ ڕۆکفلەر ـ هەلبگرن کە « سەرەتای هەول و کۆششی ـ وەك خاوەن ووتار دەلێ ـ بە مانگانەیەکی ٤ دۆلاری دەستی پێ کردو خزمەتگوزار بوو لە دایەرەیەك‌دا ، تا سەرکەوت و بووە خاوەنی چەندین ملیار »[٢٣٨]

هەرچۆنێك بێ تێکڕای چالاکی‌ی هۆیەکانی ڕاگەیاندنی کرێکاران ، بەڕۆژنامەی کرێکارانیشەوە ، یەکێکە لە دیاردە گرنگەکانی پەرەسەندنی بزووتنەوەی کرێکاران لە کۆتایی سالانی بیستی ئەم سەدەیەداو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆیش کاری لەو گەشە کردن و چوونە پێشەوەیە کردو پاشان بووە سیمای هەرە دیاری بزووتنەوەی نیشتمانی‌ی ئەوسای عیراق .

## سەرهەلدانی بزووتنەوەی کرێکاران لە عێراقدا ١٩٢٩ ـ ١٩٣٢

لە دوا سالانی بیست و سەرەتای سالانی سی‌دا چەند هۆیەکی ئابووری و سیاسی‌ی نوێ دەرکەوتن ، خەباتی چینی کرێکارانی عیراقیان لە شێوەی تازەو پەرەسەندوودا ، بردە بارو دۆخێکی ترەوە . لە نێوان سالانی ١٩٢٩ ـ ١٩٣٣ دا ، سەرتاپای جیهانی سەرمایەداری و ئەو وولاتانەی بە ڕەورەوەی ئەوانەوە بەسترابوون ، دووچاری تەنگ و چەلەمەیەکی ئابووری ئەوتۆ هاتن ، توێژە زەحمەتکێشەکان تا سەر ئێسقان بە دەستی‌یەوە دەیان نالاند . دیارە عیراقیش نەك هەر نەیدەتوانی خۆی لە ئاسەواری ئەو تەنگ و چەلەمەیە

قوتار بکا بگره چەند دیاردەیەکی نوێی ئابوری تێدا پەیدا بوون و بە ئەندازەیەك بە دەستی یەوە دەیناڵاند پێشتر شتی وای بە خۆیەوە نەدیبوو . بەرهەمهێنان لە پێناو بازاڕی سەرمایەداری داو کەم بوونەوەی شمەکی نێردراو بۆ دەرەوەو بەرێژەی دوو ئەوەندە لە جاران کەمتر[٢٣٩] لە ئەنجامی ئەو بارە ناهەموارەی تووشی بازار هاتبوو ؛ دەڵێین هەموو ئەمانە بوونە هۆی بێ بازاڕیی ئەوکەل وپەل شمەکانەی لە ناوخودا بەرهەم دەهێنران . ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە نرخیشیان دوو ئەوەندەو زیاتری نرخی بەرهەمی کشت وکاڵیش دابەزیبوون[٢٤٠] بە نموونە : نرخی تەنێك خورما کە بەرهەمی سەرەکیی جووتیارانی خوارووی وولاتە لە ١٠٠ روپیەوە هاتە سەر ١٥ روپیە[٢٤١] لە هەمان کات دا بە شێوەیەکی هەست پێکراو کەل و پەلی بێگانە لە وولاتدا کەمی کرد . لە ساڵی ١٩٣٠ دا ئەو قوماشانەی لە دەرەوە دەهێنران ٢٥٪ و جل و بەرگ ٤٥٪ و ئامێری جۆربەجۆر بە ترومپایشەوە ٤٧٪ ، لە چاو ساڵی پێشووتردا کەمیان کرد[٢٤٢]

هەموو ئەمانەو بە تایبەتی بێ بازاڕیی بەرهەمە کشت و کاڵی یەکان بە شێوەیەکی سەلبی شوێن دەستیان بەسەر باری ئابوری وولاتەوە دیار بوو . داهاتی جووتیار بە ڕادەیەك هاتە خوارەوە ، تا ئەو کاتە نەبینرا بوو . بازرگانەکان بە دوکاندارەکانیشەوە ، بە ئەندازەیەك بە دەست گیروگرفتی ئابوری یەوە دەیان ناڵاند ، زۆربەیان سەرمایە کانیان لە دەست داو « بازارەکان وەك گۆرستانیان » لێهاتبوو ، وەك ئەندامێکی پەرلەمانی ئەو کاتە تاریفی کردووە[٢٤٣] .

بێگومان شتێکی سروشتی بوو کە لە سایەی ئەم بارو دۆخەدا داهاتی دەوڵەت لەو باجانەی کە بنچینەی بودجەی گشتی یان پێك دەهێنا ، بێتەوە یەك . بۆیە لە خۆوە نەبوو کە هەر زوو میری بڕیاری دا لەبەر کەم دەرامەتی ی جووتیاران و کەلەکەبوونی دەغل و دانێکی زۆر؛ باجی دەغل ودان بە شێوەی نەخیتنە وەربگرێ[٢٤٤] زۆرجاریش خەڵکی سەر بە توێژە کۆمەڵایەتی یە نەداراکان لە ناو شارەکان دا ، نەیان دەتوانی ئەو باجانەی لەسەریان دانرابوو بیدەن . لەبەر ئەوە دەکەوتنە بەر زەبروزەنگی دام و دەزگا رەسمی یەکان[٢٤٥] .

جا بۆ ئەوەی دەوڵەت شوێنەواری ئەم تەنگو چەڵەمەیە بسرێتەوە چەند هەنگاوێکی بێ سوودی ناو سەرەنجام ئەوەندەی تر باری سەرشانی توێژە هەژارو مام ناوەندی یەکانی گرانتر کرد . ئەوە بوو وەزارەتی ئاودێری و کشتوکاڵی هەڵوەشاندو چی دەسەڵاتێك درابوو بە وەزیری ئەو وەزارەتە ، درا بە وەزیری ئەشغال و هاتوچۆ .[٢٤٦] ئەم بڕیارە سەیرو عەنتیکەیە بەسە بۆ ئەوەی لە

سروشتیئەو هەنگاوانە تێ بگەین کە میری بە مەبەستی چارەسەرکردنی گیروگرفتە ئابوری یەکان نابووی . هەر ئەم هەنگاوەی جگە لە ئەنجامەکانی تری ، بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر فەرمانبەری وەزارەتی باسکراو بە بێ ئیش وکار بمێننەوە[٢٤٧] وەنەبێ ئەم چارەنووسە بە تەنها فەرمانبەرانی وەزارەتی ئاودێریو کشتوکاڵی گرتبێتەوە ، نەخێر . چونکە بە پەلە یاسای نیوە مووچە بۆ ئەو فەرمانبەرانەیش دەرکرا کە یاسای خانەنشینی مەدەنی دەیگرتنەوەو بە پێی ئەو یاسایەیش دەسەلات درا بە ئەنجومەتی وەزیران ، ئەو وەزیفانە چزبکا کە پێویست نینو دەست بەرداری ئەو فەرمانبەرانەیش بن کە پێویستیان پێیان نی یە[٢٤٨] ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر فەرمانبەری ناو دام ودەزگاکانی دەولەت ناوەرۆکی ئەم یاسا ناڕەوایەیان بە سەردا سەپاندنو لەوەزیفە دەرکران[٢٤٩] . نەك هەر ئەوەیش بەڵکو بڕیاری دەرکردن ، ئەو فەرمانبەرانەیشی گرتەوە کە تا ئەمرۆیش جۆری ئیشەکانیان لە ناو دامەزراوە رەسمی یەکاندا دانسقەنو بایەخێکی زۆریان هەیە . ئەوەتا بە پێی یەکێك لەو لیستانەی لەم بارەیەوە دەرچووە ، دەولەت لە سەرانسەری وولاتدا دەست بەرداری ١٠ ئەندازیار بوو[٢٥٠] بەلام بە نیسبەت فەرمانبەرانی ترەوە ، یاسای داشکاندنی مووچەو پاداشتی خانەنشینی ی دەرکراو بە پێی ئەو یاسایە نیسبەتی مووچە ٥٪ تا ٨٪ هاتە خوارەوە . ئەمەیش کارێکی سەلبی کردە سەر جەماوەری فەرمانبەرانو تەنانەت پاش ماوەیەك بەوە تاوانبار کران گوایە هانی خەڵکیان داوە دژی یاسای باجی شارەوانی یەکان مان بگرن .[٢٥١] ئەوەشی کە زیاتر خەڵکەکەی وورووژاند ئەوە بوو لە رۆژگارێکی وا سەختو دژواردا میری نەی وێرا توختی مووچەی فەرمانبەرانی ئینگلیز بکەوێ ، یان هیچ نەبێ ژمارەیەکی کەمیان لێ دەربکا[٢٥٢] ئەمە لە کاتێکدا کە مووچەی فەرمانبەرێکی ئینگلیزی چەند ئەوەندەی مووچەی فەرمانبەرێکی عیراقی بوو . هەر لەبەر ئەوەیش بوو ، فەرمانبەرەکانی ئینگلیز بوو بوونە بار بەسەر خەزێنەی دەولەتی عیراقەوە . لە هەموو ئەوانەیش خواپتر فەرمانبەری وایان تێدا بوو لەو کاتە ناهەموارەدا بێ سڵ کردنەوە کاروباری وای ئەنجام دەدا ، ئەوەندەی تر باری نالەباری ئابوری عیراقی قورس دەکرد . بە نموونە . بەڕێوەبەرایەتی ئەوسای بەندەری « بەسرە » ، دەستی کرد بە دروستکردنی بینایەکی گەورەو کۆلۆنێل « وارد » ی بەڕێوەبەری بەندەر خۆی دانی پێدا دەنێ کە « بە پێچەوانەی باری ئابوری » یەوە ، جووڵاوەتەوە . کەچی لە کاتی کردنەوەی بیناکەدا کە ڕێکەوتی نیسانی ١٩٣١ ی دەکرد لە بەردەم مەلیك فەیسەلی یەکەمدا ، بیانووی بۆ ئەم

کاره نارەوایەی هێنایەوە[٢٥٣] .

هەر لەم مەیدانەدا ، شوێنی خۆیەتی لەسەر مەسەلەی باج هەڵوێستەیەکی تایبەتی بکەین ، چونکە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر ئاستی گوزەرانی زەحمەتکێشان و داهاتی خێزانی کرێکاران و پیشەوەرە بچکۆلەکان دێنێتەوە یەك . لە سەرەتای داگیرکردنی عیراقەوە سەپاندنی باج بەسەر دانیشتووان‌دا بووە یەکێك لە هۆ بنەڕەتی‌یەکانی نارەزایی توێژە چەوساوەکان . هێلی بەیانی‌ی باجی ناڕاستەوخۆیش بەردەوام سەرەو ژوو دەبووەوە . تا وای لێهات بەر لەوەی وولات سەربەخۆ ببێ ئەو چەشنە باجە ٨٢٪ ی باجی گشتی‌ی دەوڵەت و ٧٠٪ ی سەرجەم داهاتی بودجەی عیراقی پێك دەهێنا[٢٥٤] بەشێکی زۆری ئەم باجانەیش لەو سالانەدا کە وولات دووچاری گیروگرفتی ئابوری بوو بوو ، زیاد کران ، بە نموونە : لە ساڵی ١٩٣٠ دا بە تەنها کاسبانە ٥٠٪ زیاد کرا[٢٥٥] .

رووەکەی تری ئەم سککەیەیش ئەوەندە تەڵخ بوو ، بنیادەم قێزی لێ دەهاتەوە . کۆمپانیا بیانی‌یەکان و لە پێش هەموویانەوە کۆمپانیاکانی نەوت چەندین جۆر رەسم و باجیان لەسەر هەڵگیرا . بەوەیشەوە رانەوەستان و بێ ئەوەی گوێ بدەنە باری دارایی وولات ، لەو رۆژگارە ناسکەدا پێیان دادەگرت چەند باجێکی تریشیان لەسەر لابرێ بە داهاتانەیشەوە[٢٥٦] . ئەوە بوو ، حکوومەتی ئەوسای عیراق چەند بڕیارێکی دەرکرد ؛ بەپێ‌ی ئەو بڕیارانە گومرگی لەسەر هەندێ کۆمپانیای بیانی لابرد[٢٥٧] پاشان ناچار بوو بکەوێتە قەرزوقۆڵە لە « کۆمپانیای نەوتی عیراق »[٢٥٨] .

لە سەرەتای سالانی بیستەوە پیشەوەران سەبارەت بەو باج و رەسمانەی بەسەریان‌دا سەپێزا بوو ، بە شێوەی جۆربەجۆر نارەزایی خۆیان دەربڕی‌و تەنانەت هەندێ جار مانیان لە ئیش دەگرت . لە یەکەم رۆژی مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٢٢ دا قەسابەکانی بەغدا مانیان گرت و پایتەختی وولات ماوەی سێ رۆژ بەبێ گۆشت مایەوەوتا موتسەرفی بەغدا لە گەڵیان کۆنەبووەوەو دەستکاری رەسمی مەڕوماڵات سەربڕینی نەمرد و رێ‌و شوێنێکی تازەی بە دڵی ئەوان بۆ دانەنا ، وازیان لە مانگرتن نەهێنا[٢٥٩] دوای ئەوەیش مانگرتنی لەوبابەتە چ لە بەغداو چ لە شارەکانی تردا روویان‌دا ، وەك مانگرتنی قەسابەکانی « بەسرە » کە لە دوا دوای کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٨ دا ساز کرا[٢٦٠] زۆر جاریش پیشەوەران و خەڵکی تریش ، خۆیان لە رەسمی شارەوانی دەدزی‌یەوەو بە

شێوەی جیا جیا فێڵیان لەو داموو دەزگایانە دەکرد کە ئەو رەسمەیان وەردەگرت . رژێمیش بۆ دەستخستنی ئەو رەسمو باجانە بەرامبەر بە خەڵکی ی زەبرو زەنگی بەکار دەهێنا ، بە رادەیەك هەندێ جار حاڵ دەگەیشتە ئەوەی پەنای دەبردە بەر ئەو یاسایانەی داگیرکەران لەسالانی جەنگی یەکەمی جیهان دا دایان نابوو[٢٦١]

لەو ساڵانەدا کە وولات دووچاری تەنگو چەڵەمەی ئابوری هاتبوو ، نارەزایی پیشەوەران رەنگو روویەکی راستەقینەو لە جاران بەرفراوانتری بە خۆیەوە دی . یادداشتو ئەرزوحاڵی کۆمەڵەو پیشەوەر و دوکاندارەکانی بەغداو برووسکەی هاوەڵەکانیان لە سەرپاکی شارەکانی تردا ، بەسەر پەرلەمانو ئەنجومەنی وەزیران دا ، داباریو داوایان دەکرد هەندێ لەو رەسمانەی بە سەریان دا سەپێنراو، یان کەم بکرێنەوە ، یاخود لەسەریان لاببرێ[٢٦] خاوەن ئەرزوحاڵو برووسکەکان هەمیشە ئەوەیان دووپات دەکردەوە ، کە لە ئەنجامی پەستاندنی ئەو باجو رەسمانەی لە سەریان دانراوە ، باری ئابوری یان تا چ رادەیەك خراپ بووە . بە نموونە : سەرتاشەکان لە ئەرزوحالێکیان دا باسی ئەوە دەکەن کە « ناتوانن ئەوەندە پەیدا بکەن پێ ی بژین »[٢٦٣] پیشەوەران سەر لەنوێ بەهۆی مانگرتنەوە نارەزایی خۆیان دەربری . لە ناوەراستی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣٠ دا « کۆمەڵەی میوەفرۆشان » داوای کرد هەندێ لەو باجانە لابرێن کە بووبوونە بار بەسەر ئەندامەکانی یەوە ، کاتێکیش کە زانرا میری بە پێر داخوازی یەکانیانەوە ناچێ میوەفرۆشانی بەغدا مانیان گرتو لە رۆژی ٣١ ی ئایاردا بریاریان دا میوەو سەوزە لە بازار نەکرن[٢٦٤] جاری وایش هەبوو ، رژێم ناچار دەبوو هەندێ لەو باجانەی لەسەر کاری پیشەیی دانرابوون لایان بیا ، یان کەمیان بکاتەوە ، وەك ئەوەی وەزارەتی ناوخۆ لەسەرەتای تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ دا کردیو بریاری دا چەند رەسمێکی نائاسایی کە لە سەر دەلالو سەرافو خاوەن چاپخانەو ماسی فرۆشانی «مووسل» دانرابوون، لابچێ.[٢٦٥]

بەو چەشنە مەسەلەی باجو رەسم بووە داینەمۆیەکی بەهێزو پاڵی بە توێژە کۆمەڵایەتی یەکانی ناو شارەوە دەناو ئەنجام لە ناوەراستی ساڵی ١٩٣١ دا ـ وەك لەمەودوا دەی بینین ـ یەکەم مانگرتنی گشتی ی بەرپا کرا . مانگرتنێك تا ئەو کاتە لە وولات دا نەبینرا بوو .

باری سیاسی وولاتیش هۆیەکی تر بوو پاڵی بە کۆمەڵانی خەڵکەوە نا بچنە مەیدانی خەباتی نیشتمانی یەوە . لە دوا دوای ساڵانی بیستەوە داموو دەزگای

ئیمپریالیزم‌و دەستەو دایەرەی ئەوسای عیراق کە ئەلقە لە گوێی سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئینلگیزی بوون ، کەوتنە خۆ تا بە دژی میللەتی عیراقەوە ، داوی پەیمانێکی نوێ ـ بەلام لەوانەی پێشوو قورس‌ترو گرانتر ـ لە نێوان عیراق‌و بەریتانیادا بچنن کە دەویسترا وولات پاش ئەوەیش کە سالی ۱۹۳۲ بە رووکەش سەربەخۆیی وەرگرتبوو ، لە هەموو روویەکەوە لە ژێر رکێفی ئەودا بمێنێتەوەو لە تەوەرەی سیاسەتی بەریتانیادا بخولێتەوە . بێ گومان ئەم هەلوێستەیش بووە هۆی ئەوەی هێزە نیشتمانییەکان لە ناخەوە بورووژێنێ . بۆیە کۆبوونەوەو نارەزایی دەربرین‌و خۆ نیشان‌دانی جەماهیری دژی ئەم پیلانە نوێیە یەك لە دوای یەك دەستیان پێ کردو چالاکیی راگەیاندن بە شێوەیەکی فراوان دژی ئیمپریالیزم هاتە گۆرێ‌و توانیشی کار بکاتە سەر هەموان ، بە تایبەتی لەو رۆژگارەدا خەلکیی دادو بێ دادیان بوولە دەست باری ناهەمواری ئابوری‌یان . شتێکی ئێجگار سووشتیش بوو کە هەموو ئەم ئالۆ گۆرانەی لەسەر شانۆو لە پشت پەردەوە روویان دەدا راستەوخۆ کار لە جەماوەری کرێکاران‌و پیشەوەران بکەن ؛ نەك هەر ئەوەیش بەلکو خەباتی بێ وچانیان بە تایبەتی مانگرتنەکانی کرێکارانی رێگای ئاسن ، لەو رۆژانەدا بوونە دیارترین شێوەی دەربرینی بە کردەوەی جەماوەر دژی ئیمپریالیزم‌و دام‌و دەزگاکانی .

---

## مانگرتنەکانی کرێکارانی رێگای ئاسن

---

لە بەشەکانی پێشوودا بۆمان دەرکەوت کە هەموو ئەو رێگا ئاسنەی ئینلگیزەکان رایان کێشابوو ، بۆ ئەوە بوو لە سالانی جەنگدا خزمەتی نیازو مەبەستە سوپاییەکانی خۆیانی پێ بکەن و دوای جەنگیش ئامانجە ستراتیژی‌کانی پێ جێبەجێ بکەن . جا لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا ئینلگیز دووچاری تەنگو چەلەمەی ئابوری هاتبوو ، ناچار بوون بۆ راکیشانی ئەو رێگایانە خراپترینی ئەو کەرەسانە بەکار بهێنن کە لە بەردەستدا بوو . زۆربەی ئەو کەرەسانەیش بریتی بوون لەو ئاسنانەی لە هیندوستان بەکار هاتبوون . لەبەر ئەوە هەر رێگایەو پیوانەیەکی جیاوازی هەبوو[۲٦٦] جگە لەوەیش لە رووی چۆنیەتی‌یەوە جۆربەجۆر بوون . زۆربەی ئەو پردانەی دروست کرابوون لە تەختە بوون‌و بەرگەی رۆیشتنی خێرای شەمەندوفەریان نەدەگرت . سەرپاکی

ئەو فارگۆنانەی لە عیراقدا ئیشیان پێ دەکرا کۆن و تەمەنیان لە نێوان ١٢ و ٢١ ساڵدا بوون و هەر هەموویشیان لە هیندوستانەوە هێنرابوون . شایانی باسە تێکڕای ڕاپۆرتە ڕەسمی یەکان ، بە ڕاپۆرتەکەی ژەنەڕاڵ « ف . د. هامند » یشەوە بە ئاشکرا دان بەم حەقیقەدا دەنێن.[٢٦٧]لە ڕاپۆرتێکی ڕەسمی ی تردا هەر لەم بارەیەوە نووسراوە کە « .. هێزە سوپایی یە کان ئەم ڕێگایانەیان بۆ ئەوە ڕانەکێشاوە تا هەمیشە بەکار بهێنرێن ، یان بۆ ئەوەی مەبەستی ئابوری و بازرگانی یان پێ جێبەجێ بکرێ ، بەڵکو مەبەست لە ڕاکێشانی ئەوە بووە ، سەربازو تفاقی جەنگیان پێ بگوێزرێتەوە و لە کاتی جەنگی گشتی ی دا هامشۆو بزووتنی سوپا ئاسان بکەن .. »[٢٦٨]

بەلام سەرەڕای ئەمەیش ئینگلیزەکان ، سەبارەت بە پێداویستە ئابوری یە نوێ یەکانیان و لە پێناو جێ بەجێ کردنی ئەو نەخشە فراوانەیان دا کە دەرهەق بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کێشابوویان و لە دوای ساڵانی جەنگ بە تەواوی مەودایان دەرکەوت و لەبەر ئەوەی دەیانویست پرۆژە بەناوبانگەکەی ڕێگای ئاسنی بەغدا بژیەننەوە کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٨ وە بە نهێنی چەندین پەیوەندیی لە بارەوە کراو مەبەستیان بوو ڕێگاکەی عیراق بگەیەننە شاری « نوسێبین » ی تورکیا ؛ دەڵێین لەبەر ئەم هۆیانە ، سووربوون لەسەر ئەوەی ئەم کەرتە گرنگە بپارێزن و لەژێر چنگی خۆیاندا بیهێڵنەوە . هەموو ئەمانە وایان کرد سەرکردایەتی سوپایی بەریتانیا لە ڕۆژی ١ ی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ دا ڕێگای ئاسن بداتە دەست بەڕێوەبەرایەتی ئینیداب . لە ماوەی تەنها دووساڵدا ، واتە دوای ئەو مێژووە ئەوەی کە لە ڕێگای ئاسندا خەرج کرا ١١٤ لك روپیە[٢٦٩] لە داهاتەکەی زیاتر بوو ، هەموو ئەو پارەیەیش لە خەزێنەی بەریتانیا دەردەچوو[٢٧٠] . لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٢٣ یشەوە بەڕێوەبردنی ڕێگای ئاسن تەنها بەناو درا بە حکوومەتی عێراق .

ئەگەرچی بەهای ڕاستەقینەی گشت پرۆژەکانی ڕێگای ئاسن بە نیسبەت ئینگلیزەوە هیچ نەبوو ، چونکە لە بنەڕەتدا بۆ ڕاپەڕاندنی کارو باری جەنگ بنیات نرابوون و کەرەسەکانیشی کۆن و پەرپووت بوون و وەك ڕاپۆرتە ڕەسمی یەکان خۆیان دانی پیا دەنێن[٢٧١] لە ناوەڕاستی ساڵانی بیستەوە پێویستیان بە گۆڕین بوو . لەبەر ئەوەیش کە نەدەتوانرا ئەو کەرەسانە بگوێزرێنەوە بۆ شوێنیتر و بۆ هەر جێیەکی دیکەیش بنێردرانایە دەبوو ئەوەندەیان پارە تێدا خەرج بکرێ زۆر لە بەهای ڕاستەقینەیان زیاتر بوو[٢٧٢] .

سەرباری هەموو ئەمانەیش وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانیا بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسنی قەرزار بار کردو ناچاری کرد ساڵی چەردەیەك لەو « قەرز » ە بداتەوە ، بەمەیش ئەوەندەی باری شانی بەڕێوەبەرایەتی ناوبراوی لە رووی داراییەوە گران کرد[٢٧٣] . هەموو ئەو هەوڵو کۆششەی حکوومەتی عیراق لە ساڵانی ئینتیدابدا لە تەك وەزارەتی موستەعمەراتدا بەختی کرد تاوەکو ڕێگای ئاسنو بەڕێوەبەرایەتی راستەقینەی بدرێتە عیراق بە فیڕۆ چوو . چونکە وەزارەتی موستەعمەرات داوای پارەیەکی ئەوتۆی دەکرد لە کێشی عیراقدا نەبوو . ئەمە لە کاتێکدا نوێنەری عیراق لە سەر ڕێو شوێنی هەمیشەیی خۆی لە زۆر لایەنەوە ملی بۆ بەریتانیا شۆڕ کردو رای گەیاند کە حکوومەتی عیراق بە کوڵو دل دەیەوێ تفاقو دامو دەزگاکانی ڕێگای ئاسن بکڕێتەوە[٢٧٤] .

ئەم تابلۆ گاڵتە جاڕییە بە تەواوی لەوەدا بەرجەستە دەبێ کە دەبینین هەر لەو ڕۆژەوەی بەڕێوەبردنی ڕێگای ئاسن بەناو درایە حکوومەتی عیراق ، ئیتر بەریتانیا چی یارمەتی هەیە لەو بەڕێوەبەرایەتییەی بڕی . تەنانەت ئەو ملیۆنو نیو چونەیەهەیشی نەدایە کە بڕیار بوو لە ساڵی ١٩٢٥ دا بە قەرز بیدا بە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسنو ئەمیش هەندێ لە پرۆژە ئێجگار پێویستەکانی پێ تەواو بکا[٢٧٥] . کەچی حکوومەتی عیراق یەك لە دوای یەك بەبێ دەست گێڕانەوە قەرزو قوڵەی بەو بەڕێوەبەرایەتییە دەدا . بەرادەیەك ئەو قەرزانەی عیراق لە نێوان تەممووزی ١٩٢٣ و ١٩٢٦ دا ، دابوویە گەیشتە چوار ملیۆنو نیو روپیە . لە هەموو ئەو ماوەیەدا بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن لە ١٤ ی ئایاری ١٩٢٥ دا تەنها قەرزێکی ٢٣٠ هەزار روپیەیی لە کۆمپانیای نەوتی فارسی - ئینگلیزی وەرگرت ، ئەویش بە مەرجێك ڕێگایەکی تایبەتی بۆ خانەقین رابکێشێ چونکە کۆمپانیای ناوبراو هێندە پەرژەوەندی راستەو خۆی لە ناوچەکەدا هەبوو دەیهێنا ئەو « قوربانییە گەورەیەی » بۆ بدا !![٢٧٦] ئەمە لە کاتێکدا کە حکوومەتی عیراق بەردەوام- تەنانەت دوای ئەو مێژووەیش کە باس کرا - قەرزی بەو بەڕێوەبەرایەتییە دەدا . ئەوەبوو لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٢٦ دا قەرزێکی ٦٠٠ هەزار روپیەیی دایە[٢٧٧] لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٢ یشدا ، واتە لەو کاتەدا کە وڵات لە تەنگو چەڵەمەی ئابووریدا دەژیا ، قەرزێکی تری ٤٨ لك روپیەیی دایە[٢٧٨] ئەم هەڵوێستە بە توندی کۆمەڵانی خەڵکی عیراقیان وروژاندو[٢٧٩] دەنگیان لێ هەڵبڕیو دەیان پرسی « ئاخۆ حکوومەتی عیراق قەرز بە موڵکێك دەدا هی خۆی نییە !» وەك دەقاو دەق لە بەڵگەنامەیەکی رەسمیی باڵیۆزخانەی ئینگلیزی رۆژی ١٢ ی ئەیلوولی ١٩٢٥ دا نووسراوە[٢٨٠] .

شایانی باسە داهاتی ڕێگای ئاسنیش لە پاش سالی ١٩٢٢ وەوە ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادی بوو ، تا وای لێهات لەو پارەیەی تێ پەڕاند کە تێیدا خەرج دەکرا . ئەوەتا سالی دارایی ١٩٢٢ ـ ١٩٢٣ ، ٣٣٥ هەزار ڕوپیەی پاشەکەوت کرد .[٢٨١] بەلام ئەم دۆخە ئابوری‌یەی ڕێگای ئاسن لە سالێك زیاتر نەخایاند ،[٢٨٢] چونکە تەنگو چەلەمەی ئابوری کاری لەویش‌کردو بە هۆی زیادکردنی ئەو پارانەوە کە تێیدا خەرج دەکران‌ولە داهاتەکەی زۆرتر بوون ، بودجەی سالانەی کورتی هێنا ،[٢٨٣] بە مەرجێك لە تواناد‌ا بوو بە هەرشێوەیەك بێ چارەسەری بکەن . ڕاستی‌یەکەیشی کورت هێنانی بودجەی سالانەی وولات ئەنجامی چەند هۆیەك بوون ، ڕاستەوخۆ پەیوەندی‌یان بە تەنگوچەلەمەکەی جیهانی سەرمایەداری‌یەوە هەبوو . لەبەر ئەوەی دەغلو دان ڕەوانەی دەرەوە نەدەکرا ، ڕادەی گواستنەوەیشی بە شەمەندوفەر هاتە خوارەوە . هەمان شتیش بە نیسبەت ئەو کەلو پەلانەوە ڕووی‌دا کە لە دەرەوەی وولاتەوە دەهێنرانە عیراقەوە . بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن خۆیشی ڕۆلێکی دیاری هەبوو لە زیادکردنی تەنگو چەلەمەکانی‌دا . بە نموونە : زۆر کەم پارەی بۆ پەرەپێدانی فارگۆن‌و چاککردنەوەی هێلە ئاسنینەکان خەرج دەکرد کە زۆربەی کات لافاو تێك‌و پێکی دەدان‌و ڕێگای هاتوچۆ لەسەرکردنی دەبڕی . یەکێك لەو لیژنە تایبەتی‌یانەی بۆ لێکۆلینەوە لە گیروگرفتەکانی ڕێگای ئاسن پێکهاتبوو ، دانی پیا دەنێ کە « بە تەنگەوە نەهاتنی هامشۆکەران » لە ڕادەیەکدا بووە « خەلکی هەلپەی ئەوە نەکانە بە شەمەندوفەر هاتوچۆ بکەن »و « لەبەر ئەوەی هۆیەکانی حەوانەوەی تێدا نەبوو . هامشۆکەران حەزیان لێ نەبوو هاتوچۆی پێ بکەن »[٢٨٤]

هۆیەکی تری گرنگیش هەبوو ، وای کرد ڕێگای ئاسنی عیراق بگاتە ئەو حالەی باسمان کرد . بەڕێوەبەرایەتی ئەم داموو دەزگایە ئەوەندەی لەگەل کرێکارو فەرمانبەرە عیراقی‌یەکان‌دا چروك بوو ، ئەوەندەو بگرە زیاتریش لە تەك ئەو فەرمانبەرە بیانی‌یە گەورانەدا دەست‌و دل کراوە بوو کە لەلای ئیشیان دەکرد . فەرمانبەری وایان تێدا بوو مانگانەکەی بەبێ ـ مخصصات ـ بە قەدەر مانگانەی ١٥٠ کرێکاری عیراقی‌وبگرە زیاتریش بوو[٢٨٥] لە کاتێك‌دا کە ئەم هەموو کرێکارو فەرمانبەرە بیانی‌یانە بوو بوونە گرێ‌یەك‌و چەندین گیروگرفتیان خولقاندو پالی بە ژمارەیەکی زۆرەوە نا عیراق بەجێ بهێلن‌و لەکاتێك‌دا کە بەڕێوەبەرایەتی خۆی ، دەستە دەستە کرێکاری عیراقی لە ئیش دەردەکرد وەك لەمەودوا باسی دەکەین ؛ دەلێین لە هەمان‌کات‌دا خەلکی تری بیانی دەهێناو لە

داموده‌زگاکانیدا ئیشی پێ ده‌کردن . له‌ ماوه‌ی سالی دارایی ١٩٢٤ ـ ١٩٢٥ دا ژماره‌ی ئه‌وانه‌ی بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ هاتبوونه‌ عیراقه‌وه‌ گه‌یشته‌ ١٩٣ که‌س و له‌ سالی دوایی‌دا ٩٠ که‌س و له‌ شه‌ش مانگی یه‌که‌می سالی ١٩٢٦ ـ ١٩٢٧ دا ٤٤ که‌س بوون[٢٨٦] .

بێ گومان به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی ڕێگای ئاسن بۆ خۆ قوتار کردن له‌ ته‌نگو چه‌لّه‌مه‌ی دارایی زۆر به‌ ئاسانی‌ی کرێکاره‌ عیراقی‌یه‌کانی ده‌کرده‌ قوچی قوربانی‌ی . پێش ئه‌وه‌ی ئه‌م ته‌نگو چه‌لّه‌مه‌یه‌ زێفی لێ بستێنێ و به‌ئاشکرا شوێنه‌واره‌کانی ده‌ربکه‌وێ ، به‌ بیانووی ڕێکخستنی ئیش و کاری ناو داموده‌زگاکانی‌یه‌وه‌ ده‌ستی کرد به‌ ده‌رکردنی ژماره‌یه‌کی زۆر کرێکاری عیراقی . ئنجا ڕێگای که‌م کردنه‌وه‌ی سه‌عاتی ئیش‌کردنی گرته‌ به‌رو ڕۆژی دوو سه‌عاتی که‌م‌کرده‌وه‌ ، دیاره‌ به‌رامبه‌ر به‌مه‌یش ڕۆژانه‌ی کرێکاره‌ عیراقی‌یه‌کان هێنرایه‌ خواره‌وه‌ . ئه‌مه‌ جگه‌ له‌وه‌ی که‌ ڕۆژانه‌ی ژماره‌یه‌ك کرێکاری به‌نیسبه‌تی ٥٠٪ داشکاند ، بێ ئه‌وه‌ی گوێ بداته‌ ماوه‌ی ئیش کردنی ڕۆژانه‌یان .

به‌لام ئه‌م هه‌نگاوانه‌ی وه‌ك سالانی پێشووتر هه‌روا به‌ ئاسانی‌ی به‌سه‌ر خه‌لّکی‌دا تێپه‌ڕیان نه‌کردو هه‌لّس و که‌وتی ناڕه‌وای به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی زۆر لایه‌نی جیاجیاو له‌ پێش هه‌موویانه‌وه‌ « کۆمه‌لّه‌ی سنعاتکاران » ی جوولاند ؛ ئه‌میش چه‌ند جارێك بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ په‌یوه‌ندی به‌ لێپرسراوانه‌وه‌ کردو یادداشتی پێشکه‌ش کردن و داوای ده‌کرد سنوورێك بۆ هه‌لّس و که‌وتی به‌ ئاره‌زووی لێپرسراوانی ڕێگای ئاسن ده‌رهه‌ق به‌کرێکاره‌ عیراقی‌یه‌کان دابنێ . کۆمه‌لّه‌ی ناوبراو هه‌رچی شتێکی ده‌رباره‌ی جموجوّلی به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی بزانیایه‌ ، له‌ ڕۆژنامه‌کانی ناوخۆدا بلاوی ده‌کرده‌وه‌ تاوه‌کو ڕای گشتی‌ی عیراق ئاگاداری هه‌موو ئه‌و شتانه‌ بێ که‌ روویان ده‌دا[٢٨٧] .

. به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی ڕێگای ئاسن نه‌ك هه‌ر ئه‌و پرۆتستۆیانه‌ی پشت گوێ خست که‌ کرێکاران و ڕێکخراوه‌کانیان پێشکه‌شیان ده‌کرد ، به‌لّکو بایه‌خی به‌و یادداشتانه‌یش نه‌دا که‌ هه‌ندێ لایه‌نی ره‌سمی‌ی له‌ژێر زه‌بری ڕای گشتی‌ی‌دا پێشکه‌شیان کردبوو . به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ بیانووی هیچ و پووچ و نابه‌جێ‌ی کرده‌ به‌لّگه‌ و له‌سه‌ر هه‌لّوێستی سته‌مکارانه‌ی خۆی به‌رده‌وام بوو ، به‌ڕاده‌یه‌ك تا ده‌هات باری ژیانی کرێکارانی ڕێگای ئاسن رووی له‌ خراپی‌ی بوو . پێش ئه‌وه‌ی سالی ١٩٣٠ کۆتایی بێ ، جارێکی تریش به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی ده‌ستی له‌ سه‌عاتی ئیش‌کردن وه‌رداو که‌می کرده‌وه‌ ، ئه‌مه‌یش له‌گه‌ل هه‌نگاوه‌کانی پێشووی‌دا ، بوونه‌ هۆی ئه‌وه‌ی کرێکاری عیراقی له‌ مانگێك‌دا کری‌ی ١٢ ڕۆژ زیاتر

وەرنەگرێ[٢٨٨] .

جا کە دەرکەوت هەوڵو کۆششی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » ئەنجامێکی ئەوتۆی بە دەستەوە نەداوە ، سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕیاریدا لە پێناوی جێ بەجێ کردنی داخوازییە رەواکانیدا مانگرتنێکی گشتیی ساز بکا .« ئەلقەزاز » و هاوەڵەکانی کەوتنە خۆو بە شێوەیەکی فراوان پەیوەندییان کرێکارانەوە . کردو لە تەکیاندا کۆبوونەوە ، تاوەکو بۆ رۆژی خۆی ئامادەیان بکەن[٢٨٩] . لە رۆژی ٣ ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠ دا ، نزیکەی هەزار کرێکاری[٢٩٠] سەر بە لقە جیاجیاکانی کارگەکانی رێگای ئاسن لە گوڕەپانی ئیستگەی رۆژئاوای بەغدا کۆبوونەوەو بانگی مانگرتنیان هەڵدا . ئەم مانگرتنە لە رووی قەوارەو شێوەی رێکخستنو ئەنجامەکانییەوە بە یەکەم مانگرتن دادەنرێ لە مێژووی عیراقدا .

مانگرتووەکان بە مەبەستی لابردنی زوڵمو ستەم چەند داخوازییەکیان پێشکەش کرد، بریتی بوون لەم خاڵانەی خوارەوە :

١ ـ رۆژانەی کرێکاران بچێتەوە دۆخی جارانی .
٢ ـ مووچەی جەژنە رەسمییەکانیان بدرێتێ .
٣ ـ کە کرێکار مۆڵەتی نەخۆشی وەردەگرێ ، رۆژانەکەی نەبڕدرێ .
٤ ـ ئەو « ئانە » یەی کە پێشتر لە هەموو روپیەیەك دەبڕدرا ، بیان درێتەوە .
٥ ـ سنوورێك بۆ هەڵسو کەوتی لێپرسراوانی رێگای ئاسن دابنرێ کە بە ئارەزووی خۆیان لەگەڵ کرێکارە عیراقییەکاندا دەجووڵێنەوە[٢٩١] .

مانگرتووەکان روویان کردە وەزارەتی ئەشغالو هاتوچۆ ، بەڵام پۆلیس رێگەی پێ گرتنو ماوەی نەدان بگەنە جێ . بەڕێوەبەرایەتیش بەیاننامەیەکی سەبارەت بە مانگرتنەکە دەرکردو روونی کردەوە کە بەڕێوەبەری گشتیی ئامادەیە لەگەڵ نوێنەری مانگرتووەکان کۆببێتەوەو « وتوویژی برایانەیان لەگەڵدا بکاو ئەوەی لە توانادایە ئەنجامی بدا »[٢٩٢] . کرێکاران وەفدێکیان بە سەرۆکایەتی « ئەلقەزار » پێکهێناو رۆژی دوایی چاویان بە بەڕێوەبەری گشتیی کەوتو داخوازییە کانی کرێکارانیان خستە بەردەست . بەڕێوەبەری گشتیی « بەو لووت بەرزییەوە پێشوازی نەکردن کە پێی ناسرابوو » وەك « ئەلقەزاز » وەسپی دەکا[٢٩٣] . ناوبراو دڵنیای کردن یاسای باجی مووچە کە دەوڵەت داینابووکرێکارانی رێگای ئاسن ناگرێتەوەو بەڕێوەبەرایەتی سەر لەنوێ چاو بە مەسەلەی کەمکردنەوەی سەعاتی ئیشکردندا دەگێڕێتەوە و چارەسەرێکی باشی دەکاو بەوەیش قایلە « ئەلقەزار » ببێتە نوێنەری

کرێکاران[٢٩٤] . دوا بە دوای ئەمە ، مانگرتووەکان چوونەوە سەر ئیش و کاری خۆیان . جا بۆ ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی رێگای ئاسن نیاز پاکی ی خۆی دەربخا ، دوای چەند رۆژێك لیژنەیەکی پێکهێناو بە قسەی خۆیان ئیشی ئەوە بوو ، گوایە رێگای ئەوتۆ دەگرێ خەرجی کەم بکاتەوەو دەست بەرداری هەندێ کرێکاری هیندۆسیش دەبێ[٢٩٥] . بەلام هەر زوو دەرکەوت مەبەستی بەڕێوەبەرایەتی لەم هەنگاوانەی ئەوە بووە ، کات بەسەر بباو پاشان هێرشێکی وایان بکاتە سەر و بە شەڕی دەروونی ی تێکیان بشکێنێ تا جارێکی تر نەتوانن توخنی مانگرتن بکەون ، وەك لەو هەنگاوانەی دا دەردەکەوێ کە دوایی هاویشتنی .

مانگرتنی کرێکارانی رێگای ئاسن ، ئەگەرچی کەمی خایاند بەلام خالێکی رۆشن و گرنگە لە مێژووی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق داو نیشانەی ئەو ئال و گۆڕە تازەیەیە کە بە سەر بزووتنەوەی کرێکاران دا هات . ئەو تۆزە سەرکەوتنەی کرێکاران بە هۆی مانگرتنەوە بە دەستیان هێنا ، تێ ی گەیاندن کە هاریکاری کردنی یەکتری تا چ رادەیەك بایەخی هەیە . جگە لەوەیش سەرنجی توێژەکانی تری کرێکارانی راکێشاو هەستیان بە کەلك و سوودی ئەم شێوازە نوێیەی خەبات کرد . دیارە هەروا لە خۆڕا نەبوو کە دوای مانگێك کەمتر پتر لە هەزار کرێکار ئەرزوحالێکیان دا بە لیپراسراوان و تێیدا پشتگیریی کرێکارانی رێگای ئاسن یان کردو داوایان کرد « لە پێناو پاراستنی مافە زەوت کراوەکانی کرێکاران داو لەبەر نەبوونی یاسایەکی تایبەتی کرێکاران ، بە زووترین کات یاسای کرێکاران دابنرێ »[٢٩٦] گرنگ ئەوەیە ئاگاداری ئەوەبین کە ئەو مانگرتنە بە تەنیا کاری لە کرێکاران ، بەلکو کاری لە چەندین توێژی تری کۆمەلایەتی کرد ، کە هەموویان بە حوکمی ئیش و شوێن دەستیان لە بەرهەمهێنان دا سەر بە چینی بۆرژوای بچووك بوون . جارێکی تریش دووبارەی دەکەینەوە کە هەروا لە خۆوە نەبوو فەرمانبەرە عیراقی بچکۆلەکانی ناو دام و دەزگای رێگای ئاسن ، دوو هەفتە دوای مانگرتنی کرێکاران و سەبارەت بەوەی جیاوازی یان لەگەل دا دەکراو دەچەوسێنرانەوە نەچوون مووچەکانیان وەرگرن[٢٩٧] . ئەوەی لێرەدا مەغزایەکی گەورەی هەیە ئەو تێبینی یە یە کە لەناو راپۆرتە تایبەتی یەکەی حکوومەتی بەریتانیادا نووسراوە کە لە بارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی عیراقەوە لە سالانی ئینتیداب دا ، پێشکەش بە « کۆمەلی گەلان » ی کردووەوە دەلێ :

« هەندێ بەلگە هەن دەری دەخەن کە زەحمەتکێشان ـ لە عیراقدا . ك . م ـ خەریکن لەوە تێ دەگەن کە کاری هەرەوەزی چ هێزو توانایەکیان پێ دەبەخشێ و

چۆنیش لەگەڵ خاوەن ئیش‌دا بەکاری دەهێنن » ئەوەی لێرەدا پێویستە دووپات بکرێتەوە ئەوەیە ئەم برگەیە راستەوخۆ لەو جێیەدا نووسراوە کە راپۆرتەکە دێتە سەر باسی مانگرتنی کرێکارانی رێگای ئاسن[298] .

وەك لە پێشەوە باس کرا ، پاشگەز بوونەوەی بەرێـوەبەرایـەتی رێگای ئاسن لەبەردەم مانگرتووەکان‌دا ، لەوە بەولاوە کە فرۆفێڵێك بوو کرێکارانی پێ دەسخەرۆ کرد ، هیچی تر نەبوو . چونکە تاقە داخوازی‌یەك چی‌یە بۆ کرێکاران جێ بەجێ نەکرا . نەك هەر ئەوەیش بەڵکو چەند هەنگاوێکی تریشی ناودەیویست هێزو توانای خۆی نیشان بداو تۆوی نائومێدی لە دەروونی کرێکاران‌دا بچێنێ ؛ بەوەی پەرژەوەندی هەندێکی پێ‌شێل کرد ، تاوەکو بە حســابی خۆی دەرسی ئەوانی تری پێ دا بدا . بە پێچەوانەی هەموو ئەو گفتو بەڵینانەوە کە پێ‌ی دابوون ، بەرێوەبەرایەتی لە ئێوارەی کریمس‌دا رای گەیاند کە بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵەوە هەموو دامو دەزگاکانی لە رۆژی ٢٥ ی کانوونی یەکەمەوە بۆ ماوەی سێ رۆژ لە ئیش رادەوەستن[299] . ئەمەیش مانای ئەوە بوو کە مووچەی ئەی ئەو سێ رۆژەی کرێکارە عیراقی‌یەکان دەبڕدرێ . ئنجا هەنگاوێکی نارەوا تری هاویشتو بۆ کرێکارانی سەلماند کە لێپراسراوانی رێگای ئاسن نەك هـەر نیازیان خراپە ، بەڵکو بە ئاشکرایش گاڵتە بە پەرژەوەندی‌یەکانیان دەکەن ، لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣١ دا بەرێوەبەرایەتی بڕیارێکی دەرکردو بە پێ‌ی ئەو بڕیارە مـاوەی ئیش‌کردنی رۆژانـەی کردە (٤) ســەعاتو مــووچەی کـرێکارە عیراقی‌یەکانی بە هەمان رێژە هێنایە خوارەوە ، بە مەرجێك ئەو بڕیارە لە رۆژی ٢٤ ی شوباتەوە ئیشی پێ بکرێ[300] ئا ئەم بڕیارە بە نیسبەت کرێکارانی رێگای ئاسنەوە دەست وەشاندنێکی لە ناکاو بوو ، چونکە ئەوان وایان چاوەڕوان دەکرد بە پێ‌ی ئەو گفتو بەڵێنەی پاش مانگرتنەکە پێیان درابوو ماوەی ئیش کردنی رۆژانەیان لە شەش سەعاتەوە بۆ بکرێتەوە بە هەشت سەعـات . وەك نەریتی هەمیشەیشی ، کەوتە بڵاو کردنەوەی گیانی دووبەرەکی‌ی لە ناو کـرێکاران‌داو بڕیاری‌دا داشکاندنی رۆژانە کرێکارە ئەرمەنی‌یەکان نەگرێتەوە[301]

ئەم بڕیارە نوێ‌یە هەرایەکی گەورەی لە ناو کرێکارانی رێگای ئـاسن‌دا نایەوەو « کۆمەڵەی سنعاتکاران »جارێکی تریش خۆی کردەوە بە خاوەنی ئەم مەسەلەیەو لە زۆر لاوە کەوتە پەیـوەندی کـردن . کرێکـارانیش دەمو دەست وەفدێکیان بە سەرۆکایەتی « ئەلقەزاز » پێکهێنـا تاوەکـو چاویـان بە گـەورە لێپرسراوانی رێگای ئاسن بکەوێ . هەر ئەو رۆژەی بڕیارەکە دەرچوو ، وەفدەکە

چاویان بە سەرۆکی ئەندازیارە میکانیکییەکانی کارگەی « شالچییە » کەوت[٣٠٢] و رۆژی دوایی چوونە لای بەڕێوەبەری گشتیی بەڵام بێ ئەوەی بگەنە ئەنجامێك شایانی باس کردن بێ .

لە لایەکی ترەوە ، کرێکارانی ڕێگای ئاسن بە مەبەستی ئەوەی سەرنجی رای گشتیی بەلای مەسەلەکەیاندا رابکێشن ، لە مەیدانی راگەیاندندا چالاکییەکی هەست پێکراویان نواند . « ئەلقەزاز » لەو بانگەوازەیدا کە بەو بۆنەیەوە بڵاوی کردەوە دەپرسێ : « .. نازانین هەڵوێستی پیاوە لێپرسراوەکانمان‌و پیاوانی دام‌و دەزگا نیشتمانییەکان‌و ئەوانەی مەسەلەی کرێکارانیان لا مەبەستەو بەتایبەتی ڕۆژنامەکانی عیراق چی دەبێ ؟! »[٣٠٣] ئەوجا ڕۆژنامەکان کەوتنە قسەکردن لەسەر ئەو « پەشێوییە گەورەیە » ی کەوتووەتە ناو ریزی کرێکارانی ڕێگای ئاسنەوەو خەریکە « دەست لە ئیش هەڵبگرن » ، چونکە « بێ ئیشییان لەو چەشنە ئیش کردنە » پێ باشترە . ناچار سەرۆکی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » و هەندێ لە سەرکردەکانی تری « هەوڵێکی زۆریاندا کرێکاران خاو بکەنەوە تا وەڵامی بەڕێوەبەری گشتییان بۆ دێتەوە »[٣٠٤]

بەڵام وەڵامی بەڕێوەبەرایەتی زۆر دڵڕەقانە بوو ؛ بە ئاشکرایش کرێکارانی خستە بەردەم دوو ریانێك ـ یان سەعاتی ئیش کردنی ڕۆژانە وەك خۆی بمێنێتەوە ، یان ئەوەتا ١٧٣ کرێکارا لە ئیش دەربکرێن تا بتوانێ « بە قسەی بەڕێوەبەرایەتی » رۆژی شەش سەعات ئیش بە کریکارەکانی تر بکا . بە سەرزاریش گفتیدا چی لە تواناداا بێ لە داهاتوودا بیکا تاوەکو هەموو شتێك بگەڕێتەوە شوێنی خۆی[٣٠٥] بەو جۆرە کرێکاران هیچیان بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ پەنا بەرنە بەر ئەو چەکە نوێیەی فێری بەکارهێنانی بوون‌و پێشی سێ مانگ بەوپەڕی سەرکەوتنەوە تاقییان کردەوە ؛ ئەو چەکەیش مانگرتن بوو .

مانگرتنی دووەمی کرێکارانی ڕێگای ئاسن لە ٢٦ ی شوباتی ساڵی ١٩٣١ دا دەستی پێ کرد . ئەم مانگرتنە بە هەنگاوێکی بەرەو پێشەوەی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق دادەنرێ ، چونکە ئەمجارەیان ژمارەیەکی زۆرتر بەشدارییان تێدا کرد[٣٠٦] . جگە لەوەیش لە ئەنجامی پراکتیك‌و تاقیکردنەوەدا چووە بارێکی ڕێك‌و ترەوە . بۆیە مانگرتنی دووەم لە ناو کۆمەڵانی خەڵکدا لە مانگرتنی یەکەم زیاتر دەنگی دایەوە . ئەوەبوو کرێکارانی بەغداو چەند شارێکی تر پشتگیرییان کردو زۆربەی کۆمەڵەو حزب سیاسییەکان‌و ڕۆژنامەو پیاوە ئاینییەکان لەسەریان هاتنە دەنگ[٣٠٧] .

« کۆمەڵەی سنعاتکاران » بەیاننامەیەکی تێرو تەسەلی لە بارەی ئەم مانگرتنە تازەیەوە ، بڵاو کردەوەو تێیدا هۆی بەرپا بوونی مانگرتنەکەو فرِوفێڵی بەرِێوەبەرایەتیو چی هەوڵو تەقەللایەك لە دوادوای کانوونی یەکەمی سالی ١٩٣٠ وە تا رۆژی مانگرتنەکە ، بۆ هەڵخەڵەتاندنی کرێکاران دابووی ، روونی کردەوە . بەیاننامەکە دەست نیشانی هەموو داخوازییەکانی کرێکارانی کردووە کە بریتین لە هەمان داخوازییەکانی پێشوو ، لەگەڵ دوو خاڵی نوێدا . یەکەمیان ، دەربارەی ئەوە بوو کە پێویستە ئەو بریارەی سەعاتی ئیش کردنی رۆژانەی لە ٢٤ ی شوباتەوە کردبوو بە ٤ سەعات ، چز بکرێ . دووەمیشیان : « لابردنی ئەو فەرمانبەرە بیانییانەی کە پسپۆر نین » لە تێکرِای دامو دەزگاکانی رێگای ئاسندا[٣٠٨] . سەرکردەکانی مانگرتنەکە رستەی « خواردنی مافی کرێکاران زوڵمێکی ئاشکرایەو ئەنجامەکەی ماڵ وێرانییە » کردبووە دروشمی سەرەکییو مانگرتووەکان لە کۆبوونەوەکانیاندا بەرزیان دەکردەوەو لەگەڵ لێپرسراوانیشدا پێیان لەسەر دادەگرت[٣٠٩]

لە بارودۆخێکی ئاوادا ئەگەر بەرِێوەبەرایەتی رێگای ئاسن رێگای پێچو پەناو فرِوفێڵی گرتبێ ، شتێکی سروشتیی بووە . ئەوەتا بڵاوی کردووەتەوە گوایە ئامادەیە لە ماوەیەکی کورتدا هەموو شتێك بگێرِێتەوە سەر دۆخە سروشتییەکەی خۆیو چی پێویست بێ ئەنجامی بدا . بەلام کرێکاران سوور بوون لەسەر ئەوەی تا نەگەنە ئەنجامێکی ئەوتۆ کەمێك باری شانیان سووك بێ ، درێژە بە مانگرتنەکەیان بدەن[٣١٠] . هەر دوو رۆژ دوای ئەوەی مانگرتنەکە دەستی پێ کرد ، نزیکەی ١٢٠٠ کرێکاری رێگای ئاسن لە گۆرەپانی « السرای » کۆبوونەوەو داوایان لە میری کرد پشتگیرییان بکا تاوەکو داخوازییە رەواکانیان بۆ جێ بەجێ بکەن . دروشمی ناوەندیی کرێکاران لەو کۆبوونەوەیەدا ئەوە بوو کە پێویستە لەگەڵ کرێکارە بیانییەکاندا بە یەك چاو سەیر بکرێنو چونیەك هەڵسو کەوتیان لەگەڵ بکرێ . دوای نزیکەی دوو سەعاتو پاش ئەوەی کە میری نەیتوانی بڵاوەیان پێ بکا ، وەزیری ئابووریو هاتوچۆ ، ناچار بوو قایل ببێ لەگەڵ « ئەلقەزاز » کۆببێتەوەو سەبارەت بە داخوازی مانگرتووەکان ووتووێژی لەگەڵ بکا[٣١١] . پاش ئەوەی وەزیری ناوبراو گفتیدا میری لەسەریان هەڵبداتێ ، کرێکاران ویستیان درێژە بە خۆ نیشاندانەکەیان بدەن ، بۆ ئەوەی مەسەلەکەیان بخەنە بەردەم لایەنە لێپرسراوەکانی تر . لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی سەرنجی رای گشتیی بەلای

بزووتنەوەکەیان‌دا رابکێشن[٣١٢] . ئنجا بە بیانووی ئەوەی سەرەك وەزیران لە شوێنی خۆی نەلوا ، بۆیان نەلوا چاویان پێی بکەوێ ، بڕیاریان‌دا بچنە « کۆشکی پاشایەتی »[٣١٣] جا هەرچەندە خۆ نیشان‌دانەکە هێمن بوو ، لەگەڵ ئەوەیش‌دا کە بەشداران بە ژیانی « مەلیك » و « سەرەك وەزیران » و « وەزیری ئابوری‌و هاتوچۆ » و تەنانەت بە ژیانی « بەڕێوەبەری گشتی‌ی ڕێگای ئاسن » یش هیتافیان دەکێشا ، کەچی پۆلیس ڕێگای کرێکارانی نەدا لەسەر خۆ نیشان‌دانەکەیان بەردەوام بن‌و «لەبەر زۆریی کرێکاران » لە ئەنجامەکەی دەترسان‌و نەوەك ببێتە هۆی « شێواندنی ڕای گشتی‌ی » لەبەر ئەوە داوایان لێ کردن بڵاوەی لێ بکەن‌و « بە پێی ئەو فەرمانە رەسمی‌یانەی دەرچووە .. هەر کەس بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی »[٣١٤].

بەلام پێش ئەوەی کرێکاران بڵاوەی لێ بکەن بڕیاریان‌دا ئێوارەی ڕۆژێ دوایی « ١ ی مارت » لە بارەگای « کۆمەڵەی سنعاتکاران » کۆ ببنەوە . سەرکردەکانی مانگرتنەکە ، نوێنەری کۆمەڵە کرێکاری وپیشەیی یەکان‌و ژمارەیەك لە پیاوە سیاسی‌یەکان‌و ڕۆژنامە نووسان‌یان بانگ کرد بەشداریی ئەو کۆبوونەوەیە بکەن . لە کاتی دیاری کراودا کرێکاران‌و میوانەکان روویان کردبووە بارەگای کۆمەڵەو بە ڕادەیەك قەرەباڵغ بوو بوو جمەی دەهات‌و[٣١٥] زۆرکەس ناچار بوون لەسەر باڵکۆن لەبەردەم بارەگاکەدا ، بە پێوە بوەستن[٣١٦] .

هەموو ئەو ووتارانەی لەو کۆبوونەوەیەدا خوێندرانەوە باسی ژیانی پڕ لە کوێرەوەری کرێکاری عیراق‌یان دەکردو بە تایبەتی رەخنەی توندوتیژیان لە هەڵس‌و کەوتی نامرۆڤانەی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن دەگرت دەرهەق بە کرێکارە عیراقی‌یەکان‌و داوایان لە میری دەکرد بە هەموو تواناوە پشتگیریی مانگرتووەکان بکاو چی وزەو توانای هەیە بیخاتە کارو لێپرسراونی ڕێگای ئاسن ناچار بکا بە پیر داخوازیی کرێکارەکانەوە بێن . لە کۆتایی‌دا بڕیاریان‌دا ڕۆژی هەینی کە ڕێکەوتی « ٦ ی مارت » ی‌ دەکرد ، لە مزگەوتی « حەیدەرخانە » کە یەکێك بوو لە بنکەکانی شۆڕشی بیست کۆببنەوەو لەوێوە بە خۆ نیشان‌دان بکەونە ڕێ‌و پاش ئەوەی چاویان بە گەورە لێپرسراوان دەکەوێ ، بگەڕێنەوە بۆ بارەگای کۆمەڵە . « ئەلقەزاز » بۆ ئەم مەبەستە بەڕەسمی‌ی داوای لە موتسەریفی بەغدا کرد ڕێگای بدەن[٣١٧] بەلام موتبسەریف داواکەی دایە دواوە .

یەکێك لەو بڕیارە گرنگانەی دەستەی بەڕێوەبەری «کۆمەڵەی سنعاتکاران» لە سەرەتای مانگرتنەکەدا دابووی، ئەوەبوو «لیژنەی دەستگیرۆیی کرێکارن» بە

سەروکایەتی «ئەلسەیید یووسف ئەلسەیید تـالیب» و ئەنـدامێتی ی «یووسف ئەلووەللی» و «جەمیل عیسا»و «محەممەد جەمیل» و «تەها عەبباس» و «داوود گەییارە» پێك بهێنرێ. ژمارەیەکی زۆر کرێکارو پێشەوەرو خەڵکی تریش پیتاکیان کردو پاشان ئەو پارەیەو پارەی سندووقی کۆمەڵە لەلایەن لیژنەی ناوبراوەوە، بەسەر کرێکارە مانگرتووەکاندا دابەش کرا. ئەوەبوو لە ماوەی تەنها دوو رۆژدا زیاد لەسەد کرێکار یارمەتی یان لە «لیژنەی دەستگیرۆیی کرێکاران» وەرگرت.[٣١٨]

بەو جۆرە مانگرتنی کرێکارانی رێگای ئاسن لەسـەر ئاستی رەسمی ی و میللی زۆر بە خێرایی بووە بابەتی یەکەم . ئنجا لە زۆر لای جیاجیاوە پشتگیریی لە مانگرتن و مانگرتووەکان کـرا . رۆژنامـەکان لەگـەڵ جیاوازیی رێبـازیشیاندا بایەخێکی زۆریان بە مەسەلەی مانگرتن و جموجۆڵی مانگرتووەکان دا . رۆژنامە نیشتمانپەروەرەکان وایان لەقەڵەمدا ئەوەی کرێکارانی رێگای ئاسن کردوویانە « بـزووتنـەوەیـەکی پیـرۆزە » هـەر وەك لە سـەرووتـاری رۆژنـامـەی « الاستقلال » دا باس کراوە[٣١٩] .

حکوومەتی عیراق لەم بارو دۆخـە ناسکـەداو لە ژێر زەبـری کۆمـەڵەو لایەنەکانی تری کـرێکاراندا کـە لە هەمـوو بۆنـەیەکدا ، داوایـان لێ دەکرد پارێزگاری یان بکا نەیدەتوانی هەڵوێستی تەماشاکەری هەبێ . لە رۆژی ٢٨ ی شوباتدا ، کاتێك کرێکاران خـۆ نیشاندانـەکەیـان ساز کـردو لە گۆرەپـانی « السرای » دا کۆبوونەوە ، وەزیری ئابوری و هاتوچۆ « نامەیەکی بە پەلەی بۆ بەرێوەبەری گشتی ی رێگای ئـاسن نووسی و تێیـدا داوای لێ کرد تـەماشـای داخوازیی کرێکـاران بکا »[٣٢٠] وەزیـر خۆیشی لەگـەڵ « ئەلقـەزاز » و چەنـد ئەندامێکی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » کۆبووەو لە بارەی مانگرتنەکەوە وتوویژیان کرد[٣٢١] رۆژی ٣ ی مارت وەزیر داوای لە « ئەلقەزاز » کرد لەگەڵیدا کۆببێتەوە . لەو کۆبوونەوەیەدا کە پارێزەرەکەی کۆمەڵە « داوود ئەلسەعدی » و ئەندامێکی فەخریی ئامادەی بوون ، وەزیر داوای کـرد کرێکـاران بگەرێنـەوە سەر ئیشی خۆیان و گفتی پێ دان بۆ چارەکردنی گیرو گرفتەکانیان یارمەتی یان بدا . بەڵام « ئەلقەزاز » دووبارەی کردەوە کە « کرێکاران تا بە تەواوی لە سەرچاوەیەکی رەسمی یەوە دڵنیا نەکرێن کە داخوازی یەکانیان جێ بەجێ دەکرێ ، ناچنەوە سەر ئیش » . ئەم پێ داگرتنە ی « ئەلقەزاز » وەزیری گەیاندە ئەو قەناعەتەی کە پێویستە بە زووترین کات مانگرتووەکان لەگەڵ بەرێوەبەری گشتی ی رێگای ئاسندا کۆببنەوەو خۆیشی لەگەڵیاندا بـەشداریی بکـاو پاش کـۆتایی هـاتنی

کوبوونەوەکە گفتیدا ئەم مەسەلەیە بگەیەنێتە ئەنجام[٣٢٢].

بەو جۆرە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن لە پاشەکشە زیاتر هیچی تری بۆ نەمایەوە . ڕۆژنامەیەکی ناوخۆ بە شێوەیەکی ئەوتۆ پاشەکشەی بەڕێوەبەرایەتی وەسپ کردووە ، توێژەرەوە پێویستی بە لێکدانەوەو بۆچوونی تایبەتی نامێنێ . ئەوەتا لەو سەر ووتارەیدا کە بە ناونیشانی « کرێکارە مانگرتووەکان پاش ئەوەی مەرجەکانی خۆیان سەپاند دەگەڕێنەوە سەر ئیش » بڵاوی کردووەتەوە ، دەڵێ :

« .. بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن کە بۆی دەرکەوت کرێکاران ئەم مانگرتنەیان بە ڕاستییەو فرتوفێڵو دووبەرەکی نانەوە کار لە گیانی نەبەزیویان ناکاو پاش ئەوەی زانی خەریکە شەمەندوفەریش لەکار دەخرێ[٣٢٣] ، ناچار بوو بە پیر داخوازییەکانیانەوە بچێ »[٣٢٤].

کەواتە کرێکاران لە ڕێگەی یەکێتیی و پێ داگرتنیانەوە ، توانییان لە سەرەتای بزووتنەوەکەیاندا یەکەم سەرکەوتنی لەو جۆرە بەدەست بهێنن . وەزیری ئابوریو هاتو چۆ لەرۆژی ٤ ی مارتدا ، واتە لە رۆژی شەشەمی مانگرتنەکەدا لە دیوانی وەزارەت « محەممەد ساڵح ئەلقەزاز » ی سەرۆکی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » ی لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتیی ڕێگای ئاسندا بە یەك گەیاند[٣٢٥] و دوای مشتو مڕێکی دوورو درێژ کە چەند سەعاتێکی خایاند هەردوولا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی لەسەر چوار خاڵی سەرەکیی ڕێك بکەون .

١ ـ دەبێ بەڕێوەبەرایەتی بە پەلە دەست بەرداری هەموو ئەو کرێکارە بیانییانە ببێ کە تەکنیکی نینو کاتی خۆی بەو ناوەوە دامەرزێنراون . هەروەها داوا لە سەرپاکی کرێکاران بکرێ شەهادەتنامەی جنسییە بخەنە روو ، تاوەکو بە شێوەیەکی راستو رەوان ژمارەی تەواوی کرێکارە بیانییەکان دەست نیشان بکرێ .

٢ ـ بەڕێوەبەرایەتی گفتیدا لەجێی ئەو کرێکارە بیانییانەی دەست بەرداریان دەبێ ، کرێکاری عیراقی دابمەزرێنێ .

٣ ـ دەبێ ناتەواوی بودجەی بەڕێوەبەرایەتی بە مووچەی کرێکارانو فەرمانبەران پڕ بکرێتەوە، بە مەرجێك ئەو پارەیەی لێیان دەبڕن بەرێژەیەکی ئەوتۆ بێ لەگەڵ مووچەکەیاندا بگونجێ.

٤ ـ لە رۆژی ای نیسانەوە، واتە لەسەری ساڵی داراییەوە، ئیش بەم رێککەوتنە دەکرێ.[٣٢٦]

پاش ئەم رووداوە سەرکردایەتی مانگرتنەکە دەنگی کرێکارانیدا، لە رۆژی ٥ی مارتەوە بچنەوە سەر ئیش. لەو رۆژەوە گیان کرایەوە بەبەر کارگەکانی «شالچی یە»داو کرێکارانیش لە قوتابخانەی خەبات و تێکۆشاندا دەرسێکی ئەوەندە گەورە فێربوون، چی دەستەو تاقمی نیشتمانیی ئەو کاتە هەبوو دانیان بە گرنگیدا نا. ئەوەتا رۆژنامەی «الاستقلال» کە قسە لە سەرکەوتنی کرێکاران دەکا، دەڵێ:

«ئەم هەنگاوە سەرکەوتووانەیە وای لە کرێکاران کرد،[٣٢٧] شانازیی بە خۆیانەوە بکەن و تێی گەیاندن کە تەنها بە یەکێتیی؛ مافەکانیان دەستگیر دەبێ و ئەگەر کرێکار پشت و پەنایەکی هەبێ، هەر برای کرێکاریەتی کە لە گەڵیدا ئازار دەچێژێ و لە رۆژی رەشدا شیوەنی بۆ دەکاو دڵی بۆی دەسووتێ. گومانیش لەوەدا نییە کە سەرکەوتنی ئەم بزووتنەوە پیرۆزەو شاد بوونیان بە هەندێ لە مافە رەواکانیان، پتر هانیان دەدا لەسەر ئەم رێبازە تەخت کراوە، رێبازی کرێکاران بەردەوام بن، تاوەکو مافە زەوت کراوەکانیان وەردەگرنەوە...».[٣٢٨]

سەرکەوتنی ئەو مانگرتنە هەندێ ئەنجامی ئەوتۆی لەو قۆناغەدا بە دەستەوەدا، راستەوخۆ شوێن دەستی بەسەر بزووتنەوەی کرێکارانەوە دیار بوو. جگە لەوەی کە کرێکاران زیاتر باوەڕیان بە خۆیان هێنا، ناوو شۆرەتی «کۆمەڵەی سنعاتکاران»یش لە ناو کرێکاران و پیشەوەراندا بە جۆرێك دەنگی دایەوە، تا ئەو کاتە نەبیسترا بوو. ئەم حەقیقەتەیش لەوەدا دەردەکەوێ کە دوو هەفتەی دوای مانگرتنەکەو «پاش ئەوەی کرێکاران لە دڵسۆزیی و هەوڵ و تەقەللای کۆمەڵە لە پێناو جێبەجێ کردنی مافەرەواکانیاندا دڵنیا بوون»[٣٢٩] دەستە دەستە «جوڵا»و «دارتاش»و «کرێکاری بینا» و هیتریش بە گەرمییەوە تێی وروکان و داوایان دەکرد بچنە ریزی کۆمەڵەوە. ماوەیەکی کەمیش دوای ئەوە کرێکارانی «دیوانی یە» و «حیللە» داوای لەو جۆرەیان پێشکەش بە دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵە کرد.[٣٣٠] هەر کە سەرکردەی کۆمەڵە جیاجیاکانی کرێکاران و پیشەوەران لەناو خۆیاندا و بە مەبەستی یەکخستنی رێکخراوەکانیان کەوتنە وتووێژو گفتوگۆ کردن، ئەم مەسەلەیە چووە بارێکی ترەوەو لە چوار چێوەیەکی نوێتردا خۆی بینییەوە. چونکە هەموو دەیانویست رێکخراوەکانیان بە هۆی لیژنەیەکی باڵا؛ یاخود لە ناو کۆمەڵێکی گشتییدا یەك بخەن.[٣٣٠]

لەگەڵ ئەوەیشدا، هێشتا ژمارەیەك لەوانەی سەرکردایەتی مانگرتنەکەیان دەکرد، گومانیان لە نیازو مەبەستی بەڕێوەبەرایەتی رێگای ئاسن

هەبوو، بەڵام هەڵوێستی گەرمو گوڕی وەزیر[٣٣٢] لەلایەكو مەترسی ی ئەوەی کرێکاران لەژێر زەبری نەبوونی ی و بێ دەرامەتی دا دەست لە مانگرتن هەڵبگرن لە لایەکی ترەوە، بە تایبەتی لەو ڕۆژانەدا «کۆمەڵەی سنعاتکاران» لە ڕووی دارایی یەوە کەم دەستو بێ توانا بوو، ناچار بوون مل بدەنو بەوە قایل بن دەست لە مانگرتن هەڵبگرن. کەچی هەر زوو ڕاستی ی بۆچوونی کرێکاران دەرکەوت. چونکە تاکە هەنگاوێك کە بەڕێوەبەرایەتی لە دوای مانگرتنەکە هاویشتی ئەوە بوو، شەهادەتنامەی جنسی یەی کردە مەرجو بەسەر ئەو کوڵ هەڵگرانەی دا سەپاند کە تاكو تەرابان نەبێ، سەرپاکیان عیراقی بوون.[٣٣٣] پێش «١» ی نیسانیش، واتە ڕۆژی جێ بەجێ کردنی بەندەکانی ئەو ڕێککەوتنەی کۆتایی بە مانگرتنەکە هێنا، بەڕێوەبەرایەتی وەك بیەوێ کرێکاران تاقی بکاتەوە، «١٢» کرێکاری عیراقی ی لە ئیش دەرکرد. ئەوەیش کە باشتر ئەم حەقیقەتە دەچەسپێنێ ئەوەیە، دەرکراوەکان سەر بە دوو بەشی جیای کارگەکانی ڕێگای ئاسن بوونو هاوڕێ کانیان ئامادە بوون دەست لە ٦٪ ی ڕۆژانەکانیان هەڵبگرن بە مەرجێك دەرکراوەکان بخرێنەوە سەر کار، کەچی بەڕێوەبەرایەتی بەتەواوی ئەم پێشنیازەی ڕەت کردەوە.[٣٣٤] بەڵام کە زانی «کرێکاران زۆر دڵگرانن»و هەڕەشەی مانگرتن دەکەنو سەر لەنوێ سەرکردەکانیان کەوتوونە خۆو پەیوەندی بە زۆر لایەنەوە دەکەنو یادداشتیان بۆ مەندووبی سامی و سەرۆکی ئەنجومەنی پیاو ماقووڵانو وەزیری ئابوریو هاتوچۆو جێگری وەزیری ناوخۆو گشت ڕۆژنامەکان ناردووە،[٣٣٥] جارێکی تر پاشەکشەی لێ کردو لەسەر ڕێو شوێنی هەمیشەیی خۆی، دەیویست بەفرو فێڵ تۆوی گومانو دوو دڵی ی لە دەروونی کرێکاران دا بچێنێ. ئەوەبوو لە ڕۆژی ٢ ی نیسان دا، فەرمانێکی دەرکرد کە لە سەرپاکی بەشەکانی کارگەدا ڕۆژی ٨ سەعات ئیش بکرێ. دوای دوو ڕۆژیش بە کرێکارانیان ڕاگەیاند کە دەبێ هەموو کەس شەهادەتنامەی جنسی یە بخاتە ڕوو؛ تاوەکو ـ بەقسەی بەڕێوەبەرایەتی ـ بە پێ ی بەندی یەکەمی ڕێککەوتنامەکە دەست بەرداری ئەو کرێکارە بیانی یانە ببێ کە پێویستی پێیان نی یە. بەو جۆرە «بەڕێوەبەرایەتی کرێکارانی هێمن کردەوە».[٣٣٦]

هێشتا مەرەکەبی ئەو دوو بڕیارە ووشك نەبووبووەوە، دوو دیاردەی دژبەو دوو بڕیارە لە ئاسۆوە دەرکەوتن. بەڕێوەبەرایەتی بە مەبەستی نزم کردنەوەی وورەی کرێکاران و خاو کردنەوەیان، زنجیرەیەك هەنگاوی تازەی نا، بێ ئەوەی لێپرسراوە عیراقی یەکان لە جێ ی خۆیان ببزوون، هەروەك «ئەلقەزاز» لە دوایی دا دووپاتی کردەوە.[٣٣٧]

وا پێ دەچێ هەردوو لایان پێشتر لە سەری ڕێککەوتبن. هەنگاوەکانی بەڕێوەبەرایەتی یەك لە دوای یەكو بە خێرایی جێ بەجێ دەکرانو شتی ئەوتۆیشی تێدابوو هەرگیز بە خەیاڵی کرێکاراندا نەدەهات. ئەوەبوو بە ئەنقەست ڕۆژانەو سەعاتی ئیش کردنی کرێکارە عیراقییەکانی کەم کردەوە، ئەوانەی لەو بەشانەدا بوون پێش مانگرتنەکە نەیدەگرتنەوە، وەك بەشی گواستنەوە. پاشان لە ڕۆژی ١٣و ١٤ی نیساندا فەرمانێکی دەرکرد تێیدا دەست بەرداری نزیکەی (٥٠) کرێکاری عیراقی بوو. پاش ماوەیەکی تریش چەند کرێکارێکی دی دەرکرد. ئەمە جگە لەوەی لێپرسراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی.لەسەر ڕێو شوێنی جارانیان کەوتنەوە زەبرو زەنگ نواندن.[238] جا وەنەبێ بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن هەر بەم کردەوانەوە ڕاوەستابێ، بەڵکو ئەو قەوالانەیشی پووچ کردەوە کە لەگەڵ هەندێ لە کرێکارە عیراقییەکاندا مۆری کردبوونو مەرجێك لە مەرجەکانی ئەوەبوو، مووچەی نەگۆڕیان بدرێتێ. بەو شێوەیە توانی بە ڕۆژانە ئیشیان بەسەردا بسەپێنێ، تاوەکو ڕۆژانی جەژنە ڕەسمییەکانو لەکاتی مۆڵەتی نەخۆشیدا بێ بەشیان بکا؛ بەسەرێکی تریش بۆ ئەوەی چەندی لە سەعاتی ئیش کردنیان کەم کردەوە ئەوەندەیش لە ڕۆژانەکەیان دابشکێنێ.

سەبارەت بەم هەڵوێستە کرێکارانو ڕای گشتی ی بە توندی بەر پەرچی ئەم هەنگاوەی بەڕێوەبەرایەتییان دایەوە. «کۆمەڵەی سنعاتکاران» دەستبەجێ بەیاننامەیەکی بۆ «لێپرسراوانو ڕای گشتی ی» بڵاو کردەوە تێیدا باسی بڕیاری دەرکردنی کرێکارانی کردبوو، بە سەرێکی تریش ئەوەی خستبووە ڕوو کە چۆن کاربەدەستانی ڕێگای ئاسن سوکایەتی بە مافی کرێکاران دەکەنو چی گفتو پەیمانێك لەوەوپێش دابوویان ولەسەری ڕێککەوتبوون پشت گوێیان خستووە. ئەوجا بەیاننامەکە هەڕەشە دەکا، گەر بێو دەرکراوەکان نەگێڕێتەوە بۆ سەر ئیشو کاریان، ناچارن سەر لەنوێ مان بگرنەوە.[239] هەروەها «ئەلقەزاز» داوا لە دامو دەزگا ڕەسمییەکانی عیراق دەکا بە گورجی تێ بکەونو سنوورێك بۆ هەڵسو کەوتی بە ئارەزووی بەڕێوەبەرایەتیو چەوساندنەوەی کرێکاران دابنێن.[240] پاش ئەوەی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» «بەدەست هاتوچۆی نێوان وەزارەتەکانی عیراقو ئەنجومەنی پیاوماقوولانو پەرلەمانو باوەڕ پێکراوی بەریتانیاو بەڕێوەبەری گشتی ی ڕێگای ئاسنەوە شەکەتو ماندو بوو»، لە ڕۆژی ٢٦ی نیساندا یادداشتێکی دوورو درێژی پێشکەش بە شەخسی مەلیك کردو ئەم حەقیقەتەیشی تێدا ڕوون کردەوە، پاشان وێنەی ئەو یادداشتەیان دا بە سەرۆکی ئەنجومەنی پیاو ماقوڵانو سەرەك وەزیرانو مەندوبی سامیو ژمارەیەك

لەوەزیرەکانی عیراق‌و بەڕێوەبەری گشتی‌ی ڕێگای ئاسن.[٣٤١] بەلام «پارێزەری وولات هەنگاوێکی ئەوتۆی نەنا بۆ دەستگیرویی کردنی ئەو کرێکارانەی «لە کەوانی خۆڕاگرتنیان‌دا تیریان پێ‌نەماو ناچار پەنایان وەبەر خاوەن شکۆ برد».[٣٤٢] ئەمە لە کاتێك‌دا ڕای گشتی‌ی بە تەواوی ئاگای لەو یادداشتە بوو کە پێشکەش کرا.[٣٤٣] دوای ئەوەی کە لە ٢٧ی حوزەیران‌دا جارێکی تریش «ئەلقەزان» سەرنجی خاوەن شکۆی بۆ ئەوە ڕاکێشا «کەتا چ ڕادەیەك کرێکاران بەدەست هەڵس‌و کەوتی نارەواوە دەناڵێنن» و پاش ئەوەی دووپاتی کردەوە کە «تەنها ئەو بە پشت‌و پەنای ستەم لێکراوان دەزانێ»،[٣٤٤] دەڵێین سەرەڕای هەموو ئەمانە، گۆڕانێك لە هەڵوێستی مەلیك‌دا بەدی نەکراو تەنانەت دیوانی پاشایەتی ئەرکی وەڵام دانەوەی یادداشتەکانی «ئەلقەزان»ی وەك نەرتییکی باو بە خۆی ڕەوا نەبینی. ئەوەندە نەبێ وەزیری ئابوری‌و هاتوچۆ وەلامێکی بۆ ناردەوەو تێیدا جارێکی تریش ئەوە دووبارە دەکاتەوە گوایە داوای لە بەڕێوەبەری گشتی‌ی ڕێگای ئاسن کردووە کێشەی کرێکاران «بە شێوەیەکی باش» چارەسەر بکەن.[٣٤٥]

سەبارەت بەوەی ڕای گشتی‌ی بە تەواوی ئاگاداری ئەم حەقیقەتە بێ «کۆمەڵەی سنعاتکاران» چەند کۆڕو کۆبوونەوەیەکی ڕێکخست‌و کرێکاران‌و نوێنەری کۆمەڵە جیا جیاکان‌و ڕۆژنامەو لاوانی شۆڕشگێڕو ژمارەیەك پیاوی ئایینی‌و هێزەکانی ئەپۆزیسیون بەشداری‌یان تێدا کردو «کەوتنە خۆو تووێژ کردن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر هات‌و بەڕێوەبەرایەتی؛ ئەو کرێکارانەی نەگێڕایەوە کە دوای ٤ی ئاداری ١٩٣١ دەری کردوون چ ڕێگایەك بگرن».[٣٤٦] بەلای سەرکردایەتی کرێکارانەوە، پرس‌و ڕاوێژکردن بە هەموو لایەنەکانی‌ترو لەو قۆناغە ناسکەی بزووتنەوەکەیان‌دا، کارێکی ئێجگار پێویست بوو. بە تایبەتی دوای ئەوەی کێشەکەیان زۆرتر پەرەی سەندو بوو بە «مەسەلەیەکی نەتەوایەتی» و نەك هەر بە «کرێکارانی ڕێگای ئاسن بەڵکو هەموو هاوولاتی‌یەکی بەشەرەفی عیراق»ی[٣٤٧] دەگرتەوە. یەکێك لەو خاڵانەی ئامادەبووان لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ١٩ی نیسان‌دا لە بارەگای کۆمەڵە بڕیاریان لەسەردا ئەوە بوو، گەر هات‌و بەڕێوەبەرایەتی سوور بوو لەسەر ئەو هەڵوێستانەی خۆی، داوا لە هاوولاتیان بکەن بە شەمەندوفەر هاتوچۆ نەکەن‌و[٣٤٨] لیژنەی تایبەتی بۆ پروپاگاندە پێك بهێنن‌و لە پێناو سەرخستنی ئەم هەوڵەدا فەتوای پیاوە ئایینی‌یەکانیش وەربگرن.[٣٤٩] کۆمەڵە ویستی سوود لەو دەرفەتەیش وەربگرێ کە

لەو رۆژانەدا بۆی رەخسابوو. ئەوە بوو هەر لەو رۆژانەدا ئەمینداریتی ی پایتەخت بڕیاریکی دەرکرد، بە پێ ی ئەو بڕیارە نەدەبوو پاسی هاتوچۆ پێ کردنی خەڵك لە شەقامی گشتی ی دا ئیش بکەن. ئنجا کۆمەڵە هەموو ئەوانەی بانگ کرد کە ئەو بڕیارە دەیگرتنەوەو داوای لێ کردن کۆمپانیایەکی ئەهلی ی بە هاوکاری لە تەك ئەودا پێك بهێنن، تاوەکو لە نێوان بەغداو مەزارە پیرۆزەکاندا خەڵکی بگوێزێتەوە؛ باوەڕیشی وابوو بەو کارەیان «ڕێگای ئاسن لە مانگرتن زیاتر زیانی لێ دەکەوێ»و هیوایشی وایە ئەو کۆمپانیایە ژمارەیەك کرێکاری بێ ئیش جێ بکاتەوە.[٣٥٠] زۆر لایەنی جۆر بەجۆر بە گەرمی یەوە بەرەو پیری ئەم پرۆژەیە چوون، لەوانە هەندێ لە پیاوە نیشتمان پەروەرەکان و پیاوانی ئایین، گفتیشیاندا ئەوەندەی لە تواناداد بێ یارمەتی ئەم پرۆژەیە بدەن. کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن، بەڕێوەبەری گشتی ی داوای لە وەزیری ناوخۆ کرد ئەو بڕیارەی کە پەیوەندی بە قەدەغە کردنی پاسی هاتوچۆ پێ کردنی خەڵکی یەوە هەیە، هەڵبوەشێنرێتەوە؛ وەزیر دەستبەجێ بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوەو بەیاننامەیەکی دەرکرد تێیدا جێ بەجێ کردنی بڕیارەکەی ئەمینداریتی پایتەختی تا کاتێکی نەزانراو راگرت.[٣٥١]

جموجۆڵی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» بە ڕادەیەك بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن و دامو دەزگاکانی سەر بە میری یان ورووژاند، کەوتنە بەرهەڵستی کردنی و تەنگیان پێ هەڵچنی. بە نموونە: لەو ڕۆژانەدا دایەرەی موتسەریفی بەغدا ماوەی کۆمەڵەی نەدا، رۆژی ١٠ ی ئایار لە هۆڵی سینترال سینەما کۆبوونەوەیەکی گشتی ی ساز بکا، بۆیە ناچار بوو لە بارەگای کۆمەڵەدا پێکی بهێنێ.[٣٥٢] هەر لەو کاتەدا «محەممەد سالح ئەلقەزاز»ی سەرۆکی کۆمەڵە، نامەیەکی بە ناوی «پێشمەرگەیەکی بیانی یەکان» پێ گەیشت تێیدا هەڕەشەی کوشتن لە خۆی و هاوڕێ یانی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵە دەکا.[٣٥٣]

ئەوەیشی کە لە هەموو شت زیاتر ڕژێمی تووڕە دەکرد ئەوە بوو، چالاکی یەکانی کۆمەڵە هەر بە تەنها هەڵوێستی ناڕەوای میریی لە بەردەم رای گشتی ی دا ئاشکرا نە دەکرد، بەڵکو بووە هۆی ئەوەی بزووتنەوەیەکی نارەزایی دەربڕینیش دژی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن بۆ پشتگیری کردنی کرێکاران و «کۆمەڵەی سنعاتکاران» بێتە کایەوە. بزووتنەوەی نارەزایی دەربڕین بێجگە لە چەندین کۆمەڵەو خەڵکی پیشەوەر، ژمارەیەکی زۆر «شوفێر»و «پایسکلچی»و «بەنا»و «دارتاش» و خەڵکی تریشی گرتەوە.[٣٥٤] لێرەدا گرنگ ئەوەیە دەست بۆ ئەوەیش رابکێشین کە ئەمجارەیان کرێکارانی عیراق وەك چینێکی سەربەخۆ، خۆیان

لەو ڕۆژانەدا بۆی ڕەخسابوو. ئەوە بوو هەر لەو ڕۆژانەدا ئەمینداریێتی ی پایتەخت بڕیارێکی دەرکرد، بە پێ ی ئەو بڕیارە نەدەبوو پاسی هاتوچۆ پێ کردنی خەڵك لە شەقامی گشتی ی دا ئیش بکەن. ئنجا کۆمەڵە هەموو ئەوانەی بانگ کرد کە ئەو بڕیارە دەیگرتنەوەو داوای لێ کردن کۆمپانیایەکی ئەهلی ی بە هاوکاری لە تەك ئەودا پێك بهێنن، تاوەکو لە نێوان بەغداو مەزارە پیرۆزەکاندا خەڵکی بگوێزێتەوە؛ باوەڕیشی وابوو بەو کارەیان «ڕێگای ئاسن لە مانگرتن زیاتر زیانی لێ دەکەوێ»و هیوایشی وایە ئەو کۆمپانیایە ژمارەیەك کرێکاری بێ ئیش جێ بکاتەوە.(٣٥٠) زۆر لایەنی جۆر بەجۆر بە گەرمی یەوە بەرەو پیری ئەم پرۆژەیە چوون، لەوانە هەندێ لە پیاوە نیشتمان پەروەرەکان و پیاوانی ئایین، گفتیشیان دا ئەوەندەی لە تواناداا بێ یارمەتی ئەم پرۆژەیە بدەن. کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن، بەڕێوەبەری گشتی ی داوای لە وەزیری ناوخۆکرد ئەو بڕیارەی کە پەیوەندی بە قەدەغە کردنی پاسی هاتوچۆ پێ کردنی خەڵکی یەوە هەیە، هەڵبوەشێنرێتەوە؛ وەزیر دەستبەجێ بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوەو بەیاننامەیەکی دەرکرد تێیدا جێ بەجێ کردنی بڕیارەکەی ئەمینداریێتی پایتەختی تا کاتێکی نەزانراو ڕاگرت.(٣٥١)

جموجوڵی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» بە ڕادەیەك بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن و دام و دەزگاکانی سەر بەمیری یان وروژاند، کەوتنە بەرهەڵستی کردنی و تەنگیان پێ هەڵچنی. بە نموونە: لەو ڕۆژانەدا دایەرەی موتسەڕیفی بەغدا ماوەی کۆمەڵەی نەدا، ڕۆژی ١٠ ی ئایار لە هۆڵی سینترال سینەما کۆبوونەوەیەکی گشتی ی ساز بکا، بۆیە ناچار بوو لە بارەگای کۆمەڵەدا پێکی بهێنێ.(٣٥٢) هەر لەو کاتەدا «محەممەد سالح ئەلقەزاز»ی سەرۆکی کۆمەڵە، نامەیەکی بە ناوی «پێشمەرگەیەکی بیانی یەکان» پێ گەیشت تێیدا هەڕەشەی کوشتن لە خۆی و هاوڕێ یانی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵە دەکا.(٣٥٣)

ئەوەیشی کە لە هەموو شت زیاتر ڕژێمی تووڕە دەکرد ئەوە بوو، چالاکی یەکانی کۆمەڵە هەر بە تەنها هەڵوێستی ناڕەوای میریی لە بەردەم ڕای گشتی ی دا ئاشکرا نە دەکرد، بەڵکو بووە هۆی ئەوەی بزووتنەوەیەکی ناڕەزایی دەربڕینیش دژی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن بۆ پشتگیری کردنی کرێکاران و «کۆمەڵەی سنعاتکاران» بێتە کایەوە. بزووتنەوەی ناڕەزایی دەربڕین بێجگە لە چەندین کۆمەڵەو خەڵکی پیشەوەر، ژمارەیەکی زۆر «شوفێر»و «پایسکلچی»و «بەنا»و «دارتاش» و خەڵکی تریشی گرتەوە.(٣٥٤) لێرەدا گرنگ ئەوەیە دەست بۆ ئەوەیش ڕابکێشین کە ئەمجارەیان کرێکارانی عیراق وەك چینێکی سەربەخۆ، خۆیان

نیشان داو هەڵس و کەوتیان کردو لە ناو ریزەکانی خۆیان داو لە هەموو لایەکەوە، دەنگی نارەزایی دەربڕین بڵند بووەوە. کرێکارانی نەوت لە «کەرکووك» بە گشتی ی «لە کردەوەی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن» نارازیی بوون و پاش ئەوەی «بەیاننامەو بڵاوکراوەی کۆمەڵەی سنعاتکاران یان خوێندەوە، بڕیاریان دا لە هەموو ئیش و کارێك دا پشتگیری یان بکەن و یارمەتی یان بدەن»و «بەو پەڕی بێ ئارامی یەوە» چاوەڕوانی سەرکەوتنی برا کرێکارەکانیان دەکرد. لە هەمان کاتیش دا سەریان لەوە سڕ مابوو کە چۆن دەبێ کەسێکی وەك «بەڕێز وەزیری ئەشغال هەڵوێستی تەماشاکەری هەبێ».[٣٥٥] بەڵام کرێکارانی نەوتی خانەقین یادداشتێکیان لە رۆژنامەکانی ناوخۆدا دژی «زوڵم و ستەم»ی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن بڵاو کردەوە، تێیدا ئەوەیان روون کردووەتەوە کە تا چ رادەیەك مافی رەوای کرێکاران پشت گوێ دەخاو گەر بێ و «یەکە یەکە ئەو مافە رەوایانە بۆ هاوولاتیان بنووسینەوە، لە ستوونی رۆژنامەکان دا جێگایان نابێتەوە».[٣٥٦] وەك لە دەقی یادداشتەکەدا نووسیویانە. ئەمە جگە لەوەی کە لە شارەکانی تریشەوە کرێکاران داوایان لە دام و دەزگا لێپرسراوەکان دەکرد «لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی کرێکارانی ڕێگای ئاسن دا بکەونە خۆو هەنگاو بنێن».[٣٥٧] شتێکی سرووشتیش بوو ئەم بارو دۆخە، کرێکاران و بە تایبەتی سەرکردایەتی یەکەیان هوشیار بکاتەوەو لە جاران زیاتر لە یاسای کرێکاران بدوێن و یەك لەسەر یەك داوا لە رژێم بکەن «یاسای مافی کرێکاران» دابنێ.[٣٥٨]

ئاسەواری ئەم تەوژمە بەتینە لاوانی شۆڕشگێڕیشی گرتەوە، بە تایبەتی لە بەغدا. سەدو سی کەس لەوانە بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە تێیدا دژی «کردەوە ناڕەواکانی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن»[٣٥٩] پشتیگیریی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» یان کرد. هەروەها دانیشتووانی گەڕەکی «فەرجوڵلا»و «بەنی سەعید» و «کولات» لە بەغدا، بە هۆی رۆژنامەکانی ناوخۆوە پشتگیریی لەو جۆرەیان کرد.[٣٦٠]

هەموو ئەمانە، بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن و لایەنە لێپرسراوەکانیان ئەوەندە نەجووڵاند، تاوەکو دەستبەرداری ئەو نەخشەو پلانانە ببێ کە بە ئاشکرا بۆ داپڵۆسین و سەرکوت کردنی تێکڕای بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق لە قۆناغی یەکەمیدا دایانابوون. هەروا بە رێککەوتیش نەبوو کە کۆمپانیا بیانی یەکانی تر شوێن پێ ی هەنگاوەکانی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن یان هەڵگرت، لە کاتێك دا کە نەك هیچ گیروگرفتێکی ئابووری یان نەبوو، بەڵکو سوودو قازانجێکی لە ژمارە

نەهاتوویش‌یان لە سامانەکانی وولات دەست دەکەوت. بە نموونە: کۆمپانیـای نەوتی خانەقین کارگەی چاککردنەوەی کەشتی ی لە «بەسرە» دەستیان کرد بە رێکخستنی کرێکاران‌و کەمکردنەوەی مووچەی هەندێکی‌تر. کۆمپانیـای نەوتی کـەرکووك ژمـارەیـەکی‌تـر کـرێکـاری بیـانی هێنـاو لە دام‌و دەزگـاکـانی‌دا، دایمەزراندن، بێ ئـەوەی گوێ بـداتە ئـەو هەمـوو داخوازی‌یـەی بەردەوام سەبارەت بە دامەزراندنی ئەو کـرێکارە بێ‌ئیشـانە پێشکـەشی دەکران کـە نا ئومێدی‌یان گەیشتبووە رادەیەك زیاد لە هەزار کەسیان داوا بکەن «پاسپۆرت‌و کرێ‌ی رێگایان بدەنێ، ئەو وولاتە بەجێ دەهێڵن کە تێیدا گۆش کران‌و پەروەردە بوون» وەك دەقاودەق لەو یادداشتەدا نـووسراوە کـە بە هـۆی رۆژنامـەکانی ناوخۆوە پێشکەش بە دەسەلاتدارانی رژێم کرا.[٣٦١]

هەموو ئەمانە، وایان لە کرێکاران کرد، دژی چەوسێنەرەکانیان ئامادەی شەڕێکی تازە ببن. هەر لەو کاتەدا بارو دۆخێکی نوێ هاتە گۆڕێ‌و وای کـرد، بزووتنەوەیەکی جەماهیری بتەقێتەوە کە بە مانگرتنی رەسمی شارەوانی‌یەکان ناسراوەو تێیدا کرێکاران‌و پیشەوەران رۆڵی بنچینەیی‌یان لە رووداوەکـانی‌دا گێڕا. ئەم مانگرتنە نوێ‌یەیش بووە ئامرازێکی گـرنگ‌و بـە هۆیـەوە توورەیی‌و ناڕەزایی خۆیان دەربڕی.

---

## کرێکاران و مانگرتنی رەسمی شارەوانی

---

لە کۆتایی سالی ١٩٣٠ دا، تەنگو چەڵەمەی ئابوری لە عیراقدا گەیشتە لوتکە. هێزی کڕین لای زۆربەی خەڵکی بە رادەیەکی لە ئەنـدازە بەدەر هـاتە خوارەوە. جووتیار بە هۆی نەفرۆشتنی بەرهەمەکـەی، کرێکـار بە هـۆی کەم کردنەوەی رۆژانەو دەردی بێ ئیشی‌یەوە، پیشەوەران بە هۆی ساغ نەبوونەوەی کەل‌و پەلەکانیان، فەرمانبەری بچووك بە هۆی بڕیاری دەرکردن و کەم کردنەوەی مووچەوە، فرۆشیارەکان بە حوکمی ئەوەی باری ئابوری‌یان بەندە بەو توێژانەوە کە باسمان کردن؛ دەڵێین سەرپاکی ئەوانە، بە دەست ئەم بارە ئابوری‌یە هەرەس هاتووەوە، بە رادەیەك دەیان نالانـد. بە ئـاشکرا جێ دەستی بـەسەر بـاری گوزەرانی توێژە ناونجی‌یەکانیشەوە دیار بوو، بە تایبەتی بازرگانەکان‌و خاوەن وەرشە وکارگەکان. بەنموونە: بە قسەی لێپرسـراوان خۆیـان، ئەو فـرۆشیارە

دەستگیرانەی راستەوخۆ پەیوەندی‌یان بە جەماوەری هەژارو نەدارای لادێو شارەوە هەبوو، رۆژی چوار، یان لە باشترین حاڵدا هەشت ئانە زیاتریان دەست نەدەکەوت.(٣٦٢) ئەمەیش پارەیەکی ئەوەندە کەمە، بەتەواوی دەری دەخا کە بارودۆخی بازار لە عیراقدا گەیشتبووە چ رادەیەك.

رژێمیش لای خۆیەوە، هیچ هەنگاوێکی بە کردەوەی نەنا، تاوەکو بە هۆیەوە کەمێك تەنگو چەڵەمەی ئابوری بکاتەوە. راستی‌یەکەی بە هۆی ئەوەی لە بەردەم کۆمپانیا بیانی‌یەکان و پاڵپشتەکەیاندا کە ئینگلیز بوو، نەیدەتوانی هەنگاوێکی لەو جۆرە بهاوێژی. بۆیە هیچی بۆ نەمابووەوە، ئەوە نەبێ قورسایی‌یەکە بخاتە ئەستۆی زەحمەتکێشان و بەو چەشنە چارەسەری بودجەی گشتی‌ی بکا. کە بە راستی‌ی تووشی گیروگرفت هاتبوو. ئەوەبوو لە ٢ی حوزەیرانی ١٩٣١دا یاسایەکی نوێی بۆ رەسمی شارەوانی‌یەکان داناو ناوەرۆکی ئەو یاسایە بووە هۆی راستەوخۆی تەقینەوەی جەماوەرو نارەزایی دەربرین.

ئەم یاسا نوێیە، ماددەی وای تێدا بوو، چی زەحمەتکێشانی عیراق هەیە دەیخستنە ژێر باری گرانی باجێکی نوێی ئەوتۆوە، لە زۆر رووەوە سەیرو سەمەرە بوو. یاسای ناوبراو رەسمی وای دانابوو پێشتر نەبیسترابوو، وەك ئەوەی خرابووە سەر سەگو(٢١٣) گوێدرێژو مردووناشتن و یوقلەمە کردنی ئۆتۆمبیل و پردو کەڵەك و هەموو جۆرە هۆیەکی گواستنەوەو ئەو شلانەی قابیلی داگیرساندن و سووتاندنن و ئیجازەی بینا دروست کردن و ئیعلان و مۆڵەتی پیشە بە هەموو جۆرەکانی‌یەوەو وێنەگرتن و چاپکردن و ئەچزاخانەکان وشانۆو شوێنی رابواردن و ئوتێل و چێشتخانەو پاسەوانی و کرێی شوستەو سەنگو ترازوو، زۆری تریش.(٣٦٤) هەندێك لەم رەسمانە زۆر زۆر بوون. بە نموونە: رەسمی مردوو ناشتن. سەرەتا وا بریار درا ئەگەر کەس و کاری مردوو، مردووەکەی لە سنووری شارەوانی‌دا ناشت ٦٠٠ روپیە رەسم بدەن، ئەمە لە کاتێکدا «لە سەرانسەری عیراقدا چەند کەسێکی لێ دەرچێ کەس توانای ئەو پارەیەی نەبوو» وەك نوێنەرێك لە کاتی مشت و مر لەسەر کردنی لایەحەکەدا دانی پیا دەنێ.(٣٦٥) کۆڵکێش کە زۆر بە زەحمەت دەستکەوتی مانگێکی دەگەیشتە ١٥ روپیە، بە پێی یاسای رەسمی شارەوانی‌یەکان، دەبوو مانگی سێ روپیە بدا.(٣٦٦) ئەمە جگە لەوەی کە سنوورێکی دیاری کراوی لە نێوان پیشەوەرو خاوەن پەرژەوەندی‌یەکاندا نەکێشا بوو. سەرتاش کە تا ئێستایش لە هەندێ ناوچەدا بە گەنم و جۆ سەر دەتاشن، دەبوو وەك ئەچزاچی و خاوەن کارگەی سەهۆڵ و سۆدە دروستکردن وخشت وکاشی مانگی ٥ روپیەبدا. تەنانەت بۆیاخچی وزێراب

پاککەرەوەو فرۆشیارە دەستگێڕەکان دەبوو لەو دەستکەوتە کەمەی پەیدایان دەکرد، مانگی سێ روپیە رەسم بدەن.(٣٦٧)

لەگەڵ هەموو ئەو حەقیقەتانەی کە لە زاری نوێنەرانەوەو لە کاتی لێکۆڵینەوەی یاسای رەسمی شارەزانی یەکاندا، لە ناو پەرلەماندا دەرهاتن، و سەرەڕای ئەو مشتو مڕەی لەسەر بەندەکانی ئەو یاسایە کراو دان پیانانی زۆربەی نوێنەران کە تەنگو چەڵەمەی ئابوری «خەریکە دەست دەنێتە بینەقاقای هەموو چینەکانی کۆمەڵو ڕێگای ژیانی لێ بەستوون»، داوایان کرد ئیش پێ کردنی یاساکە ماوەیەك دوا بخرێ، یان هەندێ لەو رەسمانەی تێیدا دانراون کەم بکرێنەوە.(٣٦٨) دەڵێن سەرەرای هەموو ئەوانە لایەحەی یاساکە دوای پێنجەمین خوێندنەوەی بە بێ ئارەق دەرچوو. لە کۆبوونەوەی پەنجاو دووهەمی رۆژی ٤ ی نیسانی ساڵی ١٩٣١دا لەو ٥٥ ئەندامەی ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون ٥٣ کەس دەنگیان بۆ دا.(٣٦٩)

رژێمی سیاسی هەوڵێکی زۆریدا تاوەکو زەینی جەماوەر بەو یاسایە پڕبکا. بە نموونە: چاودێریی بیروّی چاپەمەنی لە ٤ی تەممووزدا راگەیاندنێکی لەگەڵ دوو خشتەی دوورو درێژدا بڵاو کردەوەو دەیویست بە هۆی ئەوانەوە بیسەلمێنێ کە «ئەو باجەی یاسای نوێی رەسمی شارەوانی یەکان دایناوە، نیسبەتی لەوە کەمترە کە پێشتر بانگەوازەکەی ـ بلفوّر ـ ی(٣٧٠) حاکمی سیاسی سوپایی بەغدا دایناب‌وو..»(٣٧١) ئەو رۆژنامانەیش‌کە ئەڵقە لە گوێی رژێم بوون پروپاگاندەیەکی زۆریان بۆ ئەو یاسایە کرد، تەنانەت حاڵ گەیشتە ئەوەی لە «رەسمی سەگ رەواتریان» نەدەبینی‌یەوەو دەیانگوت ئەم جۆرە رەسمە تەنها خەڵکی بیانی دەگرێتەوە».(٣٧٢)

لە گەڵ ئەوەیش‌دا هەرکە ئیرادەی پاشایەتی سەبارەت بە بڵاوکردنەوە وئیش پێ کردنی یاساکە دەرچوو لە هەموو لایەکەوە دەنگی نارەزایی بەرز بووەوە. بە تایبەتی لە ناو کرێکارانو ئەو پیشەوەرە بچکۆلانەدا کە لێپرسراوان خۆیان دەیانزانی ئەم یاسا تازەیە چ کارێکی خراپ دەکاتە سەر ئاستی گوزەرانیان.(٣٧٣)

سەرەنجام کۆمەڵەی کرێکارانو پیشەوەران جڵەوی مەسەلەکەیان گرتە دەستو جەماوەریان رووەو بزووتنەوەیەکی ئەوتۆ برد، لە مێژووی هاوچەرخی عیراقدا بێ هاوتایە. لە رۆژی ٢٧ ی حوزەیراندا سەرۆکی ٢٣ کۆمەڵەو پیشەی

جیاجیا لە بارەگای «کۆمەڵەی سنعاتکاران» کۆبوونەوەو لەناو خۆیاندا وەفدێکیان هەڵبژاردو چاویان بە ئەمینداری پایتەخت کەوتو داوایان لێ کرد یاسای ناوبراو هەڵبووەشێننەوە، یاخود ئەو رەسمانەی بە سەر خەڵکیدا سەپێنراوە کەم بکرێنەوە. لە هەمان رۆژیشدا سەرکردەکان ئەرزوحاڵێکیان دا بە وەزیری ناوخۆو داوایان کرد ئەو یاسا نوێیە گەر بێو بچەسپێنرێ «بەتەواوی لەناومان دەبا»، وەك لە دەقی ئەرزوحاڵەکەدا نووسیویانە.[٣٧٤]

«کۆمەڵەی کرێکاران و پیشەوەران» لە سەرو هەموویشیانەوە «کۆمەڵەی سنعاتکاران بەردەوام بوون لەسەر پروپاگاندەی خۆیان و دەیانویست جەماوەر ئامادە بکەن بۆ شتێك «نارەزایی کۆمەلانی خەڵك بە پیشەوەرو سنعاتکارانەوە لە ئەنجامی سەپاندنی یاسای رەسمی شارەوانییەکاندا، نیشان بدا».[٣٧٥]

کاتێکیش کە زانرا هەموو ئەو هەوڵ و تەقەللاو ئەرزوحاڵ پێشکەش کردنەی کۆمەڵەکان ئەنجامێکی هەست پێکراوی بە دەستەوە نەدا، سەرکردەکانیان بیریان لە مانگرتنی گشتیی کردەوە لە ٣٠ حوزەیراندا. هەر ئەوەندەی وەزیری ناوخۆی ئەوسا «موزاحیم ئەلپاچەچی» هەواڵەکەی پێ گەیشت، ئیتر کەوتە پەیوەندی کردن لەگەڵ سەرکردەی کۆمەڵەکان و دواجار قایلی کردن بەوەی دەستبەرداری مەسەلەی مانگرتن ببن، چونکە نیاز وایە بە پێی ئەو دەسەلاتەی پێی دراوە، ئەو رەسمانەی یاساکە دەست نیشانی کردوون کەمیان بکاتەوە. ئەوە بوو لە رۆژی دیاری کراودا لە شاری «حیللە»و «دیالە» نەبێ، لە هیچ شوێنێکی تر مانگرتن رووی نەدا.[٣٧٦] هەر زوویش دەستەکەی وەزیری ناوخۆ کەوتە روو کە دەیویست کاتیان پێ بەسەر بەرێو بەداپلۆسین و تۆقاندن یان بە دەستخەرۆ کردن و هەڵخەڵەتاندن دووبەرەکیی بخاتە نێوان سەرکردەی کۆمەڵەکانەوە.[٣٧٧] ئەنجام دەرکەوت کە توانیویەتی بە شێوەی جۆر بەجۆر کار بکاتە سەر چەند سەرکردەیەکیان.[٣٧٨]

ئەم هەڵوێستەی وەزیری ناوخۆ وای لە سەرکردەکانی کۆمەڵەی کرێکاران وپیشەوەران کرد، جارێکیتر بیر لە مانگرتن بکەنەوە؛ بە تایبەتی کە زانییان کۆمەلانی خەڵك بە گەرمیی پشتگیریی چالاکییەکانیان دەکەن. لە هەمان کاتدا «ئەلقەزاز» هەوڵی دا، وا لە سەرکردەکانی ئەپوزیسیۆن بکا پشتگیریی بکەن، لەوانە «جەعفەر ئەبو لتمەن»و «یاسین ئەلهاشمی»و «رەشید عالی ئەلگەیلانی» و «وایان لێ بکا بەلای مانگرتندا رایان بکێشێ.[٣٧٩] هەر بە راستیش ئەوانە هانی مانگرتنەکەیانداو ژمارەیەکی باش لە دۆست و لایەنگیرەکانیان کەوتنە پروپاگاندە کردن بۆ سازدانی مانگرتنەکە، بە تایبەتی لە شارەکانی

تردا.[٢٨٠]

پاش ئەوەی گوێچکەی جەماوەر بە مانگرتنی گشتی ی ئاو درا، ڕۆژی ەی تەمووز دانرا بە یەکەم ڕۆژی مانگرتن. کۆمەڵانی خەڵکیش بە گەرمی ی بە پیر مانگرتنەکەوە چوون و بەڕادەیەکیش سەرکەوتنی وەدەست هێنا، تەنانەت ئەوانەی سازیان کردبوو بە تەمای ئەو ئەنجامە نەبوون.[٢٨١] چی دوکان و چاپخانەو ئەجزاخانەی پایتەخت هەیە لەگەڵ دوکانی پیشەوەراندا، لەو ڕۆژەداو بێ سێ و دوو کردن داخران. ئەمە وای لە میری کرد لە یەك کاتدا هەم ڕێگای دەسخەڕۆ کردن و هەم ڕێگای تۆقاندن بگرێتە بەر. لە ڕۆژی یەکەمی مانگرتنەکەدا چاودێری بیرۆی چاپەمەنی بەیاننامەیەکی بەناو خەڵکیدا بڵاوکردەوە تێیدا بە سەرێك گفت و پەیمان تازە دەکاتەوە و هەوڵی قایل کردنی دڵی جەماوەر دەداو بەسەرێکی تریش هەڕەشەو گوڕەشە دەکا. بەیاننامەکە لە لایەکەوە وای دەردەخا گوایە، ناوەرۆکی ئەم یاسا نوێیە «شتێکی چەسپاو نییەو ئەشێ دەستکاری بکرێ و کەم بکرێتەوەو لێی چز بکرێ» ومیرییش بڕیاری داوە «کەس بە زۆر نەخاتەوە سەر ئیش و کاری خۆی و دوکانی پێ نەکاتەوە»و «نایەوێ دەست بخاتە کاروباری کەسەوەو دوکانیان پێ دابخا، یان پێیان بکاتەوە» لە لایەکی تریشەوە بەیاننامەکە ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە میری سوورە لەسەر ئەوەی «هەر کەسێك سەربەستی خەڵکی ی زەوت بکا یاسای بەسەردا بچەسپێنێ و سزای بدا» ئینجا هەڕەشەی ئەوە دەکا، گەر بێ و «ئەمڕۆ شوفێرەکان نەچنەوە سەر ئیش و کاری خۆیان» ئیجازەی لێخوڕینیان لێ دەسێنرێتەوەو «یاسای تەندروستی ی بەسەر ئەو ئەجزاچی یانەیشدا دەچەسپێنرێ کە ئەجزاخانەکانیان داخستووە».[٢٨٢] لە هەمان کاتدا پۆلیس بەشەقامە گشتی یەکاندا بڵاو بووەوە دەستیان کرد بە بڵاوە پێ کردنی کۆڕو کۆمەڵ و «لێدانی ئەو کەسانەی نەیان دەهێشت خەڵکی دوکان بکەنەوە » وەك ڕۆژنامەکانی سەر بە میری باسی دەکەن[٢٨٣] ئەم ڕۆژنامانەیش لای خۆیانەوە کەوتنە هان دانی خەڵکی بۆ ئەوەی بچنەوە سەر کارو فرمانی خۆیان[٢٨٤] پاشان چەند سەرکردەیەکی کۆمەڵە پیشەیی و کرێکاری یەکان و لە پێش هەموویانەوە « محەممەد ساڵح ئەلقەزاز » و « محەممەد مەکی ئەلئەشتەری و « عەبدوڵلا ئەلبەدری » کە تازە بوو بووە سەرۆکی « کۆمەڵەی کرێکارانی چاپخانەکان » و « محەممەد یاس ئەلبەیاتی » و چەند کەسێکی تریش ، لەلایەن پۆلیسەوە گیران و تۆمەتی هاندانی خەڵکی یان خرایە پاڵ[٢٨٥] .

بەیاننامەی ناوبراوو هەموو هەنگاوەکانی تری میری ، نەیانتوانی ئەوەندەی تۆزێك ورەی خەڵکی ی بهێننە خوارەوە . دانیشتووان قایل نەبوون بچنەوە سەر کاروباری خۆیان ؛ کرێکاران و پیشەوەران بەردەوام لە کۆڵان و جادەکان دا کۆڕو کۆمەڵیان دەبەست . گرووپە جیاجیاکانی ئەپۆزیسیون ، بە تایبەتی باڵە نیشتمانی یەکەی ، پشتگیریی مانگرتووەکانیان دەکردو هانیان دەدان لەسەر ئەم کارەیان بەردەوام بن کە تێکرای دانیشتووان پێ ی گەشکەدار بوون . لە بەردەم ئەم واقیعەدا میری بۆ شکاندنی مانگرتنەکە پەنای بردە بەر رێگایەکی تر . فەرمانی بە دام و دەزگاکانی شارەوانی دا چی لە توانادا هەیە بیکەن و بەزوویی چەردەیەکی زۆر گۆشت و سەوزەو میوەو شتی پێویست بە نرخێکی هەرزان بخەنە بازارەوە . بەڵام دانیشتووان بە پیری یەوە نەچوون و شارەوانی یەکان ناچار بوون هەموو ئەو شتانە فڕێ بدەنە روباری دیجلەوە[٣٨٦]. ئا ئەم یەکێتی ی و یەك دەنگی یە بێ هاوتایە ، ئەوەندەی تر دەروونی هاوولاتیانی لە شارەکانی تردا وروژاندو دانیشتووان بە گەرمی ی پشتگیریی مانگرتنە گشتی یەکەی پایتەخت یان کرد . هەندێ لەو شارانەیش ئیعلانی مانگرتن یان کرد ، وەك لە « حیللە » و « دیوانی یە » و « مونتەفیك » و « بەسرە » رووی دا .

سوور بوون لەسەر ئەو هەڵوێستەی پەرەسەندنی رووداوەکان بەو خێرایی یە میری ناچار کرد پاشەکشە لە هەڵوێستی خۆی بکا . وەزیری ناوخۆو جێگری سەرۆك وەزیران « موزاحیم ئەلپاچەچی » وەفێکی لە « قاسم پاشا ئەلخضەیری » ی سەرۆکی ژووری بازرگانی و[٣٨٧] بەرێوەبەری گشتی ی پۆلیس و ژمارەیەکی تر خەڵکی خاوەن پلەوپایە ، پێکهێناو ناردنی بۆ بەندیخانەی مەرکەزی ، تا وتوێژ لەگەڵ سەرۆکی کۆمەڵەکان دا بکەن . بەڵام بە هۆی پێ داگرتنی « ئەلقەزاز » و هاوەڵەکانی لەسەر لابردنی یاسای رەسمی شارەوانی یەکان نەگەیشتنە ئەنجامێکی ئەوتۆ .[٣٨٨] پاشان « ئەلپاچەچی » بانگی کردنە دیوانی وەزارەت و بە ئامادە بوونی ئەمینداری پایتەخت و موتسەریفی لیواو سەرۆکی ژووری بازرگانی و هەندێ خەڵکی تر ، لە گەڵیان دا کۆبووەوەو پەیمانی دا گەربێ و کۆتایی بە مانگرتنەکەیان بهێنن ، دەست بەجێ فەرمان بە « دام و دەزگاکانی شارەوانی دەدا کە .. بڕیاری لابردنی هەندێ لەو رەسمانەو کەمکردنەوەی هەندێکی تریان بدا ، بە شێوەیەك لەگەڵ خواست و ئارەزووی هاوولاتیان و گیروگرفتی ئابوری ئێستادا بگونجێ[٣٨٩] » .

ئەم گفتەی وەزیری ناوخۆ ئەگەرچی ناکۆکی خستە ناو سەرکردەکانەوە بەڵام وەك ئەوە وابوو ئاسنی سارد بکوتێ . هەبوو باوەڕی بە گفتو پەیمانی « ئەلپاچەچی » نەبوو ، لەبەر ئەوە داوایان دەکرد لە سەر مانگرتن بەردەوام بن . هەیش بوو ، قسەکانی ئەو کاری تێ کردبوون و رایان وابوو کۆتایی بە مانگرتنەکە بهێنن. جا لەترسی ئەوەی ناکۆکی ناوخۆیان لەوە زیاتر پەرە نەستێنێ « ئەلقەزاز » پێشنیازی کرد ، دوو بەیاننامە بڵاو بکرێتەوە ، یەکێکیان بەناوی میریەوە بێ و تێیدا پەیمان بدا ئەو رەسمانەی تازە دانراون لەسەر دانیشتووان لا دەبرێ ، یاخود کەم دەکرێنەوە . دووەمیشیان ، بە ناوی سەرۆکی کۆمەڵەکانەوە بێ و تێیدا بەخەڵکی رابگەیەنن بەشێوەیەکی کاتی ی بچنەوە سەر کارو فرمانی خۆیان. ئەوەبوو ، لە پاش نیوەڕۆی ٧ ی تەممووزدا ، بەیاننامەیەك بە ناوی ١٨ سەرۆك کۆمەڵەوە ، بڵاو کرایەوە تێیدا داوا « لە گەلی عیراقی ئازادیخوازو مانگرتووەکان دەکان بچنەوە سەر ئیش و کاری خۆیان » و رایان گەیاند کەوا لیژنەیەکیش بە سەرۆکایەتی « ئەلقەزاز » و ئەندامێتی ی « سەرۆکی کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان » « محەممەد مەکی ئەلئەشتەری » و سکرتێری کۆمەڵەی میوە فرۆشان « حەسوون ئەبولجبن » پێکهاتووە ، بۆ « وتووێژ کردن لەگەڵ میری و جێ بەجێ کردنی ئەو گفت و پەیمانانەی داوێتی » بە مەرجێك ئەو لیژنەیە ئەنجامی کاروبارەکانی راستەوخۆ بە خەڵکی رابگەیەنێ پاشان سەرۆکی کۆمەڵەکان بەیاننامەکەیان بەم شێوەیە کۆتایی پێ دەهێنن و دەڵێن : « گەربێ و میری گفتی خۆی نەباتە سەرو خوا نەخواستە - ویست و ئارەزووی خاوەن پەرژەوەندییەکانی جێ بەجێ نەکرد پیشەوەرو سنعاتکاران ، بۆیان هەیە دەست بە مانگرتن بکەنەوەو چ رێگایەك بە رەواو لەبار دەزانن لە پێناوی ئاواتەکانی نەتەوەدا بیگرنە بەر »[٣٩٠]

بەڵام لێرەدا جەماوەر رای خۆی سەپاندو پێش هەڵوێستی سەرکردایەتی کەوت . ژمارەیەکی زۆر کەم « قەساب » و « دوکاندار » و « چایچی » نەبێ ، کەس بە دەنگ ئەو بانگەوازەوە نەچوو . ئەوانەی لایەنگیری مانگرتن بوون بە هەندێ ئەندامی نیقابی و خەڵکی سەر بە ئەپۆزیسیونیشەوە کەوتنە هاندانی جەماوەر ، تاوەکو لەسەر مانگرتن بەردەوام بن ، ئەمەیش وای لەوانی تر کرد لە هەڵوێستی خۆیان پاشگەز ببنەوەو رۆژی دوایی سەر لەنوێ دوکانەکانیان داخست[٣٩١] ئەم هەڵوێستە ئەوەندەی تر ئەو سەرکردانەی هان دا کە لایەنگیری مانگرتن بوون ، لە پێش هەموویانەوە « ئەلقەزاز » ، تاوەکو لە بڕیارەکەی پێشوویان پاشگەز ببنەوە ، بە تایبەتی کە دەرکەوت وەزیری ناوخۆ هیچ

هەنگاوێکی ئەوتۆی نەهاویشتووەو نیازی چاکەی لێ چاوەڕوان ناکرێو جێگەی دڵنیایی نییە .

بەو جۆرە مانگرتنەکە تا دەهات توندو مەودای فراوانتر دەبوو، بە رادەیەك پەلی بۆ شارەکانی تریش هاویشتو لە هەندێکیاندا بووە جێگای مەترسی، بەتایبەتی کە پۆلیس دەستی خستە کاروباری مانگرتنەکەوەو چەند کەسێك لە مانگرتووەکان کوژران، وەك لە «ناسرییە» رووی‌دا.[392] لە «بەسرە»یش مانگرتن سەرانسەی شاری گرتەوە ولە شوێنی خۆیدا بە درێژی باسی دەکەین.

بەو پێیە لە ماوەی چەند رۆژێکی کەمدا مانگرتن بە جۆرێك پەرەی سەند، بووە بزووتنەوەیەکی نیشتمانییو داوای رووخاندنی وەزارەتو دانانی سنوورێکی دەکرد بۆ زوڵمو ستەم؛[393] دیارە ئەمەیش وای لە رژێم کرد بە توندیی رێگای داپڵۆسینو سەر کوت کردن بگرێو نەهێڵێ ئەم بارو دۆخە بگاتە رادەیەك توانای چارەسەر کردنی پێ نەمێنێ. ئەوە بوو مەرسوومێکی پاشایەتی دەرچوو. بە پێی ئەو مەرسوومە ماددەی ٨٤ی یاسای سزا بەغدایی‌یەکانی بە شێوەیەك گۆڕی، کاربەدەستە ئیداری‌یەکانی شارو قەزاو ناحی‌یەکان، بۆیان هەبوو بلاوە بە هەموو کۆڕ کۆبوونەوەیەك بکەن کە لە پێنج کەسو زیاتر لەوانەی گومان لە هەڵسو کەوتیان دەکرێ پێکی بهێنن.[394] ئنجا ژمارەیەکی تر سەرکردەو لایەنگیری بزووتنەوەکەیان گرت. هێزەکانی میری لە شەقامەکانی پایتەختدا، دابەزین و لە شوێنە گرنگەکاندا رەشاشیان دابەست. چەند هێزێکی پۆلیسو سوپایش خرانە حاڵەتی «إنذار»ەوەو بۆ کاتی پێویست ئامادە کران.

ئەم هەنگاوانەی دوایی رژێم، ئەوەندەیتر هاووڵاتیانی تووڕە کرد. پەیتا پەیتاو لە زۆر شوێنەوە برووسکەی نارەزایی کرایە سەر میری. حزبە ئەپۆزیسیۆنەکان یادداشتیان دا بە جێگری مەلیكو[395] تێیدا ئەو کردارە ناڕەوایانەی پۆلیس «کە هێندە دڵ رەقانە بوون، لە سنووری ئەرکی وەزیفە چووبوونە دەرەوە» باس کرا. وەك لە دەقی ئەو یادداشتەدا نووسراوە کە هەردوو حزبی «الوطنی العراقي» و «الاخاء الوطني» پێشکەشیان کرد.[396]

رووداوەکان بە خێرایی پەرەیان سەندو تا دەهات باری ووڵات بە شێوەیەکی ترسناك بەرەو خراپیی دەچوو، بە رادەیەك وا چاوەڕوان دەکرا جڵەوی کار لەدەست لێپرسراوان دەربچێو مانگرتنەکە ببێتە «شۆڕشێکی مەزن لە عیراقدا». لەبەر ئەوە جێگری مەلیك ناچار بوو برووسکەیەك بنێری بۆ

«فەیسەلی یەکەم» و داوای لێ بکا «بە زوویی بگەڕێتەوە بۆ بەغدا» وگەر ئەمەیش نەکرا، «دەبێ سەرۆك وەزیران دەستبەجێ بگەڕێتەوە».[٣٩٧] ئەوەبوو، لە ڕۆژی ١٥ی تەمووزدا «نوری سەعید» گەڕایەوەو لەسەر ڕەوشتی هەمیشەیی خۆی لەم چەشنە زرووفانەدا، بە گورجی ی چەند هەنگاوێکی نا. هەندێکیان بە نیازی دەستخەڕۆ کردن و هەندێکی تریشیان بۆ سەلماندنی دەست و دەسەلاتی ڕژێم. هەر ئەو شەوەی گەیشتە بەغدا کۆبوونەوەیەکی بە پەلەی لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیران کرد، چوار سەعاتی خایاند. پاشان سەرۆکی کۆمەڵەکانی لەبەندیخانەوە هێناو لە گەڵیان دا کەوتە وتوویژ کردن سەبارەت بە کۆتایی هێنان بە مانگرتنەکەو گفتیدا سەر لە نوێ چاو بە «یاسای ڕەسمی شارەوانی یەکان»دا بگێڕێتەوە هەر لەوێدا فەرمانی بەرەڵلا کردنی خۆیان و هاوڕێکانیانی دەر کرد.[٣٩٨] دوای ئەوە بەیاننامەیەکی دیماگۆگی یانەی بۆ ڕۆڵەکانی گەل دەرکردو رای گەیاند کە میری «تەنها لەبەر ئەوە یاسای ڕەسمی شارەوانی یەکانی داناوە، تاوەکو هەندێ ڕەسم لەسەر چەند پیشەوەرو سنعاتکارێك لابچێ». لە ناو بەیاننامەکـەدا دەست بۆ ئەوەیش رادەکێشێ کە «میری بە هەموو هێزو توانایەکی یەوە» و «زۆر بە توندیی» لەگەڵ ئەو «تاقمە خەڵکەدا»[٣٩٩] دەجووڵێتەوە کە هانی دانیشتووان دەدەن مان بگرن. لەسەر فەرمانی «نووری سەعید»یش ئەنجومەنی ئەمینداریێتی پایتەخت دەمو دەست بڕیارێکی دەرکردو بە پێ ی ئەو بڕیارە ڕەسمی لەسەر ١٩ جـۆر پیشەوەرو سنعاتکاری گرنگ لابرد، وەك «قەساب» و میوەفرۆش» و «نانەوا» و چەند پیشەوەرێکی تر لەوانەی لە بواری خزمەتگوزارییدا هەڵئەسووڕێن.[٤٠٠] هەمووی چەند ڕۆژێکیشی نەبرد بڕیارێکی تری لەو بابەتە دەرچوو، تێیدا ڕەسم لەسەر ١٧ جۆر پیشەیتر لابراو بە شێکی زۆری ئەو ڕەسمانەی کەم کردەوە کە «یـاسای ڕەسمی شـارەوا نی یەکـان» دایناب‌ـوون.[٤٠١] هەروەهـا دەستبەجێ وەزارەت چەند هەنگاوێکی رووکەشی نا، وەك بیەوێ لە خەڵکی ی بگەیەنێ گوایە بـایەخ بـە کـارو بـاری کـرێکـاران دەدا. بـۆیـە دەسـەلاتی سکـرتـاریـەتی شارەوانەیەکانی فراوانتر کردو خۆی وا نیشاندا کە «چاودێریی هەڵو مەرجی ئیش کردن دەکاو لە گوزەرانی کرێکاران دەکۆڵێتەوەو هەوڵ دەدا هـۆیەکـانی خۆش گوزەرانی یان بۆ دابین بکاو دەیەوێ ئاگای لەوە بێ ئاخۆ تا چ رادەیەك ئەو یاسایانەی پەیوەندی یان بە ڕێکخستنی کرێکارانەوە هەیە جێ بەجێ دەکرێن..». ئەو ڕۆژنامانەی بە زمانی وەزارەتەوە قسەیان دەکرد، موژدەیان بە خەڵکی ی دا، گوایە میری «دەیەوێ یاسایەك بە ناوی یاسای مافی کـرێکارانـەوە دەر بکا» و

دەیانگوت مەبەستیش لەم یاسایە ئەوەیە: «ژیان و خۆشگوزەرانی ی بۆ ئەم چینە ئیشکەرە دابین بکا کە رۆژ لە زیاد بوون دایە».[402] دیارە ئەو هەنگاوانە لەوە بەولاوە هۆیەك بوون بۆ ئیفلج کردنی هەست و هۆشی ئەو چینەی بووبووە هێزی بزوێنەری مانگرتنەکە، هیچی تر نەبوون.

لە هەمان کات دا رووەکەی تری سیاسەتی «نووری سەعید» کە دەیویست دەستبەجێ مانگرتنەکە سەرکوت بکا، دەرکەوت. رۆژی دوای گەرانـەوەی بۆ بەغدا، مەرسوومێکی پاشایی دەرکرد بریتی بوو لە شەش ماددەی ئەوتۆ تەنانەت کاربەدەستان خۆیشیان دانیان پیا دەنا کە لەگەل دەستووری وولات دا ناگونجێ. ناوەرۆکی مەرسوومەکە ئەوەی دەگەیاند بە لێدانی سەرکردایەتیو ئـەوانەی هانەهانەی خەلکی یان داوە، کۆتایی بە مانگرتنەکە دێ.[403] بەلام پێش ئەوەی سەرۆك وەزیران پیلانەکەی جێ بەجێ بکا، بارو زرووفی بەسرە بە خێرایی و بە شێوەیەکی ترسناك تەقی یەوە. لە ١٥ ی تەمووزدا ئەو شارە بانگی مانگرتن یان هەل داو مانگرتووەکان نزیکەی دوو رۆژ دەستیان بەسەر کارو باردا گرت.[404] لەو ماوەیەدا چەند جارێك خۆ نیشان دانی جەماهیری لە دژی رژێم و بەریتانیا ساز کرا. ئینگلیز هێزەکانی خۆی ئامادە کرد تا بەناوی پارێزگاری کردنی هاولاتی یە ئینگلیزەکانەوە بێتە ناو شارەوە . لە دووەم رۆژی مانگرتنەکەدا خۆ نیشان دەران گوللەباران کران و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو بریندار کرا. بـە پێچەوانـەی هەرچی داب و نەریتەوە هەیە دەست کرا بە جێ بەجێ کردنی «یاسای داوای عەشایەری» دژی ئەو مانگرتووانەی شارنشین بوون،[405] پاشان هێزێکی سوپاو پۆلیس بە فرۆکەو شـەمەنـدوەمەر گـوێزرایـەوە بۆ «بـەسرە».[406] رۆژی ٢٠ ی تـەمووز سـەرۆك وەزیران بـە فرۆکـە گەیشتـە «بـەسـرە» تـاوەکـو خـۆی سـەرپەرشتی ی کـۆتایی پێ هێـنـانی مانگـرتنەکـە بکا.[407] جـا بە هـۆی ئەو زەبروزەنگەوە کە هێزەکـانی پۆلیس نـوانـدیـان و لە دوای گرتنی ژمـارەیەك لە چالاکترین پیاوانی بزووتنەوەی نیشتمانی ی، «نووری سەعید» بە ئاواتی خۆی گەیشت.

بەو جۆرە «نووری سەعید» توانی ئەو مانگرتنە گشتی یەی دژی «رەسمی شارەوانی یەکان» ساز کراو لە مێژووی سیاسی عیراق دا جێگایەکی بە ناوبانگی داگیر کردووە،[408] سـەرکوت بکـا. جا ئیتـر بایـەخی ئـەم روو داوە، هـۆیـە پالپێوەرەکانی بووبێ، یان بە هۆی ئەنجام و سرووشتی سەرکردایەتی یەکەوە بێ. ئەوەیش لەو لاوە بووەستێ کە خۆی لە خۆی دا گۆرانێکی چۆنیەتی بوو لە

شێوەی خەباتی جەماوەرداو بۆ یەکەم جار چەکی ئابوری کرایە هۆی جێ یەجێ کردنی داخوازیی گشتیی بۆ سەرجەم کۆمەلانی خەلك. بەلای هەندێ سەرچاوەوە، زەرەروزیانی ئەو مانگرتنە رۆژی لە نیوملیۆن روپیە کەمتر نەبووە.[409] شایانی باسە رۆژنامە بیانی یەکانی ئەو رۆژگارە باسی خاسی یەتەکانی ئەم مانگرتنە دەکەن و لایان وایە رووداوێکی «سەیرەو تا ئێستا شتی وا رووی نەداوە» لە عیراقدا.[410] بە پێی ئەو چەند بەلگەیەی لەبەر دەستدان وا پێ دەچێ سەرکردایەتی مانگرتنەکە بە تەنها بریتی نەبووبێ لە سەرۆکی کۆمەلە پیشەیی و کرێکاری یەکان و هەندێ لەسەر کردەکانی ئۆپۆزیسیۆن، بەلکو رەگەزی نوێ و شۆرشگێر تریش تێکەلی بوون، دیارەئەمەیش هەنگاوێکی ترە لە سەر رێگای خەباتی زەحمەتکێشانی عیراق. لێرەدا گرنگیش ئەوەیە دەست بۆ ئەو قسانە رابکێشین کە «نووری سەعید» لەبەردەم پەرلەمان دا کردی. ئەوەتا دەلێ: «هەندێ کۆمەلەی نهێنی» ئەو مانگرتنەیان رێك خستبوو.[411] ئەوەیشی کە ئەم قسەیە دەسەلمێنێ، هەلوێستی مانگرتووەکانە بەرامبەر بەو بانگەوازەی سەرکردەکانیان لە رۆژی ٧ی تەممووزدا دەریان کردو تێیدا داوایان لێ کردن بچنەوە سەر کارو فرمانی خۆیان.[412] ئەو کاتەیش کە بانگی مانگرتنەکە هەلدرا، چەند جارێك بە هیما رۆلی گرنگی «تیوریستانی کۆمەلەکان» نیشان دراوە کە چۆن دەوریان لە سازکردنی مانگرتنەکەدا گێرا.[413]

هەموو ئەمانە وایان لە کۆنەپەرستانی عیراق کرد زیندە بەچال کردنی بزووتنەوەی کرێکاران بە ئەرکی سەرەکی ی ئەو کاتە دابنێن. هەر ئەمەیش هۆی مەنتیقی ی ئەو هێرشە فراوانەیە کە لە رۆژانی مانگرتنی کرێکارانی رێگای ئاسن و مانگرتنە گشتی یەکەی دژی «یاسای رەسمی شارەوانی یەکان»، کرایە سەر کرێکاران و رێکخراوەکانیان، بە تایبەتی ئەو هێرشەی میری لە پاش کۆتایی هاتنی مانگرتنەکە بەرپای کرد. هەروەك لە کاتی خۆیدا باسمان کرد، رژێم بە چەندین شێوە هەولی دا دەست لە «کۆمەلەی سنعاتکاران» بووەشێنێ. چونکە لە کۆمەلەکانی دی زیاتر بە تەنگ مەسەلەکانی چینی کرێکارانەوە بوو. سەبارەت بە بەرگری لێ کردنیشیان، ئەم کۆمەلەیە لە هەمووان چالاکانەتر ئیشی بۆ دەکرد. لە گەرمەی رۆژانی مانگرتنی گشتی یدا، هێرشی میری لە دژی کۆمەلەی ناوبراو، لە هەموو کاتێك توندو تیژ تر بوو. کاتێکیش چەند لایەنێکی سەر بە رژێم توانی یان ویژدانی هەندێ ئەندامی کۆمەلە بکرن، لە روزی ٢١ی ئابی سالی ١٩٣١ دا و لەکاتی هەلبژاردنی دەستەی بەرێوەبەدا، ئەوانە ئاژاوەیەکیان نایەوەو

«ئەلقەزاز» و هاوەڵە کانیان بەوە تاوانبار کرد، گوایە ساختە لە هەڵبژاردنەکەدا دەکەن.

ئەمەیشیان کردە بیانووی ئەوەی ئەرزوحاڵ بدەن بەوەزارەتی ناوخـۆو داوای لێ بکەن کۆمەڵ دابخا، «چونکە بە پێچەوانەی یاساوەو بە شێوەیەك ئیش دەکا دژی پەرژەوەندی گشتی یە». وەزارەتی ناوبراویش ئەم ئەرزوحاڵەی کردە بەڵگەو دای بەسەر بارەگای کۆمەڵ داو دایخست.[414] رۆژنامەی «الاخاء الوطني» دەربارەی داخستنی کۆمەڵەو راوەدونانی سەرۆکەکەی دەڵێ:

«.. میری بە بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی یاسایی بەدەستەوە بێ، کۆمەڵەی سنعاتکارانی داخست. کاتێکیش داوای لێ کرا هۆی لە کار خستنی کـۆمەڵەی ناوبراو بە خەڵکی ی رابگەیەنێ، هیچ شتێکی بە دەستەوە نەبوو بیکاتە بەهانە بۆ ئـەم بڕیـارەی. تا ئێستـایش راوە دووی باوەڕپێکـراوی کۆمـەڵەو هەنـدێ لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەرەکەی دەنێ و بە تۆمەتی جۆر بەجۆر تاوانباریان دەکاو رایان دەکێشێتە بەردەم دادگا، کەچی ئەوەندەی پێ ناچێ دادگا لەبەر بێ تـاوانی ی بەرەڵلایـان دەکا. بـە ڕاستی ی ئەم دەست وەشـاندنـەی میری لە کۆمەڵەیەکی ئەدەبی ی کارا، ئەوەندە کاریگەر بوو، کـرێکاران و پیشـەوەران و سنعاتکارانی بە تەواوی پەرەوازە کرد...»[415]

بەرامبەر بەم هەڵوێستەیش، ئەو رۆژنامانـەی سەر بـە میری بـوون، لە پیش هەموویانەوە رۆژنامەی «العراق» و «صدی العهد» کەوتنە بوختان کردن و تۆمەت هەڵبەستن دژی «کۆمەڵەی سنعاتکاران»، لەهەمان کاتیش دا «محەممەد سالح ئەلقەزاز» ی سەرۆکی کۆمەڵە کەلەو کاتەدا لەگەڵ دەستەیەك لە هاوڕێیـانی گیرابوون، کەوتبووە بەر هێرشی تانەو تۆمەتی ناڕەوای ئەم رۆژنامانەو[416] بەوە تاوانبار دەکرا گوایە دەستی خستووەتە هەڵبژاردنەکەی دەستەی بەڕێوەبەری « کۆمەڵەی سنعاتکاران » ەوە.[417]

هەر لەو ماوەیەدا « کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیکی عیراق » پەردەی لەسەر روو ی راستـەقینەی خـۆی هەڵـماڵی و بە گـەرمی ی پشتگیریی هـەنگاوەکـانی وەزارەتی ناوخۆی کـرد، بە تـایبەتی ئـەوەی کە پـەیوەنـدی بە « کـۆمەڵەی سنعاتکاران » ەوە هەبوو. ئەمیان کۆمەڵی ناوبراوی بەوە تاوانبار دەکرد گوایە توخنی سیاسەت کەوتووەو « بۆ مەبەستێك کە لەگەڵ ئامانجەکانی دا ناگونجێ » جووڵاوەتەوە. سوپاسی میریش دەکا کـە ئەو کـۆمەڵەی « لەکـارخستووە »[418] سەرۆکە تازەکەی « کۆمەڵەی میوە فرۆشان » یش هەمان ڕێگای ئەوی گرت و لە زۆر بۆنەدا هێرشی کردەسەر « کۆمەڵەی سنعاتکاران » و سەرکردەکانی. شێوەی داڕشتنی ئەو باس و ووتارانەیش لە رووی زمانەوانی یەوە هێندە توندو تۆڵ بوون،

ئەوەیان دەگەیاند کەچەند دەستێك هەن بە دزی‌یەوە هەڵی دەسوورێنن.[٤١٩]

هەر لەو کاتەدا یەك لە دوای یەك حوکمی ئەوانەیش درا کەبە شداری‌یان لە مانگرتنەکەدا کردبوو، بە تایبەتی ئەوەی « بەسرە ». زۆر جاریش دامودەزگای پۆلیس ئەو حوکمانەی « إستئناف » دەکرد کە دەرهەق بە نیشتمانپەروەران دەر کرابوون‌و داوای دەکرد حوکمی گرانترو قورستریان بەسەردا بسەپێنرێ.[٤٢٠]

لە هەموی ترسناکتر ئەوەبوو، رژێم هەوڵی‌دا چینی کرێکار بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە؛ بەوەی سەرکردایەتی‌یەکی نوێی لەو کەسانە بۆ دروست کرد کە بە شێوەی جۆر بە جۆر کڕیبوونی. دیارترینی ئەو کەسانەیش « عەبدولڕەزاق ئەلسامەڕائی» بوو کە کاتی خۆی ئەندامێکی چالاکی « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بوو.[٤٢١] «ئەلسامەڕائی» کۆمەڵێکی نوێی بە ناوی «کۆمەڵەی کرێکارانی عیراق» ەوە دامەزراند، تاوەکو بە قسەی خۆی جێگای « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بگرێتەوەو « حکوومەتی خاوەن شکۆ » یش دەستبەجێ بڕیاری‌دا ماوەی ئەو کۆمەڵە نوێیە بدرێ، چونکە « خاوەن شکۆ وا دروست بووە کرێکارانی خۆش بوێ‌و بەزەیی پێیان‌دا بێتەوە » وەك « ئەلسامەڕائی » وەسپی دەکا.[٤٢٢] دواییش دەرکەوت فەرمانبەرێکی وەزارەتی ناوخۆ پەیڕەوی ناوخۆی « کۆمەڵەی کرێکارانی عیراق » ی نووسیوە.[٤٢٣]

نۆبەرەی کاری « کۆمەڵەی کرێکارانی عیراق » ئەوە بوو، لە رۆژی ٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣١ دا، یادداشتێکیان پێشکەش بە «خاوەن شکۆ، باوکی کرێکاران» کرد و تێیدا بە گەرمی‌یەوە پشتگیری داخستنی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» دەکەن.[٤٢٤] لە کۆتایی یادداشتەکە دا، «ئەلسامەڕائي» کە خۆی بە «نۆکەری ئەڵقە لە گوێی خاوەن شکۆ »[٤٢٥] دەزانێ، رووی دەم دەکاتە مەلیك فەیسەڵی یەکەم‌و دەڵێ:

«.. لەبەر ئەوەی هەر نەمامێك بەڕێزتان بەشداریی لە ناشتنی‌دا نەکەن نایەتە بەر، لە بەڕێزتان دەپاڕێینەوە لێمان قبووڵ بکەن ببنە سەرۆکی دەستەی سەرپەرشتی‌ی کردن[٤٢٦]، بە مەیش بەرگی شەرەف بە بالای ئەم کۆمەڵە دەبڕن‌و بۆ ئەوەی ـ ئەی باوکی هەموان ـ ئەو رێگایەمان بۆ رۆشن بکەنەوە کە لەسەری دەڕۆین‌و بە هۆیەوە کرێکاران دەگەیەنینە ریزی کرێکارانی نەتەوە پێشکەوتووەکان‌و بۆ ئەوەی دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ بکەن‌و ئێمەیش دەستگیرۆیی کرێکارە نەدارەکان بکەین. خودا، وەك باوکێکی دڵسۆزو رزگاریکەری نیشتمان ئێوەمان بۆ بهێڵێ.. ».[٤٢٧] شایانی باسە « ئەلسامەڕائی » بە

هەمان شێوەیش ڕووی دەمی دەکردە « نووری سەعید » وگەورە لێپرسروان.[٤٢٨]

هەر لەم کاتەدا کۆمپانیا بیانی یەکان دەستیان کردەوە بە زوڵم و ستەم کردن لە کرێکارە عیراقی یەکان. تەنها لە ماوەی دوو مانگدا « ئەیلوول و تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣١ » کۆمپانیای نەوتی عیراق نزیکەی سەد کەسی عیراقی بەبیانووی ئەوەی شتێك پارەپاشەکەوت ئەکا، لەکار دەکرد. کەچی بە قەدەر ژمارەی دەکراوەکان خەڵکی بیانی ی دامەزراند.[٤٢٩] تەنانەت دوای ئەو مێژووەیش، دەرکردنی بە ئارەزووی کۆمپانیای ناوبراو هەر بەردەوام بوو.[٤٣٠] لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا بەڕێوە بەرایەتی ڕێگای ئاسن دەستبەرداری ٥٦ کرێکاری عیراقی ی بوو. ئنجا فەرمانێکی دەرکردو بە پێ ی ئەو فەرمانە هەموو کارگەو بەشێکی سەر بەو بەڕێوەرایەتی یە، مانگی ئیش کردن بە نیسبەت کرێکارە عیراقی یەکانەوە کرا بە ١٨ ڕۆژ و بە هەمان ڕێژەیش ڕۆژانەکانیان هێنرایە خوارەوە.[٤٣١]

سێ مانگی تری پێ نەچوو، بەڕێوەبەرایەتی ناوبراو دەستی لە نزیکەی ٢٠٠ کرێکاری تری عیراقی هەڵگرت و مانگی ئیش کردنی بانیسبەت ئەوانەی کە لەسەر ئیش ماون کرد بە ١٥ ڕۆژ.[٤٣٢] پێش ئەوەیش کە کرێکارانی ڕێگای ئاسن بەو هەنگاوە ناڕەوایە ئاشنا بن، بەڕێوەبەرایەتی ١٢٠ کرێکاری تری عیراقی ی دەر کردو ڕۆژانەی ئەوانەیش کە لەسەر ئیش بەردەوام بوون بە نیسبەتی ٥ر١٢٪ هێنایە خوارەوە.[٤٣٣] دوو هەفتەی پێ نەچووو، بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن لیستەیەکی تری دەرکرد تێیدا ٤٠ دارتاش و ژمارەیەکی زۆر فیتەرو تۆرنەچی عیراقی ی دەرکردو سیستەمێکی نوێیشی هێنایە گۆڕێ و بە پێ ی ئەوە، بۆی هەبوو چ کاتێك ویستی ئیش بە کرێکاران بکا، بێ ئەوەی زێدە کرێیان بداتێ.[٤٣٤]

وەنەبێ بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن هەر بەم کارە ناڕەوایانەوە، ڕاوەستابێ، بەڵکو لەگەڵ کرێکارە عیراقی یەکاندا، بەجۆرێکی ئەوەندە ناشایستە دەجووڵایەوە هیچ نەریت و یاسایەك نەیدەگرتەوە. بەنموونە کرێکارێك لە کاتی ئیشدا لە سەر ستوونێك بەر بوو بووەوەو ماوەی سێ مانگی ڕەبەق لە ناو جێگەدا کەوت، کەچی پاش ئەو ماوەیە کە گەڕایەوە سەر ئیشەکەی بینی دەر کراوە.[٤٣٥]

وا پێ دەچێ هەڵس و کەوتی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن وەك پەتایەك تووشی کۆمپانیاو کارگە ئەهلی یەکانی تریش بووبێ؛ بە تایبەتی چونکە هەڵوێستی ناڕەوای کۆمپانیا بیانی یەکان و زۆر بوونی بێکاریی وایان لە کرێکاران کرد

لەسایەی ناخۆشترین هەل‌و مەرجی ئیش کردن‌و بە کەمترین رۆژانە ئامادەی ئیش کردن بن. بۆیە شتێکی سەیر نی‌یە هەندێ دامەزراوەی ئەهلی رۆژی یازدە تا چواردە سەعات ئیشیان بە کرێکارەکانیان دەکرد.[٤٣٦] «چاپخانەی حکوومەت» یش لای خۆیەوە، بەبیانووی کەم کردنەوەی ژمارەی کرێکارەکانی یەوە، دەستبەرداری چەند کرێکارێك بوو. کەچی «لەبەر زۆریی ئیش»[٤٣٧] زێدەکاری بە کرێکارەکانی تر دەکرد.

لەگەڵ هەموو ئەمانە، رۆژگارو تاقیکردنەوەی قورس‌و گران ئەوەندەی تر چینی کرێکارانی عیراق‌یان پتەوتر کرد و مەیدانی خەباتی چۆڵ نەکرد وەك دوژمنەکانی دەیان ویست‌و ئاواتیان پێ دەخواست. سەرەڕای ئەوەی کە میری بەردەوام بوو لەسەر گرتن‌و تۆقاندنی خەڵکی‌و یەك لەدوای یەك دەستی لەجەماوەر دەوەشاند، بەلام پایتەخت‌و شارو ناوچەکانی تر، بوونە شانۆی خەباتی هوشیارانەی کرێکاران. سەرکردەکانی هەر دوو کۆمەڵەی لەکارخراوی «سنعاتکاران» و «هاریکاری سەرتاشان» و لەسەروو هەموویشیانەوە «ئەلقەزان» و «ئەلئەشتەری» بەردەوام چالاکی‌یان دەنواند؛ چەند جارێك پرۆتستۆیان دژی هەڵوێستی میری بەرامبەر بەو دوو کۆمەڵە پێشکەش کردو داوایان دەکرد سەرلە نوێ ماوەی ئیش‌کردنیان بدرێتەوە. لەو ماوەیەدا بە تەنها «ئەلقەزان» پێنج یادداشت زیاتری پێشکەش بە داموو دەزگا لێپرسراوەکان کرد و تێیان‌دا چاو نەترسانە رۆشنایی خستە سەر ئەو بارو زرووفە نالەبارەی وولات تێیدا دەژی‌و کرێکاران بە دەستی‌یەوە دەنالێنن.[٤٣٨] ئەم هەڵوێستە دڵسۆزانەیە وای لە کرێکاران‌و پیشەوەرە بچکۆلەکان کرد چ لە بەغداو چ لەدەرەوەی بەغدا، لە «ئەلقەزان» کۆببنەوەو لە هەموو بۆنەیەك‌دا بە گەرمی‌ی پشتگیریی هەڵوێستەکانی بکەن‌و نارەزایی خۆیان سەبارەت بە داخستنی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» دەرببڕن‌و داوا بکەن ماوەی بدرێ سەر لەنوێ بکەویتەوە ئیش کردن.[٤٣٩] راستی یەکەیشی ئەو کرێکارانەی داوایان لە رژێم‌کرد سەر لەنوی کۆمەڵەی ناوبراو بکرێتەوە، سەدان کەس زیاتر بوون.[٤٤٠] زۆر کرێکارو پیشەوەریش بەرەنگاری ئەو درۆو دەلەسانە بوونەوە کە رۆژنامەکانی سەر بە میری‌ر هەندێ خەڵکی بەکرێ گیراو دژی «ئەلقەزان» و کۆمەڵەکەی بلاویان دەکردەوە. چونکە ئەم هێرشە نارەوایە لەوە بەولاوە کە ئامانجی «لەناوبردنی کرێکاران‌و وتێك شکاندنی راپەڕینەکەیان بوو» هیچ شتێکی‌تر نەبوو، وەك لە دەقاو دەقی ئەو یادداشتەدا نووسراوە کە دەستەیەك کرێکار لەم بارەیەوە پێشکەشیان کردووە.[٤٤١]

لە لایەکی تریشەوە هەندێ کۆمەڵە، بە تایبەتی هەر دوو کۆمەڵەی «کرێکارانی چاپخانەکانی عیراق» و «هاریکاری سەرتاشان» دوای ئەوەی ماوەیان

درا سەر لەنوێ بکەونەوە ئیشکردن، بەردەوام بوون لەسەر چالاکیی کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریی خۆیانو بەکوڵو دڵ بەرگرییان لە بەرژەوەندیی کرێکارانو پیشەوەرە بچکۆلەکان دەکرد.[٤٤٢]

خەباتی کرێکارانو پیشەوەرە بچکۆلەکان لەو رۆژگارەدا کە زەبرو زەنگی میری گەیشتبووە ئەو پەڕیو سەرەنجام مانگرتنە گشتییەکەی لێ رسکا، ئەو سنوورەی تێپەڕاند و چووە دۆخێکی ترەوەو لەسایەیدا راستەوخۆ کاری زۆر ئیجابیی راپەڕێنرا وکەوتنە نارەزایی دەربڕین سەبارەت بە ژیانی ناهەمواریان. ماوەیەکی زۆر کەم دوای کۆتایی هێنان بە مانگرتنە گشتییەکەی دژی رەسمی شارەوانییەکان لە بەغداو شارەکانی تردا، سازکرا و پاش ئەوەی میری دەستی لە کرێکارە مانگرتووەکانی بەسرە وەشاند؛ کرێکارانو پیشەوەرانی «هەولێر» لە کۆتایی مانگی ئابی ساڵی ١٩٣١ دا، مانگرتنێکی لەوچەشنەیان سازکرد وچەند رۆژێکی خایاند و دروشمی دژ بە یاسای رەسمی شارەوانییەکانیان تێدا بەرز کردەوەو داوا کرا نرخی کارەبا کەم بکرێتەوەو پەیوەندییان لەگەڵ هەموو ئەوانەیشدا پساند کە هەوڵی زیادکردنی نرخەکەیان دابوو. ئەمە جگە لەوەی هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر ئەو فەرمانبەرانە ئاشکرا کرد کە «پلەوپایەی خۆیان بۆ ئەوە دەخەنە گەڕ یاری بە نانی میللەت بکەن». ئنجا دوو ئەرزوحالیان سەبارەت بە داخوازییەکانیان پێشکەش بە لایەنە لێپرسراوەکان کرد، یەکەمیان پێنج سەد کەسو ئەوی تریان نزیکەی ٦٠٠ کەس پەنجەمۆریان کرد بوو.[٤٤٣]

وەنەبێ ئامانجی ئەو نارەزایی دەربڕینەیش بە تەنها لابردنی یاسای رەسمی شارەوانییەکان بووبێ نەخێر. ئەوەتا لە کۆتایی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٣٢ دا کرێکارانی رێگای ئاسن سەبارەت بەوەی ٥ر١٢٪ ی رۆژانەیان کەم کرایەوە نارەزاییان دەربڕی، چونکە وایان لێهاتبوو «نەیان دەتوانی بژین»[٤٤٤]. بێئیشەکانیش بەردەوام کۆدەبوونەوەو « لەناو خۆیاندا وتووێژیان لەسەر ئەو رێگایانە دەکرد کەبە هۆیەوە داخوازییەکانیان دێتە دی.»[٤٤٥] پێ بە پێی ئەمانەیش هەرلەو ماوەیەدا چەند مانگرتنێك روویان دا. لەرۆژی ٢١ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ دا شۆفیری ئۆتۆمبیلە گەورەکان مانیان گرت.[٤٤٦] دوای ئەوانە، شۆفیری تراکتۆرەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراق لەسەر رێگای نێوان «بێجی» و «حەدیسە» مانیان گرت، چونکە «کۆمپانیای ناوبراو زوڵمی لێ دەکردنو شەوورۆژ دەیچەوساندنەوە» هەندێکیشیان بە یەکجاریی وازیان لە ئیش هێناو «بێکارییان لەوە پێ چاکتر بوو کە کۆمپانیای نەوت بە سەریاندا سەپاندبووی».[٤٤٧]

بۆیە شتێکی سروشتی بوو کە ئەم هەڵوێستانە ببنە هۆی تێك شکانی ئەو پیلانانەی میری بە مەبەستی سەرکوت کردنی بزووتنەوەی کرێکاران دابووی.

ئەم تێ شکاندنەیش ئاشکراتر لە چارە نووسی ئەو ڕێکخراوانەدا ڕەنگی دایەوە کە داموو دەزگا لێپرسراوەکان و یستیان بە شێوەی جۆر بەجۆر بەسەر کرێکاراندا بیان سەپێنن. کاتێکیش دەرکەوت هەندێ کەسی ناو دەستەی بەڕێوەبەری «کۆمەڵەی کرێکارانی عیراق» خەڵکی گومان لێکراونو رابوردوویەکی خراپیان هەیەو پێشتر بە تۆمەتی جیا جیا حوکم دراون[٤٤٨] ئەندامەکانی یەك لە دوای یەك لێی هاتنەدەرەوەو وازیان دەهێنا. تەنانەت ئەوانەیش هەڵسو کەوتی کەسێکی وەك «عەبدولڕەززاق ئەلسامەڕائی» یان پێ قبوول نەدەکرا کە بە حوکمی سەرۆکایەتی کردنی کۆمەڵە، بە ڕاستو چەپدا یاری بە پارەو پوولی کۆمەڵە دەکرد؛ ئەوە بوو لە ماوەیەکی کەمدا، چوار کەسیان وازیان لە ئەندامێتی دەستەی بەڕێوەبەر و کۆمەڵەیش هێنا.[٤٤٩] لەوەیش سەیرتر، ڕژێم خۆیشی ناچار بوو دەست بەسەر بارەگاکەدا بگرێو چی‌نامەو نووسراوی تێدابوو بی پشکنێو کەفالەت لە دووان لە سەرکردەکانی کە «عەبدولڕەزاق ئەلسامەڕائی» و «سەعید ئەلحەدداد» بوون، بستێنێ، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە کاروکردەوەیان گەیشتە رادەیەك لە هەموو کۆڕو کۆمەڵێکی تایبەتیو گشتی‌دا باس هەر باسی ئەوان بوو.[٤٥٠]

پاش ئەوەی لە نێوان دەستەی دامەزرێنەری «کۆمەڵەی کرێکارانی عیراق» دا، «ناکۆکی زێفی سەند» و «شەڕو ئاژاوە زیادی کرد» دەیان کەس لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵە کە ژمارەیان ٣٥٠ کەس بوو،[٤٥١] ئەرزوحاڵێکیان لە ڕۆژی ١٨ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ دا، پێشکەش بە وەزیری ناوخۆ کرد، تێیدا داوا دەکەن کۆمەڵەی ناوبراو دابخرێو لەبەر ئەوەی «بۆ پەرژەوەندی گشتی‌ی کار ناکا» و چونکە «بۆ ئەوە دروست بووە خزمەتی چەند کەسێ بکا، کە هەندێکیان نەك هەر کرێکار نین بەڵکو رابوردوویەکی خراپیشیان هەیە...». سەبارەت بەم ڕاستی‌یان داوایان کرد ئیجازەکەی لێ وەربگیرێتەوە. ڕۆژی ١٦ ی شوبات ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانی کۆمەڵە کۆبوونەوەو چوار بڕیاریان دەرکرد. یەکەم: داوای داخستنی کۆمەڵە بکەن. دووەم: چی کەلو پەلی هەیە، یان بدرێ بە کۆمەڵەی سنعاتکاران یاخود بە یەکەم کۆمەڵەی کرێکاران کە لەمەو دوا دادەمەزرێ. سێیەم: دەسەلات بدرێ بە «محەممەد سالح ئەلقەزاز» ئەو کەلو پەلانە وەربگرێ. چوارەم پشتگیری ئەو داخوزی‌یانە بکا کە کرێکاران پێشکەش بە داموو دەزگا لێپرسراوەکانی دەکەن، سەبارەت بەرێکەپێدانی «کۆمەڵەی سنعاتکاران»: چونکە «خزمەتێکی گەورەی چینی کرێکارانی کردووەو بە تەواوی بەرگری لە مافەکانیان دەکا». ئەمانە بەیاننامەیەکیان بۆ هەموو « ئەندامانی کۆمەڵەی رای گشتی‌ی » دەرکردو تێیدا ئەو بڕیارانەیان نووسی‌یەوە.[٤٥٢]

هەرچی «کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیک» بوو، کرێکاران بە جۆرێکی تر بڕیاری چارەنووسیان‌دا. پاش ئەوەی دەرکەوت هەموو ئەو هەوڵ و تەقەللایەی بۆ رێگە پێدانی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» درا، بێ ئەنجامەو سەرەڕای ئەوەیش کە «نووری سەعید» گفتی دابوو بە پیر داوای کرێکارانەوە بچێ،[403] دەڵێین سەرەڕای ئەمانە «ئەلقەزاز» بڕیاری دا ئەو کۆمەڵەیە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. ئەگەرچی «کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیک» لە چەند هەڵوێستێکی‌دا[404] و لە رووی جۆری ئەندامەکانی‌یەوە لەگەڵ «کۆمەڵەی سنعاتکاران» دا جیاوازیی هەبوو، بەڵام بە پێی نەخشەیەکی دیاری کراو، ژمارەیەکی باشی کرێکاران بوونە ئەندامی «کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیک»، کاتێکیش لە ناوەڕاستی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٣٢ دا، هەڵبژاردنی نوێی دەستەی بەڕێوەبەر دەستی پێ‌کرد، «ئەلقەزاز» لیستەیەکی سەربەخۆی دابەزاند بریتی بوو لە خۆی و «سەلیم ئەحمەد»[405] و «محەممەد عەلی ئەحمەد» و «سەلمان ئەلشەیخ ناسر» و «عەبدولڕەحمان ئەلجیدە» و «عەبدولوەهاب ئەلسەعید» و «حسەین موحی‌ی» و «ئەلسەیید عەبدولەجید» و « سەعید عەبدولڕەزاق ». ئەنجامیش زۆربەی هەرە زۆری دەنگەکانیان وەرگرت.[406] لە رۆژی ٢٥ ی نیسان‌دا دەستەی بەڕێوەبەری نوێ، بە گشتی‌ی «محەممەد ساڵح ئەلقەزاز» یان بەسەرۆکی «کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیک» هەڵبژارد.[407]

دوای ئەوەی ئەم هەنگاوە پڕ مەغزایە سەرکەوتنی بە دەست هێنا، «ئەلقەزاز» و هاوەڵەکانی ویستیان ئەو بڕیارەی میری بەسەر بکەنەوە کە «کۆمەڵەی سنعاتکاران» ی پێ لە کاز خستبوو. ئەوەبوو لە ١١ ی ئایاردا بە ناوی «کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیک» ەوە، بەیاننامەیەکیان دەرکرد، هەر دوو کۆمەڵەکەیان کرد بەیەك ناوی «یەکێتی‌ی کرێکارانی عیراق» یان لێنا.[408]

لەگەڵ ئەوەیش‌دا کە وەزارەتی ناوخۆ بەرهەڵستی ئەم بڕیارەی کردو کۆمەڵەیش وەڵامی خۆی دایەوە[409]، مەسەلەی یەکگرتنی هەردوو کۆمەڵەوەك خۆی مایەوە، بەڵام «یەکێتی‌ی کرێکاران» دەستبەجێ کەوتە خۆ و جموجوڵێکی ئەوەندە فراوانی نواند، هیچی لە چالاکی‌یەکانی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» کەمتر نەبوو. سەرەتا داوای لە میری کرد یاسایەکی تایبەتی بۆ پاراستنی کرێکاری عیراقی دابنرێ. ئنجا دەستی کرد بە ناونووس کردنی کرێکارە بێ ئیشەکان‌و پەیوەندیشی بە کۆمپانیاو دامەزراوەجۆر بەجۆرەکانەوە کرد تاوەکو ئیشیان بداتێ‌و دایان بمەزرێنێ. هەروەها هەڵوێستی نارەوای کۆمپانیا بیانی‌یەکانی سەبارەت بە کرێکارە عیراقی‌یەکان یەکالا کردەوە. پاشان هەموو توانای خستە کار بۆ ئەوەی خزمەتگوزاری تەندروستی‌یان بۆ دابین بکاو باری رۆشنبیری‌یان بەرەو پێشەوە ببا. پەیوەندی‌یەکی پتەوی لەگەڵ کۆمەڵەکانی تریش‌دا بەست.

ئەمە جگە لە زۆر کارو باری‌تر کە بە هەموویان کارێکیان کرد سەر لەنوێ دەنگی کرێکاری عیراقی ببیسترێ.[٤٦٠]

لەبەر ئەوە شتێکی سرووشتی بوو کـرێکارو پیشـەوەرە بچکۆلەکـان لە دەوری ئەم کۆمەڵە تازەیە گرد ببنەوەو لە ماوەی چەند رۆژێکدا چی تۆکمەچی‌و تۆرنەچی و پایسکلچی هەیە، لە کۆمەڵی ناوبراودا بوون بە ئەندام. دوای ماوەیەك «کۆمەڵەی شوفێرە عیراقی‌یەکان» یش بە مەبەستی «یەکخستنی ریزی کرێکاران و هێنانەدی بەرەیەکی بە هێزی ئەوتۆ لە بەردەم هەموو کۆسپ‌و تەگەرەیەکدا خۆی رابگرێ‌و لە پێنـاوی ئامـانج‌و ئـاواتەکـانی کرێکـاران‌دا» وەك لە دەقی بڕیارەکەیان‌دا نووسراوە،[٤٦١] تێکەڵ بەم کۆمەڵە تازەیە بوو.

هـەروەك چاوەڕوان دەکـرا، رژێم لەسەر هـەمان ئـەو شێوەیـەی کە لەگـەڵ «کۆمەڵەی سنعاتکاران» دا بەکاری هێنـا، کەوتـە بیانـووگرتن بـە «یەکێتی‌ی کرێکاران»[٤٦٢] هەرچۆنێك بێ دامەزراندنی «یەکێتی‌ی کرێکاران» و هەڵوێستی رژێم بەرامبەر بەو یەکێتی‌یەو زۆر مەسەلەی تریش کە پێشتر قسەمان لەسەر کردن، ئەوە دەگەیەنن کە لەگەڵ کۆتایی هاتنی ئینتداب‌دا چینی کرێکاران بووە هێنرێکی کۆمەلایەتی ئەوتۆ لە سەرانسەری وولاتدا جێگاو رێگای خۆی دیار بوو. بۆیە هەرگیز لە خۆڕا نەبوو کە مەلیك فەیسەلی یەکەم بۆ یەکەمین جار لە مێژووی عیراق‌دا بەشێکی گرنگی لە دوا ووتاری عەرشی سەردەمی ئینتیداب، لە بەردەم پەرلەمان‌دا بۆ مەسەلەی کرێکاران تەرخان کرد. ئەوەتا دەڵێ:

«.. ئەم حکومەتەمان بە تەنگ باری کۆمەلایەتی کرێکارانیشەوە هاتووەو بۆ ئەم مەبەستە وەفدێکی نارد[٤٦٣] بۆ ژنێف تاوەکو سەر لە بیرۆی کـرێکارانی دەوڵەتان بداو لە داهاتوویش‌دا یاسایەك بۆ پاراستنی مافی کـرێکاران و بـەرز کردنەوەی باری ماددی‌و ئەدەبی‌یان دادەنێ؛ هیوایشی ئەوەیە ئەم لایەحەیەو هی تریش کە پەیوەندی‌یان بە چاککردنی باری ئابوری‌و دارایی‌و کۆمەلایەتی وولاتەوە هەیە لە داهاتوودا بخرێتە بەر دەستتان.»[٤٦٤]

ئەم ئاڵ‌و گۆڕەی بە سەر چینی کرێکارانی عیراق‌دا هات، باری سەرنجی هێزە سیاسی‌یەکانی عیراقی بەلای خۆی‌دا راکێشاو هەر یەکەیشیان بـە پێ‌ی پەرژەوەندی وتێ‌ڕوانینی چینایەتی‌یان، هەڵوێستی جیا جیایان نیشان‌دا.

---

## هەڵوێستی هێزە سیاسی‌یەکان بەرامبەر بە چینی کرێکارانی عێراق

---

ئەو دەستەو تاقمانەی لە عیراق دا جڵەوی حوکمڕانی‌یان کەوتە دەست،

لەسەرەتاوە بەرامبەر بە چینی کرێکاران و بزووتنەوەکەیان، هەڵوێستی دژایەتی کردن، یان پشت گوێ خستنی تەواویان گرتبووە بەر.[٤٦٥] ئەوانە هەر زوو هەستیان بە باری گرانی ئەو کرێکارانە کرد کە «ئەگەر زوڵمیان لێ بکرێ کەس گوێیان لێ ناگرێ» بەڵام ئەو زوڵمەیش لەبەر ئەوەیە «لە ئیش و کاردا زۆر دڵ ڕەقن و بەرۆژانەیەکی ئەوەندە زۆر ئیش دەکەن لە ووزەی خەڵکیدا نییە، نەشتێك هەیە سڵی لێ بکەنەوەو نە خۆیشیان هۆشێك دێننەوە بە بەریاندا» وەك رۆژنامەی «العراق» ی زمانی حاڵی حکوومەت نووسیبووی.[٤٦٦] سەرکردایەتی کرێکارانیش، پاش ئەوەی چەند جارێك بەرووی دەسەلاتداراندا تەقییەوەو زۆر حەقیقەتی چەسپاوی سەبارەت بە هەڵس و کەوتی رژێم بۆ دەرکەوت، ئەوجا وردە وردە باوەری پێی نەما. چونکە ئەو سەرکردایەتییە لە گەرمەی رۆژانی بزووتنەوەی کرێکاران و کۆتایی هاتنی ئینتیدابیشدا رێ نومایی بیروڕای تیوریستەکانی رژێمیان دەکرد، وەك «توفیق ئەلسەمعانی» کە سەرنووسەری رۆژنامەی «صدیٰ العهد» زمانی حاڵی «نووری سەعید» و سیستەمەکەی بوو.[٤٦٧]

زۆر نموونەیش لەبەر دەستدان بە ئاشکرا هەڵوێستی توێژە کۆمەڵایەتییە باڵاکانمان بەرامبەر بزووتنەوەو مانگرتنی کرێکاران و پیشەوەران بۆ دەر دەخەن، بە تایبەتی لەو رۆژانەدا کە مانگرتنە گشتییەکەی دژی «یاسای رەسمی شارەوانییەکان» ساز کرا. یەکێك لە رۆژنامەکانی سەر بە میری، ئەو مانگرتنە بە «لادان»[٤٦٨] لە قەڵەم دەدا؛ یەکێکی تریشیان وای دادەنێ «سووکایەتییە بە بیری مرۆڤایەتی»[٤٦٩]، هەندێ لە ئەندامانی پەرلەمانیش ئەو زەبروزەنگەی رژێم لەگەڵ مانگرتووەکاندا بە کاری هێنا بە «نەرمیی و بەزەیی پیاهاتنەوە» دەزانن، چونکە بەڕای ئەوان «هیچ هۆیەکی ماقووڵی نەبووە». لەبەر ئەوە داوایان دەکرد بە توندی «لەو دەستە ناپاکانە بدرێ کە یاری بە ئەمن و ئاسایش دەکەن»[٤٧٠]. هەر لەو کاتەدا دەستەیەك «ئەشراف و پیاو ماقووڵ و خاوەن موڵکی بەسرە» نامەیەکیان بۆ «نووری سەعید» ی سەرۆك وەزیران نارد، تێیدا بە گەرمیی ستایشی «دام و دەزگای ئیداریی و موتسەریف و پۆلیسی بەسرە دەکەن» و لایان وایە ئەو هەنگاوانەی ئەم دام و دەزگایانە ناویانە «شایانی هەموو سوپاس و ستایشێکە» چونکە بوونە هۆی ئەوەی «نەهێڵن» ئەم ئاژاوەیە تەشەنە بکا وەك لە نامەکەیاندا نووسیویانە.[٤٧١]

کاتێکیش ئەم هەڵوێستەمان باشتر بۆ روون دەبێتەوە کەبەوردیی سەرنجی سیاسەتی ئەپۆزیسیۆنی ئەو کاتە بدەین بەرامبەر بە چینی کرێکاران و

مانگرتنەکانیان، بێ گومان مانگرتنی کرێکاران بە نیسبەت ئەپۆزیسیۆنـەوە کە جڵەوی فـەرمانـڕەوایی بەدەستـەوە نەبـوو، مەغـزاو مەبـەستێکی گـەورەی دەگەیاند. بەڵام هەر ئەو ئەپۆزیسیۆنە کە خۆی دەچووە سەر حوکمو وەزارەتی پێك دەهێنا، ئەوەندەی تۆزێك مەسەلەی کرێکارانی بەلاوە مەبـەست نەبـوو. تەنانەت لەو کاتانەیشدا کە جڵەوی فەرمانڕەوایی بە دەستەوە نەبوو بـەلای خۆیەوە پشتگیریی هەندێ ڕووداوی دەکرد، نەیدەتوانی کارێك بکا جێ پێی ئەو وەزارەتە شلۆق ببێ، وەك لە نیشان دانێکی خێرای هەندێ هەڵوێستیاندا بۆمان دەر دەکەوێ.

با لە حزبە ئەپۆزیسیۆنەکانی سەردەمی ئینتیدابەوە دەست پێ بکەین. کام حزب لەوانە لە هەمووان زیاتر پێی دادەگرتو توندو تیژ تر بوو، پەیڕەوەکەی توخنی مەسەلەی کرێکاران نەدەکەوت، کەلە ساڵانی بیستەوە خـۆی بەسـەر کـۆمەڵدا سـەپانـدبوو.[٤٧٢] مـەسەلەی کـرێکانیش هـەر ئـەوەنـدە کـاری لە ئەپۆزیسیۆن دەکرد کە لەبواری سیاسیداو بۆ ماوەیەکی کورت ڕەنگی دەدایەوە، وەکوتر ئەو مەسەلانە بە هیچ شێوەیەك ئـامانجی ستـراتیژیی ئـەپۆزیسیـۆن نەبوون. لەبەر ئەوەشتێکی سەیر نییە ڕۆژنامەکانی حزبی «الاخاء الوطنی» کە بریتی بوون لە «الاخاء الوطنی» و «نداء الشعب» و «الأخبار» لەو ڕۆژانەدا کە گەرمەی بزووتنەوەی کرێکاران بوو، گۆشـەیەکیـان بۆ مـەسەلەی کـرێکاران تەرخان نەکردبوو، وەك چۆن گۆشەی جیا جیایان بۆ هەندێ مـەسەلە ئـامادە کردبوو لە چاو مەسەلەی کرێکاراندا بایەخێکی ئەوتـۆیان نـەبوو، لە بـابەتی «کیژانو خانمان»[٤٧٣] و «کاروباری قوتابیان» و «شیعرو بەیان» و «ئەدەب وژیان» و «مێژوو» و لەو بابەتانە. ئەمە لە کاتێکدا هەندێ لە ڕۆژنامەکانی ئەو حزبە بە شەش لاپەرە دەر چوون، کەچی زۆربەی ڕۆژنامەکانیتر چوار لاپەڕەیی بوون. ڕاستییەکەیشی ڕۆژنامەکانی حزبی « الاخاء الوطنی» وەك هەموو ڕۆژنامە بێ لایەنەکانو تەنانەت ئەوانەیشی کە سەر بەمیری بوون، لەو دەنگو باسانە زیاتر کە لە کۆمەڵەکانەوەو بە تایبەتی لە «کۆمەڵەی سنعاتکاران» ەوە بۆی دەچوو، هیچ شتێکیان سەبارەت بە کرێکارانو مەسەلە ڕەواکانیان بڵاو نەکردەوە. ئەوەیشی کەلەم بوارەدا مەغزایەکی تایبەتی هەیە، ئەوەیە بە تەنها ڕۆژنـامەی «العـالم العربی» لە تێکڕای ڕۆژنامەی حزبە سیاسییەکـان ولەپێش هەمـوویشیانـەوە، حزبەکانی ئەپۆزیسیۆن، زیاتر بایەخی بەمەسەلەی کرێکاران دەدا.

لەمەوە بۆمان دەر دەکەوێ بۆچی هێزە سیاسی یەکانی ئەپۆزیسیۆن لە کاتی مانگرتنەکانی کرێکارانی ڕێگای ئاسن‌دا هەڵوێستێکی ئەوەندە دڵسۆزانەیان لە دژی دام‌و دەزگایەکی بیانی نیشان نەدا کە بە ئارەزووی خۆی‌و بە بەرچاوی جەماوەرەوە یاری بە چارەنووسیان دەکرد.[474] ئەمە هەمووی لە کاتێک‌دا کە سەرکردایەتی کرێکاران چەندین بانگەوازی ئاراستەی ئەو هێزە سیاسی یانە کرد.[475] بە نموونە: ڕۆژنامەی «نداء الشعب» لە ڕۆژانی مانگرتنی یەکەمی کرێکارانی ڕێگای ئاسن‌دا چ لەسەرووتارو چ لە شوێنی تردا، ووشەیەکی دەربارەی ڕووداوەکانی مانگرتنە نەنووسی؛ کەچی هەر لەو ڕۆژانەدا زنجیرەیەك ووتاری بە بۆنەی دراوی عیراقی لە «ڕوپیە» وە بۆ «دینار» بڵاو کردەوە.[476] تەنانەت هەڵوێستی سیاسەتمەدارێکی لیبرایی وەك «جەعفەر ئەبولتمەن» کە بە خاوەنی هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە ناسراوەو «ئەلقەزاز» هەمیشە لە سەرکردەکانی‌تر جیای دەکاتەوە، جیاوازی‌یەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوانی‌تردا نەبوو.[477]

بەڵام کاتێك هێزەکانی ئەپۆزیسیۆن هەستیان کرد مانگرتنی گشتی ی دژی «یاسای ڕەسمی شارەوانی‌یەکان» دەتوانێ جێ پێ ی حکوومەتەکەی «نووری سەعید» شلۆق بکا، زۆر بە گەرمی‌یەوە هاتنە مەیدان‌و هەوڵیان‌دا بزووتنەوەی کرێکاران بەو شێوەیە بجووڵێنن خزمەتی مەبەستە سیاسی‌یەکانیان بکاو بەس. ئەوەبوو ڕۆژنامەکانیان بایەخێکی لە ئەندازە بەدەریان بەم مەسەلەیە داو زنجیرەیەك ووتاری ئاگرین‌یان بە نیازی ورووژاندنی خەڵکی ی دژی وەزارەتەکەی ئەو کاتە بڵاوکردەوە.[478] دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش بە هەموو توانایانەوە هەوڵیان‌دا هەڵوێستی هێزەکانی ئەپۆزیسیۆن ئاشکرا بکەن کە «دەیانویست بە هۆی مانگرتنەکەوە خۆیان بگەیەننە کورسی فەرمانڕەوایی وهیچی تر..».[479]

کە سەرکردەکانی ئەپۆزیسیۆن لەوە تێ گەیشتن جەماوەری کرێکاران‌و پیشەوەرە بچکۆلەکان چ هێزێکیان لە خۆیان‌دا حەشار داوە ، هەوڵیان‌دا دەست بەسەر ئەو کۆمەڵانەدا بگرن کە لە پێناوی کرێکاران‌و پیشەوەران‌و بەناویانەوە دروست بوون . بە ڕادەیەك حاڵ گەیشتە ئەوەی « یاسین ئەلهاشمی » ی سەرۆکی حزبی « الاخاء الوطني » داوای لە « ئەلقەزاز » کرد « کۆمەڵەی سنعاتکاران » بکاتە لقێکی حزبەکەی‌و بە پێ ی ئەم نەخشەیە کۆمەڵەی ناوبراو

دەبووە ئامرازێکی کاریگەر بە دەست ئەپۆزیسیۆنەوە[180] .

لێرەدا پێویستە ئەم هەڵوێستە ناوەختانەی ئەپۆزیسیۆن لە سنووری راستەقینەی خۆیان‌دا هەڵبسەنگێنین‌و لەو حەقیقەتەیش تێ بگەین کە هەموو ئەوانە لە چوار چێوەی ململانەی سیاسی تیپەڕیان نەدەکردو مەبەست‌و ئامانجیشیان بە تەنها گەیشتن بوو بە کورسی وەزارەت . شایانی باسە زۆر خەڵکی لایەنگری « نووری سەعید » هەر یەکە لای خۆیەوە هەوڵی‌دا سوود لە رووداوەکانی مانگرتنی گشتیی دژ بە « یاسای رەسمی شارەوانی‌یەکان » وەربگرن‌و لە پێناوی سوودی تایبەتی ودەستکەوتی گەورەتردا ، ئەوانی‌تر بەد ناو بکەن . ئەوانەیش بێ بەپێی هێزەکانی ئەپۆزیسیۆن زۆر شتی راستیان دەووت ، بەڵام لە پێناوی ناراستی‌ی‌دا . نەك هەر ئەوەیش بەڵکو هەوڵیان‌دا « نووری سەعید » بێ تاوان دەربکەن‌و چی رووی داوە بیخەنە ئەستۆی « موزاحیم ئەلپاچەچی » کە وەزیری ناوخۆی حکوومەتەکەی بوو ، بە مەرجێك لە خراپترین حاڵ‌دا ناوبراو ئەوەندەی « نووری سەعید » بەرپرسیاری رووداوەکان نەبوو.[181] « نووری سەعید » خۆی سەرپەرشتی‌ی دارشتن‌و دانانی لایەحەی « یاسای رەسمی شارەوانی‌یەکان » ی کردو لە کۆبوونەوەیەکی پەرلەمان‌داو لەو مشت‌ومڕەدا کە لەسەر یاسای باس‌کراو بەرپا بوو ، زۆر بەگەرمی‌یەوە بەرگریی لە هەموو ماددەکانی ئەو یاسایە کرد.[182] ئەمە جگە لەوەی سەیرترین شتێك کە رژێم لە رۆژانی مانگرتنەکەدا دژی دانیشتووانی « بەسرە » پەنای وەبەر نا « مەبەستمان نیش کردنە بە یاسای داوای عەشایەری » بە فەرمانی راستەوخۆی « نووری سەعید » بوو ، دوای ئەوەی لە دەرەوەی وولات گەڕایەوە[183] .

چاکترین پێوانە بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی ئەپۆزیسیۆن بەرامبەر بزووتنەوەی کرێکاران‌و ئەو مانگرتنانەی لە دوو ساڵی دوایی سەردەمی ئینتیداب‌دا روویان‌دا ، ئەو هەڵوێستانەیە دەرهەق مەسەلەی زەحمەتکێشان نیشانیان داوە ، جا چ پێش چوونە سەرخوکمیان بێ و چ دوای کۆتایی هاتنی ئینتیداب . بەر لە هەموو شتێك دەبێ ئەوە بزانین کە رۆڵی حزبی « الاخاء الوطنی » لە دانانی بەردی بناغەی « یاسای رەسمی شارەوانی‌یەکان » دا هیچی لە لایەنەکانی‌تر کەمتر نەبووە . چونکە دەنگ‌و باسی ئەو یاسایە لە ساڵی « ١٩٢٦ » ەوە لە ناو پەرلەمان‌دا لە گۆڕێ بووەو مشت‌و مڕو قسەی زۆری لەسەر کراوە . « یاسین ئەلهاشمی » و « رەشید عالی ئەلگەیلانی » و

« حیکمەت سولەیمان » و خەڵکی تریش هەر یەکەیان بە شێکی بنچینەیی یاساکەیان دارشت[484] . ساڵێکیشی پێ نەچوو لایەحەی ئەو یاسایە بۆ یەکەمجار وبەشێوەیەك پێشکەش پەرلەمان کرا [ لە رووی سەپاندنی باجەوە لە بەیاننامەکەی بلفور - ی سەر دەمی ئینتیداب .ك .م - قورس‌ترو گرانتربوو ] بێ ئەوەی « رەشید عالی ئەلگەیلانی » کە وەزیری ناوخۆو « یاسین ئەلهاشمی » ی کە نەك هەر وەزیری دارایی بەڵکو جێگری سەرۆك وەزیرانیش بوو ، بەرهەڵستی ی بکەن .[485] یەکێك لەوانە هەنگاوێکی ئەوتۆیان نەنا بۆ ئەوەی لە کۆمپانیا بیانی‌یەکان‌دا رێگا لە دامەزراندنی خەڵکی بێگانە بگرن ، بە تایبەتی ئەم مەسەلەیە لەناو کرێکارو فەرمانبەرە عیراقی‌یەکان‌دا بوو بووە گرێ کوێرەی هەموو گیروگرفتێك . بە پێچەوانەوە یەکێك لە سەرکردەکانی ئەپۆزیسیۆن لەکاتی خۆی‌دا قەواڵەیەکی مۆر کردو بە پێی ئەو قەواڵەیە رێگای‌دا پتر لە ١٥٠ کەسی بیانی بە یەکجار دابمەزرێنرێ[486] کاتێکیش حزبی « الاخاء الوطني » جڵەوی فەرمانڕەوایی گرتەوە دەست ، هەڵوێستیان بەرامبەر بە زەحمەتکێشان گۆڕانێکی بەسەردا نەهات ، ئەوەندە نەبێ گەرەکیان بوو ئەوانە پاڵپشتێکی بێ ئاگا بن‌و بە هۆیانەوە شوێن پێ‌ی خۆیان قایم بکەن‌و جێ بە خەڵکی‌تر شلۆق بکەن . ئەوەتا دوای چوار ساڵ بەسەر مانگرتنە گشتی‌یەکەی دژ بە « یاسای رەسمی شارەوانی‌یەکان » دا « رەشید عالی ئەلگەیلانی » لە بەردەم پەرلەمان‌دا ، بێ سێ‌ودوو کردن دەڵێ : « ...لەم ووڵاتەدا گیروگرفت یان کێشەی کرێکاران لە گۆڕێ نی‌یە ، چونکە زۆربەی دانیشتووانی جووتیارن » .[487]

گومانی تێدا نی‌یە کە ئەم هەڵوێستانە بەر لە هەموو شتێك رەنگدانەوەی ئایدۆلۆژیای چینێك بوون کە خاوەنی پەرژەوەندیی‌و هەڵسەنگاندن‌و بۆچوونی تایبەتی خۆیەتی . لێرەدا رەنگە ئەوەندە بەس بێ کە یەکێکی وەك « یاسین ئەلهاشمی » لە گەرمەی ململانەی کرێکاران‌و کۆتایی هاتنی سەردەمی ئینتیداب‌دا بە تاقی تەنها ئیمتیازی پیشەسازیی چیمەنتۆ دروست‌کردنی لە سەرانسەری عیراق‌دا وەرگرت .[488] ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی یەکەم کارگەی ئەهلی‌ی چیکەنە کردنی لۆکە لە عیراق‌دا ، بریتی بوو لە ژمارەیەك سیاسەتمەداری ناوداری ئەوسای ووڵات .[489] دەبێ ئەوەیشمان لەیاد نەچێ کە ئەو بزووتنەوانەی لەبابەتی مانگرتنە گشتی‌یەکەی دژ بە یاسای رەسمی شارەوانی‌یەکان‌و « مقاطعة » کردنی کۆمپانیای کارەبای ساڵی ١٩٣٣ بوون ، تەواو لەگەڵ پەرژەوەندی ئابوری چینی بۆرژوای تازە پێ گەیشتوودا

دەگونجان .[٤٩٠] بۆیە قسەکەی « موزاحیم ئەلپاچەچی » لە بارەی ڕووداوەکانی ئەو مانگرتنەوە لەجێی خۆی دایە ، ئەوەتا دەڵێ : « ئەوانەی پاڵیان بە پیشەوەرو سنعاتکارانەوە ناو هانیان دان مان بگرن بازرگانەکان بوون » .[٤٩١] لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ « محەمەد سالح ئەلقەزاز » ئەوەی دووبارە کردەوە کە باشتر وابوو لە ڕۆژانی مانگرتنەکەی دوایی‌دا تەنیا پێ لەسەر ئەوە دابگرن ئەو باجانەیان لەسەر لاببرێ کە پەیوەندی ڕاستەو خۆیان بە پەرژەوەندی زەحمەتکێشانەوە هەبوو[٤٩٢] .

وەنەبێ هەڵوێستی تاقمە ڕادیکالی‌یەکەی ناو چینی بۆرژوای نیشتمانی‌ی کە کەرتێکی بەهێزی ئەپۆزیسیۆنی پێك دەهێنا ، جیاوازی‌یەکی ئەوتۆی لەگەڵ هەڵوێستی توێژەکانی تری ئەو چینەدا هەبوو بێ . ئەمە لە کاتێکدا چ کرێکاران و چ پیشەوەران هیوایەکی گەورەیان بەم تاقمەو بە تایبەتی بە شەخسی « جەعفەر ئەبولتمەن » هەبوو . هەروەها بە ڕێکەوتیش نەبوو کە « ئەلقەزاز » لە هەموو کەس زیاتر متمانەی پێ دەکردو هەوڵی دەدا بۆ هەموو بڕیارێکی گرنگ پرس و ڕاوێژی پێ بکاو[٤٩٣] مانگرتووەکانیش لە ڕۆژانی مانگرتنەکەدا لەماڵەوە سەریان لێ دەدا[٤٩٤] . لەگەڵ ئەوەیش‌دا کە « ئەبولتمەن » لەچاو خەڵکی‌تردا هەڵوێستی ئازایانەو دڵسۆزانەتری سەبارەت بە کرێکاران و پیشەوەرە بچکۆلەکان نواند .[٤٩٥] بەلام هەموو ئەو هەلوێستانەی هێشتا لە ئاستی گرنگی‌ی ڕووداوەکان‌دا نەبوون .

ڕۆژنامەی « الاستقال » یش کە دەتوانرێ بە زمانی حاڵی ئەم تاقمە دابنرێ ، دەرهەق بە مەسەلەی کرێکاران هیچ هەڵوێستێکی جیاوازی لەگەڵ ڕۆژنامەکانی تری ئەپۆزیسیون‌دا نەبوو . ئەویش لە گەرمەی بزووتنەوەی کرێکاران‌دا گۆشەیەکی سەربەخۆی بۆ گیروگرفت و شکایەتی کرێکاران تەرخان نەکردو لەو دەنگوباسانە زیاتر کە لە کۆمەڵەکانەوە بۆی دەچوو شتێکی دی بلاو نەدەکردەوە . جاری وایش هەبوو ئەو هەوالانەی لە ڕۆژنامەکانی‌تر کورتتریش بلاو دەکردەوە . کەچی بایەخێکی گەورەی بە « کاروباری قوتابیان »[٤٩٦] و مەسەلەی ئافرەتان دەداو تەنانەت گۆشەیەکی هەمیشەیی بۆ تەرخان کردو هەندێ جار باسی « شێوەکانی خۆجوانکردن » و « لە پێناوی جوانی‌دا » وشتی لەو بابەتەی تێدا بلاو دەکرایەوە[٤٩٧]

جا بۆ ئەوەی ڕۆشنایی‌یەکی بەهێزتر ئاراستەی هەڵوێستی تاقمە ڕادیکالی یەکەی بۆرژوای نیشتمانی‌ی بکەین بەرامبەر بە مەسەلەی کرێکاران ، ئەو قسانە بە نموونە دەهێنینەوە کە شاعیری نیشتمانپەروەر « مەعرووف

ئەلرەسافی » سەبارەت بە دانانی یاسایەکی تایبەت بە کارو کرێکـارانی عیراق کردی . ئەو یاسایەی کە بەر لە قسەکانی « ئەلرەسافی » بوو بـووە دروشمی ناوەندیی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق . ئەوەتا ناوبراو سالی ۱۹۳۵ لە بەردەم پەرلەماندا دەلێ : « .. لەبەر ئەوەی هەرچی پیشەسازیی هەیە لە دەرەوە بۆمان دێ ، وولاتی ئێمە وولاتێکی پیشەسازیی نی‌یەو کشتوکالی‌یە . هەروەها کارگەو کارخانەیەکی ئەوەندە زۆری تێدا نی‌یە هەزاران کرێکار ئیشیان تیا بکەن . ئەمە جگە لەوەی کە هیچ ناکۆکی‌یەك لە نێوان کرێکاران و ئەو کەسانـەدا نی‌یە کـە ئیشیان لا دەکەن . .. نازانم ـ کە حال وابێ ـ ئەم لایەحە یـاسایی‌یـە بۆچی دانراوە ؟.. هیچ بە پێویستی نازانم ئەم یاسایە لە وولاتی ئێمەدا دابنرێ . وای بۆ دەچم ئەم لایەحەیە تەنها بۆ کارگەی فەتتاح پاشا دانرابێ و بەس »[498]

کە ناوەرۆکی ئەم ووتەیە هەلدەسەنگێنین ، دەبێ ئەوەمان لەبەرچاو بێ کە خاوەنەکەی رۆشنبیرێکی دەرکەوتووەو لە هەمان کاتیشدا لایەنگری « کۆمەلەی سنعاتکاران » و هامشۆکەرێکی هەمیشەیی کۆرەکانی ئەو کۆمەلەیە بووە .[499] لای خۆی شاعیرێك بوو بەسەر کرێکاراندا هەلی دەدا ، کەچی لەو رۆژگارەدا باری ژیانی ئەو دەیان هەزار کرێکارەی بە خەیالدا نەهات کە لەناو کۆمپانیـا بیانی‌یەکان[500] و دامەزراوەکانی دەولەتدا ئیشیان دەکرد . بۆیە نوێنـەرێکی وەك « سەعید ئەلحاج سابت » کە سەر بە هەمان تاقم بوو ، لەو کۆبوونەوەیەدا بە روویدا تەقی‌یەوەو وەلامی دایەوە[501] .

هـەلوێستی راستەقینـەی دەستەو تـاقمە جیـا جیاکـانی چینی بۆرژوا بەرامبەر بە پەرژەوەندی‌یە بنەرەتی‌یەکانی کرێکاران ، سەرەتای دابڕ بوونی ئەو دوو چینە بوو لە یەکتر . لەمەوە کرێکاران کەوتنە خۆو لە شێوازی نوێی خـەبات دەگـەڕان کە زیـاتر سـەربەخـۆیی‌یان بـداتێ ، دیارە ئـەمـەیش لە پەرژەوەندی بزووتنەوەی کرێکاراندا بوو . باشترین بەلگەی ئەم هەلوێستەیش ئەوە بوو کە « محەممەد سالح ئەلقەزاز » پێشنیازەکەی « یاسین ئەلهاشمی » دایە دواوەو قایل نەبوو بەوەی « کۆمەلەی سنعاتکاران » بخـاتە سـەر حزبی « الاخاء الوطنی »[502]

لەو سەردەمەدا، تـوێژی رۆشنبیـران و لە پێش هەمـوویانـەوە، لاوانی شۆڕشگێڕی پایتەخت، نزیکترین هێزی کۆمەلایەتی بوون لە چینی کرێکارانەوە. ئەم توێژەبە ژمارەکەمە، لەهەمووان چاکتر شارەزای گیروگرفت وئازارەکانی گەل بـوو. لە هــەمــوو هـێـزە سیـاسی‌یـەکـانـی تـرپش رادیکـالی‌یـانـەتـر

چارەسەری ئەو گیروگرفتانەی دەکرد. ئەمانە لە رۆژگاری «شۆرشی بیست»ەوە شێوەیەکی هەست پێکراو بوونی خۆیان لە مەیدانی سیاسیدا سەپاند. ئامانجیان ئەوە بوو، وولات بە تەواوی لە هەموو شێوەکانی ئیمپریالیزم رزگاری بێ. لە رووی ئایدۆلۆژیشەوە، بیروڕای دیموکراسی لیبرالی شێوە رۆژئاوایی کاری تێ کردبوون. بەسەرێکی تریش بیروباوەری سۆشیالیزم وردە وردە لەناو ریزەکانیدا بڵاو بووبووەوەو لە ناوەراستی سالآنی بیستەوە خۆی نواند. ئەم توێژە کۆمەلآیەتی یە کە درێژەی بە خەباتی خۆی دەداو لە پێناوی جێ بەجێ کردنی ئامانجەکانی داو بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆیی سیاسیو کۆمەلآیەتی بۆ سەرجەم کۆمەلآنی خەڵك، پێویستی بە هێزێکی جەماهیری هەبوو. لەو رۆژگارەداو بە حوکمی سروشتی دروست بوون و پێکهاتنی نەیدەتوانی روو بکاتە لادێو مەیدانی خەبات بگوێزێتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە پەیوەندی خێڵەکیو دەرەبەگایەتی دەرگای ئەو مەیدانە فراوانەی لەسەر داخستبوو. سەبارەت بەم بارو زرووفە، کرێکاران باشترینو نزیکترین هێز بوون لە رۆشنبیرانەوەو دەیانتوانی کاریان تێ بکەنو پشتیان پێ ببەستن. چونکە کرێکاران، رۆشنبیرێکی ئەو کاتە ووتەنی: «ئەو چینەن لەناو جەرگەی گەلەوە هەڵقولآونو بناغەی تەلاری سەربەخۆییو سەربەستین»[٥٠٣] بۆیە رۆژنامەی «الأهالی» یش کە زمانی حاڵی گرووپی «الأهالی» بوو، بە ئاشکرا رووی دەکردە «لاوانی نەتەوە» و داوای لێ دەکردن: «.. روو بکەنە ئەو چینەو پەرۆشیان بنو[٥٠٤] بچنە ناویانەوەو خۆشیان بوێنو بە دڵسۆزییەوە خزمەتی بکەن، تاوەکو راپەرین هەموو لایەك دەگرێتەوە. ئەوسا پاشەرۆژی ئابوریو سیاسی گەلەکەتان کە ئەمڕۆ لێی بێزارن، بەو جۆرە دەبێ کە خۆتان دەتانەوێ. گەر بێو دەست بۆ چینی رەشو رووت درێژ بکەنو لێتان دڵنیا بن، ئەوسا بزووتنەوەیەکی ئەوتۆ لە ناویاندا دەخولقێنن کەس نەتوانێ بەرهەڵستی بکا»[٥٠٥].

گومان لەوەدا نییە کە سەرکەوتنەکانی بزووتنەوەی کرێکارانی ئەورووپای رۆژئاوا، کاری تەواوی لە تاقمە رادیکالییەکەی ناو رۆشنبیرانی عیراق کردبوو، بە تایبەتی چونکە کرێکاران لەو وولآتانەدا بوو بوونە «خاوەن دەسەلآتو چ لایەنە سیاسییەکانو چ ئەوانەیش سیاسی نەبوون ترسیان لێیان هەبوو»[٥٠٦] نەك هەر ئەوەیش بەڵکو لە ئەوروپادا بوونە «خاوەنی هەموو هەلوێستێکی ترسناك. چی ئاڵو گۆڕی ئابوریو پەرە سەندنی کومەلآیەتیو هەرەس هێنانی ئەم رژێمو ئەو رژێم هەیە، بە کورتیی ئەو رووداوە مەزنانەی ناو بە ناو لە

سەرانسەری جیهان‌دا دەیان بینین ، زۆربەیـان جیّ دەستی دیارو نـادیاری کریّکارانیان پیّوەیە .. » لەبەر ئەوە شتیّکی سەیـر نی‌یە ئـەگەر خـاوەنی ئەم بیروڕایانە چاو ببڕنە ئەو ڕۆژەی تیّیدا « کریّکارانی عیراقیش ڕۆلیّکی وا مەزن لە ژیان‌دا بگیّڕن».[507]

بەو جۆرە ڕۆشنبیران بەر لە تویّژە کۆمەلاَیەتی‌یەکانی دی ، بایەخیان بە مەسەلەی کریّکاران‌دا. ئەوانە یەکەمین کەس بوون لە زووەوەو لە ناواخنی ئەو ووتارانەیان‌دا کە لە گۆتارەکانی ئەو سـەردەمەدا بـلاَویان دەکـردەوە ، گیرو گرفتی بیّکاریی‌وزۆربوونی کریّکاری بیانی‌یان چارەسەر دەکرد[508] هەر زوویش بە شیّوەیەکی ئەوەندە عاتیفی‌ی لە سەر هەلویّستی سەلبی ڕژیّمیان سە بارەت بە کریّکاران نووسی ، کاریان لە هەستیان دەکردو بۆیان دەرخستن کە ڕۆشنبیران تا چ رادەیەك بلیەخ بە مەسەلە ڕەواکانیان دەدەن . پیّش ئەوەی بزووتنەوەی کریّکاران کلّپە بستیّنیّ ڕۆشنبیریّکی ئەو کاتە بەم جۆرە کۆتایی بە ووتارەکەی دەهیّنیّ بەشیّوەیەك کار دەکاتە سـەر ئادەمیـزاد ، لە ناخـەوە مرۆڤی سـادە دەهەژیّنیّ .

« .. خەلّکینە وەرن برینی ئەو کریّکارە عیراقی‌یە تیمار بکەن کە برسی‌یەتی پشتی شکاندووە ؛ هیچ نەبیّ بە چاوی بەزەیی‌یەوە تیّی[509] بڕوانن . کام دلّ زۆر ڕەقە کە گوزەرانی ئەو دەبینیّ خویّنی لیّ دەتکیّ .. ئەو ژیانە دووچاری کویّرەوەری‌و نەهامەتی‌ی کردووە . تاکەی دلّتان نەرم نابیّ ! ئەی ئەوانەی بە ناوی گەلەوە لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی پالّتان لیّ داوەتەوە ، تاکەی هەستی نەتەوەیی‌تان ناجوولیّ . کاتی ئەوە هاتووە ئەو کۆت‌و زنجیرانە بپچڕیّنین کە تەنانەت بەندەکانی بـەندیخـانەی - بـاستیل - ی سـەردەمی لویسی شازدەهـەم بە خـۆیـانـەوە نەدیوە .. »[510]

هـەنـدیّ گـۆڤـاریش وەك «الـحـاصـد »[511] و بـەتـایبـەتي گـۆڤـاری « الشبـاب » ی مانگـانە کـە « سەعید ئەلسـامـەڕائی » و « عـەبـدولقـادر ئیسمـاعیل » دەریـان دەکرد ، بـایەخیّکی هـەست پیّکراویـان بە مـەسەلەی کریّکاران‌و شکایەتە کانیان دەدا . گۆڤـاری « الشباب » کـە نووسـەری وەك « مەحموود ئەحمەد ئەلسەید » و « یووسف ڕەجیب » تیّیدا دەیا ننووسی ، هەر لەیەکەم ژمارەوە کە ڕۆژی ١٦ ی ئـابی سالّی ١٩٢٩ دەرچـووە ، دەستی بۆ مەسەلەی هەژاریی‌و سوالّکردن ڕاکیّشاوەو داوای لە میری دەکرد چارەسەریان

بکـا[٥١٢] . کاتێکیش کـۆمەڵە کـرێکاریو پیشـەیی‌یەکـان دروست بوون ، چی ڕۆشنبیری پایتەخت هەبوو بە شێوەی جۆر بەجۆر وئەوەندەی لە توانایاندا بوو ، پشتگیری‌یان کرد .[٥١٣] هەبوو بە شداری کۆڕەکانی دەکردو باسی سوود بەخش و بەکەڵکی بۆ ئەندامەکانی دەخوێندەوە ، هەیش بوو بە مـەبەستی نـەهێشتنی نەخوێندەواری لەناو کرێکاران و پیشەوەران داو لەناو ئەو پۆلانەدا کۆمـەڵەکان کردبوویاننەوە ، دەرسیان بە ئەندامەکانیان دەووتەوە . خەڵکی وایش هەبـوو کتێبی قوتابخانەوسەرچاوەی ڕۆشنبیری گشتی‌ی پێ دەبەخشین و تەختەی بۆ دەنووسین و بەرهەمی هـونەریی پێشکـەش دەکردن . هـەندێکی تـریش ئەو بۆستانەیان وەردەگێڕا کە « کۆمەڵەی سنعاتکاران » لەگـەڵ دەرەوەی وڵات ئاڵ و گۆڕیان دەکردو[٥١٤] زۆر کاروباری تریش کە وایان لەو کۆمـەلانە کـرد بە شێوەیەکی باشتر ئەرکەکانی سەرشانیان ڕابپەڕێنن[٥١٥] . لێرەدا پێویستە ڕۆڵی تایبەتی پارێزەران و ڕادەی پشتگیری کردنیان لە کرێکاران و ڕێکخراوەکانیان لە یاد نەکەین . بێ گومان ئەم هەڵوێستە یشیـان لەوەوە هاتـووە کە بـە حوکمی پیشەکەیان پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە گیروگرفتی خەڵکەوە و بە تایبـەتی بە هـەژارانەوە هـەیە . ئـەوانە لە زۆر بـۆنەداو لەبـەردەم دادگادا بـە خۆڕایی بـەرگری‌یـان لە کرێکـاران دەکرد . چ وەك نـووسـەرو چ وەك لێپـرسـراوی ڕۆژنامەیش ڕۆڵێکی هەست پێکراویـان لە ڕۆژنامـەی کرێکـاران‌دا بینی . لەو سەردەمەدا کۆڕێکی کرێکاران ساز نەکراوە ژمارەیەك پارێزەر بەشداری تێدا نەکردبێ[٥١٦] .

ڕۆشنبیـرە شۆڕشگێـڕەکـان ، بـە تـایبـەتی ئـەوانـەی بیـروبـاوەڕی سـۆشیالیـزمی‌یان تێـدا دروست بـوو ، وەك « حسـەین ئـەلڕەحـال »[٥١٧] و « مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید » ی چیرۆك نووس[٥١٨] و « یووسف ڕەجیب » ی نـووسەر[٥١٩] و «عـەبدوڵلا جـەددوع » و « ئیبراهیم ئـەلقـەزاز » و خـەڵکی تریش[٥٢٠] ڕۆڵێکی دیاریان گێڕاو توانی‌یان هوشیاری چینایەتی لەناو کرێکاران‌دا بخـەملێنن و پەرەی پێ بـدەن و تـۆوی ورەو متمـانـە بـە خـۆ کـردن لە دژی چەوسێنەران لە دەروونیان دا بچێنن . بە هۆی پەیوەندی کردنیان بـە چەنـد سـەرکردەیـەکی ئـەو کـۆمـەلانـەوەو بـەو ووتـارانـەی کـە لە کـۆڕەکـان‌دا دەیـانخوێنـدنەوەو بـەوانەیش کـە لەڕۆژنامـەکان‌دا بـلاویان دەکـردنـەوە ، داکۆکی‌یان لە کۆمەڵەی پیشـەیی و کرێکـاری دەکرد . لەگـەڵ ئەوەیش‌دا بـە ڵگەیەکی زۆر لەبەر دەست دایە و هەموویشیان گەواهی ئەم حەقیقەتەن . لێرەدا ئەوەندە بەسە بیروڕای نووسەری ناسراو « مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید » بە

نموونە بهێنینەوە کە ڕۆژنامەی «العامل»[٥٢١] پێی دەڵێ، لەو تاك تاك خەڵکەیە «بوسەر خستنی کرێکاران هەوڵ دەداو گەرەکیەتی بیانگەیەنێتە ریزی چینە دەسەلاتدارەکان وگیانی ئاوێتەی بەکسانیی بووە. بۆیە حەزی بە یەکسانییەر خۆشی دەوێ. هەر ئەو خۆشە ویستییەیشە لە قەڵەمە بەخشندەکەیدا دەرکەوتو خۆی نواند».[٥٢٢]

« ئەلسەبید » لەو ووتارەیدا کە پاش نیوەڕۆی « ١ » ی ئابی ساڵی ١٩٣٠ لە ئاهەنگێکی کریکارانی « کۆمەڵەی چاپخانەکانی عیراق » دا خوێندییەوە ، ڕوو دەکاتە ئامادە بووانو دەڵێ : «کار، بەڵگەی یەکەمین شارستانیەتو ئاوەدانییە. سەرچاوەی پیرۆزی ژیانەو بەهۆیەوە شەرەفێکی تایبەت بە کرێکاران دەبەخشێو لە هەموو چینەکانی دی جیای دەکاتەوە» لێرەدا ووتەیەکی «نەهرۆ» بە بەڵگە دێنێتەوە و دەڵێ: «پاشە ڕۆژ بۆ چینە زەحمەتکێشەکانە کە میللەت پێك دەهێنن، وەك کرێکاران و جووتیارانو خاوەن پیشە سەربەستەکانو سنعاتکاران.[٥٢٣] ئەو خێرو بێرەی لەوانە چاوەڕوان دەکرێ، سەد یەکی لە چینی بالاو ناوەڕاست چاوەڕوان ناکرێ» هەروەها «ئەلسەبید» کرێکاری عیراقی ؛ هوشیار دەکاتەوەو ئاموژگاری دەکا خۆی دووچاری ئەو هەڵەیە نەکا کریکاری میسری تێی کەوتو جڵەوی خەباتی کۆمەلایەتی وئابوری دایە دەست چەند نوینەرێك... ئەوانیش چوونە کۆڵیو[٥٢٤] مەسەلەکەیشیان بۆ مەبەستی خۆیان بەکار هێنا، بەلام نەیانتوانی هیچی بۆ بکەن».[٥٢٥]

لەو ووتارەیشدا کە لە یەکێك لە ڕۆژنامە کریکارییەکاندا بلاوی کردووەتەوە «ئەلسەبید» بۆ کرێکارانی دووبارە دەکاتەوە کە «پارچە پارچە بوونو بەربەرەکانەی یەکتری، تێکیان دەشکێنێو بەرەو دوا یانگێرێتەوەو ماوەیەکی زۆرتریش بە ماف خوراوی دەمێننەوە» چونکە «بەبێ هاوکاری یەکتری ئەو مافانەیان دەستگیر نابێ»و دەبێ لە پێناوی «پەرژەوەندی ناوکۆییاندا بەرگری بکەن» و «هەوڵ بدەن یاسایەکی نوێ.بۆ پاراستنیان بهێننە دیو ئەوەندەی لە تواناداهەیەو لەسایەی ئەم رژێمە کۆمەلایەتییەدا کە بە زۆر بەسەرماندا سەپاوە، مافەکانیان بپارێزن...».[٥٢٦]

گرووپی «الأهالی»[٥٢٧] کە دەستەیەك ڕۆشنبیری هەڵبژاردەی ئەو قۆناغەی عیراقی تێدا کۆبووبووەوە، لە هەموو توێژە کومەلایەتییەکانی تر، زۆرتر بە تەنگ مەسەلەی کرێکارانەوە بوو.[٥٢٨] ئەم گرووپە داوایان لە لاوان دەکرد چاو ببڕنە

«چینی ڕەش و ڕووت»، چونکە «شایانی خزمەت کردنە»و «میللەت لەو پێکهاتووە»، وەك ڕۆژنامەی «الأهالی» کە زمانی حاڵی ئەم گرووپە بوو نووسیویەتی.[٥٢٩] ئەم بۆچوونەوە ڕۆژنامەی ناوبراو لە ڕۆژنامەکانی‌تر زۆرتر بایەخی بە کرێکاران‌و گیروگرفتەکانیان دەدا. لەیەکەم ژمارەی‌دا بڵاوی کردووەتەوە کە «بە زۆریی بایەخ بە کاروباری لاوان‌و کرێکاران‌و ئافرەتان دەدا»و نرخی ڕۆژنامەکەیش بۆ کرێکاران‌و قوتابیان ١٠٪ی لێ دادەشکێنرێ.[٥٣٠] بەشێکی ڕۆژنامەکەیشی بۆ چارەسەر کردنی کاروباری کرێکاران تەرخان کرد بوو؛ بە شێوازێکی نوێ‌یش کەوتە بڵاوکردنەوەی بابەتی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ پەیوەندی‌یان بە «کرێکاری بێ ئیش»ی ناو «شاری دەرۆزە»[٥٣١] وە هەبوو. داوای لە ڕژێمیش کرد یاسایەکی سەر بەخۆ بۆ کرێکاران دابنێ تا لە سایەی‌دا «قورسایی کۆمپانیا بیانی‌یەکان» لەسەر شانی کرێکاران کەم بێتەوەو پێشنیاز یشی کرد، پرۆژەی دروستکردنی خانوبەرە بۆ کرێکاران ئەنجام بدرێ‌و کارێك بکرێ کرێکاری بێ ئیش دەستەبەر بکرێ. ئەمە جگە لەوەی‌چەندین ووتاری وەرگێردراوی لەبارەی کرێکارانەوە بڵاوکردەوە.[٥٣٢]

هەڵوێستی دڵسۆزانەی گرووپی «الأهالی» وای کرد، لە ڕۆژانی سەربەخۆیی وولات‌داو لە پێش چاوی سەرکردایەتی کرێکاران بوونە باشترین هێزی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی.[٥٣٣] بەڵام لەگەڵ ئەوەیش‌دا نەیتوانی لەو ڕۆژگارەدا ڕۆڵێکی دیار لە سەرکردایەتی کردنی بزووتنەوەی کرێکاران‌دا بگێرێ. ئەو مەسەلانەی گرووپی ناوبراو بایەخیان پێ دەدا، با گرنگیش بووبن، بێجگەلەوەی ئاوات‌و ئامانجی کرێکارانی دەرنەدەبڕی، لە چاو بزووتنەوەی ئەو قۆناغەی کرێکاران‌دا شتێکی ئەوتۆ نەبوون. لێرەدا باشتر وایە دەست بۆ ئەو نامیلکەیە درێژ بکەین کە ئەو گرووپە لەژێر ناونیشانی «میللی‌یەت - ئەو باوەڕەیە - الأهالی - هەولی وەدەست هێنانی دەدا»[٥٣٤] بڵاوی کردەوەو تییدا

پەیڕەوەکەی خۆیانی دەست نیشان کردو بە بەڵگەنامەیەکی گرنگ دادەنرێ. ئەو نامیلکەیە هەر چەندەپێ لەسەر چارە سەرکردنی کێشە سیاسی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتی یەکان دادەگرێ «بە شێوەیەك خۆشگوزەرانی‌و پێشکەوتن‌و دڵنیایی بۆ کۆمەڵ - کۆمەڵی عیراق. ك. م. «تیدا بێ، کەچی ئیشارەتێکی ڕاستەوخۆی بۆ چینی کرێکاران‌و مەسەلەکانی ئەو چینە تێدا نی‌یە. بەهەرحاڵ دەتوانرێ ڕادەی بایەخ‌دانی گرووپی «الأهالی» بە چینی کرێکارانی عیراق لە ناوەرۆکی ماددەی شەشەمی پرۆگرامی «کۆمەڵەی ریفۆرمی

میللی»دا[٥٣٥] دەربهێنرێ کە چوار ساڵ دوای کۆتایی هاتنی ئینتداب داڕێژرا بوو. دەقی ئەو ماددەیە داوا دەکا هەوڵ بدرێ «یاسایەك دابنرێ، کرێکاران بپارێزێ بەرەو پێشەوەیان بەرێ‌و مافەکانیان دابین بکاو ماوەی ئیش کردنی رۆژانەیان بکا بە هەشت سەعات‌و پشتگیریی کۆمەڵەی کرێکاران‌و نیقابەکانیان بکاو رادەی هەرە کەمی ی رۆژانە دیاری بکا».

لە دوا دوای سەردەمی ئینتداب‌دا، دەستەیەك لە رۆشنبیرانی عیراق کەوتبوونە ژێر کارتێکردنی ئەو حزبە لیبرالی‌یە رۆژئاواییانەوە کە ناوی کرێکارانەیان لە خۆیان نابوو،[٥٣٦] لە بواری سیاسیش‌دا چەند سەرکەوتنێکیان وەدەست هێنا بوو. ئەم مەسەلەیە لە لایەن رۆژنامەکانی عیراقەوە، بە رۆژنامە کرێکاری یەکانیشەوە[٥٣٧] بایەخێکی لە ئەندازە بەدەری پێ درا. تا حاڵ گەیشتە ئەوەی رۆژنامەی «العالم العربي» لەو سەر ووتارەی‌دا کە بە بۆنەی ماوە پێ‌دانی «کۆمەڵەی سنعاتکاران»ەوە بڵاوی کردەوە، نیمچە بەراوردێکی لە نێوان «پارتی کرێکارانی بەریتانیا» وکرێکارانی عیراق‌دا کرد.[٥٣٨]

وا پێ دەچێ برێك لەو رۆشنبیرانە هەوڵیان دابێ لە گەرمەی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق‌دا هەمان ئەو رێبازە بگرنەبەر کە لە رۆژئاوادا پەیڕەو دەکرێ‌و پارتێکی سیاسی بە ناوی کرێکارانەوە دابمەزرێنن. ئەوەتا لە ١٤ی مارتی ساڵی ١٩٣١دا «سەعەددین‌زیادە»ی پارێزەر لەگەڵ «دەستەیەك لاوی پێگەیشتووی مووسڵ» داوایەکیان پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆ کرد تا رێگایان بدرێ «پارتی کرێکاران» دابمەزرێنن. چونکە «نەبوونی پارتێکی سیاسی خاوەن پلانی ژیرانەو بناغەیەکی پتەو و بۆ گەیاندنی گەل بە ئاوات‌و ئامانجەکانی» بۆ شایی‌یەکی سیاسی ی گەورەی دروست کردووە، وەك لەدەقی داواکەیاندا نووسراوە.[٥٣٩] ئەو ئامانجەیش کە پەیڕەوەکەی دیاری کردبوون، سروشتی چینایەتی ئەو پارتە دەردەخەن. ئەوەتا پەیڕەوی بنچینەیی ئەو پارتە کرێکاری‌یەی نیازبوو دابمەزر ێنرێ بریتی یە لە:

«آ: هەوڵ بدرێ بۆ ئەوەی عیراق سەربەخۆیی تەواوو راستەقینە وەربگرێ.

ب: هەوڵ بدرێ ئاشتی‌و برایەتی یەکی سەرومڕ نە نێوان عیراق‌و دەوڵەتە دراوسێ‌و[٥٤٠] بیانی یەکان‌دا بەرکەماڵ‌بێ.

ج: هەوڵ بدرێ خوێندن فێربوون بکرێتە گشتی ی.

د: بەرهەمی خۆولاتی رەواجی پێ‌بدرێ.

هـ: کاروبارەکانی میری بخرێتە ژێر چاودێری یەوەو بەرگری لە

پەرژەوەندی‌یەکانی گەڵ بکرێ.
و: بەرهەڵستی کردنی ئەو بیروڕایانەی زیان بە یەکێتی‌ی عیراق‌و نەتەوەی عەرەب دەگەیەنن.
ز: دابین‌کردنی مافی کرێکاران‌و پێشخستنی باری ئەدەبی‌و تەندروستی‌و گوزەرانیان‌و هەوڵ بدرێ یاسای پێویست بۆ مسۆگەر کردنی ئەمانە دابنرێ.
ح: هەوڵ‌دان بۆ ئەوەی گیانی یارمەتی لەناو ئەندامانی حزب‌دا بڵاو بکرێتەوەو بە هەموو شێوەیەکیش بەرگری لە مافەکانیان بکرێ.»[٥٤١]

ئەوی راستی‌ی بێ، ئەم هەنگاوەیش جیاوازی‌یەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەو هەوڵ‌و تەقەللایەدا نەبوو کە هەر لەو کاتەدا «یاسین ئەلهاشمی» بۆ دەست بەسەراگرتنی بزووتنەوەی کرێکاران‌و بەتایبەتی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» کردی. بۆیە ئەمیش لە لایەن کرێکاران‌و شەخسی «محەممەد ساڵح ئەلقەزاز»ەوە بایەخی پێ نەدرا، ئەمە لە کاتێکدا پێشنیازیان کرد «ئەلقەزاز» ببێتە سکرتێری ئەو پارتەی نیازیان بوو پێکی بهێنن.[٥٤٢] چاك وایە لێرەدا دەست نیشانی ئەو حەقیقەتەیش بکەین کە حزبی «الاخاء الوطنی» لەو کاتەدا لە ناو دەستەو تاقمە سیاسی‌یەکانی ئەو سای «مووسڵ»دا دەست‌و دەسەلاتێکی گەورەی هەبوو.

واپێ دەچێ ئەوانەی داوای پێکهێنانی «پارتی کرێکاران» یان کردبوو، بەوە تاوانبار کرابن گوایە سەر بە لایەنێکی سیاسی کراون، بۆیە بەو جۆرە بەرگری‌یان لە خۆیان دەکرد و دەیان ووت: «بە داخەوە هەندێ کەس خراپ لەنیازو مەبەستی دامەزراندنی ئەم پارتەتێ گەیشتووەو بە شێوەی جۆر بە جۆر لێکی دەدەنەوە. بەڵام ئێمەبەم بۆنەیەوە، بە ئاشکرا رای دەگەیەنین کەمەبەست لەدامەزراندنی پارتی کرێکاران، ئەوە نی‌یە بەرهەڵستی حزبێك‌و پشتگیری یەکێکی‌تر بکا».[٥٤٣] دیارە ئەمەیش یەکێك بووە لەو هۆیانەی کاتی خۆی مۆڵەتی ئیش کردنی نەدرێتێ.[٥٤٤]

هەرچۆنێك بێ ئەم بایەخ پێ‌دانە، باشترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی کەلەدوای کۆتایی هاتنی ئینتداب‌و بوونی عیراق بە ئەندامی «کۆمەڵی گەلان»، کرێکاران بوونە هێزێکی کۆمەلایەتی نوێ‌و توانی‌یان خۆیان بەسەر ژیانی رۆژانەی کۆمەڵدا بسەپێنن‌ولە مێژووی بزووتنەوەی کرێکاران‌دا هەنگاوی پێویست بهاوێژن.

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

١ ـ بڕوانە: « الاخاء الوطني » ٢٨ تشرين الاول ١٩٣١.

٢ ـ ژمارەی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی عیراق لە ساڵی ١٩٥٦ دا گەیشتە ١٢ر٨٠٠ کەس، بەو ٤٥ر٢٠ کەسەیشەوە کە خەریکی راکێشانی بۆری نەوت بوون.

٣ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە: E. A. Kinch, OP, cit; P 194.

٤ ـ « نداء العمال » العدد الاول ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠، ص ١٤

٥ ـ بڕوانە چیرۆکی « تیپ رێکخەرەکە » المنضد » ی « عەبدولقادر ئیسماعیل » کە لە رۆژنامەی « البلاد » ی رۆژی ٣٠ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٩ دا بڵاو کراوەتەوە.

٦ ـ A. M. Hamilton, Op, cit P. 139.

٧ ـ بەنموونە: لە هیندستاندا کرێکارانی چنین نزیکەی ٢٥٪ ی تێکرای کرێکارانی پیشەسازي پێك دەهێنن. ( بڕوانە: التركيب الطبقي للبلدان النامية. تاليف مجموعة من العلماء السوفيت. ترجمة الدكتور داود حيدر ومصطفى الدباس ١٩٧٢ ص ١١٠).

٨ ـ دەربارەی ئەوانە، بڕوانە بەشی سێیەم.

٩ ـ Report on the administration of Iraq for the year 1920 P. 29 بۆ زیاتر تێ گەیشتنیش. بڕوانە: بەشی سێیەمی ئەم کتێبە.

١٠ ـ « العالم العربي » ٢٤ آيار ١٩٣٢.

١١ ـ بڕوانە: کۆڤاری « الحاصد » بغداد العدد / ٤ السنة الثانية. ١٤ آب ٩٣٠ ص ١٠.

١٢ ـ هەر ئەو سەرچاوە ل ١٠.

١٣ ـ « العراق » ١٠ تشرين الاول ١٩٢٨.

١٤ ـ بۆ شارەزا بوون لە بیرورای « ئەلقەزاز » لەم بارەیەوە، بڕوانە: « العالم العربي » ٤ حزيران و ١٦ آب ١٩٣٠.

١٥ ـ چاو پێ کەوتنێك لەگەڵ « محەممەد سالح ئەلقەزاز » رۆژی ٩٧٩/٧/٣١.

١٦ ـ بڕوانە هەندێ لە ژمارەکانی رۆژنامەی « العرب » و « تێ گەیشتنی راستی ی » بە کوردي، کە ساڵی ١٩١٨ دەردە چوون. شایانی باسە سێیەکی ئەو بابەتانەو بگرە زیاتریش کە رۆژنامەی « العرب » دوایی بوو بە « العراق » بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کرابوون.

١٧ ـ بڕوانە: « العالم العربي » ١٥ تشرين الثاني ١٩٢٩.

١٨ ـ لە ناو هەموو ئەو بەڵگەنامەو راپۆرتە جۆر بەجۆرانەدا کە بۆ ئامادە کردنی ئەم کتێبە سوودمان لێ وەرگرتووە، باسی مانگرتنی لەو جۆرە نەکراوە.

١٩ ـ بە نمونە، بڕوانە: « مساهمة في كتابة تاريخ الحركة النقابية في العراق، نبذة تاريخية عن حركة العمال النقابية في العراق خلال ربع قرن » مجلة الثقافة الجديدة. بغداد العدد ٣٩ آب ١٩٧٢ ص ١١.
« صادق قدير الخباز. نصف قرن من تاريخ الحركة النقابية في العراق. بغداد ١٩٧١ ص ٣١. « رزاق ابراهيم حسن ص ، تاريخ الطبقة العاملة في العراق.ص ٩ ».
« عبد السلام الناصري ـ ابو نصير. معارك طبقية. منشورات الطريق الجديد. بغداد بلا. ص ٥.

٢٠ ـ بە نموونە بڕوانە: « مساهمة في كتابة تاريخ الحركة النقابية في العراق. الثقافة الجديدة آب ١٩٧٢ ص ١١.
٢١ ـ « عبد السلام الناصري » هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٢ ـ بڕوانە: « ايام من ثورة العشرين في بغداد. ترجمة واعداد الدكتور صالح جواد الكاظم. جريدة « العراق » بغداد ٢٩ حزيران ١٩٧٨.
٢٣ ـ بۆ زیاتر ئاگادار بوون لەو رووداوە بڕوانە: « الدكتور علي الوردي. لمحات من تاريخ العراق الحديث، الجزء الخامس. القسم الاول، ص ١٧٦ ـ ١٨٠ ».
٢٤ ـ بڕوانە: ل.نز كاتلوف. راپەڕینی رزگاریخوازنەی نیشتمانیی ١٩٢٠ لە عیراق، بە زمانی رووسی. ل ١٣٥ ـ ١٢٦ ».
٢٥ ـ « العراق » ٢١ حزيران ١٩٢٢.
٢٦ ـ بڕوانە: « العراق » ١٨ تموز ١٩٢٢.
٢٧ ـ مەبەستمان لەو پیشەوەرە لیبرالی‌یانەیشە کە خۆیان بە خاوەنی مەسەلەی کرێکاران دەزانی.
٢٨ ـ بڕوانە « العراق » ١٥ تموز ١٩٢٢.
٢٩ ـ « العراق » ٢٥ و ٢٧ تموز و ١٢ آب ١٩٢٢ و ١٨ ايلول ١٩٢٤.
٣٠ ـ « العراق » ١٥ ايلول ١٩٢٢ و ١٠ تشرين الاول ١٩٢٤.
٣١ ـ « العراق » ٢٨ ايلول ١٩٢٢ و ٢٤ كانون الثاني و ٧ شباط و ٢٩ تشرين الثاني ١٩٢٤.
٣٢ ـ « العراق » ٢٥ و ٢٧ تشرين الثاني ١٩٢٤.
٣٣ ـ لەو ساڵەدا یەکەم کۆمەڵەی وەرزشی بە ناوی « کۆمەڵەی یەکێتی‌ی تۆپی پێ » وە دامەزرا. بڕوانە: « العراق ٢٣ كانون الثاني ١٩٢٤.
٣٤ ـ الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦ ص ٨٠٥.
٣٥ ـ لە هەندێ سەرچاوەدا « موحی‌ی موجبیل » نووسراوە. بڕوانە: عبد الرزاق مطلك الفهد. تاريخ الحركة العمالية في العراق ص ٩١ » بەڵام راستی یەکەی « موحی‌یەددین محەممەدە » و هەر ئەو کەسەیە کە لەگەڵ « ئەلقەزاز » دا ماوەیەکی دوورو درێژ هەوڵی دامەزراندنی یانەی کرێکارانی‌دا و پاشان بووە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵەی سنعاتکاران. بڕوانە « العالم العربي » ٣١ تموز ١٩٢٩.
٣٦ ـ هەندێ سەرچاوە وای دادەنێن کە ئەو هەوڵە هەر کرێکارانی رێگای ئاسن داویانە. بڕوانە: « رزاق ابراهيم حسن. تاريخ الطبقة العاملة في العراق ص ٩٥ » « صادق قدير الخباز. نصف قرن من تاريخ الحركة النقابية ص ٣١ ».
٣٧ ـ چاو پێکەوتنێك لەگەڵ « محەممەد سالح ئەلقەزاز » دا رۆژی ٩٧٩/٧/٣١.
٣٨ ـ « کوپەرمان » ی مێژوو نووسی سۆڤیەتی‌یش دەست بۆ ئەم رووداوە درێژدەکا. بڕوانە « م. کوپەرمان بزووتنەوەی کرێکاران لە عیراقدا. گۆڤاری ـ رۆژهەڵاتی شۆڕشگێڕ بە زمانی رووسی. مۆسکۆ. ژمارە ـ ٦ ـ ساڵی ١٩٤٣ ».
لە گۆڤاری « الثقافة الجديدة » ی ژمارە ـ ٢٤ ـ ی مانگی ئایاری ١٩٧١ دا و لە سەر لاپەرەکانی ٩٧ ـ ١٠٦، دەقی ئەو ووتارە کرابووە عەرەبی‌ی و بڵاو کرابووەوە.
چاو پێکەوتنێك لەگەڵ « محەممەد سالح ئەلقەزاز » دا رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٢.
٣٩ ـ چاوپێ کەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ « محەممەدسالح ئەلقەزاز » دا.
٤٠ ـ بە نموونە، بڕوانە: « العراق » ١٠ تشرين الاول ١٩٢٨.
٤١ ـ بڕوانە « العراق » ٣١ آيار ١٩٢٧.
٤٢ ـ ئەو ووتانە لە رۆژنامەی « العراق » ی رۆژی ٢٥ ی ئایاری ١٩٢٧ وە، رگیراوە.
٤٣ ـ هەموو ئەوانەی لەبارەی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراقەوە شتیان نووسیوە، دەست بۆ ئەد

ڕووداوه درێـژ دەکەن. «محـەممەد سـالح ئەلقـەزاز» یش پێی لێ دەنێ، کەچی هیـچ کـام لە ڕاپۆرتەکانی بەریتانیا و فایلە نهێنییەکانیان و تەنانەت ڕۆژنامەکانی ناوخۆیش شتێکیـان لەو ڕووەوە نەنووسیوە.

٤٤ ـ هەندێ جار بەڕێوەبەرایەتی دە ڕۆژو بگرە زیاتریش مووچەی کرێکارانی دوا دەخست، ئەمەیش دەبووە هۆی ئەوەی کرێکاران وەڕس بێن و ناڕەزایی دەربڕن.

٤٥ ـ چاو پێکەوتنی ڕۆژی ٢٢/٨/٩٧٩ لەگەڵ «محەممەد سالح ئەلقەزاز» دا.

٤٦ ـ بڕوانە: «العراق» ٢٥ حزيران ١٩٢٨.

٤٧ ـ بڕوانە: E. A. Kinch, OP, cit, P.197.

٤٨ ـ دەقی ووتارەکە نووسیویە «داخوازییەک».

٤٩ ـ لەو ووتارەوە، وەرگیراوە کە «ئەلقەزاز» بە بۆنەی تێپەڕ بوونی ساڵێک بەسەر «کۆمەڵەی سنعاتکاران» دا خوێندییەوە.

٥٠ ـ «العالم العربی» ٥ تموز ١٩٣٠.

٥١ ـ بڕوانە «العراق» ١٠ تشرين الاول ١٩٢٨.

٥٢ ـ بڕوانە «العالم العربی» ٢٨ تشرين الاول ١٩٣٠.

٥٣ ـ بڕوانە «الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦ ص ٨٢٧» بە پێی هەندێ سەرچاوە «کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان» لەو مێژووە کەمێک دوا کەوت. بڕوانە: «الاستقلال» ١٩ مارت ١٩٢٩. «عبد الرزاق مطلك الفهد. تاريخ الحركة العمالية في العراق. ص ١٣٤» بە هەرحاڵ ئەمە یەکەمین کۆمەڵەیە کە بە ڕەسمی ماوەی ئیش کردنی پێ درابێ.

٥٤ ـ ئەو نووسەرانەی کە وای دادەنێن گوایە «کۆمەڵەی سنعاتکاران» پێش «کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان» ڕێگای پێ دراوە بە هەڵەدا چوون. بە نموونە بڕوانە «صادق قدير الخباز ـ نصف قرن من تاريخ الحركة النقابية في العراق. ص ٣١».

٥٥ ـ «العالم العربی» ٢٢ ايلول ١٩٢٩.

٥٦ ـ «العالم العربی» ١٩ كانون الثاني ١٩٣٠.

٥٧ ـ بڕوانە «نداء الشعب» ٢ كانون الثاني ١٩٣١. هەندێ سەرچاوەی لە بابەتی ئەوەی «عبد الرزاق مطلك الفهد» وای دادەنێن کە کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیکی عیراق «لە ٢٠ ی کانوونی دووەمدا دامەزراوە نەک لە ٤ ی کانووندا. بەڵام ئەو مێژووەی ئێمە دەست نیشانمان کردووە ڕاستییەکەیە، چونکە دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵە دوای ئەو مێژووە ڕاستەوخۆ داوای لە تێکڕای ئەندامانی کرد و لە ڕۆژنامەکانی ناوخۆدا پێی ڕاگەیاندن کە بەشداری لە هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵەدا بکەن. ئەوەبوو ئێوارەی ڕۆژی ١١ ی کانوونی دووەم ژمارەیەکی زۆر لە کرێکاران لە بینای پەیمانگای زانیاریی لە «حەیدەرخانە» کۆبوونەوەو دەستەی بەڕێوەبەریان هەڵبژارد. دەستەی هەڵبژێردراویش لە ڕۆژی ١٨ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ دا یەکەم کۆبوونەوەیان سازکرد. «بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە: «العالم العربی» ١٠ ز ١٢ و ١٩ كانون الثاني، ١٩٣٠.» لە دە لیلی عیراقیشدا، مێژووی دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە بەڕاستیی نووسراوە.

٥٨ ـ بڕوانه: «العالم العربي» ٣١ كانون الثاني ١٩٣٠.
٥٩ ـ كه ئەوە دەڵێین مەبەستمان ئەوە یە «كۆمەڵەی كرێكارانی میكانیك»ی لێ دەرهاوێژین.
٦٠ ـ ئەنجامی هەڵبژاردنەكە بەم جۆرە بوو: «عەبدولقادر «ناوی باوكی نەنووسراوە» ٧١ دەنگەو «ئیبراهیم حەمدی» ٦٥ دەنگەو «مەنشی زەعروور» ٥٦ دەنگەو «عەبدولحسەین ـ ناوی باوكی نەنووسراوە ـ ٥٤ دەنگەو «عەبدولكەریم ـ ناوی باوكی نەنووسراوە ـ ٥٠ دەنگەو «محەممەدعەلی» ٤٢ دەنگەو «عەبباس ئال ئەلچەلەبی» ٣٦ دەنگیان هێنا بوو. بڕوانە «العالم العربي» ١٢ كانون الثاني ١٩٣٠.
٦١ ـ بۆمان نەلوا تەماشای پەیڕەوی ناوخۆی كۆمەڵە بكەین.
٦٢ ـ بڕوانە «العالم العربي» ١٩ كانون الثاني ١٩٣٠.
٦٣ ـ «العالم العربي» ١٩ كانون الثاني ١٩٣٠.
٦٤ ـ «الاخبار» ٢٠ تشرين الثاني ١٩٣١.
٦٥ ـ بڕوانە ئەو قسانەی سەرۆكی كۆمەڵەی ناوبراو لە ژمارەی یەكەمی ڕۆژی ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠ ی «نداء العمال» دا نووسیویەتی.
٦٦ ـ بۆ شارەزابوون لە ناوەڕۆكی ئەو ڕۆژنامەیە، بڕوانە ئەو بەشەی بۆ چالاكی ی ڕاگەیاندن‌و ڕۆژنامەی كرێكارانمان تەرخان كردووە.
٦٧ ـ ئەوانە قسەی سەرۆكی «كۆمەڵەی كرێكارانی چاپخانەكانی عیراق» «عەبباس حسەین ئال ئەلچەلەبی» یەو لەو كۆبوونەوەیەدا كردی كە لەگەڵ وەزیری ئەشغال‌و هاتوچۆدا ڕۆژی ٢٤ی ئابی ١٩٣٠ پێكی هێناو باسی هەل‌و مەرجی ئیش‌كردنی كرێكارانی چاپخانەكەی ڕێگای ئاسنی كردبوو. بڕوانە «العالم العربي» ١ ايلول ١٩٣٠.
٦٨ ـ بڕوانە: «الاخاء الوطني» ١٩ تموز ١٩٣٢. «ئەلقەزاز» زۆر جار ئەوەی دووبارە كردەوە كە سەرۆكی «كۆمەڵەی كرێكارانی چاپخانەكان» ڕارا بووەو هەڵوێستی چەسپاوی نەبووە. (چاو پێكەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٢ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا).
٦٩ ـ بڕوانە: دەقی پەیڕەوی ناوخۆی كۆمەڵەی سنعاتكاران لە پاشكۆی ژمارە ـ ٢ ـ دا.
٧٠ ـ لەم بەشەدا، جێگایەكی تایبەتی بۆ چۆنیەتی دروست بوونی «كۆمەڵەی سنعاتكاران»و چالاكی‌یەكانی تەرخان دەكەین.
٧١ ـ لەناو «كۆمەڵەی سنعاتكاران»دا چەند لیژنەیەكی سەربەخۆ هەبوون‌و هەریەكەیان نوێنەری پیشەیەك بوون.
٧٢ ـ هەندێ جار ئەلقەزاز بە باوەڕ پێكراوو هەندێ جاریش بە سەرۆك ناو براوە.
٧٣ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ٧ كانون الثاني ١٩٣٠.
٧٤ ـ چاو پێكەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ «محەممەد ساڵح ئەلقەزاز» دا.
٧٥ ـ «ئەلقەزاز» ئەوەی دووبارە كردەوە كە لە ساڵی ١٩٠٥ دا لە دایك بووە نەك لە ١٩٠٤ دا، وەك لە لاپەڕە «٨٩٤»ی دەلیلی عیراقی ڕەسمی‌ی ساڵی ١٩٣٦ دا بە هەڵە نووسراوە. «چاو پێكەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٠ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا».
٧٦ ـ چاو پێ كەوتنێك لەگەڵ «ئیبراهیم عەبدولجەببار ئەلقەزازدا ڕۆژی ١٩٧٩/٩/٨. چاو پێ كەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٠ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٧٧ ـ قوتابخانەی پیشەسازی‌یەكان.
٧٨ ـ سەرەڕای ئەوەی چووەتە ساڵەوەو گۆشەگیرە، تا ئەمڕۆیش بە چاكی‌یی زمانی ئینگلیزیی لە بیر ماوە.
٧٩ ـ لە یەكەم چاو پێ كەوتن‌دا، هەست بە زیرەكی‌ی‌و بیرتیژیی دەكرێ.

٨٠ ـ چوار جار چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەلقەزازدا. بۆ ئاگاداربوون لە مێژووی ژیانی ئەلقەزاز دەتوانرێ تەماشای «الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦؛ ص ٨٩٤» بکرێ. هەروەها «عبدالرزاق فهد المطلك. تاريخ الحركة العمالية في العراق ص ٥٧٠ ـ ٥٧١» ناتوانین لەگەڵ دکتۆری ناوبراودا لەسەر ئەوە رێك بکەوین کە «ئەلقەزاز» بەکرێکار دادەنێ.

٨١ ـ «ئەلقەزاز» دەڵێ: کاتێك کە لە قوتابخانەی پیشەسازییەکان قوتابی بووم، هاتوچۆی یەکێك لەو خزمانەم دەکرد کە لە کارگەی «عەباخانە»و دوایی لە کارگەکانی رێگای ئاسن ئیشی دەکـردو ئەو پیشەیە بووە خولیام. ئەمە جگە لەوەی کە باری ژیانی کرێکاران زۆر کاری لێ کردم بە تایبەتی کە لە کارگەی عەباخانەو رێگای ئاسن تێکەڵیان بووم و لەنزیکەوە شارەزایان بووم. (چاو پێ کەوتنی رۆژی ٣١/٧/١٩٧٩).

٨٢ ـ لە یەکەم چاو پێکەوتندا بۆم روون کردەوە با پیشەوەریش بووبێ، هیچ لە مێژووی خەباتی پڕ شکۆی ئەو کەم ناکاتەوەو رۆڵی ئەو لە بزووتنەوەی کرێکاراندا ناسڕێتەوە، بە پێچەوانەوە، بە دەگمەن ری دەکەوێ مرۆڤ ـ سەربە چینێکی لە کرێکاران بەرەوژوورتر بێ و خۆی بکاتە خاوەنی مەسەلەی ئەوان و بەو دڵسۆزی و پێداگرتنەوە داکۆکییان لێ بکا کە سەرنجی هەموو لایەکی راکێشا. تەنانەت مێژوو نووسی بیانیش رۆڵی گرنگی ئەو هەڵسەنگێنن. بەنموونە بڕوانە. ك. ی. میرسکی، عیراق لە سەردەمێکی شێواو دا. بە زمانی رووسی. مۆسکۆ ١٩٦١ ل ٩٦.

٨٣ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٢٥ كانون الثاني ١٩٣٠.

٨٤ ـ بڕوانە «الاخاء الوطني» ١٦ آذار ١٩٣٤.

٨٥ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە ئەو کوێرەوەرییەی سەرۆکی «کۆمەڵەی کرێکارانی چاپخانەکان» لە «نداء العمال»ی رۆژی ٢٢ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠دا، دەیگێڕێتەوە.

٨٦ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن بڕوانە: «الدكتور محمد سلمان حسن. التطور الاقتصادي في العراق ص٤٦٣ ـ ٤٦٤.

٨٧ ـ «ئەلقەزاز» هەندێ پیاو ماقووڵی «بەسرە»ی لێ دەردەهاوێژێ، چونکە لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ ئەوێ ئەوانە نزیکەی ٤٠٠ روپیە باربووی کۆمەڵەی سنعاتکاریان کرد، لە پێش هەموویـانەوە «عەبدولموحسن چەلەبی ئەلشەمخانی». بڕوانە «العالم العربي» ٥ تموز ١٩٣٠. شایانی بـاسە «عەبدولکازم ئەلشەمخانی» گەورەی ئەو بنەماڵەیە سەرەتـای ژیانی لای ئینگلیـزەکان کـرێکار بووەو پاشان خۆی پێگەیاندووەو بووەتە یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی بەسرە.

٨٨ ـ بە نموونە بڕوانە: «العالم العربي» ٢٠ شباط و ١٢ حزيران ١٩٣٠.

٨٩ ـ بڕوانە «العراق» ١٤ شباط ١٩٣٠. ئێستا «ئەلقەزاز» دان بەوەدا دەنێ کە ئەوە یەکێك بووە لە هەڵەکانی دەستەی بەڕێوەبەر چونکە «نووری فەتتاح پاشا» لە سنوورێکی ئێجگا تەسکدا نەبێ یارمەتی کۆمەڵەی سنعاتکارانی نەداوە، ئەوەیش تەنها لە سەرەتای دامەزراندیدا بوو. «چاو پێ کەوتنی رۆژی ٢٢/٨/١٩٧٩ لەگەڵ ئەلقەزازدا».

٩٠ ـ بڕوانە «الاستقلال» ١٩ مارت ١٩٢٩.

٩١ ـ بڕوانە «جريدة ـ المعارف ـ الاسبوعية» بغداد ١٠ كانون الأول ١٩٢٩.

٩٢ ـ «العالم العربي» ٤ تموز ١٩٢٩.

٩٣ ـ هەرئەوسەرچاوە.
٩٤ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٢٩ كانون الثاني ١٩٣٠.
٩٥ ـ لە بانگەوازێكی كۆمەڵەی كرێكارانی چاپخانەكانەوە، وەرگیراوە كە بە بۆنەی كردنەوەی «چەند پۆلێك بۆ فێر بوونی زانیاری‌یە جۆر بەجۆرەكان، بڵاوی كردووەتەوەو تیایدا رووی دەمی كردەووەتە ئەندامەكانی. بڕوانە «العالم العربي» ٢٠ حزيران ١٩٣٠.
٩٦ ـ ووتاری «شاكرمحەحموود هیلال، لە ئاهەنگێكی كۆمەڵەی سنعاتكاراندا. بڕوانە «المعارف» ١٠ كانون الاول ١٩٢٩.
٩٧ ـ ووتاری لاوێكە لە ئاهەنگی كۆمەڵەی هاریكای سەرتاشان‌داو تیایدا «كرێكارانی عیراق هان دەدا بە تەنگ یەكێتی‌یەكەیلوە بێن‌و لەسەری بەردەوام بن». بڕوانە «العالم العربي ٢٩ كانون الأول ١٩٣٠.
٩٨ ـ ووتارێكی «تۆفیق ئەلسەمعانی» یەو لە كۆبونەوەكەی كۆمەڵەی سنعاتكاراندا خوێندی‌یەوە. بڕوانە «المعارف» ١٠ كانون الأول ١٩٢٩.
٩٩ ـ ووتارێكی «محەممەد عەلی سیدقی» یە لە كۆمەڵەی هاریكاری سەرتاشان‌دا خوێندی‌یەوە. بڕوانە «العالم العربي» ١٤ ايلول ١٩٢٩.
١٠٠ ـ ووتارێكی «ئەحمەد حەقی ئەلحیللی» یە لە كەكۆمەڵەی هاریكاری سەرتاشان‌دا خوێندی‌یەوە بڕوانە «العالم العربي» ١٨ آب ١٩٢٩.
١٠١ ـ لەو ووتارەی «محەممەد سالح‌ئەلقەزاز» وە رگیراوە كە لە ئاهەنگێكی كرێكاران‌دا بە بۆنەی جەژنەوە لە سینەملیەكی بەغدادا سازكرا، خوێندی‌یەوە. بڕوانە «الاستقلال ٢٣ شباط ١٩٣١.
١٠٢ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٢٣ ايلول و ٢٨ تشرين الاول ١٩٣٠.
١٠٣ ـ بڕوانە «العالم العربي» ١٥ آب ١٩٢٩.
١٠٤ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٢٠ آب ١٩٢٩.
١٠٥ ـ جريدة «العامل» بغداد، ٨ ايلول ١٩٣٠. «دەبارەی ئەو رۆژنامەیە، بڕوانە ئەو بەشەی كە بۆ چالاكی‌ی راگەیاندن‌و رۆژنامەی كرێكارانمان تەرخان كردووە».
١٠٦ ـ بڕوانە: «نداء العمال» العدد الأول ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠ ص ٥.
١٠٧ ـ مجلة «الحاصد» بغداد، العدد الثالث، السنة الثانية، آب ١٩٣٠. ص ٦.
١٠٨ ـ نداء الشعب» ٤ تشرين الثاني ١٩٣٠.
١٠٩ ـ «العالم العربي» ١٠ كانون الثاني ١٩٣٢.
١١٠ ـ بڕوانە «نداء العمال» ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠، ص ١١؛ «العالم العربي» ٧ كانون الثاني و ٢٦ آذار ١٩٣٠.
١١١ ـ «ئەلئەشتەری» بە یەكێك لە دیارترین ئەندامی نیقابی‌و ئەو قۆناغە دادەنرێ. لەبەر ئەوەی خاوەنی رۆشنبیری یەكی گشتی‌ی بوو، تارادەیەكی زۆر كاری كردە سەر كۆمەڵەی هاریكاری سەرتاشان، هەر لەبەر ئەوەیش بوو كاروباری لە كۆمەڵەكانی تر رێك وپێك تر ئەنجام دەدا. تەنانەت پەیرەوە بنچینەیی‌و ناوخۆیی‌یە كەی چاپ كردو بەسەر دەستەو تاقمە سیاسی‌یەكان‌و رۆژنامەكانی ناوخۆدا بڵاوی كردەوە. بڕوانە: «العالم العربي» ١٢ حزيران ١٩٢٩. كۆمەڵەی ناوبراو پەیوەندی‌یەكی پتەوی لەگەڵ كۆمەڵەكانی‌تردا بەست. «ئەلئەشتەری» لە بزووتنەوە جۆر بەجۆرەكانی كرێكاران‌دا بەشداری كرد، تەنانەت لە بواری راگەیاندن‌و رۆژنامەی كرێكارانیش‌دا دەوری بینی. ئەلقەزاز بەرێزەوە هەوڵ‌و كۆششی ئەلئەشتەری هەڵدەسەنگێنێ. «چاو پێ كەوتنی رۆژی ١/٨/٩٧٩ لەگەڵ محەحمەد سالح ئەلقەزازدا».

١١٢ ـ «عەبدولڕەحیم ئەلکریتی» کابرایەکی پیشەوەر بوو. بە ڕێکەوت ئەو لەسەر پووڵی ئەرزوحاڵە کە پەنجەمۆر دەکا، بۆیە ئیمتیازی کۆمەڵەی سنعاتکاران بە ناوی ئەوەوە دەردەچێ. ناوبراو خۆی هەڵدەبژێرێ بۆ ئەندامێتی یەکەم دەستەی بەڕێوەبەر بەڵام ئەوەندە دەنگناهێنێ پێی ببێتە ئەندام پاش و ئەوە هیچ پەیوەندی‌یەکی بەکۆمەڵەوە نامێنێ. «چاوپێ کەوتنەکەی ڕۆژی ٢٢/٨/٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزا دا».

١١٣ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٤ تموز ١٩٢٩.

١١٤ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٢٨ ايلول ١٩٢٩.

١١٥ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٢٥ تموز ١٩٢٩.

١١٦ ـ «ئەلقەزاز» زۆر باسی زەبرەکی‌ی‌و خۆ ڕاگرتن‌و لێهاتوویی دەکا. زمانی ئینگلیزی زانیوەو بەردەوام نامەی بۆ دامەزراوەزانیاری‌یەکانی دەرەوەی عیراق دەنووسی «چاو پێکەوتنی ڕۆژی ٢٢/٨/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا».

١١٧ ـ هەر ئەو کەسەیە کە لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا، ساڵی ١٩٢٤ داوای دامەزراندنی یانەی کرێکارانیان کرد.

١١٨ ـ چاو پێ کەوتنی ڕۆژی ٢٢/٨/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا. «العالم العربي» ٣١ تموز ١٩٢٩.

١١٩ ـ «العالم العربي» ١٩ تشرين الاول ١٩٢٩.

١٢٠ ـ «الاستقلال» ٦ و ١٦ شباط ١٩٣١.

١٢١ ـ باشتر وایە پشت بەو دەقە ببەسترێ کە لە ڕۆژنامەکانی ناوخۆدا بڵاوکرایەوە، نەك ئەوەی بە تایپ‌ڕایتەر چاپکراوەو. تا ئێستا لای هەندێ لە ئەندامەکانی ئەوسای کۆمەڵەی سنعاتکاران ماوەتەوە. چونکە گۆڕین‌و دەستکاری کردنی هەندێ ڕستەو بەندی ناو پەیڕەوەکە، ناوەرۆکی هەندێ لەو ماددە بنەڕەتی‌یانەی گۆڕی کە پەیوەندیی بە ئامانجەکانی کۆمەڵەوە هەبوو. دەقە ئەسڵی‌یەکەی پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەی سنعاتکاران لە ڕۆژنامەی «العالم العربي»ی ڕۆژی ٢٨ ی ئەیلوول‌و ٢ تشرینی یەکەمی ١٩٢٩ دا بڵاوکراوەتەوە.

١٢٢ ـ بڕوانە دەقی پەیڕەوەکە لە پاشکۆی ژمارە ـ ٢ ـ ی ئەم کتێبە دا.

١٢٣ ـ تا ئێستایش سەرۆکی کۆمەڵە ئەو مەسەلەیە دووپات دەکاتەوە. «چاو پێ کەوتنی ڕۆژی ٣١/٧/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا».

١٢٤ ـ لەو دەقەدا کە بە تایپ‌ڕایتەر چاپکراوە دەڵێ «کۆمەڵەی سنعاتکاران هەقی بەسەر ناکۆکی سیاسی‌و ئاینی‌یەوە نی‌یەو ئامانجی ئەوەدیە سنعاتکاران لە ڕووی ڕەوشت‌و پیشەسازیی‌و زانیاری‌و کۆمەڵایەتی‌یەوە پەروەردە بکاو نەخوێندەوارەکانیان فێری خوێندن بکاو بیرو باوەڕی بەرز لە ناو ئەندامانی‌دا بڵاو بکاتەوەو بەرگری لە مافەکانیان بکا» بە ئاشکرا دیارە کە ئەوتۆزە دەستکاری‌یە، مەفهوومی ئەو ماددەیەی لە بنەڕەتەوە گۆڕیوە کە بڕبڕەی پشتی پەیڕەوەکەی کۆمەڵەیە.

١٢٥ ـ بڕوانە: «العراق» ١٠ تشرين الاول ١٩٣٠.

١٢٦ ـ بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە: «عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية. الطبعة الثالثة. الجزء الثاني. صيدا ١٩٦٥ ص ٢٩٨ ـ ٣١٦».

١٢٧ ـ بروانه: «العالم العربي» ٢٠ آذار ١٩٣٠.
١٢٨ ـ «ئەلقەزاز» لە چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/١دا دەڵێ: لەسەر ئەوەی کۆمەڵە توخنی مەسەلە سیاسی‌یەکان دەکەوت، رژێم زۆر جار رەخنەی لێ گرتوون، بەڵام ئێمە هەوڵمان دەدا بیانوو بۆ ئەو هەڵوێستەمان بهێنینەوەو سوورببووین لەسەر ئەوەی کە ئەم مەسەلانە لە جەوهەردا ئابوورین.
١٢٩ ـ هەڵەیەکی زمانەوانی‌یە لەدەقەکەدا راستمان کردووەتەوە.
١٣٠ ـ لەو ووتارە وەرگیراوە کە «ئەلقەزاز» بە بۆنەی هەڵبژاردنی دووەم دەستەی بەڕێوەبەردەوە لە رۆژنامەکانی ناوخۆدا بڵاوی کردەوە. بروانە «العالم العربي» ١٦ آب ١٩٣٠. شایانی باسە «ئەلقەزاز» لە یەکەم رۆژی دامەزراندنی کۆمەڵەوە هەر ئەوە قسەی بووە. بروانە «العالم العربي» ٥ تموز ١٩٣٠.
١٣١ ـ لە بەشی پێشوودا باسی چەند لایەنێکی ئەم مەسەلەیەمان کردو دواییش بە درێژیی لە هەندێ لایەنی تری دەدوێین.
١٣٢ ـ ژیانی پڕ لە کوێرەوەریی زەحمەتکێشان هەر لە سەرەتای ساڵانی بیستەوە سەرنجی «مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید»ی راکێشا، بۆیە لە ناوەرۆکی چیرۆکەکانی‌دا ئازارو کێشەی ژیانی ئەوانی دەردەبڕی. «المجموعة الكاملة للقصص محمود احمد السيد، إعداد وتقديم الدكتور علي جواد الطاهر والدكتور عبدالاله احمد، بغداد ١٩٧٨، الدكتور علي جواد الطاهر، محمود احمد السيد، بيروت ١٩٦٩: عبداللطيف عبدالرحمن عبدالمجيد، الفكر الاشتراكي في الادب العراقي ١٩١٨ ـ ١٩٥٨، رسالة دكتوراه، بغداد ١٩٧٦، ص ١٧١ ـ ١٧٥».
١٣٣ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ محەممەد سالح ئەلقەزازدا.
١٣٤ ـ قسەی «مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید»ە. بروانە «المجموعة الكاملة للقصص محمود احمد السيد ص ٢٥٠».

١٣٥ ـ لەو شوێنەدا کە بۆ باسی رۆژنامەی کرێکاران و هەڵوێستی هێزە سیاسی‌یەکان بەرامبەر چینی کرێکارانی عیراق‌مان تەرخان کردووە، دێینەوە سەر ئەم مەسەلەیە.
١٣٦ ـ بروانە «العالم العربي» ٥ تموز ١٩٣٠.
١٣٧ ـ بروانە «العالم العربي» ٧ كانون الثاني و ١٢ آذار و ٥ تموز ١٩٣٠.
١٣٨ ـ بروانە «نداء العمال» العدد الاول ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠ ص ١٥.
١٣٩ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/١ لەگەڵ محەممەد سالح ئەلقەزازدا.
١٤٠ ـ بروانە «العالم العربي» ٥ تموز ١٩٣٠.
١٤١ ـ هەر ئەو سەرچاوە.
١٤٢ ـ بروانە «العالم العربي» ٧ كانون الثاني و ٥ تموز و ٢٣ ايلول ١٩٣٠.
١٤٣ ـ بروانە «الاستقلال» ١٨ شباط ١٩٣١.
١٤٤ ـ سەیر ئەوەیە لەو رۆژگارەدا خانەی مامۆستایان و قوتابخانەی ناوەندیی کچان فێر بووبوون لە ١ی ئایاردا ئاهەنگێکی تایبەتی‌یان دەگێڕا بە ناوی «ئاهەنگی یەکی ئایار»ەوە. بروانە: «العراق» ٣ آيار ١٩٢٧.
١٤٥ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ محەممەد سالح ئەلقەزازدا. مجلة «وعي العمال» بغداد العدد ٥١١، ٢٨ نيسان ١٩٧٩، ص ٣٦، ٣٧.
١٤٦ ـ هەندێ جار کۆمەڵە بێ ئەوەی جیاوازیی بکا، مووچەی تەواوی بۆ کرێکاری بێ ئیش دەبڕییەوە. بروانە «العالم العربي» ٩ تموز ١٩٣٠.

١٤٧ ـ كۆمەڵەی ناوبراو لەگەڵ دکتۆر فایەق‌شاکردا بۆ ئەم مەبەستە پێکهات. شایانی باسە دکتۆری باسکراو نوێنەری دلێم‌بوو لە پەرلەمان‌داو هەرئەویش‌بوو کاتی خۆی‌یەکەم پرۆژەی یاسای کرێکارانی پێشکەش پەرلەمان کرد. بڕوانە «الاستقلال» ١٩ آیار ١٩٣٠. محاضر مجلس النواب لسنة ١٩٣٠ الاجتماع الاعتيادي. «ئەلقەزاز» ئەوەی دووپات کردەوە کە دکتۆر فایەق بەپێی خۆی دەهاتە بارەگای کۆمەڵەو نەخۆشەکانی چارەسەر دەکرد. «چاوپێ کەوتنی رۆژی ٨/٩/١٩٧٩ لەگەڵ ئەلقەزازدا».

١٤٨ ـ بڕوانە «نداء الشعب» ٢٩ كانون الأول ١٩٣٠.

١٤٩ ـ بڕوانە «الاستقلال» ٤ آذار ١٩٣١.

١٥٠ ـ چاوپێ‌کەوتنی رۆژی ٢٢/٨/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.

١٥١ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ٣٠ نيسان ١٩٣٠. «الاستقلال» ٣٠ نيسان ١٩٣٠.

١٥٢ ـ بڕوانە: جريدة «السياسة» بغداد ٤ آذار ١٩٣١.

١٥٣ ـ ئەو بیرۆیە وەك دەزگایەكی سەر بە كۆمەڵی گەلان لە ساڵی ١٩٣٢ دا، دامەزرا.

١٥٤ ـ بۆ زیاتر تێگەیشتن بڕوانە «وثائق ومراسلات بين نقابات العمال العراقية ومثيلاتها الاجنبية من سنة ١٩٣٢ الى سنة ١٩٣٥» [مكتبة المجمع العلمي العراقي].

١٥٥ ـ دەربارەی ئەم مەسەلەیە، بڕوانە بەشی سێیەم کە بۆ یاسای کرێکاران تەرخان کراوە. هەروەها بڕوانە «المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفه: ص ٣/٥، موضوع [illegible]. العمال وما يتعلق بهم ١٩٣١».

١٥٦ ـ بڕوانە «وثائق ومراسلات بين نقابات العمال العراقية ومثيلاتها الاجنبية من سنة ١٩٣٢ الى سنة ١٩٣٥». الوثيقة رقم ـ ١ ـ.

١٥٧ ـ هەر ئەو سەرچاوە. «الوثيقة رقم ١».

١٥٨ ـ هەر ئەو سەرچاوە. «الوثيقة رقم ٣».

**١٥٩ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٩ كانون الاول ١٩٣٠.**

**١٦٠ ـ بڕوانە «وثائق ومراسلات بين نقابات العمال العراقية ومثيلاتها الاجنبية من سنة ١٩٣٢ الى سنة ١٩٣٥. الوثيقتان رقم ٥ و ٦».**

**١٦١ ـ چاو پێ‌کەوتنی رۆژی ٣١/٧/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.**

**١٦٢ ـ «النقابي الأول يتذكر. مجلة وعي العمال العدد ٥١١، ٢٨ نيسان ١٩٧٩ ص ٣٧».**

**١٦٣ ـ چاو پێ‌کەوتنی رۆژی ٣١/٧/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.**

**١٦٤ ـ «المعارف» ١٠ كانون الأول ١٩٢٩.**

**١٦٥ ـ دکتۆر «عەبدولەرزاق موتلەك ئەلفەهد» لای وایە «سەلیم ئەلمیسری» لە رۆژی ٢٠ شوباتی ١٩٣٠دا داواری لە وەزارەتی ناوخۆ کرد رێگای بدەن کۆمەڵەی کرێکارانی میکانیك دابمەزرێنێ. بڕوانە: لاپەرە ـ ١١٤ ـ ی نامەی دکتۆراکەی.**

**١٦٦ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٣١ كانون الثاني و ١ شباط ١٩٣٠.**

**١٦٧ ـ «عبدالرزاق مطلك الفهد. تاريخ الحركة العمالية في العراق. ١٩٢٢ ـ ١٩٥٨. ص ١١٥».**

**١٦٨ ـ چاوپێ‌کەوتنی رۆژی ٣١/٧/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەدساڵح ئەلقەزازدا.**

**١٦٩ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ٨ تشرين الثاني ١٩٣٠.**

١٧٠ ـ چاو پێکەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
١٧١ ـ بەنموونە، هەمیشە ئەوەیان دووبارە دەکردەوە گوایە «ئەلقەزاز» مەبەستی تایبەتی خۆی هەیەو دەیەوێ بەهۆی ئەوانەوە پێ‌ی بگا.
١٧٢ ـ چاو پێکەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٨/١ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
١٧٣ ـ بڕوانە «العالم العربي» ٢٩ تشرين الأول ١٩٣٠.
١٧٤ ـ چاو پێکەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ ئیبراهیم عەبدلجەببار ئەلقەزازدا.
١٧٥ ـ «الحاصد» العدد ٢٧، السنة الثانية، ٢١ كانون الثاني ١٩٣١ ص ١١.
١٧٦ ـ بڕوانە «الاستقلال» ٢١ نيسان ١٩٣١.
١٧٧ ـ «العراق» ٢٧ و ٢٨ نيسان ١٩٣١، «الاستقلال» ٢٧ نيسان ١٩٣١.
١٧٨ ـ «الاستقلال» ٢١ نيسان ١٩٣١. «ئەلقەزاز» یش هەمان شت دووبارە دەکاتەوە.
١٧٩ ـ «چاو پێکەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٩/٨».
بڕوانە «صدى العهد» ٢١ تموز ١٩٣١، «العراق» ١ و ٦ آب و ٢ ايلول و ٣ تشرين الأول ١٩٣١.
١٨٠ ـ «العالم العربي» ٢٠ آب ١٩٣٠.
١٨١ ـ لەو باسانەی پێشەوەدا دەستمان بۆ چەند نموونەیەکیان ڕاکێشا.
١٨٢ ـ لە ناوەڕاستی ساڵانی بیستەوە کۆمەڵەو یانە عیراقی‌یەکان بایەخیان بە ڕۆژنامە دا، هەندێکیان ڕۆژنامەو بڵاوکراوەی تایبەتی‌یان دەردەکرد، وەك «المجلة الطبية البغدادية» کە کۆمەڵەی پزیشکی‌ی لە ١ ی حوزەیرانی ١٩٢٥ دا یەکەم ژمارەی دەرکردو گۆڤارە مانگانەکەی «المحامي»ی کە ژمارەی یەکەمی لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا دەرچوو، ئەمە جگە لە ڕۆژنامەی «الارشاد»ی هەفتانە کە یانەی «الارشاد» دەری دەکردو یەکەم ژمارەی لە ٥ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ دەرچوو.

١٨٣ ـ لەو سەردەمەدا ڕۆژنامە ڕەخنەیی‌و کۆمیدی‌یەکان ناوو شۆرەتێکی گەورەیان هەبوو، ڕۆژنامەی «صدى الحقائق» یش ڕۆژنامەیەکی گشتی‌ی بوو، خۆی لەمەسەلەی کرێکاران نەدا.
١٨٤ ـ بڕوانە «فائق بطي. الموسوعة الصحفية العراقية. بغداد ١٩٧٦ ص ١٠٠».
١٨٥ ـ «نداء العمال» العدد الأول، ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠ ص ١.
نەمانتوانی چاومان بە ژمارەکانی «التعاون» بکەوێ، چونکە لە کتێبخانەکاندا نین. وەك هەندێ سەرچاوە دووپاتی دەکەنەوە ئەو ڕۆژنامەیە لە دوای ژمارە (٤) لە ئارادا نەماو لەبەر چاو وون بوو. بڕوانە «عبدالرزاق الحسني. تاريخ الصحافة العراقية، ص ١٢١؛ زاهدة إبراهيم، كشاف الجرائد والمجلات العراقية، بغداد، ١٩٧٦ ص ٤٨». کەچی هەندێ سەرچاوەی تر وای رادەگەیەنن کە دوای ژمارە «٥» لەکار کەوتووە. بڕوانە «حميد جاعد، الصحافة العمالية، نشاتها مهامها، اهميتها ـ مجلة العامل المعاصر ـ بغداد، العدد السابع، ١٩٧١ ص ٢١» بە پێ‌ی ئەو زانیاری‌یانەیش کە لە کتێبەکەی ـ زاهیدەئیبراهیم ـ دا نووسراون، ژمارە ١ ـ ٤ ی «التعاون» لە کتێبخانەی «عەزیزئیسماعیل»دا لە «مووسل» دەست دەکەون.
١٨٧ ـ بە نموونە بڕوانە: «سليم طه التكريتي! الصحافة العمالية في العراق وما رافق ظهورها من ملابسات سياسيه ـ مجلة العاملون في النفط، بغداد، العدد ١٠٠ تشرين الأول ١٩٧٠ ص ٢٢، «قيس عبدالحسين الياسري، الصحافة العراقية والحركة الوطنية من نهاية الحرب العالمية الثانية حتى ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، بغداد ١٩٧٨ ص ١٥٨ ـ الهامش رقم ٦».
١٨٨ ـ بڕوانە «زاهدة إبراهيم، كشاف الجرائد والمجلات العراقية ص ٢٧٥».
١٨٩ ـ «ئەلقەزاز» بیری نایە گۆڤاری «الصنائع» چ ڕۆژێك دەرچووەو ژمارەکانیشی بە هۆی چەندین جار پشکنینی ماڵەکەیەوە، لە ناو چوون.

١٩٠ ـ «العالم العربي» ١٠ تموز ١٩٣٠.
١٩١ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
١٩٢ ـ «ئەلقەزاز» دەڵێ «محەممەد مەکی ئەلئەشتەری» لەو سێ ژمارەیەی «الصنائع» دا، چەندین ووتاری بڵاو کردووەتەوە.
١٩٣ ـ لەو کاتەدا «عەبدلقادر ئەلسەییاب» ئەندامی حزبی «الوطني»ی «ئەبولتممەن» بووە.
١٩٤ ـ چاوپێ کەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/١ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
١٩٥ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٧/٣١.
١٩٦ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/١.
١٩٧ ـ چاو پێ کەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٢.
١٩٨ ـ «العامل» بە شێوەو قەوارەی گۆڤار دەر دەچوو. بەڵام وەك رۆژنانەیەك خۆی بە خوێنەران ناساند. هەیە «العامل» بە گۆڤارێکی هەفتانە دادەنێ. بڕوانە «سلیم طه التکریتي. الصحافة العمالية ص ٢٢».
١٩٩ ـ «العالم العربي» ١٣ آب ١٩٣٠.
٢٠٠ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٢ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٢٠١ ـ ئەو تاقە ژمارەیەی لە کتێبخانەکەی «کۆڕی زانیاری عیراق دا پارێزراوە، بریتی‌یە لە «١٨» لاپەڕەو لەوە دەچێ تاتەواو بێ. ئەوانەی لەسەر ئەم رۆژنانەیەیان نووسیوە سوورن لەسەر ئەوەی کە ژمارەی یەکەمی ٢٤ لاپەڕە بووە. بڕوانە: «سلیم طه التکریتي، الصحافة العمالية في العراق، ص ٢٢».
٢٠٢ ـ «العامل» بغداد، مطبعة الآداب، العدد الأول ٨ أيلول ١٩٣٠. تەنها ژمارە ـ ١ ـی ئەم رۆژنامەیە لە کۆڕی زانیاری عیراق پارێزراوە.
٢٠٣ ـ «مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید»ی چیرۆك نووسە.
٢٠٤ ـ دروشمی «ئەی کرێکارانی جیهان یەککرن» لە ناوەڕاست داو بە خەتێکی کەورە نووسراوە.
٢٠٥ ـ «ئەلسەیید» کە ووتاریشی دەخوێنەوە هەر بەو شێوەیە رووی دەمی لە کرێکاران دەکرد، بۆیە لە قۆناغێکی دیاری کراوی دروست‌بوون‌و کەشەکردنی ئەو بیروباوەڕەدا جێگایەیەکی تایبەتی هەیە.
٢٠٦ ـ هەموو ئەو نووسەرە عیراقی‌یانەی باسی رۆژنامەی «العامل»یان کردووە، ئەم حەقیقەتە دەخەنە روو. بڕوانە «حمید جاعد، الصحافة العمالية، ص ٢٠ ـ ٢١» «قیس عبدالحسین الياسري، الصحافة العراقية والحركة الوطنية ص ١٥٨».
٢٠٧ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ١٠ أيلول ١٩٣٠، «الحاصد» العدد ٨ السنة الثانية» ١١ أيلول ١٩٣٠ ص ١٤.
٢٠٨ ـ بڕوانە «عبدالرزاق الحسني، تاريخ الصحافة العراقية ص ١٢١».
٢٠٩ ـ بڕوانە «عبدالرزاق مطلك الفهد، تاريخ الحركة العمالية في العراق ص ١٣٩».
٢١٠ ـ «نداء العمال» بە شێوەو قەوارە، وەك گۆڤار دەردەچوو، بەڵام وەك لە لاپەڕەی یەکەمدا نووسیبووی بە شێوەی رۆژنامە خۆی ناساندو لەناو بابەتە بڵاوکراوە کانیش‌دا زۆر جار دەستی بۆ ئەوە راکێشاوە کە رۆژنامەیە.

٢١١ ـ ڕۆژی دوایی ڕۆژنامەکانی ناوخۆ هەواڵی دەرچوونی ئەو ڕۆژنامەیەیان بڵاوکردەوە. بڕوانە: «العالم العربي»، ١٠ ایلول ١٩٣٠.

٢١٢ ـ «نداء الشعب» ٢٣ تشرين الثاني ١٩٣٠.

٢١٣ ـ پارێزەر «تەوفیق ئەلفکێکی» بەڕێوەری لێپرسراوی ئەو ڕۆژنامەیە بوو.

٢١٤ ـ «نداء العمال» العدد الاول، بغداد، السبت ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠.

٢١٥ ـ نووسەرو ئەدیبە.

٢١٦ ـ بریتی‌یە لە دوو، وێنە. یەکەمیان. «پایەبەرز عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدوونە کە بووە قوچی قوربانیی وولات. بە بۆنەی یتپەڕ بوونی ساڵێک بەسەر ئەو کۆستەدا کە دەرسی خۆ بەختکردنە لە پێناوی نیشتماندا» دووەمیان: وێنەی: ئەو شاهەنگەیە کە پارێزەران بەو بۆنەیەوە گێڕاویانە.

٢١٧ ـ هەر وەك لە سەرەتای ئەم بەشەدا باس کرا، خاوەنی ڕۆژنامەی «نداء العمال» کە «عەبباس حسەین ئال ئەلچەلبی» بوو، لە سەرەتای ژیانی بەکردەوەیەوە، بایەخێکی زۆری بە ڕۆژنامە دابوو.

٢١٨ ـ «نداء العمال» العدد الاول، ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠ ص ١.

٢١٩ ـ «نداء العمال» العدد الاول، ص ١ ـ ٢.

٢٢٠ ـ «نداء العمال» العدد الاول، ص ٢.

٢٢١ ـ ئەو عیبارەتە لەسەر دوا لاپەڕەی ڕۆژنامەکە نووسرابوو.

٢٢٢ ـ ڕۆژنامەکە لە کۆتایی یەکێك لە گرنگترین ئەو ووتارانەی‌دا کە بۆ کێشەی کرێکارانی چاپخانە نووسیبووی. دەڵێ: «ئێمە نامانەوێ خاوەن چاپخانەکان کرێکار بەو مێرووە دانەنێن (؟) کە میکروبی کوشندە بڵاو دەکاتەوە، تاوەکو بەو دڵرەقی‌یە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ‌دا بکەن، کەچی بە ئاشکرا دیارە مەبەستیان تەواو بە پێچەوانەی ئەو قسەیەوەیە. بڕوانە: «نداء العمال» العدد الاول. ص ١٥.

٢٢٣ ـ عبدالرزاق الحسني، تاريخ الصحافة العراقية، ص ١٢١ ـ ١٢٢. فائق بطي، الموسوعة الصحفية العراقية، ص ١١٤. زاهدة ابراهيم، كشاف الجرائد والمجلات العراقية، ص ١٧٣.

٢٢٤ ـ عبدالرزاق مطلك الفهد، تاريخ الحركة العمالية في العراق، ص ١٤٢.

٢٢٥ ـ یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی «العمال» لە کتێبخانەی «کۆڕی زانیاری عیراق» دا پارێزراوە.

٢٢٦ ـ هەرگیز لەگەڵ ڕای نووسەری «الصحافة العمالية في العراق»دا ڕێ ناکەوین کە ڕۆژنامەی «نداء العمال»ی بە تەواوکەری ڕۆژنامەی «العمال» لەقەڵەم داوەکە لە «مووسڵ» دەردەچوو. بڕوانە: «رزاق إبراهيم‌حسن. الصحافة العمالية في العراق ص ٢٢».

٢٢٧ ـ «سەعدەددین زیادە»ی پارێزەر ڕۆژی ١٥ی ئاداری ساڵی ١٩٣١ داوای لە وەزارەتی ناوخۆ کرد مۆڵەتی ڕۆژنامەکەی بدرێ.

٢٢٨ ـ ڕۆژنامەی «العمال» لە چاپخانەی «الشعب» لە مووسڵ چاپ دەکرا. لە کاتی خۆی‌دا ڕۆژنامەکانی ناوخۆ هەواڵی دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیەیان بڵاوکردەوە بڕوانە: «العراق» ٨ ایلول ١٩٣١.

٢٢٩ ـ ڕەنگە خاوەنی ئەو ڕۆژنامەیە پەیوەندی ناڕاستەو خۆی بە سەرکردەکانی کرێکاران و پیشەوەرانەوە بووبێ، بەڵام ئەو پەیوەندی‌یە لەوە تێپەڕی نەکردووە کە هێزەکانی تری ئەپۆزیسیون لەگەڵ کرێکاران‌دا بوویانە.

٢٣٠ ـ چاو پێکەوتنی ١٩٧٩/٨/١ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.

٢٣١ ـ لەو شوێنەدا کە باسی هەڵوێستی هێزە سیاسی‌سەکان دەکەین بەرامبەر بە چینی کرێکارانی عیراق، دێینە سەر، سە ووتاری یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی «العمال»، چونکە سەرتاپا پەیوەندیی بە پەیڕەوی حزبی «العمال»ەوە هەیە کە چەند ڕۆشنبیرێکی مووسڵ دەیانویست دای بمەزرێنن.



٢٣٢ ـ دەقی ووتارەکە چۆن نووسراوە، بە بێ دەستکاری دە بنووسینەوە.

٢٣٣ ـ لە کۆتایی ساڵانی بیست و سەرەتای ساڵانی سیدا بەهۆی ئەو تەنگو چەڵەمە ئابووری یەی جیهانی گرتبووەوەو کاری راستەوخۆی لە بازارەکانی عیراقیش کردبوو، نرخی دانەوێڵە بەرادەیەکی زۆر هاتبووە خوارەوە.

٢٣٤ ـ لە رۆژنامەی تریش دا، گۆشەی لەو بابەتەیان کردەوەو تێیدا لە کێشەی کرێکاران دەدوان و باسی شکایەتەکانیان دەکردن.

٢٣٥ ـ لەبەر ئەوەی ژمارەکانی تری «العمال» لە کتێبخانەکاندا دەست ناکەون، تەنها یەکەم ژمارەیمان سەیر کردووە.

٢٣٦ ـ بڕوانە «العالم العربي» ١١ حزیران ١٩٣٢ رۆژنامەی «العالم العربي» ئەو هەواڵانەی لە رۆژنامەی «العمال» ەوە گرتووە.

٢٣٧ ـ بەنموونە، بەراوردێکی، ناوەرۆکی ئەو دوو، ووتارە بکە کە «ئیبراهیم حیلمی» بە ناونیشانی «ژیانی کرێکار» و «مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید» بە ناوی «یەکێتی ی کۆمەڵەی کرێکاران» نووسیویانە. بڕوانە «العامل» العدد الأول ٨ أيلول ٩٣٠ ص ٢ ـ ٣.

٢٣٨ ـ «نداء العمال» العدد الأول، ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠، ص ٤.

٢٣٩ ـ بڕوانە. «عبدالرزاق الهلالي. معجم العراق. ص ٢٠٥.

Summary of foreign trade statistics, 1927 — 1961, Baghdad 1961, PP. 2 — 3.

٢٤٠ ـ بڕوانە: K. M. Langely, OP, Cit, P. 65.

٢٤١ ـ بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣١» ص ٣٠٩.

٢٤٢ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ١٦ تشرين الأول ١٩٣١.

٢٤٣ ـ قسەی «سابیت عەبدولنوور» ی نوێنەری «مووسڵ» ە. بڕوانە: «الحكومة العراقية، محاضر مجلس النواب، الدورة الانتخابية الثالثة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٣١ بغداد، بلا، ص ٥١.

٢٤٤ ـ بڕوانە: «الاستقلال» ١٤ آيار ١٩٣٠.

٢٤٥ ـ بڕوانە: «الاستقلال» ٢٧ آيار ١٩٣٠.

٢٤٦ ـ «الحكومة العراقية، محاضر مجلس النواب، الدورة الانتخابية الثالثة، إجتماع سنة ١٩٣٠، بغداد، بلا. ص ٢٣٢ و ٢٥٥.

٢٤٧ ـ بڕوانە: «نداء الشعب» ٦ شباط ١٩٣١.

٢٤٨ ـ «محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣٠» ص ٢٦٦ ـ ٢٧٢، ٣٥٤.

٢٤٩ ـ بڕوانە «نداء الشعب» ١ و ٢ و ٣ كانون الثاني و ٦ شباط و ٣١ آذار ١٩٣١ : «صدى العهد» ٨ تموز ١٩٣١.

٢٥٠ ـ بڕوانە: «صدى العهد» ٨ تموز ١٩٣١.

٢٥١ ـ «محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣٠»، ص ٢٤٨ ـ ٢٥١، ٧٢٦ ـ ٧٣٣: «صدى العهد» ٣١ مارت ١٩٣١، «العالم العربي» ١٤ و ٢٠ و ٢٨ تشرين الثاني ١٩٣٠.

٢٥٢ ـ «العالم العربي» ٦ و ٧ تشرين الاول ١٩٣١. ئەو هەوڵە سەرەتاییەی بۆ داشکاندنی مووچەی فەرمانبەرە بیانییەکان درا، بە شێوەیەك دەندووبی ساميی ورووژاندا حکوومەتی عیراقی ناچارکرد، چاو بەو یاسایەدا بگێڕێتەوە کە پەرلەمان بڕیاری لەسەر دابوو. بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە: «عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، ص ٩٧ ـ ٩٨».

٢٥٣ ـ بڕوانە: The Times of Mesopotamia, March 17 Th 1931 Golden Souvenir issue

٢٥٤ ـ بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە: Special Report... P. 89 The economic developient of Iraq. Repo.t of amission Organized by The International Bank of Reconstrution and Development at The request of The Govermment of Iraq. Baltimore 1952, P. 96.

الدكتور محمد سلمان حسن. التطور الاقتصادي في العراق، ص ٣٥٠.

٢٥٥ ـ بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣٠»، ص ٣٤٥ ـ ٣٤٧، «العالم العربي» ٢١ تشرين الاول ١٩٣١.

٢٥٦ ـ بڕوانە «جريدة ـ السياسة ـ بغداد ٢٧ شباط ٩٣١»؛ «العالم العربي» ٦ آب ١٩٣٢.

٢٥٧ ـ «محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣٠»، ص ٢٧٥.

٢٥٨ ـ (The Iraq Directory, 1936) P. 223

٢٥٩ ـ بڕوانە: «العراق» ٣ و ٤ تموز ١٩٢٢.

٢٦٠ ـ بڕوانە: «العراق ٢٨ كانون الثاني ١٩٢٨.

٢٦١ ـ بڕوانە «العراق» ١٧ آب و ٣٠ ايلول ١٩٢٠.

١٦٢ ـ بڕوانە «العالم العربي» ١٧ شباط ١٩٢٧؛ «العراق» ١٣ و ٢٠ نيسان ١٩٢٧ و ٦ تموز و ٧ ايلول و ٢ تشرين الأول ١٩٢٨ و ٤ و ٦ شباط ١٩٣١؛ «السياسة» ٨ آذار ١٩٣١.

٢٦٣ ـ بڕوانە «نداء الشعب» ٤ شباط ١٩٣١.

٢٦٤ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ١٨ شباط ١٩٣٠؛ «الاستقلال» ١ و ٢ حزيران ١٩٣٠.

٢٦٥ ـ بڕوانە: «نداء الشعب» ٥ تشرين الثاني ١٩٣٠.

٢٦٦ ـ هەموو ڕێگاکان لە جۆری تەسك بوون، تەنها ڕێگای بەغدا ـ مووسڵ نەبێ کە ئەڵمانەکان بەشی یەکەمیان لە جۆری پان و بە باشترین کەرەسەی ئەوکاتە ڕاکێشابوو، وەك ڕاپۆرتە ڕەسمییەکانی بەریتانیا دانی پێدا دەنێ.

٢٦٧ ـ بڕوانە: المركز الوطني لنوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/١٠ موضوع الملفة السكك ١٩٢٦ تقرير الجنرال ف. د. هامند.

٢٦٨ ـ بڕوانە، المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملف، ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٩ ـ ١٩٣٢، تقرير اللجنة المالية.

٢٦٩ ـ «لك» یێك دەکاتە سەد هەزار ڕوپیە، یان ٧٤٤٨ جونەیهی ئیسترلینی..

٢٧٠ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي، رقم الملفة، ص/١٠ موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦ تقرير الجنرال ف. د. هامند.

٢٧١ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاد الملكي، رقم الملفة: ص/١٠. موضوع الملفة، السكك ١٩٢٤ ـ ١٩٢٨.

٢٧٢ ـ کارشوناسێك بەهای چی موڵك و ماڵی ڕێگای ئاسنی هەیە بە ٥ و ٤٥ ملیۆن ڕوپیە خەمڵ کردووە، بەڵام لیژنەیەکی تر دەڵێ بایی ٤٠ ملیۆن ڕوپیەیە. بڕوانە: (الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة، ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦، تقرير الجنرال ف. د. هامند. عبدالرزاق الحسني. تاريخ الوزارات العراقية. الجزء الثالث ص ٤٤».

٢٧٣ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/١٠. موضوع الملفة: السكك ١٩٢٤ ـ ١٩٢٨.

٢٧٤ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: ص/١٠ موضوع الملفة: السكك: ١٩٢٤ ـ ١٩٢٨. عبدالرزاق الحسني. تاريخ الوزارات العراقية. الجزء الثالث ص ٤٢ ـ ٥١.

٢٧٥ ـ المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٤ ـ ١٩٢٨.

٢٧٦ ـ المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة، ص/١٠، موضوع الملفة، السكك ١٩٢٦، تقرير الجنرال ف. د. هامند.

٢٧٧ ـ بروانه «العالم العربي» ٢٦ آيار ١٩٢٧.

٢٧٨ ـ بروانه «العالم العربي» ١٧ شباط ١٩٣٢.

٢٧٩ ـ زۆر جار رۆژنامەکانی عیراق باسی مەسەلەی ڕێگای ئاسن و گیروگرفتەکانیان دەکرد. رای گشتی ی عیراقیش ئاگاداری کارو فرمانی ئەم دەزگایە و چۆنیەتی چەوساندنەوەی کرێکارە عیراقی یەکان بوو.

٢٨٠ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة، ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٤ ـ ١٩٢٨.

٢٨١ ـ بروانه: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/١٠، موضوع الملفة: السكك ١٩٢٩ ـ ١٩٣٢، تقرير اللجنة المالية.

٢٨٢ ـ بروانه: «الاستقلال» ١ ايلول ١٩٢٧؛ «العالم العربي» ١ شباط و ٥ آيار ١٩٢٧؛ ٨ حزيران ١٩٢٩؛ «العراق» ١٥ و ٢٤ كانون الاول ١٩٢٧ و ٢ كانون الثاني و ٢ آذار ١٩٢٨.

٢٨٣ ـ کاتێك ئەو دەزگایە لە لوتکەی تەنکوچەڵەمەدا دەژیا، بودجەی مانگانەی ڕێگای ئاسن ٢٠٠ ـ ٧٠٠ هەزار روپیە کورتی دەهێنا. بروانە: «الاخاء الوطني» ٢٣ تشرين الأول ١٩٣١.

٢٨٤ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة، ص/١٠ موضوع الملفة: السكك ١٩٢٤ ـ ١٩٢٦.

٢٨٥ ـ لەسەر ئەو بنەرەتەی کە رۆژانەی کرێکارێکی نەشارەزا ١٥ روپیە بوو، هەروەها بە بەراورد کردنیش لەتەك ئەو ژمارانەدا کە لەلاپەڕە ٨٣ی فایلی پێشوودا نووسراوە.

٢٨٦ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/١٠ موضوع الملفة: السكك ١٩٢٦، تقرير الجنرال ف. د. هامند.

٢٨٧ ـ بە نموونە بروانە: «العالم العربي» ٤ حزيران و ٩ تموز و ١٣ تشرين الثاني ١٩٣٠. «نداء الشعب» ١٣ تشرين الثاني ١٩٣٠.

٢٨٨ ـ بروانه: «العالم العربي» ٣ تشرين الثاني ١٩٣٠.

٢٨٩ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/١ لەگەڵ محەممەد سالح ئەلقەزازدا.

٢٩٠ - هەر سەرچاوەیە بە جۆرێك ژمارەی مانگرتوان خەمڵ دەكەن. بەپێی ئەو زانیاری‌یانەی سەركردایەتی مانگرتنەكە لە رۆژنامەكانی ناوخۆدا بڵاوی كردووەتەوە، ژمارەیان ١٢٠٠ كرێكار بوون. بڕوانە «نداء الشعب»و «العالم العربي» ٤ كانون الاول ١٩٣٠. كەچی بە پێی سەرچاوە ئینگلیزی‌یەكان ژمارەیان لە ٣٠٠ كەس تێپەڕی نەكردووە. بڕوانە: Baghdad Times December 3 and 4 1930; Specid Report... P. 243. بە قسەی «ئەلقەزاز»یش سەرپاكی كرێكارە عیراقی‌یەكانی كارگەی «شاڵچی»یە، بە شداری ئەو مانگرتنەیان كردووە. «چاو پێكەوتنی رۆژی ٨/٩/١٩٧٩». لەوە دەچێ ژمارەیان لە هەزار كەش زیاتر نەبووبێ.

٢٩١ - بڕوانە: «العالم العربي» و «نداء الشعب» ٤ كانون الأول ١٩٣٠. چاو پێكەوتنی رۆژی ٨/٩/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.

٢٩٢ - «نداء الشعب» ٤ كانون الأول ١٩٣٠.

٢٩٣ - چاو پێكەوتنی رۆژی ١/٨/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.

٢٩٤ - «العالم العربي» ٦ كانون الأول ١٩٣٠، «نداء الشعب» ٥ كانون الأول ١٩٣٠.

٢٩٥ - «نداء الشعب» ١٤ كانون الأول ١٩٣٠.

٢٩٦ - بڕوانە: «العراق» ٢١ كانون الثاني ١٩٣١.

٢٩٧ - بڕوانە: «نداء الشعب» ٢٣ كانون الأول ١٩٣٠.

٢٩٨ - بڕوانە: Special Repart P. 243.

٢٩٩ - بڕوانە: «نداء الشعب» ٢٥ كانون الأول ١٩٣٠.

٣٠٠ - «صدى العهد» ٢٧ شباط ١٩٣١؛ «العراق» ٢٥ شباط ١٩٣١.

٣٠١ - «الاستقلال» ٢٧ شباط ١٩٣١.

٣٠٢ - وەك «ئەلقەزاز» دەیگێڕێتەوە سەرۆكی ئەندازیارانی میكنێت، كابرایەكی لووت بەرزی قسە رەق بوو، وەكو كۆیلە لە تەك كرێكارەكاندا دەجووڵایەوەو بەرادەیەك زەبرو زەنگی لەگەڵدا دەنواندن، پاڵی بە بەڕێوەبەرایەتی رێگای ئاسنەوە دەنا زۆر دڵ رەقانە لە گەڵیاندا بجووڵێتەوە.

٣٠٣ - بڕوانە: «السیاسة» ٢٦ شباط ١٩٣١؛ «العراق» ٢٦ شباط ١٩٣١.

٣٠٤ - «صدى العهد» ٢٧ شباط ١٩٣١؛ «السیاسة» ٢٦ شباط ١٩٣١.

٣٠٥ - «صدى العهد» ٢٧ شباط ١٩٣١؛ چاو پێكەوتنی رۆژی ١/٨/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا. Special Report P. 244.

٣٠٦ - ژمارەی ئەوانەی لە مانگرتنی دووەمی كرێكارانی رێگای ئاسندا بەشداری‌یان كردوە بە هەزار كەس زیاتر خەمڵ كراوە. بڕوانە «العراق» ٢ آذار ١٩٣١.

٣٠٧ - پاش كۆتایی هاتنی مانگرتنەكە «ئەلقەزاز» سوپاسی هەموو ئەوانەی كرد كە «یارمەتی كرێكارە مانگرتووەكانی رێگای ئاسنیان داوە» بڕوانە: «العراق» ٢٤ آذار ١٩٣١.

٣٠٨ - دەقی بەیاننامە كە لە رۆژنامەی «الاستقلال»ی رۆژی ٣ی مارتی ١٩٣١ دایە.

٣٠٩ - چاو پێكەوتنی رۆژی ٨/٩/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.

٣١٠ - بڕوانە: «العراق» ٢٨ شباط ٩٣١، «الاستقلال» ٦ آذار ١٩٣١.

٣١١ - بڕوانە: «صدى العهد» ٢ مارت ١٩٣١؛ «العراق» ٢ آذار ١٩٣١.

٣١٢ - چاو پێ كەوتنی رۆژی ١/٨/١٩٧٩ لەگەڵ محەممەد صالح ئەلقەزازدا.

٣١٣ - «صدى العهد» ٢ مارت ١٩٣١.

٣١٤ - ئەو رستانە قسەی بەڕێوەبەری پۆلیسی بەغدایە كە بە خۆی‌و هێزێكی پۆلیسەوە گەیشتە گۆڕەپانی «السرای». بۆ زیاتر تێگەیشتن بڕوانە: «العراق» ٢ آذار ١٩٣١؛ «صدى العهد» ٢ مارت ١٩٣١.

٣١٥ ـ وەنەبێ ئەو خانووەی کرابووە بارەگای کۆمەڵە بچووك بوو بێ، بەڵکو بریتی بوو لە چوار ژووری گەورەو یەکێکی بچووك لەگەڵ کۆردیدۆرێك دا. چاو پێکەوتنی رۆژی ٢٢/٨/١٩٧٩.
٣١٦ ـ بڕوانە: «السياسة» ٤ آذار ١٩٣١، «الاستقلال» ٣ آذار ١٩٣١، «العراق» ٣ و ٤ آذار ١٩٣١.
٣١٧ ـ بڕوانە: «العراق» ٣ و ٤ آذار ١٩٣١.
٣١٨ ـ «صدى العهد» ٤ مارت ١٩٣١، «الاستقلال» ٤ آذار ١٩٣١؛ «العراق ٣ و ٤ آذار ١٩٣١».
٣١٩ ـ «الاستقلال» ٦ آذار ١٩٣١.
٣٢٠ ـ بڕوانە: «العراق» ٢ آذار ١٩٣١، «الاستقلال» ١٥ نيسان ١٩٣١.
٣٢١ ـ بڕوانە: «السياسة» ٥ آذار ١٩٣١.
٣٢٢ ـ بڕوانە: «صدى العهد ٦ مارت ١٩٣١.
٣٢٣ ـ مانگرتووان نەیان ویست هاتوچۆی شەمەندوفەر رابگرن و لە کاری بخەن، نەوەك هامشۆکەران زیانیان پێ بگا، کەروا نەبوایە، بەهەموو شێوەیەك دەیانتوانی دەستی لێ بووەشێنن.
٣٢٤ ـ بڕوانە: «الاستقلال» ٦ آذار ١٩٣١ «سەرووتاری ئەو رۆژە».
٣٢٥ ـ بە قسەی رۆژنامەکانی ئەو کاتە، وەزیر قسەکانی وەردەگێڕا. «ئەلقەزاز» یش لەم بارەیەوە دەڵێ: هەندێ جار وەزیری ناوبراو ووتەکانی ئەمی وەك خۆی وەرنەدەگێڕاو هێواشی دەکردەوە، بەڵام ئەم راستی دەکردەوەو ئەوەی دەیویست بە بەڕێوەبەری دەووت. «چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٣٢٦ ـ المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية. البلاط الملكي. رقم الملفة: د/١٤ موضوع الملفة: الاحزاب السياسية. «السياسة» ٥ آذار ١٩٣١؛ «الاستقلال» ٦ آذار ١٩٣١، «چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ محەممە ساڵح ئەلقەزازدار.
٣٢٧ ـ لە دەقەکەدا «وای لێ کردن».

٣٢٨ ـ «الاستقلال» ٦ آذار ١٩٣١.
٣٢٩ ـ بڕوانە: «العراق» ١٨ آذار ١٩٣١.
٣٣٠ ـ بڕوانە: «الاستقلال» ٣ آيار ١٩٣١.
٣٣١ ـ بڕوانە «الاستقلال» ٩ نيسان ١٩٣١.

٣٣٢ ـ ئەو کاتە «جەمیل ئەلمواى» وەزیری ئەشغال و هاتوچۆ بوو، پێشتریش سەبارەت بە باروزرووفی کرێکارانی ڕێگای ئاسن ووتبووی: گووایە پڕ بە دڵ حەز دەکا کرێکاری عیراقی بە خۆشیی و بەختیاریی بژی و هەرچییەك ئەو ئازار دەدا، ئەمیش بیوەی دەتلێتەوە»، هەندێ سەرکردەی کرێکاران ئەم قسەیەی وەزیریان کردبووە «بەڵگەیەکی روون و ئاشکرا ی هەوڵ و تەقەلای ئەو، لە پێناو چاککردنی گوزەرانیاندا، ئەمەقسەی «عەبباس حسەین ئالئەلچەلەبی ی «سەرۆکی کۆمەڵەی کرێکارانی عیراق» ە. بڕوانە «نداء العمال» العدد الأول، ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠ ص ١٥.
٣٣٣ ـ بڕوانە «الاستقلال» ٢٩ آذار و ٢٢ آيار ١٩٣١.
٣٣٤ «الاستقلال» ١ و ٣ نيسان ١٩٣١.

٣٣٥ ـ «ئەلقەزاز» بە یاننامەیەکی دوورو درێژی بڵاوکردەوەو تێیدا بە دوورو درێژیی هەڵوێستو کەللەرەقیی لیبرسراوانی رێگای ئاسنو چۆنیەتی گاڵتە کردنیان بە عیراقییەکانی، روون کردەوە. هەروەها باسی ئەوەی کردبوو کە چۆن سەرۆکی ئەندازیاران وتوویەتی «گوێ بە جنسیەتنامەی عیراقیی نادا و بەڕێوەبەرایەتی کێ ی بوێ دای دەنێو کێیشی بوێ دەری دەکا، بێ ئەوەی حساب بۆ رەگەزیان بکاو هیچ کاتێك فەزڵی عیراقی بەسەر بیانیدا نادرێ، با وەکو یەکیش بن. پێش مانگرتنەکەیش ئیشو کار چۆن رۆیشتووە هەر بەو شێوە دەمێنێتەوە».

٣٣٦ ـ المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة: ٢/١٤، موضوع الملفة: الاحزاب السياسية؛ «صدى العهد» ٧ نيسان ١٩٣١؛ «العراق» ٧ نيسان ١٩٣١؛ «الاستقلال» ١ و ٣ و ٧ نيسان ١٩٣١.

٣٣٧ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ٥ تشرين الثاني ١٩٣٢.

٣٣٨ ـ بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە: المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة: ٢/١٤، موضوع الملفة: الاحزاب السياسية؛ «الاستقلال» ٣ و ١٥ و ١٦ نيسان ١٩٣١؛ «صدى العهد» ٣ نيسان ١٩٣١.

٣٣٩ ـ بڕوانە: «صدى العهد» ٣ نيسان ٩٣١؛ «الاستقلال» ١٧ نيسان ١٩٣١.

٣٤٠ ـ بڕوانە: «الاستقلال» ١٩ نيسان ١٩٣١.

٣٤١ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة: د/١٤، موضوع الملفة: الاحزاب السياسية». دەقی ئەو یاددا شتە لەو فایلەدا بلاّ وکراوەتەوە.

٣٤٢ ـ ئەو رستانە لەدەقی ئەو یادداشتە وەرگیراون کە ئاراستەی مەلیك کراوە.

٣٤٣ ـ بڕوانە: «العراق» ٧ آیار ١٩٣١؛ «الاستقلال» ٢٧ نيسان ١٩٣١.

٣٤٤ ـ دەقی ئەوە یادداشتە لە رۆژنامەی «العراق» ی رۆژی ٣ ی تەمموزی ٩٣١ دا بلاّ و کراوەتەوە.

٣٤٥ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة: ص/٥/٣، موضوع الملفة: العمال ومايتعلق بهم ١٩٣١؛ «العراق» ١٧ تموز ١٩٣١.

٣٤٦ ـ ئەم دەستنیشان کردنە، ئەو کرێکارانەی نەدەگرتەوە کە پێش ئادار دەرکرابوون. ئەمەیش دەستکەوتێکی گرنگ بوو تا بە هۆیەوە بەڕێوەبەرایەتی رێگای بە پێچو پەنا بگرێ.

٣٤٨ ـ دوور نییە سەرکردایەتی مانگرتنەکە بەو بڕیارەیان، نەکەوتبنە ژێر کارتێکردنی ئەو مانگرتنەوە کە کرێکارانی سوریا ئەنجامیان دا و «مقاطعە» ی ترامواى و کارەبایانکرد تا کۆمپانیا فەرەنسنی یەکەیان ناچار بوو داخوازییەکانیان جێبەجێ بکا. ئەوەیشی کە زیاتر ئەم بۆچوونە دەچەسپێنێ ئەوەیە ئەلقەزاز لەو رۆژگارەدا کە گیروگرفتی نێوان کرێکارانو رێگای ئاسن گەیشتبووە لوتکە بەیاننامەیەکی بلاّوکردەوەو تێیدا باسی ئەم «مقاطعە» یەی کردووە. «بڕوانە دەقی یادداشتەکە لە «تطور الحركة النقابية في العراق، هاشم علي محسن ص ٣٤ ـ ٣٥ و ١٠٥» دا.

٣٤٩ ـ «الاستقلال» ٢٢ نيسان و ١٠ و١٢ آيار ١٩٣١.

٣٥٠ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ٥ تشرين الثاني ١٩٣٢. «ئەلقەزاز» رای وایە لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی کرێکاران هیوایەکی گەورەی بەم کۆمپانیایە هەبوو، کرێکاران پەنایان نەبردە بەر مانگرتن.

٣٥١ ـ هەر ئەو سەرچاوە.

٣٥٢ ـ بڕوانە: «الاستقلال» ١٠ و ١٢ آيار ١٩٣١.

٣٥٣ ـ بڕوانە: «العراق» ١٤ نيسان ١٩٣١.

٣٥٤ ـ بڕوانە: «الاستقلال» ٢٠ نيسانو ٨ و ٢٢ و ٢٧ آيارو ٤ حزيران ١٩٣١؛ «العراق» ٨ و ١١ آيار ١٩٣١؛ «صدى العهد» ٨ آيار ١٩٣١.

٣٥٥ ـ بڕوانە: «صدى العهد» ٦ آيار ١٩٣١؛ «الاستقلال» ٦ آيار ١٩٣١.

٣٥٦ ـ دەقی یاددا شتەکە لە رۆژنامەی «الاستقلال» ی رۆژی ٥ آیاری ١٩٣١ بلاّوکراوەتەوە.

٣٥٧ ـ بڕوانە: «الاستقلال» ٣ و ١٧ آيار ی ١٩٣١.

٣٥٨ ـ بڕوانە: «العراق» ١٠ حزيران و ٣١ تموز ی ١٩٣١؛ «صدی العهد» ١٤ آيار ١٩٣١.

٣٥٩ ـ بڕوانە: «صدی العهد» ٦ آيار ١٩٣١؛ «الاستقلال» ٦ آيار ١٩٣١

بڕوانە: «الاستقلال» ١٩ آيار ١٩٣١.

٣٦١ ـ «العراق» ٦ آب ١٩٣١؛ «الاستقلال» ٢٢ آذار و ١٢ حزيران ١٩٣١.

٣٦٢ ـ بڕوانە: «محاضر مجلس النواب» سنة ١٩٣١ ص ٥٢٩.

٣٦٣ ـ وا بڕيار بوو ئەو کەسەی دانیشتووی شار بوایەو سەگی هەبووایە ساڵی ٥ ڕوپیە ڕەسم بدا.

٣٦٤ ـ «محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣٠ ص ٣٠٩، ٥٢٠، ٥٢٨.

٣٦٥ ـ قسەی «ئیبراهیم عەتتار باشی»، نوێنەری «مووسڵ» ٥. بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣٠ ص ٥٢٠.»

٣٦٦ ـ هەر ئەو سەرچاوە ص ٣٠٩.

٣٦٧ ـ بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ل ٥٢٠، ٥٢٩.

٣٦٨ ـ بڕوانە: «محاضرات مجلس النواب، الدورة الانتخابية الثالثة. اجتماع سنة ١٩٣١، بغداد ١٩٣١ ص ٣٦ ـ ٣٧: «العراق» ١١ آذار ١٩٣١.

٣٦٩ ـ بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣٠، ص ٧٣٤ ـ ٧٣٨. «ئەو دوو نوێنەرەی بەرهەڵستی ی یاساکەیان کرد، «ئیبراهیم عەتار باشی ی مووسڵاوی و عەبوود ئەلمەللاکی بەسرەیی بوون».

٣٧٠ ـ مەبەست لە ڕاگەیاندنی ڕقم ٧١٠، ٥ کە ئینگلیز لە ١ ی نیسانی ١٩١٩ دا دەری کرد و تێیدا ڕەسمو باجێکی زۆری بەسەردا نیشتووان‌دا سەپاندو پاشان بووە مایەی ناڕەزایی خەڵکی: بە ڕادەیەك لە ڕووداوەکانی شۆرشی بیستدا دەنگی دایە.

٣٧١ ـ بڕوانە: هەردوو ڕاگەیاندنەکە، لە ڕۆژنامەی «صدی العهد» ی تەمووزی ١٩٣١ دا.

٣٧٢ ـ بڕوانە: «صدی العهد» ٩ تموز ١٩٣١.

٣٧٣ ـ بڕوانە: «العراق» ١٦ کانون الثانی ١٩٣١.

٣٧٤ ـ بڕوانە: «العراق» ١ و ٢ تموز ١٩٣١.

٣٧٥ ـ «الاخاء الوطنی» ٢ آب ١٩٣١.

٣٧٦ ـ بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣١، ص ٤١.»

٣٧٧ ـ لە بەڵگەنامە ڕەسمی‌یەکان‌دا بە ئاشکرا دیارە کە «موزاحیم ئەلپاچەچی» چۆن بەتوندی لەگەڵ سەرۆکی کۆمەڵەکان‌دا وتوویژی کردووە. تەنانەت «ئەلقەزاز» دوای ئەو مێژووە، لە دادگادا شکایەتی لێ کردووەو تاوانی ئەوەی داوەتە پاڵ کە «ئیهانە» ی کردووە. بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣١ ص ٣٧؛ «الاخاء الوطنی» ٢٢ تشرين الاول ١٩٣١.

٣٧٨ ـ چاوپێ کەوتنی ڕۆژی ٢٢/٨/٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا

٣٧٩ ـ بڕوانە: «العالم العربی» ٥ تشرين الثانی ١٩٣٢.

٣٨٠ ـ بڕوانە: سامی عبد الحافظ القیسی: آفاق عن الحركة الوطنية [illegible] في العراق ـ آفاق عربية ـ بغداد، العدد التاسع، آيار ١٩٧٦، ص ٧٤.

٣٨١ - چاو پێکەوتنی رۆژی ٢٢/٨/٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٣٨٢ - بڕوانە دەقی بەیاننامەکە لە «صدی العهد» ی رۆژی ٧ ی تەمووزی ١٩٣١ دا.
٣٨٣ - «صدی العهد» ٦ تموز ١٩٣١.
٣٨٤ - بڕوانە: «العراق» ٩ - ١١ و ١٣ - ١٥ و ٢٣ تموز ١٩٣١؛ «صدی العهد» ٨ و ٩و ١١ تموز ١٩٣١.
٣٨٥ - «الأخبار» ٧ تموز ١٩٣١؛ چاو پێکەوتنی رۆژی ٨/٩/٧٩ گەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزاز دا.
٣٨٦ - بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە: «عبد الرزاق الحسني، تاريخ الزرارات العراقية، الجزء الثالث ص ١٤٣.
٣٨٧ - «ئەبولتممەن» کە ئەندامی ژووری بازرگانیی بوو، قایل نەبوو ببێتە ئەندامی ئەو وەفدە.
٣٨٨ - چاو پێکەوتنی رۆژی ٨/٩/٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٣٨٩ - بڕوانە: «العراق» ٨ تموز ١٩٣١.
٣٩٠ - بڕوانە «صدی العهد» ٨ تموز ١٩٣١؛ «العراق» ٨ و ٩ تموز ١٩٣١؛ رۆژنامەی «صدی العهد» کە سەر بە میری بوو، لەسەر لاپەڕەی یەکەمو لەجێی سەر ووتارەکەیدا بەیاننامەکەی بڵاوکردەوە. «ئەلقەزاز» دەڵێ: رژێم هەندێ دەستکاری بەیاننامەکەی کرد و لای خۆیشیەوە ئەو بەننامەیەی دەر نەکرد کەلەسەری رێککەوتبووین و مەرج وابوو بڵاوی بکاتەوە تێیدا رەسمو باجە تازەکان لا ببا، یان کەمیان بکاتەوەو ئەو روون کردنەوەیەیش کە بۆ رۆژنامەکانی ناردبوو، لە کاتی خۆیدا بڵا و بوونەوە «چاو پێکەوتنی رۆژی ٨/٩/٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا».
٣٩١ - بڕوانە: «العراق» ٩ و ١٠ تموز ١٩٣١.
٣٩٢ - بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣١ ص ٤٠.
٣٩٣ - بڕوانە: «عبد الرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث ص ١٤٦.
٣٩٥ - لەو کاتەدا مەلیك فەیسەڵی یەکەم بە سەردانێکی رەسمی لە تورکیا بوو، مەلیك عەلی برای کردبووە جێگری خۆی. «نووریسەعید» ی سەرۆك وەزیرانیش خەریکی گەشتێك بوو لە ئەورووپاو پاشان چووە تورکیاو لەگەڵ فەیسەڵدا یەکیان گرتەوە. وەزیری دارایی «رۆستەم حەیدەر» جێگری بوو، بەڵام کە چوو بۆ دەرەوەی وڵات وەزیری ناوخۆ «موزاحیم ئەلپاچەچی» بووە جێگری سەرۆك وەزیران.
٣٩٤ - بڕوانە: «العراق» ١٣ تموز ١٩٣١.
٣٩٦ - قسەی نوێنەری «حیللە» عەبدولڕەزاق ئەلڕوەیشدی» یە. بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣١ ص ٣٨.
٣٩٧ - بڕوانە: عبد الرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، ص ١٤٦ - ١٤٧.
٣٩٨ - «صدی العهد» ١٧ تموز ١٩٣١؛ «العراق» ١٨ تموز ١٩٣١؛ چاو پێکەوتنی رۆژی ٢٢/٨/٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٣٩٩ - دەقی بەیاننامەکە لە «صدی العهدی» ی رۆژی ١٧ تەمموزی ساڵی ١٩٣١ دا بڵاوکراوەتەوە.
٤٠٠ - «العراق» و «صدی العهد» ١٧ تموز ١٩٣١.
٤٠١ - «العراق» ٢٢ و ٢٣ تموز ١٩٣١؛ «صدی العهد» ٢٢ و ٢٣ تموز ٩٣١.
٤٠٢ - بڕوانە: «العراق» ٢٧ تموز ١٩٣١ «سەر ووتاری ئەو رۆژە».
٤٠٣ - بڕوانە: «محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣١ ص ٣٢ - ٥٠» «العراق» ١٧ تموز ١٩٣١.
٤٠٤ - «نووری سەعید» بەم جۆرە باسی بارو دۆخی ئەو کاتەی بەسرە دەکاو دەڵێ: «٣٦٠ سەعات بەسرە لە ئاژاوەدا ژیا، ئنجا بۆ ئەوەی بیانوو بۆ ئەو زەبرو زەنگە بهێنێتەوە کە دەرهەق بە دانیشتووان نواندی. پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ گوایە بۆیە ئەم هەنگاوەی نا، نەوەك ئینگلیز بێنە بەسرەوەو داگیری بکەن. «براوانە: محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣١ ص ٤٨.

٤٠٥ ـ بەکارهێنانی یاسای داوای عەشایەری دژی دانیشتوانی شارەکان بووە دیاردەیەکی زۆر ترسناك. هێشتا ماوەیەکی کەم بەسەر مانگرتنەکەدا تێ نەپەڕیبوو، کەچی بە پێی ماددەی ٤٠ ی ئەو یاسایە هەر دوو سیاسەتمەداری ناودار «فەهمی ئەلمودەڕیس» و «ڕۆفائیل بەتی ی» لە پایتەخت دوور خرانەوە.

٤٠٦ ـ بڕوانە: «العالم العربی» ٢١ تشرین الأول ١٩٣١.

٤٠٧ ـ «صدی العهد» ٢١ تموز ١٩٣١.

٤٠٨ ـ «جەعفەر ئەبولتممەن» ئەو مانگرتنە بە یەکەمین سەرکەوتن دادەنێ لە دوای شۆڕشی بیستەوە. بڕوانە: «الاخاء الوطنی» ٦ ایلول١٩٣١.

٤٠٩ ـ «العراق» ١٥ تموز ١٩٣١.

٤١٠ ـ بڕوانە: عبد الرزاق الحسنی، تاریخ الوزارات العراقیة، الجزء الثالث، ص ١٤٩. دەربارەی بایەخدانی ڕۆژنامە بیانییەکان بەو مانگرتنە، بڕوانە: «العراق» ٢٧ تموز ١٩٣١.

٤١١ ـ بڕوانە: «محاضر مجلس النواب؛ اجتماع سنة ١٩٣١ ص ٤٧.»

٤١٢ ـ لە سەرەتای باسەکەداو لەو شوێنەدا کە باسی چۆنیەتی ساز کردنی مانگرتنەکەمان کردووە، دەستمان بۆ ئەو بەیاننامەیە ڕاکێشاوە.

٤١٣ ـ بڕوانە «العراق» ٢ تموز ١٩٣١.

٤١٤ ـ محاضر مجلس النواب، اجتماع سنة ١٩٣١، ص ٤٤؛ «العراق» ٢٤ آب ١٩٣١.

٤١٥ ـ «الاخاء الوطنی» ١٦ تشرین الاول ١٩٣١.

٤١٦ ـ «ڕاجی ئەلعەسکەری» یەکێك بوو لەوانەی پۆلیس گرتیان. ناوبراو سەرۆکی «کۆمەڵەی هاریکاری سەربازە خانەنشینەکان» بوو. ئەم کۆمەڵەیە لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ١٩٣٠ دا دروست بوو. ئامانجی «چاککردن و خۆشگوزەرانیی سەربازە خانەنشینەکان بوو». خۆی بە «کۆمەڵەیەکی ئەدەبیی و کۆمەڵایەتی» دادەناو کە «هیچ پەیوەندییەکی بە سیاسەتەوە نییە». ئەم کۆمەڵەیە پشتگیری هەڵوێستەکانی «کۆمەڵەی سنعەتکاران» ی دەکرد، لەبەر ئەوە ڕژێم چەند جارێك زوری بۆ هێنا. بۆ زیاتر تێ گەیشتن، بڕوانە «الاستقلال» ٥ و ٦ و ١٢ حزیران ١٩٣٠؛ «العراق» ٢٢ ایلول ١٩٣١.

٤١٧ ـ «العراق» ٢٥ آب ١٩٣١.

٤١٨ ـ بڕوانە: «العراق» ١ و ٣١ آب ١٩٣١.

٤١٩ ـ بڕوانە: «العراق» ٦ آب و ٢ ایلول و ٣ تشرین الاول ١٩٣١.

٤٢٠ ـ بڕوانە: «العراق» ٨ و ٢٠ ٢٢ و ٣١ آب و ١٢ ایلول ١٩٣١.

٤٢١ ـ «عەبدولڕەززاق ئەلسامەرائی» زۆر چالاکانە بەشداری کۆڕەکانی «کۆمەڵەی سنعەتکارا» ی دەکرد و ووتاری تێدا دەخوێندنەوە کلتی خۆیشی دژی هەڵوێستی ناڕەوای کۆمپانیا بیانییەکان بەرامبەر بە کرێکارە عیراقییەکان، ڕاوەستا. بڕوانە «الاستقلال» ٩ حزیران ١٩٣١.

٤٢٢ ـ المرکز الوطنی للوثائق. الوحدة الوثائقیة، البلاط الملکی، رقم الملفة: د/١٤ موضوع الملفة: الاحزاب السیاسیة.

٤٢٣ ـ بڕوانە «العالم العربی» ١٥ کانون الأول ١٩٣٠.

٤٢٤ - بروانه: المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية، البلاط المكي، رقم الملفة: د/١٤ موضوع الملفة: الاحزاب السياسية.

٤٢٥ - «ئەلسامەڕائی»-لە دامێنی یادداشتەکەیدا بەو جۆرە ناوی خۆی نووسیبوو.

٤٢٦ - بڕیار وا بوو «کۆمەڵەی کرێکارانی عیراق» لە سێ دەستە پێك بێ. یەکێکیان ئیداریو یەکێك راوێژکاریو ئەوی تریشیان بۆ سەرپەرشتیی کردنی کرێکاران.

٤٢٧ - المركز الوطني للوثائق. الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة: د/١٤ موضوع الملفة: الاحزاب السياسية.

٤٢٨ - چاو پێکەوتنی رۆژی ٨/٩/٩٧٩ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.

٤٢٩ - بروانه «الاستقلال» ٢٠ تشرين الثاني ١٩٣١؛ «الاخاء الوطني» ٢٢ و ٢٩ تشرين الاول ١٩٣١.

٤٣٠ - بروانه: «العالم العربي» ١٢ كانون الثاني ١٩٣٢.

٤٣١ - بروانه: «الإخاء الوطني» ٢٥ تشرين الأول ١٩٣١.

٤٣٢ - بروانه «العالم العربي» ٩ كانون الثاني ١٩٣٢.

٤٣٣ - بروان: «الاخاء الوطني» ٢ آب ١٩٣٢؛ «العالم العربي» ٢ و ٣٠ آب ١٩٣٢.

٤٣٤ - بروانه: «العالم العربي» ١٩ /اب، ١٩٣٢.

٤٣٥ - بروانه «العالم العربي» ٣ ايلول ١٩٣٢. لە بەشی سێیەمو لەو شوێنەدا کە باسی «گیروگرفتی سەرەکیی کارو کرێکاران و چۆنیەتی رەنگدانەوەی لە بزووتنەوەی کرێکاران» مان کردووە، نموونەی تری لەو بابەتەمان هێناونەتەوە.

٤٣٦ - بروانه: «العالم العربي» ٢٠ آب ١٩٣٢.

٤٣٧ - بروانه: «العراق» ٥ تشرين الثاني ١٩٣١.

٤٣٨ - بروانه: «الاخاء الوطني» ٢٦ تشرين الأول ١٩٣١، و ٦ كانون الثاني ١٩٣٢؛ «العالم العربي» ٨ تشرين الأول ١٩٣١، ٥ و ١٥ كانون الثاني ١٩٣٢؛ «الاخبار» ١٧ و ١٩ تشرين الثاني ١٩٣١.

٤٣٩ - بروانه «الاخبار» ١٢ و ١٩ و ٢٦ تشرين الثاني ١٩٣١؛ «الاخاء الوطني» ١٩ و ٢١ و ٢٣ تشرين الأول و ١ و١٢ تشرين الثاني ١٩٣١؛ «الاستقلال» ٢٠ و٢٣ تشرين الثاني ١٩٣١.

٤٤٠ - بروانه: «العالم العربي» ١٤ شباط ١٩٣٢.

٤٤١ - بروانه: «الاخاء الوطني» ١٦ تشرين الأول ١٩٣١. هەروەها بروانه «ئەو پرۆتستۆیەی حەلواچییەکان لە ژمارەی رۆژی ١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١ دا بڵاویان کردەوە».

٤٤٢ - بروانه: «العالم العربي» ١٠ و ١٩ و ٢٩ كانون الثاني و ٦ و ٢٠ و ٢٢ آيار و ٧ تموز ١٩٣٢.

٤٤٣ - بروانه: «العراق» ١ و ٨ ايلول ١٩٣١.

٤٤٤ - بروانه: «العالم العربي» ٣١ آب ١٩٣٢.

٤٤٥ - بروانه: الاخاء الوطني» ٢ آب ١٩٣٢.

٤٤٦ - بروانه: «العالم العربي» ٢٢ و٢٣ تشرين الثاني ١٩٣٢.

٤٤٧ - بروانه: «العالم العربي» ٢٨ تشرين الأول و ٢٥ تشرين الثاني ١٩٣٢.

٤٤٨ - بروانه: «الاخاء الوطني» ١ تشرين الثاني ١٩٣١.

٤٤٩ - بروانه «الاخبار» ١٢ تشرين الثاني ١٩٣١؛ «الاستقلال» ١٩ تشرين الثاني ١٩٣١.

٤٥٠ - بروانه: «الاستقلال» ٢٣ تشرين الثاني ١٩٣١، چاو پێکەوتنی رۆژی ٨/٩/١٩٧٩ لەگەڵ ئەلقەزاز.

٤٥١ - بروانه: «العالم العربي» ٢٢ كانون الثاني ١٩٣٢.

٤٥٢ - بروانه: «العالم العربي» ٢٢ كانون الثاني و ٢١ شباط ١٩٣٢.

٤٥٣ - بروانه: «صدى العهد» ١٩ تموز ١٩٣١؛ چاو پێ کەوتنی رۆژی ٨/٩/١٩٧٩ لەگەڵ ئەلقەزاز.

٤٥٤ - كۆمەگەڵ كرێكارانی میكانیك، پشتگیری داخوازی‌یەكانی كرێكارانی رێگای ئاسن‌یان كرد لە شوباتو ئاداری ١٩٣١ دا؛ واتە لە رۆژگاری مانگرتنی دووەمیان‌دا. بروانە: «العراق» ٢٤ آذار ١٩٣١.

٤٥٥ - ئەمە ئەو «سەلیم ئەحمەد ئەلمسیری»، یە نی‌یە كە پێشتر باس كرا. چاو پێكەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٩/٨.

٤٥٦ - بروانە: «العالم العربي» ١٢ آذار و ٢٢ نيسان ١٩٣٢.

٤٥٧ - بروانە: «العالم العربي» ٢٧ نيسان ١٩٣٢.

٤٥٨ - بروانە: «العالم العربي» ١٢ و ٢١ آيار ١٩٣٢.

٤٥٩ - بروانە: «الاخاء الوطني» ٢٧ آيار و ١٠ حزيران ١٩٣٢؛ «العالم العربي» ١٠ و ١٤ حزيران ١٩٣٢.

٤٦٠ - بۆ زیاتر تێگەیشتن بروانە: «العالم العربي» ٢٤ و ٣١ آيار و ٣ و ٥ و ٧ و ٢٢ حزيران و ٥ و ٧ و ١٤ تموز و ٢٠ و ٣١ آب و ١٤ و ٢١ و ٣٠ ايلول و ١٦ كانون الاول ١٩٣٢؛ «الاخاء الوطني» ٢ و ١٠ و ٢٧ حزيران و ٤ و ١٢ تموز ١٩٣٢.

٤٦١ - بروانە: «العالم العربي» ١٠ و ١٦ حزيران ١٩٣٢.

٤٦٢ - بروانە: «الاخاء الوطني» ١٢ تموز ١٩٣٢.

٤٦٣ - چۆن نووسراوە، وەك خۆی دەینووسینەوە.

٤٦٤ - بروانە: «محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣١ ص ٢».

٤٦٥ - لەو باسانەی پێشوودا، چەند لایەنێكمان لە بارەی هەڵوێستی د. ە سەلاتداران سەبارەت بە چینی كرێكاران نیشان دا.

٤٦٦ - «العراق ٢٠ و ٢١ حزيران ١٩٢٢.

٤٦٧ - كۆمەڵە كرێكاری‌یەكان، بانگیان دەكرد ووتاریان بۆ بخوێننەوە.

٤٦٨ - «العراق» ٢٠ تموز ١٩٣١.

٤٦٩ - «صدى العهد» ٦ تموز ١٩٣١ «لە ناونیشانی سەر ووتارەكەوە، وەرگیراوە كە دەڵێ: «مانگرتنەكەی دوێنێ سووكایەتی‌یە بە بیری مرۆڤایەتی‌و زیان بە مانگرتووە كانیش دەگەیەنێ».

٤٧٠ - «محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣١ ص ٣٤ - ٣٥».

٤٧١ - هەر ئەو سەرچاوە. ص ٤٤. «العراق» ٥ آب ١٩٣١.

٤٧٢ - بۆ زیاتر تێ گەیشتن بروانە: «الدكتور فاروق صالح العمر، الاحزاب السياسية في العراق ١٩٢١ - ١٩٣٢، بغداد ١٩٧٨» «عبدالرزاق عبدالدراجي، جعفر ابو التمن ودوره في الحركة الوطنية في العراق، بغداد ١٩٧٨، ص ٤٩٠ - ٤٩٢».

٤٧٣ - رۆژنامەی «الاخاء الوطني» هەفتەی دوو جار لاپەڕەی - كیژان‌و خانمان ١١ ی بڵاو دەكردەوە.

٤٧٤ - دوور نی‌یە ئەگەر هێزەكانی ئەپۆزیسیۆن هەڵوێستێكی توندتریان بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی رێگای ئاسن نیشان بدایەو وایان لە میریش بكردایە - لەسەر مەسەلەی كرێكاران بكاتەوە، بەڕێوەبەرایەتی رێگای ئاسن نەیدەتوانی ئەو هەنگاوانە بنێ كە دوای كۆتایی هاتنی مانگرتنی یەكەم هاویشتی‌و دوا جاریش نەیدەوێرا بەو شێوەیەی كە باسمان كرد گاڵتە بە مافی كرێكاران بكا وەك بە دوورو درێژیی قسەمان لێ كرد.

٤٧٥ ـ بڕوانە: «السياسة» ٤ آذار ١٩٣١؛ «العراق» ٢٦ شباط ١٩٣١.
٤٧٦ ـ «نداء الشعب» ٨ ـ ١٠ كانون الاول ١٩٣٠.
٤٧٧ ـ لە چاو پێکەوتنی ٧/٣١ و ١٩٧٩/٩/٨ دا. «ئەلقەزاز» ووتی: هەر زوو «ئەبولتممەن»ی لێ دەرچێ، بلوەڕم بە سەرکردەکانی تری ئەپۆزیسیۆن نەما. تەنانەت ئەو پێشنیازەی «یاسین ئەلهاشمی» یشی داوەتە دواوە کە دەیوست کەل‌و پەلی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» لەلای «کۆمەڵەی جەنگاوەران» دابنێ‌و وای بە باشتر زانی چی کەل‌و پەلیان هەیە بیداتە دەست «ئەبولتممەن».
٤٧٨ ـ ئەم هەڵوێستە وای لە گەلێك نووسەری عیراقی‌و بیانی کردووە مانگرتنی گشتی‌ی دژ بە یاسای رەسمی شارەوانی‌یەکان بە ئیشی حزبە ئەپۆزیسیۆنەکان دابنێن، بە تایبەتی پارتی نیشتمانی‌ی «الحزب الوطني». بە نموونە بڕوانە «محمد مهدي كبة، مذكراتي من صميم الاحداث ١٩١٨ ـ ١٩٥٨؛ بيروت ١٩٦٥»، «عبدالغني الملاح، تاريخ الحركة الديمقراطية في العراق، بغداد ١٩٧٥ ص ١١٠»، «ن. و. ئۆهانیسیان. بزووتنەوەی رزگاری نیشتمانی لە عیراقدا ٩١٧ ـ ١٩٥٨، بە زمانی رووسی. یەریڤان ١٩٧٦ ل ٢٣٢» . ئەوی راستی‌ی بێ کەس ناتوانێ نکوولی لەو دەورە گەورەیە بکا کە حزبە ئەپۆزیسیۆنەکان‌و بە تایبەتی پارتی نیشتمانی‌و شەخسی سەرۆکە کەی «جەعفەر ئەبولتممەن» لە گەشە پێکردنی رووداوەکانی مانگرتنەکەو درێژەپێدانی دا بینی‌یان، بەڵام سەرکردە کرێکاری‌و پیشەیی یەکان‌و لە پێش هەموویانەوە سەر کردەکانی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» ئەوان نەخشەی مانگرتنەکەیان کێشاو تەقاندیانەوەو سەرکردایەتی‌یان کردو کۆتایی‌یان پێ هێنا. هەر ئەوانیش تووشی گرتن‌و راوەدوونان هاتن. شایانی باسە سەرۆکی «کۆمەڵەی سنعاتکاران» چەندین جار بەر پەرچی ئەو قسەو باسانەی دایەوە گوایە هێزەکانی ئەپۆزیسیۆن سەرکردایەتی مانگرتنەکە دەکەن. بڕوانە: «العالم العربي» ٢١ تشرين الأول و ٥ تشرين الثاني ١٩٣٢ «هاشم علي محسن: تطور الحركة النقابية في العراق. ص ٥٣ ـ ٥٨». گرنگ ئەوەیە بەڵگەی نهێنی ئەوتۆ لەبەر دەستدان پشتگیری ئەو حەقیقەتە دەکەن کە ئێمە باسمان کرد لەو راپۆرتە نهێنی‌یەدا کە سێ مانگ دوای مانگرتنەکە «س. ج. ئەدمۆندس»ی راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ بو شەخسی مەلیکی ناردووە دەڵێ: «ناشێ سیاسەتمەدارەکان ئەو مانگرتنەیان رێك خستبێ. بەڵکو سەرکردە پیشەیی‌و سنعاتکارانی بەغدا سازیان کردووە. ئەوەندە هەیە سیاسەتمەدارەکان سوودی زۆریان لە ورەی پیشەوەرو سنعاتکاران وەرگرتووەو بە هۆی نوماییندەکانی خۆیانەوە، ئەوەی ویستوویانە دەریان بڕیوە. بڕوانە: «المركز الوطني للوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، رقم الملفة: د/٦/٣، موضوع الملفة، الداخلية ١٩٣١».
٤٧٩ ـ بڕوانە «العراق» ١١ و ١٣ و ٢٠ و ٢١ و ٢٨ ـ ٣٠ تموز ١٩٣١. ژمارە کانی رۆژنامەی «صدى العهد» یش لەو ماوە یەو دوای ئەوەیش «تا ئەیلوولی ١٩٣١» پڕیەتی لە هێرش بۆ سەر ئەپۆزیسیۆن و بە تایبەتی بۆ سەر حزبی برایی نیشتمانی‌ی «الاخاء الوطني» بە بیانووی ئەوەی گوایە رووداوی مانگرتنەکەی قۆستووەتەوەو بۆ خزمەتی نەخشە سیاسی‌یەکانی خۆی بەکاری هێناوە. «موزاحیم ئەلپاچەچی» یش لە بەردەمی پەرلەمان‌داو بۆ بەرگری کردن لە هەڵوێستی خۆی دەستی بۆ ئەو مەسەلەیە راکێشاوەو هەمان شت دووبارە دەکاتەوە. بڕوانە «محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣١، ص ٤٤».
٤٨٠ ـ چاو پێ کەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزاز؛ سامي عبدالحافظ القيسي، ياسين الهاشمي ودوره في السياسة العراقية بين عامي ١٩٢٢ ـ ١٩٣٦، الجزء الثاني، بغداد، ص ١٤٤.
٤٨١ ـ دەربارەی رزگارکردنی «نووری سەعید»و ستایش کردنی زیرەکی‌ی ئەو کە چۆن «چارەسەری هەموو ئەوشتانەی کرد کە موزاحیم ئەلپاچەچی لە کەڵکی خستبوون» بڕوانە: محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣١ ص ٣٥ ـ ٤١.

٤٨٢ ـ هەر ئەو سەرچاوە ل ٥١٧ ـ ٥٣٨.
٤٨٣ ـ هەر ئەو سەرچاوە ل ٤٣.
٤٨٤ ـ بروانە «العراق» ٣٠ تموز ١٩٣١.
٤٨٥ ـ «صدى العهد» ٧ تموز ١٩٣١.
٤٨٦ ـ «صدى العهد» ١٤ تموز ١٩٣١.
٤٨٧ ـ بروانە. «محاضر مجلس النواب، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٣٥ ص ٤٣٧».
٤٨٨ ـ K. M. Langeley, OP, Cit, P. 73.
٤٨٩ ـ Ibid, P. 37.
٤٩٠ ـ کەم کردنەوەی بەهای کارەبا کە ئامانجی سەرەکی ی «مقاطعە» کەبوو، بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ پەرژەوەندی کرێکاراندا نەدەگونجا، چونکە ئەوانە لە بنەڕەتەوە کارەبایان بەکار نەدەهێنا، بەڵکو پەیوەندی بە پەرژەوەندی‌یەکانی چینی بۆرژواوە هەبوو، بە تایبەتی خاوەن وەرشەو کارگەکان کە خەریك بوون بە ئەندازەیەکی لە جاران زیاتر کارەبا بەکار بهێنن.
٤٩١ ـ بروانە: محاضر مجلس النواب، إجتماع سنة ١٩٣١ ص ٤٥».
٤٩٢ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٤٩٣ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٤٩٤ ـ بروانە: «صادق قدير الخباز ـ نصف قرن من تاريخ الحركة النقابية في العراق ص ٣٨.
٤٩٥ ـ بۆ زیاتر تێگەیشتن بروانە: «عبدالرزاق عبدالدراجي، جعفر ابو التمن ودوره في الحركة الوطنية في العراق، ص ٣٠٦ ـ ٣١٨.
٤٩٦ ـ رۆژنامەی «الاستقلال» گۆشەیەکی بەم ناونیشانە تەرخان کردبوو.
٤٩٧ ـ بە نموونە، بروانە: «الاستقلال» ١٠ كانون الاول ١٩٣١.
٤٩٨ ـ بروانە: «محاضر مجلس النواب، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٣٥ ص ٤٤٢».
٤٩٩ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ٨/٢٢ و ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.
٥٠٠ ـ لەو کاتەدا هێزەکانی ئەپۆزیسیۆن خۆیان چەند جارێك دەستیان بۆ ئەو هەزاران کرێکارە راکێشا کە لە ناو کۆمپانیا بیانی‌یەکاندا ئیشیان دەکردو چۆن لە سایەی ناخۆشترین هەلو مەرجی کارکردندا، دەچەوسێنرانەوە. بروانە سەرووتاری «الاخاء الوطني» ١٦ آذار ١٩٣٤.
٥٠١ ـ «محاضر مجلس النواب، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٣٥ ص ٤٤٣.
٥٠٢ ـ بروانە: «سامي عبدالحافظ القيسي، ياسين الهاشمي ودوره في السياسة العراقية بين عامي ١٩٢٢ ـ ١٩٣٦».
٥٠٣ ـ قسەی «ئیبراهیم حیلمی ئەلعومەری»یە. بروانە «العامل» العدد الأول، ٨ أيلول ١٩٣٠.
٥٠٤ ـ چینی رەش و رووت.
٥٠٥ ـ «الاهالي» ١٥ نيسان ١٩٣٢.
٥٠٦ ـ «نداء العمال» العدد الأول ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠، ص ٢.
٥٠٧ ـ «العامل» العدد الاول ٨ ايلول ١٩٣٠ ص ٤.
٥٠٨ ـ بروانە: «العراق» ٢٠ تموز و ٢٧ تشرين الثاني ١٩٢٨؛ «العالم العربي» ٦ آذار ١٩٣٠، «صوت العراق» بغداد ١٠ تشرين الاول ١٩٢٩.

٥٠٩ ـ هەڵەیەکی زمانەوانییە. راستمان کردووەتەوە.

٥١٠ ـ بڕوانە «العراق» ٢٠ تموز ١٩٢٨.

٥١١ ـ «الحاصد» بە گۆڤارێکی سەرکەوتوو دادەنرێ. نووسەرو شاعیر «ئەنوەر شائوول» لە ١٤ شوباتی ١٩٢٩ دا دەری کرد.

٥١٢ ـ گۆڤاری «الشباب» لە سەرەتای ژمارەی یەکەمیدا ١٦ ئاب ١٩٢٩، ووتارێکی «یووسف رەجیب»ی بڵاو کردەوە ناونیشانەکەی «تازەترین رێگا بۆ لە ناوبردنی هەژارییو سوال کردن، تۆ بڵێی حکوومەتی عیراقیش ئەو رێگایە بگرێ ؟» بوو.

٥١٣ ـ لەو ناوانەی کە بە زۆریی لە رۆژنامەی ئەو سەردەمەدا نووسراونو «ئەلقەزاز» پشدووپاتیان دەکاتەوە، «ئەحمەد حەققی ئەلحیللی» و «عەبدولفەتتاح ئیبراهیم» و «حسەین ئەلرەحال»و «عەبدوڵڵا جەددوع» و «مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید» و «مستەفا عەلی» و «عەلی حەیدەر سلەیمان» و «ئیبراهیم ئەلقەزاز» و خەڵکی تره.

٥١٤ ـ بە تایبەتی «عەبدولفەتتاح ئیبراهیم» و «عەبدوڵڵا جەددووع». چاو پێ کەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/١.

٥١٥ ـ چاو پێ کەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/١. «العالم العربي» ١٨ آب و ٥ و ١٤ ايلول ١٩٢٩ و ٢٥ و ٢٩ كانون الثاني و ٢٥ شباط و ١٢ حزيران و ٢٦ تموز ٣ آب ١٩٣٠. «السياسة» ٢٣ شباط ١٩٣١.

٥١٦ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٢.

٥١٧ ـ «حسەین ئەلرەحال» لەو تاکوتەرا رۆشنبیرانە بوو کە زوو بیروباوەڕی سۆشیالیزم کار بی تێ کردبوو، بۆ خوێندن چووەتە ئەستەموولو لەوێوە چووە بۆ ئەڵمانیاو بە هۆی تێکەڵ بوونی بە سۆشیالیستەکانەوە، ئەو بیرو باوەڕەی وەرگرتووە. پاش جەنگی یەکەمی جیهان گەڕاوەتەوە بۆ عیراقو هەندێ سەرچاوەی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوەو لەتەك چەند رۆشنبیرێکدا بەنهێنی لە ژوورەکەی باوکی «مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید» لە مزگەوتی «حەیدەرخانە» خوێندوویانەتەوە، چونکە باوکی «ئەلسەیید» ئەو کاتە خوتبە خوێنی مزگەوتی ناوبراو بووە. هەر وەك یەکێك لە ئەندامانی ئەو ئەڵقە رۆشنبیرییە دووپاتی دەکاتەوە، ئەگەرچی ئەوانە هەروا بە ئاسانیی لە ناوەرۆکی ئەو کتێبانە تێ نەدەگەیشتن، بەڵام تاڕادەیەك کاریان لە هەڵوێستو شێوەی تێڕوانینیان بەرامبەر بە ژیان، کرد. بەتایبەتی هەڵوێستیان لە چینی زەحمەتکێشان. «چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ ئیبراهیم عەبدولجەببار ئەلقەزاز. عبد اللطيف عبدالرحمن عبدالمجيد، الفكر الاشتراكي في الأدب العراقي ١٩١٨ ـ ١٩٥٨، رسالة دكتوراه، بغداد، ١٩٧٨، ص ١٨ ـ ٢٧.

٥١٨ ـ دەربارەی «مەحموود ئەحمەد ئەلسەیید» بڕوانە بەشی «رۆژنامەو هۆیەکانی تری راگەیاندنی کرێکاران».

٥١٩ ـ رۆژنامەی «نداء العمال» وەك کەسێکی سەر بە بزووتنەوەی کرێکاران، بە خوێندەوارانی ناساند. بڕوانە: «نداء العمال» العدد الأول، ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠ ص ٢.

٥٢٠ ـ «ئیبراهیم ئەلقەزاز» هاوڕێی هەرە نزیکی «حسەین ئەلرەحال» و «مەحموود ئەحمە ئەلسەیید» بووە. لە ئەڵقە رۆشنبیرییەکەی مزگەوتی «حەیدەرخانە» دا بە شداری کردووەو بە هەموو توانایەوە پشتگیریی «محەممەد ساڵح»ی برا بچووکی کردووەو لەسەر «کۆمەڵەی سنعاتکاران»ی کردووەتەو هامشۆی کۆڕەکانی کردووەو جاروباریش ووتاری خوێندووەتەوە. زۆر پەرۆشی پیشەسازیی نیشتمانیی بووەو لە ساڵی ١٩٢٣وە، واتە لەو ساڵەوە کە کتێبی «الابجديات»ی بڵاوکردەوە بە گەرمیی پشتگیری ئەو مەسەلەیەی کردووەو هانی داوە. «چاو پێ کەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٢ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزاز؛ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ ئیبراهیم عەبدولجەببار ئەلقەزاز».

٥٢١ ـ محەممەد ساڵح هەلقەزاز، ئەوەی دووبارە کردەوە کە ئەوانە ڕۆڵێکی گەورەیـان لە هوشیـار کردنەوەی کرێکاراندا بینیو لە قۆناغی یەکەمی دروست بـوونیدا کاریـان لە بزووتنـەوەی کـرێکارانی عیـراق کرد. «چـاو پێ کەوتنی ڕۆژی ١ و ١٩٧٩/٨/٢٢ لەگـەڵ محەممـەد ساڵح ئەلقەزاز».

٥٢٢ ـ «العامل» العدد الأول ٨ ايلول ١٩٣٠ ص ٣.

٥٢٣ ـ «نەهرۆ» مەبەستی لە پیشەوەرانە.

٥٢٤ ـ لە دەقەکەدا نووسراوە: چووونە کۆڵیان.

٥٢٥ ـ بڕوانە: «الحاصد العدد السابع، السنة الثانية، ١٤ آب ١٩٣٠ ص ١٠ ـ ١١.

٥٢٦ ـ بڕوانە: «العامل» الاوول، ٨ ايلول ١٩٣٠ ص ٣.

٥٢٧ ـ بۆ زیاتر تێگەیشتن بڕوانە: «فؤاد حسين الوكيل، جماعة الأهالي في العراق» بغداد ١٩٧٩.

٥٢٨ ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤٣ ـ ٢٤٧.

٥٢٩ ـ بڕوانە: «الأهالي» ١٥ نيسان ١٩٣٢.

٥٣٠ ـ «الاهالي» العدد الأول، ٢ كلنوون الثاني ١٩٣٢.

٥٣١ ـ بڕوانە: «الأهالي» ٢ تموز ١٩٣٢.

٥٣٢ ـ بڕوانە: «فؤاد حسين الوكيل، جماعة الأهالي في العراق» بغداد ١٩٧٩ ص ٢٤٣.

٥٣٣ ـ چاو پێکەوتنی ڕۆژی ٧/٣١ و ١٩٧٩/٩/٨.

٥٣٤ ـ دەقی نامیلکە کە لە لاپەڕە ٤ ـ ٧ی کتێبی «تاريخ الحزب الوطني الديمقراطي»ی دکتۆر «فاضل حسين» دا بلاو کراوەتەوە.

٥٣٥ ـ «کۆمەڵەی ڕیفۆرمی میللی» بە درێژە پێدانی گرووپی «الأهالي» دادەنرێ. دوای ئینقلابەکەی ساڵی ١٩٣٦ بە ڕەسمیی مۆڵەتی ئیش کردنی پێ درا.

٥٣٦ ـ بە تایبەتی ئەوەی ئینگلتەرا.

٥٣٧ ـ بە نموونە، بڕوانە: «نداء العمال» العدد الاول ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠ ص ٨ ـ ٩.

٥٣٨ ـ ناوی ووتارەکە «پێویستیی پاڵەوانو کردار دەخـولقێنێ». ڕۆژنامـەکە بـاسی «ماکـدۆناڵد»ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا دەکا. شایانی باسە ئەو پیاوە پالێوراوی پارتی کرێکارانی بەریتانیا بووو. بڕوانە «العلم العربي» ٤ تموز ١٩٢٩.

٥٣٩ ـ بڕوانە: «العمال» العدد الأول، ٥ ايلول ١٩٣١.

٥٤٠ ـ هەڵەیەکی زمانەوانییە، ڕاست کراوەتەوە.

٥٤١ ـ «العمال» العدد الأول ٥ ايلول ١٩٣١.

٥٤٢ ـ چاو پێکەوتنی ڕۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ محەممەد ساڵح ئەلقەزازدا.

٥٤٣ ـ «العمال» العدد الأول ٥ ايلول ١٩٣١.

٥٤٤ ـ لەو شوێنەدا کە باسی چالاکیی ڕاگەیاندنی کرێکارانمان کردووە، لەوە دواین کە بڕیـار وابوو ڕۆژنامەی «العمال» ببێتە زمانی حاڵی «حزبی کرێکاران». ئەم حەقیقەتانەیش پشتیگیریی هەموو ئەو بۆچوونانە دەکەن، کە ئێمە دەرهەق بەم حزبەو ئـەوانەی هـەوڵیان بـۆ دەدا، باسمـان کردبوون.

# کۆتایی

ئەو زانیاری‌یانەی لە دوو توێی هەر چوار بەشەکەی ناو ئەو کتێبەدا نووسراون، دەتوانن بمانگەیەننە چەند ئەنجامێکی بنەڕەتی لەبارەی مێژووی کرێکارانی عیراقەوە، هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە تا کۆتایی هاتنی ئینتیدابی بەریتانی. بەر لە هەموو شتێك چینی کرێکارانی عیراق لەچاو زۆربەی وولاتانی ناوچەکەدا درەنگتر دروست بووە، ئەمە جگە لەوەی نەش‌ونما کردنی بەو سستی‌یەی کە بەخۆیەوە دی، کارێکی زۆری کردە سەر چۆنیەتی دەرکەوتنی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق‌و سروشتی گەشە کردنی.

بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق شان بەشانی بزووتنەوەی نیشتمانی‌ی دژ بە ئیمپریالیزم‌و ئەو هێزانەی لە پاشکۆی‌دا بوون، پەرەی سەندووە. لەو رۆژگارەدا عیراق مانگرتنی سەربەخۆی کرێکارانەی وەك ئەوەی لە وولاتە ئەوروپایی‌یە گەشە کردووەکان‌دا روویان‌دا، نەدیبوو. تەنانەت بزووتنەوەیەکی کرێکارانەی وەك ئەوانەی وولاتانی ئەمریکای لاتین‌و هەندێ وولاتی ئاسیایی هیندوستان ئاسا نەهاتبووە گۆرێ. هۆی بنچینەیی ئەم دیاردەیەیش لاوازیی چینی بۆرژوای نیشتمانی‌ی بوو کە لە لایەن هەمان ئەو داموو دەزگایانەوەکە کرێکارانیان دادەدۆشی‌ی، دەچەوسێنرانەوە. ئەمە لەلایەك‌و لە لایەکی تریشەوە چینی کرێکارانی عیراق لە رووی چەندیەتی‌و چۆنیەتی‌یەوە لاواز بوو. لەبەر ئەوە هەرچی بزووتنەوەیەکی سەربەخۆی بەرپا بکردایە، نەیدەتوانی دەستکەوتێکی هەست پێکراو وەدەست بهێنێ. بە نموونە: کرێکارانی رێگای ئاسن تاوەکو لە تەمووزی سالی ١٩٣١ دا تێکەلی بزووتنەوەیەکی نیشتمانی‌ی فراوانتر نەبوون کە مانگرتنە گشتی‌یەکەی دژ بە «یاسای رەسمی شارەوانی‌یەکان»ە، نەیتوانی بگاتە ئەنجامێکی چەسپاوی ئەوتۆ شیاوی باسکردن بێ. بەو جۆرە بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق لە دوو توێی ئەم باسەمان‌دا، نەبووەتە بزووتنەوەیەکی سیاسی سەربەخۆ.

بە حوکمی ئەم واقیعە چینی کرێکارانی عیراق توندو تۆل بە هێزە کۆمەلایەتی‌یەکانی ترەوە گرێ درابوو، لە هەمان کاتیش‌دا کەوتبووە ژێر کارتێکردنی

هەڵوێستو فەرمانی ئەوانەوە، بێ ئەوەی ئەم لە سنووریکی تەسکدا نەبێ، بتوانێ کار لەوان بکا. چینی بۆرژوای بچووکیش کە لە توێژە رۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکەیدا خۆی دەنواند، نزیکترین هێزی سیاسی بوو لەم چینەوە. دوای ئەویش چینی بۆرژوای نیشتمانیی بوو کە بە حوکمی ئەو واقیعەی تێیدا دەژیا. نەیتوانی سەرکردایەتی خەباتی کرێکاران بکا، نەك هەر ئەوەیش بەڵکو دەستەوسانیش بوو لەوەی لە چوار چێوەیەکی تەسکدا نەبێ کار بکاتە سەری.
ئەوی راستیی بێ چینی بۆرژوای نیشتمانی خۆیشی هەوڵی ئەوەی نەدا لە رووی ئایدۆلۆژی یەوە نەبێ، بەلام لە سنووریکی ئێجگار دیاری کراودا، کار بکاتە سەر ئەم چینە؛ ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی نەتوانێ تاسەر چینی کرێکاران بەلای خۆیدا رابکێشێ، بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە هەندێ ووڵاتی تری وەك «توونس»و «مەغریب» رووی دا.
بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا بە دەست کۆمەڵێك ناتەواوییەوە کە لەواقیعدا شتێکی سرووشتیی بوون، دەیناڵاند. چی بزووتنەوەی کرێکارانیش هەیە کە لە باروزرووفێکی وادا پێکهاتبێ، دووچاری ئەو تەنگو چەڵەمانە بووە. نزمیی ئاستی هوشیاریی کرێکارانو پەیوەندی بەتینی بەشێکی زۆری ئەوانە بە لادێوەو چەندین هۆی تری لەو بابەتە، ماوەیان نەدا ریگای راستی خەبات وەك شێوەیەکی بنەڕەتیی بدۆزنەوەو بە هۆیەوە کەمێك ئەو قورسایییە گەورەیە لەسەر خۆیان کەم بکەنەوە کە بە دەگمەن وێنەی دەست دەکەوت.[1] بەڵگەی ئاشکراو دیاریش بۆ سەلماندنی ئەم حەقیقەتە زۆرنو هەموویشیان پەیوەندییان بەو سەردەمەوە هەیە. بە نموونە: رۆژنامەی «نداء العمال» دانی بەوەدا ناوە کە «کرێکارانی ئەم ووڵاتە تازە لەگەڵ سیستەمی کۆمەڵایەتی ئاشنایەتییان پەیدا کردووەو لەتەك ئەو ئەرکانەدا پێیان دەسپێردرێ تاقیکردنەوەیان کەمە».[2]
ئەم ناتەواوییو کەمو کوڕییانە لە سەرپاکی ئەو رێکخراوانەدا رەنگیان دایەوە کە لوتکەی هوشیاریی کرێکاران لەو قۆناغەدا دروستیان کردبوو. کرێکاران هەر ئەوەندەیان دەویست «چەند کۆمەڵەیەك بەناوی جیا جیاوە پێك بهێنن، بێ ئەوەی پرۆگرامێکیان هەبێ ئیشی لەسەر بکەنو پشتی پێ ببەستن».[3] هەندێ جاریش تاقە کەسێك سەرکردایەتی چەند کۆمەڵەیەکی دەکرد وەك «عەبدوللا ئەلبەدری» کە لەیەك کاتدا سەرۆکی «کۆمەڵەی کرێکارانی چاپخانەکان»و سکرتێری «یەکێتیی کرێکارانی عیراق» یش بوو.[4] ئەمە بێجگە

لەوەی کە چەندین جۆر بەربەرەکانێ و ناکۆکی لە نێوان ئەو کۆمەڵانەو[5] «تەنانەت لە نێوان ئەنداماني یەك کۆمەڵدا پەیدا بوون». ئەم دیاردەیە وای لە رۆژنامە نیشتمانی یەکان کرد، داوا لە کرێکارا بکەن واز لە دووبەرەکی ی بهێنن، چونکە «هیچ سەرکەوتنێك لەگەڵ دووبەرەکی ی دا دەستگیر نابێ».[6] لەبەر ئەوە ئەگەر لەسایەی ئەو بارودۆخەدا زۆربەی ئەو کۆمەڵانە نەیانتوانیبێ ماوەیەکی دوورو درێژ خۆیان رابگرن و «پیش ئەوەی تەمەنیان بگاتە ساڵەوەختینە لە کار کە وتبن»[7] شتێکی سرووشتی ی بووە. جاری وایش هەبوو ئەندامانی ئەم کۆمەڵانە ئیلتیزامیان بەو بڕیارانەوە نەدەکرد کە تەواو لەگەڵ پەرژەوەندی یەکانیاندا دەگونجان، بەنموونە: سەرتاشەکان ئەو بڕیارەیان نەبردە سەر کە کۆمەڵەکەیان دابووی و رۆژانی دوو شەممەی کردبوو رۆژی حەوانەوەو پشوودان. ئەنجام ناچار بوو دوای سێ مانگ کەمتر لەو بڕیارەی پاشگە زببێتەوە.[8]

سەرەرای هەموو ئەمانە، مێژووی بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە، پڕیەتی لە تاقیکردنەوەی بەسوودو لاپەرەی پرشنگدار، چونکە «کرێکارانی عیراق لە خەوی چەند ساڵە راست بوونەتەوەو خەریکن بیر لە چارەنووسی خۆیان بکەنەوە، هوشیاری و بیرکردنەوەیش گرنگترین دەستپێشخەریی ژیانن» وەك رۆژنامەی «الحاصد»ی ئەو رۆژگارە بەو شێوە دڵتەزێنە دەری دەبڕێ.[9] لەو رۆژەوە کرێکارانی عیراق بۆ یەکەمین جار هەستیان بە سەنگی کۆمەڵایەتی خۆیان کردو رۆژ بە رۆژیش باشتر شارەزای شێوەکانی زۆرانبازیی و مل ملانە کردن لە پێناوی مافەکانیاندا بوون و بە هوشیاری یەکی لە جاران زیاترەوە هاتنە مەیدانی نیشتمانی یەوەو توانی یان رۆڵی بنچینەیی لە رووداوی زۆر گرنگدا ببینن و لەسالانی سی دا سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیاندا رابکێشن. ئەو رووداوانەی کە هێندە گرنگ و بایەخدار بوون هێزە نیشتمانی یەکانی تریان وا لێ کرد چەند جارێك واقیع ئاوەژوو بکەنەوەو خۆیان بە سەرکردەو بزوێنەریان لە قەڵەم بدەن. وەك چەند جارێك لەتەك مانگرتنە گشتی یەکەی دژ بە یاسای رەسمی شارەوانی یەکان رووی دا. بە هەر حاڵ ئەمەیش دیاردەیەکە لە مێژووی مرۆڤایەتی دا بە گشتی ی زۆر جار رووی داوەو شتێکی دانسقەو دەگمەن نی یە.

سەرەرای لاوازیی سەرکردایەتی یەکەی کرێکاران، رووداوەکانی ئەو قۆناغە سەرکردەی ئەوەندە دلسۆزیان هێنایە کایەوە، هەموو ژیانی خۆیان بۆ

مەسەلەی کرێکاران تەرخان کردبوو، لە پێش هەموویشیانەوە یەکەمین کەسی نیقابی «محەممەد سالح ئەلقەزاز» ە کە «رزگارکردنی کرێکارانی عیراق لەوکۆت و پێوەندەی تێ ی ئالاوە، بە تاکە مەبەستی خۆی دەزانی»[10] و بەئازایەتی و خۆڕاگرتن ناوبانگی دەرکردبوو. هەر لەبەر ئەوەیش بوو چەند جار تووشی راوەدوونان هات و بۆ «سلەیمانی»و «عانە» و «دیالە» دوور خرایەوەو لە ئەنجامی ئەو ٤١ داوایەی رژێم لە سەری تۆمار کردبوو، نزیکەی چوار ساڵ لە بەندیخانەدا توندکراو تا ساڵی ١٩٥٤ رێگای نەدرا لە عیراق بچێتە دەرەوە.[11] لە خۆڕایش نی یە کە دەسەلاتدارانی سەردەمی پاشایەتی تا ئەمرۆیش دانی لێ دەکرۆژن و رقیان لێ یەتی. ئەوەتا لە یادداشتی یەکێک لە سەرۆک وەزیرانی سەردەمی پاشایەتی دا، بە «بێ شەرم و لە خۆبایی» وەسپ کراوە، لە بەر هیچ نا، تەنها لەبەر ئەوەی لەکاتی «مقاطعة» کردنی «کۆمپانیای کارەبای ئینگلیزی»دا ساڵی ١٩٣٣ سوور بوو لەسەر هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانەی خۆی و وەڵامی هەرەشەو گوڕەشەی سەرۆك وەزیرانی بەم جۆرە دایەوە: «ئێمە لەکەس ناترسین»[12]. دیارە ئەمەیش گەواهی ئەوەیە کە ئەو پیاوە بە هەموو توانایەوە دڵسۆزو پێ داگرتوو بووەو لێپرسراوانی ئەو سەردەمەیش فێری ئەوە نەبوون گوێیان لەشتی وا بێ.

بەرامبەر بەمە، خەڵکی ئەوتۆیش هەبوون هەر کە هەستیان کرد مەترسی یان کەوتووەتە سەر، بە زوویی کشانەوەو دەستبەرداری کرێکاران بوون. هەیشیان بوو ئەوەندە بە گەرمی یەوە بەرگری لە مەسەلەی کرێکاران کرد گەیاندی یە رادەی زێدە رۆیی وەك «عەبدولقادر ئەلسەییاب»، کەچی هەر ئەوەندەی ئاوڕێکی لێ درایەوە «لە پەرلەماندا بووە نوێنەرێکی سەرەرۆ»، وەك «ئەلقەزاز» وەسپی دەکا.[13] دەبێ ئەوەیش لەیاد نەکرێ کە لەو رۆژگارەدا کرێکارێکی عیراقی نابینین لە رووی ئابوری یەوە ئەوەندەی کەڵەکە کردبێ، بووبێتە بۆرژوا. ئەم دیاردەیەیش ئەوە دەگەیەنێ کە پەرەسەندنی سەرمایەداری لە وڵاتدا نەگەیشتبووە ئەو رادەیەی چینی بۆرژوای نیشتمانی ی پێویستی بە توێژێکی کاریگەری کرێکاران بێ و ئیمتیازی گەورەیان بداتێ و بەهۆیانەوە شێوەی ژیان و شێوازی بیرکردنەوەیان بگۆڕێ و لە چینەکەی خۆیان هەڵیان بگیرێتەوە.* تا درەنگانێکیش ئەم دیاردەیە لە کۆمپانیای نەوتدا و لە سنوورێکی زۆر تەسکدا نەبێ، دەرنەکەوت، ئەمانەیش ژمارەیەکی کەم لەو کرێکارە تەکنیکی یە بە ئاین نامووسڵمانانە بوون کە دوایی بوونە خاوەنی قەشەنگترین چێشتخانەو ئوتێل و کۆگای گەورە گەورە لە پایتەختدا.

بزووتنەوەی کرێکارانی عیراق لە سەردەمی ئینتدابدا ، هەندێ دەستکەوتی بۆ چینی کرێکاران وە دەست هێنا . بەر لە هەرچی ، بوونی ئەم چینەی چەسپاندو سەرنجی هەموو چین و توێژە کۆمەڵایەتی یەکانی تری بەلای خۆیدا راکێشاو پێی سەلماندن کە هێزێکی نوێیەو توانای زۆروسەنگی خۆی لە هەموو بوارەکانی ژیانی ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسیدا هەیە . دەولەتیش نەیتوانی ئەم چینەو پەرژەوەندی یەکانی پشت گوێ بخا کە لە ساڵی ١٩٣٢ بە دواوە خۆی بەسەر پرۆگرامی وەزارەتە یەك لەدوای یەکەکانی وولاتدا سەپاند بوو.[١٤] دوای کۆتایی هاتنی ئینتیدابیش چەند یاسایەك بۆ چارەسەرکردنی مەسەلە جیا جیاکانی کریکاران دەرچوون ، وەك « یاسای قۆرخ کردنی پیشە بۆ عیراقی یەکان . ژمارە ـ ٢١ ـ ساڵی ١٩٣٦ » و « یاسای کار ژمارە ٧٢ ی ساڵی ١٩٣٦ » . لە ساڵی ١٩٣٧ یشدا عیراق دانی نا بە « رێککەوتنامەی کاری دەوڵەتان » ی ژمارە ـ ١٨ ـ ی ساڵی ١٩٢٥ ، تاوەکو پارە بدرێ بەو کرێکارانەی بەهۆی پیشەکەیانەوە تووشی نەخۆشی دەبن یاخود کەفتەکار دەکەون . دوای ساڵێکیش رێککەوتنامەی دەستکاری کراوی ژمارە ـ ٥٨ ـ ی ساڵی ١٩٣٦ ی مۆر کرد کە پەیوەندی بە دیاری کردنی تەمەنی منداڵانەوە هەبوو لە پیشەسازی کەشتی دروستکردندا. بێجگە لەمانە دەولەت هەر لەو ماوەیەدا چەند بڕیارێکی تری لەو بابەتەی دەرکرد.

بەرامبەر بەم بڕیارانە کە سەرەرای کەم و کوڕی و ناتەواوی یان دەستکەوتێکی گرنگ و بەرهەمی خەباتی کرێکاران بوون، دام و دەزگای دەولەت هەولێکی زۆریاندا بە هۆی چەند بڕیارو یاسایەکی نا دیموکراسی یانەوە، کۆسپ و تەگەرە بخەنە بەردەم رەوتی گەشە کردووی بزووتنەوەی کرێکاران و[١٦] تێکڕای بزووتنەوەی نیشتمانی یەوە.

ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ چینی کرێکاران خەریکە بەخۆیدا بێ، بە شێوەیەکی وا ترس و لەرزی خستە دڵ و دەروونی دەسەلاتدارانەوە.

بەلام گرنگترین دەستکەوت کە چینی کرێکارانی عیراق لە ئەنجامی خەباتی ساڵانی پێش کۆتایی هاتنی ئینتداب وەدەستی هێنابێ ئەوە بوو، دەرس و تاقیکردنەوەیەکی باشی لە رووداوەکانی ئەو قۆناغە وەرگرت. بەمەیش یارمەتی کرێکارە هوشیارەکانیدا، تاوەکو لە داهاتوودا گەشە بە شێوەی ئیش کردن و خەباتیان بدەن و رقی پیرۆزیان بەرامبەر بە ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانی تیژتر

بکەن و تەنانەت لە ماوەیەکی کەمدا بوونە داینەمۆی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی نیشتمانیی گەلی عیراق. ئەمە جگە لەوەی کە بزووتنەوەی کرێکاران خۆی چەند هەنگاوێکی نوێی بۆ پێشەوە ناو بە شێوەیەکی تایبەتی لە رەوتی چوونە پێشەوەو گەشە کردنیدا رەنگیان دایەوە.



١ ـ «ئەلقەزاز» ئەو دەگێڕێتەوە کە چۆن خۆی و هاوەڵەکانی هەتا مانیان بە کرێکارانی رێگای ئاسن گرت، چەند کۆسپ و تەگەرەیان هاتەرێ.
چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٧/٣١ لەگەڵ «محەممەد سالح ئەلقەزاز»دا.
٢ ـ «نداء العمال» العدد الأول ٢٢ تشرين الثاني ١٩٣٠ ص ١.
٣ ـ هەر ئەو سەرچاوە ل ٣.
٤ ـ چاو پێ کەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ محەممەد سالح ئەلقەزازا.
٥ ـ لە چەند شوێنێکی تردا، ئەوەمان ئاشکرا کردووە کە رژێم دەورێکی بالای لە دووبەرەکی ی ونلکۆکیی ناوەوەدا هەبوو لە ناو کرێکاراندا.
٦ ـ «الحاصد» العدد الثالث، السنة الثانية، ٧ آب ١٩٣٠، ص ٦.
٧ ـ «الاستقلال» ٢٣ شباط ١٩٣١.
٨ ـ بڕوانە: «العالم العربي» ٢٠ آب و ٢ ايلول و ٦ تشرين الاول ١٩٢٩.
٩ ـ «الحاصد» العدد الثالث، السنة الثانية، ٧ آب ١٩٣٠ ص ٦.
١٠ ـ «العالم العربي» ١٦ آب ١٩٣٠.
١١ ـ چاو پێکەوتنی رۆژی ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ «ئیبراهیم عەبدولجەببار ئەلقەزاز». چاو پێ کەوتنی رۆژی ٧/٣١ و ١٩٧٩/٩/٨ لەگەڵ «محەممەد سالح ئەلقەزاز». لە رۆژنامەکانی ئەو کاتەدا، زۆر شتی تێدایە باسی چەوساندنەوەی ئەلقەزاز دەکەن.

١٢ - بڕوانە «ناجي شوكت، سيرة وذكريات ثمانين عاماً ١٨٩٤ - ١٩٧٤، الطبعة الثالثة، بيروت ١٩٧٧، ص ٢٤٧ - ٢٤٨. «ئەلقەزاز» لە گۆڤاری «وعي العمال» دا وەڵامی داوەتەوە.

١٣ - چاو پێکەوتنی ڕۆژی ٢٢/٨/١٩٧٩ لەگەل «محەمەد سالح ئەلقەزاز»دا.

* لە قۆناغێکی دیاری کراودا کە سەرمایەداریتی ترسی تەواو لە کرێکاران پەیدا دەکیا، ناچار دەبێ توێژێکیان لێ هەڵبگیرێتەوە. ئەوانە لە لایەن چینی بۆرژواوە ئیمتیازی جۆر بە جۆریان دەدرێتێو دەبنە دەم راستی کرێکاران، لە کاتێکدا فریان بە سەر کرێکارانەوە نەماوە. چینی بۆرژوا بۆ تەفرەدانو دەستەمۆ کردنیان هیوایەکی زۆری بەم توێژە هەیەو ئەوانیش لە زۆر بواری کۆمەلایەتیو ڕۆشنبیریو سیاسیدا بەتەنگییەوە دێنو خزمەتی دەکەن، بۆیە پێیان دەگوترێ «کرێکاری ئۆرستۆکرات». - وەرگێر -

١٤ - مەسەلەی کرێکاران بۆ یەکەمجار لە پرۆگرامی وەزارەتەکەی «ناجي شەوکەت»دا کە لەسەرەتای تشرینی دوووەمی ساڵی ١٩٣٢ پێکهات، نووسرابوو. پرۆگرامەکە دووپاتی دەکاتەوە کە پێویستە ئیشو کار ڕێك بخرێو هەوڵ بدرێ ماڵ کرێکاران زامن بکرێ، بڕوانە: «العالم العربي» ١٧ تشرين الثاني ١٩٣٢.

١٥ - بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە: «محاضر مجلس النواب لسنة ١٩٣٥ ص ٧١ - ٧٢، معالجات عمالية ص ٧٤ - ٧٥.

١٦ - بەنموونە: بەشی پێنجەمی «یاسای سزا دانی ساڵی ١٩٣٥، بۆ مەسەلەی «کۆبوونەوەی ناڕەوا» تەرخان کردووە. لەو بەشەدا ئەووەندە سزا تۆمار کراون تا جارێکی تر ڕووداوی وەك مانگرتنە گشتییەکەی دژ بە ڕەسمی شارەوانییەکان، دروست نەبێتەوە. لێرەدا چاك وایە دەست بۆ ئەوەیش رابکێشین کە ئەم یاسایە لە سەردەمی «یاسین ئەلهاشمی» دا، دانرا. بڕوانە: «الدولة العراقية، محاضر مجلس النواب، الدورة الانتخابية الخامسة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٣٤ بغداد ١٩٣٥ ص ١٤٨».

# پاشکۆی ژماره «۱» *

* دکتۆر ئەم ووتارەی کاتی خۆی لە ژمارە ۷۲ی شوباتی ساڵی ۱۹۷۹ی گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ» دا بلاو کردبووەتەوە. جا لەبەر ئەوەی خۆی لە خۆی‌دا بەشێکی لە بچڕان نەهاتووی ئەم کتێبەیە هەربووڵا وامان بە چاک زانی لێرەدا بلاوی بکەینەوەو ژمارە «۱» پاشکۆی بدەینێ. وەرگێر -

## چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی چینی کرێکاری کورد

بە دەگمەن نووسەرانی خۆمان و بێگانە بیریان لە کرێکاری کورد کردووەتەوە. دوور نەڕۆین لە هیچ کامێك لە بەرهەمەکانی مامۆستا «ئەمین، زەکی ی» مێژوو نووسی گەورەمان دا زۆر و کەم ناوی کرێکاری کورد نەهاتووە. بێ گومان ئەمیش کەلێنێکی ترە لەو دەیان کەلێنانەی لە مێژووی نووسراومان دا هەن، بەلام کەلێنێکی گەورە !.. وا بزانم لە ڕاستی ی دوور ناکەومەوە گەر بلێم ئەدەبی کوردیش، بە داخەوە، لەو کەلێنە بێ بەش نی یە. کرێکاری کوردیش وەك ڕووناکبیرو جووتیارو هەموو خەڵکێکی تر خاوەن دڵ و هەستە، دڵی وەك هەموو کرێکارێکی تر ساف و هەستی وەك ئەوان بەرزە، ئەویش لە هەمووان زیاتر ئارەق دەڕێژێ و لە هەمووان هیلاك و بێ کات ترە، بۆیە کەمتر باسی خەڵك دەکاو زیاتر لە هیلاکی ی و دەردو ئازارو نەبوونی و بێ مافی دەگاو حەز بە یاریدەی هەموو لێقەوماوێك دەکا. تاڵ لای ئەو تاڵترو شیرین لای ئەو شیرینترە. لەزەت لە هەموو خۆراکێك دەبینێ. وەك هەمووان و رەنبگێ زیاتریش، حەز بە چاوی کاڵ و لێوی ئاڵ و گۆنای پڕ خاڵ بکا. کاتی بوایە ئەویش چاوباز دەبوو !. ژمارەیان زۆرو کێشەیان زۆرتر، بۆیە ژیانیان پڕ لە چیرۆکی بێ هاوتاو داستانی دانسقە وتابلۆی رەنگینە... حەیفە دەستی ئەدیبی کوردی دل پەڕەی گوڵ کە تالاوی زوخاوی ژیان زاخاوی مێشك و قەڵەمی داوە، زوو نەگاتە گەوهەرو ئەڵماسی ئەو خەزنە دەوڵەمەندە !.

لەم ووتارەدا هەوڵ دەدەین بە کورتی ی چەند روویەکی سەرەتای دروست بوون و هاتنە کایەی چینی کرێکاری کورد بخەینە بەر چاو کە دوور نی یە سەرنجی خوێنەر ڕاکێشن.

لە سەردەمی هەرە کۆنی شارستانیەتی مرۆڤەوە کرێکارو کری گرتە هەیە. بەلام هیچ کات و لە هیچ شوێن ئەو کرێکارە پەرش و بلاوانە نەبوونەتە هێزی

بنچینەیی هێنانە بەرهەم لەناو کۆمەڵدا تا پەیدا بوونی سەرمایەداری. لەگەڵ ئەمیاندا دوو چینی نوێ دێنەکایەوە - بۆرجوازیو کرێکار - لەبەر ئەوەش کە پەیوەندیی سەرمایەداری لە ئەوروپای رۆژئاوا بەر لەشوێنی تر دروست بوو، هەر لەوێش دەوروبەری سەدەی چواردەو پازدە بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئادەمیزاددا چینی کرێکار وەك هێزێکی دیاری کۆمەڵ هاتە ناوەوە.[1]

لە زۆربەی وولاتانیتر، تایبەت لە رۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاست، پەیدا بوونی چینی کرێکار زۆر لەوە دواکەوت. جۆر و هۆی دروست بوونەکەش گەلێك لەگەڵ ئەو جیاوازە. لە ئەوروپا ئاڵو گۆڕەکانی ناو کۆمەڵ چینی کرێکاریان دروست کرد، بەلام لە وولاتانی رۆژهەلات ئەو ئاڵو گۆڕانە بەهۆی تێکەڵ بوون بەبازاڕی سەرمایەدارییەوە کەمتر دەوریان بینی. لەسەدەی نۆزدەوە لێشاوی تێکەڵ بوونی وولاتانی رۆژهەلاتی نزیكو ناوەڕاست بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهان دەستی پێ کرد. ئەمەو گەیشتنی ژمارەیەك دەستکەوتی پیشەسازیی نوێی ئەوروپا بوونە هۆی دارشتنی بەردی بناغەی دروست بوونی چینی کرێکاری زۆربەی وولاتانی ئەم ناوچەیە.

لە کوردستان ئەم دیاردەیە لەبەر دوو هۆی گرنگ تا ڕادەیەك لەو وولاتانە دواکەوت، یەکەمیان: هێزی زۆری پەیوەندیی دەرەبەگییو پاشماوەی ژیانی کۆچەرییو نیمچە کۆچەریی ناو کۆمەڵی کورد بوو. ئەوی تریان نەبوونی دەربەندێکی سەربەخۆ بوو کە کەڵو پەلی کوردستانو بەرهەمی هێنراوی پیشەسازیی ئەوروپای تێدا کۆببێتەوەو پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر کرێکارو چەند کۆمپانیایەك بێ.

بەلام بەرامبەر بەوە، مەرجی تری پێویست بۆ دروست بوونی ئەم چینە تازەیە لە ئارادا بوون. یەکەمیان: دەولەمەندیی کوردستانە کە بەرهەمی کشتوکاڵو ئاژەڵیلە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە گەیشتە چەند بازاڕێکی گرنگی ئەوروپا. کەڵو پەلی دروست کراوی ئەوێش بە خێرایی گەیشتە کەلاترین شارو گوندی لای خۆیان. تەنانەت بەر لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە ئینگلیزەکان کۆمپانیای تایبەتییان لە شاریٍ وەك « دیاربەکر » دامەزراند. هەر لە خۆشەوە نییە « گ. ناپێر » پێش پەنجا ساڵ شاری کرمانشای ناو ناوە بەندەری کەڵو پەلی ئینگلیزیو هیندی.[2]

دووەمیان: پەرەسەندنی شارە کوردەکانو بەهێز بوونی پەیوەندیی بازرگانییان لەگەڵ شارانیترو پێشکەوتنی پیشەسازیی خۆماڵییانە. لەم

رووانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر کوردستان شان بە شانی مەلبەندەکانی تری ڕۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاست هەنگاوی بەرەو پێش چوونی دەنا. لە ڕێگەی ژمارەو بەراوردەوە دلنیا دەتوانین بلێین سەدەکانی ناوەند شارە کوردەکان لە گەلێت ڕووەوە، وەك شارانی تری ڕۆژهەلات پەرەی سەندو قەوارەی خۆی وەرگرت. گەڕیدەی تورکی ناودارو سەرچاوەی رەسەن «ئۆلیا چەلەبی ١٦١١ ـ ١٦٧٩» کە ناوەندی سەدەی حەڤدە هاتۆتە کوردستان لە بەرگی چوارەمی «سیاحەتنامە کەیدا»[٣] باسی گەورەیی ژمارەیەك شاری وەك «دیاربەکر» و «بدلیس» ی کردووە. ئەو بازاڕ و قەیسەرییانەی «دیاربەکر» کە ئەو باسیان دەکا ئەوسا لە زۆر ناوچەی ڕۆژهەلات کەم وێنە بوون. هەر بە پێی قسەی ئەو، «دیاربەکر» ١٢ گەرماو «حەمام» ی گشتی ی تێدا بووەو ١٤٠ مالیش گەرماوی خۆیان هەبووە. «بدلیس» ٥ گەرماوی گشتی ی و ٦٠٠ ی تایبەتی ی تێدا بووە. ئەم ژمارەیەی دوایی یان بەلگەی پڕمانای دەولەمەندی ی و ڕەفاهەتە.[٤]

دوای «ئۆلیا چەلەبی» بە دەورو بەری ١٥٠ سالێك نوێنەری ناوداری ئینگلیز لە عیراق «کلۆدیۆس جێمس ریچ» باسی چەند شارێکی تری کوردستانی کردووە. قسەکانی ئەویش بەلگەی مێژوویین دەربارەی ئال و گۆڕ و بەرەو پێش چوونی شارە کوردەکان. «سنە» ی بە ٥ هەزاز مال داناوە، کە هەر جۆر لێکی بدەیتەوە لە ٢٠ هەزار کەس تێدەپەڕی. مانای ژمارەیەکی وا زیاتر خۆ دەنوێنێ گەر بێت و بزانین ژمارەی دانیشتوانی شاری «قودس» سالی ١٨١٤ دەورووبەری ١٢ هەزار و بەغدا سالی ١٨٣١ نزیکەی ٢٠ هەزار و «عەممان» ی پایتەختی «ئوردن» یش سالی ١٨٨٠ تەنها هەزار کەس بووە.[٥]

**پەیوەندی بازرگانی ی نێوان شارەکانی کوردستان خۆی و ئەو مەلبەندو ناوچانەی لێوەی نزیك بوون بە پێودانی قۆناغی دەرەبەگی خراپ نەبوو. بە پێی سەرچاوە کۆنەکان تاوەکو سەدەی نۆزدەیش «ئەستەموول» و «دیمەشق» و «حەلەب» و «بێرووت» تارادەیەکی زۆر بە مەڕو بزنی کوردستان بەرێوە دەچوون. تەنها شاری «ئەستەموول» هەر سالەی یەك ملیۆن و نیو سەر مەڕی لە وێوە بۆ دەهات. ئەو سوپا گەورەیەی بەسەرکردایەتی «ئیبراهیم کوڕی محەممەد عەلی گەورە»ی فەرمان ڕەوای میسر، سالی ١٨٣٢ ـ ١٨٣٣ و ١٨٣٩ هێرشی بردە سەر «سوریا» بە مەڕو مالاتی کوردەواری دەژیا.[٦] بەر لەوەی سەدەی ڕابوردوو کۆتایی بێ تەنها «ئەستەموول»و «حەلەب» و «بەغدا» هەرسالەی ٣ ملیۆن مەڕی کوردستانیان بۆ دەهات. بەندەری «سامسۆن» یش بە تەنها ٢٠ ملیۆن**

هێلکەی لەوێوە دەهـانی.[٧] دروستکـردنی پـردی «قلیاسـان»یش لە لایـەن دەوڵەمەندێکی «سلەیمانی»یەوە تەنها کاری خێر نەبوو، ئـەگینا دەبـوو بەر لە «قلیاسان» لە «تانجەرۆ» دروستی بکردایە، چونکە ئەمیان ئاوی زۆر ترو کاتی لافاو ترسدار ترە.

بە هەمان دەستوور پیشەسازی خۆماڵی کوردستان بەر لە تێکەڵ بوون بە بازاڕی سەرمایەداری جیهان هەنگاوی باشی بەرەو پێش ناو هیچی لە پیشە سازیی وولاتانی دەوروبەری کەمتر نەبوو . جلو بەرگی نەتەوەیی و ژمارەیەك نەریتی تایبەتی هەوێنی باشی ئەو بەرەوپێش چوونە بوون . دیسـان لە بەرگی چوارەمی « سیاحەتنامە » کەی « ئۆلیا چەلەبی » دا گەلێك بەڵگەی پڕ بایەخ و مانا لەم بارەوە چنگ دەکەون . بە قسەی ئەو لە هەموو جیهان وێنەی زەرەنگەری « دیـاربەکـر » کەم بـووە . وەك دەڵێ کاری « جـۆلا » و « بـەرگ دروو » و « دەباخانە » کانی « بـدلیس » دەنگی دابووەوە ، بـەڕادەیەك « چـەرمی بە دیاریی دەبرایە وولاتی فەرەنگ » .

دوای دەوروبەری دوو سەدە ، واتە ناوەندی سەدەی نۆزدە ، « تایلەر » ی گەڕیدەی ئەورووپایی لەو کتێبەیدا کە بەناوی « گەشتێك بە کوردستاندا » بڵاوی کردووەتەوە ، باسی کوتاڵی ئاوریشمی « دیار بەکر » دەکاو بۆ چـاکیی لەگەڵ ئاوریشمی بە ناوبانگی « حەڵەب » بەراوردی دەکاو دەڵێ ئەویان هەرزانتر دەفرۆشری بۆیەکا لە هەموو ئەو ناوچانەی کەوتوونە نێـوان « دیار بـەکر » و دەریـای رەش بازاڕی گـەرمە .[٨] نـاونانی گـەڕەکێکی شاری سلەیمـانی بـە « سابوونکەران » شتێکی ماناداره بۆ ئەم مەبەستەی ئێمە باسی لێوە دەکەین . بەر لە شەڕی یەکەمی جیهـان بە مـاوەیەك دەیـان خێزانی ئـەم گەڕەکـە بە دروستکردنی سابوونەوە خەریك بوون[٩] و ساڵی بەلای کەمـەوە ٥٠٠ تەنیـان ئەنارده بازاڕەکانی شارو دەورو بەریو چەند مەڵبەندێکی ترو تەنانـەت لێشی دەگەیشتە شاری وەك « بەغدا » و « تەورێز ».[١٠]

لە کوردستانیش بە چەشنی ناوچەکانی تری رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست تێکەڵ بوونی خێرا لە نیوەی دووەمی سەدەی رابوردووەوە بە بازاڕی سەرمایە داریی جیهان کاری کوشندەی کردە سەر پیشەسازیی خۆماڵی کـە تاك تـاکە خەریك بوو هەنگاو بەرەو قۆناغی مانیفاکتۆرە[١١] بنێ . کاری بنەماڵەی موتابچی کە لە سلەیمانی جەواڵیان دروست دەکرد نیمچە مانیفاکتۆرەیەك بوو بۆ خۆی . کرێکاری کرێ گرتە کاری تێدا دەکرد ، ئەمرازی تاڕادەیەك پێشکەتوویان بەکار دەهێنا ، دابەش کردنی کار « تقسیم العمـل »[١٢] تێیدا سیمـای روونی خۆی وەرگـرتبوو[١٣] جـۆری دروستکردنی تـۆپەکـانی وەستـا « رەجـەب » یش لە

ڕەواندوز نموونەیەکی تری ئەم ڕاستی‌یە یە. شۆرەتێ تۆپەکانی کە بۆ میری ڕەواندوزی دروست دەکردن دنگی داپووەوە[١٤] زۆرێ ئەو ٨٠ تۆپەیش کە والی «مووسڵ» هەیبوو لە دەستکردی کرێکارانی ڕەواندوز بوون. شایانی باسە ئەوو مەعدەنەی بۆ دروستکردنی تۆپەکان بەکار دەهێنران لە دەوروپشتی ڕەواندوز بە کاری کرێگرتە دەردەهێنران. لە مەیدانی دروستکردنی بەڕەو جاجم و چۆخیش دا خەریك بوو، ووردە ئاڵ و گۆڕ دەست پێ بکا.

بەلام تەنانەت ئەم جورە پیشەسازی‌یانەیش نەیانتوانی خۆیان لەبەر لێشاوی کەلوپەلی هەرزان و چاکتری کارگەکانی ئەورووپادا ڕابگرن ، بۆیەکا یەك لە دوای یەك دام و دەزگایان پێچایەوە . « کارتسۆف » ساڵی ١٨٩٦ نووسیویەتی دەڵێ : « .. چاران چۆخی کورد بە ناوبانگ بوو ، بەڵام ئیستا کوتاڵی ئینگلیز تەنگی پێ هەڵچینوە »[١٥،١]

ئەو یەك دوو دوکانی فیشەك پڕکردنەوەیەی دوای شەڕی یەکەمی جیهان خاوەنەکانیان لە سلەیمانی بە کولەمەرگی دەژیان ، پاشماوەی ١٥٠ دوکانی لە خۆیان گەورەتر بوون کە بەر لەشەڕ « مارك سایکس » لەوێ دیبوونی[١٦] .

هەرچۆن بێ لەو جۆرە شوێنانەی بە کاری پیشەسازی خۆماڵی‌یەوە خەریك بوون و هەنگاوی باشیان بەرەو پێش نابوو ، یەکەم توێکڵی تەنکی چینی کرێکاری کورد بەدی دەکرێ . لە لایەکی ترەوە قەزای ئەو پیشەسازی‌یە لە چینی داهاتووی کرێکاری کورد کەوت ، چونکە بەشی زۆری کارگەرانی چوونە ناو ریزەکانی ئەو. چەوساندنەوەی دەرەبەگیش لەلای خۆیەوە بە هەزاران جووتیاری ڕووت و قووت و برسی ناردە بازاڕی کار لە شارەکان و ئەوانیش تایبەت لەبەر هەرزانی‌یان ، بوونە سەرچاوەی هەرە گرنگی دروست بوونی چینی نوێی کۆمەڵ . ژمارەی ئەم جۆرە کەسانە کە لە هەندێك ناوچە هەژاریان پێ دەگوتن ، جاری وا هەبوو پتر لە نیوەی دانیشتووانی مەڵبەندێکیان پێك دەهێنا . بە پێی هەندێك سەرچاوە ئەوانە لە ناوچەیەکی وەك « شنۆ » ی نزیك « مەهاباد » ٨٠٪ ی هێزی کاریان دروست دەکرد ( ١٠ هەزار لە ٢ هەزار کەس »[١٧] لە وێنەی ئەمە تەنها مەگەر لە ئینگلتەرەی کۆتایی سەدەکانی ناوەند هەبوو بێ ؛ کاتێك بە هۆی قازانجی زۆری خوری‌یەوە ، دەوڵەمەندو دەسەلاتدارانی ئەو وولاتە زەوی‌یەکانیان دەکردە لەوەڕگەو بەو جۆرە بە دەیان هەزار جووتیار بێ دالدەو پەناگە دەمانەوەو ئاوارەی دارستان و دەشت و دەرو شاران دەبوون و بە گژو گیاو پاشماوەی خەڵکی دەژیان و ئەمەیش هەستی « تۆماس مۆر »[١٨] ی بەناوبانگی وا بزواند « یۆتۆپیا » بنووسێت و قسە بەناوبانگەکەی بکا « خەریکە مەڕ پیاو بخوا ». لێرەدا سەیر ئەوەیە کە دەردو ئازاری هەژارانی کوردیش هەستی

شاعیری جووڵاندووەو باسی ئەوەی کردووە چۆن « برسێتی لە کوردستان زۆری بۆ هەمووان هێناوەو بە ڕەوە بەرەو فابریقە کانیان[19] دەنێری»[20] .

ژمارەی هەژاری شارو تایبەت لادێی کوردستان هێند زۆر بوو ، لەوانە نەبوو بازاڕی کەم دەرامەتی ناو وولات دادی بەشێکی زۆر کەمیشی بدا . لە قوڕکاری و حەماڵی و بەولاوەکاریکی تری ئەوتۆ دەست نەدەکەوت . لەبەر ئەوە بە هەزاران هەژاری کورد ڕوویان دەکردە شاری گەورەی وەك « ئەستەمووڵ » و بە هەمووکارو نرخێك قایل دەبوون . « بەرلە شەڕی یەکەمی جیهان ژمارەیەکی بێ شومار لە حەماڵی ڕەش و ڕووتی کورد بازاڕی ئەستەمووڵ و بەغداو شاری تریان تەنی بوو ». هی وایان هەبوو لە تاو نەبونی ی دەچوونە شاری بچووکی وەك « حەلەب » ی « شام » و « بیرووت » ی « لوبنان » و « ئەدەنە » ی « تورکیا » ، یا ناوچەی وەك « ئاق چەم » و « قەرەباغ » ی « ئازەربایجان » . بەلام توانای بازاڕی کاری ئەو جۆرە ناوچەو شارانەیش ئەوەندە نەبوو دادی ئەو خەڵکە زۆرە بدا کە دەبوونە سەرباری بێ کارەی خۆیان .

بۆیەکا هەر زوو ژمارەیەکیان ناچار چاویان بڕییە وولاتانی دەرەوەو خۆیان دایە دەست قەدەرو گەلێکیان دەریای ئەتلەسی یان بڕی و گەیشتنە خاکی ئەمریکا . زۆربەی ئەمانە خەڵکی دەرسیم بوون[21] .

بوونی کانە مەعدەن لە ناوچە کوردەواری یەکان و دەورو بەری هۆیەکی یاریدەدەری پەیدابوونی کاری کرێ گرتە بوو لەوێ بەر لەشەڕی یەکەمی جیهان . ئەوسا بەشی زۆری کرێکارانی کانە خەڵووزەکانی زەنگولدات کورد بوون . کوردی « جولەمێرك » یش ئاسن و مس و زەرنیخیان دەردەهێناو لەوێوە ناوی یەکێك لە ناوچەکانی بۆتە « زەرنیخ مەیدان » . بەشێك لەو زەرنیخەی لێرە دەردەهێنرا دەنێررایە بازاڕی دەرەوە . بە پێی ژمارەیەك سەرچاوە ساڵی ۳۰ هەزار قەنتاری لێ دەنیررایە ئەستەمووڵ و بەغداو هیندوستان[22] هەر ئەو سەردەمە ژمارەیەك کورد بوو بوونە کرێکاری کانە خەڵووزەکانی نزیك « کفری » کە بەرهەمی ساڵانەی کاریان بەر لەشەڕی یەکەم وکاتی ئەو شەڕە هەزار تەن دەبوو[23] .

ڕووداوەکانی شەڕی یەکەمی جیهان بوونە هۆی پەرەسەندنی ژمارەی کرێکاری کورد بە جۆرێکی هەست پێکراو . کوردستان بۆ خۆی بووە یەکێك لە شەرگە دیارەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و سوپای چوار وولاتی تێ ڕژا . ئاگری شەڕ زۆربەی ئەو ناوچانەشی گرتەوە کە لێوەی نزیك بوون . وەك ئاشکراشە تەکنیك و خێرایی دەوری گەورەیان لەو شەڕەدا بینی ، بۆیەکا لە هەر چوارلاوە

دەست کرا بە کردنەوەی ڕێگاو بان و دامەزراندنی بنکەی سەربازی . بە هەزاران هەژاری کورد لەو شوێنانە بوونە کرێکار . ئەم دیاردە نوێیە بە تەواو بوونی شەڕ کۆتایی نەهات . هەر بۆ نموونە سالی ١٩٢٥ پتر لە ٢٢٥٠ کورد کرێکاری شەمەنەفەر بوون لە عیراق[٢٤] بە پێی هەندێك سەرچاوەی باوەڕ پێکراو ناوەندی بیستەکان ئەو کرێکانە ٢٣٪ ی هەموو کرێکارانی شەمەنەفەری عیراق بوون[٢٥] زۆری ئەم ژمارەیە زیاتر لەوەدا خۆ دەنوێنێ گەر بێتو بزانین زۆربەی هەرە زۆری خەتی شەمەنەفەری ئەوسای عیراق لە باشوورو ناوەندی وولاتدا بوون ، وجگە لە « عەرەب »و[٢٦] « کورد » ژمارەیەکی زۆر هیندی ١١٢٤ و ئێرانی ی و ئەرمەن و ئاسوری و تورك و هی تر کرێکاری ئەم دەزگایە بوون .

دیسان دوای شەڕی یەکەمی جیهان ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هەژاری کورد بوونە کرێکاری نەوت و دامەزراندنی لولەکانی و دروست کردنی ڕێگە و بان و خانووبەرەو شتی تر . کۆتایی بیستەکان لە هەموو عیراق ٢٥٠ر٤ کەس بە دروست کردنی ڕێگەوبانەوە خەریك بوون[٢٧] کە ژمارەیەکی زۆریان کرێکاری ڕێگەی نێوان « کەرکوك » و « سلەیمانی » و « کەرکووك » و « هەولێر » و « مووسل » و « هەولێر » « ڕەواندزو ڕایات » بوون . ئینگلیز بایەخێکی زۆریان دابوو بە ڕێگەی دواییان واتە « هەولێر ـ ڕەواندوز ـ ڕایات » چونکە ، جگە لە بایەخی ستراتیژی دەیانویست بیکەنە یەکێك لە هۆکانی زیاتر بەستنەوەی بازارەکانی ڕۆژئاوای ئێران بە جیهانی سەرمایەداری یەوە ، تا چەند بتوانن ئەوەندە پەیوەندی ئابوری ئەو وولاتە لەگەڵ شوورەوی کز بکەن[٢٨]

کرێکاری کورد یەکسەر دڵسۆزی و پەرۆشی لە کارداو توانای فێربوونی خێرای نیشاندا . گەلێك بەڵگەی سەیر بۆ ئەم ڕاستی یە بە دەستەوەیە . وا بزانم لە هەموویان گرنگتر لەم لایەنەوە یەککرتنەوەی نرخاندنی کاربەدەستانی ئینگلیزو ئەڵمانە لە کاتێکدا کە لە دوو خەندەقی جیاوازدا بەرامبەر بە یەك وەستابوون . ئەڵمانەکان سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهان دەست و برد کەوتنە دروست کردنی ئەو بەشانەی پرۆژەی ناوداری خەتی شەمەنەفەری بەغدا کە هێشتا تەواو نەبوو بوون .

بەو جۆرە خەتێکیان لە نێوان « بەغدا » و « سامەڕا » دا ڕاکێشا کە کرێکاری کوردیش لە دروستکردنیدا بەشدار بوون . نووسەری ئەڵمانی « داکۆ بێرت » لەم بارەیەوە نووسیوەیەو دەڵێ :

« ئەندازیارە ئەڵمانەکان لە کوردا باشترین و دڵسۆزترین کرێکاریان دییەوە »[٢٩]

جەنەراڵ هاڵدێنی ـ فەرماندەی هێزەکانی ئینگلیز لە عیراق دەورو بەری هەمان کات بێ ئەوەی بزانێ « داگۆ بێرت » کێیە ، یان رای ئەڵمان چیە بە هەمان دەستوور باسی کرێکاری کوردی کردووەو رەزامەندی زۆری بەرامبەریان نیشان داوە[30] هەر لەبەر ئەوەیش هیچ سەیر نی یە رۆژانەی کرێکاری کورد لە هی تر زیاتر بوو . ئەوسا هەندێك دەزگا رۆژی نزیکەی ۲۱ عانەی دەدا بەو بەرامبەر بە ١٤ عانە کە هی وەك ئەو وەری دەگرت[31] لەوەیش ماناداتر ئەم نموونەیەی ترە : دەزگای شەمەنەفەری ئینگلیز ترە : دەزگای شەمەنەفەری ئینگلیز لە عیراق لە بیستەکاندا دوو جۆر کرێکاری هەبوو ، یەکەمیان ئەو کرێکارانە بوون کە بەکاری ئەساسی یەوە Capital Works خەریك دەبوون ، دووەمیشیان ئەوانە بوون کە کاریان لەدروست کردنی خەتی تازەدا دەکرد . ساڵی ١٩٢٤ ـ ١٩٢٥ لە ٢٧٤ ,٢کرێکاری شەمەنەفەری کورد تەنها ٧٢٩ یان لە جۆری دووەم بوون و ئەو باقی یەکەیان ١٥٤٥ کرێکار لە جۆری یەکەم بوون[32] .

دیارە ئەم راستی یە نەبووە هۆی ئەوەی تالاوی چەوساندنەوەی کرێکاری کورد لە هی هاوەڵەکانی کەمتر بێ . بەڵکو بە پێچەوانەوە ژمارەیەك نموونەی هەر ئەو سەردەمە وای نیشان دەدەن کە هەندێك جارو لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی ئەو چەوساندنەوەیە توندتر بووە . لەگشت ناوچەکانی باکوری عیراق رۆژانەی کرێکار لە ناوچەکانی تر کەمتر بوو . بە وێنە کرێکارانی کۆمپانیاکانی نەوت دەبوو حەفتەی ٥٤ سەعات کار بکەن و بەرامبەر بەوە ٧٠ تا ١٠ روپیەیان وەردەگرت ، کەچی کرێکاری چنین لە بەغداو کرێکاری بەندەری « بەسرە » حەفتەی ٤٨ سەعات کاریان دەکردو بەرامبەر بەوە هەریەکەیان ٣ تا ٦ روپیە زیاتریان لەوان وەردەگرت[33] باری کارو رۆژانەی ئەو کرێکارە کوردانەی بە دروست کردنی خانووبەرەو رێگەو بانەوە خەریك بوون گەلێك لەوەیش خراپتر بوو . ئەوانە زۆر جار مەلابانگان دەچوونە سەر کارو لەگەڵ بانگی شێواندا .

دەستیان لێ هەڵدەگرت کە وەك ئینگلیزەکان خۆیان دانی پێدا دەنێن ئەو پارەیە تەنانەت « بەشی نان و جگەرەی نەدەکردن »[34] وێرای ئەوە کرێکاری کورد، وەك کرێکاری ناوچەکانی تر، ماوەیەکی دوورو درێژ نەیتوانی خۆی لە پەیوەندی و نەریتی دەرەبەگی قوتار بکا. زۆر جار ئەو کرێکارانە دەگەرانەوە گوندەکانیان بۆ کاری کشتوکاڵ و یاریدەی کەس و کاریان. زۆر بەیان بەشێکی داهاتی کرێکاری ی خۆیان هەروەك جاری جاران دەدا بە ئاغاو سەرەك هۆزەکانیان.

بەر لە کۆتایی با ئەوەش بڵێین کە کرێکاری کورد لە سەرەتای سەرەتاوە بەگیانی برایەتی گۆش بووە، چونکە هەمیشە چ لە خاکی خۆی و چ دوور لێ ی شان بەشانی کرێکاری تر کاری کردووەو ئازاری چەوساندنەوەی چێشتووە.

جوانترین بەڵگەی ئەم راستییە رەنگبێ ئەو قسانە بن کە لە گەڵ تەواو بوونی رێگەکەی « هەولێر ـ رەواندوز ـ رایات » لەسەر تاشە بەردێك نووسیبوویان: «ئێمە کە هەزاران کەسین‌و بە عەرەبی‌و ئەرمەنی‌و ئینگلیزی وهیندی‌و کوردی‌و رووسی‌و تورکی قسە دەکەین ئەم رێگەیەمان بۆ خزمەتی هەموو گەریدەیەکی بێوەی دروست کرد.»[٣٥]

لیستەی ناوی ئەم زمانانە لە دەزگای شەمەنەفەری عیراق دەگاتە ١٦ ناو. جگە لەوانەی سەرەوە ئەم ناوانەشی دەچنە سەر: سریانی‌و میسری‌و فارسی‌و تونسی‌و[٣٦] ئیتالی‌و یۆنانی‌و هەنگاری[٣٧]. لە گاوربارغیش هاوینی ساڵی ١٩٤٦ دەنگی زوڵاڵ‌و خوێنی گەشی کرێکاری کورد تێکەڵ لەگەڵ دەنگ‌و خوێنی پیرۆزی براکانی ئاوازێکی بەجۆش‌و لاپەڕەیەکی پڕ شانازیی دروست کرد. !



١ ـ بۆ یەکەمجار لە مێژووی ئادەمیزادا پەیوەندی سەرمایەداری لە فلۆرەنسای ئیتالیا دروست بوو، بۆیەکا لەوێش یەکەم چەکەرەی هەردوو چینی نوێی کۆمەڵ ـ پرولیتاریاو بۆرژوا سەری هەڵ دا.

٢ ـ G. Napier, The road from Baghdad to Baku, — (The Geo graphical Journal) Landon, Vol. L11, No 1, January 1919 P. 18.

٣ ـ ١٠ بەرگەو سەرچاوەیەکی گرنگ‌و رەسەنە بۆ باسی وولاتانی رۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست لە دەوروبەری کۆتایی سەدەکانی ناوەندا. «ئۆلیا چەلەبی» بەشی زۆری تەمەنی بە ناوچەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی‌و چەند وولاتێکی ئەوروپاییدا گەڕاوە.

٤ ـ بە پێی قسەی «شەمسەدین سامی» ژمارەی دانیشتوانی میرنشینی بدلیس ٣٠ هەزار کەس بوو. سەرچاوەی‌تر بە ٥٠ هەزاری لە قەڵەم دەدەن. «بڕوانە: شمس الدین سامی. قاموس الاعلام، بەرگی‌دووەم ل ١٣٢٩، م. ی. شەمسی، شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی وەك سەرچاوەی گەلی کورد، باکۆ. ١٩٦٧. ل ١٦».

٦ ـ بۆ ئەو ژمارانە، بڕوانە «پیوتەر لیرخ، لێکۆڵینەوە دەربارەی کوردی ئێران‌و کلدانییەکانی باکوری باوو باپیریان. بە زمانی‌رووسی. کتێبی یەکەم. پەترۆسبورگ ١٨٥٦ ل. (٢٤).

٧ ـ بڕوانە: B. Nikitine, Les Kurdes, Paris, 1956. P. 165. A. R. Ghassemlou, Kurds and The Kurdistan, Prague 1965. P. 104.

٨ ـ بڕوانە: «و. ل. فلچێفسکی. ژیانی ئابووری کوردە کۆچەرەکانی پشت قەفقاس و ناوچەکانی نزیکی، نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە. بەزمانی رووسی، گۆڤاری «ئەتنۆگرافیای سۆڤیەتی» ژمارە «٥ ـ ٦»، ١٩٣٦ ل ١٥٠.
٩ ـ بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ لە سلەیمانی تەنها پێنج شەش کەس بە دروست کردنی سابوونەوە خەریك بوون «بڕوانە: إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧. الجزء الثاني. بغداد ١٩٥٤ ص ١٦٣».
١٠ ـ جگە لە سابوون بەرهەمی تری پیشەسازیی خۆماڵی کوردەواری دەگەیشتە شارو وولاتی تر. بڕوانە: R. Berliner and P. Borchardt, Silberschmiedarbe iten aus Kurdistan, Berlin, 1922. P. 8.
١١ ـ مانیفاکتۆرە زاراوەیەکە لە دوو وشەی لاتینی پێك هاتووە: Manuse واتە دەست و Factura واتە دروستکراو. گەیشتنی پیشەسازیی خۆماڵی بە قۆناغی مانیفاکتۆرە یەکەم هەنگاوی گرنگە بەرەو پەیوەندی سەرمایەداریی. مانیفاکتۆرە بە عەرەبی «ورشة»یە.
١٢ ـ لەگەڵ پەیدا بوونی پەیوەندی سەرمایەداریی، دابەش کردنی کار زیاتر چەسپ دەبێ. بەر لەو قۆناغە یەك کەس یا ئەندامانی یەك خێزان هەموویان زۆربەی کاری دروست کردنی بەرهەمێکیان دەگرتە ئەستۆ. دابەش کردنی کار دەبێتە هۆی زۆرو چاك بوونی بەرهەم.
١٤ ـ تۆپی وایان تێدا بوو درێژییەکەی لە ٣ مەترو لوولەکەی لە ٤٥ سم کەمتر نەبوو.
١٥ ـ بڕوانە: انور المائي، الاكراد في بهدينان. موصل ١٩٦٠. ص ٣.
١٥آ ـ ا. کارتسۆف تێبینی دەربارەی کورد، بە زمانی رووسی، تفلیس ١٨٩٦ ل ٢٤.
١٥ ـ بڕوانە: «ل. ن. کاتلۆف. پەیدا بوونی بزووتنەوەی نەتەوەیی رزگاریخواز لە رۆژهەڵاتی عەرەب، بەزمانی رووسی. مۆسکو ١٩٧٥. ل ٩٠ ـ ٩١. ژمارەی دانیشتووانی «عەممان»ی پایتەختی ئوردن ئیمڕۆ لە ملیۆن تێ دەپەڕێ.
١٦ ـ بڕوانە: C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, London, 1957. P. 80.
١٧ ـ بڕوانە: «گ. ب. ئاکۆپۆف. دەربارەی سروشتی زەویداریی تایبەتی کوردستانی ئەمڕۆ». گۆڤاری «هەواڵەکانی کۆڕی زانیاری ئەرمینیای سۆڤیەت»، بە زمانی رووسی. یەریڤان. ژمارە ـ ٥ ـ ١٩٦٤، ل ٦٧.
١٨ ـ سیاسەتمەدارو نووسەرێ بە ناوبانگی ئینگلیز «تۆماس مۆر» ١٤٧٨ ـ ١٥٣٥ بە دامەزرێنەری بیری سۆشیالیزمی یۆتۆپی دادەنرێ.
١٩ ـ دیارە مەبەستی فابریقەکانی دەرەوەی کوردستانە.
٢٠ ـ بڕوانە: «گ. ب. ئاکۆپۆف، سەرچاوەی ناو براو. ل ٦٧.

٢١ ـ بڕووانە «و. فلچێفسکی، دەربارەی پەیوەندی کشتوکاڵ لە کووردستان. گۆڤاری ـ کێشەکانی کشتوکاڵ ـ بە زمانی رووسی. مۆسکۆ. بەرگی ١ ـ ٢، ١٩٣٢، ل ١٣٠. موسى كاظم باشوزاده، الحان،

عادات اكراد، استانبول ١٩٢١. دکتۆر ئاجی عەبباس بۆی گێڕامەوە کە کاتی خۆی لە شاری ـ دیترویت ـ تووشی ژمارەیەك لەو کرێکارە کوردانە هاتووە.

٢٢ ـ بڕوانە: م. ل فلچێفسکی، ژیانی ئابووری کوردە کۆچەرەکانی پشت قەفقاس، ل ١٥١، و. ل. فلچێفسکی. دەربارەی پەیوەندی کشتوکاڵ لە کوردستان. ل ١٣٠.

٢٣ ـ عبدالرزاق الحسني، العراق قديماً وحديثاً. الجزء الثاني. صيدا ١٩٥٨ ص ٦١.

٢٤ ـ بڕوانە: Iraq Railways. Administration Report For the year 1924 — 1925. Baghdad. 1925, P. 16.

٢٥ ـ بڕوانە: Report by Britannic Majesty's Goverment to The Council of The League of Nations on The administrafion of Iraq for The year 1926. London, 1927. P. 29.

٢٦ ـ ژمارەیان ٥٩٠و٤ کەس بوو، واتەدوو ئەوەندەی کورد کەمتر.

بڕوانە: Report by His Majesty's Goverment in the United King dom of Great Britain and Nor Thern Ireland to The Council of The League of Nations on The administration of Iraq for The year 1931. London, 1932.

٢٨ ـ بە هۆی نزیکی‌یەوە بازرگانی‌ی نێوان رووسیاو ناوچەکانی قەفقاس هەر لە زووەوە، زۆر گەرم بوو.

٢٩ ـ Dagobert Von Mikusch, Mustafa Kemal between Europe and Asia, trans by J. Linton, London 1931 . P. 360.

٣٠ ـ بڕوانە: A. L. Haldane, The insurection Mesoptammia 1920 London, 1922, P. 106

٣١ ـ بڕوانە: المركز الوطني للوثائق. بغداد. رقم الملف: 80/19 Establishment General

٣٢ ـ Iraq Railways. Administration, Report for The year 1924 — 1925. P. 16.

٣٣ ـ بڕوانە: Report for The year 1926. P. 29.

٣٤ ـ A. M. Hamilton, Road Through Kurdistan. The Narrative of on Engineer in Iraq, London, 1937, P. 61.

٣٥ ـ بڕوانە: J. Morris, The Hashemite Kings, London, 1959, P. 97.

٣٦ ـ دیارە لێرەدا مەبەست لە میسری و تونسی، وولاتە نەك زمان.

٣٧ ـ Iraq Railways, Administration Report for The Year 1924 — 1925, P. 16.

---

* ماف مەدەنی‌ی، هەموو ئەو مافانەیە کە دەستووری وولات بە هاووڵاتیانی دەبەخشێ، وەك سەربەستی بیروڕا دەربڕین و خۆ پاڵاوتن و خەڵك هەڵبژاردن و پارێزگاری کردنی ژیان.. تا.. هەندێ جار لە ئەنجامی هەڵوێستێکی دیاری کراودا کەسێك یان چەند کەسێك ئەو مافانەیان لێ وەردەگیرێتەوە. ـ وەرگێڕ ـ

## بەشی یەکەم

## ئامانجەکانی کۆمەڵەی سنعاتکاران

ماددەی یەکەم: کۆمەڵەی سنعاتکاران توخنی سیاسەت و ئایین ناکەوێ و تاقە مەبەستی ئەوەیە، خاوەن پیشەسازی‌یەکان لە ڕووی ڕەوشت و پیشەو زانیاری و کۆمەڵایەتی‌یەوە پەروەردە بکاو بیرو باوەڕی باش و سوود بەخش لەناو ئەندامانی‌دا بڵاو بکاتەوە.

ماددەی دووەم: کۆمەڵە هەوڵ دەدا پیشەسازی لە عیراق‌دا پێش بخاو ئەوانەیش کە لێهاتوون لەسەر ئەرکی خۆیان بیان نێرێتە دەرەوەی وڵات تاوەکو لە بواری پیشەسازی‌یەک‌دا ببێتە پسپۆر.

ماددەی سێیەم: کۆمەڵە هەوڵ دەدا پزیشکێك یاخود چەند پزیشکێك تەرخان بکا بۆ چارەسەر کردنی ئەندامانی کۆمەڵ و ماڵ و منداڵیان بە کرێ‌یەکی کەم، یان بە مانگانە بە مەرجێك کۆمەڵە لە بۆدجەی خۆی بی‌دا.

ماددەی چوارەم: کۆمەڵە داوا لە هەندێ پزیشك و پسپۆری پیشەسازی دەکا، ووتاری گشتی‌ی بنووسن و لە کۆڕی تایبەتی‌دا بۆ ئەندامانی کۆمەڵەی بخوێننەوە، تاوەکو سوودیان لێوەر بگیرێ.

ماددەی پێنجەم: کۆمەڵە هەموو ساڵێك لە ڕۆژی ١ ی تەمموزدا کە ڕۆژی دامەزراندێتی ئاهەنگ دەگێڕێ.

ماددەی شەشەم: کۆمەڵە لە هەموو بۆنەیەک‌دا، هەستی خۆی بەرامبە ربە کۆمەڵە ناسیاسی‌یەکان دەردەبڕێ و پشتگیریی پەیوەندی و دۆستایەتی‌یان دەکا.

## بەشی دووەم

## مەرجەکانی بە ئەندام بوون

ماددەی حەوتەم: هەر عیراقی‌یەك ئەم مەرجانەی خـوارەوەی تێدا بێ، دەشێ ببێتە ئەندامي كۆمەڵە:

ئا ـ دەبێ تەمەنی لە بیست ساڵ کەمتر نەبێ.

ب ـ دەبێ رەوشتی باش‌و پەسەندکراو بێ.

ج ـ دەبێ لە مافی مەدەنی‌ی بێ بەش نەکرابێ.*

ء ـ دەبێ بەلای کەمەوە دوو ئەندامی بیناسن‌و پەسەندی بکەن.

ماددەی هەشتەم: ئەو کەسەی داوای بوون بە ئەندامی دەکا، دەبێ نووسراوێك پێشکەش دەستەی بەڕێوەبەر بکا و دەستەی ناوبراویش بە پێی ماددەی حەوتەمی ئەم پەیڕەوە لە داواکەی دەکۆڵێتەوە.

ئا ـ ئەو کەسەی داوا پێشکەش دەکا، دەبێ روپیەیەك یان دوو روپیە رەسمی بوون بە ئەندامێتی بدا.

ب ـ ئەو کەسەی داوای بە ئەندام بوون دەکا دەبێ بە پێی توانا ئابـوونەی مانگانە بە کۆمەڵە بدا.

ج ـ ئەو کەسانەی دەست کورت‌و نەداران، ئابوونەیان لێ وەرناگیرێ.

ماددەی نۆیەم: هەر ئەندامێك یەکێك لەم شتانەی خوارەوەی لێ روودا، لە کۆمەڵە بەردەکرێ.

ئا ـ ئەگەر یەکێك لەو مەرجانەی تێدا نەما کە لە ماددەی حەوتەمی ئەم پەیڕەوەدا نووسراوان.

ب ـ ئەگەر سێ مانگ لەسەر یەك ئابوونەی مانگانەی نەدا.

ج ـ ئەگەر داوای واز هێنانی کردو دەستەی بەڕێوەبەر بە داواکەی قایل بوو.

ء ـ ئەگەر کارێکی کرد کۆمەڵە تووشی لێپرسینەوە ببێ.

## بەشی سێیەم

## دەستەی گشتی

ماددەی دەیەم: دەستەی گشتی ی بریتی یە لە هەموو ئەندامانی کۆمەڵە کە ماددەی حەوتەمی ئەم پەیڕەوە دەیانگرێتەوە: بەڵام نابێ ئەو ئەندامەی کە ئابوونەی نەداوەو چوار مانگ بەسەر بوون بە ئەندامێتی دا تێ نەپەڕیوە، بۆ دەستەی بەڕێوەبەر هەڵببژێردرێ.

ماددەی یازدەیەم: دەستەی گشتی ی لە یەکەم کۆبوونەوەی دا، دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵە هەڵدەبژێرێ کە بریتی یە لە حەوت ئەندام و ماوەی ساڵێکی تەواو ئیش و کاری کۆمەڵە بەڕێوە دەبا.

ماددەی دوازدەیەم: دەستەی بەڕێوەبەر کات و شوێنی هەڵبژاردن دیاری دەکا. لە کاتی دیاری کراودا سەرژمێری ئامادەبوان دەکرێ و گەر یەک کەسی لە نیوەی هەموو ئەندامان زیاتر بوو، بە تەمەن‌ترین ئەندام سەرۆکایەتی هەڵبژاردنەکە دەکا و یەکێکیش ئەرکی نووسینەوەی پێ دەسپێردرێ وپاشان دەست بە هەڵبژاردن دەکرێ. جا ئەگەر ژمارەی ئامادەبوان لەوە کەمتر بوو، ئەوا هەڵبژاردن بۆ ماوەی دوو هەفتە دوا دەخرێ و بە لای کەمەوە بەر لە هەفتەیەک لە رۆژنامە ناوخۆیی یەکان دا ئاگاداری ئەندامان دەکرێ. ئەمجارەیان ژمارەی ئامادەبوان هەرچەندێک بێ، دەست بە هەڵبژاردن دەکرێ و دەشێ هەموو ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری پێشوو، یان هەندێکیان جارێکی تریش خۆیان هەڵببژێرنەوە.

## بەشی چوارەم

## ئەرکەکانی دەستەی بەڕێوەبەر

ماددەی سیازدەیەم: دەستەی بەڕێوەبەر لە یەکەم کۆبوونـەوەیدا، سەرۆك‌و جێگـری سـەرۆك‌و سکـرتێـرو ئـەمینـداری سنـدووق‌و چاودێریکەری گشتیی هەڵدەبژێرێ.

ماددەی چواردەیەم: سەرۆك، سەرۆکایەتی ئەو کۆبوونەوانە دەکا کە دەستەی بـەڕێوەبـەر لە ڕۆژانی دیاری کـراودا سـازیـان دەکـاو لەسەریەتی چی بڕیاری دەستەی بەڕێـوەبەر هـەیە جێ بەجێیان بکاو هەر ئەویش لەبەردەم میری‌و لە ئاهـەنگە ڕەسمی‌یەکاندا نوێنەری کۆمەڵەیە.

ماددەی پازدەیەم: جێگری سـەرۆك ـ ئەو کـاتانـەی سەرۆك ئـامادە نی‌یـە ـ سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکانی دەستەی بەڕێوەبەر دەکاو لەو حاڵەدا هەموو ئەو دەسەڵاتانەی هەیە کە بە سەرۆك دراوە.

ماددەی شازدەیەم: سکرتێر؛ کاروباری نووسینەوەی لە ئەستۆیەو دەبێ سجلی تایبەتی بۆ هەموو ئەو بابەتانە تەرخان بکا کە پێویستیان بە تۆمارکردن هەیە. هەروەها دەبێ سجلێکیش بۆ بڕیارەکانی دەستەی بەڕێوەبەر ئامادە بکاو سەرپەرشتی کاروباری ئەندامەکانیشی بکا.

ماددەی حەقدەیەم: ئەمینداری سندووق؛ راستەوخۆ لە دارایی کۆمەڵە بەرپرسیارەو دەبێ سەرپاکی ئەو سجل‌و نامانەی پەیوەندییان بە کاروباری دارایی یەوە هەیە بیانپارێزێ‌و حسابی مانگانەی کۆمەڵە رێک بخاو پێشکەش بە سەرۆکی بکا. نابێ لە مانگێکدا بۆکاروباری زۆر پێویست‌و ناچاری نەبێ لە دە روپیە زیاتر خەرج بکاو دەبێ لە بری هەر چەردە پارەیەك کە سەرفی دەکا وەسلی تایبەتی بخاتە روو.

ماددەی هەژدەیەم: پێویستە هەموو سەری مانگێك لیستەیەك پێشکەش دەستەی بەڕێوەبەر بکا تێیدا ناوی ئەو ئەندامانە بنووسێ کە ئابوونەیان داوەو نەداوە.

ماددەی نۆزدەیەم: دەبێ کەفالەتێکی دارایی بەو نرخەی دەستەی بەڕێوەبەر دەست نیشانی دەکا بداتە کۆمەڵەو نابێ لە ۲۰۰ روپیە زیاتریش لە سندووقی کۆمەڵەدا بێ.

ماددەی بیستەم: چاودێریکەری گشتی ی؛ ئەو کەسەیە چاو دێری حساباتی گشتی ی‌و داهات‌و خەرجی کۆمەڵ دەکاو نابێ بەبێ ئاگاداری ئەو درهەمێك خەرج بکرێ. دەبێ هەموو سەری مانگێك بە هاوکاری ئەمینداری سندووق راپۆرتێك پێشکەش بکاو تێیدا داهات‌و خەرجی کۆمەڵە بنووسێ وبیداتە دەستەی بەڕێوەبەر. هەر پازدەرۆژ جارێکیش راپۆرتێك بداتە سەرۆك‌و چی تێ‌بینی هەیە لەسەر کۆمەڵە تۆماری بکا.

## بەشی پێنجەم
## کۆبوونەوە

ماددەی بیست‌و یەك: هەموو هەفتەیەك دەستەی بەڕێوەبەر بەلای کەمەوە دوو جار کۆدەبێتەوە، یاخود لەسەر داوای سەرۆك لە کاتی پێویستیدا.

ماددەی بیست‌و دوو: هەر ئەندامێکی دەستەی بەڕێوەبەر سێ کۆبوونەوەی لەسەر یەك بەبێ ئەوەی هۆیەکی بەجێی هەبێ؛ یان لە ماوەی مانگێك‌داو لە پێنج کۆبوونەوەی ناوبەناودا ، ئامادە نەبوو بە وازهێنەر دادەنرێ‌و ئەو ئەندامەی لە هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەردا دەنگی لەو کەمتری وەرگرتووە، جێگای دەگرێتەوە.

ماددەی بیست‌و سێ: ئەگەر یەکێك لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەر وازی هێنا، ئەو کەسە شوێنی دەگرێتەوە کە لە لایەن دەستەی گشتی‌یەوە زۆرترین دەنگی وەرگرتووە. گەر هات‌و لە دەنگیش‌دا وەك یەك بوون، دەستەی بەڕێوەبەر مافی ئەوەی هەیە کامیان بە سوود بەخش‌تر دەزانێ بۆ کۆمەڵە، ئەوەیان هەڵبژێرێ.



## بەشی شەشەم

## لیژنەکان

ماددەی بیست و چوار: لەناو ئەندامانی هەر پیشەیەکدا لیژنەیەکی پێنج کەسی پێک دەهێنرێ ئەوانیش لەناو خۆیاندا سەرۆکێک هەڵدەبژێرن.

ماددەی بیست و پێنج: کاروباری: هەر یەک لەو لیژنانە ئەوەیە هانی پیشەکەی خۆیان بدەن و هەموو مانگێکیش راپۆرتێک دەربارەی کارو بارەکانیان پێشکەش بەدەستەی بەڕێوەبەر بکەن.

ماددەی بیست و شەش: هەر لیژنەیەک ویستی کارێکی گرنگ جێ بەجێ بکا، دەبێ پێش هەموو شتێک دەستەی بەڕێوەبەر قایل بکا.

# بەشی حەوتەم
# پێشانگاکان

ماددەی بیست و حەوت: ئا: کۆمەڵە هەموو ساڵێك دوو پێشانگا دەکاتەوەو پێش چوار مانگ لە ڕۆژنامە ناوخۆیی یەکان دا کات و شـوێن دیاری دەکا.

ب : کۆمەڵە پادداشتێك بۆ یەکـەمی هەر پیشـەیەك تەرخان دەکا بە مەرجێك ئەو پادداشتە لە دە [جنیە] زیاتر و لە پێنج کەمتر نەبێ. ناوی دووەم و سێیەمیش لە ڕۆژنامەکان دا بڵاو دەکاتەوە.

ماددەی بیست و هەشت: دەستەیەکی پێنج ئەندامی پێك دەهێنێ بۆ پشکنینی ئەو بابەتانەی پێشکەش بە پێشانگا کراون، بە مەرجێك سێ کەسیان لە شارەزایانی ئەو پیشەیە بن و دوانەکەی تریان ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر بن.

ماددەی بیست و نۆ: هەر کەس بەشداری یەکێك لەو پێشانگایانەی کرد کە کۆمەڵە سازی دەکا، دەبێ پێنج روپیە ڕەسمی بەشدار بوون بداو بەلای کەمەوە پێش دوو مانگ داوا لە دەستەی بەڕێوەبەر بکا.

ماددەی سی: ئەو بابەتانەی لە پێشانگادا دادەنرێن پاش کۆتایی هاتنی پێشانگا دەدرێنەوە بە خاوەنەکانیان. ئەوانیش بۆیان هەیە بیبەخشن یاخود بیفرۆشن.

# بەشی هەشتەم

## ئەرکی ئەندامان

ماددەی سیو یەك: هەر ئەندامێك سەرپێچی لە بڕیارەکانی دەستەی بەڕێوەبەر کرد، یاخود لە سنووری پەیڕەو وپرۆگرامی کۆمەڵە چووە دەرەوە، یەکێك لەو سزایانەی بەشەردا دەسەپێنرێ کە لەخانەی سزاکاندا دیاری کراون.

ماددەی سیو دوو: قومار کردنو خواردنەوە لەناو بارەگای کۆمەڵەدا، یان هامشۆکردنی کۆمەڵە بە سەرخۆشی ی، بە تەواوی قەدەغەیە.

سزاکان:

ماددەی سیو سێ: ئەو سزایانەی کەدوای لێکۆڵینەوە بەسەر ئەندامانی دا دەسەپێنرێن ئەمانەن:

ئا : ئاگادار کردن.

ب : دوور خستنەوەی کاتی ی.

ج : دەرکردنی یەکجاریی

# بەشی نۆیەم

## چەند ماددەیەکی گشتی

ماددەی سی‌و چوار: هیچ کەس بۆی نی‌یە، بەبێ ئاگادار کردنی دەستەی بەڕێوەبەرو کات دیاری کردن، ووتارو باس لەناو بارەگای کۆمەڵەدا بخوێنێتەوە. دەبێ دەستەی بەڕێوەبەریش بە بوون‌و نەبوون رای خۆی دەربڕێ‌و ئاگاداری خاوەن ووتار بکاتەوە. گەر ووتار یان باسەکە نووسراو بوو، پێویستە وێنەیەکی بداتە کۆمەڵەو لای بمێنێتەوە.

ماددەی سی‌و پێنج: ئەگەر لە سێ بەش دوو بەشی ئەندامانی کۆمەڵە قایل بوون، دەستەی بەڕێوەبەر بۆی هەیە چەند ماددەیەکی نوێ بخاتە سە رپەیرەوی کۆمەڵە، یاخود هەندێکیان بگۆڕێ.

ماددەی سی‌و شەش: دەستەی بەڕێوەبەر مافی ئەوەی هەیە هەرچی ناکۆکی‌یەک بکەوێتە نێوان ئەندامەکانی‌یەوە چ لە ناو کۆمەڵەو چ لە دەرەوەی‌دا، بەپێی دەسەلاتی خۆی چارەسەریان بکا.

ماددەی سی‌و حەوت: کۆمەڵە هەوڵ دەدا کار بۆ ئەندامە بێ ئیشەکانی بدۆزێتەوە.

ماددەی سی‌و هەشت: ئەنجومەنێك لە دەستەی بەڕێوەبەرو سەرۆك لیژنەکان پێك دەهێزێ، تاوەکو تەماشای ئەو کاروبارە گرنگانە بکا کە پەیوەندی‌یان بە چارە نووسی کۆمەڵەوە هەیە.

ماددەسی‌و نۆ: کۆمەڵە بۆی هەیە لە سەرانسەری عیراقدا لقی خۆی دابمەزرێنی، بە مەرجێك ئەو لقانە لە هەموو روویەکەوە بە مەڵبەندی گشتی‌یەوە پەیوەست بن.

# پاشکۆی ژماره «٣»

راپۆرتەکەی نوێنەری دلێم ـ دکتۆر فائیق شاکر ـ کە لە کۆبوونەوەی ئاسایی پانزەهەمی ساڵی ١٩٣٠ دا کە ڕێکەوتی ١١ ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠ دەکا پێشکەش بە پەرلەمانی کرد.

«.. لەبەرئەوەی چەند ساڵێکە خەریکی چارەسەرکردنی کرێکارانی عیراقم و بە چاوی خۆم دەبینم، نەبوونی یاسایەکی تایبەتی بۆ پاراستنی مافەکانیان بووەتە هۆی چەوساندنەوەو ستەم لێکردنیان؛ لەبەر ئەوەو بە پێی ماددەی ٣٩ ی پەیڕەوی ناوخۆ ئەم پێشنیازە پێشکەش بە حکوومەت دەکەم و داوا کارم لایەحەیەکی یاسایی دابنرێ ئەم خاڵە بنچینەیی یانەی خوارەوەی تێدا ڕەچاو بکرێ.

یەکەم: دیاری کردنی ماوەی ئیش کردن.

دووەم: کرێی ڕۆژانی جەژن و ئەو ڕۆژانە بدرێنە کرێکارە هەمیشەیی یەکان کە دام و دەزگاکان بە ڕەسمی ی لەکار دەکەون.

سێیەم: کرێکاران لە زوڵم و ستەمی سەرمایەداران بپارێزرێن.

چوارەم: مافی کرێکاران لە کاتی نەخۆشی دا دەست نیشان بکرێ و کە نەخۆشیش کەوتن چارەسەر بکرێن.

پێنجەم: زامنی ئەوە بکرێ خاوەن کار بە ئارەزووی خۆی کرێکارە هەمیشەیی یەکان دەر نەکا.

شەشەم: ئەو کرێکارەی بە هۆی ئیشەکەیەوە کەفتەکار دەبێ، چەردەیەك پارەی بدرێتێ.

حەوتەم: کۆمپانیاکان لە بودجەی خۆیان مووچەی خانەنشینی بەو کرێکارانە بدەن کە بە هۆی پیری یەوە توانای کارکردنیان نەماوە.

هەشتەم: ئیش پێ کردنی منداڵان قەدەغە بکرێ.

نۆیەم: ماوە نەدرێ کۆمپانیا بیانی یەکان لەو کاروبارانەدا کە کرێکاری عیراقی توانای هەڵسوڕاندیان هەیە، کرێکاری بیانی دابمەزرێنن.

ئەم برا بەڕێزانەیش کە ناویان لە خوارەوە تۆمار کردووە پشتگیریی ئەم پێشنیازەم دەکەن »

# پاشکۆی ژماره «٤»

دەقی پرۆژەی « یاسای کاری عیراق » کە ـ محەممەد ساڵح ئەلقەزاز ـ سەرۆکی «کۆمەڵەی سنعاتکاران » لە رۆژی ١٩٣١/٣/٣١ دا، پێشکەش بە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانو پەرلەمانو وەزارەتی ناوخۆ و دادو ئابوریو هاتوچۆی کرد.

یەکەم: ماوەی ئیشکردن بە رۆژ هەشت سەعات بێ، بە مەرجێك نیو سەعات مۆڵەت بە کرێکاران بدرێ نان بخۆنو بحەوێنەوە. ئەوانەیشی کە شەوکار دەکەن، ماوەی ئیش کردنیان شەش سەعات بێ.

دووەم: کرێی جەژن و « عطلة » ڕەسمی یەکانیان بدرێتێ.
سێیەم: کرێی ئەم ڕۆژانەیان بدرێتێ کە مۆڵەتی نەخۆشی یان هەیە و ئەو ڕۆژانەیش کە لە نەخۆشخانەی کارگەکان دا دەمێننەوە ڕۆژانەکانیان نەبڕن.
چوارەم: ئەگەر کرێکار لە کاتی ئیش کردن دا بریندار بوو، چەردەیەك پارەی لە بریتی بدرێتێ و گەر لە کاتی ئیش کردنیش دا مرد، یان کارەساتێکی وای بەسەر هات کەفتەکاری بکا، چەردەیەك پارە بۆ ماڵ و منداڵی تەرخان بکرێ.
پێنجەم: ئەو کرێکارانەی خزمەتیان زۆرەو پیر بوون و توانای ئیش کردنیان نەماوە، مووچەی خانە نشینی یان بدرێتێ.
شەشەم: ئەو منالانەی تەمەنیان لە ١٤ ساڵ کەمترە ماوەیان نەدرێ لە کارگەکان دا ئیش بکەن.
حەوتەم: ئەو کارو بارانەی پێویستیان بە پسپۆری تەکنیکی نی یە، بدرێنە کرێکارە عیراقی یەکان و ماوەی کرێکاری بیانی نەدرێ لەو جێگایانەدا ئیش بکەن.
هەشتەم: کرێکارە عیراقی یەکان مەشقیان لەسەر ئیشی تەکنیکی پێ بکرێ، تا لە ماوەیەکی دیاری کراودا شارەزایی پەیدا بکەن و جێگای کرێکارە بیانی یەکان بگرنەوە.
نۆیەم: کرێکاران لە زوڵم و ستەمی سەرمایەداران و خاوەن کارگەو کۆمپانیاکان بپارێزرێن. بۆ ئەم مەبەستەیش یان بیرۆیەکی تایبەتی کرێکاران دابمەزرێنرێ، یاخود لیژنەیەك لە بابەتی لیژنەی دیسپلین پێك بهێنرێ و ئەرکی تەماشا کردنی داوا وشکایەتی کرێکاران و هۆی جیابوونەوەیانی پێ بسپێردرێ.
دەیەم: کە کرێکارە هەمیشەیی یەکان دەردەکرێن، ئەوەندە پارەیان بە شێوەی پادداشت بدرێتێ کە لەگەڵ ماوەی خزمەت و جۆری ئیش کردنیان دا بگونجێ. هەر کاتێکیش ئەو شوێنانە پێویستیان بە کرێکار هەبوو، دەرکراوەکان بگێردرێنەوە بۆ شوێنی خۆیان.

یازده: هەموو ساڵێك بە پارە یارمەتی ئەو دامەزراوانە بدرێ كە كرێكاران بە نوێنەری خۆیانی دەزانن‌و ئەوانیش پشتگیری داوا رەواكانیان دەكەن، تاوەكو بۆ قەلاچۆكردنی نەخوێندەواری‌و یارمەتی دانی كرێكاران لە كاتی پێویستیدا، خەرجی بكەن.

دوازدە: خانوبەرەی وا كە هەل‌و مەرجی تەندروستی ی تێدا بێ بۆ ئەو كرێكارانە بنیات بنرێ كە لە دەرەوەی شار دەژین‌و بایەخیش بە گوزەرانیان بدرێ.

سیازدە: ئەوانەی دەوڵەت لە سەر حسابی خۆی بۆ دەرەوەیان دەنێرێ بكرێن بە دوو بەشەوە. بەشێكیان پیشەسازی‌و ئەویتر زانیاری. داوایش لە كۆمپانیاكانی نەوت‌و هەردوو بەرێوەبەرایەتی بەندەرو رێگای ئاسن بكرێ، هەموو ساڵێك ژمارەیەك كرێكار لەسەر حسابی ئەوان بۆ خوێندن بنێرنە دەرەوەی وولات.

چواردە: ئەوانەی چەند جۆر پیشەسازی دەزانن، رۆژانە كانیان دیاری بكرێ‌و دەبێ رادەی هەرە كەمی مووچەكەیان، لای كەم گوزەرانیان دابین بكا.

پازدە: ژمارەی قوتابخانە پیشەسازی‌یەكانی وولات زیاد بكرێن‌و لقی ئێوارانیشیان بۆ بكرێتەوەو زانیاری میكانیكی بە خۆرایی فێری ئەو كرێكارانە بكەن كە بە رۆژ لە كارگەكاندا ئیش دەكەن.

شازدە: وەك ئەو سیستەمەی لە وولاتانی تردا پەیرەو دەكرێ، كرێكاری هەمیشەیی لای خۆمان ساڵی دوو هەفتە مۆڵەتی بدرێتێ.

حەڤدە: هەموو ساڵێك چەردەیەك پارە بدرێتە ئەوانەی شتی نوێ دادەهێنن، بە مەرجێك ئەو لایەنانەی پەیوەندی‌یان بەم مەسەلەیەوە هەیە پشتگیری داهێنانەكانیان بكەن‌و خاوەنەكانیشیان گفت بدەن كە تەواویان كرد یان گەر بۆیان تەواو نەكرا، ئەو پارەیەی پێیان دراوە بیگێرنەوە.

هەژدە: قوتابخانەی ناوخۆیی بۆ پەروەردەكردنی منداڵی ئەو كرێكارانە بكرێتەوە كە پیشەی زۆر نزمیان هەیەو رۆژانەكانیان بەشی خاو خێزانیان ناكا.

نۆزدە: نابێ ئەو كەسەی تووشی دەردی كوشندە هاتووە دابمەزرێنرێ. هەروەها ئەوانەیش ناخرێنە سەر ئیش كە بەد رەوشتی‌یان لێ دەر دەكەوێ، وەك دزی‌و ... تاد.

# فەرهەنگۆك

## ئا

| | |
|---|---|
| ئەپۆزیسیۆن | : المعارضة |
| ئەنجومەنەکانی شارەوانی | : المجالس البلدية |
| ئەندامی یاریدەدەر | : عضو مساعد |
| ئەنجومەنی پیاوماقوڵان | : مجلس الأعيان |
| ئەمینداریێتی ی پایتەخت | : أمانة العاصمة |
| ئامۆژگای زانستی | : المعهد العلمي |

## ب

| | |
|---|---|
| بەلەك | : عرق السوس |
| بەرهەمی پیشەیی | : الانتاج الحرفي |
| بەش | : السهم |
| بەست | : السد |
| بزووتنەوەی سوپایی | : الحركات العسكرية |
| بەڕێوەبەرایەتی ڕێگای ئاسن | : إدارة السكك الحديدية |
| بەرهەمی میکانیکی | : الانتاج الالي |
| بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی | : مدير السجون الملكية |

| | |
|---|---|
| بڕیاری حوکم | : قرار الحكم |
| بیرۆ | : مكتب |
| بیرۆی کرێکارانه | : مكتب عمالی |
| بیرۆی کرێکارانی دەوڵەتان | : مكتب العمال الدولی |
| بەشی فیتەرخانەکەی کارگەی سوپا | : قسم البرادة في المعمل العسكری |
| باجی دەغڵو دان | : ضريبة الحبوب |
| باجی مووچە | : ضريبة الراتب |
| بەرجەستە | : تجسيد |

پ

| | |
|---|---|
| پیشەوەر | : الحرفي |
| پاککەرەوە | : المنظف |
| پیشەسازی نیشتمانیی | : الصناعة الوطنية |
| پرۆگرامی ناوخۆ | : النظام الداخلی |
| پرۆتستۆ | : إحتجاج |
| پارتی کرێکارانی بەریتایی | : حزب العمال البريطانی |
| پەیوەندی بەرهەمهێنانی باو | : علاقات الانتاج السائدة |

چ

| | |
|---|---|
| چاودێری گشتیی | : مراقب عام |
| چاودێری بیرۆی چاپەمەنی | : ملاحظ مكتب المطبوعات |

## ح

حوكمی هەتا هەتایی : الحكم المؤبد

## خ

خزمەتگوزاری تەندروستی : الخدمات الصحية

## د

دەرەكی : خارجی
دراو : العملة
داهاتی نەتەوەیی : الدخل القومی
دووسێیەك : ثلثی
دوا پلە : الدرجة القطعية
دیسپلین : الانضباط
دەستەی گشتی ی : الهيئة العامة
دەستەی دامەزرێنەر : الهيئة المؤسسة
داهات : دخل
دابەشكردنی كار : تقسيم العمل

## ر

| | |
|---|---|
| رەوکردنی بەگەلە | : الهجرة الجماعية |
| راوێژکاری یاسایی | : مستشار قانونی |
| راسپاردە | : توصية |
| رێکەوتنامە | : اتفاقية |
| رادەی هەرەکەمی رۆژانە | : الحد الأدنی للأجر. |
| رێکەوتنامەی کاری دەوڵەتان | : اتفاقية العمل الدولية |

## ز

| | |
|---|---|
| زێدەکرێ | : الأجر الاضافی |
| زێدەکار « ئۆڤەرتایم » | : العمل الاضافی |

## س

| | |
|---|---|
| سەرمایەی کەڵەکەبوو | : الرأسمال المتراكم |
| سانسۆر | : الرقابة |
| سەرۆکی دیوانی نووسینەوەی یاسا | : رئيس ديوان التدوين القانونی |
| ساڵی دارایی | : السنة المالية |
| سەرۆکی دەستەی سەرپەشتی کردن | : رئيس هيئة الأشراف |

## ش

| | |
|---|---|
| شارۆچکە | : القصبة |

## ق

| | |
|---|---|
| قەواڵە | : تعهد، سند، عقد |
| قەواڵەی کار | : عقد العمل |
| قازانگەر | : صانع المراجل |
| قوتابخانەی سنعاتکاران | : مدرسة الصنائع |

## ز

| | |
|---|---|
| زێدەکرێ | : الأجر الاضافي |
| زێدەکار « ئۆڤەرتایم » | : العمل الاضافي |

## س

| | |
|---|---|
| سەرمایەی کەڵەکەبوو | : الراسمال المتراكم |
| سانسۆر | : الرقابة |
| سەرۆکی دیوانی نووسینەوەی یاسا | : رئيس ديوان التدوين القانوني |
| ساڵی دارایی | : السنة المالية |
| سەرۆکی دەستەی سەرپەشتی کردن | : رئيس هيئة الأشراف |

## ش

| | |
|---|---|
| شارۆچکە | : القصبة |

## ق

| | |
|---|---|
| قەواڵە | : تعهد، سند، عقد |
| قەواڵەی کار | : عقد العمل |
| قازانکەر | : صانع المراجل |
| قوتابخانەی سنعاتکاران | : مدرسة الصنائع |

## ك

| | |
|---|---|
| کۆمەڵی گەلان | : عصبة الأمم |
| کاری کرێگرتە | : العمل الأجير |
| کرێکاری هەمیشەیی | : عامل دائمي |
| کرێکاری کاتیی | : عامل وقتي |
| کرێی نەختینە | : الأجر العيني |
| کرێ راستەقینە | : الأجر الحقيقي |
| کرێی بەناو | : الأجر الاسمي |
| کرێکاری شارەزا | : عامل ماهر |
| کۆمپانیای گشتیی ئەهالیی عیراق | : شركة العراق الأهلية العامة. |

| | |
|---|---|
| کەلوپەل | |
| کۆمەڵەی پشتگیری کردنی | : البضاعة ، السلعة |
| بەرهەمە | |
| نیشتمانی‌یەکان | جمعية تشجيع المنتوجات الوطنية |
| کۆمەڵەی سنعاتکاران | |
| کرێکاری نەشارەزا | : جمعية أصحاب الصنايع |
| کۆمپانیای ئینگلیزی پەرە | : عامل غير ماهر |
| پێدانی لۆکە | : شركة انماء القطن الانكليزية |
| کۆمەڵەی کرێکارانی | |
| میکانیکی عیراق | : جمعية عمال الميكانيك العراقية |
| کۆمەڵەی هاریکاری سەرتاشان | : جمعية تعاون الحلاقين |
| کۆمەڵەی میوەفرۆشان | : جمعية البقالين |
| کاسبانە «داهاتانە» | : ضريبة الدخل |
| کاری هەرەوەزی | : العمل الجماعي |
| کۆمەڵەی ریفۆرمی میللی | : جمعية الاصلاح الشعبي |
| کارشوناس | : خبير |

## ل

| | |
|---|---|
| لابۆر | : المختبر |
| لیژنەی دیسپلین | : لجنة الانضباط |
| لیژنەی تۆکمەچی‌یەکان | : لجنة السباكين |
| لیژنەی تۆرنەچی‌یەکان | : لجنة الخراطين |

میتالۆژیا : الصناعة الثقیلة
مەکۆ : نول
مەڵبەندی نیشتمانی ی بەڵگەنامەکان المرکز الوطنی للوثائق
میتاڵ : معدن
ماشین : ماکنة
مۆڵەتی ساڵانە : الاجازة السنویة
مۆڵەتی نەخۆشی : الاجازة المرضیة
مووچەی نەگۆڕ : الاجر الثابت
مۆڵەتی پیشەگەرێتی : اجازة ممارسة المهنة

## هـ

هێزی کڕین : القوة الشرائیة
هۆی دەرەکی : عامل خارجی

## و

وەچە : أحفاد
وزەی میکانیکی : الطاقة الآلیة
ورکشۆپ :الصیانة ، الورشة

## ی

| | |
|---|---|
| یاسای کار | : قانون العمل |
| یاسای زامن‌کردن | : قانون الضمان |
| یۆنیفۆرم | : الزى الموحد |
| یاسای پشتگیری کردنی پیشەسازی نیشتمانی | : قانون تشجيع الصناعة الوطنية |
| یاسای پەنا وەبەربردنی پێویست | : قانون الاستعانة الضرورية |
| یاسای کۆمەڵەکان | : قانون الجمعيات |
| یانەی راپەڕینی ئافرەتان لە بەغدا | : نادى النهضة النسائية في بغداد |
| یاسای نیوە مووچە | : قانون نصف الراتب |
| یاسای خانەنشینی مەدەنی | : قانون التقاعد المدنى |
| یاسای داشکاندنی مووچە | : قانون تخفيض الراتب |
| یاسای قۆرخ کردنی پیشە بۆ عیراقییەکان | : قانون حصر المهن بالعراقيين |
| یاسای سزا بەغدایی‌یەکان | : قانون العقوبات البغدادي |
| یاسای پاداشتی خانەنشینی | : قانون المكافئات التقاعدية |



# پێرست

لاپەرە

